# شەریعەتی ئیسلام

بە پێی پەیرەوی ئیمامی شافیعی
خوای لێ رازی بێ





مەلا عبدولکەریمی مودەڕڕیس

بەرگی: ٣-٤

# شەریعەتی ئیسلام

بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی
- خوای لێ رازی بێ -

دانراوی:
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

«بەرگی سێهەم»

بڵاوکردنەوەی کوردستان و پەرتەو بەیان

بڵاو کردونەوەی پەرتەو بەیان
سنە - پخشانگای ئیمام غەزالی
تەلەفون: ۲۲۵۶۱۰۰

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنە - پاساژی عیزەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

# شەریعەتی ئیسلام

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | شەریعەتی ئیسلام (۳) |
| ✓ دانراوی (تألیف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول): ۱۳۸۸ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ دەورەی دوو بەرگی (دورەی دو جلدی) |
| ✓ ژمارەی لاپەرەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۴۰۴ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان)<br>بڵاوکردنەوەی پەرتەو بەیان (انتشارات پرتو بیان) |

| | |
|---|---|
| شابک دوره: ۰ - ۱۰ - ۹۹۲۶ - ۹۶۴ - ۹۷۸ | ISBN: 978 - 964 - 9926 - 10 - 0 |
| شابک ج ۴و۳: ۱ - ۱۳ - ۹۹۲۶ - ۹۶۴ - ۹۷۸ | ISBN: 978 - 964 - 9926 - 13 - 1 |

# ناواخن

## باسی وەسیەت

وەسیەت لە شەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك حەقێکی خۆی بدا بە کەسێکی تر لە پاش مردنی خۆیەوە؛ وەسیەت سوننەتێکی موئەککەدەیە، وایش ئەبێ واجب ئەبێ، واتە ئەگەر نەکردنەکەی ببێ بەهۆی فەوتانی حەقی کەسێك بەسەریەوە، یا حەقی خۆی بەسەر کەسێکەوە، یا فەوتانی منداڵێك یا چەند منداڵێك لەوانە کە وان بە دەستی ئەم کەسەوە پەروەردەیان ئەکا؛ وەسیەت کەراهەتی هەیە ئەگەر زیاتر لە سێ یەکی ماڵی وەسیەتکەرەکە بگرێتەوە، بەو شەرتە کە مەبەستی بێبەشکردنی میراتگر نەبووبێ، ئەگینا حەرامە؛ وایش ئەبێ وەسیەت مەباح ئەبێ، وەك وەسیەت بە کردنەوەی خانێك کە رێبواری ئەهلی زیممە تیا دابەزن.

ئەرکانی وەسیەت، چوارە: «مُوصِی» یەعنی ئەو کەسە کە وەسیەتەکە ئەکا؛ «مُوصیٰ لە» یەعنی ئەو کەسە کە وەسیەتەکەی بۆ ئەکرێ؛ «مُوصیٰ بِە» یەعنی ئەو شتە کە وەسیەتی پێ کراوە؛ «صیغە»، یەعنی ئەو لەفزە کە وەسیەتەکەی پێ ئەکرێ.

شەرتی ئەو کەسە کە وەسیەتەکە ئەکا، ئەوەیە تەکلیفی لەسەر بێ و ئازاد بێ، هەرچەند کافریش بێ یا حیجری خرابێتە سەر بەهۆی سەفاهەتەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر ئەم کەسە ئیقرار بە شتێکی وەك تەڵاق بکا لێی قەبووڵ ئەکرێ؛ کەواتە، وەسیەتی منداڵ و شێت و بێهۆش دروست نییە.

ئەوەش کە وەسیەتەکەی بۆ کراوە، ئەگەر «لایەك»[1] بێ، شەرتی ئەوەیە حەرام و مەکرووه نەبێ، جا خواه خێر و چاکە بێ، وەك دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانە، یا مەباح بێ، وەك کردنەوەی خانێك بۆ ئەهلی زیممە؛ کەواتە، دروست نییە وەسیەت بە حەرام، وەك ئاوەدانکردنەوەی کەنیسەیەك، یا وەسیەت بە مەکرووه، وەك کردنەوەی خانوویەك بۆ رابواردنی وا کە ئینسان دوور بخاتەوە لە خواپەرستی.

وە ئەگەر وەسیەت بۆ کەسێك بوو، ئەوە لەگەڵ ئەوەشداکە ئەبێ وەسیەت بە کرداری

[١. واتە ئەگەر بۆ جیهەتێکی عومومی بوو، شەرتی ئەوەیە.... ـ بڵاوکردنەوە کوردستان].

حەرام و مەکرووهـ نەبێ، وەك کڕینی عەرەق بۆ عەرەقخۆر، ئەبێ وەسیەت بۆکراوەکە جۆرە زانراوییەکی تیا هەبێ، وەك وەسیەتکردن بۆ سکی ژنێکی دوو گیان وە ئەبێ قابیلی ئەوەیش بێ ببێ بە خاوەن موڵك؛ کەواتە، وەسیەت دانامەزرێ بۆ سکێك کە لەمەولا پەیدا ئەبێ و بۆ حەیوان بەنیازی حەیوانەکە خۆی؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: ئەم شتە وەسیەت بێ بۆ ئەو حەیوانە بۆی بدرێ بە ئالف و خواردەمەنی، ئەوە دروستە وە لە مەعنادا وەسیەتە بۆ خاوەنەکەی، بۆیە ئەگەر لەپاش ئەم وەسیەتە حەیوانەکە مرد، ئەو ماڵە ئەدرێ بە خاوەن حەیوانەکە.

هەروەها، دروست نییە وەسیەت بۆ مردوو بە نیازی خۆی؛ بەڵێ، ئەگەر نیازی، وەسیەت بێ بۆ ئەو کەسانە کە قورئانی لەسەر ئەخوێنن، یا ئەڕۆن بۆ زیارەتی، ئەوە دروستە وە دروست نییە وەسیەت بۆ «مەعدووم»، یەعنی شتێ کە لە وەختی وەسیەتەکەدا نەبێ، وەك وەسیەت بۆ سکێك کە لەمەولا پەیدا ئەبێ، یا مزگەوتێك کە لەمەولا ئەکرێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم شتە نەبووە ناوی لەپاش شتێکی بووەوە هێنرا، ئەوە دروستە، وەك ئەوەکە بڵێ: ئەم ماڵەم وەسیەت پێ کرد بۆکوڕەکانم و بۆ ئەوکوڕەزایانەیشم کە لەمەولا لەدایك ئەبن، هەروەها ئەگەر بڵێ: ئەم ماڵە وەسیەت بێ بۆ ئەو مزگەوتە کە ئێستا هەیە لە گەڕەکەکەمانا و بۆ ئەو مزگەوتانەش کە لەمەولا ئەکرێنەوە تیایدا.

هەروەها، دروستە وەسیەت بۆ سکێك کە لە وەختی وەسیەتەکەدا ببێ، بەم رەنگە کە لە کەمتر لە شەش مانگ لەکاتی وەسیەتکردنەکەوە لەدایك جیا ببێتەوە، خواهـ ژنەکە لەگەڵ مێرددا بێ یا نە، یاخود جیا ببێتەوە لە ئەوەڵی شەش مانگەوە تا چوار ساڵ لەو وەختەوە و ژنەکەیش لەگەڵ مێرددا نەبێ، بەڵام ئەگەر لەم ماوەیەدا هاتە دنیاوە و ژنەکە لەگەڵ مێرددا بوو وە یا زیاتر لە چوار ساڵ لە وەختی وەسیەتەکەوە پەیدا بوو، ئەوە ئەو ماڵە نادرێ بە مناڵەکە، چونکە ئاشکرایە مناڵەکە لەم سوورەتەدا لە وەختی وەسیەت کردنەکەدا نەبووە، چونکە بە «اِسْتقراء» دەرکەوتووە کە سك لە چوار ساڵ زیاتر بەئافرەتەوە نابێ، خواهـ لەم سوورەتەدا ژنەکە لەگەڵ مێرددا بێ یا نە.

دروستە وەسیەت بۆ ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت و وەسیەت بە تێکڕا بۆ هەرچی کە مەسڵەحەتی مزگەوتی تیابێ کە ئاوەدان کردنەوەو کڕینی حەسیر و فەرش و بەرماڵ و

چراو نەوت و کارەباو ئاوو سووتەمەنیو کرێی مجێورو مەسرەفی بانگدەریش ئەگرێتەوە، هەروەها کرێی پێش‌نوێژیش، وەك ئیمامی غەزالی فەرموویەتی، وە ئەگەر وتی: وەسیەت بێ بۆ مزگەوت، ئەویش حوکمی وەسیەتی هەیە بۆ مەسڵەحەتی مزگەوت؛ تازەکردنەوەی حەوزی ئاوو ئەدەبخانەیش، بەپێی عورف، حوکمی مەسڵەحەتی مزگەوتی هەیە.

جا ئەگەر مزگەوتەکە سەرپەرشتیکەری هەبوو، واجبە ئەو ماڵە بدرێتە دەستی سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەر و ئەبێ ئەویش بە ئاگاداری و رێگادانی سەرپەرشتیکەری ماڵی مزگەوتەکە، لێی سەرف بکا، یاخود بیداتە دەستی خۆی، یا کەسێك کە لەجێگەی ئەودا بێ، بۆ ئەوە کە لێی سەرف بکا.

دروستە وەسیەت بۆ ئاوەدانکردنەوەی حوجرەی فەقێو بۆ مەسلەحەتی ئەو حوجرەیە و ئەم مەسڵەحەتی حوجرەیە، ئاوەدانکردنەوەی و کڕینی فەرش و حەسیر و چراو سووتەمەنی و هەر پێویستییەکی تری حوجرەکە ئەگرێتەوە، هەروەها مەعاشی مامۆستا و فەقێیش ئەگرێتەوە.

هەروەها، دروستە وەسیەت بۆ حەرەمی مەککە و بۆ مەرقەدی پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ لە شاری مەدینە و سەرف ئەکرێ بۆ ئاوەدانکردنەوە و هەر پێویستییەکی تری ئەو شوێنە پیرۆزانە و بۆ ئەوانە کە خزمەتی ئەو شوێنانە ئەکەن؛ هەروەها، دروستە وەسیەتکردن بۆ قەبرستانی زانایان و ئەولیاو پیاو چاکان و ئەو ماڵە سەرف ئەکرێ لە هەرچییەکدا کە مەسڵەحەتی شەرعی ئەو قەبرستانانەی تیابێ و بۆ ئەوانە کە قورئانیان لەسەر ئەخوێنن و خزمەتیان ئەکەن.

ئەگەر وەسیەتکەرەکە هەندێ مەسرەفی تایبەتی دیاری کرد، ئەوە لەسەر قسەکەی ئەو موعامەلە ئەکرێ وە ئەگەر باسی نەکرد و لەو شوێنەدا عورفێکی تایبەتی هەبوو، ئەوە ئەو عورفە ئەکرێ بە پەیڕەو بۆ سەرفکردنی ماڵە وەسیەت پێ‌کراوەکە.

دروستە وەسیەت بۆ ئەهلی زیممە بە جۆرێك کە نەبێ بەهۆی سووکی بۆ ئایینی ئیسلام؛ هەروەها، دروستە وەسیەت بۆ کافر کە لە وڵاتی کافرانا بژی، بەو شەرتە

وەسیەت بە چەك (سِلاح) نەبێ یا بە هەر شتێکی تر کە ببێ بەهۆی بەهێزبوونی ئەو کافرانە؛ مەسەلا، دروستە بڵێت: وەسیەت بێ فلأنە شتم سەرف بکرێ بۆ نـان و ئـاو پێدانی ئەو کافرە جەنگییانە کە بە دیل ئەگیرێن وە دروستە وەسیەتکردن بۆ پاشگەز بووەوە (مُرتَد) و بۆ پیاوکوژ؛ مەسەلا، کەسێك یەکێك بریندار ئەکا و هێشتا کـابرای بریندارکراو نەمردووە، وەسیەت ئەکا بۆ ئەو کەسە کـە بـرینداری کـردووەو لەپـاشا ئەمرێ. مەبەس لەمانە، ئەمەیە کـە لە ئـایینی ئـیسلاما ئـەوپەڕ دەرەجـەی رەحـم و میهرەبانی و بەزەیی هەیە لەگەڵ هەموو کەسدا، هەر بەو شەرتە نەبێ بەهۆی سووکی بۆ ئیسلامەتی و نەبێ بەهۆی یارمەتیدانی کەس لەسەرگوناهکردن بەنیازی یارمەتیدانی لەسەرگوناه.

هەروەها، دروستە وەسیەت بۆ میراتبەر، بەو شەرتە میراتبەرەکـانیتر لەپـاش مردنی کابرا رێگا بدەن؛ بەڵام وەسیەت بۆ میراتبەر بە ئەندازەی بەشەکـەی خـۆی بەتاڵە، ئەگەر لەجیاتی ئەو بەشە عەینێك جیا نەکرابێتەوە وە ئەگەر جیاکرابێتەوە، ئەوە دروستە، بە شەرتێ کە میراتبەرەکانیتر رێگا بدەن، چـونکە مـەبەستی ئـینسان لە عەینی شتدا ئەگۆڕێ.

تەبەڕوعاتی «مُنجَّزە»، واتە: خێراتی دەسبەجێ بۆ هەندێ لە مـیراتبـەران، وەك «هِبَة» (بەخشین) و وەقف و ئازادکردن لە قەرز لە نەخۆشی مردنا، هـەموو حـوکمی وەسیەتیان هەیەو پێویستیان بە رێگادانی میراتبەرەکانیتر هەیە و بە رێگادانی ئەوان نەبێ، دانامەزرێ، بەو شەرتە کە ئەندازەی ماڵەکە کە دراوە بە وەسیەت بۆ کـراوەکـە دیاری بێ لەلایان و هەموو میراتبەرەکانیش تەسەڕوفیان دروست بێ؛ کەواتە، ئەگەر هەندێك لەوانە حیجریان لەسەر بوو، ئەوە لە بەشی ئەوانەدا ئەو تـەبەڕوعـە بـەتاڵە، یەعنی رائەگیرێ تا حیجرەکەیان لەسەر لائەچێ وە ئەگەر لەپاش رێگادانـەکـەیان، هەندێکیان یا هەموویان ئیددیعایان کرد کە ئەندازەی ئەو ماڵە نـازانـن کـە دراوە بـە وەسیەت بۆکراوەکە، ئەوە بە سوێند باوەڕیان پێ ئەکرێ و رێگادانەکەیان بەتاڵ ئەبێتەوە، مادام بە شاهید ئیسپاتی ئەوە نەکرێت کە ئەزانن ئەندازەکە چەندە.

ئەگەر کەسێك وتی: ئەم ماڵەم وەسیەت بێ بۆ سکی ئەو ژنە و کە منداڵی بوو، بە کەرەتێك دوو منالّی بوو، ئەوە ماڵەکە ئەدرێ بە هەردوو منالّەکە وە ئەگەر یەکێکیان بە مردوویی بوو و ئەویان زیندوو بوو، ئەوە هەموو ماڵەکە ئەدرێ بە زیندووەکە وە ئەگەر وتی: ئەگەر سکەکەت نێرینە بوو، ئەو ماڵە وەسیەت بێ بۆی وە ژنەکە بە سکێ کوڕێك و کچێکی لێ بوو، ئەوە وەسیەتەکە بەتاڵە، لەبەر ئەوەکە سکەکەی نە بە تەنیا کوڕ بووەو نە بەتەنیا کچ بووە. وە ئەگەر وتی: ئەگەر کوڕ لەسکیا بوو، ئەو ماڵە وەسیەت بێ بـۆی، کەچی ژنەکە کوڕو کچی بوو، ئەوە ماڵەکە گشتی ئەدرێ بە کوڕەکە؛ هەروەها، ئەگەر وتی: ئەگەر کچ لەسکیا بوو، ئەو ماڵە وەسیەت بێ بۆی و ژنەکە کوڕو کچی بوو، ئەوە هەموو ماڵەکە ئەدرێ بەکچەکە، چونکە مەبەستی کابرای وەسیەتکەر لە سوورەتی یەکەما ئەوە بووە کوڕی ببێ و لە سوورەتی دووهەما ئەوە بووە کچی ببێ، ئیتر با منالّی تریشیان لەگەڵدا پەیدا ببێ وە ئەگەر لە سوورەتی یەکەمدا، ژنەکە دوو کوڕی ببێ و لە سوورەتی دووهەما، دوو کچی ببێ، ئەوە وەسیەتەکە دروستە و کابرای سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەرەکە بە ئارەزووی خۆیەتی ماڵەکە بە هەرکام لەو دوو کوڕە یا ئەو دوو کچە بدا، دروستە.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بۆ دراوسێ و بەیانی ژمارەو سیفەتی دراوسێکـانی نەکرد، ئەوە ئەو ماڵە وەسیەتپێکراوە ئەگەیەنرێ بە چل خانوو لە چوار لای ماڵی کابرای وەسیەتکەرەوە، یەعنی بە سەدو شەست خانوو، خواه دەوڵەمەند بن یا فەقیر؛ بەڵێ، ئەگەر عورفی وڵاتەکە مەعنای دراوسـێیـی بـە ژمـارەو سـیفەتێکـی تـایبەتی لێئەدایەوە، یاخود کابرای وەسیەتکەر خۆی بەیانی کردبوو، ئـەوە هـەر بـەوانـەدا ئەگەیەنرێ کە عورفەکە ئەیانگرێتەوە یاکابرا بەیانی کردوون وە ئەگەر کەسێك وتی: ئەم ماڵەم وەسیەت بێ بۆ زانایان، ئەوە ئەدرێ بەو کەسانە کە زانای شەریعەتن کە تەفسیر و حەدیس و فیقه ئەگرێتەوە و نادرێ بەو کەسانە کە قورئان ئەزانن و دەرسی چۆنیەتی قورئانخوێندن ئەڵێنەوە، هەروەها نـادرێ بـە ئـەدیب و بـەوانـەی تـەعبیری خـەو لێئەدەنەوە و بە دوکتۆر و زانایانی عیلمی کەلام، بە پێی قسـەی زۆرتـری زانـایانی

شەرع، بەڵام ئەگەر عورفی وڵاتێك بە غەیری ئەم جۆرە بوو، واتە وشەی «زانا» هەر جۆرە زانایەکی ئەگرتەوە، ئەوە بە پێی ئەو عورفە رەفتار ئەکرێ.

ئێستا لەم کوردەوارییەی ئێمەدا، کە وترا «مەلا» یا «عالم»، مەبەست کەسێکە کە شارەزای عولوومی دین بێ کە لە حوجرە و مزگەوتا ئەخوێنرێن، چ لە «مَقاصِد» و چ لە «مبادِیء» واتە: چ ئەو عیلمانەی کە راست و رەوان باسی دینن و چ ئەو عیلمانەی کە رێگان بۆ زانینی عولوومی دین؛ کەواتە، «مەلا»، وەك زانایانی شەرع و تەفسیر و حەدیس ئەگرێتەوە، زانایانی نەحوو سەرف و بەلاغەو مەنتیق و ئاداب و کەلام و ئوسوولی فیقھ و ریازیاتیش ئەگرێتەوە، خواە پایەیەکی بەرزی هەبێ لەو زانستەدا یا نە و خەریکی دەرس‌وتنەوە بێ یا خەریکی پێش‌نوێژی و خوتبەخوێندنەوە بێ.

هەروەها، فەقێیش بەو کەسانە ئەڵێن کە خەریکی خوێندنی ئەو عیلمانەن کە پەیوەندییان بە دینەوە هەیە، خواە لە «مُهَمّات»ی دین بێ یا لە «مقدّمات» و ئەسبابی زانینی موهیمماتەکان، وە خواە فەقێکە زۆری خوێندبێ یا هێشتا هەر لە سەرەتادا بێ.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بۆ فەقیر و هەژار، ئەوە ماڵەکەی ئەدرێ بەو کەسانە کە بەشی ژیانی عادەتی خۆیانیان نییە؛ جا هەرکاتێ کەسێك وەسیەتی کرد بۆ ئەم جۆرەکەسانەو ناوی کەسێکی تایبەتی نەبرد و سەرپەرشتیکەری ماڵەکەیشی فەقیر بوو، ئەوە بە قەتعی دروست نییە لەو ماڵە سەرف بکا بۆ خۆی یا بۆ میراتبەرێکی فەقیری ئەو کابراکە وەسیەتەکەی کردووە، بەڵکوو ئەدرێ بە غەیری ئەوان. وە دروست نییە سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەر، ئەو ماڵە بداتە لای کەسێکی تر بە ئەمانەت، هەروەها دروست نییە لای خۆی رای‌بگرێ، بەڵکوو ئەبێ دەس بەجێ بیگەیێنێ بەو کەسانەو بەولایانەدا کەوا وەسیەتیان بۆ کراوە.

ئەگەر کەسێك وتی: ماڵەکەم وەسیەت بێ بۆ عولەماو بۆ فەقێیان، ئەبێ بە شەریکی بدرێ بە هەردوولایان بە نیوەیی؛ جا ئەگەر دیاریی نەکردبوو لەکوێ دابەش بکرێ، یاخود شوێنێکی تایبەتی دیاری کرد، بەڵام ژمارەی وەسیەت بۆکراوەکان لەو شوێنەدا لە ژمارە نەئەهات، ئەوە پێویستە لای کەمی، بدرێ بە سێ کەس لە هەر تاقمێکیان و

دروستە بۆ سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەر لەم سێ کەسەدا بەشی یەکێکیان لە یەکێکی تریان زیاتر بدا وە ئەگەر ژمارەی وەسیەت بۆکراوەکان کەم بوون و لەبەر چاو بوون، ئەبێ بدرێ بە هەموویان، چونیەك. وە ئەگەر وتی: ئەو ماڵەم وەسیەت بێ بۆ فڵانکەس و بۆ هەژاران، ئەوە ئەو کەسەیش وەکوو یەکێ لە هەژارەکان بەشی ئەدرێ و هەر ئەوەندەیە نابێ بێبەش بکرێ.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بۆ کۆمەڵێکی دیاریو لە ژمارە نەهاتوو، وەکوو ئەولادی پێغەمبەرﷺ، ئەوە دروستە ئەو ماڵە بدرێ بە سێ کەسیان وە ئەگەر وەسیەتی کرد بۆ خزمانی فڵانکەس، ئەوە ئەدرێ بە هەموو خزمێکی، چ لەلای باوك و چ لەلای دایکەوە، با زۆر دووریش بێ، بەڵام نادرێ بە باوك و دایك و مناڵ و مناڵەزای ئەوکەسە وە ئەگەر وەسیەت بکا بۆ ئەوە کە بدرێ بە کەسێك کە لە هەمووکەس نزیکتر بێ بە فڵانکەس، ئەوە لەم کاتەدا ئەدرێ بە باوك و دایك و مناڵی، بەڵام کوڕ پێش باوکی ئەکەوێو برا پێش باپیرە ئەکەوێ و لێرەدا نێرینە تەرجیح نادرێ بەسەر مێینەدا و ئەوەی بەشە میراتی زۆرتر بکەوێ تەرجیح نادرێ بەسەر ئەوەدا کە کەمتری بکەوێ، بەڵکوو باوك و دایك و کوڕوکچ وەکوو یەکن وکوڕی کچ ـ با میراتبەریش نەبێ ـ پێش ئەکەوێ لە کوڕی کوڕی کوڕ، چونکە پایەی ئەو دوورترە وە ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بۆ خزمانی خۆی، میراتبەری بەر ناکەوێ.

شەرتی وەسیەت پێکراو (مُوصى بِه)یەکەیش ئەوەیە قابیلی گوێزانەوە بێ بە ئارەزووی کابرای وەسیەتکەر؛ کەواتە، دروست نییە کەسێك کە حەددی «قَذْف»ی هەیە وەسیەت بکا ئەو حەددە بۆ کەسێکی تر بێ، بەڵام دروستە قەزفکراوەکە وەسیەت بۆ ئەو کەسە بکا کە قەزفەکەی کردووە، واتە لە نەخۆشی مردنیا عەفوی بکا؛ هەروەها، دروست نییە وەسیەت بەو حەقی شوفعەیە کە هەیەتی بۆ غەیری کەسێك کە حەقی شوفعەکەی هەیە، واتە لەجیاتی ئەم، ماڵەکە بە شوفعە وەربگرێ، بەڵام دروستە بۆ ئەو کەسە کە شوفعەکەی لەسەرە، بەمڕەنگە کە کابرای بە شوفعەوەرگر لە نەخۆشی مردنیا ئەو کابرا عەفو بکا لە حەقی خۆی بۆ بە شوفعەوەرگرتنی ماڵە کڕراوەکە.

بەشەرت گیراوە لە ماڵی وەسیەت پێ کراودا کە کەڵك لێ وەرگرتنی بەشەرع حەڵاڵ بێ. دروستە وەسیەتکردن بە شتێ کە ئێستا ببێ یا نەبێ و بە عەین و بە مەنفەعەت و بە زانراوو نەزانراو؛ کەواتە، دروستە وەسیەتکردن بە شتێ کە لەمەولا پەیدا ئەبێ، وەك میوەی باخێك بۆ ساڵی داهاتووی، یا سکی حەیوانێك کە لەمەولا بەران بگرێ.

ئەگەر کەسێك حەیوانێکی وەسیەت کرد بۆ کەسێك، ئەوە سکەکەی و مووەکەی و خورییەکەی و شیرەکەی و هەر قازانجێکی تر ئەگرێتەوە کە لەوانەبێ لەو حەیوانە پەیدا ببێ. وە ئەگەر وەسیەتی کرد بە درەختێك، ئەوە هەموو ئەو شتانە ئەگرێتەوە کە لە فرۆشتنی درەختەکەدا بەربکەون، وەك لقە وردەو ریشەی درەختەکەو میوەیەکی کە هێشتا دەرنەکەوتبێ و دروستە وەسیەتکردن بە یەکێك لە دوو حەیوان، جا پاشان میراتبەر یا سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەر، بە ئارەزووی خۆی حەیوانەکە دیاری ئەکا؛ هەروەها، دروستە وەسیەت بە شتێکی پیسی وا کە قازانجێکی هەبێ، وەك زبڵ و پشقل و تەپاڵە و سەگی راوو سەگی پاس و بە شەرابێك کە حورمەتی هەبێ و نەرێژرێ بەو رەنگە کە ئاوی ترێکە بە نیازی سرکە یا بە بێ نیاز گوشرابێ.

جا ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە سەگێك لە سەگەکانی، ئەوە ئەگەر سەگی نەبوو وەسیەتەکەی بەتاڵە وە ئەگەر هەیبوو، دروستەو میراتبەر یا سەرپەرشتیکەری ماڵی کابرای وەسیەتکەرەکە دیاریی ئەکا کامیان ئەدا وە ئەگەر کابرا ماڵێکی کەمی هەبوو و سەگێکی زۆری هەبوو و وەسیەتی کرد بە هەموو سەگەکانی، ئەوە دروستە لە هەموویانا هەرچەند لە سێ یەکیش زیاد بێ؛ بەڵێ، ئەگەر سێ یەکی ماڵی وەسیەت کرد بۆ کەسێك، ئەوە لە سەگەکانیشا هەر سێ یەکیان دروستە وە ئەگەر وەسیەتی کرد بۆ کەسێك، بە تەپڵ و تەپڵی رابواردنو تەپڵی حەج یا تەپڵی جەنگیشی هەبوو، ئەوە تەپڵەکە بە تەپلە حەڵاڵەکەیان مەعنای لێ ئەدرێتەوە وە ئەگەر بەتایبەتی وەسیەتی کرد بە تەپڵە حەرامەکە، ئەوە بەتاڵە، مەگەر پارچەکانی کەڵکی شتێکیان پێوە بێ.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە مەڕێك یا بزنێك، ئەوە گەورەو بچووك ئەگرێتەوە و بێ عەیب و عەیبدار و نێرو مێ ئەگرێتەوە، چونکە لەفزی «بزن» و «مەڕ»، ناون بۆ

جۆرەکە؛ بەڵێ، لە مەڕدا فەرق هەیە لەبەینی بەران و مێ و کاوڕو بەرخ‌دا و لە بزندا فەرق هەیە لە بەینی سابرین و خرت و چتیرو گێسك و کارژەڵەدا و ئەمانە هیچیان جۆرێکی تریان ناگرنەوە. ئەگەر کەسێك وتی: لە رانەکەم مەڕێك بدەن بە فڵانکەس و رانی نەبوو، ئەوە وەسیەتەکەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر وتی: لە ماڵی من مەڕێك بدەن بە فڵانکەس، ئەوە پێویستە بە ماڵی ئەو مەڕێك بکڕن بۆ ئەو کەسە.

وەك دروستە وەسیەت‌کردن بە عەین، دروستیشە وەسیەت‌کردن بە مەنفەعەت، وەك مەنفەعەتی پارچەزەوییەك یا جۆگە ئاوێك یا باخێك ـ مەسەلا ـ جا ئەگەر لەفزەکەی هەر وەسیەت بە مەنفەعەتی شتەکە بوو، ئەوە مەعنای هەمیشە ئەگەیەنێ، وەك ئەوەکە بڵێ: وەسیەت بێ مەنفەعەتی ئەو زەوییەم بۆ ئەو مزگەوتە بێ وە ئەگەر ناوی زەمانێکی تایبەتی برد، ئەوە تەنها بۆ ئەو ماوەیە ئەدرێ بە وەسیەت بۆ کراوەکە.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە مەنفەعەتی دە سەر مەڕ بۆ ئەو کەسانە کە دێنە ماڵەکەی، ئەوە سەری حەیوانەکان و هەر بەچکەیەکیان لێ ببێ، بۆ میرات‌بەرەکەیەتی، بەڵام مەنفەعەتیان، وەك خوری و شیرو دۆو رۆن و هەرچییەکی تر بۆ ئەو کەسانەیە کە دێنە ماڵەکەی، تا هەموو دە سەرە حەیوانەکە ئەمرن، ئیتر وەسیەتەکە ئەبڕێتەوە وە ئەگەر وتی: مەنفەعەتی ئەو دە سەرە مەڕەو هەر بەچکەیێکی مێچکەیشیان لێ پەیدا ببێ، وەسیەت بێ بۆ فڵانکەس، ئەوەیش دروستە و لەم سوورەتەدا، میرات‌بەر ئەتوانێ هەر بەچکەیەکی نێریان ببێ بۆ خۆی تەسەڕوفی تیا بکا، بەڵام ناتوانێ تەسەڕوف لە بەچکە مێچکەکانا بکا و هەرچی مەسرەفیشیانە لەسەریەتی، چونکە خاوەنی سەرەکانیانە!

وە ئەگەر کەسێك وەسیەت بکا بە سێ‌یەکی ماڵی خۆی بۆ ئەو موسوڵمانانەکە دێنە ماڵیەوە، ئەوە دروستە و واجب نییە لەسەر میرات‌بەر ئەو سێ‌یەکە لە ماڵەکە جیا بکاتەوە، چونکە مەبەستی خاوەن‌ماڵەکە ئەوەیە خێری لە ماڵەکەیدا نەبڕێتەوە وە ئەگەر ئەو سێ‌یەکە جیا بکرێتەوە نایەتەناو و قابیل نییە بەعادەت، کەسێك بەجیا سێ‌یەکی حەیوانەکان بدۆشێ و سێ‌یەکی گەنمەکە بهارێ بۆ خەڵك وە ئەگەر لە فەرزێکا جیایشی بکاتەوە، لە ماوەیەکی کەمدا ئەفەوتێ و ئەمە پێچەوانەی مەبەستی کابرای وەسیەت‌کەرە،

هەر وەك چۆن دروستە برای گەورەماڵی برای نابالغ تێکەڵی ماڵەکەی خۆی بکاو میوانداریشی لەسەر بکا، بەڵام بەو شەرتە بە پێی عادەت زیان نەگەیەنێ بە بەشی برا بچووکەکەی.

ئەگەر کابرای وەسیەتکەر ویستی مناڵەکانی خۆی لە خواردنی ئەو سێ‌یەکەدا گوناهبار نەبن، با لەفزی وەسیەتەکەی بەمجۆرە بێ: "سێ‌یەکی ماڵم وەسیەت بێ بۆ ئوممەتی پێغەمبەر، ئەوانەیان لەم خانووی مندا دائەنیشن، ئیتر لە هەر تاقمێك بن و لە ئەولادی هەرکەسێ بن، یا: ئەوانەی دێن و ئەڕۆن بەم ماڵەدا و هەرکەسێ هەن" وە ئەگەر بەتایبەتی لەو سێ‌یەکەدا باسی خانوو، وە فەرش و پێخەف و قاپ و قاچاغ بکرێ چاکترە.

دروستە وەسیەت بەکردنی حەجی سوننەت و ئەم وەسیەتە لە مەعنادا وەسیەتە بەو پارەیەکە سەرف ئەکرێ لەکرێی ئەوکەسەداکە ئەڕوا بۆ حەجەکە؛ جا لەم سوورەتەدا، ئەگەر لە وەسیەتەکەدا ناوی شوێنی ئیحرامی نەبرد، ئەوە لە میقاتی عادەتییەوە ئیحرام بۆ ئەو حەجە دائەبەسرێ وە ئەگەر شوێنێکی تایبەتی دیاری کرد، هەرچەند دوورتر بێ لە میقات و هەتاوەکوو ئەگەر ناوی وڵاتەکەی خۆی ببا بۆ ئیحرامبەستن، پێویستە بەو جۆرە حەجەکەی بۆ بکرێ و لەم حەجی سوننەتەدا، نە بێگانە و نە میراتبەر، دروست نییە بە بێ‌وەسیەت حەجیان بۆ بکرێ و پارەی ئەم حەجەیش لە سێ‌یەکی ماڵ دەرئەچێ.

بەڵام ئەگەر قەرزاری حەجی فەرز بوو، ئەوە با وەسیەتیش نەکا، واجبە بۆی بکرێ؛ جا بۆ پارەکەی، ئەگەر بڕیاری دابوو لە سەرمایە یا لە سێ‌یەك دەر بکرێ، ئەوە دیارە، ئەگینا هەر لە ئەسڵی میراتەکە دەرئەکرێ و لە میقاتی عادەتییەوە ئیحرامی بۆ دائەبەسرێ و لەپاش عەقدی بەکرێ‌گرتنی ئەو کەسە کە حەجەکەی لەجیاتی ئەکا، دروست نییە بە عوزرێکی شەرعی وەك پەككەوتنی کابرای بەکرێ‌گیراو یا پەیدابوونی نیشانەی خەیانەتکردنی، ئەو عەقدە هەڵبووەشێنرێتەوە. وە دروستە بۆ خزم و بێگانە حەجی فەرز بکەن لەجیاتی مردوو، هەرچەند خۆیشی وەسیەتی نەکردبێ، وەك چۆن دروستە بە بێ‌ئیزنی قەرزار قەرزەکەی لەجیاتی بدرێتەوە.

## لەبارەی ئەندازەی وەسیەتەوە

لایق نییە ئینسان وەسیەت بکا بە زیاتر لە سێ‌یەکی ماڵی خۆی وە ئەگەر بە زیاتر لە سێ‌یەك وەسیەتی کرد و میراتبەرەکان رازی نەبوون بەوە، ئەوە وەسیەتەکەی بە زیاتر لە سێ‌یەك بەتاڵە وە ئەگەر رێگایان‌دا، جێ‌بەجێ ئەکرێ؛ بۆ دیاری‌کردنی ئەندازەی ماڵی کابرای مردوویش، تەماشای رۆژی مردنەکە ئەکرێ، هەروا بۆ رازی‌بوون و رازی نەبوونی میراتبەرەکانیش، هەر تەماشای ئەو رۆژە ئەکرێ؛ هەروەها، هەر تەبەڕوعێك کە بە تەنجیز لە نەخۆشی مردنا بیکا، ئەوە حوکمی وەسیەتی هەیە، خواە بەخشین بێ یا وەقف‌کردن بێ یا گەردن‌ئازایی بێ یا شتی‌تر.

جا ئەگەر چەند تەبەڕوعێك کەوتەیەك و سێ‌یەکی ماڵی، بەشی هەمووی نەئەکرد، تەماشا ئەکەین، ئەگەر ئەو تەبەڕوعانە بە تەنجیزو بەرودوا بوون، بە تەرتیب تەماشایان ئەکرێ تا هەرچەند سێ‌یەکە بەشی بکا و هەرچەندی لەو سێ‌یەکە زیاتر بێ، بەتاڵە وە ئەگەر بەیەکەوە بوون، بەم‌ڕەنگە لە یەك‌کاتا کابرا خۆی و چەند وەکیلێکی تەبەڕوعەکانیان کردبوو ـ مەسەلا ـ ئەوە ئەو سێ‌یەکە بەش ئەکرێتەوە بەسەریانا، لەسەر حیسابی قیمەتی تەبەڕوعەکان و هەرکام چەندی پێ‌ئەبڕێ، ئەوەندەی دائەمەرزێ‌و زیادەکەی بەتاڵە وە ئەگەر تەبەڕوعەکان وەعدەیان بۆ دانرابوو، وەك ئەوە کە بڵێ: پاش مردنم، سێ‌یەکەکە بەش ئەکرێ بەسەریانا، هەرکام هەرچی بەرکەوت، ئەوەندەی دروستەو باقییەکەی بەتاڵە؛ مەسەلا، کابرا وەسیەتی کرد بۆ فلانکەس بە ئەسپێك کە دوازدە دینار قیمەتی بوو و بۆ کەسێکی‌تر بە مەڕێك کە شەش دینار قیمەتی بوو و بۆ یەکێکی‌تر بە بزنێك کە سێ دینار قیمەتی بوو، وە سێ‌یەکی ماڵەکەیشی چواردە دینار بوو، ئەوە هەشت دیناری ئەدرێ بە یەکەمیان و چوار دیناری ئەدرێ بە دووهەمیان‌و دوو دیناری ئەدرێ بە سێهەمیان.

بزانن! وەسیەت لە عەینێکدا کە وەسیەت کرابێ بە قازانجەکەی بۆ هەمیشە، یا بۆ وەختێکی دیاری‌کراو، وا دائەنرێ کە وەسیەتە بە ئەندازەی جیاوازی لە قیمەتەکەیا بە

قازانجەکەیەوەو بە بێ‌قازانجەکەی؛ مەسەلا، خانوویەك بە بێ‌قازانجی هەمیشەیی، دە دینار ئەژی و بەقازانجەوە، سەد دینار ئەژی، وەك ئەوە وایە وەسیەتی تیا کرابێ بە نەوەد دینار.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی بە حەجی سوننەت کردبوو، تەماشای کرێی کابرای بەکرێ‌گیراو ئەکرێ: ئەگەر سێ‌یەکی ماڵەکەی بەشی ئەکرد، ئەوا باشە، ئەگینا هەرچەندی زیاد بێ، بە بێ‌ڕێگادانی میراتبەرەکان دروست نییە.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە عەینێکی حازر لە ماڵەکەی کە بە سێ‌یەکی دەرئەچوو و ئەوی‌تری لە بەردەستا نەبوو، ئەوە دروست نییە هەموو ئەم عەینە حازرە بدەین بەو کابرایە کە وەسیەتەکەی بۆ کراوە، بەڵکوو سێ‌یەکی ئەم عەینەی ئەدەینێ تا ماڵە نادیارەکەی پەیدا ئەبێتەوە و لەگەڵ ئەوەشا کە سێ‌یەکی عەینەکەی ئەدەینێ، ماوەی نادەین کە تەسەڕوفی تیا بکا تا میراتبەرەکان دەس ئەگرن بەسەر ئەو دوو سێ‌یەکی ماڵەکەداو تەسەڕوفی تیا ئەکەن.

هەروەکوو وەسیەت لە سێ‌یەکی ماڵدا دائەمەزرێ، هەر تەبەڕوعێکیش لە نەخۆشییەکا بکرێ کە مەترسی مردنی لێ بکرێ، ئەویش هەر لە سێ‌یەکدا دائەمەزرێ؛ جا ئەگەر لە نەخۆشییەکی وەهادا تەبەڕوعی بە زیاتر لە سێ‌یەکی ماڵی لەبەردەستابووی خۆی کرد، ئەوە هەر لە سێ‌یەکیا دائەمەزرێ و بۆ زیادەکەی لێی رائەوەستین؛ ئەگەر لەو نەخۆشییە رزگاری بوو، دەرئەکەوێ ئەویش دروست بووە وە ئەگەر مرد، دەرئەکەوێ بەتاڵ بووە، چونکە نەخۆش مەنعی تەسەڕوفی لێ کراوە لە زیاتر لە سێ‌یەکی ماڵدا.

ئەگەر کەسێك تەبەڕوعێکی کرد لە نەخۆشییەکدا کە ترسی مردنی پێوە نەبوو، کەچی کابرا مرد، ئەوە ئەگەر مردنەکەی بە مردنی کوت‌وپڕ دابنرێ بەهۆی ئەوەوە کە نەخۆشییەکەی نەخۆشییەکی وا نەبووبێ ئینسانی پێ‌بمرێ، وەك چاوئێشان، ئەوە تەبەڕوعەکەی جێ‌بەجێ ئەکرێ وە ئەگەر مردنەکەی بە مردنی کوت‌وپڕ دانەنرێ، وەك ئەوە کە ژانەسکێکی لێ پەیدا ببێ و بمرێ، ئەوە دەرئەکەوێ نەخۆشییەکەی ترسی مردنی پێوە بووە و وەسیەتەکەی لە زیاد لە سێ‌یەکدا دانامەزرێ.

ئەگەر گومانمان هەبوو لەوەدا کە ئاخۆ ئەو نەخۆشییە مەترسی پێوەیە یا نە، ئەوە بۆمان دەرناکەوێ بە قسەی دوو دوکتۆری موسوڵمانی ئازادی بەداد نەبێ؛ ئەگەر ئەوان شەهادەتیان دا لەسەر ئەوە کە نەخۆشییەکە ترسی پێوەیە، ئەوە بە مەترسیدار دائەنرێ، ئەگینا هیچ و بە هیچجۆرێ، ترسی مردن لێکراوی‌و ترسی مردن لێنەکراویی هیچ نەخۆشییەك ئیسپات نابێ بە شەهادەتی یەك دوکتۆری پیاو یا یەك دوکتۆری پیاوو دوو دوکتۆری ژن و هەروەها بە شەهادەتی تەنها دوکتۆری ژن، مەگەر لەو نەخۆشییانەدا کە تایبەتین بە ژنانەوە، ئەوە بە شەهادەتی چوار دوکتۆری ژن ئیسپات ئەبێ.

ئەگەر میراتبەر بوو بە هەرای لەگەڵ کابرای وەسیەت بۆ کراودا، ئەم ئەیوت: نەخۆشییەکە مەترسی لێ کراو بووەو ئەو ئەیوت: مەترسی لێ کراو نەبووە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی وەسیەت بۆکراوەکە ئەکرێ، مەگەر لەحاڵێکا کە میراتبەرەکە دوو شاهیدی هەبێ کە دوکتۆری موسوڵمان و ئازادو بەداد بن [و] شەهادەت بدەن کەوا نەخۆشییەکە مەترسی لێکراو بووە وە ئەگەر بوو بەهەرایان لەسەر ئەسڵی نەخۆشییەکە؛ مەسەلا، کابرای میراتبەر ئەیوت: گرانەتا بووەو وەسیەت بۆکراوەکە ئەیوت: دانئێشە بووە، ئەوە بە غەیری دوکتۆریش ئیسپات ئەکرێ کە چ نەخۆشییەك بووە.

لە نەخۆشی مەترسیدارە «کۆڵنج» و «ذاتُ‌الجَنب» و بەربوونی خوێنی لووت تا ماوەیەك کە بە عادەت ئینسان بێ‌خوێن بکاو بیکوژێ و «إسهال»، یەعنی رەوانی، بەو شەرتە کە درێژە بکێشێ و «باریکە» کە نەخۆشی دڵە، بەڵام «سیل» کە بریتییە لەوە سی بریندار ببێ، ئەوە بە نەخۆشی مەترسیدار ناژمێررێ، چونکە زۆر درێژە ئەکێشێ‌و وا ئەبێ دە پازدە ساڵ ئەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر گەیشتە دەوری دوایی، بە شەهادەتی دوو دوکتۆری موسوڵمانی ئازاد و بەداد، ئەوە بە مەترسیدار دائەنرێ، هەروەها «ئیفلیج» بوونێك کە لە سەرەتایدا بێ، ئەوەش بە نەخۆشی مەترسیدار دائەنرێ، واتە: کە ئینسان لایەکی ئیفلیج ئەبێ، ئەوە تا حەوت رۆژ بە نەخۆشی مەترسیدار دائەنرێ‌و لەوەپاش، بە نەخۆشی مەترسیدار دانانرێ؛ هەروەها، لە نەخۆشی مەترسیدارە دەرچوونی خواردەمەنی لە ئینسانەوە بە ساغی بە بێ‌ئێش و هێزکردن و «زەحیری» ـکە ئەوەیە

پیسایی لەگەڵ خوێنا دابنێ ـوە «گرانەتا» کە تایەکی بەدەوامی شەوو رۆژە، مەگەر سەر لە بەیانیان کەمێك نەخۆشەکە بەربدا؛ هەروەها، بە نەخۆشی مەترسیدار دائەنرێ هەر جۆرە «تا»یەکی تر کە بە نۆبە ئینسان بگرێ، مەگەر «سێبەرۆ» کە رۆژێ دێت و دوو رۆژ نایەت و لە نەخۆشی مەترسیدارە بـرینێك کـە کـونی کـردبێتـە سك. وە ئـاوسان و رشانەوەی بەردەوام.

بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی خۆی، حوکمی نەخۆشی مـەترسیداری هـەیە بەدیل رۆیشتنی موسوڵمانێك بە دەستی کافر یا بە دەستی دوژمن، ئەگەر عادەتیان وابێ دیل بکوژن وە تێکڕژانی سوپا لە هەردوولاوە بەو شەرتە کە ئەوەندەی یەك بن، ئەگینا حوکمی نەخۆشی مەترسی لێنەکراوی هەیە بۆ ئەفرادی ئەولایە کە بەهێزترن لەویان، وە بۆ بێهێزترەکەیان حوکمی نەخۆشی مەترسی لێکراوی هەیە.

هەروەها بردنی کەسێك بۆ لێسەندنەوەی تۆڵەی پیاوکوشتن (قِـصاص)، یـا بـۆ سەنگەسارکردن (رَجْم) و هێرشی شەپۆلی دەریا بەسەر ئەوانەدا کە لەناو کەشتیدا بن و ژانەسکی ژن لەپێش منداڵبوونیا، هەروەها پاش منداڵبوونەکەیش تا مناڵدانەکەی لێ جوێ ئەبێتەوە، ئەوە هەموو حوکمی نەخۆشی مەترسی لێکراوی هەیە.

داکەوتنی تاعوونی وەك چاوە قووڵەو رشانەوە لە وڵاتێکا، حـوکمی نـەخۆشـی مەترسی لێکراوی هەیە بۆ هەموو خەڵکی ئەو وڵاتە، بەو شەرتە کە زۆربەی خەڵکەکەی گرتبێتەوە؛ لە حاڵیوادا، تەبەرڕوعی هەرکەس لە ئەهلی ئەو وڵاتە، لە سێیەك بەولاوەی ماڵیا دانامەزرێ و بۆ زیاد لەو ئەندازەیە، تەماشا ئەکەین، ئەگەر تا پـاش لاچـوونی تاعوونەکە کابرا نەمرد بە تاعوون، ئەوە هەمووی دائەمەزرێ، ئەگینا هەرچـەندی لە سێیەك زیاد بێ، بە بەتاڵ دائەنرێ.

## سیغەی وەسیەت

سیغەی وەسیەت، لەفزێکە مەعنای بە موڵك کردنی شتێك بگـەیەنێ بـۆ کـەسێك لەپاش مردنی کابرای وەسیەتکەر، وەسیەتی بێپیچ و پەنا، وەکوو ئەوە کـە بـڵێت:

وەسیەتم کرد بۆ فڵانکەس بە فڵانە شت، یا: ئەوەندەی لە ماڵم بدەنێ لەپاش مردنم، یا: ئەو شتەم داناوە بۆ فڵانکەس، یا: بڕیارمداوە بۆی، یا: ئەو شتەی بدەنێ لەپاش مردنم؛ ئەگەر وتی: ئەو شتە ماڵی فڵانکەسە، ئەوە بە پێ‌لێنان دائەنرێ. هەروەها، لە سیغەی وەسیەتە ئەوە کە بڵێ: ئەو شتەم بەخشی بە فڵانکەس لەپاش مردنم، یا: کردم بە موڵکی لەپاش مردنم، یا: بە سەدەقە پێمدا لەپاش مردنم، یا: کە مردم، ئەو شتە بدەن بە فڵانکەس، یا: کە مردم، ئەو شتە بۆ ئەو مزگەوتە بێ، یا بۆ فڵانکەس بێ.

ئیشارەتکردنیش بە وەسیەتی سەریح و بێ‌پێچو پەنا دائەنرێ ئەگەر هەمووکەس لێی تێبگا، ئەگینا کینایەیە؛ نووسینیش کینایەیەو لەگەڵ نیەتدا ئیعتیباری پێ‌ئەکرێ، بەڵام ئەبێ بە دەم پێ‌لێ‌بنێ کە ئەو نیەتەی بووە، یاخود میراتبەرەکەی لەپاش مردنی خۆی پێ‌لێ‌بنێ کە مەبەست لەو نووسینە نیازی وەسیەتکردن بووە؛ جا ئەگەر وەسیەتی بۆ کۆمەڵێکی لەژمارە نەهاتوو کردبوو، وەك فەقیر و هەژار، ئەوە بە بێ‌قەبووڵی کەس، هەر بە مردنی کابرای وەسیەتکەر واجب ئەبێ‌و قەبووڵی ناوێ، هەروەها ئەگەر بۆ جیهەتێکی گشتی وەسیەتی کردبێ، وەك گرتنی سنووری وڵاتی موسوڵمانان وە ئەگەر وەسیەتی بۆ کەسێکی تایبەتی کردبێ، یا بۆ کۆمەڵێکی لەژمارە هاتوو وەك ئەهلی ماڵێك، ئەوە واجبە خۆیان قەبووڵی بکەن، بەو شەرتە کە تەسەڕوفیان دروست بێ وە ئەگەر حیجریان لەسەر دانرابوو، ئەبێ سەرپەرشتیکەری کاروبار (ولی أمر)یان قەبووڵی بکا بۆیان.

ئەگەر باوکی مناڵ بە عەناد قەبووڵی وەسیەتەکەی نەکرد، حەقی سەرپەرشتیکردنی کاروباری مناڵەکەی نامێنێ؛ جا ئەگەر ئەو مناڵە باپیری هەبوو، ئەو ئەبێ بە سەرپەرشتیکەری کاروباری، ئەگینا قازی وڵات ئەبێ بە سەرپەرشتیکەری وە ئەگەر لەبەر عوزرێکی شەرعی قەبووڵی نەکرد؛ مەسەلا، وتی: ئەو ماڵە وەسیەت پێ‌کراوە بە ماڵی کابرای وەسیەتکەر نازانم، بۆیە قەبووڵی ناکەم، ئەوە پێویستە قازی لەجیاتی ئەو قەبووڵی بکا وە ئەگەر وەسیەتەکە بۆ مزگەوت بوو، ئەبێ سەرپەرشتیکەری کاروباری مزگەوتەکە قەبووڵی بکا.

قەبووڵ کردن یا دانەدواوەی وەسیەت هیچ قیمەتێکی نییە تا کابرای وەسیەتکەر مابێ لەدنیادا، هەروەها لەکاتی گیان دەرچوونیا، بەڵکوو پێویستە لەسەر وەسیەت بۆکراوەکە لەپاش مردنی وەری بگرێ یا بیداتەدواوە؛ بەڵێ، وەرگرتن لەپاش دانەدواوە هیچ سوودێکی نییە، وەك چۆن دانەدواوەی پاش قەبووڵ کردن بێ کەڵکە، ئیتر خواه ماڵەکەی وەرگرتبێ یا نە.

دانەدواوەی سەریح وەك ئەوەیە کابرای وەسیەت بۆکراو بڵێت: من ئیحتیاجم بەو ماڵە نییە، یا: پێویستم پێ نییە، یا: بۆ من ناشێ، یا: لایقی من نییە وە شەرت نییە لەپاش مردنی کابرای وەسیەتکەر دەس بەجێ قەبووڵی بکا، مەگەر لەحاڵێکاکە لەباتی کەسی حیجر لەسەر دانراوی خۆی وەری بگرێ.

ئەگەر کابرای وەسیەت بۆکراو بەرلە کابرای وەسیەتکەر مرد، وەسیەتەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر لەپاش مردنی ئەو مرد، میراتبەرەکەی دائەنیشێ لەجێگەیدا بۆ وەرگرتن یا دانەدواوەی ماڵە وەسیەت پێ کراوەکە؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە موڵکی وەسیەت پێ کراو رائەگیرێ تا کابرای وەسیەت بۆکراو رای خۆی دەرئەبڕێ، ئەوکاتە دەرئەکەوێ ئاخۆ بووە بە موڵکی ئەو یا هەر هی میراتبەرەکانی کابرای وەسیەتکەرە و کە وەری گرت، وادائەنرێ کە لەکاتی مردنی کابرای وەسیەتکەرەوە هی ئەم بووە، بەخۆی و هەموو بەرو قازانجێکیەوە کە لەکاتی مردنی وەسیەتکەرەکەوە پەیدا بوون، مەسرەفیشی لەکاتی مردنی کابراوە ئەکەوێتە سەر ئەم وەسیەت بۆکراوە.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە باخێك بۆ کەسێك، ئەوە هەر میوەیەکی پێوە بووبێ لەکاتی مردنی کابرای وەسیەتکەردا، هی میراتبەرەکانە، خواه ئەو میوەیە لەکاتی مردنی کابرادا پاش دەرکەوت بێ، یا نە و هەر میوەیەك کە پاش مردنی کابرای وەسیەتکەر پەیدا ببێ، بۆ وەسیەت بۆکراوەکەیە وە ئەگەر میوەی ئەم دوو بەشە تێکەڵ بوون و جیا نەئەکرانەوە، پێویستە میراتبەرو وەسیەت بۆکراو لە بەینی خۆیانا سوڵح بکەن.

**بزانن!** سیغەی وەسیەت بۆ ئەوە ئەشێ تەعلیق بکرێ بە وەعدەیەکەوە، یا شەرتی بۆ دابنرێ، خواه ئەو شەرتە لەکاتی ژیانی وەسیەتکەرەکەدا بێ، یا لەپاش مردنی؛

کەواتە، دروستە بڵێت: ئەگەر بەم نەخۆشییە مردم، ئەم خانووەم وەسیەت بێ بۆ فڵانکەس، یا ئەگەر فڵانکەس هات بۆ ئێرە، ئەو خانووەم وەسیەت بێ بۆی، یاخود بڵێ: باخەکەم وەسیەت بێ بۆ فڵانکەس، ئەگەر خەریکی خوێندن بوو وە لەو حاڵەداکە ئەم شەرتانە بڕیار بدا، ئەگەر شەرتەکان نەهاتنەدی، وەسیەتەکە بە بێسوود دەرئەچێ؛ هەروا، دروستە بڵێ: ئەو باخەم وەسیەت بێ بۆ فڵانکەس، ئەگەر لەپاش مردنم ڕۆژی جوزئێك قورئان لەسەر قەبرەکەم بخوێنێ، یاخود: بەو شەرتە لە بەرهەمی باخەکە ساڵێ فەرشێك بکڕێ بۆ مزگەوتی دێکەمان؛ جا ئەگەر کابرای وەسیەت بۆکراو ئەم شەرتانەی نەهێنایەدی، ئەوە دەرئەکەوێ کە وەسیەتەکە نەهاتووەتەدیو باخەکە موڵکی وەسیەت بۆکراوەکە نییەو هەر هی میراتبەرەکانە.

## باسی پەشیمان بوونەوە لە وەسیەت

هەر تەبەڕوعێك کە دەسبەجێ (مُنَجَّز)بێ، کابرا حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە لێی و هەر تەبەڕوعێك کە بەسرابێ بە شتێك یا بە وەعدەیەکەوە (مُعلَّق) ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە لە هەمووی یا لە هەندێکی و ئەو پەشیمان بوونەوەیە بە قسە دێتەجێ، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەو وەسیەتەم بەتاڵ کردەوە، یا: پەشیمان بوومەوە لێی، یا: هەڵموەشاندەوە، یا: ئەم ماڵە ماڵی میراتبەرەکانمە. وە بەکردەوە، وەکوو ئەوەکە ماڵەکە بفرۆشێ یا بیکا بە مارەیی ژن، یا بیبەخشێ یا بیخاتە ڕەهنەوە، خواه وەریبگرن یا نە، یا وەسیەت بکاکە لە پاش مردنی ئەو ماڵە جۆرە تەسەڕوفێکی وای تیا بکرێ کە لەگەڵ وەسیەتە پێشووەکەیدا نەگونجێ، یاخود وەکیل بگرێ بۆ فرۆشتنی، یا بەدەستی خۆی بیبا بۆ شوێنی فرۆشتن.

ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد بە دەغڵێکی تایبەتی بۆ کەسێك، کەچی لەپاشا تێکەڵی دەغڵێکی تری کرد، ئەوەیش بە پەشیمان بوونەوە دائەنرێ لە وەسیەتەکەی؛ هەروا، ئەگەر وەسیەتی کرد تەغارێك گەنم لە خەرمانێکی دیاری بدرێ بە کەسێك، کەچی ئەو خەرمانەی تێکەڵی خەرمانێکی باشتر کرد، ئەوەش پەشیمانبوونەوەیە؛ بەڵێ، ئەگەر تێکەڵی خەرمانێکی وەك خۆی یا خراپتری کرد، ئەوە بە پەشیمانبوونەوە دانانرێ.

ئەگەر وەسیەتی کرد بە گەنمێك، کەچی خۆی وەشاندی یا بردی بۆ ئاش و هاڕی، یا وەسیەتی کرد بە ئەندازەیەکی ئارد، کەچی شێلای و کردی بە هەویر، یا وەسیەتی کرد بە ئەندازەیەك خوری، کەچی ڕێسای، یا وەسیەتی کرد بە ریسمانێك کەچی پاشان بردیە لای جۆڵاو کردی بە شاڵ، یا وەسیەتی کرد بە پارچە قوماشێك، کەچی بڕی بە کراس یا بە کەوا، یا وەسیەتی کرد بە پارچە زەوییەك کەچی بینای تیا کردەوە، یا درەختی تیا ناشت و کردی بە باخ، ئەوە هەموو ئەم تەسەڕوفانە بە پەشیمانبوونەوە دائەنرێن لە وەسیەتەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر بیناکەی لە سووچێکی زەوییەکەدا کردەوە، یا درەختەکەی لە لایەکیەوە ناشت، ئەوە وادائەنرێ کە تەنها لەو سووچە پەشیمان بووەتەوە، بەڵام ئەگەر وەسیەتی کرد بە گۆشتێکی کاڵ و لەپاشا برژاندی، ئەوە بە پەشیمانبوونەوە دانانرێ؛ هەروەها، ئەگەر تووی داکرد لە زەوییەکەدا، ئەوەش نابێ بە پەشیمانبوونەوە لە وەسیەت بەو زەوییە.

ئەم تەفسیلاتە لەسەر ئەساسی ئەوە بوو کە ئەو ماڵە وەسیەت پێ کراوە دیاری بێ؛ ئەگینا ئەگەر سێ یەکی ماڵی وەسیەت کرد بۆ ئەوانەی دێنە ماڵی، لەپاشا هەرچی هەبوو فرۆشتی، ئەوە نابێ بە پەشیمانی لە وەسیەتەکە، لەبەر ئەوە کە ئیعتیبار بە سێ یەکی ماڵیەتی لە کاتی مردنیا و قابیلە لەوەپاشیش ماڵ بنێ بە یەکەوە.

بزانن! زانایانی شەرع هەموو هاودەنگن لەوەدا کە سەدەقەکردن بە نیازی ئەوە کە خێرو حەسەناتەکەی بڕوا بۆ مردوویەك، قازانج ئەگەیەنێ بەو مردووە، هەروەها وەقفکردنی قورئان و کتێبی شەرع و حەدیس و خوێندنی ئایینی کەوا هەرکەس تیایاندا بخوێنێ خێرەکەی بۆ ئەو مردووە بێ، یاخود هەڵکەندنی بیرو کاریز لێدان و دارناشتن، چ بۆ میوە و چ بۆ سێبەرو چ بۆ ئەوە کە پاش پێ گەیشتنی ببڕدرێ و لە بینایەکی خێریدا بەکار بهێنرێ، یاخود جومعانە و هەر خێرێکی تر؛ هەروەها، زانایانی شەرع هاودەنگن لەوەدا کە دوعاکردن بۆ داوای ئەوە کە خوا خۆش ببێ لە کەسێك، سوودی هەیە بۆ ئەو کەسە، لەگەڵ ئەوەدا کە دوعاکەرەکە خۆیشی خێری ئەگا و بۆ خۆیشی ئەنووسرێ بە مایەی سەواب و حەسەنات؛ مەبەستیش لەو ئایەتە کە خوا ئەفەرموێت: ﴿وَ أَنْ لَيْسَ لِلإِنْسانِ إِلاَّ ما سَعىٰ﴾، واتە: «ئینسان لە پاداشی ئەو چاکەیە زیاتری نییە

کە خۆی کردوویەتی»، ئەوەیە موستەحەقی جەزا و پاداش نییە، مەگەر لەسەر کارێك کە خۆی کردبێتی و ئەمەی کە وتمان، لەسەر ئەساسی ئەوە نییە کە موستەحەقی ئەو پاداشەیە، بەڵکوو لەسەر ئەو ئەساسەیە کە خوا بە لوتفی خۆی ئەیداتێ، هەرچەند هەرچی جەزای خێرە هەر لوتفی خوا خۆیەتی، بەڵام هەندێکی بە بێ عەلاقەی هەوڵدانی ئینسان خۆیەوەیەتی و هەندێکی لەسەر عەلاقەی تێکۆشانی ئینسانە و لە هەردوو حاڵدا هەر بە لوتفی خوا خۆیەتی.

خێر و حەسەناتی نەبڕاوەی ئینسان خۆیشی، وەك بیرێك کە وەقفی کردبێ، یا جەزای دەرسێکی خێر کە بە یەکێکی وتبێ، یا دوعای منالی باش، ئەمانە لەسەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، هەر بە کردەوەی خۆی ئەژمێررێن.

هەروەها، قازانجی هەیە بۆ مردوو دانەوەی قەرزێك کە لەسەری بێ و دانی ئەو ئەندازە زەکاتە کە وەختی خۆی نەیداوە و بەجێ‌هێنانی قەرز لەجیاتی ئەو و گێڕانەوەی ڕۆژووی فەرز کە بەسەریەوە بێ؛ بەڵام لە گێڕانەوەی نوێژی فەرزدا ئیختیلاف هەیە لەناو زانایانی شەرعدا و هەندێکیان ئەڵێن: قازانجی هەیە، یەکێك لەمانە، ئیمامی «سُبْکی»یە کە فتوای بەمە داوەو تەنها خۆی لەجیاتی هەندێ لە کەس و کاری نوێژی فەرزی گێڕاوەتەوە؛ تەقلیدکردنی ئەم زاتە بۆ ئێمە دروستە و هەرکەس ئەتوانێ بۆ خۆی عەمەلی پێ بکا؛ هەروەها، بۆی هەیە لە ماڵی خۆی کەفارەتی بۆ بدا لە کەفارەتی «مُرتَّبة» و «مُخیَّرة»دا[1].

هەروەها، قازانجی هەیە ئینسان لە سەوابی کردەوەی خۆیا، وەك تاعەت و خێر و حەسەنات و سەڵەوات‌دان و دەرس‌وتنەوەو قوربانی‌کردن، خەڵك بکا بە شەریکی خێری خۆی و بە تایبەتی بۆ حەزرەتی پێغەمبەرﷺ، هەرچەند ئەگەر ئینسان نیازی شەریك‌کردنی ئەویشی نەبێ، ئەو لە خۆیەوە هاوبەشی خێری هەموو موسوڵمانێکە، چونکە هەموو موسوڵمانێ بەهۆی شەریعەتی ئەوەوە کەوتووەتە سەر ڕێگای ئیسلامەتی.

١. کەفارەتی «مُرتَّبة»، ئەوەتە چەند شتێك دانرابێ بۆ کەفارەت و تا یەکەمیان مومکین بێ، دروست نەبێ دووهەمیان بکا وە هەر بەم تەرتیبە؛ کەفارەتی «مُخیَّرة»یش، ئەوەیە کابرا بە ئارەزووی خۆی بێ یەکەم یا دووهەم یا سێهەمیان هەڵبژێرێ و بیکا؛ لە شوێنی خۆیدا میسالی ئەم کەفارەتانە ئەهێنینەوە.

هەروەها، قازانجی هەیە قورئانخوێندن لای ئینسانی زیندوودا کە گوێی بداتێ و گوێی لێوەبێ، بەتایبەتی ئەگەر قورئانخوێنەکە ئینسانێکی لەخواترس و پیاوچاك بێ، نەخوازەڵا ئەو کوێرانەی کە قورئانیان لەبەر کردووە وە ئەگەر لەسەر قورئان خوێندنەکەیان پارەیان وەرئەگرت یا بەکرێ گیرابوون لەلایەن گوێگرەکەوە، ئەوە بۆی ئەبێ بە دوو خێر؛ هەروەها، قورئانخوێندن قازانجی هەیە بۆ مردوو، چ لەسەر قەبرەکەی بێ و چ لە دوورەوە بێ، بەو شەرتە لە سەرەتای قورئان خوێندنەکەوە بەنیازی سەوابی ئەو مردووە بێ و لەپاش تەواوبوونیشی دوعای بۆ بکرێ و وێنەی حەسەناتەکەی بۆ رەوانە بکرێ؛ دیسان، خێری هەیە و دروستە وەسیەتکردن بە خەتمی تەهلیلە لەسەر قەبری مردوو، یا لەشوێنێکی ترا، بەو دوو شەرتە کە بەیانمان کردن. بە «سیلەی رەحم» دائەنرێ لەگەڵ خزمان و بە چاکە لەگەڵ باوك و دایك کە پاش مردنیان تا لەتوانادا هەبێ سەعی و کۆشش لەم خێر و حەسەناتانەدا بکرێ بۆیان؛ ﴿وَ اللّٰهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَ اللّٰهُ ذُوالْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾.

## باسی «وصاية» یەعنی «وَصي» گرتن

سوننەتە بۆ ئینسانێك کە ئازاد بێ و تەکلیفی لەسەر بێ، وەسییەك بگرێ بۆ دانەوەی قەرزێکی کە لەسەریەتی، چ حەقی خوا بێ، وەك زەکات و چ حەقی ئادەمیزاد بێ، وەك دەسقەرز و بۆ دانەوەی هەرچی کە بە ناحەق لەژێر دەستیا بێ، وەك ماڵی زەوتکراو و بۆ دانەوەی ماڵی خواستەمەنی و بە ئەمانەت دانراو؛ بەڵێ، ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو کە میراتبەرەکانی ئەو ماڵە نەدەنەوە بە خاوەنی، واجبە لەسەر خۆی تا وا لەدنیادا بیداتەوە، یاخود وەسی بگرێ و شتەکە ئاشکرا بکا لە خەڵك بۆ ئەوە لەپاشانا حەقی هیچ خاوەن حەقێك نەفەوتێ وە ئەگەر بە وەسییەکەی وت: ئەو ماڵەم بدە بە موستەحەق، چۆن خۆت ئارەزوو ئەکەی، دروست نییە سەرفی بکا بۆ خۆی، هەرچەند موستەحەقیش بێ و دروستیش نییە بیدا بە کەسێك کە نەفەقەی واجب بێ لەسەر ئەم وەسییە.

شەرتی وەسی، ئەوەیە موسوڵمان و باڵغ و عاقڵ و بەداد بێ و بتوانێ ئەو ئیشانە

جێبەجێ بکا کە پێی سپێرراون؛ ئیتر شەرت نییە نێرینە بێ، بەڵکوو دایکی منداڵ ئەگەر خاوەنی ئەو سیفەتانە بوو، لە هەرکەسی تر باشترە.

دروست نییە بۆ وەسی خۆی ئیشەکان نەکاو بیداتە دەستی کەسێکی تر، مەگەر کابرای وەسیەتکەر خۆی رێگای دابێ، یاخود ئەو جۆرە ئیشە بۆ ئەو لایق نەبێ، یاخود ئیشەکان زۆر بن و بەتەنها خۆی جێبەجێ نەکرێن بۆی و تا باوکی مابێ، نابێ کەسێ تر بکا بە وەسی لەسەر منداڵەکانی، بەو شەرتە کە شەرتەکانی ویسایەتی تیابێ؛ هەروەها، دروست نییە وەسی بگرێ بۆ ژن مارەبڕین لە کوڕی بچووکی، هەروەکوو دروست نییە وەسی بگرێ بۆ مارەکردنی کچی نابالغی.

سیغەی ویسایەت، لەفزێکە سپاردنی ئەم جۆرە تەسەڕوفانە بگەیەنێ کە بەیانمان کردن بە کەسێکی تر کە ئەو سیفەتانەی تیا بێ کە ناومان هێنان، وەك ئەوەکە بڵێ: وا تۆم کرد بە وەسی لەسەر منداڵەکانم، یا لەسەر دانەوەی قەرزم، یا لەسەر دانەوەی ئەو ماڵی خواستەمەنی یا ئەمانەتانەی کە دانراون لاموو ... بەم جۆرە؛ بە شەرتیش گیراوە بەیانی ئەو شتانە بکا کە وەسییان بۆ ئەگرێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی وا تۆم کرد بە وەسی، وە باسی نەکرد لەسەرچی کردوویە بە وەسی، ئەوە بەتاڵە؛ هەروەها، شەرتە وەسییەکەیش قەبووڵی بکا تا کابرای وەسیەتکەر لە دنیادایە و لەوەپاش، قەبووڵ کردن و دانەدواوە کەڵکی هیچی نییە.

ئەگەر کەسێك دوو کەسی کرد بە وەسی، ئەوە دروستە و ئەبێ هەردووکیان پێکەوە رێبکەون لەسەر ئەوە کە بە یەکەیەکە یا بەیەکەوە ئیشەکە بکەن و هەر ئیشێك کە یەکێکیان سەربەخۆ بیکا، بەتاڵە. دروستە بۆ وەسیەتکەر وەسییەکە عەزل بکا، هەروەها دروستە وەسییەکەیش خۆی عەزل بکا؛ بەڵێ، ئەگەر ترسی فەوتانی ماڵ و منداڵەکانی بوو کە کراوە بە وەسی لەسەریان، دروست نییە خۆی عەزل بکا وە ئەگەر خۆی عەزلکرد، قیمەتی نییەو عەزل نابێ، ئەوەندە هەیە لەمکاتەوە ئەتوانێ کرێ بۆ خۆی وەربگرێ لەسەر ئەو ماڵە.

وە ئەگەر وەسییەکە فاسقی بەسەرا هات، عەزل ئەبێ، وەك چۆن ئەگەر قازی فاسقی بەسەرا هات، ئەویش عەزل ئەبێ؛ بەڵام خەلیفەی موسوڵمانان بەوە عەزل نابێ کە

فاسقی بەسەرا بێت؛ هەروەها باوك و باپیریش بەهۆی فاسق بوونەوە عەزل ئەبن، بەڵام لەپاش تەوبەکردن، حەقی سەرپەرشتیکردنەکەیان بۆ ئەگەڕێتەوە.

دروستە ویسایەت بیەسرێ بە مەرجێکەوە یا بە وەختێکەوە؛ مەسەلا، بڵێ: ئەگەر لەم نەخۆشییەدا مردم، ئەوە تۆ وەسی بە لەسەر منالەکانم تا برا گەورەکەیان لە فلان شوێن دێتەوە.

وە ئەگەر منالی وەسی بۆ دانراو پاش باڵغبوونی کەوتە هەراکردن لەگەڵ وەسییەکە لە ئەسڵی مەسرفکردنا و وتی: حاشا! تۆ هیچت سەرف نەکردووە لەمندا، یاخود بوو بە هەرایان لە ئەندازەی ئەو ماڵەدا کە بۆی سەرف کراوە، ئەم وتی: ئەوەندەیەو ئەو وتی: ئەوەندەیە، ئەوە لەم حاڵانەدا باوەڕ بە سوێندی وەسییەکە ئەکرێ، چونکە کاتێك کە کراوە بە وەسی، ئەمین و بەداد بووە و ئەسڵیش وایە ئەو سیفەتانەی تیا نەفەوتاوە و زەحمەتیشە بتوانێ ئیسپاتی ئەو مەسرەفانە بکا بە شاهید کەوا کردوونی بۆ منالەکە؛ کەواتە، ئەگەر قەناعەت نەکرێ بە سوێندی وەسی، کەس رازی نابێ ببێ بە وەسی لە هیچ مەسەلەیەکدا چونکە لەپاشانا لەوانەیە تووشی هەزار گێرەو کێشە ببێ، ئەوەش ئەبێ بەهۆی بەرەڵڵابوونی ماڵ و منالی موسوڵمانان.

وە ئەگەر وەسی و وەسی لەسەر دانراوەکە بوو بە هەرایان لە دانەوەی ئەو ماڵەدا کە دراوەتە دەستی وەسییەکە؛ مەسەلا، منالەکە لەپاش باڵغبوونی، وتی: ئەو ماڵەی باوکم دابوویە دەستت نەتداوەتەوە پێم، ئەویش وتی داومەتەوە پێت، ئەوە ئەگەر وەسییەکە شاهیدی هەبوو، باشە، ئەگینا باوەڕ بە سوێندی کوڕەکە ئەکرێ؛ جا ئەگەر سوێندی نەخوارد، وەسییەکە سوێند ئەخوا لەسەر دانەوەی ماڵەکە و رزگار ئەبێ.

هەروەها، باوەڕ بە سوێندی وەسی ئەکرێ لە مەسەلەی خەیانەتکردنا لەو ماڵەدا و لە ئیددیعای فەوتانیا بەهۆی دزی یا زەوتکردنەوە، نەك لەوەدا کە بڵێ: لەبەر موحتاجی منالەکە یا لەبەر مەسڵەحەتی ماڵەکە فرۆشتوومە، لەم حاڵەتانەدا، ئەبێ بە شاهید ئیسپاتی ئیددیعاکەی خۆی بکا؛ بەڵێ، باوك و باپیرە باوەڕ بە سوێندیان ئەکرێ لەم حاڵانەدا، ئەگەر منالەکە لەپاش باڵغبوونی کەوتە هەرا لەگەڵیان لەم بارەیەوە.

## باسی دابەش‌کردنی میرات (الفَرائِض) لەبەینی میرات بەرەکانا

«میرات»، بریتییە لەوەی کە مردوو لەپاش خۆی بەجێی ئەهێڵێ، خواه «حُقوق»بێ، وەك حەقی هەڵبژاردن (خِیار) لە موعامەلەدا، یا حەقی حەددی بوختان پێوەکردن (حَدُّ القَذف)، یا «اختصاصات»بێ، وەك زبڵ و شەرابێك کە لەوانە بێ ببێتەوە بە سرکە و وەك سەگی پاس و سەگی راو، یاخود ماڵ بێ، وەك ئەو شەرابە کە لەپاش مردنی کابرا بووبێتەوە بە سرکە و وەك خوێنێك کە وەرئەگیرێ لەو کەسەی کە کوشتوویەتی، یەعنی ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، ئەوە هەرچەند لەپاش مردنی ئەو کابرا کوژراوە «دِیَة» (خوێنە)کەی ئەدرێ، بەڵام لە حوکمی ئەوەدایە کە لەپێش مردنەکەیدا وەری‌گرتبێ و بووە بە موڵکی و لەپاش مردنەکەی بووە بە میرات.

جا، میرات هەر جۆرێ بێ، لەپاش مردنی کابرا، قابیلە پێنج حەق پەیوەند (تعلّق)ی پێوە پەیدا بکا؛ تەرتیبی جێبەجێ کردنی ئەم حەقانە بەم جۆرەیە:

(یەکەم)، ئەو حەقانە کە بەسراون بە عەینی میراتەکەوە بە بێ‌واسیتەی حیجردانان لەلایەن قازییەوە؛

(دووەم)، حەقی بەرێ‌خستنی مردووەکە خۆی‌و ئەو مردوانەی کە نەفەقەیان لەسەر ئەو بووەو لەپێش گیان‌دەرچوونی ئەم‌دا گیانیان دەرچووە؛

(سێهەم)، ئەو قەرزانەی کە بەسەر ئەو شەخسەوەن کە مردووە، خواه قەرزی خوایی بن یا قەرزی ئادەمیزاد؛

(چوارەم)، وەسیەتی کابرای مردوو خۆیەتی؛

(پێنجەم) حەقی میراتگرەکان لە وەرگرتنی میراتدا.

هەرکەس کە مردو میراتێکی لەپاش بەجێ‌ما، ئەوە بەر لە هەرچی دەس‌ئەکرێ بە جێبەجێ کردنی ئەو حەقانە کە بەسراون بە میراتەکەیەوە، بە بێ‌واسیتەی حیجری قازی؛ ئەم حەقانە زۆرن، بەڵام بۆ نموونە، باسی هەندێکیان ئەکەین.

یەکەم، حەقی سوکنای ئەو ژنەی کە عیددەی وەفاتی لەسەرە؛ ئەوە کرێی جێگای

دانیشتنی ئەخرێتە پێش بەڕێ‌کردنی مردووەکە خۆی و ئەو کەسانەی کە نـەفەقەیان لەسەریەتی و بەر لەو مردوون.

دووەم، حەقی خاوەن‌قەرز لە ماڵی قەرزکراودا، یەعنی کەسێك ماڵێك قەرز بکـاو پاشان بمرێ‌و تەنها ئەو ماڵە قەرزکراوەی لێ بەجێ بمێنێ، ئەوە ئەو ماڵە ئەدرێتەوە بە خاوەن ماڵەکە و سەرف ناکرێ لە بەڕێ‌کردنی مردووەکەدا.

سێهەم، حەقی عامیلی قازانج بەشەراکەت؛ مەسەلا، ئەگەر خاوەن ماڵێك پارەی‌دا بە کەسێك کاسبی پێوە بکا بە قازانج بەشەراکـەت و پـاشان، هـەموو سـەرمایەکـە و قازانجەکەی وەرگرت و مرد و تەنها ئەوەی بە میرات لێ‌بەجێ‌ما، ئەوە پێویستە لەپێشا بەشە قازانجی عامیلەکەی لێ بدرێ، ئەوسا لێی خەرج ئەکرێ بۆ بەڕێ‌کردنی خاوەن ماڵە مردووەکە.

چوارەم، حەقی کڕیارە لەو قیمەتەدا کە داویەتی بە فرۆشـیار؛ مـەسەلا، کـەسێك ماڵێکی کڕی و پارەکەی دا بە فرۆشیارەکە و ئەو ماڵە بە عەیب‌دار دەرچوو، کـابرای کڕیار بردیەوە بۆ سەر فرۆشیارەکەو فرۆشیارەکە مردبوو و تەنها ئەو پارەیەی لەپاش بەجێ‌مابوو کە کڕیارەکە تەسلیمی کردووە، ئەوە ئەو پارەیە ئەدرێ بە کڕیـارەکـە و سەرف ناکرێ بو بەڕێ‌کردنی کابرای مردوو.

پێنجەم، حەقی مێردە لە عەینی مارەیی ژنەکەیدا؛ مەسەلا، کابرایەك عەینێك بدا لە مارەیی ژنێکا و لەپێش ئەوەدا کە بیگوێزێتەوە، تەلاقی بدا، ئەوجا ژنەکە بمرێ و هەر تەنها ئەو عەینی مارەییەی لێ بەجێ بمێنی، ئەوە واجبە لەپێشا نـیوەی ئـەو عـەینە بدرێتەوە بە کابرای کۆنە مێرد، ئەوسا لە نیوەکەیتری ژنەکە بەڕێ بکرێ.

شەشەم، حەقی زەوت‌کەر لە عەینی ماڵی زەوت‌کراودا؛ مەسەلا، کەسێك عەینێکی زەوت کرد لە کەسێك، پاشان کـابرای مـاڵ زەوت‌کـراو دەسـتی گـەیشتەوە بـە مـاڵە زەوت‌کراوەکەی و قیمەتەکەی لە کابرای زەوت‌کەر وەرگرت تا ئەو ئەسڵی ماڵەکەی ئەداتەوە و بەرلەوە کە کابرای زەوت‌کەر ماڵە زەوت‌کراوەکەی بـداتـەوە، ئـەو مـردو قیمەتەکەیشی خواردبوو، ئەوە ئەبێ لە ماڵە زەوت‌کراوەکە پـێشـان پـارەی کـابرای

زەوتکەر بدرێتەوە، ئەوسا ئەگەر شتێکی لێمایەوە، بدرێ بە میراتبەرانی کابرای ماڵ زەوتکراو بۆ بەرێکردنی.

حەوتەم، حەقی شەریکە موڵکە لەو بەشە موڵکەدا کە بە شوفعە وەریگرتووە؛ یەعنی ئەگەر ئەو کابرا کە ماڵەکەی بە شوفعە لێ وەرگیراوە بمرێ و تەنها ئەو بەشە ماڵەی لەلا مابێ کە بە شوفعە وەرگیراوە، ئەوە ئەبێ بدرێ بە کابرای خاوەنی حەقی شوفعە و سەرف نەکرێ لە بەرێکردنی مردووەکەدا و نەدرێ بە هیچ خاوەن قەرزێکی تریش، بەو شەرتە ئەم کابرای خاوەن حەقی شوفعەیە پارەی ئەو بەشەی دابێ بە شەریکەکەی یا بە میراتبەرەکانی.

هەشتەم حەقی ئەو کەسەیە کە ماڵێکی لێ نەزر کراوە لە عەینی ماڵە نەزر کراوەکەدا؛ یەعنی ئەگەر کەسێك ماڵێکی نەزرکرد لە کەسێك، جا کابرای نەزرکەر مرد، ئەوە پێویستە ئەو ماڵە نەزرکراوە بدرێ بەو کەسە کە لێی نەزر کراوە و سەرف نەکرێ لە بەرێکردنی مردووەکەدا.

نۆهەم، حەقی خاوەنماڵە لە ماڵی دوزراوەدا؛ یەعنی کەسێك ماڵێکی دوزییەوە و لەپاش ساڵێك کردی بە موڵکی خۆی، ئەوجا خاوەن ماڵەکە پەیدا بوو، ئەوە مادام ئەو ماڵە ماوەتەوە، ئەم کابرا پێش ئەخرێ بۆ وەرگرتنەوەی ماڵەکەی و ماڵەکە سەرف ناکرێ لە «تَجهیز» (بەرێخستنی) مردووەکەدا کە ماڵەکەی دۆزیبووەوە.

دەهەم، حەقی فرۆشیارە لەو ماڵەیدا کە فرۆشتوویەتی؛ یەعنی کاتێك کە فرۆشیار و کریار بوو بە هەرایان لە قیمەتی ماڵەکەدا و هەردووکیان سوێندیان خوارد و کریار لەپێش هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکەدا مرد، ئەوە فرۆشیار موعامەلەکە هەڵئەوەشێنێتەوەو عەینی ماڵەکەی خۆی وەرئەگرێتەوەو ئەو ماڵە خەرج ناکرێ لە بەرێکردنی کریارەکەدا کە مردووە.

یازدەهەم، حەقی بژاردنەوەی ناتەواوییەکە لە ماڵی فرۆشراوا پەیدا بووبێ؛ یەعنی کەسێك ماڵێکی کڕی و پارەکەی داو پاش ئەوە، دەرکەوت ماڵەکە عەیبدارەو ماڵەکەی لەگەڵ ئەو عەیبەشدا پەسەند کردو گەڕایەوە بۆ سەر فرۆشیارەکە بۆ داوای تۆڵەی ئەو

عەیبە و فرۆشیارەکە مردبوو، ئەوە هەتا تۆڵەی ئەم عەیبە نەدرێ بە کڕیارەکە، دروست نییە فرۆشیارەکە لە پارەی فرۆشتنی ماڵە عەیبدارەکە بەڕێ بخرێ.

دوانزەهەم، حەقی سەلەمدادەرە لەو پارەیەداکە تەسلیمی کردووە؛ یەعنی کەسێك ئەندازەیەك پارەی دابوو بە کەسێکی تر بە عەقدی سەلەم و هێشتا بەهۆی شتێکەوە پارەکە مابوو و خەرج نەکرابوو، وە سەلەمەکە فەسخ کرایەوە و کابرایش مرد، ئەوە حەقی کابرای ماڵ بەسەلەمدەر (مُسلِم) لەو پارەداکە تەسلیمی کردووە، پێش ئەکەوێ لەسەر حەقی بەڕێ خستنی کابرای ماڵ بەسەلەم پێدراو (مُسلَم اِلیه).

سیانزەهەم، حەقی زەکاتە؛ یەعنی کەسێك بمرێ و ماڵێکی لەپاش بەجێ بمێنێ کە زەکاتی تیابێ، ئەوە تا زەکاتەکەی لێ دەرنەکرێ، ئەو ماڵە سەرف ناکرێ لە بەڕێخستنی مردووەکەدا.

چواردەهەم، حەقی ماڵ بە رەهن وەرگرە لە ماڵی خراوە رەهندا؛ مەسەلا، کەسێك ماڵێك بخاتە رەهنی قەرزێکەوە لەلای کەسێك، وە کابرای ماڵ لە رەهندانەر بمرێو تەنها ئەو ماڵە رەهنکراوەی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوە دانەوەی حەقی ماڵ بەڕەهن وەرگرەکە ئەخرێتە پێش بەڕێخستنی ماڵ رەهنکەرەکەوە.

بەڵام هەر حەقێك کە بەسرابێ بە عەینی میراتەکەوە بەهۆی ئەوەوە کە قازی حیجری لەسەر ئەو ماڵە دانابێ لەبەر مەسڵەحەتی بژاردنەوەی قەرزی خاوەن قەرز، ئەوە ئەکەوێتە پاش بەڕێ کردنی مردووەکەوە؛ ئەوەندە هەیە پێویستە بزانین کە دانەوەی ئەو حەقانەی کە بەسراون بە عەینی میراتەکەوە، بەو شەرتە ئەخرێتە پێش بەڕێ کردنی مردووەکەوەکە ترسی گۆڕانی مردووەکەو بۆگەنکردنیمان نەبێ، ئەگینا پێویستە لەپێشا لاشەی مردووەکە بەڕێ بکرێو بشاررێتەوە، ئەوجا حەقەکان بدرێنەوە.

جا ئەگەر ئەمجۆرە حەقانە نەبوون، یا بوون و جێبەجێ کران، ئەمجار نۆبەی دانەوەو جێبەجێ کردنی حەقی دووهەمە کە بریتییە لە بەڕێخستن و شاردنەوەی مردووەکەو هەر مردوویەکی تریش کە لەپێش ئەوا یا لەگەڵ ئەوا مردبێ و نەفەقەی لەسەر ئەوبێ، وەك کرێی هەڵگرتنی مردووەکە بۆ جێگای شۆردن و کفنکردنو

دەرمانی بۆن‌خۆشی پێوەکردنی و بردنی بۆ گۆڕستان و حەقی گۆڕ بۆ هەڵکەندن و هەر مەسرەفێکی‌تر کە پێوەندی بە شاردنەوەیەوە بێ و ئەبێ ئەم حەقە بە جۆرێکی‌وا جێ‌بەجێ بکرێ کە لایقی شانی مردووەکە بێ، لەبارەی دەوڵەمەندی و فەقیری و پایەی کۆمەڵایەتییەوە، هەرچەند خۆیشی لە حاڵی ژیانیا بەوجۆرە نەژیابێ.

جاکە ئەم حەقە جێ‌بەجێ کرا، ئەمجارە نۆبەی حەقی سێهەمە کە بریتییە لە دانەوەی ئەو قەرزانەی وان بەسەر مردووەکەوە، بەڵام ئەوەی قەرزی خودا بێ، وەك زەکاتێك کە قەرز بێ لە ئەستۆی کابرای مردوودا بەهۆی فەوتانی ماڵەکەیەوە و حەقی زەکاتی سەر (زَكاةُالفِطْر) و کەفارەتی پیاوکوشتن و کەفارەتی نیسبەت‌دانی ژن لە پشتی خۆی (ظِهار) و کەفارەتی چوونە لای ژن لە رۆژی رەمەزانا و کەفارەتی سوێندی درۆ و تۆڵەی نەچیرێك کە لە حەرەمی مەککەدا راوی کردبێ و بەدەڵی حەجی فەرز، ئەمانە هەموو پێش‌ئەخرێن لەسەر قەرزی خەڵك کە بەسەریەوە بێ و میرات‌بەر یا وەسی، ئارەزووی خۆیەتی لە پێش‌خستنی هەرکام لەم قەرزە خواییانەدا لەسەر ئەوی‌تریان.

پاش ئەم قەرزانەش، دەس‌ئەکرێ بە دانەوەی قەرزی خەڵك کە بەسەریەوەیەتی و ئەو قەرزی ئادەمییە، کەم بێ یا زۆر بێ، بەسراوە بە میراتەکەوە، وەك پەیوەندی ئەو کەسەی کە رەهنی وەرگرتووە بەو ماڵەوە کە بەڕەهن دانراوە لەلای، یەعنی تا ئاخر بەشی قەرزەکە نەدرێتەوە، ئەو میراتە بەرەڵڵا ناکرێ و بە قەتعی، دروست نییە میرات‌بەر تەسەڕوفی تیا بکا بە فرۆشتن یا بەخشین یا هەر تەسەڕوفێکی‌تر، هەرچەند خاوەن قەرزەکەیش رێگای ئەو تەسەڕوفەی بدات، چونکە مادام خاوەن‌قەرز ئەوەندە پیاوە، دەبا بفەرموێت مردووەکە ئازاد بکا لەو قەرزەی کە لەسەریەتی! وە مادام ئازادی ناکا، واجبە لەبەر مەسڵەحەتی رزگاربوونی مردووەکە لە حەقی خەڵك ئەو قەرزانەی لەسەرینی، بدرێنەوە.

خیلاف نییە لەبەینی زانایانی شەرعداکەوا میرات‌بەر ئەتوانێ لە ماڵی خۆی قەرزی مردووەکە بداتەوەو ماڵەکە لە جیاتی قەرزەکە هەڵبگرێ بۆ خۆی بەگوێرەی ئەندازەی قەرزەکە، وە فەرموودەی راستتر ئەوەیە پەیوەندی قەرز بە ماڵی میراتییەوە، رێگای

ئەوە ناگریٚ میراتگرەکان ببن بە خاوەنی میراتەکە؛ کەواتە، هەر زیادەیەك لەسەر عەینی میراتەکە پەیدا ببیٚ، چ ئەوانەی لکاون بە میراتەکەوە و چ ئەوانەی جیان لیٚی، هەموو ئەبن بە هی میراتبەرەکان و قەرزی کابرای مردوو نابەسریٚ بەم زیادانەوە، بەڵکوو تەنها ئەبەسریٚ بە عەینی ئەسڵی میراتەکەوە؛ مەسەلا، ئەو میراتبەرانە ئەتوانن تەسەڕوف لە موو و لە خوری و دۆو رۆن و شیر و بەچکەی حەیوانی میراتیدا بکەن، یا لە میوەی باخی میراتیدا، هەرچەند کابرایش بە قەرزاری مردبیٚ و واجب نییە قەرز لەمانەیش بدریٚتەوە، هەرچەند ئەسڵی ماڵە میراتییەکەیش کە ئەم زیادانەیان پیٚوە پەیدا بووە، بەشی قەرزەکەی نەکا.

ئەگەر هیچ قەرزیٚك لە ئەستۆی کابرای مردوودا دیار نەبوو و میراتبەرەکان تەسەڕوفیان کرد لە ماڵەکەیدا کە لە پاشی بەجیٚماوە، ئەوجا قەزریٚکی کۆن هاتەڕوو، یاخود قەرزیٚکی تازە پەیدابوو بەهۆی گیٚڕانەوەی ماڵیٚکی فرۆشراوەوە لەبەر عەیبداری، ئەوە ئەگەر میراتبەرەکان ئەو قەرزەیان دایەوە، دیارە هەر تەسەڕوفیٚکیان لە ماڵەکەدا کردووە دروست بووە، ئەگینا هەمووی بەتاڵەو ئەبیٚ لەپیٚشا قەرزەکەی بدریٚتەوە.

کە ئەم حەقی سیٚهەمەیش جیٚبەجیٚ کرا ئەمجار نۆبەی حەقی چوارەمەکە بریتییە لە جیٚبەجیٚ کردنی هەر وەسیەتیٚك کە کابرا کردبیٚتی و هەرچی کە بەسراوە بەو وەسیەتەوە، وەك تەبەڕوعی دەسبەجیٚ (مُنَجَّز) کە لە نەخۆشی مردنیا کردبیٚتی و ئەو وەسیەتانە لە سیٚ یەکی میراتەکەدا جیٚبەجیٚ ئەکریٚن بەوجۆرە کە لەپیٚشەوە باسمان کرد و پاش جیٚبەجیٚ کردنی ئەم حەقەیش، دەس ئەکریٚ بە جیٚبەجیٚ کردنی حەقی پیٚنجەم کە دابەشکردنی میراتە لەبەینی میراتبەرەکاندا.

* * *

بۆ میرات وەرگرتن، سەبەب و شەرت و مانیع هەیە؛ سەبەبی میرات وەرگرتن لەم چەرخا، بریتییە لە خزمایەتی (قَرابَة)، ژن و میٚردی (نِكاح)، موسوڵمانەتی؛ کەواتە، ئەگەر یەکیٚك مردو کەسیٚکی وای لەپاش بەجیٚ نەما کە بەهۆی یەکیٚ لەم ئەسبابانەوە میراتی لیٚ وەربگریٚ، میراتەکەی ئەخریٚتە خەزیٚنە (بیتُ‌المال)ی موسوڵمانانەوە؛

یەکێکی تر لە ئەسبابی میرات وەرگرتن، بریتییە لە «وِلاْءْ»، یەعنی ئەو حەقەی کە بەهۆی ئازادکردنی بەندەوە پەیدا ئەبێ بۆ خاوەنەکەی کە ئازادی کردووە، لەبەر ئەوە کە ئەمڕۆ ئەم هۆیە نەماوە، تەنها درێژە بە باسی سێ سەبەبەکەی پێشوو ئەدەین.

شەرتی میرات وەرگرتن ئەمانەیە:

(یەکەم)، مردنی خاوەن میراتەکە مەعلووم بێ یا لە حوکمی مەعلوومدا بێ، وەك حوکمی قازی بەمردنی کەسێك کە دەمێ ساڵ بێ ونبووبێ؛

(دووەم)، بوونی میراتبەرەکە لەکاتی مردنی خاوە میراتەکەدا هەرچەند گیانیشی نەکرابێ بە بەرا، وەك ئەو تۆم (نُطفَە)یەکەوا لە سکی ژنی کابرای مردوودا و لەپاشی بەجێ ئەمێنێ؛

(سێهەم)، ژیانی میراتبەرەکەیە لەپاش مردنی خاوەن میراتەکە؛

(چوارەم)، ئەوەیە نیسبەت و پەیوەندی میراتبەرەکە بە خاوەن میراتەکەوە ئاشکراو دیاری بێ.

ئەو شتانەش کە مانیعی میرات وەرگرتنن، ئەمانەن:

یەکەم، ئەوەیە میراتبەرەکە خاوەن میراتەکەی کوشتبێ بە حەق یا بە ناحەق؛

دووەم، ئەوەیە ئایینیان جیاواز بێ بە ئیسلامەتی و کافری؛

سێهەم، جیاوازییانە لە یەك بە ئازادی و بەندەیی؛ ئەمڕۆ ئەم حاڵەتە نەماوە لە وڵاتی ئێمەدا، لەبەر ئەوە قسە لەم بابەتە ناکەین.

**بزانن!** دابەشکردنی میرات، پێویستی بە زانینی عیلمی «فَتوی» و «نَسَب» و «حِساب» هەیە؛ یەعنی ئەو کەسەی ماڵ دابەش ئەکا لەبەینی میراتبەراندا، ئەبێ ئاگای لەو حوکمە شەرعییانە هەبێ کە پەیوەندیان هەیە بە دابەشکردنی میراتەوە، وەك ئەوە کە بزانێ خاوەن بەشی دیاری کێیە و کێ کە خاوەن بەشی دیاری نەبێ، میراتی بەرئەکەوێ. وە ئەبێ ئاگای هەبێ لە پەیوەندی میراتبەر بە خاوەنمیراتەوە و ئەبێ حیساب بزانێ وە بە تایبەتی، دابەشکردن.

❋ ❋ ❋

ئەو کەسانە کە ـ بە ئیجماع ـ میرات وەرئەگرن لە پیاوانا، بە تەفسیل، پازدە کەسن: کوڕ؛ کوڕەزا، هەرچەندیش بەرەوخوار بڕوا؛ باوك؛ باوکی باوك، هەرچەند بەرەوژوورتریش بڕوا؛ برای باوك و دایکی؛ برای باوکی؛ برای دایکی؛ کوڕی برای باوکی و دایکی؛ کوڕی برای باوکی؛ مامی باوکی و دایکی؛ مامی باوکی؛ کوڕی مامی باوکی و دایکی؛ کوڕی مامی باوکی؛ مێردی ژن؛ خاوەنی پێشووی بەندەی ئازادکراو، ئەمەیان ئێمرو نەماوە.

ئەو کەسانەش کە ـ بە ئیجماع ـ میرات ئەبەن لە ژنانا، بە تەفسیل، دە کەسن: کچ؛ کچی کوڕ با بەرەوخواریش بێتەوە؛ دایك، دایکی دایك؛ دایکی باوك؛ خوشکی باوکی و دایکی؛ خوشکی باوکی؛ خوشکی دایکی؛ ژن؛ خاوەنی پێشووی بەندەی ئازادکراو کە خاوەنەکە ژن بێ.

جا ئەگەر ئەم میراتبەرانە هیچیان نەبوون، یاخود هەندێك خاوەنبەشی دیاری (ذوِی الفُروض) هەبوون، بەڵام شتێ زیاد لە بەشەکەیان ئەمایەوە، ئەوە ئەو میراتە ئەدرێ بە «بیتُ‌المال» (خەزێنەی موسوڵمانان)، مادام بەپێی شەرع ببرێ بەڕێوە، ئەگینا لەو سوورەتەدا کە خاوەن بەشی دیاری هەبێ ئەو زیادەیە ئەگەڕێتەوە بۆیان بە پێی بەشەکانیان، تەنها ژن و مێرد نەبێ وە ئەگەر ئەمانەیش نەبوون، ئەدرێ بە «ذَوِی الأَرْحام» کە بەکورتی، یازدە بەشن؛

(یەکەم)، ئەو باپیرو نەنکانە کە میراتبەری هەمیشەیی نین، یەعنی باپیرێك کە لە ریزی نێرینەی خالیسدا نەبێ و بە عیبارەتێکی‌تر، عەلاقەی ژن هەبێ لە گەیشتنیدا بە مردووەکە و نەنکێك کە بەهۆی پیاوێکەوە لەبەینی دوو ژنا گەیشتبێ بە مردووەکە، وەکوو باوکی باوکی دایك و باوکی دایك باوك و باوکی دایکی و دایکی باوکی دایکی مردووەکە؛

(دووهەم)، ئەولادی کچی مردووەکە، چ کوڕ بن و چ کچ؛

(سێهەم)، کچی برا، خواە برای باوکی و دایکی بێ یاخود برای باوکی بێ یا برای دایکی بێ؛

(چوارەم)، کوڕی برای دایکی؛

(پێنجەم)، ئەولادی خوشك، چ کوڕ بن و چ کچ؛

(شەشەم)، مامی دایکی؛

(حەوتەم)، کچی مام، هەر مامەیەك بێ؛

(هەشتەم)، خوشکی باوك؛

(نۆهەم)، خوشکی دایك؛

(دەهەم)، برای دایك؛

(یازدەهەم)، ئەوکەسانەکە ئەگەن بە مردووەکە بەهۆی یەکێك لەم بەشانەوە، تەنها جۆری یەکەمیان نەبێ، لەبەر ئەوە کە هەندێ لەوانەی بەهۆی ئەو بەشەوە ئەگەن بە مردووەکە میراتبەری هەمیشەیین، وەك دایك و هەندێکیشیان ناویان هێنراوە، وەك برای دایك و خوشکی دایك.

## «عەسەبە»و خاوەن بەشی دیاریکراو

میراتبەر، دوو بەشن؛ یەکەم، ئەوانە کە لە قورئان و حەدیسدا بەشیان بۆ دیاری نەکراوە؛ ئەمانە ناویان (عەسەبە)یە؛ دووهەم ئەوانە کە بەشیان بۆ دیاری کراوە؛ ئەمانە ناویان خاوەن بەشی دیاری کراوە (ذَوُوا الفُروض).

ئەو بەشانەش کە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان کراوە، شەشن: نیوە؛ چواریەك؛ هەشتیەك؛ دوو سێیەك؛ سێیەك؛ شەشیەك.

یەکەم ـکە نیوەیە ـ بەشی پێنج تاقمە؛

(یەکەم) مێردێك کە ژنەکەی ئەولادو ئەولادی ئەولادی خاوەن میراتی نەبێ، چ لەو مێردەو چ لە غەیری ئەو مێردە؛

(دووهەم)، تاقەکچە، یەعنی ئەوەی خوشك و برای خۆی لەگەڵدا نەبێ؛

(سێهەم) تاقەکچێکی کوڕ کە نە خوشك و براو نە ئەولادی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ؛

(چوارەم)، تاقەخوشکی باوکی و دایکی کە برای لەگەڵدا نەبێ؛
(پێنجەم)، تاقە خوشکی باوکی کە نە براو نە کور و کچی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ.
دووەمیش ـکە «چواریەك»ە ـ بەشی دوو تاقمە؛
یەکەم، مێردێك کە ژنەکەی ئەولاد یا ئەولادەزای میراتبەری هەبێ؛
دووەم، ژنێك یا زیاتر لە ژنێك تا چوار ژن کە مێردەکەیان ئەولاد یا ئەولادەزای میراتبەری نەبێ.
سێهەمیش ـکە «هەشتیەك»ە ـ بەشی ژنێکە یا زیاتر لە یەك ژن کە مێردەکەیان ئەولاد یا ئەولادەزای میراتبەری هەبێ.
چوارەمیش ـکە «دوو سێیەك»ە ـ یەعنی دوو بەش لە سێ بەشی ماڵ، ئەمیش بەشی چوار تاقمە؛
(یەکەم)، دوو کچ یا زیاتر لە دوو، بەو شەرتە کە برایان لەگەڵ نەبێ؛
(دووەم)، دوو کچی کوڕ یا زیاتر، بەو شەرتە نە لەگەڵ برای خۆیان و نە لەگەڵ چینێکی لای سەرووی خۆیانا نەبن لە ئەولادو ئەولادەزای مردووەکە؛
(سێهەم)، دوو خوشکی باوکی و دایکی یا زیاتر لە دوو خوشك، بەو شەرتە نە لەگەڵ برای خۆیانا و نە لەگەڵ ئەولادی مردووەکەدا نەبن؛
(چوارەم)، دوو خوشکی باوکی یا زیاتر، بەو شەرتە نە لەگەڵ برای خۆیانا و نە لەگەڵ خوشکی باوکی و دایکی یا برای باوکی و دایکیدا و نە لەگەڵ ئەولادی مردووەکەدا نەبن.
پێنجەمیش ـکە «سێیەك»ە ـ بەشی دوو تاقمە؛
یەکەم، دایکی مردووەکە، بەو شەرتە کە مردووەکە ئەولادی نەبێ و کوڕەزایشی نەبێ و ژمارەیەکیشی لە براو خوشك نەبێ؛
دووەم، ژمارەیەك لە براو خوشکی دایکی، هەندێ جاریش ئەدرێ بە باپیرە کە لەگەڵ براو خوشکی مردووەکەدا کۆببێتەوە.
شەشەمیش ـکە «شەشیەك»ە ـ بەشی حەوت تاقمە؛

(یەکەم) باوکی مردووەکە؛

(دووەم)، باپیری مردووەکە، بەو شەرتە مردووەکە ئەولاد یاخود کوڕەزای بێ؛

(سێهەم)، دایکی مردووەکە، بەو شەرتە مردووەکە کوڕ یا کوڕەزای بێ، یاخود ژمارەیەکی لە براو خوشك بێ؛

(چوارەم)، بۆ نەنکێکە یا زیاتر لە نەنکێك، بەو شەرتە کە نەگاتەوە بە مردووەکە بەهۆی پیاوێکەوە لەبەینی دوو ژندا، خواه بەهۆی تەنها پیاوەوە یا بەهۆی تەنها ژنەوە یا بەهۆی هەردوولایانەوە بگا بە مردووەکە؛

(پێنجەم) کچی کوڕە، یەکێك بێ یا زیاتر، بەو شەرتە لەگەڵ کچی مردووەکەدا یا لەگەڵ کچی کوڕێکی لەخۆی بەرەوژوورتردا نەبێ‌و برایشی لەگەڵدا نەبێ؛

(شەشەم)، بۆ خوشکی باوکییە، یەکێك بێ یا زیاتر، بەو شەرتە لەگەڵ خوشکێکی باوکی و دایکیدا بێ‌و برایشی لەگەڵ نەبێ؛

(حەوتەم)، بۆ تەنها برا یا تەنها خوشکی دایکییە.

هەرچی میراتبەرێکی تری غەیری ئەمانە کە لە قورئان و حەدیسدا ناویان هاتبێ، هەموویان عەسەبەن، هەرچەند هەندێ لەمانە کە خاوەن بەشی دیاری کراون، جاروبار بە عەسەبەییش میرات ئەبەن، وەك باوك و باپیرەو کچی مردووەکەو کچی کوڕی مردووەکەو خوشکی باوکی‌و خوشکی باوکی‌و دایکی، وەکوو لەمەولا، خوا یار بێ! باسیان ئەکەین.

بزانن! رێگای زۆرکردنی نەنك، چەند جۆری هەیە؛ یەکێك لەوانە ئەوەیە کە لەبەینی نەنك و مردووەکەدا چوار باوك بێ ـ مەسەلا ـ ئەمجار لەپاڵ نەنکەکەدا یەکێکیان بگۆڕرێ بە دایك، ئەمجار دوانیان، ئەمجار سیانیان، ئەمجار هەر چواریان، وەکوو دایکی باوکی باوکی باوکی باوکی مردووەکە، یا دایکی دایکی باوکی باوکی باوکی، یا دایکی دایکی دایکی باوکی، یا دایکی دایکی دایکی دایکی مردووەکە.

## باسی تەرتیبی عەسەبەکان

ئەو میراتبەرانە کە بەشیان دیاری نەکراوەو پێیان ئەوترێ (عـەسەبە)، ریـزیکی تایبەتییان هەیە لەسەر ئەو ریزە ئەبن بە میراتبەر، یەعنی تـا یـەکـەمیان وەسـتابێ، دووهەمیان میرات نابا و تا دووهەمیان وەستابێ، سێهەمیان میراتی نییە و بـەمجۆرە؛ ئەمانە، یەکەمیان «کوڕ» و دووهەمیان، «کوڕی کوڕ»ە، هەرچەند بەرەوخواریش بڕوا و سێهەمیان، «باوك» و چوارەمیان، «باوکی باوك»ە هەرچەند بەرەوژووریش بڕوا بەڕیز؛ پێنجەمیان، «برای باوکی و دایکی» و شەشەمیان «برای باوکی»یە؛ بەڵێ ئەگەر باپیرە لەگەڵ براو خوشکی باوکی و دایکی یا باوکیداگردبێتەوە، ئەوە حوکمێکی تایبەتییان هەیە؛ حەوتەم، «کوڕی برای باوك و دایکی»؛ هەشتەم، «کوڕی برای باوکی» هەتا بەرەو خواریش بڕۆن بە تەرتیب؛ بەڵێ، نزیکی لای بێهێز پێش ئـەکـەوێ لە دووری لای بەهێز؛ کەواتە، کوڕی برای باوکی، پێش ئەکەوێ لە کوڕەزای برای باوك و دایکی وە هەروەها لەسەر ئەم قیاسە؛ نۆهەم، «مامی باوك و دایکی»؛ دەهـەم، «مـامی بـاوکی»؛ یازدەهەم، «کوڕی مامی باوك و دایکی»؛ دوازدەهەم «کوڕی مامی باوکی» و دەستوورە پێشووەکە لێرەیشدا هەیە؛ کەواتە، کوڕی مامی باوکی، پێش ئەکەوێ لە کوڕەزای مامی باوکی و دایکی؛ سیازدەهەم، «مامی باوکی مردووەکە» لەلایـەنی بـاوك و دایکـەوە؛ چواردەهەم، «مامی باوکی مردووەکە» لەلایەنی باوکەوە؛ پانزەهەم، «کوڕی مامی باوك» لەلایەنی باوك و دایکەوە؛ شانزەهەم «کوڕی مامی باوك» لەلایـەنی بـاوکەوە لەسـەر ئوسووڵی پێشوو، ئەمجار مامی باپیری مردووەکە بەوجۆرە کـە بـاس کـرا، یـەعنی لەلایەنی باوك و دایکەوە، یا لەلایەنی باوکەوە؛ جا ئەگەر عەسەبەی نەسەب نـەبوو، ئەوجار میرات ئەدرێ بە (مُعْتِق) یەعنی ئەو خاوەنەکە بەندەکەی ئازادکردووە، ئەگەر مردووەکە کۆنە بەندە بوو.

## باسی (مَخارجُ‌الفُروض) یەعنی ئەو ژمارانەی کە بەشە دیاریکراوەکانیان بەساغی لێ دەرئەچێ

ئەو ژمارانە کە بەشە دیاری کراوەکانیان بەساغی لێ دەرئەچێ، بەم‌جۆرەن کە باسیان ئەکەین: «نیوە» لە «دوو» دەرئەچێ، یەعنی ئەگەر بمانەوێ نیوەی میرات بدەین بە خاوەن‌فەرز، ئەبێ ئەو میراتە بکەین بە دوو بەشەوە، ئەوجا بەشێکیان بدەین بە خاوەن فەرزەکە. «چواریەك»یش لە «چوار» دەرئەچێ. «هەشت‌یەك»یش لە «هەشت» دەرئەچێ. «سێ‌یەك»یش لە «سێ» دەرئەچێ، هەروەها «دوو سێ‌یەك». «شەش‌یەك»یش لە «شەش» دەرئەچێ وە ئەگەر کەسرێکی ئیزافەکراو هەبوو، وەك «نیوەی چواریەك»، ئەوە ئەبێ زەربی ئیزافەکراوەکە بکەین لە ئیزافە بۆ لاکراوەکە؛ کەواتە «نیوەی چواریەك» لە هەشت دەرئەچێ و «سێ‌یەکی نیوە» لە شەش دەرئەچێ و «سێ‌یەکی چواریەك» لە دوازدە دەرئەچێ و «سێ‌یەکی شەش‌یەك» لە هەژدە دەرئەچێ.

مەخرەجی چەند کەسرێکی عەتف‌کراو، یەعنی چەند کەسرێك کە بەیەکەوە تەماشا بکرێن، عەددێکە کە ئەو کەسرانەی بەساغی لێ‌دەربچێ؛ کەواتە، «سێ‌یەك و چواریەك» لە «دوازدە» دەرئەچن و بە ئوسووڵی زەرب، مەخرەجی کەسری یەکەم زەرب ئەکرێ لە کەسری دووهەم.

## ئەسڵی مەسئەلە

ئەسڵی مەسئەلە بەو ژمارەیە ئەڵێن کە ئەو بەشانەی کە لە مەسئەلەکەدا مەتڵەبن لەو ژمارەیە دەربچن؛ جا ئەگەر میراتبەرەکان عەسەبە بوون، ئەوە ئەسڵی مەسئەلە ژمارەی سەری میراتبەرەکانە؛ جا ئەگەر نێرینەو مێینە کۆبوونەوە، ئەوە لەویادا نێرینە سەری بە دوو سەر ئەژمێررێ، هەروەك لە بەشا دووقاتی پێ ئەدرێ، وە ئەگەر خاوەن‌فەرزی تیا بوو، ئەوە ئەسڵی مەسئەلە لەسەر مەخرەجی فەرزەکە دائەنرێ؛ کەواتە، ئەسڵی مەسئەلەیەك کە ژنێك و کوڕێکی تیابێ، هەشتە کە مەخرەجی فەرزی

ژنەکەیە، یەك بۆ ژنەکەو حەوت بۆ کوڕەکە وە ئەسڵی مەسئەلەیەك کە براو ژنی کابرای مردووی تیابێ، چوارە کە مەخرەجی فەرزی ژنەکەیە، یەکێکی بۆ ژنەکە و سێی بـۆ براکە.

وە ئەسڵی مەسئەلەیەك کە دوو کچ و برای مردووەکەی تیابێ، سیانە کە مەخرەجی دوو سێ یەکەکەی کچەکانە، دوو بۆ کچەکان و یەکێك بۆ براکە. وە ئەسڵی مەسئەلەیەك کە دایك و باوکی مردووەکەی تیابێ، هەم سێیە کە مەخرەجی فەرزی دایکەکەیە کە سێ یەکە، یەکێکی بۆ دایکەکەو دوانی بۆ باوکەکە. وە ئەسڵی مەسئەلەیەك کە مێردی مردووەکەو برایەکی تیابێ، دووە کە مەخرەجی فەرزی مێردەکەیە کە نیوەیە، یەکێك بۆ ئەوو یەکێك بۆ براکەی. وە ئەسڵی مەسئەلەیەك کە دایکی مردووەکەی تیابێ لەگـەڵ کوڕێکا، شەشە کە مەخرەجی فەرزی دایکەکەیە کە شەش یەکە، یەکێکی بۆ دایکەکەو پێنج بۆ کوڕەکە.

## باسی نیسبەت لەبەینی مەخرەجی چەند فەرزێکداکە بکەونە یەك

هەروەختێك چەند فەرزێك لەیەك مەسئەلەدا کەوتنەیەك، ئـەوە مـەخرەجی ئـەم فەرزانە، یا «تَماثُل»یان لە بەیندایە، یا «تَداخُل» یا «تَوافُق» یـا «تَـبایُن». ئـەگـەر دوو مەخرەجەکە یەك بوون، وەکوو دوو «نیوە» لە مەسئەلەی مێردێك و خوشکێکی باوکیدا ئەوە تەماسولیان لەبەیندایە و ئەسڵی مەسئەلە مەخرەجی فەرزەکەیە، وەکوو «دوو»، لەم سوورەتەدا؛ ئەگینا، ئەگەر زۆرەکەیان بە کەمەکە ئەفەوتا بە دووجار یا زیـاتر، ئـەوە تەداخولیان لەبەیندایەو ژمارە زۆرەکەیان دائەنرێ بە ئەسڵی مـەسئەلە وەکـوو «دوو سێ یەك» و «شەش یەك» لە مەسئەلەیەکداکە میراتبەر دایك بێ لەگەڵ دووکچدا، ئێستە ئەسڵی مەسئەلە شەشە، چوار بۆ دوو کچەکەو یەکێك بۆ دایکەکە و یەکەکەی تری کە ئەمێنێتەوە، ئەدرێتە دواوە بۆ سەریان بە ئوسوولی بەشەکان و لە ئەنجامدا مەسئەلەکە لە پێنجدا تەواو ئەبێ.

وە ئەگەر زۆرەکە بەکەمەکە نەئەفەوتا بە دوو جار یا زیاتر، لەبەر ئەوەکە یاکەم ئەبوو یا زیاد ئەبوو وە هەردووکیان ئەفەوتان بە ژمارەیەکی جیا لەخۆیان، ئەوە تەوافوقیان

لەبەیندایە، وەك «شەش یەك» و «هەشت یەك» لە مەسئەلەی ژن و دایك و کوڕێکا؛ جا ئەگەر ئەو ژمارەیە کە ئەمانەی ئەفەوتاند دوو بوو کە مەخرەجی «نیوە»یە، ئەوە ئەو دوو ژمارەیە مەشهوورن بە «مُتَوافِق بِالنِّصف» و ئەسڵی مەسئەلەکە حاسڵی زەربی نیوەی یەکێکیانە لە تەواوی ئەویانا؛ ئێستە لەم مەسئەلەدایە سێ زەرب ئەکەین لە هەشتدا ئەبێ بە بیست و چوار، بۆ ژنەکە سێ و بۆ دایکەکە چوارو ئەویشی بۆ کوڕەکە.

وە ئەگەر ئەو ژمارەیە کە ئەم دوانەی ئەفەوتاند سێ بوو، وەکوو شەش و نۆ، ئەوە مەشهوورن بە «مُتَوافِقٌ بِالثُّلث» و... بەم جۆرە.

ئەگەر وەها رێکەوت ئەو دوو ژمارەیە بە چەند ژمارەیەك ئەفەوتان کە مەخرەج بوون بۆ «نیوە»و بۆ «چواریەك» و بۆ «هەشت یەك»، ئەوە «وِفْق»ە وردەکەیان ئەگیرێ کە بریتییە لەویانە کە بە ژمارە زۆرە، بەڵام بە ئەندازە لەوان کەمترە، وەك «هەشت یەك» لەم شوێنەداکە باسمان کرد، لەبەر ئەوە هەتاکەسرەکە وردتر بێ، حاسڵی زەربەکە کەمترە و بە ئاسانتر حیسابەکە ئەبڕێتەوە؛ ئەمە لای ژمارەکەران (محاسِب) زۆر مەتڵەبە.

وە ئەگەر ئەو دوو ژمارەیە نەئەفەوتان بە یەك نەبێ و یەکیش بە ژمارە دانانرێ، ئەوە ئەو دوو ژمارەیە «تەبایون»یان لەبەیندایەو ئەسڵی مەسئەلەکە حاسڵ زەربی یەکێکیان ئەبێ لەویاندا، وەك «سێ یەك» و «چواریەك» لە مەسئەلەی دایك و ژن و برادا، لێرەدا ئەسڵی مەسئەلەکە دوازدەیە، سێ بۆ ژنەکەو چوار بۆ دایکەکە و ئەوی تری ـکە پێنجە ـ بۆ براکەیە.

جا لەسەر ئەم تەفسیلاتە کە باسمان کرد، ئوسوولی مەسئەلە، حەوتن «دوو، سێ، چوار، شەش، هەشت، دوازدە، بیست و چوار»، لەبەر ئەوەکە ئەگەر فەرز یەکێك بێ یا دوو فەرزی موتەماسیل، ئەوە دەرناچێ لە مەخرەجی ئەو فەرزانە کە ناویان براوە، «مَعَ العِلْم»، سێ یەك و دوو سێ یەك، هەردووکیان یەك مەخرەجیان هەیە، هەروەها ئەگەر جیاجیاو موتەداخیل بوون، وەك سێ و شەش وە ئەگەر موتەوافیق بوون، وەك چواریەك و شەش یەك، یا موتەباین بوون، وەك سێ یەك و چواریەك، ئەوە بە زەربی کەسری یەکێکیان لە تەواوی ئەوی تریانا، یاخود بە زەربی تەواوی یەکێکیان لە تەواوی

ئەویاندا، ئەگەر لە ژمارەی مەخاریجی شەش فەرزە مەشهوورەکە دەربچن، لە مەسئەلەی دوازدە و بیست‌وچوار دەرناچن.

بەڵێ، عالمە موتەئەخیرەکانی مەزهەبی شافیعی، دوو ئەسڵی تریان بڕیار داوە؛ یەکەم «هەژدە» لە مەسئەلەی باپیرەو چەند برایەکدا لەو شوێنانەداکە سێ‌یەکی پاشماوە لەپاش فەرز، باشتر بێ بۆ باپیرە؛ دووهەم، «سی‌وشەش»، وەك لەمەولا باسی ئەکەین، خوا یار بێ!

## باسی «حَجْب»، یەعنی مەنع‌کردنی میرات‌بەر لە میرات‌بردن

«حَجْب» لە شەرعدا، بریتییە لە مەنع‌کردنی کەسێك کە سەبەبی میرات‌بردنی هەبێ لە وەرگرتنی هەموو بەشە میراتەکەی یا لە هەندێکی؛ جا ئەگەر مەنع‌کرا لە وەرگرتنی هەموو بەشە میراتەکەی، ئەوە پێی ئەڵێن: «حَجْبُ‌الحِرمان» وە ئەگەر مەنع کرا لە وەرگرتنی هەندێکی و بەشەکەی کەم‌کرایەوە، وەك لە باسی فوروزی موقەددەرەدا باسمان کرد کە بەهۆی منداڵەوە بەشی مێرد لە نیوەوە دێتە خوارو ئەبێ بە چواریەك و بەشی ژن لە چواریەکەوە دێتە خوارو ئەبێ بە هەشت‌یەك، ئەوە پێی ئەڵێن: «حَجْبُ‌النُّقصان». جا ئەم بەتەواوی بێ‌بەش‌کردنە، یا لەبەر «وەسفە» یا لەبەر «شەخسە» یا لەبەر «اِستِغْراق»و داگرتنی هەموو بەشەکانە لەلایەن خاوەن‌بەشەکانەوە.

بێ‌بەش‌کردنی تەواو لەبەر وەسف، ئەوەیە بەهۆی یەکێ لە مانیعەکانی میرات‌وەرگرتنەوە، میرات‌وەرگرەکە بێ‌بەش بکرێ لە میرات‌وەرگرتن؛ یەکێك لەو مانیعانە، جیاوازیی ئایینی میرات‌بەرو مردووەکەیە، وەك ئیسلامەتی و کوفر؛ کەواتە، کافر لە موسوڵمان و موسوڵمان لە کافر میرات وەرناگرن؛ بەڵێ، کافر میرات لە کافر وەرئەگرێ، هەرچەند ئایینیشیان جیا بێ، ئەوەندە هەیەکافرێ کە لە وڵاتی موسوڵمانان یا وڵاتی ژێردەستەی موسوڵمانانا دانیشتبێ، میرات وەرناگرێ لە کافرێ کە لە وڵاتێکا بێ کە لە حاڵی جەنگدا بێ لەگەڵ موسوڵمانان و بە پێچەوانەشەوە؛ هەروەها، کافری پاشگەز بووەوە (مُرتد)، میرات لە کەس وەرناگرێ و کەسیش میرات لەو وەرناگرێ و

هەر میراتێکی لێ بەجێ بمێنێ، بە «فَيْء» دائەنرێ و ئەخرێتە گەنجینەی موسوڵمانانەوە؛ هەروەها، «زِندیق»یش کە هیچ ئایینێکی نەبێ، نە میرات لە کەس وەرئەگرێ و نە کەس میراتی لێ وەرئەگرێ.

یەکێکی تر لەو مانیعانەی کە رێگای میرات وەرگرتن ئەگرن، بەندەییە (رِقْ)؛ بەندە، نە میرات لە کەس وەرئەگرێ و نە کەس میراتی لێ وەرئەگرێ.

مانیعێکی تریش، کوشتنە (قَتل)؛ هەرکەس کەسێك بکوژێ بە حەق یا بە ناحەق و بە دەسەنقەست یا بە هەڵە، ئەوە میرات لە کوژراوەکە وەرناگرێ.

هۆیەکی تری میرات وەرنەگرتن، «دەوری حوکمی»یە کە بریتییە لەوە میراتدان بە کەسێك ببێ بەهۆی میرات پێنەدانی؛ مەسەلا، ئەگەر برای مردوویەك ئیقراری کرد: فلانکەس کوڕی برا مردووەکەمە، ئەوە نەسەبی سابت ئەبێ، بەڵام نابێ میراتی وەربگرێ، لەبەر ئەوە کە ئەگەر میرات لە باوکی وەربگرێ، ئەبێ مامی میرات نەبا و مادام مامی میرات نەبا، نەسەبی ئەم کوڕەیش سابت نابێ، چونکە شەرتی تەئسیری ئیقرار بە نەسەب ئەوەیە میراتبەر بیکا و مادام نەسەبی سابت نەبوو، میرات نابا، ئەنجامیش ئەوەیە مادام ئەم کوڕە میرات ببا، ئەبێ میرات نەبا، ئەوەیش مەحاڵە؛[1] بەڵێ، پێغەمبەرایەتی (نُبوَّت) مانیعی ئەوەیە میراتی لێ وەربگیرێ، ئەم حوکمەیش هەر بەکاری زەمانی حەزرەتی عیسا دێت ـ علی نَبِیِّنا و علیه الصَّلاةُ و السّلام ـ.[2]

جۆرێکی تری بێبەشکردن بە تەواوی، بەهۆی شەخسەوەیە؛ جا لێرەدا ئەبێ بزانین باوك و دایك و ژن و مێرد و کوڕ و کچ هەرگیز بەهۆی ئەمجۆرە بێبەشکردنەوە بێبەش

١. [بۆ زانیاری زیاتر لەم باسە بڕوانە بەرگی دووەمی شەریعەتی ئیسلام دوایین باسی «ئیقرار کردن بەنەسەب» ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان].

[ ٢. لەوانەیە لەم عیبارەتەدا داکەوتن و هەڵەی نووسین (تایپی) هەبێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەفەرموی: «نَحنُ مَعاشِرَ الأَنبیاءِ لا نُوَّرَثُ و ما تَرَكْناهُ صَدَقة» واتە: ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران کەس میراتمان لێ وەرناگرێ وە ئەوەی بەجێی دێڵین سەدەقەیە. دیارە ئەم حوکمەش بۆ هەموو پێغەمبەرانە. وە لەوانەشە مەبەست ئەوەبێ کە ئەم حوکمە تازە بە سەر هیچ پێغەمبەرێکدا جاری نابێ مەگەر بە سەر حەزرەتی عیسا علیه السلام دا دوای هاتنە خوارەوەی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان].

نابن، بەڵام کوڕی کوڕ بێبەش ئەبێ بە کوڕی مردوو یا بە کوڕی کوڕێ کە لەخۆی نزیکتر بێ وە باپیرە بێبەش ئەبێ بەپیاوێ کە لەبەینی ئەوو مردووەکەدا بێ و برای باوکیو دایکی بێبەش ئەبێ بە باوك و کوڕو کوڕی کوڕ وە برای باوکی بێبەش ئەبێ بەم کۆمەڵەو بە برای باوکیو دایکیش، هەروەها بە خوشکێکی باوکی و دایکیش کە لەگەڵ کچی مردووەکە یا لەگەڵ کچی کوڕیا بێ وە براو خوشکی دایکی بێبەش ئەبن بە باوك و باپیرەو بە ئەولادی مردووەکە و بە ئەولادی کوڕی، هەرچەند بەرەوخواریش بووبێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر باپیرە لەگەڵ براو خوشکی باوکی و دایکی، یا براو خوشکی باوکیدا کۆبووەوە، ئەوە حوکمێکی تایبەتی هەیەو لەمەولا -خوا یار بێ!- باسی ئەکەین.

کوڕی برای باوکی و دایکی، بێبەش ئەبێ لە میرات بە باوك و باپیرە و بە کوڕو کوڕی کوڕی مردووەکە و بە برای باوکی و دایکی و بە برای باوکی وە کوڕی برای باوکی بێبەش ئەبێ لە میرات بەمانەو بە کوڕی برای باوکی و دایکیش؛ بەڵێ، کوڕی برای باوکی، کوڕی کوڕی برای باوکی و دایکی بێبەش ئەکا لە میرات، چونکە ئەم نزیکترە، وە ئەم ئوسوولە ئیش ئەکا لە هەموو بێهێزێکی نزیکا کە کۆببێتەوە لەگەڵ بەهێزێکی دووردا.

مامی باوکی و دایکی، بێبەش ئەبێ لە میرات بەوانەی باسمان کردن و بە کوڕی برای باوکی و مامی باوکی، بێبەش ئەبێ بەمانەو بە مامی باوکی و دایکی، وە کوڕی مامی باوکی و دایکی، بێبەش ئەبێ بەوانەو بە مامی باوکی وە کوڕی مامی باوکی بێبەش ئەبێ بەوانەو بە کوڕی مامی باوکی و دایکی وە هەر بەمپێیە لەلایەنی مامی باپیرەیشەوە و ئەو خاوەن بەندەیە کە بەندەی ئازاد کردووە، بێبەش ئەبێ بەهۆی عەسەبەی نەسەبی ئازادکراوەکەوە وەکچی کوڕ، بێبەش ئەبێ بە کوڕی مردووەکەو بە دوو کچیشی یا زیاتر لە دوو کچ، ئەگەر کەس نەبێ ئەم کچی کوڕە بکا بە عەسەبە، وەکوو برای یا برازای خۆی، وەکوو لەمەولا باسی ئەکەین.

نەنکی تەرەفی دایك، کەس بێبەشی ناکا دایك خۆی نەبێ، بەڵام نەنکی تەرەفی باوك، بە باوکیش و بە دایکیش بێبەش ئەبێ و نەنکی دوور، لە هەر تەرەفێکەوە بێ،

بێبەش ئەبێ بە نەنکی نزیك لەو تەرەفەوە؛ کەواتە، دایکی دایکی دایك بێبەش ئەبێ بە دایکی دایك وە دایکی باوکی باوك، بێبەش ئەبێ بە دایکی باوك؛ بەڵێ، ئەگەر نەنکە دوورەکە لە تەرەفێکی تریشەوە بگا بە مردووەکە، ئەوە بێبەش نابێ بەو نزیکە؛ مەسەلا، ژنێ ببێ کچی کچی ئەو شوو بکا بە کوڕی کوڕی کوڕی، جا ئـەو کـچە شـوو کردووە بمرێ و دوو نەنکی لێ بەجێ بمێنێ: دایکی دایکی و دایکی دایکی دایکی، لەم سوورەتەدا نەنکە دوورەکە بێبەش نابێ بە نەنکە نزیکەکە، لەبەر ئەوەکە هەر وەکوو لە تەرەفی دایکەوە نەنکی مردووەکەیە، لە تەرەفی باوکیشەوە هەر نەنکیەتی و لەواقیعدا، دایکی باوکی باوکی باوکی ئەم مردووەیشە؛ کەواتە، شەش‌یەکەکە هەر بە هـاوسانی لەبەینی خۆیانا بەش ئەکەن.

دایکی باوکی باوك، بێبەش ئەبێ بە دایکی باوك، ئـەگـەر ئـەو نـەنکە لەلایـەنی دایکیشەوە نەگا بە مردووەکە وەکوو وێنەی میسالی پێشوو؛ هەروەها، نەنکی دوور لە تەرەفی باوکەوە بێبەش ئەبێ بە نەنکی نزیك لەتەرەفی دایکەوە؛ کەواتە، دایکی باوکی باوك، بێبەش ئەبێ بە دایکی دایك، بەڵام پێچەوانەی ئەمە نییە؛ کەواتە، دایکی دایك، بێبەش نابێ بە دایکی باوك، بەڵکوو هەردووکیان لە شەش‌یەکەدا بەشدارن.

خوشکی باوکی و دایکی، یا باوکی، وەکوو برا وایە، برا بە کێ بێبەش ببێ، ئەمیش بەو کەسە بێبەش ئەبێ؛ کەواتە، خوشکی باوکی و دایکی، بێبەش ئەبێ بە باوك و بە کوڕو بە کوڕی کوڕ و بە دووکچی مردووەکەو بە دووکچی کوڕیشی، ئەگەر لەگەڵ ئەم خوشکەداکەسێکی وەها نەبێ بیکا بە عەسەبە وە خوشکی باوکی بەمانە بێبەش ئەبێ، هەروەها بە برای باوکی و دایکیش و بە دوو خوشکی باوکی و دایکیش، بەو شـەرتە برای باوکی لەگەڵ ئەم خوشکەدا نەبێ، هەروەها بێبەش ئەبێ بە خوشکێکی باوکی و دایکیش، ئەگەر لەگەڵ کچی مردووەکە یا لەگەڵ کچی کوڕیا بێ.

عەسەبەی غەیری کوڕو غەیری ئەو عەسەبانەی کە بە فەرزیش بەش ئەبەن، وەکوو باوك و باپیرە و برای باوکی و دایکی، لە مەسئەلەی «مشرّكة»دا وە خوشکی باوکی و دایکی یا باوکی، لە مەسئەلەی «أَكدريَّة»دا، بێبەش ئەبن بە کۆمەڵێك لە خاوەن‌فەرز کە

هەموو میراتەکە دابگرن؛ مەسەلا، وەکوو مەسئەلەی مێردێك و برایەك یا خوشکێکی دایکی و دایکێك و مامەیەك، ئەم مەسئەلەیە لە شەشە و زیاد ئەکرێ بۆ حەوت؛ مێردەکە سێ بەش‌و دایکەکە دوو بەش‌و برا دایکییەکە بەشێك ئەبەن و لەبەر ئەوە کە هیچی لێ نامێنێتەوە، مامەکە بێ‌بەش ئەبێ.

**بزانن!** شەرتی ئەوە کە کەسێك میراتبەرێك بێ‌بەش بکا لە میرات، ئەوەیە ئەم کەسە بێ‌بەش‌کەرە خۆی میرات ببا؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك خۆی بێ‌بەش بێ لە میرات، ناتوانێ کەس بێ‌بەش بکا لە میرات؛ بەڵێ، عالمەکانی شەرع، نۆ سوورەتیان جیا کردووەتەوە لەو نۆ سوورەتەدا میراتنەبەر، ئەبێ بەهۆی بێ‌بەش‌کردنی میراتبەر؛

(یەکەم)، مەسئەلەی باوك و دایك و ژمارەیەك لە براو خوشك ؛ ئێستە ئەم خوشك و برایانە دایکەکە لە سێ‌یەکەوە دائەپەڕێنن بۆ شەش‌یەك، کەچی خۆیشیان لەبەر باوکەکە میرات نابەن، ئەم مەسئەلەیە لە شەشەکە مەخرەجی «شەش‌یەك»ی دایکەکەیە، یەکێکی بۆ دایکەکەو ئەوی‌تری بۆ باوکەکەیە.

(دووەم)، مەسئەلەی دایك و دوو برای دایکی و باپیرەیە؛ لەم مەسئەلەیەدا براکان دایکەکە لە سێ‌یەکەوە دائەپەڕێنن بۆ شەش‌یەك، لەگەڵ ئەوەشداکە خۆیشیان بێ‌بەش کراون لە میرات بەهۆی باپیرەکەوە، ئەم مەسئەلەیە لە شەشەکە مەخرەجی شەش‌یەکی دایکەکەیە، یەکێکی بۆ ئەوو ئەوی‌تریان بۆ باپیرەکە.

(سێهەم)، مەسئەلەی دایك و باپیرە و برایەکی دایکی‌و برایەکی باوکییە؛ ئەم دوو برایە دایکەکە لە سێ‌یەکەوە دائەپەڕێنن بۆ شەش‌یەك، لەگەڵ ئەوەشداکە برا دایکییەکە بێ‌بەش کراوە بەهۆی باپیرەکەوە، ئەم مەسئەلەیەیش لە شەشەکە مەخرەجی شەش‌یەکی دایکەکەیە. یەکێکی بۆ ئەوو پێنجی بۆ باپیرەکەو براباوکییەکە؛ جا لەبەر ئەوەکە ئەم پێنجە بەش ناکرێ بەسەر ئەم دوانەدا، زەربی دوو ئەکەین لە شەش ئەبێ بە دوانزە: دووی بۆ دایکەکەو براو باپیرەکەیش، یەکی پێنجی وەرئەگرن، چونکە لەم جۆرە شوێنەدا براو باپیرە برابەشن.

(چوارەم)، مەسئەلەی باپیرو برایەکی باوکی و دایکی و برایەکی باوکییە؛ لەم مەسئەلەیەدا ئەم دوو برایە ئەبن بەهۆی ئەوە باپیرەکە لە نیوەی میراتەکەوە داپەڕێنن بۆ

سێ یەك، چونكە لە سوورەتدا سێ بران، لەگەڵ ئەوەشدا كە برا باوكی و دایكییەكە، برا باوكییەكە بێبەش ئەكاو بەشەكەی ئەویش وەرئەگرێ؛كەواتە، ئەو میراتەكە سێ بەش بووە، دوو بەشی بۆ برا باوكی و دایكییەكەو بەشێكی بۆ باپیرەكەیە وە ئەگەر برا باوكییەكە نەبوایە، ئەكرا بە دوو بەشەوە، بەشێكی بۆ باپیرەكەو ئەو بەشەكەی بۆ بـرا بـاوكی و دایكییەكە.

(پێنجەم)، مەسئەلەی دایك و برایەكی باوكی و دایكی و برایەكـی بـاوكییە؛ لەم مەسئەلەیەدا ئەم دوو برایە دایكەكە لە سێ یەكەوە دائەپەڕێنن بۆ شـەش یەك، لەگـەڵ ئەوەشداكە برا باوكییەكە بێبەش كراوە بەهۆی براباوكی و دایكییەكەوە، ئەم مەسئەلەیە لە شەشەكە مەخرەجی شەش یەكی دایكەكەیە، یەكێكی بۆ ئەوو ئەوی تری بۆ براكە.

(شەشەم)، مەسئەلەی مێرد و دایك و خوشكێكی باوكی و دایكـی و بـرایـەكـی باوكییە؛ لەم مەسئەلەیەدا خوشك و براكە، دایكەكە لە سێ یـەكـەوە دائـەپەڕێنـن بـۆ شەش یەك، لەگەڵ ئەوەشداكە برا باوكییەكەیش بێبەش كراوە لە میرات بەهۆی ئەوەوە كە خاوەن فەرزەكان هەموو میراتەكەیان داگرتووەتەوە، ئەم مەسئەلەیە لە شەشە كـە مەخرەجی شەش یەكی دایكەكەیە و زیاد ئەكرێ بۆ حەوت، سێ بەشی بۆ مێردەكەو سێ بەشی بۆ خوشكە باوكی و دایكییەكەو بەشێكی بۆ دایكەكەیە.

(حەوتەم)، مەسئەلەی مێردو خوشكێكی باوكی و دایكـی و بـراو خـوشكێكـی باوكییە؛ مەسئەلەكە لە دووە كە مەخرەجی فەرزی مێردەكە یا فەرزی خوشكەكەیە كە نیوەیە؛ یەكێك بۆ مێردەكەو یەكێك بۆ خوشكەكەیە. وە برا باوكییەكە ئـەبێ بـەهۆی بێبەش بوونی خوشكە باوكییەكە، چونكە كردوویەتی بە عەسەبە وە ئەگەر ئەو نەبوایە، خوشكە باوكییەكە شەش یەكی ماڵی ئەبردو مەسئەلەكە لە شەش ئەبوو و ئەچوو بـۆ حەوت، بەڵام مادام ئەویش بوو بە عەسەبە وەكوو براكە، هەردووكیان بێبەش بوون بە داگرتنی میراتەكە لەلایەن خاوەنفەرزەكانەوە.

(هەشتەم)، مەسئەلەی دایك و دوو برای دایكی و خوشكێكی باوكی و دایكی و براو خوشكێكی باوكییە؛ ئەم مەسئەلەیە لە شەشە كە مـەخرەجی فـەرزی دایكـە كـە

شەش یەکە، یەکێك بۆ دایکەکەو دوو بۆ دوو برا دایکییەکەو سێ بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکە وە براو خوشکە باوکییەکە بێبەشن، بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن فەرزەکـان هەموو میراتەکەیان داگرتووە، ئێستە ئەگەر براکە خوشکەکەی نەکردایە بە عەسەبە، شەش یەکێکی بۆ دائەنراو مەسئەلەکە زیادَ ئەکرا بۆ حەوت، بـەڵام مـادام کـردی بـە عەسەبە، بێبەشی کرد لە فەرزەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆیشی بێبـەشە، بـەهۆی ئەوەوە کە خاوەن فەرزەکان هەموو میراتەکەیان داگرتووە.

(نۆهەم)، مەسئەلەی مێرد و باوك و دایك و کچێك و کوڕی کوڕ و کـچی کـوڕە؛ مێردەکە چواریەك و باوکەکە شەش یەك و دایکەکە شەش یەك و کچەکە نیوەی ماڵەکە ئەبەن؛ مەسئەلەکە لە دوازدەیە، بەهۆی زەربکردنی چوارەوە لە سێ و زیاد ئەکرێ بۆ سیازدە بەش؛ کچەکە، شەش بەش و مێردەکە، سێ بەش و باوك و دایکەکەیش، یەکی دوو بەش ئەبەن و کوڕی کوڕەکە خوشکەکەی ئەکا بە عەسەبە، جا هەردووکیان بێبەش ئەبن بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن فەرزەکان ماڵەکەیان هەموو داگرتووە وە ئەگەر ئەوکوڕە خوشکەکەی نەکردایە بە عەسەبە، شەش یەکێکی بۆ دائەنرا و ژمارەی مەسئەلەکە زیاد ئەکرا بۆ پازدە، وا دەرکەوت کە کوڕەکە خۆی بێبەشەو بوویش بەهۆی بێبەشبوونی خوشکەکەی.

## باسی میراتی ئەولادو ئەولادی ئەولاد

کەسێك بمرێ و هەر کوڕی ببێ، یەك یا زیاتر، یا کوڕ و کچی ببێ، ئەوە هـەموو ماڵەکەی ئەبەن و لە بەشکردنا کوڕ دوو ئەوەندەی کچی ئەدرێتێ وە ئەگەر هەر کچی هەبوو، ئەوە تاقە کچێك نیوەی ماڵ ئەباو دوو کچ و زیاتر لە دوو کچ، دوو سـێ یـەك ئەبەن؛ یەعنی ماڵەکە ئەکرێ بە سێ بەشەوەو دوو بەش لەو سێ بەشە ئەبەن. ئەولادی کوڕیش ئەگەر هەر خۆیان بن، وەك ئەولادی مردووەکەن وە ئەگەر ئەولادی خۆی و ئەولادی ئەولاد کەوتنەیەك، ئەوە بۆ هەر تاقمێك چوار سوورەت هەیە، چونکی یا هەر کوڕن، یا کوڕو کچن، یا تاقە کچێکە، یا چەند کچێکە؛ زەربی چوار لە چوار ئەکاتە شازدە.

جا ئەگەر ئەولادی مردووەکە هەر کوڕ بوو، یاخود کوڕ و کچ بوو، ئەوە ئەولادی ئەولاد بە هەر چوار سوورەتیانەوە ئەکەون و هیچیان بەرناکەوێ، ئەمە هەشت سوورەت وە ئەگەر مردووەکە تاقە کچێکی بوو، نیوەی ماڵەکە ئەبا؛ جا لەم وەختەدا، ئەگەر ئەولادی ئەولاد هەر کوڕ بوون، یاخود کوڕو کچ بوون، باقی ماڵەکە ئەبەن و بە ئوسوولی عەسەبات، لەبەینی خۆیانا بەشی ئەکەن وە ئەگەر هەر کچی هەبوو، یەکێك یا زیاتر، ئەوە ئەوانیش شەش یەکی ماڵەکە ئەبەن و لەگەڵ بەشی کچی مردووەکەدا، ئەگات بە دوو سێ یەك و سێ یەکەکەی تری ئەدرێ بە «بیتُ‌المال»، یاخود دابەش ئەکرێتەوە بەسەر هەردوو تاقمەکەدا، وەك لەمەوپاش باسی ئەکەین؛ وا لێرەیشدا چوار سوورەت تەواو بوو، ئەمە دوانزە.

وە ئەگەر ئەولادی مردووەکە دوو کچ بوون یا زیاتر، ئەوە ئەمانە دوو سێ یەکی ماڵەکە ئەبەن؛ ئەمجار ئەگەر ئەولادی ئەولاد هەر کوڕ بوون یا کوڕو کچ بوون، باقی ماڵەکە ـکە سێ یەکە ـبە تەعسیب وەرئەگرن وە ئەگەر هەرکچ بوون، کەم یا زیاد، ئەوە بە قەتعی هیچیان دەس ناکەوێ، مەگەر لە خواریانەوە کوڕێك یا زیاتر بێ کە ئەبێ بە کوڕی کوڕی کوڕی مردووەکە، ئەوە ئەم کوڕە کچی کوڕەکە ـکە لە ژوور خۆیەوەیەتی ـ ئەکا بە عەسەبە و بە ئوسوولی عەسەبات، ئەو ئەندازە ماڵە لەبەینی خۆیانا دابەش ئەکەن؛ لێرەشدا وا چوار سوورەت تەواو بوو، ئەمە هەر شازدە سوورەتەکە.

ئەم ئوسوولە کە لە بەینی ئەولادی مردووەکەو ئەولادی ئەولادیا باسمان کرد، جاری ئەبێ لەبەینی هەموو دووچینێکی بەرەوژوور یا بەرەوخواردا لە ئەولادی ئەولاد، وە ژووروووەکە، وەکوو ئەولادی مردووەکە و خوارووەکە، وەکوو ئەولادی ئەولاد وەهایە و هەموو سوورەتە پێشووەکانیان تیا تێ‌ئەپەڕێ. ئەبێ ئەوەش بزانین کە نێرینەی ئەولاد، هاوپایەی خۆی ئەکا بە عەسەبە، هەروەها ژنێکیش کە لە ژووریەوە بێ، ئەگەر لە فەرز بەش‌دار نەبێ، بەمڕەنگە کە لە ژووریەوە دوو کچ یا زیاتر هەبێ.

## باسی میراتی باوك و دایك و باپیرە

ئەگەر باوکی مردووەکەکەسی لەگەڵدا نەبوو لە ئەولاد و ئەولادی ئەولاد، ئەوە هەر بە تەعسیب ماڵ ئەبا، هەمووی یا چی‌مایەوە، لە بەشدار وەری‌ئەگریٚ وە ئەگەر ئەولاد یا ئەولادی نێرینەی لەگەڵدا بوو، هەر بە فەرز بەش ئەبا وە ئەگەر هەر کچی لەگەڵدا بوو یا کچی کوڕ، ئەوە بە فەرزیش و بە تەعسیبیش بەش ئەبا، یەعنی شەش‌یەکی ماڵەکە ئەبا بە فەرز و لەپاش بەشی کچەکەیش، هەرچی مایەوە بە تەعسیب ئەیبا؛ کەواتە، لە مەسئەلەی باوك و کچێکا، ئەسڵی مەسئەلە لە شەشە و باوکەکە بەشێك و کچەکە سیٚ بەش ئەبەن، دوو بەش ئەمێنێتەوە، ئەویش هەر باوکەکە ئەیبا بە تەعسیب.

دایکی مردوویش، یا سیٚ‌یەکی میراتەکە ئەبا یا شەش‌یەکی، وەکوو باسمان کرد، بەڵام ئەگەر لەگەڵ باوکی مردووەکەو مێردیا، یاخود لەگەڵ باوکی و ژنیا کەوتە یەك، ئەوە بۆ ئەوەکە باوکەکە دوو ئەوەندەی ئەوی دەس بکەویٚ، ئەم دایکە سیٚ‌یەکی ئەوە ئەبا کە لەپاش فەرزی مێردەکە، لە مەسئەلەی یەکەمدا وە لەپاش فەرزی ژنەکە، لە مەسئەلەی دووهەما، ئەمێنێتەوە.

کەواتە، مەسئەلەی یەکەم لە شەشە، چونکی بەشی مێردەکە نیوەیەو بەشی دایکەکەیش سیٚ‌یەکی نیوەیەو مەخرەجی سیٚ‌یەکی نیوە، شەشەو بەشی مێردەکەی لەناوایە و لەو شەشە، مێردی مردووەکە سیٚ بەش ئەباو دایکەکەی بەشێك، چونکە سیٚ‌یەکی نیوەکە کە ماوەتەوە یەکە و باوکەکەیش، دوو بەش ئەبا.

مەسئەلەی دووهەمیش لە دوانزەیە، چونکە بەشی ژنەکە چواریەکەو بەشی دایکەکە سیٚ‌یەکی چواریەکە باقییەکانە، مەخرەجی سیٚ‌یەکی چواریەکەکان، دوازدەیەو چوار لەناو دوازدەدایە، سیٚ بەشی -کە چواریەکی ماڵەکەیە- بۆ ژنەکەو سیٚ بەشی کە سیٚ‌یەکی نۆ بەشە، باقییەکەیە بۆ دایکەکەیەو شەش بەشیش بۆ باوکەکەیە.

ئەم مەسئەلانە پێیان ئەڵێن: «عُمَرِیَّتَیْن» و «مِنْبَرِیَّتَیْن» و «غرّاوین»، چونکە حەزرەتی عومەر -خوای لیٚ رازی بیٚ- حوکمی تیا داون و حوکمەکەشی لەسەر مینبەرەوە داوەو

زۆریش مەشهوور بووە لەدنیادا؛ فەلسەفەکەشی هەر ئەوەیە کە باوکەکە دوو ئەوەندەی دایکەکە ببا و ناوبردنی بەشی دایکەکە بە سێ یەکی ئەوەی ئەمێنێتەوە، هەر لەبەر ئەدەب و ریعایەتکردنی لەفزی قورئانی پیرۆزە، ئەگینا بەشەکەی لە یەکەمدا شەش یەك و لە دووهەمدا چواریەکە.

باپیرەیش، وەکوو باوك وایە لە هەر سێ حاڵە پێشووەکەدا، تەنها لەوەدا نەبێ کە باوك، براو خوشکی باوکی و دایکی یا باوکی بێبەش ئەکا، بەڵام باپیرە بێبەشیان ناکاو ماڵەکەیان لەگەڵدا بەش ئەکا و باوکی مردووەکە لە مەسئەلەی «غراوین»دا، دایك لە سێ یەکی ماڵەوە ئەگێڕێتەوە بۆ سێ یەکی باقی لە فەرزی ژن یا مێرددا، بەڵام باپیرە ئەو هێزەی نییەو دایکی مردووەکە لەو دوو مەسئەلەیەدا، سێ یەکی ماڵەکە ئەبا.

## باسی میراتی دەوروپشت (حَواشی)

براو خوشکی باوکی و دایکی، ئەگەر هەر خۆیان بن، ئەوە حوکمیان وەکوو ئەولادی مردووەکە وایە؛ هەروەها، ئەگەر براو خوشکی باوکیش بن، ئەوانەیش وەکوو ئەولادی مردووەکەن و لە حوکمدا، وەکوو براو خوشکی دایکی و باوکی وان، مەگەر لە مەسئەلەی «مشركة»دا کە ـ وەك وتمان ـ بریتییە لە مێردێك و دایك و دوو برای دایکی و برایەکی باوکی و دایکی؛ لەم مەسئەلەیەدا، مێردەکە نیوەو دایك شەش یەك ئەبا و دوو برا دایکییەکە سێ یەك ئەبەن، ئەم مەسئەلەیە لە شەشە: نیوەی بۆ مێردەکەیەو شەش یەکی بۆ دایکەکەیەو سێ یەکی کە دوو بەشە بۆ دوو برا دایکییەکەیە و برا باوکی و دایکییەکە بێبەش ئەبێ بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانیتر هەموو میراتەکەیان گرتووەتەوە؛ جا ئەم برای باوکی و دایکییە، ئەڵێ بە دوو برا دایکییەکەی وا بزانن باوکی من بەردێکە و فڕێ دراوەتە بنی ئاوەوە، خۆ من هیچ نەبێ بە دایك براتانم و لەگەڵتانم و ئەبێ لەو سێ یەکەدا بەشدار بم لەگەڵتان، ئەوانیش بەشداری ئەکەن؛ جا لەبەر ئەوە کە ئەو دوو بەشە بەش ناکرێن بەسەر سێ کەسدا، زەربی سێ ئەکەین لە شەش ئەبێ بە هەژدە، بۆ مێردەکە نۆ بەش و بۆ دایکەکە سێ بەش و بۆ هەرکام لە سێ براکەیش دوو بەش؛ ئەم مەسئەلەیە، بە موناسەبەی میسالەکەوە کە هێنامانەوە، پێی ئەڵێن: «يَميّة» یا «حَجَرِيَّة».

وە ئەگەر ئەم دوو تاقمە کەوتنەیەك، ئەو کاتە براو خوشکە باوکی و دایکییەکـان، وەکوو ئەولادی مردووەکە و براو خوشکە بـاوکییەکـان، وەکـوو ئـەولادی ئـەولاد تەماشایان ئەکریٚ و شازدە سوورەتە پێشووەکەیان تیا جاری ئەبیٚ، وەکوو لە ئەولاد و ئەولادی ئەولادا باسمان کرد. جا ئەگەر باوکی و دایکییەکان نێرینەیان تیا هەبوو، ئەوە باوکییەکان هەموو بیٚبەش ئەبن وە ئەگەر باوکی و دایکییەکە یەك ژن بوو، نیوەی ماڵەکە ئەباو ئەوی تری ئەدریٚ بە باوکییەکان، ئەگەر نێرینەیان تیا هەبیٚ، ئـەگـینا ئـەمانیش شەش یەك وەرئەگرن و باقی میراتەکە یا ئەدریٚ بە «بیتُ‌المال» یا ئەگێڕرێتەوە بۆ سەر هەردوو چین، بەپێی بەشەکەیان وە ئەگەر باوکی و دایکییەکان دوو ژن یا زیاتر بوون، دوو سیٚ یەکی میراتەکە ئەبەن؛ جا باوکییەکان ئەگەر نێرینەیان تیا هەبوو، باقی میراتەکە ئەبەن، ئەگینا بیٚبەش ئەبن لە میراتەکەو باقییەکەی ئەدریٚ بە «بیتُ‌المال» یا ئەگێڕرێتە دواوە بۆ سەر خوشکەباوکی و دایکییەکان وە ئەگەر ئەم خوشکە باوکییانە برازایـان هەبوو، ئەو برازایە ئەوان ناکا بە عەسەبە، بەڵکوو خۆی ئەوەی لە دوو خوشکە باوکی و دایکییەکان ئەمێنێتەوە ئەیبا بۆ خۆی، بەڵام لە زەنجیرەی ئەولادی ئەولادا، کوڕی کوڕی کوڕ، وەکوو خوشکی خۆی ئەکا بە عەسەبە، لای ژوورووی خۆیشی، وەکوو پووری خۆی بە قەتعی ئەیکا بە عەسەبە لە کاتێکدا کـە بـەشی نـەبیٚ لە دوو سیٚ یەکدا، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

ئەولادی دایك، یەکە یەکە شەش یەك ئەبەن و دوو یا زیاتر لە دوو سیٚ یەکی ماڵ ئەبەن و براو خوشك، لێرەدا وەکوو یەك بەش ئەبەن، بە بیٚ زیاد وکەم و خوشکی باوکی و دایکی یا خوشکی باوکی، ئەبن بە عەسەبە لەگەڵ کچی مردووەکەدا یا لەگەڵ کچی کوڕیا؛ کەواتە، خوشکی باوکی و دایکی لەگەڵ کچا یا لەگەڵ کچی کوڕا، براو خوشکی باوکی بیٚبەش ئەکەن لە میرات.

کوڕانی برای باوکی و دایکی یا برای باوکی، وەکوو باوکیان وان بە تاقم تـاقم و لەکاتی کۆبوونەوەی تاقمێك لەگەڵ تاقمێکی تریشا، بەڵام ئەوەندەیان فەرق هەیە لەگەڵ باوکیان ئەمان دایکی مردووەکە لە سیٚ یەکەوە دانا پەڕێنن بۆ شەش یەك و لەگەڵ باپیرا

میرات وەرناگرن و لە مەسئەلەی «مشركة»دا، هەرچەند کوڕی برای باوکی و دایکیش بن، بەش نابەن و خوشکی خۆیشیان ناکەن بە عەسەبە، چونکە کچی بـرا لە «ذَواتُ الأَرْحام»ە.

هەروەها، مامی باوکی و دایکی، وەکوو برای باوکی و دایکی وە مامی باوکی، وەکوو برای باوکی وایە، چ بە تەنها بن و چ هەردوو تاقمەکە بکەونەیەك، هەروەها ئامۆزای نێرینە و مامی باپیرەو بەرەوژوورتریش، هەروەکوو لەمەوپێش وتمان.

«عەسەبە» بە شەخسێك ئەڵێن لەوانەکە بە ئیجماع میرات وەرئەگرن و ئەندازەی بەشیان مەعلووم نەکراوە؛ ئەمانە، ئەگەر خاوەن فەرزیان لەگەڵدا نەبوو، هەموو میراتەکە ئەبەن، ئەگینا هەرچی لەوان مایەوە وەری‌ئەگرن.

## باسی میراتی باپیرە لەگەڵ براو خوشکدا

هەرکاتی باپیرە لەگەڵ براو خوشکی باوکی و دایکی‌دا یا لەگـەڵ بـراو خـوشکی باوکیدا کەوتنە یەك، ئەوە ئەگەر خاوەن فەرزیان لەگەڵ‌دا نەبوو، کام بەشی زۆرترە لە سێ‌یەکی هەموو میراتەکە یا لە برابەشی لەگەڵیانا، ئەیبا. ئەوەش بزانین کە برایەك بە دوو خوشك ئەژمێررێ.

جا ئەگەر ژمارەیان کەمتر بوو لە دووقاتی باپیرەکە، ئەوە برابەشی، قازانجی زۆرترە؛ ئەمەیش، پێنج سوورەت ئەگرێتەوە:

(یەکەم)، باپیرە لەگەڵ یەك خوشکدا؛ لێرەدا مەسئەلە لە سێیە، دوو بەش بۆ باپیرەکە و بەشێك بۆ خوشکەکە؛

(دووەم)، باپیرە لەگەڵ دوو خوشکدا؛ لێرەدا مەسئەلە لە چوارە، دوو بۆ باپیرەکەو دوو بۆ خوشکەکان؛

(سێهەم)، باپیرە لەگەڵ برایەکدا؛ لێرەدا مەسئەلە لە دووە، بۆ هەرکامیان یەکێك؛

(چوارەم)، باپیرە لەگەڵ براو خـوشکێکـدا؛ لێرەدا مـەسئەلە لە پـێنـجە، دوو بـۆ باپیرەکەو دوو بۆ براکەو یەکێك بۆ خوشکەکە؛

(پێنجەم)، باپیره لەگەڵ سێ خوشکدا؛ لێرەدا مەسئەلە لە پێنجە، دوو بۆ باپیرەو سێ بۆ خوشکەکان.

وە ئەگەر ژمارەیان دووقاتی باپیره بوو، ئەوە سێ‌یەك و برابەشی، وەکوو یەکـن؛ ئەمەیش، سێ سوورەت ئەگرێتەوە:

یەکەم، باپیره لەگەڵ دوو برادا؛ لێرەدا مەسئەلە لە سێیە، بۆ هەرکامیان یەکێك؛

دووەم، باپیره لەگەڵ برایەك و دوو خوشکدا؛ لێرەدا مەسئەلە بە ئیعتیباری برابەشی، لە شەشە، دوو بۆ باپیرەو دوو بۆ براکەو دوو بۆ دوو خوشکەکە و بە ئیعتیباری سێ‌یەك، لە سێیە، یەکێك بۆ باپیره و یەکێك بۆ براکەو یەکێك بۆ دوو خوشکەکە، ئەم یەکەیش دابەش ناکرێ، لەبەر ئەوە زەربی دوو ـکە ژمـارەی سـەریانە ـ ئـەیکەین لە ئـەسڵی مەسئەلە، ئەبێ بە شەش و دابەشی ئەکەینەوە، وەکوو وتمان؛

سێهەم، باپیره لەگەڵ چوار خوشکا؛ ئەمە بەئیعتیباری برابەشی، مەسئەلە لە شەشە، وە بە ئیعتیباری سێ‌یەك، لە سێیە، یەکێك بۆ باپیرەو دوو بۆ چوار خوشکەکە، کە بەش ناکرێ و بەش و خاوەن‌بەش موتەوافیقن؛ نیوەی ژمارەی سەریان کـە دووە زەربـی ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکە سێ‌یە ئەبێ بە شەش، ئەمجار وەك وتمان دابەشی ئەکەین بەسەریانا.

وە ئەگەر ژمارەیان لە دوو قات زیاتر بوو، کە سوورەتی ئەمەیش ناژمێررێ؛ سێ‌یەك بۆ باپیره باشترە وەك ئەوەکە باپیره کۆببێتەوە لەگەڵ سێ برادا؛ لێرەدا مەسئەلە لە سێیە، یەکێك بۆ باپیرەکەو دوو بۆ سێ براکە کە بەش ناکرێ بەسەریانا، زەربی سێ ئەکەین لە سێ ئەبێ بە نۆ، سێ بۆ باپیرەو شەش بۆ سێ براکە، یەکی دووبەش.

دەلیلی وەرگرتنی باپیره بۆ سێ‌یەك، ئەمەیە کە لەگەڵ دایکی مردووەکەدا دووقاتی ئەو وەرئەگرێ؛ جا مادام براو خوشکەکان دایك لە شەش‌یەك داناپەرێنن، پێویستـە باپیریش لە دوو قاتی ئەو دانەپەرێنن وە دەلیلی برابەشیش، ئەوەیە کە ئەم باپیره وەکوو براکانە لەوەدا کە هەردوولایان بەهۆی باوکەوە ئەگەن بە مردووەکە، دەلیلی وەرگرتنی بەشە باشەکە لە سێ‌یەك و برابەشی، ئەوەیەکە باپیره خاوەنی جیهەتی فەرزو تەعسیبە و کەسێك دوو جیهەتی هەبێ، کامیانی بۆ قازانج‌تر بێ بەویانە بەش ئەبا.

وە ئەگەر خاوەن فەرزیان لەگەڵا هەبوو، ئەوە لە شەش یەکی هەموو میراتەکەو لە سێ یەکی ئەوەی لە خاوەن فەرزەکان ئەمێنێتەوەو لە برابەشی لەمەدا کە ماوەتەوە، کامیان قازانجی زۆرتر بێ ئەویانە ئەبا. دەلیلی شەش یەك بردنەکەی ئەوەیە ئەولادی مردووەکە باپیرە بێبەش ناکەن لە شەش یەك؛ کەواتە، براو خوشکەکانیش ناتوانن داپیەڕێنن لە شەش یەك، دەلیلی بردنی سێ یەکی ئەوەش کە لە فەرزەکە ئەمێنێتەوە، ئەوەتە ئەگەر خاوەن فەرز لە ئارادا نەبێ، باپیرە حەقی سێ یەکی هەیە [و] ئێستایش پاش ئەوەکە خاوەن فەرز بەشی خۆی برد، مەسئەلەکە وەکوو ئەوەی لێ دێت کە خاوەن فەرزی تیا نەبووبێ، دەلیلی بردنی برابەشیش لەپێشانا رابوورد. ئەوەش بزانین کە خاوەنبەش لێرەدا، کچەو کچی کوڕو دایك و نەنك و ژن و مێرد.

دەستووری ئەوەیش کە بزانین کام لەم بەشانە قازانجیان زۆرترە، ئەوەیە ئەگەر فەرزەکە نیوەی ماڵ بوو، یاخود لە نیوەی ماڵ کەمتر بوو، وەکوو چواریەك یا سێ یەك یا شەش یەك، ئەوە ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان کەمتر بوو لە دوو قاتی باپیرە، ئەوە برابەشی قازانجی زۆرترە وە ئەگەر لە دووقات زیاتر بوو، ئەوە سێ یەکی ئەوەی کە لەپاش فەرز ئەمێنێتەوە، قازانجی زۆرترە وە ئەگەر دووقاتی باپیرە بوو، هەردوولا وەکوو یەکن، وەکوو بەیانی ئەکەین.

**میسالی بەشی یەکەم:** باپیرە لەگەڵ کچێك و برایەك؛ کچەکە نیوە ئەبا، مەسئەلەکە لە دووە، یەکێ بۆ کچەکەو یەکێك ئەمێنێتەوە، دابەش ناکرێ بەسەر دووکەسدا؛ زەربی دوو ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکە ئەبێ بە چوار، دوو بۆ کچەکەو دووی بۆ باپیرەو براکە، هەریەکی یەك؛ ئەگەر ویستمان بزانین بۆچی لێرەدا برابەشی بەقازانجە، ئەم مەسئەلەیە بە ئیعتیباری سێ یەکی باقی و شەش یەکیش دروست ئەکەین، جا تێ ئەگەین؛ مەسەلا، لێرەدا مەخرەجی سێ یەکی نیوەی باقی، شەشە، هەر وەك مەخرەجی شەش یەکیش شەشە؛ جا ئەگەر باپیرە شەش یەك ببا یا سێ یەکی نیوە ببا لە شەشدا، یەکێك ئەبا وە ئەگەر لەپاش فەرزەکە موقاسەمە و برابەشی بکا، یەك و نیوێك ئەبا. کە ئەم ئیشەمان بۆ سوورەتەکانی تریش کرد، وەزعەکەمان بەتەواوی بۆ ڕوون ئەبێتەوە.

**میسالی بەشی دووەم:** باپیرە لەگەڵ سێ براو کچێك؛ لەم مەسئەلەیەدا نیوە هەیە و سێ یەکی نیوەی باقی؛ مەخرەجی نیوە دووە، داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی نیوەدا کە شەشە؛ کەواتە، ئەسڵی مەسئەلەکە شەشە، سێ بۆ کچەکەو یەکێك بۆ باپیرەو دوو بۆ سێ براکە کە بەش ناکرێ بەسەریانا، زەربی-سێ ئەکەین لە شەش ئەبێ بە هەژدە، نۆی بۆ کچەکەو سێی بۆ باپیرەو شەشەکەشی بۆ سێ براکە، هەریەکی دوو بەش.

میسالێکی تر: باپیرەو سێ برا لەگەڵ دایکدا؛ لەم مەسئەلەیەدا شەش یەك هەیەو سێ یەکی شەش یەکەکانی تر هەیەکە ماونەتەوە؛ مەخرەجی شەش یەك کە شەشە داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی شەش یەکەکانا کە هەژدەیە؛ کەواتە ئەسڵی مەسئەلە هەژدەیە، سێ بۆ دایکەکەو، پێنج بۆ باپیرەکە، دەی ئەمێنێتەوە بۆ سێ براکە کە دابەش ناکرێ بەسەریانا، زەربی سێ ئەکەین لە هەژدە ئەبێ بە پەنجاو چوار، نۆ بۆ دایکەکەو پازدە بۆ باپیرەکەو سی بۆ سێ براکە، هەریەکی دە بەش.

میسالێکی تر: باپیرە لەگەڵ سێ براو ژنێك؛ لەم مەسئەلەیەدا چواریەك هەیە بۆ ژنەکەو سێ یەکی چواریەکە باقییەکان هەیە؛ مەخرەجی چواریەك داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی چواریەکەکاناکە دوازدەیە، واتە ئەسڵی مەسئەلەکە دوازدەیە، سێ بۆ ژنەکە و سێ بۆ باپیرەکەو شەش بۆ سێ براکە، هەریەکی دوو بەش.

میسالێکی تر: باپیرەو سێ براو دایك و ژنێك؛ لەم مەسئەلەیەدا چواریەك هەیە بۆ ژنەکەو شەش یەك هەیە بۆ دایکەکە، چواریەك و شەش یەك، «مُتَوافِق بالنّصف»ن، زەربی دوو ئەکەین لە شەش ئەبێ بە دوانزە، جا ئەڵێین: پاش فەرزی دایك و ژنەکە، باپیرەکە سێ یەکی حەوت بەشە باقییەکە ئەبا لە دوانزە، زەربی سێ ئەکەین لە دوانزە ئەبێ بە سی و شەش، شەش بۆ دایکەکە، نۆ بۆ ژنەکە، بیست و یەکی ئەمێنێتەوە، حەوتی بۆ باپیرەکە، چواردەی ئەمێنێتەوە، دابەش ناکرێ بەسەر سێ براکەدا، زەربی سێ ئەکەین لە سی وشەش ئەبێ بە سەدو هەشت، هەژدە بۆ دایکەکە، بیست و حەوت بۆ ژنەکە، شەست و سێی ئەمێنێتەوە، بۆ باپیرەکە بیست و یەك، وە بۆ براکان، هەریەکی چواردە بەش.

**میسالی بەشی سێهەم:** باپیرەو دوو براو کچێك؛ لەم مەسئەلەیەدا نـیوە هـەیە و سێ یەکی نیوە؛ مەخرەجی نیوە کە دووە، داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی نـیوەدا کـە شەشە، سێ بۆ کچەکەو یەکێك بۆ باپیرەکەو دوو بۆ براکان، هەریەکی یەك.

میسالێکی تر: باپیرەو دوو براو دایك؛ لەم مەسئەلەیەدا شەش یەك هەیە کە مەخرەجەکەی شەشە، داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی شەش یەکەکاندا کە بۆ باپیرەکەیە کە مەخرەجەکەی هەژدەیە، سێ بۆ دایکەکەو پێنج بۆ باپیرەکەو دە بۆ دوو براکە، یەکی پێنج.

میسالێکی تر: باپیرەو دوو براو ژنێك؛ چواریەکـی ژنـەکـە داخـڵە لە مـەخرەجی سێ یەکی چواریەکەکانی باپیرەدا کە دوازدەیە، سێ بۆ باپیرەکەو شەش بۆ دوو براکە، هەریەکی سێ وە سێ بۆ ژنەکە.

میسالێکی تر: باپیرەو دوو براو دایك و ژن؛ لەم مەسئەلەیەدا شەش یەکی دایکەکەو چواریەکی ژنەکە، «مُتوافِق بالنّصف»ن، زەربی دوو ئەکەین لە شەش دا ئەبێ بە دوازدە، ئەم دوازدەیە داخڵە لە مەخرەجی بەشی باپیرەکەدا کە بریتییە لە سێ یەکی دوازدە بەشە باقییەکەکە مەخرەجەکەی سی و شەشە، شەشی بۆ دایکەکەو نۆی بۆ ژنەکە و حەوتی بۆ باپیرەکەو ئەو چواردەکەی بۆ براکان، هەریەکی حەوت. جار بەجاریش لەم کـاتەدا شەش یەکی هەموو میراتەکەو سێ یەکی باقییەکە، وەکوو یەك ئەبن، وەکوو لە میسالی یەکەمدا.

وە ئەگەر فەرزی خاوەن فەرز، «دوو سێ یەك» بوو، ئەوە ئەگەر یەك خوشك لەگەڵ باپیرەدا بێ، برابەشی قازانجترە بۆی، ئەگینا هەر شەش یەکی میراتەکە قازانجی زۆرە.

**میسالی یەکەم:** باپیرە و خوشکێك و دوو کـچ؛ ئـەم مـەسئەلەیە لە سـێیـە کـە مەخرەجی دوو سێ یەکە، دووی بۆ کچەکان و یەکێکی بۆ باپیرەو خوشکەکە کە دابەش ناکرێ بەسەریانا، چونکە ئەبێ بکرێ بە سێ بەشەوە، زەربی سێمان کرد لە سێ بوو بە نۆ، شەشی بۆ دوو کچەکەو دووی بۆ باپیرەکەو یەکێکی بۆ خوشکەکە.

**میسالی دووەم:** کە ژمارەی نییە، وەکوو باپیرەو برایەك و دوو کچ؛ لەم مەسئەلەیەدا دوو سێ یەك و شەش یەك هەیە؛ کەواتە، مەسئەلەکە لە شەشە، چواری بۆ دوو کچەکەو یەکێکی بۆ باپیرەکەو یەکێکی بۆ براکە.

وە ئەگەر فەرزی خاوەنفەرز لە بەینی نیوەو دوو سێ یەکدا بوو، ئەوە ئەگەر ژمارەی براو خوشکەکان ئەوەندەی شەخسی باپیرەکە بوو، یا کەمتر بوو، ئەوە برابەشی قازانجی زۆرترە وە ئەگەر لەو زیاتر بوو، ئەوە شەش یەك قازانجی زیاترە.

**میسالی بەشی یەکەم:** باپیرەو خوشکێك و کچێك و ژنێك؛ کچەکە نیوە ئەباو ژنەکە هەشت یەك ئەبا، مەسئەلە لە هەشتە، چوار بۆ کچەکەو یەکێك بو ژنەکە، سێ ئەمێنێتەوە، دووی بۆ باپیرەو یەکێکی بۆ خوشکەکە.

میسالێکی تر: برایەك و کچێك و ژنێك؛ مەسئەلەکە لە هەشتە، چواری بۆ کچەکەو یەکێکی بۆ ژنەکەو سێی ئەمێنێتەوەکە دابەش ناکرێ بەسەر باپیرەو براکەدا، زەربی دوو ئەکەین لە هەشتدا ئەبێ بە شازدە، کچەکە هەشت و ژنەکە دوو و باپیرەکە سێ و براکەی سێ بەش ئەبا.

**میسالی بەشی دووەم:** باپیرەو برایەك و خوشکێك و کچێك و ژنێك؛ لەم مەسئەلەیەدا، باپیرە شەش یەك و کچەکە نیوەو ژنەکە هەشت یەك ئەبا، شەش یەك و هەشت یەك «مُتوافِق بالنّصف»ن، زەربی سێمان کرد لە هەشت بوو بە بیست و چوار، بۆ کچەکە دوازدەو بۆ ژنەکە سێ و بۆ باپیرە چوار، پێنج بەش ئەمێنێتەوە بۆ براو خوشکەکە دابەش ناکرێتەوە بەسەریانا، زەربی سێمان کرد لە بیست و چوار بوو بە حەفتاو دوو، بۆ کچەکە سی و شەش، بۆ ژنەکە نۆ، بۆ باپیرەکە دوازدە، بۆ براکە دە، بۆ خوشکەکەیش پێنج بەش. ئینسانی بەرچاو روون، ئەم میسالانە ئەکا بە سەرمەشق بۆ خۆی بۆ زانینی چۆنیەتی دابەشکردن لەمجۆرە حالانەدا.

**بزانن!** ئەمەی تا ئێستا وتمان کە باپیرە کامبەش لەو سێ بەشە قازانجی زۆرتر بێ بۆی، ئەویانە ئەبا، بۆ کاتێکە خاوەنفەرز بەشی خۆی بباو مەجالی زیاتر لە شەش یەك ببێ بۆ باپیرەکە، بەڵام لە شوێنێکا کە هەر شەش یەك بمێنێتەوە، یا کەمتر لە شەش یەك، یاخود هیچ نەمێنێتەوە، ئەوە باپیرەکە شەش یەك ئەبا، خواه بە بێ زیادکردن لە ژمارەی مەسئەلەکە (عَوْل) یا بە زیادکردنی کەمتر لە شەش یەك، یا بە زیادکردنی تەواوی ئەندازەی شەش یەك.

**میسالی یەکەم:** باپیرەو برایەك و دوو کچ و دایك؛ لێرەدا کچەکان، دوو سێ یەك ئەبەن و دایکەکە، شەش یەك و مەسئەلەکە لە شەشە، چواری بۆ کچەکـان و یـەك بـۆ دایکەکە و یەك بۆ باپیرە وە براکە بێ بەش ئەبێ بەهۆی ئەوەوە کە «ذَوی الفُـروض» هەموو بەشەکانیان داگرتووە.

**میسالی دووەم:** باپیرەو برایەك و دوو کچ و مێردێك؛ دوو کچەکە، دوو سێ یەك و مێردەکە، چواریەك ئەبا، جا لەبەر ئەوەکە سێ و چوار «مُتَبایِن»ن، زەربی سێ ئەکەین لە چوار ئەبێ بە دوانزە، هەشتی بۆ کچەکان و سێ بۆ مێردەکە، یەکێکی ئـەمێنـێتـەوە، شەش یەك تەواو ناکا، ژمارەی مەسئەلەکە ئەگەیەنینە سیازدە و دوو بەشەکە ئەدەین بە باپیرەکە وە براکە بێبەش ئەبێ بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن فەرزەکان هەموو میراتەکە دائەگرن.

**میسالی سێهەم:** باپیرەو دوو کچ و دایكو مـێردو بـرایـەك؛ ئـەم مـەسئەلەیە لە دوانزەیە، زیادی ئەکەین بۆ سیانزە بۆ تەواوکردنی بەشی دایکەکە و بۆ پازدەیش بـۆ پەیداکردنی شەش یەکی باپیرەکە و لەم ژمارەیەدا، هەشت بۆ دوو کچەکەو سـێ بـۆ مێردەکەو دوو بۆ دایکەکەو دوو بۆ باپیرەکەیەو براکە، بێبەشە بـەهۆی ئـەوەوە کـە خاوەنفەرزەکان هەموو میراتەکەیان داگرتووە و ئەیشتوانـرێ لەم سـوورەتانەدا کـە بەیانمان کردن شەش یەکی باپیرەیش لەناو فەرزەکانا لە عـەمەلیاتی دروستکـردنی مەسئەلەکانا حیساب بکرێ.

هەروەها حوکمە پێشووەکان جاری ئەبن، ئەگەر باپیرەکە لەگەڵ هەردوو تاقمەکەدا بێ، یەعنی برا و خوشکی باوکی و دایکی و برا و خوشکی باوکی وە لەکاتی بەراوردی بەشی بەسوووددا لە برابەشی و شەش یەکی میرات و سێ یەکی ئەوەی ئەمێنێتەوە، براو خوشکە باوکی و دایکییەکان، هەموو براو خوشکە باوکییەکان لەسەر باپیرەکە ئەژمێرن، جا پاش ئەوەکە باپیرە بەشی خۆی برد، خواه بە یاسای برابەشی بیبا، یاخود لەسەر ئەساسی شەش یەکی ماڵ، یا سێ یەکی باقی. ئەگەر ئەولادە باوکی و دایکییەکان هەر برا بوون، یا براو خوشك بوون، چ یەکێ بنو چ زیاتر، یاخود خوشك بوو لەگەڵ کچی

مردووەکە یا لەگەڵ کچی کوڕیا، هەرچی مایەوە لە میراتەکە هەمووی وەرئـەگـرن و ئەولادە باوکییەکان بێبەش ئەکەن وە ئەگەر بە وەزعی پێشوو نەبوون، ئەمجار ئەگەر ئەولادە باوکی و دایکییەکان هەر ژن بوون، ئەوە ئەگەر یەك کەس بوون، جارجار نیوەی ماڵی دەس ئەکەوێ و هەندێ جار کەمتر لەنیوە وە ئەگەر دوان بوون، یا زیاتر لە دوو، هەندێجار دوو سێ یەك وەرئەگرن و هەندێجـار کـەمتر لە دوو سـێ یـەك و ئـەمە، بەکورتی چوار بەشەکە وا باسیان ئەکەین:

بەشی یەکەم: باپیرەو خوشکێکی باوکی و دایکی و خـوشکێکـی بـاوکی؛ لەم مەسئەلەیەدا برابەشی قازانجی زۆرترەو مەسئەلەکە لە چوارە، دوو بۆ باپیرەکە و دوو بۆ خوشکەکان، بەڵام خوشکە بـاوکی و دایکـییەکـە بـەشی خـوشکە بـاوکییەکـەیش وەرئەگرێتەوە بۆ خۆی و نیوەی ماڵەکەی دەست ئەکەوێ.

میسالێکی تر: باپیرەو خوشکێکی باوکی و دایکی و برایەکی باوکی؛ لەم میسالەیشدا، برابەشی بەقازانج ترە، مەسئەلەکە لە پێنجە، دووی بۆ باپیرەکەو یەکێك بۆ خوشکەکەو دوو بۆ براکە، بەڵام خوشکەکە بۆ تەواوکردنی نیوەی میراتەکە بەش و نیوێك لە براکە ئەسێنێتەوەو نیوبەش بەجێ ئـەهێڵێ بـۆ ئـەو؛ کـەواتـە، لەم مـەسئەلەیەدا یـەكبەش ئەشکێتەوە بەسەر دووکەسدا[١]؛ جا بە ناچاری، دوو زەرب ئەکەین لە پێنج ئەبێ بە دە، چواری بۆ باپیرەکەو پێنجی بۆ خوشکەکەو یەکێکی بۆ براکە.

میسالێکی تر: باپیرە و خوشکێکی باوکی و دایکـی و دوو خـوشکی بـاوکی؛ لەم میسالەیشدا برابەشی قازانجی زۆرترە؛ کەواتـە، مـەسئەلەکـە لە پـێنـجە، دووی بـۆ باپیرەکەو یەکێکی بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکە و دووی بۆ دوو خوشکە باوکییەکە، بەڵام خوشکە باوکی و دایکییەکە بەش و نیوێکیان لێ ئەسێنێتەوە بۆ وەرگرتنی نیوەی میراتەکە و نیوبەش ئەهێڵێتەوە بۆ ئەو دوو خوشکە باوکییە، جا لەبەر ئەوە کە نیوەی بەشی دووەم لەم دوو بەشە بەتەنها بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکەیەو نـیوەیشی بـۆ هەردوو خوشکە باوکییەکەیە، ئەم خوشکە باوکی و دایکییە بەنیسبەت ئەوانەوە وەکوو

---

١. واتە: بەشی پێنجەم کە یەکێکە، نیوەی ئەگەڕێتەوە بۆ خوشکەکەو نیوەی حەقی براکەیە.

برای لێ هات؛ کەواتە، ئەڵێین: بەشێك شکاوەتەوە بەسەر چوار کەسداو زەربی چوارمان کرد لە پێنج بوو بە بیست، هەشتی بۆ باپیرەکەو دەی بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکەو دووی بۆ خوشکە باوکییەکان، هەریەکی یەکێ.

میسالێکی تر: باپیرەو خوشکێکی باوکی و دایکی و برایەك و دوو خوشکی باوکی؛ لەم مەسئەلەیەدا سێ یەك بۆ باپیرە بەقازانجترە، وە لەبەر ئەوە خوشکە باوکی و دایکییەکە تا ئەگا بە نیوەی ماڵ دایئەنێین بە خاوەن فەرز، زەربی سێ ئەکەین لە دوو ئەبێ بە شەش، دوو بۆ باپیرەو سێ بۆ خوشکەکەو یەکێکی ئەمێنێ کە دابەش ناکرێ بەسەر براو خوشکەکانا، زەربی چوار ئەکەین لە شەش ئەبێ بە بیست و چوار، هەشتی بۆ باپیرەکەو دوانزەی بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکەو دووی بۆ برا باوکییەکەو دووی بۆ دوو خوشکەکە، هەریەکی یەکێ.

میسالێکی تر: باپیرەو خوشکێکی باوکی و دایکی و برایەك و خوشکێکی باوکی؛ لەم میسالەدا سێ یەك بەقازانجترە بۆ باپیرەکە، تەماشای سێ یەکەکە ئەکەین لەگەڵ نیوەداکە بە تەقدیر بۆ خوشکەکە دائەنرێ، مەسئەلەکە لە شەشە، دووی بۆ باپیرەو سێی بۆ خوشکەکەو یەکێکی بۆ خوشك و براکە کە بەش ناکرێ بەسەریانا، زەربی سێ ئەکەین لە شەش ئەبێ بە هەژدە، شەشی بۆ باپیرەکەو نۆی بۆ خوشکەکەو دووی بۆ براکەو یەکێکی بۆ خوشکەکەی.

میسالێکی تر: باپیرەو خوشکێکی باوکی و دایکی و برایەك و خوشکێکی باوکی لەگەڵ دایکدا؛ لەم میسالەدا برابەشی و سێ یەکی ئەوەی لەپاش فەرزی دایکەکە ئەمێنێتەوە، هەردووکیان وەکوو یەکن، لەم مەسئەلەیەدا نیوەتەقدیرییەکەی خوشکەکە داخڵە لە شەش یەکی دایکەکەدا و ئەم شەش یەکە داخڵە لە مەخرەجی سێ یەکی شەش یەکەکانی باپیرەکەدا کە هەژدەیە، سێ بۆ دایك و نۆ بۆ خوشکەکەو پێنج بۆ باپیرەکەو یەکێك بۆ براو خوشکەکان کە دابەش ناکرێ بەسەریانا، زەربی سێ ئەکەین لە هەژدە ئەبێ بە پەنجاو چوار، نۆی بۆ دایکەکەو پازدە بۆ باپیرەکەو بیست و حەوت بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکەو دوو بۆ براکەو یەکێك بۆ خوشکەکەی.

میسالێکی‌تر: باپیرەو دایك و خوشکێکی باوکی و دایکی و دوو براو خوشکێکی باوکی؛ لەم میسالەدا سێ یەکی باقی باشترە بۆ باپیرەکە، چونکە فەرز لە نیوە کەمترەو ژمارەی براو خوشکەکان لە دوو قاتی باپیرە زیـاترە، لەم مـەسئەلەیەدا شـەش‌یەك و نیوەتەقدیرییەکەی خوشکەکە و سێ یەکی شەش‌یەکە باقییەکـانی بـاپیرەیش هـەیە؛ کەواتە، مەسئەلە لە هەژدەیە، سێ بۆ دایکەکەو پێنج بۆ باپیرەکەو نۆ بۆ خوشکە باوکی ودایکییەکە، یەکێك ئەمێنێتەوەکە دابەش ناکرێ بەسەر پێنجەکەسدا، زەربی پێنج ئەکەین لە هەژدە ئەبێ بە نەوەد، پازدەی بۆ دایکەکەو بیست و پێنجی بۆ باپیرەکەو چل و پێنجی بۆ خوشکە باوکی‌و دایکییەکەو چواری بۆ دوو براکەو یەکێکی بۆ خوشکەکە.

**بەشی دووهەم:** وەك باپیرەو ژنێك و خوشکێکی باوکی و دایکی و خوشکێکی باوکی؛ ئەم مەسئەلەیە لە چوارە کە مەخرەجی فەرزی ژنەکەیە، یەکێکی بۆ ژنەکە و دووی بۆ باپیرەکەو دووی بۆ خوشکە باوکی ودایکییەکەو خوشکە باوکییەکە، بێ‌بەشە.

**بەشی سێهەم:** وەك باپیرەو دوو خوشکی باوکی و دایکی و برایەکی باوکی؛ لەم سوورەتەدا برابەشی بە قازانجترەو لەگەڵ سێ یەکیشدا موساوییە. جا بـە ئـیعتیباری برابەشی، مەسئەلەکە لە شەشە، دووی بۆ باپیرەکەو چواری بۆ دوو خوشکە باوکی و دایکییەکەکە ئەکاتە دوو سێ یەکی میراتەکە و بە ئیعتیباری سێ یەك، مەسئەلەکە لە سێیە، یەکێکی بۆ باپیرەکەو دووی بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکان و برا باوکییەکە، بێ‌بەشە.

**بەشی چوارەم:** وەك باپیرەو دوو خوشکی باوکی و دایکی و خوشکێکی باوکی؛ مەسئەلەکە لە پێنجە، دووی بۆ باپیرەو سێی بۆ خـوشکە بـاوکی و دایکـییەکـان کـە کەمتریشە لە دوو سێ یەك و خوشکە باوکییەکە، بێ‌بەشە.

**بزانن!** هەرگیز هیچ لە دوو سێ یەك زیاد نامێنێتەوە بۆ ئەولادە باوکییەکان، لەبـەر ئەوە ئەگەر برابەشی زیاتر بێ لە سێ یەك، ئەوە دیارە کەمتر لە دوو سێ یەك ئەمێنێتەوە وە ئەگەر سێ یەك قازانج بێ بۆی، ئەوە هەر دوو سێ یەك ئەمێنێتەوە؛ بەڵێ، وا ئەبێ شتێ لە نیوەی ماڵ زیاد ئەبێ‌و ئەمێنێتەوە لە خوشکە باوکی و دایکییەکـە، ئـەوە ئـەدرێ بـە ئەولادە باوکییەکان، وەکوو لەمەو پێش لە هەندێ میسالدا باس کرا.

**بزانن!** خوشکی مردوو لەگەڵ باپیرەدا فەرزی بۆ دانانرێ، ئەگینا لازم ئەبێ لە باپیرە زیاتر بەرێ و لە واقیعیشدا ئەم باپیرەو خوشك و برایانە، وەکوو کۆمەڵێك براو خوشك وانە کە کەوتبنەیەك و ئەو نیوەی ماڵە یا ئەو دوو سێیەکە کە لە هەندێ شوێنا پێیان ئەدرا، لەسەر ئەساسی خاوەن فەرزی و فەرز وەرگرتن نەبوو، ئەگینا هەرگیز لەو بەشە نەئەهاتنە خوارەوە، بەڵکوو لەسەر ئەو ئەساسە بوو مادام باپیرە بەشی راستی خۆی وەرگرت و ئەولادی باوکیش بێبەش ئەکرێ لەگەڵیانا، چاکوایە کە بەشەکەی ئەوان وەربگرن بۆ خۆیان، بەتایبەتی کە بەهۆی ئەوەوە وەختی خۆی ئەمانە خاوەنفەرز بوونو بەشیان دراوە.

بەڵێ مەسئەلەیەك هەیە لەو مەسئەلەیەدا خوشك فەرزی بۆ دائەنرێ، ئەگینا یا ئەبێ باپیرە لە فەرزی خۆی داپەڕێ، یا شەخسێکی خاوەنفەرز بێبەش بکرێ بە بێدەلیل و ئەو مەسئەلەیە، بریتییە لە باپیرەو دایك و مێرد و خوشکێکی باوکی و دایکی یا هەر باوکی؛ لەم مەسئەلەیەدا شەش یەك دائەنرێ بۆ باپیرە، لەبەر ئەوەکە ئەگەر بە عەسەبەی دابنێین، خوشکەکەیش لەگەڵ خۆیدا ئەکا بە عەسەبە و بەشی باپیرە لە شەش یەك کەمتر ئەبێتەوە و ئەمەیش پێچەوانەی نەسسی ئایەتە، جاکە ئەومان بە خاوەنفەرز دانا، فەرز بۆ خوشکەکەیش دائەنێین، چونکە لە ئایەتدا خاوەنفەرزە و قابیل نییە بەهۆی «استِغْراق» گرتنەوەی میراتەوە بێبەش بکرێو هیچ بەشێکی بۆ دانەنرێ.

جا لەم مەسئەلەیەدا، باپیرە شەش یەك و دایك سێیەك و مێردەکە نیوەو هەروەها، خوشکە دایکی وباوکییەکەیش نیوە ئەبا؛ کەواتە، ئەسڵی مەسئەلە لە شەشە و بە «عَوْل» (زیادکردن) زیاد ئەکرێ بۆ نۆ، لەم ژمارەیە، سێی بۆ مێردەکەو دووی بۆ دایکەکەو یەکێکی بۆ باپیرەکەو سێی بۆ خوشکە باوکی و دایکییەکەیە، ئەمجا لەبەر ئەوەکە باپیرە لەگەڵ ئەو خوشکەدا وەك براو خوشك وایە، ئەبێ بە ئوسوولی کۆبوونەوەی عەسەبات، ئەو یەك بەشەی باپیرەکە لەگەڵ سێ بەشەکەی خوشکەکە دابەش بکرێ بەسەریانا و لەبەر ئەوەکە چوار ئەشکێتەوە بەسەر سێ کەسدا، زەربی سێ ئەکەین لە نۆ ئەبێ بە بیست و حەوت، نۆی بۆ مێردەکەو شەشی بۆ دایکەکەو دوازدەی ئەمێنێتەوە، هەشتی بۆ باپیرەو چواری بۆ خوشکەکە.

بەکورتی، لەپێشەوە تەماشای فەرزمان بۆ کردن، چونکە ئەگەر تەماشای تەعسیبمان بکردایە، باپیرەکە لە شەش یەکی خۆی کەمتری بۆ ئەمایەوە و لەپاش فەرزیش تەماشای تەعسیبمان کرد، بۆ ئەوە کە باپیرە دووقاتی خوشکەکە ببا.

ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لەجیاتی خوشکەکە برایەك بوایە، ئەوە بەهۆی داگرتنی میراتەکەوە لەلایەن خاوەنفەرزەکانەوە، بێبەش ئەبوو و هیچی دەس نەئەکەوت.

وا مەشهوورە ئەوکەسەی پرسیاری لەم مەسئەلەیە کردووە، ناوی «اَکْدَر» بووە، بۆیە مەسەلەکە ناونراوە «أَكْدَرِيّة»؛ هەندێکیش ئەڵێن: لەبەر ئەوە کە ئەم جۆرە میرات پێ گەیاندنە تاریکەو بووە بەهۆی ئەوە کە ئوسوول‌و دەستووری "زیدی کوڕی سابت" -خوای لێ رازی بێ- لە «عیلمی فەرائیز»دا لێڵ و تاریك ببێ لەبەر چاوی، ئەم ناوەی بەسەردا بڕراوە.

## باسی کۆبوونەوەی جیهەتی فەرزو تەعسیب و دوو جیهەتی فەرز و دوو عەسەبەکە یەکێکیان جیهەتی فەرزیشی ببێ

ئەگەر کەسێك جیهەتی فەرزو جیهەتی عەسەبەیی تیابوو، ئەوە بە هەردوو جیهەتەکە میرات ئەبا، وەکوو مێردێك کە ئامۆزای ژنەکەی بێ، ئەوە نیوەی میراتەکە بە فەرز و نیوەکەیتری بە جیهەتی عەسەبەیی وەرئەگرێ، بەڵام کەسێك کە تەنیا جیهەتێکی تیا بێ و هەندێجار بە فەرزو هەندێجار بە تەعسیب میراتی پێ وەربگرێ، ئەوە هەموو کاتێك بە هەردوولایان میرات وەرناگرێ، وەکوو باوك کە بەجیهەتی باوکیەتی جاروبار بە فەرزو جاروبار بە تەعسیب میرات ئەبا، ئەگەرچی لەگەڵ تەنیا کچدا بە هەردوو جیهەتەکە ماڵ وەرئەگرێ.

هەروەها ئەگەر جیهەتی تەعسیبەکە زاتی نەبێ، ئەوە هەر بە فەرز میرات ئەبا، وەکوو کچێ کە خوشکی باوکی بێ؛ مەسەلا، یەکێك بەشوبهە بڕواتە لای کچی خۆی‌و کچێکی لێ ببێ، جا کچە گەورەکە بمرێ، ئەوە کچە بچووکەکە هەرچەند کچی کچە گەورەکەیە، خوشکی باوکیشیەتی و خوشك لەگەڵ کچا ئەبێ بە عەسەبە، بەڵام

تەعسیبی زاتی نییە، بەڵکوو تەعسیبی «مَع الغَیر»ە؛ کەواتە، لەم مەسئەلەیەدا کچە بچووکەکە، هەر بە فەرزو بە جیهەتی کچیەتی میرات لە کچە گەورەکە وەرئەگرێ، وە بەجیهەتی تەعسیبی «مع الغیر» باقی میراتەکە نابا.

وە ئەگەر کەسێك دوو جیهەتی فەرزی تیا هەبێ، ئەوە کامیان بەهێزتر بێ بەویانە میرات ئەبا، هێزیش بریتییە لەوە کە یەکێکیان ئەویتریان بێبەش بکا لە میرات بە تەواوی، یا بەشە میراتی کەم بکاتەوە، یاخود جیهەتێکیان هەرگیز بێبەش یا کەمبەش نەکرێ، بەڵام ئەویان جارجار بێبەش یا کەمبەش بکرێ، یاخود هەردووکیان بێبەش بکرێن بە تەواوی، بەڵام یەکێکیان کەمتر بێبەش بکرێ.

**میسالی یەکەم لە بەشی یەکەم**، وەکوو ئەوە کە یەکێك بەشوبهە بڕواتە لای دایکی و کچێکی لێبێ ئەوجا بمرێ، ئەوە کچەکە بەجیهەتی کچیەتی میراتی لێ وەرئەگرێ نەك بەجیهەتی ئەمەکە خوشکی دایکیشیەتی، چونکە ئەولادی مردوو براو خوشکی دایکی بێبەش ئەکەن.

**میسالی دووەم لە بەشی یەکەم**، وەکوو یەکێك بەشوبهە بڕواتە لای کچی خۆی و کچێکی لێ ببێ و کابرا بمرێ و ئەم دوو کچە بەجێ بهێڵێ، ئەوە هەردوو کچەکە بەجیهەتی کچیەتی دوو سێیەکی میراتەکەی ئەبەن، ئیتر تەماشای ئەوە ناکرێ کچە گەورەکە ژنیشی بووە، چونکە جیهەتی کچیەتی بەهێزترە، بەهۆی ئەوەوەکە ئەولاد ژن کەمبەش ئەکەن و لە چواریەکەوە دای ئەپەڕێنن بۆ هەشت یەك.

**میسالی بەشی دووەم**، وەکوو ئەوە کە یەکێك بەشوبهە بڕواتە لای کچی خۆی و کچێکی ببێ لێی، ئەمجار کچەکەی بمرێ و دایکی بمێنێتەوە، ئەوە هەرچەند دایکیشەو خوشکی باوکیشە، بەڵام بەجیهەتی دایکیەتی میرات ئەبا، نەك بەجیهەتی ئەوە کە خوشکی باوکییە، لەبەر ئەوە کە دایك هەرگیز بێبەش ناکرێ لە میرات، بەڵام خوشك گەلێ جار بێبەش ئەکرێ.

**میسالی بەشی سێهەم**، وەکوو ئەوە کە ئەم کابرایە بڕواتە لای کچە بچووکەکەیشی و کچێکی لێ ببێ، جا ئەم کچە دواییە بمرێ و نەنکەکەی بمێنێتەوە کە وەکوو

نەنکیەتی، خوشکی باوکیشیەتی، ئێستە ئەوە بە نەنکایەتی میرات ئەبا نەك بەجیهەتی خوشکایەتی لەلای باوکەوە، لەبەر ئەوە هەرچەند ئەم دوانە هەردووکیان بێبەش ئەکرێن، بەڵام نەنك هەر تەنها بە دایك بێبەش ئەکرێ و خوشکی باوك بە گەلێ کەس بێبەش ئەکرێ.

بەڵێ، لەم بەشەدا ئەگەر جیهەتە خاوەنهێزەکە وەها رێکەوت بێبەش کرا، وەك ئەوە کە لەم میسالەدا دایکی مابێ و نەنکی بێبەش بکا، ئەوە ئەوکاتە بەجیهەتە بێهێزەکە وەکوو خوشکێتی باوکی بێ، میرات ئەبا، جا نەنکەکە نیوەی ماڵ ئەباو دایکەکەی سێیەك و مەسئەلەکە لە شەش ئەبێ و ئەو بەشەی کە ئەمێنێتەوە، یا ئەدرێ بە «بیتُ‌المال» یا بەنیسبەت ئەگێڕرێتەوە بۆ دایك و خوشکەکە و لەم میسالەدایە کە بەشێوەی لەغەزو مەتەڵە، ئەڵێن: «نەنکی مردووەکە نیوەی ماڵ ئەباو دایکی سێیەك.»

وە ئەگەر دوو عەسەبەی موساوی بوون و یەکێکیان جیهەتی فەرزیشی بێ، وەکوو دوو ئامۆزا کە یەکێکیان برای دایکیش بێ، ئەوە بەجیهەتی فەرزەکە بەشی خۆی ئەبا، جا باقی ماڵەکە بەموساوات لەگەڵ رەفیقەکەیدا بەش ئەکا، ئیتر ئەو جیهەتە نابێ بەهۆی بێبەشبوونی ئەو رەفیقەی، یەعنی ئەو ئامۆزایەکە برای دایکی مردووەکە نییە.

## میرات وەرگرتن لە ونبوو (مَفْقُود) و میرات وەرگرتنی ئەو

ئەگەر کەسێك بەدیل گیرا یاخود ونبوو و باس و خواسی نەما، ئەوە ماڵەکەی بەمیرات نابرێ تا بە دوو شاهید ئیسپاتی مردنی نەکرێ، یاخود ماوەیەکی وا رانەبوورێ کە باوەڕی ئینسان بێتە سەر ئەوە کە لەوە زیاتر ناژی، ئەوسا قازی ئیجتیهاد ئەکاو حوکم ئەدا بە مردنی، جا ئەگەر لە حوکمەکەیا ناوی وەختی مردنی کابرای نەبرد، ئەوە هەرکەس لەپێش ئەو حوکمەدا مردبێ، میراتی لێوەرناگرێ وە ئەگەر ناوی وەختێکی تایبەتی برد، ئەوە هەرکەس لەپێش ئەو وەختەدا مردبێ، میراتی لێ نابا و هەرکەسێ پاش ئەو وەختە مردبێ، میراتی لێوەرئەگرێ.

وە ئەگەر لەپێش حوکمکردن بەمردنیا، کەسێکی وا مرد کە کابرای ونبوو میراتی لێبیا، خواە هەموو میراتەکەی ببا یا هەندێکی ببا، ئەوە بەشی ئەو شەخسە ون بووە

هەڵئەگیرێ و هەرکەسێ حازر بێ، بە وەزعێکی چڕووك موعامەلەی لەگەڵ ئەکرێ، یەعنی هەرکەسێ بەهۆی ژیانی ونبووەکەوە بێبەش ببێ، بەشی نادەین تا وەزع ڕۆشن ئەبێتەوە و هەرکەس بەهۆی ژیانی ئەوەوە بەشی کەم ببێتەوە، وادائەنێین نەمردووە. وە هەرکەس بە هۆی مردنی ئەوەوە بەشی کەم ببێتەوە، وای دائەنێێن نەمردووە. وە هەر کەس بە هۆی مردنی ئەوەوە بەشی کەم بێتەوە وای دائەنێین مردووە. وە هەرکەس بەهۆی مردن و ژیانیەوە بەشی نەگۆڕێ، ئەوە حەقی خۆی ئەدرێتێ.

جا لە کاتێکا کە مردنی بۆ هەندێ‌کەس زەرەر بێ و ژیانی بۆ هەندێکی‌تر، پێویستە دوو مەسئەلە دروست بکەین لەسەر ئەم دوو تەقدیرە، جا ئەگەر ژمارەی مەسئەلەکان «مُتَداخِل» بوون زۆرەکەیان وەرئەگرین وە ئەگەر «مُتَوافِق» بوون، زەربی هاوجۆر (وِفق)ی یەکێکیان ئەکەین لە تەواوی ئەویانا وە ئەگەر «مُتَبايِن» بوون، زەربی تەواوی یەکێ لەوان ئەکەین لە تەواوی ئەوی‌تریانا، بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێ ئەندازەی ئیستیحقاق و ئەندازەی ڕاگیراو چەندە.

مەسەلا، ئەگەر کەسێك مرد، باپیرەو برایەکی باوکی و دایکی‌و برایەکی باوکی ونبووی لێ بەجێ‌ما، ئەوە دەرحەق بە باپیرەکە قەراری ژیان ئەدەین و لەم کاتەدا سێ‌یەك بۆ باپیرەکە باشە و مەسئەلە لە سێیە و دەرحەق بە برا باوکی و دایکییەکە قەراری مردن ئەدەین و مەسئەلەکە لە دووە، لەبەر سەری خۆی و باپیرەکە، جا زەربی دوو ئەکەین لە سێ ئەبێ بە شەش، سێی بۆ براکەو دووی بۆ باپیرەکەو بەشێکی ڕائەگرین، ئەگەر ونبووەکە مردبوو، ئەیدەین بە باپیرەکە وە ئەگەر مابوو، ئەیدەین بە برا باوکی و دایکییەکە.

وە ئەگەر ژنێك مرد، کوڕێکی ونبوو و مێردو کچێکی بەجێ‌هێشت، مادام بەهۆی کچەکەوە مێردەکەی چواریەك ئەبا، مەسئەلەکە لە چوارە، یەکێکی بۆ مێردەکەی و یەکێکی بۆ کچەکەی و دووبەشی هەڵئەگرین، ئەگەر کوڕە ونبووەکە مابوو، ئەدرێ بەو وە ئەگەر مردبوو، بەشێکی‌تر ئەدەین بە کچەکە بۆ تەواوکردنی نیوەکەی و بەشەکەیتر ئەدرێ بە «بیتُ‌المال» یاخود ئەگێڕرێتەوە بۆ کچەکە.

وە ئەگەر ژنێك مرد مێردێكی ونبوو و دوو خوشكی باوكی و دایكیو مامێكی هەبوو، ئەوە ئەگەر مێردەكەی مردبێ، مەسئەلەكە لە سێیە، كە مەخرەجی دوو سێ یەكی خوشكەكانە وە ئەگەر زیندوو بێ، مەسئەلەكە لە شەشە، بە زەربی مەخرەجی نیوە ـ كە بەشی مێردەكەیە ـ لە سێ ـ كە مەخرەجی دوو سێ یەكی خوشكەكانە ـ و بە زیادكردن (عَول)ەوە، ئەگا بە حەوت و بەدەستووری «تَعدُّد»ی مەسئەلە، زەربی سێ ئەكەین لە حەوت ئەبێ بە بیستویەك، جا دوازدە بەش ئەدەین بە خوشكەكان و نۆ بەشی هەڵئەگرین ئەگەر مێردەكەی مابوو، ئەیدەین بە ئەو و مامەكەی بە «اِستِغراق» بێبەش ئەبێ وە ئەگەر مردبوو، دووبەشی تر ئەدەین بە خوشكەكان بۆ تەواوكردنی دووسێ یەك و حەوت بەشی ئەدەین بە مامەكەی.

## باسی میراتی «حَمْل» (سكی ژن)

ئەگەر كەسێك مردو سكێكی بەجێ هێشت كە بە هەموو جۆرێ میراتی ئەبرد، وەكوو ئەولادی خۆی، یاخود لە هەندێ كاتا میراتی ئەبرد، وەكوو سكی براژنێكی كە ئەگەر كوڕ بێ، میرات ئەباو ئەگەر كچ بێ، میرات نابا، چونكی كچی برا لە «ذَواتُ الأَرحام»ە، یاخود وەكوو ژنێ بمرێ مێردو خوشكێكی باوكی و دایكی و باوەژنێكی سك پڕ بەجێبهێڵێ كە ئەگەر سكەكە كوڕ بێ، بەشی نییە، چونكی برای باوكییەو لەم مەسئەلەیەدا بە «استِغراق»ی خاوەن فەرزەكان بێبەش بووە وە ئەگەر كچ بێ، بەشی هەیە، چونكە لەگەڵ خوشكەكەدا دوو سێ یەك ئەبەن و مەسئەلەكە لە شەشە و زیاد ئەكرێ بۆ حەوت، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا دەرحەق بە سكەكە، ئەوەی «اِحتِیاط» بێ بەكار ئەهێنرێ، جا ئەگەر میراتبەر هەر سكەكە بوو، بەمڕەنگە كابرای مردوو ژنێكی تەڵاقدراوی بائینەی دووگیانی بەجێ هێشت، یاخود لەو مەیدانەدا میراتگرێك هەبوو كە بەهۆی سكەكەوە بێبەش ئەبوو، وەكوو براو خوشكی دایكی، یاخود لە هەندێ تەقدیرا بێبەش ئەكرا، وەكوو برایەك یا خوشكێكی باوكی، ئەوە ئەگەر سكەكە كوڕ بێ، ئەوانە بێبەش ئەكا وە ئەگەر كچ بێ، بێبەشیان ناكا، یاخود

بەهۆی سکەکەوە بێبەش نەئەبوو لە میرات، بەڵام خۆیشی بەشی دیاری نەبوو، وەکوو کوڕ، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا هەموو میراتەکە ماتڵ ئەکرێ تا سکەکە لەدایك ئەبێ، چونکە نازانین نێرینەیە، یا مێیینە و یەك منداڵە لە سکەکەدا، یا زیاترە و لای ژووررووی سکیش دیاری نەکراوە، چونکەڕێکەوتووە ئافرەت بە سکێك چوار یا حەوت یا دوانزە منداڵی بووە، بەڵکوو ئەگێڕنەوە کە ئافرەتێك لە بەغدا بە سکێ چل منداڵی داناوە وەکوو پەنجەی دەس و ژیاویشن.

وە ئەگەر کەسێك بەشی تەقدیرکراوی بوو، ئەوە ئەیدرێتێ، خواە زیادکردن (عَول)ی نەوێ، وەکوو پیاوێك بمرێ ژنێکی سكپڕو باوك بەجێ بێڵێ، ئەمە بە ئیعتیباری زەربی سێ لە هەشت، مەسئەلە لە بیستو چوارە، سێ بۆ ژنەکەو چوار بۆ باوکەکەو حەڤدەی ئەمێنێتەوە، جائەگەر سکەکە دووکچ یا زیاتربوو، ئەوە شازدە سەهم بۆ ئەوانە و سەهمێ بۆ باوکەکەیە، بە تەعسیب وە ئەگەر کچی بوو، ئەو دوازدە سەهم لەو حەڤدەیە بۆ ئەوە و باقی، بە تەعسیب بۆ باوکەکەیە و لە غەیری ئەم سوورەتانەدا، هەرچی مایەوە، خواە یەك کوڕ بوو یا زیاتر، یا کوڕ و کچ بن، یا خود عەولی پێویست بێ، وەکوو ئەوە کەسێ بمرێ باوك و دایك و ژنێکی دووگیانی لێ بە جێ بمێنێ، لێرەدا بڕیار ئەدەین سکەکە، دوو کچە و بە ئیعتیباری «ثُلثان» [(دوو سێیەك)] بۆ ئەوان و «ثُمْن» [(هەشت یەك)] بۆ ژنەکە، مەسئەلەکە لە بیست و چوارە، عەول ئەکرێ بۆ ژنەکە و هەشت بۆ باوك و دایکەکە، یەکی چوار و شازدەی ئەمێنێتەوە، جا ئەگەر سکەکە دووکچ بوو یا زیاتر، ئەوە حەقی خۆیانە وەری‌بگرن وە ئەگەر تاقە کچێك بوو، دوانزەی حەقی خۆیەتی و چواری وەرئەگرینەوە و لەم چوارە باقیاتی هەشت یەکی ژنەکەو شەش یەکی باوك و دایکەکە تەواو ئەکەین و هەرچی مایەوە، بە تەعسیب ئەیدەین بە باوکەکە، چونکە ئەو بەشانەی بردوویانە ئەندازەی بەشەکانیان ناتەواوە لەبەر لێ زیادکردن (عَول)، وەکوو لەمەولا باسی ئەکەین.

وە ئەگەر سکەکە کوڕ بوو بەتەنها یا لەگەڵ کچا، ئەوە حەقی خۆیانە وەری‌بگرن بە تەعسیب. درێژەدان بەمشوێنە بەمجۆرەیە: مەسئەلەکە لەگەڵ لێ‌زیادکردن (عول)دا، لە

بیست و حەوتە، ئەگەر سکەکە کچی «متعدّد»ن و یا هەر لە بیست و چوارە؛ جا بە قانوونی «تعدُّد»ی مەسئەلە، لەبەر ئەوەکە مەسئەلەکان «توَافُق»یان لەبەینایە بە سێ یەك، زەربی هەشت ئەکەین لە بیست و حەوت ئەبێ بە دوو سەدو شازدە و زەربی بەشی هەرکام لەم خاوەن فەرزانە لە هەر مەسئەلەیەکدا ئەکەین لە سێ یەکی ئەو مەسئەلەیە، بەم حیسابە ژنەکە، لە مەسئەلەی یەکەمدا سێ بەشی هەبوو، زەربمان کرد لە نۆ بوو بە بیست و حەوت و دایکەکە، چواربەشی هەبوو زەربمان کرد لە نۆ بوو بە سی و شەش، هەروەها باوکەکەیش.

وە لە مەسئەلەی دووهەمیشدا، ژنەکە سێ بەشی هەبوو، زەربمان کرد لە هەشت، بوو بە بیست و چوار و دایکەکە چوار بەشی هەبوو، زەربمان کرد لە هەشت بوو بە سی‌ودوو، هەروەها باوکەکەیش، جا لای کەمی ئەم بەشانە ـکە بیست‌و چوارە ـ بۆ ژنەکە و سی‌و دووە بۆ دایکەکە و سی‌و دووە بۆ باوکەکە، ئەدرێتە دەستی خۆیان وە ئەندازەی فەرقی بەینی بەشەکان ـکە سێ بەشە بۆ ژنەکەو چوارە بۆ باوك و چوارە بۆ دایك ـ هەڵی ئەگرین کە ئەکاتە یازدە بەش.

جا ئەگەر سکەکە کوڕ بێ بەتەنیا یا لەگەڵ کچدا، ئەوە بۆ تەواوکردنی هەشت‌یەکی ژنەکەو شەش‌یەکی باوك و دایك، یازدە بەشەکەیشیان پێ‌ئەدەین لەگەڵ بەشە پێشووەکەیانا کە تێکڕا ئەکاتە نەوەدو نۆ بەش و باقی میراتە، کەکە سەدو حەڤدە بەشە ئەیدەین بە ئەولادەکان بە تەعسیب.

وە ئەگەر یەك کچ بوو، نیوەی هەموو میراتەکە ـکە بریتییە لە سەدو هەشت بەش ـ ئەیدەینێ و عەینی نەوەدونۆ سەهمەکەیش بەشێوەی پێشوو ئەدەین بە ژن‌و دایك‌و باوکەکە و نۆ سەهم لە میراتەکە ئەمێنێتەوە، بە تەعسیب ئەیدەین بە باوکەکە.

وە ئەگەر دوو کچ یا زیاتر لە دوو کچ بن، ئەوە لەبەر ئەوەکە ئەبن بەهۆی زیادکردن (عَول) لە مەسئەلەکەدا، خاوەن فەرزەکان ئەگێڕنەوە بۆ سەر بەشەکەمەکەیان کە بریتییە لە هەشتاو هەشت سەهم، یەعنی بۆ ژنەکە، بیست‌و چوار و بۆ هەریەکێ لە دایك و باوکەکەیش، سی‌ودوو بەش و باقی میراتەکە ـکە سەدو بیست و هەشت بەشە ـ بۆ

تەواوکردنی دوو سێ‌یەکی مەسئەلەکە، وەری ئەگرن بۆ خۆیان، چونکی وەختی خۆی لە بیست و حەوت سەهمدا شازدە سەهمیان ئەبرد کە دوو سێ‌یەکی بیست و چوار بوو، ئێستەیش کە هەشت زەرب بکەین لە شازدە، ئەگا بە ژمارەی سەدو بیست‌و هەشت.

بێداربن! میرات‌بردنی سك بە دوو شەرتە:

(یەکەم)، ئەوەیە کە بە زیندوویی جیا ببێتەوە لە دایکی بەجۆرێك کە نیشانەی ژیانی بەهێزی تیادا بێ، وەکوو هاوار یا گریان یا کردنەوەو قوونجاندنی دەست؛

(دووەم)، ئەوەیە کە بزانین لە وەختی مردنی خاوەن‌میراتەکەدا بووە بەوجۆرە کە جیا ببێتەوە لە دایکەکەی لەماوەی شەش مانگەوە تا چوار ساڵ و دایکەکەی لەم‌ماوەیەدا رەفیقی مێرد نەبووبێ، یاخود لە کەمتر لە شەش مانگ لە مردنی خاوەن میراتەکەوە، خواە دایکەکەی رەفیقی مێرد بووبێ یا نە، یاخود جیا بووبێتەوە لە زیاتر لە شەش مانگ‌و کەمتر لە مافەوقی چوار ساڵدا و دایکەکەی رەفیقی مێرد بووبێ، بەڵام میرات‌بەرەکان پێ‌بنێن بە بوونی ئەو سکەدا لەکاتی مردنی خاوەن میراتەکەدا.

## میراتی نێرومێ (خُنْثى)

نێرومێ، دوو جۆرە:

یەکەم، ئەوەیە کونێکی ببێ وەکوو پەلەوەر، نە لە عەورەتی پیاو بچێ و نە لە عەورەتی ژن؛ ئەمە پێی ئەڵێن: نێرومێی سەر لێ‌دەرنەچوو (مُشكِل) و چاوەڕوانی ئەکەین تا باڵغ ئەبێ، جا پاش باڵغ‌بوون، ئەگەر حەیزی پیا هات یا سکی بوو، ئەوە ژنە، ئەگینا ئەگەر ئەیگوت: حەز لە پیاو ئەکەم، ئەوەیش هەر بە ژن دائەنرێ وە ئەگەر ئەیگوت: حەز لە ژن ئەکەم، ئەوە بە پیاو دائەنرێ وە ئەگەر حەزی لە کەسیان نەبوو، ئەوە هەر بە موشکیلی ئەمێنێتەوە.

دووەم، ئەوەیە ئالەتی پیاوو ژنی هەبێ، جا ئەگەر لەم ئالەتە پیاوانەیەوە میزی ئەکردو مەنی ئەهاتە خوارەوە، ئەوە پیاوە وە ئەگەر سکی ئەکردو حەیزی پیا ئەهات و

میزو مەنی لە ئالەتی ژنانەیەوە بوو، ئەوە ژنە وە ئەگەر لە هەردوو ئالەتەکەیەوە میزی ئەکرد، بەڵام لە ئالەتە پیاوانەکەیەوە زۆرتر دەرئەچوو، ئەوە هەر پیاوە وە ئەگەر لە ئالەتە ژنانەکەوە زۆرتر دەرئەچوو، ئەوە ژنە وە ئەگەر لە هەردوو ئالەتەکـەیەوە وەك یـەك دەرئەچوو، بەڵام حەزی لە ژن ئەکرد، ئەوە پیاوە وە ئەگەر حەزی لە پیاو ئەکرد، ئەوە ژنە وە ئەگەر حەزی لە هیچکامیان نەئەکرد، یاخود حەزی لە هەردووکیان ئـەکـرد، ئەوەیش هەر موشکیلە.

خونسا تا بە موشکیلی مابێتەوە، قابیل نییە ببێ بە باوك و باپیرە، یا بە دایك و نەنك، یا بە ژن و مێرد وە ئەگەر ئاشکرا بوو ژنە یا پیاوە، وەکوو لە هەندێ لەم حاڵانەدا کە بەیانمان کرد، ئەوە حوکمی دیارە وە ئەگەر موشکیل بوو، تەماشا ئەکەین، ئەگەر بە هیچ بارێکا میراتی نەئەگۆڕا، وەکوو ئەولادی دایکـی، ئـەوە بـەشی خـۆی بـە تـەواوی پێ ئەدرێ وە ئەگەر ئەگۆڕا، ئەوە ئەو ئەندازەیە کە یـەقینە بـەشیەتی، پـێی ئـەدرێ و باقییەکەی رائەگیرێ تا وەزعیەتی دەرئەکەوێ وە ئەگەر میراتبەری تریشی لەگەڵا بوو، ئەویش ئەوەی یەقینە پێی ئەدرێ؛ کەوا بوو، ئەگەر کەسێك بمرێ و برایەکی باوکی و ئەولادیکی دایکی خونسای هەبێ، ئەوە ئەو مەسئەلەیە لە شـەشە: شـەش یەکـی بـۆ خونساکەیە، چونکە بە هەموو تەقدیرێك شەش یەك ئەبا و ئەوی تری بۆ براکەیە.

وە ئەگەر ئەولادێکی خونساو برایەکی باوکی هەبوو، ئەوە فەرزی مناڵە خونساکە ئەکەین بە کچ و لەبەر ئەوە کە کچ نیوە ئەبا، مەسئەلەکە لە دووە، یەکێکی ئەدەین بە مناڵە خونساکەو یەکێکی رائەگرین، ئەگەر خونساکە بە کوڕ دەرچوو، ئەویشی ئەدەینێ وە ئەگەر بە کچ دەرچوو، ئەیدەین بە براکە وە ئەگەر کەسێك بمرێ کچێك و مناڵێکی خونساو مامێکی هەبێ، ئەوە خونساکە دائەنێین بە کچ، جا مادام دوو کچ ئەکەونە یەك، مەسئەلەکە لە سێیە، دوانی بۆ ئەم دوو مناڵەو یەکێکی هەڵئەگرین، ئەگەر خونساکە بە کوڕ دەرچوو، ئەوە بۆ ئەوە، ئەگینا ئەیدەین بە مامەکە وە ئەگەر ژنێك بمرێ باوك و مێرد و مناڵێکی خونسای هەبێ، ئەوە لەبەر ئەوە کە باوك شەش یەك ئەبا و مێردەکە چـواریـەك ئـەبا، مەسئەلەکە لە دوازدەیە، سێی بۆ مێردەکەو دووی بۆ باوکەکەو شەش بەش ئەدەین بە

خونساکە لەسەر تەقدیری ئەوەکەکچە و بەشێك ئەمێنێتەوە، جا ئەگەر خونساکە بەکوڕ دەرچوو، حەقی ئەوە وە ئەگەر بە کچ دەرچوو، حەقی باوکەکەیە بە تەعسیب.

## میرات وەرنەگرتن لەبەر نەبوونی شەرتی میرات

ئەگەر دوو کەس یا چەند کەسێك لەوانە کە میرات ئەبەن لە یەکتر، مردن بەجۆرێکی واکە ئاشکرا نەبێ کامیان لەپێش ئەویانا گیانی دەرچووە، وەکوو کۆمەڵێك کە لە پاپۆڕێکا بخنکێن، یا ئاو بیان با، یا بسووتێن، یا خانوو بەسەریانا بڕووخێ، یا لە غەریبیدا بمرن، یا لە کۆڕی شەڕو ئاشووبا لەناو بچن، یا بە جۆرێکی تری وا بمرن، ئەوە هیچکام لەوانە میرات لە یەکتر نابەن و ماڵی هەرکامیان ئەگەڕێتەوە بۆ میراتبەرەکانی تری خۆی، ئەگەر میراتگری هەبێ.

بەڵێ، ئەگەر زانرابوو کامیان لەپێشا گیانی دەرچووە، بەڵام لەبیر چووبووەوە، ئەوە میراتەکەی رائەگیرێ تا پێشووەکەیان دەرئەکەوێ، یاخود لەناو خۆیانا رێئەکەون؛ دەلیلی میرات نەبردنی ئەمانە، ئەوەیە شەرتی میراتبردن ئەوەیە میراتبەرەکە لەکاتی مردنی خاوەن میراتەکەدا زیندوو بێ، بە حەقیقەت یا بە حوکم.

مناڵی زۆڵیش میرات وەرناگرێ، مەگەر لە دایکی و لە براو خوشکی دایکی، ئیتر میرات لە باوکی وەرناگرێ؛ هەروەها، مناڵێکیش کە باوکی بەهۆی لەعنەت (لِعان)ەوە لە مناڵی خۆی خستبێ، ئەوەیش میرات لە باوکەکەی وەرناگرێ، چونکە مەرجی میراتوەرگرتن ئەوەیە کە نەسەب دیاری بێ؛ هەروەها، کۆمەڵێك کە لە یەك هۆز بن، بەڵام جیهەتی خزمایەتییان لەگەڵ یەك دیاری نەبێ، ئەوانەیش میرات لە یەکتر وەرناگرن.

## باسی (عَوْل) یەعنی زیادکردنی ژمارەی مەسئەلە

هەر مەسئەلەیەك خاوەنفەرزی تیا بوو، ئەوە ئەجزای فەرزەکان یا وەك یەکن لەگەڵ ئەسڵی مەسئەلەکەدا، ئەوە لەم حاڵەدا لە عەینی مەسئەلەکە خۆی بەشەکان تەواو ئەبن، وەکوو ئەوە کەسێك بمرێ دوو کچ و دایك و باپیرەی لێ بەجێ بمێنێ، مەسئەلەکە لە

شەشە و ئەجزای فەرزەکانیش شەشن، چوار بۆ دوو کچەکەو یەکێك بۆ دایکەکەو یەکێك بۆ باپیرەکە؛ هەروەها ئەگەر ئەجزای فەرزەکان کەمتر بن لە ئەسڵی مەسئەلەکەو عەسەبەیان لەگەڵدا بێ، ئەوەیش وەکوو پێویستی بە «عَوْل» (لێ زیادکردن) نییە، پێویستی بە «رد» (گێڕانەوە)یش نییە، وەکو ئەوە کە یەکێك بمرێ، کچێك و دایك و باوکی هەبێ، ئەم مەسئەلەیەیش هەر لە شەشە، سێ بۆ کچەکەو یەکێك بۆ دایکەکەو ئەوی تری بۆ باوکەکە وە ئەگەر عەسەبەیان لەگەڵا نەبوو، ئەوە «رَد» (گێڕانەوە)ی تیا هەیە، وەکوو لەمەوپاش بەیانی ئەکەین.

یاخود ئەجزای فەرزەکان زیاترن لە ئەسڵی مەسئەلە؛ لەم حاڵەدا، ناچارین بە «عول» (زیادکردنی) ژمارەی بەشەکان و کەمکردنەوەی ئەندازەی میراتەکەیان؛ مەسەلا، ئەگەر کەسێك بمرێ دوو خوشکی باوکی و مێردێکی لێ بەجێ بمێنێ، ئەمە لەم حاڵەدا مەسئەلەکە لە شەشە، بەڵام چونکە ئەجزای فەرزەکان حەوتن، خوشکەکان چوارو مێردەکە سێ وەرئەگرن، ناچارین بە «عول»، یەعنی لە هەر بەشێ لەو شەش بەشە حەوت یەکێکی ئەگێڕینەوە، بۆ ئەوە بەشێکی تر پەیدا ببێو بگا بە حەوت؛ وا دەرکەوت کە ژمارە زۆر بوو و ئەندازەی حەوت یەکێك لە هەر سەهمێك کەم بووەوە، جا لەسەر ئەم ئەساسە ئەبێ لەو مەسئەلانەدا، «عَول» بکرێ.[1]

---

١. بۆ روونکردنەوەی ئەم شوێنە، پێویستە بزانین ژمارە، سێ جۆرە؛

یەکەم: «مُساوی» کە بریتییە لەو ژمارەیە کە کەسرەکانی بەقەدەر خۆی بن، وەکوو «شەش» کە نیوەو سێ یەك و شەش یەکی هەیەو هەموو ئەمانە ئەگەن بە شەش؛

دووهەم: «زائِد» کە ئەو ژمارەیەیە کەسرەکانی لە خۆی زیاتر بن، وەکوو «دوانزە» کە نیوەو سێ یەك و چواریەك و شەش یەکی هەیەو تێکڕایان ئەگاتە پازدە، ئەم دوو بەشە ناو ئەبرێن بە ژمارەی تەواو (عدد تام)؛

سێهەم: «ناقِص» کە بەو ژمارەیە ئەڵێن کەسرەکانی لە خۆی کەمتر بن، وەکوو «چوار» کە نیوەو چواریەکی هەیەو تێکڕاکەی ئەکاتە سێ.

جا هەر ئەسڵی مەسئەلەیەك کە تەواو بێ، وەکوو شەش و دوازدەو بیستو چوار، رێ ئەکەوێ فەرزەکانی لە خۆی تێپەڕ بکاو پێویستی ئەبێ بە عەول، واتە لێ زیادکردن و هەر ئەسڵی مەسئەلەیەك کە ناتەواو بێ، هەرگیز پێویستی بە عەول نابێ، چونکە بەشەکانی فەرزەکانی لە خۆی کەمترن؛ ☜

ئەو ئەسڵانەی کە عەولیان تیا ئەکرێ، سێ ئەسڵن: «شەش» و «دوانزە» و «بیست و چوار»؛ یەکەمیان کە شەشە، چوارجار عەولی تیا ئەکرێ بە تاق‌و بە جووت؛ عەول بۆ حەوت، وەکوو ئەو مەسئەلەیە کە ئێستا باسمان کرد و عەول بۆ هەشت، وەکوو هەمان مەسئەلەی کۆمەڵە پێشووەکە لەگەڵ دایکا کە دیارە دایکیش شەش‌یەك ئەباو سەهمێکی ئەوێ؛کەواتە، ئەبێ ژمارەی مەسئەلەکە بگا بە هەشت وە عەول بۆ نۆ، وەکوو عەینی ئەم کۆمەڵە لەگەڵ برایەکی دایکی‌دا کە دیارە ئەویش شەش‌یەکی ئەوێ و پێویستە ژمارەی مەسئەلەکە بکەین بە نۆ وە عەول بۆ دە، وەکوو ئەم کۆمەڵە لەگەڵ برایەکی‌تری دایکی‌دا، لەبەر ئەوە کە دوو برای دایکی سێ‌یەکیان ئەوێ، ئەبێ بەشێکی‌تر زیاد بکەین و ژمارەکە بگا بە دە.

ئەسڵی دووهەمیش ـکە دوازدەیە ـ سێ عەولی تیا ئەکرێ بە تاق بۆ سیانزەو پانزەو حەڤدە؛ یەکەم، وەکوو ئەوەکە یەکێك بمرێ دایك‌و ژن‌و دوو خوشکی باوکی لێ بەجێ بمێنێ، مەسئەلەکە لە دوازدەیە، بە زەربی سێ لە چوار، هەشتی بۆ دوو خوشکەکەو سێی بۆ ژنەکە، دووی‌ترمان ئەوێ بۆ شەش‌یەکی دایکەکە، هەرچەند کە یەك سەهم ماوە؛ کەواتە، ناچارین بە زیادکردنی مەسئەلەکە بۆ سیانزە.

---

☞

مەسەلا، بۆ وێنە، مەسئەلەی مێردو دوو خوشکی باوکی و دایکی لە شەشە، مێردەکە نیوە ئەبا کە سێیە، خوشکەکان دوو سێ‌یەك ئەبەن کە چوارە، تێکڕای ئەمە ئەکاتە حەوت و ئەسڵی مەسئەلەکە دەری ناکا؛ کەواتە، پێویستە شەش بەرز بکەینەوە بۆ حەوت تا تەقسیمەکە دەری‌بێنێ.
بزانن! بۆ ئەوەی تێ‌بگەین ئەندازە زیادکراوەکە چەندێکە، نیسبەتی ئەدەین لە ئەسڵی مەسئەلەکە؛ مەسەلا، ئەڵێین شەش ئەوەندەی شەش‌یەکی لێ زیادکراوە کە ئەکاتە یەك و بۆ ئەوە کە تێ‌بگەین ئەو بەشانە لە ئەسڵی مەسئەلەکەدا چەندێکیان لێ‌ئەگەڕێتەوە تا بەشی خاوەن‌بەش تەواو بێ، نیسبەتی ئەو زیادەیە ئەدرێ بۆ ژمارە لێ‌زیادکراوەکە؛ مەسەلا، لە میسالی پێشوودا، ئەڵێین هەر سەهمێك حەوت‌یەکێکی لێ گەڕاوەتەوەو لە مەجموعەکەیان بەشی تەواو بووە؛ بۆ نموونە، ئەگەر ئەو شەش سەهمی ئەسڵی مەسئەلەیە، هەریەکێ حەوت فلس بێ لە هەریەکێ فلسێك ئەگێڕینەوە کە ئەکاتە شەش فلس، جا بەشێکی شەش فلسی پەیدا ئەبێ، وەك چۆن ئەو سەهمانە هەریەکێ ئەبن بە شەش فلس، یەعنی لە هەر سەهمێك حەوت‌یەکی لاچوو و سەهمێکی شەش بەشی لە شەش سەهمی حەوت بەش پەیدا بوو.

دووەم: وەکوو ئەم کۆمەڵە لەگەڵ برایەکی دایکی، دیارە برا دایکییەکەیش شەش یەکی ئەوێ؛ کەواتە، ئەبێ ژمارەی مەسئەلەکە بگاتە پازدە؛ سێهەم، وەکوو ئەم کۆمەڵە لەگەڵ برایەکی تری دایکی کە لەگەڵ براکەی تردا سێ یەك ئەبەن کە چوار سەهمە؛ کەواتە، ئەبێ مەسئەلەکە بگەیەنرێتە حەڤدە.

ئەسڵی سێهەمیش، وەکوو بیستو چوار، یەك عەولی تیا ئەکرێ بۆ بیستو حەوت، وەکوو ئەوە پیاوێك بمرێ دوو کچو ژنێك و دایك و باوکی لەپاش بەجێ بمێنێ، کچەکان، شانزەو باوك و دایکەکە، یەکی چوارو ژنەکە، سێ بەش ئەبا.

## ڕەدکردنەوە بۆ سەر خاوەن فەرز

هەرکاتێك جوزئەکانی فەرزەکە کەمتر بن لە ژمارەی مەسئەلە و عەسەبەیش لە ئارادا نەبێ، لەم سوورەتەدا ژمارەی بەشەکان کەم ئەکرێتەوە بەجۆرێك کە ببێ بە ئەوەندەی جوزئەکانی فەرزەکە و ئەندازەی بەشەکان زیاد ئەکرێ، بەپێچەوانەی عەولەوە، وەکوو باسمان کرد.

ئەم دابەشکردنەوەی زیادەیە بەسەر خاوەن فەرزەکانا، لە حاڵەتێکا ئەبێ کە «بیتُ‌المال»ی موسوڵمانان ئوسووڵێکی ڕێكو پێکی نەبێ بەگوێرەی شەرع، ئەگینا ئەبێ بدرێ بە «بیت‌المال».

دروستکردنی مەسئەلەکانی ڕەدکردنەوە، بە دوو جۆر ئەبێ؛

یەکەم، بە تەفسیل کە بریتییە لەوە لەسەر دەستووری فەرزەکان مەسئەلەکە دروست بکرێ و هەرکەسێ بەشی خۆی پێ‌بدرێ، جا هەرچی مایەوە لە ژمارەی مەسئەلەکە، ڕەد بکرێتەوە بۆیان بەگوێرەی ئەندازەی فەرزەکەیان، تەنها ژن و مێرد نەبێ کە هیچیان بۆ ڕەد ناکرێتەوە، یەعنی پێویستە تەماشا بکرێ نیسبەتی یەکەیەکەی بەشەکان بۆ تێکڕای بەشەکان چۆن بووە، هەروەها، ئەم ئەندازە ڕەدکراوەیش بکرێ بە ئەوەندە بەشەوە کە نیسبەتی سەهمی هەر خاوەن فەرزێك بۆ تێکڕای سەهمەکان لەم بەشە ڕەدکراوانەدا وەکوو نیسبەتی پێشوو بێ؛ کەواتە، لەوەدا کە زوو دراوە بە خاوەن فەرزەکان، یەکەیەکەی بەشەکان «مَنْسوب»ن و تێکڕای بەشەکان، «مَنْسوبٌ إليه»ین، لەم

ئەندازەیەیشدا کە ڕەدئەکرێتەوە، بەشی هەرکەسێك «منسوب»ەو تێکڕای ئـەندازەی بەشە ڕەدکراوەکان، «منسوبٌ إليه»یە و هەردوو نیسبەتەکە یەکن.

مەسەلا، ئەگەر کەسێك بمرێ کچێك و دایکێکی لێ بەجێ بمێنێ، مەسئەلەکە لە شەشە، سێ بۆ کچەکەو یەکێك بۆ دایکەکە، تێکڕای بەشەکەیان چوار سەهمە، بەشی دایکەکە، چواریەکەو بەشی کچەکە، سێ چواریەکی هەموو سەهمەکـانە، ئـەو دوو سەهمەیش کە ئەمێنێتەوە، ئەکرێن بە چوار نیوە سەهم، یەکێکی بۆ دایکەکەو سێ بەشی بۆکچەکە، جا ئەڵێین دوو، دابەش ناکرێ بەسەر چواردا، چوار زەرب ئەکەین لە شەش ئەبێ بە بیستوچوار، هەژدەی بۆ کچەکە کە سێ چواریەکە، وە شەشی بۆ دایکەکە کە یەك چواریەکە.

وە لە مەسئەلەی کچو دایكو ژندا، مەسئەلەکە لە بیستو چوارە. سێ بۆ ژنەکەو دوازدەی بۆ کچەکەو چواری بۆ دایکەکە. پێنج سەهم ئەمێنێتـەوە، نـیسبەتی بـەشی کچەکەو دایکەکە بۆلای تێکڕای بەشەکەیان بە چەند چواریەك بووە. پێنجیش دابەش ناکرێ بەسەر چواردا؛ کەواتە، چوار زەرب ئەکەین لە بیست و چوار ئەبێ بە نەوەدو شەش، ژنەکە دوازدە ئەبا، هەشتاوچوار سـەهم ئـەمێنـێتـەوە، چـواریـەکـێکـی کـە بیستویەکە بۆ دایکەکەو سێ چواریەکی کە شستوسێ بەشە بۆ کچەکەیە، جا ئیتر قیاس بکە لەسەر ئەم دوو میسالە.

بەڵام[١] چونکە ئەم وەزعە ناڕەحەتی زۆری تیایەو ئەنجامیش هەر بەشکردنەکەیە، زانایانی شەرع ڕێگایان داوە مەسئەلەکان کورت بکرێنەوە؛ جا لەسەر ئەو دەستوورە ئەڕۆین و ئەڵێین مەسئەلەی ڕەدکردنەوە بە کورتکردنەوە، چوار بەشە، چونکە ژن یا مێرد کە بەشیان وەرگرت و شتێك مایەوە، ئەوە ڕەد ناکرێتەوە بۆ سەر ئەوان، بەڵکوو هەر بۆ خاوەن فەرزەکانی‌تر ڕەد ئەکرێتەوە، جا یـا لەو مـەسئەلەی ڕەدکـردنەوەیەدا یەکێك لە ژن و مێرد هەیە یا نییە و لە هەردوو حاڵەکەدا ئەهلی ڕەد، یا سینفێکە یا زیاترە لە یەك سینف، ئەمە بوو بە چوار بەش:

[١. وا دەر ئەکەوێ ئەمە جۆری دووهەمی دروستکردنی ڕەدکردنەوەبێ ـ بڵاوکردنەوە کوردستان].

بەشی یەکەم، نە ژن و نە مێردی تیا نییە و ئەهلی رەد بۆ کردنەوەیش یەك سینفن، لێرەدا ژمارەی سەریان بە ئەسلی مەسئەلە دائەنرێ، وەکوو ئەوە کە یەکێك بمرێ یەك خوشکی لەپاش بەجێ بمێنێ، یا کچێك، یا دوو کچ، یا دوو خوشك، یـا دوو بـرای دایکی، یا دوو خوشکی دایکی، یا دوو نەنك، ئەوە لە دوو سوورەتی پێشوودا، مەسئەلە لە یەکە و لە پێنج سوورەتە دواییەکەدا، لە دووە؛

بەشی دووهەم کە یەك لە ژن و مێردی تیا نییەو ئەهلی رەد بۆکردنەوەیش لە سینفێك زیاترن، ئەوە ئەسڵی مەسئەلە بەقەدەر ژمارەی سەهمەکەیانە، ئەگـەر تـەماشای رەد نەکرێ، وەکوو ئەوەکە یەکێك بمرێ نەنك و خوشکی لێ بەجێ بمێنێ، ئەمە لەبەر ئەوە کە لە ئەسڵی مەسئەلەکەدا ـکە شەشە ـنەنك یەك سەهمی ئەباو خوشکەکە سێ سەهمی ئەبا، ئەسڵی مەسئەلەکە لە چوارە وە ئەگەر دووکچ و دایکی بەجێ هێشت مەسئەلەکە لە پێنجەو ئیتر بەمجۆرە.

بەشی سێهەمیش کە ئەوەیە یەك لە ژن و مێردی تیا هەبێ و ئەهلی رەد بۆکردنەوەیش یەك سینفن، ئەوە ئەسڵی مەسئەلە لە مەخرەجی فەرزی مێردەکە یا ژنـەکـە دروست ئەکرێ و بەشەکەی ئەو جیا ئەکرێتەوە، ئەمجار ئەگەر باقییەکەی قابیلی دابەشکردن بێ بەسەر ئەهلی بۆ رەدکردنەوەدا، ئەوە هەر ئەو مەخرەجە ئەسڵی مـەسئەلەیە، وەکـوو ژنێك لەگەڵ حەوت کچدا، لێرەدا ئەسڵی مەسئەلەکە هەشتە، یـەکـێك بـۆ ژنـەکـەو حەوتەکەی کە ئەمێنێتەوە بۆ حەوت کچەکەیە، یا وەکوو مێردێك لەگەڵ سێ کچدا، لێرەدا ئەسڵی مەسئەلەکە چوارە، یەکێك بۆ مێردەکەو سێ بۆکچەکان وە ئەگەر باقییەکە قابیلی دابەشکردن نەبوو، ئـەوجا ئـەگـەر لەگـەڵ ژمـارەی سـەری ئـەهلی رەد بـۆ کردنەوەکەدا تەوافوق هەبوو، زەربی وەفقی سەرەکەیان ئەکەین لە مەخرەجی فەرزی مێرد یا ژنەکەدا، وەکوو مێردێك لەگەڵ شەش کچدا، لێرەدا مەسئەلەکە لە چوارە، یەکێك بۆ مێردەکە، سێی ئەمێنێتەوە کە دابەش ناکرێ بە سەر شەش کچەکەدا، تەوافوقیش هەیە لەبەینیانا بە سێ یەك، زەربی سێ یەکی ژمارەی کچەکان ئەکەین ـکە دووە ـ لە چواردا ئەبێ بە هەشت، دووی بۆ مێردەکەو شەشی بۆ کچەکان، هەریەکی یەك.

وە ئەگەر تەبایون هەبوو لە بەینیانا، زەربی تەواوی ژمارەی سەریان ئەکەین لە مەخرەجەکەدا، وەکوو مێردێك لەگەڵ پێنج کچدا، لێرەدا مەسئەلەکە لە چوارە، یەکێك بۆ مێردەکە، سێی ئەمێنێتەوە، تەبایونی هەیە لەگەڵ پێنج، زەربی پێنج ئەکەین لە چواردا ئەبێ بە بیست، پێنج بۆ مێردەکەو پازدە بۆ کچەکان، هەریەکی سێ سەهم.

بەشی چوارەمیش کە یەك لە ژن و مێردی تیا هەیەو ئەهلی رەد بۆکردنەوەیش لە یەك سینف زیاترن، ئەوە لەوێشدا مەسئەلەکە لە مەخرەجی فەرزی مەسئەلەکە دروست ئەکرێو بەشیان ئەدرێ، ئەمجار ئەگەر باقییەکەی بەش ئەکرایەوە بەسەر عەدەدی سەهمەکانی ئەهلی رەد بۆکردنەوەکەدا، کە بریتییە لەو سەهمانەی ئەکرێن بە ئەسڵی مەسئەلە، ئەگەر مێرد یا ژنیان لەگەڵا نەبێ، ئەوە ئەسڵی مەسئەلەکە لەو مەخرەجەیە، وەکوو چوار نەنك و ژنێك و شەش خوشکی دایکی، لێرەدا مەسئەلەکە لە چوارە، یەکێ بۆ ژنەکەو یەکێك بۆ نەنکەکان کە لە شەشدا یەکێك ئەبەن وە دوو بۆ شەش خوشکە دایکییەکە کە لە شەشدا دوو ئەبەن.

وە ئەگەر باقییەکەی مەخرەجەکە بەش نەئەکرایەوە بەسەر ئەو سەهمانەدا، ئەوە ژمارەی ئەو سەهمانە زەرب ئەکرێ لە مەخرەجەکە، وەکوو ئەمەکە یەکێك بمرێ نۆکچ و شەش نەنك و چوار ژنی لەپاش بەجێ بمێنێ؛ لەم حاڵەدا مەسئەلە لە هەشتە، یەکێك بۆ ژنەکان، حەوت ئەمێنێتەوە، بەش ناکرێ بەسەر سەهمی کچەکان و نەنکەکاندا، چونکە سەهمی کچەکان لە شەشدا چوارە و سەهمی نەنکەکان لە شەشدا یەکە؛ کەواتە، زەربی پێنج ئەکەین لە هەشت ئەبێ بە چل.

جا ئەگەر ویستت بزانی هەر سینفێك چەندی ئەکەوێ لەو حاسڵی زەربە، ئەوە سەهمی مێردەکە یا ژنەکە، کە لەم میسالی ئێمەدا یەکە، زەربی بکە لەوەکە زەرب کراوە لە مەخرەجی فەرزەکەدا کە لەم میسالەدا پێنجە و عەدەدی سەهمی هەر سینفێك لەوانە کە ئەهلی رەد بۆکردنەوەن، زەربی بکە لەوەداکە لەپاش بەشی مێرد یا ژن ئەمێنێتەوە لە مەخرەجەکە، وەکوو حەوت بێ لەم میسالەدا.

کەواتە لەم میسالەداکە مەسئەلەکە گەیشتووە بە چل، یەك زەرب ئەکەین لە پێنج کە حاسڵ زەربەکەی هەر پێنجە بۆ ژنەکان وە چوار ـ کە بەشی کچەکان بوو ـ زەربی ئەکەین

لە حەوت ئەبێ بە بیست و هەشت بۆ کچەکان. وە یەك ـکە بەشی نەنکەکانە ـ زەربی ئەکەین لە حەوت کە هەر حەوتی لێ دەرئەچێ، ئەمە چل سەهمەکە.

جا پاش ئەوەکە بەشی هەر سینفێکمان دا بە خاوەنی، ئەگەر بەسەر ژمارەی سەری سینفەکەدا دابەش نەئەکرایەوە، ئەوە بە دەستووری تەسحیحی مەسائیل موعامەلەی لەگەڵ ئەکرێ کە لەمەولا باسی ئەکەین؛ مەسەلا، لەم میسالەدا کە بەشی هیچ سینفێك بەش ناکرێتەوە و لە بەینی بەش و سینفەکانیشا تەبایون هەیە، عەدەدی سەرەکەیان ئەهێڵینەوە، ئەمجار تەماشای عەدەدی سەری سینفەکان ئەکەین، لەبەر ئەوە کە تەوافوقیان لەبەینایە، دوو ـکە نیوەی عەدەدی ژنەکانە ـ زەربی ئەکەین لە عەدەدی سەری نەنکەکان ـکە شەشە ـ ئەبێ بە دوانزە و ئەم حاسڵە زەرب ئەکەین لە سێیەکی عەدەدی کچەکان کە سێیە، ئەبێ بە سیو شەش و زەربی ئەم حاسڵە ئەکەین لە چل، ئەبێ بە هەزارو چوارسەدو چل، جا ژنەکان کە پێنجیان ئەبرد، زەربی پێنجەکەیان ئەکەین لە سی و شەش، ئەبێ بە سەدو هەشتا، بۆ هەر یەکێکیان چلو پێنج وە کچەکان کە بیستو هەشتیان ئەبرد، بۆیان زەرب ئەکەین لە سیو شەش، ئەبێ بە هەزارو هەشت و هەر یەکێکیان سەدو دوازدە ئەبەن، شەش نەنکەکەیش کە حەوت سەهمیان هەبوو، بۆیان زەرب ئەکەین لە سیو شەش ئەبێ بە دوو سەدو پەنجاو دوو، یەکی شەستو سێ بەش ئەبەن.

## میراتی «ذَوي الأَرْحام»

کاتێك کە نە خاوەن فەرز و نە عەسەبە، هیچیان نەبوون، یا خاوەن فەرزێکی وا نەبوو کە رەدی بۆ بکرێتەوە و «بیت‌المال»ی موسوڵمانانیش لەسەر ئوسووڵی شەرع نەئەرۆیی و سینفێك یا زیاتر لەو سینفانەی «ذَوي الأَرحام» هەبوو کە پێشان باسمان کردن، ئەوە ئەو میراتە هەمووی یا ئەوەی کە لەو خاوەن فەرزە ئەمێنێتەوە کە رەدی بۆ ناکرێتەوە ـوەك ژن و مێرد ـ ئەدرێ بەو تەنها سینفە یا ئەو چەند سینفانەی «ذَوي الأَرْحام».

جا ئەگەر تەنها یەك کەس لە «ذوي الأرحام» هەبوو، ئەوە هەموو میراتەکە ئەبا؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك مرد و تەنها کچی کچێکی هەبوو، ئەوە هەموو میراتەکە بۆ ئەو

کچی کچەیە وە ئەگەر ژنێك و کچی کچێکی هەبوو، ژنەکە چواریەك ئەباو ئەوی تری ئەدرێ بە کچی کچەکە وە ئەگەر مێردێك و کچی کچێکی هەبوو، ئەوە مێردەکە نیوەی میراتەکە ئەباو ئەوی تری ئەدرێ بە کچی کچەکە؛ لەم بەیانەوە دەرکەوت کەوا «ذوی الأرحام» مەنعی میراتبردنی خاوەن فەرزی ئەسڵییان پێناکرێ، وەکوو ژن یا مێرد و لە بەشی تەواو داینابەڕێنن بۆ بەشی ناتەواو، چونکە ئەوان بە «نَصّ»ی قورئان خاوەن بەشن.

وە ئەگەر لە یەك کەس زیاتر هەبوو، بەڵام لە یەك سینف بوون، وەك کچی کچ و کوڕی کچ، ئەوە لەم سوورەتەیشدا هەموو میراتەکە یا ئەوەی لە یەکێك لە ژن یا مێرد ئەمێنێتەوە، ئەیبەن بە پێی ئوسووڵی دوو بەش بۆ کوڕو یەك بەش بۆ کچ، بەڵام لەناو ئەولادی براو خوشکی دایکیدا، ئەوە هەر هاوسانی تەماشا ئەکرێ.

وە ئەگەر سینفەکان زۆر بوون، ئەوە سێ مەزهەب گێڕراوەتەوە لە زانایانی شەرع لە میراتبردنیانا؛

یەکەم، مەزهەبی جومهوور کە مەشهوورە بە مەزهەبی ئەهلی رەحم و، ئەوەیش بریتییە لەوە کە میراتەکە بدرێ بە هەموویان وەکوو یەك، بە بێ جیاوازی لە بەینی نێرو مێ‌دا، یا لەبەینی دوورو نزیکدا لە مردوو، یا دوورو نزیك لە میراتبەر، لەبەر ئەوە کە هەموویان لە ئەسڵی رەحمدا وەکوو یەکن.

دووهەم، مەزهەبی ئەهلی قەرابەتە کە بریتییە لە تەماشاکردنی دووری و نزیکی لە مردووەوە، بە پێی ئەم مەزهەبە،کام لە «ذوي الأرحام»ەکان نزیکتر بێ لە مردووەکە ئەوە میراتەکە ئەبا وە ئەگەر چەند کەس وەکوو یەك وا بن لە نزیکی لە مردووەکەوە، تەماشای ئەوەیان تیا ئەکرێ کامیان نزیکترە لە میراتبەرەوە وە ئەگەر لەم سیفەتەیشدا وەکوو یەك وا بن، ئەو کاتە میراتەکە ئەدرێ بە هەموویان، بەڵام لە غەیری ئەولادی براو خوشکی دایکی‌دا، فەرقی نێرو مێ ئەکرێ.

سێهەم، مەزهەبی ئەهلی تەنزیلە؛ ئەم مەزهەبە بەهێزترینی سێ مەزهەبەکەیە، ئەمەیش بریتییە لەوە هەرکام لەم «ذوي الأرحام»انە دابنرێ لەشوێنی ئەو ئەسڵە یا ئەو

فەرعە یا ئەو حاشییەیەدا کە بەهۆی ئەوەوە ئەگا بە مردووەکە، یەعنی لە ئـەندازەی میرات و لە فەرزو تەعسیبدا و لەوەدا کە مەنعی میراتبردنی غەیر بکا یاخود مەنعی میراتبردنی لیّ بکریّ.

مەسەلا، باپیرەو نەنکێك کە خاوەن فەرز تین، لە شوێنی ئەو ئەولادەیان دائەنرێن کە بەهۆی ئەوەوە ئەگەن بە مردووەکە، وەکوو باوکی بێ یاخود دایکی؛ کەواتە، بـاوکی دایك، وە باوکی دایکی دایك، وە باوکی باوکی دایك، لەشوێنی دایکـدان وە بـاوکی دایکی باوك، لە شوێنی باوکدا دائەنرێ و ئەولادی کچ لەشوێـنـی کـچدا و ئـەولادی خوشك لەشوێنی خوشکدا و کچی برا لە شوێنی برادا و کچی مام لەشوێـنـی مـامدا دائەنرێ، بەڵام مامی دایکی و پوورێك کە خوشکی باوك بێ و ئـەولادی ئـەمانە، لە شوێنی باوکدا وە خاڵو پووریّ کە خوشکی دایك بێ، وە ئەولادی ئەمانە، لە شوێنی دایکا دائەنرێن.

جا پاش ئەوەی کە زانیمان هەر کام لەشوێنی کام میراتبەردایە، تەماشای ژمارەی پلە ئەکەین لەبەینی ئەوان و ئەو میراتبەرانەدا کە پێی ئەگەن، خواه بەرەوخوار ببێتەوە لە باوك و باپیرەو دایك و نەنکدا، یا بەرەوژوور ببێتـەوە لە مـناڵ و مـناڵەزادا، یـا لە تەنشتەوە بێت لە حاشییەکاندا؛ جا ئەگەر جیاوازییەکمان دی لەبەینا؛ مەسەلا، کەسێك بە یەك پلە ئەگەیشت بە میراتبەر و یەکێك بە دوو پلە پێی ئەگەیشت، ئەوە میراتبەر یەکەمەکەیانە وە ئەگەر کەسێك بە دوو پلەو کەسێك بە سێ پلە ئەگەیشت، ئەوە دوو پلەییەکە میراتبەرە، یەعنی تا لەتوانادا هەبێ، ئەهلی تـەنزیل تـەماشای نـزیکی لە میراتبەرەوە ئەکەن؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك مرد، کچێکی کچ و کچێکی کچی کچی هەبوو، ئەوە هەر یەکەمیان میرات ئەباو هەموو ماڵەکە بۆ ئەوە؛ هەروەها، ئەگەر کچێکی کچی کوڕ و کچێکی کوڕی کچی هەبوو، هەر یەکەمیان میرات ئەبا، لەبەر ئەوە کە ئەو لکاوە بە میراتبەرەکەوە، بەڵام دووهەم واسیتەی لەدواوەیە.

وە ئەگەر کەسێك مرد و دایکی باوکی دایکی هەبوو و بـاوکی دایکـی دایکـیشی هەبوو، ئەوە دووهەمیان پێش ئەخرێ وە ئەگەر باوکی باوکی دایکی هەبوو لەگەڵ دایکی

باوکی دایك و باوکی دایکی دایك، ئەوە سێهەمیان میرات ئەبا وە ئەگەر باوکی باوکی دایکی باوك و دایکی باوکی دایکی باوکی هەبوو لەگەڵ باوکی باوکی باوکی دایك و دایکی باوکی باوکی دایکدا، ئەوە یەکەم و دووهەم پێش ئەخرێن و شەش یەکەکە لەبەینی خۆیانا وەکوو یەك دابەش ئەکەن.

وە ئەگەر کوڕی کوڕی خاڵ و کوڕی پووری هەبوو، کوڕی پوورەکە پێش ئەخرێ. وە ئەگەر کوڕی پووری هەبوو و کوڕی کوڕی مامیشی هەبوو، هەر کوڕی پوورەکە پێش ئەخرێ.

وە ئەگەر کۆمەڵێکمان دی کە لە نزیکی بە میراتبەردا وەکوو یەك وابوون، ئەوە وایان دائەنێین کە لەپاش مردووەکە بەجێ ماون و هەموویان میراتبەری ئەسڵین و لە «ذوي الأرحام» نین؛ کەواتە، هەر میراتێك بگا بەوانە لەحاڵێکا کە میراتبەری راستەقینە بن، ئەگا بەمانەیش کە بەهۆی ئەوانەوە ئەگەنەوە بە مردووەکە، لەسەر ئوسووڵی میراتی ئەوان بە فەرز یا بە تەعسیب.

کەواتە، ئەگەر کەسێك مردو باوکی باوکی دایك و کچی کچی کچ و کچی کچی برای باوکی بەجێ هێشت، ئەوە وابزانە کە مردووەکە دایك و کچ و برایەکی باوکی بەجێ هێشتووە، لەم مەسئەلەیەدا دایك، شەش یەك بەرەو کچەکە، نیوە ئەباو براکە، عەسەبەیە؛ کەواتە، مەسئەلەکە لە شەشە، یەکێك بۆ دایکەکەو سێ بۆ کچەکەو دوو بۆ براکە، هەر بەوجۆرە لەم سوورەتەی خۆیشمانا مەسئەلەکە لە شەشە، سێ بۆ کچی کچی کچەکەو یەکێك بۆ باوکی باوکی دایکەکەو دوو بۆ کچی کچی براکەیە، ئەوان بە فەرزو ئەمیان بە تەعسیب.

وە ئەگەر هەندێك لەوانە لەسەر تەقدیری ئەوەکە میراتبەری راستەقینە بن هەندێکیان بێبەش ئەکرد لە میرات، ئەوە لێرەیشدا ئەو بێبەش کردنە دێتە کایەوە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك مرد، کوڕی خوشکێکی دایکی و کوڕی خوشکێکی باوکی و کوڕی خوشکێکی باوکی و دایکی بەجێ هێشت، ئەوە کوڕی خوشکە باوکییەکە بێبەش ئەکرێ بەهۆی کوڕی خوشکە باوکی و دایکییەکەوە، هەر وەك چۆن برای

باوکی و دایکی برای باوکی بێبەش ئەکا؛ کەواتە، ئەو ماڵە ئەکرێ بە شەش بەشەوە لەبەر مەخرەجی فەرزی خوشکە دایکییەکە سەهمێکی بۆ ئەو و ئەوی تری بۆ کوڕی خوشکە باوکی و دایکییەکە، بە تەعسیب.

وە ئەگەر چەند ئەولادیکی خاڵ و پووری لێ بەجێما، ئەوە دوو بەشی ماڵەکە ئەدرێ بە ئەولادی خاڵەکە و بەشێکی ئەدرێ بە ئەولادی پوورەکە و لەناو ئەولادی خاڵەکەیشا، تەماشای ئوسووڵی دوو بەش بۆ نێرینەو بەشێك بۆ مێیینە ئەکرێ، هەروەها لەناو ئەولادی پوورەکەیشا بەو ئوسووڵە میراتەکە دابەش ئەکرێ. ئەمە، تەحقیقێکە کە زانایانی شەرع بەیانیان کردووە و «شیروانی» ئەیگێڕێتەوەو قسەی «تُحفة» و «نِهايَة» و «مُغني»ی بە سەهو داناوە کە بەپێچەوانەی ئەمەوەیە؛ بەڵێ لە ئەولادی براو خوشکی دایکییا، بە قەتعی فەرقی نێرو مێ ناکرێ و هەرچی میراتێکیان دەسگیر ببێ، وەکوو یەك دابەشی ئەکەن لە بەینی خۆیانا.

## باسی دروستکردنی مەسئەلەکان

ئەگەر بەشی میراتبەرەکان لە ئەسڵی مەسئەلەدا دابەش ئەکرا بەسەریانا، ئەوە ئاسانە، وەکوو مێردێك لەگەڵ سێ کوڕدا؛ لێرەدا مەسئەلەکە لە چوارە کە مەخرەجی چواریەکی مێردەکەیە، یەکێکی بۆ ئەوو سێی بۆ سێ کوڕەکە ئەگینا ئەگەر بەشی تاقە سینفێك ئەشکایەوە بەسەر ئەفرادی سینفەکەدا، واتە لەبەینی ژمارەی بەشەکەو ژمارەی سەری بەشدارەکانا، یا «تبايُن» هەبوو، یا «توافُق» یا «تداخُل»، بەڵام ژمارەی سەری بەشدارەکان زۆرتر بوو لە ژمارەی ئەسڵی مەسئەلەکە[1]، ئەوە لە سوورەتی «تەوافوق»دا زەربی وەفقی عەدەدی سەری بەشدارەکان ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکەدا وە ئەگەر مەسئەلەکە عەولی تیا بوو، عەولی بۆ ئەکەین و تەقسیمەکە لە حاسڵی زەربەکە تەواو ئەبێ.

میسالی بێعەول، وەکوو ئەوە کەسێك بمرێ دایکێك و چوار مامی لێ بەجێ بمێنێ، مەسئەلەکە لە سێیە کە مەخرەجی فەرزی دایکەکەیە، یەکێکی بۆ ئەو، دووی

١. راستەکەی، ئەم جۆرە «تداخُل»ەیش هەر بە «توافُق» دائەنرێ، بەڵام بە مەعنای عام.

ئەمێنێتەوە دابەش ناکرێ بەسەر چوار مامەکەداو تەوافوقیشیان لە بەیندا هەیە، زەربی نیوەی ژمارەی سەری مامەکان ئەکەین لە سێ ئەبێ بە شەش، دووی بۆ دایکەکەو چواری بۆ مامەکان، هەریەکی یەك.

میسالی لەگەڵ عەولیشدا، وەکوو ئەوەکەسێك بمرێ شەش کچ و باوك و دایك و مێردی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەسڵی مەسئەلەکە لە دوازدەیە، بە زەربی سێ لە چوار یا زەربی دوو لە شەش، عەولی تیا ئەکرێ لە سیانزەوە بۆ پانزە، هەشتی بۆ شەش کچەکەو چواری بۆ باوك و دایکەکەو سێی بۆ مێردەکە، جا لەبەر ئەوەکە هەشت دابەش ناکرێ بەسەر شەشدا، و تەوافوقیشیان لەبەیندا هەیە، زەربی سێ ئەکەین لە پانزە ئەبێ بە چل و پێنج، بیست و چواری بۆ کچەکان، هەریەکی چوار و شەشی بۆ باوکەکە و شەشی بۆ دایکەکەو نۆی بۆ مێردەکە.

وە ئەگەر بەشەکان ئەشکانەوە بەسەر دوو سیفندا، پێویستە بەراوردی بەشی هەر سینفێك بکەین لەگەڵ سینفەکەدا جا ئەگەر ژمارەی بەشەکە لەگەڵ ژمارەی خاوەن بەشەکانا «تەوافوق»یان هەبوو، ئەبێ ژمارەی سینفەکە بێنینە خوارەوە بۆ وەفقی خۆی وە ئەگەر «تەبایون»یان هەبوو، ئەبێ ژمارەی سینفەکە بە حاڵی خۆی رابگرین، جا لەپاش ئەم موعامەلەیە، تەماشای عەدەدی سینفەکان ئەکەین، ئەگەر «تَماثُل»یان هەبوو، یەکێکیان زەرب ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکەدا بە عەولەوە، ئەگەر عەولی تیا هەبوو و لەو حاسڵ زەربەدا مەسئەلەکە بەش ئەکرێتەوە بەسەریانا.

میسالی بە بێ عەول، وەکوو شەش خوشکی دایکی و نۆ مامی باوکی و نەنکێك، مەسئەلەکە لە شەشە، یەکێك بۆ نەنکەکە و دوو بۆ شەش خوشکەکەو سێ بۆ نۆ مامەکە، دوو بەسەر شەشا دابەش ناکرێ و تەوافوقیشیان لەبەیندا هەیە بە نیوەیی، ژمارەی خوشکەکان دێنینە سەر سێ، هەروەها سێ بەش ناکرێتەوە بەسەر نۆ مامەکەدا و تەوافوقیشیان لەبەیندا هەیە بە سێ یەك، ژمارەی مامەکان دێنینە سەر سێ یەك کەسێیە، ئەمجار لەبەر ئەوە کە ژمارەی هەردوو سینفەکە وەکوو یەك دەرچوون، زەربی سێ ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکە کە شەشە ئەبێ بە هەژدە، سێی بۆ نەنکەکەو شەشی بۆ شەش خوشکەکەو نۆیش بۆ مامەکان.

وە ئەگەر تەداخولیان لەبەیندا بوو، ژمارە زۆرەکەیان زەرب ئەکەین لە ئەسڵی مەسئەلەکە بە عەولەوە، ئەگەر عەولی تیا هەبوو، و تەقسیمەکە لە حاسڵی زەربەکەدا تەواو ئەبێ؛ میسالی بە بێعەول، وەکوو نەنکێك و دوازدە خوشکی دایکی و نۆ مام، مەسئەلەکە لە شەشە، یەکێکی بۆ نەنکەکەو دووی بۆ دوازدە خوشکەکەو سێی بۆ مامەکە، دوو لەگەڵ دوازدەدا «مُتوافِق بالنّصف»ن؛ کەواتە دوازدەمان هێنایە سەر شەش و سێ لەگەڵ نۆدا «متوافق بَالثُّلث»ن، نۆمان هێنایە سەر سێ و لەبەر ئەوەکە سێ داخڵە لە شەشدا، شەشمان زەرب کرد لە ئەسڵی مەسئەلەکە کە شەشە بوو بە سیو شەش، شەشی بۆ نەنکەکەو دوازدەی بۆ دوازدە خوشکەکەو هەژدەی بۆ نۆ مامەکە.

وە ئەگەر تەوافوقیان هەبوو، وەفقی عەدەدی سینفێك زەرب بکە لە تەواوی عەدەدی سینفەکەی تردا و حاسڵی زەربەکە زەرب بکەلە ئەسڵی مەسئەلەکەدا بە عەولەوە، ئەگەر عەول کرابوو لەو حاسڵ زەربەدا، تەقسیم بەسەر ئەفرادی سینفەکانا تەواو ئەبێ.

میسالی بە بێعەول، وەکوو نەنکێك و هەشت ئەولادی دایکی و هەژدە مامی باوکی، مەسئەلەکە لە شەشە، یەکێکی بۆ نەنکەکەو دووی بۆ هەشت ئەولادەکەو سێی بۆ هەژدە مامەکە، دوو لەگەڵ هەشتدا «مُتوافِق بالنّصف»ن، هەشت دێنینە سەر چوار و سێ لەگەڵ هەژدەدا «مُتوافِق بِالثُّلث»ن، هەژدە دێنینە سەر شەش، ئەمجار لەبەر ئەوە کە چوارو شەش «متوافِق» بوون، دوومان زەرب کرد لە شەشدا بوو بە دوازدە و دوازدەکەمان زەرب کرد لە شەشدا بوو بە حەفتاو دوو، دوازدە بۆ نەنکەکەو بیست و چوار بۆ هەشت ئەولادە دایکییەکەو سیو شەش بۆ هەژدە مامەکە.

وە ئەگەر «تبایُن»یان لەبەیندا هەبوو، تەواوی ژمارەی ئەفرادی سینفێکیان زەرب بکە لە تەواوی ئەویانا و حاسڵی زەربەکە زەرب بکە لە ئەسڵی مەسئەلەکەدا بەعەولەوە، ئەگەر عەول کرابوو لەو حاسڵەدا، تەقسیمەکە تەواو ئەکرێ.

میسالی بە بێعەول، وەکوو ژنێك و شەش نەنك و هەشت ئەولادی دایکی و برایەکی باوکی مەسئەلەکە لە دوازدەیە، دوو بۆ نەنکەکان، سێ بۆ ژنەکەو چوار بۆ هەشت ئەولادەکانو سێ بۆ برا باوکییەکان، دوو لەگەڵ شەشدا «متوافِق بالنّصف»ن، عەدەدی شەش نەنکەکەمان هێنایە سەر سێ، هەروەها چواریش لەگەڵ هەشتدا،

ئەوانیشمان هێنایەسەر چوار، جا لەبەر ئەوەکە سێو چوار «مُتباین»ن، زەربی سێمان کرد لە چوار بوو بە دوازدە و دوازدەمان زەرب کرد لە دوازدە کە ئەسڵی مەسئەلەکەیە بوو بە سەدو چلو چوار، بیستو چوار بۆ شەش نەنکەکە، یەکی چوار وە سی و شەش بۆ ژنەکەو چل و هەشت بۆ هەشت ئەولادەکان، یەکی شەش وە سێ و شەش بۆ برا باوکییەکە.

هەروەهایە قیاسی دروستکردنی مەسئەلە لەکاتی شکاندنەوە بەسەر سێ سینف یا بەسەر چوار سینفدا، ئیتر قەت مەسئەلە بەسەر زیاتر لە چوار سینفدا ناشکێتەوە، مەگەر لە میرات بەهۆی ئازادکردن و سیادەتدا. میسالی شکاندنەوە بەسەر سێ سینفدا، وەکوو دوو نەنك و سێ برای دایکیو دوو مامی باوکی و دایکی یا باوکی، مەسئەلەکە لە شەشە، یەکێ، بۆ دوو نەنکەکەو دوو، بۆ سێ، براکەو، سێ بۆ دوو مامەکە، لە هەر سێ سینفەکەدا تەبایون هەیە لە بەینی بەش و خاوەن بەشا، جا زەربی دوومان کرد لە سێ بوو بە شەش، زەربی شەشیشمان کرد لە شەش بوو بە سی و شەش، شەش، بۆ دوو نەنکەکەو دوازدە، بۆ دوو براکەو هەژدە، بۆ سێ مامەکە.

میسالی شکاندنەوەیش بەسەر چوار سینفدا، وەکوو دوو ژن و چوار نەنك و سێ برای دایکی و سێ مامی باوکی یا باوك و دایکی، مەسئەلەکە لە دوازدەیە، سێ بۆ ژنەکان و دوو بۆ نەنکەکان و چوار بۆ براکان و سێ بۆ مامەکان، بەشی نەنکەکان لەگەڵیانا تەوافوقی هەیە، ژمارەکە دێنینە سەر دوو، وە بەشی باقییەکان تەبایونی هەیە لەگەڵیانا، هەروەکوو خۆی رایئەگرین، جا لەبەر ئەوەکە ژمارەی ژنەکان و وەفقی ژمارەی نەنکەکان هەر دووە، دوو زەرب ئەکەین لە سێ ـکە ژمارەی براکانە ـ ئەبێ بە شەش و شەشیش زەرب ئەکەین لە دوازدە ئەبێ بە حەفتاو دوو،دوازدەی بۆ نەنکەکان هەر یەکی سێ وە هەژدەی بۆ ژنەکان، هەریەکی نۆ وە بیستو چواری بۆ براکان، هەریەکی شەش وە هەژدەی بۆ مامەکان، هەر یەکی شەش.

قانونی زانینی بەشی هەر سینفێك لە حاسڵی زەربەکەدا، ئەوەیە ئەوەی هەر سینفێك دەسی کەوتووە زەربی بکە لەو عەددەدا کە پاش موعامەلەی سینفەکان زەرب ئەکرێ لە

ئەسڵی مەسئەلەکەدا، ئێستا لە میسالەکەی پێشوودا، ئەسڵی مەسئەلە دوازدە بوو و بەشی نەنکەکان لەویا دوو بوو و ئەوەیش کە لە ئەنجامی عەمەلیاتەکەدا زەربمان کرد لە ئەسڵی مەسئەلەکە، شەش بوو، جا دوو زەرب بکە لە شەش، ئەوە بەشی ئەوانە، باقی سینفەکانیش هەر بەمجۆرە.

## باسی «مُناسَخَات»، واتە مردنی هەندێ لە میراتبەرەکان بەرلە دابەشکردنی میراتەکە

ئەگەر کەسێك مردو هەندێ میراتبەری لەپاش بەجێما و هێشتا ماڵەکە دابەش نەکرابوو یەکێکیان لێ مرد، ئەمە ئەگەر میراتبەر هەر ئەوانە بوون کە زوو لەگەڵیا بوون و میراتیان لەم مردووە ـ وەکوو میراتیان لە مردووە پێشووەکە بوو ـ ئەوە لەم سوورەتەدا، وا بڕیار ئەدەین ئەم مردووە دووهەمە نەبووەو میراتەکە لەبەینی میراتبەرە پێشووەکانا دابەش ئەکەینەوە، وەکوو چەند براو خوشکێك کە یەکێکیان لێ بمرێ لەپێش دابەشکردنی میراتەکەداو هەر ئەو براو خوشکانەی لێ بەجێ بمێنێ.

وە ئەگەر میراتبەری تری غەیری ئەو میراتبەرانەی لێ بەجێ بمێنێ، وەك ژن و مناڵی خۆی، یاخود هەر میراتبەرە پێشووەکانی لێ بەجێما، بەڵام میراتیان لەم مردووە وەك میراتیان لە مردووی پێشوو نەبوو، وەکوو دایکی ئەم مردووە، کە لە مەسئەلەی پێشوودا، بە سیفەتی ژنیەتی کابرای مردوو و لەم مەسئەلەیەدا بە سیفەتی دایکیەتی مردووی دووهەم میرات ئەبا، ئەوە پێویستە هەردوو مەسئەلەکە دروست بکەین، جا ئەگەر بەشی مردووی دووهەم لە مەسئەلەی یەکەمدا دابەش ئەکرا بەسەر مەسئەلەکەی خۆیدا، ئەوە ئاسانە، لەبەر ئەوە لە عەینی بەشەکەی خۆی بە بێ زەحمەت وەرئەگیرێ و بەش ئەکرێتەوە بەسەر میراتبەرەکانی خۆیا؛ میسالی، وەکوو ئەمە ژنێك بمرێ مێردێك و دوو خوشکی لەپاش بەجێ بمێنێ و یەکێك لەم دوو خوشکە بمرێ و خوشکەکەی و کچێکی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەمە مەسئەلەی پێشوو لە شەش بووەو عەولی تیا کراوە بۆ حەوت، سێی بۆ مێردەکەی و چواری بۆ دوو خوشکەکەی،

هەریەکی دوو سەهەم، مەسئەلەی دواییش ـکە بریتییە لە کچێك و خوشکێك ـ لە دووە، یەکێك بۆ کچەکەو یەکێك بۆ خوشکەکەی؛کەواتە، عەینی دوو سەهمەکەی خۆی بەش ئەکرێتەوە بەسەر ئەم خوشك و کچەدا، هەریەکی بەشێك.

وە ئەگەر بەشەکەی لە مەسئەلەی یەکەمدا بەش نەئەکرایەوە بەسەر مەسئەلەکەی خۆیدا، ئەوە یا «تەوافوق»یان لەبەینا هەیە، یا «تەبایون»؛ ئەگەر تەوافوقیان لەبەینا بوو، وەفقی مەسئەلەی دووهەم زەرب بکە لە تەواوی مەسئەلەی یەکەم وە ئەگەر تەبایونیان لەبەینا بوو، تەواوی مەسئەلەی دووهەم زەرب بکە لە تەواوی مەسئەلەی یەکەم، تا لە حاسڵی زەربەکەدا تەقسیمی هەردوو مەسئەلەکە بکرێت، جا هەرکەس لە مەسئەلەی یەکەمدا شتێکی هەبوو، ئەوە زەرب ئەکرێ لەو ژمارەیە کە زەرب کراوە لە مەسئەلەی یەکەمدا، چ وەفقی مەسئەلەی دووهەم بێ و چ هەموو عەددەکەی بێ وە حاسڵی زەربەکە بەشی خۆیەتی و هەرکەسێ شتێکی هەبوو لە مەسئەلەی دووەما، ئەوە لەکاتی تەوافوقدا زەرب ئەکرێ لە وەفقی بەشی مردووی دووهەم لە مەسئەلەی یەکەمدا وە لە کاتی تەبایوندا، زەرب ئەکرێ لە تەواوی بەشی مردووی دووەم لە مەسئەلەی یەکەمدا.

میسالی «تەوافوق»، وەکوو ئەوە یەکێك بمرێ سێ خوشکی لێ بەجێ بمێنێ، یەکێکی باوکی و دایکی و یەکێکی باوکی و یەکێکی دایکی لەگەڵ دوو نەنکدا، دایکێکی دایك و دایکێکی باوك، ئەمجا خوشکە دایکییەکەیش بمرێ وە نەنکەکەی کە دایکی دایکیەتی و خوشکێکی دایکی کە بریتییە لە خوشکە دایك و باوکییەکەی مەسئەلەی یەکەمو دوو خوشکی باوکی و دایکی کە عەلاقەیان نییە بە مەسئەلەی یەکەمەوە، بەجێ بمێنن لێی.

مەسئەلەی یەکەم لە شەشە، یەکێکی بۆ دوو نەنکەکەو سێی بۆ خوشکە باوکیو دایکییەکەو یەکێکی بۆ خوشکە باوکییەکە و یەکێکی بۆ خوشکە دایکییەکە و لەبەر شکانەوەی بەشی نەنکەکان بەسەریانا، زەربی دوو ئەکەین لە شەش ئەبێ بە دوازدە، دووی بۆ نەنکەکان و شەشی بۆ خوشکە باوکیو دایکییەکەو دووی بۆ خوشکە باوکییەکەو دووی بۆ خوشکە دایکییەکە.

مەسئەلەی دووهەمیش هەر لە شەشە، چواری بۆ دوو خوشکە باوکی و دایکییەکەو یەکێکی بۆ نەنکەکەو یەکێکی بۆ خوشکە دایکییەکە، جا لەبەر ئەوەکە بەشی مردووی دووهەم لە مەسئەلەی یەکەمدا دوو بوو و «مُتَوافِق بالنِّصف» بوو لەگەڵ ئەم مەسئەلەیەدا، نیوەی ئەم مەسئەلەیە ـکە سێیە زەربمان کرد لە مەسئەلەی یەکەم کە دوازدەیە ـ بوو بە سی و شەش، جا دوو نەنکەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا دوانیان ئەبرد زەربی دوو ئەکەین لە سێ ئەبێ بە شەش، وە خوشکە باوکی و دایکییەکە شەشێ ئەبرد، زەربی شەش ئەکەین لە سێ ئەبێ بە هەژدە و خوشکە باوکییەکە دووی ئەبرد، زەربی دوو ئەکەین لە سێ ئەبێ بە شەش و نەنکەکەیش کە دایکی دایکە لە مەسئەلەی دووهەمدا یەکێکی ئەبرد، زەربی یەك ئەکەین لەیەك هەر ئەبێ بە یەك و خوشکە دایکییەکە یەکێکی ئەبرد، زەربی یەك ئەکەین لە یەك و دوو خوشکە دایکی و باوکییەکان چواریان ئەبرد زەربی یەك ئەکەین لە چوار، هەمووی ئەکاتە سی و شەش.

میسالی «تەبایون»یش، وەکوو ئەوە یەکێك بمرێ ژنێك و سێ کوڕو کچێکی لێ بەجێ بمێنێ، ئەوجا کچەکەیش بمرێ و ئەو کۆمەڵەی پێشووی لەپاش بەجێ بمێنێ، مەسئەلەی یەکەم لە هەشتە، یەکێك بۆ ژنەکەو حەوت بۆ سێ کوڕو کچەکە، مەسئەلەی دووهەمیش لە شەشە یەکێکی بۆ دایکەکە، پێنجی ئەمێنێتەوە، بەش ناکرێ بەسەر سێ براکەدا، سێ زەرب ئەکەین لە شەش ئەبێ بە هەژدە، سێ بۆ دایکەکەو پازدە بۆ براکان، هەریەکی پێنج، جا لەبەر ئەوەکە بەشی کچەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا تەبایونی هەیە لەگەڵ ئەم مەسئەلەی خۆیەدا، هەژدە زەرب ئەکەین لە هەشت ئەبێ بە سەدو چل و چوار، ژنەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا یەکێکی ئەبرد، زەربی یەکەکە ئەکەین لە هەژدە هەر ئەبێ بە هەژدە، کوڕەکانیش شەشیان ئەبرد، زەربی ئەکەین لە هەژدە ئەبێ بە سەدو هەشت، دایکەکەیش لە مەسئەلەی دووهەما سێی ئەبرد، زەربی سێ ئەکەین لە یەك هەر ئەبێ بە سێ، براکانیش لە مەسئەلەی دووهەما پازدەیان ئەبرد، زەربی ئەکەین لە یەك هەر ئەبێ بە پازدەو هەمووی ئەکاتە سەدو چل و چوار.

جا پاش ئەم دوانە، ئەگەر کەسێکی سێهەم مرد، ئەوە ژمارەی ئەم دوو مەسئەلەیە

دائەنرێ بە یەك مەسئەلە و مەسئەلەی مردووی سێهەم دائەنرێ بە مەسئەلەی مردووی دووهەم و ئەو موعامەلانەی کە زوو ئەکران، لەم کاتەیشدا جێبەجێ ئەکرێن.

## باسی ژن مارەکردن (نِکاح)

«نیکاح» لە شەرعدا بریتییە لە عەقدێك کە ببێ بەهۆی حەڵاڵ کردنی چوونەلای ژن بەو لەفزانە کە خوا لە قورئانا فەرموونی، وەکوو «ئینکاح» و «تەزویج» یا وەرگێڕانی ئەو لەفزانە بۆ سەر زمانێکی‌تر؛ بەهۆی ئەم عەقدەوە، مێرد ئەتوانێ لەگەڵ ژنەکەیدا رابوێرێ و لەزەتی لێ وەربگرێ.

جا ئینسان یا ئارەزووی ژنهێنانی هەیە، یا نییەتی و لە هەردوو حاڵەکەدا، یا دەستی ئەڕوا بەسەر نەفەقەی شەوو رۆژی گوێزانەوەی ژنەکەو پۆشاکی ئەو وەرزەی و مارەیی ئەو ژنەدا یا نییەتی؛ ئەگەر ئارەزووی ژنهێنانی هەبوو و دەستیشی ئەڕۆیی، ئەوە سوننەتە ژن بێنێ وە ئەگەر ئارەزووەکەی بەجۆرێك بوو ئەگەر ژنی نەهێنایە بێ‌گومان تووشی «زینا» ئەبوو، ئەوە واجبە ژن بێنێ، هەر وەك ژنێك کە ترسی دەس‌درێژی‌کردنەسەری هەبێ لە ئینسانی سەرسەرییەوە و بە غەیری شووکردن چارەیەکی نەبێ بۆ رزگاربوون لەو سەرسەرییانە، واجبە لەسەری شوو بکا.

وە ئەگەر ئارەزووی هەبوو، بەڵام دەستی نەئەڕۆیشت، ئەوە سوننەت ئەوەتە ژن نەهێنێ‌و بە رۆژووگرتن ئارەزووەکەی خۆی بشکێنێ و لەم کاتەدا کەراهەتی هەیە دەرمان بخوا بۆ شکاندنی ئارەزووی خۆی، بەڵکوو ئەگەر ترسی بڕانەوەی تۆوی خۆی هەبوو، ئەوە حەرامە و گوناهێکی گەورەیە دەرمان بخوا. هەروەها حەرامە لەسەر ژن و لەسەر پیاو کارێکی‌وا بکەن ئەوەی لە منداڵدانی ژنەکەدایە بکەوێتە خوارەوە، هەتاوەکوو ئەگەر هێشتا پارچە خوێنیکیش بێ؛ بەڵێ، حەرام نییە ئینسان لە وەختی ئاوهاتنەوەیدا خۆی بکێشێتەوە بۆ ئەوە ئاوەکەی نەگاتە جێی خۆی و منداڵی لێ پەیدا نەبێ، بەتایبەتی ئەگەر لە وڵاتی کافراندا بێ.

وە ئەگەر ئارەزووی نەبوو، وە دەستیشی نەئەڕۆیی، یاخود دەستی ئەڕۆیی، بەڵام نەخۆشییەکی بەدەوامی هەبوو، یا پیرو لێکەوتوو بوو، ئەوە کەراهەتی هەیە ژن بێنێ،

مەگەر مەبەستی لە ژنهێنانە کە هاورێیەتی و ئولفەت و یارمەتیدانی بێ بۆ خواپەرستی، ئەوە ئەگەر ژن قەناعەتی پێکرد سوننەتە ژن بێنێ. بەڵێ، ئینسانی بێئارەزووی بێدەسەڵات ئەگەر عەقڵیشی نەبوو (سفیە)، ئەوە حەرامە ژنبێنێ و نیکاحەکەشی دانامەزرێ.

وە ئەگەر ئارەزووی ژنهێنانی نەبوو، بەڵام دەستی ئەرۆیی و نەخۆش و پیریش نەبوو، ئەوە ئەگەر خەریکی خواپەرستی ئەبوو، چاك ئەوەیە ژننەهێنێو خۆی یەكلایی بکاتەوە بۆ عیبادەت وە ئەگەر خەریکی عیبادەت نەئەبوو، ئەوە چاكوایە ژن بێنێ، تا بەهۆی بەتاڵییەوە تووشی ئیشی گوناه و نابار نەبێ.

## ئەحواڵی ئەو ژنەی کە مارە ئەکرێ

سوننەتە ئینسان ژنێك بینێ کە بە دیانەتو ئەخلاق بێ و کچ بێ، مەگەر بۆ کەسێك کە نەتوانێ بچێتە لای کچ یاخود منالّی وردی هەبێ کە پێویستیان بە ژنێك بێ سەرپەرشتییان بکا و سوننەتە کچەکە باڵغ بووبێو پێگەیشتبێ و ئەسڵو نەسەب باش و ناسراو بێ؛ کەراهەتی هەیە هێنانی ئافرەتێ کە باوکی فاسق بێ یا زیناکەر بێ و کچێ کە دۆزرابێتەوە و سوننەتە ئینسان خزمی خۆی بهێنێ، بەو شەرتە کە لە یەکەم دەرەجەی ئامۆزاو پوورزادا نەبێ و سوننەتە خاوەن عەقڵ و خۆشەویستی و ئولفەت بێ و بە تەبیعەتی کابرا جوان بێ و لەڕو لاوازو سوورێکی زۆر سوور نەبێ و بەهۆی دایك و خوشکەوە بزانرێ کە سكو زا ئەکا وە ئەگەر بێوەژن بوو، سوننەتە منالّی لە خەڵك نەبێ، مەگەر منالّێکیوا کە لە نەسەبی کابرا بێ، وەك برازاو ئامۆزا، یاخود منالّێکی وا بێ کە بیەوێ لەبەر رەزامەندیی خوا بیژێنێ وە ئەگەر تەڵاقدراو بێ، ژنێکیوا نەبێ دڵی لای مێردە پێشووەکەی بێ، یا ئەو دڵی لای ئەم بێ و سوننەتە مارەییەکەی سووك بێ؛ هەروەها، سوننەتە لە ئەوەڵی رۆژەوە و لە مانگی شەشەڵان (شوّال)دا مارەی بکا لەناو مزگەوتا و لەنێوان کۆمەڵێك پیاوی باشدا و هەر لەو مانگەیشدا بیگوێزێتەوە.

هەروەك چۆن سونەتە پیاو بەدوای ئافرەتێکی‌وادا بگەڕێ کە ئەم سیفەتە باشانەی تیابێ، سونەتە ژنەکەو حەقداری ژنەکەیش بەشوێن پیاوێکی باشا بگەڕێن بەپێی ئوسووڵی شەرع و ئوسووڵی ئەهلی مەعریفەت و هەموو ئەو سیفەتانەی تیابێ کە ئەبن بەهۆی ئولفەت و خۆشەویستی.

سونەتە ئینسان کاتێك کە ویستی داوای ژنێك بکا و گومانی لەوەدا هەبوو کە ئەیدەنێ، بڕوانێ بۆ ئەو ژنە لەپێش خوازبینی‌کردنیا، هەرچەند ژنەکەو حەقداری ژنەکەیش رازی نەبن و چاك وایە ژنەکە نەزانێ بەوە کە بۆ ئەو نیازە تەماشای ئەکا بۆ ئەوە کە وەك خۆی بمێنێتەوە و سەرو رووی خۆی بە دەرمان جوان نەکا و دروستە تا چەند جار تەماشای بکا بۆ ئەوە باش لە وەزعی تێ‌بگا، بەڵام دروست نییە بڕوانێ بۆ غەیری روخسارو هەردوو دەستی تا مووچەکانی، چونکە جوانی‌و دڵگیری لە روخسارا دەرئەکەوێ‌و نەرم و ناسکیش لە دەستەکانیا دیاری ئەدا.

هەروەها سونەتە ژنەکەیش باش بڕوانێ بۆ کابرا و ئەوەندەی پێویست بێ، تەماشاکردنەکەی دووبارە بکاتەوە و سونەتە بۆ دەرکەوتنی ئەخلاق و رەوشتی پیاو، پرسیار لە کەسێکی ئاگاداری ئەمین بکا و واجبە ئەویش هەر عەیبێك لە کابراکەدا هەبوو بەڕاستی باسی بکا وە ئەگەر پرسیارکەر بە وەرامێکی کەم قەناعەت پەیدا بکا، ئیتر حەرامە کابرای پرسیار لێ‌کراو لەسەر دەرخستنی عەیبی ئەو کەسە بڕوا.

## تەماشاکردنی ژن‌و پیاو بۆ یەکتر

حەرامە لەسەر ئینسانی نێرینەی باڵغ تەماشای بەشێك لە لەشی ژنێکی نامەحرەمی گەورەی وا بکا کە گەیشتبێتە رادەی ئارەزووی نەفس بەپێی تەبیعەتی عادەتی، خواه دەست و دەم و چاوو روخساری، یا غەیری ئەو شوێنانەی و خواه ئەمین بێ لەوە کە ئارەزووی هەڵناسێ یا نە و ژنەکە جوان بێ یا ناشیرین و گەنج بێ یا پیر بێ و بێ‌پەردە تەماشای بکا یا لەسەر پەردەیەکەوە، لە رێگای دووربینەوە یا لەسەر سەتحی ئاوەوە کە ژنەکە لەبنی ئاوەکەدا بێ.

بەڵێ، گوناه نییە تەماشای وێنە (ڕەسم)ی لە ئاوێنە یا لەناو ئاوا، چونکە عەکسی زاتەکەیە؛ هەروەکوو حەرام نییە تەماشای کچێکی واکە نەگەیشتبێتە رادەی ئارەزووی نەفس، تەنها فەرجی نەبێ، ئەوە دروست نییە؛ هەروەها حەرامە لەسەر باوکی کوڕی نابالغ، بەو شەرتەکە نزیك بێ لە بالغبوونەوە، مەجالی کوڕەکەی بدا تەماشای ئافرەتی نامەحرەم یا کچی نابالغی وا بکاکە گەیشتبێتە رادەی حەز لێ کردن.

بەڵێ، حەرام نییە گوێ راگرتن لە دەنگی ژن، هەرچەند دەنگەکەشی زۆر خۆش بێ، بەو شەرتە بەنیازی خراپ نەبێ و ترسی فیتنەی نەفسی خۆی نەبێ، بەو رەنگە واکاری تێ بکاکە بکەوێتە تەقەلای دەسگەیاندن بە ئافرەتەکە یاخود دانیشتن لەگەڵیا بەجۆرێك کە خیلافی شەرع بێ.

هەروەها، حەرامە لەسەر ژن تەماشای ئەندامێکی نێرینەیەك بکاکە بالغ بووبێ یا بالغ نەبووبێ، بەڵام بەتەبیعەت گەیشتبێتە رادەی ئارەزووکردن؛ بەڵێ، ئەگەر نەگەیشتبێتە رادەی ئارەزووکردن، ئەوە تەماشاکردنی زەکەریشی دروستە.

هەر شوێنێکی ئینسان کە تەماشاکردنی بۆ پیاو یا بۆ ژن حەرام بێ، دەس لێ‌دانیشی حەرامە، چ بە رووتی‌و چ لەسەر جلەوە و خواه ئەمین بێ لە فیتنەی نەفس یا ئەمین نەبێ وە بە ئارەزووەوە بێ یا بە بێ‌ئارەزوو؛ هەروەها، حەرامە تەماشاکردنی نێرینەی گەورە بۆ نێرینەیەك کە لەوانە بێ حەزی لێ بکرێ‌و جوان بێ‌و هێشتا مووی لێ‌نەڕوابێ، خواه بە ئارەزووی نەفسەوە بێ یا بە بێ‌ئارەزوو؛ هەروەها، ئەگەر ناشیرینیش بێ، تەماشاکردنی بە ئارەزووەوە هەر حەرامە.

هەر پارچەیەك لە کەسێك کە تەماشاکردنی حەرام بێ، ئەگەر جیایش بکرێتەوە لێی، هێشتا تەماشاکردنی هەر حەرامە، هەتا وەکوو مووی سەرو بەرو زولفو پەلکەو نینۆك‌و ئەو پارچانەی‌تری کە داپۆشینیان پێویستە.

حەرامە بە تەنها دانیشتنی پیاو لەگەڵ ژندا لە شوێنێکی خەڵوەتی‌واداکە کەسیان تیا نەیەت بەسەرا و سەفەرکردنیش لەگەڵیا حەرامە، هەروەها بە تەنها دانیشتن یا سەفەرکردنی دوو پیاو لەگەڵ ژنێکدا؛ بەڵێ، قەیدی نییە بە تەنها دانیشتن یا

سەفەرکردنی یەك پیاو لەگەڵ دوو ژنی باوەڕ پێکراوا؛ هەروەها، حەرامە بەتەنها دانیشتن لەگەڵ کوڕێکا کە تووکی لێ نەهاتبێ.

ئەوەی کە باسمان کرد لەم تەماشاکراوە حەرامانە، لەبەر ناچاری تەماشاکردنیان دروستە بۆ دوکتۆر یا خوێنگر یا کەڵەشاخگر، بەو شەرتە کە ئەو ئیشە بە ژن نەکرێ بەنیسبەت ژنەوە، یا پیاوی بۆ دەس‌نەکەوێ بەنیسبەت پیاوەوە و تا موسوڵمان دەس‌بکەوێ، دروست نییە ئەو تەداوییە لای کافر بکرێ و لەکاتێکا کە تەداویی پیاو لای ژن یا تەداویی ژن لای پیاو بکرێ، ئەبێ مەحرەمێکی لەگەڵدا بێ، یاکۆمەڵە ژنێکی باوەڕپێ‌کراوی لەگەڵدا بێ بەنیسبەت ژنە تەداوی کراوەکەوە.

هەروەها، دروستە تەماشاکردنی پیاو بۆ ژن و ژن بۆ پیاو لەبەر کڕینو فرۆشتنو موعامەلەی‌تر و ئاگاداربوون لە شتێ کە پاشان شەهادەتی لەسەر بدرێ، یا بۆ شەهادەت‌دان وە بۆ فێرکردنی شتێ کە خوێندنی قازانجی هەبێ بۆ کابرا خۆی‌و بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان، هەرچەند واجبیش نەبێ.

دروستە ژن و پیاوی مەحرەم تەماشای یەکتر بکەن تەنها ناوبەینی ناوك و ئەژنۆیان نەبێ؛ هەروەها، تەماشاکردنی ژن بۆ ژنو پیاو بۆ پیاویش دروستە تەنها بۆ ئەو ئەندازەیە نەبێ؛ بەڵێ، حەرامە ژنەکافر تەماشای زیاتر لە دەم و چاوو دەستو پێی ژنە موسوڵمان بکا، ئەوەندەی کە لە ئیش‌کردنا دەرئەکەوێ؛ هەروەها، حەرامە لەسەر ژنە موسوڵمان خۆی دەربخا بۆ ژنەکافر وە بەشێوەیەکی گشتی، هەر شوێنێ کە تەماشاکردنی دروست بێ، تەماشاکردنی بە ئارەزووەوە حەرامە وە بە هەموو جۆرێ دروستە ژن و مێرد تەماشای هەر شوێنێکی یەکتری بکەن وە حەرامە دوو پیاو یا دوو ژنی رووت لەژێر یەك نوێندا رابکشێن و کە منداڵ بوو بە دەساڵان، ئەبێ نێرینە لە خوشك و دایکیو مێیینە لە باوك و برای جیا بکرێتەوە، واتە نەهێڵرێ پێکەوە بخەون؛ بەڵێ، هەندێ لە زانایانی شەرع فەرموویانە: واجب نییە جیا بکرێنەوە لە باوك و دایکیان.

سوننەتە لەکاتی بەیەك‌گەیشتنی دوو پیاو یا دوو ژندا، پیاو دەس بنێتە ناو دەستی پیاوو ژن دەس بنێتە ناو دەستی ژن، هەروەها پیاوو ژنی مەحرەم دەس بنێنە ناو دەستی

**یەك؛ بەڵێ، کەراهەتی هەیە دەس‌کردنە مل، مەگەر بۆ کەسێك کە لە سەفەرێکی دوور هاتبێتەوە، یا بۆ دووکەس کە ماوەیەکی زۆر بێ لە یەك برِا بن و دروستە ماچ‌کردنی منالّی بچووك کە نەگەیشتبێتە رادەی حەز لێ کردن.**

**سوننەتە ماچ‌کردنی دەستی پیاوی خاوەن عیلم و دیانەت و شەرافەت و هەستان لەبەری و ئەم دەس ماچ‌کردن‌و هەستانەوەیە، کەراهەتی هەیە بۆ پیاوی دنیایی بکرێ، مەگەر لەحاڵێکا کە ئەگەر هەڵنەسێتەوە، یا دەستی ماچ نەکا، تووشی زیانێك ببێ، بەڵام کورِنووش بردن بۆ هەرکەس و لەبەر هەر هۆیەك بێ، حەرامە؛ هەروەها، دەس‌خستنە ناو دەستی گول و بەڵەك و دەردەداری نابار، کەراهەتی هەیە و ماچ‌کردنی نـاوچاوی مردوو لەبەر خۆشەویستی، دروستە.**

**بزانن! فەرمانی حیجاب (آیة الحِجاب) [1] لەناو موسوڵمانانا، تەنها بۆ حەرەمەکانی**

---

[١. مەبەست لە ئایەتی حیجاب (ئایەتی پەردە) ئایەی ٥٣ی سوورەتی ئەحزابە کە ئەفەرموێ: «وَ إِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَسْئَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ» واتە: هەر کاتێ داوای شتێکتان کرد لە وان (لە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ) لە پشت پەردەوە داوایان لێ‌بکەن، بەڵام حیجاب بە مانای خۆداپۆشین لە عاستی نامەحرەم لەسەر ژنان و کچانی پێغەمبەر و ژنانی موسوڵمان واجبە بەبێ جیاوازی. لە دوو شوێنی قورئانی پیرۆزدا، سەبارەت بە «حِجاب» (خۆداپۆشین) باس‌کراوە (ئایەتی ٣١ی سوورەی "نوور" و ئایەتی ٥٩ی سوورەتی "ئەحزاب" و لە هەردوو شوێنەکەدا، بە ئاشکرا ناوی ژنانی موسوڵمانیش براوەو فەرمانەکە بۆ ئەوانیشە؛ «مامۆستا مەلا عەبدولکەریم» خۆی، لە تەفسیری ئەو دوو ئایەتەدا، ئاوای فەرمووە:

ئایەتی ٣١ی نوور: «... بفەرموو بەو ژنانە کە باوەڕیان کردووە چاویان دابخەن لە تەماشاکردنی نامەحرەم‌و عەورەتی خۆیان بپارێزن لە لەزەت پێ‌وەرگرتنی ناشەرعی‌و دەری‌نەخەن بۆ تەماشاکردنی نامەحرەم... وە با سەرپۆشەکانیان بگەیەنن بە بەرۆکیان بۆ ئەوە کە مل و سنگیان داپۆشن....

... وە "ئەبوداود، ریوایەتی کردووە لە عائیشەوە ـخ ـکە حەزرەتﷺ فەرمووی بە ئەی ئەسما! ئافرەت کە حەیزی پێداهات ـواتە باڵغ بوو ـ ئیتر دروست نییە لەدەم و چاو و هەردوو لەپی بەولاوە دەربخات...".

بە لێ، کاتێ ژنێ ئاگادار بوو لەوە کە لە رێگەو بانا نامەحرەم تەماشای ئەکەن، ئەوە پێویستە بەگوێرەی توانا، خۆی بپارێزی و سەرودەم و چاوی داپۆشێ...».

تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز، بەرگی پێنجەم، ل: ٤٦٠ ـ ٣٤٤.

حەزرەتی پێغەمبەر هاتووەو هەر لەسەر ئەوان پێویستبووە لەکاتی داواکردنی شتێك لێیان لە پشت پەردەوە بن. وە لەوان بەولاوە هیچ ئافرەتێکی موسوڵمان واجب نییە لەسەری لە پشت پەردەوە وەڵام بداتەوە، تەنها ئەوەندە واجبە لەسەری جگە لە دەم و چاو و هەردوو دەستی هەموو ئەندامی داپۆشێ و پیاو تەماشای ژن و ژن تەماشای پیاوی نامەحرەم نەکا، تەنها لەو حاڵانەدا نەبێ کە جیاکراونەتەوە، وەك دەرمانکردن و دەرس‌پێ‌وتن و موعامەلەکردن، وەکوو بەیانمان کرد.

بەڵێ، دروستە بۆ فەرمانداری موسوڵمانان لەبەر قازانجی گشتی مەنعی ژنان بکا لەوەکە بەبێ رووپۆش بچنە دەرەوەو فەرمان بدا بە رووداپۆشین؛ هەر وەکوو ئەگەر ژنێك ئەیزانی پیاوی نامەحرەم تەماشای ئەکا، واجبە لەسەری رووی داپۆشی؛ هەروەها، ئەگەر پیاوێك ئەیزانی کە ژنێکی نامەحرەم تەماشای ئەکا ئەبێ ئەوەندەی پێی بکرێ خۆی لێ دوور بگرێ.

پێویستە کە ئینسان، ویستی بڕواتەماڵێکەوە، بدا لە دەرگاو داوای رێگادان بکا لە ئەهلی ئەو ماڵە، جا ئەگەر رێگایان دا بچێتە ژوورەوە، ئەگینا بگەڕێتە دواوە، بەتایبەتی ئەگەر وەختەکە وەختی حەسانەوە بوو. حەرامە ئینسان لە پەنجەرەو سەربان و دەرگاو دەلاقەو شتی‌واوە سەیری ناوماڵ و حەوشی خێزانی نامەحرەم بکا، هەتاوەکوو ئەگەر جارێك دەریان کردو دەس‌بەردار نەبوو، دروستە بیدەنەبەر بەردو رێی لێ‌بگرن.

---

☞

ئایەتی ٥٩ی ئەحزاب: «"ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! تۆ بە خێزانەکانت و کچەکانت و ژنانی موسوڵمانان بفەرموو: با چارشێوەکەیان بدەن بە سەر خۆیاناو نزیکی بخەنەوە لە روخسار و گەردنیان؛..."

... مەبەس ئەمەیە کە ئافرەتانی جیهانی ئیسلام خاوەن‌ئەدەب و خاوەن شەرم بن‌و کارێکی وانەکەن کە فاسقەکان تەعەرروزیان بۆ بکەن و باسی ئەحواڵیان بکەن.

واتە: بەسەر پۆشەکەیان زۆربەی روویان داپۆشن هەتا نەبەن بە سینەمای بەدڕەوشت و سەرسەریان».

تەفسیری نامی، بەرگی شەشەم، ل. ٩ ـ ٦٦.

لەم باسەدا هەڵەیەکی چاپی هەبوو، بەگەڕانەوە بۆ سەر «مغني المحتاج» و «إعانة الطالبين» راستمان کردەوە.] «بلاّوکردنەوەی کوردستان»

## خوازبینی

سوننەتە بۆ کەسێك کە ئارەزووی داواکردنی ژنێکی هەبێ، خۆی یا وەکیلی، خوازبینی بکا لە ژنەکە خۆی یا لە وەلیئەمرەکەی بە قسەی بێپێچ و پەنا یا بە مەعنا، بەو شەرتە ئەو ژنە لە نیکاحی کەسێکیترا نەبێو لە «عِدّە»دا نەبێ و بە هیچجۆر دروست نییە خوازبینیکردنی ژنێك کە لە نیکاحی کەسێکیترا بێ یا لە «عدّة»ی تەڵاقی «رِجعی»دا بێ، یاخود لەپێشا یەکێکیتر خوازبینی کردبێو بە بێپێچ و پەنا خوازبینییەکەی قەبووڵ کرابێ، مەگەر ژنەکە خۆی واز لە خوازبینیکەرە پێشووەکەی بێنێ یا رێگای خوازبینیکەرە تازەکە بدا وە ژنێك کە لە «عدّة»ی وەفات یا لە «عدّة»ی تەڵاقی بائینەدا بێ، دروستە بەمەعناوە خوازبینی لێ بکرێ، بەڵام بەئاشکرا دروست نییە.

خوازبینی بێپێچو پەنا (صَرِیح)، بە لەفزێك ئەڵێن بە قەتعی ئەوە بگەیەنێت کە ئەو کەسە ئارەزووی لە خواستنی ئەو ژنەیە، وەکوو ئەوەکە بڵێ، ئارەزووم هەیە کە مارەت بکەم وە خوازبینی بەمەعنا (تَعریض) لەفزێکە ئەوەیش هەڵبگرێو مەعنایتریش بگەیەنێ، وەکوو ئەوەکە بڵێ: هەرکاتێ کە «عِدّە»ت تەواو بوو پێم بڵێ، یاخود بڵێ: کێ هاورێی وەکوو توی دەس ئەکەوێ.

سوننەتە بۆ خوازبینیکەر لەپێش خوازبینیکردنەکەیدا خوتبەیەك بخوێنێتەوە، وەکوو: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَ الصَّلاٰةُ عَلىٰ رَسُولِ اللّٰهِ، أُوصيكُمْ بِتَقْوَى اللّٰهِ، جِئْتُكُمْ راغِباً في فَتٰاتِكُمْ...»، هەروەها سوننەتە وەلیئەمری ئافرەتەکەیش بە خوتبەیەك وەرامی بداتەوە.

بزانن! سوننەتە بۆ وەلیئەمری ئافرەتیش بگەڕێ بەدوای ئینسانی باشا بۆ ئەوەکە بیکا بە خزمی خۆی وە ئەگەر کەسێکی باشی دەس کەوت، وەك خوازبینی پێی بڵێ: ئارەزووم هەیە کچی خۆمت بدەمێ، یا ئارەزووم هەیە لە نزیکی تۆ.

## ئەركانی نیكاح

ئەوەی لە عەقدی نیكاحدا پێویستە، پێنج شتە: مێرد (زَوْج)؛ ژن (زَوْجة)؛ بەشوودەری ژنەكە (ولي أمر)؛ شاهید؛ لەفزی مارەبرین (صیغة).

شەرتی مێرد چەند شتە؛

یەكەم، ئەوەیە دیاری بێ؛ كەواتە، ئەگەر كەسێك وتی بە دوو كەس: وا كچەكەم مارەكرد لە یەكێكتان، ئەوە بەتاڵە، هەرچەند نیازی یەكێكی تایەتی بیێ و ئەوكەسەیش كە قەبووڵی ئەكا نیازی خۆی هەبێ.

دووەم، ئەوەیە مەحرەمی ژنەكە نەبێ بە نەسەب یا بە شیرخواردن یا بەهۆی ژن و ژنخوازەوە، وەك دایك یا كچی ژنەكە كە مارە ئەكرێ.

سێهەم، ئەوەیە مەحرەمێكی ژنەكە لە نیكاحیا نەبێ یا لە «عِدّە»ی تەلاقی «رِجعیّة»یدا نەبێ؛ كەواتە، ئەگەر كەسێك مەحرەمێكی بەسەر مەحرەمێكا مارە كرد، ئەوە عەقدی ئەمەی دووهەم بەتاڵە وە ئەگەر هەردووكیانی بە یەك عەقد وەرگرت، وەك ئەوەكە خۆی لەگەڵ وەكیلیدا بەجارێك قەبووڵی عەقدی ژنێك و خوشكی ئەو ژنەیان كرد، ئەوە هەردوو عەقدەكە بەتاڵە.

چوارەم، ئەوەیە كە غەیری ئەم ژنەی ئێستە ئەیەوێ مارەی بكا چوار ژنی تری لەژێر نیكاحدا نەبێ، هەرچەند یەكێكیشیان لە «عِدّە»ی تەلاقی «رِجعیّة»دا بێ؛ كەواتە، هەر عەقدێك بەسەر زیاتر لە چوار ژندا بڕوا، بەتاڵە وە ئەگەر بەجارێ هەڵكەوت قەبووڵی نیكاحی پێنج ژنی كرد، ئەوە عەقدی هەموویان بەتاڵە.

پێنجەم، ئەوەیە كابرا لە ئیحرامدا نەبێ؛ كەواتە ئەگەر ئەو كەسەی كەوا لە ئیحراما خۆی یا وەكیلی قەبووڵی نیكاحی ژنێكی كرد، ئەوە بەتاڵە.

شەشەم، ئەوەیە موختار بێ، یەعنی بە مەیل و ئارەزووی خۆی ژنەكە مارە بكا وە ئەگەر بە زۆری یەكێك مارەی بكا، بەتاڵە، مەگەر ژنێك كە تەلاقی «بائِن» درابێ بە بێتەسلیمكردنی حەقی قەسمی خۆی، واتە حەقی شەو لە لا نووستنی، ئەوە قازی ئەتوانێ زۆر بكا لەو كابرایە ژنەكەی مارە بكاتەوەو حەقی قەسمی بۆ جێبەجێ بكا.

حەوتەم، ئەوەیە هاوکوفی ژنەکە بێ، یەعنی لە چوار شتدا لە سیفاتی کەفائەت وەکوو یەك بن یا ئەم لەو زیاتر بێ، وەك ئایین و ئازادی و نەسەب و پیشە و لە سیفەتی پێنجەمدا ـ کەوا سەلامەتییە لە عەیبەکانی نیکاح (وەك شلەپەتکەیی و ئالەت براوی) ـ ئەبێ بەری بێ لەو عەیبە، هەرچەند ژنەکەیش ئەو عەیبەی تیابێ، ئەگینا بە بێ ئیزنی ژنەکەو حەقدارەکەی، ئەو نیکاحە بەتاڵە.

هەشتەم، ئەوەیە ئەوەندەی «مَهرُالمِثل»ی ژنەکەی هەبێ، ئەگەر ژنەکەی بە بێ ئیزنی خۆی لێ مارەکرابێ، واتە باوکی لەخۆیەوە مارەی بڕیبێ.

نۆهەم، ئەوەیە ژنەکە بە تەواوی نەناسراو نەبێ لای.

شەرتی ژن (زوجة)یش، چەند شتە؛

[شەرتی] یەکەم، ئەوەیە نیکاحی کەسی تری بەسەرەوە نەبێ و لە «عِدّە»ی کەسێکی تردا نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر ژنێك وتی: نیکاح و «عِدّە»ی کەسی بەسەرەوە نییەو داوای کرد مارە ببڕێ لە کەسێك، ئەوە دروستە بۆ قازی و بۆ غەیری قازی مارەی ببڕن؛ هەروەها، ئەگەر وتی: مێردەکەی مردووە یا تەڵاقی داوەو «عِدّە»یشی بەسەر چووە، ئەوە دروستە قازی و غەیری قازی مارەی ببڕن، بەو شەرتە کە مێردەکەی دیاری نەبێ و خۆیشی ناوی نەبا، یەعنی دروستە بۆ قازی مارەی بکا لەو کەسەی کە ئەیەوێ بیهێنێ وە دروستە بۆ «ولي أمر»ی ژنەکەیش مارەی بکا لەو کەسەی کە ئەیەوێ بیهێنێ، بەو شەرتە کە باوەڕیان بە قسەکەی بێ، هەرچەند لەم حاڵەیشدا وا باشترە راوەستن تا ئیسپاتی مردنی مێردەکەی یا تەڵاقدرانی خۆی ئەکا، بەڵام ئەگەر ناوی مێردەکەی برد، ئەوە دروست نییە بۆ قازی مارەی ببڕێ تا ئیسپاتی مردنی مێردەکەی یا تەڵاقدرانی خۆی ئەکا.

ئەم تەفسیلاتە بۆ کاتێکە مێردە پێشووەکەی ئینکاری ئەوە نەکا کە تەڵاقی داوە، ئەگینا هەروەکوو بۆ قازی دروست نییە مارەی ببڕێ، بۆ «ولی أمر»یشی دروست نییە تا ئیسپاتی تەڵاقدانەکەی ئەکرێ؛ هەروەها، بۆ هیچ مەلایەکیش دروست نییە عەقدی نیکاحەکەی بکا بەر لە ئیسپاتبوونی تەڵاق درانەکەی.

بەڵێ، ئەگەر ژنێك شووی كرد بە كابرایەك و لەپاش عەقدەكە، پیاوێكی‌تر هات و وتی: ئەم ژنە، ژنی منەو تەڵاقم نەداوە و ژنەكەیش وتی: تەڵاقت داوم، بەڵام بۆی ئیسپات نەكرا كە تەڵاقی داوە، ئەوە ئەگەر بە شاهید یا بە پێ‌لێنانی ژنەكە لەپێش ئەم عەقدی دووهەمەدا سابت بوو كە زووژنی ئەو كابرا بووە، واجبە جیا بكرێتەوە لەم مێردە دووهەمەی و لەپاش تەواوكردنی «عِدّە»ی شوبهە ئەدرێتەوە دەستی كابرای كۆنە مێردی وە ئەگەر مەعلووم نەبوو ئاخۆ وەختی خۆی ژنی ئەو كابرایە بووە یا نە، ئەوە ئەگەر ژنەكە ئیزنی دابوو بۆ مارەبڕینی خۆی لە مێردی دووهەم یاخود مەجالی ئەوەی دابوو كە مێردی دووهەم بچێتە لای، ئەوە هەر لای ئەم مێردی دووهەمە ئەمێنێتەوە وە ئەگەر نە ئیزنی دابوو بۆ نیكاحەكە (وەكوو ئەوەكە باوكی مارەی بڕیبێ) و نە مەجالی ئەوەیشی دابوو بچێتە لای، مێردی یەكەم سوێند ئەخوا لەسەر ئیددیعاكەی خۆی و ژنەكەی ئەباتەوە.

**شەرتی دووهەم**، ئەوەیە «مُختارة»بێ و بە ئیزن و مەیلی خۆی شوو بكا، مەگەر كاتێك كە وەلییەكەی «وَلی مُجبِر» بێ‌و شەرتی عەقدی ئیجباریش بێتەجێ.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە لە ئیحراما نەبێ.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە كە ژنەكە دیاری بێ؛ بەڵێ، ئەگەر وەلی‌ئەمر وتی بە داواكەری ژن: وا یەكێك لە كچەكانم لێ مارە كردی‌و كابرایش قەبووڵی كرد و هەردووكیان نیازی كچێكی تایبەتییان هەبوو، ئەوە نیكاحەكە دائەمەزرێ بەپێچەوانەی مەسئەلەی مێردەوە، وەكوو باسمان كرد؛ بەڵێ، ئەگەر مێردەكەو وەلی‌ئەمری كچەكە نیازیان جیا بوو لەیەك، ئەوە بەتاڵە وە ئەگەر لەپاش مردنی وەلی‌ئەمری كچەكە، مێردەكە داوای یەكێك لە كچەكانی كابرای مردووی كردو وتی: وەختی خۆی منیش‌و وەلی‌ئەمرەكەیش ئەم كچەمان مەبەست بووە، بەڵام كچەكە وتی: من مەبەست نەبووم، ئەوە باوەڕ بە سوێندی كچەكە ئەكرێ، هەرچەند شاهید شاهیدی بدەن لەسەر ڕاستی قسەی كابرای مێرد، چونكە شاهید ئاگای لە نیازی دڵ نییە.

ئەگەر كەسێك كچێكی هەبوو ناوی گوڵچین بوو ـ مەسەلا ـ وە وتی بەكەسێك: وا گوڵچینم لێ مارە كردیت وە نەیوت: گوڵچینی كچم، ئەوە ئەو عەقدە بەتاڵە، مەگەر

لەحاڵێکا کە وەلی ئەمرو مێرد هەردووکیان مەبەستیان ئەو گوڵچین ناوە بێ وە ئەگەر لەباتی گوڵچین، وتی: وا زێڕینی کچم لێ مارە بڕیت، ئەوە دروستە، لەبەر ئەوە مادام وتوویە: «کچم»، ئەم سیفەتە لە ناوەکەی دامەزراوترە، چونکە ئەم سیفەتە ناگۆڕێ، بەڵام ناو لەوانەیە بگۆڕێ.

هەروەها، دروستە ئەگەر ئیشارەت بکا بۆ گوڵچین و بڵێ: ئەم زێڕین ناوەی کچم لێ مارە کردی لەبەر ئەوە ئەو دیاریکردنە کە لە ئیشارەتەکەوە پەیدا بووە گەلێ لە دیاریکردنی ناوە کە بەهێزترە، بەڵام ئەگەر بە بێ ئیشارەت و بە بێ ئەوە کە بڵێ: کچەکەم، هەروتی: وا زێڕینم لێ مارەکردی وکچەکەیشی ناوی زێڕین نەبوو، ئەوە ئەو عەقدە بەتاڵە وە ئەگەر وتی: گوڵچینی کچە گەورەم لێ مارە کردی و کچە گەورەکەیشی ناوی گوڵچین نەبوو، ئەوە نیکاحەکە دائەمەزرێ، چونکە ئیعتیباری سیفەتەکە زۆرترە لە ناوەکەی؛ هەروەها، پێچەوانەی ئەمەیش؛ مەسەلا، بڵێ: زێڕینی کچە بچووکم لێ مارە کردی، کەچی کچە بچووکەکەی ناوی زێڕین نەبێ، ئەوەش هەر دروستە.

شەرتی پێنجەم، ئەوەیە کچەکە مەحرەمی خوازبینیکەرەکەی نەبێ، نە بە نەسەب و نە بە شیرخواردن (رِضاع)و نە بەهۆی ژن و ژنخواز (مُصاهَرە)وە، وەك کچی ژنی خۆی.

شەرتی شەشەم، ئەوەیە موسوڵمان یاخود «کِتابیّە»یەکی ساغ بێ کە بریتییە لە گاورو جوولەکە؛ کەواتە، ژنهێنان لە بتپەرست و ئاگرپەرست و شتیوا دروست نییە تا موسوڵمان ئەبێ؛ جا ئەگەر ژنە کیتابییەکە، «اسرائیلیّة» بوو، یەعنی لە ئەولادی حەزرەتی «یعقوب» بوو ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ ئەوە بەشەرت گیراوە نەزانرێ باپیرە گەورەی وەختێ بووە بە جوولەکە کە "حەزرەتی عیسا" ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ بووە بە پێغەمبەر، هەرچەند بزانرێ لەپاش دەس تێوەردانی تەورات و ئاینیی "حەزرەتی موسی" بووە بە جوولەکە وە ئەگەر «اسرائیلیّة» نەبێ، ئەوە مارەکردنی زەحمەتترە، چونکە بە شەرتگیراوە بزانرێ باپیرە گەورەی لەکاتێکا هاتووەتە ئەو دینەوە کە هێشتا شەریعەتێکی تر نەهاتبێ شەریعەتەکەی ئەوان هەڵوەشێنێتەوە، هەرچەند لەپاش

دەس تێوەردانی ئەو شەریعەتە چووبنە ناوی، بەو شەرتە کە خۆیان لەو ئەندازە دەس تێوەردراوە لادابێ، زانینی ئەمەیش یا بەهۆی «تَواتُر»ەوە ئەبێ لە کافرەوە یا لە موسوڵمانەوە، یاخود بەهۆی ئەوە کە دوو شاهیدی نێرینە لە خۆیان کە موسوڵمان بووبن، بێن شاهیدی بدەن و ئەمەیش شتێکی گەلێك گرانە، لەبەر ئەوە زانایانی شەرع بڕیاریان وایە مارەکردنی جوولەکەو گاور دروست نییە بەر لە موسوڵمان بوونیان.

شەرتی وەلیئەمریش، هەشت شتە؛

(یەکەم)، ئەوەیە نێرینە بێ؛ کەواتە، ژن نابێ بە وەلیئەمری نیکاح و ناتوانێ خۆی مارە ببڕێ یا ژنێکیتر مارە ببڕێ، نە بە ویلایەتو نە بە وەکالەت، وەکوو ناتوانێ قەبووڵی نیکاحیش بکا بە وەکالەتی شەخسی؛

(دووەم)، ئەوەیە ئازاد بێ؛ کەواتە، بەندە ویلایەتی نیکاحی بۆ نییە؛

(سێهەم)، ئەوەیە موختار بێ، یەعنی بە ئارەزووی خۆی ژنەکە مارە ببڕێ و بە زۆری کەس نەبێ؛

(چوارەم)، ئەوەیە لە ئیحراما نەبێ، چ ئیحرامی حەج و چ ئیحرامی عەمرە؛ کەواتە، ناتوانێ لەماوەی ئیحراما کچی خۆی بە ویلایەت، یا کچی کەسێکیتر بە وەکالەت مارە ببڕێ؛ هەروەها، ناتوانێ یەکێکی وا بکا بە وەکیل کە لە ئیحراما نەبێ، بۆ مارەبڕینی کچەکەی؛

(پێنجەم)، ئەوەیە بیری تێكنەچووبێ بەهۆی نەخۆشی یا پیری یا بێهۆشی یا شێتییەوە؛ بەڵێ، ئەگەر شێتییەکەی پچڕ پچڕ بوو و ماوەکەی کەم بوو، رائەوەستین تا چاك ئەبێتەوە، ئەو کاتە ئەتوانێ ژن مارە ببڕێ؛

(شەشەم)، ئەوەیە ئایینی جیا نەبێ لە ئایینی ئەو ئافرەتەی کە ئەیدا بە شوو؛ کەواتە، ئەگەر کچە جوولەکەیەك موسوڵمان بوو، باوکی ناتوانێ مارەی ببڕێ، بەڵکوو ئەدرێتە دەستی قازی؛

(حەوتەم)، ئەوەیە روشدی هەبێ، یەعنی بەهۆی سەفاهەتەوە حیجری لەسەر دانەنرابێ؛

(هەشتەم)، ئەوەیە عادڵ بێ؛ مەبەست لەم عەداڵەتە ئەوەیە فاسق نەبێ، نەك ئەوەکە خاوەنی نەفسێکی‌وا بێ مەنعی بکا لە گوناهی گەورەو بەردەوام بوون لەسەر گوناهی بچووك؛ کەواتە، ئەگەر منداڵێك باڵغ بوو، بە بێ‌ئەوەی مانیعێکی ویلایەتی پێوە بێ و گورج خوشکەکەی خۆی مارەبڕی لە کەسێك، ئەوە دروستە وە ئەگەر فاسق تۆبەی کردو گورج کچەکەی مارەبڕی، ئەوە دروستە؛ بەڵێ، شەرت نییە بۆ وەلی‌ئەمری گشتی، واتە گەورەی موسوڵمانان و بۆ جێ‌نشینەکانی وەك ئەو قازییانەی کە لە ناوچەکاندان، عەداڵەتیان ببێ؛ کەواتە، دروستە بە ویلایەتی گشتی کچی خۆی و موسوڵمانانی‌تریش مارە ببڕێ.

بزانن! بەهۆی زیددی ئەو سیفەتانەوە کە بەیانمان کردن، وەکوو منداڵی و شێتی و فاسقی و تێکچوونی عەقڵ‌و حیجر لەسەر دانان، ویلایەت نەقڵ ئەبێ لە وەلی‌ئەمری نزیکەوە بۆ وەلی‌ئەمری پاش خۆی، یەعنی لە باوکەوە بۆ باپیرە وە لە براوە بۆ برازا وە هەر بەم‌تەرتیبە وە لەم حاڵانەدا مادام وەلی‌ئەمری دوور ببێ، ویلایەت ناڕوا بۆ قازی؛ بەڵێ، لە چەند ماددەیەکدا ویلایەت نەقڵ ئەبێ بۆ قازی، وەکوو کاتێ کە وەلی‌ئەمری بە نەسەب هەر نەبێ، یا بێ‌سەرو شوێن رۆیشتبێ، یاخود مەسافەی دوو مەنزڵ رێ دوور بێ، یاخود حازر بێ بەڵام خۆی شاردبێتەوە، یا هەر لەبەر خۆ بە گەورەگرتن نەیەت ئافرەتەکە مارە ببڕێ‌و وەکیلیش نەگرێ، یاخود حەپس کرابێ‌و مەجالیش نەبێ وەکیل بگرێ، یاخود لە ئیحراما بێ، یاخود یەك دوو جار رێگای کچی خۆی نەدابێ شوو بکا بە کەسێکی هاوکوف.

شاهیدیش، چەند شەرتێکی هەیە، واتە ئەبێ ئازاد و نێرینە و باڵغ‌و عاقڵ و عادڵ و خاوەن چاوو گوێ‌و زمان بێ و دیاریش نەبێ بۆ ویلایەت، واتە خۆی ژن بە شوودەر نەبێ؛ کەواتە، شەهادەتی بەندەو ژن‌و منداڵ‌و شێت و فاسق‌و کوێرو کەڕو لاڵ دروست نییە؛ هەروەها، ئەگەر شاهید چاوساغ بێ، بەڵام مارەبڕینە کە لە شوێنێکی‌وادا بێ کە شاهیدەکە چاوی نەبێ لە وەلی‌ئەمرو مێردو ژنەوە، ئەوە ئەو عەقدە بەتاڵە.

وە ئەگەر باوکی کچ، کەسێکی کرد بە وەکیلی خۆی بۆ مارەبڕینی کچەکەی و خۆی لەگەڵ کەسێکی‌ترا بوون بە شاهید، ئەوە بەتاڵە، هەروەها برای تاقانەیش؛ بەڵێ، ئەگەر

برایەك لە سێ برا، ژنەکەی مارە بڕی تەنها لەلایەنی خۆیەوە بە بێ وەکالەتی براکانی تری، بەو رەنگە کە داواکەری ژنەکە هاوکوفی بێ و ژنەکەیش هەر ئیزنی ئەم برایەی دابێ بۆ عەقدی نیکاحەکەی و ئەو دوو براکە بوون بە شاهید، ئەوە دروستە، بەڵام ئەگەر کابراکە داوای کچەکەی کردووە هاوکوفی نەبێ و ڕێگادانی براکانی کچەکەی پێویست بێ و ئەو دوو براکە ئەم برایە بکەن بە وەکیل، یاخود ژنەکە ئیزنی ئەوانی دابوو بۆ عەقدی نیکاحەکەو ئەوان ئەمیان کردبوو بە وەکیل، ئەوە لەم سوورەتانەدا، دروست نییە ئەو دوو برایە بین بە شاهیدی عەقدی نیکاحەکە.

بەشەرت گیراوە شاهیدەکان لەکاتی مارەبڕینەکەدا مەعنای قسەی وەلی ئەمرو مێرد حاڵی بین، ئەگینا ئەگەر لەو کاتەدا لێی حاڵی نەبوون و لەپاشا بۆیان وەرگێڕان، ئەوە عەقدەکە بەتاڵە و دروستە شاهیدی نیکاح، دووکوڕی مێردەکە یا ژنەکە، یاکوڕێکی ئەم و کوڕێکی ئەو بێ، یا دوو دوژمنی مێردەکە یا ژنەکە یا دوژمنێکی ئەم و دوژمنێکی ئەو بێ، چونکە تێکڕا شەهادەتدانی ئەمانە دروستە.

بزانن! واجبە شاهیدەکان ژنەکە بناسن، بەشێوەیەکی شەخسی یا بە ناوو نەسەب، بەجۆرێك کە شوبهە نەمێنێ لەوەدا کە ئەو ئافرەتە کێیە، وەك ئەوە کە بزانن فڵانی کچی فڵانە، یاخود سەروچاوی ببینن بەجۆرێ کە بیناسنەوەو جیای بکەنەوە لە کەسێکی تر، خواه ئەم ناسینە یا ئەم چاو پێ کەوتنە لەپێش عەقدەکەدا بێ یا لەپاش عەقدەکە؛ کەواتە، ئەگەر ئەو شاهیدانە لەکاتی مارەبڕینەکەدا ژنەکەیان نەئەناسی، بەڵام لە پاشان خۆی دەرخست بۆیان یا ناوونیشانی خۆی بۆ هەڵدان، ئەوە ئەو عەقدە دروستە، وەکوو لە «تُحفە»دا بەیانی فەرمووە.

بزانن! عەدالەتی شاهید بریتییە لەوەکە حاڵەتێکی نەفسی وای تیابێ مەنعی بکا لە گوناهی گەورەو دەوامکردن لەسەر گوناهی وردە؛ کەواتە، ئەگەر فاسقێك ئێستە تەوبە بکا، ئەوە دەس بەجێ ناکرێ بە شاهید تا ماوەی پاکەوەبوونی بەسەرا نەڕوا بە بێ گوناه کە بریتییە لە ساڵێك، بەڵام بە زاهیری شەرع، دروستە عەقدی نیکاح بە دوو پیاوی واکە بە ئاشکرا دادپەروەر بن و تەحقیقی ئەحواڵیان نەکرابێ کە ئاخۆ لە راستیشدا وان یا نە،

ئەمجۆرەکەسانە پێیان ئەوترێ: «مَستُورالعَدالة»، بەڵام نیکاحکردن بە شەهادەتی ئینسانی «مَستُورالاسلام» دروست نییە کە بە زاهیر موسوڵمان بن‌و حەقیقەتی ئەحواڵیان نەزانرێ ئاخۆ بەڕاستی موسوڵمانن یا نە؛ بەڵێ، ئەگەر عەقدەکەکراو پاشان دەرکەوت کە موسوڵمانی ڕاستەقینەن، ئەوە عەقدەکە بە دروست دائەنرێ.

بێداری! ئەوەی کە باسمان کرد لەبارەی عەدالەتی وەلی‌ئەمرو شاهیدەوە، فەرموودەی بەهێزی ئیمامی شافیعییە -خوای لێ ڕازی بێ- بەڵام ئیمام فەرموودەیێکی تریشی هەیە کە موسوڵمانان دەمێك زەمانە بە پێی ئەو فەرموودەیە ئەجووڵێنەوەو چینی دووهەمی زانایانی مەزهەبی شافیعی (العُلَماء المُتَأخِّرون)، فتوایان پێ‌داوەو، «ئیمامی غەزالی» و «ابنُ عبدالسّلام» بە ڕاستیان زانیوە، هەروەها ئیمامی «نَوَوی» و «ابنُ الصّلاح» و «سُبْکی» و گەلێك لە زانایانی یەمەن پەسەندیان کردووە، ئەوەش بریتییە لەمەکە عەقدی نیکاح دروستە بە ویلایەتی وەلی‌ئەمری فاسق و بە شەهادەتی شاهیدی فاسق لەزەمانێکا کە فاسقی بڵاو بووبێتەوەو بەشی زۆری خەڵك فاسق بن؛ بۆ ئیمڕۆ، چارەیەکی ترمان نییە جگە لە ڕەفتارکردن بەم فەرموودەیە؛ کەواتە، پێویستە لەسەر وەلی‌ئەمرو مێردو ژن‌و شاهیدەکان، تەقلیدی ئەم فەرموودەیە بکەن و ڕازی بن پێی.

تەقلیدکردنی شاهیدەکان هەر بۆ ئەوەیەکە لە حازربوون و هەڵگرتنی شەهادەتەکەدا گوناهبار نەبن، ئەگینا ئەگەر تەقلیدیش نەکەن زیان بە نیکاحەکە ناگات، بەڵام تەقلیدکردنی وەلی‌ئەمر و ژن و مێرد، بۆ دروستبوونی عەقدەکەیشە، یەعنی ئەگەر تەقلید نەکەن، عەقدی نیکاحەکە دانامەرزێ‌و خۆیشیان تاوانبار ئەبن، بۆیە لە کتێبەگەورەکانی شەرعدا، وەکوو «تحفە»، ئەفەرموێت: هەر کردارێکی ئایینی کە جێگەی خیلاف بێ لە بەینی پێشەوایانی شەرعدا، دروست نییە بکرێ بە بێ‌تەقلیدکردنی ئەو ئیمامەکە فتوای پێ‌داوەو دایشنامەزرێ بە حوکمی حاکمی شەرع نەبێ وە ئەگەرنە تەقلیدی تیاکراو نە حاکمی شەرع حوکمی تیادا، ئەوە ئیعتیباری پێ‌ناکرێ و شەرع بە بەتاڵ و بێ‌قیمەتی دائەنێ.

هەروەها، ئەگەر تاقە ئیمامێکی «مُجْتَهِد» دوو فەرموودەی ببێ یەکێکی بەهێزو یەکێکی بێهێز وەکابرا بیەوێ بە فەرموودە بێهێزەکە رەفتار بکا بۆ نەفسی خۆی، هەر ئەوەندە پێویستە کە تەقلیدی ئەو ئیمامە یا ئەوکەسانە بکا کە ئەو فەرموودەیان پەسەند کردووە؛ بەڵێ، ئەم مەسئەلە کە فتوایەکی بێهێزی تیا دراوە، نابێ ببرێ بۆلای قازی، چونکە قازی ناچارە حوکم بە فەرموودە بەهێزەکە بداو بێهێزەکە هەڵوەشێنێتەوە.

ئەو قسەیەش کە مەشهوورە ئەڵێن: پێویست نییە ژنەکە تەقلید بکاو تەقلیدی وەلیئەمرەکەی بەسە، ئەوە بۆ عەقدێکە کە وەلیئەمر تیایدا حەقی زۆرکردنی ببێ، یەعنی «ولی مُجبِر»بێ، واتە بە شوودراوەکە کچ بێو داواکەرەکەیشی هاوکوفی بێو ئەوەندەی هەبێ کە بتوانێ «مَهر المِثل»ی کچەکە بداو دوژمنایەتی لە بەینی باوك و کچەکەدا نەبێ، ئەوە لەم سوورەتەدا، پێویست نییە کچەکە بە عەقدەکەیش بزانێ، چجای ئەوەکە ئیزنی بەشوودانی خۆی بدا یا تەقلید بکا، ئەگینا ئەگەر مارەکراو بێوەژن بێ، یا خود کچ بێو وەلیئەمرەکەی براو مام و ئامۆزا بێ، یا هەر باوك و باپیرە بێ بەڵام شەرتەکانی عەقدی بە زۆر (اِجْبار)ی نەهاتبنەجێ، ئەوە بە بێئیزنی ئافرەتەکەو تەقلیدکردنی، عەقدەکە بەتاڵەو دانامەزرێ.

وە ئەگەر لەم سوورەتانەدا، لەپاش عەقدەکە، ژنەکە ئیددیعای کرد کەوا: ئیزنم نەداوە، یا کچەکە وتی: لەکاتی عەقدەکەدا بچووك بووم، یا: باڵغ بووم بەڵام ئیزنم نەداوە، یا: تەقلیدم نەکردووە، ئەوە مادام لەلایەنی مێردەکەوە بە شاهید ئیسپاتی پێچەوانەی قسەی ئافرەتەکە نەکرێ، باوەڕ بە قسەی ئافرەتەکە ئەکرێ بە سوێندو نیکاحەکە بە بەتاڵ دائەنرێ.

بۆ تەقلید، ئەوەندە پێویستە ئەم شەخسە بزانێ ئەم رەفتارە کە ئەیکا لەسەر فەرموودەی هەندێکە لە پێشەوایان و بە دڵ پێی رازی بێ، ئیتر شەرت نییە ناوی ئیمامەکە یا ئەحواڵی بزانێ.

شەرتی سیغەی عەقدیش، چەند شتێکە؛

(یەکەم)، ئیجابە لەلایەنی وەلییەکەوە بە لەفزی «اِنکاح» یا «تَزویج» یا تەرجەمەی ئەمانە کە مارەکردن و بەشوودانە؛

(دووەم)، قەبووڵە لەلایەنی مێردەوە بە عەینی ئەو دوو لەفزە یا تەرجەمەیان، بەجۆرێ کە «مُتّصل» (لکا)بێ بە ئیجابەکەوە و شتێکی وای لەگەڵا بێ ئەوە بگەیەنێ کە ئەو ژنە مارەکراوە؛ مەسەلا، وەلییەکە بڵێ: وا فاتمەی کچم لێ مارەکردی و مێردەکەیش بڵێت: وا قەبووڵی مارەبڕینی فاتمەم کرد بۆ خۆم؛ کەواتە، نیکاح دانامەزرێ بە غەیری ئەو لەفزانە یا بە تەرجەمەیان؛ مەسەلا، بە نووسین یا بە راسپێری، وەکوو ئەوە بڵێت بە کەسێك: برۆ بڵێ بە فڵانکەس فاتمەی کچم لێ مارەکردووە با قەبووڵی بکا، ئەویش کە ئەم قسەیەی بیست، قەبووڵی بکا، ئەوە بەتاڵە.

هەروەها، بە لەفزی فرۆشتن و نەزرو بەخشین و بەکرێدان و بۆ حەڵاڵ کردن، نیکاح دانامەزرێ؛ کەواتە، عەقدی نیکاح دانامەزرێ بەوە کە بڵێ: ئەم کچەم لێ نەزر کردی، یا پێم‌بەخشیت، یا پارچەی ئەوم پێ‌فرۆشتی، یا پێم‌دای بە کرێ، هەموو ئەمانە بێ‌سوودو پووچن؛ هەروەها، ئەگەر لەلایەنی مێردەکەوە لەفزێکی وا نەبێ دەلالەت بکا لەسەر ژنەکە؛ مەسەلا، وەلی‌ئەمر بڵێت: وا فاتمەی کچم لێ مارەکردی، ئەویش بڵێ: وا قەبووڵم کرد، ئەوە بەتاڵە، بەڵکوو پێویستە بڵێت قەبووڵی مارەبڕینی فاتمەم کرد.

دیسان، عەقدی نیکاح دانامەزرێ ئەگەر ماوەیەکی زۆر بکەوێتە بەینی ئیجاب و قەبووڵەوە؛ «قَفّال» ـ کە یەکێکە لە زانا گەورەکان ـ وتوویەتی: مەبەس لە ماوەکەوتنە بەینی ئیجاب و قەبووڵ کە ئەبێ بەهۆی دانەمەزرانی عەقدی نیکاح، ئەوەیە هەردوولا ئەوەندە بێ‌دەنگ بن کە جوابی کابرای ژن‌مارەکەر لەوە بکەوێ کە جوابی وەلییەکە بێ؛ ئەمەیش دێتەوە سەر فەسڵی عورفی. وە لە قسەی زاناکانی شەرعەوە دەرئەکەوێ تا ماوەی شەش کەلیمەی عورفی زیانی نییەو لەوە زیاتر زیانی هەیە؛ بەڵێ، لەلایەنی ئەو کەسەوە کە جواب‌دانەوەی پێویستە، واتە مێرد، ئەگەر قسەیەکی بێگانە بکەوێتە بەینەوە، زیانی هەیەو عەقدەکە بەتاڵ ئەکاتەوە، هەرچەند قسەکەیش کەم بێ؛ هەروەها، ئەگەر بێ‌دەنگی زۆریش بکەوێتە بەینەوە، هەر زیانی هەیە، بەڵام بەین‌کەوتن لەلایەن ئەو کەسەیانەوە کە قسەی خۆی تەواو کردووە، وەلی‌ئەمر بێ یان مێرد، زیانی نییە، مەگەر درێژ بێ، چونکە ئەو قسەی خۆی دوایی هێناوە و بە قەتعی زیانی نییە ئەگەر وەلی‌ئەمر یا مەلا بڵێت بە مێردەکە کەوا: بڵێ: وا قەبووڵی نیکاحەکەم کرد.

شەرتێکی تری سیغەی عەقدی نیکاح، جواب‌دانەوەیە لەلایەن ئەو کەسەوە کە قسەکەی لەگەڵدا ئەکرێ؛ کەواتە، ئەگەر وەلی‌ئەمری ئافرەتەکە قسەی لەگەڵ مێردەکەدا کردو وەکیلی مێردەکە جوابی دایەوە، ئەوە بەتاڵە. هەروەها، بەشەرتگیراوە قەبووڵەکە لەگەڵ ئیجابەکەدا موافیق بێ، ئەگینا ئەگەر کابرا بڵێ: وا فاتمەم لێ مارەکردی، ئەویش بڵێ: وا قەبووڵی نیکاحی عائیشەم کرد، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، موخالەفە لە مارەییدا نابێ بەهۆی بەتاڵبوونەوەی نیکاحەکە، بەڵکوو نیکاحەکە دائەمەزرێ و مارەییەکە ئەڕواتە سەر «مَهرالمِثل».

شەرتە دەنگی هەردوولایان ئەوەندە بەرز بێ هەرکەس لەنزیکیانەوە بێ بیبیسێ و شەرتە هەرکامیان لەپێشانا قسە ئەکا، پەشیمان نەبێتەوە تا بەرابەرەکەی جوابی ئەداتەوە؛ هەروەها، تا ئاخری عەقدەکە ئەهلییەتی ئەوەی یەکەمیان بمێنێتەوە، یەعنی نەمرێ و شێت نەبێ و مانیعی تری بەسەرا نەیەت، بەڵکوو واجبە ئەو ژنەیش کە ئیزنی داوە مارەی ببڕن، تا ئاخری عەقدەکە ئەهلییەتی بمێنێتەوە؛ کەواتە، ئەگەر وەلی‌ئەمر سیغەی ئیجابەکەی بەدەما هات و مرد و پاش مردنی ئەو مێردەکە عەقدەکەی قەبووڵ کرد، ئەوە بەتاڵە.

هەروەها، بە شەرتگیراوە سیغەی عەقدەکە ئاشکراو بێ‌پێچ و پەنا بێ؛ کەواتە، کینایە لە سیغەی عەقددا ئەبێ بەهۆی بەتاڵبوونەوەی عەقدەکە، وەکوو ئەوەکە بڵێ: ئەو کچەم بۆ حەڵاڵ کردی، بەڵام کینایە لە عەقد لەسەرکراوەکەدا دروستە، بەو شەرتە کە هەردووکیان نیازی یەکێکی تایبەتییان ببێ، وەك ئەوەکە وەلی‌ئەمرەکە بڵێ: یەکێك لەو دوو کچەم لێ‌مارە کردی و مێردەکەیش قەبووڵی بکاو هەردووکیشیان مەبەستیان یەکێکی دیارییان بێ.

بە شەرتگیراوە سیغەی عەقد تەعلیقی تیا نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: هەر کاتێك جەژنی ڕەمەزان هات، ئەو کچەم لێ مارە کردی و کابرایش قەبووڵی کرد، هەر بەتاڵە وە ئەگەر کەسێك وتی بە کەسێکی تر: ژنەکەت منداڵێکی بوو، ئەویش وتی: ئەگەر کچ بوو، وا مارەم کرد لە تۆ و ئەمیش قەبووڵی کرد، هەر بەتاڵە، بەڵام ئەگەر کەسێك وتی بە

کەسێکی تر: ژنەکەت کچێکی بوو و ئەویش باوەڕی پێ کرد و وتی: ئەگەر کچ بوو لێم مارەکردی، ئەویش قەبووڵی کرد، ئەوە دروستە، چونکە ئەم لەفزە بە زاهیر تەعلیقەو لە حەقیقەتدا تەنجیزو دەس‌بەجێییە و لە حوکمی ئەوەدایە کە باوکی کچەکە وتبێتی: مادام ژنی من کچی بووە، وا ئەو کچەم لێ‌مارەکردی.

بەڵێ، بەشەرت گرتنی عەقد لە عەقدەکەدا زیانی نییە، وەکوو ئەوە کە بڵێ: وا کچەکەمم لێ مارەکردی بەو شەرتە کچەکەی خۆتم لێ مارە بکەی، ئەویش بڵێ: وا عەقدی نیکاحی کچەکەتم قەبووڵ کردو کچەکەی خۆم لێ مارە بڕیت، ئەوە دروستەو شێوەیەکە لە شێوەکانی ژن بەژن.

بزانن! ژنبە ژن هەرچەند بە شەرع دروستە، بەڵام لەم زەمانەدا ئەبێ بەهۆی روودانی چەند شتێکی گوناە و ناشەرعی، وەکوو ئەوە ئەگەر یەکێك لەو دووکەسە کە ژن بەژنیان کردووە ژنەکەی خۆی تەڵاقدا، پێویست ئەبێ ئەویشیان ژنەکەی خۆی تەڵاق بدا وە ئەگەر ژنی یەکێکیان لای مێردەکەی دانەنیشت، ئەبێ ئەویشیان ژنەکەی بتۆرێ؛ ئەم کردارە ناشەرعییانە، ئەبن بەهۆی ئەوەکەوا ژن بەژن حەرام بێ، چونکە هەر رەفتارێك لە زاتی خۆیدا حەلاڵ بێ و ببێ بە مایەی حەرام، ئەویش بەقەتعی حەرام ئەبێ؛ کەواتە، فەرزە لەسەر خەڵك یا ئەم رەوشتە ناشەرعییە واز لێ‌بێنن یاخود دەس‌بەرداری ژن بەژن بین.

شەرتێکی تری سیغەی عەقدی نیکاح، ئەوەیە بۆ ماوەیەکی تایبەتی نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: ئەم کچەم لێ‌مارەکردی بۆ وادەی شەش مانگ یا ساڵێك یا هەرچەند، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، قەیدی نییە ژن بەشوودان بۆ ماوەیەك کە لە حوکمی هەمیشەدا بێ، وەکوو ئەوە کە بڵێ: ئەم کچم لێ مارە بڕیت تا ماویت، یا تا ئەو ماوە.

بزانن! دروستە پێشکەوتنی لەفزی مێرد لە لەفزی وەلی‌ئەمری ئافرەتەکە؛ مەسەلا، بە وەلی‌ئەمرەکە بڵێ: کچەکەتم لێ مارە بکە لەسەر پەنجا دینار، ئەویش بڵێ: وا کچەکەمم لێ مارەکردی لەسەر پەنجا دینار، یا بڵێ: وا کچەکەتم قەبووڵ کرد بە مارە بڕاوی خۆم، ئەویش بڵێت: وا مارەم بڕی لێت، ئەمانە هەموو دروستن.

## دەرکەوتنی ئەو شتانەکە مانیعی دامەزرانی نیکاحن

**بزانن!** نیکاح بەتاڵ ئەبێتەوە بە سابتبوونی مانیعێك لە مانیعەکانی نیکاح بە شەهادەتی دوو شاهید، یاخود بەوەکە ژن و مێردەکە ڕێك بکەون لەسەر بوونی ئەو مانیعە، بەڵام نیسبەت بە حەقی خۆیان؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك ژنێکی مارەکردو چووە لای، لەپاشا، ژنەکە وتی: لەو وەختەدا کە مارەیان کردووم «عِدّە»م بەسەر نەچووبوو و کابرایش قەناعەتی پێ کرد، ئەوە ئەو نیکاحە بە بەتاڵ دائەنرێ و بەهۆی ئەوەوە کە کابرا چووەتە لای ژنەکە، «مَهرُالمِثل»ی لەسەر دائەنرێ کە ئەبێ بیدا بە ژنەکە، نەك ئەو مارەییە کە لە وەختی مارەبڕینەکەدا بڕیاریان لەسەر داوە.

وە ئەگەر تەنها ژنەکە ئیددیعای بوونی مانیعی دامەزرانی نیکاحی کردو کابرا ئینکاری کرد، ئەوە باوەڕ بە سوێندی مێردەکە ئەکرێ، چونکە ئەسڵ مانەوەی پەیوەندی ژن و مێردییە، کە پێی ئەڵێن: «بَقاءُ العِصمة». وە ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کە مانیعی دامەزرانی نیکاحە کە هەیەو ژنەکە ئینکاری ئەکرد، ئەوە لەسەر قسەی کابرا لەیەك جیا ئەکرێنەوە، بەڵام نیسبەت بە مارەییەکە هەر لەسەر ئەساسی دامەزرانی عەقدەکە ئەڕۆین؛ کەواتە، ئەبێ کابرا تەواوی مارەییە ناو براوەکە بدا بە ژنەکەو ناگەڕێنەوە بۆ سەر «مَهرالمِثل».

بەڵام بە قەتعی دروست نییە ژن و پیاوەکە ڕێكبکەون لەسەر ئەوەکە شتێکی وا هەیە نایەڵێ عەقدەکە دامەزرابێ و شتەکەیش پەیوەندی بە حەقی خواوە هەیە؛ کەواتە، ئەگەر لەپاش سێ تەڵاقە هەردوکیان وتیان: شاهیدەکانی نیکاح فاسق بوون یا: وەلی ئەمر فاسق بووەو تەقلیدیشیان نەکردووە، بۆ ئەوە ئەو عەقدە بە هیچ دانێن و بەبێ «تَحلیل» (جاشکردنەوە) کابرا ژنەکە بباتەوە، ئەوە بە قەتعی ئەو قسەیەیان لێ قەبووڵ ناکرێ، چونکە ڕوودانی تەڵاق لەبەینیانا پێ لێنانە بە دامەزرانی نیکاحەکە و ئەمانەیش شوبهەی ئەوەیان لێ ئەکرێ کە مەبەستیان لەم ئیددیعایە نەکردنی مارە بەجاش بێ.

بەڵکوو ئەگەر دوو شاهیدیش ڕاست بکەنەوە لەسەر ئەم ئیددیعایەیان، هەر قەبووڵ ناکرێ لێیان، لەبەر ئەوە کە ئەمان ڕاستیان کردوونەتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر دوو کەس لە

خۆیانەوە، لەبەر ڕەزای خوا و بە بێعەلاقەی ئەمان، شاهیدییان دا لای قـازی کـەوا مانیعێکی دامەزرانی نیکاحەکەیان هەیە، ئەوە قەبووڵ ئـەکـرێ؛ هـەروەها، ئـەگـەر خۆیشیان لە بەینی خۆیانو خوادا بزانن بە مانیعی دامەزرانی نیکاحەکە و بە پێی ئەو زانینەی خۆیان بجووڵێنەوە، هەر دروستە، بەڵام کە قازی پێی زانین، ئەتوانێ ـبەڵکوو واجبە لەسەری ـ جیایان بکاتەوە لە یەك.

هەروەها، ئەگەر کەسێك لەپاش سێ تەڵاقە ئیددیعای کرد کەوا لەپێشانا ژنەکەی بە تەڵاقی «بائِن» تەڵاقداوە بۆ ئەوەی کە تەڵاقی تری نەکەوێ، ئەم ئیددیعای لێ نابیسرێ، بەڵکوو هەتا وەکوو ئەگەر شاهیدیش ڕاست کاتەوە، سـوودی نـییە، چـونکە دیـارە مەبەستی نەکردنی مارەبەجاشە، ئەگینا بۆچی لەپێش سێ تەڵاقەکەدا لەگەڵ ژنەکەیدا بووەو لێی جیا نەبووەتەوە؟! بەڵێ، ئیعتیبار نییە بە قسەی شاهیدانی نیکاح کە بڵێن: ئێمە لەوەختی عەقدەکەدا فاسق بووین و بە قەتعی، ئەو نیکاحە بە قسـەی ئـەمانە بـەتاڵ نابێتەوە.

بێدار بن! وا ڕێئەکەوێ کەسێك بە تەقلیدی «مُتَأَخِّرین» لەسەر ئەساسی فاسقی وەلیئەمرو شاهیدەکان، ژنێك مارە ئەکا و لەپاشا سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، جا بۆ ئەوە بە بێمارە بەجاش مارەی بکاتەوە، فێری ئەکەن کەوا عەقدە پێشـووەکـە بـە تـەقلیدی «متأخّرین» بووەو وا ئێستە پەشیمان ئەبێتەوەو ئەیەوێ لای مەلایەك سەر لەنوێ مارەی ببڕێتەوەو مەلاکە بکا بە حەکەم و دوو شاهیدی «مَستورُ العَدالة» پەیدا بکا بۆ شاهیدی لەسەر ئەم نیکاحە تازەیە؛ گوایە ئەم عەقدە تازەیە لەسەر ئەسڵی مـەزهەبی ئـیمامی شافیعییەو دروستە و ئەوەی پێشوو بە هیچ دەرئەچێ؛ موعامەلەی وا ـبەتایبەتی لەم زەمانەدا ـ بەهیچجۆرێ دروست نییەو خیلافی شەرعەو ئەبێ بـەهۆی تـاوانـباری و شەرمەزاری لەبەر چەند شت؛

یەکەم: ڕەشەخەڵك، هەرچەند واجب نەبێ لەسـەریان هـەمیشە تـەقلیدی یـەك «مُجتهِد» بکەن، بەڵام کاتێك لە عەقدێکدا تەقلیدی ئیمامێکیان کرد، واجبە تا ئاساری ئەو عەقدە مابێ ئەو مەزهەبە بەرنەدەن و یەکێك لە ئاساری تەقلیدە پێشووەکە، ئەوەیە کە لەپاش سێ تەڵاقە ناتوانێ بە بێمارە بەجاش مارەی بکاتەوە.

دووەم: شەرتی لادان لە تەقلیدی یەکەم بۆ تەقلیدی دووەم، ئەوەیە کە «تَلفیق» بە مەعنا مەشهوورەکەی پەیدا نەبێ کە بریتییە لە دروستبوونی یەك ڕەفتارو یەك حەقیقەت لە فەرموودەی دوو ئیمام کە کەسیان بەو ڕەفتارە ڕازی نەبن؛ هەروەها تەلفیقی بە مەعنای غەیرە مەشهووریش نەیەتەجێ کە بریتییە لە ڕەفتارکردنی ئینسان بە فەرموودەی ئیمامێك لە مەسئەلەیەکدا و بە زیددی ئەو فەرموودەیە لە هەمان مەسئەلەدا؛ ئێستا ئەم پەشیمانبوونەوەیە لە تەقلید، ئەگەر نەبێ بە تەلفیق بەمەعنا مەشهوورەکەی، بێ‌گومان تەلفیقی بە مەعنای غەیرەمەشهووری تیا هەیە، چونکە لە تەقلیدی یەکەما ڕازی بووە بە فاسقی وەلی‌ئەمرو شاهیدەکان و ئەوەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە و ئەبێ کە سێ تەڵاقەی کەوت، بە مارە بەجاش ژنەکەی بباتەوە، کەچی لە تەقلیدی دوایی‌دا بە زیددی ئەوە ڕەفتار ئەکا.

سێهەم: لەگەڵ بوونی قازیدا ـ هەرچەند قازی ناچاریش بێ ـ تەحکیم دروست نییە وە ئەگەر کەسێك بڵێت: قازی بە بێ‌پارە تەماشای ئەم مەسئەلەیە ناکا، ئەڵێین: ئەم حەکەمەیش بە بێ‌پارەی زیاتر لە پارەی قازی ئەم عەقدە جێبەجێ ناکا.

چوارەم: فتوادان بە تەحکیمی کەسێك کە «مُجتهِد» نەبێ لەگەڵ بوونی قازی ناچاریدا، فتوایە کە نیسبەت دراوەتە هەندێ لە زانا «متأخِر»ەکان، وەکوو «بُلقینی» و ئەم زانایانە هەموو ڕازین بە عەقدە پێشووەکە.

پێنجەم: ئەم شاهیدانە کە ئەبن بە شاهیدی عەقدی دووهەم، «مستورُ العدالة» نین، چونکە «مەستوور» بەوە ئەڵێن کە زاهیری حاڵیان وا بگەیەنێ عەداڵەتیان هەیەو حەقیقەتی وەزعیان دیار نەبێ، بەڵام ئەمانە لەبەر چاوی ئێمەدا دیارن‌و کردەوەو ڕەوشتیان ئاشکرایە کە خیلافی عەداڵەتە؛ کەواتە، فەرقی شاهیدی ئەم عەقدەو شاهیدی عەقدی پێشوو نییە، بەڵکوو ئێمە ئاگامان لە ئەحواڵی ئەوانەی پێشوو نییە.

شەشەم: ئەو عەقدە کە چەند ساڵ لەمەوپێش کراوە، چۆن قەناعەت بکەین کەوا وەلی‌ئەمرەکە کە جێبەجێی کردووە، فاسق بووە یا شاهیدەکانی فاسق بوون؟! لە سوورەتێکا کە ئەگەر وەلی‌ئەمری فاسق تۆبە بکا، ئەتوانێ بە ئەسڵی مەزهەب عەقدی

نیکاح بکا، یاخود بە چ بەڵگەیەك بزانین ئەو شاهیدانە فاسق بوون و قسەی ئەم مێردە ژن تەڵاقدەرە کە موتتەهەمە بەوە نیازی هەڵگرتنی مارە بەجاشی هەیە، چۆن جێگای باوەڕو متمانەمان بێ؟ کەواتە، ئەو کەسەی کە بیەوێ ئایینی خۆی بپارێزێ، واجبە تەرێز بکا لەمجۆرە موعامەلانە.

## باسی سیفەتەکانی هاوکوفی (كَفاءَة)

ئەو سیفەتانەی کە لە هاوکوفییا پێویستن، پێنجن؛ ئەم سیفەتانە ئیعتیبار ئەکرێن لەژندا بۆ ئەوەی کە لە مێردەکەیشا ئیعتیبار بکرێن، ئەگینا پێویست نییە لەژندا بێنەجێ و دروستە پیاوی موسوڵمانی خاوەنحەسەب و نەسەب، ئافرەتێکی فاسقی دۆزراوەی بێحەسەب مارە بکا؛ بەڵێ، لەسەر مەزهەبی ئیمام دروست نییە وەلی ئەمری مەجبوورکەر ژنێکیوا مارە بکا لە کوڕی خۆی کە ئەو عەیبانەی تیابێ کە ئەبن بەهۆی دروستبوونی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح؛ هەروەها، دروست نییە ژنێکی کوێر یا پیر یا ئەندام بڕاوی لێ مارە بکا وەکوو گێڕراوەتەوە لە گەلێك لە ئیمامەکانەوە.

**بزانن!** سیفاتی کەفائەت، پێویستن بۆ کاتی عەقدی نیکاحەکە، واتە ئەگەر تەنها لەو کاتەدا بووبن، ئەوە بەسە، با لەوە پێشیش نەبووبن؛ مەسەلا، پیاوێکیوا کە لەپێش عەقدەکەدا عەیبدار بووبێ و لەکاتی عەقدەکەدا ئەو عەیبەی نەمابێ، ئەوە بە هاوکوف ئەزانرێ بۆ ژنێك کە پاكبووبێ و پاك بێ لەو عەیبانە؛ بەڵێ، کاسبی و پێشەی سووك کە لەپێش عەقدەکەدا بووبێ، ئەوە مانیعی هاوکوفییە، هەرچەند لەکاتی عەقدەکەدا نەمابێ، تا ماوەیەکیوا تێنەپەڕێ کە نیسبەتدانی ئەو پیشە عەیبدارە لە کابرا ببێتەوە؛ هەروەها، فاسقێك کە تۆبەی کردبێ، نابێ بە هاوکوفی ئافرەتێکی بەداد تا ماوەیساڵێك بە پاکی بەسەر تۆبەکەیدا تێنەپەڕێو ئەمین نەبین لەوەکەوا ڕەوشتی خراپی نەماوە.

یەکەم لە سیفەتەکانی هاوکوفی، سەلامەتییە لەو عەیبانە کە ئەبن بەهۆی دروستبوونی هەڵوەشاندنەوەی عەقدی نیکاح، وەکوو گولی و بەڵەکیو شێتی؛ کەواتە، کەسێك یەکێك لەمانەی تیابێ هاوکوف نییە بۆ ژنێك کە ئەم عەیبانەی تیا نییە؛ هەروەها

بۆ ژنێکیش کە ئەم عەیبانەی تیابێ، هەرچەند عەیبی ژنەکە خراپتر بێ، لەبەر ئەوەکە ئینسان بۆ عەیبی خۆی چاوپۆشی پێ ئەکرێ ـ با زۆریش بێ ـ بەڵام بۆ عەیبی خەڵکی خۆی پێ ڕاناگیرێ، هەرچەند کەمیش بێ.

پیاوی شلەپەتکەو عەورەت بڕاو، هاوکوف نین بۆ ئافرەتی کە عەیبی تیا نەبێ یا بۆ ئافرەتێك کە پارچەگۆشت یا پارچە ئێسك گیرابێتە عەورەتی؛ بەڵێ، لەم عەیبانەدا وەلی‌ئەمر حەقی ڕەخنەگرتنی نییە، مادام ژنەکە خۆی ڕازی بێ؛ مەسەلا، ئەگەر یەکێك لە دوو برا خوشکی خۆی مارە بڕی لە کابرایەکی شلەپەتکە یا عەورەتبڕاو بە ڕەزامەندیی ژنەکە و کابرای مێرد لە سیفەتەکانی‌ترا هاوکوفی ئافرەتەکە بوو، ئەوە براکەی‌تریان حەقی بەتاڵکردنەوەی ئەو نیکاحەی نییە.

بەڵام بەشەرت نەگیراوە بۆ هاوکوفی سەلامەت بوون لەو عەیبانە کە نابن بەهۆی دروستبوونی پەشیمانبوونەوە لە نیکاحا، وەك کەڕی‌و کوێری‌و دەس‌بڕاوی‌و یەك چاوی و ناشیرینی، هەرچەند هەندێ لە ئیمامەکانی پێشین، وەکوو «قاضی حُسین»، وتوویانە: سەلامەت بوون لەم عەیبانەیش مەبەستە، بەڵکوو قازی حوسێن فەرموویەتی: لە کەفائەتدا تەماشای هەر عەیبێکی وا ئەکرێ کە ببێ بەهۆی کزکردنی ئارەزووی ئینسان، شێخی «ابن حجر»یش هەرچەند ڕازی نییە بەم قسەیەی قازی حوسێن، بەڵام فەرموویەتی: پێویستە وەلی‌ئەمر تەماشای سەلامەتی لەم عەیبانە بکا؛ لەواقیعدا ژن و پیاو کە کەوتنە یەك، ئەبن بەهۆی دامەزرانی خێزانێکی تازەو پێویستیان بە یارمەتی‌دانی یەکە بۆ یەك و یارمەتی پێویستی بە خۆشەویستی هەیە لەسەر ئەساسی ئارەزووی دڵ و ئولفەتگرتن بە هاوڕێوە؛ کەواتە، زۆر پێویستە باوك و براو وەلی‌ئەمرەکانی‌تری ئافرەت، تەماشای ئەو شتانە بکەن کە ئەبن بەهۆی زیادە ئولفەت لەبەینی ژن و پیاوەکەدا، ئەگینا گوناهبار ئەبن.

دووەم: ئازادییە؛ کەواتە، بەندە هاوکوف نییە بۆ ئازاد و ئازادکراو هاوکوف نییە بۆ ئافرەتێك کە لە بنچینەدا ئازاد بووبێ.

سێهەم: نەسەبە؛ کەواتە، پیاوی غەیرە عەرەب، هاوکوف نییە بۆ ئافرەتی عەرەب‌و پیاوی غەیرە قورەیشی هاوکوف نییە بۆ ئافرەتی قورەیشی و پیاوی غەیرە هاشمی و

موتەللیبی، هاوکوف نییە بۆ ئافرەتی هاشمی و موتەللیبی و پیاوی ئەولادی غـەیری «فاطمةُ الزهراء»، هاوکوف نییە بۆ ئافرەتێك کە لە ئەولادی ئەو بێ؛ هـەروا، نـەسەب لەناو غەیری عەرەبیشا ئیعتیبار ئەکرێ لەسەر ئەساسی حـیسابکردنی شـەرەف و پایەبەرزی لەناویانا؛ بەڵێ، گوێ نادرێ بە گەورەییەك بـەهۆی دەسـەڵات و زوڵم و زۆرکردنەوە پەیدا بووبێ، چونکە هەر پایەیەك لەسەر ئەساسی تاوان بێ لە ترازووی شەرەف و پایەبەرزیدا قیمەتی نییە.

**چوارەم:** پاکییە لە فیسق و تاوانباری لە خۆیو باوك و باپیرەیدا؛ کەواتە، پیاوێ کە بەهۆی تەرکی نوێژ یا ڕۆژووەوە فاسق بووبێ، هاوکوف نییە بۆ ژنی پاك و بێگوناه ، بەتایبەتی بۆکچی منداڵی بێگوناه و بێگوناهی کوڕی فاسق، هاوکوف نییە بۆ ئافرەتی بێگوناهی کچی پیاوی بێگوناه، وەك لە «تُحفە»وە دەرئەکەوێ؛ بەڵێ، پیاوی فاسق هاوکوفە بۆ ئافرەتی فاسق، بەڵام شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی: بەو شەرتەکە جۆری فیسقەکەیان یەك بێو ئەندازەکەشی ئەوەندەی یەك بێ؛ کەواتە، ئافرەتێك کە بەهۆی تەرکی نوێژەوە فاسق بووبێ، هاوکوف نییە بۆ پیاوێك کـە بـەهۆی غـەشکردنەوە لە موعامەلەدا فاسق بووبێ یا بەهۆی دزیکردنەوە وە لەسەر ئەم ئەساسە، کـەفائەت لە بەینی پیاوو ژنی فاسقدا زۆر نایابە، بەڵکوو ئینسان ئەتوانێ بڵێ: بە خەیاڵ نەبێ نییە؛ «خَطیب»یش لای وایە پیاوی فاسق هەرچۆن بێ هاوکوفە بـۆ ئـافرەتی فـاسق؛ ئـەم فەرموودەیە ئاسانترە بۆ ئەمڕۆ و ئینسان ئەتوانێ بۆ نەفسی خۆی ڕەفـتاری پـێبکـا یاخود ڕەفتار بە فەرموودەکەی «ابن حجر» بکا و لە قازی بـەولاوە کـەس نـاتوانـێ ڕەخنەی لێبگرێ، ئەویش بەو شەرتە کە بۆی ساغ بووبێتەوە قسەکەی «ابن حـجر» ـ مەسەلا ـ بەهێزترە لە مەزهەبی شافیعیدا لە قسەکەی خەتیب.

ئەهلی بیدعەتیش ـ ئیتر بیدعەتەکەی هەرجۆرێك بێ ـ هاوکوف نییە بۆ ئافرەتێك کە لەسەر ئادابی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بڕوا بەڕێوە.

**پێنجەم:** کەسب و سنعەتە لە خۆی و بـاوك و بـاپیرەیدا؛ کـەواتـە، پـیاوێك کـە کاسبییەکی پەستی هەبێ، هاوکوف نییە بۆ ژنێك کە خۆی یا باوکی کاسبییەکی بەرزی

خاوەن ئیعتیباری بێ، یا پیاوێك کە کاسبییەکی بەرزی بێ، بەڵام باوکی کاسبییەکی پەستی بووبێ و ئێستە ئەم بەو کاسبییەی باوکییەوە ناسرابێ، هاوکوف نییە بۆ ژنێك کە خۆی و باوکی کاسبییەکی بەرزیان بێ. هەروەکوو کاسبی پەست و بەرز فەرقیان هەیە، لەناو کاسبییە پەستەکان و کاسبییە بەرزەکان خۆیشیانا، فەرق هەیە؛ مەسەلا، لەناو کاسبییە پەستەکانا، ئەوانەیان کە بە تێکەڵی لەگەڵ پیسایی دا بکرێن، پەست ترن لەوانەی کە دووربن لە پیسایی وە لەناو کاسبییە بەرزەکانا، ئەوانەیان کە پەیوەندیان بە زانست و زانیارییەوە هەبێ، بەرزترن لەوانیتریان وە بۆ دیاریکردنی بەرزی و پەستی هەر کاسبییەك، ئەگەڕێنەوە سەر عورف و عادەتی وڵات. فەرموودەی راست ئەوەیە دەوڵەمەندی و هەژاری ئیعتیباری نییە لە دیاریکردنی هاوکوفی دا؛ کەواتە، کوڕە زانایەکی هەژار، هاوکوفە بۆ کچە زانایەکی دەوڵەمەند. هەروەها، فەرموودەی راست ئەوەیە سیفاتی پەست لەناو ئەم سیفاتانەدا بەرابەرکێیان پێ ناکرێ بە سیفاتی بەرز، واتە پینە ناکرێن بە سیفاتی بەرز لە عەینی ئەوکەسەدا کە سیفەتە پەستەکەشی هەیە؛ کەواتە، کوڕەهاشمییەکی فاسق، نابێ بە هاوکوف بۆ کچە عەجەمییەکی بێ گوناه و ناتوانین بڵێین؛ فاسقیەتی کوڕەهاشمییەکە بەوە پینە ئەکەین کە هاشمییە؛ کەواتە، ئەگەر باوك کچی خۆی بە بێ ئیزنی کچەکە لە سوورەتێکی وادا مارە ببڕێ، ئەوە نیکاحەکە دانامەزرێ.

## ئەو ئافرەتانەی کە مارەیان نایەت

ئەو ژنانەی کە مارەکردنیان حەرامە و مارەیان نایەت سێ جۆرن؛ جۆرێکیان، ئەوانەن کە بەهۆی نەسەبەوە مارەیان نایەت؛ ئەمانەش حەوت تاقمن؛

یەکەم: دایك، واتە ئەو ئافرەتەی کە خۆتی لێ پەیدا بووبێت یا ئەو پیاوو ژنەی لێ پەیدا بووبێ کە تۆ پەیدا بوویت لێیان؛

دووهەم: کچ، واتە هەر ئافرەتێك کە لە پشتی تۆ پەیدا بووبێت یا لە پشتی کەسێك کە لە پشتی تۆ بووە، راستەوخۆ یا بە واسیتەوە، بەڵام کچێك کە بەهۆی زیناوە لە تۆ

پەیدابوو‌بێت، ئەو مارەبڕینی دروستە، چونکە ڕێی تێ‌ئەچێ لە تـۆوی کـەسێکـی‌تر پەیدا بووبێ، بەڵام ئەگەر منداڵی زنا کوڕ بوو، دروست نییە دایکی خۆی مارە بکا، چونکە ئاشکرایە کە لەو دایکە داکەوتووەو هەروەها منالّی زینا، کوڕ بێ یا کـچ بـێ، نیکاح دانامەزرێ لە بەینی ئەوو بـراو خـوشکە دایکـییەکـانیا و لە بـەینی ئـەوان و هاونەسەبی دایکەکەیانا، وەك براو خوشك و مام و خاڵی دایکیان.

**سێهەم:** خوشکە؛

**چوارەم:** کچی خوشکە؛

**پێنجەم:** کچی برایە، هەرچەند ئەمانە زۆریش دوور کەوتبنەوە؛

**شەشەم**، پووری خوشکی باوکە؛

**حەوتەم**، پووری خوشکی دایکە، ڕاستەوخۆ بێ یان بـەهۆی یـەکـێکـی‌ترەوە؛ ئەتوانین بڵێین هەر ئافرەتێك خوشکی نێرینەیەك بێ کە تۆ لەپشتی ئەو هەڵکەنرابی، لە نزیك و دوور، ئەوە بە پوور (خوشکی باوك)ت دائەنرێ، هەروەها هەر ئافرەتێك کە خوشکی ژنێك بێ کە تۆی لێ بووبیت، نزیك بێ یـا دوور، ئـەوە پـوور (خـوشکی دایك)تە و تێکڕا، ئەتوانین بڵێن: هەر ئافرەتێك لەنەسەبدا خزمت بێ، ئەوە حەرامـە لەسەرت، تەنها ئەولادی مام و خاڵ و پوور نەبێ.

جۆری دووهەمیش، ئەو ژنانەن کە بەهۆی شیرخواردن (رِضاع)ەوە حەرامن؛ جا بزانە هەر ئافرەتێك لە نەسەبدا حەرام بێ بە شیرخواردنیش حەرامە، وەکوو دایکـی شیری؛ هەر ئافرەتێ شیری دابێ بە تۆ، یا بە کەسێك کە ئەو شیری دابێ بە تۆ، یا بـە کەسێك کە تۆ لەو کەسە بووبیت، یا دایەنەکەی تۆی لێ‌بووبێ، یا ئەو پیاوەی لێ‌بووبێ کە شیری دایەنەکەت لەوەوە پەیدا بووە، ئەوە دایکی شیریتە.

هەروەها، کچی شیری؛ هەر ئافرەتێ شیری تۆی خواردبێ، یا شیری ئەولادی تۆی خواردبێ، لە کوڕو کچی تۆ، بە نەسەب یا بە شیرخواردن و کچی ئـەو ژنـەیش، بـە نەسەب یا بە شیرخواردن، هەرچەند بەرەوخوار بووبێتەوە، ئەوە کچی شیرییە.

هەروەها، خوشکی شیری؛ هەر ئافرەتێك شیری باوکی تۆ یا دایکی تۆی خواردبێ، بە نەسەب یا بە شیرخواردن و ئەولادی باوك و دایکی شیریی تۆ، خوشکی شیری تۆیە.

هەروەها، برازاو خوشکەزای شیری؛ هەر ئافرەتێك کچی ئەولادی ئەو ژنە بێ کە شیری بە تۆ داوە، یا ئەولادی پیاوە خاوەن شیرەکە بێ، هەرچەند بەرەوخوار بڕوا و هەر ئافرەتێك شیری برا یا خوشکی بە نەسەب یا بە شیرخواردنی تۆی خواردبێ و کچی ئەو ئافرەتە بە نەسەب یا بە شیرخواردن، با بەرەوخواریش بڕوا و کچی ئەوانەی کە دایکت شیری پێداون، یاخود شیری باوکی بە نەسەب یا بە شیرخواردنی تۆی خواردبێ، هەرچەند بەرەوخواریش بڕوا، ئەوە کچی برای شیری یا کچی خوشکی شیریتە.

هەروەها، پووری شیری؛ هەر ئافرەتێك خوشکی پیاوە خاوەن شیرەکە بێ، یا خوشکی دایەنەکەت بێ و خوشکی باوك و دایکی ئەوان بێ، بە نەسەب یا بە شیرخواردن، ئەوە پووری شیریتە و لەجێی خوشکی باوك یا خوشکی دایکتایە.

بەڵێ، هەندێ کەس هەن لە نەسەبدا حەرامن نەك لە شیردانا؛

یەکەم: ئافرەتێك کە شیری دابێ بە برات یا بە خوشکت، ئەوە لە شیر پێدانا حەرام نییە لێت، چونکە بێگانەیە پێت، بەڵام لە نەسەبدا حەرامە، چونکە یا دایکتە یا باوەژنتە؛

دووهەم: ژنێ کە شیری دابێ بە کوڕەزات یا بە کچەزات، ئەمە لە شیرپێدانا حەرام نییە کەچی لە نەسەبدا حەرامە، چونکە یا کچی خۆتە یا بووکتە یەعنی ژنی کوڕتە؛

سێهەم: دایکی ژنێك کە شیری دابێ بە ئەولادی تۆ، ئەمە لە شیر پێدانا حەڵاڵەو لە نەسەبا حەرامە، چونکە خەسووتە یا دایکی شیریی ژنتە؛

**چوارەم:** کچی ژنێك کە شیری دابێ بە مناڵی تۆ، ئەمە لە شیرپێدانا حەڵاڵەو لە نەسەبدا حەرامە، لەبەر ئەوە کە کچی خۆتە یا کچی ژنتە؛

**پێنجەم:** ژنێ کە شیری دابێ بە مامت؛

**شەشەم،** ژنێ کە شیری دابێ بە خاڵت؛

**حەوتەم:** ژنێ کە شیری دابێ بە پوورت، خوشکی باوکت یا خوشکی دایکت؛

**هەشتەم:** دایکی نەسەبی برای شیریت؛ مەسەلا، کوڕێك شیری دایکی تۆی خواردووە و ئەو کوڕە دایکی هەیە، ئەتوانی دایکەکەی مارە بکەی؛ ئەگەر ئەم برایە

برای نەسەب بوایە، نەتئەتوانی دایکەکەی مارە بکەی، چونکە یا دایکی خۆیشتە یا باوەژنتە. جیاکردنەوەی ئەم سوورەتانە، لەڕاستیدا شتێکی زاهیرییە، چونکە ئەمانە ئەو هۆیانەیان تیا نییە کە ئەبن بەهۆی حەرامبوون تا جیا بکرێنەوە.

بێدار بن! چوار ئافرەت هەن کە حەرام نابن لێت کەچی بەدیمەن لە حەرام ئەچن؛

یەکەم: خوشکی نەسەبی برای نەسەبیت کە خوشکی نەسەبی خۆت نەبێ؛ مەسەلا، برایەکی باوکیت هەیە، ئەویش خوشکێکی دایکیی هەیە، ئەتوانی ئەو خوشکەی مارە بکەی، یاخود برایەکی دایکیت هەیە، ئەویش خوشکێکی باوکیی هەیە، ئەتوانی ئەو خوشکەی مارە بکەی؛

دووهەم: خوشکی شیریی برای نەسەبیت؛ مەسەلا، برایەکی باوکیت هەیە خوشکێکی دایکیی هەیە بە شیرخواردن، یاخود برایەکی دایکیت هەیە خوشکێکی باوکیی هەیە بە شیرخواردن، ئەتوانی ئەو خوشکەی مارە بکەی؛

سێهەم: خوشکی نەسەبی برای شیریت؛ مەسەلا، برایەکی دایکیی شیریت هەیە کە ئەویش خوشکێکی نەسەبی هەیە لە باوکەوە یا لە دایکەوە یا لە باوك و دایکەوە، تۆ ئەتوانی ئەو خوشکەی مارە بکەی؛

چوارەم: خوشکی شیریی برای شیریت؛ مەسەلا کوڕێك شیری دایکیی تۆی خواردووە و شیری ژنیتریشی هەر خواردووە و ئەو ژنە شیردەرە کچێکی هەیە، تۆ ئەتوانی مارەی بکەیت.

## باسی شیردان (رِضاع)

شیردان لە شەرعدا، بریتییە لەوە شیری ژنێکی زیندوو یا خواردەمەنییەك کە لەو شیرە دروست بکرێ، بڕواتە ناو بۆشایی لەشی منداڵێکەوە کە عومری لە دوو ساڵ زیاتر نەبێ.

ئەرکانی شیردان، سێ شتە: شیرەخۆر (رَضیع)؛ شیر (لَبَن)؛ شیردەر (مُرضِعة). شەرتی شیرەخۆرەکە ئەوەیە زیندوو بێ بە زیندوویەتییەکی دامەزراو و لە سەرەتای جاری پێنجەمی شیرخواردنەکەوە عومری لە دوو ساڵ کەمتر بێ و پێنج جاریش شیرەکەی خواردبێ.

زەبتی ئەم پێنج جارە بە عورفە، چونکە شەرع لەم جۆرە شتانەدا تەماشای عورف ئەکا؛کەواتە، ئەگەر منالّەکە دەمی لە مەمکی ژنەکە هەڵگرت لەبەر ئەوەکە حەزی لە شیر نەبوو، ئەوجا دووبارە گرتیەوە، یاخود ئەگەر ژنەکە مەمکی خۆی لە دەمی منالّەکـە دەرهێنا لەبەر ئەوە کە منالّەکە حەزی لە شیر نەبوو، کەچی دوّوبارە گرتیەوە، ئەوە لە هەردوو سوورەتەکەدا بە دووجار شیر پێدان ئەژمێررێ، هەرچەند هەر جـارێکـیش تنۆکێ شیری خواردبێ، بەڵام ئەگەر لەبەر هانەسەدان یا لەبەر قووتدانی ئەو شیرەی لەدەمیایە، یا لەبەر گاڵتە دەمی لە مەمکەکە بەرداو پاشان گورج گرتیەوە، یا شیردەرەکە لەبەر سووکە ئێشێك مەمکەکەی لە دەمی دەرهێناو منالّەکە گورج گرتیەوە، یا شیردەرەکە لە مەمکێکیەوە گواستیەوە بۆ ئەو مەمکەکەی، یاخود منالّەکە وەنەوزێکی داو مـەمکەی بەردا، یا هەر لە دەمیا بوو گورج دەستی کردەوە بە شـیرمژین، ئـەوە لە هـەموو ئـەم سوورەتانەدا هەر بە یەكجار حیساب ئەکرێ.

وە ئەگەر منالّەکە زۆر نووست، یا غافڵ بوو لە شیرمژین لە مـاوەیەکـی زۆردا و مەمکەکەی لەو ماوەیەدا هەر بەدەمەوە بوو، ئەوە بە یەكجار حیساب ئەکرێ وە ئەگەر بەریداو لەدواییدا مەمکەکەی گرتەوە، ئەوە بە دووجار حیساب ئەکـرێ وە ئـەگـەر بەجارێك یەك پیاڵە شیر لە مەمکی ژنەکە دادۆشرا و بە تاقە جارێك کرا بـە قـوڕگـی منالّەکەدا، یا بە پێنج جار شیرەکەی لێ دادۆشراو بە یەكجار کرا بە قوڕگی منالّەکەدا، یا بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئەوە هەر بە یەكجار ئەژمێررێ، چونکە تەئسیری شیری رووت بەو شەرتەیەکە بە پێنج جار دابدۆشرێو بە پێنج جار بخورێ.[1]

ئەگەر پیاوێك چوار ژنی هەبوو وە منالّێك لە سێ ژنیان هەریەکە جارێك شیری خوارد و لە ژنی چوارەمیش دوو جاری خوارد، ئەوە ئەو منالّە ئەبێ بە منالّی شیریی کابرا، بەڵام نابێ بە منالّێ شیریی هیچکام لە ژنەکانی، هەرچەند ئەگەر کوڕ بـێ لێی حەرام ئەبن، چونکە بوون بە باوەژنی.

وە ئەگەر کەوتینە شکەوە لەوەدا کە ئاخۆ یەكجار شیری خواردووە یا پێنج جار، یا

١. «إعانةُ الطّالبين»، بەرگی ٣، لاپەڕە ٢٨٧.

لە تەمەنی دوو ساڵییا بووەکە شیرەکەی خواردووە یاکەمتر بووە لە دوو ساڵ، ئەوە ئەو شکە نابێ بەهۆی حەرامبوونی منداڵەکە لە شیردەرەکە، بەڵام خۆپاراستن لەم جۆرە شتانەدا باشترە.

شەرتی شیرەکەیش کە منداڵەکە ئەیخوا، ئەوەیە شیری ژنی زیندوو بێ؛ کەواتە، شیری مەمکی پیاوو شیری ئینسانی نێرومێ‌و شیری ژنێ کە لە گیانەڵادا بێ، یا شیری ژنی مردوو، تەئسیری نییە؛ هەروەها، شیری حەیوانیش ئەگەر کوڕو کچێك بەیەکەوە بیخۆن، نابن بە هاوشیرە. فەرق نییە لەوەدا ئەو شیرە بە شیری مابێتەوە یاکرابێ بە پەنیر یاخود ئاردی پێ کرابێ بە هەویرو منداڵەکە بیخوا؛ هەروەها، ئەگەر تێکەڵی شتێکی‌تر کرابێ، خواه شیرەکە زۆرتر بێ لەو شتە یاکەمتر بێ‌و منداڵەکە هەموو تێکەڵ کراوەکە بخوا، بەڵام لەم شیرە تێکەلەدا، شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی: ئەگەر بە تاقە جارێکیش ئەو شیرە دۆشرابێ جا تێکەڵی شتێکی‌تر کرابێ، کافییە بۆ تەئسیرکردن لە حەرامبوونی منداڵەکەدا، بەو شەرتە بە پێنج جار بیخوات؛ شێخی «نِهایە» و «قاضی زکریا» و «خەتیبی شەربینی» و «زیادی»یش، ئەڵێن: هەروەکوو پێویستە بە پێنج جار بیخواتەوە، ئەبێ بە پێنج جاریش دادۆشرابێ.

هەروەها، تەئسیری هەیە ئەگەر بکرێ بە قوڕگی منداڵەکەدا بە بێ‌مژینی خۆی، یا وەکوو بڕنووتی بکرێتە دەماغیەوە، بەڵام سوودی نییە ئەگەر شیرەکە بکرێ بە شاف‌و منداڵەکە هەڵی‌بگرێ، یاخود لەپێشیەوە پێی هەڵبگیرێ یا بکرێتە ناو گوێچکەیەوە، مەگەر ئەوەندە زۆر بێ لەگوێیەوە بچێتە ناودەماغی یا ئەو شیرەی لەپێشیەوە پێی هەڵگیراوە بگاتە ناو مەعدەی منداڵەکە.

شەرتی شیردەریش ئەوەیە ژن بێ‌و زیندوو بێ بە زیندوویەتییەکی بەهێز و عومری لە نۆ ساڵ کەمتر نەبێ وە ئەگەر دوو ژن یەکێ پێنج جار شیری خۆیان دادۆشی‌و تێکەڵیان کردو بە پێنج جار دایان بە منداڵێك، هەردووکیان ئەبن بە دایکی منداڵەکە، خواه شیری هەردووکیان ئەوەندەی یەك بێ یاخود زیاد و کەم بن. جا ئەو ژنە خاوەن شیرە ئەگەر بە بێ‌مێرد شیر لە مەمکیا پەیدا بوو، ئەوە هەر نیسبەت لەخۆی ئەدرێ و

مناڵەکەی پێ‌مەحرەم ئەبێ وە ئەگەر بەهۆی پیاوێکەوە پەیدا بوو بوو، ئەوە نیسبەت لەو پیاوە ئەدرێ، خواه ئاوی پیاوەکە لەڕێگای خۆیەوە چووبێتە ئافرەتەکەوە، یا لە نیکاحێکی دروستا تێی کرابێ، یا پیاوەکە بەشوبهە چووبێتە لای ئافرەتەکە و یا بە هۆی موڵکییەتەوە و بە یەکێك لەم هۆیانە شیر زابێتە مەمکی ئافرەتەکە؛ بەڵام شیرێك کە بەهۆی پەیوەندی «زینا»وە پەیدابووبێ لە مەمکی ئافرەتا، ئەوە تەئسیری نییەو نابێ بەهۆی حەرامبوونی مناڵی شیرخۆر لە ئافرەتە شیردەرەکە.

ئەگەر کەسێك ژنێکی خاوەن شیری تەڵاق‌دا و ژنەکە لەپاش بەسەرچوونی «عِدّە» شووی کردو لای مێردە تازەکەی شیری دا بە مناڵێك، ئەوە ئەو مناڵە ئەبێ بە مناڵی مێردی پێشووی نەك ئەم مێردەی ئێستای وە ئەگەر دووکەس بە شوبهە چوونە لای ژنێکی بێ‌مێردو ژنەکە مناڵێکی بوو، ئەوە شیری ئەم ژنە نیسبەت ئەدرێ بۆ ئەو پیاوەیان کە مناڵەکە ئەکرێ بە هی ئەو، خواه بەهۆی قیافەت‌شناسەوە بکرێ بە هی ئەو، یا لەبەر دەلیلێکی‌تر، وەکوو ئەوە کە مناڵەکە لەکاتی چوونەلای یەکێ لەوانەوە کە باسمانکردن شەش مانگی تێ‌نەپەڕاندبێ، بەڵام لە چوونەلای ئەوی‌تریانەوە تەواوی کردبێ؛ ئەم شیرە نیسبەت بە هەرکەس درا، بەهۆی مردنیەوە یا بەهۆی تەڵاق‌دانی ژنەکەوە نیسبەتەکە نابڕێ، هەرچەند ماوەیەکی زۆریشی بەسەرا بڕوا، یاخود شیرەکە وشك بکات‌و پاش ماوەیەك پەیدا ببێتەوە؛ جا ئەگەر شووی کرد بە کەسێکی‌تر، ئەوە شیرەکەی هەر نیسبەت لە کابرای پێشوو ئەدرێ تا مندالی ئەبێ لەم مێردە دواییە.

کاتێ کە شیردان هاتەجێ، ئەم مناڵە ئەبێ بە ئەولادی ئەو ژن و پیاوەکە شیرەکەیانی خواردووەو ئەبن بە مەحرەمی یەکتر. ئەو حەرامییەی کە بەهۆی شیردانەوە پەیدا ئەبێ لە ژن و پیاوەکەوە، ئەڕوا بۆ باوك و باپیرو نەنك (أُصول) و مناڵ‌و مناڵەزا (فُروع)و دەوروپشت، واتە براو خوشك (حواشی)یان. وە لە شیرخۆرەکەوە هەر بۆلای مناڵ و مناڵەزای ئەڕوا.

شیر پێدان ئیسپات ئەبێ بە شەهادەتی دوو پیاو و پیاوێك و دوو ژن و چوار ژن، بەڵام شاهیدی لەسەر پێ‌لێنان بە شیر پێدان، ئیسپات نابێ بە دوو پیاو نەبێ و لە

پێ‌لێنان و لە شەهادەت لەسەر پێ‌لێنانا، درێژەپێدان شەرت نییە. فەرموودەی راستتر ئەوەیە کە شەهادەتی ئەو ژنەیش کە شیری داوە بە منداڵەکە قەبووڵ ئەکرێ، ئەگەر وەختی خۆی داوای کرێی نەکردبێ بەرابەر بە شیردانەکە، خواهـ لە شەهادەتەکەیدا باسی کردەوەو شیر پێدانەکەی خۆی بکا یا نە؛ هەروەها، شەهادەتی دایکی ژنە شیردەرەکەیش دروستە.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە بەس نییە بۆ ئەو شەهادەتە تەنها ئەوە کە شاهیدەکان بڵێن: «شیرخواردنێکی منداڵ حەرامکەریان لەبەینایە»، بەڵکوو واجبە باسی وەخت و ژمارەی شیرپێدانەکەو گەیشتنی شیرەکە بە بۆشایی ناولەشی منداڵەکە بکەن، بەمڕەنگە کە شاهیدەکە بڵێت: شەهادەت ئەدەم ئەو ئافرەتە لە ژوور نۆ ساڵییەوە پێنج جار شیری داوە بەو منداڵە لەتەمەنێکا کە عومری کەمتر بوو لە دوو ساڵ.

گەیشتنی شیرەکە بە بۆشایی لەشی منداڵەکە ئەزانرێ بەهۆی ئەوەوەکە چاوت لێ بێ لە دادۆشینی شیری ژنەکەو کردنی بە قورگی منداڵەکەدا و لەگەڵ ئەوەیشا چاوت لێ بێ قومقوم بیخواتەوە؛ هەروا، ئەزانرێ بەهۆی قەرینەیشەوە، وەکوو ئەوە مەمکی ژنەکە لە دەمی منداڵەکەدا بێ‌و بیمژێ و قورگی منداڵەکەیش بجووڵێتەوە لە قووتدانی شیرەکەدا، پاش ئەوە کە بزانی بەوە ئەو ژنە خاوەن شیرەو وشك نییە؛ بەڵێ، ئەگەر شاهیدەکە شەرعزانێکی‌وا بوو هاومەزهەب بوو لەگەڵ قازیداو باوەڕ پێ‌کراو بوو، ئەوەندە بەسە کە بڵێ: شەهادەت ئەدەم لە بەینی ئەو کوڕو کچەدا شیرپێدانێکی حەرامکەر هەیە، ئیتر پێویست نییە بە تەفسیل پێدانی شەهادەتەکەی.

## باسی پێ‌لێنان لە شیرپێدان

ئەگەر ژنێك یا پیاوێك، یەکە یەکە یا هەردووکیان، وتیان: شیرپێدان هەیە لە بەینی ئێمەدا، ئەوە ئەبێ بەهۆی ئەوە کە بەقەتعی نیکاح لە بەینیانا حەرام بێ بە زاهیرو باتینی شەرع، ئەگەر راست بکەن وە بە زاهیری شەرع، ئەگەر درۆ بکەن.

وە ئەگەر لەپاش عەقدیش هەردووکیان رێکەوتن‌و پێیان لێنا بە شیرپێدان، یا پیاوەکە بەتەنیا پێی لێ بنێ‌و ژنەکە ئینکاری بکا، ئەوەیش ئەبێ بەهۆی جیایی خستنە بەینیان؛

جا ئەگەر کابرا چووبووە لای ژنەکە، ئەوە لە سوورەتی یەکەما واجبە «مَهرالمثل» بدا بە ژنەکە، بەو شەرتە ژنەکە وەختی خۆی ئاگای لە شیر پێدانەکە نەبووبێ، یا کابرا بە زۆر چووبێتە لای، ئەگینا هیچی ناکەوێ وە لە سوورەتی دووهەما، واجبە عەینی مارەییە ناوبراوەکەی تەسلیم بکا وە ئەگەر ژنەکە پێی لێناو کابرا ئینکاریکرد، ئەوە ئەگەر وەختی خۆی ژنەکە لە ئیزنی مارەبڕیناکابرای دیاری کردبوو و لەپاش گوێزانەوەیش بە ئارەزووی خۆی مەجالی مێردەکەی دابوو بێتەلای، ئەوە قسەکەی بێ‌سوودەو ئیعتیباری نییە وە ئەگەر هەر ئیزنی نەدابوو، بەو رەنگە «ولی مُجبِر» مارەی کردبوو، یا لە ئیزنا کابرای دیاری نەکردبوو، یا رێگای کابرای نەدابوو بچێتە لای، یا رێگای دابوو بەڵام ئاگای لە شیردانەکە نەبوو بوو، یا ئاگادار بوو بوو بەڵام کابرا بەزۆر رۆیشتبووە لای، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ‌و جیا ئەکرێتەوە لە کابرا.

جا ئەگەر کابرا چووبووەلای، واجبە «مَهرالمِثل»ی پێ‌بدا، ئەگەر ژنەکە لەو وەختەدا بێ‌ئاگا بووبێ لە شیرخواردنەکە، یا ئاگادار بووبێ بەڵام کابرا بە زۆر داگیری کردبێ، ئەگینا هیچی ناکەوێ وە ئەگەر نەڕۆیشتبێتە لای‌و ژنەکەیش مارەیی وەرنەگرتبێ ناتوانێ داوای هیچ بکا وە ئەگەر وەریگرتبێ، واجبە بیداتەوە بە کابرا، چونکە نەچووەتەلای‌و ژنەکەیش خۆی بووە بەهۆی ئەم جیابوونەوەیە.

بزانن! ئەم ئیقرارکردنە بە شیر تەئسیری نییە بۆ غەیری ئەوکەسەکە ئیقرارەکە ئەکا، چ لەپێش عەقدا بێ‌و چ لەپاش عەقد، مەگەر ئیقرارێك کە پیاو لەپێش عەقدا بیکا و بەشێوەی پێوەلکاندن (اِسْتِلْحاق)یش بێت؛ مەسەلا، بڵێت: فڵانە کچ کچی منەو بۆ کوڕەکەم ناشێ، یا: فڵانەکوڕ کوڕی منەوکچەکەمی بۆ ناشێ، ئەوە تەئسیر ئەکاتە سەرو خوارو دەوروبەر؛ بەڵام ئیقرارێك کە لەپاش عەقدەکەدا بێ‌و ئەولادەکەی خۆی باوەڕی پێ‌نەکا، یاخود لەپێش عەقدەکەدا بێ بە غەیری شێوەی پێوەلکاندن، وەکوو ئەوە کە بڵێ: کچەکەم شیری فڵانە ئافرەتی بێگانەی خواردووە و بۆکوڕی ئەو ناشێ، یا بڵێت: کوڕەکەم شیری فڵانە ژنی خواردووەو کچی ئەوی بۆ ناشێ، ئەوە سوودی نییەو لای شەرع ئیعتیباری نییە، مادام ئەندازە (نِصاب)ی شەهادەت تەواو نەبێ.

له هەرلایەکدا کە ئیقرارکردن بە شیردان تەئسیری ببێ، ئەوە هەر بۆ حەرامیەتی نیکاحە، ئەگینا بۆ مەحرەمیەتی ئافرەتەکەو پیاوەکە بە یەك سوودی نییە؛کەواتە، بەتەنها دانیشتنی ئەو پیاوو ئافرەتە یا تەماشای یەکترکردنیان، حەرامەو دەسکەوتنیان لە یەك دەسنوێژیان ئەشکێنێ.

## باسی ئەوەکە باوك و دایك کوڕو کچەکە بە مەحرەم دابنێن

ئەگەر باوك و دایکی کوڕەکە یا کچەکە لەپێش عەقدا بەیانی شیریان کرد لەبەینی کوڕو کچەکەدا، ئەوە ئەگەر نیسبەتیان دان لە غەیرو وتیان: ئەم کوڕو کچە بەیەکەوە شیری فڵانە ژنی بێگانەیان خواردووەو بۆ یەك ناشێن، ئەوە ئەگەر ژمارەی شەهادەتدەرەکان تەواو بوو، هەرچەند باوك و دایکەکە خۆیشیان لەوان بن، یا ژمارەیان تەواو نەبوو بەڵام کوڕو کچەکە باوەڕیان بە قسەی باوك و دایکەکە بوو، ئەوە نیکاح لەبەینیانا حەرام ئەبێ بۆ هەمیشە وە ئەگەر ئەندازەی شەهادەتدەرەکان تەواو نەبوو و کوڕو کچەکەیش باوەڕیان پێ‌نەئەکردن، ئەوە بە قسەی رووتی ئەوان ئەم دوو کەسە لە یەکتر حەرام نابن و لەم سوورەتەدا، ئەگەر کوڕەکە هاوکوفی کچەکە بوو و هاوکوفێکی‌تر داوای کچەکەی نەکردبوو، قازی ئەم کچە مارە ئەکا لەو کوڕە، چونکە باوکەکە حوکمی باوکێکی هەیە کە رێگای کچی خۆی نەدا شوو بکا ـ وەکوو «ابن حجر» فەرموویەتی لە «فَتاوی» و لە «تُحفه»دا، لە باسی رێگانەدانی شووکردنی کچدا ـ هەروەها، ئەگەر ئەم قسەیە لەپاش عەقدەکەدا بکەن و شاهید تەواو نەبێ‌و منداڵەکانیش باوەڕ نەکەن، هەر لە یەك حەرام نابن.

وە ئەگەر نیسبەتی شیردانەکەیان ئەدا لە خۆیان، ئەوە ئەگەر ژنەکە ئەم نیسبەتەی ئەداو ئەیوت: فڵانە کچ کچی منەو بۆ کوڕم ناشێ، یا: فڵانە کوڕ کوڕی منەو کچی منی بۆ ناشێ، تەماشا ئەکەین، ئەگەر شاهید ببێ لەسەر قسەی ئەم ژنە، یاخود ئەگەر کوڕو کچەکە باوەڕ بکەن، ئەوە لە یەك حەرام ئەبن، ئەگینا حەرام نابن لە یەك؛ بەڵێ، ئیقرارکردنی ئەم ژنە تەنها بۆ حەرامی نیکاحی خۆی لەو کوڕەی کە کردوویەتی بە

کوڕی خۆی تەئسیری هەیە و بۆ بەرەوژوورو بەرەوخوارو دەوروبەری ناڕوا، چونکە ئەم قسەیە ئەگەر بە شەهادەتی دابنێین، ئەوە ژمارەی شاهید تەواو نییە وە ئەگەر بەشێوەی پێوەلکاندن (إستلحاق)ی دابنێین، شەرتی پێوەلکاندن ئەوەیە پیاو بیکا نەك ژن؛ کەواتە، هەر تەنها بە ئیقرار دائەنرێ‌و ئیقرارەکەیش هەر بۆ خۆی بەکار دێت، وەکوو «ابن حجر» لە «فتاوی»دا فەرموویەتی و لە قسەی «شهاب الرّملی»یەوە دەرئەکەوێ و «علي الشّبراملسي» روونی کردووەتەوە.

وە ئەگەر پیاو ئەم نیسبەتە بدات و بڵێت: فڵانە کچ کچی منەو بۆ کوڕەکەم ناشێ، یا فڵانە کوڕ کوڕی منەو کچی منی بۆ ناشێ، ئەمە ئەگەر لەپێش عەقدا بێ، بە قەتعی نیکاحیان حەرام ئەبێ، شاهید ببێ یا نەبێ و منداڵەکان باوەڕ بکەن یا نەیکەن، چونکە ئەم نیسبەتدانە پێوەلکاندنە بەشێوەی شیردان وە وەك بە نەسەبەوە لکاندن وایە و تەئسیر ئەکاتە سەر بەرەوژوورو بەرەوخوارو دەوروبەری ئەو کابرایە، لەبەر ئەوە کە مادام ئەم کوڕە یا ئەم کچە بوو بە منداڵی کابرا، ئەیشبێ بە کوڕەزای باوك و دایکی کابرا وە بە برا یا خوشکی منداڵەکانی تری. وە بە برازای خوشك و برای کابرایش.

وە ئەگەر لەپاش عەقد ئەم نیسبەتەی دا، ئەوە ئەگەر کوڕو کچەکە ـکە ئێستە ژن و مێردن ـ باوەڕیان پێ کرد، یاخود شاهیدی تەواو هەبوو لەسەر راستی نیسبەتەکە، ئەبێ ئەو ژن و مێردە جیا بکرێنەوە لە یەك وە ئەگەر باوەڕیان نەکردو شاهیدیش نەبوو، ئەوە ئەو نیسبەتدانە قیمەتی نییەو نابێ بەهۆی لێك‌جوێ کردنەوەیان و ئەو عەقد و عیسمەتەی دامەزراوە، بەم نیسبەتدانە تێك‌ناچێ؛ بەڵێ، ئەگەر تەڵاقی بائینیان کەوتە بەین، جارێکی تر مارە ناکرێنەوە لەیەك.

**بزانن!** لە هەرلایەکدا شوبهەی شیردان پەیدا بوو، هەرچەند ئەو شوبهەیە بە شەرع سابت نەبێ، باشتر ئەوەیە ئینسان خۆی لەو نیکاحە دوور بگرێ و لە هەر شوێنێکدا سوێند بخورێ لەسەر نەبوونی شیر پێدان، ئەبێ ئەو سوێندە لەسەر نەزانین بەو شیردانە بخورێ و لە هەر شوێنێکدا سوێند لەسەر بوونی بخورێ، ئەبێ سوێندەکە بە روودانی ئەو شیرخواردنە بێ‌و سوێندخۆرەکە بڵێ: شیرخواردنمان لەبەینا بووە.

## باسی هاتنی شیر بەسەر نیکاحدا

ئەگەر کەسێك مارەبڕاوێکی هەبوو کە هێشتا منداڵی شیرەخۆرە بوو و دایکی ئەو کەسە یا خوشکی یا ژنێکی تری پێنج جار شیری دایە، ئەوە نیکاحەکەی هەڵئەوەشێتەوە، چونکە بەو شیرپێدانە بووە بە مەحرەمی کابرا؛ هەروەها نیکاحی ژنە گەورەکەیشی هەڵئەوەشێتەوە کە شیری پێداوە، چونکە ئەمیش ئەبێ بە خەسووی کابرا، وە بۆ هەمیشە حەرام ئەبن لێی؛ جا لەم حاڵەدا، مارەبڕاوە شیرخۆرەکە نیوەی مارەیی ئەکەوێتە سەر کابرا، چونکە هێشتا نەگوێزراوەتەوە، ئەمیش نیوەی «مَهرالمثل» ئەبژێرێ بە دایکی یا خوشکی یا ژنەگەورەکەی کە شیرەکەی داوە بە مارەبڕاوە شیرەخۆرەکە، چونکە ئەو بوو ئەو زەرەرەی لێدا.

وە ئەگەر مارەبڕاوە شیرەخۆرەکە لەکاتی نووستنی ژنە گەورەکەدا دەمی نا بە مەمکیەوەو پێنج جار شیری لێخوارد، ئەوە دیسان نیکاحی هەردووکیان هەڵئەوشێتەوە ـ وەکوو وتمان ـ بەڵام شیرەخۆرەکە نیوە مارەیی ناکەوێ، چونکە خۆی بووە بەهۆی هەڵوەشانەوەی نیکاحەکەی و پێویستە تەواوی «مَهرالمثل»ی ژنەگەورەکەکە ئەم دەمی ناوە بە مەمکیەوە لە ماڵی مارە بڕاوە شیرەخۆرەکە بدرێ بە ژنە گەورەکە، ئەگەر مێردەکەی چووبووە لای، یا نیوەی «مهرالمثل»ی، ئەگەر مێردەکەی نەچووبووە لای، چونکە ئەو مارەبڕاوە شیرەخۆرەیە بووە بەهۆی هەڵوەشانەوەی نیکاحی ژنە گەورەکە لە مێردەکەی و لەم سوورەتەدا کابرا هیچی ناکەوێتە سەر ژنە گەورەکەی، چونکە لەکاتێکاکە مارەبڕاوە شیرەخۆرەکە دەمی ناوە بە مەمکیەوە، ئەو نووستوو بووەو ئاگای لە خۆی نەبووەو مناڵەکە خۆی چووە دەمی ناوە بە مەمکیەوە.

ئەگەر کەسێك ژنێکی گەورە و مارەبڕاوێکی شیرەخۆرەی هەبوو و دایکی ژنە گەورەکە شیری دا بە مارەبڕاوە بچووکەکە، ئەوە نیکاحی هەردوو ژنەکەی هەڵئەوەشێتەوە، چونکە بوون بە خوشك لەژێر نیکاحی یەك کەسدا، بەڵام کابرا بۆی هەیە ئارەزووی لە کامیان هەبێ مارەی بکاتەوە؛ جا ئەگەر پێشان نەچووبووە لای ژنە گەورەکەی، ئەوە پێویستە کابرا نیوەی مارەیی هەردووکیان بدا پێیان و بیبژێرێتەوە بەو

ژنەکە شیرەکەی داوە وە ئەگەر چووبووە لای، ئەوە گەورەکەیان عەینی مارەییەکەی خۆی ئەکەوێ، ئەگەر مارەبڕینەکەی دروستو دامەزراو بووبێ و «مهرالمثل»ی ئەکەوێ، ئەگەر دروست و دامەزراو نەبووبێ و لە هەردوو سوورەتەکەدا، تەواوی «مَهرالمثل»ی ئەم ژنە ئەبژێرێ بە دایکەکەی کە بووە بەهۆی هەڵوەشانەوەی نیکاحەکە.

ئەگەر کچی ژنەگەورەی کابرا شیریدا بە مارەبڕاوە شیرەخۆرەکەی، ئەوە هەردووکیان بۆ هەمیشە حەرام ئەبن، چونکە ژنەگەورەکە ئەبێ بە نەنکی مارەبڕاوە شیرەخۆرەکەو ئەمیش بووە بە کچەزای ئەو.

ئەگەر کەسێك مارەبڕاوێکی بچووکی کەمتر لە دوو ساڵانی تەڵاقدا و ژنێك شیری پێدا، ئەوە ئەو ژنە بۆ هەمیشە حەرام ئەبێ لەم کابرا، چونکە بووە بە خەسووی؛ هەروەها، ئەگەر ژنێکی تەڵاقدراو مارەبڕرا لە منداڵێکی بچووك و شیریدا بەو منداڵە، ئەوە بۆ هەمیشە حەرام ئەبێ لەو پیاوە کە تەڵاقی داوە، چونکە بووە بە بووکی و حەرامیش ئەبێ لەو منداڵە کە لێی مارەبڕاوە، واتە لە مێردە بچکۆلەکەی، چونکە پێشان ژنی باوکی بووە، هەم لەبەر ئەوە کە بوویشە بە دایکی، چونکە شیری داوەتێ.

ئەگەر کەسێك ژنێکی گەورەو سێ مارە بڕاوی شیرەخۆرەی لەژێر نیکاحدا بوو و ژنەگەورەکە شیری دا بە مارەبڕاوە بچووکەکان، ئەوە نیکاحی هەر چواریان هەڵئەوەشێتەوەو بۆ هەمیشەیش لێی حەرام ئەبن، ئەگەر شیری مێردەکەی پێدابن، هەروەها ئەگەر شیری مێردی پێشووی پێدابن، بەڵام مێردەکەی ئێستای چووبێتە لای، لەبەر ئەوە کە ژنە گەورەکە ئەبێ بە خەسووی و ژنە بچووکەکانیش، یا ئەبن بە کچی خۆی یا بە کچی ژن (رَبيبَه)ی[1] وە ئەگەر شیری مێردێکی تر بێو ئەم مێردەی ئێستاشی هێشتا نەچووبێتەلای، ئەوە ئەگەر دوایی شیرپێدانی پێنجەم بۆ هەر سیانیان لەیەك کاتا بوو[2]، ئەوە نیکاحی هەر سیانیان هەڵئەوەشێتەوە، لەبەر ئەوە کە ئەبن بە سێ خوشك لە

١. ئەگەر ژنەکەی شیری ئەم کابرایەی پێدا بن، ئەبن بە کچی کابرا خۆی وە ئەگەر شیری کابرای پێشووی پێدابن، ئەبن بە کۆڵەوەس (رَبيبَة)ی.

٢. وەکوو ئەوە کە شیرەکە دادۆشرابێتە قاپێكو بە کەوچکە چا لە یەك کاتا بیکەن بە دەمی هەر سێ منداڵەکەوە!

نیکاحی یەك کەسدا، بەڵام لەوەپاش کابرای مێردیـان مـەیلی لە هـەرکامیان هـەبوو، ئەتوانێ مارەی بکاتەوە وە ئەگەر بەرودوا شیری پێدان، ئەوە نـیکاحی یـەکـەمیان هەڵئەوەشێتەوە لەگەڵ ژنەکەیداکە نەچووەتە لای، لەبەر ئەوەکە بوون بە دایك و کچێك لە نیکاحی یەك کەسدا و نیکاحی دووهەمیشیان هەڵئەوەشێتەوە لەوکاتەداکە ژمارەی شیرپێدانی سێهەمەکەیان ئەبێ بە پێنج‌جار، چونکە ئەبن بە دوو خوشك لە نیکاحی یەك کەسدا و هەڵناوەشێتەوە بە شیرخواردنی خۆی، لەبەر ئەوە کە مارەبڕاوە بچووکە یەکەمەکەیان لە نیکاحی کابرادا نەماوە تا بڵێین: دوو خوشکن لە نیکاحی کەسێکدا؛ کە شیر پێدانی مارەبڕاوی سێهەمیش بوو بە پێنج جار، نیکاحی ئەمیش هەڵئەوەشێتەوە لەبەر ئەوەکە لەگەڵ مارەبڕاوە شیرەخۆرە دووهەمەکەدا، دوو خـوشکن لە نـیکاحی پیاوێکدا.

**بەشی سێهەم:** ئەو ژنانەیەکە بەهۆی ژن و ژن‌خوازی (مُصاهَرة) وە حەرام‌بوون؛ ئەمانەش چەند تاقمن؛

**یەکەم:** مارەبڕاوی باوك و باپیرەو بەرەوژوورترە بـە مـارەبڕیـنێکـی دروست و دامـەزراو، جـا بـاوك و بـاپیری نـەسەب بـن، یـا هـی شـیری بـن وە چـووبنە لای مارەبڕاوەکەیان یا نەچووبنە لای؛

**دووهەم:** مارەبڕاوی کوڕو کوڕەزاو بەرەوخوارترە بە مـارەبڕیـنێکـی دروست و دامـەزراو، جـا کـوڕو کـوڕەزای نـەسەب بـن یـا هـی شـیری بـن وە چـووبنە لای مارەبڕاوەکەیان یا نە؛

**سێهەم:** دایكو دایکی دایكو بەرەوژوورتری مارەبڕاوەکەیە بە مـارەبڕیـنێکـی دروست و دامەزراو، خواه دایکی نەسەب بێ یا دایکی شیر و کـابرا چـووبێتـە لای مارەبڕاوەکەی یا نە؛

**چوارەم:** کچ و کچی کچو کچی کوڕو بەرەوخوارتری مارەبڕاوەکەیە بە نیکاحێکی دروست و دامەزراو، جاکچی نەسەبی بێ یاکچی شیری، بەو شەرتەکە چووبێتە لای لەپێشەوە یا لەپاشەوە، یاخود ئاوی بە حورمەتی تۆوی هەڵگرتبێ لەبەرەوە یا لەدواوە،

بەو شەرتەکە باوەڕی وابووبێ حەڵاڵە، ئەگینا بە تەنیا مارەکردنەکەکچی مارەبڕاوەکەی لێ حەرام نابێ و ئەتوانێ بەرلە چوونە لای مارەبڕاوەکە، تەڵاقی بداو کچەکەی مارە بکا.

**بەشی چوارەم:** ژنێکە کە چووبنە لای بەهۆی نیکاحەوە یا بە شوبهە یـا بـەهۆی موڵکییەتەوە؛ ئەم ژنە، حەرام ئەبێ لە هەندێ کەس، بەپێی ئەو تەفسیلەی لەمەولا دێت:

هەرکەس بڕواتە لای ژنێکی زیندوو بەهۆی نیکاحێکی دامەزراو یا دانەمەزراوەوە، یا بەهۆی موڵکییەتەوە، و لەبەرەوە یا لەدواوە، ئەوە ئەو ژنە بۆ هەمیشە حەرام ئـەبێ لەسەر باوك و باپیری کابرا، هەرچەند بەرەوژوور بـڕوا وە لەسـەر کـوڕو کـوڕەزای، هەرچەند بەرەوخوار بڕوا؛ دایك و نەنك و کچ و کچەزای ئەو ژنەو کچی کـوڕیشـی حەرام ئەبن لەو کابرا، خواه لەو کاتەدا بین یا لەوەپاش پەیدا بین؛ مەسەلا، بەمجۆرە کە ئەو ژنە شوو بکا بە کەسێکی تر و کچێکی لێ ببێ یاخود کوڕێکی لەم کابرا ببێ کە تازە شووی پێ کردووەو ئەم کوڕەش کچێکی ببێ، ئەمانە هەموو حـەرام ئـەبن لە مـێردە پێشووەکەی، هەرچەند لەم وەختەدا، لە عورفا بە کچی ئەم ژنە لە مێردە دواییەکەی ناڵێن: «رَبیبَة»ی مێردە پێشووەکەیەتی، بەڵام هەر بەهۆی ئەوەوەکە مێردە پێشووەکەی چووەتەلای، نەتەوەی ئەم ژنەی لێ حەرام ئەبێ.

لەم مەسئەلانەدا، هەروەکوو حەرامیەتی نیکاح سابت ئەبێ، مەحرەمیەتیش سابت ئەبێ؛ کەواتە، ئەو ژنە دەسنوێژی باوك و باپیرو کوڕو کـوڕەزای کـابرا نـاشکێنـێو تەماشاکردن و خەڵوەتکردن لەنێوانیانا حەڵاڵە؛ هەروەها، کچی ژنەکە دەسنـوێژی کابرا ناشکێنێو تەماشاکردن و بەتەنیا لەگەڵ دانیشتن لەناویانا دروستە، وەکوو لەگەڵ کچی خۆیا.

ئەگەر کەسێك بەشوبهە چووە لای ئافرەتێك، یەعنی شوبهەکە لای کـابراوە بـێ، خواه ژنەکەیش شوبهەی ببێ یا نە، ئەوە دایك و نەنکی ئەو ژنە تا بەرەوژوور بڕوا وە کچ و کچەزای تا بەرەوخوار بڕوا، حەرام ئەبن لەسەر ئەم کابرایە وە ئەو ژنە حـەرام ئەبێ لە باوك و باپیری ئەو کابرا، هەرچەند بەرەوژوور بـڕۆن و لە کـوڕو کـوڕەزای،

هەرچەند بەرەوخوار بڕۆن، بەڵام ئەوەندە هەیە لەم مەسئەلەیەدا تەنها حەرامیەتی نیکاح سابت ئەبێ، ئیتر مەحرەمیەت سابت نابێ؛ کەواتە، بە تەنها دانیشتن و تەماشاکردن لەنێوانیانا حەرامە و دەس‌نوێژی یەکتر ئەشکێنن.

**بزانن!** هەروەکوو چوونەلای ئافرەتێك بە شوبهە لە ئەساسا ئەبێ بەهۆی حەرامبوونی نیکاحی ژنی بێگانە، هەروەها ئەگەر ئەو چوونەلایە بەسەر نیکاحیشا بێت، نیکاحەکە بەتاڵ ئەکاتەوەو ژنەکە حەرام ئەبێت لەو کابرایە بۆ هەمیشە، بەپێی ئەم تەفسیلەی خوارەوە؛

مەسەلا، ئەگەر کەسێك بەشوبهە چووە لای ژنی کوڕی خۆی، ئەوە ئەو ژنە حەرام ئەبێ لە کوڕەکە، خواه وەختی خۆی ئەو ژنە نامەحرەم بووبێ بۆ ئەم کابرایە، یاخود مەحرەمی بووبێ؛ مەسەلا، خوشکەزای یا برازای خۆی بووبێ‌و مارەی‌کردبێ بۆ کوڕەکەی.

وە ئەگەر کوڕێك بڕواتە لای ژنی باوکی خۆی، ئەوە ئەو ژنە حەرام ئەبێ لەسەر باوکی، خواه ژنەکە دایکی کوڕەکە بووبێ یاخود باوەژنی بووبێ وە ئەگەر بڕواتە لای خەسووی خۆی، ژنەکەی لێ حەرام ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر بڕواتە لای کچی ژنی، ژنەکەی لێ حەرام ئەبێ، خواه ئەو کچە لەخۆی بێ یا کچی ژنەکەی بێ لە مێردێکی تری؛ هەروەها، ئەگەر بچێتە لای کچی کوڕی ژنەکەی، هەر ژنەکەی لێ حەرام ئەبێ.

**بزانن!** شوبهە، سێ جۆرە؛ شوبهەی ئێشکەر (فاعِل) هەیە، وەکوو ئەوە ئینسان بچێتە لای ژنێکی بێگانە لەحاڵێکا کە بە ژنی خۆی بزانێ.

وە شوبهەی ڕێگا (طریق) کە لەسەر جیاوازیی مەزهەبەکان پەیدا ئەبێ، وەکوو چوونەلای مارەبڕاوێك کە لەسەر فەرموودەی هەندێ لە ئیمامەکان مارەبڕینەکەی دامەزرابێ و لەسەر فەرموودەی هەندێکیان دانەمەزرابێ، وەك مارەبڕین بە بێ وەلی‌ئەمر کە بە فەرموودەی «ئیمامی ئەعزەم» دروستە، یا بە بێ‌شاهید کە بە فەرموودەی «ئیمامی مالیك» دروستە، هەروەها هەر مارەبڕینێکی تر کە تەنها لەسەر فەرموودەی هەندێ لە ئیمامەکان دروست بێ.

وە شوبهەی جێگا (محلّ) کە ئەوەتە هاوبەشێك بڕواتە لای جاریەیەك کە موڵکی هەردوو هاوبەشەکە بێ، یاخود باوك بڕواتە لای جاریەی کوڕی خۆی؛ لە هەموو ئەم بەشانەدا، حوکمەکانی چوونەلای بە شوبهە (وَطء بالشُّبهة) جاری ئەبێ.

**بێداری!** چوونە لای ئافرەتێك بە زینا، هیچ ئەسەرێکی نیکاحی لێ پەیدا نابێ و «مُباشَرة»، یەعنی خۆتێکەڵکردن لەگەڵ ئافرەت بە ئارەزووەوە، مادام چوونەلای لەگەڵ نەبێ، نابێ بەهۆی حەرامبوون، یان پەیدابوونی ئەو ئەسەرانەی لەمەوپێش باسمان کردن، هەرچەند کابرا ئاویشی بێتەوە بەهۆی ماچکردنی ئافرەتەکە یا نووساندنی بەخۆیدا یا بەهۆی دەست لەملکردنیەوە، یا بە هەر جۆرێکی تر.

**بەشی پێنجەم:** ئەو ئافرەتانەن کە بەهۆی «لِعان» (لەعنەتکردنەوە) لە مێردەکانیان جیا ئەبنەوە؛ ئەوانە بە قەتعی دروست نییە بۆ کۆنەمێردەکانیان جارێکی تر مارەیان بکەنەوە.

**بەشی شەشەم:** غەیری جوولەکەو گاورە لەناو ژنانی کافردا، خواه لەوانەبێ کە هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەکوو ئاگرپەرست و بتپەرست، یا هەر باوەڕی بە خوا نەبێ، یا لە ئەهلی کتێب و ئایینی کۆن بێ وەك ئەوانەی کە ئیدیعای ئەوە ئەکەن کە لەسەر دینی حەزرەتی ئیبراهیمن، یا وەکوو «صابِئە» کە خۆیان ئەدەنە پاڵ «صابِیء» کە گوایە مامی "حەزرەتی نوح" بووە، نەك ئەو سابئییانە کە گاورن، هەروایە ژنێ کە خۆی بداتە پاڵ «زَبُور» و لەسەر دەستووری «زَبور» بجووڵێتەوە، یاخود باوکی کیتابیبێ و دایکی بتپەرست بێ، یا بەپێچەوانەوە، یاخود لە دینی عیسایی لایدابێ و بووبێ بە جوولەکە، یا بەپێچەوانەوە، یاخود لە ئایینی ئیسلام پاشگەز بووبێتەوە؛ ئەمانە نیکاحیان بە هیچ جۆرێ دروست نییە تا موسوڵمان ئەبن.

بەڵێ، ژنە جوولەکەو ژنە گاور، مارەبڕینیان دروستە، بەو شەرتانەی لەوەپێش باسمان کردن؛ هەروەها مارەبڕینی ژنە «سامِری» دروستە کە بەشێکن لە جوولەکە ئەگەر بە خیلافی دینی جوولەکە رەفتار نەکەن و ژنە «صابِئی» ئەگەر بەخیلافی دینی مەسیحی رەفتار نەکەن، ئەگینا مارەکردنی ئەمانیش وەکوو کافرەکانی تر حەرامە.

ئەگەر ژنێکی موسوڵمان پاشگەز بووەوە، ئەوە ئەگەر بەرلەوە بوو کە مێردەکەی بچێتەلای، دەس‌بەجێ نیکاحەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە وە ئەگەر پاش چوونەلای بوو، رائەوەستین‌و تەماشا ئەکەین، ئەگەر لە ماوەی «عِدّة»کەیدا هاتەوە بۆ سەر ئایینی ئیسلام، ئەوە دەرئەکەوێ کە نیکاحەکەی ماوە، ئەگینا دەرئەکەوێ کە هەر لەکاتی پاشگەز بوونەوەیەوە نیکاحەکەی هەڵوەشاوەتەوە.

هەروەها، ئەگەر موسوڵمانێك ژنە جوولەکەیەکی هێنا کە ئەویش لای دابوو لە دینی عیسا، یاخود ژنەگاورێکی مارەکرد کە لایدابوو لە دینی جوولەکە، ئەوەش حوکمی ژنە موسوڵمانیکی هەیە کە پاشگەز بووبێتەوە لە ئایینی ئیسلام، یەعنی ئەگەر بەر لە چوونەلای، لایدا لە دینی پێشووی، ئەوە دەس‌بەجێ نیکاحەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەگینا ئەگەر لە ماوەی «عِدّة»دا موسوڵمان بوو، ئەوە باشە، ئەگینا لەوکاتەوە کە لە دینی خۆی لایداوە، نیکاحەکەی هەڵوەشاوەتەوە و بەقەتعی دروست نییە بۆ ئەم ژنە کە بگەڕێتەوە سەر ئایینە پێشووەکەی، بەڵکوو ئەگەر بیەوێ نیکاحەکەی هەڵنەوەشێتەوە، ئەبێ موسوڵمان ببێ.

جا ئەگەر کەسێك ژنێکی جوولەکە یا گاوری مارەکردو شەرتەکانی تیا هاتەدی، ئەوە ئەو ژنە کیتابییە وەك موسوڵمان وایە لە نەفەقەو لە دابەش‌کردنی شەوەکانا بەسەر ئەم ژنەو ژنەکانی تریا و لە تەڵاقدا لەبارەی «سنّي» و «بِدْعي»یەوە، بەڵام میرات نابا لە مێردەکەی‌و مێردەکەیشی میرات نابا لەم؛ هەروەها، مێردەکەی ئەتوانێ زۆری لێ بکا بۆ ئەوەی لەپاش لەش پیس‌بوون خۆی بشوا هەرچەند کە کافر نییەت‌هێنانی بۆ نییە وە لەکاتی پاکەوەبووندا لە حەیزو لە زەیسانی؛ هەروەها، ئەتوانێ زۆری لێ‌بکا بۆ شۆرینی هەر شوێنێکی یا هەر جلێکی کە پیس بووبێ وە لەسەر شۆردنی قاپ و قاچاخی وە ئەتوانێ بە زۆر دەسی پێ‌هەڵبگرێ لە خواردنی گۆشتی بەرازو خواردنەوەی شەراب و عەرەق و لە هەر شتێکی‌تری حەرام، بۆ ئەوەی بەتەواوی لەزەتی لێ‌وەربگرێ.

**بەشی حەوتەم:** ژنێکە بەهۆی تێکەڵییەوە لەگەڵ مەحرەمدا حەرام ئەبێ؛ مەسەلا، کەسێك خوشکی یا دایکی یا مەحرەمێکی‌تری تێکەڵ ببێ بە کۆمەڵە ژنێکی ژمێرراوەوەو

مەحرەمەکەی خۆی نەناسێتەوە، ئەوە بەقەتعی حەرامە هیچکام لەو کۆمەڵە ژنە مارە بکا وە ئەگەر مارەی کرد، دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر تێکەڵی کۆمەڵەژنێکی لە ژمارە نەهاتوو بوو بوو، وەك ئەهلی شارێك، ئەوە دروستە لەو ژنانە مارە بکا.

بەڵێ، چەند بەشە ئافرەتێکی‌تر هەن مارەکردنیان حەرامە، بەڵام حەرامییەکە بۆ ماوەیەکی تایبەتییە؛

یەکەم: ئەو ژنانە کە پیاو بیەوێ لەگەڵ مەحرەمی خۆیانا کۆیان بکاتەوە لە نیکاحدا، وەکوو دوو خوشك وە ژن و پووری. قاعیدەی زانینی ئەم جۆرە حەرامییە، ئەوەتە: «هەردوو ئافرەتێك کە خزمایەتییەکی‌وایان لەبەینا بێ، بە نەسەب یا بە شیر، کە ئەگەر فەرز بکەین یەکێکیان پیاوە، نیکاح حەرام ببێ لەنێوانیانا، ئەوە کۆکردنەوەیان پێکەوە حەرامە لە نیکاحی یەك کەسدا». جا ئەگەر لە عەقدێکا دوو ئافرەتی وای کۆکردەوە، ئەوە نیکاحی هەردووکیان بەتاڵە وە ئەگەر بەرودوا هاوردینی، ئەوە نیکاحی پێشووەکەیان دامەزراوەو هی دووهەمیان بەتاڵە، هەروەها ئەگەر پێشووەکەیان تەڵاقی کەوت بە تەڵاقی «رِجعی» کە ئەتوانێ بە بێ‌مارەکردنەوە بیگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی، چونکە ژنێك کە تەڵاقی «رِجعی»ی کەوتبێ، لە حوکمی ژندایە بۆ مێردەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر تەڵاقی بە شێوەی بائینە کەوتبوو، یاخود فەسخی نیکاحی کرابووەوە، ئەوە دروستە دووهەمەکەی بەسەرا بهێنرێ، هەرچەند هێشتا «عِدّة»ی ژنە تەڵاقدراوە بائینەکە یا ژنە نیکاح هەڵوەشێنراوەکە تەواو نەبووبێ.

جا بەو قسەیەکە وتمان: «بە نەسەب یا بە شیر»، ئەوە دەرچوو کە ئافرەت کۆبکرێتەوە لەگەڵ کۆنە خەسوویا، یەعنی لەگەڵ دایکی مێردی پێشوویدا، یا لەگەڵ کۆنە بووکیا، یەعنی لەگەڵ ژنی پێشووی کوڕیا، یا کۆبکرێتەوە لەگەڵ رەبیبەی ئەو پیاوەدا کە لە غەیری دایکی کچەکەی بێ، یا کۆبکرێتەوە لەگەڵ رەبیبەی مێردەکەیا لە ژنێکی تری، یا خوشکی دایکیی کەسێك کۆبکرێتەوە لەگەڵ خوشکی باوکیی ئەو کەسەدا.

وە بەو قسەیەکە وتمان: «ئەگەر یەکێکیان فەرز بکەین بە پیاو، نیکاح حەرام بێ لەنیوانیانا»، ئەوە دەرچوو کە ئافرەتێك کۆبکرێتەوە لەگەڵ کچی پووریا، خواه پوورەکەی خوشکی باوکی بێ یا خوشکی دایکی؛ ئەمانە کۆکردنەوەیان دروستە.

دووەم: مارەکردنی ئافرەتێك کە زیاد بێ لەسەر ئەو ژمارەیە کە بەپێی شەرع مارەکردنی دروستە؛ پیاوی ئازاد حەقی هەیە چوار ژنی لە یەك کاتدا هەبێ، کە کردی بە پێنج، ئەوە نیکاحی پێنجەمیان دانامەزرێ؛ جا ئەگەر بە یەك عەقد پێنج ژنی هێنا، ئەوە نیکاحی هەموویان بەتاڵە وە ئەگەر بەرودوا بوون، ئەوە نیکاحی پێنجەم و زیاتر لە پێنجەمیان بەتاڵە و هەتا ئەو چوار ژنە لە نیکاحی ئەو کابرایەدا بن، دروست نییە ژنی تر مارە بکا، هەروەها ئەگەر تەڵاقیشیان بدا بە تەڵاقی «رِجعی»، بەڵام ئەگەر تەڵاقی دان بە تەڵاقی «بائِن»، یاخود نیکاحی هەڵوەشایەوە، یا بەهۆی لەعنەتکردن (لعان)ەوە ژنەکان لە نیکاحی دەرچوون، دروستە هی تر مارە بکا، هەرچەند «عِدّە»ی ئەو ژنە پێشوانەشی بەسەر نەچووبێ.

سێهەم: ژنێکە کە لە ئیحرامی حەج یا عەمرەدا بێ، ئەمە نیکاحی دروست نییە تا لێ ئەبێتەوە.

چوارەم: ژنێکە لە «عِدّە»ی کەسێکی ترا بێ غەیری ئەو کەسەی کە ئەیەوێ مارەی بکا، خواە «عِدّە»ی تەڵاق یا «عدّة»ی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح؛ ئەوە تا «عِدّە»کەی تەواو ئەبێ، نیکاحی دروست نییە.

پێنجەم: ژنێکە کابرای مێردی هەر سێ تەڵاقەی دابێ؛ ئەمە نیکاح ناکرێتەوە لەو مێردەی تا جاش (تحلیل) نەکرێتەوە، یەعنی تا شوو نەکا بە مێردێکی تر و ئەویش جیا ببێتەوە لێی بەهۆی تەڵاق یا هەڵوەشاندنەوەی نیکاح یا مردنیەوە.

لەم تەحلیلکردنەدا، چەند مەرجێك پێویستە؛

یەکەم: ئەوەیە نیکاحەکە دروست و راست بێ، ئەگینا نیکاحی دانەمەزراو ژنی پێ حەڵاڵ نابێ، هەرچەندیش کابرا بچێتە لای؛

دووەم: ئەوەیە مێردەکە لە تەمەنێکا بێ کە بەتەبیعەت ئارەزووی ژن بکا؛

سێهەم: ئەوەیە ئەو مێردە بڕواتە لای ژنەکەو ئیشی لەگەڵدا بکا؛

چوارەم: ئەوەیە کە لەم مێردە جیا ببێتەوە بە مردن یا بە تەڵاق یا بە هەڵوەشاندنەوەی نیکاح؛

پێنجەم: ئەوەیە «عِدّە»ی ئەو جیابوونەوەیش بەسەر بچێ. جا ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنەجێ، دروستە مێردە پێشووەکەی مارەی بکاتەوە و قەیدی نییە ئەگەر کابرای مێردی دووهەم لە وەختی نووستنی ژنەکەدا بڕواتە لای یا لە حەیزا یا لە زەیسانییا یا لەکاتی ڕۆژوودا یا لە «عِدّە»ی شوبهەدا، بەمڕەنگە پاش ئەوەکە مارەکرا لەم کابرایەی دووهەمە کە پێی ئەڵێن: «محِلّل»، کەسێکی تر بە شوبهە بڕواتە لایو موحلیلەکەیش لەو «عدّة»ی شوبهەیەدا بە حەرامی بڕواتە لای، یاخود کە چووە لای، شتێك بپیچێ بە زەکەریەوە، یاخود ئاوی نەیەتەوە، یاخود ژنەکە «بێبن»بێو بەکارەتی لانەچێ؛ لە «تُحفە»دا فەرموویەتی: بە هەموو ئەم وەزعانە تەحلیلەکە تەواو ئەبێ.

جا ئەگەر بە ڕێکەوت ژنەکە شووی کرد بە کەسێك و لەپاش گواستنەوەی کابراکە مرد، یاخود تەڵاقیدا، ئەوە باشە وە ئەگەر کەسێکیان دۆزییەوە، بۆی مارە بکەن و لەپاش چوونەلای تەڵاقی بدا، ئەوە ئەگەر بە بێناوبردنی هیچجۆرە مەرجێك ژنەکەی بۆ مارەکرا، ئەوە باشە وە ئەگەر لەناو عەقدەکەدا شەرتیان کرد هەرکە چووە لای تەڵاقی بدا، یا تەڵاقی بکەوێ یا نیکاحی نەمێنێ، یا بائینە ببێتەوە، ئەوە ئەو نیکاحە بەتاڵە و بەم نیکاحە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ مێردە پێشووەکەی وە ئەگەر لە عەقدەکەدا شەرتەکە نەکرا، بەڵام لەپێشا کابرا حاڵی کرابوو لە ئیشەکە و لەناو عەقدەکەدا لەدڵا هەبوو، ئەوە بە زاهیری شەرع دروستە، بەڵام کەراهەتی هەیە.

ئەگەر ئەو ژنە کە سێ تەڵاقەی کەوتووە، لەپاش ماوەیەك کە بەشی ئەوەی ئەکرد شوویەکی تیا بکاو تەڵاق بدرێو «عِدّە»ی بەسەر بچێ، هاتەوە و ئیددیعای کرد کەوا تەحلیل کراوەو مێردە پێشووەکەی باوەڕی پێکرد، ئەوە بە بێسوێند قسەکەی قەبووڵ ئەکرێ، هەتا وەکوو ئەگەر ڕاستی قسەی ژنەکەشی نەئەچووە دڵەوە، هەر دروستە مارەی بکاتەوە، لەبەر ئەوە کە لە عەقدا قسەی خاوەنەکەی حیسابە و لەم مەسئەلەیەدا، ئەو ژنە خاوەنی عەقدەکە بووە؛ بەڵێ، لەمکاتەدا کەراهەتی هەیە مێردی پێشوو مارەی بکاتەوە تا تەحلیلەکەی بەتەواوی بۆ ساغ ئەبێتەوە.

وە ئەگەر کابرای مارەکەر (مُحلِّل) وتی: تەڵاقم نەداوە، ئەوە باوەڕ بە قسەکەی ئەکرێ، مادام مێردی پێشوو نەزانێ کە درۆ ئەکا؛ ئەگەر کابرای مارەکەر وتی:

نەچوومەتە لای‌و ژنەکەیش وتی: هاتووەتەلام، ئەوە ئەگەر مێردی پێشوو باوەڕی بە قسەی ژنەکە ئەکرد، دروستە مارەی بکاتەوە، هەرچەند وەلی ژنەکە بەتەنها یا شاهیدەکانی عەقدەکە بەتەنها لەسەر قسەی کابرای مارەکەر بن؛ بەڵێ، ئەگەر شاهیدەکان لەگەڵ وەلی‌ئەمری ژنەکە هەموو لەسەر قسەی کابرای مارەکەر بن، ئەوە باوەڕ بە قسەی ژنەکە ناکرێ.

وە ئەگەر مێردە پێشووەکە خۆی ژنەکەی بەدرۆدا خستەوەو وتی: حاشا! مارە نەکراوی لەکەس، ئەوە بۆی دروست نییە مارەی بکاتەوە، مادام پەشیمان نەبێتەوە لە بەدرۆدا خستنەوەکەی؛ جا ئەگەر پەشیمان بووەوەو وتی: لام مەعلووم بوو کە راست ئەکا، ئەوە دروستە مارەی بکاتەوە.

وە ئەگەر ژنەکە پێی لێنا کەوا شووی کردووە بە کابرایەکی تازە، کەچی لەدواییدا پەشیمان بووەوە، ئەوە ئەگەر لەپێش مارەکردنەوەدا بێ لە مێردە پێشووەکەی، یا لەپاش مارەکردن و پێش‌چوونەلای دابێ، قسەکەی قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر لەپاش مارەکردن و چوونەلای‌دا بێ، قیمەتی نییە، چونکە ئەسڵ لە عەقددا دامەزرانیەتی و پاش ئەوەش کە ژن مارەکرایەوە لە مێردی پێشووی، عەقدەکە تێك‌ناچێ بە قسەی ئەو ژنە.

## باسی ئەوانەی کە بەشوودانی ژنیان بەدەستە (ولیّ)

لەناو ئەوانەدا کە حەقی بەشوودان و مارەبڕینی ئافرەتیان بەدەستە، باوك لەپێش هەموویانەوەیە، ئەمجا باپیرە، ئەمجا برای باوکی‌و دایکی، ئەمجا برای باوکی، ئەمجا کوڕی برای باوکی‌و دایکی، ئەمجا کوڕی برای باوکی، هەرچەند دووریش بکەونەوە، ئەمجا مامی باوکی و دایکی، ئەمجا مامی باوکی، ئەمجا کوڕی مامی باوکی و دایکی، ئەمجا کوڕی مامی باوکی، هەروەها ئەم حەقە ئەگا بە مامی باوکی ژنەکە و ئەولادی ئەوو مامی باپیرەی و ئەولادی ئەویش؛ لەم ریزەوە کە باسمان کرد، دەرکەوت برای دایکی و مامی دایکی حەقی بەشوودان‌و مارەبڕینی ئافرەتیان نییە.

بەڵێ، عەلاقەی دایك بە ئافرەتەوە ئەبێ بەهۆی پێشکەوتنی هەندێ کەس لەسەر هەندێ کەسی تر؛ کەواتە، ئەگەر ژنێك دوو ئامۆزای هەبوو و یەکێکیان برای دایکیشی

بوو، ئەوە ئەمەیان پێش ئەکەوێ، خواه ئەو دوو ئامۆزایە وەکوو یەك بن، یەعنی هەردووکیان کوڕی مامی باوکی و دایکی یا کوڕی مامی باوکی بن، یاخود یەکێکیان بەهێزتر و بێ‌هێزەکەیان عەلاقە دایکییەکەی هەبێ؛ کەواتە، ئەگەر ئافرەتێك ئامۆزایەکی باوکی و دایکی هەبوو لەگەڵ ئامۆزایەکی باوکیدا و ئامۆزا باوکییەکەی لە هەمانکاتا برای دایکیشی بوو، ئەوە ئەمەیان پێش ئەکەوێ لەسەر ئەوەی پێشوویان، چونکە ئەمیان لەلایەن دایکەوە برایەتی و لەبەر ئەوە پەیوەندی زۆرترە لەگەڵی.

بەڵام ئەگەر ژنێك دوو ئامۆزازای هەبوو و یەکێکیان کوڕی خۆی بوو؛ مەسەلا، ئەو ژنە شووی کردبوو بە ئامۆزای خۆی و کوڕێکی لێ بووبوو وە ئەوی تریان برای دایکیی بوو، ئەوە ئەو ئامۆزازایەیان پێش ئەکەوێ کە کوڕی خۆیەتی لەسەر ئەویان کە برای دایکییەتی، چونکە کوڕ عەسەبەیە، نە وەك برای دایکیی.

لەناو ئەم وەلی‌ئەمرانەدا کە باسمان کردن، کەسیان حەقی مەجبوورکردنی ژنی نییە بۆ شووکردن بە کەسێکی تایبەتی، تەنها باوك و باپیرە نەبێ، ئەویش بەو مەرجە کە شەرتەکانی دروستی مەجبوورکردن هاتبنەدی و کەسیان ویلایەتی مێردو ژنی پێکەوە پێ‌ناکرێ تەنها باپیرە نەبێ.

هەروەها دەرکەوت لەو تەرتیبەوە کە لەوەپێش باسمان کرد، ئەمە کەوا کوڕی ژن حەقی ویلایەتی نییە بەو سیفەتە کە کوڕی ژنەکەیە؛ بەڵێ، ئەگەر وەکوو کوڕیەتی ئامۆزازایشی بێ، یاخود قازی بێ، ئەوە ئەتوانێ بە سیفەتی ئامۆزازایەتی یا قازییەتی دایکی خۆی مارە ببڕێ لە کابرایەك.

جا ئەگەر وەلی‌ئەمری ژن بەهۆی نزیکی (نَسَب)ەوە دەس نەکەوت، ئەوجار حەقی ئەوانەیە کە ئەهلی ئازادکردنن، یەعنی ئەگەر ئافرەتەکە بەندەی ئازادکراو بوو، ئەوە ئازادکەرەکەی حەقی هەیە بیدا بە شوو، ئەوەش بزانین کە ئەم حەقە بە نیسبەت ئازادکەرو ئازادکراوەوە بە میرات ئەڕوا، وەکوو لە نەسەبدا وە ئەگەر ئافرەتەکە بەندەی ئازادکراویش نەبوو، حەقی بەشوودانی، هی حوکمڕانی موسوڵمانانە لەو شوێنەدا.

## باسی ویلایەتی قازی بەدرێژی

**قازی شەرع لە چەند شوێنێکا ئافرەت ئەدا بە شوو؛**

**یەکەم:** لەشوێنێکا کە ئافرەتەکە کەسێکی نەبێ وەلی ئەمری بێ بە نەسەب.

**دووهەم:** لەشوێنێکا کە وەلی ئەمری ببێ بە نەسەب، بەڵام شتێك ببێ بەهۆی ئەوە کە ئەو وەلی ئەمرە واجبی خۆی پێ نەبینرێ؛ مەسەلا، منداڵ بێ یا شێت بێ یا فاسق بێ یا نەفام بێ و لەویش بەولاوە وەلی ئەمرێکی تری دووری بە نەسەب نەبێ؛ ئەگینا لەسوورەتێکا کە برای ژنەکە منداڵ بێ، ئەگەر مامی هەبێ، ئەو عەقدی نیکاحەکە ئەکا نەك قازی.

**سێهەم:** لەکاتێکا کە وەلی ئەمری نەسەب بێ‌سەرو شوێن ڕۆیشتبێ، ئەوە هەتا ماوەیەکی وا تێ ئەپەڕێ کە قازی بتوانێ حوکم بکا بە مردنی، هەر قازی کچی ئەو کەسە مارە ئەکا؛ جا پاش ئەوە کە قازی حوکمی کرد بە مردنی، ئەگەر وەلی ئەمری دووری هەبوو، ئەوە ئەو مارەی ئەکا، ئەگینا ویلایەتەکە ئەگەڕێتەوە بۆ قازی.

**چوارەم:** لەکاتێکا کە وەلی ئەمری نەسەب ئیحرامی دابەستبێ بۆ حەج یا بۆ عەمرە، خواه ئیحرامەکەی دروست بێ یا بەتاڵ بێ.

**پێنجەم:** لەکاتی «عضل»دا، یەعنی لەکاتێکا کە کچێکی بالیغەی عاقیلە داوا بکا لە وەلی ئەمرەکەی کە مارەی بکا لە کەسێکی هاوکوفی خۆی و ئەویش بە بێ‌بیانوویەکی شەرعی مارەی نەکا لەو کەسەو هاوکوفێکی تری خۆی نەبێ بیداتێ، ئەوە ئەگەر ئەم بەشوونەدانە جارێك یا دوو جار بێ، قازی ئەتوانێ کچەکە مارە بکا لەو هاوکوفەی، چونکە وەلییەکە بەم یەك دوو جارە فاسق نابێ‌و لەسەر ویلایەتی خۆی ئەمێنێتەوە و قازی ئەبێ بە جێ‌نشینی؛ بەڵام ئەگەر ڕێ لێ گرتنەکەی بوو بە سێ جار یا زیاتر، ئەوە بەوە فاسق ئەبێ‌و ویلایەتەکەی ئەڕوا بۆ وەلی ئەمری دوور، بەڵێ، ئەوەندە پێویستە ئەو ڕێ لێ گرتنە ئیسپات ببێ لای قازی، یەعنی یا خۆی ببینێ یا بە دوو شاهید ئیسپات ببێ، ئەگینا ئەم وەلی ئەمرە دوورە، لەخۆیەوە ناتوانێ کچی کابرا بدا بە شوو.

شەشەم: بەهۆی دیار نەبوونی وەلییەوە، واتە ئەوەندە دوور بێ لەو شوێنەوە کە ئەگەر بۆی بڕۆی، بۆت هەبێ لەڕێگەدا نوێژ کورت کەیتەوە کە ئەکاتە دوو مەنزڵ یا زیاتر؛ ئەگەر دوورییەکەی لەم مەسافەیە کەمتر بوو، قازی ناتوانێ بە بێئیزنی ئەو ژنەکەی مارە ببڕێ. ئەگەر کچێك هاتە لای قازیو وتی: باوکم دوو مەنزڵ ڕێگا دوورە لێرەوە، دروستە بۆ قازی مارەی ببڕێ، بەڵام سوننەتە داوای شاهیدی لێ بکا بۆ ئیسپاتکردنی دیارنەبوونی باوکی؛ جا ئەگەر پاشان باوکی هاتەوەو ئیددیعای کرد کەوا بەر لەوە قازی کچەکەی بدا بە شوو، ئەو خۆی مارەی بڕیوە لە کەسێکی تر، ئەوە ئەگەر بە شاهید ئەوەی ئیسپات کرد، ئەو عەقدەی کە قازی کردوویەتی هەڵئەوەشێتەوە، ئەگینا بە دروست دائەنرێو بە قسەی ئەو باوکی کچە تێكناچێ.

حەوتەم: کاتێکە کە وەلیئەمری ئافرەتەکە حەپس بێو مەیدانی وەکیلگرتنی نەبێ.

هەشتەم: کاتێکە کە وەلیئەمرەکە لەترسانا خۆی شاردبێتەوەو نەوێرێ دەرکەوێ.

نۆهەم: کاتێکە کە وەلیئەمرەکە خۆی بە زل بزانێو ڕێگای بەشوودانی ئافرەتەکە نەدا.

دەهەم: کاتێکە کە وەلیئەمری ئافرەتەکە بیەوێ مارەی بکا بۆ خۆی یا بۆ کوڕێکی منداڵی و وەلیئەمرێکی تری هاوپایەی خۆی نەبێ عەقدی بکا بۆی.

یانزەهەم: کاتێکە باپیرە بیەوێ ئافرەتەکە مارە بکا لە کوڕەزای خۆی و مەجالی زۆرکردنیشی نەبێ لێی تا بەتەنیا خۆی «ایجاب» و «قَبول»ەکە جێبەجێ بکا، لەبەر ئەوە کە ئافرەتەکە نابالغ و بێوەژن بێ ـ مەسەلا ـ ئەوە لەم حاڵەدا واجبە قازی ایجابی عەقدەکە بکاو وەلییەکەی قەبووڵی بکا.

دوانزەهەم: کاتێکە کە ئافرەتەکە باڵغ بووبێو شێت بێو باوك و باپیرەی نەبێ، ئەوە قازی ئەتوانێ لەبەر پاراستنی مەسڵەحەتی ژنەکە مارەی ببڕێ لە کەسێك، بەڵام ئەبێ موراجەعەی وەلی نەسەبیشی بکا، بۆ ئەوە ئەوانیش ڕێگا بدەن.

ئەگەر وڵاتێك قازی تیا نەبوو لەبەر ئەوە کە لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی موسوڵمانانا نەبوو، واجبە لەسەر دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە قازییەك دابنێ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری

موسوڵمانان و ئەو قازییە هەرچەند سوڵتانی موسوڵمانان دایەناوە، ئەبێ بەکار بەدەستی موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە.

لە هەر شوێنێکا کە قازی ژن مارە ببڕێ، پێویستە چەند شەرتێك بێتەدی؛

یەکەم: ئەوەیە ئەو ژنە دانیشتووی ئەو شوێنە بێ کە حوکمی قازییەکەی بەسەرا ئەڕوا، هەرچەند بە ڕێبواریش ڕێی تێکەوتبێ؛

دووهەم: ئەوەیە ئەو کەسە کە داوای ژنەکە ئەکا هاوکوفی بێ؛

سێهەم: ئەوەیە کە کەمتر لە مارەیی هاوچەشنی خۆی مارەی نەکا؛ جا ئەگەر ئافرەتێکی بێ وەلی داوای کرد لە قازی کە مارەی بکا لە کەسێك کە هاوکوفی نەبێ، دروست نییە مارەی بکا وە ئەگەر کردی، بەتاڵە، بەڵام گەلێك لە زانایانی مەزهەبی شافیعی، فەرموویانە دروستە.

وە لە حاڵێکا کە قازی لەبەر ئەوە ژنەکە مارە ببڕێ کە وەلی ئەمرەکەی دوور بێ لەو شوێنەوە، دروست نییە مارەی ببڕێ لە کەسێك کە هاوکوفی نەبێ، بەڵام گەلێك لە زانایانی شەرع فەرموویانە: ئەگەر فاسقی بڵاو بووبووەوە بە وڵاتا و ئافرەتەکەیش هاوکوفی نەبوو و ئارەزووی نەفسی هەبوو، ئەوە دروستە قازی مارەی ببڕێ لە کەسێك کە هاوکوفی نەبێ، بەتایبەتی ئەگەر ترسی فیتنەو فەسادی حاڵی ژنەکەی ببێ، یاخود ژنەکە موحتاج بێ بە مەسرەف بۆ ژیانی؛ ئەوەندە هەیە لەمجۆرە شوێنانەدا ئەبێ قازی لەناو خەڵکە ناهاوکوفەکاندا مارەی ببڕێ لە باشتریان، ئەگینا ئەبێ ژنی بێ وەلی هەر ماتڵ ببێ، بەتایبەتی کە لە نەسەبێکی شەریف بێ.

جا ئەگەر قازی لە مەزهەبی «أصح» نەهاتە خوارەوەو ژنەکەی مارە نەبڕی لە ناهاوکوف وە لەو وڵاتەدا قازییەکی تریوا هەبوو کە بە مەزهەبی ئەو ئەم نیکاحە دروست بوو، ژن و پیاوەکە بڕۆن بۆلای ئەو قازییە؛ ئەگەر ئەویش نەبوو وە لەو شوێنەدا پیاوێکی دادپەروەر هەبوو، بیکەن بە حەکەم و ئەویش ژنەکە مارە ببڕێ لە کابرا. وە ئەگەر ئەمیش نەبوو، ئەمجار پێویست ئەبێ لەسەر قازییەکە مارەی بکا لەو کابرایە بەناچاری، وەکوو لە «تُحفە»دا لە سەرەتای باسی هاوکوفییەوە ئەڵێ وە ئەگەر نە وەلی

نەسەب هەبوو و نە قازی لەو وڵاتەدا، دروستە ژنەکە پیاوێکی دادپەروەر بکا بە وەلیئەمری خۆی بۆ ئەوەی مارەی ببڕێ لەو کەسەی کە داوای کردووە.

## باسی بە وەلیئەمرکردن (تَوْلیە) و بە حەکەمکردن (تَحکیم)

«تولیە»، ئەوەیە کە ئافرەت پیاوێکی دادپەروەر بکا بە وەلیئەمری خۆی و دایبنێ لە جێگەی باوکی بۆ ئەوەی مارەی ببڕێ لەو کەسەی کە ئەیەوێ بیهێنێ. شەرتی «تولیە»، ئەوەیە ئافرەتەکە وەلیئەمری بە نەسەبی نەبێو ئەو شوێنەیش قازی تیا نەبێ. بەڵام نەبوونی وەلی، دوو جۆرە؛ نەبوونی «حِسيّ» کە ئەوەتە هەر بە یەکجاری نەبێ وە نەبوونی «شەرعی» کە ئەوەتە وەلییەکە ببێ بەڵام ژنەکە مارە نەکا لەو هاوکوفەی کە هاتووە بۆ خواستنی و هیچجۆرە بیانوویەکی شەرعیشی نەبێ و جارێك یا دوو جار مەنعی ژنەکە بکا لە شووکردن؛ لەم سوورەتەدا، ئەگەر قازی نەبوو ئەو ژنە مارە بکا، ئەوە ژنەکە ئەتوانێ پیاوێکی عادڵ بکا بە وەلیئەمری خۆی. هەروەها، نەبوونی قازیش لەسەر دوو جۆرە: نەبوونی «حسّی» واتە قازی لە وڵاتەکەدا نەبێ وە نەبوونی «شەرعی» کە ئەوەتە قازی ببێ بەڵام بە بێخەرجکردنی پارەیەکی زۆر ژنەکە مارە نەکا لە کابرا؛ لێرەدا ژنەکە بۆی دروستە پیاوێکی عادڵ بکا بە وەلیئەمری خۆی، جا ئەم پیاوە دادپەروەرە، وەك باوك ژنەکە مارە ئەکا لە کابراو کابرا قەبووڵی نیکاحەکە ئەکا بۆ خۆی.

«تحکیم»یش ئەوەیە ژنەکەو پیاوەکە هەردووکیان شەخسێك بکەن بە حەکەمی خۆیان بۆ ئەوە عەقدەکە جاری بکا لەبەینیانا و خۆی ئیجاب و قەبووڵەکە تەواو بکا؛ مەسەلا، لە حوزووری دوو شاهیدا بڵێت: وا ئەم ژنەم مارە بڕی لەم پیاوە لەسەر ئەوەندە مارەیی و قەبووڵی نیکاحی ئەو ژنەیشم کرد لەبۆ ئەم پیاوە لەسەر ئەو مارەییە. جا ئەگەر قازی ئیجتیهادکەر لە وڵاتەکەدا هەبوو، ئەوە شەرتی ئەم حەکەمە ئەوەیە دادپەروەرو ئیجتیهادکەر بێ وە ئەگەر قازی ئیجتیهادکەر لە وڵاتەکەدا نەبوو، یەعنی وڵاتەکە قازی هەر تیا نەبوو، یا قازی تیا بوو بەڵام تەقلیدکەر (مُقلِّد) بوو وە بە بێپارەیەکی زۆر ئەو عەقدەی نەئەکرد، ئەوە تەنها ئەوەندە بەسە بۆ حەکەمەکە کە

عەداڵەتی هەبێ و شەرت نییە خاوەن ئیجتیهاد بێ؛ بەڵام ئەگەر قازی تەقلیدکەر هەبوو و بە بێپارەیەکی زۆر عەقدەکەی بۆ ئەکردن، ئـەوە دروست نـییە ئـینسانی غـەیرە موجتەهید بکرێ بە حەکەم.

هەروەها شەرتە بۆ بە حەکەمکردن کە وەلی‌نەسەب نەبێ؛ کەواتە، حەکەم ڕاگرتن دروست نییە لەکاتێکا کە وەلی‌ئەمرەکە دیار نەبێو دوور کەوتبێتەوە؛ ئـەمە ئـادابـی حەکەم ڕاگرتنە، وەکوو لە «تُحفه» و «شیروانی»دا باس کراوە؛ بەڵێ، ئیمامی «اذرعی» و «رَدّاد» فەرموویانە: حەکەم ڕاگرتن دروستە لەکاتێکا کە وەلی‌نەسەب بێ بەڵام دیار نەبێو دوور کەوتبێتەوە؛ هەروەها، گەلێ لە زانایانی وەك «بُلقینی» فەرموویانە: لەکاتی فیسقی عومومی‌دا، دروستە ئینسانی فاسق بکرێ بە حەکەم، مادام قازی ئیجتیهادکەر لە وڵاتا نەبێ وە ئەوکەسەی کە بۆ نەفسی خۆی تەقلیدی فەرموودەی ئەم ئیمامانە ئەکا، ئەبێ ئاگای لەوە بێ کە «تلفیق» نەکا، واتە تەقلیدکردنەکەی نەبێ بەهۆی ئەوەکە ڕەفتار بە دوو فەرموودەی دژی یەك پەیدا بێ.

بزانن! دروستە قازی یەکێك بکا بە جێ‌نشینی خۆی بۆ بەجێ‌هێنانی هەندێ لەو عەقدانە کە بەخۆی ئەکرێن، بەو شەرتە لە فەرمانی‌دانانیا بە قازی مەنعی نەکرابێ لە جێ‌نشین دانان، ئیتر خواه ئیزنی درابێ یا باسی نەکرابێ و خۆیشی ئیشی ئەوەندە زۆر بێ فریای هەمووی نەکەوێ؛ جا ئەگەر هاتو قازی کەسێکی کرد بە جێ‌نشینی خۆی، ئەوە ئەبێ یا بە وتن ڕووبەڕوو بیکا بە جێ‌نشین، یا ئەگەر ئەو کابرا لەو شوێنەدا نەبوو، ئەبێ دوو شاهید ئەو قسەیەی قازییەکە بگەیەنن بە جێ‌نشینەکە؛ ئەگەر قازی بە نووسین بۆی بنووسێ و بە لەفزو وتن نەیکا بە جێ‌نشین، ئـەوە هـەر عـەقدێك ئـەم جێ‌نشینە بیکا بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر لەگەڵ نووسینەکەدا کابرا بـە وتـنیش کـردی بـە جێ‌نشین، ئەوە لەپاش گەیشتنی نامەکەی هەر عەقدێ بکا دائەمەزرێ، بەڵام کابرای جێ‌نشین تا بە ئاشکرا نەزانێ کە بـە وتـن کـراوە بـە جـێ‌نشـین، دەس بـخاتە هـەر عەقدێکەوە گوناهبار ئەبێ.

## باسی ئەوانەی حەقی مارەبڕینیان هەیە (ولي نكاح)

وەکوو لەمەوپێش باسمان کرد، ویلایەتی نیکاحکردن، یەعنی حەقی ژن مارەبڕین بۆ ژن و منداڵو شێت نییە، ئەگەر شێتییەکەی هەمیشەیی بێ؛ هەروەها، ئەگەر پـچڕ پچڕیش بێ لە ماوەی شێتییەکەیدا، حەقی نییە؛ بەڵێ، ئەگەر لە ساڵێکا ڕۆژێك شێتی بەسەرا ئەهات، ئەوە مەنعی ویلایەتەکەی لێ ناکرێو ئەبێ چاوەڕوانی چاك بوونەوەی بکەین وکە چاك بووەوە، ئەو وەختە ژنەکە مارە ئەبڕێ.

هەروەها ویلایەت نییە بۆ کەسێك کە بیری لێ تێكچووبێ، خواە هـەر لە زاتــی خۆیدا بێهۆش بێ، یاخود بەهۆی پیریو نـەخۆشـییەوە سـەری لێتـێك چــووبێ، هەروەها بۆ کەسێکیش کە هەر بە سەفیهی باڵغ بووبێ، یاخود بە ڕوشدەوە باڵغ بووبێ، بەڵام لەدواییدا دەسی کردبێ بە سەفاهەت و قازیش حیجری نابێتـە سـەرو مـەنعی تەسەڕوفکردنی لێ کردبێ لە ماڵی خۆیا؛ بەڵێ، ئەگەر قازی گوێی نەدابوویەو مەنعی تەسەڕوفکردنی لێ نەکردبوو، ئەوە بە سەفیهی بەرەڵڵا دائەنرێو هەموو تەسەڕوفاتێکی دروستە.

هەر وەختێك وەلینیکاح یەکێك لەم مانیعانەی پێوە بوو، ئەوە حەقی ویلایەتەکە ئەڕوا بۆ کەسێك کە لەو دوورتر بێو مانیعێك نەبێ ڕێی ویلایەتی نیکاحی لێ بگرێ؛ مەسەلا، لە باوکەوە بۆ باپیرە و لە براوە بۆ برازا وە ئەگەر وەلینەسەبی غەیری ئەو کەسە عەیبدارەی نەبوو، ویلایەتەکە ئەڕوا بۆ قازی وە ئەگەر وەلی لە هۆشی خۆی چوو، ئەوە ماوەیەك چاوەڕوانی ئەکەین، ئەگەر بێهۆشییەکەی درێژەی کێشاو چاك نـەبووەوە، ویلایەتەکەی لێ ئەسەنرێتەوە وە ئەگەر چەند ڕۆژێك درێژەی کێشـا، ئـەوە حـەقی ویلایەتەکەی ئەمێنێ؛ جا ئەگەر وای لێهاتبوو هەر چەند ڕۆژێك جارێك لە هۆشی خۆی ئەچوو وە پاش چەند ڕۆژ چاك ئەبووەوە، ئەبێ چاوەڕوانی بکەین چاك ببێتەوەو ویلایەتەکەی لەدەست وەرناگیرێ.

بە پێی فەرموودەی مەزهەبی ئیمامی شافیعی، فاسق حەقی ویلایەتی نییە، بـەڵام لەپێشەوە فەرموودەی دووهەمی ئیمامماں گێڕایەوە کە زانـا گـەورەکـانی مـەزهەبی

ئیمامی شافیعی ئیختیاریان کردووە کەوا لەکاتێکا فاسقی بڵاو بوویێتەوە، فاسقیش حەقی ویلایەتی ئەبێ؛ بەڵێ، کوێری مانیعی ویلایەت نییە.

## باسی ئەو وەلییەی کە حەقی زۆرکردنی هەیە لە کوڕو کچ (وَلی مُجْبر)

وەلی، یا بنچینەیە (اصُول)، یا دەوروپشتە (حواشی) و بە عیبارەتێکی تر، وەلی یا حەقی زۆرکردنی هەیە لە کوڕو کچ، یا نییەتی.

وەلی لە «ئوسوول»دا، حەقی چەند شتێکی هەیە کە وەلییەکانی تر حەقی ئەوەیان نییە؛

[ئیشی] یەکەم: ئەوەیە ئەتوانێ کچی خۆی یا کوڕەزای خۆی منداڵ بێ یا باڵغە بێ، مادام بێوەژن نەبێ، مارەی ببڕێ بە بێ ئەوەی کە داوای ئیزنی لێ بکا. مەزهەبی ئیمامی شافیعی وایە ئەگەر باوك و باپیرە دادپەروەر بن، حەقی مەجبوورکردنی کچیان هەیە کە شوو بکا بە کەسێکی تایبەتی، چونکە خۆشەویستی و دادەروەرییەکەیان مەیدانی ئەوە ناهێڵێتەوە کە مێردی خراپ بۆ کچەکە بدۆزنەوە و بە پێی مەسڵەحەتی ئەو کچە ئەیدەن بە شوو. بە فەرموودەی زانایانی «مُتأخّرین»، ئەگەر باوك و باپیرە فاسقیش بن، هەر حەقی مەجبوورکردنی کچیان هەیە کە شوو بکا بە یەکێکی تایبەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوننەتە داوای ئیزنی لێ بکەن بۆ دڵخۆش کردنی، ئەگەر باڵغ بووبێ، یا باڵغ نەبووبێ بەڵام چاك و خراپ لەیەك جوێ بکاتەوە.

بێ دەنگ بوونی ئافرەت، بە ئیزن دائەنرێ لە ئەسڵی عەقدەکەدا بۆ ئەو شەخسە ناوبراوە، هەرچەند هاوکوفیشی نەبێ، بەو شەرتە لەگەڵ نارەزاییدا نەبێ، وەکوو هاوارکردن و لەخۆدان.

بۆ ئەوە کە باوك و باپیرە حەقی ناچارکردنی کچیان هەبێ، حەوت شەرت هەیە؛ چواریان شەرتی دامەزرانی عەقدەکەن؛

یەکەم: ئەوەتە ئەو کەسە کە کچەکەی بۆ مارە ئەکەن، هاوکوفی کچەکە بێ لە هەموو سیفەتەکانی هاوکوفیدا؛

دووەم: ئەوەیە دەستی بڕوا بەسەر «مَهرالمثل»ی کچەکەدا؛

سێهەم: ئەوەیە دوژمنایەتی نەبێ بە هیچ جۆرێ لە بەینی کچەکەو وەلی ئەمرەکەیدا؛

چوارەم: ئەوەیە دوژمنییەکی ئاشکرا نەبێ لەبەینی کچەکەو خوازبینیکەرەکەیدا؛

کەواتە، دروست نییە مارەکردنی کچێکی نابالَغ لە کوڕێکی بالَغی وەها گوناهی گەورەی هەبێ بەهۆی تەرکی نوێژ یا ڕۆژوو یا شتیواوە، یا بەهۆی کردارێکی حەرامەوە، وەکوو عەرەق خواردنەوەو دزیکردن و فڕوفێڵ کردن لە موعامەلەدا، یاخود دەوامی بێ لەسەر وردە گوناه و تاعەتکردنی زیاتر نەبێ لە گوناه کردنەکانی.

هەروەها دروست نییە مارەکردنی ئافرەت لە کەسێك کە دەستی نەڕوا بەسەر «مَهرالمثل»ی ئافرەتەکەدا، بالَغ بێ یا نابالَغ وە دروستە شەخسێك بەر لە عەقدەکە بە ئەندازەی «مَهرالمثل»ی ئافرەتەکەی لێ نەزر بکا لە مالَی خۆی یا پێی ببەخشێ بۆ ئەوە بتوانێ بیدا بە مارەیی ئافرەتەکەدا کە ئەیەوێ مارەی ببڕێ.

باوکێك کە بە بێعوزرێکی شەرعی لەخۆیەوە بدا لە کچەکەی یا جنێوی بداتێ بەجۆرێك کە کچەکە کینەدار بووبێ لێی، دورست نییە ئەو کچەی بە بێئیزن بدا بە شوو، هەروەها دروست نییە مارەبڕینی بە بێئیزن لە پیاوێك کە دەرکەوتبێ چەند جارێك لەگەڵ کچەکەیدا شەڕە جنێوو شەڕە قسەیان بووبێ، یا لە پیاوێك کە هەڕەشەی لێکردبێ بیکوژێ یا لێی بداو ناوبەینیان تێكچووبێ.

پێویستە لەسەر ئەو مەلایەیش کە ئەم عەقدە ئەکا لەکاتی عەقدەکەدا تەماشای ئەم بابەتانە بکا، چونکە ئیسپاتکردنی ئەم جۆرەشتانە لەپاش عەقدەکە زەحمەتەو کابرا بە ناحەق بەدرێژایی ساڵ لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا ئەمێنێتەوە.

ئەو سێ شەرتەکەی تری حەوت شەرتەکە، بۆ دروستبوونی عەقدەکە نین، بەڵکوو بۆ ئەوەن دروست بێ کابرای وەلیئەمر خەریکی عەقدەکە ببێ؛

یەکەم: عەقدەکە لەسەر مارەییەك بێ کە کەمتر نەبێ لە «مَهرالمثل»؛

دووەم: ئەوەیە مارەییەکە «حالّ» بێ، یەعنی حازر بێ؛

سێهەم: ئەوەیە لەپارەی نەختی ئەو وڵاتە بێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو ماڵە عادەتیان وا بوو بە نەختی غەیری ئەو وڵاتە ژن مارە ببڕن، یاخود مارەییەکە هەمووی بە مۆڵەتدار

(مُؤَجَّل) دابنێن، یا هەندێکی بە حازرو هەندێکی بە موڵەتدار دابنێن، وەکوو لەناو ئێمەدا عادەتە، ئەوە ئەو شەرتانە پێویست نین.

هەندێ لە زانایانی شەرع دوو شەرتی تریشیان داناوە؛ یەکەم: ئەوەیە ژنەکە بەهۆی پیری یا نەخۆشی یا ناشیرینی کابراوە تووشی نارەحەتی و دڵپەرێشانی نەبێ؛ دووەم: ئەوەیە لەوکاتەدا کە عەقدەکەی بۆ ئەکرێ، حەجی لەسەر واجب نەبێ، نەوەك بەهۆی چوونیەوە بۆ سەفەری حەج ئافرەتەکە بەتەنها بمێنێتەوەو تووشی دڵپەرێشانی بێ، ئەگینا ئیزندانی ئافرەتەکە پێویستە وە ئەگەر بە بێئیزندانی ئەو عەقدەکە کرا، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی هەیە، بەڵام شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی: ئەم دوو شەرتە لاوازو زەعیفن، «خەتیبی شەربینی»یش فەرموویەتی: ئەم دوو شەرتە شەرتی دروست بوون و دامەزرانی عەقدەکە نین، بەڵکوو شەرتی دروستبوونی کردنی عەقدەکەن.

جا لەسەر ئەم فەرموودەیە، واجبە لەسەر باوکەکە کارێکیوا نەکا پاشان ژیانی کچەکەی تاڵ ببێ و ئەبێ تەماشا بکا هەروەك چۆن ئەگەر پیرەژنێك مارە ببڕن لە کوڕێك، لەوانەیە رابکاو دنیا بەجێبێڵێ، هەرچەند تەڵاقیشی بەدەستە، هیچ رەوای حەق نییە کچێکی گەنج ببەسترێ بە پیاوێکی پیرەوەو دنیای رۆشنی لێبکرێ بە شەوی تاریك.

بزانن! وەلیئەمری مەجبوورکەر، هەروەك ئەتوانێ لەگەڵ ئەم شەرتانەدا بە بێئیزنی کچەکە عەقدەکەی بکا، هەروەها ئەیشتوانێ وەکیل بگرێ بۆ مارەبڕینی، خواه مێرد دیاری بکا بۆ بەشوودانی کچەکە یانە؛ جا ئەگەر مێردی بۆ دیاری کرد، ئەوە باشە، ئەگینا واجبە لەسەر ئەم وەکیلە ئیحتیات بکا و زیاد لەوەکە واجبە شەرتە پێشووەکانیش بێنێتەجێ، پێویستە ئەگەر کەسێك ئارەزووی لێبوو بەزیاتر لە ئەندازەی «مَهرالمثل» کچەکە مارە بکا، مارەی نەبڕێ بە ئەندازەی «مهرالمثل» بەکەسێك کە زیاتر نەدا وە لەم سوورەتەدا کە وەکیلی باوك کچەکە مارە ئەبڕێ. هەروەکوو پێویستە دوژمنایەتی لە بەینی باوك و کچەکەدا نەبێ، ئەبێ دوژمنایەتی لەبەینی کچەکەو ئەم وەکیلەیشدا نەبێ.

لە سوورەتی هاتنەجێی شەرتەکانا، سوننەتە باوکەکە داوای ئیزن لە کچەکەی بکا ئەگەر باڵغە بێ، یاخود باڵغە نەبێ، بەڵام فام و شوعووری هەبێ و سوننەتە باوك کچی

نابالغ نەدا بەشوو، مەگەر لەبەر مەسڵەحەتی کچەکە و سوننەتە دایکی کچەکە راسپێرێتە لای کچەکەی تا باش لە بیروباوەڕو ئارەزووی تێبگا، چونکە حەقیقەتی شەرافەت و پیاوەتی لەوەدایە کە ئینسان لەسەر سوننەتی پێغەمبەرﷺ رەفتار بکا و خۆی نەبەستێتەوە بە عورف و عادەتی پڕوپووچی ناوخەڵکەوە.

**ئیشی دووهەم:** لەو ئیشانە کە بە وەلیئەمری مەجبوورکەر ئەکرێن، بەشوودانی کچی نابالغی شێتی پێشان شوونەکردووە.

**ئیشی سێهەم:** بەشوودانی کچی نابالغی شێتی بێوەژنە.

**ئیشی چوارەم:** بەشوودانی کچی بالغەی شێتی پێشان شوونەکردووە.

**ئیشی پێنجەم:** بەشوودانی کچی بالغەی شێتی بێوەژنە. ئەم پێنج ئیشە بە وەلیئەمری «اصول» نەبێ ناکرێن، وەك باوك و باپیرە وە دروستە ئەمانە لەبەر مەسڵەحەتی کچەکە بیکەن وە ئەگەر کچەکە موحتاج بوو بۆ مەسرەف یا ترسی فیتنەی لێهەبوو، یا لەبەر هەر هۆیەکی تری لەم بابەتە، پێویستە بیدەن بە شوو؛ بەڵێ، ئەگەر کچە شێتەکە بالغە بوو وە باوك و باپیریشی نەبوو، ئەوە قازی ئەتوانێ بیدا بەشوو لەبەر هۆیەکی وەك موحتاجبوونی بەگوزەران.

**ئیشی شەشەمیان:** ژنهێنانە بۆ کوڕی نابالغی عاقڵ؛ ئەمە، هەر بە باوك و باپیرە ئەکرێ ژنێك یا زیاتری بۆ مارە بکەن لەبەر مەسڵەحەتی پاشەڕۆژی مناڵەکە.

**ئیشی حەوتەم:** ژنهێنانە بۆ کوڕی شێتی بالغ؛ دروستە بۆ باوك و باپیرە ژنی بۆ مارە ببڕن لەبەر ئەوەکە موحتاجە کەسێکی ببێ بۆ سەرپەرشتیکردنی؛ هەروا، ئەتوانن ژن بێنن بۆ کوڕی گێژو سەرگەردانیشیان؛ ئەگەر باوك و باپیرە نەبوو، قازی ئەتوانێ ژن بۆ کوڕیوا مارە ببڕێ وە ئەگەر قازیش نەبوو، حەقی هیچ وەلیئەمرێکی تر نییە ژنی بۆ مارە ببڕێ.

**بزانن!** کچی عاقڵی نابالغی بێوەژن بە کەس مارە ناکرێ تا بالغ ئەبێ، وە لەپاش بالغبوون، لەسەر رێگادانی خۆی، وەلیئەمرەکانی بەپێی ئەو ریزەی باسمان کرد، ئەتوانن مارەی ببڕن لەو کەسەی کە خۆی رازییە پێی. هەروەها، کوڕی شێتی نابالغیش

کەس ناتوانێ ژنی بۆ مارە ببڕێ تا باڵغ ئەبێ، ئەوسا باوك و باپیرەو هەروەها قازیش لەپاش ئەوان ئەتوانن ژنی بۆ مارە ببڕن؛ بەڵێ لەکاتی نزیکە باڵغبوونیشدا، ئەگەر پێویستی بە خزمەتکردن هەبوو، دروستە باوك و باپیرەو قازی ژنی بۆ مارە بکەن، چونکە خزمەتی نێرینەی نزیکە باڵغبوون بە ئافرەتی نامەحرەم ناکرێ.

هەروەها، غەیری باپیرە هیچ وەلی‌ئەمرێکی‌تر ناتوانێ هەردوولای عەقد جێبەجێ بکا، بەڵام ئەو ئەتوانێ کچێکی کوڕەزای خۆی لە کوڕێکی کوڕەزای خۆی مارە بکا؛ مەسەلا، بڵێت: وا گوڵچینی کوڕەزام مارە بڕی لە بەختیاری کوڕەزام لەسەر ئەوەندە مارەیی‌و قەبووڵی نیکاحی گوڵچینم کرد بۆ بەختیار.

باوك و باپیرە ناتوانن کچی بێوەژنی خۆیان لە کەس مارەببڕن، هەروەها ناتوانن کچی شووکردوویان مارەببڕن لە کەسێك کە هاوکوفی نەبێ یا مەرجەکانی‌تری تیا نەهاتبێتەدی، مەگەر بە ئیزنی کچەکە خۆی. ئیزنی بێوەژن، ئەبێ بە وتەیەکی ئاشکرای بێ‌پێچ‌و پەنا بێ، بەڵام ئیزنی کچی شوونەکردوو بە بێدەنگیش ئەبێ، واتە کە لێیان پرسی: شوو ئەکەی بە فڵانکەس؟ هاوکوفی بێ یا نە، ئەویش بێدەنگ بوو، ئەوە دائەنرێ بە رەزامەندی، بەڵام بۆ رازی‌بوونی بەکەمتر لە «مَهرالمثل» یا بە غەیری پارەی نەختی وڵات، ئەوە ئیزنی ئاشکراو بێ‌پێچ‌و پەنای ئەوێ و ئەوە بەس نییە کە بێدەنگ بێ وە ئەگەر باوکەکە داوای ئیزنی لێ نەکردبوو، بەس لەلای خۆیا دایناببوو وە مارەی ئەبڕی لە کەسێك کە هاوکوفی نەبێ، ئەوە پێویستی بەوەیە بە زوبان ئیزنی بدا و قەناعەت ناکرێ بە تەنها بێدەنگ بوونی، لەبەر ئەوە کە باوکی پرسی پێ‌نەکردووە.

وە ئەگەر لەکاتی پرس‌پێ‌کردنا کچەکە بەتێکڕایی ئیزنی باوکی‌دا و وتی: رازیم لە هەرکەسم مارە ببڕێ، ئەوە دروستە مارەی ببڕێ لە هاوکوف و ناهاوکوف وە ئەگەر هەر ناوی هاوکوفی هێنا، دروست نییە باوکی مارەی ببڕێ لە ناهاوکوف؛ هەروەها، ئەگەر بەتایبەتی ناوی کەسێکی ناهاوکوفی هێنا، دروست نییە لە غەیری ئەو ناهاوکوفەی مارە ببڕێ، چونکە لێرەدا باسمان لەوەیە کە وەلی‌ئەمر حەقی ناچارکردنی ئافرەتی نەبێ؛ بەڵێ، لەم شوێنەدا وەلی‌ئەمر ئەتوانێ بەگوێی کچەکە نەکاو مارەی نەبڕێ لەو کەسە، چونکە حەقی خۆی هەیە لە دۆزینەوەی هاوکوفدا.

وە ئەگەر لەکاتی پرس پێ‌کردندا، نـاوی خـوازبـینی‌کەر گـۆڕا؛ مـەسەلا، نـاوی «ئەحمەد» بوو و بە «حامید» ناوبرا و ژنەکەیش لەسەر ئەو ناوە ئیزنی دا، ئەمە ئەگەر ژنەکە لەگەڵ ناوهێنانەکەدا ئیشارەتی کرد بۆکابرا، یاخود نییەتی هەمان کابرای بوو کە پێشان خوازبینی کردووە، ئەوە گۆڕانی ناوەکە قەیدی نییە، ئەگینا ئیزن‌دانەکە بەتاڵەو عەقدەکە دانامەزرێ.

ئەگەرکچەکە لەجیاتی ئیزن‌دان باسی وەکیلی کرد؛ مەسەلا، وتی: باوکم وەکیلم بێ مارەم ببڕێ لە فڵانکەس، ئەوە دروستە، چونکە مەبەست لەم وەکیل‌گرتنە ئیزن‌دانە؛ هەروەها، قەناعەت ئەکرێ بەوە کە ئافرەتەکە لەپـاش پـرس‌پێ‌کـردن و نـاوهێنـانی داخوازی‌کەرەکەی، بڵێ: «بەڵێ»؛ مەسەلا یەکێ لێی ئەپرسێ: باوکت مارەت ببڕێ بۆ «ئەحمەد» لەسەر دە دینار؟ ئەویش، ئەڵێ: «بەڵێ»، هەروەها لە تـەقلیدیشا؛ مـەسەلا، یەکێ لێی ئەپرسێ: رازیت بە فەرموودەی ئەو ئـیمامانە کـە فـەرموویانە لە وەخـتی زۆربوونی فاسقی‌دا دروستە وەلی‌ئەمرو شاهیدی نیکاح فـاسق بـن؟ ئـەویش بـڵێ: «بەڵێ»، ئەوە بەسە.

سوننەتە شاهید رابگیرێ لەسەر ئیزن‌دانی هەر ئافرەتێك کە ئیزن‌دانی پێویست بێ نەوەك لەپاشا ئینکاری ئیزن‌دانەکەی بکا، چونکە ئەگەر لەپاشا وتی: ئیزنم نەداوە مارەم ببڕن لە فڵانکەس و شاهید لەناوا نەبوو، باوەڕ بە سوێندی ئەکرێ.

**بزانن!** هەر ئافرەتێك کە ئیزن‌دانی پێویست بێ بۆ دامەزرانی مارەبڕینی، ئەبێ تا عەقدەکە تەواو ئەبێ لەسەر ئیزنەکەی خۆی بمێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش عەقدەکە ژنەکە ئیددیعای کرد کە پەشیمان بووەتەوە لە ئیزنەکە، ئەوە مادام شاهیدی نەبێ لەسەر ئەوە کە پێش‌عەقدەکە پەشیمان بووەتەوە، قسەکەی قیمەتی نییە وە ئەگەر وتی: بەو شەرتە ئیزنم داوە کە خوازبینی کەرەکەم نوێژ بکا و ئێستە بۆم دەرکەوتووە نوێژ ناکا، ئـەوە مادام شاهید نەبێ لەسەر ئەوە کە بە بێ‌قەیدو شەرت ئیزنی داوە، باوەڕ بە سوێنـدی ئەکرێ‌و حوکم ئەدرێ بە بەتاڵیی نیکاحەکەی، چونکە هەرکەس لە ئـەسڵی ئـیزندا باوەڕی پێ‌بکرێ، لە سیفەتی ئیزنەکەشدا باوەڕی پێ‌ئەکرێ.

وە ئەگەر ئافرەتەکە وتی: عەقدەکە بە بێ وەلی ئەمر یا بە بێ شاهید کراوە و کابرا بڵێ: بە وەلی و شاهیدەوە کراوە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ، چونکە ئەم جیاوازییەی قسە ئەگەڕێتەوە سەر جیاوازیی و یەکنەکەوتنی قسە لە کردن و نەکردنی عەقدەکەدا؛ بەڵێ، ئەگەر ئافرەتەکە بڵێ: وەلییەکە یا شاهیدەکە فاسق بووە و کابرا بڵێ: دادپەروەر بووە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی پیاوەکە ئەکرێ، چونکە ئەسڵ لە عەقددا دامەزرانیەتی.

وە ئەگەر لەپاش ئەوەکە ئافرەتەکە ئیزنی وەلی ئەمرەکەی دا مارەی ببڕێ، ئەم خۆی عەزل کرد لە ویلایەت، ئەوە قیمەتی نییەو عەزل نابێ، چونکە ویلایەت شتێکی ناچارییەو بە دەستی ئینسان خۆی نییە، تەنها ئەوەندە هەیە ئیزندان پێویستە بۆ تەسەڕوفاتی وەلی ئەمرەکەو نابێ لەخۆیەوە ئێش بکا.

## بێوەژن و کچ

مەبەست لە «بێوەژن» لە عورفی شەرعدا، ئەوەیە ژنێك کچێتییەکەی لاچووبێ بەهۆی ئەوەوە کەسێك لەپێشەوە چووبێتە لای، بە چوونەلایەکی حەلاڵ یا حەرام، هەرچەندکە حەیوانێکی وەکوو مەیموونیش چووبێتە لای؛ غەیری ئەمە لەشەرعدا بە «کچ» دائەنرێ هەرچەند کچێتییەکەی هەر لە ئەسڵا نەبووبێ، یا بە تەئسیری حەیزەوە نەمابێ، یا پەنجەی بە خۆیا کردبێ و نەیهێشتبێ، یا یەکێك لەپاشەوە چووبێتە لای و بە تەئسیری ئەوە کچێتییەکەی نەمابێ، یا لەسەر بانێکەوە کەوتبێتە خوار، یا کەوتبێ بەسەر شتێکدا، یا هەر هۆیەکی تری لەم چەشنە.

ئافرەتی باڵغ و عاقڵ لە ئیددیعای کچێتیدا باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، هەروەها لە ئیددیعای بێوەژنیەتیدا، ئەگەر ئیددیعاکەی لەپێش عەقدەکەدا بووبێ، بەڵام ئەگەر لەپاش عەقدەکە ئیددیعای کردکەوا لەپێش عەقدەکەدا بێوەژن بووە و ئیزنێکی بێ پێچ و پەنای نەدابوو بە وەلی ئەمرەکەی بۆ بەشوودانی، ئەوە ئیددیعاکەی قەبووڵ ناکرێ، چونکە ئەسڵ دامەزرانی عەقدەو قابیلە کچێتییەکەی خۆی بە پەنجە لابردبێ؛ هەروەها

ئەگەر لەپێش عەقدەکەدا پێی لێنا کەوا باڵغ بووەو لەپاش عەقدەکە پەشیمان بووەوە و وتی: لەکاتی پێ‌لێنانەکەدا باڵغ نەبووبووم، ئەوە لێی نابیسترێ، چونکە ناکەوێتە یەك لەگەڵ پێ‌لێنانە پێشووەکەیدا.

ئەگەر کەسێك ئافرەتێکی مارەکرد بە شەرتی ئەوە کە کچ بێ و لەپاش گوێزانەوە، کابرا ئیددیعای کرد کەوا کچ نەبووە، ئەوە ئەگەر ژنەکە خۆی وتی: کچ بووم، باوەڕ بە سوێندی ئەو ئەکرێ، چونکە ئەسڵ وایە عەقدەکە بەدروستی رابوردبێ و ئەسڵ لە ئافرەتا کچێتییە نەك بێوەژنی و هەتاوەکوو ئەگەر بێوەژنیش بووبێ، قابیلە بە پەنجە کچێتییەکەی لابردبێ.

## باسی ژنهێنانی کەسێك کە حیجری لەسەر دانرابێ بەهۆی سەفیهییەوە

هەرکەس حیجری لەسەر دانرابێ بەهۆی سەفیهییەوە، بەو رەنگە کە هەر بە سەفیهی باڵغ بووبێ ـ کە مەعنای حیجر لێرەدا، دەوامی مەنعە لە تەسەڕوفکردن ـ یاخود بەڕوشدەوە باڵغ بووبێ و ئەوجا سەفاهەتی بەسەردا هاتبێ و قازی حیجری نابێتە سەر تەسەڕوفکردنی و مەنعی کردبێ لە تەسەڕوفکردن، ئەوە ئەم شەخسە ناتوانێ سەربەخۆ ژن مارە بکا، بەڵکوو پێویستە بە ئیزنی وەلی‌ئەمرەکەی ژن بێنێ، یاخۆد وەلی‌ئەمرەکەی لەسەر ئیزنی ئەم قەبووڵی نیکاحی بۆ بکا، بەو شەرتە کە موحتاجی ژنهێنان بێ؛ لە سوورەتی یەکەمدا، باوك ئەمجا باپیرە ئەبن بە وەلی‌ئەمر و لە سوورەتی دووهەمدا، قازی ئەبێ بە وەلی‌ئەمر؛ بەڵێ، ئەگەر نە خۆی وەلی‌ئەمری هەبوو و نە شوێنەکەیش قازی تیابوو، ئەوە دروستە بۆ خۆی ژن بێنێ.

کەواتە، ئەگەر سەفیهی حیجر لەسەر دانراو لەخۆیەوە بە بێ‌ئیزنی وەلی‌ئەمر ژنی هێنا، ئەوە نیکاحەکەی بەتاڵە وە ئەگەر رۆیشتبووە لای ژنەکە، ئەوە ئەگەر ژنەکە خاوەن روشد بوو و بە ئارەزووی خۆی شووی کردبوو بەو کەسە، ئەوە مارەیی ناکەوێتە سەری، چونکە خۆی تەقسیری کردووە ئەحواڵی مێردەکەی نەپرسیوە کە بنیادەمێکی

چۆنە؛ هەروەها، «حەدی زینا»یش ناکەوێتە سەر مێردەکەی، چونکە شوبهەیەك هەیە لە دامەزرانی نیکاحەکەدا وە ئەگەر ژنەکە بچووك بوو، یا شێت بوو، یا بە زۆر دابوویان بەو سەفیهە، یاخود لەکاتی نووستنا کابرا چووبووە لای، ئەوە لە هەموو ئەم حـاڵانـەدا، «مَهرالمثل»ی ئەکەوێ و واجبە ئـەو «مَـهرالمـثل»ە لە مـاڵی کـابرای حـیجر لەسـەر دانراوەکە بدرێتە دەستی ئافرەتەکە یا وەلی ئەمرەکەی.

وە ئەگەر کابرای حیجر لەسەر دانراو بە ئیزنی وەلی ئەمرەکەی ژنی هێنا، ئەوە ئەگەر وەلی ئەمرەکە ژنێکی بۆ دیاری کرد، دروست نییە غەیری ئەوە مارە بکاو پێویستە بە «مَهرالمثل» یا کەمتر لە «مَهرالمثل» مارەی بکا وە ئەگەر بە زیاتر لە «مَهرالمثل» مارەی کرد، ئەوە نیکاحەکەی دائەمەزرێ بە ئەندازەی «مَهرالمثل» لەو ماڵەی کە دانراوە بۆ ئەم ژن مارەبڕینە وە ئەگەر مارەیی بۆ دیاری کرد نەك ژن، ئەوە پـێویسـتە بـەو ئـەندازە مارەییە ژن بێنێ، ئەگەر کەمتر بوو لە «مَهرُالمثل» یا ئەوەندەی «مَهرالمثل» بوو وە ئەگەر زیاتر بوو لە «مَهرالمثل»، ئەبێ بە ئەوەندەی «مَهرالمثل» ژن بێنێ.

وە ئەگەر لە ئیزن‌دانەکەدا نە باسی مارەیی و نە باسی ژنی نەکرد، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەو ئیزنە دروستە و کابرای سەفیهی حیجر لەسەر دانـراو لەم حـاڵەدا ئەتوانێ ئافرەتێکی وا مارە بکاکە لایقی شان و پایەی خۆی بێ بە «مَهرالمثل» وە ئەگەر ژنێکی مارە کرد کە مارەییەکەی هەموو ماڵەکەی ئەگرتەوە، ئەوە ئەو عەقدە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر ماڵی ئەم کابرایە هەر ئەوەندەی مارەیی ژنێکی عادەتی بوو کە لایقی شانی بێ، ئەوە نیکاحەکەی دروستە، چونکە مەسرەفێکی بێ‌جێی نەکردووە.

وە ئەگەر وەلی ئەمرەکەی قەبووڵی نیکاحی بۆکرد، پێویستە بە ئیزنی کوڕە سەفیهەکە بێ و واجبە لەسەری قەبووڵی نیکاحەکەی بۆ بکا بە ئەندازەی «مَهرالمثل» یا بە کەمتر لە «مَهرالمثل» وە ئەگەر هات‌و بە زیاتر لە «مَهرالمثل» ژنی بۆ هێنـا، ئـەوە نـیکاحەکـە دائەمەزرێ بە ئەندازەی «مَهرالمثل» و ناوبردنی ئەو ئەندازە مارەییە، شتێکی زیاد و بێ‌سوودە.

## باسی پێ‌لێنانی ژن یا مێرد یا وەلی‌ئەمر بە نیکاح

ئەگەر ئافرەتێکی باڵغ و عاقڵ، هەرچەند سەفیهیش و فاسقیش بێ، پێی لێنا کەوا مارە کراوە بۆ فڵانکەس، ئەوە ئەو پێ‌لێنانەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، مادام ئەو کابرا کە ئەم ناوی ئەهێنێ باوەڕی پێ‌بکا، با وەکوو هاوکوفیشی نەبێ و هەرچەند وەلی‌ئەمرو شاهیدەکانیش بەدرۆیدا بخەنەوە، چونکە نیکاح تەنها حەقی ژن و مێردە؛ کەواتە، ئینکارکردنی کەسێکی تر هیچ تەئسیری نییەو پێ‌لێنانەکەی ئەو بەتاڵ ناکاتەوە.

فەرموودەی «مُعتمَد» وایە: شەرتە بۆ قەبووڵی ئەم پێ‌لێنانە کە ژنەکە بەدرێژی باسی پێ‌لێنانەکەی بکاو بڵێ: وەلی‌ئەمرەکەم مارەی کردووم لە فڵانکەس بە شاهیدیی دوو شاهید و بە ڕەزامەندیی خۆم، ئەگەر ئافرەتەکە لەوانە بوو کە بێ‌ئیزنی خۆی دروست نەبێ بدرێ بە شوو وە ئەگەر مێردەکە ئینکاری کرد، ئەوە پێ‌لێنانی ژنەکە بێ‌سوود ئەبێ؛ لەم کاتەدا ژنەکەیش بۆی نییە کە شوو بکا تا کابرا تەڵاقی ئەدا، جا قازی حەقی وایە بڵێ بە کابرا: مادام ژنی تۆ نییە، بە لەفز تەڵاقی بدە با بە عەقیدەو باوەڕی خۆی دروست بێ شوو بکا وە ئەگەر کابرا لە ئینکارەکەی خۆی پەشیمان بووەوە، وتی: ژنەکە ڕاست ئەکا ژنی منە، ئەوە تازە لێی نابیسرێ، مەگەر ئیددیعای نیکاحێکی تازە بکاو ژنەکەیش بڵێ: ڕاست ئەکا.

هەروەها، ئەگەر پیاوێك ئیقراری کرد کەوا: فڵانە ژن مارە بڕاوی ئەوەو ژنەکەیش وتی: ڕاست ئەکا، ئەوە باوەڕی پێ‌ئەکرێ‌و قسەکەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، بەو شەرتەکە تەفسیلی ئیقرارەکەی بداو بڵێ: فڵان وەلی‌ئەمری ژنەکە لێی مارە بڕیوم بە شاهیدیی دوو شاهیدو بە ئیزن‌دانی ژنەکە خۆی بۆ عەقدی نیکاحەکە، هەرچەند کە وەلی‌ئەمرەکەو شاهیدەکانیش باوەڕی پێ نەکەن وە ئەگەر پیاوێك وتی: ئەم ژنە ژنی منەو ژنەکە بێ‌دەنگ بوو، یا بە پێچەوانەوە، ئەوە ئەگەر کابرای ئیقرارکەر مرد، ژنە بێ‌دەنگ بووەکە میراتی لێ ئەبا بەهۆی ئیقرارەکەیەوە، بەڵام ئەگەر ژنە بێ‌دەنگ بووەکە مرد، کابرای ئیقرارکەر میراتی لێ‌ناباو لە پێچەوانەکەدا، بە پێچەوانەیە.

هەروەها، ئیقراری وەلی‌ئەمر بە مارەبڕینی کچەکەی لە کەسێك ـ با کچەکەش بڵێ درۆیە ـ قەبووڵ ئەکرێ بە دوو شەرت؛ یەکەم، ئەو وەلی‌ئەمرە لە کاتی ئیقرارەکەدا حەقی ئەوەی هەبێ سەربەخۆ کچەکە مارە بکا، یەعنی باوك یا باپیرە بێ‌و مەرجەکانی زۆرلێ‌کردنیشی تیا هاتبێتەجێ؛ دووهەم، ئەوەکە مێردەکەیش بڵێ: ڕاست ئەکا، وەکوو شێخی "بُجَیْرمی" بەیانی کردووە.

کەواتە، ئیقراری غەیری «وەلی موجبیر» بە بەشوودانی ئافرەت، بەقەتعی قیمەتی نییە مادام بە شاهید ئیسپات نەبێ یا ژنەکە نەڵێ ڕاستە، هەتا وەکوو ئەگەر باوك بڵێ: ئەو کچی خۆمەم بە ئیزنی خۆی مارە کردووە لە فڵان و کچەکە ئینکاری ئیزن بکا، ئەوە کچەکە باوەڕی پێ ئەکرێ، چونکە ئەسڵ ئیزن نەدانە.

## باسی ئەو وەلی‌ئەمرانەی کە حەقی زۆرکردنیان نییە

هەر وەلییەك کە حەقی زۆرکردنی نەبێ لە ئافرەت، وەکوو باوك و باپیرە لە کاتێکا کە مەرجەکانی زۆرکردن نەهاتبنەجێ، یاوەکوو وەلی‌ئەمرێك کە لە دەوروپشتی نەسەب بێ، یا وەکوو قازی‌و جێ‌نشینی قازی، ناتوانن کچی نابالغ مارە ببڕن لە هیچ‌کاتێکا؛ هەروەها، ناتوانن ئافرەتی بالغیش مارە ببڕن بە بێ‌ئیزنێکی ڕاست و دروست، خواه ئەو ئافرەتە بالغ بووە کچ بێ یا بێوەژن بێ، مەگەر لەحاڵەتی ئافرەتی بالغ‌بووی شێتدا، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

جا ئەگەر ئافرەتەکە بێوەژن بوو، ئەوە پێویستە ئیزنەکەی بە عیبارەتێکی ئاشکرای بێ‌پێچ‌و پەنا بێ، چ بۆ شووکردنەکەی و چ بۆ ئەندازەی مارەییەکەی، ئەگەر کەمتر بێ لە «مَهرالمثل»، یا لە پارەی نەختی ئەو وڵاتە نەبێ وە ئەگەر ئافرەتەکە کچ بوو، ئەوە بۆ ئەسڵی شووکردنەکەی بێ‌دەنگی بە ئیزن دائەنرێ، بەڵام بۆ مارەییەك کە کەمتر بێ لە «مَهرالمثل»، یا لە غەیری نەختی وڵاتەکە بێ، ئیزنی ئاشکراو بێ‌پێچ و پەنا پێویستە وە ئەگەر مارەکرا لەسەر کەمتر لە «مَهرالمثل» ئەوە نیکاحەکەی لەسەر «مَهرالمثل» دائەمەزرێ؛ جا لەم شوێنەدا، چەند ماددەیەك هەیە ئێمە بەکورتی باسیان ئەکەین.

یەکەم: وەلی‌ئەمرە «غیر مُجبِر»ەکە تاقە پیاوێکە، ئەمە ئەتوانێ بە ئیزنی ژنەکە مارەی بکا لە هاوکوف و ناهاوکوف وە ئەگەر ژنەکە ویستی شوو بکا بە غەیری هاوکوف، ئەم ئەتوانێ مارەی نەکا وە ئەگەر ئەم ویستی بیدا بە ناهاوکوف بە بێ‌ئیزنی ژنەکە خۆی، ناتوانێ وە ئەگەر ئیزنی ژنەکە رووت بوو لە باسی هاوکۆف و ناهاوکوف، ئەوە پێویستە مارەی بکا لە هاوکوف، ئەگینا نیکاحەکەی بەتاڵە وە ئەگەر ئیزنەکەی تێکڕایی بوو، وتی: بۆ هەرکەس خۆت ئارەزووت لێیە مارەم بکە، ئەوە دروستە مارەی ببڕێ لە هاوکوف و ناهاوکوف وە ئەگەر ئیزنەکەی بەست بە یەك کەسەوە، ئەوە ئەگەر هاوکوف بوو، واجبە مارەی بکا بۆ ئەو کەسە وە ئەگەر ناهاوکوف بوو، وەلی خۆیشی رازی بوو پێی، دروستە مارەی ببڕێ لێی، ئەگینا ئەتوانێ گوێی نەداتێ، چونکە ئەمیش خۆی لە مەسئەلەی کەفائەتدا حەقی هەیە.

وە ئەگەر ئەم تاقە وەلییە ویستی ژنەکە بۆ خۆی مارە بکا، ئەوە پێویستە قازی بۆی مارە ببڕێ و دروست نییە وەلی‌ئەمرێکی لە خۆی دوورتر مارەی ببڕێ، چونکە تا ئەم بێ، ئەو وەلی‌ئەمرە دوورە حەقی نییە؛ هەروەها، ئەم وەلی‌ئەمرە ناتوانێ وەکیلێك بگرێ بۆ بەجێ‌هێنانی سیغەی «ایجاب»ی نیکاحەکەو خۆیشی «قَبول»ی بکا، چونکە غەیری باپیرە، کەس تەماشای هەردوو سەری عەقدەکەی پێ‌ناکرێ، نە بە ئەسالەت و نە بە وەکالەت، هەتاوەکوو بە وەکیلی باپیرەیش ناکرێ، بەڵکوو ئەبێ یا دوو وەکیل بگرێ بۆ هەردوو سەری عەقدەکە یا خۆی ئیشی هەردوو سەرەکە بکا؛ بەڵکوو ئەگەر قازیش ویستی ژنێکی شێتی باڵغی بێ‌کەس مارە ببڕێ لە شێتێکی باڵغی موحتاجی بێ‌کەس، ئەوە بەتەنها خۆی عەقدەکە ناکرێ‌و پێویستە خۆی سەرێکی و جێ‌نشینی قازی یا وەکیلەکەی ئەو سەرەکەی بەجێ‌بێنن وە ئەگەر فەرمانڕەوای موسوڵمانان ویستی ژنێکی بێ‌وەلی مارەبکا بۆ خۆی، ئەبێ قازییەك ئیجابی عەقدەکەی بۆ بکاو خۆیشی یا وەکیلەکەی قەبوڵی بکا وە ئەگەر قازی ویستی ژنێکی بێ‌وەلی مارە بکا بۆ خۆی، پێویستە یا قازییەك کە هاوکاری خۆیەتی لەو شوێنەدا، یا لە ژوور خۆیەوەیەتی، یا یەکێك لە جێ‌نشینەکانی خۆی، بۆی مارە ببڕێ.

دووهەم، وەلییەکان زۆرن و هەموویان حازرن و خوازبینیکەریش هاوکوف نییە؛ ئەمە، پێویستە لەگەڵ ئیزنی ژنەکەدا هەموویان رازی بن بەو عەقدە وە ئەگەر هەندێکیان عەقدەکەیان کرد بە بێ ئیزن و رەزای ئەوانی تریان، ئەوە ئەو نیکاحە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر لەوەختی خۆیا بە رەزامەندیی هەموویان ئەو ژنەیان مارەکردبوو لە پیاوێکی غەیرە هاوکوف و ئێستە ئەو کابرایە تەڵاقی ژنەکەی داوە بە تەڵاقێکی «بائِن»، ئەو دروستە بۆ هەندێکیان سەرلەنوێ مارەی ببڕنەوە بۆ کابرا لەسەر ئیزنی ژنەکە، هەرچەند وەلییەکانی تر بەم عەقدە نەزانن و رێگا نەدەن، لەبەر قەناعەت بە ئیزنە پێشووەکەیان، وەکوو «نِهایە» و «مُغنی» پەسەندیان کردووەو "شهابُ الرَّمَلی"یش فتوای پێداوە.

سێهەم: حاڵەتێکە کە وەلی ئەمرەکان زۆرن، هەندێکیان حازرن و هەندێکیان دیار نین و ئەوەندەی مەسافەی دوو مەنزڵ رێگا یا زیاتر دوورن، خوازبینیکەری ئافرەتەکەیش هاوکوف نییە؛ لەم سوورەتەیشدا، رەزامەندیی هەموویان پێویستە و حازرەکانیان ناتوانن بە سەربەخۆ ژنەکە مارە ببڕن؛ هەروەها، قابیل نییە قازیش ببێ بە جێنشینی ئەوانەیان کە دیار نین، چونکە قازی ناتوانێ ژن مارە ببڕێ لە ناهاوکوف؛ کەواتە، چار هەر ئەوەیە ژنەکە ئیزنی هەموولایەکیان بدا بۆ بە شوودانی و وەلی ئەمرە دوورەکانیش یەکێك لە حازرەکانیان بکەن بە وەکیل تا ئەم شەخسە بە ئەسالەت لەلایەنی خۆیەوەو بە وەکالەت لەلایەن وەلی ئەمرەکانی ترەوە، ژنەکە مارە ببڕێ.

چوارەم: حاڵەتێکە کە وەلی ئەمر زۆر بن و هیچیان دیار نەبن و خوازبینیکەریش هاوکوف نەبێ؛ لێرەشدا قازی ناتوانێ ئەم ژنە مارە ببڕێ، چونکە خوازبینیکەرەکە هاوکوف نییە و چار هەر ئەوەیە ژنەکە ئیزنی وەلی ئەمرە نادیارەکانی بدا بۆ عەقدەکە و ئەنجا، یا ئەم کەسە بڕواتە لای ئەوان مارەی ببڕن لێی، یاخود ئەوان یەکێ بکەن بە وەکیل ژنەکە لێرە مارە ببڕێ، بەڵام دروست نییە تا وەکالەتی وەکیلەکە ئیسپات نەبێ عەقدەکە بکرێ وە ئەگەر مەلای مارەبڕو ژن و مێردەکە باوەڕیان بە قسەی ئەو کەسە ئەکرد کە ئەیوت: وەلی ئەمرەکانی، منیان کردووە بە وەکیل، ئەوە دروستە عەقدەکە تەواو بکەن.

**پێنجەم:** حاڵەتێکە کە وەلی‌ئەمرەکان زۆرن و هەموویان حازرن و خوازبینی‌کەری ئافرەتەکەیش هاوکوفە؛ لەم حاڵەدا، ئەگەر ژنەکە ئیزنی یەکێکیانی دا، ئەوە واجبە هەر ئەو یەك کەسە مارەی ببڕێ و هەرکەس غەیری ئەو مارەی ببڕێ، عەقدەکە بەتاڵە وە ئەگەر بەتێکڕایی ئیزنی دابوو، هەرکامیان مارەی ببڕێ دروستە. وە ئەگەر ئیزنی وەها دابوو هەموویان مارەی بکەن، ئەوە لەم حاڵەدا پێویستە یا هەموویان بەکۆمەڵ، «ایجاب»ی عەقدەکە بکەن، یاخود بە هەموویان یەکێك لە خۆیان یا لە غەیری خۆیان بکەن بە وەکیل عەقدەکە تەواو بکا.

**شوێنی شەشەم:** حاڵەتێکە کە وەلی‌ئەمرەکان زۆرن و هەموویان مەسافەی دوو مەنزڵ یا زیاتر دوورن؛ لەم حاڵەدا، قازی ئەتوانێ بە بێ‌ئاگاداریی ئەوان و ئیزنی ژنەکە خۆی، مارەی ببڕێ لەو کەسەی کە داوای ئەکا، ئەگەر هاوکوف بێ.

**حەوتەم:** حاڵەتێکە کە وەلی‌ئەمرەکان زۆر بن‌و هەندێکیان لەو شوێنەدا بن‌و هەندێکیان مەسافەی دوو مەنزڵ یا زیاتر دوور بن و خوازبینی‌کەرەکەیش هاوکوفە؛ لەم‌حاڵەدا ئەگەر ژنەکە ئیزنی یەکێ لە وەلی‌ئەمرەکان بدا، ئەتوانێ مارەی ببڕێ، هەرچەند وەلی‌ئەمرەکانی تر ئاگایان لێ نەبێ وە ئەگەر هەر ئیزنی یەکێ لە نادیارەکانیان بدا ـ مەسەلا ـ ئەوە پێویستە هەر ئەو مارەی ببڕێ بە نەفسی خۆی یا وەکیل بگرێ وە ئەگەر ژنەکە ئیزنی بە گشتی دابوو، ئەوە هەرکامیان مارەی ببڕێ دروستە.

**بزانن!** ئەگەر درێژە بدەین بە باس‌کردنی ئەم حاڵەتانە، زۆریان لێ‌دەرئەچێ و کورتەی حاڵەتەکانیش هەموو دێتەسەر ئەوەی کە باسمان کرد، لەبەر ئەوە پێویست نەبوو لەمە زیاتر لەسەری بڕۆین.

لە حاڵەتێکا کە هەموو وەلی‌ئەمرەکان ئیزنیان دابێ بۆ عەقدەکە، خواه خوازبینی‌کەرەکە هاوکوف بێ یا نە و هەموو وەلی‌ئەمرەکان رازی بن بەو عەقدە، سوونەتە ئەویانە کەوا شارەزاترە لە ئەحکامی شەرع ئەوەیان مارەی ببڕێ و پاش ئەو، سوننەتە ئەوەیان مارەی ببڕێ کە لە هەموویان زیاتر خۆی لەگوناه دوور ئەخاتەوە، ئەوجا ئەوەیان کە لە هەموویان پیرترە.

وە ئەگەر بوو بەهەرایان لەسەر ئەوە کە کامیان مارەی ببڕێ، ئەبێ دەوی لێ بکەن لەبەینی خۆیاناو دەوەکە بەناوی هەرکامیانەوە دەرچوو، ئەوەیان مارەی ئەبڕێ؛ جا ئەگەر غەیری ئەوەیان مارەی بڕی کە دەوەکە بەناویەوە دەرچووە، هەر دروستە، چونکە لێرەدا قسەمان لەوەیە کە داخوازیکەر هاوکوف بێ، یا هاوکوف نەبێ بەڵام هەموولایەك رازی بن بە عەقدەکەو ژنەکەیش رێگای هەموویانی دابێ؛ کەواتە، سوودی دەوکردنەکە هەر ئەوەیە کە دەفعی هەراو ئاژاوە ئەکاو بۆ دامەزرانی عەقدەکە نییە.

ئەگەر یەکێ لە وەلیئەمرەکان ئافرەتەکەی مارەی بڕی لە یەکێك و یەکێکی تریان مارە بڕی لە یەکێکی ترو هەردوو مارە لێبڕاوەکەش هاوکوف بوون، یاخود هیچیان هاوکوف نەبوون، بەڵام ژنەکە رێگای دابوو لە هەرکامیان مارە ببڕرێ و وەلیئەمرەکانیش قەناعەتیان کردبوو بەو غەیرە هاوکوفانە، لەم سوورەتەدا ئەگەر یەکێ لەم دوو عەقدە پێشکەوتبوو و دیار بوو کامیان پێشکەوتووە، ئەوە هەر ئەویانە دروستە وە ئەگەر هەردوو عەقدەکە لە یەك کاتا تەواو بووبوون، یاخود نەمانئەزانی ئاخۆ پێکەوە یا بەرودوا تەواو بوون، یا ئەمانزانی یەکێکیان لەپێشانا کراوە، بەڵام عەینی ئەوەیانمان بۆ مەعلووم نەبوو، ئەوە هەردوو عەقدەکە بەتاڵە وە ئەگەر ئەمانزانی کامیان پێشکەوتووە، بەڵام لەبیرمان چووبووەوەو لێمان تێك چوو بوو، ئەوە پێویستە ئەم ژنە ماتڵ ببێ و نەدرێ بە دەستی کەسیانەوە و دروستیش نییە شوو بکا بە کەسێکی تر، تا ئەم دوو پیاوە هەردووکیان ئەمرن یا تەڵاقی ئەدەن، یا یەکێکیان ئەمرێ و یەکێکیان تەڵاقی ئەدا و مەسرەفی لەسەر هەردوو پیاوەکەیە بەنیوەیی؛ بەڵێ، «زەرکەشی»و «بُلقینی» فەرموویانە: ئەگەر ماوەیەکی وەها رابوورد کە بە عورف و عادەت نائومێد بووین لە دۆزینەوەی پێشووەکەیان، ئەوە ژنەکە ئەتوانێ داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکا لای قازی و دروستە قازیش بەگوێی بکاو بڵێ: وا حوکممدا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو نیکاحە کە لەپێشەوە بووە لەمدوانەدا وە ئەگەر هەر کام لەو دوو کەسە ئیددیعای کرد کە ژنەکە ئەزانێ عەقدەکەی ئەو لەپێشەوە بووە، ئەوە ئیددیعاکەیان ئەبیسترێ بەپێی ئەوە کە قەبووڵی ئیقراری ژن ئەکرێ بە نیکاح، جا ئەگەر ژنەکە وتی: نازانم، ئەوە سوێندی ئەدرێ کە نازانێ عەقدی کامیان لەپێشترە.

وه‌ ئه‌گه‌ر پێی لێنا به‌ پێش‌كه‌وتنی عه‌قدی یه‌كێكیان، ئه‌وه‌ سابت ئه‌بێ كه‌ عه‌قدی ئه‌وه‌یان دامه‌زراوه‌؛ جا له‌م كاته‌دا قازانجی بیستنی ده‌عوای ئه‌وی‌تریان ئه‌وه‌یه‌ به‌ڵكوو ژنه‌كه‌ په‌شیمان ببێته‌وه‌ له‌ پێ‌لێنانه‌كه‌ی و پێ‌لێ‌بنێ بۆ ئه‌میتریان، چونكه‌ ئه‌گه‌ر په‌شیمان بووه‌وه‌، ئه‌وه‌ هه‌رچه‌ند تازه‌ عه‌قدی ئه‌میان هه‌ڵناوه‌شێته‌وه‌، به‌ڵام پێویسته‌ ئه‌و ژنه‌ «مَهرالمثل» ببژێرێ بۆ ئه‌م كه‌سه‌ كه‌ جاری دوایی پێی لێناوه‌ بۆی، وه‌كوو یه‌كێ پێ‌لێ‌بنێ كه‌وا ئه‌م ماڵه‌، ماڵی فڵانكه‌سه‌، نه‌خه‌یر هی فڵانكه‌سه‌، له‌م حاڵه‌دا ماڵه‌كه‌ ئه‌درێ به‌وه‌ی پێشوویان و ئه‌بژێررێتیشه‌وه‌ بۆ ئه‌وی دواییان، له‌م بابه‌ته‌ی ئێمه‌شدا، ئیسپات ئه‌بێ كه‌ ژنه‌كه‌ ژنی كابرای پێشووه‌و «مَهرالمثل»یش ئه‌درێ به‌ كابرای دوایی.

ئاشكرایه‌ ئه‌گه‌ر مه‌رجی دامه‌زرانی یه‌كێك له‌ دوو عه‌قده‌كه‌ نه‌هاتبووه‌جێ؛ مه‌سه‌لا، كابرا هاوكوف نه‌بوو و ژنه‌كه‌ یا وه‌لی‌ئه‌مره‌كانی‌تر پێی رازی نه‌بوون، یاخود هاوكوف بوو به‌ڵام ژنه‌كه‌ ئیزنی نه‌دابوو بۆ ماره‌بڕین له‌و، ئه‌مه‌ له‌م سووره‌ته‌دا ته‌نها نیكاحه‌كه‌ی‌تریان دروسته‌.

**بزانن!** وه‌لی‌ئه‌مر یه‌كێك بێ یا زیاتر له‌ یه‌كێك، هه‌ركاتێك ژن داوای لێ كرد كه‌ ماره‌ی ببڕێ له‌كه‌سێكی هاوكوف كه‌ داوای بكات، واجبه‌ له‌سه‌ری ماره‌ی ببڕێ لێی وه‌ ئه‌گه‌ر به‌ بێ‌عوزری شه‌رعی جارێك یا دووجار مه‌نعی ژنه‌كه‌یان كرد له‌وه‌كه‌ شوو بكا به‌و كه‌سه‌، حه‌قه‌كه‌یان ئه‌ڕوا بۆ قازی وه‌ ئه‌گه‌ر مه‌نعه‌كه‌ بوو به‌ سێ جار، حه‌قی ویلایه‌ته‌كه‌یان ئه‌ڕوا بۆ وه‌لی‌ئه‌مری له‌ خۆیان دوورتر، جا ئه‌گه‌ر وه‌لی‌ئه‌مری دوورتر نه‌بوو، ئه‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ قازی. به‌كورتی، به‌پێی شه‌رع دروست نییه‌ وه‌لی‌ئه‌مر ته‌فره‌ی به‌شوودانی كچی خۆی یا خوشكی خۆی بدا، ئه‌گه‌ر بیه‌وێ شوو بكا و كه‌سێكی هاوكوف بێ كه‌ بیه‌وێ ماره‌ی بكا؛ به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر دووكه‌سی هاوكوف هه‌بوون هه‌ردووكیان داوایان ئه‌كرد، باوكی كچه‌كه‌ حه‌قی هه‌یه‌ بڵێ: ناتده‌م به‌ فڵانیان و ئه‌تده‌م به‌وی‌تریان.

## باسی وه‌كیل‌گرتنی وه‌لی له‌كاتی عه‌قددا

هه‌ر وه‌لی‌ئه‌مرێك حه‌قی مه‌جبووركردنی ئافره‌تی نه‌بێ، تا ئافره‌ته‌كه‌ ئیزنی نه‌دا ماره‌ی ببڕێ، وه‌ك خۆی ناتوانێ ماره‌ی ببڕێ، ناتوانێ وه‌كیلیش بگرێ بۆ ماره‌بڕینی؛

بەڵێ، قازی لەپێش ئەوەدا کە ژنەکە ئیزنی بدا ئەتوانێ وەکیل بگرێ، جا لەپاش وەکیلگرتنەکە، ئەبێ ژنەکە بڵێ: ئیزنم هەیە قازی مارەم ببڕێ لە فڵانکەس وە ئەگەر یەکێك خەبەری هێنا بۆ وەلی ئەمرەکەکەوا خوشکەکەت ئیزنی داوی‌و ئەمیش باوەڕی کرد بەڕاستی قسەی ئەو کەسە، ئەوە لەم کاتەدا وەکوو خۆی دروستە مارەی ببڕێ، ئەیشتوانێ وەکیل بگرێ بۆ مارەبڕینی. هەندێ لە زانایان، فەرموویانە: بۆ هەر عەقدێك کە خیلافی تیا هەبێ لە بەینی زانایانی شەرعدا، پێویستە لەپێشا وەلی ئەمرەکە تەقلید بکا، ئەوجا ژنەکەش تەقلید بکا، ئەمجا ئیزنی وەلی ئەمرەکەی بدا، چونکە لە پێش تەقلیدکردنەکەدا، ویلایەتی وەلی ئەمرەکە سابت نییەو ئیزنی ئافرەتەکەیش قیمەتی نییە.

جا ئەگەر ئافرەتەکە بە وەلی «غیر مجبِر»ی وت: خۆت مارەم مەبڕەو وەکیل بگرە بۆ عەقدەکەم، ئەوە ئەو ئیزندانە دانامەزرێ و لەوە ئەچێ کە ئیزنی بێگانەیەکی دابێ بۆ بەشوودانی، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر ئەوە کە مەبەستی حورمەتگرتنی وەلی ئەمرەکەی بووە وە ئەگەر ئیزنی دابوو بۆ مارەبڕینی، بەڵام مەنعی کرد لە وەکیلگرتن، ئەوە پێویستە خۆی مارەی ببڕێ و دروست نییە وەکیل بگرێ وە ئەگەر هەر ئەوەندەی وت: ئیزنم هەیە مارەم ببڕێ بۆ فڵان، ئەوە ئەتوانێ خۆی مارەی ببڕێ‌و ئەیشتوانێ وەکیل بگرێ، چونکە مادام حەقی ویلایەتی بۆ پەیدا بوو، تا مانیعێك پەیدا نەبێ حەقی وەکیلگرتنیشی هەیە؛ کەواتە، ئەگەر ئافرەتێکی بێ‌وەلی ئیزنی قازیدا بۆ ئەوەی مارەی ببڕێ، ئەوە قازی هەروەکوو خۆی ئەتوانێ مارەی ببڕێ، ئەیشتوانێ وەکیل بگرێ و ئەمە، خەلفەدانان (اِستِخلاف) نییە تا یەکێ بڵێ: قازی لەخۆیەوە حەقی خەلفەدانانی نییە، بەڵکوو ئەمە وەکیلگرتن (تَوکیل)ە و قازی، وەلی «غیر مُجبِر»ەو وەلی «غیر مجبر»یش، حەقی وەکیلگرتنی هەیە دوای ئیزندرانی بۆ نیکاحکردن.

وە ئەگەر ژنەکە لە ئیزنەکەیدا پیاوێکی دیاری کرد بۆ وەلی ئەمرەکەی کە مارەی ببڕێ لەو پیاوە، ئەوە واجبە لەسەر وەلی ئەمرەکە، ئەگەر وەکیلی گرت بۆ مارەبڕینی ژنەکە، ئەویش عەینی پیاو دیاری بکا بۆی و مارەبڕینی لە غەیری ئەو کەسە، دروست نییە وە ئەگەر وەلی ئەمرەکە لە وەکیلگرتنەکەیدا ناوی ئەو کەسە نەبا، ئەوە بەتاڵە، هەرچەند

وەکیلەکەیشی ئافرەتەکە لە هەمان پیاو مارە بکا، چونکە ئیزنی موتڵەق لەکاتێکا کە مەبەست دیاری نەکرابێ، بەتاڵەو دانامەزرێ وە ئەگەر ژنەکە وتی: براکەم مارەم ببڕێ لە فڵانکەس و ئیزنم هەیە وەکیلیش بگرێ، ئەوە لەهەموو لەفزەکان ئاشکراترە.

هەرکاتێك شەخسی ئەو وەلی ئەمرەکە وەکیلەکەی گرتوە لە مەجلیسی عەقدەکەدا حازر نەبوو، واجبە لەسەر وەکیلەکەی ئەوەندە نەسەبی بەیان بکا کە بەتەواوی دەربکەوێ؛ ئەمە، زیاتر وایە بە ناوی خۆی و باوکی دەرئەکەوێ، جارجار پێویست بە ناوی باپیریشی ئەکا؛ خۆ ئەگەر مەشهوور بوو بە سیفەتێك، ئەوە باس‌کردنی سیفەتەکە بەسە؛ هەروەها، واجبە ناوی وەکالەتەکەی خۆیشی ببا، ئەگەر مێردەکەو شاهیدەکان نەیانئەزانێ بەوە کە وەکیلە؛ بەڵام ئەمانە، مەرجی دروستبوونی دەس‌بردنن بۆ مەسەلەی عەقدەکە و مەرجی دامەزرانی ئەسڵی عەقدەکە نین.

ئەگەر «ولی مجبِر» وەکیلی گرت بۆ عەقدکردنی کچەکە بە بێ‌ئیزنی ئەو، کەچی کچەکە بەهۆی ئەوەوە کە کابرایەك بەشوبهە چووەلای کچێنی نەما، یاخود کابرای داخوازی‌کەری فاسقییەکی بەسەراهات و کەفائەتی نەما، ئەوە ئەو وەکیلە ناتوانێ کچەکە مارە بکا تا بەئاشکراو بێ‌پیچ و پەنا ئیزنی باوکی نەدا وکە ئیزنی باوکی دا، ئیتر تازەکردنەوەی وەکیل‌گرتنەکە پێویست نییە، چونکە کابرا هەر وەکیل بووەو مانیعێك پەیدا بووە لە تەسەڕوف‌کردنی، وا ئێستە بەهۆی ئیزنی کچەکەوە ئەو مانیعە نەما.

ئەگەر کەسێك کەسێکی کرد بە وەکیلی قەبووڵی نیکاح لە باوکی کچەکە و بە رێکەوت باوکەکە وەفاتی کردو ویلایەتەکە گەڕایەوە بۆ برای کچەکە، ئەوە ئەو وەکیلە ناتوانێ قەبووڵی نیکاح بکا لەم برایە تا جارێکی‌تر کابرا نەیکاتەوە بە وەکیل، چونکە تەرەفی عەقدەکە لەم مەسئەلەیەدا فەوتاوە.

**بزانن!** واجب نییە وەلی‌ئەمر باسی مارەیی بکا لەگەڵ وەکیلەکەدا؛ جا ئەگەر باسی نەکرد، ئەوە واجبە لەسەر وەکیلەکە ژنەکە مارە ببڕێ لەسەر «مَهرالمثل» یا زیاتر لە «مَهرالمثل» وە ئەگەر لەسەر کەمتر لە «مَهرالمثل» مارەی بڕی، ئەوە عەقدەکە لەسەر «مَهرالمثل» دائەمەزرێ؛ کەواتە، ئەو واجبییە کە باسمان کرد، بۆ دروستبوونی

دەس‌بردنە بۆ ئیشی عەقدەکە. هەروەها، ئەگەر وەلی‌ئەمرەکە وتی بە وەکیلەکە: مارەی مەبرە لەسەر کەمتر لەو ئەندازەیە، ئەویش بەپێچەوانەی قسەکەی ئەو لەسەر کەمتر مارەی بڕی، هەر عەقدەکە دروستەو دێتەوە سەر «مهرالمثل»؛ بەڵێ، ئەگەر وەلی‌ئەمرەکە ئەو وەزعەی کرد بە شەرت لە وەکیل‌گرتنەکەیدا؛ مەسەلا، وتی: تۆم کرد بە وەکیل لە عەقدی نیکاحیا، بەو شەرتە لەسەر سەد مسقاڵ ئاڵتوون کەمتر مارەی نەبڕی، ئەوە پێویستە بۆ دامەزرانی عەقدەکە لەسەر ئەو ئەندازەیە مارەی ببڕێ، ئەگینا عەقدەکە بەتاڵ ئەبێ، چونکە بە بێ‌چاودێریی ئەو شەرتە، نابێ بە وەکیل.

واجبە لەسەر وەکیلی موتڵەق، واتە وەکیلێك کە قەید و شەرتی بۆ دانەنرابێ، ئیحتیات بکاو تەماشای رەزای وەکیل‌گرەکەو مەسڵەحەتی ئافرەتەکە بکا، ئەگینا لە هەندێ ماددەدا عەقدەکە بەتاڵە، وەکوو لە حاڵی مارەبڕینی ژنەکەدا لە ناهاوکوف وە لە هەندێ ماددەدا دائەمەزرێ، بەڵام وەکیلەکە تاوانبار ئەبێ. هەروەها، ئەگەر مێردەکە کەسێکی کرد بە وەکیل بۆ قەبووڵی نیکاحی ئافرەتێك، ئەویش واجبە لەسەری، یا بە «مَهرالمثل» یا بە کەمتر «مهرالمثل» قەبووڵی نیکاحەکەی بۆ بکا وە ئەگەر بە زیاتر لەو ئەندازەیە بۆی قەبووڵ کرد، عەقدەکە دروستەو دێتەوە سەر «مَهرالمثل»، مەگەر لەحاڵێکا کە مێردەکە ئەو وەکیل‌گرتنەی بە شەرتی ناوبردنی ئەندازەیەکی تایبەتی کردبێ، ئەوە لەکاتێکا کە وەکیلەکە لێی لابدا، عەقدەکە بەتاڵ ئەبێتەوە.

ئەگەر ئافرەتێك بە سوورەتی تەعلیق ئیزنی وەلی‌ئەمرەکەی‌دا؛ مەسەلا، وتی: هەرکاتێ مێردەکەم تەڵاقی دام‌و «عِدّە»م بەسەرچوو، تۆ مارەم ببڕە، ئەوە ئەو ئیزنە دروستەو وەلی‌ئەمرەکە ئەتوانێ لەسەر بڕیاری ناوبراو مارەی ببڕێ، بەڵام ئەگەر وەلی‌ئەمر بە سوورەتی تەعلیق وەکیل بگرێ؛ مەسەلا، بڵێ: هەروەختی کچەکەم تەڵاق‌دراو «عدّة»ی بەسەرچوو، تۆ وەکیلی منی لە مارەبڕینیا، ئەوە ئەم وەکیل‌گرتنە بەپێی فەرموودەی هەموو زانایانی شەرع، بەتاڵە، بەڵام شێخی «ابن حجر» لەسەر ئەوەیە هەرچەند وەکیل گرتنەکە بەتاڵەو ئیزنەکەی لەبارەی وەکیل‌گرتنەکەیەوە دانامەزرێ، بەڵام ئیزنێکی تێکڕایی لەم قسەیەوە دەرئەکەوێ، لەبەر ئەوە ئەگەر

وەکیلەکە لەسەر ئەو بڕیارەکچەکە مارە ببڕێ، دروستە و ئەم مەبەستەی باس کردووە لە «کتابُ الوَکالة»دا لە کتێبی «تحفة»، هەروەها لە «کتابُ النّکـاح»یشـدا؛ «رەمـەلی» و «خەتیب» و چەند زانایەکی تریش، لەسەر ئەوەن هەروەکوو وەکیل‌گرتنەکـە بـەتاڵە، تەسەڕوفی کابرای وەکیلیش بەتاڵە، لەبەر ئەوە کـە ئـەو ئـیزنە لە وەکـیل‌گرتنەکـەوە وەرئەگیرێ و کە وەکیل‌گرتنەکەیش نەبوو، ئیزنیش نابێ.

هەرچۆن بێ، بۆ ئەسڵی دامەزران و دانەمەزرانی عەقدەکە، هەرکەسێ بە ئارەزووی خۆیەتی بەگوێرەی فەرموودەی شێخی «ابن حـجر» ئـەجووڵێتـەوە یـا بـەگـوێرەی فەرموودەی «رەمەلی» و لەم مەسئەلەیەدا، مەگەر قازی بتوانێ حوکمێکی قەتعی بدا بە لایەکا.

بزانن! هەروەکوو چۆن لە مەسئەلەی بێ گوێیی‌کردنی شەرتی وەکالەت‌دا عەقدەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، لە هەرلایەکیشا وەکیلەکە بەئاشکرا لابدا لە شەرتی کابرای وەکیل‌گر، عەقدەکە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ مەسەلا، کابرای وەلی‌ئەمر بڵێ بە وەکیلەکە: وەکـیلم بـە لە عەقدی ئەو کچەدا، بەڵام مارەی مەبڕە هەتاوەکوو فڵانکەس ئەبێ بە زامنی مارەییەکەی، یاخود تا رەهنێك دائەنێن لەجیاتی مارەییەکەی و وەکـیلەکـەیش گـوێی نـەدا بـەم شەرتانە، ئەوە تەسەڕوفی وەکیلەکە بەتاڵەو عەقدەکە دانامەزرێ.

بێداری! هەروەکوو ئیحتیات‌کردن پێویستە بۆ وەکیل، پێویستیشە بۆ ئەو مەلایەی کە عەقدی نیکاحەکە ئەکا و پێویستەکە هاتنەلای بۆکردنی عەقدی نیکاحەکە، بپرسێ ئاخۆ ئەو ئافرەتەکچە یاخود بێوەژنە وە ئەگەرکچە، ئاخۆ بچووکە یاخود باڵغ بووە و ئاخۆ «ولی مُجبِر» مارەی ئەکا یا یەکێکی تر؟ وە لە سوورەتێکا کە «ولی مجبر» مارەی بکاو کچەکە نابالغ بێ، یاخود بالغ بووبێ، بەڵام بە بێ‌پرس بیدەن بـە شـوو، ئـاخۆ مەرجەکـانی تـوانـای مـەجبوورکردن لەلایـەن وەلی‌ئـەمرەکـەوە، وەك کـەفائەت و دەسەڵات‌شکانی داخوازی‌کەر بەسەر «مَهرالمثل»دا، لەم عەقدەدا هاتوونەتەجێ یا نە؟ هەروەها، ئەبێ بپرسێ، ئەگەر ئافرەتەکە بێوەژن بێ. ئاخۆ مێردی مردووە یاخود تەڵاق دراوە و بە هەرحاڵ، «عِدّە»ی بەسەر چووە یا نە؟ بۆ ئەوەی بەرچـاوی رۆشـن بـێ،

چونکە گەلێ جار بە بێ‌پرسیار عەقدی نیکاح ئەکرێ‌و لەدواییدا دەرئەکەوێ ئەو عەقدە دانەمەزراوەو هەراو ئاژاوەیەکی زۆری لێ‌پەیدا ئەبێ.

هەروەها، ئەگەر مەلاکە وەلی‌ئەمرو شاهیدەکان و ژن‌و مێردەکە نەناسێ، پێویستە بەکورتی هەردوو کەلیمەی شەهادەت‌و مەعنایان‌و ئەرکانی ئیمان و ئیسلامیان بۆ باس بکاو ئەوانیش بێن بەشوێنیا، ئەمجا وەلی‌ئەمرەکە فێربکا کە تۆبە بکا لە گوناهانی رابوردووی، هەروەها شاهیدەکانیش؛ جا لەپێشا وەلی‌ئەمرەکە تەقلید بکا، ئەمجار ئافرەتەکەش وە ئەگەر «مجبرة» نەبوو، ئیزنی وەلی‌ئەمرەکەی بدا کە مارەی ببڕێ، ئەوجا مێردەکەو شاهیدەکانیش هەموو تەقلید بکەن، جا وەلی‌ئەمرەکە دوو سێ کەلیمە قسە بکا لەبارەی ئەو ژن بەشوودانەوەو[1] سیغەی «ایجاب»ی عەقدەکە بڵێ‌و پاش ئەوە، بە بێ‌فەسڵ کەوتن، مێردەکەیش قەبووڵی نیکاحەکە بکا.

جا ئەگەر وەلی‌ئەمرو مێردەکە خۆیان هاتبوون، وەلی‌ئەمر ئەڵێ: وا فڵانی کچی خۆم «انکاح»کرد لەتۆ لەسەر ئەوەندە مارەیی و مێردەکەیش، گورج ئەڵێ: وا قەبووڵم کرد لە تۆ «انکاح»ی کچەکەت کە فڵانە بۆ خۆم لەسەر ئەوەندە مارەیی وە ئەگەر وەکیلی وەلی‌ئەمرەکەو مێردەکە هاتبوون، وەکیلی وەلی‌ئەمرەکە ئەڵێ: وا فڵانی کچی «مُوکِّل»ەکەی خۆمم «انکاح» کرد لە فڵانکەس کە تۆی کردووە بە وەکیل لەسەر ئەوەندە مارەیی‌و وەکیلی مێردەکەیش، گورج ئەڵێ: وا قەبووڵم کرد لە تۆ نیکاحی فڵانی کچی فڵان کە تۆی کردووە بە وەکیل بۆ فڵانکەس کە منی کردووە بە وەکیل لەسەر ئەوەندە مارەیی.

وە ئەگەر وەلی‌ئەمرەکە خۆی هاتبوو و مێردەکە وەکیلی ناردبوو، وەلی‌ئەمرەکە بڵێ: وا فڵانی کچی خۆم «انکاح» کرد لە فڵانکەس کە تۆی کردووە بە وەکیل لەسەر ئەوەندە مارەیی‌و وەکیلەکەیش، گورج بڵێ: وا قەبووڵم کرد لە تۆ «انکاح»ی فڵانی کچت بۆ فڵانکەس کە منی کردووە بە وەکیل لەسەر ئەوەندە مارەیی وە ئەگەر وەلی‌ئەمرەکە وەکیلی ناردبوو و مێردەکە خۆی هاتبوو، وەکیلی وەلی‌ئەمرەکە بڵێ: وا فڵانی کچی فڵان کە منی کردووە بە وەکیل «انکاح»م کرد لە تۆ لەسەر ئەوەندە مارەیی‌و مێردەکەیش،

---

١. مەبەس لە حەمد و سەنای خواو درووده بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرو داوای خۆپاراستن لە گوناه.

گورج بڵێ: وا قەبووڵم کرد لە تۆ «إنکاح»ی فلانی کچی فلان کە تۆی کردووە بە وەکیل بۆ خۆم لەسەر ئەوەندە مارەیی.

## باسی نیکاحی کافرێ کە موسوڵمان بووبێ

ئەگەر کافرێك موسوڵمان بوو و ژنێکی «کِتابیّە»ی وای هێنابوو کە لە ئەساسا نیکاحی دروست بێ، ئەوە نیکاحەکەی دەوام ئەکا وە ئەگەر ژنەکەی «کتابیّە» نەبوو یا «کتابیّە»یەکی وا بوو کە نیکاحی نەدەهات بۆ موسوڵمان، بەڵام لەگەڵ مێردەکەیا موسوڵمان بوو بوو، بەم رەنگە دواکەلیمەی شەهادەتیان پێکەوە بەدەما هاتبوو، ئەمەیش هەر نیکاحەکەی دەوام ئەکا.

وە ئەگەر دواکەوتبوو لە مێردەکەی، ئەمە تەماشا ئەکەین، ئەگەر مێردەکەی نەچووبووە لای، دەس‌بەجێ نیکاحەکەی هەڵئەوەشێتەوە وە ئەگەر چووبووەلای، رائەوەستین، ئەگەر لە ماوەی «عدّة»دا موسوڵمان بوو، ئەوە نیکاحەکەی دەوام ئەکا وە ئەگەر موسوڵمان نەبوو تا «عِدّە»کەی تەواو بوو، ئەوە لەکاتی موسوڵمانبوونی مێردەکەیەوە لەیەك جیابوونەتەوە وە ئەگەر ژنەکە موسوڵمانبوو، وە مێردەکەی دواکەوت، عەینی ئەم تەفسیلەی تیا جاری ئەبێ.

موسوڵمانبوونی منداڵیش، بە موسوڵمانبوونی یەکێك لە باوك و دایکیەوەیەتی و وەکوو موسوڵمانبوونی سەربەخۆیە؛ کەواتە، ئەگەر کچە کافرێکی نابالغ مارە کرا لە کوڕە کافرێکی نابالغ و باوك و دایکی هەردووکیان موسوڵمان بوون، ئەوە مادام بەیەکەوە موسوڵمانبوون، نیکاحی منداڵەکان دەوام ئەکا وە ئەگەر بەرودوا موسوڵمان بوون، ئەوە جیایی لەبەینیانا دێتەجێ.

جا هەرکاتێ بەهۆی موسوڵمانبوونەوە جیایی کەوتە بەینی ژن و پیاوەکە، ئەوە ئیتر ئەو مانیعەی کە وەختی خۆی لە عەقدی نیکاحەکەیاندا بووبێ و بە فەرموودەی هەموو ئیمامەکان مانیعی دامەزرانی نیکاح بووبێ، نابێ بە مانیع بۆ بەردەوامی نیکاحەکەیان، مادام ئێستە نەمابێ و ژنەکەیش لەوانەبێ کە ئێستە نیکاحی حەڵاڵ بێ بۆ ئەم کابرایە، یا

شتێکی‌وای لەگەڵدا نەبێ کە مانیعی هەمیشەیی بێ لە عەقدی ژنەکە بۆ کـابرا، «بِـناءً علیه»، نیکاحی کافرێ کە موسوڵمان ببێ، ئەبێ بە دوو بەشەوە؛ یەکەم، نیکاحێکە کە دەوام ئەکاو دووهەم، نیکاحێکە کە تێك ئەچێ؛ لە میسالی بەشی یەکەمە ئەم چەند حاڵەتە:

یەکەم: نیکاحێك کە نە لە وەختی خۆیاو نە ئێستە مانیعی دامەزرانی لەگەڵ نەبووبێ.

دووهەم: نیکاحێك کە لە وەختی خۆیدا مانیعێکی لەگەڵدا بووە، بەڵام بە مەزهەبی یەکێك لە پێشەوایانی دین ئەبێ بە مانیع نەك بە مەزهەبی هـەموویان، وەك نـیکاحی بێ‌وەلی ئەمر کە لای «حەنەفییەکان» دائەمەزرێ، یا نیکاحی بێ‌شاهید کە لای «مالِك» دائەمەزرێ، یا نیکاحی بێ‌وەلی و بێ‌شاهید کە لای «داود الظّاهری» دائەمەزرێ؛ ئەم نیکاحانە هەموو بەردەوام ئەبن، چونکە مانیعەکەیان بە ئـیجماعی هـەموو زانـایانی شەرع مانیع نییە، بەڵکوو تەنها لای هەندێکیان مانیعە و ئەو شتەیش کە ئەبێ بەهۆی دانەمەزرانی عەقد، ئەبێ بە هەموو مەزهەبێك عەقد تێك‌بدا، ئەو کافرەیش کە موسوڵمان بووە، دینی ئیسلامی لە ئەستۆی خۆی گرتووە بە بێ‌ئـەوەی بـیبەستێ بـە مـەزهەبی ئیمامێکی تایبەتییەوەو مەزهەبی ئیمامێکی تایبەتی وەرنەگرتووە؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش موسوڵمان بوونەکەی گورج چووە سەر مەزهەبی یەکێك لەو ئیمامانە، ئەوە پێویستە بەوجۆرە بجووڵێتەوە، وەکوو موسوڵمانێکی خوێندەوار کە بـەهۆی خـەریك‌بوونی عیلمەوە پایەی بەرز ببێتەوەو بیری بچێتە سەر مەزهەبی ئیمامێك، واجـبە لەسـەری بەگوێرەی مەزهەبی ئەو ئیمامە بجووڵێتەوە، یـاخود لە دڵی خـۆیـا لە تـەقلیدکردنی ئیمامێك پەشیمان بووەوەو بە تێگەیشتنی خۆی حاڵی هاتەسەر ئـەوە کـە مـەزهەبی ئیمامێکی‌تر پەسەندترە، ئەوە هەر ژنێ کە لەسەر تەقلیدە پێشووەکەی مارەی کردووە حەرام ئەبێ لێی، وەکوو لە عیبارەتی هەندێ لەو زانایانەوە دەرئەکەوێ کە لەم مەسەلەیە کۆڵیونەتەوە.

سێهەم: نیکاحێك کە لە «عِدّة»ی غەیردا کرابێ و ئێستە «عِدّة»کەی تەواو بووبێ.

چوارەم: نیکاحی وەختی (مُؤَقّت)، ئەگەر لە ئایینی خـۆیـانا بـە هـەمیشەییان زانیبێ و باس‌کردنی وەختەکەیان بە شتێکی عادەتی دانابێ، یاخود بە وەختییان زانیبێ،

بەڵام لەكاتی موسوڵمانبوونیانا وەختەكە بەسەرچووبێ؛ ئەم نیكاحە بەردەوام ئەبێ لەبەر ئەوە یا بە هەمیشەییان داناوە، یاخود ئێستە وەختەكەی بەسەرچووە؛ بەڵێ، ئەگەر لەكاتی موسوڵمانبوونیانا وەختەكە بەسەر نەچووبێ، ئەوە جیا ئەكرێنەوە لە یەك و سەرلەنوێ، ئەگەر مەیلیان بێ، ژنەكە مارە ئەكرێتەوە بۆ كابرا.

هەندێ لە زانایانی شەرع، ئەم حاڵەتەیان بە حاڵەتی نەبوونی تێكدەری نیكاح داناوە، لەبەر ئەوە كە «ابنُ عبّاس» -خوایان لێ رازی بێ- فتوای پێداوە، بەڵام فەرموودەی راستتر ئەوەیە بەر حاڵەتیبوونی تێكدەری نیكاح ئەكەوێ، چونكە «ابن عبّاس» پەشیمان بووەتەوە لە فتواكەی، یاخود ئەگەر لە فەرزێكا كە پەشیمان نەبووبێتەوە، قسەی تەنها ئەو بەرابەر بە یەككەوتنی قسەی هەموو ئەسحابەكان -كە نیكاحی وەختییان بە حەرام زانیوە- تەئسیری نییە، بێجگە لەمەش، مەزهەبی ئەم زاتە كۆنەكراوەتەوە، بەڵام «داود الظّاهری» مەزهەبی كۆكراوەتەوەو ماوەیەكی زۆر رەفتاری پێكراوە لە وڵاتانی رۆژاوای ئیسلامدا، لەوەپاش كەموكوڕتی رووی تێكردووە یا هەر فەوتاوە.

پێنجەم: نیكاحی بێوەژنێكە بە بێئیزنی خۆی مارە كرابێ.

شەشەم: نیكاحی كچێكی نابالغە كە غەیری باوك و باپیرە مارەیان كردبێ.

حەوتەم: نیكاحی كچێكی بالغە كە غەیری «ولی مجبِر» بە بێئیزن مارەی كردبێ.

هەشتەم: نیكاحی ژنێكە كە وەلییەكەی زۆری لێ كرابێو بە زۆر عەقدەكەی كردبێ.

ئەمانە، هەموو دەوامیان پێ ئەدرێ، لەبەر ئەوە كە پاش نیكاحەكە مانیعەكە نەماوەو ژن و پیاوەكە رێكەوتوون؛ كەواتە، ئەمانە ئەگەر لەپاش نیكاحەكە هەر ناڕەزا بوون و ئێستەش كە موسوڵمان بوون هەر ناڕازی بوون لە یەك، ئەوە جیائەكرێنەوە لە یەك.

نۆهەم: نیكاحێكە وەختی خۆی مانیعی تیا نەبووە، بەڵام رۆژێك بەر لە موسوڵمانبوونی پیاوو ژنەكە، «عدّة»ی شوبهە ئەكەوێتە سەر ئافرەتەكە؛ ئەم نیكاحەیش، هەر دەوام ئەكا، لەبەر ئەوە كە «عِدّە»ی شوبهە هەرچەند مانیعی ئەوەیە كابرا بڕواتە لای ژنەكەی، بەڵام نابێ بە مانیعو رێگری هەمیشەی نیكاحەكە.

**دەهەم:** نیکاحی کافرێکە بەتەنها خۆی موسوڵمان بووبێ و ئیحرامی بەستبێ بۆ حەج، جا ژنەکەیشی لەکاتی ئیحرامەکەی ئەودا موسوڵمان بووبێ، ئەوەیش هەر دەوام ئەکا، لەبەر ئەوەکە ئیحرام هەرچەند مانیعی نیکاحە، بەڵام مانیعێکی وەختییەو مانیعی هەمیشەیی نییە.

لە میسالانی بەشی دووهەمیشە ئەم چەند میسالە؛

**یەکەم:** نیکاحی ئافرەتێ کە مەحرەمی کابرا بووبێ، وەکوو دایك و خوشك و پوورو کچ و کچەزا، لەبەر ئەوەکە وەختی خۆی مانیعێکی قەتعی هەبووە بۆ دامەزرانی ئەو نیکاحەو ئێستایش مانیعەکە بەردەوامە.

**دووهەم:** نیکاحی ژنێکەکە خاڵی بووبێ لە مانیع، بەڵام لەدواییدا بەپێی شەریعەتی ئیسلام مانیعێکی هەمیشەیی بەسەرا هاتبێ، هەرچەند بەپێی ئایینی پێشووی کابرایش مانیع نەبێ، وەکوو ئەوە دایکی کابرا شیری دابێ بە ژنەکەی، یا باوکەکەی یا کوڕەکەی بەشوبهە چووبنە لای ژنەکەی.

**سێهەم:** نیکاحی ژنێکە وەختی خۆی مانیعی تێدا نەبووەو مارەی کردووە، بەڵام لەپاشا سێ تەڵاقەی ئەداو بە بێ «تَحلیل» لای خۆی ئەیهێڵێتەوە.

ئەم نیکاحانە هەموو بەتاڵ ئەژمێررێن.

## باسی ئەوەکە کافر موسوڵمان ببێ و زیاتر لە چوار ژنی ببێ

ئەگەر کافرێك موسوڵمان بوو و زیاتر لە چوار ژنی هەبوو ـ کە ئەندازەی شەرعی ژن راگرتنە ـ ئەوە ئەگەر ژنەکان هەموویان لەگەڵیا موسوڵمان بوون، خواه چووبێتە لایان یا نەچووبێتە لایان، یاخود لەپاش ئەو موسوڵمان بوون و چووبووە لای هەموویان و موسوڵمان بوونەکەیان لەپێش تەواوبوونی ماوەی «عِدّە»ی ئەو جیابوونەوەیە بوو کە بەهۆی موسوڵمانبوونی مێردەکەیانەوە پەیدا بووە، یاخود موسوڵمان نەبوون، بەڵام «کِتابیّە»یەکیوا بوون کە نیکاحیان بۆ موسوڵمان دروست بێ، لەم سوورەتانەدا واجبە لەسەری چواریان لێ هەڵبژێرێ بۆ ژنیەتی خۆی و هەر کە ئەو چوارەی هەڵبژارد، نیکاحی ئەوانیتریان هەڵئەوەشێتەوە.

وە ئەگەر نەچووبووە لایان‌و تەنها چواریان موسوڵمان بوون لەگەڵیا، یا چووبووە لایان‌و هەر تەنها چواریان لەگەڵیا یا لە ماوەی «عدّة»دا موسوڵمان بوون، ئەوە هەر نیکاحی ئەم چوارەیان دائەمەزرێ‌و نیکاحی ئەوانی تریان هەڵئەوەشێتەوە وە ئەگەر دایك و کچێك بە جووت ژنی بوون و هەردووکیان «کتابیّە» بوون، یا «کتابیّة» نەبوون بەڵام موسوڵمان بوون، ئەوە ئەگەر کابرا چووبووە لای هەردووکیان، ئەوە هەردووکیان حەرام ئەبن لێی بۆ هەمیشە، هەروەها ئەگەر تەنها چووبێتە لای دایکەکە وە ئەگەر نەچووبێتەلای هیچیان یا تەنها چووبێتە لای کچەکە، ئەوە هەر نیکاحی کچەکە دائەمەزرێ. سیغەی هەڵبژاردنی ئەو ژنانەیش کە هەڵیان‌ئەبژێرێ، ئەوەیە بڵێ: وا ئەو ژنانەم هەڵبژارد، یا: نیکاحیانم دامەزراند، یا: رامگرتن.

وە ئەگەر هەندێکیانی تەڵاق‌دا، ئەوە ئەو تەڵاق‌دانە ئەبێ بە هەڵبژاردن بۆیان، لەبەر ئەوە کە تەڵاق بەسەر نیکاحا ئەڕوا، بەڵام ئەگەر «ظِهار»یان لەگەڵدا بکا، واتە بڵێ: ئێوە بۆ من وەك پشتی دایکم وان، یاخود «ایلاء»یان لەگەڵدا بکا، واتە: سوێند بخوا کە تا زیاتر لە چوار مانگ تێ‌نەپەڕێ نایەمە لاتان، ئەوە نابێ بە هەڵبژاردن، چونکە ئەم لەفزانە تەنها دووری ئەگەیەنن و لە راستیدا دوورکەوتنەوە لە ژن ئەوە ئەگەیەنێ کە بێگانەیە لێی.

بەستنەوەی هەڵبژاردنی هەندێ لەو ژنانە یا هەڵوەشاندنەوەی نیکاحیان بەشەرتێکەوە، هیچ کەڵکێکی نییە، وەکوو ئەوە کە بڵێ: هەر کاتێك شەوی جەژن هات، ئەو ژنەم هەڵبژاردووە، یا: نیکاحەکەیم هەڵوەشاندووەتەوە وە ئەگەر کابرا هات زیاتر لە چواریانی هەڵبژارد، ئەوە نیکاحی ئەوانی تریان هەڵئەوەشێتەوە، ئەنجا واجبە لەسەری مەسرەفی ئەم هەڵبژێرراوانە بدا تا لەناو ئەمانیشا چواریان دیاری ئەکا وە ئەگەر گوێی نەدانێ، ئەخرێتە بەندیخانەوە.

وە ئەگەر لەپێش هەڵبژاردنی چوارەکەدا مرد، ئەوە هەر ژنێکیان سکی هەبێ، «عدّة»ی تەواو ئەبێ بە جیابوونەوەی سکەکەی و هەر ژنێ کە نەچووبێتە لای‌و هەر ژنێ کە «عِدّە»ی بە مانگ بێ، ئەبێ چوار مانگ و دە رۆژ راوەستن و هەر ژنێ کە لە حەیزدا بێ، «عدّة»ی تەواو ئەبێ بە رابواردنی ماوەی زۆرتری بەینی «عِدّە»ی حەیز و

پاكبوونەوە یا «عدّة»ی مردن ـكە چوار مانگ و دە رۆژە ـ و لە میراتی كابرایش بەشی چوار ژن جیائەكرێتەوە، بەڵام رائەگیرێ تا ئەم ژنانە لەناو خۆیانا رێ ئەكەون، چونكە ئێمە بە ساغی نازانین كابرا لەناو ئەم ژنانەدا كامیانی هەڵئەبژاردو ئەیكردن بە ژنی خۆی‌و دەسبەرداری كامیان ئەبوو.

نیكاحی ئەو ژنە كافرانەش كە بە كافری ماونەتەوە بە دروست ئەزانین و ئاساری نیكاحی ئیسلامی بەسەرا ئەڕوا، ئەگەر ئەو شەرتانەیان تیا بێتەجێ كە بڕیار دراون بۆ دامەزرانی نیكاحی ژنی كافر، هەروەها ئەگەر ئەو شەرتانەیش نەیەنەجێ، بەگوێرەی ئەو فەرموودەیە كە پشتی پێ‌بەستراوە؛ كەواتە، ئەگەر ژنەكەی تەڵاق‌دا بە سێ تەڵاقەو لەپاشا موسوڵمان بوون، ئەوە ژنەكە حەڵاڵ نابێ بەهۆی مارە بەجاش نەبێ. هەر ژنێ كە پاش موسوڵمانبوون نیكاحەكەی جێگیر كرا، ئەوە ئەو مارەییەی كە ناوبراوە لە نیكاحەكەیدا بەتەواوی ئەیكەوێ، ئەگەر دروست بێ وەرگرتنی ئەو مارەییە و مارەییەك كە دورست نەبێ، وەكوو شەراب، ئەوە ئەگەر وەختی خۆی لەپێش موسوڵمانبوونیا وەری‌گرتبێ، ئێستە هیچی ناكەوێ وە ئەگەر وەری‌نەگرتبێ، ئێستە «مَهرالمثل»ی ئەكەوێ وە ئەگەر هەندێكی وەرگرتبێ، ئەوە بەشی باقییەكەی ئەكەوێ لە «مَهرالمثل».

هەر ژنێ كە بەهۆی موسوڵمانبوونەوە نیكاحەكەی هەڵوەشێتەوە، ئەوە ئەگەر وەختی [كابرا] خۆی چووبێتە لای‌و مارەییەكەی دروست بووبێ، هەمووی ئەكەوێ، ئەگینا «مَهرالمثل»ی ئەكەوێ وە ئەگەر نەچووبێتە لای، ئەوە تەماشا ئەكەین، ئەگەر هەڵگیرانی نیكاحەكەی بەهۆی موسوڵمانبوونی ژنەكەوە بووبێ، هیچی ناكەوێ وە ئەگەر بەهۆی موسوڵمانبوونی كابراوە بووبێ، نیوەی مارەییەكەی ئەكەوێ، ئەگەر مارەییەكەی دروست بووبێ، ئەگینا نیوەی «مَهرالمثل»ی ئەكەوێ.

## باسی نەفەقەی ئافرەتی كافر لەپاش موسوڵمانبوون

ئەگەر ژن و پیاوێك بەیەكەوە موسوڵمان بوون، ئەوە نەفەقەی ژنەكە دەوام ئەكا وە ئەگەر كابرا موسوڵمان بوو و ژنەكە بەكافری مایەوە تا «عِدّە»ی بەسەر چوو، یاخود لە

ماوەی «عدّة»دا موسوڵمان بوو، ئەوە نەفەقەی ماوەی دواکەوتنی ناکەوێ خواە هەمووی ماوەی «عِدّە» بێ یا هەندێکی وە ئەگەر ژنەکە موسوڵمان بوو وکابرا بەکافری مایەوە تا «عدّة»ی ژنەکە تەواو بوو، یاخود لەماوەی «عدّة»کەدا موسوڵمان بوو، ئەوە نەفەقەی ژنەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا دەوام ئەکا لە هەموو ماوەی «عدّة»کەدا وە ئەگەر ژنێك پاشگەز (مُرتَدّ) بووەوە، ئەوە ئیتر نەفەقەی ناکەوێ، جا ئەگەر لە «عدّة»دا موسوڵمان بووەوە، ئەوە لەو وەختەوە نەفەقەی ئەکەوێ کە موسوڵمان بووەتەوە، ئەگینا هیچ وە ئەگەرکابرا پاشگەز بووەوە، ئەوە ژنەکە نەفەقەی ماوەی «عدّة»ی ئەکەوێ، ئیتر کابرا موسوڵمان ببێتەوە یا نە.

## باسی حەقی پەشیمانبوونەوەی پیاو یا ژن لە نیکاح

ئەگەر پیاوەکە یا ژنەکە عەیبێکی دۆزییەوە بەویانەوە، لەو حەوت عەیبەی لەمەولا باسیان ئەکەین، ئەوە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی هەیە؛ ئەم حەوت عەیبە، بۆ هەرکام لە ژن و پیاو سێیان دێتەجێ؛

یەکەم: شێتییە کە بریتییە لە نەخۆشییەکیوا شوعوور لەدڵدا ناهێڵێ، بەڵام هێزو جووڵەی ئەندامی لەش نافەوتێ، خواە ئەم شێتییە هەمیشەیی بێ یا پچڕ پچڕ بێ، وە بەتەواوی جێگیربووبێ لەوکەسەدا یا نە، وە وەك شێتی وایە «صرع»، واتە: «پەرکەم» یا «فێ». هەروەها «خَبل» واتە: دەماغ تێكچوون، هەرچەند بەهۆی دەرمانخواردنەوە تووشی ئەم دەردانە بووبێ.

دووهەم: گولی کە نەخۆشییەکە لەشی ئینسان سوور ئەکاتەوەو رەش ئەبێتەوەو شەق ئەباو پارچە پارچە دائەکەوێ. فەرموودەی بەهێز ئەوەیە مادام دوو دوکتۆری باوەڕ پێکراو وتیان: ئەم نەخۆشییە گولییە، ئیتر حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح پەیدا ئەبێ، هەرچەند هێشتا نەخۆشییەکە لە سەرەتایا بێ.

سێهەم: بەڵەكبوون کە نەخۆشییەکە پێستی لەشی ئینسان سپی ئەکاتەوەو بەڵەكبەڵەکی ئەکاو خوێنی لێ ئەبڕێ.

**چوارەم:** «رَتق»، واتە پەیدابوونی پارچە گۆشتێك لەناو عەورەتی ئافرەتدا؛ لە حاڵەتی وادا، کابرا ناتوانێ زۆر بکا لە ژنەکە بە عەمەلیات ئەو پارچە گۆشتە دەربێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر ژنەکە خۆی عەمەلیاتی کرد، کابرا حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نامێنێ. هەروەها، ئەگەر عەورەتی ئافرەتەکە ئەوەندە تەسك بوو کابرا نەیئەتوانی بچێتە لای و ئەگەر زۆری بخستایەتە سەر، یەکاڵای ئەکردەوەو بەرودوای ئەکرد بە یەك، ئەوە لەم کاتەشدا کابرا بۆی هەیە نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە، هەروەها، ژنەکەیش حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی هەیە، ئەگەر هینەکەی کابرا ئەوەندە گەورە بوو ژنەکە پێی هەڵنەئەگیراو لەوانەبوو یەکاڵای بکاتەوە.

**پێنجەم:** «قَرن»، واتە ئێسقانێك لەناو عەورەتی ژنەکەدابێ کە رێگای چوونەلای گرتبێ.

**شەشەم:** «عُنّە»، واتە شلەپەتکەیی کە ئەوەتە ئالەتی کابرا راست نەبێتەوە، هەروەها ئەگەر کابرا ئیفلیج بوو و بەهۆی ئەوەوە ئالەتیشی راست نەبێتەوە.

**حەوتەم:** بڕانی ئالەتی کابرایە، خواه لەبنا بڕابێ یا لەسەرەوە، بەڵام ئەوەندەی نەمابێتەوە کە بتوانێ پێی بچێتە لای ژنەکە.

هەرکام لە ژن و مێرد ئەگەر یەکێ لەم عەیبانەی بەویانەوە دی، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی هەیە بەو شەرتە لەپێش عەقدەکەدا پێی نەزانیبێ، یاخود پێیزانیبێ بەڵام بەتەواوی لێی حاڵی نەبووبێ، یاخود باش لێی حاڵی بووبێ بەڵام ئێستا دەردەکەی خراپتر بووبێ یا تەشەنەی کردبێ و جێگای تریشی گرتبێتەوە و خواه ئەم پیاوە یا ئەم ژنەکە عەیبەکە بەویانەوە ئەبینێ خۆیشی هەمان عەیبی پێوەبێ یا نە وە ئەگەر پێوەی بوو، ئەوەندەی ئەویان بێ یا خراپتر بێ، هەر حەقی هەڵوەشاندنەوەی هەیە، لەبەر ئەوە کە ئەو تەرێزەی ئینسان ئەیکا لە نەخۆشی کەسێکی تر لە نەخۆشی خۆی نایکا.

هەروەها، ئەگەر لەپاش مارەبڕین و چوونەلا، یەکێ لەم عەیبانە پەیدا بوو، ئەوی تریان هەر حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی هەیە؛ بەڵێ نەخۆشی شلەپەتکەیی

ئەگەر لەپاش چوونەلا پەیدا بووبێ، نابێ بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح، هەروەها، ئەگەر لەحاڵێکا کە ژنەکە پارچە گۆشت یا ئێسقان لەناو عەورەتیا بوو، پیاوەکەیش شلەپەتکە بوو یا ئالەتەکەی بڕابوو، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحیان نییە.

وە ئەگەر عەیبەکە لەپێش مارەبڕیندا هەبوو و زیاد وکەمی نەکردبوو و عەیبدارەکە ئەیوت کە: ئەوی تر پێی‌زانیوەو ئەمیش ئینکاری ئەکرد، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ئینکارکەرەکە ئەکرێ. هەروەها، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح هەیە بۆ وەلی‌ئەمری ژنەکەیش بەهۆی ئەم عەیبانەوە، تەنها بەهۆی شلەپەتکەیی‌و بڕانی ئالەتەوە نەبێ، ئەگەر لەپێش عەقدەکەدا بووبن یا لەگەڵ عەقدەکەدا پەیدا بووبن، هەرچەند ژنەکەیش رازی بێ بە مێردەکەی بەو عەیبانەوە، چونکە وەلی‌ئەمرەکە حەقی هەیە دەفعی عەیب و عار بکا لەخۆی وە ئەگەر نەخۆشییەکان لەپاش عەقدەکە پەیدا بوون، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نییە؛ هەروەها، ئەگەر وەلی‌ئەمرەکە «غیر مُجبِر» بوو و ژنەکەیش لەپێش عەقدەکەدا رازی بوو بە عەیبی شێتی و گولی و بەڵەکی، ئەوە کابرای وەلی‌ئەمر حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نییە.

بەڵام وەلی‌ئەمری منداڵێکی نێرینە کە ژنێکی عەیبداری بۆ مارەکردبێ، ئەوە هەر عەقدەکەی دانامەزرێ تا پێویست بە هەڵوەشاندنەوە بکا وە ئەگەر ئەو عەیبە لەپاش عەقدەکە پەیدا بووبێ، تەماشا ئەکەین، ئەگەر منداڵەکە عەقڵ و فامی هەبوو، ئەوە مەسەلەکە ئەکەوێتە دەستی خۆی، هەرکاتێك باڵغ بوو، ئەتوانێ نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە وە ئەگەر شێت بوو، ئەوە زاهیری قەواعیدی شەرع ئەوەیە دروستە بۆ باوکەکەی بۆی هەڵوەشێنێتەوە، بۆ ئەوە کە ئەو کوڕە بەستەزمانە بەهۆی مانەوە لەگەڵ ئەو ژنەدا تووشی ئەو دەردانە نەبێ، بەڵام زانایانی شەرع بەئاشکرا دانیان بەمەدا نەناوە.

بێداری! حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح نییە نە بۆ پیاو و نە بۆ ژن بەهۆی غەیری ئەم عەیبانەوە، وەکوو بۆنی دەم و بۆنی بن‌باڵ‌و ئیفلیجی‌و کەڕی‌و کوێری‌و خوێنی

«استِحاضه»، هەرچەند درێژه بکێشێ، یا کەچەڵی و گەرۆڵی و سەوداو ئالۆش و دەردی تر، هەروەها بەهۆی خەسراوی یا بێ سەلیقەییەوە.

شەرتی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح، ئەوەیە بچنە لای قازی تا دەردەکە ئیسپات ببێ لای، جا ئەویش حوکم ئەدا بە هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکە وە ئەگەر ئەو وڵاتە قازی تیا نەبوو، کەسێك ئەکەن بە حەکەم وە ئەگەر حەکەمیان دەس نەکەوت، دروستە بۆ کابرا یا بۆ ژنەکە سەربەخۆ نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە؛ مەسەلا، پیاوەکە بڵێ: وا فەسخی نیکاحی ئەم ژنەم لە خۆم کردەوە، یا ژنەکە بڵێ: وا فەسخی نیکاحی ئەم پیاوەم لە خۆم کردەوە.

بزانن! رێگای ئیسپاتبوونی گولی و بەڵەکی و شێتی، قسەی دوو دوکتۆری خاوەن عەداڵەتە، هەروەها بە بینینیش ئیسپات ئەبن و رێگای ئیسپاتبوونی پارچە گۆشت و پارچە ئێسقان لە عەورەتی ئافرەتدا، یا پێ لێنانی ژنەکەیە یا شەهادەتی چوار ژنە و رێگای ئیسپاتبوونی شلەپەتکەیی و بڕانی ئالەتی پیاوەکە، لەپاش ئیددیعای ژنەکە، یا پێ لێنانی کابرایە یا بوونی دوو شاهیدە لەسەر پێ لێنانەکەی، یا سوێندخواردنی ژنەکەیە، ئەگەر پیاوەکە سوێندی نەخوارد.

لەپاش سابتبوونی شلەپەتکەیی پیاوەکە، قازی لەسەر داوای ژنەکە ساڵێکی بۆ دائەنێ لەو ساڵەدا ژنەکە لای پیاوەکە ئەمێنێتەوە، جا ئەگەر لەماوەی ئەو ساڵەدا کابرا توانی بچێتە لای ژنەکە، ئەوە باشە وە ئەگەر هەر بە شلەپەتکەیی مایەوە، ژنەکە پیاوەکەی ئەباتەوە لای قازی، جا ئەگەر کابرا پێی لێناکە هیچی پێ ناکرێ، ئەوە باشە وە ئەگەر وتی: چوومەتە لای ژنەکەم و ژنەکەیش ئینکاری کرد، ئەوە لەم سوورەتەدا ئەگەر ژنەکە بێوەژن بووبوو، یا کچێکی بێ بن (غَوْراء) بووبوو، ئەوە کابرا لەسەر ئیددیعاکەی سوێند ئەدرێ و باوەڕ بە سوێندەکەی ئەکرێ وە ئەگەر کچێکی عادەتی بوو، ئەوە مادام چوار ژن وتیان: هەر کچە، ئەوە کچەکە سوێند ئەدرێ کەوا ئەو کابرایە نەچووەتە لای، ئەمجار قازی نیکاحەکە هەڵئەوەشێنێتەوە.

وە ئەگەر لە ماوەی ئەو ساڵەدا ژنەکە نەڕۆیشتە لای کابرا، یا نەخۆشکەوت، یا چوو بۆ سەفەر، یاخود مەنعکرا لەوە کە لەلایا بێ، ئەو ساڵە ناژمێررێ و پێویستە قازی

ساڵێکی تری بۆ دانێ وە ئەگەر لە فەسڵێکی تایبەتیدا لێی دوورکەوتەوە ـ وەکوو بەهار مەسەلا ـ ئەوە پێویستە لەو فەسڵەدا لە ساڵی داهاتوودا بڕواتەوە بۆلای مێردەکەی وە ئەگەر لەو ساڵەداکابرا نەڕۆیشتە لای ژنەکە، لەسەری حیساب ئەکرێ و لەپاش ساڵەکە قازی نیکاحەکە هەڵئەوەشێنێتەوە؛ بەڵێ، «اَذرعی»، فەرموویەتی: ئەگەر کابرا نەخۆش کەوت، یا خرایە بەندیخانەوە، یا تووشی سەفەرێکی ناچاری بوو، ئەوە ئەو ماوەیەی بۆ حیساب ناکرێ.

ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کە ژنەکە رێی نادا بچێتەلای، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، جا قازی ساڵێکی تازەی بۆ دائەنێ و ئەو ژن و پیاوە لەناو کۆمەڵێك لە دەرو دراوسێی باوەڕ پێکراوا دائەنێ بۆ ئەوەی ئاگایان لە وەزعیان هەبێ و لەسەر قسەی ئەوان موعامەلەیان لەگەڵ ئەکا.

ئەگەر لەپاش تێپەڕبوونی ساڵەکە، ئەو ژنە رازی بوو بەو شلەپەتکەییە بە مێردەکەیەوە، ئەوە حەقی نامێنێ، داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکا، بەڵکوو حەقی دواخستنی ئەو داوایەشی نامێنێ وە ئەگەر پاش تەواوبوونی ساڵەکە گورج کابرای بردەوە بۆلای قازی و شلەپەتکەییەکە ئیسپات بوو و قازی وتی: وا لای من ئیسپات بوو کە ئەو کابرا شلەپەتکەیە، ئیتر ژنەکە بۆی هەیە سەربەخۆ نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوەو پێویست ناکا قازی هەڵیوەشێنێتەوە.

حەقی پەشیمانبوونەوە لە هەموو ئەو عەیبانەداکە باسمان کردن و بردنی مەسەلەکە بۆ لای قازی، یا بۆ لای حەکەم، یا بۆلای ئەهلی ئەو شوێنە، ئەگەر شوێنەکە قازی و حەکەمی تیا نەبوو، حەقێکی کوتوپڕییەو دواخستن هەڵناگرێ؛ کەواتە، پێویستە لەسەر هەرکام لە ژن و مێرد کە هاوڕێکەی عەیبدار ئەکا، موراجەعە بکا؛ هەروەها، لەپاش سابتبوونی عەیبەکەیش، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکە کوتوپڕییەو ئەگەر تەفرەی بدا، حەقی نامێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئیددیعای کرد کە نەیزانیوە حەقی پەشیمانبوونەوەی هەیە، یا نەیزانیوە کە حەقەکەی کوتوپڕییە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ، ئەگەر لەوانە بێ باوەڕی پێبکرێ؛ مەسەلا، کابرایەك بێ لەگەڵ زانایانی شەرعدا هەڵسان و دانیشتنی نەبێ.

هەرکاتێك نیکاح هەڵوەشێنرایەوە، بەهۆی عەیبێکەوە لە ئافرەتەکەدا، ئەگەر ئەو هەڵوەشاندنەوەیە پێش ئەوە بێ کابرا بچێتە لای ژنەکە، ئەوە ژنەکە حەقی داوای مارەیی نابێ وە ئەگەر پاش چوونەلای بێ، ئەوە ئەگەر هەڵوەشاندنەوەکە بەهۆی عەیبێکەوە بووبێ کە لەکاتی عەقدەکەدا بووبێ، خواه لەوەپێشیش بووبێ یا هەر لەوکاتەدا پەیدا بووبێ، یاخود لەپاش عەقدەکەو پێش چوونەلای ژنەکەدا پەیدا بووبێ، یاخود لەکاتی چوونەلای ژنەکەدا پەیدا بووبێ و کابرایش لە هەموو ئەم سوورەتانەدا بە عەیبەکەی نەزانیبێ، ئەوە ژنەکە «مَهرالمثل»ی ئەکەوێ وە ئەگەر بە عەیبەکەی زانیبێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا چووبێتە لای، ئەوە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نامێنێ، چونکە رازی بووە بەو عەیبەوە بچێتە لای ئافرەتەکە وە ئەگەر بەهۆی عەیبێکەوە نیکاحەکەی هەڵوەشاندبێتەوە کە پاش چوونەلای پەیدا بووبێ، ئەوە مادام مارەییەکە دروست بووبێ مارەی لەسەر ببڕن، ژنەکە ئەو مارەییەی ئەکەوێ.

**بێداری!** لە مەسەلەی شلەپەتکەیی‌دا، وتمان: ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کەوا چووەتە لای ژنەکەو ژنەکەیش ئینکاری کرد، ئەوە کابرا باوەڕی پێ‌ئەکرێ لەگەڵ ئەوەشدا کە مەشهوورە لە کاتێکا کە ژن و پیاو قسەیان یەك‌نەکەوێ لە مەسئەلەی چوونەلادا، باوەڕ بەوەیان ئەکرێ کە ئینکاری چوونەلا ئەکا؛ ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئەم حاڵەتە یەکێکە لەو حەوت حاڵەتە کە باوەڕیان بە قسەی ئەو کەسە تیا ئەکرێ کە ئیددیعای چوونەلا ئەکا.

یەکێك لەو حەوت حاڵەتە ئەوە بوو کە وتمان؛

حاڵەتی دووهەمیشیان، ئەوەتە کابرا لە مەسئەلەی «ایلاء»دا[1] ئیددیعا بکا کەوا چووەتەلای ژنەکەی؛

حاڵەتی سێهەمیشیان، ئەوەتە ژنەکە بڵێ: مێردەکەم نەهاتووەتەلام و ئەوەندەش دەسەڵاتی نییە کە مارەییەکەم بداتێ، لەبەر ئەوە داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەم ئەکەم وە کابرایش بڵێ: نەخەیر چوومەتەلای؛

---

١. ایلاء: ئەوەیە کابرا سوێند بخوا کەوا تا ماوەی زیاتر لە چوار مانگ ناچێتەلای ژنەکەی.

حاڵەتی چوارەم، ئەوەتە پیاوو ژنەکە قسەیان یەك نەکەوێ لەوەدا کە ئاخۆ بەرلە چوونەلای تەڵاقی داوە یا پاش چوونەلای؛ کابرا بڵێت: بەرلەوەی بێمەلات، تەڵاقم داوی‌و ژنەکە بڵێ: پاش‌ئەوەی کە هاتیتەلام، تەڵاقت دام؛ ئەمە، لەم حاڵەتەدا باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ کە سوێند بخوا کە کابرا بەرلەوەی تەڵاقی بدا چووەتەلای وە تەواوی مارەییەکەی ئەکەوێ، بەڵام بەو شەرتە باوەڕی پێ‌ئەکرێ کە ژنەکە منداڵێکی ببێ قابیل‌بێ بکرێ بە منداڵی ئەو کابرا بۆ ئەوەی بە بێ‌باوك دانەنرێ؛

حاڵەتی پێنجەم، ئەوەتە ژن و پیاوەکە قسەیان یەكنەکەوێ لەوەدا کە ئاخۆ لەپاش تەڵاقی «سُنّی» چووەتە لای یا نەچووەتەلای؛ مەسەلا، کابرا بە ژنەکەی وت: تەڵاقت کەوتبێ‌و تەڵاقدانەکەی لە جۆری تەڵاقدانی «سُنّی»[1] بێ و ئیددیعا بکا کە لە پاکی پێش تەڵاقدانەکەیا چووەتەلای و تەڵاقەکەی «سُنّی» نەبووەو ناکەوێ، ژنەکەیش بڵێ: نەهاتوویتە لام و تەڵاقەکەم «سُنّی»یەو کەوتووە؛ ئەمە، لەم حاڵەدا باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ، چونکە ئەسڵ تێكنەچوونی پەیوەندی بەینی ژن و پیاوە؛

حاڵەتی شەشەم، ئەوەتە کابرایەك ئافرەتێك مارە بکا بە شەرتی کچێتی‌و لەپاشا ئیددیعا بکا کە بێوەژن بووەو ژنەکەیش بڵێ: خۆی هاتووەتە لام؛ ئەوە، لەم حاڵەدا باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ لەسەر ئەوە کە کابرا چووەتەلای بۆ ئەوەی نیکاحەکە هەڵنەوەشێتەوە، باوەڕ بە سوێندی کابرایش ئەکرێ کەوا نەچووەتەلای بۆ ئەوەی هەموو مارەییەکەی لەسەر نەبێ بە ماڵ‌و تەنها نیوەی بدا؛

حاڵەتی حەوتەم، یەكنەکەوتنی قسەی ئافرەت و مێردی مارە بەجاش (مُحلّل)ە، واتە ئافرەتەکە بڵێ: هاتووەتەلام و مێردەکە بڵێ: نەچوومەتەلای؛ ئەمە، لەم حاڵەتەدا باوەڕ بە سوێندی ئافرەتەکە ئەکرێ.

---

١. تەڵاق، دوو جۆرە، «سُنّی» و «بِدْعی» و لەمەولا باسیان ئەکەین.

## باسی بەشەرتگرتنی هەندێ سیفەت لە عەقدا لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە (فَسْخ)ی نیکاح لە هەندێ حاڵەتیا

ئەگەر لەناو سیغەی عەقدی نیکاحدا شتێك بەشەرت گیرا، ئەوە ئەگەر ئەو شتە شەرت بوو بۆ دامەزرانی نیکاحەکە، وەکوو باوکێك کچی شوو نەکردووی خۆی بە بێ ئیزنی کچەکە مارە ببڕێ لە یەکێك بەو شەرتە کە ئەو یەکە هاوکوفی کچەکەی بێ، ئەوە ئەگەر شەرتەکە هاتەجێ، باشە، ئەگینا نیکاحەکە بەتاڵە وە ئەگەر شتەکە شەرت نەبوو بۆ دروستبوونی نیکاحەکە، ئەوە یا بەشەرتگرتنی سیفەتێکە لە مێردەکەدا، یا لە ژنەکەدا، یا لە مارەییەکەدا، یا لە غەیری ئەمانەدا؛ جا ئەگەر بەشەرتگرتنی سیفەتێك بوو لە مێردەکەدا، یا لە ژنەکەدا، وەکوو نەسەب یا زانایی یا پیاوچاکی و خواپەرستی، ئەوە ئەگەر شەرتەکە هاتەجێ، باشە، ئەگینا نیکاحەکە هەر دروستە؛ جا ئەگەر مێردەکە یا ژنەکە باشتر بوو لەوەی کە بەشەرت گیراوە، ئەوە حەقی پەشیمانی لەم نیکاحەدا نییە وە ئەگەر کەمتر بوو لەوەی بەشەرتگیراوە، دەس‌بەجێ حەقی پەشیمانبوونەوەی هەیەو پێویستیش بە قازی ناکاوەکوو لە «تُحفە»دا وتراوە؛ حوکمی مارەییشی وەکوو ئەوە وایە لە باسی «خِیارُالعَیب»دا باسمان کرد.

وە ئەگەر ژنەکە رازی بوو بەو پیاوە کە شەرتەکەی تیا نەهاتووەتە جێ و وەلی‌ئەمرەکانی رازی نەبوون، ئەوە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەیان هەیە، ئەگەر سیفەتە بەشەرتگیراوەکە هاوکوفی بێ لە نەسەبدا وە ئەگەر بەشەرتگرتنی سیفەتێك بوو لە مارەییەکەدا، وەکوو بەشەرتگرتنی حەقی پەشیمانبوونەوە لە مارەییەکەدا؛ مەسەلا، کابرا بڵێ: وا ئەو ژنەم لێ مارە کردی لەسەر چل دینار بەو شەرتە حەقی پەشیمانبوونەوەت بێ، ئەگەر رازی بووی بەو مارەییە ئەوە باشە، ئەگینا مارەییەکە هەڵوەشێتەوەو ژنەکە «مَهْرالمثل» وەربگرێ، ئەوە نیکاحەکە دروستە، بەڵام مارەییەکە ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل».

وە ئەگەر غەیری ئەمانە بەشەرتگیرا لە نیکاحەکەدا، ئەوە ئەگەر شەرتی پەشیمانبوونەوە بوو لە نیکاحەکەدا، ئەوە ئەو نیکاحە بەتاڵە؛ هەروەها، ئەگەر

شەرتێکی تری وا بەشەرت گیرابوو کە پێچەوانەی مەبەستی نیکاحەکە بوو، وە زیانیشی بەو مەبەستە ئەگەیاند، وەکوو بەشەرتگرتنی ئەوە کە کابرا نەچێتەلای ئافرەتەکە یا تەڵاقی بدا؛ غەیری ئەم شەرتانەیش ئەگەر پێچەوانەی مەبەستی نیکاحەکە بوو، بەڵام زیانی نەئەگەیاند بەو مەبەستە، وەکوو بەشەرتگرتنی ئەوەکە کابرا ژن بەسەرَ ئەو ژنەدا نەهێنێ یا مەسرەفی بۆ نەکا، ئەوە نیکاحەکە دروستەو شەرتەکە بێ کەڵکە؛ هەروەها، مارەییەکەیش بەهۆی ئەو شەرتەوە تێك ئەچێو ئەرواتە سەر «مَهرالمثل».

وە ئەگەر شەرتەکە شەرتێکی وا بوو لەگەڵ مەبەستی نیکاحەکە یەك ئەکەوت، وەکوو ئەوەکە شەوەکان بە عەداڵەت دابەش بکا لە بەینی ئەم ژنە و ژنی تریا، یاخود هیچ مەبەستێکی پێوە نەبەسرابوو، وەکوو ئەوە فلانەجۆر خواردنی دەرخوارد بدا، ئەوە ئەو شەرتە پووچەو نیکاحەکەش دامەزراوە.

**بێداری!** ئەگەر ژنەکە یا مێردەکە سیفەتەکەیان بەشەرت نەگرت لەناو عەقدەکەدا، بەڵکوو هەر بەهۆی بیستنەوە لە خەڵك یا بەهۆی بایی‌بوونەوە بە قسەی کەسێك قەناعەتیان کرد؛ مەسەلا، کابرایەك ژنێکی مارەکرد بە خەیاڵی ئەوە کە ئەو ژنە موسوڵمانە یا ئازادە، کەچی دەرچوو «کتابیّە»یەکی وایە کە نیکاحکردنی دروست بێ، یا دەرکەوت کە کەنیزەك (جاریە)یەو نیکاحیشی بۆ ئەم کابرایە دروست بوو، ئەوە حەقی پەشیمان‌بوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نییە.

هەروەها، ئەگەر ژنێك ئیزنی دا مارە ببڕێ بۆ پیاوێك کە وایئەزانێ هاوکوفیەتی، کەچی هاوکوفی نەبوو، ئەوە حەقی پەشیمان‌بوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نییە، چونکە چ ئەمیش و چ پیاوەکەیش لە میسالی پێشوودا کەمتەرخەمییان کردووە کە ورد نەبوونەتەوەو لەناو عەقدەکەشدا بەشەرتیان نەگرتووە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا بە بەندە یا بە عەیبدار دەرچوو و ژنەکەیش گومانی وابوو کە ئازادە، یاخود عەیبدار نییە، ئەوە ئەو ژنە حەقی پەشیمان‌بوونەوەی هەیەو ئەتوانێ نیکاحەکەی خۆی هەڵوەشێنێتەوە.

وە ئەگەر کەسێك کابرای هەڵخەڵەتاند بەوەکە ئەو ئافرەتە کچە، کەچی بێوەژن بوو و کابرایش مارەییەکەی دابوویە، ئەوە بۆی نییە مارەییەکە بژێرێ بەو کەسە کە

هەڵی خەڵەتاندووە، چونکە خۆی کەمتەرخەمی کردووە لەوەدا کەوا لە مەسئەلەکە نەکۆڵیوەتەوە تا باش لە ژنەکە ئاگادار بێ.

## هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی دەس نەڕۆیشتنی کابراوە بەسەر مارەییدا

دروستە بۆ ژن نیکاحی خۆی هەڵوەشێنێتەوە بەهۆی ئەوەوەکە مێردەکەی لات بێ و نەتوانێ مارەییەکەی بدا، بە سێ شەرت:

یەکەم: مارەییەکەی حازری بێ؛ کەواتە، هەڵوەشاندنەوەی نیکاح دروست نییە لەبەر بێ دەسەڵاتی کابرا بەسەر مارەییەکدا کە وەختی خۆی وادەی بۆ دانراوە، با ئێستەیش لەم کاتی لاتییەی کابرادا وادەکەی هاتبێ، چونکە ژنەکە وەختی خۆی رازی بووە بەوەکە ئەو مارەییە حازری نەبێ و لەئەستۆی کابرادا بێ.

دووهەم: ئەوەیە هیچی لەو مارەییە حازرییە وەرنەگرتبێ؛ ئەگەر هەندێکی لێ وەرگرتبوو، ئیتر ناتوانێ بەهۆی بێ دەسەڵاتی کابراوە کە ناتوانێ پاشماوەکەی بدا، نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە.

سێهەم: ئەوەیە ئەم هەڵوەشاندنەوەی نیکاحە لەبەر دەسەڵات نەشکانی مێردەکە بێ بەسەر مارەییەکەیدا پێش چوونەلای ژنەکە، ئەگینا مادام ژنەکە رێگای کابرای دا بچێتە لای و کابرایش چووەلای، ئەوە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی نامێنێ، لەبەر ئەوەکە ژنەکە رازی بووە خۆی بدا بەدەستەوە بەر لە وەرگرتنی مارەیی؛ بەڵێ، ئەگەر وەلی ئەمرێك کچێکی نابالغی مارە کرد لە کەسێك و بە بێ تەماشاکردنی مەسڵەحەتی کچەکە، دای بەدەستەوەو کابرایش چووە لای، ئەوە کاتێك کە بالغ بوو، ئەتوانێ خۆی نەدا بەدەستەوە، تا مارەییە حازرییەکەی ئەداتێ و ئەیشتوانێ نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە لەپاش سابتبوونی لاتی و بێ دەسەلاتی مێردەکەی لای قازی.

## باسی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی بێدەسەڵاتی مێردەوە لەسەر نەفەقەدانی ژنەکە

دروستە بۆ ژن فەسخی نیکاحی خۆی بکاتەوە بەهۆی ئەوەوە کە مێردەکەی دەسەڵاتی نەبێ ئەو ئەندازە نەفەقەی پێبداکە واجبە لەسەر پیاوی لات بۆ ژنی خۆی، خواه ئەو نەفەقەیە جل و بەرگ بێ یا نوێن بێ یا جێگای تیا دانیشتن بێ یا خواردەمەنی پێویست بێ بۆ ژیان؛ هەروەها، ئەگەر کابرا خۆی لەوێ بوو و ماڵەکەی دوو مەنزڵ ڕێگا یا زیاتر دوور بوو و ژنەکەیش خۆی ڕانەئەگرت تا ماڵەکەی کابرا ئەگەیشتە بەرەوەو کابرایش نەفەقەی بۆ ژنەکەی قەرز نەئەکرد، ژنەکە بۆی هەیە نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە، یا ئەگەر کابرا خۆیشی و ماڵەکەیشی ئەوەندەی دوو مەنزڵ ڕێگا یا زیاتر دوور بوون و مەجالی ئەوە نەبوو کە ژنەکە نەفەقەی خۆی لێ بسێنێ، یا ئەگەر کابرا بە لاتی ڕۆیشتبێ‌و ماڵی نەبووبێ‌و مەعلووم بێ کە ئێستەش لات و بێدەسەڵاتە.

هەروەها، ئەگەر کابرا بە دەوڵەمەندی ڕۆیشتبێ‌و ئێستە ڕێ و شوێنی نەزانرێ تا ئەو نەفەقەیە کە لەسەریەتی لێی وەربگیرێ، ژنەکە ئەتوانێ نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە، لەسەر فەرموودەی «ابنُ الصّلاح» و «زَرکَشی»[1]؛ هەروەها، دروستە بۆ ژن نیکاحی خۆی هەڵوەشێنێتەوە، ئەگەر کابرا بە لاتی ڕۆیشتبێ‌و ئێستا سەرو شوێنی دیار نەبێ‌و نەزانین ئاخۆ دەوڵەمەندە یا هەژارە، بەو شەرتە کە دوو شاهید شەهادەت بدەن لەسەر ئەوە کە ئێستاش لاتە، هەرچەند شەهادەتەکەشیان لەسەر ئەساسی ئەوەبێ کە شارەزای ڕەوشتینی و ئەزانن هەوڵ نادا بۆ ئیش و هەر بە لاتی ئەمێنێتەوە، بەڵام ئەبێ لەکاتی شەهادەتەکەیاندا، ئەوە نەڵێن کە لەسەر ئەو ئەساسە شەهادەت ئەدەن.

---

١. زاناکانی شەرع قسەیان یەك نییە لەم مەسئەلەیەداو «تُحفە» مەیلی بۆ ئەوەیە کە ژنەکە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی نییە، بەڵام «شیروانی» ئەڵێ: فەرموودەی باوەڕ پێکراو ئەوەیە کە حەقی هەڵوەشاندنەوەی هەیە.

شەرتی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی لاتی مێردەوە، ئەوەیە ژنەکە موستەحەقی نەفەقە بێو مەسەلەکەش ببرێ بۆ لای قازی وە ئەگەر قازی نەبوو، ببرێ بۆ لای حەکەمێکی دادپەروەر و لاتی کابرایش سابت ببێ بە پێ‌لێنانی خۆی، ئەگەر خۆی لەویا بێ، یا بە شەهادەتی دوو شاهید، ئەوکاتە واجبەکە قازی یا حەکەمەکە، موڵەتی بدا تا سێ ڕۆژ، جا ئەگەر هەر نەفەقەی دەس‌نەکەوت، ئەوجارە، لە سبەینێی ڕۆژی چوارەما ژنەکە ئەچێتەوە لای قازی تا نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر لە سبەینێی ڕۆژی چوارەما نەفەقەی بۆ ئەو ڕۆژە دەس‌کەوت، ژنەکە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی نامێنێ، چونکە نەفەقەی ڕۆژەکانی پێشوو بووە بە قەرز لە ئەستۆی کابرادا و بەهۆی نەفەقەی قەرزیشەوە حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح نییە وە ئەگەر دوو ڕۆژی بە بێ‌نەفەقە بردەسەرو ڕۆژی سێهەم نەفەقەی پێداو ڕۆژی چوارەم دیسان نەفەقەی نەبوو، ئەوە ئەم ڕۆژە ئەخرێتە سەر دوو ڕۆژە پێشووەکە و لە ڕۆژی دواییدا حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بۆ پەیدا ئەبێ وە ئەگەر ئەو وڵاتە نە قازی و نە حەکەمی تیا نەبوو، ئەوە ژنەکە ئەتوانێ خۆی نیکاحەکەی خۆی هەڵوەشێنێتەوەو بڵێ: «وا نیکاحی خۆمم لە فلانکەس هەڵوەشاندەوە».

**بزانن!** ژن حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی نییە ئەگەر کابرا بتوانێ نەفەقەی بداتێ، بەڵام نەیداتێ، خواه خۆی دەوڵەمەند بێ یا لات بێو بتوانێ بۆی وەربگرێ لە خەڵك یا مامناوەندی بێ، چونکە ژنەکە ئەتوانێ بەهۆی قازییەوە نەفەقەی خۆی وەربگرێ و نەبوونی قازی لە وڵاتێکا یا دەس‌نەڕۆیشتنی بەسەر مێردەکەدا، شتێکی نایابەو گوێی نادرێتێ؛ هەروەها، ژن حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی نییە بەهۆی نەفەقەی لەمەوپێشەوە کە مێردەکەی نەیدابێتێو بووبێ بە قەرز لە ئەستۆیدا؛ هەروەها، حەقی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی نییە ئەگەر مێردەکەی ئەوەندەی کابرایەکی لات نەفەقەی بداتێ، هەرچەند لەوەپێش دەوڵەمەندیا مامناوەندی بووبێ، لەبەر ئەوەکە مادام واجبی ئەمرۆی ئەستۆی ئەوەیە کە ئەیداتێ، ئەوە واجبی خۆی جێ‌بەجێ کردووە؛

هەروەها، ژن بۆی نییە نیکاحی خۆی هەڵوەشێنێتەوە ئەگەر مێردەکەی ڕۆیشتبێ

بەڵام دەوڵەمەند بێ، مادام بە شاهید ئیسپاتی ئەوە نەکرێ کە هەرچی داراییشی هەیە بۆ مەسافەی دوو مەنزڵ دووری خستووەتەوە.

**بزانن!** هەڵوەشاندنەوەی نیکاح جیایە لە تەڵاق لە چوار رووەوە؛ یەکەم: بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەوە ژمارەی تەڵاق کەم نابێتەوە، هەرچەند زیاتر لە جارێکیش نیکاحەکە هەڵوەشێنرێتەوە؛ دووەم: هەر هەڵوەشاندنەوەیەکی نیکاح کە بەرلەوە بێ پیاوەکە بچێتە لای ژنەکە، نابێ بەهۆی سابتبوونی مارەیی بەسەر مێردەکەوە، بەڵام تەڵاقی بەر لە چوونەلا، ئەگەر سەبەبەکەی لە مێردەکەوە بێ، ئەبێ بەهۆی سابتبوونی نیوەمارەیی بەسەر پیاوەکەوە بۆ ژنەکە؛ سێهەم: هەر هەڵوەشاندنەوەیەکی نیکاح کە لەپاش چوونەلای ژنەکە بێ بەهۆی عەیبێ کە لەپێش عەقدو چوونەلادا بێ، یا لەبەینیانا بێ، یا لەگەڵیا بێ، ئەبێ بەهۆی سابتبوونی «مَهرالمثل»، هەرچەند ئەگەر بەهۆی عەیبێکەوە بێ کە پاش چوونەلاکە پەیدا بووبێ، ئەبێ بەهۆی سابتبوونی ئەسڵی مارەییەکە بەڵام تەڵاقی پاش چوونەلای ئافرەتەکە، ئەبێ بەهۆی سابتبوونی مارەییەکە، ئەگەر مارەییەکە خۆی دروست بووبێ؛ چوارەم: هەر هەڵوەشاندنەوەیەکی نیکاح کە بەهۆی عەیبێکەوە بێ کە لە پێش عەقدەکە یا لەگەڵ عەقدەکەدا بووبێ، نابێ بەهۆی حەقی نەفەقەو ژنەکە نەفەقەی ناکەوێ هەرچەند دووگیانیش بێ تەنها حەقی جێگەی دانیشتن نەبێ. بەڵام لە تەڵاقدا حەقی جێگەی دانیشتن و نەفەقەی تریشی هەیە.

## باسی ژن‌هێنان بۆ باوك و باپیره

واجبە لەسەر ئەولادی هەرکەس، لە کوڕو لە کچ و لەسەر کوڕەزاو لەو خوارتر، پارێزگاریی شانی باوك و باپیرەی خۆیان بکەن، چ باپیرەی باوکی و چ باپیرەی دایکی، بەوە کە مارەیی ژنیان بدەنێ یاخود پێیان بڵێن: ژن بێنن و ئێمە مارەییەکەتان بۆ ئەدەین، یاخود ژنیان بۆ بهێنن بە ئیزنی خۆیان و مارەییەکەیان بدەنێ. ئەم واجببوونەیش چەند شەرتێکی هەیە:

یەکەم: ئەوەیە ئەولادەکە دەوڵەمەند بێ، بەو رەنگە ئەو مەسرەفەی ئەیکا بۆ مارەیی ژنەکە زیاد بێ لە پێویستی ژیانی خۆیو خێزانی لە شەوو رۆژێکا.

دووهەم: ئەوەیە ئەو باوکە یا ئەو باپیرە پێویستی بە ژن بێ بۆ دەفعی ئارەزووی نەفس یا بۆ خزمەتکردن و سەرپەرشتیکردنی کارو باری لەبەر نەخۆشی یا پیری و لێکەوتوویی، لەبەر ئەوە کە لایقی شانی نەبێ خۆی خزمەتی خۆی بکا؛ ئەمەیش، بە قسەی کابرا خۆیدا دەرئەکەوێ‌و پێویستێ بە سوێندخواردن نییە، ئەگەر موحتاجییەکەی شتێکی دیاری بێ، یەعنی شتێکی وای پێوە دیار نەبێ کە لەگەڵ داواکەی یەك نەکەوێ، هەروەها ئەگەر شتێکی‌وای پێوە دیار بوو کە لەگەڵ داواکەی یەك نەئەکەوت، بەڵام ئەیوت: ژنم بۆ خزمەتکردنی خۆم ئەوێ، ئەگینا ئەگەر ژنی بۆ خزمەتکردن نەئەویست و مەحرەمی هەبوو خزمەتی بکا، بەڵکوو بۆ دەفعی ئارەزووی نەفسی ئەویست و لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆش و لێکەوتوو بوو، ئەوە ئەبێ سوێند بخوا کە پێویستی بە ژنە بۆ دەفعی ئارەزوو، ئەوجا پێویستە لەسەر کوڕو کوڕەزا ژنی بۆ بێنن.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە ئەو باوکە یا ئەو باپیرەیە خۆی دەوڵەمەند نەبێ، واتە نە دارایی هەبێ و نە کاسبییەکی وا بزانێ کە لایقی پایەی بێ تا پارەی پێ پەیدا بکاو ژنی پێ بێنێ.

جا پاش ئەوە کە کوڕ ژنی هێنا بۆ باوکی یا بۆ باپیری، واجبە لەسەری مەسرەفی ئەو باوکە یا ئەو باپیرە و ژنەکەیشی بکا وە ئەگەر ژنەکەی مرد، یاخود نیکاحەکەی هەڵوەشایەوە بەهۆی عەیبێکەوە، یا بەهۆی پاشگەزبوونەوەی لە موسوڵمانەتی، یاخود مێردەکەی تەڵاقی‌دا لەبەر بیانوویەکی بەجێ، واجب ئەبێ لەسەر کوڕەکە یا کوڕەزاکە دیسانەوە ژنی بۆ بهێنێ؛ جا ئەگەر ئەولاد یەکێك بوو، ئەوە دیارە وە ئەگەر زۆر بوون و تەنها کوڕ بوون یا تەنها کچ بوون، ئەوە وەکوو یەك مەسرەف ئەکەن، هەروەها ئەگەر کوڕ و کچیش بوون، بەڵام هەندێ لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: ئەگەر کوڕ و کچ بوون، لەسەر قیاسی میرات وەرگرتن مەسرەف ئەکەن بۆ باوك و باپیرە.

## باسی مارەیی (صِداق)

مارەیی، بریتییە لە ماڵێك کە واجب ئەبێ لەسەر کەسێك بیدا بەهۆی عەقدی نیکاحی ئافرەتێکەوە یا بەهۆی بڕیاردانیەوە لەپاش عەقدەکە، یا بەهۆی چوونەلای

ژنەکەوە بەشوبهە، یا بەهۆی ئەوەوە کە بووبێ بەهۆی حەرامبوونی ئافرەتێك لە مێردەکەی.

سوننەتە ناوبردنی مارەیی لە عەقدی نیکاحدا و سوننەتە لە دە درەمیش کەمتر نەبێ و زیادەڕەویش لە ئەندازەکەیا نەکرێ وە ئەگەر هات و بەدزییەوە ئافرەتەکە لەسەر مارەییەکی کەم مارە بڕرا و پاشان بەئاشکرا لەسەر ئەندازەیەکی زۆر مارە بڕرا، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە ئەو مارەیەیان دائەمەزرێ کە لەپێشا کراوەو مارەیی ئەوەیان واجب ئەبێ کە لە پێشا کراوە وە ئەگەر عەقدی نیکاحی ئافرەتێك دووبارە کرایەوە بەهۆی حازربوونی کۆمەڵێك خزم و دۆستەوە، یا لەبەر ئیحتیات ـ مەسەلا ـ جاری یەکەم بە باشی تەقلیدی تیا نەکرابێ، یا شاهیدەکان جێگای بڕوا نەبووبن، یا گومانی ئەوە بکرێ کە ماوەیەکی زۆر کەوتووەتە بەینی «ایجاب» و «قَبول»ەوە، یاخود لەبەر ئەوەکە کابرا لە شکایە کە بە یەك تەڵاقە تەڵاقی خواردووە یا هیچ تەڵاقی نەخواردووە وە ئەگەر خواردوویەتی، کەوتووە یا نەکەوتووە، یاخود عەقدەکە لەسەر مەزهەبی ئیمامێك کراوەو بە بێ پەشیمانبوونەوە لە تەقلیدکردنی ئەو ئیمامە، تەقلیدی ئیمامێکی تریش ئەکەن و مارەی ئافرەتەکە ئەبڕنەوە نەوەك بە مەزهەبە پێشووەکە عەیبێك لە عەقدەکەدا بووبێ، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا مارەیی هەر ئەو مارەییەیە کە لە عەقدە پێشووەکەدا دانراوەو ئەم عەقدەی دوایی دووبارەکردنەوەی عەقدی پێشووە؛ ئەو قسەیش کە مەشهوورە ئەگەر لەپاش دووبارەکردنەوەی عەقد، مێردەکە ئیددیعای کرد کە: عەقدی دووهەم تازەکردنەوەی عەقدی یەکەم بووە، لێی وەرناگیری و عەقدەکە بە عەقدێکی سەربەخۆ دائەنرێ، ئەوە راستە، بەڵام بۆ ئەم شوێنە نییە کە شاهیدەکان ئاگایان لە تازەکردنەوەکە هەیە، بەڵکوو بۆ وەختێکە مەعلووم نەبێ ئاخۆ عەقدی دووهەم سەربەخۆ بووەو لەپاش جیابوونەوە بووە، یاخود تازە کردنەوەیەو کابرای مێرد ئیددیعای تازەکردنەوە بکاو ژنەکە بڵێ: وا نییە.

بەڵێ، لە چەند حاڵەتێکا واجبە ناوی مارەیی ببرێ:

یەکەم، لە حاڵەتێکا کە ئافرەتەکە نابالغ بێ؛

دووهەم، لە حاڵەتێکا کە باڵغ بووبێ بەڵام نەفام بێ؛
سێهەم، لە حاڵەتێکا کە ئافرەتەکە شێت بێ؛
چوارەم، لە حاڵەتێکا کە ئافرەتەکە باڵغ بووبێ و خاوەن روشد بێ و ئیزنی وەلی ئەمرەکەی دابێ کە مارەی ببڕێ و دانانی حەقەمارەیی عائید بە وەلی ئەمر نەکردبێ و ئەو وەلی ئەمرە خۆی یا وەکیلی مارەی ببڕێ؛ لەم چوار حاڵەتەدا، ئەگەر وەلی ئەمرەکەو ژنخوازەکە رێك کەوتن لەسەر زیاتر لە «مَهرالمثل» ئافرەتەکە مارە ببڕن، ئەوە واجبە لەسەر وەلی ئەمرەکە یا وەکیلەکە ناوی ئەو ئەندازە مارەییە ببا بۆ ئەوەی عەینی ئەو ئەندازەیە ببێ بە ماڵ لەسەر کابرا وە ئەگەر لەم وەختەدا ناوی مارەییەك نەبەن، ئەوە هەرچەند نیکاحەکە دروستە، بەڵام ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل» و ئەمە ئەبێ بە زەرەری ژنەکە، چونکە ئەو ئەندازەیەی بڕیاریان داوە لە «مَهرالمثل» زیاترە.

حاڵەتێکی تریش هەیە لەو حاڵەتەدا وەکوو واجبە ناوی مارەییەکە ببرێ، ئەگەر هات و ناوی نەبرا، نیکاحەکەیش دانامەزرێ؛ ئەوەش، ئەوەتە کە ئافرەتێك ئیزنی «وَلی غیر مجبِر» بدا مارەی ببڕێ بۆ کەسێك بەو شەرتە ئەو کەسە ئەندازەیەکی دیاری کراو مارەیی بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوە مادام ئیزندانەکە بەو شەرتەیە، ئەگەر وەلی ئەمرەکە ناوی مارەییەکەی نەبرد، یا شتێکی تری ناوبرد غەیری ئەوەی کە ئافرەتەکە وتوویەتی، یا ناوی کەمتری برد لەو ئەندازەیە کە ئافرەتەکە دیاریی کردووە، لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، ئەو نیکاحە بەتاڵە، چونکە ئەو نیکاحە وەستاوە لەسەر ئیزنی ژنەکەو ئیزنی ژنەکەیش بەسراوە بەو ئەندازەوەکە ئافرەتەکە ناوی بردووە وە ئەگەر ناوی ئەو ئەندازەیە نەبرا، ئیزندانەکە بە بێ کەڵك دەرئەچێ و نیکاحەکە دانامەزرێ.

**بزانن!** هەرچی دروست بێ ببێ بە قیمەت بۆ ماڵێك کە بفرۆشرێ، دروستە ببێ بە مارەیی بۆ ژن؛ ئەوەیش بریتییە لە شتێ کە پاك بێ و پارە بکاو کەڵکی شەرعی لێ وەربگیرێ و موڵکی کابرای ژنخواز بێ و قابیل بێ لەلایەنی ژنەکەوە وەربگیرێ.

ئەگەر عەقدەکە کرا لەسەر کۆمەڵێك تەپاڵە، یا لەسەر دوو سێ دەنکە گەنم، یا لەسەر دڕندەیەکی پاك، یا لەسەر ماڵێکی کابرای ژنخوازکە زۆردار داگیری کردبێ و ژنەکەش

نەتوانێ لێی بسێنێتەوە، یا لەسەر ماڵێك كە هی كابرای ژنخواز نەبێ، وەكوو عـادەتە ئاڵتوون ئەخوازنو مارەی ژنی لەسەر ئەبڕن بۆ فرۆفێڵ، یا باوكی كوڕ ژن مارە ئەكا بۆ كوڕەكەی لەسەر چەند سەر مەڕو بزن بە بێ‌ئەوە كە نەزریان بكا لە كوڕەكەی، ئەوە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا نیكاحەكە دروستە، بەڵام ئەڕواتە سەر «مَـهرالمـثل»و ئـەوەی ناویان بردووە بەهیچ دەرئەچێ.

مارەیی ژن، یا «عَین»ە، وەكوو مەڕێك، مانگایەك، خانوویەك، باخێك، دووكانێك، پارچە موڵكێك كە هەموو دیاری كرابن، یاخود قەرزە، یەعنی شتێكە وا لە ئـەستۆی كابراداو دیاری نەكراوە لە بەرچاودا، وەكوو شتێك كە وەسف كرابێ لە ئەستۆی كابرادا، یاخود پارەیەك كە قەرز بێ بەسەریەوە، خواه حازر بێ یا وەعدەی بۆ دانرابێ؛ ئەوەش بزانین ئەگەر لە مارەییەكدا كە «عَین» نەبێ ناوی وەعدە نەبرا، ئەوە بە حازر دائەنرێ، خواه وتبێتیان حازر بێ یا باسی هیچیان نەكردبێ.

جا ئەگەر مارەییەكە «عَین» بوو و ژنەكە وەریگرت، ئەوە باشە وە ئەگەر هەر لای كابرا مایەوەو لای ئەو فەوتا، ئەوە كابرا ئەبێ بە زامـنی بـە «ضِـمانُ‌العَـقد» نـەك بـە «ضِمانُ‌الیَد»؛ «ضِمانُ‌العَقد» بریتییە لەوە كە كابرا ببێ بە زامنی بەدەڵی شەرعی ئەو شتە كە عەقدەكەی لەسەر كراوە، خواه ئەو بـەدەڵە قـیمەتی ئـەوەندەی قـیمەتی عـەینی مارەییەكە بێ یا زیاتر بێ یا كەمتر بێ، وەكوو «مَهرالمثل» و «ثَمَنُ‌المثل» لە فرۆشتندا؛ «ضِمانالیَد»یش بریتییە لە زامن‌بوونی خودی ئەو شتە كە موعامەلەكەی پێ كراوە بە وێنەی ئەو شتە كە مارەكەی لەسەر بڕاوە، ئەگەر وێنەی هەبێ و بە قیمەتی، ئەگەر وێنەی نەبێ؛ لەسەر ئەم فەرموودەیە، ئەگەر عەینەكە نە وێنە نە قیمەتی نەئەدرا؛ مەسەلا، كابرا مەڕێك لە مەڕەكانی بكا بە مارەیی بۆ ژنێك، پاشان هەموو مەڕەكانی ئاو بیانبا، ئەوە بە ناچاری دێتەوە سەر «مَهرالمثل» و لێرەدا هەردوو جۆرە زامن‌بوونەكە ئەبنەوە بە یەك.

جا ئەگەر مارەییە عەینەكە لای كابرا فەوتا، بە بەڵایەكی ئاسمانی، یاخود كـابرا خۆی فەوتاندی، واجبە «مَهرالمثل» بدا بە ژنەكە وە ئەگەر كابرایەكی تر فەوتاندی، ئەوە بە ئارەزووی ژنەكەیە، ئەگەر رازی بوو بەو مارەییە فەوتاوە، ئەیبژێرێ بە كـابرا كـە

فەوتاندوویەتی وە یا وێنەی یا قیمەتەکەی لێ ئەسێنێ وە ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە «مَهرالمثل» ئەستێنێ لە مێردەکەی و مێردەکەشی ئەو مارەییە فەوتاوە ئەبژێرێ بە کابرا کە فەوتاندوویەتی وە ئەگەر ژنەکە خۆی مارەییەکەی فەوتاند، ئەوە حەقی خۆی وەرگرتووە.

وە ئەگەر کابرا دوو سەر مەڕی دیاریکراوی دا بە مارەییدا و لەپێش وەرگرتنیانا یەکێکیان فەوتا، ئەوە ژنەکە حەقی هەڵوەشاندنەوەی لە تەنها ئەو مەڕەدا نییە، بەڵکوو حەقی هەڵوەشاندنەوەی لە هەردووکیانا هەیە؛ جا ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە ئەوە «مَهرالمثل» لە مێردەکەی وەرئەگرێ وە ئەگەر رازی بوو پێی، ئەوە ئەو مەڕەیان کە ماوە وەریئەگرێ لەگەڵ بەشی مەڕە فەوتاوە کە لە «مَهرالمثل»ەکەی، واتە ئەگەر ئەو دوو مەڕە قیمەتیان وەکوو یەك بوو، نیوەی «مَهرالمثل» وە ئەگەر قیمەتی فەوتاوەکە دووقاتی قیمەتی ئەویان بوو، دوو سێیەکی «مَهرالمثل»ەکەی وەرئەگرێ و هەر بەمجۆرە.

وە ئەگەر عەینی مارەییەکە لەپێش وەرگرتنیا بە غەیری دەستی ژنەکە عەیبدار بوو، ئەوە بە ئارەزووی ژنەکە خۆیەتی، ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە «مَهرالمثل» وەرئەگرێ وە ئەگەر رێگای‌دا، پێویستە ئەو عەینە بەو عەیبەوە وەربگرێ‌و قەناعەتی پێ‌بکا؛ بەڵێ، ئەگەر عەیبداری دەستی خاریج بوو، ئەتوانێ تۆڵەی عەیبەکەی لەوکەسە خاریجییە وەربگرێ.

بینا لەسەر ئەمە کە مارەییەکە زەمانەت بکرێ بە «ضِمانالعقد»، هەر قازانجێکی ئەو عەینە لە دەستی کابرادا لەخۆیەوە بفەوتێ، یا کابرا بیفەوتێنێ، ئەوە ئەوکابرا نابێ بە زامنی، هەرچەند ژنەکە داوای عەینەکەی لێ کردبێ‌و کابرا نەیدابێ پێی.

بزانن! دروستە بۆ ژنی خاوەن روشد و فام بەرلەوەی مێردەکەی بچێتە لای مەنعی نەفسی خۆی بکا لە کابراو خۆی نەدا بەدەستەوە تا مارەییە عەینییەکەی یا مارەییە قەرزە وەعدە بۆ دانەنراوەکەی وەرئەگرێ، خواهئەو قەرزە پارەیەکی نەخت بێ، یاخود عەینێکی وەسفکراو بێ لە ئەستۆی کابرادا و خواه وەسفەکە تەواو بێ، یا ناتەواو بێ‌و

مارەییەکە چووبێتە سەر «مَهرالمثل» وە ئەگەر ئافرەتەکە خاوەن روشد نەبوو، وەلییەکەی ئەتوانێ نەیەڵێ خۆی بدا بەدەستەوە و لەم کاتەیشدا، هەر موستەحەقە بۆ نەفەقە، لەبەر ئەوەکە مادام بیانوویەکی شەرعی هەیە، نکوولییەکی ناشەرعی نەکردووە لە خۆ بەدەستەوەدانو بە خۆبەدەستەوەدەر دائەنرێ.

بەڵێ، ئافرەت ناتوانێ خۆی نەدا بەدەستەوە بۆ وەرگرتنی مارەییەك کە قەرز بێو وەعدەیەکی بۆ دانرابێ، هەرچەند وەعدەکەشی هاتبێ، چونکە وەختی خۆی رازی بووە بەوە کە مارەییەکەی لە ئەستۆی کابرادا بێ؛ هەروەها، ناتوانێ لەپاش ئەوەی مێردەکەی چووە لای، جارێکی تر خۆی نەدا بەدەستەوە، چونکە مادام یەکەمجار هێشتی کابرا بچێتە لای، مارەییەکەی دائەمەزرێو هەرکاتێ بیەوێ، ئەتوانێ لێی بستێنێ.

بەڵام ئەگەر باوکێك وەختی خۆی کچێکی بچووکی خۆی مارەکردبوو بۆ کابرایەك بە مارەییەکی حازرو مارەییەکەی وەرنەگرتبوو و کچەکەیشی دابوو بە دەستی مێردەکەیەوەو مێردەکە چووبووە لای، ئەوە ئەو کچە پاش باڵغبوونی ئەتوانێ نەهێڵێ کابرا بچێتە لای تا مارەییەکەی پێ ئەدا و گوێ نادرێتە ئەوەکە لە منالّیدا رێگای داوە بچێتە لای؛ هەروەها، گوێ نادرێتە ئەوەکابرا بەزۆر بڕواتە لای یا بەوەکە کچەکە نەفام بێو رێگای کابرا بدا بچێتە لای؛ لەم سوورەتانەدا، پاش ئەوەش کە رێگای مێردەکەی بدا بچێتە لای، ئەتوانێ لەوەپاش خۆی نەدا بەدەستەوە تا مارەیی حازر وەرئەگرێ، بەڵام لە سوورەتی ئافرەتی نەفامدا، ئەبێ خۆ بەدەستەوەنەدانەکە بە فەرمانی وەلی ئەمرەکەی نەبێ.

وە لەمکاتەداکە ژنەکە حەقی هەیە خۆی نەدا بەدەستەوەو داوای مارەییەکەی ئەکا، ئەگەر مێردەکەی وتی: مارەییەکەت نادەمێ تا خۆتم نەدەی بەدەستەوە و ژنەکەیش، وتی: خۆمت نادەم بەدەستەوە تا مارەییەکەم نەدەیتێ، ئەوە ئەبێ هەردووکیان ناچار بکرێن؛ ئەبێ کابرا ناچار بکرێ کە مارەییەکەی لای پیاوێکی دادپەروەر دابنێ و ئەبێ ژنەکەیش ناچار بکرێ کە خۆی بدا بەدەستەوە، جاکاتێ کە ژنەکە خۆی دا بەدەستەوە، کابرای دادپەروەر مارەییەکەی ئەداتە دەست.

وە ئەگەر پێش ئەوە کە کابرا مارەییەکە لای کابرای دادپەروەر دابنێ، ژنەکە پەلەی کردو خۆی دا بەدەستەوە، ئەوە هەر حەقی داواکردنی مارەییەکەی ئەمێنێ؛ جا ئەگەر کابرا مارەییەکەی نەدایە، ئەوە ئەگەر لەم ماوەیەدا کابرا چووبووە لای، ئەوە ئیتر ناتوانێ جارێکی تر خۆی نەدا بەدەستەوە وە ئەگەر نەچووبووە لای، ئەتوانێ خۆی نەدا بەدەستەوە تا مارەییەکەی وەرئەگرێ.

وە ئەگەر کابرا پەلەی کردو مارەییەکەی دا بە ژنەکە، واجبە ئەویش خۆی بدا بەدەستەوە وە ئەگەر خۆی نەدا بەدەستەوە، کابرا حەقی نییە مارەییەکە بستێنێتەوە لە ژنەکەی، لەبەر ئەوە حەقێکی حازرو دامەزراوە لەسەری؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە ژنەکەیش مەجبوور ئەکرێ کەوا خۆی بدا بەدەستەوە.

وە ئەگەر ژنەکە بەخۆی یا وەلی ئەمرەکەی داوای مۆڵەتی کرد لە مێردەکە بۆ ئەوەی خۆی پاك بکاتەوە یا بحەسێتەوە، پێویستە قازی سێ رۆژ یا کەمتر لە سێ رۆژ مۆڵەتی بدا؛ بەڵێ، ئەگەر مۆڵەتەکەی لەبەر حەیز یا بۆ قەڵەوبوون بوو، پێویست ناکا مۆڵەتی بدا، چونکە ئەمانە ماوەیەکی زۆر ئەبەن و لە توانادا هەیە کابرا بەو حاڵەشەوە لەزەتی لێ وەربگرێ، هەرچەند کە چوونەلای [لە کاتی حەیزدا] دروست نییە.

وە ئەگەر ژنەکە یا وەلی ئەمرەکەی داوای مۆڵەتیان کرد لە کابرا لەبەر ئەوە کە ژنەکە منداڵەو قابیلی ئەوە نییە بچێتەلای، یا لەبەر ئەوە کە نەخۆشە، واجبە مۆڵەتی بدا وە ئەگەر بەشوو دراوەکە ئەوەندە منداڵ بوو قابیل نەبوو پیاوەکە بچێتە لای، ئەوە حەرامە وەلی ئەمرەکەی بیدا بەدەستەوە تا وای لێدێ توانای چوونەلای ئەبێ بە شەهادەتی چوار ژن.

بزانن! ئەگەر مارەیی ئافرەتەکە قەرزی وەعدە بۆ دانراو بوو، ئەوە مەجالی ئەم هەرای بەینی پیاوو ژنە نییە کە تا ئێستا باسمان کرد، بەڵکوو ئەبێ لەپێشا ژنەکە خۆی بدا بەدەستەوە.

مارەیی ژن دائەمەزرێ لەسەر مێرد بەهۆی ئەوەوە کە کابرا بچێتە لای، هەرچەند چوونەلاکەیشی حەرام بێ، وەك ئەوە لەکاتی حەیزا بچێتە لای، یا لە پاشەوە بچێتەلای و ئەو چوونەلایەیش بە سەری زەکەری بێ یا بە ئەندازەی سەری زەکەری، ئەگەر

سەری زەكەری برِا بێ، بیكا بە پاش یا پێشی ئافرەتەكەدا هەرچەند ئەگەر بەپێشیشیا كرد كچێتی لانەبا، یاخود لەكاتی چوونەلاكەدا زەكەری هەڵنەسێ.

هەروەها، مارەیی دائەمەزرێ بەهۆی مردنی یەكێكیانەوە و واجب نابێ بەهۆی ئەوەوە كە پیاوەكە لەگەڵ ژنەكە بە تەنها دانیشێ لەشوێنێكا؛ هەروەها، واجب نابێ بە «اِستِمْتاع» یەعنی لەزەت وەرگرتن لە ژنەكە بەهۆی ئەوەوە كە ماچی بكا یا باوەشی پیا بكا؛ هەروەها، مارەیی واجب نابێ بە لابردنی كچێتی ئافرەتەكە بە پەنجە و لەم كاتەدا، ئەگەر تەڵاقی دا، ئەوا نیوەی مارەیی ئەكەوێتە سەر نەك تۆڵەی كچێتییەكە وە ئەگەر نیكاحەكەی هەڵوەشایەوە بەهۆی شتێكەوە، ئەوە هەر بژاردنەوەی كچێتییەكەی ئەكەوێتە سەر نەك نیوە مارەیی.

## باسی مارەییەك كە ناوبرابێ لە عەقدی نیكاحدا لە مارەیی دامەزراوو دانەمەزراو

بزانن! ئەو شتانە كە ئەبن بەهۆی دانەمەزرانی مارەیی و گەرِانەوە بۆ سەر «مَهرالمثل»، چەند شتن:

یەكەم، ئەوەیە ناو نەبرابێ؛

دووهەم، ئەوەیە ناوبرابێ بەڵام پیس بێ؛

سێهەم، ئەوەیە قەبووڵی موڵكییەت نەكا؛ چوارەم، ئەوەیە موڵكی كابرا نەبێ؛ پێنجەم، ئەوەیە سوودێكی شەرعی لێ وەرنەگیرێ؛

شەشەم، ئەوەیە توانای نەبێ كە بیدا بە دەستی ژنەكەوە؛

حەوتەم، ئەوەیە نامەعلووم بێ؛

هەشتەم، ئەوەیە ببەسرێ بە قەیدێكی واوە كە وەكوو نەناسراوی لێ بكا، وەكوو ماوەیەكی دیاری نەكراو، یا وەكوو شەرتێ لەپاڵ مارەییەكەدا؛

نۆهەم، ناوبردنیەتی بەجۆرێك كە پێچەوانەی شەرع بێ؛ ئیتر ئەم ئەسبابانە یەكە یەكە بن یا بەیەكەوە بن و هەموو مارەییەكە بگرنەوە یا هەندێكی بگرنەوە، ئەبن بەهۆی دانەمەزرانی مارەییەكە.

جا ئەگەر کەسێك ژنێکی مارە کرد لەسەر شتێ کە موڵکی نەبوو، خواه لە «اختِصاصات» بێ، وەکوو شەراب و تەپاڵە، یاخود ماڵی غەیری خۆی بێو داگیری کردبێ، ئەوە «مَهرالمثل» واجب ئەبێ وە ئەگەر مارەی بڕی لەسەر ماڵێکی موڵکی خۆیو زەوتکراو، ئەوە مارەییەکە لە ماڵە ٘زەوتکراوەکەدا بەتاڵەو لە موڵکەکەدا دروستە و لەم‌کاتەدا، ژنەکە بە ئارەزووی خۆیەتی، ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە «مَهرالمثل»ی ئەکەوێ وە ئەگەر رێگەی دا بەشە موڵکەکەی هەڵبگرێو بە ئەندازەی بەشە زەوتکراوەکەیش لە «مَهرالمثل» وەربگرێ بە پێی قیمەتی بازاڕی هەردووکیان، ئەگەر زەوتکراوەکە ئەوەندەی موڵکەکە بوو، نیوەی «مَهرالمثل» وەربگرێ وە ئەگەر نیوەی ئەو بوو، سێ‌یەکی «مَهرالمثل» وەربگرێ لەگەڵیاو بەم‌جۆرە.

ئەگەر باوکێ کە وەکیلی کچەکەی بوو لە فرۆشتنی ماڵیا، وتی بە کەسێك: وا ئەم کچەم لێ مارە کردیو ئەو جلەیشم پێ‌فرۆشتی بەو خانووە و کابرایش قەبووڵی کردن، ئەوە نیکاحەکە دروستە، هەروەها مارەییو فرۆشتنی جلەکەیش دائەمەزرێو خانووەکەش بەش ئەکرێ بەسەر قیمەتی جلەکەو «مَهرُالمِثل»ی کچەکەدا؛ مەسەلا، ئەگەر «مَهرالمثل» دە دینار بوو و جلەکەیش دوو دیناری ئەکرد، ئەوە خانووەکە ئەکرێ بە شەش بەشەوە، بەشێکی قیمەتی جلەکەیە و پێنج بەشی حەقی مارەییەکەیە وە ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا، جلەکە ماڵی وەلی‌ئەمرەکە بوو، ئەوە هەرچەند نیکاحەکە دروستە، بەڵام مارەیی ژنەکە دانامەزرێو ئەبێ بە «مَهرالمثل» و فرۆشتنی جلەکەیش دانامەزرێ وە ئەگەر ئەو بەشانەی خانووەکە، «مَهرالمثل»ی دەرنەئەهێنا، ئەوە مارەیی لەو خانووە دەرناکرێ، بەڵکوو «مَهرالمثل» واجب ئەبێ لەسەر کابراو خانووەکە هەر ماڵی خۆیەتی، تەنها ئەو بەشەی نەبێ کە ئەبێ بە قیمەتی جلەکڕاوەکە بە ئەندازەی خۆی.

وە ئەگەر مارەی بڕی لەسەر دە دیناری وەعدە بۆ دانراو بە وەعدەیەکی نەزانراو، ئەوە «مَهرالمثل» واجب ئەبێ وە ئەگەر مارەی بڕی لەسەر سەد دینار بەشەرتی ئەوەکە باوکی ژنەکە یاکەسێکی‌تر سەد دیناری بدرێتێ، ئەوە نیکاحەکە دروستە و مارەییەکە دانامەزرێ، بەڵکوو «مَهرالمثل» واجب ئەبێ.

وە ئەگەر کەسێك دوو ژنی مارە کرد بە یەك مارەیی، ئەوە مارەییەکە دانامەزرێو، هەرکام لە ژنەکان «مَهرالمثل»ی ئەکەوێ وە ئەگەر وەلی ئەمری ژنەکە تەسەڕوفێکی وای کردکە مەسڵەحەتی ژنەکەی تیا نەبوو، وەکوو ئەوە ژنێك مارە ببڕێ بۆ کوڕێکی حیجر لەسەر دانراوی خۆی بە زیاتر لە «مَهرالمثل»، یا کچێکی حیجرلەسەر دانراوی خۆی دا بە شوو بە کەمتر لە «مَهرالمثل»، یا کچێکی خاوەن روشدو فامی خۆی بە بێ ئیزن مارەبڕی لە کەسێك بە کەمتر لە «مَهرالمثل»و شەرتەکانی «ولی مجبِر»ی تیاهاتبووەجێ، ئەوە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا مارەییەکە دانامەزرێو «مَهرالمثل» واجب ئەبێ.

وە ئەگەر ئافرەتەکە وتی بە وەلیئەمرەکەی: مارەم بکەو ئیتر هیچی نەوت، ئەمیش مارەی کرد لەسەر کەمتر لە «مَهرالمثل»، ئەوە نیکاحەکە دێتەوە سەر «مَهرالمثل» وە ئەگەر پێی وت: مارەم ببڕە لەسەر هەزار درەم، ئەویش مارەی کرد لەسەر نۆسەد درەم، ئەوە مارەییەکەی دانامەزرێو ئەچێتەوە سەر «مَهرالمثل»؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو ژنە ئیعتیبار بە ئیزنی هەبوو، یەعنی وەلییەکەی، «ولی مجبِر» نەبوو و ئەو ئەندازە مارەییەی کردبوو بە شەرت و وەلیئەمرەکەی بەپێچەوانەی ئەو شەرتە مارەی بڕیبوو، ئەو نیکاحەکە بەتاڵە، وەکوو لەمەوپێش باسمان کرد.

بێدار بن! لەم مەسئەلەیەدا ئەگەر وەلیئەمرەکە مارەییەکی زیاتری دانا لەوەندەی کە ژنەکە دیاریی کردووە و ئەو زیادەیە ئەیگەیاندە ئەندازەی «مَهرالمثل» یا زیاتر، ئەوە ئەو عەقدە دائەمەزرێ بە عەینی ئەو مارەییە زیادەکە ناوی هێناوە.

## باسی پێسپاردن (تَفويض)

«تفويض» لە شەرعا دوو مەعنای هەیە؛

[مەعنای] یەکەم ئەوەیە ژنەکە ئەندازەی مارەییەکەی بداتە دەستی وەلیئەمرەکەی؛ مەسەلا، پێی بڵێ: مارەم ببڕە لەسەر هەرچەند خۆت ئارەزووت لێیەتی؛ لەم وەختەدا دروست نییە وەلیئەمرەکە ناوی مارەیی نەهێنێ لە عەقدەکەدا؛ بەڵێ، دروستە مارەی ببڕێ لەسەر «مَهرالمثل»و کەمتر لە «مَهرالمثل»، چونکە ژنەکە

دیاریکردنی ئەندازەی مارەییەکەی داوەتە دەستی ئەم وە ئەگەر ناوی مارەیی نەبرد، نیکاحەکە لەسەر «مَهرالمثل» دائەمەزرێ.

**مەعنای دووهەم**، ئەوەیە عەقدی نیکاحەکە ناوی مارەیی تیا نەبرێ لەسەر بڕیاری ژنەکە، بەوجۆرە کە لەمەولا باسی ئەکەین. جا ئەگەر ژنەکە ژنێکی خاوەن روشد و فامیوا بوو ئیزنی ئیعتیبار بکرێ لە نیکاحدا، خواهکچ بێ یا بێوەژن بێ، یاخود ژنێکی نەفامی حیجر لەسەر دانەنراو بێو بڵێ بە وەلیئەمرەکەی: مارەم بېڕە بە بێمارەیی، یا: مارەم ببڕە لەسەر بڕیاری ئەوە کە مارەییم نەبێ، یا: مارەم ببڕە بە بێمارەیی بۆ ئێستەش و بۆ لەمەولاش هەرچەند کابرایش بێتەلام، یا: مارەم ببڕە لەسەر ئەو بڕیارە کە مارەیی و نەفەقەم نەبێو سەد دیناریشی بدەمێ و وەلیئەمرەکەیش مارەی بڕیو ناوی مارەیی نەبرد، یا لەسەر بڕیاری ئەوەکە مارەیی نەبێ، یا مارەی بڕی بە کەمتر لە «مَهرالمثل»، یا بە غەیری نەختی ئەو وڵاتە، یا بە مارەیی وەعدە بۆ دانراو و بنەماڵەکەی لەوانە نەبوون عادەتیان غەیری نەختی وڵاتەکە بێ، یا عادەتیان مارەیی وەعدە بۆ دانراو بێ، یا مارەی بڕی لەسەر ئەو بریارە کە مارەیی و نەفەقەی نەبێ، یا لەسەر ئەوەکە مارەیی و نەفەقەی نەبێ و سەد دیناریش بدا بە کابرا، ئەوە لە هەموو ئەم ماددانەدا نیکاحەکە دروستە و بە ماددەی سپاردن و دانەدەستی مارەیی دائەنرێن؛ بەڵێ، نەبوونی نەفەقەو دانی سەد دینارەکە بە کابرا، قسەی بێسوودو پووچەو ژنەکە نەفەقەی ئەکەوێو سەد دیناری ناکەوێتەسەر بیدا بە کابرا.

بەڵێ، ئەگەر ژنەکە هەر ئەوەندەی وت بە وەلییەکە: «مارەم ببڕە» ئەمە ناکەوێتە بەر پێسپاردن و دانەدەست و مەعنای بەوە لێئەدرێتەوە کە ژنەکە ئیزنی مارەبڕینی داوە بەجۆرێ کە مەسڵەحەت بێ بۆ ئەو ژنە بە شەرع و عورف وە پێویستە لەسەر وەلیئەمرەکە ئەو ژنە مارە ببڕێ بە ئەندازەیەك کە کەمتر نەبێ لە «مَهرالمثل» و حازر بێو لە نەختی وڵاتەکە بێ؛ ئەگەر وای نەکرد، گوناهی ئەگا، بەڵام نیکاحەکە دروستەو مارەییەکەی ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل».

وە ئەگەر ئەو ژنەکە ئەو قسانەی وتووە بە وەلیئەمرەکەی خاوەن روشدو فام نەبێ، یەعنی منداڵ بێ، یا باڵغ بێ بەڵام قازی حیجری لەسەر دانابێ، ئەوەیش هەر

پێسپاردن و دانەدەستە، بەڵام بۆشە، وە دانامەزرێ‌و حوکمی پێسپاردنی دروست و دامەزراوی بەسەرا نایەت؛ بەڵێ، بەهۆی ئەو پێسپاردنەوە وەلی‌ئەمرەکە تەنها ئیزنی دەسگیر بووە بۆ مارەبڕینی ژنەکە؛ جا هەرکاتێ کە پێسپاردنەکە راست و دروست بوو و وەلی‌ئەمرەکە ژنەکەی مارە بڕی، ئەوە بە نەفسی ئەو عەقدە هیچ واجب نابێ لەسەر مێردەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا چووە لای ژنەکە، ئەوە «مَهرالمثل» واجب ئەبێ لەسەری بە ئیعتیباری وەختی عەقدەکە، لەبەر ئەوە کە پارچە (بِضْع)ی ژن حەقی خوایە و بە حەڵاڵکردنی خۆڕایی حەڵاڵ نابێ.

جا هەر لەبەر ئەوەکە «پارچە» حەقی خوایەو بە حەڵاڵ کردنی حەڵاڵ نابێ، دروستە بۆ ئەو ژنە کە «تفویض»ی کردووە، لەپێش ئەوەدا کە مێردەکـەی بـچێتـەلای، داوای فەرزکردنی مارەیی لێ‌بکا و ئەیشتوانێ مەنعی خۆی لێ‌بکاو نەیەڵێ بچێتـە لای تـا مارەییەکەی بۆ دائەنێ، هەروەها تا مارەییە دانراوەکەی ئەداتە دەستی؛ شەرتی ئەو ماڵە بە مارەیی دانراوەش ئەوەیە کە ژنەکە پێی رازی بێ، ئیتر پێویست ناکـا بـزانـێ «مَهرالمثل»ی خۆی چەندێکە بۆ ئەوەی بەراوردی بکا لەگەڵ ئەم ماڵەدا و مادام دانانی ئەو ماڵە لەسەر رەزامەندیی ژنەکە بوو، دروستە کابرا عەینێك دابنێ بۆ مـارەیی، یـا قەرزێکی حازر، یا وەعدەدار، خواه ئەوەندەی «مَهرالمثل» بێ یا کەمتر بێ یا زیاتر.

جا ئەگەر کابرا مارەیی بۆ دانەنا، یاخود دایناو ژنەکە رازی نەبوو پێی، واجبە قازی ئەندازەیەکی بۆ دانێ کە ئەوەندەی «مَهرالمثل» بێ‌و لە نەختی وڵاتەکە بێ و پێویستە قازی بزانێ «مَهرالمثل»ی ژنەکە چەندە؛ بەڵێ، ئەگەر بە بێ‌ئەوەی بزانێ «مَهرالمثل»ی ژنەکە چەندە؛ ئەندازەیەکی بۆ داناو ئەندازەکە بە رێکەوت ئەوەندەی «مَهرالمثل» بوو، ئەوە دروستە، لەبەر ئەوەکە لە عەقددا تەماشای ئەوە ئەکرێ مەسەلەکە لە خۆیدا چۆنە، بەڵام قازی گوناهبار ئەبێ لەوەدا کە نەکۆڵیوەتەوە بزانێ «مَهرالمثل»ی ژنەکە چەندە.

دروست نییە بێگانەیەك لە ماڵی خۆی شتێ دانێ بۆ مارەیی ژنەکە بـە بـێ‌ئـیزنی مێردەکەی، بەڵام بە رەزامەندیی ژن و مێردەکە دروستە.

ئەگەر کەسێك بڵێ: مادام بە عەقدێك کە بە سپاردنی دروست و دامەزراو کرابێ هیچ واجب نابێ، ئەی چۆن دروستە ژنەکە داوای مارەیی بۆ دانان بکا لە مێردەکەی و خۆی

نەدا بەدەستەوە تا ئەو مارەییەی بۆ دائەنیّ و تا ئەیدا بەدەستیەوە؟! ئێمەش لە وەڵامدا، ئەڵێین: ئەم داواکردن و مەنعی خۆ بەدەستەوەدانە لە ئەسڵی عەقدەکەوە نییە، بەڵکوو لەبەر بەجێهێنانی واجبی حەقی خوایە لە پارچە (بضع)ەکەیدا، یەعنی مادام ژنەکە ئەیەوێ پارچەی خۆی بدا بەدەستەوە، ئەو پاڕچەیەیش حەقی خوای تیایەو بە حەڵاڵ کردن حەڵال نابێ بۆ کەس، ئەتوانێ بۆ ئەوە کە بەرچاوی رووناك بێ و بزانێ ئاخۆ چی دەس ئەکەوێ بەرابەر بەو بەدەستەوەدانی پارچەیەی، ئەو داوایە بکاو خۆی نەدا بەدەستەوە، وەکوو باسمان کرد.

**بزانن!** لەپاش پێ سپاردنی راست و دروست، هەر مارەیی دانانێکی دامەزراو ئەبێ بەهۆی واجببوونی ئەوەی ناوی براوە و هەر مارەیی دانانێکی نادروست، ئەگەڕێتەوە بۆ سەر «مَهرالمثل»، بەڵام ئەگەر پێ سپاردنەکە دانامەزراو بێ، ئەوە ئەسڵی عەقدەکە ئەبێ بەهۆی واجببوونی «مَهرالمثل» لەسەر مێردەکە.

## باسی «مَهرالمثل»

«**مَهرُالمثل**» بۆ ژن، بریتییە لە ئەندازەیەك ماڵ کە خەڵك ئارەزوویان لێیە سەرفی بکەن بۆ ژنێکی وەك ئەو ژنە کە مارە بڕراوە. ئەو شتەیش کە زیاتر ئەندازەی «مَهرالمثل»ی پێ دیاری ئەکرێ، بن و بنەچەی ئافرەتە، چ لەناو عەرەب و چ لەناو غەیری عەرەبدا، چونکە زۆرتر وایە خەڵك ئارەزوویان لە ژنی خاوەن نەسەب و بنەچەیە. جا تەماشای نزیکترین ژنێ ئەکرێ کە نیسبەت بدرێ بۆ نزیکترین پیاوێ کە ئەم ژنە نیسبەت ئەدرێ بەو پیاوە؛ لەسەر ئەم ئەساسە، دیارە نزیکترین ژن، خوشکی باوکی و دایکییە، ئەمجار خوشکی باوکی، ئەمجار کچی برای باوکی و دایکی، ئەمجار کچی برای باوکی، ئەمجار پوور، واتە خوشکی باوك لە باوك و دایکەوە، ئەمجار لە باوکەوە... وە هەر بەم جۆرە.

ئەگەر ئەم ژنە کەس و کاری ئافرەتی وای نەبوو کە لە ئوسووڵی میراتبردنا پێیان ئەوترێ «عَصَبة»، یا هەیبوو بەڵام شوویان نەکردبوو، یا ئەندازەی مارەییان دیاری

نەبوو، ئەوە تەماشای ژنی «أَرْحام» ئەكرێ، یەعنی خزمی دایك لەلای دایكیەوە، یا لەلای باوكیەوە؛ كەواتە، ئەم ئەرحامی ئێرە لەلایەكەوە ماوەی فراوانترە لە ئەرحامی میرات، چونكە نەنكی میراتبەریبەر ئەكەوێ، وەكوو دایكی دایك و لەلایەكیترەوە ماوەی تەسكترە، چونكە كچی پوورو كچی خوشكی بەرناكەوێ و غەیری ئەم دوو جۆرەكە باسمان كرد، وەكوو كچی خوشك، ئەوە وەك ژنی بێگانەیەو لە پلەی سێهەما تەماشای ئەكرێ. میسالی ژنی ئەرحام، وەكوو دایك، جا خوشكی دایك، جا نەنك تا بڕوا.

لەگەڵ تەماشاكردنی بنو بنەچەدا بۆ «مَهرالمثل»، تەماشای تەمەن و دەوڵەمەندی و هەژاری و جوانی و عەقڵ و فامو زاناییو فەساحەتو شەرمو حەیاو هەر ئەخلاقێكیتری بەرزو نزمو كچێتیو بێوەژنیش ئەكرێ؛ كەواتە، ئەگەر ئەم ژنە جیابوو لە ژنانی هاونەسەبی خۆی بە یەكێك لەم سیفەتە بەرزانە، ئەوە مارەییەكەی بە زیاتر دائەنرێ وە ئەگەر پێچەوانەی ئەم سیفەتانەی تیابوو و سیفەتەكان خۆیان لە ژنانی هاونەسەبیا هەبوون، ئەوە مارەییەكەی بەكەمتر دائەنرێ؛ ئەم زیاد وكەمەیش وەستاوە لەسەر ئیجتیهادی قازی وە ئەگەر یەكێك لە ژنانی هاونەسەبی چاوپۆشی كردبوو و مارەیی خۆی بە كەمتر دانابوو، واجب نییە لەسەر ئەمیش چاوپۆشی بكا وە ئەگەر ئوسووڵی بنەماڵەكەی وابوو بۆ خزمی خۆیان چاوپۆشییان ئەكرد و بۆ بێگانە نەیانئەكرد، ئەوە لەمیشا لەسەر عەینی ئوسووڵ بەڕێوە ئەچین.

## باسی یەكنەكەوتنی قسەی ژن و مێرد لە مارەییدا

ئەگەر ژن و مێرد تێكچوون لە ئەندازەی مارەییدا و ئەو ئەندازەیە كە مێردەكە ئیددیعای ئەكرد كەمتر بوو لەوەی ژنەكە داوای ئەكرد، یا تێكچوون لە سیفەتی مارەییەكەدا، ئاخۆ ئاڵتوونە یا زیوە، پاكە یا غەشداره، حازرە یا قەرزە و هیچیان شاهیدیان نەبوو، یاخود شاهیدیان هەبوو، بەڵام بەرابەری یەك وەستان، ئەوە پێویستە هەردوولایان سوێند بخۆن بە سوێنێكیوا كە قسەی خۆیان بگرێتەوەو بەرپەرچی

قسەی ئەویان بداتەوە، وەکوو لە باسی فرۆشتندا باسمان کرد؛ بەڵێ، لێرەدا لەپێشا مێردەکە سوێند ئەخوا، هەرچەند لەجێی کڕیاردایەو حەقی وابوو لە دواوە بێ؛ هەروەهایە حوکمی ناکۆکییەکە، ئەگەر لە بەینی مێردەکەو باوکی ئافرەتێکی بچکۆلەی بەشوودراو، یا باوکی ژنێکی شێتا بێ، هەروەها، ئەگەر میراتبەری هەردوولایان بوو بە هەرایان، یا ئەگەر میراتبەری یەکێکیان لەگەڵ ئەویان خۆیدا بوو بە هەرای، بەڵام ئەو میراتبەرەکە سوێند لەسەر نەبوون ئەخوا، ئەبێ سوێند لەسەر نەزانین بخوا؛ مەسەلا، ئەڵێ: «وَاللّٰه»، مارەیی کچەکەم سەد دینارەو ئاگام لێ نییە پەنجا دینار بێ وە ژنەکە یا مێردەکە خۆی بۆ بوونو نەبوون سوێند بە قەتعی ئەخوا و ئەڵێ: «واللّٰه»، ئەوەندەیە؛ بەڵێ، کچێ کە بە منداڵی یا بە باڵغی مارەکرابێو ئیزنی لێوەرنەگیرابێ، ئەویش بۆ نەبوون سوێند لەسەر نەزانین ئەخوا؛ جا پاش سوێندخواردنی هەردوولایان، ئەمجار هەردوولایان یا لایەکیان یا قازی ئەو مارەییە هەڵئەوەشێنێتەوەو «مَهرالمثل» واجب ئەبێ.

**بزانن!** لە گەڕانەوەی مارەییەوە بۆ سەر «مَهرالمثل» لەپاش سوێندخواردن، ئەوە دەرئەکەوێ کە ئەگەر مێردەکە ئیددیعای ئەوەی کرد کە مارەییەکە کەمترە لە «مَهرالمثل»، ئەوە بە بێسوێندخواردنی هەردوولا، ئەگەڕێتەوە سەر «مَهرالمثل»، هەروەها ئەگەر ئەو ئەندازەیە کە پێی لێئەنێ زیاتر بێ لە «مَهرالمثل»و ژنەکەیش ئیددیعای زیاتر بکا، لەویایشدا بە بێسوێندخواردن قەناعەت ئەکرێ بەوە کە مێردەکە ئەیڵێ، چونکە زیاترە لە «مَهرالمثل» وە ئەگەر سوێند بخۆن، دێتەوە سەر «مَهرالمثل» کە کەمترە لەوەندە کە ژنەکە پێی لێناوەو ئەبێ بە زیانی ژنەکە؛ بەڵێ، هەندێ لە زانایانی شەرع فەرموویانە: ئەبێ سوێندخواردنی هەردوولا بێتە بەینەوە بە ئومێدی ئەوە کە مێردەکە سوێند نەخواو ژنەکە بیخواو ئەو ئەندازەمارەییە کە داوای ئەکا، زیاترە لەوەندە کە مێرد پێی لێ ناوە، ئیسپات ببێ.

وە ئەگەر ژنەکە ئیددیعای کرد کە ناوی ئەندازەیەك مارەیی براوەو کابرایش لە بنچینەوە ئینکاری ناوبردنی مارەیی کرد، لەویایشدا هەردووکیان سوێند ئەخۆن وە

ئەگەڕێنەوە بۆ سەر «مهرالمثل» وە ئەگەر ئیددیعای نیکاحو «مَهرالمثل»ی کرد، لەبەر ئەوە کە مارەییە ناوبراوەکە دروست نەبووەو دانەمەزراوە و مێردەکەیش پێی لێنا بۆ نیکاحەکەو ئینکاری مارەییەکەی کرد، یا هەر بێدەنگ بوو، ئەوە داوای بەیانکردنی ئەو ئەندازەیەی لێ ئەکرێ کە عەقدەکەی لەسەر کراوە؛ جا ئەگەر بەیانی ئەندازەیەکی کردو ژنەکەی داوای زیاتری کرد، دیسانەوە هەردووکیان سوێند ئەخۆن وە ئەگەر کابرا هەر بەردەوام بوو لەسەر ئینکارکردنەکەی و ناوی ئەندازەکەی نەبرد، ژنەکە سوێند بخوا لەسەر داواکەی خۆیو حوکمی پێ ئەکرێ بۆی.

ئەگەر ژنەکە وتی: لە فڵان ڕۆژا مارەت بڕیوم لەسەر چل دینار و لە فڵان ڕۆژیشا لەسەر سی دینارو هەردوو عەقدەکەیش سابتبوون، بە پێ‌لێنانی کابرا یا بە دوو شاهید، ئەوە واجبە ئەو کابرایە هەردوو مارەییەکە بدا بە ژنەکە وە ئەگەر کابرا وتی: نەچوومەتە لای لە هیچ عەقدێکیانا، یا لە یەکێکیانا، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند و نیوەی مارەیی ئەویانە لائەچێ وە ئەگەر وتی: عەقدی دووهەم تازەکردنەوەی عەقدی یەکەم بووە، ئەوە لێی قەبووڵ ناکرێ.

بزانن! پێ‌سپاردن، یا دامەزراو ئەبێ یا دانەمەزراو؛ ئەگەر دانەمەزراو بوو، هەر بە عەقدەکە خۆی «مَهرالمثل» واجب ئەبێ، هەتا وەکوو ئەگەر پاش ئەو پێ‌سپاردنە دانەمەزراوە کابرا مارەییەکی دروستی بۆ دابنێ، هەر کەڵکی نییەو ئەچینەوە سەر «مَهرالمثل»ەکە؛ کەواتە، ئەگەر ژن و مێردەکە جیابوونەوە لە یەك بە مردن یا بە تەڵاق لەپێش ئەوەداکە بچێتە لای، «مَهرالمثل» واجب ئەبێ لەسەر کابرا بۆ ژنەکە وە ئەگەر بە تەڵاق لەیەك جیابوونەوە لەپێش ئەوەداکە بچێتە لای، ئەوە نیوەی «مَهرالمثل» واجب ئەبێ.

وە ئەگەر پێ‌سپاردنەکە دامەزراو بوو، ئەوە جیابوونەوەیان لە یەك، یا لەپێش ئەوەدایە کە کابرا مارەیی بۆ دیاری بکا یا پاش ئەوەیە؛ ئەگەر لەپێش ئەوەدا بوو و بەهۆی مردنەوە بوو، ئەوە «مَهرالمثل» واجب ئەبێ لەسەر کابرا، چووبێتە لای یا نە، هەروەها ئەگەر بە تەڵاق جیابوونەوە لە یەك، لەپاش ئەوەداکە بچێتەلای وە ئەگەر

جیابوونەوە لە یەك بە تەڵاق لەپێش ئەوەدا کە بچێتەلای، ئەوە هیچی لەسەر واجب نابێ، هەروەها ئەگەر جیابوونەوەکەیان لەپاش دانانی مارەییەکی دانەمەزراو بێ.

وە ئەگەر جیابوونەوەکەیان لە یەك، لەپاش پێ‌سپاردنێکی دروست‌و مارەیی‌دانانێکی دامەزراو بوو، ئەوە ئەو مارەییە دامەزرێنراوە وەك ناوبراوێکی دامەزراو وایە، واتە ئەگەر بە مردن لەیەك جیابوونەوە «مُطلقاً»، یا بە تەڵاق، لەپاش ئەوە کە کابرا چوبووە لای ژنەکە، ئەوە عەینی ئەوەی کە دامەزرێنراوە واجب ئەبێ لەسەر کابرا وە ئەگەر بەهۆی تەڵاقەوە جیابوونەوە لە یەك بەرلەوەی بچێتە لای، ئەوە نیوەی واجب ئەبێ لەسەری.

## باسی مارەیی یا «مَهرالمثل» بەهۆی چوونەلاوە بەشوبهە، یا لە نیکاحی دانەمەزراودا

چوونەلای ئافرەت بە شوبهە، ئەبێ بەهۆی واجب‌بوونی «مَهرالمثل» چ بەهۆی شوبهەی «طریق» (رێگا)وە بێ، وەکوو نیکاحێك کە بە مەزهەبی یەکێك لە ئیمامەکان دروست بێ‌و بە مەزهەبی هی‌تریان دروست نەبێ؛ ئەمە، لای ئەو قازییە کە نیکاحەکە بە دامەزراو دائەنێ، ئەبێ بەهۆی واجب‌بوونی مارەیی ناوبراو و لای ئەو قازییە کە بە دانەمەزراوی دائەنێ، ئەبێ بەهۆی واجب‌بوونی «مَهرالمثل»، وەکوو نیکاحی بێ‌وەلی‌ئەمر کە بە "مەزهەبی شافیعی" بەتاڵەو بە "مەزهەبی حەنەفی" دروستە، یا نیکاحی بێ‌شاهید کە بە "مەزهەبی مالیکی" دروستەو بە مەزهەبەکانی‌تر بەتاڵە و نیکاحی بێ‌وەلی و بێ‌شاهید کە بە "مەزهەبی داوودی زاهیری" دروستە و بە مەزهەبەکانی‌تر بەتاڵە.

یاخود بەهۆی شوبهەی «فاعِل» (ئیشکەر)ەوە بێ، وەکوو ئەوە ژنێك لە «عِدّە»ی تەڵاقی ریجعیدا مارە بکرێ بۆ پیاوێك و خوێندەوارێکی نەزان پێیان بڵێ: ئەم نیکاحە دروستە، کەچی بە هەموو مەزهەبێك بەتاڵەو لای هیچ ئیمامێك قابیلی مارەکردن نییە، بەڵام مێردەکەی خۆی وا بزانێ دروستە چونکە ئەو خوێندەوارە نەزانە وای حاڵی

کردوون، یاخود کابرا بڕواتە لای ژنێکی بێگانە بەگومانی ئەوەکە ژنی خۆیەتی و بە ژنی خۆی بزانێ.

یاخود بەهۆی شوبهەی «محلّ» (شوێنە)وە بێ، وەکوو ئەوە پیاوێك بڕواتە لای جارییەیەکی وەهاکە شەریکی بێ لە بەینی ئەو پیاوەو کەسێکی ترا.

پیاو کە چووە لای ژن، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا کە باسمان کردن، ئەبێ بەهۆی واجببوونی «مَهرالمثل» بۆ ژنەکە لەسەر کابرا بە ئیعتیباری ئەو ڕۆژەکە چووەتە لای، یەعنی لەو سەردەمەدا مارەیی ژنێکی لە چەشنی ئەو ژنە چەند بێ ئەبێ ئەوەندە بدا بەو ژنە؛ جا ئەگەر کابرا چەند جارێك ئەو چوونەلای بە شوبهەیەی دووبارە کردەوە، ئەوە ئەگەر شوبهەیەکی وەکوو ئەوە بێ کە ژنێك ساڵێك بە نیکاحێکی دانەمەزراو لای مێردەکەی بێ، ئەوە لای ژووروویی «مَهرالمثل» واجب ئەبێ.[1] وە ئەگەر جۆری شوبهەکە زیاتر بوو لە یەك، وەك ئەوە جارێك بچێتە لای لە نیکاحێکی دانەمەزراوا و لەپاش جیابوونەوە، جارێکی تر بچێتە لای بەگومانی ئەوەکە بە ژنی خۆی بزانێ، یاخود جارێك شوبهەیەکی کردو لەپاش ئەو چوونەلای بە شوبهەیە، «مَهرالمثل»ەکەی دایەو دیسانەوە بە هەمانجۆری شوبهە چووە لای، ئەوە بە پێی دووبارەبوونەوەی شوبهەکان ئەبێ «مَهرالمثل»ی بداتێ؛ هەروەها، ئەگەر بە زۆر چەند جار زینا بکا لەگەڵ ژنێکا، ئەوە ئەوەندەی ژمارەی چوونەلاکەی ئەبێ «مَهرالمثل»ی بداتێ.

## باسی حوکمی جیابوونەوەی ژن لە پیاو

هەر جیابوونەوەیەك ڕوو بدا لە بەینی پیاوو ژندا پێش ئەوەی پیاوەکە بچێتە لای ژنەکەی، ئەوە ئەگەر جیابوونەوەکە لەلایەنی ژنەکەوە بوو، وەکوو هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی عەیبێکەوە لە پیاوەکەدا، یا بەهۆی لاتی کابراوە، یاخود ژنەکا جیا نەبێتەوە، بەڵام ببێ بەهۆی جیابوونەوەکە، وەکوو ئەوە کابرا نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە

---

١. واتە: ئەگەر چوونەلا زۆر بوو بە یەك شوبهە، لە کاموەختا قیمەتی مارەیی گرانترە، ئەو قیمەتە ئیعتیبار ئەکرێ.

بەهۆی عەیبی ژنەکەوە، ئەوە ژنەکە حەقی داوای مارەیی نامێنێ، چ ئەو مارەییەی کە لە نیکاحەکەدا ناوبراوەو چ «مَهرالمثل» و چ مارەیی دانراو وە هەر زیادەیەك لەو مارەییەدا پەیدا بووبێ لەبەینی عەقدەکەو جیابوونەوەکەدا، هی مێردەکەیە.

وە ئەگەر نە جیابوونەوەکە لەلایەنی ژنەکەوە بوو و نە بەهۆی ئەویشەوە بوو، وەك تەڵاقدان و خولعکردن و لیعان و پاشگەزبوونەوەی کابرا لە ئایینی ئیسلام، یاوەکوو ئەوە دایکی کابرا شیر بدا بە ژنەکە بە منداڵی، یا دایکی ژنەکە شیر بدا بە مێردەکە بە منداڵی، ئەوە مارەییە ناوبراوە دروستەکە ئەکا بە دووکەرتەوە، یەعنی نیوەی ئەگەڕێتەوە بۆ مێردەکەو نیوەی ئەمێنێتەوە بۆ ژنەکە، هەروەها مارەیی دانراوی دامەزراو و «مَهرالمثل»ێك کە بە عەقدەکە دامەزرابێ، وەکوو لە پێ‌سپاردنی دانەمەزراوا و لە هەر حاڵەتێکی تردا کە بەهۆی شتێکەوە عەقدی نیکاحەکە بگەڕێتەوە بۆ سەر «مَهرالمثل».

کەواتە، هەر زیادەیەك لە مارەییەکەدا، خواه پێیەوە نووسابێ یا جیا بێ لێی و لەپێش جیابوونەوە پەیدا بووبێ، ئەوە هی ژنەکەیە و هەرچی لەپاش جیابوونەوە پەیدا بووبێ، نیوەی بۆ مێردەکەو نیوەی بۆ ژنەکەیە و هەر ناتەواوییەك کە لەپاش جیابوونەوە لێی پەیدا بووبێ، ئەگەر لە دەستی ژنەکەدا بووبێو کابرا داوای عەینەکەی کردبێو ژنەکە نەیدابێتەوە، نیوەی ئەو ناتەواوییە ئەبژێررێ بە ژنەکە، هەروەها ئەگەر لە دەستی کابرادا بووبێو ناتەواوییەکە بە دەستی ژنەکە پەیدا بووبێ وە ئەگەر بەهۆی بێگانەیەکەوە پەیدا بووبێ، بەو بێگانەیە ئەبژێررێ وە ئەگەر بەدەستی کابرا خۆی پەیدابووبێ، ئەوە بەشی ژنەکە ئەبژێرێو بەشەکەی خۆی لە ئەستۆی خۆیایەتی.

وە ئەگەر مارەییەکە فەوتابوو، ئەوە نیوەی بریتییەکەی پێ‌ئەبژێررێ بە هاوچەشنی خۆی یا بە قیمەتەکەی وە ئەگەر عەیبدار بووبێ لای ژنەکە، ئەوە نیوەی عەیبەکەی ئەگەڕێتەوە سەر ژنەکەو نیوەیشی بۆ کابرایە، ئەگەر قەناعەت بکا پێی بەو عەیبەوە، ئەگینا قیمەتی نیوەی ماڵەکەی ئەکەوێ لەسەر حیسابی دواڕۆژی بێ‌عەیبی وە ئەگەر لە دەستی کابرادا عەیبدار بووبوو، ئەوە نیوەی بەو عەیبەوە عائیدی کابرایەو نیوەیشی عائیدی ژنەکەیە، ئەگەر رازی بێ پێی وە ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە

نیوەی بریتییەکەی وەربگرێ لە کابراکە وە ئەگەر بە دەستی بێگانەیەك عەیبدار بووبێ و ژنەکە تۆڵەی عەیبەکەی وەرگرت، ئەوە نیوەی عەینەکە بەو نیوەی تۆڵەکەوە ئەگەڕێتەوە بۆ کابرا.

وە ئەگەر بەهۆی هەندێ زیادەوە کە «مُتّصِل» بوو بە مارەییەکەوە، ژنەکە دڵی نەدەهات نیوەی عەینەکەی پێبداتەوە، ئەوە واجبە قیمەتی نیوەی عەینەکەی بە بێ زیادە بۆ حیساب بکاو بیداتێ وە ئەگەر عەینەکە زیادیشی کردبوو وکەمیشی بەسەرا هاتبوو، وەکوو دارخورماریەك کە زۆر درێژ بووبێ ـکە زیادەکەی بریتییە لە لقەکانی و کەمییەکەی ئەوەیە بەری کەم ئەبێ ـ ئەوە لەمکاتەدا ئەگەر رێکەوتن لەسەر نیوەی عەینەکە، ئەوە باشە، ئەگینا واجبە قیمەتی نیوەی دارەکەی بدرێتێ بە بێ تەماشاکردنی زیادو کەمکردن؛ مەسەلا، زەراعەتکردنی زەوی کەمکردنەو کێڵانی زیادەیە، ئاوسبوونی حەیوان کەمکردنە، چونکە پێی لەڕ ئەبێ و زیادکردنیشە، لەبەر سکەکەی.

ئەگەر مارەیی ژنەکە باخێك بوو و لەکاتێکا کە تەڵاقیدا ئەو باخە میوەی دەرکەوتبوو، واجب نییە لەسەر ژنەکە ئەو میوەیە ببڕێ لە دارەکان وە ئەگەر میوەکەی بڕی، نیوەی عەینی دارەکان هی کابرایە وە ئەگەر کابرا رازیبوو بەوە کە میوەکان بە دارەکانەوە بن تا کاتی بڕینیان، واجبە ژنەکە رازی بێ بەمە، چونکە قازانجی خۆیەتی وە ئەگەر ژنەکە ئارەزووی بوو ئەوەکابرا ناچار ناکرێ، بەڵکوو ئەتوانێ داوای قیمەتی نیوەی دارەکان بکا.

بزانن! هەرکاتێك حەقی «خِیار» لە مارەییدا هەبوو بۆ ژن و مێردەکە هەردووکیان یا بۆ یەکێکیان، ئەوە نیوە مارەییەکە نابێ بە موڵك تا خاوەن «خِیار»ەکە هەڵینەگرێ و هەرکاتێك ئیعتیباری قیمەت بکرێ، ئەوە ئیعتیبار بەو قیمەتەیە کە لای خوارووی قیمەتەکەیە لە رۆژی عەقدەکەوە تا ئەو رۆژە ژنەکە عەقدەکەی وەرگرتووە، لەبەر ئەوە ئەگەر لە رۆژی عەقدەکەدا کەم بوو، ئەو زیادەی پاش ئەو رۆژە، موڵکی ژنەکەیە وە ئەگەر لە رۆژی وەرگرتنیدا لەلایەن ژنەکەوە کەم بووە، ئەوە هەر قیمەتێ کە لەوەبەر بووە، لە زەمانەتی کابرادا بووەو ژنەکە نابێ بە زامنی.

وە ئەگەر لەو کاتەداکە تەڵاقی دا عەینی مارەییەکە لە موڵکی ژنەکەدا نەمابوو، ئەوە کابرا نیوەی بریتییەکەی وەرئەگرێ؛ بەڵێ، ئەگەر زوو لەلای نەمابوو و ئێستەکەوتبووە لای، ئەوە نیوەی عەینەکەی ئەباتەوە وە ئەگەر ژنەکە هەموو عەینی مارەییەکەی بەخشی بە کابرا و پاش ئەوە کابرا تەڵاقی‌دا، ئەوە نیوەی بریتییە عەینەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر نیوەی پێ‌بەخشیبوو، ئەوە نیوەی ئەوەی ماوەتەوە لای لەگەڵ چواریەکی بریتییەکەی، هەمووی ئەکەوێتەوە.

وە ئەگەر مارەییەکە لە ئەستۆی کابرادا بوو و ژنەکە ئازادی کرد، ئەوە کابرا تازە ناتوانێ نیوەی مارەییەکەی لە ژنەکە بسێنێتەوە، چونکە هیچی لەو وەرنەگرتووە.

بێداربن! وەلی‌ئەمری ئافرەت، خواه ئافرەتەکە خاوەن روشد بێ یا بێ‌ڕوشد بێ، حەقی نییە مێردەکە عەفو بکا لەو مارەییەی کە وابەسەریەوە؛ بەڵێ، هەندێ لە زانایانی شەرع فەرموویانە: ئەگەر کابرا رەوشتی لەگەڵ ژنەکەدا زۆر خراپ بوو، وەلی‌ئەمری ژنەکە ئەتوانێ دەس‌بەرداری مارەیی کچەکە ببێ بۆی بۆ ئەوە تەڵاقی بداو رزگاری بکا، ئەگەر ژنەکە خۆی بێ‌ڕوشد بێ. ئەگەر بڕیار وابوو کابرا قورئانی پیرۆزی یا زانستێکی فێر بکا لەجیاتی مارەییەکەی و بەر لەوەی فێری بکا تەڵاقی‌دا، ئەوە ئیتر ناتوانێ نیوەکەی‌تری لەوەپاش فێربکا؛ جا ئەگەر چووبووە لای، واجبە لەسەری هەموو «مَهرالمثل» بدا بەو ژنە وە ئەگەر نەچووبووە لای، واجبە نیوەی «مَهرالمثل»ی پێ‌بدا.

## باسی حەقی «مُتْعَە»

«مُتْعە» بریتییە لە ماڵێك کە پیاوەکە ئەیدا بە ژنەکە لەپاش جیابوونەوەیان لە یەك؛ ئەم حەقە، هەیە بۆ هەر ژنێك کە مێردەکەی چووبێتە لای‌و پاشان بە غەیری مردن لێی جیابووبێتەوە و خۆیشی سەبەبی ئەو جیابوونەوەیە بووبێ، ئیتر بەهۆی پاشگەزبوونەوەیەوە لە ئایینی ئیسلام لێی جیا بووبێتەوە، یا بەهۆی «لِعان»ەوە، یا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەوە، یا بەهۆی تەڵاقەوە، خواه تەڵاقەکەی «بائِن» بێ یا «رِجعی» بێ و «عِدّە»ی تەڵاقەکە بەسەر چووبێ یا نە؛ هەروەها، ئەم حەقە هەیە بۆ ئافرەتێکیش کە مێردەکەی

نەچووبێتە لای، بەو شەرتانەی کە باسمان کردن‌و بەو شەرتەیش کە نیوە مارەیی نەبێ، وەکوو ژنێ کە مارەییەکەی سپاردبێ بە مێردەکەی‌و تەڵاق بدرێ لەپێش ئەوەدا مێردەکەی بچێتە لای‌و بەرلەوەش کە مارەیی بۆ دیاری بکا. ئەم ئەندازەی حەقی موتعەیە، قازی خۆی دیاریی ئەکا بەپێی دەوڵەمەندی و فەقیریی کابرا.

حەقی موتعە، نییە بۆ ژنێك کە بە مردن جیا ببێتەوە لە مێردەکەی، یا بەهۆیەکی ترەوە، بەڵام خۆی هۆی جیابوونەوەکەی بێ، وەکوو ئەوە کە نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە بەهۆی عەیبێکی مێردەکەیەوە، خواه مێردەکەی چووبێتە لای یا نە چووبێتە لای؛ هەروەها، حەقی موتعە نییە بۆ ئافرەتێ کە مێردەکەی نەچووبێتە لای‌و نیوە مارەیی ببێ، وەك ئەوەی کە مارەییەکەی خۆی سپاردبێ بە مێردەکەی‌و ئەویش تەڵاقی دابێ، یا نیکاحەکەی بەهۆی عەیبێکەوە هەڵوەشاندبێتەوە.

## باسی دابەش‌کردنی وەختی مێرد بەسەر ژنەکانیا (قَسْم)

«قَسْم» بریتییە لەوە پیاو بە عەداڵەت رەفتار بکا لەگەڵ ژنانی خۆیا لەکاتی حەسانەوەدا؛ ئەم رەفتاری بەعەداڵەتە حەقی ئەو ژنانەیە کە مارەکراوی کابرا بن و بۆ کەنیزەکێك نییە کە موڵکی خۆی بێ. هەر مێردێك شەو مایەوە لای هەندێ لە ژنەکانی، واجبە ئەوەندە لای ئەوانی تریشیان بمێنێتەوە وە ئەگەر کابرا گوێی نەدا بە هیچیان، ئەوە گوناهبار نابێ، بەڵام سوننەتە ماتڵیان نەکا لە چوونەلا، بەجۆرێ کە ناموسیان بپارێزێ، بەڵکوو ئەگەر ترسی ئەوەی بوو کە ژنەکانی لەبەر ئارەزووی نەفس تووشی گوناه‌بین، حەرامە ماتڵیان بکاو واجبە یا بچێتە لایان یا تەڵاقیان بدا.

دابەش‌کردنی وەخت بە هاوسانی، واجبە ژنی نەخۆش و خاوەن‌حەیزو زەیسان‌و ئەو ژنەش بگرێتەوە کە ئێسکێك یا پارچەگۆشتێك بەری عەورەتی گرتبێتەوە، چونکە مەبەس لەم شەو لەلا نووستنە تەنها چوونەلا نییە، بەڵکوو لەبەر ئولفەت و رابواردنەو بۆ لەزەت لەیەك وەرگرتنە بە هەر جۆرێك کە خوا حەڵاڵی کردبێ.

بەڵێ، ئافرەتێك کە لە فەرمانی مێردەکەی یاخی بووبێ، حەقی شەو چوونەلای نییە.

جا ئەگەر مێردەکەیان شوێنێکی تایبەتی هەبوو، دروستە هەرکامیان لە نۆبەی خۆیدا بانگ بکا بۆ لای خۆی و باشتر ئەوەیە کە ئەم بگەڕێ بەسەریانا و حەرامە هەندێکیان بانگ بکا بۆ لای خۆی‌و بڕوا بۆ لای هەندێکی‌تریان، مەگەر لەبەر عوزرێکی شەرعی، وەکوو ترسی ئەوە کە ژنەکە لە ڕێگەدا تووشی ئاشووبێك ببێ؛ هەروەها، حەرامە لە ماڵی یەکێکیانا دانیشێ‌و ئەوانی‌تریان بانگ بکا بۆ ئەوێ، یاخود دوو هەوێ لە ماڵێکا گردبکاتەوە، مەگەر هەموو پێویستییەکی ماڵ‌و ڕێگای هاتوچۆیان جیابێ لە یەك، یاخود ژنەکان بە ئارەزووی خۆیان مەیلیان ببێ کە بەیەکەوە بن.

دروستە تەرتیبی دابەش‌کردنی وەخت بدا لەبەینی ژنەکانیا لەسەر شەوێك لەگەڵ ڕۆژی پێشوویدا یا ڕۆژی پاشەوەی. ئەسڵ لە دابەش‌کردنی وەختدا بەسەر ژناندا، شەوە، چونکە شەو کاتی حەسانەوەیەو ڕۆژ بەدوای شەوەوەیەو بە لقی ئەو دائەنرێ، مەگەر بۆ کەسێك کە کاسبییەکەی بە شەو بێ، وەك ئێشکچی شەو؛ ئەمانە، ئەبێ ڕۆژ دابەش بکەن بەسەر ژنیاناو شەویان تابیعی ڕۆژیانە. حەرامە پیاو لە سەرەی ئەسڵی ژنێکا بڕواتە لای ژنێکی‌تریان، مەگەر لەبەر ناعیلاجی، وەك ئەوە کە ژنە خاوەن سەرەکە نەخۆشییەکی خراپی پێوە بێ یا لەبەر هۆیەکی‌تر.

جا ئەگەر زۆر مایەوە لای ئەم ژنە، وەك تا سێ‌یەکی شەو، پێویستە قەزای ئەو شەوە بکاتەوە بۆ ژنەکەی‌تری؛ بەڵام بۆی هەیە لە ڕۆژا بڕوا بۆلای ژنێکیان کە سەرەی خۆی نەبێ بۆ دانانی کەل‌و پەلی ناوماڵ یا هێنانە دەرەوەی یا بۆ بەخێرهاتنی میوان و چاك وایە درێژە نەدا بە مانەوەی لای ئەم ژنە کە سەرەی نییە؛ فەرموودەی ڕاست وایە ئەم ڕۆیشتنەی ئەگەر لەبەر پێویستییەك بێ، پێویست ناکا قەزای بکاتەوە بۆ ژنەکانی‌تری و بۆیشی دروستە لە غەیری چوونەلا هەر جۆرە لەزەتێکی‌تر وەربگرێ لەو ژنەی کە بە ڕۆژ ئەچێتە لای وە ئەگەر بە بێ‌پێویستییەك چووە لای ژنێکیان، واجبە قەزای بکاتەوە بۆ ئەوانی‌تریشیان.

واجب نییە هاوسانی بکا لە بەینی ژنەکانیا لە مانەوەی ڕۆژدا لایان، ئەگەر بە عەمدی‌و تایبەتی جیاوازی نەخا لە بەینیانا، ئەگینا حەرامە و قەزاگێڕانەوەی ئەو

زیادەیە واجبە بۆ ژنەکانی تری، وەکوو «امامُ الحَرَمَیْن» فەرموویەتی؛ بەڵام واجبە هاوسانی‌کردن لە مانەوەی شەودا لایان، هەتاوەکوو ئەگەر بەتەنها لە نۆبەی یەکێکیانا بڕوا بۆ نوێژی جەماعەت، ئەوە حەرامە، بەڵکوو یا ئەبێ لە نۆبەی هەموویانا بڕوا یا لە نۆبەی کەسیانا نەڕوا، مەگەر بە ئیزنی ژنەخاوەن نۆبەکە.

لای کەمی وەخت دابەش‌کردن لەبەینی ژنانا، شەوێکە و لای سەرووی سێ شەوە و زیاتر لە سێ شەو حەرامە، هەرچەند ژنەکان یەکێ لە وڵاتێکدا بن، مەگەر بە ڕەزامەندیی هەموویان. باشترینی ماوەی نۆبە یەك شەوە وە ئەگەر لە یەككاتا چەند ژنێکی کەوتنەیەك، واجبە لەسەری دەویان لەبەینا بکا (قورعە رابکێشێ) بۆ دامەزراندنی ریزی نۆبە لێ گرتنیان؛ جا دەوەکە بە ناوی هەرکەسەوە دەرچوو، لەپێشا ئەڕواتە لای ئەویانە، ئەمجار ئەگەر دوو ژنی تری یا زیاتری مابوو، دەویش لە بەینی ئەوانا ئەکا تا یەکێکیان ئەمێنێتەوە، ئیتر ئەم تەرتیبە بکا بە سەرمەشق و لەسەری بڕوا.

ئەگەر کچێکی تازەی هێنا، حەقی هەیە حەوت شەو لای بمێنێتەوە وە ئەگەر بێوەژنێکی هێنا، حەقی سێ شەوی هەیە و بۆی هەیە ئەو بێوەژنە خاترخۆ بکا لەبەینی سێ شەودا بە بێ‌قەزاکردنەوە یا حەوت شەو لەگەڵ قەزاکردنەوەیدا بۆ ژنەکانی تری. جا ئەگەر داوای زیادەی نەکرد، یاخود زیادەکەی لە سێ شەو زیاتر نەبوو، یاخود کابرا بە ئارەزووی خۆی چوار شەوی زیادکرد، ئەوە تەنها قەزای ئەو چەند شەوەی لەسەرە کە زیادە لەسەر حەقی شەرعی ژنە تازەکە وە ئەگەر ژنەکە خۆی داوای چوار شەو زیادەی کرد، ئەوە واجبە هەموو حەوت شەوەکە قەزا بکاتەوە بۆ یەکە یەکەی ژنەکانی تری.

ئەم بە قەزاگێڕانەوەیەش، بەوجۆرە ئەبێ کە دەو بکا لەنێوانیانا، جا هەر وەختێ نۆبەی ژنە تازەکە هات، نۆبەکەی بدا بە یەکێ لە ژنەکانی تری، هەروەها لە دەوی دووهەمیشا ئەو نۆبەی ژنە تازەیە بدا بە ژنێکی تریان، وە لە دەوی سێهەمیشا، نۆبەکەی بدا بەو ژنەکەی تریان و لەوەپاش لەسەر شێوەی ئەم دەوە ئەڕوا تا قەزای هەر حەوت رۆژەکە تەواو ئەبێ؛ ئەوەش بزانین کە ئەم ژنانە وەکوو شەوە قەرزەکانیان ئەدرێتەوە،

نۆبەکەی خۆیشیان بە تەرتیبی دەوەکە وەرئەگرن و بەم تەرتیبە، ئەو حەوت رۆژە قەرزە لە ماوەی هەشتاو چوار رۆژا تەواو ئەبێ بۆیان، ئەگەر چوار ژن بن؛ لەبەر ئەوە لە هەموو چوار شەوێکا ئەم ژنە تازەیە شەوێکی هەیە بیداتەوە بە قەرزا و لەماوەی دوازدە شەوا، ژنە کۆنەکان ئەگەر سیان بن، یەکی شەوێکیان پێ ئەدرێتەوە؛ کەواتە، بۆ ئەوەی کە یەکی حەوت شەو قەرزیان پێ‌بدرێتەوە، پێویستمان بە حەوت دوازدە هەیەو حەوت کەڕەت دوازدە، ئەکاتە هەشتاو چوار و لەم هەشتاو چوار شەوەدا ئەو ژنە تازەیە تاقە شەوێکی بەرناکەوێ.

هەر پیاوێ بڕوا بۆ جێگایەك بە یەکجاری، حەرامە هەندێك لە ژنەکانی لەگەڵ خۆی بباو هەندێکیان بەجێ بهێڵێ، بەڵکوو ئەبێ یا هەموویان ببا یا هەموویان بەجێ بهێڵێ، لەگەڵ مەسرەف و سەرپەرشتی‌کەردا وە لە سەفەری بازرگانی و زیارەتا، دروستە هەندێکیان بەرێ، بەو شەرتە دەویان لەبەینا بکا یا بە بێ‌دەو، بەڵام لەگەڵ ڕەزامەندیی ئەوانی تریشیانا؛ لەم کاتەدا، واجب نییە لەسەری قەزای ماوەی سەفەرەکە بکاتەوە بۆ ئەوانی تریان، مەگەر ئەو ماوەیە کە گەیشتووەتە ئەو شوێنەی بۆی چووەو تیا ماوەتەوە.

ئەگەر یەکێك لە ژنەکان نۆبەکەی خۆی بەخشی بە هاوڕێیەکی، واجب نییە لەسەر مێردەکەی قەبووڵی بکا، چونکە ڕێی تێ‌ئەچێ ئەم کابرا ئارەزووی لەو ژنەیان نەبێ وە ئەگەر قەبووڵی کرد و ژنەکەیش نۆبەکەی خۆی دا بە ژنێکی دیاری لەناو ژنەکانا، ئەوە واجبە لەسەر مێردەکە لە نۆبەی ئەو ژنەدا لای ئەم ژنە بمێنێتەوە زیاد لە نۆبەی ئەم ژنە خۆی، بە پێی ڕیزی نۆبەکان وە ئەگەر ئەو ژنە نۆبەکەی خۆی بەخشی بە مێردەکەی، ئەوە بۆی دروستە بیبەخشێ بە یەکێکی دیاری لەناو ژنەکانا.

## باسی سەرپێچی‌کردنی ژن لە بەگوێ‌کردنی پیاو (نُشُوز)

«نُشوز» لە شەرعدا، بریتییە لەوە کە ژن لە فەرمانی مێردەکەی دەربچێ بە بێ‌عوزرێکی شەرعی، وەك ئەوە کە بە بێ‌ڕێگادانی ئەو لە ماڵ دەربچێ بە غەیری دەرچوونی عادەتی لە بەینی دەرودراوسێدا، یاخود مەنعی مێردەکەی بکا لەوە کە

بچێتە لای و لەزەتی لێ وەربگرێ، یا دەرگای لەسەر دابخاو رێگای نەدا بێتە ماڵەوە، یا بە درۆ داوای تەڵاقی لێ بکا.

هەر ژنێ بە بێ‌مێردەکەی بڕوا بۆ سەفەر بە بێ‌ئەوە کە ئەو رێگای دابێ، ئەوە بە «ناشِزە»و لە فەرمان دەرچوو دائەنرێ، بەڵام ئەگەر بە ئیزنی کابرا بوو، عەیبی نییە؛ جا ئەگەر بۆ مەبەستێکی کابرا چووبوو بۆ سەفەر، ئەوە قەزای بەشە شەوی ماوەی سەفەرەکەی بۆ ئەکرێتەوە وە ئەگەر بۆ ئیشی خۆی چووبوو بۆ سەفەر، ئەوە قەزای نییە.

هەروەختێ نیشانەی لە فەرمان دەرچوونی ژن دەرکەوت، ئەبێ مێردەکەی ئامۆژگاریی بکاو شەو نەچێتە سەر جێگەکەی. ئەگەر لە فەرمان‌دەرچوونەکە هاتەدیو دووبارەی نەکردەوە، ئەوە مێردەکەی حەقی ئامۆژگاری‌کردنو نەچوونە سەر جێگای هەیەو فەرموودەی دیاریتریش ئەوەیە ئەتوانێ لێیشی بدا، بەڵام باش نییە قسەی لەگەڵدا نەکا، مەگەر لەبەر مەسڵەحەتێکی ئایینی کە بەو قسە نەکردنە چار بکرێ.

وە ئەگەر لە فەرمان دەرچوونەکەی دووبارە کردەوە، ئەوە شوبهەی تیا نییە کە دروستە لێی بدا، بەڵام بە چەند شەرتێك؛

یەکەم: ئەوەیە بزانێ لێدانەکەی سوودی هەیە؛

دووهەم: نەدا لە شوێنی ناسکی، وەکوو چاو و لووتو گوێو نەدا لە جێگەی کوشندەیشی، وەك سەرو سەردڵ و کەلەکەو مووسڵدانی؛

سێهەم: دوژمنایەتییەکی کۆنیان لەبەیندا نەبێ، ئەگینا ئەبێ بچێتە لای قازی.

وە ئەگەر لە فەرمان دەرچوونی ژنەکە لەبەر ئەوە بوو کە مێردەکەی حەقی شەرعی ژنەکەی ئەفەوتاند، ئەوە واجبە قازی نەهێڵێ ئەو حەقەی بفەوتێنێو ناچاری بکا کە سەر دانەوێنێ بۆ فەرمانی شەرع وە ئەگەر کابرا کابرایەکی بەدخوو بوو، واجبە قازی مەنعی بکات، وە ئەگەر کابرا موبالاتی نەکرد وگوێی نەدایە، واجبە لەبەر چاوی خەڵك سووکی بکا بە هەرجۆرێك کە خۆی بە مەسڵەحەتی ئەزانێ.

وە ئەگەر هەرکام لە ژن و پیاوەکە ئیددیعای بەدخوویی ئەویانیان کرد، واجبە لەسەر قازی کەسێکیان لەسەر دابنێ کە سەرپەرشتی ئەحواڵیان بکا تا بزانێ خەتای کامیانەو

مەنعی خەتابارەکەیان بکا وە ئەگەر پیاوەکە بیانووی هێنایەوە بۆ قازی لەسەر لێدانی ژنەکەی کەوا: بۆیە لێی ئەدا چونکە بێ گوێیەو بە فەرمانی ناکا و ژنەکەیش ئینکاری کرد، ئەوە باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ، مەگەر لە حاڵێکا کە ناسرابێ بە بەدخوویی، ئەو کاتە باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ و مەنعی کابرا ئەکرێ لەوەی لێی بدا؛ بەڵێ، لەبارەی ئەوەوە کە ژنەکە موستەحەقی نەفەقە بێ، ئەوە هەمیشە باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ کەوا بێ گوێیی نەکردووە و واجبە لەسەر مێردەکەی نەفەقەی بداتێ تا ئیسپاتی ئەکا بە شاهید کەوا لە فەرمانی دەرئەچێ.

جا ئەگەر هەرای بەینی پیاوو ژنەکە هەر درێژەی کێشاو چاری نەکرا، ئەو وەختە واجبە لەسەر قازی دوو حەکەمیان لەسەر دابنێ بە رەزامەندیی ژنەکەو پیاوەکە و سونەتە یەکێکیان خزمی پیاوەکەو ئەویان خزمی ژنەکە بێ بۆ ئەوە چاویان بە ژن و پیاوەکە بکەوێ و باش لێیان حاڵی ببن؛ شەرتی ئەم دوو حەکەمە، ئەمەیە موسوڵمان و ئازادو دادپەروەر بن و شارەزای وەزعی بەینی ژن و پیاوەکە بن بۆ ئەوە باش لە وەزعیان حاڵی ببن و بزانن چی بکەن و سونەتە پیاو بن؛ ئەم دوو کەسە، یەکێکیان وەکیلی پیاوەکەو ئەویان وەکیلی ژنەکەیە، ئیتر حەکەمی بەمەعنا «حاکِم» نین بەم مەعنا ژن و پیاوەکە تەحکیمیان کردبن، ئەگینا بە تەنها کەسێ قەناعەت ئەکرا وە حەکەم و جێنشینیشیان نین کە قازی دایناب‌ن، چونکە خۆیان خاوەن روشد و تەسەروفن لە ئیشی خۆیاناو قازی حەقی نییە دەس بخاتە ئیش و کاریانەوە؛ کەواتە، ناوبردنیان بە حەکەم، تەنها بۆ موافەقەتی قورئانی پیرۆزە، ئەگینا لەڕاستیدا تەنها وەکیلێکن لەجیاتی پیاوو ژنەکە، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد؛ کەوابێ، بەشەرتگرتنی ئەو مەرجانە لە حەکەمەکاندا، تەنها لەبەر ئەوەیەکە وەکیلییەکەیان بەسراوە بە بیر و سرنجی قازییەوە و وەك جێنشین و ئەمینداری قازی بن وایە، ئەگینا وەکیل ئەو شەرتانەی ناوێ.

وە مادام ئەمانە وەکیلی ئەم پیاوو ژنەن، ئەگەر پیاوو ژنەکە هەردووکیان یاخود یەکێکیان لەپێش تەواوکردنی ئیشەکەدا لە هۆشی خۆیان چوون، ئەمان لە وەکالەت عەزل نابن، وەك وەکیلێك کە ئەو کەسەی کردوویە بە وەکیل لە هۆشی خۆی بچێ.

ئەگەر ئەم دوو حەکەمەیش بە پێچەوانەی یەکتر رایان دا، واجبە لەسەر قازی دوو حەکەمی تریان بۆ دابنێ؛ جا ئەگەر ئەمانیش رایان یەکی نەگرت، یا لە ئەساسدا ژن و مێردەکە رازی نەبوون بە حەکەم بۆ دانان، ئەوە قازی لەسەر مەعلوومات و قەناعەتی خۆی ئیش بکاو هەرکامیانی بە تاوانبار زانی، تەمێی بکاو حەقی ستەم لێکراوەکەی لێ بسێنێ.

جا کاتێ هەردوولا رازی بوون بەم دوو حەکەمە، ئەوە ئەگەر کابرا مەیلی بوو، با حەکەمەکەی خۆی بکا بە وەکیل بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی و «خُلع» لەگەڵ کردنیو بۆ وەرگرتنی عیوەزی خولعەکە لە ژنەکە؛ هەروەها، ئەگەر ژنەکەیش ئارەزووی هەبوو، حەکەمەکەی خۆی بکا بە وەکیلی کابراکە و بۆ سەرفکردن و تەسلیمکردنی عیوەزی خولعەکە بە وەکیلەکە؛ جا ئەگەر ژن و پیاوەکە کەوتنە یەك، ئەوە باشە، ئەگینا وەکیلی پیاوەکە تەڵاقی ژنەکە بدا لەسەر ئەندازەیەك پارە بە پێی ئەمری کابرای وەکیلگر و وەکیلی ژنەکەیش قەبووڵی تەڵاقەکە بکا لەسەر رەزامەندیی ژنەکە، بۆ ئەوەکە بە رەزاو رەحمەت لە یەك جیا ببنەوە.

## باسی «خُلْع»

**«خلع»** لە شەرعدا، بریتییە لە جیابوونەوەی ژنەکە لە پیاوەکە بەرابەر «عِوَض»ێکی مەبەست کە بگەڕێتەوە بۆ مێردەکە.

خولع، لە خۆیدا کەراهەتی هەیەو هەندێ جاریش مەباحە، وەکوو خولعکردن لەگەڵ ژنێکا کە بەدرەوشت بێو ئەم پیاوەیش تاقەتی نەبێ لەگەڵیا رابوێرێ، هەروەها بۆ کەسێ کە بە سێ تەڵاقە سوێندی خواردبێ لەسەر نەکردنی شتێ کە پێویست بێ بیکا، یا لەسەرکردنی شتێ کە پێویست بێ نەیکاو ئەگەر لەسەر سوێندەکەی دەوام بکا، تووشی زیان ببێ وە ئەگەر سوێندەکەی بخا، سێ تەڵاقەی بکەوێ؛ ئەم کەسە، ناچارە خولع بکا لەگەڵ ژنەکەی بۆ ئەوەکە عەقدو عیسمەتەکەی پێشووی نەمێنێ و لەپاش ئەو خولعە، ئەو شتە کە وتوویەتی نایکەم بیکا، یا ئەو شتە کە وتوویەتی ئەیکەم تەرکی بکا، خواه لەپێش مارەکردنەوەی ژنەکەدا بێ یا لەپاشی.

بەڵام لێرەدا چەند شتێك هەیە ئەبێ تەماشای بکرێ؛

یەکەم: لەپێش خولعەکەدا بزانرێ کابرا هەر سێ تەڵاقەی ماوە یا خود دوو تەڵاقی ماوە، چونکە ئەگەر یەك تەڵاقی مابێ بەو خولعە ئەکەوێ وە پێویستی بە جاشکردنەوە (تحلیل)ی ژنەکە ئەبێ؛

دووەم: بزانێ ئەو نیکاحە لەپێشا بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی کراوە، چونکە ئەگەر بە مەزهەبی ئیمامی حەنەفی بووبێ، واجبە کابرا لەپاش خولعەکە سەبر بکا تا ژنەکەی «عِدّە»ی بەسەر ئەچێ، ئەوسا ئیشە سوێند لەسەرخوراوەکە بکا، ئەگینا ئەگەر لە ماوەی «عِدّە»کەدا بیکا، هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە لە مەزهەبی حەنەفیدا تەڵاق ئەلکێ بە ژنێکەوە کە لە «عِدّە»ی «بَیْنونَة»دا بێ؛

سێهەم: تا بۆی بکرێ خولعەکە بە سوورەتی خولعی بێگانە لەگەڵ ئینسانێکی خاوەن روشدا بکا، لەبەر ئەوە کە حاڵی بەشی زۆری ژنانی ئەمڕۆ سەفاهەتەو خولع لەگەڵ ژنی سەفیهدا، ئەبێ بەهۆی تەڵاقی «رِجعی» وە ئەگەر لەپاش خولعەکەی ئیشە سوێند لەسەر خوراوەکە بکا، هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ؛ بەڵام ئەم ماددەی سێهەمە، هەر بۆ پارێزگارییە، ئەگینا لەگەڵ ژنەکەی خۆیشیا بیکا باشە، چونکە بە پێی زاهیری، حوکم ناکرێ بە سەفاهەتی ئەم ژنە.

ئەرکانی خولع، پێنجن: مێردو، لەئەستۆگر (مُلْتزِم)، واتە ئەو کەسە کە خولعەکە قەبووڵ ئەکاو ماڵەکە ئەگرێتە گەردن و «عِوَض»، واتە ئەو شتەی ئەدرێ لە بریتی خولعەکەدا و «بِضْع»، یەعنی پارچەی ژنەکە و «صیغە»، واتە ئەو ئیجاب و قەبووڵەی کە لەبەینا رائەبوورێ.

شەرتی مێردەکە، ئەوەیە مێردێك بێ دروست بێ ژن تەڵاق بدا، یەعنی تەکلیفی لەسەر بێو بە ئارەزووی خۆی خولعەکە بکا، هەرچەند سەفیهیش بێ؛ کەواتە، خولع دروست نییە لەلایەنی مێردێکەوە کە منداڵ بێ، با نزیك بە باڵغبوونیش بێ و لە شێتو بێهۆشو نووستوو و لە کەسێکەوە بە زۆر ئەو خولعەی پێبکەن، بەڵام دروستە لەلایەنی پیاوێکەوە کە بەهۆی سەفیهییەوە حیجری لەسەر دانرابێ، چونکە ئەگەر

بەخۆڕایی تەڵاقی ژنەکەی بدا دروستە؛ کەواتە، ئەگەر بەرابەر بە ماڵ بیکا، باشتر دروستە.

شەرتی لەئەستۆگر (مُلتزِم)یش ئەوەیە، ژنەکە بێ یا غەیری ژنەکە، خاوەنی تەکلیف بێ‌و بە ئارەزووی خۆی لە ئەستۆی بگرێ و تەسەڕوفکردنیشی لە ماڵیدا بەرەڵڵابێ؛ کەواتە، دروست نییە خولع قەبووڵکردن لەلایەنی منداڵ‌و شێت‌و بێ‌هۆش‌و کەسێکەوە کە بەزۆر پێی قەبووڵ بکەن، هەروەها لەلایەنی کەسێکەوە کە حیجری لەسەر بێ بە حیجری ئەسڵی، وەك کەسێك کە بە سەفیهی بالغ بووبێ، یا بە حیجری ڕووداو (عارِض)، وەك کەسێك بە خاوەن ڕوشدی باڵغ بووبێ‌و پاش ئەوە سەفاهەت بکاو قازی حیجری لەسەر دابنێ؛ بەڵێ، خولع لەگەڵ منداڵ و شێت و بێ‌هۆشا هەر لە بناغەدا دانامەزرێ‌و تەڵاقەکەی پێ‌ناکەوێ، با قەبووڵیشی بکەن.

هەروەها، خولع لەگەڵ زۆر لێ کراوا دانامەزرێ، ئەگەر قەبووڵی نەکا وە ئەگەر قەبووڵی بکا، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە تەڵاقی ڕیجعی‌و ماڵەکەی ناکەوێتە سەری، بۆیە ئەگەر مێردەکەی مەنعی نەفەقەی لێ کرد بەنیازی ئەوە کە قەبووڵی خولع بکا، جا تەڵاقی دا لەسەر ماڵ و ژنەکە قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» و ماڵەکەیشی ناکەوێتە سەر، هەروەها ئەگەر بە لێدان مەجبووری بکا لەسەر قەبووڵکردنی خولعەکە.

بەڵام ئەگەر مەنعی نەفەقەی بەنیازی قەبووڵی خولع نەبوو و لەپاشا وا ڕێکەوت خولعی لەگەڵ کرد، ئەوە خولعەکە دروستەو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بەو ماڵە. دروستە ژن لە نەخۆشی مردنا قەبووڵی خولع بکا و هەرچی لە عیوەزی خولعەکە زیاد بێ لە «مَهرالمثل»، لە سێ یەکی ماڵەکەی ئەژمێررێ.

بەڵام خولع لەگەڵ ژنێکا کە باڵغ و بێ‌ڕوشد بێ، ئەوە چەند سوورەتی هەیە، چونکە ئەو خولعە مادام بە سوورەتی تەنجیز بێ، ئەگەر قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی بە بێ‌ماڵ ئەکەوێ بە تەڵاقی بائینە، لەپێش چوونەلا وە بە تەڵاقی «رِجعی»، لەپاش چوونەلا؛ ئەمە دوو سوورەتی وە ئەگەر قەبووڵی نەکرد، ئەوە ئەگەر کابرا مەبەستی لە

لەفزی خولع هەر خولع بوو، یەعنی تەڵاقی بەعیوەز، خواه هیوای قەبووڵکردنی ژنەکەی لەدڵا بێ یا نەبێ و یاخود بەو لەفزی خولعە هەر مەبەستی تەڵاق بێو هیوای قەبووڵی ژنەکەیشی ببێ، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ؛ ئەمەیش سوورەتێکی تر وە ئەگەر بە لەفزی خولع نیازی تەڵاقی هەبوو و هیوای قەبووڵی ژنەکەی لە دڵا نەبوو، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە تەڵاقی بائینە، لەپێش چوونەلا، وە بە تەڵاقی «رِجعی»، لەپاش چوونەلا؛ ئەمەیش دوو سوورەتی‌تر؛ وا، بەکورتی سوورەتەکانی خولعی تەنجیزی لەگەڵ ئافرەتی بێڕوشددا بە لەفزی خولع، ئەم حەوت سوورەتەی هەبوو؛ لە دوو سوورەتا، تەڵاقەکەی ئەکەوێ و بائینەیە بە بێ‌ماڵ و لە دوو سورەتیانا، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجْعی» و لە سێ سورەتیشا، تەڵاقەکەی ناکەوێ.

ئەگەر کابرایەك دوو ژنی باڵغ بووی هەبوو، یەکیان خاوەن روشدو ئەویان بێڕوشد بوو وە بە یەك لەفز وتی: وا خولعم لەگەڵ کردن لەسەر بیست دینار، ئەوە ئەگەر هەردووکیان قەبووڵیان کرد، تەڵاقیان ئەکەوێ؛ تەڵاقی خاوەن روشدەکەیان، بائینەیەو ئەرواتە سەر «مَهرالمثل» و تەڵاقی بێڕوشدەکەیان، «رِجعی»یەو بێ‌ماڵە وە ئەگەر قەبووڵیان نەکرد، تەڵاقیان ناکەوێ، هەروەها ئەگەر یەکێکیان قەبووڵی نەکا، لەبەر ئەوە مادام بە یەك گفتوگۆ بووە لە مەعنادا، کەوتنی تەڵاقی گشتیان بەسراوە بە قەبووڵی هەردووکیانەوە.

شەرتی عیوەز، ئەوەیە «مَقصود» بێو بگەڕێتەوە بۆلای مێردەکە، خواهدروست بێ، وەکوو دە مسقاڵ ئاڵتوون، یا نادروستێکی مەقسوود بێ، وەکوو کووپەیەك شەراب، کە بەکاری جوولەکەیەك دێت و لەسەر حەیوانێکی مردارەوە بوو، کە بۆ دەرخوارددانی سەگێکی راو ئەشێت و لەسەر دوو سەبەتە زبڵ، کە بەکاری بێستانەوانێك دێت و لەسەر حوقەیەك تەپاڵە یا پشقڵ، کە بەکاری ئەوە دێن نانیان پێ‌بکری یا چێشتیان پێ‌لێ‌بنرێ.

فەرقی نییە ئەو عیوەزە عەین بێ ـ وەکوو وتمان ـ یاخود قەرز بێ، وەکوو خولع لەسەر ئەو قەرزەکە ژنەکە هەیەتی بەسەر مێردەکەیەوە، یاوەکوو خولع لەسەر دە دینار بەوادەی ساڵێ بیدا بە مێردەکەی، یاخود مەنفەعەت بێ، وەکوو خولع لەسەر مانەوەی

لە دووکانێ یا خانوویەکی ژنەکەیا؛ جا ئەگەر ماوەی مانەوەکە دیاری بوو، ئەوە دیارییە، ئەگینا نادیارییە وە وەکوو خولع لەسەر حەقی خوێن کە ژنەکە بیبێ بەسەر کابراوە؛ مەسەلا، کابرا باوکی ژنەکەی کوشتبێ، یا وەکوو خولع لەسەر حەقی ژنەکە لە حەددی قەزفدا، لەبەر ئەوە کابرا قەزفی ژنەکەی کردووە، یا حەقی ژنەکە لە «تَعزیر»دا؛ مەسەلا، کابرا شتێکی‌وای لەگەڵ کردبێ کە ژنەکە بتوانێ بڕواتە لای قازی و قازی کابرا بانگ بکاو بێ بەسەریاو تەعزیری بکا وە خواه ئەو عیوەزە تەحقیقی بێ یا تەقدیری بێ، وەکوو ئەوە کابرا خولعی ژنەکە بکا لەسەر ئەو شتەی وا لەدەستیا، لەگەڵ ئەوەشا کە هیچی لەدەستا نەبێ‌و ژنەکە قەبووڵی بکا، هەرچەند هەردووکیشیان بزانن کە دەستی هیچی تیا نییە، یا وەکوو ئەوەکابرا بڵێت: وا خولعم لەگەڵ کردی لەسەر مارەییەکەت یا لەسەر ئەوەی ماوەتەوە لە مارەییەکەت لەسەرم، کەچی هیچ مارەیی لەسەر نەمابێ وە خواه ئەو عیوەزە موڵکی کابرا بێ کە لەئەستۆی گرتووە، یا زەوت کرابێ‌و داگیر کرابێ لێی.

جا هەرچی خولع بێ لەسەر نەزانراو یا لەسەر زانراوو نەزانراو، ئەوە ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل»؛ هەروەها، خولع لەسەر هەر عیوەزێك کە نادروستی مەقسوود بێ وە یـا لەسەر دروست و نادروست، بەو شەرتەکە دروستەکە نەزانراو بێ، هەر ئەچێتەوە سەر «مَهرالمثل»، بەڵام ئەگەر ئەو دروستەکە وا لەگەڵ نادروستەمەقسوودەکەدا زانراو بوو، وەکوو خولع لەسەر دە دینارو مەڕێکی مردارەوە بوو، ئەوە ئـەڕواتـە سـەر عـەینی زانراوەکەو بەشی نادروستەکەیش لە «مَهرالمثل»؛ مەسەلا، ئەگەر یەکێك ئـەو مـەڕە مردارەوە بووەی ئەکڕی بە نیو دینار بۆ ئەوەی دەرخواردی سەگێکی راوی بدا، ئەوا دەرئەکەوێ ئەو حەیوانە بیست یەکی دە دینارەکەیە؛ کەوابوو، عیوەزەکە دێتەوە سەر دە دینارەکەو بیست یەکی «مَهرالمثل».

لە وەختی تەڵاق‌دان لەسەر حەقی خوێندا، ژنەکە بائینە ئەبێتەوەو خوێنـەکـەیش لەسەر کابرا لائەچێ‌و ئیتر هیچی ناکەوێ، چونکە ئەو حەقە عیوەزێکی مەقسوودەو مەعلوومو زانراوە بە شەرع، بەڵام لە خولع لەسەر حەددی قەزف و حەقی تەعزیردا،

ژنەکە بائینە ئەبێتەوەو کابرایش عەفو ئەبێت لەو حەقانە، لەگەڵ ئەوەشداکە «مَهرالمثل» ئەکەوێتە سەر ژنەکە بیدا بەکابرا چونکە ئەم دوو حەقە، «مالِیّة»یان نییە، یەعنی نە ماڵن و نە ئەگۆڕرێنەوە بە ماڵ بەپێی عادەت، وەکوو لە «حاشیەی جەمەل»دا فەرموویەتی.

تەفسیلی تەڵاق لەسەر ئەوەی لە دەستی ژنەکەدایە؛ مەسەلا، ئەمەیە: ئەگەر ژنەکە هیچی لەدەستا نەبوو، تەڵاقەکە ئەکەوێ لەسەر «مَهرالمثل»، خواه کابرا بزانێ بەوەکە دەستی خاڵییە یا نەزانێ؛ هەروەها، ئەگەر نادروستێکی مەقسوودی لەدەستا بوو، هەر ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل»، کابرا بزانێ یا نەزانێ وە ئەگەر نادروستێکی نامەقسوودی لەدەستا بوو، وەکوو پشقڵێك، ئەوە ئەگەر بزانی پێی، ئەوە تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر پێیشی نەزانێ، وەکوو لە "حاشیەی جەمەل"دا فەرموویەتی: بەڵێ، ئەگەر شتێکی زانراوی دروستی لەدەستا بوو، وەکوو درەمێك، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بەو درەمە.

لە لقەکانی ئیکتیفاکردنە بە عیوەزی تەقدیری ئەمەکە کابرا بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ لەسەر مارەییەکەت، یا لەسەر ئەوەی ماوەتەوە لە مارەییەکەت و مارەییش لەسەر کابرا نەمابوو، ئەوە مادام ژنەکەی قەبووڵی کرد، تەڵاقەکەی ئەکەوێ لەسەر «مَهرالمثل» وە ئەگەر لەپێش چوونەلادا، بڵێت: ئەگەر ئازادت کردم لەو دە مسقاڵە ئاڵتوونە مارەییەت، تەڵاقت کەوتبێ‌و، ژنەکەیش ئازادی کرد، تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و بائینە ئەبێتەوەو کابرایش ئازاد ئەبێ، لەبەر ئەوەکە لەکاتی تەعلیقەکەدا ئەو ژنە خاوەنی مارەییەکە بووە.

بەڵێ، ئەگەر بەسوورەتی تەنجیز بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ لەسەر ئەو دە مسقاڵە ئاڵتوونە کە مارەت لەسەری بڕاوەو ئەویش قەبووڵی بکا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە لەسەر نیوەی مارەیی ناوبراوو نیوەی «مَهرالمثل»، بەڵام کابرا هەر نیوەی «مَهرالمثل»ەکەی لێ وەرئەگرێ؛ بەیانی ئەم مەسئەلەیە بەمجۆرەیە: مادام کابرا لەسەر هەموو مارەییەکە تەڵاقی داوە و ئەم خولعە لەپێش چوونەلادا بووە و لەو کاتەدا هەر نیوەی مارەییەکە دامەزراوە، ئەوە نیوەی عیوەزەکە دروستەو نیوەی نادروستە و لە

خولعی وەهادا، ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە بەشە دروستەکەو بەشی نادروستەکـەیش لە «مَهرالمثل»، وەکوو نیوەی «مَهرالمثل»بێ لەم مەسئەلەدا؛ کـەوابـێ، ژنـەکـە بـوو بـە قەرزاری نیوەی مارەییە ناوبراوەکەو نیوەی «مَهرالمثل»ەکەی؛ جـا لەبـەر ئـەوە کـە لەپاش کەوتنی تەڵاق بە ئارەزووی کابرا لەپێش چـوونەلادا، مـارەیی ئـەبێ بـە دوو بەشەوە و نیوەی ئەگەڕێتەوە بۆ مێردەکە، لەم مەسئەلەیەدا نیوەی ناوبراوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ کابرا، بەس نیوەی «مَهرالمثل»ەکە لەسەر ژنەکە ئەمێنێتەوەکە واجبە لەسەری بیدا بە کابرا، وەکوو باسمان کرد؛ ئەمە، بەیانی ئەوەیە کە شێخی «ابنُ حَجَر» لە «تُحفه»دا لە سەرەتای خولعەوە فەرموویەتی.

وە لە باسی حوکمی پێنجەمی مارەیی‌دا، لە «اَنوار»دا فەرموویەتی: ئەم حوکمە بەو شەرتەیە کابرا بزانێ بەوە مارەیی لەپێش چوونەلادا هەر نیوەی دامـەزراوە، یـا ئـەمە نەزانێ بەڵام رازی بێ بەو عیوەزە نادروستە کە لەم خولعەوە پەیدا بووە، ئەگینا ئەگەر نەزانێ بەوەکە مارەیی لەپێش چوونەلادا نیوەی دامەزراوەو بە عیوەزی خولعەکەیش رازی نەبوو، یەعنی ئەو عیوەزەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە هەموو «مَهرالمثل»ی ئەکەوێتە سەر ژنەکە و هەمووی لێ وەرئەگرێ، وەکوو ئەو شوێنانە کە عیوەزیان تیا نادروستە.

وە ئەگەر خولع لەسەر ماڵی زەوتکراو بوو، یا لەسەر ماڵێکی زەوتکراو بوو لەگەڵ شتێکی نادروستی مەقسوودا، وەکوو ئەوە کابرا خـولعی ژنـەکـەی کـردبوو لەسـەر مەڕێکی داگیرکراو لەگەڵ کووپەیەك شەرابدا، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «مَهرالمثل». هەروەها ئەگەر ئەوەی وا لەگەڵ ماڵە زەوتکراوەکەدا ماڵێکی نادیاری بوو، وەکوو ئەوە تەڵاقی بدا لەسەر ئەو مەرە زەوتکراوەو شتێ لە دەستی ژنەکەداکە نەزانێ چەندێکە وە ئەگەر ئەوەی والەگەڵ ماڵە زەوتکراوەکەدا موڵکێکی دیاری بێ، وەکوو ئەوەکە تەڵاقی بدا لەسەر دوو مەڕکە یەکێکیان زەوتکراو بێ و ئەویان موڵك بێ و بەدەستەوە بێ، ئەوە تەڵاقەکە بائینە ئەبێتەوە بە حەیوانە موڵکەکەیان لەگەڵ بەشی زەوتکـراوەکـەیان لە «مَهرالمثل»، وەکوو نیوەی «مَهرالمثل»بێ لەم مەسئەلەیەدا، ئەگەر هەردوو مەڕەکە لە قیمەتا وەکوو یەك وابن، بەڵام ئەمە بەو شەرتەیە کابرا بزانێ ئەو مەڕیانە زەوتکراوە، یا

نەزانێ زەوتکراوە بەڵام رازی بێ بەم عیوەزە تێکەڵ لە ساغ و نادروستە، ئەگینا بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل».

جیابوونەوەیەکیش کە بە بێعیوەز بێ، وەکوو ئەوە کابرا بڵێت بە ژنەکە: تەڵاقت کەوتبێ، یا لەسەر عیوەزێکی نادروستی ناتەقسوود، وەکوو پشقڵێك یا پارچەیەك تەپاڵە، یا لەسەر عیوەزێکی مەقسوود، بەڵام بگەڕێتەوە بۆ غەیری لای مێردەکە، وەکوو ئەوەکە تەڵاقی بدا لەسەر ئەوەکە ئەو ژنە فلانکەس ئازاد بکا لەو قەرزەی کە لەسەریەتی و ئەویش ئازادی بکا، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «رجعي».

بزانن! ئەگەر پیاوێکی کوێر خولعی کرد لەگەڵ ژنەکەیدا لەسەر عەینێكو ژنەکە قەبووڵی کرد، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» و عەینەکە نابێ بە ماڵی؛ کەوابێ، چاری ئەوەیە کابرای کوێر، وەکیلێکی چاوساغ بگرێ بۆ ئەوە خولع بکا لەسەر ئەو عەینە.

هەروەها ئەگەر پیاوێك خولع بکا لەگەڵ ژنەکەیدا لەسەر ئەوەکە پاش تەڵاقەکەی لە هۆدەکەی خۆیا نەمێنێ، لەم سوورەتەیشدا هەر بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» وە ئەو ژنە لە هۆدەکە دەرناچێ تا «عِدّە»ی تەواو ئەبێ، لەبەر ئەوەکە شتێك بە حوکمی شەرع واجب بێ، قابیلی گۆڕان نییە.

لە «تُحفە»دا ئەفەرموێت: ئەگەر کەسێك خولعی تەنجیزی کرد لەسەر چەند درەمێك، ئەوە ئەو درەمانە بەو درەمانە مەعنایان لێئەدرێتەوە کە زۆرتری پارەی نەختی ئەو وڵاتەن وە ئەگەر «تَعلیق» بوو، ئەوە بە درەمی زیوی ساغی ئیسلامی مەعنایان لێ ئەدرێتەوەو ناڕاوتە سەر نەقدی ئەو وڵاتە، ئەگەر زیوەکەی تێکەڵ بێ بە شتێ‌تر، وەکوو شەیخەین تەسحیحیان فەرمووە، بەڵام هەرایان لەگەڵدا کراوە لەم حوکمەدا و لە «نِهایە»دا ئەفەرموێت: مەگەر کابرا خۆی بڵێ: نیازم لەسەر ئەم درەمە مەخشووشانە بووە وە "رەشیدی" فەرموویەتی: ئەی ئەگەر درەم لە وڵاتەکەدا نەبوو چیبکەین؟! و "شیروانی" ئەفەرموێت: ئارەزووی دڵ هەر بۆ ئەوەیە بە درەمی نەقدی وڵاتەکە مەعنای لێ بدرێتەوە، چە زیوی ساغ بێو چە زیوی ناساغ؛ ئەمە فەرموودەی

ئەوان، بەڵام لێکدانەوەی زانایانی شەرع لەسەر ئەوەیە ئەگەر کابرا لە خولعی تەنجیزی و تەعلیقی‌دا نیازی شتێکی دیاریی هەبوو، ئەوە دیارە ئەوە ئیعتیبار ئەکرێ، ئەگینا مەعنای بەوە لێ ئەدرێتەوە کە زۆرتر موعامەلەی پێ ئەکەن لە وڵاتەکەدا، هەرچەند ئەسکەناس و باقەنەوتیش بێ، وەکوو لە فەرموودەی هەندێ لە زانایانەوە دەرکەوتووەو روونکراوەتەوە.

لە راستی‌دا، ئەم درەمە مەخشووشانە لەخۆیانا ماڵن و خاوەن قیمەتیشن، وەکوو «فلس» و شتێ‌تر لەو نەختانەی کە مامەڵەیان پێ ئەکرێ و کاغەزی دینارو باقەنەوت و ئەسکەناس و شتی‌وا، لەزاتی خۆیدا ماڵەو قیمەتیش ئەکا بە بێ‌ئەوە کە تەماشای ئەوە بکەین حوکوومەت نرخی بۆ داناوە یا نە؛ چونکە ـ مەسەلا ـ بۆ جوانکردنی بەرگی کتێب و شتی‌وا بە کار دێت و بەهۆی فەرمانی حوکوومەتەوە، وەکوو عەینی ئاڵتوون و زیوی ساغ قیمەتی هەیە و هەر کاتێك یەکێك بیەوێ هەندێکی لێ بگۆڕێتەوە بە نەقدی ئەم وڵاتە، لەپاش بەجێ‌هێنانی مامەڵەڕەسمییەکەی بۆی ئەگۆڕرێتەوە، بەتایبەتی لەکاتێکاکە حوکوومەت بیەوێ جۆرە پارەیەکی کاغەز بگۆڕێتەوە بە جۆرێکی‌تر و ئەم لەجیاتی ئەو بخاتە بازارەوە؛ کەوابوو، هەروەکوو ئیمامی "بُلقینی" فەرموویەتی: دروستە فلسی سوور بدرێ بە زەکاتا، هەرچەند نەقدیش نییە؛ کەواتە، حەق وایە دروست بێ درەم و دینار لە زەکاتا سەرف بکرێ‌و زەکاتیان تیا واجب بێ‌و هەرجۆرە موعامەلەیەکیان پێ بکرێ، چونکە جێگری ئەو ئەندازە ئاڵتوونەن کە حوکوومەت لە بانقا دایناوە.

زیاد لەمە لەفزی «درەم»، لە عورفی خەڵکی ئەمڕۆی لای ئێمەدا، بریتییە لەم پەنجا فلسییە و لەفزی «دینار»، بریتییە لەم کاغەزە کە نرخێکی دیاریی هەیە و لە وەختی بەکارهێنانیانا غەیری ئەم مەعنایە مەقسوود نییە و مەعنا لێ‌دانەوەی «درەم» بە درەمی زیو و مەعنا لێ‌دانەوەی «دینار» بە دیناری زێڕ، هیچ بەڵگەیەکی نییەو ئەمڕۆ وەك زەمانی پێشوو نییە، چونکە لەمەوبەر موعامەلە بە زێڕو زیوی بێ‌غەش کراوەو مەخشووش کەم بووە.

**بزانن!** زانایان، فەرموویانە: وەزنی «مسقاڵ» نەگۆڕاوە، نە لە «جاهلیّت» داو نە لە ئیسلامدا و بریتییە لە حەفتاو دوو دەنکە جۆی نە گەورەو نە بچووك کە چـزەکـانی نەمابێ، بەڵام وەزنی «درەم» گۆڕاوە و لە ئەنجاما، قەراری گرتووە لەسەر وەزنی پەنجا دەنکە جۆو دوو پێنج یەکی دەنکێك؛کەواتە، دڕەمێك سێ حەوت یەکی لێ زیاد بکەی، ئەبێ بە مسقاڵێك وە ئەگەر مسقاڵێك سێ دەیەکێ لێ کەم بکەی، ئەبێ بە درەمێك، لەبەر ئەوە سێ حەوت یەکی درەمێك بریتییە لە بیست و یەك دەنکەجۆ لەگەڵ سێ پێنج یەکی دەنکێك و ئەم ئەندازەیە بخرێتە سەر پەنجا دانەو دوو پێنج یەك، ئەبێ بە حەفتاو دوو دانە و سێ دەیەکی مسقاڵیش بریتییە لە بیستو یەك دەنك جۆو سێ پێنج یەك و ئەم ئەندازەیە کەم بکرێتەوە لە حەفتاودوو دەنکـەکـە، دێتـەوە سـەر پـەنجا دەنك و دوو پێنج یەك؛ وا، دەرکەوت هەر مسقاڵێك درەمێکە لەگەڵ سێ حەوت یەکی درەمێك و هەر درەمێك حەوتدەیەکی مسقاڵێکە و لە زەمانی پێشـوودا دە درهـەمی زیـوی سـاغ، دینارێکی ئاڵتوون بووە و ئێستە بیست درهەمی تێکەڵ، دینارێکی باقەنوتە.

شەرتی «بِضْع» (پارچە)، ئەوەیە موڵکی پیاوەکە بێ؛ کەواتە، دروستە خولع لەگەڵ ژنێ کە لەژێر نیکاحی خۆیا بێ، هەروەها لەگەڵ ژنێکیش کە تەڵاقی دابێ بە تەڵاقـی «رِجعی»، چونکە تەڵاق دراوی «رِجعی»، وەکوو ژن وایە لە تەڵاق و لە مـیرات و لە «ظِهار» و «ایلاء» و «لِعان»دا، بەڵام تەڵاق دراوی بائینە تەڵاقی پـێوە نـالکێو خـولع لەگەڵیا بێ سوودە.

هەر خولعێ لەگەڵ ژنێکا کرابێ کە پاشگەز بووبێتـەوە (مـرتد)، ئـەگـەر لەپـێش چوونەلادا بێ، تەئسیری نییە، لەبەر ئەوە کە هەر بە پاشگەز بوونەوەکە بائینە بووەتەوە وە ئەگەر لەپاش چوونەلادا بێ، یا پاش تێ کردنی ئاوی مەنی بێ، ئەوە رائەگـیرێ، ئەگەر لە ماوەی «عِدّە»دا موسوڵمان بووەوە، دەرئەکەوێ خولعەکـە دروست بـووە، ئەگینا بە ئەسڵی پاشگەز بوونەوەکە جیا بووەتەوە.

دروستە بۆ پیاوو ژن وەکیل بگرن لە خولع و لە قەبووڵ کردنی خولعدا؛ جا ئەگەر کابرا وتی بە وەکیلەکەی: خولعی ژنەکەم بکە لەسەر سەد دینار، دروست نییە بە کەمتر

لەو سەد دینارە خولعی بکا؛ هەروەها، نابێ بە غەیری جینسی دینار یا بە غەیری نەختی وڵاتەکە یاخود بە سەد دیناری وەعدەدار (مُؤَجَّل)، خولعی بکا، ئەگینا تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر هەر وتی پێی: خولعی ژنەکەم بکە بە ماڵێك و دیاریی نەکرد کە ماڵەکە چییە، ئەوە واجبە خولعی بکا لەسەر ئەندازەی «مَهرالمثل» بە حازر و لە نەقدی وڵاتەکە؛ ئەگەر پێچەوانەی ئەمەی کرد، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «مَهرالمثل»، بینا لەسەر فەرموودەی پشت پێبەسراوی «تُحفە» و «نِهایە» و «مُغنی».

وە ئەگەر وتی: وەکیلم بە ژنەکەم خولع بکە لەسەر سەد دینار و ناوی ژمارەی تەڵاقی نەبرد، ئەویش وتی بە ژنی کابرا: سێ تەڵاقەت کەوتبێ لەسەر سەد دینار و ژنەکە قەبووڵی کرد، ئەوە هەر تەنها تەڵاقێکی ئەکەوێ، مادام کابرا خۆی نەڵێ مەبەستم سێ تەڵاقە بووە، چونکە وەکیل حەقی زیانگەیاندنی نییە بە وەکیلگر بە بێ ئیزنی وەکیلگرەکە خۆی و ئەم وەکیلە لێرەدا کارێکی کردووە بەهۆی سێ تەڵاقەدانی ژنی وەکیلگرەکەوە کە ئەو بە بێ مارە بەجاش ژنەکەی بۆ حەڵال نەبێتەوە؛ کەواتە، هەر ئیعتیبار بە ئەسڵی تەڵاقەکە ئەکرێ کە یەك تەڵاقە.

وە ئەگەر وتی: وەکیلی موتڵەق بە خولعی ژنەکەم بکە لەسەر سەد دینار، ئەویش سێ تەڵاقەی دا لەسەر سەد دینار، ئەوە هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە مەعنای ئاشکرای لەفزی «موتڵەق»، بەرەڵڵاکردنە، هەتاوەکوو لە ژمارەی تەڵاقەکانا.

وە ئەگەر وتی: وەکیلم بە تەڵاقی ژنەکەم بدە، ئەویش خولعی کرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە حەقی «رِجعە»ی لەسەر فەوتاندووە؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: وەکیلی موتڵەقم بە ژنەکەم تەڵاق بدە، ئەوە ئەتوانێ بە خۆڕایی و بە عیوەز و بە حازر و بە قەرز و بە یەك تەڵاقەو سێ تەڵاقە، تەڵاقی بدا؛ ئەگەر کابرا وتی: نیازم لە «موتڵەق» ژمارە نەبووەو بەس هەر بە پارە یا بەخۆڕایی بووە، ئەوە ئەگەر بەڵگەو نیشانە ببێ لەسەر نیازەکەی، وەکوو ئەوە کە وتبێتی: هەرگیز ئەم ژنە سێ تەڵاقە نادەم، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ و سوێند ئەدرێ، ئەگینا بەئاشکرا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام کابرا حەواڵەی دیانەتی

خۆی ئەکرێ، ئەگەر ژنەکە باوەڕی پێبکا، ئەتوانێ لەپێش هێنانەوەی بۆ ژێر نیکاحی خۆی یا پاش عەقدێکی تازە، بڕواتەوە لای.

وە ئەگەر ژنەکە وتی بە وەکیلەکەی: خولعم بۆ قەبووڵ بکە بە دە دینار ـ مەسەلا ـ ئەویش بەوجۆرە بۆی قەبووڵ کرد، ئەوە دروستە و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بەو ئەندازەیە لەسەر خۆی وە ئەگەر بە زیاتر لەو ئەندازەیە قەبووڵی کرد، لەم وەختەدا، ئەگەر ماڵەکەی بەست بە ژنەکەوە، وە بەیانی وەکیلی خۆیشی کرد، ئەوە ژنەکە بائینە ئـەبێتـەوە بـە «مَهرالمثل» و واجبە «مَهرالمثل» بدا بە شووەکەی.

وە ئەگەر ماڵەکەی بەست بە خۆیەوەو بەیانی وەکیلیشی نەکرد، ئەوە هەموو ماڵەکە ئەکەوێتە سەر خۆی وە ئەم خولعە ئەبێ بە خولعی بێگانە؛ جا ئەگەر نیازی ژنەکەی نەبوو، ئەوە واجبە لەسەری هەموو ماڵەکە بدا بە مێردی ژنەکەو ناگەڕێتەوە بۆ سەر ژنەکە بە هیچ وە ئەگەر نیازی ژنەکەی هەبوو، ئەوە لەپاش تەسلیمکردنی پارەکە، ئەتوانـێ هەرچی ژنەکە ناوی بردووە بۆی، داوای لێ بکاتەوەو وەری‌بگرێ لێی.

وە ئەگەر نە ناوی خۆی بردو نە ناوی ژنەکەی برد، ئەوە ئەبێ هەموو ماڵەکە بدا بە مێردی ژنەکە، بەڵام هەرچی ژنەکە ناوی بردووە، لێی وەرئەگرێتەوە.

بێداری! لە هەر مەسئەلەیەکدا خولع ببێ بە سوورەتی خولعی بێگانە، خواه ئەم مەسئەلەیە وەکالەت بێ یا هەر کابرا لەخۆیەوە قەبووڵی خولعی ژنێك بکا، ئەگەر وا رێکەوت ئەو کابرایە لە نەخۆشینی مردنیا قەبووڵی ئەو خولعەی کرد، ئەوە هەرچـی سەرف ئەکات لە سێ‌یەکی ماڵی ئەژمێررێ، جـا ئـەگـەر لە سـێ‌یـەك زیـاد بـوو و میراتبەرەکانیش رازی نەبوون، ئەوە ئەو عیوەزە ئەڕواتە سەر «مَهرالمثل»، جا ئەگەر سێ‌یەکی ماڵەکەی، «مَهرالمثل»ەکەی دەرئەهێنا، ئەوە باشە، ئەگینا هەرچی کەم بێ لە «مَهرالمثل» لە دەستی مێردی ژنەکە دەرئەچێ.

وە دروستە بۆ مێردی ژنەکە ئینسانێکی «ذِمّی» بکا بە وەکیلی خۆی بۆ خولعکردنی ژنەکەی یا تەڵاقدانی بەخۆڕایی؛ هەروەها، دروستە ژنێك بکا بە وەکیلی خۆی و بۆ ژنەکەیش دروستە یەکێ لەمانە بکا بە وەکیلی خۆی بۆ قەبووڵی خولع لە مێردەکەی.

دروستە بە وەکیل‌کردنی کەسێك کە لەبەر نەفامی حیجری لەسەر دانرابێ بۆ خولع‌کردنی ژن، بەڵام دروست نییە بە بێ‌ئیزنی وەلی‌ئەمرەکەی بکرێ بە وەکیل بۆ وەرگرتنی عیوەزی خولعەکە وە ئەگەر کەسێك کردی بە وەکیل، ئەگەر بۆ وەرگرتنی ماڵێکی دیاری بوو وە وەری‌گرت، ئەوە وەرگرتنەکەی دروستە، هەروەها ئەگەر بۆ وەرگرتنی ماڵێك بێ کە لە ئەستۆدا بێ، بەو شەرتە تەعلیقی تەڵاقەکە کرابێ بەوەوە کە ئەم نەفامە لێی وەربگرێ، وەکوو ئەوە مێردی ژنەکە بڵێ پێی: وەکیلم بە بۆ تەڵاقی ژنەکەم بە عیوەز، بەڵام تەعلیقی تەڵاقەکەی بکە بەوەوە کە خۆت ئەو عیوەزەی لێ وەربگری وە ئەگەر بۆ وەرگرتنی ماڵێ بوو لە ئەستۆی ژنەکەدا لە غەیری ئەم سوورەتەدا و وەری‌گرت، ئەوە ئەو وەرگرتنە بەتاڵەو ئەستۆی ژنەکە ئازاد نابێ، هەرچەند وەختی خۆی تەڵاقەکەکەوتووەو ژنەکە بائینە بووەتەوە وە ئەگەر هەردووکیان یەکێکیان کرد بە وەکیل، ئەوە هەر وەکالەتی لایەکی پێ‌ئەکرێ‌و پێویستە ئەوی‌تر یا خۆی حازر بێ یاخود وەکیلێ‌تر بگرێت.

## باسی سیغەی خولع

ئەو لەفزانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون بۆ بابەتی جیابوونەوەی پیاوو ژن لە یەك، ئەمانەن: «طلاق، فِراق، سَراح، اِفتِداء»؛ لەفزی «طلاق» و «فِراق» و «سَراح»، دەست ئەدەن بۆ جیابوونەوە بە عیوەزو بێ‌عیوەز، بەڵام «اِفتِداء» و «مُفاداة»، بریتین لە جیابوونەوە بە عیوەز. بەپێی ئەوەی کە شێخ سولەیمان «الجَمل» گێڕاویەتەوە، خیلاف نییە لەوەدا کە «مُفاداة»یش تەڵاقە و کەس نەیوتووە بە مەعنا هەڵوەشاندنەوەی نیکاحە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە زاهیری فەرموودەی «تُحفه» وەرئەگیرێ؛ بەڵێ، خیلاف هەیە لەوەدا کە ئاخۆ سەریحە لە تەڵاقی بە عیوەزدا، وەکوو لە زاهیرەکەیەوە دەرئەکەوێ، یا هەر لە تەڵاقی رووتا.

لەفزی «خُلع» لە قورئانا نەهاتووە، تەنها لەبەر ئەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿هُنَّ لِباسٌ لَّكُمْ وَ أَنْتُمْ لِباسٌ لَّهُنَّ﴾ و بەهۆی تەڵاق‌دانەوە ئەو لیباسانە دائەڕنرێن لە

خاوەنەکانیان، ئەم لەفزە بەکار هێنراوە؛ لەفزی «خُلع» وەرگیراوە لە «خُلْع» بـەمەعنا دارنین؛ ئەهلی شەرع لەفزی «خُلْع»یان بەکار هێناوە بۆ جیابوونەوەی ژن و پـیاو لە یەکتر بەرابەر بە عیوەز.

بەڵێ، ئیمامە گـەورەکـان خـیلافیان هـەیەلەوەدا ئـاخۆ لەفـزی خـولع بـەمەعنا هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەو ژمارەی تەڵاقی پێ کەم نابێتەوە، یاخود بە مەعنا تەڵاقەو ژمارەی تەڵاق کەم ئەکاتەوە؛ جا ئیمامەکان، جگە لە ئیمامی شافیعی ـخـوایـان لێ رازی بێ ـلەسەر ئەوەن کە سەریحە لە هەڵوەشاندنەوەی نیکاحاو کینایەیە لە تەڵاقا و بە بێنیازی تەڵاق، نابێ بە تەڵاق و لە فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعیداکە لە فەرموودەی تازەوکۆنیدا بەیانی کردووە، سەریحە لە فەسخداو کینایەیە لە تەڵاقداو بە بێنیاز، نابێ بە تەڵاق وە گەلێ لە زانا گەورەکانی مەزهەبی شافیعی ئەم فەرموودەیان هەڵبژاردووە، بەتایبەتی «بلقینی» گەلێ جار فتوای پێداوە، بەشەرتێ ئەو کەسەی ئەم لەفزە بەکـار ئەهێنێ مەبەستی پێی تەڵاق نەبێو تەنها مەبەستی تێکدانی نیکاحەکەو جیابوونەوەی پیاوو ژن بێ؛ بەپێی ئەم فەرموودەیە، ئەگەر ئینسان چەند جارێکیش خولع بکا لەگەڵ ژنەکەیدا بە عیوەز، یا لەگەڵ بێگانەدا، ژمارەی تەڵاقی کەم نابێتەوەو ئەتوانێ ئەو ژنە مارە بکاتەوە.

بەڵام بەهێزترین فەرموودەی ئیمامی شافیعی، ئەوەیە کە لەفزی خولع سەریحە لە تەڵاقێکا کە بەرابەر بە عیوەز بێ و لە فەرموودەیەکیتریا کینایەیە. جا لەسەر ئەساسی ئەو فەرموودە بەهێزەیە، ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: وا خولعم لەگەڵ کردیو ئەویش قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل»، هەرچەند ناوی ماڵیشی نەبردووە، لەبەر ئەوە کە عورف لەنـاو ئـەهلی شـەرعدا لەسـەر ئـەوە دامەزراوە کە لەفزی خولع لە تەڵاقێکا بەکار ئەهێنرێ کە لەسەر عیوەز بێ؛ کـەواتـە، لەفزی خولع ئەبێ بەهۆی جیابوونەوەی ژن و پیاو بەرابەر بە عیوەزێك و مادام ناوی عیوەزەکە نەبراوە، ئەڕواتەوە سەر بڕیاری شەرع کە «مَهرالمثل»ە، بەو شـەرتە کـابرا نیازی داوای قەبووڵکردنی ژنەکەی ببێو ژنەکەیش ژنێکی خاوەن روشد بێ، بەڵام

لەکاتێکا کە باسی عیوەز نەکرابێ، ئەگەر نیازی داوای قەبووڵی ژنەکەی نەبوو، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی»، هەروەها ئەگەر نیازی داوای ئەوەی هەبێ بەڵام ژنەکە نەفام بێ، یاخود بەکارهێنانی ئەم خولعە بە بێناوبردنی عیوەز لەگەڵ بێگانەدابێ، ئەوە هەرچەند کابرا بە تەمای قەبووڵ بێو ئەویش قەبووڵی بکا، تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێ، لەبەر ئەوە دوورە ئەم لەفزە بە بێباسی عیوەز لەگەڵ بێگانەدا، ببێ بەهۆی واجب‌بوونی ماڵ؛ ئەمە، فەرموودەی شێخە لە «تُحفە»دا.

**بێداربن!** مادام شێخ بڕیاری دا لەکاتی ناونەبردنی عیوەزدا پێویستە کابرا بەتەمای قەبووڵ بێ لە ژنەکەیەوە، دەرئەکەوێ لە واقیعدا ناکۆکیو جیاوازی نییە لەبەینی فەرموودەی مەتنی مینهاج و ئەوەداکە لە حاشیەی جەمەلدا ئەیفەرموێت وکورتەکەی ئەوەیە: لەفزی خولع وەختێ ئەبێ بە سەریح لە تەڵاقی بەرابەر بە عیوەزدا کە یەکێ لە سێ شت بێتەجێ: یا ناوبردنی ماڵ؛ مەسەلا، بڵێ: وا خولعم لەگەڵ کردی لەسەر دە دینار؛ یا نیازی عیوەز؛ یا نیازو تەمای قەبووڵ لەلایەنی ژنەکەوە وە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، تەڵاقەکە ئەکەوێ و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە، ئەگەر قەبووڵی خولعەکە بکا.

وە لەوکاتەدا کە کابرا ناوی ماڵی بردووە، ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بەو ماڵە ناوبراوە، هەروەها لە کاتی نیازی کابرادا بۆ ماڵیش، ئەگەر نیازی پیاوەکەو ژنەکە یەکی گرت؛ مەسەلا، ژنەکە بەنیازی کابرا بزانێ و نیازی قەبووڵی خولعەکەی لەسەر ئەو ماڵە بێ کە ئەو نیازی کردووە، یاخود هەر لەسەر نیازی کابرا قەبووڵی بکا وە ئەگەر نیازی قەبووڵی خولعەکەی لەسەر نیازی هەردووکیان جیا بوو لە یەك، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «مَهرالمثل» و لە سوورەتی سێهەما، بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» وە ئەگەر لەم سێ سوورەتەدا ژنەکە قەبووڵی نەکرد، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ.

وە ئەگەر کابرا خولعی کرد لەگەڵ ژنەکەیدا بە بێ یەکێ لەو سێ شتەی کە باسمان کردن، هەرچەند نیازی ئەسڵی تەڵاقیشی نەبێ، بینا لەسەر ئەوە کە خولع سەریحە لە تەڵاقدا، یا لەگەڵ نیازی تەڵاقدا بینا لەسەر ئەوە کە کینایە بێ، تەڵاقەکە بە «رِجعی» ئەکەوێ، هەروەکوو ئەگەر بە دەم نەفیی عیوەز بکاو بڵێت: وا بە بێ‌عیوەز خولعم لەگەڵ

کردی، یا هەر بڵێ: وا خولعم لەگەڵ کردی، یا هەر بڵێ: وا خولعم لەگەڵ کردی، خواه ژنەکە قەبووڵی بکا، یا نە.

**بزانن!** لەسەر ئەو فەرموودەیە کە خولع تەڵاق بێ، لەفزی فەسخ، واتە هەڵوەشاندنەوە، کینایە ئەبێ لە خولعدا، یەعنی لە جیابوونەوەی ژنەکەدا لە پیاوەکە بەرابەر بە عیوەز، هەروەکوو کینایە ئەبێ لە ئەسڵی تەڵاقدا؛ جا ئەگەر نیازی بە هەڵوەشاندنەوە هەر تەڵاق بوو، ئەوە هەر لەسەر نیازی خۆیەتی و تەڵاقی ژنەکە ئەکەوێ بە تەڵاقی «رِجعی» وە ئەگەر نیازی تەڵاقی بەعیوەز بوو، ئەوە پێویستە لەگەڵ ناوبردنی ماڵا نیازی تەڵاقیشی ببێ.

**ئاگاداربن!** لەو شوێنەدا کە لەفزی هەڵوەشاندنەوە لە مەعنای تەڵاقدا بەکار ئەهێنرێ، پێویستە مەیدانی هەڵوەشاندنەوە بە مەعنای خۆی نەبێ، ئەگینا ئەگەر کابرا ئەم لەفزەی لەگەڵ ئافرەتێکدا بەکار هێنا کە عەیبێکی‌وای تیابوو ببێ بە مایەی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح، ئەوە مادام سەریحە لە هەڵوەشاندنەوەدا، نابێ بە کینایەی تەڵاق، وەکوو لە شوێنی خۆیدا بڕیار دراوە.

هەر لەفزێك سەریح بێ لە تەڵاقدا، ئەبێ بە سەریح لە خولعدا مادام لەگەڵ ناوبردنی عیوەزدا بێ و هەر لەفزێك کینایە بێ لە تەڵاقدا، ئەبێ بە کینایە لە خولعدا بەشەرتی ناوبردنی عیوەز و هەر لەفزێك سەریح بێ لە خولعدا، وەکوو لەفزی خولع و «مُفاداة»، ئەوە ئەبێ بە سەریح لە تەڵاقدا و هەرچی کینایە بێ لە خولعدا وەکوو لەفزی هەڵوەشاندنەوە، ئەبێ بە کینایە لە تەڵاقدا، ئەگەر مەجالی مەعنا ئەسڵییەکەی خۆی نەبێ، وەکوو باسمان کرد.

لەفزی «فرۆشتن»، کینایەیە لە خولعدا لەگەڵ عیوەزدا؛ کەواتە، ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: وا نەفسی خۆتم پێ‌فرۆشتی بە مارەییەکەت، وەك ئەوە وایە کە بڵێت: وا تەڵاقەکەتم پێ‌فرۆشتی بە مارەییەکەت، یا بە سەد دینار ـ مەسەلا ـ و ژنەکەیش گورج قەبووڵی بکا.

هەروەها، ئەگەر کابرا بەنیازی خولع بڵێ بە بێگانەیەك: وا ژنەکەی خۆم یا تەڵاقی ژنەکەی خۆم پێ‌فرۆشتی بە سەد دینارو کابرایش قەبووڵی بکا، ئەوە تەڵاقی ژنەکەی

ئەکەویٚ‌و بائینە ئەبیٚتەوە بەو ماڵە وە ئەگەر دوو کەس بە نیازی خولع تەڵاق بە تەڵاقیان کرد و ئەم وتی بەو: وا تەڵاقەکەی خۆمم پیٚ‌فرۆشتی بە تەڵاقی ژنەکـەت و ئـەویش قەبووڵی کردو نیازی قەبووڵی خولعی بوو، ئەوە ژنی هەردووکیان تەڵاقی ئەکـەویٚ‌و بائینە ئەبیٚتەوە بە «مَهرالمثل» یەعنی واجبە هەرکام لەمانە ئەو «مَـهرالمـثل»ە بـدا بـە هاوڕیٚکەی و هیچ لەو ماڵە ناکەویٚتە سەر ژنەکان و ژنەکانیش لەپاش بەسەرچـوونی «عِدّە»یان، ئارەزووی خۆیانە شوو بە هەرکەس بکەن.

سیغەی خولع، یا تەنجیزە، واتـە دەس‌بـەجیٚیـە، یـا تـەعلیقە، واتـە بـەسراوە بـە شەرتیٚکەوە، یا تیٚکەڵە لە هەردووکیان. سیغەی خولعی تەنجیزی، پیٚویستی بە ئیجاب و قەبووڵە، وەکوو ئەوە کابرا بڵیٚ: وا خولعم لەگەڵ کردی لەسەر ئەوەندە، یا: تەڵاقم دای لەسەر ئەوەندە، یا: تەڵاقەکەتم پیٚ‌فرۆشتی بەوەندە و ئەو کەسەیش کە خـولعەکـەی لەگەڵ ئەکریٚ، ئەگەر خاوەن قسە بیٚ، بە لەفز قەبووڵی بکا، وەکوو ئەوە کە بـڵیٚ: وا قەبووڵم کرد، یاخود ئیشارەتیٚکی‌وا بکا کە کەسیٚك لەو بەینەدا بیٚ تیٚی بگا، ئەگەر قسەی پیٚ‌نەئەکراوە هەروەکوو چۆن سیغەی ئیجابەکە سەریح و کینایەی هەیە، قەبووڵەکەیش، سەریح و کینایەی هەیە؛ سەریحەکەی وەکوو ئەوەی کە وتمان؛ کینایەکەشی وەکوو ئەوە بڵیٚت: «باشە» یا: «جوانە»، یا: «مەمنوونم»، یا: «رازیم»، یا: «پیٚم‌خۆشە»، بەو شەرتە هەموو لەگەڵ نیازی مەعنای قەبووڵ‌کردنا بیٚ.

پیٚویستە قەبووڵ بەینی نەکەویٚ لەگەڵ ئـیجابەکـەدا بـە وتـاریٚکـی دریٚژی‌وا کـە پەیوەندی بە خولعەکەوە نەبیٚ، نە بە وتارو نە بە بیٚ‌دەنگی، چ لەلایەنی ئەو کەسەوە قسەی لەگەڵا ئەکریٚ‌و چ لە لاینی غەیری ئەوەوە، وەکوو لە حاشیەی جەمەلدا باسی ئەکا؛ ئەندازەی وتاری دریٚژ ئەوەندەیە بگات بـە حـەوت کـەلیمە قسـەی عـادەتی؛ مەسەلا، «سُبْحَانَ اللّٰهِ، وَ الْحَمْدُ للّٰه، وَ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰهُ، وَ اللّٰهُ أَكْبر»، بە چوار کەلیمەی عادەتی دائەنریٚ، بەم‌شیٚوەیە، پیٚویستە بیٚ‌دەنگییەکەیش ئەوەندە بیٚ جیٚگەی حەوت کەلیمەی عادەتی تیا ببیٚتەوە.

بەڵام زیانی نییە بەین‌کەوتن بە وتاریٚکی کورت یا بە بیٚ‌دەنگییەکی‌واکە کەمتر بیٚ لە حەوت کەلیمە، بەو شەرتە شتیٚکی‌وا لەپیٚشەوە نەبیٚ کە نارەزایی‌و دانەدواوە بگەیەنیٚ،

وەکوو ئەوە لەپاش ئەوەی کابرا وتی: تەڵاقت کەوتبێ لەسەر ئەوەندە، ژنەکە بڵێت: تەڵاق وەرناگرم؛ تەڵاقم ناوێ؛ تەڵاقم بۆ چییە؛ ناماقووڵت کرد؛ بێجات کرد؛ بۆ خۆتت وت؛ جا پاش ئەوەکە یەکێ لەمانەی وت، ئەوسا قەبووڵی بکا، ئەو قەبووڵە بێ‌سوودە، لەبەر ئەوەکە دانەدواوەکەی پێشەوەی ئیجابی کابرای بەتاڵ کردووەتەوە.

جا ئەگەر کابرا لەفزی خولعەکەی وا بە تەنجیز وت: ئەوە «گۆڕینەوە»یە لەگەڵ تێکەڵی تەعلیقدا، چونکە لەمەعنادا ئەو ئیجابە بەسراوە بە قەبووڵی خولع وەرگرەکەوە؛ کەوابوو، هەتاوەکوو ئەو قەبووڵەکەی بەدەما دێت، کابرا ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە.

پێویستە ئیجاب و قەبووڵەکە موافیقی یەکتر بن لە ئەندازەی ئەو ماڵەدا کە لە عەقدەکەدا دامەزراوە؛ کەواتە، ئەگەر وتی بە ژنەکەی: وا خولعم لەگەڵ کردی بە سەد دینارو ژنەکەیش وتی: وا قەبووڵم کرد بە دوو سەد دینار، ئەوە بەتاڵە، هەروەها پێچەوانەی ئەمەیش؛ یا ئەگەر کابرا وتی: وا سێ تەڵاقەم دای بە سەد دینارو ژنەکەیش وتی: وا تەڵاقێکم قەبووڵ کرد بە سێ‌یەکی ئەو سەد دینارە، ئەمەیش بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا وتی: وا سێ تەڵاقم دای بە سەد دینار، ژنەکەیش وتی: وا تاقە تەڵاقێکم قەبووڵ کرد بە سەد دینار، ئەوە دروستەو سێ تەڵاقەی ئەکەوێ‌و سەد دینارەکەیش ئەکەوێتە سەر ژنەکە.

ئەو لەفزانەی کە لە خولعی تەنجیزا گۆڕینەوە ئەگەیەنن، ئەمانەن:

یەکەم، لەفزی «بە»؛ مەسەلا، کابرا ئەڵێت: وا تەڵاقم دای «بە» دە دینار، ژنەکەیش قەبووڵی ئەکا؛

دووەم، لەفزی «لەسەر»؛ مەسەلا، کابرا ئەڵێت: تەڵاقت کەوتبێ «لەسەر» دە دینارو ژنەکەیش قەبووڵی ئەکا

سێهەم، لەفزی «بەشەرتی» لە مەیدانی هاوێشتنە گەردندا؛ مەسەلا، کابرا ئەڵێت: تەڵاقت کەوتبێ «بەشەرتی» ئەوە هیچ لە ماڵت دەرنەکەی، ئەویش قەبووڵی ئەکا؛ ئەم لەفزی «بەشەرتی»یە، لەگەڵ ئەو وتارەدا وا لەدوایەوە پێی ئەڵێن: «شەرتی ئیلزامی»، یەعنی شەرتێك کە بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەوە شتێ بخرێتە گەردنی یەکێکەوە.

درێژەی باسی شەرت ئەمەیە؛ شەرت دوو بەشە؛ یەکەم، شەرتی ئیلزامی؛ دووەم، شەرتی تەعلیقی.

ئەم دوو بەشە فەرقیان هەیە لە لەفزو لە مەعنادا؛ فەرقی لەفزییان ئەوەیە کە یەکەم، بەکار ئەهێنرێ بە لەفزی «بەشەرتی»، یا بە لەفزی «لەسەر»، یا بە لەفزی «بەم قەرارە»، یا بە لەفزی «بەم بڕیارە» و دووەم، بەکار ئەهێنرێ بەهۆی لەفزێکەوە کە هۆی دوودڵی بێ، وەکوو «ئەگەر»، یا «هەرکاتێ»، یا «هەرکەسێ».

فەرقیان لە مەعنایشدا ئەوەیە هەرچی وا لەپێش شەرتەکەوە لە یەکەمدا بە قەرار و بە بێ‌دوودڵی ئەوترێ و شەرتەکەشی لەپاڵا زیاد ئەکرێ؛ مەسەلا، کابرا ئەڵێت: تەڵاقت کەوتبێ بەو شەرتە کوڕەکە بگریتە خۆت، یا بەشەرتێ دوو ساڵ شیری پێ‌بدەی، ئەویش قەبووڵی ئەکا؛ بەڵام هەرچی وا لەپێش شەرتەکەوە لە بەشی دووەما، بە دوودڵییەوە ئەوترێ، یەعنی ئەگەرو نەگەرە؛ مەسەلا، ئەڵێت: تەڵاقت کەوتبێ هەرکاتێ دە دینارم بۆ بێنی و بیژمێریتە دەستمەوە.

لەسەر ئەم ئەساسە، ئەو کابرایە کە شەرتی یەکەمی بەدەما دێت، کە لەفزەکەی تەواو کرد، وا ئەزانێ تەڵاقەکەی کەوتووەوکوڕەکەیشی کەوتووەتە سەر ژنەکە بۆی بەخێو بکا وە ئەگەر وا رێ‌بکەوێ شەرتەکەی زیانی پێ گەیشتبێ؛ مەسەلا، نادیاری بێ و یەکێك پێی بڵێت کەوا: «مَهرالمثل» لە ژنەکەی وەرئەگرێ‌وکوڕەکەی ناکەوێتە ئەستۆی ژنەکە، ئەڵێ: بەخوا، من لەسەر ئەو بڕیارە تەڵاقم داوە کە کوڕەکەم بۆ بەخێو بکا، ئەگینا ئەو ژنەم بۆچی تەڵاق ئەدا؟

بەڵام ئەو کابرا کە شەرتی جۆری دووهەمی بەدەما دێت، دڵنیایە لەوە کە تا ژنەکەی پارەکەی بۆ نەهێنێ‌و نەیژمێرێتە دەسیەوە تەڵاقی ناکەوێ و ئەڵێ: با بڕوا ماوەیەك بسووڕێتەوە، کەس فلسی بۆ نادا، ئەوجا دێتەوە مل رائەکێشی.

ئەم فەرقە کە لەبەینی مەعنای ئەم دوو جۆرەدا هەیە هەرچەند زۆر ئاشکرایە، بەڵام بۆ خەڵکی ساویلکە زۆر وردە. پێویستی سەرشانی مەلا ئەوەیە نەکەوێتە پێشیانەوەو ئامۆژگاریی کەس نەکا بۆ کەوتنی تەڵاقەکە یا نەکەوتنی و باش پرسیاریان لێ‌بکا کە

چییان مەبەست بووە؛ جا ئەگەر دەرکەوت کابرای تەڵاقدەر نیازی مەعنای ئیلزامی هەیە، ئەوە دیارە وە ئەگەر ئیددیعای مەعنای تەعلیقی ئەکرد لە لەفزی «بەشەرتی»، یەعنی تا شتەکە جێبەجێ نەبێ تەڵاقەکەی نەکەوێ، ئەوە ئەگەر قەرینەو بەڵگە هەبوو، دیارە لێی وەرئەگیرێ، هەروەها ئەگەر قەرێنە و بەڵگەیش نەبوو؛ ئەوەندە هەیە ئەگەر ژنەکە باوەڕی پێ نەکا، ئەتوانێ سوێندی بدا لەسەر ئەو نیازی خۆیە، چونکە ئەم لەفزی «بەشەرتی»یە ئەگەر موشتەرەکی لەفزی بێ لەبەینی ئەو دوو مەعنایەدا، یەعنی لەبەینی ئیلزامو تەعلیقدا، ئەوە لەسەر نیازی کابرا ئەڕوا ـ با قەرینەو بەڵگەیش نەبێ ـ وە ئەگەر حەقیقەت بێ لە مەعنای ئیلزامدا و مەجاز بێ لە تەعلیقدا، ئەوە ئەگەر قەرینە هەبوو، دروستە مەجازەکەی بگرین وە ئەگەر قەرینەیش نەبوو، هەر لەبەر ئەوە ئەم مەعنا مەجازییە لەناو کوردانا ئەوەندە باوە، ئەگەر کابرا ئیددیعای بکا، ناتوانین بەدرۆیدا بخەینەوە.

بەڵێ، ئەگەر نیازی کابرا مەعلووم نەبوو بۆمان؛ مەسەلا، کابرا مردبوو، یاخود ئەیوت: نازانم مەبەستم چی بووە، ئەمە جێگەی قسەیە؛ "خوا لێخۆشبوو مەلای نۆتشەیی"، لەسەر ئەوەیە کە ئەبڕێ بەسەر شەرتی ئیلزامیدا، ئەڵبەتە ئەفەرموێت: ئەم لەفزە حەقیقەتە لە ئیلزامداو مەجازە لە تەعلیقدا و گەلێکی تر لە زانایان، ئەیبڕن بەسەر مەعنای تەعلیقدا، ئەڵبەتە ئەڵێن: ئەم لەفزە موشتەرەکە لەبەینی هەردوو مەعناکەداو لە تەعلیقدا زۆرتر بەکار ئەهێنرێ بەجۆرێك وەکوو مەعنای عورفی خاسسی لێهاتووە، یاخود ئەڵێن: حەقیقەتە لە تەعلیقدا، یاخود مەجازی مەشهوورە و لەملایشەوە ئەسڵی بەقای عیسمەت هەیە لە ئارادا.

بزانن! مادام کابرا لەفزی «بەشەرتی»ی بەکار هێنا لە مەعنای شەرتی ئیلزامییا، ئەوە ئەبێ تەماشای ئەو شتە بکەین کەوا لەدوایەوە، ئەگەر هەر سیفەتێکی رووتیوا بوو کە بە کاری عیوەز نەدەهات، وەکوو ئەوەکە بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ بەشەرتێ بڕۆیتەوە بۆ ماڵی باوکت و لەپاش تەڵاقەکە بەم ناوەدا نەسووڕێیتەوە، یا: بەشەرتێ لەپاش تەڵاقەکەت شوو نەکەی بە فڵانکەس، یا: هەر ئامۆشۆمان بکەی، ئەمە ئەم شەرتە پووچ و بێسوودەو تەڵاقەکە بە «رِجعی» ئەکەوێو قەبووڵی ژنەکەیشی ناوێ.

وە ئەگەر شتە بە شەرت گیراوەکە شتێکی‌وا بوو کە بۆ عیوەز ئەشیا، وەکوو ئەوەکە بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ بەشەرتێ کەکوڕەکەم بۆ بەخێو بکەیت تا لە خەم ئەڕەخسێ، یا: بە شەرتێ دوو ساڵ شیرم بۆ بدەی بە منداڵەکەت، یا: بە شەرتێ هیچ شتێ لەکەل‌و پەلی خۆت لە ماڵەکەم دەرنەکەی، یا: هیچ لە ماڵم دەرنەکەی‌و مەبەستی ئەو شتانە بێ کە ژنەکە لە ماڵی باوکیەوە هێناویە، ئەوە لەم سوورەتەدا، قەبووڵی دەس‌بەجێی ژنەکەی ئەوێ‌و بەتەنها قەبووڵی ئەو تەڵاقەکە ئەکەوێ و ژنەکە، بائینە ئەبێتەوە بە عەینی ناوبراو، ئەگەر ساغ و مەعلووم بێ، وەکوو مەسئەلەی دوو ساڵ شیردان بە منداڵەکە وە لەسەر «مَهرالمثل»، ئەگەر ناوبراوەکە نادیاری بێ، وەکوو بەخێوکردنی منداڵەکە تا لە خەم رزگاری ئەبێ، یاخود ئەگەر ناوبراوەکە شتێکی نادروست بێ، وەکوو تەپاڵەو شەراب، وەکوو باسمان کرد.

وە ئەگەر کابرا بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ‌و سەد دینارت لەسەرە، ئەوە ئەگەر ژنەکە لەپێشا داوای تەڵاقی کردبێ لە مێردەکەی لەسەر ماڵ‌و ئەویش بەم لەفزە وەرامی بداتەوە، ئەوە ژنەکەی بائینە ئەبێتەوە بەو ماڵە، هەرچەند لەفزی قەبووڵی بەدەما نەیەت، چونکە داواکردنەکەی لەپێشەوە لە جێگەی قەبووڵدایە وە ئەگەر بە بێ‌داواکردنی ژنەکە ئەم لەفزەی وت، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی»، خواه ژنەکە قەبووڵی بکا یا قەبووڵی نەکا و ماڵ ناکەوێتە سەر ژنەکە، لەبەر ئەوە لەگەڵ لەفزی تەڵاقەکەدا لەفزێکی‌وا نەبووە کە ئیلزام‌و خستنە ئەستۆ بگەیەنێ، بەس ئەوەندە هەیە خەبەرێکی بێ‌ئەساسی داوەکە وتوویە: «سەد دینارت لەسەرە» و ئەوەیش بێ‌سوودە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم جوملەیە لە عورفا مەشهوور بووبێ بۆ مەعنای ئیلزام‌گەیاندن و کابرایش ئیددیعای ئەوە بکا کە مەبەستی ئیلزام بووە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ، هەرچەند ژنەکەیش باوەڕی پێ‌نەکا؛ جا ئەگەر قەبووڵی نەکردبوو، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ وە ئەگەر قەبووڵی کردبوو، ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بەو سەد دینارە، وەکوو چۆن ئەگەر بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ لەسەر سەد دینارو ئەویش قەبووڵی بکا.

ئەگەر لەفزەکە لە عورفا مەشهوور نەبوو بۆ گەیاندنی مەعنای ئیلزام و کابرایش ئیددیعای ئەوەی ئەکرد کە مەعنای ئیلزامی مەبەست بووەو ژنەکەیش باوەڕی

پێ ئەکرد، ئەوە ئەگەر ژنەکە قەبووڵی کردبوو، تەڵاقی ئەکەوێ و بائینە ئەبێتەوە بەو ماڵە وە ئەگەر قەبووڵی نەکردبوو، تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر باوەڕی پێ نەکرد، لەم سوورەتەدا، ئەگەر قەبووڵی بە دەما هاتبوو، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە، چونکە کابرا بە پێی ئیقراری خۆی ڕەفتاری لەگەڵ ئەکرێ و بۆ ماڵەکەیش ئەگەر ژنەکە سوێندی خوارد لەسەر ئەوە کە نازانێ کابرا مەبەستی لەم لەفزە ئەوە بووە ماڵ بکەوێتە سەر ئەو، ئەوە ماڵ ناکەوێتە سەری وە ئەگەر سوێندی نەخوارد، کابرا ئەتوانێ سوێند بخوا لەسەر ئیددیعاکەی خۆیو ماڵەکە لە ژنەکە ئەستێنێ.

وە ئەگەر قەبووڵی بە دەما نەهاتبوو، ئەوە ئەگەر ژنەکە سوێندی خوارد لەسەر ئەوە کە نازانێ بەوە مێردەکەی نیازی ئەوەی بووە ماڵ بکەوێتە ئەستۆی ئەم، تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێو ماڵیش ناکەوێتە سەر ژنەکە؛ ئەگەر ژنەکە سوێندی نەخوارد، ئەمجار کابرا سوێند ئەخوا لەسەر ئەوە کە مەبەستی ئیلزامی ماڵ بووە، ئیتر تەڵاقەکەی ناکەوێ وە ئەگەر نکوولیی کرد لە سوێندخواردن، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» بەخۆڕایی.

وە ئەگەر ژنەکە داوای تەڵاقی کرد لە مێردەکەی لە بەرابەری ماڵەوە؛ مەسەلا، وتی: تەڵاقم بدە لەسەر دە مسقاڵە ئاڵتوونە مارەییەکەم وکابرایش گورج وەڵامی دایەوە وتی: تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە گۆڕینەوەیەو تەڵاقەکە ئەکەوێ لەسەر ئەو ماڵە، خواه ژنەکە قەبووڵی بکا، یا نەیکا چونکە داواکردنەکەی لە شوێنی قەبووڵدایە؛ بەڵێ، ئەم جۆرە گۆڕینەوەیە تێکەڵە لەگەڵ «جَعالة»، چونکە ئەو ژنە ئەو پارە بڕیار ئەدا بەرابەر بەوە کە مێردەکەی ئەو «بِضع» (پارچە)یەی وا لەلای پێی بداتەوە؛ کەواتە، هەتا کابرا وەرامی ئەداتەوە، ژنەکە ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە.

وە ئەگەر ژنەکە داوای سێ تەڵاقەی کرد لەسەر سەد دینار، ئەویش یەك تەڵاقی دا لەسەر سێ یەکی ئەو ماڵە، ئەوە تەڵاقیکی ئەکەوێ وە ئەگەر هەر یەك تەڵاقی مابوو، ئەوە لەم سوورەتەدا تەواوی سەد دینارەکەی ئەکەوێ، چونکە مەبەستی ژنەکە ئەوە بووە کە بە جیابوونەوەی تەواو (البَـيْنونةُ الكُـبرىٰ) رزگاری ببێ لە دەستی کابرا و لەم سوورەتەدا، مەبەستەکەی هاتووەتەجێ وە ئەگەر ژنەکە داوای تەڵاقێکی لێ کرد بە سەد

دینار، ئەمیش تەڵاقەکەی دا بە دە دینار، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە دە دینارەکە وە ئەگەر ژنەکە وتی: سبەینێ تەڵاقم بدە بە سەد دینار، ئەویش هەر ئیمڕۆ تەڵاقی دا بە سەد دینارەکە، یا لە سبەینێدا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل»، لەبەر ئەوە ژنەکە سەد دینار ئەدا بەهۆی ئەوەوە کە سبەینێ تەڵاق بدرێ نەك ئیمڕۆ و ئەو دوا خستنە، شەرتە لە عیوزەکەدا و شەرتی وا، عیوەزەکە تێكئەداو ئەیباتەوە سەر «مَهرالمثل».

**بزانن!** هەروەختێ کابرا خولع بکا لەگەڵ ژنەکەیدا وە یا لە مەیدانی تەعلیق بە ماڵدا بائینە بووەوە، ئەوە کابرا حەقی «رِجعه»ی نامێنێ، یەعنی ناتوانێ خۆبەخۆ ژنەکە بهێنێتەوە بۆ ژێر عیسمەتی خۆی و پێویستە سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە، ئەگەر تەڵاقی مابێ؛ بەڵێ، ئەگەر تەڵاقی ژنەکەی دا لەسەر ماڵ بەو شەرتە حەقی گێڕانەوە (رِجعه)ی بێو ژنەکەیش قەبووڵی تەڵاقەکەی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» و ماڵ سابت نابێ.

وە ئەگەر سیغەی خولعەکە بە تەعلیق بوو، وەکوو ئەوە بڵێت: هەر وەختی دە دینارت بۆ هێنام تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەر وەختێ ژنەکە دە دیناری ماڵی خۆی بۆ هێنا، تەڵاقەکەی ئەکەوێو بائینە ئەبێتەوە: لەم سیغەی تەعلیقەدا قەبووڵی ژنەکە پێویستەو کابرایش لەپێش بەجێهاتنی مەبەستەکەیدا حەقی پەشیمانبوونەوەی نییە؛ جا ئەگەر ئەو تەعلیقە، تەعلیق بوو بە شتێکەوە کە هۆیکردن بە موڵك بێ، وەکوو پێدان، ئەوە ئەگەر ئەو لەفزەکە تەعلیقەکە ئەگەیەنێ کاتی تیا نەبوو، وەکوو «ئەگەر»، یاخود کاتی ئەگەیاند بە بێعومووم، وەکوو «کاتێ» و «وەختێ»؛ مەسەلا، کابرا وتی بە ژنەکەی: ئەگەر دە دینارت پێدام، یا: کاتێ دە دینارت پێدام، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە پێویستە دەسبەجێ لەو مەجلیسی تەڵاقدانەدا دە دینارەکەی پێبدا بە بێئەوەو تارێکی درێژ یا بێدەنگییەکی درێژ بکەوێتە بەینی قسەی کابراو تەسلیمکردنی دینارەکانەوە، هەتاوەکوو ئەگەر دینارەکان لەناو سندووقا بوونو ژنەکە دەسبەجێ هەستا بیانهێنێ، بەڵام تا سندووقەکەی کردەوەو پارەکەی هێناو گەیاندی بە کابرا ماوەی وتنی حەوت

کەلیمە تێپەڕ بوو، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ؛ جا ئەگەر لەم سوورەتەدا ژنەکە خۆی [یا وەکیلەکەی] دەس‌بەجێ دە دینارەکەی دایە دەستی [کابرا] یا لە بەردەمیا داینا‌و ژنەکە خۆیشی حازر بوو لەو شوێنەدا، ئەوە ئەو پارەیە ئەبێ بە موڵکی کابرا‌و ژنەکەیش تەڵاقی ئەکەوێ‌و بائینە ئەبێتەوە.

بزانن! پێویستە لەو بەدەستەوەدانیماڵەدا یا لە دانانیا لە بەردەمی کابرادا، چ ژنەکە خۆی داینێ‌و چ وەکیلەکەی داینێ، مەبەستیان تەسلیم‌کردن‌و دانان بێ بەهۆی هاتنەدیی ئەو «مُعلَّقٌ عَلیه»یەوە کە کابرا وتوویەتی؛ کەواتە، ئەگەر ژنەکە وتی: مەبەستم ئەوە نەبوو بیدەمێ بەهۆی تەعلیقەکەوە، بەڵکوو ماڵی خۆی بوو، یاخود بردم بە ئەمانەت هەڵی‌بگرێ بۆم ـ مەسەلا ـ ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر دە دینارت دایە دەستم تەڵاقت کەوتبێ، ئەمە وەکوو تەعلیق بە سیفەتی غەیرە عیوەز وایە، پێویستە ئەو ژنە خۆی بە دەستی خۆی لەگەڵ نیاز‌و زانست‌و ئارەزووی نەفسدا بیداتە دەستی کابرا، هەرچەند کابرا بە زۆر پێی وەربگرن، لەبەر ئەوە ئەو تەعلیقە تەعلیق بوو بە ئیشی ژنەکەوە؛ کەواتە، هەر عەمدو زانست‌و ئیختیاری ژنەکە شەرتە نەك هی پیاوەکەیش؛ تەسلیم‌کردنی ماڵەکە لەلایەن ژنەکەوە بە سەهو یا بە نەزانین یا بە زۆر یا بە دانانی لە بەردەمی کابرادا یاخود تەسلیمی بەهۆی وەکیلەوە، بە هیچ‌جۆرێ سوودی نییە‌و تەڵاقی پێ‌ناکەوێ؛ هەروەها، لە سوورەتێکا کە خۆی تەسلیمی بکا، تەڵاقەکە «رِجعی»یە.

وە کابرا نابێ بە خاوەنی پارەکە لەبەر ئەوە کە نەیوتووە: «بمداتێ»، بەڵکوو وتوویەتی: «بیداتە دەستم» و دانەدەست، بۆ بە موڵك‌کردن نییە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کە مەبەستی بە موڵك‌کردن بووە‌و قەرینەیشی هەبوو؛ مەسەلا، وتی: دە دینارم بکەیتە دەست بۆ ئەوە کە سەرفی بکەم لە پێویستی خۆما، ئەوە وەکوو مەسئەلەی پێشوو وایە‌و کابرا ئەبێ بە خاوەنی پارەکە.

وە ئەگەر کابرا وتی ئەگەر دەدینارم لێ وەرگرتی، ئەوە پێویستە کابرا بە عەمدو زانست‌و ئارەزووی خۆی ئەو پارەیە لە ژنەکە وەربگرێ، هەرچەند زۆر بکەن لە ژنەکە

پێی بداو تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێو کابرا نـابێ بـە خـاوەنی پـارەکـە و هـەر وەختێکیش وەری‌بگرێ، فەرقی نییە، مەگەر کابرا ئیددیعا بکا مەبەستی لە وەرگرتن ئەوە بووە کە ببێ بە موڵکیو قەرینەیشی هەبێ، ئەوە ئەبێ بە خاوەنی پارەکەو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە و پێویستە ژنەکە دەس‌بەجێ پارەکەی لە ماڵی خۆی پێ‌بدا، چـونکە بەشێوەیەکی گشتی، لە هەر شوێنیکا مەبەست کردن بە موڵك بێ (و سیغەی عوموومی نەبێ)، ئەوە پێویستە ژنەکەیش خاوەنی ئەو ماڵە بێ کە ئەیدا بە کابرا، لەبەر ئەوە ئەگەر خۆی خاوەنی ماڵەکە نەبێ، ئەو ماڵە نابێ بە موڵکی کابراو تەڵاقەکە ناکەوێ.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقی خۆت بدە، ئەگەر ئەبی بە زامنی دە دینار بۆم، ئەویش وتی: وا بووم بە زامنی دە دینار بۆ تۆو تەڵاقی خۆیشـم دا، یـاخود وتـی: وا تەڵاقی خۆم داو بووم بە زامنی دە دیناریش بۆ تۆ، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێو بـائینە ئەبێتەوەو کابرایش ئەبێ بە خاوەنی ئەو ئەندازە پارەیە لەسەر ژنەکە وە ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر بووی بە زامنی دە دینار بۆم، تەڵاقت کەوتبێو ئەویش، دەس‌بەجێ وتی: وا بووم بە زامنی دە دینار، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێو بائینە ئەبێتەوەو دە دینارەکەی ئەبێ بە ماڵ بەسەر ژنەکەوە.

ئەگەر وتی: ئەگەر بووی بە زامنی دە دینار بۆم، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش دەس‌بەجێ وتی: وابووم بە زامنی بیست دینار، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە دە دینارەکە و زەمانەتی زیادەکەی ناچێتە سەر و نایشبێ بە کـۆسپ لە رێی کـەوتنی تـەڵاقـەکـەدا، چـونکە موخالەفە لە ماڵدا هەر لە سیغەی گۆڕینەوەدا مانیعی کەوتنەو لە تەعلیقدا مانیع نییەو زیانی نییە، لەبەر ئەوە سیغەی گۆڕینەوە ئیجابو قەبووڵەو ئەبێ موافـیق بـن، بـەڵام لێرەدا تەعلیقە بە بەجێ‌هاتنی شتێکەوە؛ جا مادام ئەو شتە هاتەجێ، ئەوە تەڵاقـەکـە ئەکەوێ، با چەند شتی تریشی لەگەڵدا بێ؛ بەڵێ، ئەگەر بوو بە زامنی کەمتر لەو ماڵە کە کابرا وتوویەتی، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە مەبەستی کابرا نەهاتووەتەجێ.

ئەگەر وتی: ئەگەر مەڕێکی وەهاو وەهات بۆ هێنامو بەیانی سیفاتی سەلەمی تێدا کرد، ئەویش مەڕێکی بۆ هێنا بەو سیفەتانەوەو عەیبی تێدا نەبوو، ئەوە تەڵاقـەکـەی

ئەکەویٚ و ژنەکە بائینە ئەبیٚتەوەوکابرایش ئەبیٚ بە خاوەنی مەرِەکەوە ئەگەر سیفەتەکانی تیابوو بەڵام عەیبدار بوو، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەویٚ و ژنەکە بائینە ئەبیٚتەوە، بەڵام کابرا لەسەر پەیرەوی «فەسادی عیوەز»، ئەتوانیٚ ئەو مەرِە عەیبدارە بداتە دواوەو «مَهرالمثل» بسیٚنیٚ لە ژنەکە وە ئەگەر ئەو سیفەتانەی تیا نەبوو، تەڵاقەکەی ناکەویٚ.

وە ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر مەرِیٚکت بۆ هیٚنام، تەڵاقت کەوتبیٚ، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەویٚ بە هیٚنانی هەر مەرِیٚك کە موڵکی ژنەکە بیٚ (واتە دزیٚنی و زەوتکراو و شتیوا نەبیٚ)، بەڵام نابیٚ بە موڵکی کابرا، چونکە ئەم شویٚنە شویٚنی دەستکەوتنی عیوەزەو دروستیش نییە عیوەز نامەعلووم بیٚ؛ کەوابیٚ، ژنەکە قەرزاری «مَهرالمثل»ی خۆی ئەبیٚ بۆ کابرا.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر دوو ساڵ ئەو کورِەت بۆ بەخیٚو کردم، تەڵاقت کەوتبیٚ، ئەوە ئەگەر ماوەی ئەو دوو ساڵە بەخیٚوی کرد، تەڵاقەکەی ئەکەویٚ و ژنەکە بائینە ئەبیٚتەوە، چونکە بەخیٚوکردنی منداڵ بەعیوەز ئەشیٚ وە ئەگەر وتی: ئەگەر لەئەستۆی خۆتت گرت دوو ساڵ ئەو منداڵەم بۆ بە خیٚو بکەی، تەڵاقت کەوت بیٚ، ئەوە تەڵاقی بەوە ئەکەویٚ کە ئەو ژنە بە سوورەتیٚکی شەرعی بەخیٚوکردنی ئەو منداڵە لەو دوو ساڵەدا بگریٚتە گەردنی خۆی؛ مەسەلا، لەو مەجلیسەدا دەس‌بەجیٚ بڵیٚت: وا نەزرم کرد لەسەر خۆم ئەو منداڵە بەخیٚو بکەم تا دوو ساڵ؛ ئیتر بەوە تەڵاقی ناکەویٚ ژنەکە بڵیٚت: وا قەبووڵم کرد، یاخود: لە گەردنی خۆم گرت، یا: بووم بە زامن، چونکە لە ئەستۆگرتنی شەرعی بەمانە نایەتەدی. جیاوازیی ئەم سوورەتە لەگەڵ سوورەتی پیٚشوودا ئەوەیە لە سوورەتی پیٚشوودا تەعلیق کرابوو بەوەوە کە بەخیٚوی بکا و لەم سوورەتەدا تەعلیق کراوە بە پەیماندان و لە ئەستۆگرتنەوە وە مادام بە نەزری شەرعی پەیمانی دا، دەس‌بەجیٚ تەڵاقەکەی ئەکەویٚ.

ئەگەر وتی بە ژنەکەی: ئەگەر شیرت دا بەکورِەکەم ساڵیٚك، تەڵاقت کەوتبیٚ، پیٚویستە ساڵیٚکی تەواو بەعادەت شیری بداتیٚ، ئەوسا تەڵاقەکەی ئەکەویٚ و بائینە ئەبیٚتەوە؛ ئەمەش تەرجەمەی ئەوەیە کە بە عەرەبی بڵیٚ: «إِنْ أَرْضَعْتِ لي وَلَدي سَنةً، فأَنْتِ طالِقٌ».

شێخی «ابنُ حجر» لە توحفەدا ئەفەرموێت: بە پێی ئەوەکە لەگۆڕینەوەدا قەبووڵ بە دەم یا بە کردەوە پێویستە، ئەبێ لە میسالی شیرپێدانی یەك‌ساڵەدا کافی بێ قەبووڵ بە دەم یا بە کردەوە؛ جا ئەگەر بە دەم بوو، ئەوە دەس‌بەجێ ژنەکە تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر بە کردەوە بوو، لەپاش ساڵێك شیر پێدان تەڵاقەکەی ئەکەوێ؛ هەروەها، فـەرموویەتی: جیاوازی هەیە لە بەینی ئەم میسالەو ئەوەدا کە بـڵێ: «إِنْ دَخَلتِ الدّارَ فَأَنْتِ طَـالِقٌ بألفٍ»، چونکە لێرەدا پێویستە قەبووڵی بەدەم دەس‌بەجێ بێتەدی‌و چوونی ناوماڵەکە لە هەر کاتێکدا بێ، قەیدی نییە، بەڵام لە میسالی شیر پێدانەکەدا بە یەکێ لە دوو شت قەناعەت ئەکرێ، چونکە تەنها یەك شەرتی تیایەکە شیرپێدانە بەڵام بۆنی ماڵ ئەدا، جا جارێ، هێز بە شەرتە رووتەکە ئەدەین‌و جارێ، هێز بەلای گۆڕینەوە ئەدەین، بەڵام لە سوورەتی چوونەماڵەکەدا، دوو شەرتی جیاوازی تیایە، پێویستی یەکێکیان کردەوەیەو پێویستی یەکێکی تریان قەبووڵی دەس‌بەجێیەو ناچارین هەردووکیان بێنەدێ.

دیسان شێخی «ابنُ حجر» فەرموویەتی: هەندێ لە زانایان لە سوورەتی میسالی شیر پێدانەکەدا تەفسیلیان داوە، بەم‌جۆرە ئەگەر خاوەن منداڵەکە لات بێ‌و مەسرەفی دایەنی لەسەر بێ، ئەوە گۆڕینەوەیە و بە قەبووڵی دەس‌بەجێ تەڵاقی ئەکەوێ‌و بائینە ئەبێتەوە.

هەندێ لە "زاناگەورەکانی کوردستانیش"، ئەم فەرموودەیەی توحفەیان بە ئیشکال داناوەو فەرموویانە: ئەگەر لە سوورەتی تەعلیقدا حوکمی گۆڕینەوە ببێ، ئەبێ لەسەر چ دەستوورێك بێ؟ وە لەئەنجاما، بڕیاریان داوە ئەگەر ئەوەی کە ئەداتی تەعلیقەکـەی چووەتە سەر، سیفەتی رووت بێ، وەکوو چوونە ناو مـاڵ، یـاخود کـردەوەیەك بـێ بەسرابێ بە عیوەزەوە، وەکوو پێدانی پارە، ئەوە پێویستە سیفەتەکە بێتەجێ و تەڵاقەکە بە قووبوڵ‌کردن ناکەوێ وە ئەگەر کردەوەیەك بێ کە لە خۆیدا بۆ عیوەز بشێ، وەکوو شیردان بە منداڵ‌و بەخێوکردنی منداڵ‌و لەئەستۆگرتنی سك، ئەوە ئەگـەر دەس‌بـەجێ قەبووڵی کرد، تەڵاقەکە بە قەبووڵ کردنەکە ئەکەوێ وە ئەگەر دەس‌بەجێ قەبووڵی نەکرد، ئەوە پێویستە سیفەتەکە بێتەجێ، وەك لە هەر تەعلیقێکی تردا. لێکۆڵینەوەی وردو ساغ ئەوەیەکە مامۆستای خوا لێ‌خۆش‌بوومان، "ابنُ القَرەداغي " کردوویەتی کە ئەفەرموێت:

شێخی «ابنُ حجر» لە توحفەدا لە فەسڵی «أنتِ طالقٌ وَ عَلَيكِ كَذا»دا، بەئاشكرا فەرموویەتی کە: شۆرەت و ناوبانگ، سیغە ئەکا بە سەریح لە گۆڕینەوەدا، هەرچەند کینایەی تەڵاق ناکا بە سەریح؛ مادام وابوو، بەیانی شێخ لە «إن أَرْضَعْتِ وَلدي»دا لەسەر ئەساسی ئەوەیە بەکارهێنانی لە مەیدانی گۆڕینەوەدا بەناوبانگ بێ، بەجۆرێ کە مەعنای «إن أرضعتِ» ببێ بە «إن الْتَزَمْتِ إرْضاعَ وَلدِي»؛ کەوابوو، چ «إن أَرضعتِ» و چ «إن تَعَهَّدتِ الْحَملَ»، مادام مەشهوور بوون لە عورفی وڵاتەکەدا بۆ گۆڕینەوە، ئەوە لەکاتی بەکارهێنانا ئەگەر ژنەکە دەسبەجێ قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە وە ئەگەر قەبووڵی نەکرد، ئەوە لای مەعنای ئەسڵی لەفزەکە وەکوو تەعلیق تەماشای ئەکرێ، چونکە ئەم لەفزە هەرچەند مەشهوور بووبێ بۆ گۆڕینەوە، بەڵام لای تەعلیقەکەی هەر ماوەتەوە؛ ئەوەندە هەیە ئەبێ کابرایش نیازی گۆڕینەوەی پێ‌ببێ، ئەگینا ناوبانگی رووت سوودی تیا نییە.

**بزانن!** لە سوورەتی خولعدا لەسەر شیر پێدان‌و لەئەستۆگرتنی سك بە سوورەتی تەنجیز بێ یا تەعلیق، ئەگەر شیر پێدانەکە ماوەی شەرعی خۆی تەواو بوو ـ کە دوو ساڵە ـ یاخود پاشماوەی دوو ساڵەکە بوو بە مەعلوومی‌و دیاری کراوی، ئەوە ئەو ژنە بەو شیر پێدانە بائینە ئەبێتەوە وە ئەگەر ماوەکەی دیاری نەبوو؛ مەسەلا، وتی: تا شیر ئەخوا، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» وە ئەگەر بەخێوکردنی منداڵەکە لەسەر ئەساسی بڕیاردانی مەسرەفێکی دیاری‌کراو بێ، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بەو بەخێوکردنە، ئەگینا ئەویش هەر دێتەوە سەر «مَهرالمثل».

**بێداربن!** ئەگەر سیغەی تەعلیقەکە، عموومی کات یا شوێنی ئەگەیاند، ئەوە ـ مُطلَقاً ـ نە لە غەیری گۆڕینەوەو نە لە گۆڕینەوەو نە لە تەسلیم‌کردنی عیوەزەکەدا، دەسبەجێیی پێویست ناکات، وەکوو بڵێ: هەروەختی دە دینارت پێ‌دام، یا لە هەر شوێنێکا دە دینارت بۆ هێنام، تەڵاقت کەوتبێ وە ئەگەر عموومی تیا نەبوو، وەکوو «ئەگەر (إنْ)» و «کاتێ (إذا)»، ئەوە لەگەڵ عیوەزدا، وەکوو: ئەگەر دە دینارم پێبدەی تەڵاقت کەوتبێ، پێویستی بە دەسبەجێییە و بە بێ‌عیوەز، وەکوو چوونە ماڵ،

دەس‌بەجێیی ناوێ؛ ئەم دەستوورەی کە وتمان، بۆ قسەی ئیجابییە و بۆ قسەی سەلبی، هەمووی بۆ دەس‌بەجێیە تەنها «ئەگەر» نەبێ، ئەوە هەتا نائومێد نەبین لەکردنی ئیشەکە، هەر دەوامی هەیەوکار ئەکا، تەنها لە تەعلیق بە «ئەگەر»و بەستنەوەی تەڵاقەکەدا نەبێ بە مەیل و ئارەزووی ژنەکەوە، لەکاتێکا بەگفتوگۆ لەگەڵ ژنەکە خۆیدا بەکار بێت، وەکوو ئەوە کابرا بڵێت: ئەگەر ئارەزووت هەیە، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەم حاڵەدا پێویستە ژنەکە دەس‌بەجێ بڵێ: ئارەزووم هەیە.

ئەو زەمانەتە کە لەم فەسڵەدا بەیانمان کرد، ئەو زەمانەتە نییە کە پێویستی بە ئەسیل و زامن بێ و ئەو زەمانەتەیش نییە کە بەهۆی سیغەی نەزرو لەئەستۆ گرتنەوە بڕواتە ئەستۆی کابراوە، بەڵکوو تەنها لەگەردن گرتنێکە کە بەهۆی قەبووڵی ژنەکەوە دێتەجێ.

ئەگەر سیغەی تەڵاقەکە تێکەڵ بوو لە تەنجیزو تەعلیق، وەکوو ئەوەکە بڵێت: ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ فلانکەس، تەڵاقت کەوتبێ لەسەر دە دینار، ئەوە پێویستە ژنەکە دەس‌بەجێ قەبووڵی بکاو قسەیش لەگەڵ ئەوکەسەدا بکا، ئەوسا تەڵاقەکەی ئەکەوێ؛ ئەم‌جۆرە سیغەیە پێی ئەڵێن: پێکهاتوو لە خولع و تەعلیق، بەڵام ئەو سیغەی تەعلیقە کە خۆی هۆیە بۆ جیابوونەوەی پیاوو ژنەکە لە یەك، وەکوو ئەوەکە بڵێت: ئەگەر دە دینارت پێ‌دام، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە پێی ئەڵێن: خولعی موعەللەق.

## باسی حوکمی هەندێ لەفزکەکورد بەکاریان ئەهێنن

ئەگەر کابرا وتی: هەرچی شەرع ئەتداتێ نەتبێ، یا نەتکەوێ، یا نەیبەی، یا نەتدەمێ، یا بتدەمێ، ئەوە هەموو ئەم لەفزانە بۆ تەعلیقن، بەڵام «نەتبێ» و «نەتکەوێ»، بە زاهیر تەعلیق بە مەحاڵە، چونکە شتێ کە شەرع بیداتێ، چۆن نایبێ یا چۆن نایکەوێ؟! وە تەعلیق بە مەحاڵ لە نەفیا، ئەبێ بەهۆی ئەوەکە تەڵاقەکەی نەکەوێ، جا ئەگەر کابرا بێ مەبەست ئەو لەفزانەی وت، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ وە ئەگەر وتی: مەبەستم ئەوە بووە هەرچی شەرع ئەیداتێ لە عەین یا لە قەرز، نەزری بکا لێم بۆ ئەوە کە حەقی نەمێنێ و هیچی نەکەوێتە سەرم، ئەمە ئەبێ بە تەعلیق بە «ئەگەر» لە مەقامی

ئیسبات و گۆڕینەوەدا، «بِناءً عَلیه»، ئەگەر ژنەکە دەس بەجێ هەرچی هەیەتی لای کابرا لێی نەزرکرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ و بائینە ئەبێتەوە، ئەگینا تەڵاقەکەی ناکەوێ و لە سوورەتی «نەیبەی» و «نەتدەمێ»دا، هەتا کاتی نائومێد بوون لە بردنەکەی یا لە پێدانەکەی، تەڵاقەکەی ناکەوێ، لەبەر ئەوەکە تا ئەوکاتە قابیلە ماڵەکەی بداتێ یا خۆی بیبا.

وە لە سوورەتی «بتدەمێ»دا، هەرکاتێ هەرچی حەقی هەیە بیداتێ، تەڵاقەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر نەیداتێ، ناکەوێ؛ ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ هەرچی شەرع ئەتداتێ ناتبێ، یا ناتکەوێ، یا ناتدەمێ، یا نایبەی، ئەوە ئەم لەفزانە یەکەیەکە وان لە شوێنی جوملەیەکی خەبەریەدا و مەعناکەیان خەبەردانە لەوە هەرچی شەرع ئەیدا بە ژنەکە، نایبێ، یا نایکەوێ، یا نایداتێ، یا نایبا؛ جا ئەگەر ژنەکە لەپێشا داوای تەڵاقی کردبوو لە کابرا لەسەر هەموو حەقی شەرعی خۆی و کابرایش بەم جوملانە لەگەڵ تەڵاقەکەیا جوابی دابووەوە و مەبەستی ئیلزام بوو، یەعنی مەبەستی تەڵاقدانی ژنەکە بوو لەسەر هەرچی حەقی شەرعییەتی، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ و بائینە ئەبێتەوە لەسەر حەقی شەرعی ژنەکە، بەو شەرتە ئاشکرا بێ لایان حەقە شەرعییەکە چییە و لەسەر «مَهرالمثل»، ئەگەر حەقە شەرعییەکە مەعلووم نەبوو لایان وە ئەگەر بە بێ داواکردنی ژنەکە، سەربەخۆ کابرا ئەم جوملانەی وتبوو، ئەوە تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێ و هیچ شتێ ناکەوێتە سەر ژنەکە و ئەم قەیدانە بە پووچ و بێ سوود دەرئەچن.

وە ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کە مەبەستی لەم لەفزانە مەعنای شەرت و ئیلزام بووە، ئەوە ئەو تەفسیلەی کە وتمان لە مەسئەلەی «تەڵاقت کەوتبێ و سەد دینارت لەسەرە»دا، جاری ئەبێ لەم شوێنەشدا لەسەر باوەڕکردنی ژنەکە بە کابراو باوەڕنەکردنی و قەبووڵکردنی تەڵاقەکەو قووبوڵنەکردنی.

وە ئەگەر وتی بە ژنەکە: تەڵاقت کەوتبێ هیچی من و هیچی تۆ، یا بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەوە لەسەر مەعنای ئەسڵی ئەم لەفزە، خەبەردانە بەوە هیچ حەقی لەسەر ژنەکە نییەو ئەویش هیچ حەقی لەسەر ئەم نییە، یەعنی تەڵاقەکەی ئەکەوێ و ئەم خەبەردانە

بێسوودە، بەڵام لە عورفی کوردانا، ئەم لەفزە وەها بەکار ئەهێنرێ کە تـەڵاقـی داوە لەسەر هەموو حەقێکی شەرعی؛ جا ئەگەر کابرا ئیددیعای نیازی ئەم مەعنایە کـردو ژنەکەیش تەڵاقەکەی قەبووڵ کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێو بائینە ئەبێتەوە لەسـەر حەقە شەرعییەکەی، ئەگەر مەعلووم بێ و لەسەر «مَهرالمثل» ئەگەر نامەعلووم بێ وە ئەگەر قەبووڵی نەکرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

## باسی «اِبْراء» (ئازادکردن)

لەم باسەدا چەند ماددەی «ابراء» ئەنووسین کە وەرگێڕاون لە نامیلکەی «التَّلخيصُ الأخْرىٰ» کە شێخی «ابن حجر» ـ ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ نووسیویە.

(یەکەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ بە ژنەکەی: ئەگەر ئازادت کردم، تەڵاقت کەوتبێو ناوی مارەیی نەبردو نیازی مارەییشی نەبووبوو وە ژنەکەیش بڵێ: وا ئازادم کردی، یا وتی: وا ئازادم کردی لە مارەییەکەم و نەیزانی مارەییەکەی چەندە، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ.

ئەگەر لەم سوورەتەدا ژنەکە وتی: ئازادم کردی لە دە دینارە مارەییەکەم و لە دوو دینارە قەرزەکەیشم کە لەسەرتە، یا وتی: ئازادم کردی لە هەرچی قەرزم هەیە لەسەرت و ئەیشیزانی چەندی لەسەریەتی، ئەوە ئەم ئازادکردنانە دروستن و تەڵاقـی ژنـەکـە ئەکەوێ، چونکە ئەوەی کە «مُعلَّقٌ عَليە» بوو ـکە «اِبرا»کـەیە ـ هـاتووەتەجێ، بـەڵام تەڵاقەکە «رِجعی»یە، چونکە کابرا ناوی هیچی نـەبردووەو نـیازیشی نـەکـردووە و شەرتی تەڵاقی بائینە لە تەعلیقدا، ئەوەیە ئەو ژن و مێردە هەردووکیان بزانن بەو شتانە کە کابرا ئەیەوێ ئازاد ببێ لێیان؛ بەڵێ، لەم ماددەیەدا ئەگەر کابرا نیازی ئازادکردنی لە شتێکی تایبەتی کردبوو و ژنەکەیش هەر نیازی ئەو شتەی کردبوو و باوەڕیان کرد بە یەك لەسەر ئەم مەبەستە، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێو ژنەکەی بائینە ئەبێتەوە بـەرابـەر بـە ئازادکردنی مێردەکەی لەوەی کە مەبەستی بووە.

(دووەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ بە ژنەکەی: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێ و ژنەکەیش ئازادی بکا لەو مارەییە، خواهناوی ببا یا نیازی بگرێتە دڵ، ئەوە

تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە چەند شەرت؛ یەکەم، لە عەینی مەجلیسەکەدا زۆری پێنەچێ ئازادی بکا؛ دووەم، هەردووکیان بزانن مارەییەکە چەندە؛ سێهەم، حەقی زەکاتی تیا نەبێ؛ چوارەم، ژنەکە تەسەڕوفی لە ماڵیا دروست بێ. ئەگەر هاتو ماوەیەکی پێچوو ئەوجا ئازادی کرد، یا زۆری پێنەچوو، بەڵام یەکێکیان نەیئەزانی مارەییەکە چەندە، یاخود ئەیانزانی بەڵام حەقی زەکاتی پێوەبوو، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ؛ بەڵێ، مەگەر تەنها ژنەکە بزانێ مارەییەکە چەندە، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رجعي»؛ هەروەها، ئەگەر ژنەکە نەفام بێ، هەرچەند شەرتەکانی تر هەموو هاتبنەجێ، ئەوە تەڵاقەکەی هەر «رِجعی»یەو کابرایش ئازاد نابێ، بەڵام لە سوورەتی ئەوەدا کە تەنها ژنەکە بزانێ مارەییەکە چەندە، کابرا ئازاد نابێ.

(سێهەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم، تەڵاقت کەوتبێو ژنەکەیش بڵێ وا ئازادم کردیو هیچیان ناونەبردو نیازی شتێکی تایبەتیشیان نەبوو، جا کابرا پاش ئەوە دیسان گورج وتی: تەڵاقت کەوتبێ، ئەمە مەعلوومە تەڵاقەکە موعەللەقەو نەکەوتووە؛ جا ئەگەر کابرا ئەیزانی تەڵاقە موعەللەقەکە نەکەوتووە ئەوە ئەم تەڵاقە دوایییە مونەججەزەی ئەکەوێ بە «رجعي» وە ئەگەر نەیئەزانی کە ئەو تەڵاقە موعەللەقەی نەکەوتووە، ئەوە ئەم تەڵاقەیش ناکەوێ، لەبەر ئەوە کە کابرا ئەم تەڵاقەی بە تەکراری تەڵاقە پێشووەکە داناوە، یەعنی مەبەستی هەر عەینی تەڵاقی ئەوەڵە، نەك تەڵاقێکی جیاواز.

(چوارەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە دە دینارە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێو ژنەکەیش بڵێ: خوا ئازادت بکا، ئەمە بە فکری "ئیمامی غەزالی" و "وەلی عێراقی"و هەندێ لە زانایانی شەرع، کینایەیە لە ئازادکردنا و وەختی سوودی هەیە کە نیازی ئازادکردنی مێردەکەی لەگەڵدا بێ، بەڵام فەرموودەی راستتر ئەوەیە سەریحە لە ئازادکردناو تەڵاقەکەی پێئەکەوێو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بەو ئازادکردنە.

(پێنجەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم، تەڵاقت کەوتبێو ژنەکەیش بڵێ: ئازاد بە لە هەرچی حەقم هەیە لەسەرت، بەڵام هەر ئاگای لە هەندێ لەو حەقانە هەبوو،

نەك لە هەمووی، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ، لەبەر ئەوە کە موعەللەق بووە بە ئازادکردنەوە لە هەموو حەقێك، هەرچی بێ‌و هەرچۆن بێ و لە چوارچێوەی ئەم قسەی ژنەکەدا، ئازاد ئەبێ لەو هەندە حەقە کە ئەو ژنە ئاگای لێ‌بووە، بەڵام تەڵاقەکە «رِجعی»یە نەك «بائِن»، چونکە وەختێ «بائِن» ئەبێ کە ببێ بە گۆڕینەوە و وەختێ ئەبێ بە گۆڕینەوە کە هەردووکیان بزانن بەو ئەندازەیە کە ژنەکە کابرای لێ ئازاد کردووە، «مَع العِلم»، لێرەدا کابرا ئاگای لە هیچی نەبووە.

بەڵام ئەگەر وتی: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش ئازادی کرد لە نیوەی مارەییەکەی، یا ئازادی کرد لە هەمووی، بەڵام هەر ئاگای لە نیوەی مارەییەکە بوو، ئەوە ئەبەدا تەڵاقەکەی ناکەوێ، لەبەر ئەوە کە «مُعلَّقٌ علیه» لەم سوورەتەدا، ئازادکردنە لە هەموو مارەییەکەو ئەوەیش نەبووە.

(شەشەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش ئازادی کرد وە لەپاشا ئیدیعای کرد کە لەکاتی ئازادکردنەکەدا نەیزانیوە مارەییەکەی چەندێ بووە، ئەمە ئەگەر کابرا باوەڕی پێ کرد، دیارە تەڵاقەکەی ناکەوێ وە ئەگەر باوەڕی پێ‌نەکرد، یەعنی وتی: زانیوتە بە مارەییەکەت چەندێ بووە، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە لەسەر قسەی کابرا، چونکە کابرا ئیدیعای دامەزرانی ئازادکردنەکە ئەکا؛ ئەمە لەبارەی تەڵاقەکەوە، لەبارەی مارەییەیەکەیشەوە، ئەوە ئەگەر ژنەکە لە وەختی عەقدی نیکاحەکەدا زۆر لێ کراو «مُجْبرة» بووبێ‌و بەڵگەیەکیش نەبێ لەسەر ئەوە کە بە مارەییەکەی زانیبێ، ئەوە باوەڕ بە ژنەکە ئەکرێ‌و مارەییەکەی لە کابرا وەرئەگرێ وە ئەگەر کابرا لە ئینکارەکەی خۆی پەشیمان بووەوەو باوەڕی بە ژنەکە کردو وتی: راست ئەکا نەیزانیوە مارەییەکەی چەندە، ئەوە بە بێ گومان، کابرا «تەدیین» ئەکرێ، یەعنی حەواڵەی دینی خۆی ئەکرێ، بەڵام لە قەبووڵ کردنی قسەکەیدا قسەیەك هەیەو جێگای لێ‌ورد بوونەوەیە.

سوورەتی قەبووڵی قسەی ژنەکە، وەکوو ئەوە وایە ئەگەر کەسێ کابرایەکی ئازادکرد لەو قەرزەی کە باوکی بوویەتی لەسەری، لەپاشا وتی: نەمزانیوە ئەو قەرزە چەندە، ئەوە

قسەکەی قەبووڵ ئەکرێ‌و ئازادکردنەکەی بەتاڵە، چونکە دەلیلێك نییە لەسەر ئەوە کە کابرا بە ئەندازەی قەرزەکەی زانیوە، بەڵام ئەگەر خۆی موعامەلەی لەگەڵ کابرایەك کردو قەرزی کەوتە سەری، جا ئازادی کرد لەو قەرزە و لەپاشا، ئیددیعای کرد کە نەیزانیوە قەرزەکە چەندە، ئەوە لێی قەبووڵ ناکرێ.

(حەوتەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر فڵانکەست ئازاد کرد لەو قەرزەت کە وا بەسەریەوە، تەڵاقت کەوتبێ، ژنەکەیش ئازادی بکا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ، بەڵام بە «رِجعی» چونکە ئەم سوورەتە نابێ بە خولعی موعەللەق، لەبەر ئەوە کە لە خولعا پێویستە عیوەزەکە بگەڕێتەوە بۆ مێردەکە و لێرەدا بۆ بێگانەیەك بووە.

(هەشتەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ژنەکەم ئازادی کردم لە مارەییەکەی، تەڵاقی کەوتبێ، ئەمە ئەگەر ژنەکە لەو مەجلیسەدا حازر بوو کە کابرا قسەکەی تیا کردووە، واجبە دەس‌بەجێ ئازادی بکا وە ئەگەر لەو مەجلیسەدا نەبوو و کابرا ویستی خەبەری پێبدا، یا کەسێکی نارد بۆلای ئاگاداری بکا لەم تەعلیقە، ئەوە واجبە لەو کاتەدا کە خەبەرەکەی پێ‌ئەگا، دەس‌بەجێ ئازادی بکا و لەم سوورەتانەدا، تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و بائینە ئەبێتەوە وە ئەگەر کابرا نەیویست خەبەری پێبدا و تەنها ئەوەندە بوو تەعلیقەکەی کردو بەس، ئەوە لەپاش گەیشتنی خەبەرەکە بەو ژنە، شەرت نییە دەس‌بەجێ ئازادی بکا.

(نۆهەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت و لە نەفەقەی ماوەی «عِدّە»ت و لە حەقی موتعەت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش ئازادی بکا لە هەموویان، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، لەبەر ئەوە کە نەفەقەی ماوەی «عِدّە»و حەقی موتعە لەپاش تەڵاق‌کەوتن واجب ئەبن ـ ئەگەر واجب بن ـ و ئێستە هێشتا واجب نەبوون و ئازادکردنیش لە حەقێك کە هێشتا واجب نەبووبێ، مەحاڵە.

جا مادام تەڵاقەکە نەکەوت، ئەگەر ژنەکە مەبەستی لە ئازادکردنی کابرا ئەوە بوو بیکا بە عیوەزی تەڵاقەکەی‌و تەڵاقەکەی پێبکەوێ، ئەوە لەم سوورەتەدا کابرا لە مارەییەکەیش ئازاد نابێ وە ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبوو، بەخۆڕایی کابرا لە مارەییەکە ئازاد ئەبێ.

(دەهەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت و ئەو قەرزەیش کە لەسەرمە دوات‌خست تا ساڵێك، تەڵاقت کەوتبێ و ژنەکەیش وتی: وا ئازادم کردی لە مارەییەکەت و قەرزەکەیشم دوا خست تا ساڵێك، ئەمە ئەگەر کابرا مەبەستی لە دواخستنی قەرزەکە ئەوەبێ ئەو قەرزەی کە حازرییە (حاڵ) ببێ بە وەعدەدار (مُؤَجَّل)، ئەوە مەحاڵەو تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر هەر مەبەستی ئەوەبێ کە ژنەکە رازی ببێ بە دواخستنی قەرزەکە، ئەوە مادام رازی بوو بە دواکەوتنەکەی، «مُعلَّقٌ علیه»یەکە دێتەجێ‌و تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە، چونکە مارەییەکە عیوەزێکی دیارییە.

(یازدەهەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئەگەر کچەکەت بۆ کەفالەت کردم تا دوو ساڵ، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش بڵێ: وا بووم بەکەفیلی تا دوو ساڵ، ئەوە ئەگەر کابرا مەبەستی ئەوەبێ بەخێوکردنی ئەو کچە بکەوێتە گەردنی ژنەکە، بەتەنیا ئەو قسە تەڵاقەکەی ناکەوێ تا بەسوورەتێکی شەرعی نەیگرێتە ئەستۆی خۆی؛ مەسەلا، بە نەزری «بِرّی» نەزر بکا لەسەر خۆی کە ئەو کچەی تا دوو ساڵ بۆ بەخێو بکا؛ جا ئەگەر ئەم نەزرەی کرد، تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە.

(دوازدەهەم)، ئەوەیە کە ژنەکە ئەندازەیەك پارەی حازری مارەیی بەسەر مێردەکەیەوە بێ و مێردەکەی بڵێ: ئەگەر مارەییەکەت کرد بە دە بەش لەسەرم تا دە مانگ ـ مەسەلا ـ مانگی بەشێکی بدەمەوە، ئەوە تەڵاقت کەوتبێ و ژنەکەیش بڵێ: وا کردم بە دە بەش، ئەمە ئەگەر کابرا مەبەستی تەعلیق‌کردنی تەڵاقی ژنەکەی بێ بەوەوەکە ژنەکە مارەییەکە بکا بە دە بەشەوەو دوای بخا تا دە مانگ بەش‌بەش مارەییەکەی پێ‌بداتەوە، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» لە ئاخری دە مانگەکەدا، بەو شەرتە ژنەکە لەم بەینەدا داوای بەشی زیادی لێ‌نەکا وە ئەگەر مەبەستی هەر ئەوە بوو ئێستە ئەو ژنە بەیانی رەزامەندیی خۆی بکا بە دواکەوتن‌و بەش بەش‌کردنی مارەییەکە تا ئەو ماوەیە، ئەوە هەر لەوکاتەدا کە ئەڵێ: وا بەش‌بەشم کرد، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی»، بەڵام بەم قسەیە بەش‌بەش نابێ وە ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ کە ئەم مارەییە حازرە ببێ بە

وەعدەدارو ژنەکە حەقی داواکردنی نەبێ، مەگەر بە پێی ریزی بەشەکان، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە گۆڕینی قەرزی وەعدەدار مەحاڵەو تەعلیق بە مەحاڵ لە ئیسباتا مانیعی کەوتنی تەڵاقە.

بەڵێ، ئەگەر مەبەستی هەر ئەمە بوو حەقّی داواکردنی نەبێ بەوجۆرە نەبێ و ژنەکە نەزری کرد لەسەر خۆی ئەو قەرزەی بەو تەرتیبە لێ وەربگرێتەوەو یارمەتی مێردەکەی بدا، ئەوە بەو نەزرە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە تەڵاقی «رِجعی»؛ ئەمە حوکمی سوورەتی تەعلیق بوو وە ئەگەر کابرا بە تەنجیز بڵێ: وا خولعم لەگەڵ کردی لەسەر بەش‌بەش‌کردنی مارەییەکەت بە دە بەش تا دە مانگو ژنەکە قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل»، بەڵام ئەو بەش‌بەش‌کردنە واجب نییە بێتەجێ، چونکە مادام عیوەزەکە نادروست بوو وە رۆیشتەوە سەر «مَهرالمثل»، ئیتر ئیعتیبار بەو شتە نامێنێ کە بەیانکراوە لە خولعەکەدا، بەڵام ئەگەر لە تەعلیقدا شەرت نەهاتەجێ، ئەوە هەر تەڵاقەکە ناکەوێ.

(سیازدەهەم)، ئەوەیە کە پیاوەکە بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێو ئەویش، بڵێ: وا ئازادم کردی لە هەموو مارەییەکەم و لەوکاتەیشدا مارەیی لەسەر نەمابێ، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە ئازادکردنی شەرعی لەلایەنی ژنەکەوە نەهاتووەتەجێ، مەگەر هەر مەبەست ئەوەبێ بە دەم بڵێ: ئازادم کردی.

(چواردەهەم)، ئەوەیە پیاوەکە بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێو ژنەکەیش ئازادی بکا، بەڵام لەپێش ئەم ئازادکردنەدا پێی لەوە نابێ کە مارەییەکەی نەزر کردووە لە فڵانکەس، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە پێ‌لێنانی ژنەکە بە نەزرکردنی مارەییەکەی لەوکەسە، نایەڵێ ئازادکردنەکە دروستو دامەزراو بێ؛ ئەوەیش کە لە "اَنوار"دا وتراوە گوایە تەڵاقەکە ئەکەوێو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل»، پشتی پێ‌نابەسرێ.

**بزانن!** تەعلیق‌کردنی تەڵاق بە ئازادکردنەوە، خولعە لە بەرابەری عیوەزدا، ئەگەر ژن و مێردەکە هەردووکیان بزانن ئەندازەی ئەو ماڵە کە ژنەکە گەردنی پیاوەکەی لێ

ئازاد ئەکا چەندە و ئازادکردنەکە لە ژنێکی خاوەنفامەوە بێ لە مەجلیسێکا کە پیاوو ژنەکە بەرەورووی یەك دانیشتبن، وەکوو زوو باسمان کرد؛ ئەگەر وا نەبوو، ئەوە تەعلیق بە سیفەتە؛ جا ئەگەر هەردووکیان یا هەر ژنەکە، ئەندازەی ماڵەکەی نەزانی کە مێردەکەی لێ ئازاد ئەکا، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ وە ئەگەر هەر مێردەکە نەیئەزانی، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «رِجعی»، بینا لەسەر فەرموودەی پشت پێبەستراو و بەپێچەوانەی فەرموودەی «اَنوار».

(پازدەهەم)، ئەوەیە ژنەکە پیاوێك حەواڵە کا بۆسەر مێردەکەی مارەییەکەی لێ وەربگرێ و مێردەکەیشی بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش بڵێ: وا ئازادم کردی، لەپاشا کابرای حەواڵەکراو داوای مارەییەکە بکا لە مێردی ژنەکەو شاهید بێنێ لەسەر حەواڵەکە، ئەوە ئەگەر مێردی ژنەکە باوەڕی کرد، یا هەر بێدەنگ بوو، ئەوە تەڵاقی ژنەکەی ناکەوێ، لەبەرئەوە کە مەعلووم بووە ئەو مارەییە لای ژنەکە نەماوە تاگەردنی مێردەکەی لێ ئازاد بکا وە ئەگەر باوەڕی نەکرد بە شاهیدەکانو مارەییەکەی هەر بە ماڵی ژنەکەی زانی، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە پێلێنانی کابرا، لەملایشەوە مارەییەکەی لێ وەرئەگیرێ بۆ ئەوکەسە کە حەواڵەکراوە، چونکە بە شاهید ئیسپاتی حەواڵەکەی کردووە وە ئەگەر کابرا شاهیدی نەبوو لەسەر حەواڵەکەو ژنەکە ئینکاری حەواڵەکەی ئەکرد، ئەوە ئەگەر مێردەکەی هاودەنگی بوو لە ئینکارکردنی حەواڵەکەدا، لەمکاتەدا گومان نییە لە کەوتنی تەڵاقەکەیدا وە ئەگەر ژنەکە ئینکاری حەواڵەکەی کرد، بەڵام مێردەکەی باوەڕی پێ کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ و واجبە لەسەری مادام پێی لێناوە بۆ حەواڵەکە، ئەو مارەییەش بدا بە شەخسی حەواڵە کراو؛ بەڵێ، ئەگەر ژنەکە باوەڕی کرد بە کابرای حەواڵەکراو و مێردەکەی باوەڕی پێنەکرد، ئەوە باوەڕ بە قسەی مێردەکەی ئەکرێ، لەبەر ئەوە کە ئیددیعای دامەزرانی ئازادکردنەکە ئەکا.

(شازدەهەم)، ئەوەیە پیاوەکە بڵێ: ئەگەر ئازادت کردم لە مارەییەکەت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش ئازادی بکا، بەڵام هەندێکی نەزر کردبوو لە کەسێك، ئەوە تەڵاقەکەی

ناکەوێ، لەبەر ئەوە کە ئەو تەڵاقە تەعلیق کراوە بە ئازادکردنەوە لە هەموو مارەییەکە، کەچی لە هەمووی ئازادنەکراوە، جا لەمەوە وەرئەگیرێ هەر مارەییەك کە زەکاتی تیا واجب بێ، ئازادکردن لە هەمووی قابیل نییە و هەر کاتێ ببێ بە «معلَّق علیه» بۆ کەوتنی تەڵاق، ئەو تەڵاقە ناکەوێ، هەرچەند ژنەکە بەدیمەن بڵێ: ئازادم کرد لە هەموو مارەییەکەم، چونکە ئەندازەی زەکاتەکە ماڵی فەقیرو هەژارانەو ئازادبوون لەو ئەندازەیە مەحاڵە.

(حەڤدەهەم)، ئەوەیە ژنەکە داوای تەڵاق بکاو بڵێ بە مێردەکەی: ئەگەر تەڵاقت دام، ئازاد بی لە مارەییەکەم، ئەویش بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ؛ ئەم حاڵەتە سێ فەرموودەی تیا هەیە؛

یەکەم، ئەوەیە تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێ و کابرایش ئازاد نابێ، چونکە تەعلیقکردنی، ئازادکردنەکە بەتاڵ ئەکاتەوە؛ ئەمە لەسەر فتوای «شَیْخَیْن» و «ابنُ المُقری»، لە «ارشاد» و «رَوْض»دا جەزمی پیا نراوە؛

دووهەم، ئەوەیە کە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» وە «سُبْکی» فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە پشتی پێ ئەبەسترێ و «اذرَعی» فەرموویەتی: فەرموودەی هەڵبژاردەیە؛

سێهەم، ئەوەیە بائینە ئەبێتەوە بە ئازادکردن لە مارەییەکەو تەعلیقی ئازادکردنە زیانی نییە بۆ دروستبوونی ئەو ئازاد بوونە.

(هەژدەهەم)، ئەوەیە ژنە کە بڵێ: ئازادم کردی لە مارەییەکەم بە شەرتێ تەڵاقم بدەی، ئەویش گورج بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەم سوورەتەدا ژنەکە بائینە ئەبێتەوەو کابرایش ئازاد ئەبێ لە مارەییەکە، هەروەها ئەگەر کابرا لەجیاتی تەڵاقدانەکە بڵێ: قەبووڵم کرد، چونکە مادام ئازادکردنی ژنەکە بەرابەر بە تەڵاقەکەیە، قەبووڵی کابرا بۆ ئەم ئازادبوونە ئەبێ بە ئیلتیزامی تەڵاقەکە، بەو شەرتە مەبەستی لەم لەفزە کە ئەڵێ: قەبووڵم کرد، ئەوەبێ کەوا: تەڵاقم دای لەسەر ئەو ئازادکردنەم لە مارەییەکە.

(نۆزدەهەم)، ئەوەیە ژنەکە ئەڵێت ئازادم کردی لە مارەییەکەم، دەی تەڵاقم بدە، ئەویش ئەڵێ: تەڵاقت کەوتبێ ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی»و کابرایش ئازاد

ئەبێ، لەبەر ئەوە کە ئازادکردنەکە نەبەسراوە بە تەڵاقەکەوەو تەڵاقەکەیش نەبەسراوە بە ئازادکردنەکەوە، بەڵکوو ئەو ئازادکردنە جوملەیێکی سەربەخۆیە؛ بەڵێ، ئەگەر ژنەکە بڵێت: مەبەستم ئازادکردن بووە لە بەرابەری کەوتنی تەڵاقەکەمەوە بۆ ئەوە ئەو کابرایە حەقی گەڕانەوەی نەمێنێ و کابرایش، باوەڕی پێ کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە.

(بیستەم) ئەوەیە کابرا بڵێ بە ژنەکە: تەڵاقت کەوتبێ، دەی تۆیش ئازادم بکە لە مارەییەکەت، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە ریجعی و ژنەکە ئارەزووی خۆیەتی، وەکوو ئەتوانێ ئازادی بکا، ئەشتوانێ ئازادی نەکا؛ بەڵێ ئەگەر ژن و پیاوەکە یەك کەوتن لەسەر ئەوە کە کابرا نیازی تەڵاق بووە لە بەرابەری ئازادکردنەکەوەو ژنەکەیش مەبەستی ئازادکردن بووە لە بەرابەری تەڵاقەکەوە و هەردوو باوەڕیان کرد بە یەك و ژنەکەیش ئازادی کرد، ئەوە گومان نامێنی لەوەدا کە ئەو ژنە بائینە ئەبێتەوە وە ئەگەر کابرا ئیددیعای ئەو بەرابەرکێیەی کردو ژنەکە باوەڕی پێ نەکردو ئازادیشی نەکردبوو، ئەوە وادیارە تەڵاقەکە بە «رِجعی» ئەکەوێ، چونکە بەئاشکرا کابرا بە بێ قەیدو شەرت تەڵاقی داوە.

(بیست و یەکەم)، ئەوەیە کابرا بڵێ بە ژنەکەی: ئازادم بکە لە مارەییەکەت، تەڵاقت ئەدەم، ژنەکەیش ئازادی بکاو کابرایش بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ، یا کابرا بڵێ: تەڵاقت بە دامەزرانی ئازادکردنەکەت، یا بە ئازادکردنەکەت، یا ئەگەر ئازادکردنەکەت دروست بێت تەڵاقت کەوتبێ، ئەمە مەعنا دیارییەکەی ئەوەیە کابرا وەعدی داوە بە ژنەکە ئەگەر ئازادی بکا، ئەمیش تەڵاقی بداو ژنەکەیش کابرای بە سافی ئازادکردووە بە بێ ئەوە موقابەلەی بکا بە تەڵاقەکەوە؛ کەوابێ، ئەو ئازادکردنەی دروست بووەو لەملایشەوە کابرا تەڵاقەکەی داوە.

جا لەو سوورەتەدا کە کابرا ئەڵێ: ئەگەر ئەو ئازادکردنەت دروست بێت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەگەر لەڕاستیدا ئەو ئازادکردنەی دروست بوو، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ، ئەگینا ناکەوێ. و لە سوورەتی: تەڵاقت بە دامەزرانی ئازادکردنت، یا: تەڵاقت بە

ئازادکردنت، دا «بُلقینی» فەرموویەتی: ئەگەر کابرا مەبەستی تەعلیقکردنی تەڵاقەکەی بێ بە دامەزرانی ئازادکردنەکەیەوە، ئەوە مادام ئازادکردنەکە دروست بووبێ، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» وە ئەگەر دروست نەبووبێ، تەڵاقەکەی ناکەوێ وە ئەگەر مەبەستی تەنجیزی تەڵاقەکەی بێ بەرابەڕ بەو ئازادکردنە بە بێ تەماشاکردنی مەعنای تەعلیق، ئەوە تەڵاقەکەی بە «رِجعی» ئەکەوێ، خواه ئازادکردنەکە دروست بووبێ یا نە؟

وە ئەگەر موتڵەق بوو و بەیانی هیچ مەبەستێکی تایبەتی نەکرد، ئەوە وا دیارە ئەبڕِرێ بەسەر تەعلیقدا؛ کەوابوو، ئەگەر ئازادکردنەکە دروست بووبێ، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رِجعی» ئەگینا ناکەوێ وە ئەگەر ژنەکە وتی: مەبەستم لەو ئازادکردنە ئەوە بوو کە لە بەرابەری تەڵاقەکەوە بێو ویستم بیبەستم بە تەڵاقەکەمەوەو مێردەکەشی موافەقەی بکا لەسەر ئەم نیازەی و خۆیشی هەم، مەبەستی جوابی ژنەکەی بووبێ لەسەر ئەساسی بەرابەرکردنی تەڵاق بە ئازادی، ئەوە ئەبێ بە خولعو ژنەکە بائینە ئەبێتەوە و لەسەر ئەم سوورەتە حەمل ئەکرێ ئەوەی کە «طَبَری» بە موتڵەقی فەرموویەتی: ئەو سوورەتە خولعەو ژنەکەی تیادا بائینە ئەبێتەوە.

بێدار بن! ئەو تەعلیقە کە «بُلقینی» باسی کردووە لە سوورەتی: تەڵاقت بە ئازادکردنت، دا، مەعنایێکە عورفی، ئەگینا لەسەر ئەساسی ئەسڵی مەعنای لەفزەکە نییە.

بزانن! ئەگەر کابرا وتی: من، کە وتم بە ژنەکەم: تەڵاقت بە دامەزرانی ئازادکردنەکەت، مەبەستم جوابدانەوەی ژنەکەم نەبوو، بەڵکوو هەر قسەیەکی سەربەخۆ بوو، ئەوە لەم سوورەتەدا، ئەگەر ئازادکردن لەلایەنی ژنەکەوە دروست بووبێ، ئەم وەزعە ئەبێ بە خولع، لەبەر ئەوە کە گەردنی کابرا بەری بووە لە مارەییەکە، بەڵام خولعە لەسەر عیوەزی نادروست، لەبەر ئەوە لەپێش لەفزی کابرادا مارەییەکەی لەسەر لاچووە، وەکوو ئەوە کە تەڵاقی بدا لەسەر ئەو مارەییەکە وا لە ئەستۆیدا، کەچی زووتر لە مارەییەکە ئازاد بووبێ وە «مَهرالمثل»ی ئەکەوێتە سەر ژنەکە.

وه ئه‌گه‌ر ئازادکردنه پێشووه‌که‌ی دروست نه‌بووبێ، ئه‌وه ئه‌گه‌ر ژنه‌که جوابی قسه‌ی کابرای دابێته‌وه به ئازادکردنێکی ساغ، ئه‌وه بائینه ئه‌بێته‌وه به‌م ئازادکردنه وه ئه‌گه‌ر جوابی نه‌دابێته‌وه له مه‌جلیسه‌که‌دا، ته‌ڵاقی ناکه‌وێ.

(بیست و دووهه‌م)، ئه‌وه‌یه کابرا بڵێ به ژنه‌که‌ی: ئه‌گه‌ر ماره‌ییه‌که‌ت پێ به‌خشیم، ته‌ڵاقت ئه‌ده‌م، ئه‌ویش بڵێ: خوا پێت ببه‌خشێ، یا: خوا پێی به‌خشیوی، ئه‌میش بڵێ: ته‌ڵاقت که‌وتبێ، ئه‌وه ئه‌گه‌ر ژنه‌که مه‌به‌ستی له‌و له‌فزه ئازادکردنی مێرده‌که‌ی بووبێ له ماره‌ییه‌که‌ی، کابرا ئازاد ئه‌بێ و ته‌ڵاقه‌که‌ی به «رِجعی» ئه‌که‌وێ وه ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستی ئازادکردنی نه‌بووبێ، کابرا ئازاد نابێ؛ ئه‌مجا ئه‌گه‌ر کابرا مه‌به‌ستی ئه‌وه نه‌بووبێ که ته‌ڵاقه‌که‌ی ببه‌ستێ به ئازادکردنه‌که‌وه، به‌ڵکوو هه‌ر سه‌ربه‌خۆ ته‌ڵاقی دابێ، ئه‌وه ته‌ڵاقه‌که‌ی ئه‌که‌وێ به «رِجعی» وه ئه‌گه‌ر ئه‌میش هه‌ر مه‌به‌ستی به‌ستنی ته‌ڵاقه‌که بێ به ئازادکردنه‌که‌وه، ئه‌وه مادام ئازاد نه‌بووه، ته‌ڵاقه‌که‌یش ناکه‌وێ.

وه ئه‌گه‌ر ژنه‌که مه‌به‌ستی به‌و له‌فزه ئه‌وه بووبێ: ئازادت ئه‌که‌م، ئه‌گه‌ر ته‌ڵاقم بده‌ی، ئه‌وه عه‌ینی ئه‌و خیلافه که رابورد له ته‌علیقی ئازادکردندا به ته‌ڵاقه‌وه، لێره‌یشا روو ئه‌دا و فه‌رمووده‌ی راستتر ئه‌وه‌یه: ئه‌بێ به ته‌علیق[1] و کابرا ئازاد نابێ له ماره‌ییه‌که به‌هۆی ئه‌و له‌فزه‌وه که له مه‌عنای ته‌علیقی به‌خشینی ماره‌ییه‌که‌یه‌تی به ته‌ڵاقدانیه‌وه وه ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستی ژنه‌که به‌و له‌فزه ئازادکردنی کابرا نه‌بوو، یا مه‌به‌ستی ئازادکردنی بوو له غه‌یری ئه‌وه که مێرده‌که‌ی ئه‌یه‌وێ لێی ئازاد ببێ، ئه‌وه ئازاد نابێ؛ جا ئه‌مجار ته‌ماشای ته‌ڵاقه‌که ئه‌که‌ین، ئه‌گه‌ر کابرا به‌خۆڕایی خستوویه‌تی، ئه‌وه ئه‌که‌وێ وه ئه‌گه‌ر به‌رابه‌ر به شتێك خستوویه‌تی که ژنه‌که مه‌به‌ستی نه‌بووه، ئه‌وه ناکه‌وێ، له‌به‌ر ئه‌وه که ژنه‌که قه‌بووڵی نه‌کردووه.

(بیست و سێهه‌م)، ئه‌وه‌یه کابرا بڵێ به ژنه‌که‌ی: ته‌ڵاقت که‌وتبێ له‌سه‌ر ته‌واوی ئازادبوونی خۆم له ماره‌ییه‌که‌ت، ئه‌گه‌ر ژنه‌که له‌و مه‌جلیسه‌دا ده‌س به‌جێ، ئازادی کرد،

---

١. له‌سه‌ر ئه‌و فه‌رمووده‌یه که «ابنُ حجر» پشتی پێ به‌ستووه که ئه‌ڵێ: ته‌علیقکردنی ئازادکردن، ئازادکردنه که به‌تاڵ ئه‌کاته‌وه‌و به‌خشینیش وه‌کوو ئازادکردن وایه؛ به‌ڵام له‌لای هه‌ندێ له زانایانی شه‌رع دروسته‌و ئه‌بێ به خولع.

یا هەر وتی: وا قەبوولّم کرد، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە وە ئەگەر لە هەمان مەجلیسدا، نە بە بێ ئەوەی زۆری پێ بچی قەبوولّی کرد و نە ئازادی کرد، ئەوە تەلاّقی ناکەوێ.

## باسی قەبووڵ کردنی خولع لەلایەن بێگانەوە

مەبەس لە قەبووڵ کردنی خولع لەلایەن بێگانەوە، ئەوەیە ئەو کەسەی کە قەبوولّی خولعەکە ئەکا، نە ژنەکەی بێ و نە وەکیلی ژنەکە، ئیتر هەرچەند باوکی ژنەکە یا برای ژنەکە بێ هەر بە بێگانە ئەناسرێ.

دروستە بێگانە قەبوولّی خولع بکا، هەرچەند ژنەکە پێی ناخۆش بێ، چونکە تەلاّق وا لە دەستی پیاودا و ماڵ لە ئەستۆگرتنیش بەدەست خاوەن ماڵەکەیە؛ مەبەست لەم دروستبوونەیش، ئەوەیە خولعەکە دائەمەزرێ و ژنەکە لە کابرا جیا ئەبێتەوە و مەبەست ئەوە نییە مەباحەو بوونو نەبوونی وەك یەك وایە، چونکە ئەگەر کابرابێگانەکە بە نیازێکی خراپ ئەوە بکا؛ مەسەلا، بیەوێ ماڵی کابرا تێك بچێ، یا منالّەکانی بفەوتێن، ئەوە حەرامە وە ئەگەر مێردی ژنەکە کردەوەی لەگەڵ ژنەکەدا خراپ بێ و ژنەکە بەدەستیەوە پەرێشان بێ، ئەوە خێرەو سوننەتە، بەڵکوو ئەگەر باوکی ژنەکە باوەڕی وابێ کچەکە بەهۆی هاوڕێیەتی مێردەکەیەوە تووشی ناشەرعی ئەبێ، ئەوە زۆرتر خێرە.

خولع وەرگرتنی بێگانە، وەکوو خولع وەرگرتنی ژنەکە وایە لە حوکمدا؛ کەواتە، ئەگەر مێردەکە دەستی کرد بە لەفزی گۆڕینەوە، ئەوە تێکەڵی تەعلیقە لە مەعنادا، هەتا بێگانەکە قەبوولّی ئەکا حەقی هەیە پەشیمان ببێتەوە وە ئەگەر بە لەفزی تەعلیق هێنای، ئەوە حەقی پەشیمانی نییە وە ئەگەر لەلایەنی بێگانەکەوە دەست کرا بە گۆڕینەوە، ئەوە گۆڕینەوەیە بە تێکەڵی لەگەڵ «جَعالە»دا؛ کەواتە، ئەو بێگانەیە ئەتوانێ لەپێش وەرامی کابرادا پەشیمان ببێتەوە.

بەڵێ، لە چەند سوورەتێکدا ئەم جۆرە خولعە فەرقی هەیە لە خولع لەگەڵ ژنەکە خۆیدا؛

یەکەم: ئەوە کە کابرا دوو ژنی ببێ و کابرای بێگانە بەجارێك قـەبووڵی خـولعی هەردووکیان بکا بە سەد دینار ـ مەسەلا ـ ئەوە هەردوو ژنەکە، بائینە ئەبنەوە بەو سەد دینارە، بەڵام ئەگەر ژنەکان خۆیان قەبۆوڵی خولعەکە بکەن بەو سەد دیـنارە، ئـەوە هەردووکیان بائینە ئەبنەوە هەریەکی بە «مَهرالمثل»ی خۆیان.

دووهەم: ئەگەر ژنێ لە نەخۆشی مردنیا قـەبووڵی خـولع بکـا بـە زیـاد لەسـەر «مَهرالمثل»، ئەوە ئەو زیادەیە لە سێ یەکی ماڵەکەی حیساب ئەکرێ، بەڵام ئەگەر بێگانە لە نەخۆشی مردنیا قەبووڵی بکا، ئەوە هەموو ماڵەکە لە سێ یەك حسیب ئەکرێ، وەکوو لەمەوپێش باسمان کرد.

سێهەم: ئەگەر بێگانەیەك وتی بە مێردی ژنەکە تـەڵاقـی بـدە لەسـەر ئـەم مـاڵە زەوتکراوە، ئەویش تەڵاقی دا، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رَجعی»، بەڵام ئەگەر ژنەکە خۆی قەبووڵی بکا، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بە «مهرالمثل».

چوارەم: ئەگەر کابرا خولع بکا لەگەڵ بێگانەیەکدا بەوەی وا لەدەسـتیاو هـیچ لە دەستیا نەبێ، ئەوە تەڵاقەکەی بە «رجعي» ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر ئەمە لەگەڵ ژنەکەدا بێ، تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «مهرالمثل».

پێنجەم: ئەگەر ژنەکە لە وەختی حەیزدا داوای خولع بکا لە مێردەکەی، حەرام نییە تەڵاقی بدا، بەڵام ئەگەر بێگانە داوای خولع بکا، لەوکاتەدا ئەوە حەرامە کابرا تەڵاقی بدا.

بزانن! بە خولعی بێگانە دائەنرێ ئەمەکە دایکی یا باوکی ژنەکە بڵێ بە کابرا: تەڵاقی کچەکەم بدە لەسەر ئەو بەشە مارەییە دواکەوتووەی کە لاتە، لەئەستۆی مندا، واتە من ئەتدەمێ، ئەویش تەڵاقی بدا، ئەوە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» لە ئەستۆی ئەوانا وە ئەگەر نەڵێ لە ئەستۆی مندا، ئەوە تەڵاقەکەی بە «رجعي» ئەکەوێ، چونکە مادام نەیوت لە ئەستۆی منداو بەڵگەیش نییە لەسەر ئەوە کە مەبەست لە مارەیی دواکەوتوو وێنەی ئەو مارەییەیە، ئەوە وای لێ دێتەوە کە بەخۆڕایی تەڵاقی دابێ؛ هەروەها، ئەگەر لەگەڵ ئەو مارەییەدواکەوتووەدا ماڵێکی بێ قابیلەتیش هەبێ، وەکوو درەمێك، هەر حوکمەکە ناگۆڕێو تەڵاقەکە هەر «رجعي»یە و ئەمە؛ نابێ بە خولع لەسەر مەعلووم و مەجهوول

تا بڵێین: درەمەکە ئەکەوێتە سەریان وە مارەییە دواکەوتووەکەیش ئەکەوێتە سەر ژنەکە، لەبەر ئەوە کە ئەو ژنە ماڵی لە ئەستۆی خۆی نەگرتووە وە نایشکەوێتە سەر بێگانەکە، چونکە ئەم بێگانەیە شتێکی نەناسراوی ناو نەبردووە، بەڵکوو ناوی شتێکی بردووە کە لای هەردووکیان ئاشکرایە، کەچی کابرا نایتشتوانێ داوای هەموو ئەو ماڵە مەعلوومەی لێ بکا، چونکە هەمووی نەگرتووەتە ئەستۆی خۆی و کابرایش لەسەر تەنها درەمەکە تەڵاقی ژنەکەی نەداوە.

وە ئەگەر مێردی ژنەکە بڵێت: ئەگەر فڵانکەس ئازادی کردم لەو قەرزەی کەوا لەسەرم، تەڵاقت کەوتبێ، ئەویش ئازادی کرد، ئەو ژنە بائینە ئەبێتەوە؛ هەروەها، ئەگەر بڵێت: ئەگەر فڵانکەس دە دیناری پێدام تەڵاقت کەوتبێ، کابرایش دە دینارەکەی پێدا، ئەوە ژنەکەی بائینە ئەبێتەوە؛ هەروەها ئەگەر بڵێت: وا خولعی ژنەکەی خۆمم کرد لەسەر سەد دینار لەئەستۆی فڵانکەسداو ئەوکەسە دیار نەبوو و لەوکاتەداکە خەبەری پێ گەیشت گورج قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ‌و ژنەکە بائینە ئەبێتەوە.

بزانن! بێگانە ئەتوانێ نەفسی ژنەکە بکا بە وەکیلی خۆی بۆ ئەوە کە قەبووڵی خولعی بکا لە مێردەکەی بە ماڵی ئەم بێگانەیە؛ جا ژنەکە بە ئارەزووی خۆیەتی، ئەتوانێ بە ماڵی ئەم کابرایەو بە وەکالەتی ئەم قەبووڵی خولعەکە بکاو ئەیشتوانێ خۆی بە ماڵی خۆی قەبووڵی خولعەکە بکا.

جا ئەگەر لەم سوورەتەدا، ژنەکە ناوی کەسی نەبرد، نە خۆی‌و نە بێگانە، ئەوە وادیارە خولعەکە لەسەر خۆی بێ، لەبەر ئەوە کە سوودی خولعەکە بۆ خۆیەتی.

ئەگەر بێگانە ـ هەرچەند باوکی ژنەکەیش بێ ـ قەبووڵی خولعەکەی کرد، بەڵام بە درۆ ناوی وەکالەتی ژنەکەی هێنا، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ، چونکە کابرا لەسەر ماڵ تەڵاقی داوە و نە ژنەکەو نە بێگانەکە کەسیان نەیانگرتووەتە ئەستۆی خۆیان؛ بەڵێ، ئەگەر لەمکاتەدا مێردی ژنەکە پێ‌لێ‌بنێ بە وەکالەتی کابرا، یاخود ئیددیعای وەکالەتی ئەوی کرد، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوەو کابرا پارەیشی ناکەوێ وە ئەگەر بە عەینی ماڵی ژنەکە قەبووڵی خولعەکەی کردو بە درۆ ناوی وەکالەتی ژنەکەی برد، یا باوکەکەی بە

درۆ باسی ویلایەتی خۆی کرد لەسەر ژنەکە، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ لەبەر دەلیلی پێشوو وە ئەگەر بەیانی سەربەخۆیی خۆیانیان کرد، ئەوە ئەبێ بە خولع لەسەر زەوتکراوو تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «بائِن» لەسەر «مهرالمثل»و ئەکەوێتە سەر ئەم کەسە بێگانەیە، هەرچەند مێردی ژنەکەیش بزانێ بەوەکە ئەو ماڵە ماڵی ژنەکەیە وە ئەگەر نە ناوی وەکالەت و نە ناوی سەربەخۆییان نەبرد، ئەوە ئەگەر نەیوت: ئەم ماڵە ماڵی ژنەکەیە، تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «مهرالمثل» لەسەر ئەم بێگانەیە وە ئەگەر وتی: ئەم ماڵە ماڵی ژنەکەیە، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «رجعي».

وە ئەگەر باوکی ژنەکە یاکەسێکی تر قەبووڵی تەڵاقی ژنەکەی کرد بە مارەیی ژنەکە، یا لەسەر ئەوەکە مێردەکەی ئازاد ببێ لە مارەییەکەی، یا وتی تەڵاقی ژنەکەت بدەو تۆ ئازادی لە مارەییەکەی، یا لەسەر ئەوەکە تۆ ئازادیت لە مارەییەکەی ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە «رجعي» وە کابرایش ئازاد نابێ لە مارەییەکە، لەبەر ئەوەکە خۆی قوسووری کردووە نەیپرسیوە چۆن بێگانە لەخۆیەوە ئەتوانێ تەسەروف بکا لە مارەیی ژندا؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو بێگانەیە یا باوکی ژنەکە، بوو بە زامنی مارەییەکە بۆ مێردی ژنەکە؛ مەسەلا، وتی: من زامنی ئەوەم کە تۆ ئازاد ببی لە مارەییەکە، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ بە «مهرالمثل» لەسەر ئەم شەخسە زامنە، خواه باوکی ژنەکە بێ یاکەسێکی تر، هەروەها ئەگەر نەبێ بە زامن، بەڵام بەڵگەیەك ببێ لەسەر ئەوەکە مەبەستی لە مارەیی وێنەی مارەییەکەیە، وەکوو ئەوەکە مێردی ژنەکە ژنەکەی حەواڵە بکا بۆ سەر ئەم بێگانەیە بۆ ئەوە مارەییەکەی لێ وەربگرێ و ژنەکە خاوەن روشد بێ یاخود نەفام بێ و کابرا هەر باوکی ژنەکە لەسەر ویلایەتی زاتی خۆی لەباتی کچەکەی حەواڵە بکا بۆ سەر ئەم بێگانەیەکە غەیری باوکەکەیە یا هەر باوکەکەی بێ، جا لەم وەختەدا باوکی ژنەکە ئەبێ بە حەواڵەکراوو حەواڵە لەسەرکراویش و وای لێ دێتەوە کە مێردەکە پێی وتبێ: وا حەواڵەم کردی لەباتی کچەکەت بۆسەر خۆت لەباتی خۆت، چونکە خۆت قەبووڵی خولعەکەت کردووە؛ ئەوە لەم کاتەیشدا، ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» لەسەر ئەم بێگانەیە، هەرکەس بێ.

هەروەها، ئەگەر تەڵاقی ژنەکەی دا لەسەر ئەوەکە حەقی بەخێوکردن (حَضانَت)ی منداڵەکەی نەمێنێ، ئەوە ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مَهرالمثل» لەسەر خۆی، بەڵام حەقی بەخێوکردنەکەی هەر ئەمێنێو ئەتوانێ کرێی شەرعی خۆیشی لە مێردەکەی وەربگرێ؛ هەروەها، ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مهرالمثل»، ئەگەر بێگانە ـباوکی ژنەکە بێ یا یەکێکی تر ـ بڵێت بە مێردەکەی: تەڵاقی ژنەکەت بدە و لەسەر من بێ رازیت بکەم، ئەویش وەرامی بداتەوە وە پێویستە ئەم بێگانەیە «مهرالمثل»ی ژنەکە بدا بەو مێردە.

بزانن! ئەگەر کابرایەك ژنەکەی خولع کرد لەسەر ئەوەکە دوو ساڵ شیر بدا بە منالەکەی، ئەویش قەبووڵی کرد و لەپێش تەواوبوونی دوو ساڵەکەدا ژنەکە یا منداڵەکە مرد، ئەوە بەشی ئەو ماوەیەکە ماوەتەوە لە دوو ساڵەکە، واجب ئەبێ لەسەر ژنەکە بۆ مێردەکەی، بەڵام ئەو بەشە لە «مهرالمثل»ی ژنەکەیە، نەك لەکرێی دایەنێکی وەك ژنەکە خۆی، چونکە ئەو ماوەیەکە ماوەتەوە، هەرچەند بزانرێ چەندێکە، بەڵام چونکە عورفی شەرع لەسەر دوو ساڵە بۆ ماوەی شیردان بە منداڵ، ئەوەی ماوەتەوە بە نەزانراو حیساب ئەکرێو نەزانراویش هەر «مهرالمثل»ە، خواه هەمووی بێ لە سەرەتاوە، یا بەشی خۆی بێ لەم جۆرە شوێنانەدا.

## باسی یەكنەکەوتنی ژن و مێرد لە خولع یا لە عیوەزی خولعدا

ئەگەر ژنەکە ئیدیعای کرد کەوا خولعی لەگەڵ کراوەو بە مێردەکەی وت: تەڵاقت داوم لەسەر ئەوەندەو منیش دەسبەجێ قەبووڵم کردووە و کابرایش وتی: هەر تەڵاقم نەداوی، یا تەڵاقم دای لەسەر ئەو ئەندازەیە بەڵام تۆ قەبووڵت نەکرد، یا قەبووڵت کرد بەڵام بەینیان زۆر بوو و ژنەکەیش شاهیدی نەبوو لەسەر ئیدیعاکەی خۆی، «مَعَ العَلم»، شاهیدی تەڵاقیش هەر ئەبێ دوو پیاو بێ، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، باوەڕ بە کابرا ئەکرێ بە سوێند.

هەروەها، ئەگەر ژنەکە وتی: داوای تەڵاقم کرد لێت بە دە دینارو تۆیش گورج جوابت دامەوە؛ کەواتە، من بائینە بوومەتەوە، ئەویش وتی هەر جوابم نەداویتەوەو

تەڵاقم نەكەوتووە، یا زۆری پێچوو ئەوجا جوابم دایـەوەو تـەڵاقـم بـە «رجـعي» كەوتووە، ئەوە هەر باوەڕ بە سوێندی كابرا ئەكرێ و لە سوورەتی یەكەمدا تـەڵاقـی ناكەوێ‌و لە سوورەتی دووهەما تەڵاقی ئەكەوێ، بـەڵام تـەڵاقـەكـەی «رجـعي»یـە؛ هەروەها، ئەگەر ژنەكە وتی: داوای تەڵاقم لێ كردی بە دە دیناروگوزج جوابت دامەوەو بائینە بوومەتەوە و كابرایش وتی: زۆر درەنگ قسەم كرد بە جۆرێ كە قسەكەم نەئەبوو بە جواب بۆ داواكەی تۆ و تۆیش جوابت نەدامەوە، كەواتە، تەڵاقم ناكەوێ، لێرەیشدا هەر باوەڕ بە سوێندی كابرا ئەكرێ.

وە ئەگەر كابرا ئیددیعای خولعی كردو ژنەكە ئینكاری كرد، كابرا وتی: تەڵاقم داوی لەسەر سەد دیناروگورجیش قەبووڵت كرد و ژنەكەیش؛ وتی: هەر تەڵاقت نەداوم؛ یا: تەڵاقت داوم بەخۆڕایی، یاخود زۆری پێچووە لە بەینی ئیجاب و قەبووڵەكەدا، ئەوە ژنەكە لەسەر ئیعتیرافی كابرا تەڵاقی ئەكەوێ‌و بائینە ئـەبێتـەوە، بـەڵام بـۆ عـیوەزی خولعەكە، ئەگەر كابرا بە شەهادەتی دوو پیاو یا پیاوێك و دوو ژن یا بـە شـەهادەتی پیاوێك لەگەڵ سوێندی خۆیا ماڵەكەی سابت كرد، ئەوە ماڵەكە ئەكەوێتە سەر ژنەكە، هەروەها ئەگەر شاهیدی نەبوو، بەڵام ژنەكەیش سوێندی نەخواردو سـوێنـدەكـەی ڕەدكردەوە بۆ كابراو، كابرا سوێندی خوارد؛ بەڵام ئەگەر كابرا شاهیدی نەبوو و ژنەكە سوێندی خوارد، ئەوە ماڵەكە سابت نابێ و لەم‌وەختەدا؛ ژنەكە مـەسرەف و حـەقی جێگای دانیشتن‌و جل‌و بەرگی ئەكەوێتە سەر كابرا وە ئەگەر بمرێ، كابرا میراتی لێ وەرناگرێ وە ئەگەر كابرا بمرێ، ژنەكە میراتی لێ وەرئەگرێ.

وە ئەگەر ژن و پیاوەكە خۆیان یا وەكیلیان یا یەكێكیان خۆی‌و وەكیلی ئـەویان، قسەیان یەك نەكەوت لە جینسی عیوەزەكەدا، یا لە جۆریا، یا لە سیفەتیا، یا لە وادەی عیوەزێكا كە دوا خرابێ، یا لە ژمارەی تەڵاقدا؛ مەسەلا، ژنەكە ئـەیوت: داوای سـێ تەڵاقم لێ كردووی بە سەد دینار و تۆیش جوابت داومەتەوە و كابرایش وتی: داوای یەك تەڵاقت كردووەو من جوابم داویتەوە و كەسیان شاهیدیان نەبوو، بەڵام بەرامبەری یەكیان گرت، ئەوە پێویستە لەم سوورەتانەدا هەردوولایان سوێند بخۆن بە سوێندێكی

وا ئیسپاتی ئیددیعاکەی خۆیان و نەفیی ئیددیعاکەی ئەویانی تیابێ، جا هەردووکیان یا یەکێکیان یا قازی، مارەییەکە هەڵئەوەشێنێتەوە، ئەمجار «مهرالمـثل» واجب ئـەبێ، هەرچەند زیاتر بێ لەو ئەندازەیەکە کابرا ئیدیعای ئەکا لە ژنەکە.

بەڵێ، لە مەسئەلەی یەکنەکەوتنی قسەیاندا لە ژمارەی تەڵاقدا، باوەڕ بەکابرا ئەکرێ لە ژمارەدا؛ دەی هەر کاتێ پاش سوێندی یەکتریدانەکە سوێندێ‌تری خوارد لەسەر ئەوەکە یەك تەڵاقی داوە، ئەوە یەك تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر کابرا خولعی ژنەکەی کرد لەسەر هەزار و دیاریی نەکرد ئەو هەزارە چییە، بەڵام هەردووکیان یەك جۆریان نیاز کردبوو؛ مەسەلا، هەردووکیان نیازیان هەزار دینار بوو، ئەوە واجب ئەبێ لەسەر ژنەکە، چونکە شتێ لە دڵا بێ وەکوو ئەوە وایە بە دەم وترابێ وە ئەگەر کەسیان نیازی هیچیان نەبوو، ئەوە «مهرالمثل» ئەکەوێتە سەر ژنەکە وە ئەگەر کابرا وتی، مەبەستمان دینـار بووە، ژنەکە وتی: مەبەستمان پەنجایی بووە، ئەوە بینا لەسەر ئەوەکە ئەوەی لە دڵا بێ وەك بە دەم وترابێ وایە، ئەبێ بە جیایی لە عیوەزدا و پێویستە هەردوولایان سوێنـد بخۆن ـ وەکوو زوو بەیانمان کرد ـ ئەمجار «مَهرالمثل» سابت ئەبێ.

وە ئەگەر نیازیان جیا بوو؛ مەسەلا، کـابرا وتـی: مـەبەستم هـەزار دیـنار بـووە و ژنەکەیش وتی: مەبەستم هەزار پەنجایی بووە، ئەوە پێنج ئیحتیمال هەڵئەگرێ؛

یەکەم: هەردووکیان «مُتَصادِق» بن، واتە بکەونە یەك لەسەر نیازەکەیان؛ مەسەلا، کابرا بڵێ: من نیازم دینار بووە و تۆیش راست ئەکەی کە نـیازت پـەنجایی بـووە و ژنەکەیش بڵێ: من نیازم پەنجایی بووەو تۆیش راست ئەکەی کە ئەڵێی نیازت دینار بووە، ئەوە لەم حاڵەدا تەڵاقەکە ناکەوێ.

دووەم: کەسیان نە باوەڕ بەویان بکاو نە بە درۆیدا بخاتەوە، لەم سوورەتەیشدا بە بێ‌سوێندی یەکتری دان ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە «مهرالمثل».

سێهەم: ئەوەیە هەردووکیان یەکتری بە درۆدا بخەنەوە؛ مەسەلا، کابرا ئەڵێت: من نیازم دینار بووەو تۆیش نیازت هەر دینار بووەو بەدرۆ ئەڵێت: نیازم پەنجایی بووە و ژنەکە ئەڵێت: من نیازم پەنجایی بووەو تۆیش هەر نیازت پەنجایی بووەو بەدرۆ ئەڵێت:

نیازم دینار بووە، لەم سوورەتەیشدا «مهرالمثل» ئەکەوێتە سەر ژنەکە بەڵام لەپاش سوێندخواردنی هەردوولایان بۆ یەکتری، لەبەر ئەوە کە هاودەنگن لەسەر دامەزرانی خولعەکەو جیابوونەوەیان لە یەکتری ـ وەکوو «رَشیدی» فەرموویەتی ـ و عیوەزیش لەسەر نیازی هەرکامیان جیایە لە عیوەز لەسەر نیازی ئەویان.

**چوارەم:** کابرا باوەڕ ئەکا بە ژنەکە، بەڵام ژنەکە باوەڕ ناکا بە کابرا؛ مەسەلا کابرا ئەڵێت: من نیازم دینار بووەو تۆیش ڕاست ئەکەی کە ئەڵێی نیازم پەنجایی بووە، ژنەکەیش ئەڵێت: من نیازم پەنجایی بووەو تۆ درۆ ئەکەی کە ئەڵێی نیازم دینار بووە، لەم حاڵەدا ژنەکە بائینە ئەبێتەوە بە زاهیر، لەبەر ئەوەکە سیغەی خولعەکە ڕێکە، بەڵام کابرا ماڵی ناکەوێتە سەر ژنەکە، چونکە لەسەر بەیانی خۆی ئینکاری جیابوونەوەکە ئەکا، مەگەر ژنەکە پەشیمان ببێتەوە بڵێ: من نیازم دینار بووەو تۆیش راست ئەکەی کە ئەڵێت: نیازم دینار بووە، ئەوجارە عەینی دینارەکان ئەکەوێتە سەر ژنەکە.

**پێنجەم:** ژنەکە باوەڕ ئەکا بە کابرا، بەڵام کابرا باوەڕ ناکا بە ژنەکە. مەسەلا، ژنەکە ئەڵێت: من نیازم پەنجایی بووەو تۆیش راست ئەکەی کە ئەڵێت: نیازم دینار بووە، کابرایش ئەڵێ: من نیازم دینار بووەو تۆ درۆ ئەکەیت کە ئەڵێت: نیازم پەنجایی بووە، لەم حاڵەیشدا هەر ژنەکە بائینە ئەبێتەوە، چونکە بە زاهیر سیغەی خولعەکە دامەزراو بووە، بەڵام ماڵ ناکەوێتە سەر ژنەکە، لەبەر ئەوەکە ژنەکە ئینکاری جیابوونەوە ئەکا، مەگەر کابرا لێرەدا پەشیمان ببێتەوەو بڵێت: من نیازم پەنجایی بووەو تۆیش راست ئەکەی هەر نیازت پەنجایی بووە، ئەوە عەینی پەنجاییەکان ئەکەونە سەر ژنەکە.

**بزانن!** یەکنەکەوتنی پیاوو ژن لە نیازدا، هەر ئەوە نییە وەکوو ئەم سوورەتە شتێکی موتڵەق بێ، وەکوو «هەزار» وە خیلافیان لەوەدا بێ کە مەبەستیان لە هەزارەکە چی بووە، بەڵکوو سوورەتی تری زۆرە؛ مەسەلا، وەکوو ئەوە کابرا ژنەکەی تەڵاق بدا لەسەر سەد دینارو ژنەکە قەبووڵی بکا دەس بەجێ و لەپاش ئەوە بڵێت: بە خوا، من پەنجا دینارم گوێ لێ بووەو هەر پەنجا دینارم قەبووڵ کردووە، ئەم حاڵەتەیش ئەو سوورەتانەی تیا تێ ئەپەڕێ کە باسمان کردن.

**بێداربن!** زەبتکردنی باسی خولع، بەمجۆرەیە: تەڵاق، یا «بائن»ە بە عەینی ماڵی ناوبراو، ئەگەر سیغەکەو عیوەزەکە هەردووکیان ساغ بن، یا «بائن»ە بە «مَـهرالمـثل» ئەگەر هەر عیوەزەکە ناساغ و دانەمەزراو بێ، یا بە «رجعي» ئەکەوێ، ئەگەر سیغەکە ناساغ بێو کابرایش خولعەکەی بە تەنجیزکردبێ، یا هەر تەڵاقەکە ناکەوێ ئـەگـەر بەسرابێ بە شتێکەوەو ئەو شتە نەهاتبێتەجێ.

زەبتکردنی باسی تەڵاقیش، بەمجۆرەیە: هەر تەڵاقێ سـێبـەسێ بکـەوێ، ئـەوە «بائن»ی یەکەم پلەیەو بە بێمارە بەجاش (تحليل) ژنەکە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ مێردەکەی وە ئەگەر کەمتر بێ لەسێ تەڵاقە، ئەوە ئەگەر لەپێش چوونەلادا بێ، «مُطلَقاً بـائن»ەو پێویستە ژنەکە بە عەقدێکی تازە مارە بکرێتەوە لەکابرا وە ئەگەر لەپاش چوونەلا بوو، ئەگەر لە بەرابەری عیوەزەوە تەڵاقی دابێ، ئەوەیش هەر «بائن»ەو پێویستە بە عەقدی تازە وە ئەگەر بە بێعیوەز بێ، ئەوە «رجعي»یەو تا «عِدّە»ی ژنەکە تەواو ئەبێ، کابرا سەربەخۆ ئەبێ، ئەتوانێ بیهێنێتەوە ژێر عیسمەتی خۆی.

## باسی تەڵاق

تەڵاق لەشەرعا، بریتییە لە کردنەوەی گرێی نیکاح و ژن و مێردی بەو لەفـزانـەی لەمەولا باسیان ئەکەین. تەڵاق، یا واجبە، وەکوو تەڵاقی کەسێ کە سوێندی خواردبێ نەڕواتە لای ژنەکەی لەماوەیەکداکە زیاتر بێ لە چوار مانگ، بەو شەرتە لە سوێندەکەی پەشیمان نەبێتەوە؛ یا حەرامە، وەکوو تەڵاقی ژنێ کە لە حەیزا بێو عیوەزیش نەدا بە مێردەکەی بەرابەر بە تەڵاقەکە؛ یا سوننەتە، وەکوو تەڵاقی ژنـێ کـە کـابرا نـەتوانـێ بیژێنێو ژنەکەیش چاوپۆشی نەکا لەکەموکوڕیی گوزەرانەکەی؛ یا مەکرووهە، وەکوو تەڵاقی ژنێ کە خاڵی بێ لە ئەسبابی حوکمەکانی پێشوو؛ یا مەباحە، وەکوو تەڵاقی ژنێ کە کابرا زۆر ئارەزووی لێ نەبێو لەزەتی لێ وەرنەگرێ و نەفسیشی مەجالی نەدا بە بێلەزەت لێوەرگرتن رای بگرێ.

تەڵاق لەسەر مەعنای شەرع، تێکەڵە لە بەینی دوو مەعنادا؛

**یەکەم:** بەرەڵڵابوون لە عیسمەتی مێرد و ئەمە سیفەتی ژنە؛

**دووەم:** بەرەڵڵاکردنی ژنەکەیە کە ئەمە سیفەتی پیاوە. جا ئەگەر تەڵاق بەسرا بە ژنەکەوەو کابرا وتی: تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەسەر مەعنای یەکەمە وە ئەگەر بەستی بەخۆیەوەو وتی: تەڵاقم کەوتبێ، ئەوە لەسەر مەعنای دووهەمە و لەسەر هەردوو وەزعەکە سەریحەو تەڵاقی پێ ئەکەوێ.

روکنەکانی تەڵاق پێنجن: مێرد؛ نیاز، سیغە؛ شوێن؛ ویلایەت بەسەر شوێنەکەدا.

شەرتی مێرد بۆ ئەوەی قسەی بڕواو تەڵاقەکەی ڕەوا بێ، ئەوەتە تەکلیفی لەسەر بێ، واتە باڵغ و عاقڵ و زانا بێو بە عەمدی تەڵاقەکە بدا، واتە نیازی تەڵاقی هەبێ و بە ئارەزووی خۆی تەڵاق بدا؛ کەواتە، تەڵاق بە تەنجیز یا بە تەعلیق، دانامەزرێ لە نابالغ و شێت و بێ‌هۆش و سەرخۆشەوە و لە کەسێکەوە کە مەعنای ئەو لەفزە نەزانێ کە تەڵاقەکەی پێ ئەکەوێ و لەلایەنی کەسێکەوە بە زۆرو بە بێ ئارەزووی خۆی تەڵاقی ژنەکەی پێ بدرێ و لە کەسێکەوە کە زمانی هەڵکەوێ.

## باسی تەڵاقی منداڵ و شێت و سەرخۆش

ئەگەر کەسێك ئیددیعای کرد کەوا لەو وەختەدا کە ژنەکەی تەڵاق داوە منداڵ بووە، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند مادام قسەکەی ڕێی تێ بچێ، هەروەها ئەگەر بڵێ: لەوکاتەدا نووستوو بووەو بە دەم خەوەوە ئەو لەفزەی بە دەما هاتووە، یاخود شێت بووەو شێتییەکەشی خەڵك پێی بزانن، یاخود نەخۆشییەکی‌وای بووە کە هۆشی بەخۆیەوە نەبووە، وەکوو پەرکەم‌دار یا گرانەتێ‌دار، مادام دەلیلی لەسەر بوونی ئەو نەخۆشییەی هەبێ، بەڵام بە بێ‌دەلیل لێی قەبووڵ ناکرێ بە ئاشکرا و لە نهێنیشدا، حەواڵەی ئایینی خۆیو خوای خۆیو ئەکرێ و دروست نییە بۆ کەسێك کە باوەڕ بە ئیددیعاکەی بکا شەهادەت بدا لەسەر تەڵاقەکەی؛ هەروەها، باوەڕ بە سوێندی کەسێك ئەکرێ کە ئیددیعای ئەوە بکا کە سەرخۆش بووە بە جۆرێکیوا کە خۆی دەستی لەسەرخۆشییەکەیدا نەبووە، وەکوو ئەوە کە ئیسپات ببێ کەسێك پیاڵەیەك شەرابی

داوەتێ بە ناوی ئاو یا دەرمانەوەو پێی سەرخۆش بووە، بەڵام کەسێك لەخۆیەوە شەرابی خواردبێتەوەو سەرخۆش بووبێ‌و تەڵاقی بەدەما هاتبێ، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە نیازی لۆمەو سەرزەنشتکردن تا نەکا جارێکی تر شەراب بخواتەوەو، بەڵام رقهەستان لە مەزهەبی ئێمەدا نابێ بە مانیعێ کەوتنی تەڵاق، هەرچەند زۆریش رقی هەستابێ.

## باسی پێویستی نیاز

تەڵاق ناکەوێ بە لەفزی کەسێ کە زمانی هەڵکەوێ، یاخود لەفزی تەڵاقەکە بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی بەکارنەهێنێ، بەو رەنگە قسەی کەسێك بگێڕێتەوە، یاخود مەلا بێ‌و کەسێك فێر بکات؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش وتنی لەفزەکەی ئیددیعای کرد کەوا زمانی هەڵکەوتووە، ئەوە بە ئاشکرا لیێ قەبووڵ ناکرێ مادام قەرینەیەکی لەگەڵ نەبێ، بەڵام حەواڵەی خۆی‌و خوای خۆی ئەکرێ و دروستە بۆ ژنەکەی، ئەگەر باوەڕی پێ‌بکا، بچێتەوە لای؛ قەرینە، وەکوو ئەوە کابرا بڵێ بە ژنەکەی: «تۆ حەرامی لەسەر مـن» و بەهۆی ئەم لەفزەوە وا بزانێ تەڵاقی کەوتووە، ئەمجا بە شێوەی خەبەردان بڵێ: ژنەکەمم تەڵاقداوەو مەبەستی ئەوە نەبێ بەو لەفزە تەڵاقی بدا، بەڵکوو مەبەستی گێڕانەوەی قسە رابوردووەکەی بێ، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی تەڵاقدانێکی تازە بێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ؛ بەڵێ ئەگەر مەبەستەکەی لەسەر ئەم ئەساسە بوو کە وایئەزانی بە قسە پێشووەکەی تەڵاقی کەوتووەو ئیتر هەرچەند لەفزی تەڵاقی بەدەما بێت تەڵاقی ناکەوێ، ئەوە لەکەوتنی ئەم تەڵاقەدا، لە راستیدا، قسەی زانایان جیاجیایەو هەندێکیان فەرموویانە تەڵاقی ناکەوێ.

هەروەها، ئەگەر ژنەکە لە شوێنێکی تاریکا بوو و مێردەکەی نەیناسییەوە، یا لە رووناکیدا قسەی لەگەڵ ئەکرد بەڵام بە ژنێکی بێگانەی ئەزانی، چونکە باوکی بە منداڵی لیێ مارەکردبوو، یا قسەی لەگەڵ کۆمەڵە ژنێك ئەکردو ژنەکەی خۆیشی لەناویانا بوو و پێی نەزانی‌و وتی: تەڵاقتان کەوتبێ، ئەوە هەرچەند بەئاشکرا تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام

لەڕاستیدا تەڵاقی ناکەوێ.[١]

## زانینی مەعنای لەفزی تەڵاق پێویستە

ئەگەر کەسێك لەفزی تەڵاقی بەدەما هاتو مەعناکەی نەئەزانی، تەڵاقی ناکەوێ، هەرچەند نیازیشی کەوتنی تەڵاقەکە بێ، چونکە نیازکردنی شتی نەزانراو گوێی نادرێتیو ئیعتیباری نییە؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش بەدەما هاتنی لەفزەکە وتی: مەعنای ئەو لەفزەم نەزانیوە، ئەوە ئەگەر نەخوێندوارێکی دوور لە خوێندەوارانی دین بێ، یاخود لەفزەکە لە زمانی خۆیدا نەبێو لەناو خەڵکیشا مەشهوورو بڵاو نەبێ بۆ مەعنای تەڵاقدان، ئەوە باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێند، ئەگینا بە ئاشکرا لیێ قەبووڵ ناکرێو حەواڵەی خۆیو خوا ئەکرێ، یەعنی لە قازی بەولاوە کەس حەقی نییە بەسەریەوە و ژنەکەیشی مادام باوەڕی پێ‌بکا، دروستە لای بمێنێتەوە.

ئەگەر کەسێك بە گاڵتە بە ژنەکەی وت: تەڵاقت کەوتبێ، یەعنی هەر نیازی بەکارهێنانی لەفزەکە بێو مەعنای مەبەست نەبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، هەروەها لە هەموو موعامەلەیەکی تریشدا.

بێداربن! لە هەموو وەختێکدا نیازکردنی لەفزو مەعنا پێویستە، ئیتر لەفزەکە سەریح بێ یا کینایە بێ، بەڵام لە کینایەدا، وەکوو نیازکردنی لەفزو مەعنا پێویستە، نیازکردنی بەکارهێنانی ئەو لەفزەیش بۆ تەڵاقکەوتنی ژنەکە پێویستە.

---

[١. لەوە ئەچێ ئەم فەرموودەیە هەندێ دژایەتی هەبێ لەگەڵ فەرموودەی «منهاج الطالبين»دا کە ئەفەرموێ: «و لو خاطبها هازلاً أو لاعباً، أو و هو يظنّها أجنبيّة بأن كانتْ في ظلمة أو نكحها له وليه أو وكيله و لم‌يعلم، وقع». (مینهاج کتێبی تەڵاق، فەسڵی سێهەم). هەروەها لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی تری مامۆستا کە لە باسی «باسی هەندێ جۆرە تەعلیق‌کردنی جیاجیا»دا هێناویەتی کە ئەفەرموێ: «وە ئەگەر قسەی کرد لەگەڵ ژنێکدا کە نەیزانی ژنی خۆیەتی، بەو ڕەنگە کە نەیئەناسی، یاخود لە تاریکیدا بوو وە پێی وت: تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ و نەزانین و نەناسینی کابرا یا گومانی بێگانەیی پێ‌بردنی کەڵکی نییە بۆ نەکەوتنی تەڵاقەکە» ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان].

## باسی تەڵاقی کەسێکی زۆر لێ کراو

هەرکەس زۆری لێ کرا بۆ ئەوەی ژنەکەی تەڵاق بداو تەڵاقی دا، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، بە چەند شەرت؛

یەکەم: زۆرکردنەکە بە ناحەق بێ، ئەگینا ئەگەر لەسەر حەق بێ، وەکوو ئەوە کە کابرایەك پێی بڵێ: ژنەکەت تەڵاق بدە ئەگینا ئەتکوژم لە خوێنی باوکماو ئەویش تەڵاقی بدا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ.

دووەم: زۆردارەکە بیترسێنێ کە شتێکی‌وای بەسەرا دێنێ کە ئینسانی عاقڵ تەڵاق‌دانی ژنەکەی پێ‌باشتر بێ لەو کارەساتە، وەکوو ترساندنی بە کوشتنی خۆی یا باوکی یا ئەولادی یا برای یا برادەری یا خزمی یا خزمەتکاری یا بە بریندارکردنیان، یا بە ئازاردانو لێدانیان، هەرچەند بە شەقازلەیەك بێ لەناو خەڵکا، بۆ پیاوێکی خاوەن پایە و رێ‌وشوێن، یا بە حەپس‌کردنی یا بە هەڵساندنی لە مەجلیسی پیاو ماقووڵانا، یا بە فەوتاندنی ماڵێکی‌وای کە بەنیسبەت خۆیەوە ئەهمیەتی هەبێ.

سێهەم: ئەوەیە ترساندنەکەی بە شتێکی‌وا بێ کە ئێستا لەگەڵی بکا، نەك بڵێ: ئەگەر تەڵاقی نەدەی، سبەی واو وات لێ ئەکەم.

چوارەم: ئەوەیە کابرای زۆردار بتوانێ ئەو ئیشە خراپەی لەگەڵ بکا.

پێنجەم: ئەوەیە کابرای زۆرلێ‌کراو نەتوانێ خۆی رزگار بکا لە دەستی ئەوکەسە بە راکردن یا بە پەنابردن بۆ شوێنێك، یا بەهۆی دەسەڵاتەوە.

شەشەم: ئەوەیە باوەڕی وابێ ئەگەر تەڵاقی ژنەکەی نەدا، زۆردارەکە ئەو ئیشەی بەسەرا دێنێ.

حەوتەم: ئەوەیە کابرا هیچ ئەندازە ئارەزوویەکی نەبێ لە تەڵاق‌دانی ژنەکەی و هیچ بەڵگەیەك نەبێ لەسەر شتی‌وا.

ئەگەر تەڵاق‌دانەکەی نیشانەی ئەوەی تیا بوو کە کابرای تەڵاق‌دەر خۆیشی شتێکی بەدەستە، وەکوو ئەوە کە زۆری لێ‌بکەن بە سێ تەڵاقە تەڵاقی بدا، کەچی ئەو بەیەك

تەڵاق تەڵاقی بدا، یا زۆری لێ بکەن بە سەراحەت تەڵاقی بدا، کەچی ئەو بە کـینایە تەڵاقی بدا، یا بە تەعلیق تەڵاقی بدا، کەچی ئەو بە تەنجیز تەڵاقی بدا، یا لەفـزێکـی تایبەتی بەکاربێنێ، کەچی ئەو لەفزێکی تر بەکار بێنێ، ئەوە لەم حاڵەتانەدا تـەڵاقـی ئەکەوێ.

وە مادام شەرتی زۆرداری هاتەجێ، پێویست نییە ئەم کەسە «تَوْرِیە» بکا، یەعنی لەفزێکی وا بەکار بێنێ دوو مەعنای بێ و ئەو مەعنایانە بگرێتە دڵ کە زیان بە تەڵاقەکەی ناگەیەنن، ئەوەندە هەیە پێویستە کابرا لە دڵی خۆیا مەبەستی تەڵاق‌دانو تەڵاق‌کەوتنی ژنەکەی نەبێ.

زۆرلێ‌کردن بۆ کەسێك نابێ بەهۆی تەڵاق‌کەوتن کە زۆر لە خۆی بکرێ تەڵاقـی ژنەکەی بدا، ئەگینا ئەگەر زۆردارێك یەکێکی بە زۆرکرد بە وەکیل کە تەڵاقی ژنەکەی ئەو بداو وەکیلەکەیش تەڵاقی دا، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە ئەم وەزعە نیشانەی ئەوەیە کابرا خۆی مەیل و ئارەزووی هەیە لە تەڵاق‌دانی ژنەکەی.

**بزانن!** زۆر لێ‌کردن، تەنها ئەوە نییە کەسێك زۆر لە کەسێك بکا ـ وەکوو باسمان کرد ـ بەڵکوو ئەگەر وەزعێکی‌وا هاتە پێشەوە کە ئیشێك بە شەرع مەحاڵ بوو بکرێ یا بە عەقڵ مەحاڵ بوو بکرێ، ئەوەیش نایەڵێ تەڵاق بکەوێ، بەو شەرتە کابرا بە تایبەتی ئەو وەزعە نەخاتە پشت‌گوێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد قەرزی فڵانکەس نادەمەوە، یاخود ئیمڕۆ قومار ئەکەم وە حاکمی شەرع ئاگـادار بـوو لێی و بـە زۆر قەرزەکەی پێ‌دایەوە، یا مەنعی قوماری لێ‌کرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد لە ژنەکەی کە ئەبێ نوێژی ئەم نیوەڕۆیە بکەی، کەچی ژنەکەی لە ئەوەڵی نیوەڕۆدا کەوتە حەیزەوە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە بە شـەرع مـەحاڵە، یـەعنی حەرامە، قەرزەکە نەداتەوە یا قومار بکا، یا ئەو ژنە نوێژ بکا تا پاك ئەبێتەوە لە حەیز.

وە ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد کەوا لە سەری فـڵان مـانگا قـەرزی فـڵانکەس ئەداتەوە، یا قەرزەکەی لە فڵانکەس ئەسێنێتەوە، کەچی لەو کاتەدا خۆی یا ئەو کابرا لات‌کەوتن، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، یاخود تەڵاقی خوارد لە فڵان سەعاتا ئەو نانە ئەخۆم و لە پێش ئەوەداکە مەجالێ خواردنی نانەکەی ببێ، نانەکە فەوتا، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

یا کەسێك وایئەزانی قەرزارەکەی دەوڵەمەندەو تەڵاقی خوارد لیێ جیا نابێتەوە تا قەرزەکەی لێ ئەسێنێتەوە، کەچی کابرا لات بوو، یا دەوڵەمەند بوو بەڵام خۆی شاردەوە، یا رای کرد، یا زۆردارێك پەیدا بوو و لە ترسی ئەو نەیتوانی داوای قەرزەکەی لێ بکاتەوە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد وتی شوانی ئەو دێیە ناکەم، یا جووتیاری یا سەپانی ناکەم بۆ فڵانکەس، یا جلی بۆ نادرووم، یا خانووی بۆ دروست ناکەم و ئەو شوێنە زۆردارێکی تیابوو ئەو شتانەی بە زۆر پێ‌کرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، یاخود تەڵاقی خوارد لەو دێیە بار ناکەم، کەچی بە زۆر دەریانکرد، یاخود بارانو لافاو شوێنەکەی وێران کرد و ئەویش ناچار بوو باری کرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

بنچینەی ئەمانە، ئەوەیە هەر کردارێك کە «معلَّقٌ علیه»بێ بۆ کەوتنی تەڵاق، ئەبێ ئەوکردارە ئیختیاریو بە ئارەزوو بێ و ئیشێ بە زۆر بکرێ سوودی نییەو بێ‌ئیعتیبارەو نابێ بەهۆی کەوتنی تەڵاقەکە، خواه ئەو زۆرکردنە لەسەر بەتاڵ بێ یا لەسەر حەق.

ئەگەر کەسێ بڵێ: بۆچی زۆرکردن بە حەق لەسەر تەڵاق، تەڵاقی پێ‌ئەکەوێ، کەچی ئیشی «معلّق علیه»، ئەگەر بە زۆر بێ، کەڵکی نییە، هەرچەند زۆرەکەیش لەسەر حەق بێ، ئەڵێین: فەرق زۆرە لە بەینی ئەم دوو مەسئەلەیەدا؛ لەویادا زۆر لەسەر تەڵاقەکەیە، جا ئەگەر بە حەق بێ، ئیعتیباری پێ‌ئەکرێ، بەڵام لێرەدا زۆر لەسەر ئەو ئیشەیەکە بووە بە «معلّق علیه» و لە عورفی عامدا کردارێك کە بە ئارەزووی ئینسان خۆی نەبێ، ئیعتیباری نییە، هەرچەند زۆرکردن لەسەر ئیشەکەیش حەق بێ؛ بۆیە ئەگەر کابرا بەتایبەتی تەڵاقی خوارد وتی: ئەو ئیشە ناکەم، چ بە زۆرو چ بە ئارەزوو، یا ئەبێ ئەو ئیشە بکەی، چە حەلاڵ بێ‌و چ حەرام، ئەوە بە هەر جۆرێك بێ بە موخالەفەی سوێندەکەی تەڵاقی ئەکەوێ.

**بزانن!** لەم مەسئەلەی زۆرەدا کە زۆردار زۆر بکا بۆ ئیشێکی دنیایی، ئەوە هیچ سوودی نییە کەسێك بە ئارەزووی خۆی بڕوا داوێنی زۆردارێك بگرێ بڵێ؛ زۆرم لێ بکە فڵانە ئیش بکەم، یا نەیکەم، چونکە مادام ئەو زۆردارە لەسەر ئارەزووی کابرا بڕوا،

ئەوە لەڕاستیدا زۆری لێ نەکردووەو ئەم جۆرە زۆرە بە ساختە دائەنرێ، بەڵام لە زۆری شەرعدا، هەرچۆن بێ سوودی هەیە، چونکە حوکمی شەرع بە ئارەزووی کەس ناگۆڕێو هەڵناسووڕێو ئوسووڵی تایبەتی خۆی هەیە.

کەوابێ، ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد وتی قسە لەگەڵ باوکمدا یا لەگەڵ فڵان موسوڵمانا ناکەم و خەبەری دا بە قازی، ئەویش زۆری لێ کرد کە قسە بکاو ئەمیش قسەی کرد، تەڵاقەکەی ناکەوێو پێویست نییە قازی دەسەڵاتی زۆر لێ کردنەکەی ببێ وە تەنها ئەوەندە بەسە کە شەرع فەرمان بدا؛ بەڵێ، ئەم زۆرە ئەوەندە بەسوودە کە کابرا جارێك قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکا کە سوێندی خواردووە قسەی لەگەڵدا نەکا، ئیتر بۆ جاری دووەم ـ مەسەلا ـ پێویستە قازی فەرمانێکی تازەی بۆ دەرکا، مەگەر لەحاڵێکا کە قازی زۆردار بێو بتوانێ کابرا بترسێنێ، ئەوە بە یەك فەرمان بۆ ماوەیەك کە خۆی بەیانی ئەکا قەناعەت ئەکرێ.

**بزانن!** فەرمانداری شەرعی، تەنها لەسەر کردنی واجب و نەکردنی حەرام حەقی زۆرکردنی هەیە، ئیتر لە شتی مەکرووە یا سوننەت یا مەباحدا حەقی زۆرکردنی نییە. بەڵام زۆردارێك کە دەسەڵاتی هەبێ، لە هەموو شتێکا فەرمانڕەوایە و ئەتوانێ لە هەر شتێکدا زۆر بکا، چونکە ئەو نەبەسراوە بە شەرعەوە.

کەوا بوو، ئەگەر کەسێك باری کرد لە شوێنێكو تەڵاقی خوارد نەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەو، زۆردارێکیش نەبوو زۆری لێ بکاو قازیش لەویادا دەسەڵاتی زۆری نەبوو، چارەی ئەو کابرا هەر ئەوەیە بە نەزری شەرعی نەزری بکا لەسەر خۆی کە ببێ بە دراوسێی پیاوێکی چاك لەو دێیەدا و ئەم نەزرە دائەمەزرێ، چونکە هەر نەزرێك کە چاکەو حەسەناتی تیابێ ئیعتیباری هەیەو دراوسێیەتی پیاوچاکان سوننەتە؛ جا کاتێ کە نەزرەکەی کرد، واجب ئەبێ لەسەری بڕواتەوە بۆ ئەو دێیە کە باری لێ کردووە، لەم سوورەتەدا قازی ئەتوانێ زۆری لێبکا کە نەزرەکەی بەجێ بێنێو ماڵی بەرێتەوە بۆ ئەو دێیە؛ ئەگەر قازی لە وڵاتەکەدا نەبوو یا گوێی نەئەدا بەمجۆرە شتانە، ئەوە ئەو کەسە کە سوێندەکەی خواردووەو ئەو کەسە کە سوێندەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە بە

هەردووکیان، ئەتوانن پیاوێکی دادپەروەر بکەن بە حەکەم تا حوکم بکا لە کابرای تەڵاقخۆر ئەو ئیشە بکا کە وتوویەتی نایکا.

**بێداری!** لە زۆری زۆردارا پێویستە زۆرەکەی لەسەر یەك شت بێو مەجالی هەڵبژاردنی یەکێ لە دوو شت یا لە چەند شت نەدا بە کابرا؛ مەسەلا نەڵێت: یا ئەبێ ئەو شتەم پێبڵێیت یا تەڵاق بخۆی کە ئاگات لێ نییە؛ کەوابێ، ئەگەر زۆردار پیاوێکی گرتو پێی وت: ئەبێ یا راستم پێبڵێیت ئەو بارە قاچاخییە لەکوێیە یا تەڵاقم بۆ بخەی کە ئاگات لێ نییە، ئەویش تەڵاقی خوارد کە ئاگای لێ نییەو لە راستیشدا ئاگای لێ بوو، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە زۆردارەکە دوو رێگەی بۆ داناوە، هەرچەند لەکاتی ناوبردنی ماڵەکەیشدا کابرای خاوەنماڵ زیانی پێبگاو ئەم خەبەردەرەیش تاوانبار بێ؛ بەڵێ «تَوریە» بۆ ئەم سوورەتە کەڵکی هەیەو مەنعی زیان پێگەیشتنی کابرای خاوەنماڵو کەوتنی تەڵاقەکەی خۆیشی ئەکا، مادام ئەو زۆردارە بەشێوەیەکی ناشەرعی ئەم داوایە بکا.

وە ئەگەر چەتەکەسێکیان گرتو وتیان: بەرەڵڵات ناکەین تا سوێند نەخۆی یا تەڵاق نەخۆی کە باسمان نەکەی، ئەویش سوێند یا تەڵاقی خوارد کە باسیان ناکاو پاش بەرەڵڵابوون باسی کردن، ئەوە سوێندەکەی یا تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە ئەو کردارە کە لە بەرابەری تەڵاقەکەیەوەیە، ئەو ئیشە خراپەیە کە پێی ترسێنراوە وەکوو بەرەڵڵانەکردنەکەی بێ.

**بزانن!** زۆر لێکردن، لەسەر دوو بەشە؛ زۆر لێکردن بە بەتاڵو زۆر لێکردن بە حەق؛ زۆر لێکردن بە حەق دروستەو هەر تەسەڕوفێکی لێوە پەیدا ببێ رەوایە؛ زۆر لێکردن بە بەتاڵیش لەسەر هەر کردارێك بێ لە کردارەکانی ئینسانێ کە تەکلیفی لەسەر بێ، چ رەفتار بێو چ گوفتار بێ و چ کردن بێو چ نەکردن، ئەوە لە هەر بابەتێکەوە بێ، لە شەرعدا وەکوو نەبوون وایە؛ کەواتە، بە زۆر دروست نییە نە فرۆشتنو نە بەکرێدانو نە رەهنکردنو نە وەقفکردنو نە نەزرو بەخشینو نە مارەکردنو نە تەڵاقدانو نە غەیری ئەمانە؛ بەڵێ، هەر رەفتارو گوفتارێك کە ببێ بەهۆی زیانی نەفسی یا ناموسی یا دارایی بۆ غەیری ئەوکەسە، ئەوە بە قەتعی کابرا نابێ بیکا وە ئەگەر بیکا، بە پێی شەرع تاوانبار

ئەبێ؛ بەڵێ، زۆر لێ کردن لەسەر هەر شتێ کە لەو خوسووسەوە مەبەست نەبێ کە کرداری ئینسانی تەکلیف لێ کراوە، ئەوە ئیعتیباری هەیە لە شەرعداو حوکمی لەسەر دائەمەزرێ؛ مەسەلا، لەو خوسووسەوە تەماشای ئەو ئیشە بکرێ کە سەبەبە یا مەرجە بۆ شتێك یا مانیعە لە شتێك، وەکوو چوونەلای ئافرەت بە شوبهە کە سەبەبە بۆ زاواو خەزووریو مانیعی نیکاحە بۆ هەندێ کەس، یا وەکوو شیرپێدان کە ئەبێ بە مانیعی نیکاحو سەبەبی حەرامبوون بە پێی ئەسووڵی خۆی، یا وەکوو پیسبوونی جلو بەرگ کە رێگای نوێژ ئەگرێ، یا دەسنوێژ شکاندن کە ئەویش رێگای نوێژ ئەگرێ، ئەمانە هەر وەکوو چۆن ئەگەر بە ئارەزووی ئینسان خۆی بن بەکار دێن، بە زۆریش بن هەمان حوکمیان هەیە.

دەلیل لەسەر ئەمە کە لە وێنەی ئەمانەدا تەماشای ئەوە ناکرێ کە کرداری ئینسانی تەکلیف لێ کراون، ئەوەیە ژنێك بەخۆی نەزانێ تا منداڵێك شیرەکەی ئەمژێ، یا پیاوێك ئاگای لەخۆی نەبێ ژنێك بە شوبهە ئاڵەتەکەی بخاتە خۆیەوە، یا یەکێك ئاگای لە خۆی نەبێ جلەکەی پیس ببێ، یا دەسنوێژی بشکێ، عەینی حوکمی کاتی ئیختیاریان تیا دێتەجێ، بەڵام هەر کردارێك کە «مُعلَّق علیه» بێ، واجبە بە ئیختیار بکرێ، مەگەر کابرا خۆی بەتایبەتی بە سوورەتێکی تێکڕایی ئیعتیباری بکا.

بزانن! لە بەشی زۆر لێ کردنی شەرعیدا، هەر ئیشێ کە دەخڵی ئیختیارو ئارەزووی تیا نەبێ وەکوو حەیزی ژنو لاتکەوتنی قەرزار، حوکمی حاکمی شەرع پێویست نییە تیایا، بەڵکوو لەو ئیشانەدا پێویستە کە لە مەجالی ئیختیاردا بن، وەکوو قسە نەکردن لەگەڵ کەسێکدا، مەسەلا.

## باسی سیغەی تەڵاق

سیغەی تەڵاق، لەسەر دوو بەشە؛

[بەشی] یەکەم سەریحو بێ پێچو پەنایە کە ئەوەیە مەعنا زاهیرەکەی غەیری تەڵاق هیچی تر نەگەیەنێ، وەکوو ئەو لەفزانە کە لە قورئانی پیرۆزا هاتوون، وەکوو «طَلاق» و «فِراق» و «سَراح»و مەعنای ئەم لەفزانە لەناو غەیری عەرەبدا کە کراون بە تەرجەمە

بۆیان، وەکوو «تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقم کەوتبێ، تەڵاقم دای، تەڵاقم خستی، تەڵاقت نەمێنێ» لەکوردیدا؛ بەڵێ، تەرجەمەی کوردیی «فِراق» کە «جیاکردنەوە» یا «جیابوونەوە»یە و تەرجەمەی کوردیی «سَراح» کە «بەرەڵڵاکردن» یا «بەرەڵڵابوون»ە، بە سەریح دانانرێن، چونکە وەك تەرجەمەی تەڵاق مەشهوورو بڵاو نین.

لە بەشی سەریحدا، نیازی لەفزو نیازی بەکارهێنانی لەفزەکە لە مەعنای تەڵاقدا پێویستن، ئیتر پێویست نییە نیازی ئەوەیشی پێبکا کە تەڵاقەکەی پێ‌بکەوێ، چونکە مادام لەفزو مەعناکەیان مەبەست بوون، تەڵاق‌پێ‌کەوتنیان شتێکی تەبیعییەو پێویستیەتی، لەبەر ئەوەکە بە بەکارهێنانی ساغ‌و دروست، ئەم لەفزە سەریحانە هەر بۆ تەڵاق‌خستن بەکار ئەهێنرێن.

لەفزی «تەڵاقم کەوتبێ»، ئەگەر لە مەیدانی سوێندخواردنا نەبێ، ئەوە بە تەنها خۆی دەس‌بەجێ تەڵاقی پێ‌ئەکەوێ وە ئەگەر لە مەیدانی سوێندخواردنا بێ، بەورەنگەکە لە بەکارهێنانیا بیبەستێ بەشتێکەوە کە سوێندی لەسەر بخۆری، وەکوو ئەوەکە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ ئەو ئیشە ناکەم یا ئەیکەم، یاخود لە نیازدا ئەمەی لە دڵا بێ، ئەوە لە حاڵی ئیسباتدا لەپاش نائومێد بوون لەکردنی ئیشەکە و لە حاڵی نەفیدا لەکاتی کردنی ئیشەکەدا، تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر لەم کاتەدا کە مەبەستیەتی بیبەستێ بە شتێکی سوێند لەسەر خوراوەوە، لەپێش تەواوکردنی قسەکەیدا لە سوێندەکە پەشیمان بووەوە، ئەوە بە لەفزی «تەڵاقم کەوتبێ» بە تەنها تەڵاقی ناکەوێ، چونکە لە مەیدانی سوێنددا تا سوێند لەسەر خوراوەکە نەوترێ، ئەو جوملەی قەسەمە ناتەواوەو تەڵاقی پێ‌ناکەوێ، بەڵام ئەم حوکمە بۆ «نَفسُ الأمر»ەو لە زاهیردا، ئەگەر ژنەکە ئیددیعای کرد کە مەبەستی لەم لەفزە سوێند نەبووەو هەر سەربەخۆ تەڵاقی‌داوە، ئەوە ئەگەر بەڵگەیەك لەگەڵ کابرادا بێ، ئەوە باوەڕی پێی ئەکرێ بە سوێند لەسەر نیازی خۆی، ئەگینا باوەڕ بە ژنەکە ئەکرێ بە سوێند لەسەر ئەوەکە ئاگای لە نیازی سوێندی مێردەکەی نییەو تەڵاقێکی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد بە تەڵاق بەم‌شێوەیە: وتی: بە تەڵاقم ئەو شتە ئەکەم، ئەوە نابێ بە سەریح، چونکە تەڵاق بەم‌شێوەیە سوێندی پێی ناخۆری‌و ئەبێ بە کینایە،

ئەگەر نیازی تەڵاقکەوتنی خۆی ببێ، مادام شتەکە نەکا، تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر ئەو نیازەی نەبوو، پووچەو قسەیەکی بۆشە.

**بزانن!** هەندێکەس وتوویانە: «تەڵاقم کەوتبێ»، کینایەیەو بە بێ‌نیازی تەڵاق، تەڵاقی پێ‌ناکەوێ، یا لەبەر بەکارهێنانی «تێ» لەجیاتی «ط»، یا لەبەر بەکارهێنانی لامی قەڵەو «ڵ» لەجیاتی لامی لاواز «ل»، یا لەبەر ئیزافەکردن بۆلای غەیری شوێنی خۆی کە ژنەکەیە، یا لەبەر ئەوە کە لەفزی «کەوتبێ»، وەکوو هەڵئەگرێ بە مەعنای «واقِع» و «هاتووەجێ» بێ، هەڵیش ئەگرێ بە مەعنای «ساقِط» بێ‌و ئیعتیباری پێ‌نەکرێ!

بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی «زاناکانی کوردستاندا»، دەرکەوتووە ئەم لەفزە لە زمانی کوردیدا سەریحە بۆ گەیاندنی مەعنای جیابوونەوەی ژن و پیاو لەیەك و بەکارهێنانی «تێ» لەجیاتی «ط»، لەبەر ئەوەیە کە زمانی گەلی کورد وا راهاتووە هەمیشە «تێ» بەکار دێنێ‌و لە زمانی خۆیدا «ط»ێی نییە، مەگەر لەکاتێکا کە شتێکی عەرەبی بخوێنێتەوەو فێربووبێ کە «ط»، وەکوو خۆی بەکاربێنێ و کورد، باوەڕی وایە کە «تەڵاق» بەکوردی، تەرجەمەی «طَلاق»ی عەرەبییەو لەناو کوردانا مەشهوور بووە بۆ بڕینی عیسمەتی نیکاح و هەر لەفزێکیش تەرجەمەی سەریح بێ‌و مەشهوور بووبێ بۆ تەڵاقدانی ژن، ئەوە سەریح‌و بێ‌پێچ‌و پەنایە، وەکوو شێخی «ابنُ حجر» لە «تُحفە»داو «رَملی» لە «نِهایە»دا فەرموویانە. هەتاوەکوو خوالێ‌خۆش‌بوو «مەلا ئەبووبەکری موسەنیف» لە کتێبی «وضوح»ی شەرحی «محرَّر»دا، پاش ئەوە کە باسی جیاوازی قسەی زانایان ئەگێڕێتەوە لەبارەی لەفزی «تەڵاك»ەوە (بە تێ‌و لامی قەڵەو و کاف)، ئەفەرموێت: هێز بەو قسەیەیە کە ئەڵێ ئەم لەفزە سەریحە لە تەڵاقدا، چونکە تەرجەمەیەو مەشهوور بووە لە زمانی کوردانا؛ جا مادام «تەڵاك» (بە تێ‌و لامی قەڵەو و کافەوە) سەریح بێ، دیارە «تەڵاق»یش (بە تێ‌و لامی قەڵەو و قافەوە) سەریحە.

لە فەرزێکدا بڵێین: «تەڵاق» تەرجەمەی «طَلاق» نییەو سووك کراوەیەتی، هەر ئەبێ بە سەریح، چونکە شێخ لە «تُحفە»دا فەرموویەتی: گۆڕینی «ط» بە «تێ»، زیانی نییە بە نیسبەت ئەو کەسانەوە کە زمانیان وابێ و ئەم لەفزی «تەڵاقم کەوتبێ»یە، لەچەشنی

«حَلاَلُ اللّهِ عَليَّ حَرَام» نییە تا بڵێین: مەشهووربوونی بەکارهێنان کینایە ناکا بە سەریح چونکە ئەو ئوسووڵە بۆ جوملەیێکە ماددەی تەڵاقی تیا نەبێ وەکوو لە «تحفە»و «فتاوی»دا باسی ئەکا. هەروەها گۆڕینەوەی لامی لاوازیش بە لامی قەڵەو زیانی نییە بە عەینی دەلیلە پێشووەکان.

مەسئەلەی ئیزافەیش بۆ غەیری شوێنی خۆی، ئەویش لەسەر حەقیقەت نییە، لەبەر ئەوەکە «تەڵاق» موشتەرەكو تێکەڵییە لەبەینی مەعنای بەرەڵڵاکردنداکە سیفەتی پیاوەو بەرەڵڵا بووندا کە سیفەتی ژنە و ئیزافە بۆ لای «میمی گۆیندە»، قەرینەو نیشانەیە لەسەر ئەوەکە مەبەست لە تەڵاق بەرەڵڵاکردنە، هەروەکوو ئیزافەی بۆ لای «تێ»ی قسە لەگەڵ کراودا، قەرینەو نیشانەیە بۆ ئەوەکە بەمەعنا بەرەڵڵا بوونە و لە هەردوو بارا، سەریحە لە تەڵاقداو ئیزافەیە بۆ شوێنی خۆی، ئەویان شوێنی دەرکردنو ئەمیان شوێنی بەسەرا چوونە و بەر دەستووری سەریح ئەکەون کە ئەوەیە زاهیرەکەی غەیری تەڵاقدانی ژن مەعنایەکی تر هەڵنەگرێ.

وە ئەگەر بەستنی تەڵاق بە پیاوەکەوە مانیع بوایە لە سەراحەتی تەڵاق، ئەبوو «عَليّ الطّلاق» و «أوْقَعْتُ عَلَيكِ الطّلاقَ» سەریح نەبوونایە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شێخی «ابنُ حَجر» ئەفەرموێت سەریحن. ئەگەر بڵێن: لە میسالی دووەما لەفزی «عليكِ» هەیەو ژنەکە ناو براوە، ئەڵێن: لە میسالی یەکەما ناوی ژن نەبراوە، بێجگە لەوە، شێخ ئەفەرموێت: مەشهووربوونی بەکارهێنانی «عليَّ الطّلاق» لە تەڵاقدانی ژنەکەدا، دانیشتووە لە شوێنی ناوبردنی ژنەکەدا وە لەفزی «کەوتبێ»، هەرچەند مەعنای «ساقِط» و بێئیعتیبار هەڵبگرێ، بەڵام زاهیرە لە مەعنای «واقِع»و بەجێهاتندا و کەس لەکاتی وتنی ئەم جوملەیەدا خەیاڵی بۆ مەعنای «بێئیعتیبار» ناڕوا، بە قەرینەی ئەوە لە هەر کوردێك بپرسی کە ئەم جوملەیە بەکاربێنێ کەوا مەبەستی چییە؟ ئەڵێ: ژنەکەم تەڵاق ئەدەمو بەرەڵڵای ئەکەم، وەکوو خوا لێخۆشبوو «مەلای نۆتشە» لێکی داوەتەوەو «مُفتی مەککەی موکەڕڕەمە» لە وەرامی پرسیاری زانایانی کوردستانا فەرموویەتی کە: ئەم لەفزە، ئەگەر مەشهوور بوو بۆ تەڵاقدانی ژن، ئەوە تەماشای ئەو خەیاڵاتە ناکرێ.

بە تایبەتی «ئەحمەد بن حەیدەر»، ئەفەرمویت جوملەی وەکوو «تەڵاقم کەوتبێ»و «تەڵاقت کەوتبێ»، لە عورفی کوردانا دانراون بۆ بڕینی رشتەی عیسمەتی ژن، ئیتر تەماشای حەرف و موفرەداتی لەفزەکان ناکرێ و لەکاتی پرسیاردا لەکوردان، غەیری ئەم مەعنایە شتێکی تریان نایەت بە دڵدا و هەر نەتەوەیەك خۆی باشتر مەعنای لەفزی خۆی ئەزانێ؛ کەواتە، واجبە لەسەر زانایانی شەرع بەسەر ئەم شارێگەیەدا بڕۆن بەرێداو مەجالی ئەوە نەدەن بەهۆی ئەوهام و خەیاڵاتی پڕوپووچەوە، ئایینی خەڵك لەکەدار بکرێ، چونکە لە پلەی یەکەمدا ئەوان لێ پرسراون لە دانانی حوکمی شەرع «وَ اللّٰهُ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَ سَواءِ السَّبِيلِ».

بەشی دووەم: لە سیغەی تەڵاق، کنایەیە کە بریتییە لەوە بە زاهیر ئیحتیمالی تەڵاق و غەیری تەڵاقیش ببێ، ئەگەرچی لە هەندێکیانا ئاشکراتر بێ لەوانی تریان، یەعنی سەریح ئەوەیە هەر لە مەعنای تەڵاقدا زاهیر بێ و لە غەیری مەعنای تەڵاقدا زاهیر نەبێ، بەڵام کینایە ئەوەیە لە هەردوو مەعناکەدا زاهیر بێ، ئەگەرچی بۆ تەڵاق یا بۆ غەیری تەڵاق رۆشنتر بێ.

لەم بەشی کینایەدا، سێ نیاز پێویستە: نیازی لەفزەکانو نیازی بەکارهێنان لە مەعنای تەڵاقداو نیازی تەڵاق پێ خستن؛ بەنیازی یەکەم، قسەی نەخۆش و نووستوو و ورێنەکەر دەرئەچێ و بە نیازی دووهەم، وێنەی «ئەی تەڵاق دراو!» دەرئەچێ کە کەسێك بیڵێ کە ژنەکەی ناوی «تەڵاق دراو» بێ و مەبەستی بانگکردنی بێ؛ ئەم دوو نیازە لە تەڵاقی سەریحیشدا پێویستن و بە نیازی سێهەم، ئەوە دەرئەچێ کە کابرا بە ژنەکەی بڵێ: «خوات لەگەڵ بێ»و مەبەستی تەڵاقدان نەبێ، بەڵکوو مەبەستی دوعای خێر بێ و ئەم نیازە سێهەمە لە تەڵاقی سەریحدا پێویست نییە، وەکوو باسمان کرد.

کینایە وەکوو ئەوە بڵێت: «حەقم نییە بە سەرتەوە»، یا: «حەقت نییە بە سەرمەوە» یا «ونبە لە بەرچاوم»، یا: «بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت»، یا: «من کەڵکی تۆم پێوە نییە» یا «تۆ بەکەڵکی من نایەیت»، یا: «مەسرەفت لەسەرم نییە»، یا: «هاوڕییەتی تۆ بۆ من حەرامە»، یا: «تۆ بۆ هاوسەریی من ناشێیت»، یا: «خواحافیزت بێ»، یا: «بڕۆ بەرەڵلا بە»؛ هەر

جوملەیەك كە لەناومانا مەشهوور بووبێ بۆ تەڵاق‌و تەرجەمەی سەریح نەبێ، ئەوە كینایەیە، وەكوو: حەڵاڵی خوام پێ‌حەرام بێ، هەروەها ئەگەر تەرجەمەی سەریح بێ، بەڵام لە بەكارهێنانا مەشهوور نەبێ، وەكوو تەرجەمەی لەفزێك كە لە «فِراق» و «سَراح»و شتی‌وا دەرهێنرابێ، وەكوو: «جیا ببەرەوە لێم»، یا: «تۆ مەرەخەسیت».

تێكرِا، هەر لەفزێك كە لە مەیدانی خۆیدا سەریح بێ، ئەوە مادام لەكاتی بەكارهێنانیا مەجال ببێ بۆ ئەسڵی مەعناكەی خۆی، نابێ بە كینایە لە بابێكی‌ترا وە ئەگەر مەجال نەبوو بۆ ئەوە و قابیل بوو لەم شوێنی بێگانەیەدا بەكار بهێنرێت، ئەوە ئەبێ بە كینایە؛ كەواتە، ئازادكردن ئەبێ بە كینایەی تەڵاق‌و بە پێچەوانەیشەوە، بەڵام تەڵاق نابێ بە كنایەی «ظِهار»و بە پێچەوانەیشەوە.

ئەگەر كەسێك جوملەیەكی‌وای بەكارهێنا كە دەستی ئەدا بۆ تەڵاق‌و بۆ «ظِهار» مەسەلا، وتی «تۆ حەرامی لەسەر من» یا وتی: «وا حەرامم كردی»، یا: «تۆ بۆ من وەكوو بەراز وای» یا: «وەكوو سەگ وای»، یا: «وەكوو مردارەوەبوو وای»، یا: «وەكوو خوێنی مردارەوەبوو وای»، یا وتی: «دەستی تۆ حەرامە لە من»، یا: «لەشی تۆ حەرامە لە من»، یا: «باوەشی تۆ حەرامە لە من»، ئەوە ئەگەر هەر مەبەستی تەڵاق بێ، یا هەر مەبەستی «ظِهار» بێ، ئەوە مەبەستەكەی دێتەجێ وە ئەگەر مەبەستی هەردووكیان بێ، ئەوە كابرا خاترخۆیە هەركامیانی هەڵبژارد، ئەوە دائەمەزرێ و ناتوانێ لەوەیش پەشیمان ببێتەوە وە ئەگەر نیازی ئەوەبوو عەینی ژنەكە حەرام بكا، یا چوونەلای لە خۆی حەرام بكا، یا فەرجی حەرام بكا، ئەوە حەرام نابێ‌و پێویستە لەسەر ئەم نیازە نابارە دەس‌بەجێ كەفارەتێك بدا بە هەژاران، وەكوو كەفارەتی سوێند، هەرچەند نەیشچووبێتە لای ژنەكە؛ هەروەها، ئەگەر هەر بە بێ‌نیازو مەبەست ئەمانە بێن بە دەمیا، هەر كەفارەتێ پێویستە لەسەری بیدا بە هەژاران.

ئەگەر كەسێك وتی: ئەم جلەم لە خۆم حەرام كرد، یا: ئەم نانە یا ئەم چایە یا ئەم چێشتە یا ئەم گۆشتەم لە خۆم حەرام كرد، ئەوە حەرام نابێ‌و قسەكەی ئیعتیباری نییەو كەفارەتیشی ناوێ.

**بزانن!** ئیشارەتکردنی زماندار بۆ تـەڵاق، بـێ ئـیعتیبارە؛ بـەڵێ، ئـیشارەتی لاڵ ئیعتیباری هەیە؛ جا ئەگەر ئەوەندە رۆشن بوو هەموو کەسێ لێی حاڵی ئەبوو، ئەوە بە سەریح دائەنرێ وە ئەگەر هەر ئینسانی ژێر لێی حاڵی ئەبوو، ئەوە کینایەیە.

ئەگەر کەسێك سیغەی تەڵاقی نووسی و لەکاتی نووسینەکەیدا نیازی تەڵاقی نەبوو، ئەوە بێ ئیعتیبارە وە ئەگەر نووسی و لەکاتی نووسینەکەدا نیازی تەڵاقدانی پێ هێنا، ئەوە ئیعتیباری هەیەو بەکار دێت، هەروەها لە هەموو عەقدو حەللێکدا، تەنها لە نیکاحا نەبێ چونکە لە نیکاحدا نووسین و کینایە ئیعتیباری نییە وە ئەگەر کەسێ نووسراوی خۆی خوێندەوە کە سیغەی تەڵاق بوو و وتی هەر خوێندنەوەی لەفزەکەم مەبەست بوو، ئیتر نیازی تەڵاقم پێی نەکردووە ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند.

وە ئەگەر کەسێك فەرمانی دا بەکەسێك سیغەی تەڵاقەکە بنووسێ و لەگەڵ نووسینی ئەو کەسەدا خۆی نیازی کرد، ئەوە بـێ ئـیعتیبارە، چـونکە پـێویسـتە نـووسینەکـەو نیازەکەیش لە یەك کەسەوە بن؛ کەواتە؛ ئەگەر فەرمانی دا بەکەسێك سیغەکە بنووسێ و نیازی تەڵاقیشی لێ بهێنێ لە وەکالەتی ئەمەوە و کابرایش نـووسی و نـیازی ئـەوەی لێ کرد، ئەوە دائەمەرزێ و تەڵاقی پێ ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر پێی بڵێت: ئەو لەفزە کینایەیە بڵێ و نیازی تەڵاقی لێ بهێنە، ئەویش وتی و نیازی تەڵاقی لێ هێنا ئەوەیش هەر ئیعتیباری هەیەو تەڵاقی ئەکەوێ، مادام نیازی تەڵاقی هێنابێ لەو لەفزە کینایەیە.

ئەگەر کەسێك نووسی بۆ ژنەکەی: هەرکاتێك ئـەم نـامەتە خـوێنـدەوە، تـەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر ژنەکەی خوێندەوار بوو و نامەکەی خوێندەوە، یا تەماشای کردو تێی گەیشت، تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر بۆی خوێنرایەوە، تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگـەر خوێندەوار نەبوو و بۆی خوێنرایەوە، هەر تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگەر کابرای مێردی بزانێ بەوەکە نەخوێندەوارە وە ئەگەر وابزانێ خوێندەوارە، تەڵاقی ناکەوێ تا ئەو ژنە فێری خوێندنەوە ئەبێ و نامەکە ئەخوێنێتەوە.

**بزانن!** لەو سوورەتەدا کە کەسێك نامە ئەنووسێ بۆ ژنەکەی و نیازی تـەڵاقـی لێ ئەهێنێ، پێویستە بۆ قەبووڵکردنی ئیددیعاکەی بە زاهیری شەرع، دوو شاهید بگرێ

لەسەر ئەوە کە نیازی تەڵاقی بووە بەو نووسراوە، ئەگینا بە زاهیری شەرع بۆ ئێمە دروست نییە حوکم بدەین بە کەوتنی تەڵاقەکە، لەبەر ئەوە کە رێی تێ ئەچێ کابرا نیازی تەڵاقی نەبووبێ؛ بەڵێ، لە «نَفْسُ الأمر»دا، ئەگەر نیازی تەڵاقی بووبێ، ئەوە تەڵاقەکە کەوتووەو لەپاش بەسەرچوونی «عِدّە»ی ژنەکە، دروستە ژنەکە شوو بکا بە کەسێك کە باوەڕی ببێ بە کەوتنی تەڵاقەکەی، چونکە لەم ئیشانەدا «نفسُ الأمر» ئیعتیباری پێ ئەکرێ.

**بزانن!** نیازی کابرا پێویستە لە کینایەدا لە سەرەتای لەفزەکەوە یا نووسینەکەوە ببێ وە ئەگەر لەگەڵ هەموویا بوو، ئەوە باشترە؛ ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: نیوەت یا چواریەکت یا سەدیەکت تەڵاقی کەوت بێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە تەڵاقەکەی لە بەشێکەوە تەشەنە ئەکا بۆ هەمووی؛ هەروەها، ئەگەر وتی: دڵت یا جگەرت یا دانت یا مووت یا سەرت یا گوێت یا چاوت تەڵاقی کەوتبێ، هەر تەڵاقی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر بڵێت: گیانت یا رۆحت یا خوێنت تەڵاقی کەوتبێ؛ بەڵام تەڵاقی ناکەوێ ئەگەر بیبەستێ بە شتێکەوە کە زیادە بێ لە ئینسان خۆی، وەکوو ئەوە کە بڵێ: عارەقت یا تفت یا بەڵغەمت تەڵاقی کەوتبێ، هەروەها ئەگەر بیبەستێ بە سیفەتێکەوە لە ژنەکەدا، وەکوو ئەوە کە بڵێت: چەوریت یا قەڵەویت یا بیستنت یا بینینت یا تێگەیشتنت یا ژیانت تەڵاقی کەوتبێ، چونکە ئەمانە سیفەتێکن پەیوەندییان نییە بە حەلاڵی و حەرامییەوە؛ هەروەها، ئەگەر تەڵاقەکەی بەست بە بەشێکیەوە کە لیێ جیابووبووەوە، وەکوو ئەوە بڵێت: تەڵاقی دەستەبڕاوەکەت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر ژنەکەی دیار نەبوو و کابرا بە شێوەی گفتوگۆ، وتی: تەڵاقت کەوتبێ، یاخود حازر بوو و بە شێوەی قسە لەگەڵ کەسێکی نادیارا، وتی: تەڵاقی کەوتبێ، ئەوە لە هەردوو سوورەتەکەدا ئەبێ بە کینایە؛ ئەگەر نیازی تەڵاقی ژنەکە بوو، تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگینا تەڵاقی ناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر باسی ژنەکەی کرا؛ مەسەلا، کەسێك وتی: ژنەکەت داوای تەڵاق ئەکا، ئەویش وتی: تەڵاقی کەوتبێ، ئەمە سەریحە، چونکە باسی ژنەکەی ئەبێ بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە تەڵاقەکەی بەستووە بە ژنەکەوە.

هەروەها، بە سەریح ئەزانرێ لە تەڵاقدا ئەمەکە بەکەسێك بڵێ: کورە تەڵاقت کەوتبێ ئەو قسەتە نەکرد، یا ئەو قسەمە نەکرد، یا ئەو شتە وا بوو، یا ئەو شتە وا نەبوو؟ ئەویش بڵێ: بەڵێ، ئەوە ئەبێ بە تەڵاقخواردن لەلایەن ئەو کەسەوە کە «بەڵێ»کـەی کـردووە لەسەرکردن یا نەکردنی ئەو ئیشە؛ هەروەها، ئەگەرکەسێك وتی: تەڵاقم کەوتبێ، تۆێش بڵێی: سێ جار؟ ئەویش بڵێ: سێ جارو نیازی وابێ ئەم ژمارەیە ببەستێ بە تەڵاقەکەوەو ماوەیەکی زۆریش نەکەوێتە بەینی قسەکانیانەوە، ئەوە سێ تەڵاقەکەی ئەکەوێ.

## باسی تەڵاقدانە دەستی ژن (تَفويض)

دروستە بۆ پیاو تەڵاق بداتە دەستی ژن، بەو شەرتە کە خاوەن روشد بێ، یـەعنی تەڵاقەکەی بداتە دەستی بۆ ئەوەی کە تەڵاقی خۆی بدا؛ مەسەلا پێی بڵێ: تەڵاقی خۆت بدە، یا: تەڵاقی خۆت بدە بە دە دینار، یا: تەڵاقی خۆت بدە، ئەگەر ئارەزووت هەیە.

ئەم تەڵاق دانە دەستی ژنە، لەسەر فەرموودەی تازەی ئـیمامی شـافیعی، کـردنی تەڵاقە بە موڵکی ژنەکە؛ کە واتە، پێویستە بۆکەوتنی تەڵاقەکە ئەمەکە ژنەکە دەس‌بەجێ تەڵاقی خۆی بدا، چونکە ئەو تەڵاقدانە لەجێی قەبووڵ‌کردنایە، هەروەکوو قـەبووڵ ئەگەر بەینی کەوت لەگەڵ تەڵاق دانە کەداکەڵکی نامێنێ، ئەمیش هەروەهایە، هەتاوەکوو ئەگەر کابرا بەجۆرێك قسە بکا کە عوموومیەتی وەخت‌و شوێن بگەیەنێ، یەعنی پێی بڵێ: هەروەختێ ئارەزووت پێ‌بوو، تەڵاقی خۆت بدە، هەر پێویستە دەس‌بەجێ تەڵاقی خۆی بدا، بەپێی ئەوەی کە شێخ فەرموویەتی لە «تُحفه»دا، بەڵام خاوەنی «نِـهایە» و «مُغنی» ئەفەرموون: لەم سوورەتەدا، هەروەختێك ژنەکە تەڵاقی خۆی بدا دروستە.

لە فەرموودەیەکی‌تری ئیمامی شافیعیدا، پێ‌سپاردنی تەڵاق وەکیل‌گرتنە؛ کەواتە، شەرت نییە گورج تەڵاقی خۆی بداو هەرکاتێ تەڵاقی خۆی بدا، دروستە، هەروەکوو ئەگەر بڵێ بە ژنەکەی: وەکیلم‌بە تەڵاقی خۆت بدە، هەرکاتێ تەڵاقی خۆی بدا دروستە وە لەسەر هەردوو فەرموودەکە، دروستە بۆ کابرا پەشیمان ببێتەوە لەپێش ئـەوەدا کـە ژنەکە تەڵاقی خۆی بدا.

جا ئەگەر لەم تەڵاقدانە دەستو پێسپاردنەدا، کابرا ناوی عیوەزی نەبردو هەر ئەوەندە بوو وتی: خۆت تەڵاق بدە، ئەویش وتی: وا خۆم تەڵاق دا، ئەوە تەڵاقێکی بەخۆڕایی ئەکەوێ وە ئەگەر ناوی عیوەزی برد؛ مەسەلا، وتی: تەڵاقی خۆت بدە بە دە دینارو ئەویش وتی: وا تەڵاقی خۆم دا بە دە دینار، یا هەر وتی: وا تەڵاقی خۆم داو ناوی عیوەزی نەبرد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە دە دینارەکە، چونکە ئەگەر ناوی عیوەزیش نەبا لە قسەی کابرادا بووەو ئەبەسرێ پێیەوە وە ئەگەر لەم سورەتەدا ژنەکە وتی: وا تەڵاقی خۆم دا بە نۆ دینار، یا بە یازدە دینار، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە لەگەڵ قسەی کابرادا یەك‌ناکەوێ وە ئەگەر کابرا ناوی ماڵی نەبردو ژنەکە ناوی برد، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ و باسی ماڵەکەیش لەلایەن ژنەکەوە بێسوود ئەمێنێتەوە.

وە ئەگەر کابرا وتی: هەرکاتێك جەژنی رەمەزان هات خۆت تەڵاق بدە، ئەوە لەسەر هەردوو فەرموودەکە پێسپاردنەکەی بەتاڵە، چونکە نە بەموڵك‌کردن و نە وەکیل‌گرتن بە تەعلیق دروست نییە، بەڵام لەسەر وەکیل‌گرتن، کە ژنەکە تەڵاقی خۆی دا، تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە هەرچەند وەکیل‌گرتنەکە خۆی بەتاڵ بێ، بەڵام ئیزن‌دانە گشتییەکە ئەمێنێتەوە؛ ئەم قسەیە، قسەی باوەڕ پێکراوی شێخی «ابنُ حجر»ە لە «تُحفە»دا.

ئەگەر کابرا بە کینایە تەڵاقەکەی سپارد بە ژنەکەی؛ مەسەلا، وتی: خۆت جیا بکەرەوە لێم‌و نیازی تەڵاقی هێناو ژنەکەیش وتی: وا خۆم جیاکردەوەو نیازی تەڵاقی هێنا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر ژنەکە بە سەریح خۆی تەڵاق دا، یاکابرا بە سەریح تەڵاقەکەی پێسپاردو ژنەکە بە کینایە وەرامی دایەوە لەگەڵ نیازی تەڵاقدا، هەر تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر لە کینایەدا شەخسی خاوەن کینایە نیازی تەڵاقی نەبوو، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ.

ئەگەر لە سپاردنی تەڵاقدا کابرا ناوی ژمارەی تەڵاقەکەی بردو ژنەکەیش هەر ناوی ئەوەی برد، یا ناوی ژمارەی نەبرد، ئەوە تەڵاقەکەی لەسەر ئەو ژمارەیە ئەکەوێ، چونکە ئەگەر ناوی ژمارەیش نەبا، هەر ئەبەسرێ بە قسەی کابراوە وە ئەگەر ناوی ژمارەیەکی غەیری ئەوەی برد کە کابرا ناوی بردووە، ئەوە کامیان کەمتر بێ، ئەو

ژمارەیەیان ئەکەوێ، چونکە ئەگەر ژمارەی ناوبراوی کەمتر بوو، ئەوە هەر لەو ژمارەیەدا فەرمانەکەی بەجێ‌هێناوە وە ئەگەر ژمارەی کابراکەمتر بوو، ئەوە هەر بۆ ئەو ئەندازەیە ئیزنی ژنەکەی داوەو لە زیاتردا ئیزنی نییەو تەسەڕوفی ژنەکەیش بە بێ‌ئیزنی کابرا بێ‌سوودە؛ بۆیە ئەگەر یەکێك وتی بە وەکیلەکەی: تەڵاقی ژنەکەم بدە، ئەویش هەر سێ تەڵاقەی دا، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ، چونکە ئیزن لە تەڵاق‌دانا بەس ئیزنە لە یەك تەڵاقدا.

وە ئەگەر کابرا ناوی ژمارەی نەبردو نیازیشی نەبوو و ژنەکەیش تەڵاقی خۆی دا بە بێ‌نیازی ژمارە، یا بە نیازی ژمارەیەك، ئەوە هەر یەك تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە ئیزن لە ماهیەتی تەڵاقدا ئیزنە لە یەك تەڵاقداو بەس وە ئەگەر کابرا نیازی ژمارەیەکی هەبوو و ژنەکەیش هەر ئەو نیازەی بوو، ئەوە ئەو ژمارەیە ئەکەوێ کە لە نیازیانا بووە وە ئەگەر نیازی ژنەکە لەگەڵ نیازی کابراکەدا یەك نەبوو، ئەوە ئەڕواتە سەر نیازی ئەویانە کە نیازی کەمتری هێناوە.

## شوێنی تەڵاق و دەسەڵات بەسەریا

شوێنی تەڵاق، بریتییە لە ژن و دەسەڵاتیش بەسەریا، بەوە ئەبێ ژنەکە لە عیسمەتی کابرادا بێ، یا لە «عِدّە»ی تەڵاقی «رجعي»دا بێ‌و خاوەن ژنەکەیش تەسەڕوفی دروست بێ لە تەڵاقدا، یەعنی منداڵ‌و شێت‌و بێ‌هۆش نەبێ؛ کەواتە، تەڵاقی منداڵ‌و شێت‌و بێ‌هۆش دانامەزرێ؛ هەروەها، دروست نییە بۆ پیاوی باڵغ‌و عاقڵ و هۆشیار تەڵاقی ژنی بێگانە بدەن، هەرچەند تەعلیقی بکەن بەکاتێکەوە کە ئەو ژنە ببێ بە ژنیان‌و بێتە ژێر عیسمەتیانەوە. دروستیش نییە کەسێك تەڵاقی ژنی تەڵاق‌دراوی بائینەی خۆی بدا، چونکە بائینە تەڵاقی پێوە نالکێ.

جا لەسەر ئەم ئەساسە، ئەگەر کەسێك سێ تەڵاقەی خوارد لەسەر ئیشێك و لەپاشا، بە ڕێکەوت ژنەکەی بائینە بووەوە بە تەڵاق یا بە هەڵوەشاندنەوەی نیکاح ـ مەسەلا ـ و کابرا ئیشەکەی کرد، ئەوە ئەو سێ تەڵاقەیە کە زوو خواردوویەتی ناکەوێ، چونکە

لەمکاتەدا ژنەکەی بائینەیە؛ هەروەها، ئەگەر لەپاش مارەکردنەوەی ژنەکە ئیشەکە بکا، هەر ناکەویّ، چونکە ئەو عیسمەتەکەوا تەڵاقەکەی تیا خواردووە نەماوە و ئەم نیکاحە عیسمەتێکی تازەی جیاوازە وە لەم وەختەداکە ژنەکە دێتەوە ژێر نیکاحی، بەو ژمارە تەڵاقانەوە دێتەوە ژێر نیکاحی کە پاش «بائینە» بوونەوەکە ماویەتی و بە سێ تەڵاقە نایەتەوە، هەرچەند لەپاش بائینە بوونەوەکەیشی شووی کردبێ بە پیاوێکی تر، مەگەر وەختی خۆی سێ تەڵاقی دابێ‌و ئەو شووە کە کردوویەتی ببێ بە مارەبەجاش بۆی، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

بزانن! لەپاش ئەوەکە کابرا سێ تەڵاقەی خوارد لەسەر ئیشێ، ئەتوانێ بەتایبەتی بۆ رزگاربوون لە کەوتنی سێ تەڵاقەکەی، خولعی ژنەکەی بکا و لەپاش خولعەکە، لەماوەی جیاییا یا لەپاش مارەکردنەوەی ژنەکەی ئەو ئیشە بکا و ئەم خولعە سوودی هەیە، خواهـ وەختی خۆی سوێندی لەسەر ئیسبات خواردبێ یا لەسەر نەفی و ئیسبات‌و نەفیەکە «مُطْلَق» بن یا «مُقَیَّد» بن و تەڵاقەکە، زەمانی گەیاندبێ، یەعنی لەفزێکی لەگەڵا بووبێ زەمان بگەیەنێ یا نە و ئەمە، لەسەر باوەڕی گەلێ لە پێشەوایانی مەزهەبی شافیعی مەزهەبە، وەکوو «بُلقینی» و «زَرکشی»و «ابنُ الرِّفعه» وە «خەتیبی شەربینی»، ئەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە جێی باوەڕو پشت پێ‌بەستنە، چونکە زاهیری فەرموودەی هاوڕێیانی ئیمامی شافیعی لەسەر ئەمەیە، «علي الشّبراملسي»یش ئەفەرموێت: باوەڕی شێخی «زیادی»یش بەمجۆرەیە، لە حاشیەی «شیروانی»شدا ئەفەرموێت: مەیل‌و ئارەزووی «ابنُ القاسم» بۆلای قسەی ئەم زاتانایە؛ «بناءاً عَلیه»، ئینسان ئەتوانێ تەقلیدی فەرموودەی ئەو ئیمامانە بکاکە فەرموویانە: خولع پیاو رزگار ئەکا لە کەوتنی سێ تەڵاقە؛ بە هەر سیغەیەك و بە هەر شێوەیەك تەڵاقەکەی خواردبێ و پێویستە ئینسان تەماشای ئەو شتانەیش بکاکە لە سەرەتای خولعەکەوە باسم کردن.

ئاشکرایە کە ژمارەی تەڵاقی ئینسانی ئازاد، سێ تەڵاقە؛ جا هەرکەس بە کەمتر لە سێ تەڵاق ژنی تەڵاق دا و لەپاشا مارەی کردەوە، ئەوە هەر پاشماوەی سێ تەڵاقەکەی بۆ دێتەوە، هەرچەند لەو بەینەدا ژنەکە شووی کردبێ بە کەسێکی تر وە تەڵاق،

هەروەکوو لە ساغیدا ئەکەوێ، لە نەخۆشیشدا ئەکەوێ مادام کابرا هۆشی بە خۆیەوە بێ، هەرچەند کابرا بەو نەخۆشییەشەوە بمرێ و لەپاش مردنیش، میراتبردن لە بەینی ژن و مێرددا هەیە، هەرکامیان بمرن، هەر ئەوەندە تەڵاقەکە «رجعي» بێ، بەڵام لە تەڵاقی «بائن»دا میراتبردن نییە؛ بەڵێ، زۆر گوناهە ئینسان ژنی خۆی لە نەخۆشیدا بائینە بکاتەوە بۆ ئەوە کە میراتی لێ وەرنەگرێ، هەتاوەکوو حەزرەتی عوسمان ـ خوای لێ رازی بێ ـ میراتی داوە بە ژنی بائینە؛ فەرموودەی کۆنی ئیمامی شافیعیش لەسەر میراتبردنیەتی.

## باسی کەوتنێ ژمارەیەك لە تەڵاق بەهۆی نیازی ژمارەوە

ئەگەر کابرایەك وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ‌و نیازی ژمارەی نەبوو، تەڵاقێکی ئەکەوێ؛ ئەگەر نیازی ژمارەیەکی تایبەتی بوو، ئەو ژمارەیە ئەکەوێ؛ هەروەها ئەگەر بە لەفزی کینایە بێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: لێم جیابەرەوەو مەبەستی تەڵاق بێ، ئەوەیش ئەگەر نیازی ژمارەی نەبوو، تەڵاقێکی ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی ژمارەیەك بوو، ئەو ژمارەیە ئەکەوێ.

ئەگەر بە بێ‌ئەوە کە ژنەکە داوای تەڵاق بکا کابرا سێ بەردی نایە مشتی ژنەکە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، خواه نیازی تەڵاقی ببێ یا نە وە ئەگەر ژنەکە داوای تەڵاقی کردو ئەمیش سێ بەردی نایە مشتی‌و هیچ باسی تەڵاقی نەکرد، هەر تەڵاقی ناکەوێ، تەڵاقی خاوەن زوبان بە بێ‌لەفز ناکەوێ، مەگەر لەکاتی نووسینا، وەکوو باسمان کرد.

ئەگەر لەو کاتەدا کە بەردەکانی نایە مشتی وتی: ئەمە تەڵاقەکانت، وا پێم‌دایتەوە، ئەوە هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ، بەو شەرتە نیازی لەو قسەیە تەڵاق‌دان بێ، چونکە ئەو قسەیە کینایەیەو پێویستی بەوەیە کە نیازی تەڵاق‌دانی ژنەکەی ببێ وە ئەگەر نیازی تەڵاق‌دانی نەبوو، تەڵاقی ناکەوێ.

هەروەها، ئەگەر بەردەکانی یەکەیەکە نایە مشتی ژنەکەوەو وتی: ئەمە لەسەر دە دینار، ئەمەیش لەسەرگەردانەکەت، ئەمەیش لەسەر مارەییەکەت و نیازی تەڵاق‌دانی

ببێ، جا ئەگەر لەپاش لەفزی یەکەم ژنەکە قەبووڵی کرد، ئەوە تەڵاقێکی ئەکەوێ و بائینە ئەبێتەوە، ئیتر تەڵاقی دووهەم و سێهەمی ناکەوێ وە ئەگەر لەپاش لەفزی دووهەم قەبووڵی کرد، دوو تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر لەپاش لەفزی سێهەم قەبووڵی کرد، هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ.

ئەگەر ژنەکە داوای تەڵاقی لە مێردەکەی کرد، ئەمیش وتی: وەرە هەر سێ بەردەکە بنێمە مشتت، جا ژنەکە هات و کابرا سێ بەردی نایە مشتی، ئەمە ئەگەر مەبەستی لە سێ بەردە سێ تەڵاقە بوو و لەو کاتەیشدا بەردەکانی نایە مشتی لەفزێکی وای وت کە ئیشارە بێ بۆ بەردەکان، وەکوو ئەوە کە بڵێت: فەرموو! ئەمە بەردەکانت، ئەوە هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی لە بەردەکان تەڵاق نەبێ، یاخود مەبەستی تەڵاق بێ، بەڵام لەوکاتەدا بەردەکان ئەنێتە مشتی هیچ قسەیەکی وا نەکا، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە شتێك نییە ئەم بەرد خستنە مشتە ببەستێ بە تەڵاق‌دانەوە.

ئەگەر کابرا وتی: تەڵاقت کەوتبێ بە هەموو مەزهەبێك، ئەوە ئەگەر مەبەستی موبالەغە بێ لە کەوتنی تەڵاقدا، تەڵاقێکی ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی تەعلیق‌کردن بێ بە کاتی ڕەوابوونی تەڵاقەکەیەوە لە هەموو مەزهەبێکدا، ئەوە پێویستە کە هەموو مەزهەبێکی خاوەن ئیعتیبار ئەو تەڵاقە بخا.

وە ئەگەر وتی: سێ تەڵاقت کەوتبێ بە هەموو مەزهەبێك، ئەمیش ئەگەر هەر نیازی موبالەغە بوو، هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی تەعلیق‌کردن بوو بە کاتی بە حەڵاڵ‌زانینی سێ تەڵاقەوە لەو مەزهەبانەدا، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە لە مەزهەبی هەندێك لە ئیمامەکاندا سێ تەڵاقە حەرامە وە ئەگەر مەبەستی تەعلیق‌کردن بێ بە کاتی ئەوەوەکە هەموو مەزهەبەکان بڵێن: تەڵاقەکان کەوتوون، هەرچەند بە حەرامیشی بزانن، ئەوە هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ چونکە، لەسەر هەموو مەزهەبە خاوەن ئیعتیبارەکان سێ تەڵاقە بە یەکجار ئەکەوێ، هەرچەند تەڵاق‌دانەکەیش حەرام بێ و لە وەختی بێ‌نیازیدا حوکم ئەکرێ بە کەوتنی هەر سێ تەڵاقەکەی، چونکە لەفزەکە ئاشکرایە لەو مەعنایەدا.

ئەگەر کابرایەك دوو ژنی هەبوو و وتی پێیان: سێ تەڵاقەتان کەوتبێ، ئەوە سێ تەڵاقەی هەردووکیان ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر وتی: سێ تەڵاقتان کەوتبێ و نیازی ئەوە

بیٚ یەکی سیٚ تەڵاقیان بکەویٚ وە ئەگەر مەبەستی دابەشکردنی سیٚ تـەڵاق بـیٚ بـە سەریانا، ئەوە یەکی دوو تەڵاقیان ئەکەویٚ چونکە یەکیٚ تەڵاق‌و نیوێکیان بە لەفزەکە ئەکەویٚ‌و نیوەکەی تریشی بە تەئسیری نیوەکەوتووەکە ئەکەویٚ.

ئەگەر کابرا ویستی بڵیٚ: تەڵاقت کەوتبیٚ سیٚ بەسیٚ و لەپێش وتـنی لەفـزی سـیٚ بەسیٚ‌کەدا مرد، یاخود کەسێك دەستی دانا لەسەر دەمی‌و نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا، هەر سیٚ تەڵاقی ئەکەویٚ، چونکە لەوکاتەداکە وتوویەتی تەڵاقت‌کەوتبیٚ مەبەستی سیٚ تەڵاقە بووە، بەڵام ئەگەر لەپێش تەواوکردنی جوملەی تەڵاقەکەدا مرد، یا نەهێڵرا قسەکەی تەواو بکا، ئەوە تەڵاقی ناکەویٚ، چونکە نیازی رووت بە بیٚ‌لەفزی خاوەن سوود بەتاڵە. ئەگەر وتی: دوو تەڵاقت کەوتبیٚ‌و مەبەستی سیٚ تەڵاق بوو ئەوە هەر دوو تەڵاقی ئەکەویٚ.

وە ئەگەر وتی بە ژنەکەی: تۆ سیٚ تەڵاق دراوی، سیٚ تەڵاقی ئەکەویٚ وە ئەگەر وتی: تۆ وەکوو سیٚ تەڵاق‌دراوی، ئەوە یەك تەڵاقی ئەکەویٚ؛ هەروەها، ئەگەر بڵێت: یـەك تەڵاقت کەوتبیٚ هەزار جار، هەر تەڵاقێکی ئەکەویٚ.

وە ئەگەر وتی: پڕ بەدنیا، یا پڕ بە زەوی، یا پڕ بە ئاسمان تەڵاقت کـەوتبیٚ، هـەر تەڵاقێکی ئەکەویٚ؛ هەروەها، ئەگەر وتی تەڵاقێکی زۆر گەورەت کەوتبیٚ، یا زۆر درێژ، یا زۆر نابار، یا زۆر ناشیرین، هەر تەڵاقێکی ئەکەویٚ؛ ئەگەر بیشڵێت: پڕ بـەو سـیٚ خانووە تەڵاقت کەوتبیٚ، هەر تەڵاقێکی ئەکەویٚ؛ بەڵیٚ لە کتێبی «عباب»دا ئەفەرموێت: لەم سوورەتە ئاخرەدا سیٚ تەڵاقەی ئەکەویٚ، چونکە مادام خانووەکان سیٚ خانوون، ئەوەی پڕی هەر خانوویەك بێت ئیعتیبار ئەکریٚ بە تەڵاقێك؛ کەواتە، بە سیٚ خانووەکە سیٚ تەڵاقی ئەکەویٚ.

ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبیٚ، تەڵاقت کەوتبیٚ، تەڵاقت کـەوتبیٚ و مـاوە زۆر بـوو لەبەینی تەڵاقەکانا، سیٚ تەڵاقی ئەکەویٚ وە ئەگەر ماوە زۆر نەبوو، ئـەمجار ئـەگـەر مەبەستی بەو دووبارەکردنەوەیە تەئکیدکردنەوە بیٚ، تەڵاقێکی ئەکـەویٚ. وە ئـەگـەر مەبەستی دووبارەکردنەوەی قسەکەی بیٚ بەشێوەیەکی سەربەخۆ کە پەیوەندی بەوی پێشووەوە نەبیٚ، یا هیچ مەبەستی نەبیٚ، سیٚ تەڵاقی ئەکەویٚ.

وە ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ ئەوەندەی «گڵ»، هەر یەك تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر بڵێ: ئەوەندەی «لم»، سێ تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر بڵێ: ئەوەندەی گـەڵای دار، یـا ئەوەندەی داری کێو، یا ئەوەنـدەی گیای دەشت، سێ تەڵاقی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر وتی: ئەوەندەی مووی فڵانکەس و مەعلووم نەبوو ئەو کەسە لەشی چۆنـە، چـونکە بەعادەت قابیل نییە ئەو کەسە سێ موو بە لەشیەوە نەبێ.

ئەگەر وتی تەڵاقت کەوتبێ ئەوەندەی ماسی ناو ئەو حەوزە و دیار نەبوو چـەند ماسی تیایە، ئەوە هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ وە ئەگەر ژنەکەی شەڕی لەگەڵداکرد، ئەویش گۆچانێکی بەدەستەوە بوو و وتی: سێ تەڵاقی کەوتبێ، ئەوە وادیارە هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، بەڵام حەواڵەی ئایینی خۆی ئەکرێ، ئەگەر لە بەینی خۆی‌و خوادا مەبەستی گۆچانەکە بووبێ، تەڵاقی ناکەوێ، وەك ئەوەکە ژنەکەی ناوی پەروین بێ ـ مەسەلا ـ و بڵێ: پەروین تەڵاقی کەوتبێ‌و مەبەستی پەروین ناوێکی تر بێ، ئەویش وادیارە تەڵاقی ژنەکەی ئەکەوێ، بەڵام حەواڵەی دینی خۆیشی ئەکرێ، جا ئەتوانێ داوا لە ژنەکەی بکا کە لەگەڵی بمێنێتەوە، ئەگەر ژنەکە باوەڕی وابوو ڕاست ئەکا مەبەستی لە پەروین ئەو نەبووە، دروستە لەگەڵیا بمێنێتەوە وە ئەگەر باوەڕی پێی نـەبوو، دروست نـییە بـۆی لەگەڵی بمێنێتەوە.

ئەگەر ژنەکەی وتی: سێ تەڵاقەم بدە، ئـەویش وتـی: تـەڵاقت کـەوتبێ‌و نـیازی ژمارەیەکی تایبەتی نەبوو، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ؛ ئەگەر یەك تەڵاقی ژنـەکـەی داو لەپاشا وتی: واکردم بە سێ تەڵاق، ئەوە هەر ئەو یەك تەڵاقەی ئەکەوێ، چونکە مەحاڵە یەك تەڵاق ببێ بە سێ تەڵاق.

ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ‌و تەڵاقت کەوتبێ تەڵاقت کەوتبێ و ماوە لەبەینیانا زۆر بوو، سێ تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر ماوە زۆر نەبوو، ئەوە بە یەکەم‌و بە دووهەم دوو تەڵاقی ئەکەوێ، جا ئەگەر بە جاری سێهەم مەبەستی تەئکیدکردنەوەی جاری دووهەم بوو، ئەوە هەر دوو تەڵاقەکەی کەوتووە وە ئەگەر مەبەستی تەئکیدکردنەوەی تەڵاقی یەکەم بوو، یاخود مەبەستی عەتف بوو، تەڵاقێکی تری پێ ئەکەوێ. بەڵام ئەم تەفسیلاتە

بۆ ژنێکە کابرا چووبێتە لای، چونکە ئەگەر ئەم قسانە لەگەڵ ژنێکدا رووبدا کە نەچووبێتەلای، ئەوە هەر لە سەرەتاوە تەڵاقێکی ئەکەوێو ئیتر بائینە ئەبێتەوەو تەڵاقی تری پێوە نالکێ؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا وتی بە ژنێکی کە نەچووبووە لای: هەرکاتێ چووی بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ و تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەوکاتەدا کە ئەچێتە ماڵی باوکی، دوو تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە ئەم دوو تەڵاقە پێکەوە بوون بە جەزای شەرتەکەو خۆیشیان لەبەر ئەوە کە بەهۆی واوی عەتفەوە وان بەیەکەوە، بەجارێ هەردووکیان ئەکەون؛ کەواتە، ئەگەر وتی بە ژنێکی کە نەچووبێتە لای: هەروەختی چوویتە ماڵی باوکت، تەڵاقێکت کەوتبێ، جا تەڵاقێکی تریشت کەوتبێ، ئەوە کە چووە ماڵی باوکی، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ، چونکە لەفزی «جا»، دواکەوتن ئەگەیەنێو ئافرەتێ کە نەچووبێتە لای، تەڵاقی دوایی ناکەوێ.

ئەگەر وتی بە ژنەکەی: تەڵاقێکت کەوتبێ لەپێش تەڵاقێکا، یا لەپاش تەڵاقێك، یا لەگەڵ تەڵاقێکا، ئەوە ئەگەر چووبووە لای ژنەکەی، دوو تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگینا هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ. ئەگەر وتی: نێو تەڵاقت لە نیو تەڵاقا، یا نیو تەڵاقت لە تەڵاقێکا، یا تەڵاقێکت لە تەڵاقێکا کەوتبێ، ئەوە هەر یەك تەڵاقی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر وتی: هەندێکی تەڵاقێکت کەوتبێ، یا دوو نیوە تەڵاقت کەوتبێ، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ، مەگەر لەم لەفزە دواییە مەبەستی دوو نیوە بێ لە دوو تەڵاق، ئەوە دوو تەڵاقی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر وتی: نیوەو سێ یەك و شەش یەکی تەڵاقێکت کەوتبێ، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: نیوەی دوو تەڵاق، یا سێ نیوە تەڵاق یا نیوە تەڵاقێك و سێ یەکی تەڵاقێکی ترت کەوتبێ، ئەوە دوو تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر وتی: نیوەو سێ یەکی تەڵاقێکت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقێکی ئەکەوێ.

ئەگەر کابرا چوار ژنی هەبوو، و وتی: تەڵاقێکم خستن، ئەوە یەکی تەڵاقێکیان ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: دوو تەڵاقم خستن، ئەوە ئەگەر مەبەستی بەشکردن بێ، یەکی تەڵاقێکیان ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی یەکی دوو تەڵاق بێ یەکی دوو تەڵاقیان ئەکەوێ وە ئەگەر وتێ: سێ تەڵاقم خستن، ئەوە ئەگەر مەبەستی بەشکردنی تێکڕای بێ، یەکی

تەڵاقێکیان ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ هەموو تەڵاقێکیان بەش بکاتەوە بەسەریانا، ئەوە یەکی سێ تەڵاقیان ئەکەوێ وە ئەگەر وتی چوار تەڵاقتان کەوتبێ، ئەوە ئەگەر مەبەستی بەشکردنی تێکڕای بێ، یەکی دوو تەڵاقیان ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی بەشکردنی هەموو تەڵاقێ بێ، ئەوە بە دابەشکردنی سێ تەڵاق، یەکی سێ تەڵاقەیان ئەکەوێو تەڵاقی چوارەم بە زیاد دەرئەچێ.

ئەگەر وتی: سێ تەڵاقم خست لەبەینتانا و لەپاشا، وتی: مەبەستم هەر تەڵاقی ژنێکیان، یا دوانیان، یا سیانیان بووە ئەوە بەئاشکرا لێی قەبووڵ ناکرێ، بەڵام کابرا حەواڵەی ئایینی خۆی ئەکرێ، جا لەسەر ئەو نیازەی لەبەینی خۆیو خوادا، هەرکامیان دەربکا دەرئەچێ و بۆ ئەوانەیش کە ماونەتەوە، ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ هەمووی بەشبکاتەوە بەسەریانا، یا یەکەیەکەی تەڵاقەکان بەش بکاتەوە، ئەوە دیارە وە ئەگەر بێمەبەست بوو، ئەوە هەریەکی سێ تەڵاقیان ئەکەوێ وە ئەگەر ژنێکی تەڵاق دا، جا وتی بە ژنێکی تری: تۆیشم کرد بە هاوبەشی ئەو، ئەمە ئەگەر نیازی تەڵاق نەبێ، بەتاڵە وە ئەگەر مەبەستی هاوبەشی بێ لە ئەسڵی تەڵاقکەوتنا، ئەمیش تەڵاقێکی ئەکەوێ؛ مەسەلا، لە یەك تەڵاقا و لە دوو تەڵاقا، تەڵاقێکی ئەکەوێ و لە سێ تەڵاقا، دوو تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر مەبەستی لە هاوبەشی ئەوەبوو ئەمیش وەك ئەو بێ، ئەوە ئەوەندەی ئەو تەڵاقی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر کەسێك ژنی خۆی تەڵاق بداو پیاوێکیتر بە ژنەکەی خۆی بڵێ: وا منیش تۆم کرد بە هاوبەش لەگەڵ ژنەکەی فڵانکەسدا.

## باسی جیاکردنەوەی یەکێك یا زیاتر لەوەی کە وتراوە (اسِتثناء)

جیاکردنەوە، دوو جۆرە؛ یەکەمیان، ژمارە هەڵئەگرێ وەکوو ئەوە بڵێت: سێ بەسێ تەڵاقت کەوتبێ، یەك تەڵاق یا دوو تەڵاقی نەبێ؛ دووەمیان، ئەسڵی تەڵاقەکە هەڵئەگرێ، وەکوو ئەوەکە بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ «إِنْ شاءَ اللّه» (ئەگەر خوا مەیلی ببێ)، یا «إِن لَمْ یَشأِ اللّه» (ئەگەر خوا مەیلی نەبێ)، لەم دوو سوورەتەی دواییدا تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە نە مەیلی خوا لە سوورەتی یەکەمدا وە نە بێمەیلی خوا لە سوورەتی دووهەمدا

بۆ ئێمە مەعلووم نییە؛ هەروەها، ئەگەر بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ، مەگەر خوا مەیلی ببێ، یا مەگەر خوا مەیلی نەبێ، ئەوە هەر تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە مەعنای سوورەتی یەکەم ئەوەیە تەڵاقت کەوتبێ، مەگەر کاتێ کە خوا مەیلی هەبێ لەسەر کـەوتنێ و مـەعنای سوورەتی دووهەم، ئەوەیە تەڵاقت کەوتبێ، مەگەر کاتێك کە خوا مەیلی نەبێ لەسەر کەوتن وەکوو لە شەرحی «محلّي» و «خَطيب»دا نووسراوە، وە بوونو نەبوونی مەیلی خوا لای ئێمە دیار نییە و مادام «معلَّق عليه» مەعلووم نەبێ، «مُعلَّق» نایەتەجێ؛ بێجگە لەمانە، مەعنای ئەم تەعلیق بە مەیلو بێمەیلییە، ئەگەر دێتـەسەر تـەعلیقی کـەوتنی تەڵاق لەسەر مەیل، ئەو مەیلە دیار نییە وە ئەگەر دێتە سەر تەعلیقی کەوتنی تەڵاق بە نەبوونی مەیلەوە، ئەوە تەڵاقکەوتن بە بێمەیلی خودا مەحاڵە؛ کەوابوو، بە هەرحـاڵ تەڵاقەکە ناکەوێ.

وە هەروەکوو تەعلیق بە مەیلو بێمەیلی خوداوە مانیعی کەوتنی تەڵاقە، هەروەها مانیعیشە بۆ بەجێهاتنی هەموو عەقدو حەللێك، وەکوو فرۆشتنو بەکرێدانو وەقفـو نەزرو بەخشینو نیکاحو سوێندو غەیری ئەمانەیش.

تەعلیقکردنیش بە سیفەتی غـەیری خـواستی خـواوە، وەکـوو ئـارەزووکردنو نەکردنی فڵانکەس، یا وەکوو چوون بۆ ماڵی فڵان ـ مەسەلا ـ ئەوە نە ژمارە هەڵئەگرێو نە ئەسڵی تەڵاق هەڵئەگرێ، بەڵکوو تەڵاقەکە ئەبەستێبـە هـەندێك وەزعو حـاڵەوە، چونکە بەجێهاتنو بەجێنەهاتنی ئەو سیفەتە دەرئەکەوێ بۆمان و ئەمانە حوکمیان جیایە لە جیاکردنەوە.

بزانن! جیاکردنەوە بە «إلاّ»ی عەرەبی وە بەهۆی بەستن بە مەیلی خواوە، چـەند شەرتێکیان هەیە.

یەکەم، ئەوەیە کابرا نیازی ئەو جیاکردنەوەیە ببێ لەپێش تەواوکردنی جـوملەی تەڵاقەکەدا، مەسەلا.

دووهەم، ئەوەیە لکابێ بە جوملەکەوە لەکاتی قسەکردنەکەدا بەجۆرێ کە لە عورفدا بە یەك قسە بژمێررێن؛ بەڵێ، زیانی نییە ماتڵبوونی ئینسان بۆ هەناسەدان و زمانگرتنو کوکەو دەنگگیران و بیرکردنەوە لە وەزعی جیاکردنەوەکەدا.

سێهەم، ئەوەیە بە زمان بڵێت بەجۆرێ کە خۆی بیبیسێ لەکاتی ئارامی شوێنەکەدا، ئەگینا بێ سوودە؛ کەواتە، ئەگەر کابرا ئیددیعای ئەوەی ئەکرد کە ئەو جیاکردنەوەیە لە دڵیا بووە، یاخود بە زمان وتوویەتی، بەڵام خۆی نەیبیستووە، ئەوە بە قەتعی لێی قەبووڵ ناکرێ، بەڵکوو حەواڵەی دیانەتی خۆیشی ناکرێ، چونکە جیاکردنەوەی ژمارە یا جیاکردنەوە بە ئارەزووی خوا (مَشیئةُاللّه)، زۆر قورسن، یەکەمیان ژمارە هەڵئەگرێو دووهەمیان ئەسڵی تەڵاقەکە هەڵئەگرێ، نیازی شتێکیش کە ژمارە لابەرێ یا ئەسڵی تەڵاقەکە لابەرێ، دوورە لە عورفو بەکارهێنانەوە؛ بەڵام لە تەعلیق بە سیفەتدا، وەکوو رۆیشتنەوە بۆ ماڵی باوکی ـمەسەلاـ ئەگەر کابرا ئیددیعای نیازی کرد، ئەوە ئەگەر بەڵگە هەبوو لەسەری، ئەوە بەئاشکرا قەبووڵ ئەکرێ، ئەگینا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام حەواڵەی دیانەتی خۆی ئەکرێ و لە واقیعدا ئەو نیازە سوودی هەیە بۆی، چونکە ئەم قەیدە شتێکی وا نییە کە ژمارە هەڵبگرێ یا ئەسلی تەڵاقەکە هەڵبگرێ، بەڵکوو تەڵاقەکە ئەبەستێ بە هەندێ حاڵەوە.

چوارەم، ئەوەیە وای بڵێ کە غەیری خۆیشی بیبیسێ، ئەگینا ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد کە وتوویەتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ مەگەر خودا مەیلی بێ، بەڵام ژنەکە نەیبیستووە و ژنەکەیش وتی: نەخەیر، نەیوتووەو کابرایش شاهیدی نەبوو، ئەوە ژنەکە سوێند ئەدرێ لەسەر نەبوونی ئەو قەیدەو تەڵاقەکەی ئەکەوێ، بەڵام لە غەیری ئەم قەیدەدا، وەکوو تەعلیق بە سیفەتێکی تر، بیستنی غەیر شەرت نییە وە ئەگەر کابرا ئیددیعای کرد وتی: وتوومە: تەڵاقت کەوتبێ، ئەگەر بڕۆیتەوە بۆ ماڵی باوکت، یا ئەگەر مناڵەکەم بۆ بەخێو بکەی، یا ئەگەر شتێ لە ماڵم دەرنەکەی و ژنەکەیش وتی: نەتوتووەو کابرا شاهیدی نەبوو، ئەوە کابرا باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێندو بە بێ ئەو سیفەتە، تەڵاقەکەی ناکەوێ، وەکوو لە حاشیەکانی «تُحفه» و «نهایة» و غەیری ئەوانیشدا هەیە و گوێ بەوە نادرێ کە لە «بُغیه»دا ئەڵێ: ژنەکە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، چونکە باوەڕ پێ کرانی ژن لە مەسئەلەی تەعلیقکردنایە بە ئارەزووی خواوە، وەکوو باسمان کرد.

بزانن! ئەگەر ژنەکە ئینکاری وتنی قەیدەکەی نەکرد، بەڵکوو ئینکاری بیستنی خۆی کرد، ئەوە لەم سوورەتەداکابرا باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند لەسەر وتنی قەیدەکە،

هەرچەند تەعلیق بە «مشیئةُاللّه»بێ، چونکە لازم ناکا لە نەبیستنەوە نەبوونی قەیدەکە؛ هەروەها، ئەگەر دوو شاهید لەویادا بن‌و بڵێن: ئەو قەیدەمان نەبیستووە، ئەوە هەر کابرا باوەڕی پێ‌ئەکرێ لەسەر وتنی قەیدەکە؛ بەڵێ، ئەگەر شەهادەتی شاهیدەکان لەسەر نەبزواندنەوەی لێوی کابرا بوو لەکاتێکی تـایبەتییا، ئـەوە شـەهادەتەکـەیان قـەبووڵ ئەکرێ، چونکە ئەم نەفی‌کردنە مەحدوودە.

پێنجەم، ئەوەیە کابرا مەعنای ئەو جیاکردنەوەیە بزانێ، یەعنی تێبگا کەچی لێ پەیدا ئەبێ؛ ئەگینا ئەگەر مەلایەك لەفزی جیاکردنەوەکەی پیشان بداو ئەویش خۆی نەیزانێ‌و بە زمان بیڵێ‌و لە مەعناکەی حاڵی نەبێ، ئەوە هیچ سوودی نییەو بـە هـیچ دائەنرێ.

شەشەم، ئەوەیە جیاکردنەوە هەموو لێ‌جیاکراوەکە نەگرێتەوە، یەعنی ئەوەندەی ژمارەی ئەو نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: سێ تەڵاقت کەوتبێ سێ تەڵاق نـەبێ، ئـەوە سوودی نییەو هەر سێ‌تەڵاقەکەی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر بڵێ: تەڵاقێکت کەوتبێ یەك تەڵاق نەبێ، یا دوو تەڵاقت کەوتبێ دوو تەڵاق نەبێ، هەر بێ‌سوودە؛ کەواتە، ئەبێ بڵێ: سێ تەڵاقت کەوتبێ یەك تەڵاقی نەبێ، یا دوو تەڵاقی نەبێ، ئـەوە لە سـوورەتی یەکەمدا، دوو تەڵاق و لە سوورەتی دووهەمدا، یەك تەڵاقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر چەند جیاکراوەیەك کەوتنە دوای یەك‌و یەکەمیان هەموو لێ‌جیاکراوەکەی ئەگرتەوە، ئەوە ئەگەر پاش جیاکردنەوەی ئەوانی‌تر لە پێشووەکەیان راست بووەوە، باشە؛ کەواتە، ئەگەر وتی: سێ‌تەڵاقت کەوت بێ تەنها سێ تەڵاق، تەنها دوو تـەڵاق، تەنها تەڵاقێك نەبێ، ئەوە تەڵاقێکی ئەکەوێ، چونکە یەك لە دوو دەرکەین، یەکێکـی ئەمێنێتەوە و ئەم یەکە لە سێ دەرکەین، دووی ئەمێنێتەوە و ئەم دووە لە سێ دەرکەین، یەك تەڵاقی ئەمێنێتەوە کە ئەوەیە ئەکەوێ.

وە ئەگەر وتی: سێ تەڵاقت کەوتبێ تەنها سێ تەڵاقی نەبێ، تەنها دوو تەڵاقی نەبێ؛ ئەوە دوو تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە دوو لە سێ دەرکەین، یەکی ئەمێنێتەوە و ئەم یەکە لە سێ دەرکەین، دووی ئەمێنێتەوەو ئەم دووە ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: پـێنـج تـەڵاقت

کەوتبێ سێ تەڵاقی نەبێ، دوو تەڵاقێ ئەکەوێ. وە ئەگەر وتی: سێ تەڵاقت کەوتبێ نیوە تەڵاقێك نەبێ، ئەوە هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، چونکە لەپاش جیاکـردنەوەی نـیوە تەڵاقەکە، ئەو نیوە تەڵاقە کە ئەکەوێ ئەبێ بە هۆی کەوتنی نیوەکەی تریشی؛ کەواتە، وای لێ دێت وەکوو ئەوە هیچی جیا نەکردبێتەوەو هەر سێ تەڵاقەکەی ئەکەوێ.

**بزانن!** جیاکردنەوە لە نەفی ئیسباتە و جیاکردنەوە لە ئیسبات نەفیە و لە سوورەتی یەك کەوتنی چەند جیاکردنەوەیەکدا، چەند دەستوورێك هـەیە بـۆ ئـەوەی بـزانـین لەئەنجاما چەند تەڵاقی ئەکەوێ؛ ئاسانتریان، ئەوەیە جیاکراوەی دوایی دەربکـەی لەوەی وا لەپێشیەوە و هەروەها تا ئەگەی بەوەی لە سەرەتاوە جیاکراوەتەوە.

## باسی شك‌وگومان لە تەڵاقدا

گومان لەم شوێنەدا، سێ بەشە؛

یەکەم، گومانە لە ئەسڵی تەڵاقدا؛

دووەم، گومانە لە ژمارەیدا؛

سێهەم، گومانە لە تەڵاقدراوەکەدا. جا ئەگەر کابرا گومانی لەوەدابوو کە تەڵاقـی ژنەکەی داوە بە تەنجیز یا بە تەعلیق، ئەوە هەموو زانایانی شەرع لەسەر ئـەوەن کـە تەڵاقەکە ناکەوێ وە ئەگەر ئەیزانی تەڵاقێ کەوتووە بە یەقین و گومانی لەوەدا بوو کە ژمارەی تەڵاقەکە چەندە، ئەوە لای کەمی ئەکەوێ، بەڵام سوننەتە کابرا «وَرْع» (پارێز) بکا، یەعنی لە سوورەتی یەکەمدا، ژنەکەی «رِجعە» بکاتەوە، ئەگەر گومانی لە تەڵاقی «رجعي»دا بوو و عەقدی نیکاحەکەی تازە بکاتەوە ئەگەر گومانی لە تەڵاقی بائینەدا بوو، یاخود ساف تەڵاقی بدا بۆ ئەوەی لەپاش بەسەرچوونی «عِدّە» بە یەقین حەڵاڵ بێ بۆ ئەوکەسەی کە شووی پێ ئەکا وە لە سوورەتی دووهەمدا، ئیعتیباری لای ژووروی ژمارەکە بکا، یەعنی ئەگەر گومانی لە یەك‌و دوودا بوو، ئیعتیباری دوو بکا وە ئەگەر گومانی لە دوو و سێدا بوو، ئیعتیباری سێ بکاو مارەی نەکاتەوە تا شوو نـەکـا بـە یەکێکی تر؛ جا ئەگەر ویستی لەپاشا مارەی بکاتەوە و بە سێ تەڵاقە بێتەوە بۆلای، سێ تەڵاقەی بدا بۆ ئەوەی لەپاش مارەبەجاش (تَحليل) بە سێ تەڵاقەوە بێتەوە بۆلای.

## باسی گومان له ژنه تەڵاقدراوەکەدا

له سوورەتی سێهەمیشدا، ئەگەر کابرا وتی به ژنەکەی: ئەگەر ئەو پەلەوەرە کۆتر بوو، تەڵاقت کەوتبێ و یەکێکی تریش وتی به ژنەکەی خۆی: ئەگەر ئەو پەلەوەرە کۆتر نەبوو، تەڵاقت کەوتبێ و نەزانرا پەلەوەرەکە کۆترە یا نه، ئەوه حوکم ناکرێ به کەوتنی تەڵاقی هیچیان، چونکه هەرچەند ئەبێ لایەکیان راست بێ و دروست نییه هیچ لایەکیان راست نەبێ، بەڵام مادام تەعلیقەکان هەریەکی له کەسێکەوەیەو هەرکەسێ لەوان تەعلیقەکەی به تەنها مایەی کەوتنی تەڵاقەکەی نییه، تەعلیقی ئەوی‌تر نابێ بەهۆی کەوتنی تەڵاقەکەی.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك ئەم دوو تەعلیقەی بەرابەر به دوو ژنی خۆی کرد، ئەوه تەڵاقی ژنێکیان بەڕاستی ئەکەوێ، چونکه هەردوو ژنەکه لەژێر عیسمەتی ئەودان و تەڵاقی هەر کامیان بکەوێ، لەسەر ئەم کابرا حەرام ئەبێ و پێویسته لەم‌کاتەدا له وەزعی پەلەوەرەکەیش بکۆڵێتەوه، ئەگەر تەڵاقەکه «بائن» بێ و قابیل بێ پەلەوەرەکه بدۆزرێتەوه به نیشانەو عەلامەتدا، جا پاش ئەوەکه تەڵاقی هەرکامیان کەوت، واجبه کابرا دەری‌بیرێ و بەیانی بکا وه ئەگەر دۆزینەوەی قابیل نەبوو، لێکۆڵینەوەی واجب نییه، هەروەها ئەگەر تەڵاقەکه «رجعي»بێ؛ جا ئەگەر تەڵاقەکه «بائن» بوو و قابیلی چاك کردنەوە بوو، وەکوو ئافرەتێك که نەچووبێته لای، ئەوه با هەردوو ژنەکه ماره بکاتەوه وه ئەگەر تەڵاقەکه «رجعي» بوو، با هەردووکیان بگێڕێتەوه، یا بڵێت: هەرکامیان تەڵاقی کەوتووه هێنامەوه ژێر نیکاحی خۆم.

وه ئەگەر کابرا دوو ژنی هەبوو وه ژنێکیانی تەڵاق داو پاشان لەبیری چووەوه کامیانی تەڵاق داوه، واجبه خۆی رابگرێ و نزیکی هیچ‌کام لەو دوو ژنه نەکەوێ تا ئەکەوێتەوه بیری کام ژنی تەڵاق داوه و داوای بەیانیشی لێ‌ناکرێ، ئەگەر ژنەکان باوەڕ بکەن بەوەکه لەبیری نەماوه، چونکه حەق هەر حەقی خۆیانه وه ئەگەر وتیان: باوەڕمان نییه پێت که لەبیرت چووەتەوه و به عەمدی قسه ناکەی، ئەوه ئەگەر هەردووکیان

بێ دەنگ بوون، ئەوە باشە وە ئەگەر یەکێکیان پێش دەستی کردو ئیددیعای کرد کە خۆی تەڵاق دراوەکەیە، ئەوە کابرا داوای سوێندێکی جەزمی لێ ئەکرێ کە تەڵاقی ئەو ژنەی نەداوە و قەناعەت ناکرێ بەوە کە بڵێ: لەبیرم چووەتەوە، جا ئەگەر نکوولی کرد لە سوێند، ئەوە ژنەکە سوێند ئەخوا کە تەڵاق دراو خۆیەتی و حوکمی بۆ ئەکرێ بە جیابوونەوەی لە کابرا.

وە ئەگەر لەپاش ئەم ژنە ژنەکەی تریش ئەو ئیددیعایەی کرد، ئەوە تەرتیبی پێشوو جێبەجێ ئەکرێ. ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی لەگەڵ بێگانەیەکدا: یەکێکتان تەڵاقی کەوتبێ و ئیددیعای کرد کەوا نیازی ژنە بێگانەکە بووە، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند وە ئەگەر ئەم ئیددیعایەی نەکرد، ئەوە ژنەکەی خۆی تەڵاقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر ئەم قسەیە کرد بەرابەر بە ژنەکەی خۆی لەگەڵ وڵاخێکا، یا لەگەڵ دارێکا، ئەوە حەملی قسەکەی ئەکرێ لەسەر ژنەکەی، چونکە وڵاخ یا بەردو دار نابن بە جێگەی تەڵاق و ئیددیعای نیازکردنی ئەوانەی لێ قەبووڵ ناکرێ نە بە ئاشکراو نە بە نهێنی، بەڵام «شیروانی» گێڕاویەتەوە کە: هەندێ لە زانایانی شەرع لەسەر ئەوەن کە بە نهێنی لێی قەبووڵ ئەکرێ، یەعنی کابرا حەواڵەی دیانەتی خۆی ئەکرێ، وەکوو مەسئەلەی دارەکە.

وە ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکانی: ئەگەر حەجم کرد یەکێکتان تەڵاقی کەوتبێ و لەپاشا، ژنێکیان مرد، یا تەڵاق درا بە تەڵاقی «بائن» ئەوسا ڕۆیشت حەجەکەی کرد، ئەوە ئەو ژنیانە کە ماوەتەوە تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی بە دایکی ژنەکەی: تەڵاقی کچەکەت کەوتبێ و ئیددیعای کرد کە نیازم ئەو کچەی بووە کە ژنی من نییە، ئەوە باوەڕ بە قسەکەی ئەکرێ وە ئەگەر وتی: تەڵاقی ژنی عالەم کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ژنەکەی خۆی ناکەوێ، مادام بە تایبەتی نیازی لە ژنەکەی خۆی نەبێ، چونکە خاوەن قسە بەر عوموومی قسەکەی خۆی ناکەوێ.

وە ئەگەر وتی: تەڵاقی زێنەب کەوتبێ و زێنەب، ناوی ژنەکەی خۆی و ژنێکی تر بوو و وتی: نیازم زێنەبە بێگانەکە بووە، ئەوە بەئاشکرا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام حەواڵەی

ئایینی خۆی ئەکرێ وە ئەگەر وتی: فاتمەی کچی حەمەی ژنم تەڵاقی کەوتبێ، کەچی ژنەکەی ناوی ئامینەی کچی حەمە بوو، یا ناوی فاتمەی کچی ئەحمەد بوو، ئەوە تەڵاقی ژنەکەی ئەکەوێ و ئەو هەڵەیە کە لەناوەکەدا هەیە تەئسیری نییە.

وە ئەگەر وتی بە دوو ژنی خۆی: یەکێکتان تەڵاقی کەوتبێ و مەبەستی یەکێکی دیارییان بوو، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر نیازی ژنێکی نامەعلوومی کرد، یا نیازی هەردووکیانی کرد، یاخود نیازی کەسیانی نەکرد، ئەوە تەڵاقی یەکێکی نامەعلوومیان ئەکەوێ؛ جا لەو سوورەتەدا کە مەبەستی یەکێکی دیاری بووە، واجبە بەیانی بکاو ناوی دەرببڕێ و لە سوورەتەکانی تردا، واجبە یەکێکیان دیاری بکا بۆ تەڵاقکەوتن و دروست نییە نزیکی کەسیان بکەوێتەوە تا بەیانی تەڵاقدراوەکە ئەکا، یا یەکێکیان دیاری ئەکا؛ هەروەها، واجبە لەسەری پەلەپەل بکا بۆ ئەم بەیانکردنو دیاریکردنە، ئەگەر هەردوو ژنەکە یا یەکێکیان داوایان کرد، بۆ ئەوە کە تەڵاق کەوتووەکە جیابێتەوە لە تەڵاق نەکەوتووەکە کە لە بەندی کابرادا ئەمێنێتەوە؛ هەروەها، واجبە لەسەری نەفەقەو مەسرەفی هەردووکیان بدا تا وەزع مەعلووم ئەبێ؛ جا پاش دەرکەوتنی تەڵاق کەوتووەکە، ئەگەر سکی هەبوو، ئەوە تا سکەکەی لێ ئەبێتەوە، نەفەقەیشی ئەداتێ و ئەو ژنەیان کە بە تەڵاق کەوتوو دائەنرێ، هەر لەکاتی لەفزی تەڵاقەکەوە بە تەڵاق کەوتوو ئەناسرێ، نەك لەکاتی بەیانکردنو دیاریکردنەوە.

**بزانن!** ئەگەر تەڵاقەکە «رجعي» بوو، ئەوە بەیانکردنو دیاریکردن واجب نییە، چونکە تەنها گەڕانەوە لەو تەڵاقە بە دەم بەسەو بەیانکردنو دیاریکردن بە چوونە لای ژنەکە پەیدا نابن.

ئەگەر کابرا لەکاتی بەیانکردندا وتی: ئەمەیە تەڵاقدراوەکە، یا ئەمەیە ژنەکەم، ئەوە ئەبێ بە بەیانکردن و دیاریکردن وە ئەگەر وتی: مەبەستم ئەمەیانو ئەوەیان بوو، یا: مەبەستم ئەمە بوو، بەڵکوو ئەوە بوو، یا: مەبەستم ئەمە بوو لەگەڵ ئەوەدا، ئەوە بەئاشکرا حوکم ئەکرێ بە کەوتنی تەڵاقی هەردووکیان، بەڵام لەڕاستیدا تەنها تەڵاقی ئەویانە ئەکەوێ کە مەبەستی بووە وە ئەگەر مەبەستی هەردووکیان بووبوو، ئەوە تەڵاقی

هەردووکیان ناکەویٚ، چونکە بە لەفزێك کە بۆ تاقە کەسێك دەس بدا، تەڵاقی دوو کەس ناکەویٚو هەر تەڵاقی یەکێکیان ئەکەویٚ وە ئەگەر لەپێش بەیانکردنو دیاریکردنا هەردوو ژنەکە مردن، یاخود یەکێکیان مرد، ئەوە هەر داوای بەیانکردنو دیاریکردنی لیٚ ئەکریٚ بۆ ئەوەی حوکمی میراتەکەیان دیاری بیٚ.

وە ئەگەر لەپێش بەیانکردنو دیاریکردندا، کابرا مرد، ئەوە فەرموودەی دیارتر ئەوەیە لە بەیانکردنا قسەی میراتگر قەبووڵ ئەکریٚ نەك لە دیاریکردنا، چونکە بەیانکردن خەبەردانەو گێرانەوەی ناوی ئەو ژنەیە کە زوو تەڵاقی کەوتووە و قابیلە ئەم میراتگرە زوو ئەوەی زانیبیٚ. بەڵام دیاریکردن، هەڵبژاردنی ژنێکە لەناو چەند ژندا بۆ جیایی و ئەمە بە پێی ئارەزووی نەفسەو پەیوەندی بە خاوەن ژنەکەوەیەو دەخڵی میراتگری تیا نییە وە ئەگەر میراتگرەکە دواکەوت لە بەیانکردنەکە، ئەوە میراتی ژنێك هەڵئەگیریٚ تا ژنەکان لەناو خۆیانا ریٚئەکەون.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد بە سیٚ تەڵاقەو سوێندەکەی کەوتو چەند ژنێکیشی هەبوو، ئەوە یەکیٚ لەو ژنانە بە سیٚ تەڵاقە تەڵاقی ئەکەویٚو کابرا ناتوانیٚ ئەو سیٚ تەڵاقە بەش بکاتەوە بەسەریانا بۆ ئەوە کە یەکیٚ تەڵاقێکیان بکەویٚ، یاخود تەڵاقێك بدا بەسەر یەکێکیاناو دوو تەڵاقیش بدا بەسەر ژنێکی تریا، لەبەر ئەوە کە ئەو سوێندە ئەبیٚ بەهۆی «بەینوونەتی کوبرا»، بەڵام ئەگەر ژنیٚ لەو ژنانە یەك تەڵاقی مابوو، ئەوە کابرا ئەتوانیٚ ئەو ژنە دیاری بکا بۆ ئەو سیٚ تەڵاقەیە کە خواردوویەتی، چونکە مەبەست لە سیٚ تەڵاقە، «بەینوونەتی کوبرا»یە و ئەوەیش لەم ژنەدا بە تەڵاقێك دیتەجیٚ؛ کەوابوو، ئەو تەڵاقەی کە ماوە ئەکەویٚو دوو تەڵاقەکەی کە ماوەتەوە لە سوێندەکەی، بە پووچ دەرئەچیٚو زیان بە ژنیٚ تر ناگەیەنیٚ.

وە ئەگەر یەکیٚ لەو ژنانە لەپێش دیاریکردنیا بۆ تەڵاقەکان مرد، یا تەڵاقی کەوتو بائینە بووەوە، ئەوە کابرا ئەتوانیٚ ئەو سیٚ تەڵاقە کەوتووە بدا بەسەریا وە ئەگەر بە تەعلیق وتی: ئەگەر فڵانکەس هات یەکیٚ لە ژنەکانم سیٚ تەڵاقەی کەوتبیٚ و کابرا هات، جا یەکیٚ لە ژنەکانی مرد، یا بە تەڵاق بائینە بوو، ئەوە کابرا ئەتوانیٚ ئەو سیٚ تەڵاقە بدا بەسەر ئەو ژنە مردووە یا ئەو ژنە تەڵاق دراوەدا.

وە ئەگەر سوێندی خوارد بە دوو تەڵاق لەسەر ئیشێكو سوێندەكەی كەوت و دوو ژنیشی بوو كە یەكێ دوو تەڵاقیان مابوو، ئەوە ئەتوانێ ئەو دوو تەڵاقە بەش بكاتەوە بەسەریانا یەكی تەڵاقێك و واجب نییە ئەو دوو تەڵاقە هەر بدا بەسەر یەكێكیانا، چونكە دووتەڵاقە لە زاتی خۆیا نابێ بەهۆی جیابوونەوەی یەكجاری، هەرچەند لەم سوورەتەی ئێمەدا وا رێكەوتووە كە بووە بەهۆی و ئەیشتوانێ لەپێش سوێندكەوتندا یەكێ لە ژنەكان بڕیار بدا بۆ تەڵاقەكان، بەڵام واجبە لەدواییدا دیاریی بكا و ناتوانێ لەوە پەشیمان ببێتەوە.

وە ئەگەر سوێندی خواردو سوێندەكەی كەوت، بەڵام گومانی پەیدا كرد لەوەدا كە ئەو سوێندە تەڵاق بووە یا نە، ئەوە حوكم بە كەوتنی تەڵاقی ناكرێ، هەرچەند واجبە لەسەری دوور بكەوێتەوە لە ژنەكەی تا سوێندەكەی بۆ رۆشن ئەبێتەوە؛ یاخود ئەگەر تەڵاقەكەی «رجعي» بوو «رجعە»ی بكاتەوە وە ئەگەر بائینە بوو و مەجالی تازەكردنەوەی نیكاحی هەبوو، نیكاحەكەی تازە بكاتەوە.

ئەگەر وتی: ئەگەر ئەو پەلەوەرە كۆتر بوو، تەڵاقی ژنەكەم كەوتبێ، ئەگینا بەندەكەم ئازاد بێ و نەزانرا پەلەوەرەكە چییە، ئەوە مەنع ئەكرێ لە نزیك‌كەوتنەوەی ژنەكەیو ئیش‌كردنیش بە بەندەكەی وە ئەگەر لەپێش بەیان‌كردنا مرد، بەیان‌كردنی میراتگرەكەی قەبووڵ ناكرێ، بەڵكوو قورعە ئەخرێ لەبەینی ژنەكەیدا بۆ تەڵاق‌كەوتن و بەندەكەی بۆ ئازادبوون، جا ئەگەر قورعەكە بە ناوی بەندەكەوە دەرچوو، ئازاد ئەبێ وە ئەگەر بە ناوی ژنەكەوە دەرچوو، تەڵاقی ناكەوێ و لەم‌كاتەدا، هەروەكوو ژنەكەی تەڵاقی ناكەوێ، بەندەكەیش بە بەندەیی نامێنێتەوەو ئیشكالەكە هەروەكوو خۆی بەردەوام ئەبێ.

## باسی تەڵاقی «سُنّي» و «بِدْعي»

تەڵاق، هەرچەند پێنج حوكمەكەی بەسەرا ئەڕوا ـ وەكوو لەپێشەوە بەیانمان كرد ـ بەڵام بەكورتی بەپێی ئیستیلاحی مەشهوور، سێ جۆرە؛ «سُنّي» و «بِدْعي» و نە «سنّي» و نە «بدعي». و لەسەر ئیستیلاحی «مِنْهاج»، دوو جۆرە «سنّي» و «بدعي».

بەپێی ئیستیلاحەکەی مینهاج، تەڵاقێ «سنّی» ئەوەیە دروست بێ، یەعنی حەرام نەبێ و تەڵاقێ «بدعی» ئەوەیە حەرام بێ. تەڵاقی «سنّی» بەم ئیستیلاحە، ئەوەیە چوار شەرتی تیا بێتەجێ؛

یەکەم: ئەوەیە ژنەکە مێردەکەی چۆوبێتەلای؛

دووەم: ئەوەیە عیددەی بە «ئەقراء»بێ، یەعنی بە حەیزو پاکی بێ؛

سێهەم: ئەوەیە لەپاش تەڵاقدانەکەی دەس بکا بە عیددەی «اقراء»، بەم رەنگە دووگیان نەبێ یا دووگیان بێ لە زینا یا لە شوبهە و لە هەردوو حاڵەتەکەدا، حەیزی پیابێ و مێردەکەیشی تەڵاقی دابێ لەگەڵ ئاخری حەیزەکەیا، یا لەکاتی پاکیدا لەپێش تەواوبوونی ماوەی پاکییەکەیدا، یاخود تەعلیقی تەڵاقەکەی کردبێ بە رابووردنی هەندێ لە ماوەی پاکییەکەیەوە یا تەعلیقی کردبێ بە ئاخری حەیزەکەیەوە؛

چوارەم: ئەوەیە نەچووبێتە لای لەو پاکییەدا کە تەڵاقەکەی تیا داوە یا تەعلیقی تەڵاقەکەی کردووە بە رابووردنی هەندێکیەوە، هەروەها نەچووبێتە لای لەو حەیزەداکە لەپێش ئەو پاکییەوە بووە و لەو حەیزەدا کە تەڵاقی داوە لەئاخریەوە، یا تەعلیقی تەڵاقەکەی کردووە بە ئاخریەوە. جا لەسەر ئیستیلاحی مینهاج، ئەگەر ئەم چوار شەرتە هاتنەجێ، ئەوە تەڵاقەکە «سنّی»یە، ئەگینا «بدعی»یە و لەسەر ئیستیلاحە سێ لقەکە، ئەگەر هەر چوار شەرتەکە هاتنەجێ، ئەوە «سنّی»یە وە ئەگەر دوو شەرتە ئاخرییەکە فەوتا، ئەوە «بدعی»یە وە ئەگەر دوو شەرتە پێشووەکە یا یەکێکیان فەوتا، ئەوە ئەکەوێتە بەر بەشە ناونجییەکە کە نە «سنّی»یەو نە «بدعی»یە.

بزانن! لەسەر ئیستیلاحی مینهاج کە تەڵاق تەنها «سُنّی»و «بدعی»یە، تەڵاقی «سنّی» بەکورتێ، هەشت حاڵەتە؛

یەکەم: تەڵاقی ژنێ کە دووگیان نەبێو تەڵاق درابێ لەکاتی ئاخری حەیزەکەیدا؛

دووهەم: تەڵاقی ژنێ کە دووگیان نەبێو ژنێ کە تەڵاق درابێ لەکاتی پاکیدا لەپێش ئەوەداکە ئەو پاکییە تەواو ببێ؛

سێهەم: تەڵاقی ژنێکە کە دوو گیان نەبێو تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە رابووردنی هەندێ لە ماوەی پاکییەکەوە؛

چوارەم: تەڵاقی ژنێکە کە دوو گیان نەبێ‌و تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە ئاخری حەیزەکەیەوەو حەیزی پیادا بێ؛

پێنجەم: تەڵاقی ژنێکە دووگیان بێ لە زینا یا لە شوبهەو حەیزی ببێ‌و تەڵاق درابێ لە ئاخری حەیزەکەیەوە؛

شەشەم: تەڵاقی ژنێکە کە دوو گیان بێ لە زینا یا لە شوبهە و تەڵاق درابێ لە پاکیدا لەپێش تەواوبوونی پاکییەکەیدا؛

حەوتەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان بێ لە زینا یا لە شوبهە و تەعلیقی تەڵاقی کرابێ بە رابووردنی هەندێك لە ماوەی پاکییەکەوە.

هەشتەم: تەڵاقی ژنێکە دووگیان بێ لە زینا یا لە شوبهەو تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە ئاخری حەیزەکەیەوە؛ لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، شەرتە مێردەکە نەچووبێتە لای ئەو ژنە، نە لەو پاکییەداکە تەڵاقی داوە تیایا، یاکە تەعلیقی تەڵاقەکەکراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە و نە لەو حەیزەدا کە وا لەپێش ئەو پاکییەوەیەو نە لەو حەیزەدا کە تەڵاقی ژنەکە دراوە لە ئاخریەوە یا تەعلیقی تەڵاقەکەکراوە بە ئاخریەوە.

تەڵاقی «بدعی»یش، بیست‌و دوو حاڵەتە؛

یەکەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان بێ لە چوونەلای بە شوبهەو حەیزی پیادا نەیەت.

دووەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان بێ لە چوونەلای بە زیناو حەیزی پیا نەیەت.

سێهەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و حەیزی پیا بێت‌و تەڵاق درابێ لە ئاخری پاکییەکەیدا.

چوارەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و حەیزی پیا بێت‌و تەڵاق‌درابێ لە حەیزدا لەپێش دوایی هاتنیەوە.

پێنجەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و خاوەنی حەیز بێ‌و تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە رابووردنی هەندێ لە ماوەی حەیزەکەیەوە.

شەشەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و حەیزی پیا بێت‌و تەعلیقی تەڵاقی کرابێ بە دوایی پاك بوونەوەیەوە.

**حەوتەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بە شوبهەو تەڵاق درابێ لەدوایی پاك بوونەوەیدا.

**هەشتەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بە شوبهەو تەڵاق درابێ لە حەیزدا لەپێش تەواوبوونیا.

**نۆهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێت لە زینا یا لە چوونەلای بەشوبهەو تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە رابووردنی هەندێك لە حەیزەکەیەوە.

**دەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان بێ لە زینا یا لەچوونەلای بە شوبهە و تەعلیقی تەڵاقەکەی کرابێ بە دوایی پاك بوونەوەیەوە.

**یازدەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و حەیزی پیا بێت، بەڵام مێردەکەی چووبێتە لای لەو پاکییەیدا کە تەڵاق دراوە تیایا.

**دوازدەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان نەبێ‌و حەیزی پیا بێت، بەڵام مێردەکەی چووبێتەلای لەو پاکییەیدا کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە.

**سیانزەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان نەبێ‌و مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەدا کە وا لەپێش ئەو پاکییەوە کە تەڵاق دراوە تیایا.

**چواردەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان نەبێ و مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەدا کەوا لەپێش ئەو پاکییەوە کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە.

**پانزەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان نەبێ، بەڵام مێردەکەی نەچووبێتە لای لەو حەیزەدا کە تەڵاق‌دراوە لەپێش تەواوبوونیا.

**شانزەهەم:** تەڵاقی ژنێکی خاوەن حەیزە کە دووگیان نەبێ، بەڵام مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەدا کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە ئاخرەکەیەوە

**حەڤدەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بەشوبهە، بەڵام مێردەکەی چووبێتەلای لەو پاکییەدا کە تەڵاق دراوە تیایا.

**هەژدەهەم:** تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە شوبهەو

مێردەکەی چووبێتە لای لەو پاکییەدا کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە.

نۆزدەهەم: تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بەشوبهە و مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەداکەوا لەپێش ئەو پاکییەوە کە تەڵاق دراوە تیایا.

بیستەم: تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیابێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بەشوبهە و مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەدا کە تەڵاق دراوە لەپێش تەواوبوونیا.

بیست‌و یەکەم: تەڵاقی ژنێکە کە حەیزی پیا بێت‌و دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بە شوبهە و مێردەکەی چووبێتە لای لەو حەیزەدا کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە.

بیست‌و دووهەم: تەڵاقی ژنێکە کە دووگیان بێ لە زینا یا لە چوونەلای بەشوبهە، وە مێردەکەی چووبێتەلای لە پاکییەکداکەوا لەپێش ئەو حەیزەوەکە تەعلیقی تەڵاقەکە کراوە بە رابووردنی هەندێکیەوە.

لەسەر ئەو ئیستیلاحە کە ئەڵێ تەڵاق سێ جۆرە، تەڵاقی ژنێ کە نەچووبنە لای‌و تەڵاقی ژنێ کە سەرسام بێ‌و نە حەیزی دیار بێ‌و نە پاکی دیار بێ و تەڵاقی ژنێ کە تەعلیقی تەڵاقی کرابێ بە سیفەتێکەوە کە بە رێکەوت لەماوەی حەیزدا بێتەجێ و تەڵاقی ژنێ کە سکی دەرکەوتبێ لە نیکاحی دروست یا لە چوونەلای بەشوبهە و تەڵاقێك کە حەکەمی پیاوو ژنەکە بیدا لەسەر مەسڵەحەت و تەڵاقی ژنی نابالغ و تەڵاقی «مولي» و تەڵاقی ژنێ کە نائومێد بووبێ لە حەیز، لە بەشی ناونجی دائەنرێ کە نە «سنّي»یەو نە «بدعي»، لەبەر ئەوەکە لە ئافرەتی نەچووەلادا قەیدی یەکەم فەوتاوە و لە حاڵەتەکانی‌تردا لەپاش تەڵاقدانەکە ژنەکە دەس‌ناکا بە «عیددەی موحەققەقەی ئەقراء»، چونکە یا هەر «عیددەی ئەقراء» نییە وەکوو لە حاڵەتی ئافرەتی نابالغ‌و نائومێددا ـ یا «ئەقرائی موحەققەقە» نییە ـ وەکوو لە حاڵەتی ئافرەتی سەرسام و لە تەڵاقی پیاوی «مولي»دا وە لە تەڵاقی دوو حەکەمی پیاوو ژنەکەدا، لەڕاستیدا خاوەن

ژنەکە ئیختیاری بەدەست نییەو تەڵاقەکە زۆرکارییە و ئەو ژنەیش کە تەعلیقی تەڵاقەکەی کراوە بە سیفەتێکەوە کە بە ڕێکەوت لە حەیزدا دێتەجێ، ئەوە تەڵاقەکەی «سنّی» نییە، چونکە پاش تەڵاقەکە دەس ناکا بە ئەقراء و «بدعی»یش نییە نیسبەت بە کابرا، چونکە نیازی ئەوەی نەبووە سیفەتەکە لەوکاتەدا بێتەجێ، بەڵکوو بە هەڵکەوت وا هاتووەتەجێ.

**بزانن!** تەڵاقی «بدعی» حەرامە و لەگەڵ ئەوەشدا کە سوورەتی زۆرە، بەڵام بەکورتی دوو بەشە،

**یەکەم:** تەڵاقی کە بە تەنجیز بێ یا بە تەعلیق کە بە سوورەتی قەسدو عەمد بکەوێتە ماوەی حەیزی ژنێکەوە کە مێردەکەی چووبێتەلای، بەو شەرتە ژنەکە خۆی قەبووڵی خولعی نەکردبێ لە پیاوەکە، ئەگینا نابێ بە «بدعی»، چونکە ژنەکە خۆی ئارەزووی هەیە لەو تەڵاقە، بۆیە پارە سەرف ئەکاو خۆی ڕزگار ئەکا و لەم شوێنەدا، دەرئەکەوێ کە ئەگەر بێگانەیەك قەبووڵی خولع بکا لە کابرا بە بێ زانست و ئارەزووی ژنەکە ئەوە ئەو تەڵاقە هەر بە «بِدعی» ئەناسرێ و حەرامە.

**دووهەم:** تەڵاقێکە لە پاکیدا، بەو شەرتە ژنەکە مێردەکەی چووبێتەلای لەو پاکییەدا یا لە حەیزی پاش ئەو پاکییەدا و ژنەکەیش لە سكوزا نەکەوتبێ و سکیشی دەرنەکەوتبێ؛ کەواتە، ئەگەر ژنێکی خاوەن حەیز لە ماوەی حەیزدا مێردەکەی چووەلای و ژنەکە پاك بووەوە جا کابرا تەڵاقی دا، ئەوە ئەو تەڵاقە «بدعی»یە، چونکە ڕێی تێ ئەچێ لەو چوونەلاوەوە سکی پڕ بووبێ؛ بەڵێ، حەڵاڵە خولعکردن لەگەڵ ئەم ژنە «وطأ» کراوەدا، هەروەها حەڵاڵە تەڵاقدانی ژنی کە سکی دەرکەوتبێ.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ هەر کە لە حەیزەکەت پاك بوویتەوە، ئەوە ئەو تەڵاقە «سُنّی»یە وە ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ لە ئاخری پاکبوونەوەکەتدا، ئەوە بیدعییە، خواه لەو پاکییەدا چووبێتە لای یا نە وە ئەگەر وتی بە ژنەکەی: لەکاتی حەیزدا تەڵاقێکی بیدعیت کەوتبێ، ئەوە لەو کاتەدا تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: تەڵاقێکی «سنی»ت کەوتبێ ئەوە لەپاش پاکبوونەوە لە حەیزەکەی تەڵاقی ئەکەوێ وە

ئەگەر وتی بە ژنەکەی: لە کاتی پاکی دا تەڵاقت کەوتبێ بە «سنّی»، ئەمە ئەگەر لەو پاکییەو لە حەیزی پێش ئەو پاکییەدا مێردەکەی نەچووبووەلای، لە هەمانکاتدا تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر لە یەکێ لەو دوو کاتەدا چووبووە لای، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، تا ئەگاتە کاتێ پاکییەکیوا کە باسمان کرد، جا لەوکاتەدا تەڵاقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقێکی «بدعی»ت کەوتبێ، ئەوە هەر لەو کاتەدا تەڵاقەکەی ئەکەوێ، ئەگەر چووبێتەلای ژنەکەی لەوکاتەدا یا لە حەیزێکاکە لەپێش ئەو پاکییەوە بێ وە ئەگەر وتی تەڵاقێکی جوان یا زۆرجوانت کەوتبێ، ئەوە وەکوو ئەوە وایە بڵێ: تەڵاقێکی «سنّی»ت کەوتبێ وە ئەگەر وتی تەڵاقێکی ناشیرین یا زۆرناشیرینت کەوتبێ، ئەوە وەکوو ئەوە وایە بڵێ تەڵاقێکی بیدعیت کەوتبێ. وە ئەگەر وتی تەڵاقێکی سینی و بیدعیت کەوتبێ یا تەڵاقێکی جوان و ناشیرینت کەوتبێ ئەوە لە عەینی ئەو کاتەدا کە ئەم لەفزە ئەڵێت، تەڵاقەکەی ئەکەوێ، چونکە مادام ئەم دوو قەیدە زیددی یەکن، هەردووکیان بەتاڵ ئەبنەوەو ئەسڵی تەڵاقەکەی ئەمێنێتەوە.

وە هەرکەسێ تەڵاقی «بدعی» بداو ژمارەی تەڵاقی تەواو نەکردبێ، ئەوە ئەگەر تەڵاقەکەی «بائِن»بێ، سوننەتە نیکاحەکەی تازە بکاتەوە وە ئەگەر تەڵاقەکەی «رجعي»بێ، سوننەتە بیهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی؛ جا ئەگەر لە حەیزدا تەڵاقی دابێ، ئەم سوننەتە دەوام ئەکا تا ئەو حەیزە تەواو ئەبێ وە ئەگەر لە پاکیدا تەڵاقی دابوو، دەوام ئەکا تا ئەو پاکییەو حەیزی پاش ئەو پاکییەش تەواو ئەبێ.

**بزانن!** کۆکردنەوەی سێ تەڵاقە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا حەرام نییە، یەعنی ئەگەر کەسێك لە کاتی تەڵاقی «سنّی»دا بە یەك سیغە بڵێت بە ژنەکەی: سێ تەڵاقەت کەوتبێ، یاخود بە نیازی دووبارەکردنەوە (استِئناف) بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ،... تەڵاقت کەوتبێ،... تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەو تەڵاقدانە حەرام نییەو تەڵاقەکانیش ئەکەون بە چەند دەلیل:

یەکەم: ئەوەیەکە بە زاهیری مەعنای ئایەتی ﴿أَوْ يَعْفُوَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾ و ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ و چەند ئایەتی تریش، گرێی عیسمەتی

ژن، وا بەدەستی مێردەوەو موڵکی مێردەو هەرشتێ کە لە دەستی ئەودا بێ، ئەتوانێ هەموو جۆرە تەسەڕوفێکی تیا بکا، مادام شەرع مەنعی نەکاو ئەسڵیش مەنع نەکردنە.

دووەم: ئەوەیە کە «عُیمر العَجلانی»، پاش «لیعان»کردن لەگەڵ ژنەکەیدا، بەجارێ سێ تەڵاقەی دا پێش ئەوە کە حەزرەتﷺ خەبەری پێبدا کە بەهۆی «لیعان»ەکەوە حەرام بووە لەسەری، لەگەڵ ئەوەشدا کە حەزرەت مەنعی نەکرد لە خستنی ئەو سێ تەڵاقەیە وە ئەگەر ئەمە حەرام بوایە، مەنعی ئەکرد، چونکە «عمیر» بۆیە تەڵاقی ژنەکەی دا چونکە وای ئەزانی کە هێشتا ژنیەتی و ئەوکەسانەی لایان وایە سێ تەڵاقە ناکەوێ، کۆکردنەوەی سێ تەڵاقەیان بەجارێ بەلاوە حەرامە و ئینکاری حەرام واجبە لەلایەنی ئەوانەوە کە ئەو حەرامە بە حەرام ئەزانن و واجبە نەزانیان فێر بکەن، کەچی نە ئینکارکردنی ئەو حەرامەو نە فێرکردنی نەزان نەبیسراوە لە پێغەمبەرەوەﷺ.

سێهەم: گەلێ لە ئەسحابەی پێغەمبەر ژنی خۆیان بە سێ تەڵاقە تەڵاق داوەو کەس لێی نەگرتوون.

چوارەم: لە «بُخاری»دا ئەگێڕێتەوە لە «حەزرەتی عائشەوە» ـ خوای لێ رازی بێ ـ کەوا ژنی «رَفاعة القرظی» هات بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ عەرزی کرد کەوا: رفاعەی مێردم تەڵاقی داوم بە تەڵاقی «بَتّ» یەعنی قەتعی، واتە سێ تەڵاقەو شووم کردووە بە «عبدالرّحمن»ی کوڕی زوبەیر و ئەویش شتێکی پێیە وەکوو ریشەی جل وایە «واتە ناتوانێ بچێتە لای»، پێغەمبەریش فەرمووی: «ئەتەوێ بڕۆیتەوە بۆلای رەفاعە؟ ئەمە نابێ تا تۆ لەزەت لە «عبدالرّحمن» وەرنەگریو ئەویش لەزەت لە تۆ وەرنەگرێ. لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە تەڵاقی سێ تەڵاقە ئەکەوێ ئەگینا ئەم تەحلیل کردنەوەیە پێویست نەئەبوو، ئەوەش کە بڵێین لەوانەیە مێردەکەی بە جیاجیا لە سێ مەجلیسدا تەڵاقی ژنەکەی دابێ تا دوا تەڵاق، ئەوە خیلافی زاهیری حەدیسەکەیەو ئەگەر وابوایە، ئەگێڕرایەوە بۆمان.

پێنجەم: ئەوەیە «حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب» لە زەمانی خەلافەتی خۆیدا حوکمی کردووە بە کەوتنی سێ تەڵاقە و ئەسحابەکانیش لێیان نەگرتووە؛ کەواتە، ئەو حوکمە بووە بە جێگەی «ئیجماعی سکووتی».

شەشەم: ئەوەیە ئیمامە موجتەهیدەکان قسەیان یەکە لەسەرکەوتنی سێ تەڵاقەوە و خیلافیان نەبووە لە کەوتنیا؛ بەڵێ، لای هەندێکیان، وەکوو «ئەبوو حەنیفەو مـالیك و ئەحمەد» ـلە فەرموودەیەکیا ـ سێ تەڵاقە حەرامـە و لای «شـافیعی و ئـەحمەد» ـلە فەرموودەیەکیا ـ حەرام نییە و لەپاش ئەوان، لە شارانی ئیسلامدا بە پێی بیرورای ئەوان رەفتار کراوە، تەنها هەندێ زانایانی تاك و تەرا نەبێ کەس پێچەوانەی ئەوەی نەوتووە، لەپاش دامەزرانی ئیجماعیش موخالەفەکردن زیان ناگەیەنێ.

ئەمەی کە وتمان، هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوە کە سێ تەڵاقە بەجارێ ئـەکـەوێ و باوەڕی بەهێز ئەدەن بە ئینسان و لە ئەحکامی فەرعی‌دا ئەم جۆرە باوەڕە کافییەو لادان لیێ لادانە لە باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

ئەوانەش کە باوەڕیان بە پێچەوانەی ئەم باوەڕەوەیەو لایانوایە سێ تەڵاقە بە یەك تەڵاق ئەژمێررێ، ئەم دەلیلانەی خوارەوە ئەهێننەوە:

یەکەم: ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: ﴿اَلطَّلاقُ مَرَّتانِ، فَـإِمْساكٌ بِـمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْريحٌ بِإِحْسان) یەعنی ئەو تەڵاقەی کە ئەکەوێ، بەجار لەپاش جارە؛ کەواتە، ئەگەر کابرا بەجارێ هەر سێ تەڵاقەکەی خست، ئەوە هەر بەجارێك حیساب ئەکرێ؛ ئەم دەلیلەیان بەکار نایەت، لەبەر چەند شت؛ یەکەم، ئەوەیە ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە لە باسی تەڵاقی «رجعي»دا. «حاكِم» و «ترمِذي» گێڕاویانەتەوە لە «عائیشە»وە ـخوای لێ رازی بێ ـ فەرموویەتی: پیاو، ژنی خۆی تەڵاق ئەداو لەماوەی عیددەدا ئەیهێنایەوە، تا پیاوێك وتی: بە ژنەکەی وەڵڵاهی تەڵاقت نادەم تا جیا ببێتـەوە لێم بـە تـەواوی و رایشت ناگرم لای خۆم. ژنەکەیش وتی: چۆن وا ئەبێ؟ ئەویش وتی: تەڵاقت ئەدەم و وازت لێ دێنم تا کاتی تەواوبوونی «عِدّە»کەت نزیك ئەبێتەوە، ئەمجار ئەتهێنـمەوە بۆلای خۆم و هەر بەمجۆرە رەفـتارت لەگـەڵ ئـەکـەم، ژنـەکـەیش هـاتە خـزمەتی پێغەمبەرﷺ ئەم قسانەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش بێدەنگ بوو تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر باسی تەڵاقی «رجعي»، یەعنی: ئەو تەڵاقەی کە گێڕانەوەی لەپاشەوە دروستە، دووجارە، ئیتر پاش ئەو دووجارە حوکمی خودا یا راگرتنی ژنەکەیە بە یاسای شەرع یا بەرەڵڵاکردنیەتی بە چاکەو پیاوەتی لەگەڵیا بەجۆرێ کە حەقی نەفەوتێ؛

کەواتە، ئەم ئایەتە پەیوەندی نییە بە تەڵاقی بائینەوەو باسی ئەوە نییە ئاخۆ سێ تەڵاقە چۆن ئەکەوێ.

دووهەم، ئەگەر فەرز بکەین‌و بڵێین: ئەم ئایەتە باسی هەموو جۆرە تەڵاقێکە، هەر نابێ بە دەلیل لەسەر نەکەوتنێ سێ تەڵاقە بە یەك‌جار، چونکە ئەم ئـایەتە خـەبەرەو خەبەر لە حوکمدا وا لە جێی ئەمردا، ئەگەر خەبەری ئیجابی بێ، ئەمریش بە هەر شتێك مەعنای نەهیە لە پێچەوانەی ئەو شتە؛ کەواتە، ئەوپەڕی ئەم ئایەتە ئەوەیە ئەمر بێ بە خستنی تەڵاق، جار لەدوای جار و نەهی بێ لە خستنی سێ تـەڵاقـە بـە یـەك‌جار و خستنی تەڵاق بە جار لەدوای جار واجب بێ‌و خستنی سێ تەڵاقە بە جارێك حەرام بێ وە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر بە تەنها جارێك سێ تەڵاقی خست، هەر نەکەوێ یا بەجارێك‌و بە تەڵاقێك بژمێررێ؛ تەماشا ناکەی خوای گەورە لەئایەتی ﴿وَ إِذا طَلَّقْتُمُ النِّساءَ فَطَلِّقوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾دا فەرمانی داوە بەوە کە ئینسان وا تەڵاقی ژنەکەی بداکە ئەو تەڵاقە ببەسرێ بە زەمانی دەس‌کردنەوە بە «عِدّە»، لەگەڵ ئەوەیش هەموو زانایانی شەرع لەسەر ئەوەن کە تەڵاقی موخالیفی ئەمەیش، وەکوو تەڵاقی ژن لە حـەیزدا بـا حەرامیش بێ، هەر ئەکەوێ؛ کەواتە، سێ تەڵاقـە بـەجارێك ئـەکـەوێ، هـەرچـەند تەڵاق‌دانی‌وا حەرامیش بێ و ئەم ئایەتە هەر ئەبێ بە دەلیل بۆ ئـەو پـێشـەوایـانە کـە لایان‌وایە حەرامە بەجارێك پیاو هەر سێ تەڵاقەی ژنەکەی بدا.

سێهەم، بە پێی لێکدانەوەی عیلمی، «الف لام» لە لەفزی «الطّلاقُ مرّتان»دا، نابێ بۆ جینس‌و ماهییەت‌و تەبیعەت بێ، چونکە ماهییەتی تەڵاق، نە جارێکەو نە دوو جارە و نابێ بۆ ئیستیغراقیش بێ، بەم مەعنا کە بڵێیت: هەموو ئەفرادی تەڵاق بە جار لەدوای جار ئەبێ، چونکە یەك تەڵاقە بە ئیتیفاقی هەموو زانایانی شەرع ئەکەوێ و دوو تەڵاقە بە بێ‌هیچ ناکۆکییەك لەنێوانیانا، ئەکەوێ وە نابێ بۆ عەهدی خاریجیش بێ، بەم مەعنا ئەو تەڵاقە مەعهوودە کە ئەکەوێ، جار لەدوای جارە، بە وێنەی دەلیلی پێشوو؛ کەواتە، پێویستە بۆ عەهدی شەرعی بێ، بەو مەعنایە ئەو تەڵاقە کە سوننەتە، ئەبێ جار لەدوای جار بێ، یا ئەو تەڵاقە کە گێڕانەوە (رجعە)ی لەپاشەوە هەبێ، جار لەدوای جارە و ئەم

مەعنایە، مەعقوولەو مەقبوول، چونکە گێڕانەوەی سەبەبی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەری، ئیتر بە هیچ جۆرێ دەخلی بە کەوتن و نەکەوتنی سێ تەڵاقەوە نییەو دەلیل هێنانەوە بەم ئایەتە لەسەر ئەو مەبەستە، شتێکی دانەمەزراوو نارەوایە.

بەڵگەی دووهەمی ئەوانەی کە ئەڵێن: سێ تەڵاقە بەجارێك ناکەوێ، ئەوەیە کە لە روکانەی کوڕی «عبدالعزیز» یا «عبد یزید» روویدا کە ئەوەبوو ژنەکەی لە یەك مەجلیسدا بە سێ تەڵاقە تەڵاق دابوو و زۆر زویریش بوو لەو ئیشە، تا حەزرەتﷺ پرسیاری لێ کرد: «چۆنت تەڵاق داوە؟» ئەویش عەرزی کرد: سێ تەڵاقەم داوە لە یەك مەجلیسدا، ئەویش فەرمووی: ئەمە بە یەك تەڵاق دائەنرێ، جا ئەگەر ئارەزووت لێیە ژنەکەت بهێنەرەوە؛ ئەویش ژنەکەی هێنایەوە.

ئەمەیش نابێ بە دەلیل، لەبەر دوو شت؛

یەکەم، ئەوەیە کە لەفزی «لە یەك مەجلیسدا» زاهیرە لەوەدا کە تەڵاقەکەی وا داوە وتوویەتی «أَنْتِ طالِقٌ... أَنْتِ طالِقٌ... أَنْتِ طالِقٌ» ئەگینا ئەگەر بە «أَنْتِ طالِقٌ ثلاثا» بوایە، مەعنای یەك مەجلیس و دوو مەجلیس نەئەبوو؛ کەواتە، حەزرەتﷺ، جوملەی دووهەم و سێهەمی بە تەئکیدکردنەوەی جوملەی یەکەم داناوەو یەك تەڵاقی پێ خستووە، وەکوو ئێستەش شەرع لەسەر ئەوە ئەڕوا کە ئەگەر کەسێك نیازی تەئکیدکردنەوەی هەبێ بە جوملەی دووهەم و سێهەم، تەڵاقێکی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر موتڵەق بێ و کابرا مەبەستی هیچی نەبێ، فەرموودەیەك هەیە ئەڵێ: تەڵاقێکی پێ ئەکەوێ و ئیتر عەلاقەی نییە بە وتنی جوملەی «أَنْتِ طالِقٌ ثَلاثاً»ەوەو نابێ بە دەلیل بۆیان.

دووەم، ئەوەیە ئەم گێڕانەوەی رووداوەی «روکانە»، خیلافی تیایەو بۆ ئەوە ناشێ بکرێ بە بەڵگە، چونکە «ابو داود» و «ترمِذی» و «ابنُ ماجه»، لە ریوایەتێکی ترا ئەڵێن: «روکانە»، ژنەکەی بە «بتّ»ی تەڵاق دا، یەعنی پێی وت: «أَنْتِ طالِقٌ اَلْبَتَّةَ» و حەزرەت پرسیاری لێ کرد: «مەبەستت لەم «بَتّ»ە چی بووە؟» ئەویش عەرزی کرد: هیچ مەبەستم نەبووە تەنها یەك جار نەبێ و حەزرەت سوێندی داوە لەسەر ئەو

مەبەستەی و حوکمی کردووە کە تەنها تەڵاقێکی ئەکەوێ؛ لە واقیعیشدا، تەڵاقی «بتّ»ی، وەکوو هەڵئەگرێ کابرا مەبەستی سێ تەڵاقەی پێ بکا، هەروەها هەڵیش ئەگرێ نیازی یەك تەڵاقی پێ بکرێ و بڕیار وایە: «إِذَا ثَبَتَ الاِحْتِمَالُ سَقَطَ الاستِدلالُ»؛ کەواتە، ئەم ڕووداوەی «رکانه» نابێ بە دەلیل بۆیان.

بەڵگەی سێهەمی ئەوانەی کە لایانوایە سێ تەڵاقە یەك تەڵاقی پێ ئەکەوێ، ئەوەیە ریوایەتی «ابنُ عبّاس» ـ رضي الله عنهما ـ ئەکەن بە دەلیل کە سێ تەڵاقەی بە تەڵاقێك داناوە؛ ئەمەیش بۆ دەلیل ناشێ، چونکە «ابو داود»، گێڕاویەتەوە لە «مُجاهِد»ەوە ئەڵێ: لای «ابنُ عبّاس» دانیشتبووم، پیاوێك هاتە خزمەتی عەرزی کرد: ژنەکەم تەڵاق داوە بە سێ تەڵاقە، خوایش فەرموویەتی: ﴿وَ مَنْ يَتَّقِ اللّهَ يَجْعَلْ لَّهُ مَخْرَجاً﴾، منیش ئەمەوێ مەخرەجێکم بۆ بدۆزیتەوە؛ «ابن عبّاس» بێ دەنگ بوو تا باوەڕم وای لێ هات کە ژنەکەی پێ ئەداتەوە، لەپاشا فەرمووی: یەکێ لە ئێوە ئەڕوا سواری حەماقەت ئەبێ، جا دێ بۆلام و ئەڵێ: «﴿وَ مَنْ يَتَّقِ اللّهَ﴾... الآية»، تۆ تەقوای خوات نەکردووەو من هیچ مەخرەجێك نابینمەوە بۆت، تۆ بێ گوێیی خوات کردووەو ژنەکەت بائینە بووەتەوە؛ ئەم ریوایەتە دەلیلە لەسەر ئەوەکە یەکێ بەجارێك سێ تەڵاقەی ژنەکەی بدا، تەڵاقەکانی ئەکەوێ و ئەوەندەیە گوناهی ئەگا.

بەڵگەی چوارەمیشیان، ئەوەیە کە «مُسلِم» ئەگێڕێتەوە لە «ابن عبّاس»ەوە کەوا: سێ تەڵاقە لە زەمانی پێغەمبەرﷺ و زەمانی خەلافەتی "ئەبووبەکر و عومەر"دا یەك تەڵاق بوو، جا عومەر فەرمووی: خەڵکی پەلەپەل ئەکەن لەوەدا کە مۆڵەتیان هەیە تیایدا، چاکوایە بەگوێرەی پەلە پەلەکەی خۆیان حوکم بدەین بەسەریانا»، یەعنی سێ تەڵاقە لەمەوپێش یەك تەڵاقی پێی ئەکەوت و عومەر کردی بەوەکە سێ تەڵاقی پێ بکەوێ.

ئەم ریوایەتەیش بۆ دەلیل ناشێ، چونکە ئەگەر مەعنای ئایەت وابێ سێ تەڵاقە هەر یەك تەڵاقی پێ بکەوێ و حەزرەتیشﷺ وای رەفتارکردبێ و ئەبووبەکریش لەسەر ئەوە ڕۆیشتبێ، چۆن عومەر ئەتوانێ ئەو ئوسووڵە بەتاڵ بکاتەوە و ئەسحابەی حەزرەتﷺ چۆن بەرابەر بە وەزعیوا بێ دەنگ ئەبن؟

بەڵکوو مەعنای قسەکە وایە وەختی خۆی موسوڵمانان بە مۆڵەتو جیاجیا بە یەك تەڵاقە ژنی خۆیانیان تەڵاق ئەداو هێرشیان نەئەکردە سەر سێ تەڵاقە، بەڵام ئێستە ئەو ڕێگە ئارامەی قەدیمیان بەجێهێشتووە و بەجارێ سێ تەڵاقە ئەخەن، مادام وایە، با ئێمەیش لەسەر وەزعی ئەوان حوکم بدەین بەسەریانا بە کەوتنی سێ تەڵاقەکەیان، چونکە ئیشەکە وا لە دەستی خۆیانا، ئەگەر بە مۆڵەت ڕەفتار بکەنو یەکەیەکە تەڵاقی ژنیان بدەن، یاخود پەلەپەل بکەنو بەجارێ هەر سێ تەڵاقەکەیان بدەن؛ زیاد لەوە، «ابن عباس» لەگەڵێ ماددەدا خۆی حوکمی کردووە بە کەوتنی سێ تەڵاقە بـە یـەك لەفـز ـ وەکوو لە کتێبە گەورەکانا بەیان کراوە ـ ئیتر مەجال نامێنێ بۆ ئەوە کە بڵێین: باوەڕی «ابنُ عبّاس» لەسەر ئەوە بووە کە سێ تەڵاقە بە لەفزێك هەر یەك تەڵاقی پێ‌ئەکەوێ و ئەوەیش هەر لەسەر باوەڕی ئیمامەکانە.

**ئاگاداربن!** هەندێ لە خوێندەواران وایان گومان ئەبرد کەوا بە یەك لەفز قابیل نییە سێ تەڵاق بکەوێ، وەکوو قابیل نییە بە تاقە دارێك بڵێیت: ئەمە سێ دارە و بە قەتعی، بە سێ لەفز نەبێ سێ تەڵاقە ناکەوێ وە ئەم گومانە ئەوەندە پووچە بۆ ئەوە ناشێ ئینسان وەرامی بداتەوە؛ ئەم خوێندەوارانە، قیاسی حەل و عەقدی شەرعیان کردوو لەسـەر شتی عەین و نازانن ئەحکام حوکمێکیان هەیەو ئەعیان حوکمێکیان هـەیە؛ سـەیرە! بۆچی تەماشای ئەوەیان نەکردووە کە ئینسان بە یەك سیغەی فرۆشـتن ئـەتوانـێ دە موڵکی جیاجیا بفرۆشێ و بەتەنها لەفزێك ئەتوانێ دە جۆرە ماڵ نەزر بکا لە کەسێك، یاخود بیان بەخشێ و بە یەك لەفز ئەتوانێ چوار ژن تەڵاق بدا و بە یەك سیغە ئەتوانێ چەند خێرات نەزر بکا لەسەر خۆی و مادام بە شەرع ژمارەی تـەڵاق سـێ بـێو لە دەستی پیاودا بێ، ئەتوانێ هەموو جۆرە تەسەڕوفێکیان تیا بکا بە تەنجیزو تەعلیق و ئەتوانێ تەسەڕوف لە یەك تەڵاقا بکا یا لە دوو تەڵاقا یا لە سێ تەڵاقا؟! وە ئەگەر بـە گومانی ئەوجۆرەکەسانە بوایە، ئەبووکەسێك نەتوانێ بە یەك لەفزی تەڵاق، تەڵاقی دوو ژن بدا، هەرچەند کەس خیلافی لەوەدا نییە.

مەبەست لەم تەفسیلاتە، ئەوە بوو پێویستە ئینسان بە بێ‌دەلیلێکی خاوەن ئیعتیبار، لە زاهیری قورئان و حەدیس لانەدا و پێویستە لەسەر ئینسان بیروباوەڕی «خولەفای

راشیدین و ئیمامە موجتەهیدەکان» بکا بە سەرمەشق بۆ رەفتاری دینی خۆی و بە ئادابی کۆمەڵی «ئەهلی سوننەت و جەماعەت» رەفتار بکا.

* * *

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: سێ تەڵاقەت کەوتبێ بەشێوەی سوننەت و لەپاشا، ئیددیعای کرد کە نیازی وابووە ئەو تەڵاقانە بەش‌بەش بکرێنەوە بەسەر سێ قورءدا و لە هەر قورئێکدا تەڵاقێکی بکەوێ، ئەمە ئەگەر کابرا لەو کەسانە بوو کە بە باوەڕی ئەوان کۆکردنەوەی سێ تەڵاقە حەرام بێ، وەکوو «مالِکی»، ئەوە ئەو ئیددیعایەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، ئەگینا بە زاهیر لیێ قەبووڵ ناکرێ، بەڵام حەواڵەی دینی خۆی ئەکرێ‌و ئەتوانێ لەبەینی خۆی و خوای خۆیدا وا رەفتار بکا.

وە ئەگەر وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ و ئیددیعای کرد کە نیازی ئەوە بووە ئەگەر بڕواتە ماڵی فلانکەس، ئەمە ئەگەر بەڵگەیەك هەبوو لەسەر ئەم نیازەی، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ‌و باوەڕی پێ‌ئەکرێ، ئەگینا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام «تَديين» ئەکرێ، یەعنی حەواڵەی دینی خۆی ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر وتی: ژنەکانم هەموویان تەڵاقیان کەوتبێ‌و ئیددیعای ئەوە بکا کە مەبەستی هەندێکیان بووە، ئەوە ئەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر نیازی ئەوەی کە مەبەستی بووە بە قسەی خۆی، وەکوو ئەوە کە ژنەکەی شەڕی لەگەڵ بکاو بڵێت: ژنت هێناوە بەسەرم، ئەویش بڵێت: هەر ژنێکم هێناوە تەڵاقی کەوتبێ‌و ئیددیعا بکا کە مەبەستی ئەوە بووە غەیری ئەو ژنەی کە شەڕی لەگەڵ کردووە، ئەوە قسەکەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، چونکە بەڵگەی هەیە وە ئەگەر بەڵگەیەك نەبوو لەسەر راستی ئیددیعاکەی، حەواڵەی خۆی و خوای ئەکرێ.

هەروەها، ئەگەر ژنەکەی ویستی بڕواتە دەرەوە بۆ شوێنێکی دیاری‌و کابرا وتی: ئەگەر ئیمشەو بڕۆیتە دەرەوە تەڵاقت کەوتبێ و ژنەکەی شەو دەرچوو بۆ غەیری ئەو شوێنە و کابرا وتی: نیازم هەر ئەوە بوو کە مەنعی بکەم لەو شوێنە تایبەتییە، ئەوە بە زاهیر لیێ قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر وتیان بە کەسێك: ئەمڕۆ قسەت کردووە لەگەڵ فلانکەسدا، ئەویش وتی: تەڵاقم کەوتبێ قسەم لەگەڵ نەکردووە و ئیددیعا بکا کە مەبەستی ئەو رۆژە بووە، ئەوەی لێ قەبووڵ ئەکرێ.

وە ئەگەر وتی بە ژنەکەی: ئەگەر شتێکت بە خوشکەکەمەوە بینی و خەبەرت نەدامێ، تەڵاقت کەوتبێ و لەپاشا، وتی: مەبەستم ئەو شتانە بووە کە عەیب و عارن، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ، چونکە بەڵگە لەسەر مەبەستەکەی هەیە، بەڵام شێخی «ابن حجر» ئەفەرموێت: ئەو بەڵگەیە ئەبێ بەڵگەی لەفزی بێ‌و بەڵگەی حاڵ و مەقام سوودی نییە؛ کەواتە، ئەگەر یەکێ رۆیشتە لای برادەرێکی کە لەوکاتەدا قاوەڵتی ئەکرد و برادەرەکەی وتی: ئەگەر قاوەڵتیم لەگەڵدا نەکەی، تەڵاقم کەوتبێ، ئەوە حەمل ناکرێ لەسەر قاوەڵتی ئەو رۆژە بەهۆی ئەوەوە کە حاڵەتەکە وائەگەیەنێ، بەڵکوو حەمل ئەکرێتە سەر موتڵەقی قاوەڵتی و هەتا زەمانی نائومێد بوون لە قاوەڵتی کردن لەگەڵیا تەڵاقی ناکەوێ، هەرچەند قەرینەی حاڵ وائەگەیەنێ مەبەست ئەو قاوەڵتییە بێ کە تەڵاقەکەی لادا خوراوە، وەکوو «قاضی» بەیانی کردووە، بەڵام ئیمامی «بَغَوی» موخالەفەی قازی کردووەو بڕیویەتی بەسەر شتێکا کە عورف و عادەت پێویستی ئەکا و ئەم بیرە زۆرتر نزیکە لەگەڵ ئوسوولی شەرعدا وە لەسەر موافقەتی «بَغَوی»، شێخی «رَملي» ئیعتیباری کردووە بە قەرینەی حاڵ و مەقام؛ کەواتە، ئەگەر داوا کرا لە یەکێك کە رێگای ژنەکەی بدا بڕوا بۆ ناو تاقمێکی بێگانە بۆ شایی ـ مەسەلا ـ کابرایش سێ تەڵاقەی خوارد وتی: ئەم ژنی منە نابێ خۆی دەربخا بۆ ئەو تاقمەو بۆ غەیری ئەو تاقمەیش و ژنەکە لە هەمان شەودا چوو بۆ ناو کۆمەڵێك ژن و کابرا ئیددیعای کرد کە مەبەستی لە غەیری ئەو تاقمە پیاوێکی بێگانەی تر بووە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ‌و باوەڕ بە سوێندی ئەکرێ، چونکە قەرینەی حاڵ و مەقام وا ئەگەیەنێ کە غیرەتی کابرا هەڵناگرێ پیاوی بێگانە تەماشای ژنەکەی بکا.

وە ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ‌و ئیددیعای کرد کە مەبەستی ئەوە بووە ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ (إن شاءَ اللّه)، ئەوە نە بەئاشکرا لێی قەبووڵ ئەکرێ‌و نە حەواڵەی بەینی خۆی‌و خوایش ئەکرێ، چونکە بەستن بە مەیلی خواوە تەڵاقەکە لە ئەساسدا لائەبا.

بەکورتی، زەبتی بەیانی مەبەست وا ئەکرێ ئەگەر کابرا تەفسیری تەڵاقە موتڵەقەکەی بە شتێکی واکردەوە کە لە ئەساسدا تەڵاقەکە لابیا، وەکوو ئەوە کە بڵێ: مەبەستم تەڵاقێك

بووەکە نەکەوێ، یا: مەبەستم ئەوە بووە ئەگەر خوا ئارەزووی لێ ببێ، یا: مەبەستم ئەوە بووە تەنها یەك تەڵاق نەبێ، پاش ئەوەی کە وتی: هەر سێ تەڵاقم کەوتبێ، یا: مەبەستم ئەوە بووە تەنها سەلما نەبێ، پاش ئەوەی کە بڵێ: هەر چوار ژنەکەم تەڵاقیان کەوتبێ، ئەوە نە قەبووڵ ئەکرێو نە حەواڵەی خۆی و خوای ئەکرێ، هەر لەم بابەتەیە ئیددیعای رووداني بەینوونەت لەوەپێش، لەلایەن کەسێکەوە کە ئێستا سێ تەڵاقەی کەوتبێ.

وە ئەگەر مەعنای لێبداتەوە بە شتێ کە بیبەستێتەوە بە سیفەتێکەوە وەکوو رۆیشتن بۆماڵی باوکی، یا لای بدا بۆ مەعنایەکی تر، وەکوو مەعنا لێدانەوەی «طَلاق» لە زمانی عەرەبیدا بە رزگاربوون لە بەند، یا وەکوو تەخسیس کردنی شتێکی گشتی لە میسالە پێشووەکانا، ئەگەر بەڵگە هەبوو، چ لەفزی، لای هەموو زانایان و چ قەرینەی حاڵ و مەقام، لای «بَغوی» و «رَملی»، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر بەڵگە نەبوو، حەواڵەی خۆی و خوای خۆی ئەکرێ، بەڵام لە هەموو حاڵێکا، نیاز لە کاتێکا سوودی هەیە کە کابرا بەر لە تەواوبوونی قسەکەی لە دڵی گرتبێ، ئەگینا لەوەلا سوودی نییە.

**بزانن!** لە هەر شوێنێکا کە مەجالی تەدیین بێ، فاسقی کابراکە نابێ بە کۆسپ لە رێی ئەو تەدیینەدا، هەرچەند کابرا لە رادەبەدەر فاسقیش بێ، چونکە مەعنای تەدیین ئەوەیە ئێمە حەقمان بەسەرەوە نییەو حەواڵەی خوای ئەکەین و حەقیقەتی حەواڵەی خواکردن لە شەرعدا، ئەوەیە بڵێین بە ژنەکە: تۆ بە زاهیر حەرام بوویت لەسەر ئەم کابرا و حەقی فەرمانبەرداریی مێردەکەتت نییە، مەگەر باوەڕت وابێ کابرا راست ئەکا، لەبەر ئەوەکە بەڵگەیەکت هەبێ بیکەی بە دەلیل لەسەر راستی کابرا، جا ئەگەر بەڵگەیەکی وای لا بوو، واجبە لەسەری بە گوێی کابرا بکا، ئەگەرچی قازی هەرکاتێ پێیان بزانێ، لە یەکیان جوێ ئەکاتەوە وە ئەگەر ژنەکە لای وابێ کابرا درۆ ئەکا، ئەوە حەرامە بە گوێی بکا وە ئەگەر شکی ببێ لە راست و درۆیا، کەراهەتی هەیە بکەوێتە دوای.

«بێدار بن» ئەگەر کابرا ئیقراری کرد بە تەڵاق و لەپاشا ئینکاری کرد یاخود ئیقراری کرد بە سێ تەڵاقە وە لەپاشا وتی: هەر تەڵاقێك بووە، ئەوە ئەگەر عوزرێکی پەسەندی نەبێ بۆ ئەم پەشیمانبوونەوەیە، قەبووڵ ناکرێ وە ئەگەر عوزرێکی

پەسەندی هەبوو؛ مەسەلا، وتی: وامزانی وەکیلەکەم تەڵاقی داوە، کەچی تەڵاقی نەدابوو، یاخود: لەفزێکم وت وامزانی بەو لەفزە سێ تەڵاقەم ئەکەوێ، کەچی ئێستا فتوایان داوە بۆم هەر تەڵاقێکم ئەکەوێ، ئەوە ئەو پەشیمانییەی لێ قەبووڵ ئەکرێ.

## باسی تەعلیقی تەڵاق

تەعلیق، بریتییە لە بەستنی مەعنای جوملەیەك بە مەعنای جوملەیەکی ترەوە، بەجۆرێ کە تا «مُعَّلقٌ علیه» نەیەتەجێ، «معلَّق» نەیەتەجێ و لەم مەقامەدا، قسەمان لە تەعلیقی تەڵاقە کە بریتییە لە بەستنی تەڵاقی ژنەکە بە هاتنە جێگەی مەعنای جوملەیەکەوە، خواە بەهۆی حەرفی تەعلیقەوە بێ، وەکوو ئەوە بڵێت: ئەگەر لەم خانووە دەرچوویت، تەڵاقت کەوتبێ، یا بەهۆی رەبتکردنی تەڵاقەکەوە بێ بە کاتێکەوە، وەکوو ئەوە بڵێت: لە رۆژی یەکەمی مانگدا تەڵاقت کەوتبێ، یا بە شوێنێکەوە، وەکوو ئەوە بڵێت: لە ماڵی باوکتا تەڵاقت کەوتبێ، یا: بەهۆی بەستنی تەڵاقەکەوە بە سیغەی ئەمرەوە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: لە مارەییەکەت ئازادم بکەو تەڵاقت کەوتبێ، یا: کچەکەم بۆ بەخێو بکە دوو ساڵو تەڵاقت کەوتبێ، یا: دە دینار پارەم بدەرێو تەڵاقت کەوتبێ،... .

جا هەرکاتێ تەعلیقی تەڵاق کرا بە شتێکەوە، هەتا ئەو شتە نەیەتەجێ تەڵاقەکە ناکەوێ، خواە ئەو سیفەتە لەوانەبێ واجب بێ بێتەجێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: هەروەختێ فڵانکەس مرد، تەڵاقت کەوتبێ، یاخود بوونو نەبوونی وەك یەك بێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: هەروەختێ رۆیشتیتەوە بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ.

وە هەر تەڵاقێك تەعلیق کرا بە شتێکەوە، ئەوە لەپاش ماوەیەك قابیل نییە تەعلیق بکرێ بە شتێکی تریشەوە؛ مەسەلا، پاش ئەوە کە وتی: ئەگەر رۆیشتیتەوە بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ، ئیتر مەحاڵە لەسەر ئەم شەرتە شەرتێکی تریش قەرار بدرێ بە «معلَّق علیه» لەپاش ئەوە کە تەعلیقەکە تەواو بوو؛ بەڵێ، لە ئەوەڵەوە قابیلە کابرا ئەو تەڵاقە تەعلیق بکا بە چەند شتێکەوە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: هەروەختێ رۆیشتی بۆ

شایی و له شاییه‌کەدا لەگەڵ فلانکەسا دەستت گرت بۆ هەڵپەڕکێ و دەسرۆکەکەت گرت بە دەستەوە، تەڵاقت کەوتبێ، لەم کاتەدا هەموو ئەو شتانە ئەبن بە «معلَّق علیه» و تا هەموویان نەیەنەجێ، تەڵاقەکە ناکەوێ.

لەپاش تەعلیق، پەشیمانبوونەوە مەحاڵە؛ هەروەها، بەرودوا خستنی «معلَّق علیه» مەحاڵە و تا «معلَّق علیه» دێتەجێ، ئەتوانێ هەموو لەزەتێکی شەرعی لە ژنەکەی وەربگرێ و هەر نەفەقەو حەقێکی شەرعی هەبێ، واجبە بە تەواوی جێبەجێی بکا.

جا ئەگەر «معلَّق علیه» یەك شت بوو، ئەوە دیارە وە ئەگەر چەند شت بوو، بە بێ‌تەماشاکردنی تەرتیب، ئەبێ ئەو شتانە هەموو بێنەجێ و بە هەرجۆرێ بێنەجێ، بە تەرتیب یا بە بێ‌تەرتیب، کافییەو تەڵاقەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر لەگەڵ تەرتیبدا بوو، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەگەر جلەکانت کردەبەر جا رۆیشتی بۆ حەمام جا رۆیشتی بۆ ماڵی فلانکەس، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە وەکوو واجبە جوزئەکانی «معلَّق علیه»یەکە هەموو بێنەجێ، واجبە بەپێی تەرتیبەکەیش بێنەجێ؛ کەواتە، ئەگەر لەپاش ئەو تەعلیقە ژنەکە رۆیشت بۆ ماڵی ئەوکەسە، جا هاتەوەو رۆیشت بۆ حەمام، ئەمجار جلەکانی کردەبەر، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر تەڵاقێك بەسرا بە دوو شەرتەوە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ ئەگەر بڕۆیتە ماڵەوە، ئەگەر قسە لەگەڵ فلانکەسدا بکەی، ئەوە هەروەکوو واجبە هەردوو شەرتەکە بێتەجێ، واجبە ئەو شەرتەیان کە لە دواوە وتراوە لەپێشا بێتەجێ، یەعنی ئەگەر لەپێشا قسەی کرد لەگەڵ شەخسەکەداو جا رۆیشتە ماڵەوە، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر بەم تەرتیبە نەبوو، تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر دوو شەرتەکە بە دوودڵییەوە وترابوون، وەکوو ئەوە کە بڵێ: ئەگەر بڕۆی بۆ ماڵی فلانکەس، یا قسە لەگەڵ فلانکەسدا بکەی، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەرکامیان بکا تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر هەردوانیشیان بەجێ بێنێ، هەروایە بە «طَریقُ الأَولی».

بەڵام ئەگەر شەرتەکەی بەست بە شەرتێکەوە لە مەقامی ئیلزامدا، یەعنی شتەکە بخاتە گەردنی ژنەکە و ئەو شەرتە مەعنای گۆڕینەوەی تیابوو، ئەوە باشەو تەڵاقەکە

ئەبەستریٚ بەو شتەوە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقت کەوتبیٚ ئەگەر کورەکەم بۆ بەخێو بکەی، یا دوو ساڵ شیری پیٚبدەی، یا لە مارەییەکەت گەردنم ئازاد بکەی، یا هیچ لە ماڵی خۆت نەبەیتە دەرەوە ـ وەکوو لەمەوپێش باسمان کرد ـ وە ئەگەر ئەو شەرتە کە کابرا ئەیخاتە گەردنی ژنەکەوە، مەعنای گۆڕینەوەی تیا نەبوو، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقت کەوتبیٚ ئەگەر لەپاش من شوو نەکەی بە فڵانکەس، یا: رووی خۆت لە من دانەپۆشی، یا: هەروەختیٚ ویستم بێیت بۆلام، یا: هیچ لە ماڵ و موڵکی من نەبەی، ئەوە تەڵاقەکە بەخۆڕایی دەسبەجیٚ ئەکەویٚو ئەو شەرتەیش بە بەتاڵو بۆش دەرئەچیٚ.

بۆ ئیعتیبارکردن بەو شەرتەکە تەڵاقەکەی پێوە ئەبەستریٚ، چەند شتێك پێویستە؛

یەکەم: ئەوە کە لەپێش تەواوکردنی جوملەی تەڵاقەکەدا لە دڵیا بیٚو نیازی وتنی هەبیٚ؛

دووەم: ئەوەیە وای بڵێت کە بلکیٚ بە جوملەی تەڵاقەکەوە، یەعنی زیاد لە راوەستانی هەناسەدان و زمانگرتنو پشوودان، بەینی نەکەویٚ؛

سێهەم: ئەوەیە وای بڵێت کە خۆی بیبیسیٚ؛ ئەگەر بە زمان نەیوت یا بە زمان وتیو خۆی نەیبیست، ئەوە تەئسیری نییە وە ئەگەر لە سوورەتی یەکەمدا، ئیددیعای نیازی کرد و لە دووەمدا، ئیددیعای وتنی کرد لەگەڵ نیازدا، ئەوە ئەگەر بەڵگەی بوو، قەبووڵ ئەکریٚ وە ئەگەر نەیبوو، قەبووڵ ناکریٚ، بەڵام حەواڵەی بەینی خۆیو خوای خۆی ئەکریٚ بەو شەرتە تەعلیقی نەکردبیٚ بە «ئەگەر خوا مەیل بکا» و شتیواوە، ئەگینا نە قەبووڵ ئەکریٚو نە حەواڵەی خۆی و خوایش ئەکریٚ، ئیتر بیستنی غەیری خۆی پێوست نییە تەنها لە جیاکردنەوەی وێنەی «ئەگەر خوا مەیل بکا»دا نەبیٚ؛

چوارەم: ئەوەیە کابرا خۆی مەعنای شەرتەکە بزانیٚ؛ ئەگەر کابرا جارێك وتی بە ژنەکەی: هەرکاتیٚ تەڵاقت بدەم، ئەوە تەڵاقەکەت تەعلیق کراوە بە فڵان شەرتەوە و پاش ئەوە، تەڵاقی ژنەکەی دا بە بیٚباسی «معلَّق علیه»، ئەوە بە تەنها ئەو قسە پێشووە ئەم تەڵاقی ئێستەیە تەعلیق نابیٚ بەو قەیدەوە کە زوو وتوویەتی، بەڵکوو پێویستە ئێستە نیازی بکاو بە زمان بیڵێتو خۆی بیبیسیٚ؛ بەڵیٚ، ئەگەر ئیددیعای کرد: ئەو قەیدەم لە

دڵدا بووە، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ، چونکە قسە پێشووەکەی ئەبێ بە قەرینە لەسەر نیازی ئێستای.

**بزانن!** ئەو لەفزانەی کە لە کوردیدا بۆ تەعلیق بەکار ئەهێنرێن، هەندێکیان هەر تەعلیقەکە ئەگەیەنن، وەکوو «ئەگەر»، وە هەندێکیان زەمانیش ئەگەیەنن بە بێعوموم، وەکوو «کاتێ»، هەندێکیشیان عومومی زەمانیشیان تیایە، وەکوو «هەر کاتێ»، هەندێکی تریان عومومی شوێنیش ئەگەیەنن، وەکوو «هەر شوێنێ»، هەندێکیشان عومومی شەخسی عاقڵ ئەگەیەنن، وەکوو «هەرکەسێ»، هەندێکیان عومومی شەخسی ناعاقڵ ئەگەیەنن، وەکوو «هەر شتێ»، هەندێکیان عومومی شەخس ئەگەیەنن لەعاقڵ و ناعاقڵ، وەکوو «هەرکام» و «هەریەکێ»، وە بەهۆی بەستن بە لەفزێکی ترەوە بۆ ئینسان روون ئەبێتەوە؛ کەواتە، ئەتوانین بڵێین: لەفزی تەعلیق لە کوردیدا ئەمانەن: «ئەگەر، کاتێ، هەرکاتێ، هەر شوێنێ، هەرکەسێ، هەرشتێ، هەرکام، هەریەکێ». وایش ئەبێ بەهۆی ناوبردنی حاڵ و ئەجزای زەمانو غەیری ئەمانیش تەعلیق دەرئەکەوێ، وەکوو «تەڵاقت کەوتبێ لە پاکیدا»، یا «تەڵاقت کەوتبێ لە ڕۆژی یەکی مانگا» و ئەیشتوانین مەعنای دووبارەکردنەوەی تەعلیق بگەیەنین بەهۆی ئەوەوە کە بڵێین مەسەلا: هەرچەند جار بڕۆیتەوە ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ.

جا، لەفزەکانی تەعلیق یا لە نەفیدا بەکار ئەهێنرێن، وەکوو ئەوە کە بڵێت: «ئەگەر نەیەیتەوە بۆ ماڵەوە، تەڵاقت کەوتبێ» یا: «کاتێ کە نەیەیتەوە، تەڵاقت کەوتبێ» یا: «هەر ژنێك نەیەتەوە لەگەڵما، تەڵاقی کەوتبێ»، یاخود لە ئیسباتا بەکار ئەهێنرێن، وەکوو «ئەگەر بڕۆیتەوە بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ» یا: «کاتێ بڕۆیتەوە بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ» یا: «هەر ژنێ بڕواتەوە، تەڵاقی کەوتبێ».

ئەگەر لە نەفیدا بەکار هێنران، هەموویان پێویستی دەس‌بەجێیی ئەکەن تەنها «ئەگەر» نەبێ؛ تەعلیقکردن بە «ئەگەر» تاکاتی نائومێدبوون لە ئیشە «معلّق علیه»یەکە، ناکەوێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: «کاتێ نەیەیتەوە بۆ ماڵەوە، تەڵاقت کەوتبێ»، ئەوە مادام زەمانێك رابووری کە قابیل بێ لەو زەمانەدا ئەو ژنە بێتەوە بۆ ماڵو نەهاتەوە، تەڵاقی ئەکەوێ،

مەگەر مانیعێکی بەهێز مەنعی بکا، بەڵام ئەگەر بڵێت: «ئەگەر نەیەیتەوە بۆ ماڵەوە، تەڵاقت کەوتبێ»، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ تا لەحزەیەك پێش مردنی ژنەکە، یا پێش وێرانبوونی ماڵەکە.

وە ئەگەر لە مەقامی ئیسباتدا بەکار هێنران، ئەوە هیچیان پێویستی دەس بەجێیی ناکەنو هەرکاتێ «معلّق علیه» یەکە بێتەجێ، باشە، مەگەر ئەو لەفزی تەعلیقە عوموومی زەمانی تیا نەبێ و لە گۆڕینەوەدا بەکار بهێنرێ، وەکوو «ئەگەر دە دینارت پێدام»، یا «ئەگەر فلانکەس دە دیناری پێدام» یا «ئەگەر بووی بە زامنی دە دینار بۆم» یا «ئەگەر فلانکەس بوو بە زامنی دە دینار بۆم، تەڵاقت کەوتبێ» ئەوە لەم سوورەتانەدا واجبە دەسبەجێ ئەو کەسە پارەکەی پێبدا، یاخود ببێ بە زامن، یەعنی پارەکە بگرێتە گەردنی خۆی و بڵێ: وا بووم بە زامنی ئەو دە دینارە، یا نەزرم کرد لەسەر خۆم بتدەمێ.

هەروەها، دەسبەجێیی پێویستە ئەگەر حەرفی تەعلیقەکە چووە سەر سیغەی مەشیئەتو ئارەزووی ژنەکە بە شێوەی گفتوگۆ لەگەڵیا؛ مەسەلا، بڵێ بە ژنەکە: «ئەگەر ئارەزووت هەیە، تەڵاقت کەوتبێ»، ئەوە پێویستە ژنەکە دەسبەجێ بڵێ: «ئارەزووم هەیە» وە ئەگەر هات بەینیکەوت، تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر تەعلیقی کرد بە ئارەزووی ژنەکەیەوە بە بێگفتوگۆ، یاخود تەعلیقی کرد بە ئارەزووی غەیری ژنەکەیەوە، خواه بە گفتوگۆ بێ یا بە بێگفتوگۆ، ئەوە دەسبەجێیی پێویست ناکا؛ کەواتە، ئەگەر بڵێ: «ئەگەر ژنەکەم ئارەزووی هەبوو» یا بڵێ بە کەسێکی تر: «ئەگەر تۆ ئارەزووت هەبوو»، یا بڵێ: «ئەگەر ئارەزووی هەبوو، تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ»، ئەوە هەروەختێ ئارەزووی هەبوو، تەڵاقی ئەکەوێ.

**بێداری!** لە کاتی تەعلیقکردندا بە ئارەزووەوە، ئەگەر ئەو کەسە بە دەم وتی: «ئارەزووم هەیە»و لە دڵا حەزی نەبوو، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ، چونکە بەسراوە بە بەیانکردنی ئارەزووەکەوە «بە دەم»، بەڵام ئەگەر تەعلیق بە حەزو خۆشی کەسێکەوە بوو؛ مەسەلا، وتی: ئەگەر حەز ئەکەی یا شادمانی بە تەڵاق یا ئارەزووت هەیە لە تەڵاق، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە بۆ کەوتنی ئەو تەڵاقە پێویستە ژنەکە لە دڵا حەز بکاو ئارەزووی ببێ لە کەوتنی تەڵاقەکە، ئەگەر هاتو وا نەبوو، تەڵاقەکە ناکەوێ.

## باسی تەعلیق‌کردنی تەڵاق بە وەختێکەوە

ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ لەمانگی رەمەزاندا، یا لە یەکەم رۆژی رەمەزاندا، یا لە سەرەتایدا، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە یەکەم وەختی دەس پێ‌کردنی ئەو مانگە وە ئەگەر وتی: لە یەکەم رۆژی رەمەزاندا، یا لە رۆژی فڵان مانگدا؛ تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە دەرکەوتنی بەرەبەیانی یەکەم رۆژی مانگەکە وە ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ لە ئاخری مانگدا، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ لە دوا چرکە (ثانیە)ی ئاخری مانگەکەدا وە ئەگەر لە شەودا، وتی: کاتێ رۆژێ بەسەرچوو، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە ئاوابوونی خۆری سبەینێ وە ئەگەر لە رۆژدا ئەمەی وت، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە هاتنی وێنەی ئەو کاتە لە رۆژی دواییدا وە ئەگەر وتی: کاتێ ئەمڕۆ رۆیشت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر لە رۆژدا ئەو قسەیە کرد، تەڵاقی ئەکەوێ بە ئاوابوونی رۆژی ئەو رۆژە وە ئەگەر لە شەودا قسەکەی کردبوو، ئەوە بەتاڵەو تەڵاقی پێ‌ناکەوێ، نە لەپاش تەواوبوونی شەوەکە، چونکە ئەو رۆژی وتووە و نە لەپاش تەواوبوونی رۆژی سبەینێ، چونکە ئەو کەسە ئیشارەی بۆ ئەو کاتە کردووە، کە شەو بووەو رۆژ نەبووە بەڵێ، ئەگەر کابرا مەبەستی لە ئەمڕۆ، ئیمشەو بوو بە مەجاز، ئەوە کاتێ کە ئەو شەوە تەواو، بوو تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ ئیمڕۆ، یا ئەم مانگە، یا ئەم ساڵە، ئەوە دەس‌بەجێ تەڵاقی ئەکەوێ، با لەکاتی شەویشا ئەو قسەیە بکا، چونکە کابرا تەڵاقەکەی بە دەس‌بەجێیی داوە، ئەوەندە هەیە لە سوورەتێکیانا بە هەڵە ناوی شەوی بە رۆژ بردووەو ئەوەیش زیان نابەخشێ.

ئەگەر وتی: هەروەختێ مانگ تەواو بوو، یا ساڵ تەواو بوو، یا ئەم مانگە، یا ئەم ساڵە تەواو بوو، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە تەواوبوونی ئەو مانگە یا ئەو ساڵە کە وا تیایا وە ئەگەر وتی: هەرکاتێ مانگێ،یا ساڵێ تەواو بوو، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر تەواوبوونی قسەکەی رێکەوتی ئەوەڵی مانگ، یا ئەوەڵی ساڵی کرد، ئەوە

تەڵاقەکەی ئەکەوێ بە تەواوبوونی ئەو مانگە یا ئەو ساڵە وە ئەگەر لەناو مانگ یا لەناو ساڵدا بوو، پاش تەواوکردنی مانگ بە مانگی دوایی یا ساڵ بە ساڵی دوایی، تەڵاقی ئەکەوێ. مانگی رووت، بە مانگی قەمەری و ساڵی رووت بە ساڵی عەرەبی مەعنای لێ ئەدرێتەوە کە لە «موحەررەم»ەوە دەس پێ ئەکا؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: مەبەستم، مانگ یا ساڵی "رۆمی یا فارسی" بووە، ئەوە لیێ قەبووڵ ئەکرێ هەروەها، ئەگەر لە عورفی ئەو شوێنەدا هەر مانگو ساڵی رۆمی یا فارسی بەکار ئەهێنرا، دوور نییە بەوجۆرە مەعنای لێ بدرێتەوە.

ئەگەر لە مانگی رەمەزاندا ـ مەسەلا ـ وتی تەڵاقت کەوتبێ، لە مانگی رەمەزانـدا، ئەوە دەسبەجێ تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: لە جەژنی رەمەزاندا تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ لە جەژنی رەمەزانی ئەو ساڵەدا وە ئەگەر وتی: لە ئەوەڵی رەمەزانا تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لە ئەوەڵی رەمەزانی داهاتوودا تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی لەپێش مردنی خۆمدا بە چوار مانگو دە شەو تەڵاقت کەوتبێ، ئـەوە ئەگەر لەپێش تەواوبوونی ئەو ماوەیەدا مرد، تەڵاقی ناکەوێو ژنەکـە لەم حـاڵەتـەدا «عِدّە»ی وەفات بەسەر ئەبا وە ئەگەر لەگەڵ تەواوبوونی ئەو ماوەیەدا مرد، یا لەپاش تەواوبوونی ئەو ماوەیە مرد، ئەوە لە یەکەمیانا دیارە تەڵاقەکەی ئەکەوێ لەو دەقیقەوەکە تا کاتی مردنی کابرا، چوار مانگو دە رۆژەکە تەواو ئەکا، جا ئەگەر «عِدّە»ی تەڵاقەکە تەواو بووبێ، بەو رەنگە «عِدّە»ی بە مانگ بووبێ، یا بە حەیزو پاکیو حەیزو پاکییەکە رابوردبن، ئەوە ناکەوێتە بەر «عِدّە»ی مردنو میراتیش لە کابرا وەرناگرێ وە ئەگـەر «عِدّە»ی بە حەیزو پاکی بووبێو هێشتا حەیزو پاکییەکە رانەبوردبن، ئـەوە ئـەگـەر تەڵاقەکە بائین بێ عیددەکە تەواو ئەکا و میرات وەرناگرێ، وە ئەگەر تەڵاقەکە «رجعي» بووبێ، لائەدا لە «عِدّە»ی تەڵاقەوە بۆ «عدّة»ی مردنو میراتیش وەرئەگرێ، چـونکە ئەوژنەی کە بە تەڵاقی «رجعي» تەڵاق درابێ، حوکمی ژنی مارە بڕاوی هەیە لە میراتدا.

ئەگەر وتی: دوێنێ تەڵاقت کەوتووە، ئەمە بە پێی مەعنا دیارییەکەی، خەبەردانە؛ جا ئەگەر نیازی گێڕانەوەی خەبەر بوو و راستیشی ئەکرد، ئەوە دیارە وە ئەگـەر درۆی

ئەکرد، ئەوە بەتاڵەو تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام لای قازی مەسئووله لەم ئیقرارکردنەی وه ئەگەر مەبەستی دانانی تەڵاقی ئێستە بێ، ئەوە ئێستە تەڵاقی ئەکەوێ وه ئەگەر وتی: مەبەستم تەڵاقێ بووکە دوێنێ کەوتووەو پاشان ژنەکەم مارە کردووەتەوە، ئەوە ئەگەر تەڵاقدان و مارەبڕینەوەکە زانرابوو، باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ، ئەگینا باوەڕی پێناکرێو حوکم ئەکرێ بە کەوتنی تەڵاقەکەی لە ئێستەوە.

## باسی تەعلیقکردنی تەڵاق بە شتی مەحاڵەوە

ئەگەر کەسێك تەعلیقی تەڵاقێکی کرد بە شتێکی مەحاڵەوە، ئەوە ئەگەر لە ئیسباتدا بوو، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەگەر سەرکەوتی بۆ ئاسمان، یاخود بە باڵ فریت، یا دوو شتی «ضدّ»ت لەشوێنێکا کۆکردەوە، ئەوە بەقەتعی تەڵاقی ناکەوێ؛ هەروەها ئەگەر تەڵاقەکە ببەستێ بەکاتێکەوەکە تەڵاق لەوکاتەدا نەمێنێ، وەکوو ئەوەکە بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ لەگەڵ مردنتا، یا پاش مردنت، یا لەگەڵ مردنما یا پاش مردنم وه ئەگەر لە نەفیدا بوو، وەکوو ئەوەکە بڵێت: ئەگەر بە باڵ نەفڕیت بۆ ئاسمان، یا دوو شتی «ضدّ» کۆ نەکەیتەوە، ئەوە دەسبەجێ تەڵاقی ئەکەوێ.

## باسی تەعلیقکردنی تەڵاق بە تەڵاقەوە

کابرا وتی: هەرکاتێ تەڵاقم دای تەڵاقت کەوتبێ و لەپاشا، تەڵاقێکی دا، ئەوە دوو تەڵاقی ئەکەوێ، ئەوەی «معلَّق علیه»و بەشوێن ئەوا «معلَّق»ەکەیش؛ هەروەها، ئەگەر پاش ئەو قسەیە تەعلیقی تەڵاقی ژنەکەی بکا بە سیفەتێکەوەو ئەو سیفەتە بێتەجێ، ئەوە دوو تەڵاقی ئەکەوێ، تەڵاقە دواییەکە بەهۆی بوونی سیفەتەکەوەو تەڵاقە پێشووەکەیش بەهۆی کەوتنی ئەم تەڵاقە دوایی (معلَّق)ەوە؛ بەڵام لەم دوو سوورەتەدا، ئەگەر تەڵاقە دواییەکەی لەگەڵ عیوەزدا بوو، یاخود نەچووبووە لای ژنەکەی، ئەوە هەر ئەم تەڵاقە دواییە ئەکەوێ، ئیتر تەڵاقە پێشووەکەی ناکەوێ، چونکە ئافرەتی بائینە تەڵاقی پێوە نالکێ. ئەگەر وتی: هەرکاتێ تەڵاقی «مُنجَّز» (دەسبەجێت) کەوت، تەڵاقت کەوتبێ،

ئەوە ئەو تەڵاقە ناکەوێ بە تەعلیقی تەڵاق و بەجێهاتنی سیفەتی «معلق علیه». ئەگەر وتی: هەرکاتێ تەڵاقت کەوت، دووبارە تەڵاقت کـەوتبێ، ئـەوە ئـەگـەر تـەڵاقـێکـی «رجعي»ی کەوت و چوو بووە لای ژنەکەی، تەڵاقی دووهەم و تەڵاقی سـێهـەمیشی ئەکەوێ وە ئەگەر ئەم تەڵاقەی «رجعي» نەبوو، هەر تەڵاقێکی ئەکەوێ، ئیتر تەڵاقی تری ناکەوێ.

## باسی «دەور» و ئیعتیبار نەبوونی دەور

کابرا وتی: هەرکاتێ تەڵاقت کەوت یا تەڵاقم دای، لەپێش ئەوەدا سێ تـەڵاقـەت کەوتبێ و بۆ ئەوەیش ئەمەی وت کە هەرگیز تەڵاقی نـەکـەوێ، یـەعنی وایـئەزانـی هەرکاتێ تەڵاقی کەوت، لەپێش ئەوەدا سێ تەڵاقەی ئەکەوێ و مـادام لەپـێشـا سـێ تەڵاقەی کەوت، ئیتر ئێستە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە تەڵاق نەماوە تا بکەوێ؛ کەواتە، هەروەختێ تەڵاقی دا تەڵاقی ناکەوێ، ئەوە ئەم فێڵە هیچ قـیمەت و ئـیعتیباری نـییە، چونکە جەزای شەرت ئەگەر بە زەمان دوا نەکەوێ لە شەرتەکەی پێشەوەی، بە روتبە، یەعنی بە زات دوا ئەکەوێ، مادام وابوو، ئەو تەڵاقەی کە ئێستە ئەیدا، هیچ مانیعێك لە کەوتنی نییە و لەبەر ئەوە کە ئیعتیباری بەجێهاتنی جەزاکە ئەبێ بەهۆی تێکچوونی ئەم تەسەڕوفە راستە، بەڵکوو ئەبێ بەهوێ فەسادی خۆیشی؛ کەواتە، لە بنچینەوە بە پووچ و بێئیعتیبار دائەنرێ.

هەروەها، ئەگەر وتی: ئەگەر بە چوونەلایەکی حەڵاڵ چوومە لای ژنەکەم، لەپێش ئەوەدا سێ تەڵاقەی کەوتبێ و چووە لای، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ بە ئوسووڵی پێشـوو؛ کەواتە، چوونەلاکە بە حەڵاڵ دائەنێین و گوێ نادەین بە جەزاکە؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: ئەگەر چوومەلای بە چوونەلایەکی حەڵاڵ، تەڵاقی کـەوتبێ، واجـبە لەپـاش چـوونەلای و چوونە ژوورەوەی سەری زەکەری، گورج بگـەڕێتـە دواوە، چـونکە بـەو کـردەوەیە تەڵاقەکەی کەوتووە.

## باسی «تعدُّد»ی تەڵاق لە چەند سیغەیەکدا بەهۆی چەند تەعلیقێکەوە

پیاوێك چوار ژنی بوو و ژنەکانی نوێژنەکەر و بەدخوو بوون، ئەویش وتی: ئەگەر خوا بۆی ڕێك خستم، ژنێکم تەڵاق دا، مەڕێکم نەزر بێ لە فلانە هەژار وە ئەگەر دوو ژنم تەڵاق دا، دوو مەڕم نەزر بێ وە ئەگەر سێ ژنم تەڵاق دا، سێ مەڕم نەزر بێ وە ئەگەر چوار ژنم تەڵاق دا، چوار مەڕم نەزر بێ، جا هات ژنێکی تەڵاق دا، مەڕێکی نەزر ئەبێ لەوکەسە و کە دووەم ژنی تەڵاق دا، دوو مەڕی نەزر ئەبێ و کە سێهەم ژنی تەڵاق دا، سێ مەڕی نەزر ئەبێ و کە چوارەم ژنی تەڵاق دا، چوار مەڕی نەزر ئەبێ، واتە تێکڕا، دە مەڕی نەزر ئەبێ.

وە ئەگەر تەعلیقەکەی بەهۆی کەلیمەی «هەرچەند»ەوە بوو، کە تەرجەمەی «کُلَّما»یە؛ مەسەلا وتی: هەرچەند ژنێکم تەڵاق دا، مەڕێکم نەزر بێ، هەروا تا ئاخری میسالەکەی پێشوو و ئەم چوار ژنەی تەڵاق دا ـ وەکوو بەیانمان کرد ـ ئەوە پازدە مەڕی نەزر ئەبێ، چونکە لە یەکەم ژندا مەڕێکی نەزر ئەبێ و بەهۆی ئەوەوە کە سیفەتی یەك ژن لەپاشەوە سێ جار دووبارە کراوەتەوە، سێ مەڕیتری نەزر ئەبێ، ئەمە چوار و کە ژنی دووهەمی تەڵاقدا، دوو مەڕی نەزر ئەبێ و بەهۆی ئەوەوە کە سیفەتی دوویش یەك جار دووبارە ئەبێتەوە لەکاتی تەڵاقی ژنی چوارەمدا، دوو مەڕیتری نەزر ئەبێ، ئەمە چوار و لەگەڵ چوارە پێشووەکەدا ئەکاتە هەشت و لەکاتی تەڵاقی ژنی سێهەمدا، سێ مەڕی نەزر ئەبێ و لەکاتێ تەڵاقی ژنی چوارەمدا، چوار مەڕی نەزر ئەبێ، ئەمەیش حەوت و گشتی، ئەکاتە پازدە، ئیتر سیفەتی سێ و چوار مەجال نییە بۆ دووبارە بوونەوەیان.

## باسی تەعلیقکردنی تەڵاق بە سكبوون و منداڵبوون و حەیزو شتیواوە

وتی بە ژنەکەی: ئەگەر سکت هەبێ، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر لەوکاتەدا سکی هەبوو بەوجۆرە کە ژنەکە ئیددیعای سکی ئەکردو کابرایش باوەڕی پێ ئەکرد، یا دوو

پیاو شاهیدییان ئەدا بەوە کە سکی هەیە، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام سك‌بوون بە شەهادەت‌دانی ژن سابت نابێ، هەرچەند چوار ژنیش بن، هەروەکوو منداڵ بوون لە شوێنێکا کە «معلَّق علیه» بێ بۆ تەڵاق، بە شاهیدیی ژنان سابت نابێ، چونکە تەڵاق بە شاهیدیی ژن ناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر بۆ غەیری مەسئەلەی تەڵاق، بە شەهادەتی ژنان سك‌بوون و منداڵ لێ بوون سابت بوو، جا کابرایش لەولاوە تەعلیقی تەڵاقەکەی کردبوو بە یەکێ لەوانەوە، ئەوە تەڵاقەکە ئەکەوێ، چونکە لەولاوە سك‌بوون‌و منداڵ لێ‌بوونەکە سابت بووە.

وە ئەگەر سکەکەی دەرنەکەوت، ئەوە ئێستە حوکم نادرێ بە کەوتنی تەڵاقەکە، لەگەڵ ئەوەیشداکە پارێز ئەوەیە کابرا نزیکی ژنەکە نەکەوێ تا مەسەلەی سکەکەی بۆ رۆشن ئەبێتەوە؛ جا ئەگەر ئەو ژنە منداڵی لێ‌بوو لە کەمتر لە ماوەی شەش مانگ لە رۆژی تەعلیق‌کردنەکەوە، ئەوە دەرئەکەوێ لە کاتی تەعلیقەکەدا سکی بووەو لەوکاتەوە تەڵاقی کەوتووە وە ئەگەر لە ماوەی زیاتر لە چوار ساڵدا لەکاتی تەعلیق‌کردنەکەوە منداڵی لێ بوو، یاخود لە مابەینی شەش مانگ‌و چوار ساڵا منداڵی لێ بوو و لەو بەینەدا چووبوونە لای ژنەکەو قابیل بوو منداڵەکە لەو چوونەلاوە پەیدا بووبێ، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر لەو ماوەیەدا نەچووبنەلای، یاخود چووبنە لای بەڵام قابیل نەبوو منداڵەکە لەو چوونەلاوەوە پەیدا بووبێ، بەو رەنگە کە لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگدا لە چوونەلاکەوە منداڵەکەی لێ بووبوو، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: ئەگەر سکەکەت کوڕ بوو، یەك تەڵاقت کەوتبێ وە ئەگەر کچ بوو، دوو تەڵاقت کەوتبێ، کەچی بە سکێ کوڕێك‌و کچێکی بوو، ئەوە هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، لەبەر ئەوە کە لەم‌کاتەدا «معلَّق علیه» بۆ یەك تەڵاق‌و دوو تەڵاق هاتووەتەدی چونکە سکی بووە بە کوڕیش و بە کچیش وە ئەگەر وتی: ئەگەر ئەوەی وا لە سکتا نێرینە بوو، تەڵاقێکت کەوتبێ وە ئەگەر مێیینە بوو، دوو تەڵاقت کەوتبێ و بە سکێ کوڕو کچێکی لێ بوو، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئەوەی لە سکی ژنەکەدا بووە، نە تەنیا نێرینە بووەو نە تەنیا مێیینە بووە.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: ئەگەر منالْت لێ بوو، تەڵاقت کەوتبێ و لەپاش ئەم قسەیە، ژنەکە بەرودوا دوو منالْی لێ بوو، ئەوە بە داکەوتنی منالْی یەکەم تەڵاقێکی ئەکەوێ و بە جیابوونەوەی منالْی دووهەم، «عِدّە»ی تەواو ئەبێ وە ئەگەر هەردوو منالْەکەی بەجارێ لێ بوو، ئەوە هەر یەك تەڵاقی ئەکەوێ و لەو کاتەوە، ئەکەوێتە «عدّة»وە وە ئەگەر وتی: هەرچەند منالْت لێ بوو، تەڵاقت کەوتبێ و ژنەکە بەرودوا سێ منالْی لێ بوو، ئەوە بە دوو منالْی یەکەم و دووهەم دوو تەڵاقی ئەکەوێ و بە منالْی سێهەم، «عِدّە»ی تەواو ئەبێ وە ئەگەر بە جارێ سێ منالْی لێ جیا بووەوە، ئەوە هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ جا دەس ئەکا بە «عِدّە» وە ئەگەر بەرودوا چوار منالْی لێبوو، ئەوە بە سێ منالْیان سێ تەڵاقی ئەکەوێ وە بە منالْی چوارەم، «عِدّە»ی بەسەرئەچێ.

ئەگەر کابرا چوار ژنی دووگیانی هەبوو و پێی وتن: هەرچەند هەریەکێکتان منالْی لێ بوو، ئەوە رەفیقەکانی تەڵاقیان کەوتبێ، ئەوە ئەگەر هەر چواریان بە جارێ منالْیان لێ بوو، هەموویان سێ تەڵاقەیان ئەکەوێ، چونکە بۆ هەموویەکێکیان «معلّق علیه» بۆ سێ تەڵاقە پەیدا بووە و ئە ئەگەر بەرودوا منالْیان لێ بوو، ئەوە چوارەمیان سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، هەروا یەکەمیشیان سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، ئەگەر تا منالْبوونی ژنی چوارەم «عِدّە»ی تەواو نەبووبێ و ژنی دووهەم تەڵاقێکی ئەکەوێ بە منالْبوونی ژنی یەکەم وە بە منالْبوونی خۆی «عدّة»ی تەواو ئەبێ و ژنی سێهەم دوو تەڵاقی ئەکەوێ بە مندالْبوونی ژنی یەکەم و دووهەم و بە منالْبوونی خۆیشی «عِدّە»ی بەسەر ئەچێ وە ئەگەر دوانیان بەیەکەوە منالْیان بوو، جا دووی تریشیان بەیەکەوە منالْیان بوو وە «عِدّە»ی دوانە ئەوەڵەکەیش لەکاتی منالْبوونی ئەمانا مابوو، ئەوە دوانە ئەوەڵەکە سێ تەڵاقیان ئەکەوێ و دوانە ئاخرەکەیش یەکی دوو تەڵاقیان ئەکەوێ بەهۆی منالْبوونی دوانە ئەوەڵەکەوە و بە منالْبوونی خۆیان، «عدّة»یان بەسەرئەچێ.

ئەگەر تەعلیقی تەڵاقی ژنێك کرا بە حەیزی خۆیەوەو جا ئەویش ئیدیعای حەیزی کرد و کابرا باوەڕی کرد، ئەوە باشە وە ئەگەر ئینکاری کرد، ژنەکە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، مادام عومری نەگەیشتبێ بە ساڵ و تەمەنی نائومێد بوون لە حەیز ـ کە شەست و سێ ساڵە ـ بەڵام باوەڕی پێناکرێ لە حەیزی خۆیدا، ئەگەر ئەو حەیزە «معلّق

علیه»بێ بۆ تەڵاقی ژنێکی‌تر، بەڵکوو پێویستە ئیسپات بکرێ بە شاهیدی دوو پیاو؛ هەروەها، باوەڕی پێ‌ناکرێ بە سوێند لە منداڵبوونی خۆیا، چی «مُعلّق علیه»بێ بۆ تەڵاقی خۆی‌و چی «معلّق علیه»بێ بۆ تەڵاقی ژنێکی‌تر، وەکوو ئیسپات ناکرێ بە شەهادەتی چوار ژن یا بە شەهادەتی پیاوێك‌و دوو ژن، بەڵکوو پێویستە ئیسپات بکرێ بە شەهادەتی دوو پیاو، لەبەر ئەوەکە منداڵ لێبوون ئاسانە شەهادەتی لەسەر تێپەڕ ببێ و وەکوو حەیزی ژن نییە و تەڵاقیش بە شاهیدیی ژن ئیسپات نابێ، بەڵکوو ئەبێ شاهیدەکەی هەر پیاو بێ.

ئەگەر کابرا دوو ژنی هەبوو و وتی: ئەگەر هەردوانتان کەوتنە حەیزەوە تەڵاقتان کەوتبێ، لەپاشا هەرکامیان ئیددیعای حەیزی خۆی‌و ئەویانی کرد، ئەوە ئەگەر کابرا باوەڕی پێ‌کردن، تەڵاقی هەردووکیان ئەکەوێ وە ئەگەر باوەڕی بە هیچیان نەکرد، ئەمجار ئەگەر بە شەهادەتی دوو پیاو ئیسپاتی حەیزەکەیان کرد، هەردووکیان تەڵاقیان ئەکەوێ وە ئەگەر بۆیان ئیسپات نەکرا، باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ لەسەر نەبوونی حەیزەکەیان و تەڵاقیان ناکەوێ، چونکە تەڵاقی هەریەکێکیان بەسراوە بە حەیزی خۆی‌و هاوڕێکەیەوە و ئەم دوو حەیزە بە قسەی هیچ‌کامیان سابت نابێ، چونکە ئەگەر قسەی بۆ حەیزی خۆی سوودی هەبێ، بۆ حەیزی هاوڕێکەی سوودی نییە و ئەسڵیش نەبوونی حەیزو مانەوەی عیسمەتە.

وە ئەگەر کابرا باوەڕی کرد بە یەکێکیان‌و باوەڕی نەکرد بەویان، ئەوە ئەو ژنە باوەڕ پێ‌نەکراوە تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگەر سوێند بخوا لەسەر حەیزی خۆی، چونکە کابرا باوەڕی هەیە بە حەیزی ئەو ژنە و ژنەکە خۆیشی سوێند ئەدرێ بۆ حەیزی خۆی، وا «معلَّق علیه»ی تەڵاقەکەی هاتەجێ.

## باسی تەعلیقکردنی تەڵاق بە هەندێ شتی جیاجیاوە

کابرا، تەعلیقی تەڵاقی ژنەکەی کرد بە خواردنی نانێکەوە، یا خواردنی هەنارێکەوە، ئەویش نانەکە یا هەنارەکەی خوارد، بەڵام لە نانەکە پارچەیەك، یا لە هەنارەکە دەنکێك مایەوە، تەڵاقەکە ناکەوێ؛ بەڵێ، قەیدی نییە مانەوەی وردە نانێکی‌واکە چاو بە ئاستەم

ببینێ؛ ئەگەر کابراو ژنەکەی پێکەوە خورمایان ئەخوارد، لەپاشا وتی بە ژنەکەی: ئەگەر ناوکی خورماکەی خۆت جیا نەکەیتەوە لە ناوکی خورماکانی من، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر نیازی ئەوەبێ بەتایبەتی ناوکە خورماکانی ژنەکە دیاری بکاو جیایان بکاتەوە لە ناوکە خورماکانی کابرا، ئەوە تەڵاقەکەی دەس‌بەجێ ئەکەوێ، چونکە ئەمە بەعادەت مەحاڵەو تەعلیق بە مەحاڵیش لە نەفیا ئەبێ بەهۆی ئەوە کە تەڵاقەکە دەس‌بەجێ بکەوێ وە ئەگەر نیازی ئەوەی نەبێ، لەم‌وەزعەدا رزگار ئەبێ بەوەکە ژنەکە هەموو دەنکەکان جیا بکاتەوە لە یەك.

ئەگەر کابرا ژنەکەی دانا بە «دز»و وتی: ئەگەر راستم پێ‌نەڵێیت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر مەبەستی دەربڕینی باری راستی بێ بەتایبەتی، واجبە ئەو باری راستییەی بۆ دیاری بکا، بەڵام ئەگەر گورج بۆی دیاری نەکرد، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ تا کابرا نائومێد ئەبێ لە دەربڕینی ئەو راستییە لەلایەن ژنەکەوە؛ ئەگەر مەبەستی کردنی قسەی راست بوو، ئەوە رزگار ئەبێ لە تەڵاق بەوەکە بڵێ: «دزیومە»، «نەمدزیوە»، چونکە حاڵ لەم دوو حاڵە بەدەر نییە.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر خەبەرم نەدەیتێ ئەم هەنارە چەند دەنکی تیایە، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە رزگار ئەبێ بەوە بێت یەکەم ژمارەیەك بەیان بکاکە دەنکە هەنارەکان لەوە کەمتر نەبێ، جا لەسەر ئەو ژمارەوە سەرکەوێ تا ئەگاتە ژمارەیەك کە هەنارەکەی رێی تێ‌نەچێ لەوەندە زیاتری تیابێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کە بەتایبەتی ژمارەیەکی‌وا بڵێت کە عەینی ژمارەی دەنکە هەنارەکان بێت، ئەوە زاهیر وایە کە دەس‌بەجێ تەڵاقی بکەوێ، چونکە ئەمە بە عادەت مەحاڵەو هەر خوا خۆی غەیب ئەزانێ‌و تەعلیق بە مەحاڵیش لە نەفیدا دەس‌بەجێ تەڵاقی پێ‌ئەکەوێ.

ئەگەر کابرا سێ ژنی هەبوو، وە پێی وتن: هەرکامتان پێم نەڵێ ژمارەی رکاتی نوێژی فەرز لە شەوو رۆژا چەندە، تەڵاقی کەوتبێ، جا یەکێکیان وتی: حەڤدەیە، یەکێکی تریان وتی: پانزەیە، ئەوی‌تریشیان وتی: یازدەیە، ئەوە تەڵاقی هیچیان ناکەوێ و یەکەمیان مەعنای قسەکەی لێ‌ئەدرێتەوە بە رکاتی عادەتی غەیری رۆژی جومعە و دووهەمیان

مەعنای قسەکەی لێ ئەدرێتەوە بە ڕۆژی جومعە و سێهەمیان مەعنای قسەکەی لێ ئەدرێتەوە بە کاتی سەفەر؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا هەر مەبەستی ژمارەیەکی دیاری بێ، ئەوە ئەو ژنە کە ناوی ئەو ژمارەیەی هێناوە، ڕزگاری ئەبێ و ئەوانی تریش تەڵاقیان ناکەوێ تاکاتێ نائومێدبوون لە جوابدانەوەیان، چونکە تەعلیقەکە تەعلیق بە نەفیە بە بێ بەستن بە زەمانێکی تایبەتییەوە و ئەوانیش ئەتوانن بەیانی ئەو ژمارە مەبەستە بکەن.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ پاش کاتێك یا زەمانێك، ئەوە پاش تاوێك تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: ئەگەر فلانکەست چاو پێ کەوت، یا دەستت پێوەدا، یا جنێوت پێ دا، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بەم ئیشانە، لەکاتی ژیانی ئەوکەسەدا یا پاش مردنی.

ئەگەر وتی بە ژنەکەی: ئەگەر لە فلانکەست دا، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە لێدانی لەکاتی ژیانیا، نەك لەپاش مردنی، چونکە مەبەست لە لێدان ئازار گەیاندنە بە عادەت وە مردوو ئازاری پێ ناگا.

ئەگەر ژنەکە قسەیەکی ناشیرینی[1] وت بە مێردەکەی، کابرایش وتی: ئەگەر وەهابم، تەڵاقت کەتبێ، ئەوە ئەگەر کابرا نیازی ئازاردانی ژنەکە بێ بە تەڵاقدانی لە تۆڵەی ئەو قسە ناشیرینەدا، دەس بەجێ تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر نیازی تەعلیق بێ، ئەوە تا ئەو سیفەتە ئیسپات نەبێ لەو کابرایەدا، تەڵاقی ناکەوێ، هەروەها ئەگەر نیازی هیچی نەبێ.

بزانن! تێکڕا هەرکاتێ پیاو تەعلیقی تەڵاقی ژنەکەی کرد بە بوونی سیفەتێکەوە کە قابیل بێ بە عادەت شاهیدی لەسەر بگیرێ و ژنەکە ئیددیعای بوونی ئەو سیفەتەی کردو شاهیدی نەبوو و کابرایش ئینکاری کرد، ئەوە باوەڕ بە کابرا ئەکرێ بە سوێند وە

---

١. لێرەدا موناسبە مەعنای هەندێ لەو قسە ناشیرینانە لێ بدەینەوە بۆ ئەوە بزانین ئاخۆ ئەو سفەتە ناشیرینانە لە مێردەکەدا هەن یا نە؛ سەفیه: کەسێکە سیفەتێکی وای تیابێ نەهێڵێ کابرا بە پێی شەرع بە ئارەزووی خۆی تەسەڕوف بکا لە ماڵیا؛ خەسیس: کەسێکە دینی خۆی بفرۆشێ بە دنیا، یا لەبەر ڕژدی کاریوا بکا لایقی شانی نابێ؛ پەستو نامەردو ناپیاو بە کەسێك ئەڵێن بە ئوسووڵی شەرع دوور بێ لە ڕەوشتی بەرز، وەکوو شەرم و ڕاستیو وەفاو بەخششو شتیوا؛ بەدڕەسەنیش کەسێکە باوك و باپیرەی تاوانبارو دزو درۆزن بووبن.

ئەگەر تەعلیقی تەڵاقەکەی بە نەبوونی ئەو سیفەتەوە کردو کابرا ئیددیعای بوونی ئەکردو ژنەکە ئینکاری ئەکرد، ئەوە ئەگەر نەبەسرابوو بە ئیشی ژنەکە یا کابراکەوە، وەکوو ئەوەکابرا بڵێت، ئەگەر فلانْکەس نەڕۆیشتەوە بۆ وڵاتی خۆی، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەر باوەڕ بە کابرا ئەکرێ بە سوێند لەبەر ئەسڵی مانەوەی عیسمەت، هەرچەند ئەسڵ نەبوونی ئەو شتەیە وە ئەگەر ئەو شتە بەسرابوو بە یەکێکیانەوە، ئەوە ئەگەر زیاتر نەئەزانرا تەنها لەلایەنی خاوەنەکەیەوە نەبێ، وەکوو خۆشەویستیو نیازو شتیوا، ئەوە لە بوونیا یا لە نەبوونیا هەر باوەڕ بە خاوەنەکەی ئەکرێ بە سوێند وە ئەگەر لە دەرەوەیشەوە ئەزانرا، وەکوو مەسرەفکردن بۆ ژنەکە لەو سوورەتەدا کە کابرا بڵێت: ئەگەر مەسرەفم بۆ نەکردی، تەڵاقت کەوتبێ، یا ئەگەر نەمبردیتەوە بۆ ماڵی باوکت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەرکەس ئیددیعای کرد، ئەگەر شاهیدی راستەوە کرد بۆ ئیسپاتکردنی، ئەوە باشە، ئەگینا باوەڕ بە ئینکارکەرەکەی ئەکرێ بە سوێند؛ کەواتە، ئەگەر کابرا وتی: مەسرەفم بۆ کردوویو ژنەکە وتی: نەتکردووە و کابرا شاهیدی نەبوو، ئەوە ژنەکە سوێند ئەدرێو حوکم ئەکرێ بەکەوتنی تەڵاقەکەی، جا لەم شوێنەدا قابیل نییە چوونەلای ژن بە شاهید ئیسپات بکرێ، هەروەها سەرەتای حەیز پیاهاتنی ژنیش، بەڵام شاهیدگرتن لەسەر دەوامکردنی حەیزەکەی دروستە لەبەر ناچاری.

## باسی سویندخواردن بە تەڵاق (حلف)

سوێندخواردن بە تەڵاق، بریتییە لەوە تەڵاقی ژنەکەی ببەستێ بە شتێکەوە بەنیازی هاندان لەسەرکردنی یا نەکردنی شتێك لەلایەنی خۆیەوە یا لەلایەنی کەسێکیترەوە یا لەلایەنی هەردووکیانەوە، یا بۆ ئیسپاتکردنو لێکۆڵینەوەی هەواڵێك یا بۆ پێناخۆش بوونو باوەڕ پێنەکردنی ئەو هەواڵە، چ بە سوورەتی تەعلیق بێ بە زاهیر، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەگەر خزمەتی میوانم نەکرد، تەڵاقم کەوتبێ، یا: ئەگەر خزمەتی پیاوی درۆزنم کرد، تەڵاقم کەوتبێ، یا: ئەگەر ئەو قسەیە راست نەبوو کە ئەڵێن: فلانکەس ئیمڕۆ وای کردو یا ئەگەر راست بوو کە ئەڵێن: جنێوی داوە، تەڵاقم کەوتبێ؛ یاخود بە

سوورەتی تەنجیز بێ بە زاهیر، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ خزمەتی میوان ئەکەم، یا: تەڵاقم کەوتبێ خزمەتی پیاوی درۆزن ناکەم، یا: تەڵاقم کەوتبێ ئەو قسەیە راستە، یا: تەڵاقم کەوتبێ ئەو قسەیە درۆیە.

تێکرا سوێند لەسەر هەر شتێ خورا، ئەگەر شەرع عورفی هەبوو لەو شتەدا، وەکوو نوێژو فرۆشتن‌و کڕین‌و بەکرێ‌دان‌و شتی‌وا، ئەوە بە مەعنا شەرعییە راستەکە مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە، ئەگینا بە مەعنای عورفی زمان مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە، مەگەر عورفی عام ئەوەندە بڵاو بێ خەیاڵ نەڕوا بۆ مەعنای عورفی زمان بە عادەت، تەنها لە حاڵەتێکا نەبێ کە کابرا خۆی ئیددیعای غەیری ئەم مەعنایانە بکاو زیانیشی بێ بۆی، یا قازانجی بێ بۆی، بەڵام قەرینەی لەسەر نیازەکەی هەبێ.

**بزانن!** هەر سوێندێ لەسەر ئیسبات بێ، ئەوە مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە بە تەعلیق بە نەفی و هەر سوێندێ لەسەر نەفی بێ، مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە بە تەعلیق بە ئیسبات؛ کەواتە، ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ زیارەتی ئەو برادەرەم ئەکەم، ئەوە وەکوو ئەوە وایە وتبێتی: ئەگەر زیارەتم نەکرد، تەڵاقم کەوتبێ؛ کەوابوو، تەڵاقی ناکەوێ تا نائومێد نەبێ لەو زیارەتکردنە وە ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ قسە لەگەڵ فلانکەسا ناکەم، ئەوە وەکوو ئەوە وایە وتبێتی: ئەگەر قسەم لەگەڵدا کرد، تەڵاقم کەوتبێ و مادام کاتی دیاری نەکردووە، هەروەختی قسەی لەگەڵدا بکا، تەڵاقی ئەکەوێ.[1]

ئەم حوکمەی بەیانمان کرد، ئەوەش ئەگرێتەوە کە سوێندەکە لەسەر «قضیّەی حملیە» بێ، یا لەسەر «قضیّەی شرطیّە» بێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ قسە لەگەڵ فلانکەسدا بکەی، لێت ئەدەم، ئەمە تەفسیرەکەی وایە: ئەگەر قسەت لەگەڵ فلانکەسدا کردو لێم‌نەدای، تەڵاقم کەوتبێ، کەواتە، کاتێ قسەی لەگەڵ ئەو کەسەدا کردو سوێندخۆرەکە لێی‌نەدا، تەڵاقی ناکەوێ تا نائومێد نەبێ لە لێدانی بەهۆی مردنی

---

١. لەم بارەیەوە شاعیر وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| هەر سوێندێ لەسەر ئیسبات جێ بگرێ، | بە تەعلیق بە نەفی تەفسیری ئەکرێ |
| سوێندیش لە نەفیا لەسەر مەعنای خۆی | تەعلیق بە ئیسبات تەفسیرە لەبۆی |

یەکێکیانەوە؛ هەروەها، ئەگەر بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ گا بڕواتە ناو زەراعەتەکەم شاخی ئەشکێنم، یەعنی: ئەگەر گا ڕۆیشتە ناو زەراعەتەکەم و شاخم نەشکاند، تەڵاقم کەوتبێ، جا ئەگەر گا ڕۆیشتە ناو زەراعەتەکەی‌و شاخی نەشکاند، تەڵاقی ناکەوێ تا نائومێد ئەبین لەوە کە شاخی گا بشکێنێ بەوجۆرە کە گا نەمێنێ لەو شوێنەدا یا کابرا بمرێ و ئەمە، لەسەر ئەساسی فەرموودەی «شیخ ابن حجر»ە لە «تُحفە»دا و فەرموودەی «رَملی»یە لە «نهایە»دا، بەڵام هەندێ لەوانەی کە حاشیەی ئەو دوو کتێبەیان نووسیوە، لەسەر ئەوەن کە سوێند لەسەر «قضیّەی شرطیّة»، مەعنای ئەوەیە هەر کە شەرتەکە هاتەجێ، ئەبێ دەس‌بەجێ جەزاکەیش بێتەجێ، ئەگینا سوێندەکە ئەکەوێ؛ کەواتە، پێویستە پاش ڕۆیشتنی گا بۆ ناو زەراعەتەکە، گورج شاخی بشکێنێ، مادام زۆردار ڕێی لێ نەگرێ، بەڵام ئەم قسەیە پشتی پێ‌نابەسترێ.

جا ئەگەر کابرا تەعلیقی تەڵاقی کرد بەکرداری خۆیەوە لە مەیدانی سوێندخواردنا، وەکوو ئەوەکە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ ناڕۆم بۆ ماڵی فلانکەس، ئەوە لەکاتێکا تەڵاقەکەی ئەکەوێ کە بە زانین‌و ئارەزووی خۆی بڕوا بۆ ماڵی ئەوکەسە وە ئەگەر ڕۆیشتە ماڵی ئەوکەسە لەکاتێکا کە تەعلیقەکەی لەبیر چووبووەوە، یا تەعلیقەکەی لەبیر بوو، بەڵام نەیئەزانی ئەو خانووە ماڵی کابرایە، یا ئەیزانی، بەڵام بە زۆر بردیان یا ناردیان بۆی، خواه زۆرەکە بە حەق بێ وەکوو ئەوەکە وەختی خۆی نەزری کردبێ بڕوا بۆ ماڵی باوکی بۆ ئەحواڵپرسینی نەخۆش‌و ئێستا قازی بە زۆر بینێرێ، یاخود زۆرەکە لەسەر بەتاڵ بێ، یەعنی بە بێ‌هۆیەکی شەرعی، گەورەی ئەو شوێنە بە زۆر ناردی بۆ ئەو ماڵە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئیشێك کە «معلّق علیە»بێ بۆ تەڵاق، بە پێی شەرع، ئەبێ کردارێك بێ کە بە زانین‌و عەمدو ئارەزوو بێ و ئەمە، وەکوو مەسئەلەی تەڵاق بە زۆر نییە کە ئەگەر زۆرەکە بە حەق بێ، تەڵاقەکە بکەوێ وە ئەگەر بە ناحەق بێ، تەڵاقەکە نەکەوێ، چونکە فەرق زۆرە لەینی زۆر لەسەر تەڵاق‌و زۆر لەسەر ئیشێکدا کە «معلّق علیە»بێ بۆ تەڵاق وەکوو لە شوێنی خۆیدا بەیان کراوە.

ئەگەر کابرای سوێندخۆر لەپاش ئەوەکە ئیشە «معلّق علیە»یەکەی کرد، ئیدیعای کرد کە تەعلیقەکەی لەبیر نەمابوو، یا نەیزانیوە ئەو ئیشە «معلّق علیە»یە، ئەوە باوەڕی

پێ ئەکرێ بە سوێند، بەڵام ئەگەر ئیدیعای کرد کە بە زۆر پێیان کردووە، پێویستە ئیسپاتی ئەو زۆرە بکا بە دوو شاهیدی‌وا کە بە تەفسیل بەیانی زۆرەکەو ڕێگای زۆرەکە بکەن، ئەگینا کابرا تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر کابرا لەم کاتی تەعلیقەدا مەبەستی هاندان و ڕێگاگرتن نەبوو، ئەوە بە هەرچۆنێ ئەو ئیشە بکا یا تەرکی بکا، تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە لەم کاتەدا تەعلیقەکەی سوێندخواردن نییەو تەعلیقی رووتە.

وە ئەگەر تەعلیقی تەڵاقی کرد بە کرداری کەسێکی‌ترەوە، ئەوە ئەگەر ئەو کەسە لەوانە نەبێ کە گوێ بدا بە سوێندی ئەم کەسە، وەکوو زۆردارێکی بێ‌عەلاقە بەم کەسەوە، یا بێگانەیەکی نەدیوو نەناسیو ـ مەسەلا ـ ئەوە بە هەر جۆرێ ئەو ئیشە بکا، ئەم کابرایە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە ئەم تەعلیقە لەمکاتەدا شێوەی سوێندی نییەو تەعلیقێکی رووتە.

وە ئەگەر ئەو کەسە کەسێکی‌وا بوو موبالاتی ئەکرد بە سوێندی ئەم سوێندخۆرە لەبەر دۆستی یا خزمایەتی یا دڵڕاگرتن یا شەرم یا هەر هۆیەکی‌تر و کابرای سوێندخۆریش مەبەستی بوو ئەو کەسە لەمسوێندە ئاگادار بکاو بزانێ بەم سوێندە، خواه «فِعْلاً» پێی بزانێ یا نە، ئەوە لەم سوورەتەدا وەکوو سوێندی لەسەر کرداری خۆی خواردبێ وایە، یەعنی ئەگەر ئەو کەسە ئیشەکەی کرد لەکاتێکا کە ئەیزانی بە تەعلیقەکەو بە «معلّق علیه»و ئیشەکە بە ئارەزوو بوو، ئەوە ئەم سوێندخۆرە تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر ئیشەکەی کرد بەڵام بە تەعلیقەکەی نەزانی‌بوو، یاخود پێی زانی‌بوو بەڵام لەبیری نەمابوو، یاخود لە بیری بوو بەڵام نەیئەزانی ئەو ئیشە «معلّق علیه»یە بۆ تەڵاقی کابرا، یاخود ئەیزانی بەوە کە «معلّق علیه»یە بۆ تەڵاقی کابرا بەڵام کەسێك بە زۆر ئیشەکەی پێ کرد، ئەوە لەم سوورەتانەدا تەڵاقی کابرای سوێندخۆر ناکەوێ.

میسالێکی نەزانینی سوێندخۆرەکە بە «معلّق علیه»، ئەوەیە کە کابرا سوێند بخوا بە تەڵاق کە قسە لەگەڵ فڵانکەسا ناکات و کابرایەکی باوەڕ پێ کراو خەبەری بۆ هێناکەوا ژنەکەی مردووە، ئەویش لەسەر ئەو بڕیارە قسەی کرد لەگەڵ ئەو کەسەدا، لەپاشا

دەرکەوت کە ژنەکەی نەمردووە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ؛ یاخود سوێندی خوارد کە: قسە لەگەڵ فڵانکەسدا ناکا و جارێ بە زۆر ناچاریان کرد قسەی لەگەڵدا بکا، پاشان مەلایەك وتی: مادام جارێك قسەت لەگەڵدا کردووە ئیتر قسە بکەی قەیدی نییە، ئەویش دیسان قسەی کرد لەگەڵ کابرادا لەسەر ئەو قەرارەکە زیانی نییە، ئەوجا مەلایەکی گەورەتر پێی وت: ئەوجارە بە زۆر قسەت لەگەڵ کابرا کردووە، تەڵاقت نەکەوتووە، بەڵام پاش ئەو جاری زۆرە نابێ جارێکی تر قسەی لەگەڵدا بکەی، چونکە سوێند بە زۆر بەتاڵ نابێتەوەو ناکرێتەوە، ئەوە لەم سوورەتەیشدا کابرا هەر تەڵاقی نەکەوتووە، چونکە ئەو قسەیەکە کردوویەتی، لەسەر گومانی بێزیانی بووە لەسەر فتوای مەلاکە.

هەروەها، ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد لەسەر ئیشێك و یەکێکی تر وتی: «إِنْ شاءَ اللّٰه...، إِنْ شاءَ اللّٰه» و ئەم سوێندخۆرەیش باوەڕی وابوو کە «إِن شاءَ اللّٰه»ی کەسێکی تر سوودی هەیە بۆ سوێندخۆرەکە وەکوو چۆن خۆی «إِن شاءَ اللّٰه» بکا، لەسەر ئەساسی ئەوە کە مەشهوورە لەناو خەڵکدا و کابرای سوێندخۆر ئیشەکەی کرد، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە ئەم کەسە لەسەر ناوبانگ متمانەی پەیدا کردووە بەوە کە «إِن شاءَ اللّٰه»ی هەرچەند کەسێکی تریش بیکا سوودی هەیە. هەروەها، ئەگەر شێوەی ژنەکەیان گۆڕی بەجۆرێ کە ئەم کابرایە لای وابوو هەرگیز ژنەکەی خۆی نییە و هەرچەند وتیان ئەمە ژنەکەی تۆیە باوەڕی نەکرد هەتاوەکوو وتی: ئەگەر ئەمە ژنەکەی من بێ، تەڵاقی کەوتبێ، ئەوە هەر تەڵاقی ناکەوێ، چونکە هەرچەند بە سوورەتی تەعلیق قسەکەی کردووە، بەڵام لەسەر گومانی ئەوە بووە کە ژنی خۆی نییەو ئەگەر بیزانیایە ژنی خۆیەتی، تەڵاقی نەئەدا.[1]

باوەڕو گومان دەوریان زۆرە لە حوکمدا؛ بۆیە ئەگەر کەسێك سوێند بخوا بە خوا یا سوێند بخوا بە تەڵاق کە فڵانە شتی کردووە، یا نەیکردووە، یا فڵانە شت وەهایە، یا وەها نییە، ئەوە ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کە بەگومانی ئەو وایە یا وا نییە بە قەتعی، تەڵاقی

---

١. بڕوانە لاپەڕە ١٢١، بەرگی هەشتی شیروانی لە شەرحی (تحفه)دا بەسەر فەرموودەی «مِنهاج»ەوە کە ئەفەرمویت: «فَفَعَلَهُ ناسِیاً للتّعلیقِ أو مُكرَهاً».

ناکەوێ، هەرچەند ئەو شتە بەپێچەوانەی گومانی کابرایش بێ؛ هەروەها ئەگەر کابرا بە بێ ئیعتیباری باوەڕو گومانیش سوێند بخوا، هەر سوێندی ناکەوێ، لەبەرئەوە کە مەعنای «قَضيّة»، زانین و باوەڕو گومانی خاوەنەکەیەتی بەو نیسبەتدانەکە لە قسەکەوە دەرئەکەوێ؛ کەواتە، مەعنای ئەوەکە کەسێك بڵێ: «سەرکەوتن بەسراوە بە هەوڵدانەوە» ئەوەیە: من باوەڕم وایە گەیشتن بە مەرام، وەستاوە لەسەر هەوڵدان و تێکۆشین؛ بەڵێ، ئەگەر بەتایبەتی بڕیاریدا کە لە «نِفسُ الأمر»دا وایەو تەڵاقی خوارد فلانەشت لە حەقیقەت و واقیعدا وایە بە بێ پەیوەندی گومان و باوەڕی خۆی، کەچی بە پێچەوانەی ئەوە دەرچوو، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە خۆی ڕێگای لە خۆی بڕیوەتەوە، هەروەکوو ئەگەر تەڵاق بخوا کە فلانەشت ناکا نە بە زانین و نە بە نەزانین، وە نە بە دەسەنقەست و نە بە هەڵە و نە بە ئارەزوو و نە بە زۆر، ئەوە لەم سوورەتەدا بە هەرجۆرێ بیکا تەڵاقەکەی ئەکەوێ، چونکە هەموو ڕێگایەکی پەرژین کردووە لەخۆی.

میسالێکی نەزانینی کەسێکی تر بە «معلّق عليه»، وەکوو ئەوە کابرایەك سوێند بخوا بە تەڵاق لە ژنەکەی کە نابێ کەل و پەلی ناوماڵ بە خواستەمەنی بدەی بە کەس بە بێ ئیزنی خۆم، پاشان کەسێك بڕوا بڵێ بە ژنەکەوا: مێردەکەت وتی: فلانە شتم بدەیتێ، ئەویش باوەڕی پێ کردو شتەکەی پێدا، لەپاشا دەرکەوت درۆی کردووە، ئەوە تەڵاقی کابرا ناکەوێ؛ یا کابرا بە سوێند بخوا بە تەڵاق لە ژنەکەی کە نابێ بڕۆی بۆ فلانە شوێن بە بێ ئیزنی خۆم، لەپاشا ژنێ بێت پێی بڵێ: مێردەکەت ئیزنی داوی پێکەوە بڕۆین بۆ ئەو شوێنەو ئەمیش باوەڕی پێبکاو پێکەوە بڕۆن، کەچی دەربکەوێ ئیزنی نەداوە، ئەوە لەم سوورەتەیشدا هەر تەڵاقی ناکەوێ.

یاخود مەلایەك فتوا بدا بۆ ژنەکە کە ئەم جۆرە ڕۆیشتنە ئیزنی مێردی پێ ناوێ و بە بێ ئیزنی بڕۆی، تەڵاقت ناکەوێ، ژنەکەیش باوەڕی پێبکاو بڕوا، ئەوەیش هەر تەڵاقی ناکەوێ، مادام کە باوەڕی بە مەلا کردووە، هەرچەند مەلایەکی گەورەی بەناوبانگیش نەبێ.

بەڵێ، هەر گومانێك کە لەسەر ئەساسێك نەبێ و شەخسەکە هەر لەخۆیەوە باوەڕی وابێ زیانی نییە، ئەوە بە بێسوود دەرئەچێ وە ئەگەر ئیشی «معلّق عليه» بکا، تەڵاقی

ئەکەوێ، هەروەکوو ئەگەر کابرا حوکمی شەرع نەزانێ یا ئیددیعای ئەوە بکا کە حوکمی شەرع نازانێ؛ مەسەلا، بڵێت: ئەمزانی سوێندم خواردووە نەڕۆم بۆ فڵانەشوێن، بەڵام عەقڵم نەشکا بەوە کە ئەگەر بڕۆم تەڵاقم ئەکەوێ، ئەوە بەقەتعی سوودی نییەو تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە ئەوە هەر لەسەر قوسوورەو ئەیتوانی پرسیار بکا لە کەسێك ئایا لەوسوورەتەدا چی بکا باشەو چی بکا خراپە و مادام گوێی نەداوەتێ، ئەوە حوکم ئەدرێ بەسەریا بەپێی ئەوەی کە سیغەی سوێندەکەی پێویستی ئەکا.

**بزانن!** هەروەختێ ئینسان ئیشە «معلّق علیه»یەکەی کرد لەگەڵ زانین و بە دەسەنقەست و بە ئارەزووی خۆی، ئەوە سوێندەکەی ئەکەوێ و ئیتر ئەو سوێندە «مُنحَل» ئەبێ، یەعنی ئەکرێتەوە وە ئەگەر جارێکی‌تر ئەو ئیشە بکا، تەڵاقێکی‌تر یا سوێنێکی‌تری ناکەوێ، مەگەر سیغەی سوێنەکە دووبارە بوونەوەی پێویست کردبێ، وەکوو ئەوە کە کەلیمەی «هەرچەند (کُلَّما)»ی تیابێ یا «هەمیشە» و «هەرکاتێ»و شتی‌وا، ئەوە لەوحاڵەدا تا مەجال ببێ سوێنەکەی ئەکەوێ، یەعنی تا سێ تەڵاقەی تەواو ئەبێ تەڵاقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر بە نەزانین یا بە زۆر کردی، بە حەق بێ یا بە بەتاڵ، ئەوە ئەوجارە سوێنەکەی ناکەوێ، بەڵام سوێنەکەیش هەڵناوەشێتەوەو پەکێ ناکەوێ وە ئەگەر کابرا جارێکی‌تر بە ئارەزووی خۆی‌و لەگەڵ زانین‌دا ئیشەکەی کردەوە، تەڵاقی ئەکەوێ، مەگەر مەجال نەمێنێ بۆکەوتنی تەڵاقەکەی، وەکوو ئەوەکابرا سوێند بخوا بە تەڵاق کە لەم مانگی رەمەزانەدا قسە لەگەڵ فڵان نوێژنەکەردا ناکا بەڵکوو تەمێ بگرێ‌و دەس بکا بە نوێژکردن وە لەو مانگەدا بە زۆر قسەیان پێ‌کرد لەگەڵ کابرادا، پاشان مانگی رەمەزانەکە تەواو ببێ، ئەوە ئیتر هەرچەند قسە بکا لەگەڵ کابرادا قەیدی نییە، چونکە ئەو رەمەزانە تەواو بووەو مەجالی سوێند کەوتن نەماوە.

**بزانن!** ئەگەر کەسێك تەعلیقی تەڵاقی کرد بە کرداری کۆمەڵێکەوە کە هەندێکیان گوێیان ئەدا بە کابراو هەندێکیان گوێیان نەئەدایە، ئەوە بۆ هەر تاقمێك لەم دوو تاقمە حوکمێکی تایبەتی هەیە، یەعنی تاقمە گوێ‌نەدەرەکە بە هەر جۆرێك ئیشەکە بکەن

تەڵاقی کابرا ئەکەوێ، بەڵام تاقمی گوێدەر پێویستە ئەو ئیشە کە ئـەیکەن بـە زانـین بیکەن‌و بە دەسەنقەست‌و بە ئارەزووی خۆیان، ئەگینا تەڵاقی کابرا ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك ویستی سوێند بخوا لەسەر شتێك و پاش ئەوە کـە وتـی تـەڵاقـم کەوتبێ، پەشیمان بووەوەو سوێند لەسەرخوراوەکەی نـەوت و ئـیدديعای کـرد کـە مەبەستی سوێندخواردن بووە لەسەر فڵانە شت‌و پەشیمان بووەتەوە، ئەوە بە ئاشکرا لیێ قەبووڵ ناکرێ‌و حوکم ئەدرێ بە کەوتنی تەڵاقەکەی، بەڵام حەواڵەی دینی خۆی ئەکرێ، یەعنی ئەگەر مەبەستی سوێند بووبێ لەسەر شتێك و پەشیمان بێتەوە، بەو لەفزە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە جوملەی قەسەم هەتا جوابەکەی نەڵێیت، سوودی نییەو مەعنا ناگەیەنێ.

وە ئەگەر کەسێك ویستی سوێند بخوا لەسەر شتێك و لەو کاتەدا کە وتی: تەڵاقـم کەوتبێ، یەکێك دەستی نا بەسەر دەمیاو نەیهێشت سوێندەکە تەواو بکا، ئـەوە بـەو ئەندازە لەفزە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە خۆی بە تەنها مەبەست نەبووە، بەڵکوو مەبەست ئەوە بووە ببەسترێ بە سوێند لەسەر خوراوەکەوە، بەڵام مـانیعێك ڕێی لێ گـرتووەو نەیهێشتووە تەواوی بکا.

ئەگەر کەسێك چەند سوێندێکی خوارد لەسەر یەك شت، ئەوە هەموو بە یەك سوێند دائەنرێن، مادام کابرا نیازی سوێندی سەربەخۆی نەبێ لە هەموو سوێندەکان وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر چەند شتێك بە چەند جوملەی جیاواز، وەکوو تەڵاقم کەوتبێ نانووسم، تەڵاقم کەوتبێ قسە ناکەم، ئەوە سوێندەکان ئەوەندەی جوملەکان زۆر ئەبن؛ هەروەها، ئەگەر لە یەك جوملەدا عەتف بەکار هێنرابێ، وەکوو تەڵاقم کەوتبێ قسە لەگەڵ فڵانکەسدا ناکەم‌و نانیش لەگەڵ فڵانکەسدا ناخۆم، ئەوەیش بە چـەند سـوێنـدێك دائەنرێ مادام کابرا نەڵێت مەبەستم ئەوە بووە کە سـوێنـد لەسـەر هـەمووی بـخۆم؛ هەروەها، ئەگەر حەرفی نەفی لە ناودا بوو؛ مەسەلا، وتی: تەڵاقم کەوتبێ نە قسە لەگەڵ فڵانکەسدا ئەکەم و نە نـان لەگـەڵ فـڵانکەسدا ئـەخۆم، ئـەوە ئـەوەندەی سـوێنـد لەسەرخوراوەکان سوێندەکەی زۆر ئەبێ وە ئەگەر هەندێکی کرد بە قەیدی هەندێك؛ مەسەلا، وتی: تەڵاقم کەوتبێ نان نـاخۆم لە مـاڵی فـڵانکەسدا لەگـەڵ فـڵانکەسداو

فڵانکەسی تر حازر بێ لەو شوێنەداو خۆم پارەی نانەکەم نەدابێ، ئەمە هەمووی یەك سوێندە، تەواو ئەبێ بەهۆی هاتنەجێی هەموو قەیدەکانەوە وە ئەگەر هەندێکیان نەهاتنەجێ، تەڵاقی ناکەوێ وە بە هەرحاڵ، ئینسان تەڵاقی لەسەر شتێك خواردبێ، یاخود چەند تەڵاقی لەسەر چەند شتێك خواردبێ بەرودوا، یا بەیەکەوە، ئەوەکە هات خولعی ژنەکەی کردو لەپاش مارەی کردەوە، رزگار ئەبێ لەکەوتنی تەڵاقەکانی، وەکوو لەپێشەوە وتمان.

**بێداری!** شێخ لە «تُحفه»دا ئەفەرموێت: ئەگەر وتی: بە تەڵاقم ئەو شتە ناکەم و لەپاشا شتەکەی کرد، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، چونکە عادەت نییە سوێند بە تەڵاق بخورێ، مەگەر نیازی تەڵاق بێ.

لە «انوار»یشدا ئەفەرموێت: «ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: ئەگەر رۆیشتیتەوە ماڵەوە، یا قسەت لەگەڵ فڵانکەسدا کرد، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەرکام لەم دوو شتە بێتەجێ، تەڵاقەکەشی پێ ئەکەوێ و سوێندەکەیشی پێ ئەکرێتەوە، ئیتر تەڵاقێکی تر ناکەوێ بە سیفەتەکەی تریان.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر رۆیشتیتەوە ماڵەوەو ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ فڵانکەسدا، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەم شوێنەدا لەبەرئەوە کە حەرفی شەرت دووبارە بووەتەوە، ئەبێ بەهۆی ئەوەکە جەزایش دووبارە ببێتەوە؛ کەوابێ، تەڵاقەکە ئەکەوێ بە هەرکام لەو دوو سیفەتە بێتەجێ وە ئەگەر هەردووکیان هاتنەجێ، دوو تەڵاقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر لە ماڵ رۆیشتیتە دەرەوەو شتێ بدەی بە کەسێ، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ بە هەردوو سیفەتەکە نەبێ وە ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ ئەگەر لە ماڵ بڕۆیتە دەرەوە وە ئەگەر لە ماڵی من شتێ بدەی بە کەسێك وە ئەگەر بڕوێتە ماڵی دایکت، ئەوە بە هەر سیفەتێك لەم سیفەتانە بێتەجێ، تەڵاقی ئەکەوێ. وە من ئەڵێم: ئەگەر هەر سێ سیفەتەکە هاتنەجێ، هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، بەو شەرتە تەفرەی دواکەوتووەکەیان نەکەوێ تا ژنەکە «عِدّە»ی تەواو ئەبێ لەپاش تەڵاقی یەکەم، یا پاش تەڵاقی دووەم.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر من لەوە بکەمەبەرکە تۆ ڕێسابێتت، یا تۆ تەنیبێتت (یەعنی ئەو بەرگەی کە تۆ دروستی ئەکەی)، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ ئەگەر لە ڕێسراو یا لە تەنراوی ئەو ژنە بکاتە بەر، هەرچەند لە سوورەتی یەکەمدا ژنەکە نەیتەنیبێ و لە سوورەتی دووهەمدا ژنەکە نەیڕێسابێ وە ئەگەر وتی: ئەگەر من لە ڕێس و تەنینی تۆ بکەمەبەر، تەڵاقت کەوتبێ و لەپاشا، بەرگێکی کردەبەرکە ئەو ڕێسابووی بەڵام نەیتەنیبوو، یاخود تەنیبووی بەڵام ئەیڕێسا بوو، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، چونکە تەڵاقەکە بەسراوە بە هەردوو سیفەتەکەوە، کەوابوو، بە یەکێکیان ناکەوێ.

ئەگەر وتی: ئەگەر ڕۆیشتیتە ماڵ و قسەت کرد لەگەڵ فڵانکەسدا، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە پێویستە هەردوو سیفەتەکە بێنەجێ و شەرت نییە ڕۆیشتنی ماڵەکەیش پێش بکەوێ لەسەر قسەکردنەکەی و بە هاتنەدیی ئەو دوو سیفەتە یەك تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: ئەگەر ڕۆیشتیتە ماڵەوە جا قسەیشت کرد، یا: لەپاشا قسەت کرد لەگەڵ فڵانکەسدا، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە پێویستە هەردوو سیفەتەکە بێنەجێ و ڕۆیشتنی ماڵەکەیش پێش قسەکردنەکە بێ بە بێ ماوەکەوتنە بەین، ئەگەر کەلیمەی «جا»ی بەکار هێنابوو وە لەگەڵ ماوەکەوتە بەیندا، ئەگەر کەلیمەی «لەپاشا»ی بەکار هێنابوو وە ئەگەر وتی: تەڵاقت کەوتبێ ئەگەر ڕۆیشتیتە ماڵەوە، ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ فڵانکەسدا، ئەوە پێویستە هەردوو سیفەتەکە بێنەجێ و پێویستە ئەوەیان وا لەدواوە، لەپێش ئەوەیاندا بێتەجێ کەوا لەپێشەوە.

ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر شتم پێ دایت، ئەگەر وەعدم پێ دایت، ئەگەر داوای شتێکت کرد لێم، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە پێویستە بۆ کەوتنی تەڵاقەکە، لەپێشا داواکردنی کابرای قسە لەگەڵ کراو بێتەجێ، ئەمجا وەعدەی کابراو ئەمجا بەخشینەکەی، چونکی پوختەی مەعناکە ئەوەیە: ئەگەر تۆ داوای شتێکت لێ کردم و من وەعدەم دایتێ و ئەمجا پێم بەخشیت، ئەو وەختە تەڵاقت کەوتبێ.

ئەگەر وتی: ئەگەر ڕۆیشتیتە ماڵەوە، تەڵاقت کەوتبێ، ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ فڵانکەسدا، ئەمە وائەبێ مەبەستی ئەوە ئەبێ هەروەختێ ڕۆیشتیتە ماڵەوە، تەڵاقەکەت،

«معلّق»بێ بە قسەکردنەوە لەگەڵ فلانکەسدا وە هەڵیش ئەگرێ ئارەزووی ئەوەی کردبێ کاتێ قسەت کرد لەگەڵ فلانکەسدا، تەلاقەکەت، «معلّق» بێ بە رۆیشتنە ماڵەوە؛ کەواتە، پێویستە بگەڕێینەوە سەر ئەو کەسە و لێی بپرسین مەبەستی چی بووە و بەوجۆرە بجووڵێینەوە کە ئەو ویستوویەتی و بەپێی ئەوە حوکم بدەین لە مەسئەلەکەدا.

وە ئەگەر وتی: ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ ئەحمەددا، یا لەگەڵ موحەممەددا، یا لەگەڵ حامیددا، لەگەڵ موحەممەد، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە کە قسەی لەگەڵ هەر کام لەو سێ کەسەدا کرد، تەڵاقی ئەکەوێ، ئەوەندە هەیە پێویستە لەوکاتەدا کە قسە ئەکا لەگەڵ حامیددا، حامید لەگەڵ موحەممەددا بێ. ئەگەر وتی: ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ پیاوێکدا، تەڵاقت کەوتبێ وە ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ رەشێکدا، تەڵاقت کەوتبێ وە ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ درێژێکدا تەڵاقت کەوتبێ و رێکەوت لەگەڵ پیاوێکی رەشی درێژدا قسەی کرد، ئەوە هەر سێ تەڵاقەی ئەکەوێ». بڕایەوە بە کورتی فەرموودەی ئەنوار.

وە لە هەموو سوورەتی ئەم تەعلیقانەدا ئەگەرکابرا خولعی ژنەکەی بکا، ئەوە رزگار ئەبێ لە کەوتنی تەڵاق پاش بوونی «معلّق علیه»، خواه لەپێش تازەکردنەوەی نیکاحەکەدا سیفەتەکان بێنەجێ یا لەپاشان.

ئەگەر وتی: ئەگەر قسەت کرد لەگەڵ فلانکەسدا، تەڵاقت کەوتبێ و قسەی لەگەڵدا کرد لە حاڵی حەیاتدا، تەڵاقی ئەکەوێ، هەرچەند ژنەکە یاخود شەخسە قسە لەگەڵ کراوەکە لەوکاتەدا سەرخۆش بێ، مەگەر گەیشتبێتە حاڵەتێك کە هۆشی هیچ بەخۆیەوە نەمابێ، بەڵام تەڵاقی ناکەوێ بەوە کە قسەی لەگەڵدا بکا پاش مردنی یا لەکاتی شێتی یا بێهۆشی یا نووستنیا، هەرچەند بە دەنگەکەی ئەم ژنە بێدار ببێتەوە؛ ئەگەر ماوەی بەینیان ئەوەندە زۆر بوو کە بە عادەت قسەی ئەم ژنەی نەدەبیست و بە رێکەوت یا لەبەر بەرزیی دەنگ قسەکەی بیست، تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگەر "با" دەنگەکەی پێ گەیاند، ئەگینا بەعادەت نەیئەبیست، تەڵاقی ناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر بەهۆی تەلەفۆنەوە قسەی لەگەڵدا کرد، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە تەلەفۆن بووە بەهۆی قسە لەگەڵ کردنی

عادەتی وە ئەگەر لەم کاتەداکە نێوانیان زۆرەو لە یەك دوورن، ژنەکە تۆزێ قسەی خۆی نزم کردەوەو کابرا نەیبیست، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر لە نزیکیشەوە دەنگی ئەوەندە نزم کردەوە کابرا نەیبیست، هەر تەڵاقی ناکەوێ.

وە ئەگەر ماوە لەنێوانیاناکەم بوو و ژنەکە بە عادەت قسەی لەگەڵداکرد، بەڵام کابرا نەیبیست لەبەرئەوە کە بێئاگا بوو یا دەمی گیرابوو بە قسەیەکیترەوە، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ؛ هەروەها، ئەگەر پاش ئەو سوێندە کابرای دەرکردو وتی: دە بڕۆ دەرەوە، یا جنێوی پێدا، یا لۆمەو سەرزەنشتی کرد، هەر تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر بە نووسین تێی گەیاند یا بە ئیشارەتی چاو یا بە دەست یا بە زەردەخەنە یا بە راسپێری شەخسێك بۆلای، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ. هەروەها، تەڵاقی ناکەوێ ئەگەر بە غەیری زوبانی خۆی قسەی لەگەڵدا بکا و ئەو کەسەیش لێی حاڵی نەبێ، هەرچەند یەکێ حازر بێ تەرجەمەی ئەم زوبانەی بۆ بکاو تێی بگەیەنێ، چونکە ئەم قسەی لەگەڵدا نەکردووە.

وە ئەگەر سەلامی لێ کرد، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر سەلامی کرد لە کۆمەڵێك کە ئەو کەسەیان لەناودا بوو و قەسدی ئەوکابرایشەی بوو یا هیچی مەبەست نەبوو، بەڵام ئەگەر بە دڵ یا بە زوبان ئەو کەسەی جیاکردەوە، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ.

## باسی تەعلیقکردن بە چاو پێکەوتنەوە

وتی: ئەگەر فلانکەست چاو پێکەوت، تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە چاو پێکەوتنی بە زیندوویی‌و بە مردوویی، هەرچەند ژنەکە یا ئەو کەسە لەمکاتەدا شێت یا بێهۆش یا سەرخۆش یا نووستوو بێ وکافییە بەشێك لە لەشی ببینێ بە رووتی -هەرچەند کەمیش بێ- بەو شەرتە هەموو قەوارەکەی دیار بێ، ئیتر واجب نییە روخساری ببینێ؛ ئەگەر چاوی پێکەوت لەحاڵێکدا هەموو لەشی داپۆشرابوو بە جلێك یاخود لەودیوی دیوارەوە بوو، بەڵام دەستی یا پێی لە تاقێکەوە دەرکردبوو و ئەمانەی‌دی، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر کەسەکە لەناو ئاوێکی رۆشنا بوو یا لەودیوی شووشەوە بوو و ژنەکە چاوی پێکەوت، تەڵاقی ئەکەوێ. بەڵام تەڵاقی

ناکەویّ بە چاوپیّ کەوتنی ویّنەی لەناو ئاویّنەدا یا لەناو ئاودا؛ هەروەها، تەلاّقی ناکەویّ بە دیتنی ویّنەکەی یا نەخشەکەی لەسەر تەختەیەك یا لەسەر دیواریّك یا بەسەر بەردیّکەوە، لەبەر ئەوە کە ئەمانە عەین نین بەڵکوو ویّنەو خەیاڵن، بەلاّم لەناو ئاوی سافدا یا لەودیوی شووشەوە یا لە دووربیندا یا بەهۆی عەینەکەوە، هەمانکەس ئەبینریّت؛

بەڵیّ، ئەگەر وتی بە ژنەکە: ئەگەر روخساری خۆت ببینی تەلاّقت کەوتبیّ، ئەویش روخساری خۆی دی لە ئاویّنەدا، تەلاّقی ئەکەویّ، چونکە بەگوێرەی عورف ئەو وەزعە بە دیتن دائەنریّو غەیری ئەوە قابیل نییە بۆ ژنەکە.

## باسی تەعلیق‌کردن بە دەرچوونی ژنەکەوە بە بیّ‌ئیزنی کابرا

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی ئەگەر بە بیّ‌ئیزنی من دەرچووی، تەلاّقت کەوتبیّ، ئەوە کە جاریّك دەرچوو، تەلاّقیّکی ئەکەویّو سویّندەکەی بەتاڵ ئەبیّتەوە، ئیتر ئەگەر جاریّکی تر دەربچیّ، تەلاّقی ناکەویّ، مەگەر تەعلیقەکەی بە کەلیمەی وەکوو «هەرچەند» کردبیّ کە مەعنای هەمیشەو هەموو جاریّ ئەگەیەنیّ، ئەوە تا تەلاّقی مابیّ، بە دەرچوونی بیّ‌ئیزن ئەکەویّ، مەگەر بە خولع ـ مەسەلا ـ چاری بکا.

وە ئەگەر لەپاش تەعلیقەکە ئیزنی ژنەکەی دا بچیّتە دەرەوەو ژنەکەش رۆیشتە دەرەوە، ئەوە تەلاّقی ناکەویّو سویّندەکەیش ئەکریّتەوە؛ جا ئەگەر لەپاشا ژنەکە بچیّتە دەرەوە، تەلاّقی ناکەویّ؛ مەگەر سیغەی تەعلیقەکە بۆ دووبارە و سیّبارە بوونەوە بیّ، وەکوو «هەرچەند»و شتی‌وا؛ مەسەلا، بڵیّت بە ژنەکە: هەرچەند چوویتە دەرەوە بە بیّ‌ئیزنی من، تەلاّقت کەوتبیّ، ئەوە هەرچەند جاری یەکەم ئیزنی ژنەکەی دابیّو بە ئیزن چووبیّتە دەرەوە، سویّندەکەی بۆ جارەکانی تر بەتاڵ نابیّتەوەو پیّویستە هەرکاتیّ ئەچیّتە دەرەوە ئیزنی لە میّردەکەی وەرگرتبیّ، یاخود کابرا بە یەکجار بڵیّت: وا ئیزنم دای هەرکاتیّ ئەڕۆیتە دەرەوە، بڕۆ، ئەوە ئیتر بۆ هەموو جاریّ بەسەو زیانی نییە، ئەگەر بڕواتە دەرەوە؛ ئەگەر کابرا بە لەفز ئیزنی دا، بەلاّم ژنەکە نەیبیستو نەیزانیو رۆیشتە

دەرەوە، تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام کافی نییە هەر بە دڵ ئیزنی بداو بە لەفز ئیزنی نەدا، چونکە ئیزن ئەوەیە بەدەرەوە بێ؛ بەڵێ، ئەگەر بە نووسین ئیزنەکەی نووسی بۆیو ژنەکەیش پێی زانی، بەمنەوعە کە خۆی کاغەزەکەی خوێندەوە، یاخود بۆیان خوێندەوە، ئەوە کە رۆیشتە دەرەوە، تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر تەڵاق بخوا بڵێ: دە مانگ لەو دێیەدا دانانیشم، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە دانیشتنی دە مانگی جیاجیا، مەگەر بڵێت: نیازم ئەوە بووە کە دە مانگەکە پێکەوە بێ؛ ئەگەر بڵێ: تەڵاقم کەوتبێ ئیمساڵ لەمدێیەدا دانانیشم، ئەوە ئەگەر بە بێمەبەست بوو یا بە مەبەستی ئەوە بوو تەواوی ئەو ساڵە لەو دێیەدا نەبێ، رزگار ئەبێ بەوە کە لەپێش تەواوبوونی ساڵەکەدا بار بکا لەو دێیە بۆ دێیەکیتر وە ئەگەر نیازی ئەوە بوو کە بە هیچجۆری لەوکاتەوە لەو دێیەدا نەمێنێ، پێویستە دەسبەجێ لەو دێیە دەرچێ، بەڵام قەیدی نییە ئەگەر ماوەیەك خەریکی پێچانەوەی کەلوپەل بێو خۆی ئامادە بکا بۆ دەرچوون. ساڵیش کە «مُطلَق»بێ، مەعنای لێئەدرێتەوە بە ساڵی عەرەبی، مەگەر لە وڵاتێکدا کە حیسابی رۆمی یا فارسی تیا باو بێ، ئەوە لەوکاتەدا بەپێی عورف مەعنای ساڵ لێ ئەدرێتەوە وە ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ لەم ساڵەدا لەم شوێنەدا نابم، ئەوە واجبە گورج بڕوا بۆ شوێنێکیتر و هەتا ئەو ساڵە تەواو ئەبێ، نابێ کەمو زۆر لەو شوێنەدا بێ.

ئەگەر بڵێت: ئەم ساڵە، یا ئەم مانگە لەگەڵ فڵانکەسدا دانانیشم، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ بەوە نەبێ کە تەواوی ئەوساڵە یا ئەو مانگە بە عادەت لەگەڵ ئەو شەخسەدا دابنیشێ، ئیتر تەڵاقی ناکەوێ بەوە کە رۆژێ یا دوو رۆژ یا کەمتر یا زیاتر لەگەڵیا دابنیشێ، مادام نەگا بە مانگێك لە حاڵی یەکەمدا، وە نەگا بە ساڵێك لە حاڵی دووهەمدا وە ئەگەر بڵێت: ئەم مانگە یا ئەم ساڵە قسە لەگەڵ فڵانکەسدا ناکەم، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە یەکجار قسەکردن لەگەڵیا لەبەر تەماشاکردنی عورف. ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ نارۆمە خانووی فڵانکەس، یا ماڵی فڵانکەس، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بەوە کە بڕواتە خانوویەکەوە کە موڵکی ئەوکەسە بێ نەك بەکرێ یا بە پیاوەتی تیا دانیشتبێ،

مەگەر کابرا خۆی بڵێ: مەبەستم خانوویەك بووە کە تیا دانیشتبێ؛ بەڵێ، ئەگەر عورف وابوو کە مەبەست لە خانوو خانوویەك بێ تیا دانیشتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە چوونە ناو هەموو خانوویەکی وا کە ئەو کەسە تیایا دانیشێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ نارۆمە خانووی فڵانکەس، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ بە چوونی ناو ئەو خانووە، هەتا بۆ داڵانی خانووەکەیش بێ، یا هەرچەند پاش سوێندەکەی کابرا ئەو خانووە دیوارو هۆدەو شێوەی بگۆڕێ بە جۆرێکی تر یا بڕووخێ، هەتاوەکوو ئەگەر زەویی خانووەکەیش مابێتەوە؛ بەڵێ ئەگەر کرا بە حەمام یا بە دووکان یا بە مزگەوت یا بە بازاڕ یا بە شتێکی تریوا، ئەوجا رۆیشتە ناوی، ئەوە قەیدی نییەو سوێندی ناکەوێ، مەگەر کابرا وەختی خۆی وتبێتی: نارۆمە خانووی فڵانکەس کە ئەو ئەرزو شوێنەیە، ئەوە بە هەر شێوەیەك پێی تێبنێ، تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ لەگەڵ فڵانکەسدا لە دێیەکا دانانیشم، ئەوە پێویستە هەر دێیەك ئەوکەسەی تیا بێ ئەم نەیکا بە نیشتمانی خۆی وە ئەگەر بە هاتوچۆ پیا رابووری، قەیدی نییە وە ئەگەر بڵێت: لەگەڵ فڵانکەسدا دانانیشم لەودێیەدا، ئەوە ئەگەر خانووی جیابوو لە خانووی ئەوکەسە، قەیدی نییە.

وە ئەگەر وتی: بەیەکەوە لەگەڵ فڵانکەسدا دانانیشم، ئەوە قەیدی نییە لە یەك خانوودا دابنیشن، بەو شەرتە دیوارێکیوای لەبەیندا بکەن کە لەیەکیان جیابکاتەوە.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ لەم دێیە بار ئەکەم، تەڵاقی ناکەوێ تا ئەو رۆژەی کە نائومێد ئەبێ لە بارکردن وە ئەگەر بڵێت: لەم دێیەدا دانانیشم، ئەوە پێویستە چۆنی پێبکرێ پەلە بکا بۆ بارکردنو بار بکا و پاش ئەوەیش نەیەتەوە بۆ دانیشتن و نیشتەجێ بوون لەو دێیەدا وە ئەگەر وتی: بار ئەکەم لەم دێیەو باری کرد، ئەوە قەیدی نییە پاشان ماڵی بێتەوە بۆ ئەو دێیە وە ئەگەر وتی: لەگەڵ فڵانکەسدا دانانیشم، جا رۆیشت بۆ شوێنێ کە ئەوکەسەی تیابوو، تەڵاقی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر لە شوێنێکا دانیشت وە ئەوکەسەیش هات بۆ ئەو شوێنەو لەگەڵیا دانیشت؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو هاتو ئەم بە بێتەفرە هەستا رۆیشت، ئەوە قەیدی نییە، چونکە ئەم جۆرە ئیشانە کە بە ئارەزووی

ئادەمیزاد خۆی بێ، وەکوو دانیشتن‌و راوەستان‌و نـووسین‌و سـواری، فـەرقی دەس پێ‌کردن‌و دەوام لەسەر کردنیان نییە، مەگەر لەفزەکەی مەعنای پـەیداکـردنی نـوێ بگەیەنێ، وەکوو خۆ بۆن‌خۆش کردن‌و جل‌وبەرگ لەبەرکردن‌و شتی‌وا، ئەمانە بەردەوام بوونیان وەکوو ئەوەڵیان نییە؛ بەڵێ ئەگەر کابرا وتی: لەگەڵ فڵانکەسدا دانانیشم، زیانی نییە ئەگەر لە مزگەوت یا لە حەمام یا لە چاخانەدا یەك‌بگرنەوە، هەروەها زیانی نییە ئەگەر هەردووکیان یا یەکێکیان کـارەبەدەستی حـوکوومەت بـن‌و لە یـەك شـوێنـدا یەك‌بگرنەوە.

وە ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ نابێ لەگەڵ فڵانکەسدا بـڕۆی بـۆ حـەمام یـا بـۆ مزگەوت، ئەوە ئەگەر «مطلَق»بێ، یاخود مەبەستی هاوڕێیی رێگە بێ، ئەوەندە پێویستە کە لەرێگەدا بەیەکەوە نەڕۆن، ئیتر قەیدی نییە لە حەمامەکەدا یا لە مزگەوتەکەدا بکەونە یەك؛ بەڵێ، ئەگەر نیازی مەنعی کۆبوونەوەی بێ لەگەڵ ئەوکەسەدا لەو شوێنانەدا، ئەوە بە کۆبوونەوەی عەمدی‌و بە ئارەزوو تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ لەگەڵ فـڵانکەسدا ئـیش نـاکـەم، ئـەوە مـەعنای بـە هاوڕێیەتییەك لێ ئەدرێتەوە کە عورف دایناوە، جا ئەگەر عورف و عادەت وابوو کە بەردەستی نەکا یا وەستایی بۆ نەکا، تەبێ نەیکاو ئەگەر عورف وابووکە مەشغووڵی ئەو ئیشە نەبێ لەو کارخانەیەدا کە ئەو کابرا ئیشی تیا ئەکا، مادام ئەوکەسەی تیا بێ، ئەبێ نەیکا.

## باسی تەعلیق‌کردن بە جل لەبەرکردنەوە

ئەگەر وتی: ئەو مێزەرە نابەستم بەسەرمەوە، یا ئەوکراسە لەبەر ناکەم، یا ئەو دەرپێیە ناکەمە پێ، یا ئەوکەوا، یا ئەو عابا ناکەمەبەر، ئەوە هەرکامیان ئەوەندەی پەنجەیەکی لێ کەم‌کاتەوە، یا بیخاتە سەری‌و ئەوجا بیکاتە بەر، تەڵاقی ناکەوێ. مەسئەلەی بـەرگ، وەکوو مەسئەلەی چوونە ناو خانوو نییە، چونکە عورف لەوا جیاوازە؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: دەرپێ لە پێ ناکەم، یا مێزەرە نابەستم بە سەرمەوە، ئەوە هەر جۆرە مێزەرەیەك

بنێته سەری، یا هەر جۆره دەرپێیەك له پێ بكا كه لەعورفدا پێیان بوترێ دەرپێ‌و مێزەره، تەڵاقی ئەكەوێ.

## باسی تەعلیق‌كردن بەو شتانەوه كه عورفی شەرعیان تیا هەیه

تەڵاقی خوارد: ئەو شته نافرۆشم، یا: ئەو خانووه نادەم به كرێ، یا: ئەو ژنه ماره ناكەم، یا: ئەو خانووه ناخەمه رەهنەوه، ئەوه تەڵاقی ناكەوێ به هەر ئیشێ لەمانه كه موافقی شەرع نەبێ، مەگەر خۆی بەتایبەتی بڵێ: مەبەستم تێكڕایی بووه له دروست‌و نادروستی. وه ئەگەر بڵێت: ئەو شته نافرۆشم، یا: ئەوكچەم نادەم به شوو[١]، یا: ئەو ژنەم تەڵاق نادەم، ئەوه تەڵاقی ناكەوێ ئەگەر به وەكیل ئەمانه بكا وه ئەگەر بڵێ: تەڵاقم كەوتبێ ژن ماره ناكەم بۆ خۆم، ئەوه خۆی مارەی بكا یا وەكیل بگرێ هەر تەڵاقی ئەكەوێ، چونكه وەكیل له ژن هێنانا حوكمی ئەسیلی هەیەو به فروستاده دائەنرێ.

## باسی تەعلیق‌كردنی تەڵاق به تەڵاقەوه

وتی: تەڵاقم كەوتبێ تەڵاق ناخۆم، ئەوه هەروەختی تەعلیقی تەڵاق بكا به شتێكەوه له سوورەتی سوێندا، یا به تەنجیز بڵێ: تەڵاقم كەوتبێ ئەو شته ناكەم، تەڵاقی ئەكەوێ وه ئەگەر وتی: تەڵاق بەدەمما نایەت، ئەوه بەهەر جۆرێك سیغەی تەڵاق بەدەمیا بێت، تەڵاقی ئەكەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم تەڵاقه كه ئێسته خواردی «بائِن» بوو، ئەوه تەڵاقه پێشووەكەی ناكەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم كەوتبێ نابێ تەڵاقم بكەوێ، یاخود: تەڵاق ناخەم، ئەوه تەڵاقی ناكەوێ بەوه كه سوێند بخوا بەراستییەك، وەكوو ئەوه كه بڵێ: تەڵاقم وابێ حەج فەرزه یاكەعبه پیرۆزه؛ هەروەها، ناكەوێ بەوه كه تەعلیقی تەڵاق بكا به شتێكەوه بەر له بوونی

---

[١. لەوانەیه ئەم رستەی (ئەو كچەم نادەم به شوو) هەڵەبێ‌و راستەكەی (ئەو كچەم ماره ناكەم) بێ، هەروەك چۆن له باسی (باسی هەندی جۆره تەعلیق كردنی جیاجیا)دا ـكه له چەند دێری دواییدا دێ ـ روونی ئەكاتەوه ـ بڵاوكردنەوەی كوردستان].

«معلّق علیه»، چونکە تەعلیق تەڵاق خستن نییە؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش تەعلیقەکە «معلّق علیه» هاتەجێو ئەم تەڵاقە کەوت، ئەوە ئەگەر ئەم تەڵاقە «رجعي»بێ، تەڵاقە پێشووەکەیش ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر «بائن»بێ، ئەوە تەڵاقە پێشووەکە ناکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ تەڵاقی ئەم ژنە نادەم، ئەوە ئەگەر خۆی تەڵاقی بداو تەڵاقەکەیش «رجعي»بێ، تەڵاقە پێشووەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر وەکیل تەڵاقی بدا، یا خۆی تەڵاقی بداو تەڵاقەکەی «بائن»بێ، ئەوە تەڵاقەپێشووەکەی ناکەوێ.

## باسی هەندێ جۆرە تەعلیقکردنی جیاجیا

وتی: تەڵاقم کەوتبێ ئەو کچمە نادەم بە فڵانکەس، ئەوە ئەگەر ئەو کەسە هات خوازبینی کردو ئەمیش کچەکەی دایە، تەڵاقەکەی ئەکەوێ، چونکە جواب نەکردنی خوازبینیکەر لە عورفدا بە ژن پێدانی دائەنرێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ کچەکەم نادەم بە شوو، ئەوە بە بەڵێندان بە خوازبینیکەر تەڵاقی ناکەوێ تا مارەی نەکا لێی، جا هەرکاتێ لێی مارەکرد، تەڵاقی ئەکەوێ، چ خۆی مارەی بکاو چ کەسێك بکا بە وەکیل مارەی بکا، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا راستە کچی داوە بە شوو؛ ئەگەر وتی: تەڵاتم کەوتبێ ئەو کچەی لێ مارە ناکەم، ئەوە ئەگەر خۆی مارەی بکا، تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وەکیل مارەی بکا، تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ نایەڵم فڵانکەس ئەو ئیشە بکا، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ بەوە کە ئەم سوێندخۆرە نەزانێ بەو کەسە لەو کاتەدا ئەو ئیشە بکا، یا بزانێ بەڵام نەتوانێ رێی لێبگرێ؛ بەڵێ، ئەگەر پێی زانیو رێی لێ نەگرتو ئەیشیتوانی رێی لێ بگرێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ سبەینێ ئەو چێشتە ئەخۆمو پێش داهاتنی سبەینێ بە بێدەخڵی ئەمکەسە چێشتەکە فەوتا، تەڵاقی ناکەوێ وە ئەگەر سبەینێ هاتو ئەیتوانی چێشتەکە بخواتو نەیخوارد تا فەوتا، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: هەر سێ تەڵاقم کەوتبێ ئەو ئیشە بکەی تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر ئیشەکەی کرد، تەڵاقێکی ئەکەوێو سوێندخواردن بە سێ تەڵاقەکەی، هەر بۆ تەئکیدکردنەوەیەو بەس.

ئەگەر تەڵاقی خوارد کە سەفەر ناکا بۆ فڵانە شوێن، ئەوە ئەگەر کەوتەرێو لە رێدا گەڕایەوە، تەڵاقی ناکەوێ، مەگەر بڵێ: مەبەستی ئەوە بووە لە سوێنەکەی کە بەنیازی سەفەر ناکەوێتەرێ وە ئەگەر وتی: بەو مەزهەبانە کە تەڵاقیان پێ ئەکەوێ ئەو شتە ناکەمو شتەکەیشی کرد، تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئەم لەفزە سوێندە بە مەزهەبی ئیمامەکان و باسی سیغەی تەڵاقی تیادا نییە وە ئەگەر وتی بە کەسێك: تەڵاقت کەوتبێ ئەو قسەتە نەکرد؟ ئەویش وتی: بەڵێ و لەڕاستیدا درۆی کرد، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە قسەکەی لە حوکمی ئەوەدایە کە وتبێتی: تەڵاقم کەوتبێ ئەو قسەمە کردووە و دیارە ئەگەر لەم سوورەتەدا درۆ بکا، تەڵاقی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: تەڵاقم کەوتبێ ناڕۆم بۆ دیدەنی فڵانکەس، یەکێکیش لەویادا بوو، گورج وتی: سێ‌بەسێ؟ ئەویش وتی: سێ بەسێ، ئەوە ئەگەر رۆیشت بۆ دیدەنی ئەو کەسە، سێ تەڵاقەی ئەکەوێ، چونکە کابرای‌تر ئەو لەفزەی پیشان داوەو ئەمیش وەریگرتووەو بووە بە بەشێك لە سیغەی تەڵاقەکەی و وەکوو ئەوە نییە لەپێشا یەك تەڵاقی ژنەکەی بداو لەپاشا بڵێت: واکردم بە سێ تەڵاق، ئەم لەفزە قیمەتی نییە، چونکە یەك تەڵاق نابێ بە سێ.

ئەگەر کەسێك بە کەسێکی وت: ژنەکەت تەڵاق دا؟ ئەویش وتی: بەڵێ، ئەمە ئەگەر کابرا نیازی پرسیارکردن بووبێو ئەویش وەرامی دابێتەوە، ئەگەر راست بکا، ئەوە تەڵاقی داوە وە ئەگەر بە درۆ بڵێ: «بەڵێ»، قیمەتی نییە وە ئەگەر ئەم پرسیارە لە شوێنی فەرماندانا بێ بە تەڵاقدان، ئەوە کە وتی: بەڵێ، یەعنی تەڵاقی کەوتبێو تەڵاقێکی ئەکەوێ.

ئەگەر کابرا بانگی کرد لە سەلمای ژنی، کەچی عەینا جوابی دایەوە، ئەمیش وتی: تەڵاقت کەوتبێ و باوەڕی وابوو کە سەلمایە، ئەوە عەینا تەڵاقی ئەکەوێ، هەرچەند پێچەوانەی ئارەزووی کابرا بێ وە ئەگەر قسەی کرد لەگەڵ ژنێکدا کە نەیزانی ژنی خۆیەتی، بەوڕەنگە کە نەیئەناسی، یاخود لە تاریکیدا بوو و پێی‌وت: تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ و نەزانینو نەناسینی کابرا، یاگومانی بێگانەیی پێ‌بردنی، کەڵکی نییە بۆ نەکەوتنی تەڵاقەکە.

**بزانن!** تەعلیقکردنی تەڵاق، چ لە مەیدانی سوێندو چ لە مەیدانی تەعلیقکردن بە سیفەتی رووتا، بە وەکیل ناکرێ؛ یەعنی وەکیلی تەڵاق هەر حەقی تەنجیزی هەیەو حەقی تەعلیقی نییە.

**بزانن!** ئەوەی کە «تُحفه» فەرموویەتی کەوا: سوێند بە تەڵاق ناخورێ، جیایە لە تەعلیقی تەڵاق کە لە مەقامی هاندانو رێگەنەداندا بێ، هەرچەند ناویشی سوێندە، چونکە قسەکەی «تُحفه» لەسەر ئەوەیە کابرا بڵێت: بە تەڵاق یا بە سوێند ئەو شتە ناکەم وە ئەم سوێندە ئەوەیە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ ئەو شتە ناکەم ـ مەسەلا ـ وە ئەمە دێتەوە سەر تەعلیقکردنی تەڵاق بە کردنی شتێ، بەڵام لە مەقامی مەنعکردنی نەفسدا یا لە هاندان بۆ کردن یا نەکردنی شتەکەدا.

**بزانن!** فەرقی سوێند بە تەڵاق لە سوێند بە زات و سیفاتی خوا، ئەوەیە لە مەیدانی سوێند بە تەڵاقدا، مەعنای زوبان (لُغَة) پێش مەعنای عورف و عادەتی ئەخرێ و لە سوێندی عادەتیدا، مەعنای عورف و عادەتی پێش مەعنای زوبان ئەخرێ و هەردوولا، هاوبەشن لەوەدا کە ئەگەر شەرع لەو مەقامەدا عورفێکی هەبوو، مەعنای شەرعی ئیعتیبار ئەکرێ وە ئەگەر مەعنای عورفی باو بوو لە هەردووکیانا، هەر مەعنا عورفییەکە ئەگیرێ؛ هەروەهایە «مَجازی راجح»یش، ئەگەر مەعنای «حَقیقی» پشتگوێ خرابوو بەتەواوی، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ، یا قەسەم بەخوا ئەو هەنارە ئەخۆم، ئێستە لێرەدا مەعنای هەنار بە دەنکەکانی لێ ئەدرێتەوە نەك بە توێکڵەکەی وگۆشتەکەی.

## باسی گێڕانەوە (رجعە)

«رِجعه» لە شەرعدا، بریتییە لە هێنانەوەی ژنی تەڵاقدراو بۆ ژێر عیسمەت بە بێ عەقدی تازە بەو شەرتانە کە باس ئەکرێن. ئەرکانی «رجعە»، سیانە: پیاوەکە ژنەکە ئەگێڕێتەوە بۆ ژێر عیسمەتی خۆی و پێی ئەڵێن: «مُرتَجِع» و ژنەکە و سیغەی گێڕانەوەکە.

شەرتی پیاوەکە، ئەوەیە تێکڕا لایق بێ بۆ ژن مارەبڕین؛ کەواتە، «رجعە» دروست نییە لەلایەنی مناڵ و شێتو زۆر لێ کراوو پاشگەز بووەوە (مُرتدّ)ەوە، بەڵام دروستە لە

سەرخۆشی تاوانبارەوە مادام هۆشی بەخۆیەوە بێ وە لە پیاوێکەوە کە لە ئیحرامی حەجدا بێ ـ با ژنەکەیش هەر لە ئیحرامدا بێ ـ چونکە مەبەست لە «رجعه» هەر بۆ چوونەلا نییە، بەڵکوو بۆ ئولفەت و لەزەت لێوەرگرتنی حەڵاڵ و ئیش و کاری ناوماڵ و شتی وایشە.

ئەگەر کەسێك ژنەکەی خۆی تەڵاقدا، پاشان شێت بوو، وەلی‌ئەمرەکەی ئەتوانێ ئەو ژنەی بۆ «رجعه» بکاتەوە، مادام بتوانێ لەوکاتەدا ژنی بۆ بێنێ، بینا لەسەر ئەوە کە وەکیل‌گرتن لە «رجعه»دا دروستە، یەعنی هەرشتێ دروست بێ وەکیلی بۆ بگیرێ، دروستە لەکاتی ناچاریدا وەلی‌ئەمری ئەوکەسەیش جێ‌بەجێی بکا. شەرتی ژنەکەیش، ئەوەیە تەڵاقدراو بێ بە بێ‌عیوەز و مێردەکەی چووبێتە لای، هەرچەند لەبەر قووڵی کچێتییەکەی لانەچووبێ، یا لەپاشەوە چووبێتەلای؛ هەروەها ژنێکیش ئاوی «بەحورمەتی» مێردەکەی کردبێتە خۆیەوە لەپێشەوە یا لەپاشەوە، مەبەست لە ئاوی بەحورمەت ئاوێکە بە حەرامی دەرنەچووبێ نە بە باوەڕی کابراو نە لە راستی «نَفسُ‌الأمر»دا؛ شەرتیشە ژمارەی تەڵاقی تەواو نەبووبێ و ماوەی «عِدّە»ی تەواو نەبووبێ و دیاری (مُعیَّنه)یش بێ‌و قابیلی حەڵاڵ بوونیش بێ.

کەواتە، ژنێ کە نیکاحی هەڵوەشێنرابێتەوە، یا لەپێش چوونەلادا تەڵاق درابێ، یاخود بە عیوەز تەڵاق درابێ، ئەمانە پێویستە سەرلەنوێ مارە ببڕێنەوە؛ هەروەها، ژنێ کە بە سێ تەڵاقە تەڵاق درابێ، ئەبێ شوو بکا بە کابرایەکی‌تر، ئەوسا پاش مردنی ئەوکەسە، یا پاش تەڵاقدرانی، مارە بکرێتەوە لەم مێردەی وە دروست نییە گێڕانەوەی ژنی نادیاری، وەکوو ئەوە یەکێ لە ژنەکانی تەڵاقی کەوتبێ، ئەمیش بڵێ: هەرکامیان تەڵاقی کەوتووە، وا هێنامەوە ژێر نیکاحی خۆم، بەڵکوو یا ئەبێ بڵێت: وا ئەم دوو ژنەم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم، یاخود بە ناوی خۆیانەوە ناویان بیات؛ مەسەلا، بڵێت: «عەینا»م هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم‌و «مینا»م هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم، ئەوکاتە دروستەو هەرکامیان تەڵاقی کەوتبێ لە واقیع و راستیدا، ئەبێتەوە بە ژنی کابرا.

دروست نییە گێڕانەوەی تەڵاقدراوێك کە «عِدّە»ی تەواو بووبێ، یا لەگەڵ تەواوبوونی «عدّة»کەیدا، بەڵکوو پێویستە بە عەقدێکی تازە عەقدی بکاتەوە؛ هەروەها،

دروست نییە گێڕانەوەی ژنێکی تەڵاقدراو کە پاشگەز بووبێتەوە لە ئـاینی ئـیسلام، بەڵکوو ئەبێ کابرا چاوەڕوانی ئەوە بێ ئەگەر لە «عدّة»دا موسوڵمـان بـووەوە، ئـەوە بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی وە ئەگەر لەپاش «عدّة» موسوڵمان بووەوە، پێویستە بە عەقدێکی تازە مارەیبکاتەوە.

بزانن! کاتێ کە کابرا بە شوبهە چووە لای ژنی تـەڵاقدراوی «رجـعي»ی خـۆی لەماوەی «عدّة»دا و ژنەکە سکی پڕ بوو، ئەوە تـا سکـەکـەی لێئـەبێتـەوە دروسـتە بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی وە ئەگەر کەسێکی تر بچێتە لایو سکی پڕ ببێ، ئەوە لە ماوەی دووگیانییەکەیداو پاش دانانی سکەکەیشی تا «عدّة»ی تەڵاقەکە تەواو ئەبێ، گێڕانەوەی دروستە؛ هەروەها، ئەگەر بێگانەیەك بچێتەلای بە شوبهە ئەوسا خاوەنەکەی تەڵاقی بدا، یا پاش تەڵاقدان ئەو کەسە بچێتە لایو سکی پڕ ببێ، ئەوە تا سکەکەی دائەنێو پاش ئەوەیش تا «عدّة»ی تەڵاقی کابرا تەواو ئەبێ، حەقی گێڕانەوەی هەیە.

بەڵێ، تەڵاقدراوی «رجعي» ئەگەر مێردەکەی لەگەڵیا بێ، ئەوە هەرگیز «عـدّة»ی تەواو نابێ، لەگەڵ ئەوەشدا تا ماوەی «عدّة»ی عادەتی، کابرا حەقی گێڕانەوەی هەیە؛ هەروەها، ئەگەر خاوەنەکەی لە ماوەی «عدّة»دا بچێتە لایو سکی پڕ نەبێ، ئەوە ئەبێ دەس بکا بە «عدّة»یەکی تازەو پاشماوەی «عدّة»ی پێشوویش ئەکـەوێتـە نـاو ئـەم «عدّة»یەوە، هەرچەند لە ماوەی «عدّة»ی یەکەمدا حەقی گێڕانەوەی هەیە.

## سیغەی گێڕانەوە (رجعە)

سیغەی گێڕانەوە، لەفزێکە مەعنای ئەوە بگەیەنێ کە کابرا ژنـە تـەڵاقدراوەکـەی بێنێتەوە ژێر عیسمەتی خۆی و بۆ ئەمە چەند شەرتێك هەیە:

شەرتی یەکەم و دووهەم، ئەوەیە بە تەعلیق و تەوقیت نەبێ، یەعنی هێنانەوەکەی نەبەستێ بە شتێك یا وەختێکەوە؛ کەواتە، ئەگەر وتی: هـەرکاتێ نـزیك بـوویتەوە لە تەواوبوونی «عدّة»، تۆم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم، ئەوە بەتاڵە، هەروەها ئەگەر بڵێت: تۆم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم تا ساڵێ یا دە ساڵ؛ بەڵێ، دروستە وەخت بۆ دانان بە

ماوەی ژیانەوە، چونکە لە مەعنادا وەکوو وتنی شتێکی واجب وایە، وەکوو لە "حاشیەی جەمەل"دا ئەیفەرموێت.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە سیغەکە بەبەستێ بە ناو یا بە «زەمیر» یا بە ئیشارەوە بۆلای ژنەکەی، وەکوو ئەوەکە بڵێت: مینام هێنایەوە بۆ ژێر عیسمەتی خۆم، لەکاتی ئیشارەتدا بۆلای ژنەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر یەکێ ناوی ژنەکەی برد لە پرسیارێکا؛ مەسەلا، وتی: مینای ژنت هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆت؟ ئەویش وتی: بەڵێ، ئەمە هیچی ناوێ، لەبەر ئەوەکە پرسیارەکەی ئەو دائەنیشێ لەجێی ناوبردنی ئەم کابرادا بۆ ژنەکەی.

سیغەی گێڕانەوە، ئاشکراو بێ‌پێچ‌وپەنای هەیە، وەکوو ئەوەکە کابرا بڵێ: وا فڵانم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم، یا: گێڕامەوە بۆ نیکاحی خۆم، یا: رامگرتەوە لای خۆم وە «کِنایە»شی هەیە، وەکوو ئەوەکە بڵێت: وا هاورێیەتی فڵانکەسم پەسەند کرد، یا: گێڕانەوەیم پەسەند کرد. لە گێڕانەوەدا شەرت نییە پیاوەکە «ئیزافە» بکا بۆلای خۆی؛ هەروەها، شەرت نییە ژنەکە یا خاوەن کارەکەی رازی بن؛ شەرتیش نییە شاهید لەویادا حازر بێ، بەڵکوو ئەمانە هەموو سوننەتن.

هەروەکوو چۆن دروستە پیاو خۆی ژنەکەی بگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، دروستیشە وەکیل بگرێ ژنەکەی بۆ بگێڕێتەوە ژێر نیکاحی، وەکوو شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی. ئیشارەتی ئینسانی لاڵیش، وەکوو قسەی زمان‌ساغ وایە، جا ئەگەر هەموو کەس لێی حاڵی ئەبوو، ئەوە سەریحە، ئەگینا کینایەیەو پێویستە بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو کابرا لاڵە نیازی گێڕانەوەی ژنەکەیە بۆ ژێر نیکاحی خۆی.

گێڕانەوەی ژن بۆ ژێر نیکاح، نایەتەدی بە کردەوە، وەکوو چوونەلاو ماچ‌کردنو هەر کردارێکی تر کە پیاو لەگەڵ ژندا ئەیکا؛ بەڵێ، بە ئیشارەتی زماندار ئەکرێ، لە حاڵی ناچاریدا و بە نووسینی زمانداریش ئەبێ لەبەر ئەوەکە نووسین لە عورفی خەڵکدا ئیعتیباری هەیە، بەڵام ئەو نووسینە کینایەیە و پێویستە لەپاڵ نووسینەکەدا بنووسێ کە مەبەستی لەو نووسینە هێنانەوەی ژنەکەیە بۆ ژێر عیسمەتی خۆی، یا بە زوبان لەوکاتەدا بڵێت: مەبەستی لەو نووسینە گێڕانەوەی ژنەکەیە بەڕاستی بۆ ژێر نیکاحی خۆی.

**بزانن!** حەرامە لەزەت وەرگرتنی پیاوی تەڵاقدەر لە ژنی تەلاقدارو بە تەڵاقی «رجعي»، هەتا بە تەماشاکردن و بە تەنها لەگەڵیا دانیشتن‌و ماچکردن‌و بە چوونەلای، بە «طَريق الأَولىٰ»، بەڵام ئەگەر چووە لای‌و لەو باوەڕەیشدا بوو کە ئەو چوونەلایە حەرامە، ئەوە حەددی لێنادرێ لەبەر شوبهە، چونکە هەندێ لە ئیمامەکان چوونەلای ژنی تەڵاقدراوی «رجعي»یان بە گێڕانەوە داناوە، هەروەها لۆمەو سەرزەنشت (تَعزير)یش ناکرێ لەسەر هیچ جۆرە لەزەت لێوەرگرتنێك، تەنها لەکاتێکا نەبێ کە باوەڕی وابێ ئەو لەزەت وەرگرتنە حەرامە، ئەوسا لۆمەو سەرزەنشتی ئەکرێ؛ بەڵام ئەگەر چووە لای، واجب ئەبێ لەسەری «مَهرالمثل» بدا بە ژنەکە، خواه بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی یا نە.

وە ئەگەر کابرا چووە لای ژنەکەی، ئەوە ئەگەر بەو چوونەلایە سکی پڕ بوو، «عِدّە»ی ئەچێتە سەر جیابوونەوەی سکەکەی لێی و تا سکەکەی لێ ئەبێتەوە، ئەتوانێ بیهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، وەکوو وتمان. وە «ایلاء» و «ظِهار» و «لِعان» لەگەڵ ژنی تەڵاقدراوی «رجعي»دا دائەمەرزێ؛ هەروەها، تەڵاقیشی پێوە ئەلکێ، خواه بەخۆڕایی بێ یا بە عیوەز بەشێوەی خولعکردن وە ئەگەر پیاوو ژنەکە یەکێکیان لەماوەی «عدّة»ی تەڵاقە «رجعي»یەکەدا مرد، ئەوە میرات لە یەك ئەبەن.

ئەگەر ژنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی «رجعي» ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»ی کرد لەپێش ئەوەداکە مومکین بێ «عدّة»کە بەسەرچووبێ، ئەوە ئیددیعاکەی قەبووڵ ناکرێ تا ئەوکاتەی کە مومکین ئەبێ عیددەکەی بەسەر چووبێ هەرچەند ژنەکە بەردەوام بێ لەسەر ئیددیعاکەی خۆی. وە ئەگەر لەپاش ئەوەکە مومکین بێ «عدّة»کە بەسەرچووبێ ئیددیعای بەسەرچوونی «عدّة»کەی کرد و باڵغ و عاقڵیش بوو، ئەوە ئەگەر «عدّة»ی بە مانگ بوو لەبەر ئەوەکە هێشتا حەیزی پیا نەهاتبوو، یاخود گەیشتبووە کاتی نائومێد بوون لە حەیز و کابرا ئینکاری نەکرد، ئەوە دیارە وە ئەگەر ئینکاری کردو ژنەکە شاهیدی هەبوو، ئەوەیش ئاشکرایە وە ئەگەر شاهیدی نەبو ئەوە باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ لەسەر تەواونەبوونی ماوەی «عدّة»کەی، چونکە ئەم جیاوازییە ئەگەڕێتەوە سەر

جیاوازی لەکاتی تەڵاقدانا و مادام کابرا لە ئەسڵی تەڵاقدانەکەدا باوەڕی پێ ئەکرێ، لە وەختەکەیشیا هەر باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند.

بەڵێ، لە غەیری قسە یەكنەکەوتن لەم بەسەرچوونی «عدّة»یەدا، ئەگەر کابرا وتی: لە مانگی رەمەزاندا تەڵاقم داوی‌و ژنەکە وتی: لە شەشەڵانا تەڵاقت داوم‌و نەفەقەی ئەو ماوەیەم لەسەرتە، ئەوە باوەڕ بە ژنەکە ئەکرێ بە نیسبەت دامەزرانی نەفەقەی ئەو ماوەیەوە بۆی، چونکە لەلایەکەوە، زەرەری لەخۆی داوە کە قەبووڵی درێژیی زەمانی «عدّة»ی کردووە و لە لایەکی تریشەوە، مادام ئەم ژنە ژنی کابرا بووەو نەفەقەی سابت بووە لەسەری، ئەسڵ ئەوەیە نەفەقەکەی بەردەوام بێ تا بە رۆشنی مانیعێك پەیدا ئەبێ لە بەردەوامی ئەو نەفەقەیە.

وەکابرا باوەڕی پێ ئەکرێ نیسبەت بە وەزعی خۆی، وەکوو ئەوە پاش تەواوبوونی ماوەی «عدّة»ی ژنەکە لەسەر ئیدیعای کابرا، ئەو کابرا ئەتوانێ خوشکی ئەو ژنە مارە بکا، یا ئەگەر سێ ژنی تری بوو، ئەتوانێ ژنێکی چوارەمیش مارە بکا.

ئەگەر مێردی ژنی تەڵاقدراو بە «رجعي» مرد و ژنەکە ئیددیعای کرد کە لەکاتی ژیانی کابرادا «عدّة»ی تەواو بووە بۆ ئەوە لەو «عدّة»ی تەڵاقەوە نەگوێزێتەوە بۆ «عدّة»ی وەفات، ئەوە نیسبەت بەم‌وەزعە قەبووڵ ناکرێ‌و پێویستە «عدّة»ی وەفات تەواو بکا، بەڵام قەبووڵ ئەکرێ نیسبەت بە وەرگرتنی میرات لە ماڵی کابرا، چونکە ئەم سوورەتە زەرەرە بۆی.

بەڵام ئەگەر ژنەکە تەڵاقدراوی «بائن» بوو، ئەوە لە دەعوای تەواوبوونی «عدّة»کەیدا لە ژیانی کابرادا باوەڕی پێ ئەکرێ، چونکە نە میراتبەرەو نە «عدّة»کەیشی ئەگۆڕێ بۆ «عدّة»ی وەفات.

ئەگەر تەڵاقدراوە «رجعي»یەکە مردو میراتبەرەکەی ئیددیعای کرد کە لە ژیانی خۆیدا «عدّة»ی تەواو بووە و مێردەکەیشی وتی: «عدّة»ی تەواو نەبووبوو، ئەوە مێردەکەی باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند لە «عدّة»یەکدا کە بە سێ مانگ بێ و میراتبەری ژنەکە باوەڕی پێ ئەکرێ لە «عدّة»ی غەیری مانگدا، وەکوو شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی.

ئەگەر ژنەکە ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»ی کرد بەوە کە سکەکەی لێ بووەتەوەو ماوەکەیش بەشی ئەوەی ئەکرد کە سکەکەی تیا لێ جیا ببێتەوەو، ژنەکەش لەوانە بێ کە حەیزی پیا بێتو نەگەیشتبێتە تەمەنی نائومێدی، ئەوە ژنەکە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند نیسبەت بە تەواوبوونی «عدّة»، بەڵام ژنێ کە نائومێد بووبێ لە حەیز یا بچووك بێو نەگەیشتبێتە تەمەنی حەیز پیا هاتن، ئەوانە هەر سك ناکەن؛ کەواتە، باوەڕ بە کابرا ئەکرێ؛ هەروەها، ژنێکیش کە حەیزی پیا نەهاتبێ ئەوە هەرچەند مومکینیش بێ سك بکا، لەکاتی یەكنەکەوتنی قسەیدا لەگەڵ قسەی مێردەکەی لەبارەی «عدّة»ی منداڵ بوونەوە، باوەڕ بە قسەی مێردەکەی ئەکرێ.

جا ئەگەر ژن ئیددیعای دانانی سکی بەتەواوی کرد، ئەوە کەمترین ماوەیەك کە بگونجێ سکەکەی لێ جیاببێتەوە تیایا، شەش مانگ و دوو چاو ترووکاندنە لەوکاتەوە کە قابیل بێ لەگەڵ پیاوەکەدا یەکی گرتبێ لەپاش مارەبڕینیەوە و ئەو ماوەیە، چاو ترووکاندنێکی بۆ گرتنی ژنەکەو چاو ترووکاندنێکی بۆ دانانی منداڵەکەیە، شەش مانگەکەشی بۆ ئەسڵی منداڵەکەیە کە پێی بگا.

وە ئەگەر ئیددیعای دانانی پارچە گۆشتێکی کرد کە وێنەی هیچی نەگرتبوو، ئەوە کەمترین ماوەی هەشتا رۆژو دوو چاو تروکاندنە و لەمحاڵەدا پێویستە مامان شەهادەت بدا بەوە کە ئەو پارچە گۆشتە بنیادەمە؛ جا بۆ شەهادەت لای قازی پێویستە چوار مامان بن، یا دوو پیاو، یا پیاوێك و دوو ژن بن، بەڵام بۆ قەناعەتی ژنەکە، بە یەك ژنی مامان قەناعەت ئەکرێ.

وە ئەگەر ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»ی بە حەیزو پاکی کرد، ئەوە ئەگەر لە پاکیدا تەڵاق درابوو و لەپێش ئەو پاکییەدا حەیزی پیا هاتبوو، ماوەی لای کەمی سیو دوو رۆژو دوو چاو ترووکاندنە؛ مەسەلا، ئەڵێن: لەپێش ماوەی چاوترووکاندنێك لە پاکی تەڵاق دراوە، ئەمجار شەوو رۆژێك بۆ حەیز، ئەمجار پانزە شەوو رۆژ بۆ پاکی دووەم، ئەمجار شەوو رۆژێ بۆ حەیز، ئەمجار پانزە شەوو رۆژ بۆ پاکی سێهەم، ئەمجار ماوەی چاوتروکاندنی دووهەم بۆ حەیز تا مەعلووم ببێ کە پاکییەکە تەواو بووە و لەم چاو تروکاندنەدا، گەڕانەوە دروست نییە وە بەس بۆ تەواوبوونی پاکی سێهەم ئیعتیبار ئەکرێ.

وە ئەگەر لەمەوبەر حەیزی نەبووبوو، ئەوە لای کەمی ماوەی «عِدّة»کەی بریتییە لە چل و هەشت رۆژو یەك چاوترووکاندن، چونکە لەم سوورەتەدا پێویستە بە حەیزێ لە شەوو رۆژێکا بۆ ئەوەکە ئیعتیبار بکرێ بە پاکی ژنەکەو لە «عِدّة» بژمێررێ، لەبەر ئەوە کە لای شافعی -خوای لێ رازی بێ- «قُرء»، بریتییە لە پاکییەك کە لە هەردوولایەوە حەیز هەبێ وە پاش ئەو حەیزە پانزە شەوو رۆژ بۆ پاکی یەکەم، ئەمجار شەوو رۆژێ بۆ حەیز، ئەمجار پانزە شەوو رۆژ بۆ پاکی دووهەم، ئەمجار شەوو رۆژێ بۆ حەیز، جا پانزە شەوو رۆژ بۆ پاکی سێهەم، ئەمە چل و هەشت رۆژ، جا ئەوەندەی چاو ترووکاندنێکیش پێویستە بۆ حەیزی پاش ئەو پاکی سێهەمە، بۆ ئەوە کە بزانین ئەو پاکییە تەواو بووە.

وە ئەگەر لە حەیزدا تەڵاق درابوو، ئەوە کەمترین ماوەی توانای تەواوبوونی ئەو «عِدّة»یە چل و حەوت رۆژو یەك چاوترووکاندنە، بەم ڕەنگە لە دواتاوی حەیزدا تەڵاق درابێ؛ دەی سێ پاکی بە چل و پێنج رۆژو دوو حەیز لەبەینا، ئەمە چل و حەوت رۆژ وە ئەوەندەی چاوترووکاندنێکیش پاش پاکی سێهەم و لەم چاوترووکاندنەیشا گێڕانەوەی ژنەکە دروست نییە، وەکوو ووتمان.

هەرکاتێ ژنەکە ئیدیعای حەیزی کرد، باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، خواه یەکەم جاری بێ، یا خاوەن عادەت بێ و لەم سوورەتی دووهەمەدا، لەسەر عادەتی زووی بڕوا یا بەپێچەوانەی ئەو عادەتەی بڕوا؛ جا ئەگەر کابرا باوەڕی نەکرد، ئەتوانێ سوێندی ژنەکە بدا، ئەگەر سوێندی خوارد باشە وە ئەگەر نکوولی کرد، کابرا سوێند ئەخواو ئەیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی.

شێخی «ابن حجر» ئەفەرموێت: «شَیْخَیْن» گێڕاویانەتەوە لە «رَویـانی»یـەوە کـەوا هەرکاتێ ژن ئیدیعای حەیزی کرد، واجبە پرسیاری لێ بکرێ لە وەزعی حەیزو پاکییەکانی وە ئەگەر گومانی درۆی پێ ئەبرا، واجبە سوێند بدرێ لەبەر ئەوە کە درۆو دەلەسەو بەدخوویی زۆر بووە.

ئەگەر کابرا لەپێش تەواوبوونی «عِدّة»ی ژنەکەدا ئیدیعای گێڕانەوەی ژنەکەی کرد، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بێ سوێند، بەپێی زاهیری فەرموودەی «مِنهاج»، و بە سوێند،

لەسەر فەرموودەی ئیمام و «نهایه» و «مُغنی» و «اسنی»، قسەی ئیمامیان پەسەند کردووە.

وە ئەگەر کابرا لەپاش بەسەرچوونی «عدّة»ی ژنەکە ئیددیعای گێڕانەوەی ژنەکەی کرد لەپێش تەواوبوونی «عدّة»کەدا و ژنەکە ئینکاری کرد، ئەمە ئەگەر هاودەنگ بوون لەسەر کاتی تەواوبوونی «عدّة»کە، وەکوو رۆژی جومعە ـ مەسەلا ـ وە کابرا ئەیوت، لە رۆژی پێنج‌شەممەدا گێڕاومەتەوە و ژنەکە ئەیوت: لە رۆژی شەممەدا، ئەوە ژنەکە سوێند ئەدرێ وە ئەگەر تەنها لەسەر کاتی گێڕانەوەکە هاودەنگ بوون و ژنەکە ئەیوت: لەپێشا «عدّة»م بەسەر چووەو کابرا ئەیوت: لەپاش ئەو کاتە بووە، ئەوە کابرا سوێند ئەدرێ.

وە ئەگەر هەر هەرایان لە پێشکەوتنی تەواوبوونی «عدّة»دا بوو لەسەر گێڕانەوە، بەبێ‌ئەوەی رێکەون لەسەر یەکێ لە کاتی تەواوبوونی «عدّة»و گێڕانەوە، ئەوە هەرکامیان پێش‌کەوتن لە ئیددیعای خۆیاندا، ئەویانە باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێند، یەعنی ئەگەر ژنەکە لەپێش کابرادا هات ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»کەی کرد و پاش ئەوکابرا هات ئیددیعای گێڕانەوەی ژنەکەی کرد، ئەوە باوەڕ بە ژنەکە ئەکرێ بە سوێند وە ئەگەر کابرا لەپێشا هات ئیددیعای گێڕانەوەی ژنەکەی کرد، جا پاش ئەو ژنەکە هات ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»ی کرد، ئەوە کابرا باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێندکە ژنەکەی گێڕاوەتەوە لەپێش بەسەرچوونی «عدّة»کەیدا.

وە ئەگەر بەیەکەوە ئیددیعایان کرد، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ژنەکە ئەکرێ وە ئەگەر ئەیانوت: ئاگامان لە پێشکەوتن و پاشکەوتنی هیچ‌کام لەم دوانە نییە ئەوە ئەسڵ مانەوەی ماوەی «عدّة»کەیەو کابرا باوەڕی پێ‌ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر بزانرێ یەکێکیان لەپێشدا بووە، بەڵام نەزانرێ پێشووەکەیان کامیانە، ئەوە کابرا باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێند.

**بزانن!** ئەم تەفسیلی یەکنەکەوتنی قسەی ژن و مێردە لەپاش بەسەرچوونی «عدّة»، بۆ شوێنێکە کە ژنەکە لەپاش ئەو تەڵاقە شووی نەکردبێ بە مێردێکی تر وە ئەگەر پاش شووکردن بوو بە هەرایان، ئەوە ئەگەر کابرا دوو شاهیدی بوو لەسەر گێڕانەوەی ژنەکە

لەپێش تەواوبوونی «عدّة»دا، ئەوە ژنەکە بە ژنی ئەو ئەناسرێ‌و لە شووی دووهەمی ئەسەنرێتەوە وە ئەگەر چووبێتە لای «مَهرالمثل»ی لێ وەرئەگیرێ بـۆی وە ئـەگـەر شاهیدی نەبوو، ئەوە هەر بۆی هەیە ژنەکە سوێند بدا لەسەر ئەوەکە «عدّة»کەی لەپێش گێڕانەوەیدا تەواو بووە؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە باشە وە ئەگەر نکوولی کرد لە سوێندو کابرا سوێندی خوارد لەسەر پێشکەوتنی گێڕانەوە لە بەسەرچوونی «عدّة»، یاخود ژنەکە پێی لێنا بەوەکە گێڕانەوەکە لەپێش تەواوبوونی «عدّة»دا بووە، ئەوە هەر «مَهرالمثل» واجب ئەبێ لەسەر ئەم ژنە بۆ مێردی یەکەم. ئیتر ژنەکە لە مێردی دووهەم ناسەنرێتەوە، لەبەرئەوە بەهۆی ئیزندانی ژنەکـەوە بـە مـارەبڕیـنی بـۆ ئـەم کـابرای دووهەمەو مەیداندانی بۆی کە بچێتە لای، بڕیار دراوە بەوەکە ژنی مێردی دووهەمەو قابیل نییە جیا بکرێنەوە لە یەك؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم ژنە بە بێ‌ئیزن مارە کرابێ لە کابرای دووهەم، یەعنی باوکی مارەی کردبێ‌و خۆیشی مەیدانی کابرای نەدابێ بچێتـە لای، ئەوە ئەم ژنە «مَهرالمثل» نابژێرێ بۆ مێردی یەکەم؛ بە هەرحاڵ، لەو سوورەتەداکە کابرا شاهیدی نەبێ، ئەو ژنەی دەس‌ناکەوێتەوە، بـەڵام جـارێك «مَـهرالمـثل» لە ژنـەکـە وەرئەگرێ‌و جارێکیش وەری‌ناگرێ.

**بێداری!** سوورەتی مارەبڕینی ئەم ژنە بە بێ‌ئیزن بۆ مێردی دووهەم، ئەوەیە ئەو ژنە کە شوویکردووە بە مێردی پێشوو کچ بووەو کابرا نەچووەتە لای، بەڵام ژنەکە ئاوی کابرای هەڵگرتووە، یاخود رۆیشتووەتە لای لەپێشەوە بەڵام کچێتی لانەبردووە، ئەوە لەپاش تەڵاق‌دان بە تەڵاقی «رجعي» هەر حوکمی کچی هەیەو «ولی مجبر» ئەتوانێ بە بێ‌ئیزنی خۆی مارەی بکا.

**بزانن!** شێخ لە «تحفه»دا ئەفەرموێت: مێردی یەکەم حەقی دەعوای نییە لە مێردی دووهەم؛ بەڵێ، خاوەنی «مُغنی» و «نهایه»، ئەفەرموون: حـەقی دەعـوای هـەیە لێی، هەروەکوو حەقی دەعوای هەیە لە ژنەکە وە فەرموویانە: لەم سوورەتەدا ئەتوانێ لەپێشا دەعوا لە ژنەکە بکا یا لە کابرا و پاش بەیانی دەس پـێ کـردن بـە دەعـوا لە ژنـەکـە، ئەفەرموون: وە ئەگەر لەپێشا دەعوای لە مێردی دووهەم کردو ئەویش ئینکاری کرد،

ئەوە ئەم مێردی دووهەمە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند. وە ئەگەر پێی لێنا بۆ مێردی یەکەم، یاخود نکوولی کرد لە سوێندو میردەیەکەمەکە سوێندە ردەکراوەکەی خوارد، ئەوە نیکاحی کابرای دووهەم بەتاڵ ئەبێتەوەو مێردی یەکەمیش نابێ بە خاوەنی ئەم ژنە، تەنها لە حاڵێکا نەبێ کە ئەم ژنە ئیقرار بکا بۆی، یاخود پاش نکوولی ئەم ژنە لە سوێند، ئەو سوێند بخوات کە گێڕانەوەی لەپێش تەواوبونی «عدّة»دا بووەو ئەم ژنە ژنی خۆیەتی وە ئەگەر مێردی یەکەم بوو بە خاوەن ژنەکەو مێردی دووهەمیش چووبووە لای، «مَهرالمثل»ی ئەکەوێتە سەر ئەم مێردە دووهەمە وە ئەگەر نەبوو بە خاوەنی ژنەکە، بەمڕەنگەکە نیکاحی دووهەم بەتاڵ بووەوە، بەڵام ژنەکە پێی لێ نەنا بۆ مێردی یەکەم و سوێندی خوارد، یاخود ژنەکە سوێندی نەخوارد بەڵام کابرای یەکەمیش سوێنە رەدکراوەکەی نەخوارد، ئەوە ژنەکە عەینی مارەیی ناوبراو ئەستێنێ لە کابرای دووهەم، ئەگەر چووبێتە لای و نیوەی لێ ئەسێنێ، ئەگەر نەچووبێتەلای.

بزانن! هەرکاتێ ژنەکە ئینکاری گێڕانەوەی کرد لەپێش تەواوبوونی «عدّة»دا و باوەڕی پێ کراو لەدواییدا لەم ئینکارە پەشیمان بووەوەو پێی لێنا کە گێڕاراوەتەوە لەپێش تەواوبوونی «عدّة»کەیدا، ئەوە ئەم پێ لێنانەی لێ قەبووڵ ئەکرێ و ئەدرێتەوە بە مێردەکەی، مادام شووی نەکردبێ و لەژێر عیسمەتی مێردێکی ترا نەبێ. وێنەی قەبووڵی ئەم پێ لێنانو پەشیمان بوونەوەیە زۆرە؛

یەکەم: ئەوەکە ژنەکە ئیددیعا بکا مێردەکەی سێ تەڵاقەی داوەو لەپاشا، پەشیمان ببێتەوەو بچێتە پاڵ قسەی مێردەکەی کەوا تەڵاقی نەداوە، یاکەمتر لە سێ تەڵاقی داوە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ.

دووەم: ئەوەیە کە پێی لێ بنێ لەگەڵ کەسێکدا شیری یەکتریان خواردووەو لەپاشا پەشیمان ببێتەوەو بڵێ: ئەو شیرخواردنە لە پێنج جار کەمتر بووە، یا لەپاش تەواوبوونی دوو ساڵ بووەو من لەسەر ئەو ئەساسە پێم لێنا بە شیرخواردن وامئەزانی کەمتر لە پێنج جار یا پاش دوو ساڵیش ئەبێ بەهۆی مەحرەمبوونی شیرخواردووەکە، ئەوە ئەم پەشیمانییەی لێ قەبووڵ ئەکرێ.

**سێهەم:** ئەوەیە پیاوێك ژنێك مارە بكا بە ویلایەتی باوكی ژنەكەو شەهادەتی دوو پیاوو ئیزنی ئەو ژنە، كەچی ژنەكە لەپاشا ئینكاری ئەوە بكاكە ئیزنی داوەو ئیزنەكەشی پێویست بێ، جا كابرا لای قازی ئیسپاتی نیكاحەكە بكاو قازی فەرمان بدا كە ژنەكە رێگای مێردەكەی بدا بچێتە لایو ژنەكە فەرمانەكانی قازی جێبەجێ نەكا و لەپاشا بمرێ، ئەوجا ژنەكە پەشیمان ببێتەوەو پێی لێبنێ بەوەكە ئیزنی داوە بۆ عەقدەكە، ئەمە قەبووڵ ئەكرێو ژنەكە بۆی هەیە داوای مارەییو میرات لە ماڵی مێردەكەی بكا.

**چوارەم:** ئەوەیە كابرا بڵێ: ژنەكەم بە یەك تەڵاقی «رجعي» تەڵاق داوەو ژنەكە بڵێ: نەخەیر بە سێ تەڵاقە تەڵاقی داوم و لەدواییدا؛ پەشیمان ببێتەوەو بچێتە پاڵ قسەی مێردەكەیو خۆی بخاتەوە بەدرۆدا، ئەوە لێی قەبووڵ ئەكرێ وە ئەگەر مێردەكەیشی مرد، میراتی لێ وەرئەگرێ.

**پێنجەم:** ئەوەیە كابرا خولع لەگەڵ ژنەكەیدا بكاو ژنەكەی ئیددیعا بكا ئەم خولعە تەڵاقی سێهەم بووە و لەپاشا پەشیمان ببێتەوەو پێی لێ بنێ كە ئەو خولعە تەڵاقی یەكەم یا دووەم بووە، ئەوە قەبووڵ ئەكرێو ئەتوانێ بە بێ‌مارە بەجاش شووی پێ‌بكاتەوە و لەم كاتەدا ژن و مێردایەتی سابت ئەبێو لەپاش مردنی ژنەكە یا مێردەكەی، میرات لە یەك وەرئەگرن.

**شەشەم:** ئەوەیە كابرا ئیددیعا بكا بڵێ: ئەم ژنە ژنی منەو چوومەتەلایو ژنەكەیش ئینكار بكا، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ژنەكە ئەكرێ لەسەر ئەوە كە كابرا نەچووەتەلای، ئیتر حەقی گێڕانەوەی نامێنی و لەم سوورەتەدا، ئەوكەسە چونكە ئیقراری كردووە بەوە كە چووەتە لای ژنەكە، ئیقراری بە مارەیی ژنەكە كردووە؛ جا ئەگەر ژنەكە ئەو مارەییەی وەرگرتبێ، كابرا ناتوانێ لێی بسێنێتەوە وە ئەگەر وەرینەگرتبێ، ژنەكە ناتوانێ داوای زیاتر لە نیوەمارەیی لێ بكا وە ئەگەر نیوەكەی وەرگرتو جا پێی لێنا بەوە كە كابرا چووەتە لای، ناتوانێ نیوەكەی تری لێ وەربگرێ تا كابرا ئیقرارێكی تر نەكا بەوەكە چووەتە لای؛ ئەمە، بۆ مارەییەكەكە قەرز بێ، بەڵام ئەگەر عەین بوو وكابرا لەپاش تەڵاق نیوە عەینەكەی خۆی نەئەبردەوە لەبەر ئەوە كە ئەیوت: چوومەتە لایو

هەمووی ئەکەوێ، ئەوە یا ناچار ئەکرێ بەوەکە ئەو نیوە عەینە وەربگرێتەوە بۆ خۆی، یا ئەبێ نەزری بکا لە ژنەکەی تا بە هەموو ئیحتیمالێك ببێ بە موڵکی ژنەکە.

**بزانن!** ئەگەر ژنی تەڵاقدراو، وتی: «عِدّة»م تەواو نەبووەو دروست نییە مارەم ببڕن و لەپاشا خۆی خستەوە بەدرۆداو وتی: «عِدّة»م بەسەرچووە، ئەوە دروستە دەس‌بەجێ مارە بکرێ بۆ ئەو کەسەی ئەیەوێ بیخوازێ.

## باسی سوێندخواردن لەسەر نەچوونەلای ژن (ایلاء)

«ایلاء» لە شەرعدا، بریتییە لە سوێندخواردنی مێردێکی‌وا کە دروست بێ ژن تەڵاق بدا لەسەر ئەوە کە ناچێتە لای ژنەکەی، هەرگیز یا زیاتر لە چوار مانگ ـ هەرچەند ژنەکەی تەڵاق دراوی «رجعي»، یا «مُتحیِّرە»، یا لە ئیحرامدا بێ ـ وە ئەم سوێندە وەنەبێ هەر سوێند بێ بە زاتی خواو سیفەتەکانی خوا، بەڵکوو ئەگەر تەعلیقی تەڵاقیش بکا بە چوونەلاوە ـ مەسەلا ـ ئەوە هەر بە «ایلاء» دائەنرێ. کەواتە ئەگەر وتی ئەگەر هاتمەلات نەزر بێ لەسەرم نوێژێك بکەم، یا رۆژێك بەڕۆژوو بم، یا حەجی ماڵی خوا بکەم، یا بەندەیەك ئازاد بکەم، هەر بە «مُولي» یەعنی سوێندخۆری نەچوونەلای ژن ئەناسرێ.

ئەگەر پیاوێکی بێگانە سوێند بخوا لە چوونەلای ژنێك، ئەوە هەر سوێندێکی رووتەو «ایلاء» نییە وە ئەگەر پاش ئەو سوێندە ژنەکەیش مارە بکا، هەر نابێ بە «ایلاء» وە ئەگەر سوێندی خوارد لە چوونەلای ژنێك کە بۆ ئەوە نەشێ ئینسان بچێتەلای، وەکوو ئافرەتێك کە پارچە گۆشتێك یا ئێسقانێك بەری فەرجی گرتبێ، ئەوە ئەو «ایلاء»ە دانامەزرێ، لەبەر ئەوەکە ئەو سوێندە قیمەتی نییە، چونکە ئەگەر سوێندیش نەخوا ئەو ژنە قابیلی ئەوە نییە کەس بچێتەلای.

ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: قەسەم بە خوا چوار مانگ نایەمە لات، کە ئەو چوار مانگەیش رۆیشت، قەسەم بە خوا چوار مانگی‌تر نایەمە لات، ئەوە هیچیان نابن بە ئیلاء و بەیەکیشەوە یەك «ایلاء»یان لێ پەیدا نابێ، بەڵام کابرا بە گوناهبار و تاوانبار

دائەنرێ، چونکە دڵی ژنەکەی ئازار داوە وە ئەگەر وتی: قەسەم بە خوا پێنج مانگ نایەمە لات وکە ئەو پێنج مانگەیش رۆیشت، قەسەم بە خوا پێنج مانگی تر نایەمە لات، ئەوە ئەبێ بە دوو ئیلاء و هەرکامیان حوکمی خۆی لەسەر دائەمەزرێ وە ئەگەر تەعلیقی چوونە لای کرد بە شتێکی‌واوە کە جێ‌بەجێ‌بوونی دوور بێ، وەکوو هاتنەخواری "حەزرەتی عیسا" ـعلی نبینا و علیەالسّلام ـ ئەوە بە «ایلاء» ئەژمێررێ، هەرچەند کابرا وابزانێ کە لەپێش ماوەی ئیلاءدا دێتە خوارەوە، هەروەها ئەگەر شکیشی ببێ لە داپەرینیا، بە فەرموودەی راستتر.

«ایلاء»، لەفزی سەریح و کینایەی هەیە؛ لە لەفزە سەریحەکانیەتی: «چوونە لا، (وَطْء)، جیماع، دوخوولی زەکەر، لابردنی کچێتی کچ» وە لەسەر فەرموودەی تازەی ئیمام، «پێوەلکان، سواربوون، داگیرکردن، نزیك‌کەوتنەوە، پێست لە پێست دان»، ئەمانە کینایەن.

ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر وەتئت بکەم، ئەو بەندەمە ئازاد بێ‌و لەپێش تەواوبوونی ماوەکەدا بەندەکەی نەما، ئەوە ئەو «ایلاء»ەیش لا ئەچێ وە ئەگەر وتی ئەگەر وەتئت بکەم، ئەو بەندەمە ئازاد بێ لەجیاتی «ظهار»ەکەم و لەوەوبەر زیهاریشی کردبوو، ئەوە بە ئیلاء دائەنرێ، ئەگینا بە زاهیر حوکم ئەکرێ بە زیهار و بە ئیلاء، وە لە باتیندا نە ئیلاء هەیەو نە زیهار.

ئەگەر وتی: ئەگەر وەتئت بکەم، ئەو بەندەمە ئازاد بێ لەجیاتی «ظهار» ئەگەر زیهارم کرد، ئەوە بە ئیلاء ناژمێررێ تا زیهارەکە ئەکا، بەڵام کاتێ کە زیهارەکەی کرد، ئەم سوێندەیش ئەبێ بە ئیلاء.

ئەگەر وتی بە ژنەکەی: ئەگەر وەتئت بکەم هەوێکەت تەڵاقی کەوتبێ، ئەوە ئیلایە؛ جا ئەگەر وەتئی ئەم ژنەی کرد، ئەوە تەڵاقی هەوێی ژنەکە ئەکەوێ‌و ئیلاکەیش ئەکرێتەوەو نامێنێ؛ فەرموودەی دیارتر ئەوەیە ئەگەر بەجارێ وتی بە هەر چوار ژنەکەی: وەڵڵاهی جیماعتان لەگەڵ ناکەم، ئەوە ئێستە ئیلاء نییە تا جیماع ئەکا لەگەڵ سێ لەو ژنانە، ئەوسا بەرابەر بە چوارەم «ئیلاء» دێتەجێ، لەبەر ئەوە لەم سوورەتەدا

سوێند لەسەرخوراو بریتییە لە وەتئی هەموویان نەك یەکەیەکەیان؛ کەواتە، ئەگەر هەندێ لەو ژنانە مردن، ئەم «ئیلاء»یە بەتاڵ ئەبێتەوە وە ئەگەر وتی: جیماع لەگەڵ هیچتان ناکەم، ئەوە بەرابەر بە هەر یەکێکیان ئیلاء دێتەجێ وە ئەگەر وتی بە ژنەکەی: وەڵڵاهی جیماعت لەگەڵ ناکەم لە ساڵێکدا، تەنها یەکجار نەبێ، ئەوە ئێستە ئیلاء نایەتەجێ تا جارێك جیماعی لەگەڵ ئەکا، جاکە جیماعی لەگەڵ کرد، ئەگەر لەو ساڵە ماوەی چوار مانگ یاکەمتر لە چوار مانگ مابوو، ئەوە ئیلاء نامێنێ وە ئەگەر زیاتر لە چوار مانگ مابووەوە، ئەوە ئیلاء دێتەجێ.

## باسی مۆڵەتدانی کابراکە «ئیلاء»ی کردووە

ئەم کەسەکە ئیلائی کردووە، ئەگەر ئیلائەکەی لەگەڵ ژنێکاکردبێ کە لەژێر نیکاحیا بێ، ئەوە لە سەرەتای ئیلائەکەیەوە چوار مانگ مۆڵەت ئەدرێ وە ئەگەر لەگەڵ ژنی تەڵاق دراوی «رجعي»داکردبێتی، ئەوە لەوکاتەوەکە ژنەکەی گێڕاوەتەوە ژێر نیکاحی خۆی، چوار مانگ مۆڵەت ئەدرێ؛ جا لەپاش ماوەی چوار مانگەکە، ژنەکەی ئەتوانێ شکاتی لێ بکا لە دادگای شەرعدا، کە شکاتی کرد قازی کابرا بانگ ئەکا، ئەگەر ئیقراری کرد بە سوێندەکەی خۆی، یاخود بە شاهید لەسەری ئیسپات بوو، ئەوە قازی فەرمانی پێئەدا یا بێتەوە بۆلای ژنەکەی بە ئوسووڵی عادەتی، یا تەڵاقی بدا؛ ئەگەر قەبووڵی یەکێ لەمانەی کرد، ئەوە باشە وە ئەگەر هیچیەکێ لەمانەی نەکرد، ئەمجار لەسەر داواکردنی ژنەکە واجبە قازی یەك تەڵاقی ئەو ژنە بداو بڵێ: وا ئەم ژنەم تەڵاقدا لەجیاتی مێردەکەی بە یەك تەڵاق وە ئەو تەڵاقەی ئەکەوێ، هەرچەند ژنەکە پێی بائینە بێتەوە، لەبەر ئەوەکە تا ئێستا کابرا نەچووەتە لای، یاخود ئاخرتەڵاق بێ، بەو رەنگە زووتر دوو تەڵاقی کەوتبێ.

وە ئەگەر یەکێك لە ژن و پیاوەکە لە دین هەڵگەڕایەوە لەپاش چوونەلا لە ماوەی ئیلاکەدا، ئەوە ماوەکە ئەپچڕێ و هەروەختێ موسوڵمان بووەوە، ماوەکە دەس پێئەکاتەوە لە سەرەتاوە وە هەر شتێ کە مەنعی وەتء بکاو زیان بە نیکاح نەگەیەنێ،

وەکوو پاشگەز (مُرتَد) بوونەوە، ئەگەر لە کابرادا بێتەجێ، ئەوە مەنعی حیسابکردنی «مُدّە» ناکا، وەکوو رۆژوو، وە ئیحرامو نەخۆشیو شێتی وە ئەگەر لە ژنەکەدا بێتەجێو ئەو مانیعە «حِسّی» بێ، وەکوو منداڵیو نەخۆشی، ئەوە ئەبێ بە مانیع لە ژماردنی موددەکە وە ئەگەر لەناو موددەکەدا بێ، موددەکە ئەبڕێ، جا ئەگەر ئەو مانیعە نەما، ئەوە حیسابی موددە دەس پێ ئەکاتەوە وە ئەگەر مانیعەکە شەرعی بێو شتەکە فەرز بێ، وەکوو حەج و رۆژوو نوێژی فەرز، ئەوە مەنعی موددەکە ئەکا وە ئەگەر سوننەت بێ، مەنعی ناکا.

جا ئەگەر کابرا لە ماوەی مۆڵەتەکەدا وەتئی ژنەکەی کرد، ئەوە سوێندەکەی ئەکرێتەوەو «ئیلا» کە ئەفەوتێ وە ئەگەر سوێندی بە خواو سیفاتی خوا خواردبێ، کەفارەتی سوێندی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر سوێندەکەی تەعلیقی تەڵاق بووبێ بە وەتئەوە، تەڵاقەکە ئەکەوێ وە ئەگەر تەعلیقی تەڵاق بووبێ بە لەئەستۆگرتنی چاکەیەکەوە، وەکوو رۆژوو ـ مەسەلا ـ ئەوە کابرا بە ئارەزووی خۆیەتی، یا ئەو ئیشە بکاکە لەئەستۆی گرتووە یاکەفارەتی سوێندێك بدا وە ئەگەر وەتئی نەکرد، ئەوە لەپاش تەواوبوونی چوار مانگەکە ژنەکە ئەتوانێ داوای گەڕانەوە بۆلای، یاخود تەڵاقدانی لێبکا وە ئەگەر ماوەیەك دەسبەرداری حەقەکەی بوو، ئەتوانێ لەپاشا داوای بکاتەوە؛ گەڕانەوەی کابرایش دێتەجێ بەوە کە بچێتە لای ژنەکە لەپێشەوە بەئەندازەی سەری زەکەری و مادام وەتئی کرد، ئەوە ئیتر مەجالی داواکردنی ژنەکە نامێنێ هەرچەند ئەو وەتئەیش حەرام بێ، وەکوو چوونەلا لە ئیحرامدا یا لە حەیزو زەیسانی ژنەکەدا.

وە ئەگەر کابرا لەپاش موددەتی مۆڵەتەکە مانیعێکی شەرعی پێوەبوو، وەکوو ئیحرام، ژنەکە هەر ئەتوانێ داوای تەڵاقی لێ بکا وە ئەگەر مانیعێکی «حِسّی» پێوە بوو، وەکوو نەخۆشی، داوای ئەوەی لێ ئەکرێ بڵێ: هەرکاتێ توانیم بێمەلات، ئەگەڕێمەوە بۆلات؛ بەڵێ، ئەگەر ژنەکە مانیعی وەتئی پێوە پەیدا بوو، ئەوە ناتوانێ داوای تەڵاق یا وەتئی لێ بکا تا ئەو مانیعە لائەچێ.

## باسی «ظِهار»

«ظِهار» لەشەرعدا، بریتییە لەوە مێردێك ژنەکەی بشوبهێنێ بە ژنێکی مەحرەمی، ئەم وەزعە پێی ئەوترێ زیهار، و ئەم ناوە لەوەوە هاتووەکە سوورەتە ئەسڵییەکە وابووە کابرا ژنەکەی بشوبهێنێ بە پشتی دایکیو بڵێ: «تۆ بۆ من وەکوو پشتی دایکم وای»، واتە هەروەك چۆن حەرامە بۆم سواری پشتی دایکی خۆم ببم، حەرامیشە بۆم سواری پشتی تۆ ببم، ئیتر لەمەوە بە هەموو سوورەتەکانی تریش وتراوە «ظهار». ئەم زیهارە، لە سەردەمی نەزانی (پێش هاتنی ئایینی ئیسلام)دا لەجێی تەڵاق بووە، بەڵام ئایینی ئیسلام گۆڕیویەو کردوویەتی بە مایەی حەرامبوونی ئافرەت و کەفارەتێکی لەسەر واجب کردووە، بۆ ئەوەی خەڵك بە دەمیانا نەیەت.

ئەرکانی «ظِهار» چوارن؛ ئەو مێردە کە سیغەی زیهارەکەی بەدەما دێت کە پێی ئەڵێن: «مظاهِر»، وە ژنەکە کە زیهارەکەی لەگەڵ ئەکرێ کە پێی ئەڵێن «مُظاهَرٌ مِنْها» وە ئەو ژنە کە کابرا ژنەکەی خۆی پێ ئەشوبهێنێ کە پێی ئەڵێن: «مُشبَّهٌ بها»، وە ئەو لەفزی شوبهاندنە کە کابرا بەکاری دێنێ.

شەرتی «مُظاهِر»، ئەوەیە مێردێك بێ تەکلیفی شەرعی لەسەر بێو بە ئارەزووی خۆی زیهارەکە بکا، هەرچەند خەسێنراو بێ، یا زەکەری بڕاو بێ، یا شلەپەتکە بێ یا زیممی بێ؛ زیهاری سەرخۆش، وەکوو تەڵاقی وایە، ئەگەر بەگوناە سەرخۆش بووبێ، لەسەری ئەنووسرێ، ئەگینا بەتاڵە؛ کەواتە، زیهاری بێگانەو مێردێ کە مناڵ بێ یا شێت بێ یا زۆر لێ کراو بێ، بەتاڵە.

شەرتی «مظاهر منها»کەیش، ئەوەیە ژنێ بێ تەڵاقی پێوە بلکێ؛ کەواتە؛ دروستە لەگەڵ ژنێکدا کە لەژێر عیسمەتی کابرادا بێ، یا تەڵاقدراوی «رجعي» بێ، هەرچەند مناڵ بێ یا شێت بێ یا پارچە گۆشتێك یا پارچە ئێسکێك بەری عەورەتی گرتبێ یا لە حەیزدا بێ یا زەیسانی بێ یا لە «عدّة»ی شوبهەدا بێ، بەڵام دروست نییە لەگەڵ ژنی بێگانەدا، هەرچەند تەعلیق کرابێ بەو کاتەوە کە مارە ئەکرێو لەپاشا مارەیش بکرێ؛ هەروەها، دروست نییە لەگەڵ تەڵاقدراوی بائینەدا.

شەرتی «مشبّە بها»یش، ئەوەیە ژنێك بێ بە نەسەب حەرام بێ لەسەر ئەم کـەسە، وەکوو دایك و نەنك و خوشك و خوشکەزاو کچو کچەزاو پوور، یا بەهۆی شیر یـا بەهۆی ژن و ژنخوازەوە حەرام بووبێ لەسەری لەوکاتەدا کە لەدایك بووە، وەکوو ئەو ژنەی کە شیری داوە بە باوکی یا بە دایکی وَ ئەو ژنەی کە باوك و بـاپیرەی مـارەیان کردبێ لەپێش ئەوەدا کە ئەم لەدایك بووە، نەك ئەو ژنە کە شیری داوە بە خۆی یا باوکی مارەی کردووە لەپاش ئەوە کە ئەم لەدایك بووە، یا وەکوو بووکی ئـەم کـەسە یـا ژن خوشکی، ئەوە شوبهاندنە بەمانەوە نابێ بە زیهار.

هەروەها نابێ بە زیهار ئەمە کە ژنەکەی بشوبهێنێ بە ژنی بێگانە، یا بە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ یا شوبهاندن بە نێرینە، هەرچەند مەحرەمیش بن، وەکوو باوك و باپیرە.

شەرتی سیغەکەیش، ئەوەیە دەلالەت بکا لەسەر شوبهاندنی ژنەکەی خۆی بە یەکێ لەم ژنانە کە بەیانمان کردن، بەو شەرتە تەشبیهی دیار بێ بە دیار نەك هی نهێنی بێ بە نهێنی، وەك ئەوە کە بڵێت: جگەرت بۆ من وەکوو جگەری دایکم وایە، یا تـەشبیهی نهێنی بێ بە دیار، وەکوو ئەوە کە بڵێت: دڵت وەکوو پشتی دایکم وایە، یا تەشبیهی دیار بێ بە نهێنی، وەکوو ئەوە کە بڵێت پشتی تۆ لەسەر من وەکوو دڵی دایکم وایە، ئەمانە هیچیان نابن بە زیهار.

جا ئەو شوبهاندنی دیار بە دیارە، چوار جۆرە؛

یەکەم: شوبهاندنی هەموو بە هەموو، وەکوو ئەوە کە بڵێ: تۆ بۆ من وەکوو دایکم وەهای؛

دووەم: شوبهاندنی هەندێکە بە هەندێك، وەکوو ئەوە کە بڵێت: پشتی تۆ بۆ مـن وەکوو پشتی دایکم وەهایە؛

سێهەم: شوبهاندنی هەمووە بە هەندێك، وەکوو ئەوە کە بڵێت: تۆ بۆ من وەکـوو پشتی دایکم وای؛

چوارەم: شوبهاندنی هەندێکە بە هەموو، وەکوو ئەوە کە بڵێت: پشتی تۆ بـۆ مـن وەکوو دایکم وایە؛ ئەمانە، هەموو سەریحن لە زیهاردا تەنها تەشبیهێ نـەبێ کـە بـۆ

قەدرگرتن یا خۆشەویستی بەکار بهێنری وەکوو ئەوە کە بڵێ: چاوی تۆ بۆ من وەکوو چاوی دایکم وایە، یا سەری تۆ بۆ من وەکوو سەری دایکم وایە، یا گیانی تۆ بۆ من وەکوو گیانی دایکم وایە، یا وەکوو ئەوە کە بڵێ: تۆ بۆ من وەکوو دایکم وەهای، یـا نەفسی تۆ بۆ من وەکوو نەفسی دایکم وایە، یا چاوی تۆ بۆ من وەکوو دایکم وایە، یا تۆ بۆ من وەکوو چاوی دایکم وەهای؛ ئەمجۆرە شوبهاندنانە کە هەڵئەگرن بۆ قەدرگرتن یا بۆ خۆشەویستی بن و هەڵیش ئەگرێ مەبەست لێیان حەرام بوون بێ، هەموو بە کینایە دائەنرێن؛ ئەگەر مەبەستی حەرام بوون بێ، ئەوە زیهارە وە ئەگەر مەبەستی قەدرگرتن یا خۆشەویستی بێ، یاخود هیچ مەبەستی نەبێ، ئەوە نابن بە زیهار»؛ هەروەها، ئەگـەر بڵێت: تۆ دایکی منی ـ وەکوو لە «انوار»دا فەرموویەتی ـ کینایەیە، هەتا وەکوو ئەگەر بڵێت: تۆ حەرامی لەسەر من وەکوو دایکم، هەر کینایەیە لەبەر ئەوە کە رێی تێئەچێ مەبەستی حەرامکردنی عـەینەکـەی بـێ نـەك حـەرامکـردنی لەزەت لێ وەرگـرتنی. بەکورتی، هەر لەفزێك بە زاهیر بۆ حەرامبوون بـێ، ئـەوە سـەریحە و هـەر لەفـزێك هەڵبگرێ بۆ حەرامبوون بێ و هەڵبگرێ بۆ قـەدرگرتن یـا خـۆشـەویستی بـێ، ئـەوە کینایەیە.

بزانن! زیهار بە تەعلیقیش دروستە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: هەروەختێ زیهارم کرد لەگەڵ فڵانە ژنمدا، ئەو کاتە تۆیش بۆ من وەکوو پشتی دایکم وەهای، ئەوە هەرکاتێ زیهاری کرد لەگەڵ ئەو ژنەدا، ئەبێ بە «مُظاهِر» لەگەڵ ئەمیشدا.

ئەگەر کابرا وتی: ئەگەر زیهارم کرد لەگەڵ ئەو ژنەدا، ئەوە تۆیش وەکوو پشتی دایکم وەهای وە لەوکاتەدا ئەو ژنە بێگانە بوو و لەپاشا زیهاری کرد لەگەڵ ئەو ژنە بێگانەیەدا، ئەوە نابێ بە هیچ و زیهاریش لەگەڵ ئەم ژنی خۆیەدا نایەتەجێ، چونکە «معلَّق علیه» بۆ زیهار لەگەڵ ژنەکەیدا، ئەبێ بە زیهار لەگەڵ ئەو ژنە بێگانەیە و زیهار لەگەڵ بێگانەیشدا هەرگیز نایەتەجێ؛ بەڵێ، ئەگەر هەر مەبەستی بەکارهێنانی لەفزی زیهار بوو لەگەڵ ئەوە ژنەدا ـ هەرچەند بێسوودیش بێ ـ یاخود ئەو ژنە بێگانەیەی مارەکرد و زیهاری لەگەڵا کرد، ئەوە ئەبێ بە «مظاهِر» لەگەڵ ژنەکەی خۆیشیا، هەروەها ئەگەر بڵێت: هەرکاتێ زیهارم کرد لەگەڵ ئەو ژنە بێگانەیەدا، ئەوە تۆیش بۆ من وەکوو پشتی دایکم وەهای.

وە ئەگەر وتی: هەرکاتێ زیهارم کرد لەگەڵ ئەو ژنەدا لەکاتی بێگانەییدا، تۆیش بۆ من وەکوو پشتی دایکم وەهای، ئەوە ئەم لەفزە پووچ و بەتاڵە، چونکە مەحاڵە زیهار لەگەڵ بێگانەدا بێتەجێ. ئەگەر کابرا وتی بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ وەکوو پشتی دایکم و هیچ مەبەستی نەبوو، یاخود هەر مەبەستی تەڵاق بوو، یا هەر مەبەستی زیهار بوو، یا مەبەستی تەڵاق و زیهار بوو، یا بە تەڵاقەکەی مەبەستی زیهار بوو و بە زیهارەکەیش مەبەستی تەڵاق بوو، ئەوە لەم سوورەتانا، هەر تەڵاقی ئەکەوێ‌و زیهار نایەتەجێ وە ئەگەر مەبەستی بە تەڵاقەکە تەڵاق بوو و مەبەستی بە زیهارەکەیش زیهار بوو، ئـەوە تەڵاقی ئەکەوێ؛ جا ئەگەر تەڵاقەکە «رجعي» بوو، ئەوە زیهارەکەیش دێتەجێ. وە ئەگەر تەڵاقەکە بائینە بوو، بەم ڕەنگە ژنەکە مێردەکەی نەچووبووە لای، یاخود ئەو تەڵاقە دوا تەڵاقی بوو، ئەوە هەر تەڵاقەکە ئەکەوێ‌و بەس.

## باسی چۆنیەتی گەڕانەوەی ئەوکەسەکە «ظهار» ئەکا و چی واجب ئەبێ لەسەری

ئەوکەسەی کە لەفزی «ظهار»ی بە دەمدا بێ، ئەگەر دەس‌بەجێ مرد، یا شێت بوو، یا نیکاحی ژنەکەی هەڵوەشاندەوە لەبەر ئەوە کە هۆی هەڵوەشـاندنەوەکـە هـەبوو، یـا دەس‌بەجێ تەڵاقـێکـی بـائینەی ژنـەکـەی دا، یـا تـەڵاقـێکـی «رجـعي»ی خست‌و نەیگێڕایەوە، ئەوە لەم سوورەتانەدا کابرا نابێ بە گەڕاوە (عائِد) و کەفارەتی ناکەوێتە سەر وە ئەگەر وەزعێك لەوانەی بەسەرا نەهات و ژنەکـەیشی تـەڵاق نـەدا، یـاخود تەڵاقێکی «رجعي»ی خست و گێڕایەوە، ئەوە بە گەڕاوە ئەناسرێت، واتـە پـەشیمان بووەتەوە، چونکە لەفزی زیهار مەعنای ئەوەیە لە ژنەکە دوور بکەوێتەوەو هاوڕێیەتی نەکا و مادام ژنەکەی راگرت‌و تەڵاقی نەدا، ئەوە بە پەشیمان ئەناسرێ وە بەرابەر بەم حاڵە، ژنەکەی لێ حەرام ئەبێ تاکەفارەتی ئەو زیهارە ئەدا وە لەپاش ئەوەکە بە گەڕاوە ناسراو کەفارەت کەوتەسەری، ئەو کەفارەتە لاناچێ لەسەری، هەرچەند لەپاشا تەڵاقی بدا و هەتا ئەوکەفارەتە جێ‌بەجێ ئەکا، حەرامە لەسەری بچێتە لای ئەو ژنەو لەزەت لە

بەینی ناوك و ئەژنۆی وەربگرێ، بەڵام حەرام نییە بە غەیری بەینی ئەو دوو شوێنە هەر لەزەتێکی شەرعی لەو ژنە وەربگرێ، وەکوو لە «تحفه»دا ئەفەرموێت.

هەروەکوو زیهاری بەدەوام دائەمەزرێ، زیهاری مووەقەتیش دائەمەزرێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەم مانگی رەمەزانە تۆ بۆ من وەکوو پشتی دایکم وەهای وە لە زیهاری مووەقەتدا، بە راگرتنی ژنەکە نابێ بە گەڕاوەو کەفارەتی ناکەوێتەسەر، لەبەر ئەوە کە کابرا نەیویستووە لەو ژنە دوور بکەوێتەوە بەدەوام؛ جا ئەگەر وەتئی ژنەکەی کرد لەو ماوەیەدا، ئەوە هەر بە چوونەلای ژنەکە ئەبێ بە گەراوەو واجبە خۆی بکێشێتە دواوە، چونکە ئەو ژنە لەسەری حەرام بووەو کەفارەتیش واجب ئەبێ لەسەری؛ جا ئەگەر کەفارەتەکەی بەجێ هێنا، ئەوە بۆی دروستە لەو مانگەدا هەرچەند ئارەزووی لێبێ بڕواتە لای ژنەکەی وە ئەگەر کەفارەتەکەی نەدا، ئەوە تا ئەو مانگە ئەڕوا حەرامە لەسەری بڕواتە لای، بەڵام پاش ئەو مانگە قەیدی نییە بڕواتە لای، چونکە زیهارەکەی هەر بۆ مانگێك بووەو کەفارەتەکەیش لەئەستۆیدا ئەمێنێتەوە تا ئەیدا.

ئەگەر کابرا چوار ژنی هەبوو و بە یەك سیغە وتی: ئێوە بۆ من وەکوو پشتی دایکم وەهان، ئەوە زیهاری کردووە لەگەڵ هەر چواریاندا، مادام دەقیقەیەك رایانبگرێ‌و تەڵاقیان نەدا وە ئەگەر بە چوار سیغە یەك لە شوێنی یەك زیهاری لەگەڵدا کردن، ئەوە بە زیهار لەگەڵ ژنی دووەم ئەبێ بەگەڕاوە لە ژنی یەکەم و بە زیهار لەگەڵ سێهەم، ئەبێ بە گەڕاوە لە دووەم و بە زیهار لەگەڵ چوارەم، ئەبێ بە گەڕاوە لە سێهەم و بە راگرتنی چوارەم، ئەبێ بەگەڕاوە لەویش و چوار کەفارەتی لەسەر واجب ئەبێ.

وە ئەگەر بەرابەر بە ژنێك چەند جار سیغەی زیهاری وت‌و بەینی وتنی سیغەکانی خست، ئەوە ئەوەندەی خۆیان زیهارەکە زۆر ئەبێ وە ئەگەر بە بێ بەینکەوتن بوو، لەم سوورەتەدا ئەگەر مەبەستی تەئکیدکردنەوە بوو، بە یەك زیهار دائەنرێ، ئەگینا ئەوەندەی سیغەکان زیهارەکە زۆر ئەبێ‌و بە جاری دووهەم ئەبێ بەگەڕاوە لە ژنەکەی.

## باسی کەفارەتی «ظهار»

بەشەرت گیراوە لە کەفارەتدا کابرا نیازی کەفارەتی هەبێ، بەڵام شەرت نییە دیاریکردنی بە ناوی کەفارەتی زیهار. کەفارەتی زیهار، بە یەکێ لە سێ شت ئەبێ بە تەرتیب بەمڕەنگە کە ئەگەر یەکەمیان دەسگیر نەبوو، بچێتە سەر دووهەمیانو ئەگەر دووهەمیشی پێنەکرا، ئەوجا بچێتە سەر سێهەم. یەکەم: ئازادکردنی بەندەیەکی موسوڵمانی وایە کە هیچ عەیبێکیوای پێوە نەبێ کە زیان بە کارو کاسبی بگەیەنێ، وەکوو کوێریو ئیفلیجیو بێدەستی؛ جا ئەگەر ئەوەی بۆ دەسگیر نەبوو لەبەر ئەوەکە هەر بەندە دەسگیر نەئەبوو ـ وەکوو لەم زەمانی ئێمەدا ـ یاخود بەندە هەبوو، بەڵام ئەو دەسی نەئەڕۆیشت بیکڕێ، واجبە دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێ، جا ئەگەر لە ئەوەڵی مانگەوە بەڕۆژوو بوو، ئەوە ئەبێ دوو مانگەکە مانگی «قەمەری» بن وە ئەگەر لەناومانگدا نییەتی رۆژووی هێنا، ئەوە مانگە دواییەکە بە حیسابی قەمەریو مانگە ناتەواوەکەیش بە حیسابی سی رۆژ تەواو ئەکا.

لەم رۆژووەیشدا نییەتی کەفارەت پێویستە، بەڵام نییەتی یەك لەشوێن یەکی (تَتابُع) پێویست نییە و ئەم یەك لە شوێن یەکییە، ئەفەوتێ بە تەرك کردنی رۆژووی یەك رۆژ بە بێعوزر، هەروەها بەهۆی نەخۆشییەوە ـ لەسەر فەرموودەی تازەی ئیمام ـ بەڵام نافەوتێ بەهۆی رۆژوو نەگرتنی ژنێکەوە کە بکەوێتە حەیزەوە، یەعنی ئەگەر ژنێك بەهۆی قەتڵی خەتاوە ـ مەسەلا ـ رۆژووی دوو مانگی کەوتەسەرو دەسیکرد بە رۆژووگرتن و لەو ماوەیەدا کەوتە حەیزەوە، ئەوە رۆژوو شکاندنەکەی زیان بە یەك لە شوێن یەکێتی رۆژژووەکەی ناگەیەنێ، چونکە زیاتر وایە ژن لەماوەی دوو مانگدا خاڵی نابێ لە حەیز؛ کەواتە، ئەگەر ئەو رۆژوو شکاندنەی ببێ بەهۆی تێکچوونی یەك لەشوێن یەکێتییەکەی، ئەبێ بەهۆی ئەوەکە هەرگیز یا تا ماوەیەکی زۆر ئەو کەفارەتەی بۆ جێبەجێ نەکرێ.

جا ئەگەر نەیتوانی بەڕۆژوو بێ بەهۆی پیرییەوە یا بەهۆی نەخۆشییەکیواوە کە ئومێدی رزگاربوونی لێنەکرێ، یاخود بەهۆی ئەو رۆژووەوە تووشی زەحمەتێکی

زۆر ئەبوو، یاخود ترسی زیادبوونی ئەو نەخۆشییەی بوو، ئەوە کەفارەت بدا بە خۆراكپێدانی شەست کەسی کەمدەسەڵات یا لاتو نەدارا و هەریەکی «مُدّ»ێك دانەوێڵەیان بداتێ کە بۆ سەرفیترە بشێ، بەڵام ئەبێ ئەو خۆراكپێدراوانە کەسیان، نە لە ئەهلی «ذمّە» و نە لە «بنی هاشم» و «بنی مطلّب»، نەبن.

## باسی «عِدّە»ی ئافرەت

«عدّة» لە شەرعدا، بریتییە لە خۆڕاگرتنی ژن بە بێمێرد بۆ ئەوە بزانرێ منداڵدانی خاڵییە لە منداڵ، یا هەر لەبەر «تعبُّد» و خواپەرستی، یا لەبەر دەربڕینی عاجزی بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە. ئەم «عدّة»یە، بەکورتی سێ بەشە؛ یەکەم، «عدّة»یەك کە لە وەتئی شوبهەوە پەیدا ئەبێ، چ شوبهەی بکەر (فاعِل) و چ شوبهەی ڕێگا (طریق) و چ شوبهەی شوێن (محلّ)، وەکوو بەیانمان کرد لە نیکاحدا؛ دووهەم، «عدّة»یەك کە پەیدا ئەبێ لە جیابوونەوەوە لە مێردێکی زیندوو بەهۆی تەڵاقەوە یا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەوە لەبەر عەیب و لاتیو شتیوا، یا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەوە لەبەر شتێکی وەك شیرخواردن، بەو شەرتە ئەو مێردە چووبێتە لای ژنەکە لەپێشەوە یا لەپاشەوە، هەرچەند مێردەکە منداڵ بێ یا ئالەتی شلەپەتکە بێ، یاخود بەهۆی ئەوەوە کە ئاوی بەحورمەتی ئەو مێردە بکرێتە ناو فەرجی ژنەکەوە لەپێشەوە یا لە پاشەوە، یا ئەم ژنە ئاوی کەسێك بکاتە خۆیەوە کە بە مێردی خۆی بزانێ؛ سێهەم «عدّة»یێکە پەیدا ئەبێ بەهۆی مردنی مێردەوە، خواه ئەو ژنە لەو کاتەدا لەژێر عیسمەتی کابرادا بێ یاخود تەڵاقدراو بێ بە تەڵاقی «رجعي» بەڵام هێشتا «عدّة»ی تەڵاقەکەی تەواو نەبووبێ، ئەمەیش لە «عدّة»ی تەڵاقەوە ئەگوێزێتەوە بۆ «عدّة»ی وەفات.

بزانن! لە «تحفە» و «مغنی»دا ئەڵێت: ئاوی بەحورمەت ئاوێکە لەکاتی داپەڕین و هەڵگرتنیدا حورمەتی بێ؛ کەوابێ، ئەگەر کابرا لەکاتی تەماشاکردنی ژنەکەیدا ئاوی هاتەوەو ژنەکە ئاوەکەی کردە خۆیەوە، بەڵام بە ئاوی بێگانەی ئەزانێ، ئەبێ ئەم ئاوە حورمەتی نەبێ، کەچی حورمەتی هەیە و لەپاش تەڵاق، ژنەکە «عدّة»ی ئەکەوێتە سەر!

وەگەلێ لە زانایان، وەکوو خاوەنی «نهایە» و غەیری ئەویش ئەڵێن: حورمەتی ئاو هەر بە ئیعتیباری کاتی داپەڕینەو بەس؛ کەواتە، ئەگەر کابرا رۆیشتە لای ژنی خۆیو ئاوی هاتەوە و ژنێکی بێگانە خۆی ساوی بەو ژنەداو لەو ئاوەی وەرگرت، ئەویش «عدّة»ی لەسەر واجب ئەبێ وە ئەگەر منداڵی بوو، نەسەبی ئەڕواتە سەر ئەو کابرای خاوەن ئاوە.

بێداری! بەم شەرتە ئیعتیبار ئەکرێ بەوەکە ژنەکە ئاوی کابرا بکاتە خۆی کە کابراو ژنەکە کەوتبنەیەك و تەنها بە رێ تێ چوونی کەوتنەیەکەکە قەناعەت ناکرێ؛ هەروا بە تەنها ئەوە ئیعتیبار ناکرێ کە پێکەوە لە شوێنێکا بووبن و بە بێ وەتئی ژنەکە یا تێ کردنی ئاوی، نابێ بە سەبەبی «عدّة»، هەرچەند ئەو کابرایشە ئینسانێکی ساغ و خاوەن هێز بێ.

بزانن! «عدّة» چوار جۆرە؛

[جۆری] یەکەم: بە رابوردنی سێ پاکی وایە کە لەپێش‌و پاشیانەوە خوێنی حەیز ببێ؛ ئەمەیش، بۆ ژنێکە کە «فِعلا» خاوەن حەیز بێ؛ جا ئەگەر لەکاتی پاکیدا ژنەکە تەڵاق‌درا، هەرچەند دەقیقەیەك لەو پاکییە مابێ، «عدّة»کەی تەواو ئەبێ بە دەستکردن بە حەیزی سێهەم وە ئەگەر لەکاتی حەیزدا تەڵاق درابێ، «عـدّة»ی تـەواو ئـەبێ بـە دەستکردن بە حەیزی چوارەم وە ئەگەر ئەم پاکی سێهەمە نەبڕایەوەو ژنەکە نەکەوتە حەیزەوە، ئەوە «عدّة»کەی تەواو نابێ؛ کەوابێ ئەم حـەیزە دوایـییە داخـڵی مـاوەی «عدّة»کە نییەو گێڕانەوەی ژنەکەی تیا دروست نییە، تەنها بۆ ئەوەیە بزانرێ پاکییەکان تەواو بوون و لەکاتی ئەم حەیزە دواییەدا دروستە ژنەکە شوو بکا، ئەوەندە هەیە تا پاك نەبێتەوە لە حەیزەکە دروست نییە کابرا لەزەت وەربگرێ لە مابەینی ناوەك و ئەژنۆی بە وەتء یا بە هەر جۆرێکی تر.

لە ئیددیعای حەیز یا پاکیدا، ئیعتیبار ئەکرێ بە قسەی ژنەکە، هەروەها بـاوەڕی پێ ئەکرێ لە ئیددیعای تەواوبوونی «عدّة»کەیدا، ئەگەر قسەکەی رێی تێ بچێ وە ئەگەر رێی تێ نەئەچوو، ئیددیعاکەی بێ سوودو بێ ئیعتیبارە وە ئەگەر گومانی خراپی پێ برا، واجبە داوای بەیانی وەزعی حەیزو پاکییەکی لێ بکرێ‌و سوێندیش بدرێ وە هەر ژنێ کە لە حەیزدا بێ، مادام سەری لێ نەشێوابێ، ئەوە لە حەیزو پاکیدا ئەگەڕێتەوە بۆسەر

ئەو ماوەیە کە بە حەیز یا بە پاکی دائەنرێ بۆی ـ وەکوو زوو بەیان کراوە ـ خواه تازە دەستی کردبێ بە کەوتنە حەیزەوە یا خووی پێوە گرتبێ، بەڵام ئافرەتی سەر لێشیواو، «عدّة»ی بە مانگە و لەمەولا باسی ئەکرێ.

ئەگەر ژنێك لەمەوپێش حەیزی بووبوو و ئێستە ئەو حەیزەی نەمابوو لەبەر نەخۆشییەك یا لەبەر شیردان بە منالْ ـ مەسەلا ـ ئەوە واجبە لەسەری خۆی رابگرێ تا ئەکەوێتە حەیزەوە، ئەوجا بە سێ پاکی «عدّة»ی تەواو ئەبێ، یا تا ئەگاتە کاتی نائومێدبوون لە حەیز پیاهاتن، ئەوجا بە سێ مانگ «عدّة»ی تەواو ئەبێ، هەروەها ئەگەر بە بێ‌نەخۆشیش لە حەیز چووبێتەوە وە دروستە بۆ ئەم ژنەو بۆ هەر ژنێکی تریش لەوانەی کە پێویستیان بە کەوتنە حەیزەوەیە، بەهۆی دەرمانێکی تاقیکراوەوە حەیز پەیدا بکەن. وە ئەگەر ئەم ژنە کە هەرگیز نەکەوتووەتە حەیزەوە، لەمەوپێش حەیزی بووبوو و ئێستە ئەو حەیزەی لەبەر نەخۆشی یا هۆیەکی‌تر نەمابوو، تەڵاقدراوی «رجعي» بوو، دروستە بۆ مێردەکەی بیگێڕێتەوە تا ئەگاتە ساڵی ناهومێد بوونو بە مانگ «عدّة»ی تەواو ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر سێ تەڵاقە درابێ، ئەوە تا ئەو کاتە قابیل نییە جاش بکرێتەوە و لەو ماوە دوورو درێژەیشدا جێگای دانیشتنو نەفەقەی ژیانی لەسەر مێردەکەیەتی و چاری کابرا بۆ لابردنی ئەم نەفەقەیە لەسەر خۆی، ئەوەیە یا تەڵاقێکی بائنی بدا، یا بەخۆڕایی هەرچی تەڵاقی ماوە هەمووی بخا، «مع العلم» حەقی جێگای دانیشتنی ژنەکەی لەسەر لاناچێ، چونکە جێگای دانیشتنی ژنێ کە لە «عِدّە»دا بێ، واجبە، هەرچەند مەسرەف و نەفەقەیشی واجب نەبێ.

وە ئەگەر ئەم ژنە گەیشتە ساڵی نائومێد بوونو «عدّة»ی بە سێ مانگ تەواو کرد، ئەوە ئەوسا ئەتوانێ شوو بکا وە ئەگەر لەپاش تەواوبوونی «عدّة»ی بە سێ مانگ حەیزی پیاهاتەوە، ئەمە ئەگەر لەپاش شووکردنی بێ، ئیعتیباری نییە وە ئەگەر لەپێش شووکردنیا بێ، ئەوە ئەو «عدّة» بە مانگ رابوردووە بەتاڵ ئەبێتەوەو دێتەوە سەر «عدّة» بە «اقراء» وە ئەگەر لەپاش قورئێك یا دوو قورء حەیزەکەی بڕایەوە، ئەوە دیسان دێتەوە سەر «عدّة» بە مانگ و ئەبێ سەرلەنوێ مانگ تەواو بکاتەوە وە بۆ گەیشتن بە تەمەنی

نائومێدبوون لە حەیز پیاهاتن، نائومێدبوونی ژنانی جیهان تەماشا ئەکەین کە دانراوە بە شەست و دوو ساڵ.

**جۆری دووهەم،** «عدّة»یە بە رابواردنی سێ مانگ، ئەمەیش بۆ ژنێکی وایە کە بچووك بێ، یا باڵغ بووبێ بەڵام هێشتا حەیزی پیا نەهاتبێ، یا ژنێکی «مُسْتَحاضه»ی سەر لێشێواو (مُتحَيِّرة)بێ بەمەعنا ئەندازەو کاتی حەیزەکەی لەبیر نەمابێ، یا بۆ ژنێکە گەیشتبێتە تەمەنی نائومێد بوون.

**جۆری سێهەم،** «عدّة»یە بە رابواردنی چوار مانگو دە رۆژ بە شەوەکانەوە، ئەمەیش بۆ ژنێکە مێردی مردبێ، خواە لەوکاتەدا لەژێر نیکاحی ئەودا بێ یاخود تەڵاق دراوی «رجعي» بێ، بەڵام هێشتا «عدّة»ی تەڵاقەکەی تەواو نەبووبێ، مێردەکەی بمرێ، ئەوە هەم دێتەوە بۆ «عدّة»ی وەفاتو ئەبێ چوار مانگ و دە رۆژەکە تەواو بکا؛ بەڵام ژنێك کە لە «عدّة»ی تەڵاقی «بائن»دا بێ، ئەوە نایەتەوە سەر «عدّة»ی وەفات و لەسەر حیسابی خۆی «عدّة» تەواو ئەکات.

ئەگەر کەسێك دوو ژنی هەبوو و یەکێکیانی تەڵاق داو خۆی لەپێش دیارکردنی ژنە تەڵاق دراوەکەیدا مرد، ئەوە ئەگەر نەچووبووە لای هیچیان، هەردووکیان «عدّة»ی وەفات تەواو ئەکەن؛ هەروەها ئەگەر چووبێتەلایانو ژنەکان لەوانە بن کە «عدّة»یان بە مانگ بێ، یاخود «عدّة»یان بە «اقراء»بێ، بەڵام تەڵاقەکە «رجعي» بێ وە ئەگەر «عدّة»یان بە «اقراء»بێ و تەڵاقەکەیشیان «بائن» بێ پێویستە هەردووکیان «عدّة» تەواو بکەن بە رابواردنی ئەو ماوەیە کە زۆرتر بێ لە «عدّة»ی وەفاتو «عدّة»ی «اقراء» و لەم مەسئەلەیەدا، «عدّة»ی وەفات ئەژمێررێ لە مردنی کابراوە و «عدّة»ی تەڵاقەکە بە «اقراء» یا بە مانگ، ئەژمێررێ لەوکاتەوە کە ژنەکەی تەڵاق داوە، هەرچەند لە سوورەتی دیاریکردنی ژنی تەڵاق دراوی نامەعلوومدا، لەکاتی دیاریکردنەکەوە تەڵاقی ئەکەوێ.

بزانن! ئەگەر یەکێ ون بوو بەهۆی سەفەرەوە ـ مەسەلا ـ و دەنگو باسی نەما، ئەوە دروست نییە ژنەکەی شوو بکا تاکاتێ کە مەعلووم بوو مردووە یا ئەو ژنەی تەڵاق داوە

و پاش ئەوەیش «عدّة» تەواو ئەکا؛ جا ئەگەر مردنەکەی لەکاتێکەوە بووکە لەوکاتەوە تا ئێستا ماوەی «عدّة»ی مردن بەسەرچووبێ، یا زیاتر لەوماوەیە بەسەرچـووبێ، ئـەوە ئێستا بە بێ ماتڵبوون ئەتوانێ شوو بکا، ئەگینا ئەبێ لەکاتی وەفاتەکەوە ماوەی «عدّة» بەسەربەرێ، ئەوسا ئەتوانێ شوو بکا.

وە لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی شافیعیدا ـ خوای لێ رازی بێ ـ ئەو ژنە ئەتوانێ لەپاش خەبەر نەمانی کابرا، بڕوا بۆ لای قازیو قازیش ماوەی چوار ساڵی بۆ دابنێ؛ جا کاتێ لەو سەعاتەوە چوار ساڵ رابووردو کابرا هەر دەنگو باسی نەبوو، ئەمجار «عدّة»ی وەفات تەواو بکا، ئەمجار ئەتوانێ شوو بکا وە هەرچەند لە «مِنهاج»دا ئـەفەرموێت ئەگەر قازییەکی غەیرە شافیعی حوکمی کرد بەم فەرموودەی کۆنی ئیمامی شافیعییە، حوکمەکەی هەڵئەوەشێنرێتەوە، «في الأصَحّ»، بەڵام شێخ لە «تحفه»دا ئەفەرموێت: ئەم حوکمە، رووی تێكنەچوونو هەڵنەوەشانەوەکەی لای من رۆشن ترە، لەبەر ئەوەکە ئەو ژنە ئەگەر بێخاوەن بمێنێتەوە، لەوانەیە تووشی زیانی دنیاییو دینی ببێ.

جا لەپاش شووکردنی ژنەکە، ئەگەر دەرکەوت مێردەکەی لەو تەئریخەدا یا پێش ئەوە مردووە، ئەوە نیکاحی ژنەکە بە فەرموودەی تازەی ئیمامیش دامەزراوە، چونکە لە «نَفسُ الأَمر»دا ژنەکە لەو وەختەدا مێردی نەبووە وە ئەگەر مێردەکەی هاتەوە، ژنەکەی پێ ئەدرێتەوە، بەڵام نابێ ئەم مێردی یەکەمە بڕواتە لای تا ئەم «عدّة»ی شوبهەیە تەواو ئەکرێ.

بزانن! لە «منهاج» و لە «تـحفه»دا ئـەفەرموێت: لە فـەرموودەی کـۆنـی ئـیمامی شافیعیدا، بە موافیقی "مەزهەبی ئیمامی مالیك" و "ئەحمەدی کوڕی حەنبەل"، ئـەو ژنەی کە حەیزی بڕاوە، لەپاش تەڵاقدانەکەی ماوەی نۆ مانگ خۆی رابگـرێ، جـا «عدّة» تەواو بکا بە سێ مانگو شوو بکا وە ئـیمامی شـافیعی، ئـەم فـەرموودەیەی بەهێزکردووە بەوە کە "حەزرەتی عومەر" ـ خوای لێ رازی بێ ـ حوکمی پێ کردووە لەناو کۆمەڵی "ئەسحابەی موهاجیرین و ئەنسار"داو کەس لێی نەگرتووە؛ بۆیە ئیمامی "بُلقینی" ئەم فەرمووده کۆنەی ئـیمامی شـافیعییەی هـەڵبـژاردووە و "بـارزی"یش،

ئەفەرموێت: بە سێ مانگی دوایی لەو نۆ مانگە «عـدّة»ی ژنەکە تەواو ئەبێ وە تەقلیدکردنی ئەم فەرموودەیە دروستە.

**جۆری چوارەم**، لەجۆرەکانی «عدّة» بە «وضْعي حمْل» (دانانی سکە) بە چەند شەرت؛

**یەکەم**: ئەو سکە نیسبەت بدرێ لەو پیاوە کە خاوەنی «عدّة»کەیە، هەرچەند بە تەنها رێ‌تێ‌چوونیش بێ، وەکوو منداڵێك کە باوکی نەیگرێتە خۆیو بڵێ: منداڵی من نییە، بەڵام قابیل بێ لەو بێ؛ کەواتە، ئەگەر ئەو ژنە دوو گیانە ژنی منداڵێ بوو کە قابیل نەبێ بچێتە لای ژن، یا ژنی پیاوێکی «مَمْسوحِالذَّكَر» بوو کە قابیل نەبێ ئاوی بچێتە فەرجی ژنەکەوە، یا لەکاتی مارەبڕینی ئەو ژنەوە بە کەمتر لە شەش مانگ ئەم منداڵە لەدایك بوو، ئەوە بە دانانی ئەم سکە «عدّة» تەواو نابێ، بەڵکوو مادام مێردەکەی وەفاتی کردبوو، ئەبێ چوار مانگو دە رۆژ «عدّة»کەی تەواو بکا، ئەگینا بە سێ «قوره» یا بە سێ مانگ «عدّة»ی بەسەر ئەچێ.

**شەرتی دووەم**، ئەوەیە هەموو سکەکەی لێ جیا ببێتەوە، هەتا منداڵی دووەمی دوانەشی لێ جیا ببێتەوە وە ئەگەر لە بەینی دوو منداڵا کەمتر لە ماوەی شەش مانگ هەبوو، ئەوە ئەو دوو منالە بە دوانە دائەنرێن و بە جیابوونەوەی هەردووکیان نەبێ، «عدّة»ی ژنەکە تەواو نابێ.

**بزانن!** «عدّة» تەواو ئەبێ بە جیابوونەوەی منداڵی مردوو وە بە جیابوونەوەی گۆشت پارە (مُضْغَه)یەك کە شێوەی ئادەمیزادی پێوەبێ بە پەنهانی یاخود شێوەی هیچی پێوە نەبێ، بەڵام مامانێکی باوەڕ پێ‌کراو بڵێ: ئەم پارچە گۆشتە لەشی ئادەمیزادە، جا بۆلای قازی چوار مامان پێویستە کە شەهادەت بدەن، بەڵام بۆ ژنەکە خۆی ئەتوانێ بەقسەی تاقە مامانێکیش متمانە بکات، هەروەها بۆ کەسێکیش کە باوەڕی پێ‌بکا.

وە ئەگەر لە «عیددەی ئیقراء» یا عیددەی مانگدا سك پەیدا بوو لە مێردەکەوە، ئەوە ئەو «عدّة»یە دێتەوە سەر دانانی ئەو سکە.

ئەگەر ژنەکە لە «عیددەی ئیقراء» یا عیددەی مانگداکەوتە شکەوە لە خۆی کە سکی هەیە، دروست نییە شوو بکا تا ئەو شکەی لائەچێ بە باری دەرکەوتنی سك یا بە باری پاکی لە سكو تەواوبوونی «عدّة»کەیدا وە ئەگەر لەپاش ماوەی «عدّة»کەوتە شکەوە لە سکدا، ئەوە ئەگەر شووی نەکردبوو، واجبە خۆی رابگرێ تا ئەو شکەی نامێنێ وە ئەگەر هەر لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا شووی کرد، ئەوە حوکم ناکرێ بە بەتاڵیی نیکاحەکە تا ئەسبابی بەتاڵی نەیەتەجێ وە ئەگەر ئەم شکە لەپاش شووکردن پەیدابوو، ئەوە نیکاحەکە هەر دەوام ئەکا، مەگەر لە کەمتردا لە شەش مانگ لە شووکردنەکەوە ئەو منداڵەی لێ جیا ببێتەوە.

ئەگەر کەسێك ژنەکەی بائینە کردەوە و لەپاش چوار ساڵ منداڵێکی لێ بوو، ئەوە ئەو منداڵە ئەلکێ بەو کەسەوە وە ئەگەر پاش چوار ساڵ بوو، نالکێ پێیەوە و ئەم ماوەی چوار ساڵە حیساب ئەکرێ لە کاتی تەڵاقدانەکەیەوە، هەروەهایە حوکمی تەڵاق دراوی «رجعي»یش وە ئەگەر ژنێکی تەڵاقدراو لەپاش «عدّة» شووی کرد، کەچی لە کەمتر لە ماوەی شەش مانگدا لە نیکاحەکەیەوە منداڵێکی بوو، ئەوە ئەو نیکاحە بەتاڵەو وەك شووی نەکردبێ وایە و منداڵەکەی بە منداڵی مێردی پێشوو دائەنرێ وە ئەگەر لە شەش مانگ یا زیاتر لە شەش مانگەوە بوو، ئەوە نیکاحەکەی دروست بووەو منداڵەکەیشی منداڵی مێردی دووهەمە.

وە ئەگەر ژنێ لە ماوەی «عدّة»دا شووی کرد و ئەم مێردی دووهەمە نەیئەزانی کەوا «عدّة» واجبە، یا کەوا ئەم عەقدە بەتاڵە، یاخود شەخسێك بە وەتئی شوبهە چووە لای ژنێکی مێرددارو منداڵێکی لێبوو کە هەر بۆ مێردی یەکەم قابیل بوو، ئەوە منالّی ئەوە وە ئەگەر هەر بۆ مێردی دووەم قابیل بوو، بەمڕەنگە لە عەقدی مێردی یەکەمەوە تا دانانی سکەکە لە چوار ساڵ زیاتر بوو، ئەوە هەر بۆ مێردی دووەمە وە ئەگەر بۆ هەردوانیان قابیل بوو، ئەوە نیشانی قیافەشناس ئەدرێ، جا بە هەرکامیانی دا ئەوە وەکوو حەسرکردنی ئیمکانە لەو کەسەدا وە ئەگەر دای بە هەردووکیان یا نەیزانی هی کامیانە یاخود قیافەشناس هەر نەبوو لە وڵاتدا، لەم سوورەتانەدا چاوەڕوانی باڵغبوونی منالّەکە ئەکەین، کە باڵغ بوو، خۆی کرد بە کوڕی هەرکامیان، ئەدرێ بەو کەسە وە ئەگەر

بۆ کەسیان دەسی نەئەدا، بەمڕەنگە ماوەی چوار سال زیاتر بوو لە مێردی یەکەمەوەو شەش مانگ کەمتر بوو لە عەقدی مێردی دووهەمەوە، ئەوە دانانرێ بۆ هیچکامیان و لەمکاتەدا، ئەم وەزعە نابڕێ بەسەر ئەوەداکە نیکاحەکە دانەمەزراوەو ئەو ژنە دووگیان بووە لەکاتی عەقدەکەدا لە وەتئی شوبهە، بەڵکوو حەمل ئەکرێتە سەر ئەوەکە ئەو حەملە لە زینایە بۆ ئەوە کە ئەم عەقدە دروست بێ، چونکە ئەسڵ لە عەقددا دامەزرانە و بەئیحتیمال بەتاڵ ناکرێتەوە، ئەگەرچی لە واقیعدا حوکم بە زینای ژنەکەیش ناکرێ‌و حەددی لێ نادرێ.

"علي الشّبراملسي"، ئەفەرموێت: لەمەوە وەڵامی پرسیارێك وەرئەگیرێ: ئەگەر کچێك دووگیان بوو و لەسەر کەشفی مامانەکان دەرکەوت هێشتا کچە، ئایا دروستە باوکەکەی بە «اجبار» مارەی بکا یا نە؟ وەڵامەکە ئەمەیە: بەڵێ، دروستە، چونکە رێی تێ ئەچێ پیاوێ لەگەڵیا راکشابێ‌و ئاوی کابرا هاتبێتەوەو فەرجی ئەم کچە وەریگرتبێ‌و سکی پڕ بووبێ؛ دیارە ئەو ئاوە حورمەتی نییەو ئەو سکە رێگا لە مارەبڕینی ناگرێ بۆ ئەوکەسەی داوای ئەکا، ئیتر ئەو سکە نابڕێ بەسەر ئەوەداکە ئەو کچە زینای کردبێ‌و فەرجی گیرسابێتەوە، چونکە دروست نییە بەگومانی خراپ ئەو کچە خاوەن عیسمەتە بێ‌عیسمەت بکرێ.

ئەگەر ژنێك لە «عدّة»ی تەڵاقدا سکی پڕ بوو لە زینا، ئەوە «عدّة»کەی هەر لەسەر حاڵی پێشووە، بە «اقراء» یا بە مانگە و دروستە لەپاش تەواوبوونی ئەو «عدّة»یە مارە بکرێ، هەرچەند هێشتا سکەکەی لێ جیانەبووبێتەوە و دروستە مێردەکەی بڕواتە لای‌و لەزەتی لێ‌وەربگرێ بە هەموو جۆرە لەزەتێك، هەرچەند کەراهەتی هەیە تا سکەکەی لێ جیا ئەبێتەوە؛ هەروەها ئەگەر کچێك سکی پڕ بوو لە زینا، دروستە بەرلەوەی سکەکەی لێ جیا ببێتەوە مارە بکرێ بۆ کەسێك کە داوای بکا و ئەوکەسەیش ئەتوانێ لەزەتی لێ وەربگرێ.

وە ئەگەر ژنێك لە «عدّة»ی وەفاتدا چوونەلای بە شوبهەو سکی پڕ بوو و قابیل بوو ئەو سکە حەمل بکرێتەسەر ئەو کەسە کە بە شوبهە چووەتە لای وە سەر مێردە مردووەکەیشی، ئەوە ئەگەر ئەم مناڵە درا بە مردووەکە، «عدّة»ی ئەو بە دانانی سکەکەی

ئه‌بێ و له‌پاش دانانی سکه‌که‌یش، «عدّة»ی وه‌تئه شوبهه‌که ته‌واو ئه‌کا، خواه به «اقراء»بێ یا به مانگ، به‌ڵام پاش پاکبوونه‌وه‌ی ژنه‌که له زه‌یسانی وه ئه‌گه‌ر درا به‌م کابرایه، ئه‌وه «عدّة»ی ئه‌م به دانانی سکه‌که‌یه‌تی و پاش ئه‌وه‌و؛ پاش ماوه‌ی زیسانی و پاشماوه‌ی «عدّة»ی وه‌فاته‌که‌یش ته‌واو ئه‌کا وه ئه‌گه‌ر نه‌درا به‌که‌سیان، ئه‌وه به دانانی سکه‌که‌ی «عدّة»ی یه‌کێکیان ته‌واو ئه‌بێ، ئه‌مجار ماوه‌ی سێ «قورء» و پاشماوه‌ی «عدّة»ی وه‌فاته‌که به مانگ، هه‌رکامیان وه‌ختی زورتر بوێ، ئه‌بێ ئه‌وه‌یش ته‌واو بکا.

## باسی «تَداخُل»، واته به‌یه‌کا چوونی دوو «عدّة»

ئه‌گه‌ر ژنێك دوو «عدّة»ی که‌وته‌سه‌ر له یه‌ك که‌سه‌وه، ئه‌وه ئه‌گه‌ر ئه‌م دوو «عدّة»یه له یه‌ك جۆر بن، به‌م‌ڕه‌نگه کابرایه‌ك ژنه‌که‌ی ته‌ڵاق دا به ته‌ڵاقی «رجعي» یا «بائن»و وه‌تئی ژنه‌که‌ی کرد له ماوه‌ی «عدّة»ی غه‌یری سکدا و نه‌یزانی ئه‌م وه‌تئی ژنه له‌م‌کاته‌دا حه‌رامه، یا ئه‌یزانی‌و ته‌ڵاقه‌که‌ی «رجعي» بوو، ئه‌وه ئه‌و دوو «عدّة»یه ئه‌چن به‌یه‌کدا و له‌پاش وه‌تئه‌که، ده‌س‌ئه‌کا به «عدّة»ی ئه‌م وه‌تئه و پاشماوه‌ی «عدّة»ی ته‌ڵاقه‌که‌یشی تێ‌ئه‌چێ وه له پاشماوه‌ی «عدّة»ی ته‌ڵاقه‌که‌دا، حه‌قی گێڕانه‌وه‌ی ژنه‌که‌ی هه‌یه.

وه ئه‌گه‌ر دوو «عدّة»که له دوو جۆر بوون، به‌م‌ڕه‌نگه یه‌کێکیان به سك‌و ئه‌ویان به «قورء» یا به مانگ بوو؛ مه‌سه‌لا، ژنه‌که‌ی ته‌ڵاق‌دا به دووگیانی و له «عدّة»یشدا چووه لای له‌پێش ئه‌وه‌داکه سکه‌که‌ی دابنێ وه ژنه‌که حه‌یزی هه‌بوو، یاخود حه‌یزی نه‌بوو و «عدّة»ی به مانگ بۆ دائه‌نرا، ئه‌مه لێره‌یشدا هه‌ردوو «عدّة»که ئه‌چن به یه‌کدا و عیدده‌ی ئیقراء یا مانگ ئه‌چێته ناو «عدّة»ی سکه‌که و به دانانی سکه‌که، «عدّة»ی ته‌واو ئه‌بێ، هه‌رچه‌ند ژماره‌ی «اقراء» یا ماوه‌ی سێ مانگه‌که ته‌واو نه‌بووبێ ـ به‌پێی فه‌رمووده‌ی پشت پێ‌به‌ستراو ـ وه تا دانانی سکه‌که‌یش حه‌قی گێڕانه‌وه‌ی ژنه‌که‌ی هه‌یه.

وه ئه‌گه‌ر «عدّة»ی دوو که‌سی که‌وته سه‌ر، به‌م‌ڕه‌نگه له ماوه‌ی «عدّة»ی ته‌ڵاقدا، چ ته‌ڵاقی «رجعي» بێ و چ ته‌ڵاقی «بائن»، ئه‌و ژنه له‌لایه‌ن که‌سێکی‌تره‌وه به شوبهه یا به نیکاحی دانه‌مه‌زراو وه‌تئی کراو له‌یه‌ك جوێ کرانه‌وه، ئه‌وه ئه‌م دوو «عدّة»یه ناچن

بەیەکدا لەبەر ئەوە کە خاوەن «عدّة»کان دوو کەسن؛ جا ئەگەر لە یەکێکیانەوە ژنەکە سکی بوو، ئەوە «عدّة»ی سکەکە پێش ئەخرێ و بە دانانی سکەکە تەواو ئەبێ و لەپاش ماوەی زیسانی، دەس ئەکا بە «عدّة»ی دووهەم و ئەویش تەواو ئەکا؛ جا ئەگەر سکەکە لە مێردەکەیەوە بوو، ئەوە تا سکەکەی لێ ئەبێتەوە حەقی گێرانەوەی هەیە و پاش ئەوە حەقی نامێنێ وە ئەگەر لە غەیری مێردەکەیەوە بوو،ئەوە ئەو مێردە لە ماوەی «عدّة»ی سکەکەداو لە ماوەی «عدّة»کەی خۆیشیا هەر حەقی گێڕانەوەی هەیە، بەس ئەوەندە هەیە لەکاتێکدا کە ئەو ژنە تەڵاقدراوە بە تەڵاقی «رجعي» لە باخەڵی کابرای خاوەن شوبهەدا بێ، ناتوانێ بیگێڕێتەوە تا کابرا لەو ژنە جیا ئەبێتەوە و هەر بەوەکە کابرا نیازی جیابوونەوەی کرد، حوکمی جیابوونەوە کە سابت ئەبێ‌و حەقی گێڕانەوەی ژنەکە بۆ ئەم دێتەجێ.

**بزانن!** ئەگەر تەڵاقەکە «بائن» بوو و سکەکەیش لە غەیری مێردەکەیەوە بوو، ئەوە تا سکەکە دائەنێ ئەو مێردە ناتوانێ نیکاحەکەی تازە بکاتەوە، چونکە سکێ کە لە وەتئی شوبهەوە پەیدا بووبێ، حورمەتی هەیەو وەك سکی زینا نییە؛ بەڵێ، لەپاش دانانی سکەکە دروستە بۆی نیکاحەکە تازە بکاتەوە، هەرچەند هێشتا ژنەکە لە زەیسانی دەرنەچووبێ.

وە ئەگەر ژنەکە سکی نەبوو، ئەوە «عدّة»ی تەڵاقەکە ئەخرێتە پێش «عدّة»ی شوبهەکەوە، بە نیکاحی دانەمەزراو بێ یا نە و تەڵاقەکەیش لەپێش وەتئە شوبهەکەدا بێ یا لەپاشی ئەوەوە، لەبەر ئەوە کە تەڵاق هێزو ئیعتیباری زۆرترە لە «عدّة»ی شوبهە، چونکە تەڵاق تابیعی نیکاحی دامەزراوە؛ جا لەپاش ئەوە کە «عدّة»ی تەڵاقەکە تەواو بوو، دەست ئەکا بە «عدّة»ی وەتئە شوبهەکەیش و ئەویش تەواو ئەکا و لە ماوەی «عِدّة»ی تەڵاقەکەدا، کابرای مێردی حەقی گێڕانەوەی هەیە، ئەگەر تەڵاقەکە «رجعي» بێ و حەقی تازەکردنەوەی نیکاحەکەی هەیە، ئەگەر «بائن» بێ؛ جا کاتێ کە گێڕایەوە یا نیکاحەکەی تازە کردەوە، ئەوە «عدّة»ی تەڵاقەکە ئەبڕێتەوەو ژنەکە دەست ئەکا بە بە «عدّة»ی وەتئە شوبهەکە و لە ماوەی ئەو «عدّة»ی شوبهەیەدا، بە قەتعی دروست نییە بۆ مێردەکەی لەزەت لەو ژنە وەربگرێ تا «عدّة»کەی تەواو ئەبێ.

هەروەها لە غەیری ئەم ماددەیشەدا، ئەگەر ژنی کابرایەك وەتء کرا بە شوبهە، ئەوە ئەو ژنە «عدّة»ی شوبهەی ئەکەوێتە سەر و لەو «عدّة»یەدا بۆ مێردەکەی دروست نییە لەزەتی لێ وەربگرێ، خواه لەو شوبهەوە سکی پڕ بووبێ یا نە. ئەگەر ژنێك لەلایەن دوو کەسەوە بە شوبهە وەتء کرا بە نیکاحی دانەمەزراو یا بە غەیری نیکاحی دانەمەزراو، ئەوە ئەگەر بەهۆی یەکێکیانەوە سك پەیدا بووبوو لە ژنەکەدا، «عدّة»ی ئەو سکە ئەخرێتە پێشەوە وە ئەگەر سك پەیدا نەبووبوو، ئەوە هەرکامیان لەپێشا شوبهەکەی بووە، «عدّة»کەی پێش ئەخرێ وە هەر کامیان ئارەزووی هەبێ، ئەتوانێ لە «عدّة»کەی خۆیدا بە عەقدی دامەزراو ئەو ژنە نیکاح بکا و ناتوانێ لە «عدّة»ی ئەویاندا مارەی ببڕێ، چونکە «عدّة»ی غەیر، مانیعی دامەزرانی عەقدی نیکاحە.

ئەگەر کەسێك بە عەقدێکی دانەمەزراو ژنێکی مارە کردو وەتئی کرد و کەسێکی تریش بە شوبهە ئەو ژنەی وەتء کرد، یا لەپێش وەتئی کابرای خاوەن عەقددا یا لەپاش وەتئی ئەودا بەڵام لەپێش ئەوەدا کە ژنەکە جیابکرێتەوە لێی، ئەوە لە هەردوو سوورەتەکەدا عیددەی ئەو کابرایە پێش ئەخرێ کە بەتەنها شوبهە، بە بێ عەقد وەتئی ژنەکەی کردووە، چونکە «عدّة»ی خاوەن عەقدەکە دەس پێ ناکا تا لەگەڵ ژنەکەدا لە یەك جیا نەبنەوە، بەڵام «عدّة»ی وەتئی شوبهەی رووت لەکاتی تەواوبوونی وەتئەکەدا دەس پێ ئەکا؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای خاوەنی عەقدی دانەمەزراو وەتئی کردو لە ژنەکە جیاکرایەوە و لەپاشا یەکێکی تر بە شوبهە ئەو ژنەی وەتء کرد، ئەوە «عدّة»ی خاوەن عەقدەکە پێش ئەخرێت.

بزانن! ئەگەر ژنێکی تەڵاقدراو دوو قورئی تەواو کرد ئەو جار بە عەقدێکی دانەمەزراو مارە کرا بۆ یەکێ و لە یەك جیا نەکرانەوە تاساڵی نائومێدبوونی ژنەکە لە حەیز، ئەوە مانگێك تەواو ئەکا بۆ تەواوکردنی «عدّة»ی تەڵاقەکەی، ئەوجار سێ مانگیش تەواو ئەکا بۆ «عدّة»ی نیکاحە دانەمەزراوەکە.

## باسی ڕەفاقەتی پیاو بۆ ژنی خاوەن «عدّة»

ئەگەر مێردی ژنی تەڵاق دراو ڕەفاقەتی ژنەکەی کرد وەکوو مێردی ژن، بەڵام وەتئی نەکرد وە «عدّة»ی ژنەکەیش بە حەیز و پاکی بوو یا بە مانگ بوو، ئەوە ئەگەر تەڵاقەکە «بائن» بێ، «عدّة»ی ژنەکە بەسەر ئەچێ و ئەو ڕەفاقەتە نابێ بە مانیع وە ئەگەر تەڵاقەکە «رجعي» بێ، ئەوە بە قەتعی تا کابرا ڕەفیقی بێ، «عدّة»ی تەواو نابێ، هەرچەند دەساڵیش پێکەوە بمێننەوە و لە هەموو ماوەی ڕەفاقەتیانا ئەگەر تەڵاقی بدا، تەڵاقی پێوە ئەنووسێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە ماوەی تەواوکردنی سێ حەیزو پاکیدا، ئەگەر خاوەن حەیز بێ و لە ماوەی سێ مانگدا، ئەگەر بێحەیز بێ، ئەو مێردەی حەقی گێڕانەوەی هەیە و لەوە زیاتر حەقی نییە.

وە ئەگەر وەتئی کرد و لە وەتئەکەوە سکی نەبوو، ئەوە هەر حوکمەکەی پێشوو ئەمێنێتەوە؛ ئەگەر سکی بوو، ئەوە تا سکەکەی لێ جیا ئەبێتەوە حەقی گێڕانەوەی هەیە وکە سکەکەی دانا «عدّة»کەی تەواو ئەبێ، هەرچەند لەپاشانیشدا هەر پێکەوە بن.

وە ئەگەر پیاوێکی بێگانە لە ماوەی «عدّة»دا ڕەفاقەتی ئەو ژنەی ئەکرد، ئەوە نابێ بە مانیعی بەسەرچوونی «عدّة»کەی و «عدّة»کەی بەسەر ئەچێ، هەروەها تا «عدّة»کەیشی تەواو ئەبێ تەڵاقی پێوە ئەنووسێ.

وە ئەگەر کەسێك ژنێکی مارە کرد کە «عدّة»ی کەسێکی تری بەسەرەوە بوو، ئەوە لەکاتی وەتء کردنیەوە «عدّة»ی کابرای پێشوو ئەبڕێتەوە تا ئەم کابرا جیا ئەکرێتەوە لە ژنەکەی و کە جیا کرایەوە، ئەگەر ژنەکە بەم وەتئە سکی بووبوو، ئەوە لەپێشا «عدّة»ی سکەکە تەواو ئەکا، ئەگینا پاشماوەی «عدّة» پێشووەکە تەواو ئەکا و لەپاش ئەو «عدّة»ی، وەتئی ئەم نیکاحە دانەمەزراوەیش تەواو ئەکا.

ئەگەر کەسێك تەڵاقدراوێکی «رجعي»ی هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆیو دووبارە تەڵاقی دایەوە، ئەوە ئەگەر ئەو ژنە دووگیان بووبێ، «عدّة»ی بە دانانی سکەکەیەتی وە ئەگەر دووگیان نەبووبێ، پێویستە «عدّة»یەکی تر لەسەرەوە بژمێرێ وە ئەگەر لەپاش

دانانی سکەکەی مارەی کردەوەو دووبارە تەڵاقی دایەوە، پێویستە «عدّة»یەکی تر تەواو بکا، هەرچەند کابرا ئەمجارە وەتئی نەکردبێ.

وە ئەگەر کابرایەك خولعی کرد لەگەڵ ژنێکا کـە چـووبووەلای‌و لەپـاشا مـارەی کردەوەو رۆیشتەلای‌و ئەمجار تەڵاقی دایەوە، پێویستە «عدّة»یەکی تر تەواو بکـا وە ئەگەر نەرۆیشتەوە لای، یەعنی وەتئی نەکردبوو، «عدّة»ی ناوێ و ئەتوانێ لەپاش ئەم تەڵاقە دەس‌بەجێ شوو بکات وە فەرقی بەینی ئەم سوورەتەو سوورەتی تەڵاقی ژنـە دوو گیانەکە لەپاش جیابوونەوەی سکەکەی کە وتمان ئەگەر وەتئیشی نەکردبێ هەر «عدّة»ی ئەوێ، ئەوەیە ژنی تەڵاق دراوی «رجعي»، وا لە حوکمی ژنـی ئـینساندا و مادام ئەو ژنە زووتر وەتـء کرابوو، ئەوە وەك ئەوە وایە لە هەمانکاتدا تەڵاق درابـێ، لەبەر ئەوە «عدّة»ی ئەوێ، بەڵام ژنێ کـە خـولعی لەگـەڵدا کـرابـێ، پـەیوەندی بـە مێردەکەیەوە نامێنێ؛ کەواتە، ئەگەر لەپاشا مارەی کردەوە و پێش چوونەلای تەڵاقی دا، ئەوە بەشەرع حوکمی تەڵاقی ژنی وەتـء نەکراوی هەیەو «عدّة»ی ناوێ.

## باسی نەکردنی هەندێك ئیش بەهۆی مردنی کەسێکەوە (اِحداد)

«اِحداد» لە زمانی عەرەبیدا واتە بەکارنەهێنانی تیغی تیژ بـۆ لابـردنی مـوو و لە عورفی شەرعدا بریتییە لە نەکردنی ئەو شتانەکە باسیان ئەکەین. ئەم «احداد»ە، واجبە لەسەر ژنێك کە لە «عدّة»ی وەفاتدا بێ، و سوننەتە بۆ ژنێك کە لە «عدّة»ی تەڵاقـی «بائن»دا بێ؛ واجبە لەسەر ژنێك کە لە «عدّة»ی وەفاتدا بێ، دەس هەڵبگرێ لە پۆشینی هەر جل‌و بەرگێك کە رەنگ کرابێ بۆ جوانی، هەرچەند زبریش بـێ، بـەڵام حـەڵاڵە لەبەرکردنی بەرگی سادەو رەنگ نەکراوی لۆکەو خوری‌و کەتان و ئاورێشم، هەروەها بەرگێك کە رەنگ کرابێ بەڵام بۆ جوانی رەنگ نەکرابێ، وەکوو بەرگی رەش‌و تێرو تۆخ لە سەوزو شین‌و نیلی‌و سورمەیی.

هەروەها، واجبە دەس هەڵگرتن لە بەکارهێنـانی خشـڵی ئـاڵتـوون‌و زیـوو هـەر گەوهەرێکی تر و حەرامە بە بێ‌عوزر بۆنی‌خۆش بـەکـاربینێ بـۆ لەش و خـواردن‌و

خواردنەوە و حەرامە چاوی بڕێژی بە کلە، مەگەر لە ترسی چاوئێشەو تێکچوونی چاوی، هەروەها حەرامە بەکارهێنانی خەنەو وسمەو زافەران، لەبەر پێویستی لەش نەبێ و حەرامە سووراوو سپیاوکردنو باریك کردنەوەی برۆ؛ بەڵێ، حەڵاڵە جوانکردنی فەرشو نوێنو کەلوپەلی ناوماڵو قاپو قاچاخو خۆ بە پاكڕاگرتن لە لەشو جلو بەرگو پۆشاکا بە خۆشۆردنو نینۆك کردنو چڵكو موو لابردنو چوونە حەمام، مادام بەشێوەیەکی حەرام نەڕواتە دەرەوە، ئەگینا حەرامە، مەگەر لەبەر ناچاری.

ئەگەر ژنێك کە لە «عدّة»ی وەفاتدا بێ تەرکی ئیحدادی کرد، ئەوە گوناهبار ئەبێ بەڵام زیانی نییە بۆ بەسەرچوونی «عدّة»کەی وە ئەگەر ژنێك نەیزانیبوو کە مێردەکەی مردووەو بە هەڵکەوت لە ماوەی ئەو چوار مانگو دە ڕۆژەدا ئیحدادی کرد، ئەوجار خەبەری مردنی مێردەکەی بیست لە پێش ئەو موددەیەدا، ئەوە «عدّة»کەی بەسەرچووەو ئیحدادەکەشی جێبەجێ کردووە.

دروستە بۆ ژن ئیحداد بۆ غەیری مێردیشی بکا، وەکوو خزمو دۆستو ئاشنا، بەڵام نابێ لە سێ ڕۆژ زیاتر بێ وە حەرامە ئیحداد لەسەر پیاو بۆ هیچ کەسێکی، بەڵام "ئیمام" فەرموویەتی: دروستە بۆی تا سێ ڕۆژ خۆی زویر بکا.

## باسی جێگای دانیشتن بۆ ژنێك کە لە «عدّة»دا بێ

واجبە ئامادەکردنی جێگای دانیشتن بۆ ژنێك کە لە «عدّة»دا بێ، مادام «ناشِزة» نەبێ، خواه لە «عدّة»ی تەڵاقی «رجعي» یا «بائن»دا بێ؛ هەروەها واجبە بۆ ژنێك کە لە «عدّة»ی وەفاتدا بێ، یا لە «عدّة»ی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحدا بێ، بە پێی ئەوەی کە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا هەیە.

واجبە لەسەر ژن کە بمێنێتەوە لەوماڵەدا کە لەکاتی جیابوونەوەکەدا تیایا بووە و دروست نییە کەس دەری بکا لەو شوێنە، نە مێردەکەی و نە میراتبەرەکانی و دروست نییە خۆیشی بڕواتە دەرەوە؛ بەڵێ، دروستە بە ڕۆژ دەربچێ بۆ کڕینی پێویستی خۆی، وەك خواردەمەنیو هەرشتێ کە ژن ئیحتیاجی پێ‌ببێ، وەك سابوونو دەرزیو دەزوو

شتیوا و به شەویش دەربچێ بۆ ماڵە دراوسێ بۆ قسەی حەلاڵو خەبەر پرسی نەخۆش‌و دڵخۆشیدانەوەی کەسێك کە تووشی خەم و خەفەت بووبێ؛ هەروەها، دروستە بڕوا بۆ خەریك‌بوون بە جل‌دوورین و تەشی رستن‌و هەر ئیشێکی‌تر کە بە عادەتی ئەو شوێنە ئەو ژنانە ئەیکەن، چونکە ئینسان لەگەڵ هاوڕێدا ئیشی باشتر پێ‌ئەکرێ؛ بەڵام واجبە لەسەری بۆ نووستن بێتەوە بۆ خانووەکەی خۆی.

هەروەها، دروستە -بەڵکوو واجبە- خانووەکەی خۆی بەجێ‌بهێڵێ لە ترسی رووخان‌و سووتان‌و ئاوبردن و لە ترسی دزو درۆزن‌و هێرشی ئینسانی بێ‌ئەخلاق، هەروەها ئەگەر تووشی ئازار بووبێ لە دراوسێکانیەوە، یاخود دراوسێکانی تووشی ئازار بین لە نزیکی ئەوەوە.

هەر ئافرەتێك كە لە «عدّة»دا بێ‌و نەفەقەی واجب نەبێ لەسەر مێردەکەی، ئەتوانێ بڕواتە دەرەوە بۆ کاسبی‌کردن‌و پەیداکردنی شتێ کە گوزەرانی پێ‌بکا بە پێی عادەت و لەسەر عادەت بێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی‌و شەو لەوێ بنوێ وە ئەگەر بە ئیزنی مێردەکەی گواستیەوە بۆ ماڵێك‌و لەپێش گەیشتنیا بۆ ئەو ماڵە، مێردەکەی تەلاقی دا، یاخود مرد، ئەوە ژنەکە ئەتوانێ لەو ماڵەدا بمێنێتەوە تا «عدّة»ی تەواو ئەبێ، ئەگەر مەجالی هەبێ وە ئەگەر بە بێ‌ئیزنی مێردەکەی چوو بۆ ئەو ماڵە، واجبە لەسەری بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی‌و بۆ شوێنەکەی خۆی، هەروەها ئەگەر ئیزنی‌دابوو بچێ بەڵام لە پێش چوونەکەیدا «عدّة»ی تەلاق یا عیددەی وەفاتی کەوتەسەر.

وە ئەگەر بە ئیزنی مێردەکەی رۆیشت بۆ حەج یا بۆ بازرگانی و لە رێگەدا «عده»ی کەوتەسەر، ئەتوانێ بڕوا بۆ ئەو شوێنە و لەوێ ئیشەکەی جێ‌بەجێ بکا؛ جا ئەگەر هیچی لە ماوەی «عدّة»کەی مابوو، بێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و لەوێ «عدّة»کەی تەواو بکاو ئەیشتوانێ هەر لەو شوێنەداکە خەبەرەکەی تیابیستووە، بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و لەوێ ماوەی عیددەکەی بەسەر ببا.

ئەگەر ژنەکە دەرچوو بۆ شوێنێك‌و لەوێ کابرا تەلاقی دا، جا کابرا وتی: ئیزنم نەداوە بڕوا بۆ ئەو شوێنە و ژنەکەیش ئیددیعای کرد کە ئیزنی داوە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی

کابرا ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر ژنەکە ئیددیعای کرد کە مێردەکەی کۆچی پێ کردووە بۆ ئەو شوێنە تا لەوێ بمێنێتەوەو کابرایش ئەیوت: هەر بۆ ماوەی جێبەجێ کردنی ئیشی خۆی ئیزنم داوە، ئەوە هەر باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ.

**بزانن!** کەپرو دەواری کۆچەریش وەکوو خانووی نیشتەنی وایە لە حوکمدا، یەعنی ئەو ژنە لە هەر دەوارێکا «عدّة»ی کەوتەسەر، واجبە لەوێ دەرنەچێ تا «عدّة»کەی ئەباتە سەر، مەگەر ئەو هۆزە لەو هەوارە بگوێزنەوە، ئەوە لەو کاتەدا لەگەڵیانا ئەگوێزێتەوە.

ئەگەر ئەو هۆدە ژنەکەی تیایە موڵکی مێردەکەی بوو و لایق بوو بۆ ژنەکە، واجبە هەر لەوێ بمێنێتەوەو دروست نییە کابرا خۆی یا میراتبەرەکانی بیفرۆشن، مەگەر لە «عدّة»یەکدا کە بە مانگ بێ، ئەوە لەم سوورەتەدا فرۆشتنەکەی دروستە، بەڵام واجبە ژنەکە لەویادا بمێنێتەوە تا «عدّة»کەی تەواو ئەبێ وە ئەگەر ئەو هۆدەیە زۆر نایابو بەقیمەت بوو، دروستە ژنەکە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکیوا کە لایق بێ بە شانی ژنەکە وە ئەگەر شوێنێکی سووك و بێقابیلەت بوو، ژنەکە ئەتوانێ دانەنیشێ تیایاو واجبە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی باشو شایان.

وە ئەگەر هۆدەکە خواستەمەنی بوو، هەر واجبە ژنەکە تیایا دانیشێ، مەگەر خاوەنماڵەکەی پەشیمان ببێتەوەو بەکرێیش رازی نەبێ، ئەوە لەو کاتەدا پێویستە بگوێزرێتەوە، هەروەهایە هۆدەی کرێچی ئەگەر ماوەی بەکرێدانەکەی تەواو بووبێ وە ئەگەر هۆدەکە ماڵی ژنەکە بوو، ئەوە واجبە تیا بمێنێتەوە، بەڵام ئەتوانێ داوای کرێ بکا لە کابرا یا لە میراتبەرەکانی.

**بزانن!** دروست نییە لە ماوەی «عدّة»دا کابرا لەگەڵ ئەو ژنەدا لە یەك ماڵدا دابنیشێ؛ هەروەها، دروست نییە هاتوچۆیش بکا بۆ لای؛ بەڵێ، ئەگەر لەو خانووەدا نێرینەیەکی مەحرەمی ژنەکە هەبوو کە خاوەن تەمیزو فام بوو، یا مەحرەمێکی کابرا هەبوو ـ هەرچەند ژنیش بێ ـ یا ژنێکی بێگانەی لەگەڵدا بوو، ئەوە دروستە کابرا هاتوچۆ بکا بۆلای، هەرچەند کەراهەتی هەیە؛ هەروەها، ئەیشتوانێ لەم سوورەتەدا هاومەنزڵی لەگەڵدا بکا، بەو شەرتەکە ئەوکەسانە شەرمیان لێ بکرێو شوێنەکەیش ئەوەندەگەورە بێ کەسیان دەخڵیان بەسەر کەسیانەوە نەبێ.

وە ئەگەر لە یەك خانوودا دوو هۆدە هەبوو ژنەکە لە یەکێکیاناو کابرا لەویاندا دائەنیشتن، ئەوە ئەگەر هەردوو هۆدەکە پێویستییان جیاواز نەبوو لە یەك، وەکوو چێشتخانەو ئاودەسخانەو بیرو بەلووعەو حەوزو دەس‌شۆرو پلەکانەو سەربان، ئەوە وەکوو یەك، خانووی گەورە وایەو بە بێ‌مەحرەمێکی شەرم لێ کراو یا بێگانەیەکی‌وا، دروست نییە دابنیشێ لەو هۆدەیەدا وە ئەگەر ئەم پێویستییانەیان جیا بوو، ئەوە دروستە هەریەکێ لە هۆدەی خۆیدا دانیشێ ـ هەرچەند مەحرەمیش نەبێ لەگەڵ ژنەکەدا ـ بەم شەرتە رێگای هاتوچۆ لە هۆدەی ژنەکەوە بۆ هۆدەکەی کابرا بەسرابێ‌و قایم کرابێ؛ دوو هۆدەی سەرخان‌و ژێرخانیش وەکوو ئەم دوو هۆدەیە وەهان لە حوکمدا.

## باسی ئەو مەسرەفانەی واجبن لەسەر ئینسان (نَفَقة)

نەفەقە، واجبە لەسەر ئینسان بۆ خۆی‌و بۆ ژن‌و منداڵ و باوك و دایك‌و غەیری ئەمانەیش، بە پێی ئەو ئوسوولەی کە لەمەوپاش بەیان ئەکرێن.

واجبە لەسەر مێرد مەسرەف بکا بۆ ژنی خۆی لە چەند لایەکەوە؛

یەکەم: خواردەمەنی کە قووت بێ بەگوێرەی حاڵی کابرا لە دەوڵەمەندی‌و گەدایی‌و مام‌ناوەندییەتی، ئیتر پەیوەندی نییە بە بەرزی‌و پەستی ژنەکەوە؛ جا واجبە لەسەر پیاوی دەوڵەمەند، هەموو رۆژێ بە هەڵاتنی بەرەبەیانی ئەو رۆژە دوو «مُدّ» وە لەسەر گەدا، یەك «مُدّ» و لەسەر مام‌ناوەندی، «مُدّ» و نیوێك لە قووتی ساغی زیاتر بە کارهاتووی ئەو شوێنە ـ کە ژنەکەی تیا ئەژێ ـ بدا بە دەستی ئەو ژنەوە وە ئەگەر عادەت هەر خواردنی خورما یا گۆشت یا شتێکی‌وا بوو، هەر ئەوە واجبە.

بزانن! گەدا، لێرەدا ئەو «مِسکین»ەیە کە زەکاتی پێ‌ئەشێ وە هەرکەس لەوانە کە «مُدّ» و نیوێك ئەدا، ئەگەر هەمیشە دوو «مدّ»ی لێ‌بستێنرێ، ببێ بە گەدا، ئەوە بە مام‌ناوەندی دائەنرێ، ئەگینا دەولەمەندە وە «مُدّ»، بریتییە لە وەزنی سەدو حەفتاو یەك درەم‌و سێ حەوت‌یەکە درەمێك.

دووەم: پێخۆر بۆ ئەو خواردەمەنییە کە ئەبێ لەوجۆرە پێخۆرە بێ کە زۆربەی خەڵکی وڵاتی ژنەکە ئەیخۆن‌و بە گۆڕانی فەسڵەکانی ساڵ ئەگۆڕێ، وەکوو شیرو

ماستو دۆو رۆنو پەنیرو بامیەو تەماتەو باینجانو کوولەکەو پەتاتەو گۆشتو غەیری ئەمانەیش؛ هەروەها، واجبە لەسەری میوەیش بکڕێ بۆی لەسەر عادەت و ئەمانە ئەندازەیەکی دیاری کراویان نییە، بەڵکوو قازی بە ئیجتیهادی خۆی تەقدیری ئەکاو فەرق دائەنێ لەبەینی دەوڵەمەندو فەقیرو مام ناوەندی دا؛ هەروەها واجبە لەسەری چایی و قاوەو جگەرەیش بکڕێ بۆ ژنێك کە فێری خواردنی ئەمانە بێ، هەروەها ئەو حەڵواو نوقڵو شیرینییەیش کە لە جەژنەکانا عادەتە ئەکرێ.

**سێهەم:** قاپ و قاچاخ بۆ چێشتو نانو ئاوو پێخۆر بەگوێرەی پێویست، هەروەها قۆری و پیاڵە بۆ چا و فنجانو جزوە بۆ قاوە.

**چوارەم:** بەرگ و پۆشاکەو ئەمیش ئەگۆڕێ بەپێی وڵات لەبارەی گەرماو سەرماو فێنکییەوە و بەپێی دەوڵەمەندی و فەقیریی کابرا؛ مەسەلا، لە کتێبە شەرعەکاندا هەیە کەوا: واجبە بۆ کاتی هاوین کراس و دەرپێ و سوڵو سەرپۆش. وە بۆ زستان، کۆڵەنجەیەکی گەرمیشی ئەخرێتەسەر، بەڵام ئەمانە تەنها نموونەن و ئەوەی لەڕاستیدا واجبە، بریتییە لە جلو بەرگی ئەو فەسڵە بەپێی عادەتی ژنی ئەو وڵاتە و بەگوێرەی دەسەڵاتو دەس ڕۆیشتنی کابرا.

**پێنجەم:** فەرشێکە کە لەسەری دابنیشێ یا لەسەری بنوێ، و شتێکە کە بیدا بەخۆیا، وەکوو لێفەو بەتانیو ئەمەیش دووبارە بەگوێرەی فەسڵو بەگوێرەی دەوڵەمەندیو فەقیریی کابرا ئەگۆڕێ؛ هەروا، سەرینێك یا پشتییەکیش بۆ ژێر سەری پێویستە.

**شەشەم:** شوێنێکە کە ژنەکە تیا دانیشێو بەجۆرێکیوا بێ کە لایق بێ بۆ شانو پایەی کابرا.

**حەوتەم:** کرێی ئامادەکردنی خۆراکی ژنەکەیە، وەکوو گەنمهاڕینو نانکردنو چێشت لێنانو شتیوا، مادام ژنەکە لە هۆزێك نەبێ کە دەستووریان وایە ئەو شتانە بۆ خۆ ئەکەن.

**هەشتەم:** دارو خەڵووزو نەوتو سووتەمەنیترە بۆ دفعی سەرماو بۆ ئامادەکردنی نانو چێشتو چا، هەروەها، چراو نەوتو پارەی ئاوو کارەبا بەگوێرەی حاڵی کابرا.

**نۆهەم:** ئەسبابی خۆ پاك کردنەوەو خۆ شۆرین، وەکوو شانەو مەقەستو سابوونو عەتری بۆنخۆشکردنو پارەی حەمام بۆ خۆشۆردن لەبەر لەشپیسییەك کە بە هۆی کابراوە پەیدا بووبێ، یا لەبەر زەیسانی، بەڵام پارەی حەمام بۆ خۆشۆردن لەبەر شەیتانی بوون یا لەبەر دوایی هاتنی حەیز، ئەوە لەسەر کابرا واجب نییە.

**دەهەم:** ژنێك کە خزمەتی ژنەکە بکا، ئەگەر ئەم ژنە لە ماڵی خۆیا کارەکەری بووبێ؛ جا ئەگەر ئەم کارەکەرە بەکرێ گیرابوو، ئەوە هەر کرێکەی واجبە لەسەر کابرا، ئەگینا هەموو مەسرەفێکی لەسەر کابرایە، وەك چۆن بۆ ژنەکەی خۆی مەسرەف ئەکا، بەڵام فەرق ئەخرێ لەجۆری مەسرەفەکەدا لەبارەی هەرزانیو گرانییەوە.

هەرچی پێویستە بۆ ژنەکە لەمشتانە کە کابرا بۆی ئەکڕێ، هەمووی ئەبێ بە موڵکی خۆی و لە موڵکی کابرا دەرئەچێ، چ خواردەمەنیو چ قاپو قاچاخو چ بەرگو پۆشاکو فەرشو نوێنو غەیری ئەمانە، تەنها جێگای دانیشتن نەبێ، ئەوە تەنها بۆ سەربردنی وەختە تیایداو نابێ بە موڵکی ژن بەوە کە کابرا بیخاتە ژێردەستی، بەڵکوو دروستە کابرا بەدرێژایی تەمەنی لە ماڵی کرێدا دابنیشێ، یا لە ماڵی خواستەمەنیداو ژنەکەی لە ماڵیوادا دابنێ.

**بزانن!** ئەو دەستەجلە گرانبەهایە کە لەکاتی گوێزانەوەی ژندا ئەکرێ بۆی، ئەبێ بە موڵکی ژنەکە، چونکە عادەتی گشتی وایە جلی وەختی گواستنەوە ئەبێ جوانو بەقیمەت بێ ئەوەندەی حاڵی کابرا، بەڵام ئەو جلەجوانە کە پاش ئەو کاتە دروست ئەکرێ بۆ هەندێ وەخت، وەکوو شاییو دیدەنی دۆستان، ئەوە هەر موڵکی کابرا خۆیەتیو نابێ بە هی ژنەکە؛ هەروەها، ئەو پارچە زێڕو زیوەکە کابرا ئەیکا بۆ ژنەکەی، یا ئەو گەوهەرو مووروو و کارەباو بازنو غەیری ئەمانە، هەر موڵکی کابرانو ئەگەر نەیاندا بە ژنەکەی، نابن بە موڵکی.

هەر شتێ ببێ بە موڵکی ژنەکە لە خواردەمەنیو بەرگو فەرشو نوێنو قاپو قاچاخ، واجب نییە کابرا بیکاتە موڵکیەوە، بەڵکوو کافییە کابرا بە بێوتنی لەفز بیدا بە ژنەکە بە نیازی تەسلیمکردنی ئەوەی واجبە لەسەری؛ بەڵام شێخ لە «تُحفە»دا

ئەفەرموێت: ئەو نیازەیش پێویست نییە، بەڵکوو هەر ئەوەندە شتێ نەبێ کە مانیع بێ لە نیازی بەموڵك کردن، ئەوە ئەبێ بە موڵکی ـ هەرچەند کابرا نیازی بـەموڵك کـردنیش نەکا ـ جا ئەگەر کابرا وەختی خۆی فەرش و نوێنی ئەوەندەی حاڵی ژنەکە پێدا، ئەوە ئەبێ بە موڵکی ژنەکە، بەڵام ئەگەر فەرشێکی گەورەیوای پێدا کە جێگەی کۆمـەڵە خەڵکێکی لەسەر ئەبووەوە، یا لێفەیەکی خێزانی گەورەی پێدا، ئەوە مادام بـە لەفـز هەمووی نەکا بە موڵکی ژنەکە، ئەو ژنە ئەبێ بە شەریك لەو فەرشو نوێنەدا ئەوەندەی پێویستی خۆی وە ئەگەر کابرا مرد، یا تەڵاقی دا، هەموو ئەو فەرشو نوێنە گـەورەیە نابات، بەڵکوو بەئەندازەی بەشی خۆی لەوانە ئەکەوێ؛ جا یا پارەی پێ ئەدەن لەجیاتی بەشەکەی خۆی، یاخود ژنەکە پارە ئەداتەوە لە قیمەتی باقیماندەی فەرش و نوێنەکەدا.

**بزانن!** ئەگەر ژنەکە بەرگ و پۆشاك و فەرش و نەفەقەی خۆی فەوتاند، ئەوە بۆی نابژێررێو لەسەر خۆیەتی، بەڵام ئەگەر کابرا فەوتاندی، ئەبێ بۆی ببژێرێ، یا ئەگەر بێگانەیەك فەوتاندنی، واجبە ئەو بێگانەیە بیبژێرێ.

**بزانن!** بەرگ، ساڵی دوو جار تازە ئەکرێتەوە بە ئیعتیباری بەرگی کاتی گەرماو کاتی سەرما وە فەرش تازەناکرێتەوە تا لە کەڵك نەکەوێ، هەروەها قاپ و قاچاخیش؛ جا ئەگەر ژنەکە خواردەمەنی شەش مانگ، یاخود بەرگی ئەوەندەی وەرگرتو لەپاشا بوو بە «ناشِزة»و لە فەرمانی مێردەکەی دەرچوو، یا تەڵاقی دا، ئەوە ئەو نەفەقەو بەرگەی وا بەلایەوە لێی ئەسەنرێتەوە.

ئەگەر لە ماوەیەکدا ژنەکە لەگەڵ مێردەکەیدا نانو چێشتو میوەی خوارد، ئەوە نەفەقەی ناکەوێ بۆ ئەو ماوەیە، مەگەر ئەو ژنە نەفام بێو وەلییەکەشی ئیزنی نەدابێ بۆ ئەو خواردنە، ئەوە نەفەقەی قەرزە لەسەر کابراو؛ هەروەها، ئەگەر کابرا لە ماوەیەکدا بەرگی بۆ نەکرد، ئەوە حەقی ئەو بەرگەی نافەوتێو قەرزە لەسەر کابرا.

**بزانن!** واجبە لەسەر مێرد تەسلیمکردنی دەرمان بۆ نەهێشتنی چڵك و بۆنی بنباڵو بۆنی دەم بە ژنەکە ئەگەر پێویستی پێی بوو، بەڵام واجب نییە لەسەری ئەو شـتانەی پێبدا کە خۆی پێ جوان ئەکا، وەك متو مووررووو سووراوو سپیاو؛ هەروەها، واجب

نییە لەسەر مێرد ئەگەر ژنەکەی نەخۆش کەوت حەقی دوکتۆری بۆ بدا، بەڵام چونکە لەکاتی نەخۆشیشدا هەموو نەفەقەیەکی خواردەمەنی لەسەر مێردەو ئەوەی کە ئەیکەوێ سەرفی ناکا، قابیلە مێرد لەجیاتی ئەو نەفەقەیە پارەی تیمارکردن و دەرمانی بۆ بدا.

## نەفەقە بە چی واجب ئەبێ؟

نەفەقە، واجب ئەبێ بۆ ژن لەسەر مێردەکەی بەوە کە خۆی بدا بەدەستەوە، یەعنی ئەگەر خاوەن فام بوو بڵێ: وا حازرم بۆ ئەوەی مێردەکەم بێتەلام وە ئەگەر نەفام بوو، وەلی ئەمرەکەی بڵێ: کچەکەمم ئامادەکردووەو مانیعمان نییە مێردەکەی بیگوێزیتەوە؛ بەڵێ، ئافرەتێکی بچووکی واکە قابیلی ئەوە نەبێ مێرد بچێتەلای، نەفەقەی واجب نابێ، هەرچەند وەلییەکەشی بیدا بە دەستەوە، بەڵکوو ئەو بەدەستەوە دانەیەش حەرامە، چونکە لەوانەیە ئەو ئافرەتە بچووکە بکەوێتە مەترسییەوە؛ بەڵام ئەگەر ژنەکە گەورەو مێردەکەی منداڵو نابالغ بوو، یا شێتو نەفام بوو، یا نەخۆش بوو، ئەوە هەر بەوە کە ژنەکە خۆی بدا بەدەستەوە نەفەقەی واجب ئەبێ، چونکە مانیع لای مێردەکەوەیە وە بە تەنها عەقدی نیکاحو بێ خۆ بەدەستەوەدانی ژن، نەفەقەی بۆ واجب نابێ بە هیچ جۆرێ.

ئەگەر ژنەکە پیشانی داکەوا خۆی ئەدا بەدەستەوە، ئەوە نەفەقەی واجب ئەبێ بە گەیشتنی خەبەری ئەوە بە مێردەکەیو رابوردنی ماوەیەکی واکە لەوماوەیەدا بە عادەت کابرا بگا بە ژنەکە وە ئەگەر کابرا ویستی ژنەکەی لە شارەوە بیا بۆ لادێ، واجبە لەسەر ژنەکە مل پێچی نەکا، ئەگەر مل پێچی کرد، نەفەقەی ئەفەوتێ؛ بەڵام ئەگەر ماوەیەك لەبەر عوزرێکی شەرعی، وەك نەخۆشی، یا وەك پێ هەڵنەگیرانی ئالەتی مێردەکەی خۆی نەدا بەدەستەوە، ئەوە نەفەقەی نافەوتێ.

ئەگەر پیاوو ژنەکە قسەیان یەکی نەگرتەوە لەبارەی خۆ بەدەستەوە دانەوە؛ مەسەلا، ژنەکە وتی: خۆمم داوە بە دەستەوەو کابرا ئینکاری کردو شاهیدیش لەبەیندا نەبوو، ئەوە باوەڕ بە سوێندی کابرا ئەکرێ وە ئەگەر قسەیان لەبارەی مل پێچی کردنی ژنەوە لە

فەرمانی مێرد یەك نەكەوت، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ژنەكە ئەكرێ كەوا مل پێچی نەكردووە لە فەرمانی مێردەكەی.

واجبە لەسەر ژنەكە بەعادەت لە شوێنی دانیشتنی خۆیا بمێنیتەوەو بەجێی نەهێڵێ، مەگەر لەبەر عوزرێكی شەرعی، وەكوو ترسی رووخانی ماڵەكە یا ترسی ئاوو ئاگر یا دزو درۆزنو پیاو خراپ؛ بەڵام ئەگەر بە عادەت بڕواتە دەرەوە بۆ ماڵە دراوسێو بۆ دیدەنی خزمو دۆست یا بۆ قسەكردن، ئەوە بە مل پێچیكردوو دانانرێ، مەگەر كابرا بە لەفزی سەریح مەنعی بكا، ئەوكاتە بە بێ عوزرێكی وەكوو عوزرە پێشووەكان، دروست نییە ماڵەكەی خۆی بەجێ بهێڵێ وە ئەگەر بەجێی هێشت، نەفەقەی ئەفەوتێ تا دێتەوە بۆ ژێر فەرمانی مێردەكەی.

ئەگەر ژنەكە لەگەڵ كابرا چوو بۆ سەفەر، ئەوە نەفەقەی نافەوتێ؛ هەروەها، ئەگەر بڕوا بۆ سەفەر لەبەر مەسڵەحەتی كابرا بە ئیزنی ئەو خۆی؛ بەڵام ئەگەر بۆ مەسڵەحەتی خۆی سەفەری كرد ـ هەرچەند سەفەری حەج یا عەمرە بێو كابرا ئیزنی دابێ ـ یاخود بە بێ ئیزنی كابرا سەفەری كرد، ئەوە لە ماوەی سەفەرەكەیدا نەفەقەی ناكەوێ.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە كابرا ناتوانێ مەنعی ژنەكەی بكا لە كردنی نوێژی فەرزو رەواتبی «مُؤَكَّدة» لە ئەوەڵی وەختەوە، بەڵام ئەتوانێ مەنعی بكا لە كردنی نوێژی سوننەتی غەیرە «رواتِب» و فەرزێ كە بە عوزر فەوتابێ، هەروەها لە رۆژووی سوننەتیش.

**بزانن!** ژنێ كە لە «عدّة»دا بێ، بە هەموو حاڵێ حەقی جێگای دانیشتنی هەیە؛ بۆ نەفەقەیش، ئەوە ئەگەر لە «عدّة»ی وەفاتدا بوو، بە هەموو حاڵی نەفەقەی نییە، دووگیان بێ یا نە، هەروەها ژنێ كە لە «عدّة»ی تەڵاقی «بائن»دا بێ، ئەگەر دووگیان نەبێ؛ بەڵام ژنێ كە لە «عدّة»ی تەڵاقی «بائن»دا بێو دووگیان بێ و ژنێ كە لە «عدّة»ی تەڵاقی «رجعي»دا بێ، دووگیان بێ یا نە، ئەوە نەفەقەیان هەیە، مەگەر ئەو ژنەی كە لە «عدّة»ی تەڵاقی «رجعي»دا بێ [و] لەماوەی «عدّة»كەیدا مێردەكەی بمرێو بچێتە «عدّة»ی وەفاتەوە، ئەوە لەوكاتەوە نەفەقەی نامێنێ.

وە ئەگەر كابرا نەفەقەی دا بە ژنی تەڵاقدراوی «بائن»ی خۆی بەگومانی ئەوە كە دووگیانە، كەچی دەركەوت كە دووگیان نییە، ئەوە ئەتوانێ ئەو نەفەقەیەی لێ بستێنێتەوە.

## باسی نەفەقەی «اُصول» و «فُروع»

واجبە لەسەر ئینسان نەفەقەی «اصول»، وەکوو باوكو دایكو بەرەوژوورتر وە نەفەقەی «فروع»، وەکوو کورو کچو بەرەوخوارتر، بە چەند شەرت؛

یەکەم: ئەو کەسە زیاد لە نەفەقەی خۆیو خێزانی شتێکی بێ لەو رۆژی سەرفی نەفەقەیەدا؛

دووهەم: ئەو «اصول» و «فروع»ە خۆیان ماڵیان نەبێ؛

سێهەم: نەتوانن کاسبی بکەن بۆ ژیانی خۆیان، یاخود ئەو کاسبییە لایقی شانیان نەبێ، وەکوو کاسبی سووكو پەست بۆ ئینسانی خاوەن پایەو شەرەف؛ بەڵام تەکلیفی کاسبیکردن ناکرێ لە «اصول»، هەرچەند بیشتوانن بیکەنو لایقیشیان بێ، لەبەر موراعاتکردنی حورمەتیان؛ هەروەها، تەکلیفی کاسبی لە فەرعێکیش ناکرێ کە خەریکی خوێندنی عولوومی دینی بێو قازانجێکی باش لەو خوێندنەی بکا.

ئەندازەی نەفەقە دیاری ناکرێ، بەڵکوو ئەوەندە پێویستە کە بەشی ئینسان بکا وە ئەگەر فەوتا، نابێ بە قەرز، مەگەر قازی قەرزی بۆ کردبێ، یا ئیزنی دابێ قەرزی بۆ بکەن.

واجبە لەسەر دایکی مناڵ کە منداڵەکەی لێداکەوت گۆشی بکا، یەعنی شیری کاتی منداڵ بوونی بداتێ بەعادەت؛ هەندێك ئەڵێن، تا سێ رۆژو هەندێکی تر ئەڵێن: تا حەوت رۆژ؛ جا پاش ئەوە، ئەگەر هەر دایکی هەبوو شیری بداتێ، ئەبێ بیداتێ وە ئەگەر دایکی مردو تەنها ژنێکی بێگانە هەبوو شیری بداتێ، واجبە شیری بداتێ، بەڵام دروستە داوای کرێ بکا وە ئەگەر غەیری دایکەکە ژنێکی تر هەبوو شیر بدا بە مناڵەکە، ئەوە زۆر لە دایکەکەی ناکرێ، جا ئەگەر خۆی ئارەزووی هەبوو شیری پێبداو لەژێر نیکاحی باوکی منداڵەکەدا مابوو، یاخود لەژێر نیکاحی کەسێکدا بوو کە حەقی سەرپەرشتی کردنی منداڵەکەی هەبێ، وەکوو برای مێردەکەی یا مامی، یاخود لەژێر نیکاحی کەسدا نەبوو، ئەوە باوکەکەی ناتوانێ مەنعی ئەو ژنە بکا لە شیردان بە مناڵەکە، هەرچەند داوای کرێی دایەنیش بکا، مەگەر لەو شوێنەدا ژنێك هەبێ بەخۆڕایی یا بە کەمتر لە کرێی دایکەکەی شیری بداتێ.

وە ئەگەر داوای زیاتر لە کرێی عادەتی کرد، ئەوە باوکەکەی ئەتوانێ منداڵەکە بدا بە ژنێکی تر شیری بداتێ، بەو شەرتە ئەو منداڵە بە شیری ئەو ژنە باش بژیو پـێ بگـا، ئەگینا دروست نییە لە دایکەکەی وەربگرێتەوە؛ هەروەکوو لەمکاتەدا قازی ئەتوانـێ مەنعی دایکەکە بکا لەوەکە زیاد لە کرێی عادەتی وەربگرێ، لەبەر خاتری مەسڵەحەتی منداڵەکە.

ئەگەر کەسێکی موحتاج دوو لقی لێ بووبووەوە کە لە نزیکیو دووریو میراتبردن و نەبردندا وەکوو یەك وابوون، ئەوە ئەبێ هەردوانیان نەفەقەی پێبدەن، جا ئـەگـەر هیچیان میراتگر نەبوون، ئەوە وەکوو یەك نەفەقەی پـێ ئـەدەن وە ئـەگـەر هـەردوو میراتگر بوون، لەسەر نیسبەتی میرات نەفەقەی ئەدەن؛ کەوابێ، بەشی واجب لەسەر کوڕ دوو قاتی ئەوەیە کە واجبە لەسەر کچ وە ئەگەر لەنزیکیدا جیابوون، ئەوە نەفەقەی لەسەر ئەویانەیە کە نزیکترە وە ئەگەر لە نزیکیدا یەك بوون، بەڵام لە میراتبردنا جیا بوون، ئەوە نەفەقەی لەسەر ئەویانەیە کە میراتی لێ ئەبا؛ میسالی یەکەم، دووکوڕ، یا دوو کچ، یاکوڕو کچێك، یا دوو کچی کوڕ؛ میسالی دووەم، کوڕێكو کوڕەزایەك، یا کچێكو کچی کوڕێ یا کوڕی کچێك لەگەڵ کوڕی کوڕی کوڕێکا؛ میسالی سـێهـەم، کـوڕی کچێك لەگەڵ کوڕی کوڕێکا.

ئەگەر کەسێکی موحتاج چەند ئەسڵێکی هەبوو، ئەوە ئەگەر ئەسڵەکانی نێرو مێ بوون، نەفەقەی لەسەر نێرینەکەیانە، هەرچەند دوورتر بێ لە مێیینەکەیان، وەکوو باوك و دایك، یا باپیرەو دایك؛ ئەگەر هەموویان نێرینە بوون، وەکوو چەند باپیرەیەك، یا هەر مێیینە بوون، وەکوو چەند نەنکێك، ئەوە نەفەقەی لەسەر ئەویانەیە کە میراتگـرە وە ئەگەر لە میراتبردن و نەبردندا وەکوو یەك وابوون، ئەوە نەفەقەی لەسەر هەردووکیانە وەك یەك وە ئەگەر ئەو کەسە موحتاجە ئەسڵ و فەرعیشی هەبوو، ئەوە نەفەقەی لەسەر فەرعەکەیەتی.

ئەگەر کەسێك چەند کەسێکی موحتاجی هەبوو، ئەوە لەپێشا نەفەقەی خۆی واجبە لەسەری، ئەمجا نەفەقەی ژنەکەی، ئەمجا نەفەقەی منداڵی بچووکی، ئـەمجا دایکـی، ئەمجا باوکی، ئەمجا منداڵی گەورەی، ئەمجا نەنکی، ئەمجا باپیرەیو هەر بەمجۆرە.

## باسی پەروەردەکردنی کەسێ کە نەتوانێ خۆی پەروەردە بکا (حَضانَة)

بۆ پەروەردەکردنی منالْ، ژن باشترە لەپیاو و چاکتریان دایکە، جا ئەو نەنکانە کە بەهۆی ژنەوە ئەگەنەوە بەو منداڵە، پاش ئەوان دایکی باوك، ئەوجا دایکی دایکی باوك، ئەوجا دایکی باوکی باوك، ئەوجا دایکی دایکی باوکی باوكو بەمجۆرە وە خوشك، پێش پووری خوشکی دایکەو ئەمیش پێش کچی براو کچی خوشك ئەکەوێ و ئەمانە هەموو، پێش پووری خوشکی باوکن و خوشکی باوکیو دایکی، ئەکەوێتە پێش خوشکی باوکی یا دایکی و خوشکی باوکی، ئەکەوێتە پێش خوشکی دایکی؛ هەروەهاشە تەرتیب لە پووری خوشکی دایك و خوشکی باوکدا. وە هەر نەنکێك کە میرات نەبا، حەقی پەروەردەکردنی منداڵی نییە؛ بەڵێ، کچی پووری خوشکی دایك و پووری خوشکی باوك و کچی مامی باوکی و دایکی یا مامی باوکی، حەقیان هەیە.

حەقی پەروەردەکردن هەیە بۆ هەموو نێرینەیەکی مەحرەم کە میراتگر بێ لەسەر تەرتیبی میراتبردن؛ هەروەها، ئەگەر مەحرەمیش نەبێ، وەکوو کوڕی مام؛ بەڵام کچێ کە گەیشتبێتە رادەی ئارەزوو لێکران، نادرێتە دەستی، بەڵکوو ئەدرێتە دەستی ژنێکی باوەڕ پێکراو وە ئەگەر نە مەحرەمو نە میراتبەر نەبوو، وەکوو کوڕی مامی دایکی، یا هەر میراتگر نەبوو، وەکوو مامی دایکی، ئەوە حەقی پەروەردەکردنی منالی نییە.

ئەگەر نێرو مێ کۆبوونەوە، ئەوە حەقی پەروەردەکردن بۆ دایکە، پاش ئەو بۆ دایکی دایك، ئەوجا بۆ باوك وە «اصل» پێش «حاشِیە» ئەکەوێ؛ ئەگەر ئەسڵ نەبوو، ئەدرێ بە نزیکتر لە «حاشیە»دا، وەکوو برا پێش لە برازا و مام پێش لە ئامۆزا؛ ئەگەر ئەو نێرو مێیە لە نزیکیدا وەکوو یەك وابوون، وەکوو براو خوشك، ئەدرێ بە خوشکەکە؛ ئەگەر هەموو برا یا هەر خوشك بوون، قورعە ئەخرێ لەبەینیانا.

حەقی پەروەردەکردن نییە بۆ فاسق، بەڵام ئەگەر تۆبەی کرد، گورج حەقەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە؛ هەروەها، حەقی پەروەردەکردن نییە بۆ دایکی منالْ، ئەگەر ژنی غەیری باوکی منداڵەکە بێ، مەگەر ژنی پیاوێك بێ کە حەقی پەروەردەکردنی منالەکەی هەبێ،

وەکوو مام یا ئامۆزای منداڵەکە وە ئەگەر ئەو منداڵە شیرەخۆرە بوو، ئەوە حەقی پەروەردەکردنی بەسراوە بەوەوە کە بەخێوکەرەکەی شیریشی پێبدا، چونکە زەحمەتە ئەو منداڵە شیری ژنێك بخواو ژنێکی تر بەخێوی بکا.

ئەگەر دایکێك کە لە نیکاحی غەیری باوکی منداڵەکەدا بێ، تەڵاق درا، ئەوە گورج حەقی پەروەردەکردنی منداڵەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە.

ئەم تەفسیلاتە کە باسمان کرد، بۆ منداڵێ بوو کە هێشتا خۆی نەناسیبێ، بەڵام منداڵێك کە خۆی ناسیبێ، ئەوە بە ئارەزووی خۆیەتی لای هەرکەس دابنیشێ؛ جا ئەگەر باوك و دایکی لەیەك جوێ بوون، ئەوە ئارەزووی خۆیەتی لای کامیان دائەنیشێ وە ئەگەر باوکی نەبوو، ئەوە بە ئارەزووی خۆیەتی لای دایکی دائەنیشێ یا لای باپیری؛ هەروەها، بە ئارەزووی خۆیەتی لە بەینی براو خوشك و مامو باوكو پووردا کامیان هەڵئەبژێرێ و کە یەکێکیانی هەڵبژارد، ئەتوانێ لای بگوێزێتەوە بۆ لای یەکێکی تریان.

جا ئەگەر منالێ نێرینەی خۆناسیو لای باوکی دانیشت، باوکی بۆی نییە نەیەڵێ هاتوچۆی دایکی بکا، بەڵام ئەتوانێ مەنعی کچ بکا لە دەرچوون بۆلای دایکی، هەرچەند ناتوانێ مەنعی دایکەکەی بکا کە بێت بۆلای. سەر لێدانیش بەعادەت بە هەرچەند رۆژێ جارێکە.

وە ئەگەر منالێ خۆناسیو نەخۆش کەوت، دایکی باشترە بۆ خزمەتکردنی؛ جا ئەگەر باوکی هێشتی، با دایکی بێت بۆلای، ئەگینا منالەکە ببا بۆ لای دایکی تا خزمەتی بکا. ئەگەر کوڕێکی خۆناسیو ویستی لای دایکی بمێنێتەوە، ئەوە بە شەو لای ئەو ئەبێ و بە رۆژ لای باوکی، بۆ ئەوە فێری کاسبی و پیشە ببێ لای وە ئەگەر کچ ویستی لای دایکی بمێنێتەوە، ئەوە بە شەوو رۆژ لای دایکی ئەبێ و باوکیشی ئەتوانێ بڕوا بۆلای بەعادەت وە ئەگەر منداڵی خۆناسیو ویستی لای هەردووکیان بمێنێتەوە، ئەبێ دەو بکەن لەبەینی خۆیانا وە ئەگەر کەسیانی هەڵنەوێرد، باشتر ئەوەیە لای دایکی بمێنێتەوە.

ئەگەر ئەوەیان کە منالەکەی لایە سەفەرێکی پێویستی هاتە رێ، وەك سەفەری بازرگانی، ئەوە هەتا ئەو دێتەوە منالەکە لای ئەمیان ئەبێ وە ئەگەر کۆچی کرد بۆ

شوێنێکی تر، ئەوە لای باوکی بێ باشترە ـ هەرچەند کۆچکردووەکەش باوکی بێ ـ بەو شەرتە رێگا ئەمین بێ و ئەو شوێنە کە کۆچی بۆ ئەکا ئارام بێ وە هەر مەحرەمێکیش کە «عەسەبە»بێ، وەکوو باوك وایە لەم تەفسیلەدا، هەروەها، ئامۆزایش بۆ مندالّی نێرینە، بەلّام کچ نادرێتە دەستی، مەگەر کچەکە متمانەی پێ بکرێ کە ئاگای لە خۆی ئەبێ، ئەوە لەمکاتەدا ئەدرێتە دەستی ئامۆزای کچی.

**بزانن!** حەقی پەروەردەکردن، درێژە ئەکێشێ تا کاتی بالّغبوونی مندالّ و چاكبوونەوەی شێت، بەلّام تا کاتی خۆناسینی منالّ، ناچارییەو لەپاش خۆناسینی، بە ئارەزووی منالّەکەیە، وەکوو بەیانمان کردو کرێی پەروەردەکردنەکەو نەفەقەی منالّەکە، لە مالّی منالّەکە خۆی ئەدرێ، ئەگەر مالّی هەبوو، ئەگینا لەسەر ئەوکەسەیە کە نەفەقەی منالّەکە واجبە لەسەری، وەك باوكو باپیرەو دایكو دایکی دایك؛ ئەگەر ئەمانە نەبوون، لەسەر «بیتُ‌المال»ی موسولّمانانە وە ئەگەر «بیت‌المال» نەبوو، لەسەر دەسەلّاتداری موسولّمانی ئەو شوێنەو ئەگینا، لەسەر موسولّمانانی ئەو شوێنەیە.

* * *

**لەسایەی خواوە لێبوومەوە لە دانانی بەرگی سێهەمی کتێبی «شەریعەتی ئیسلام» لە سەعات هەشتی عەرەبی رۆژی پێنجشەممەی شانزدەی مانگی «ذی‌القعدە»ی سالّی ١٣٧٩، بەرابەری یانزەی مایسی ١٩٦٠، لە ژووری دەرس‌وتنەوەی خۆم لە تەکیەی تالّەبانی لە کەرکووك ـ خوا یارمەتیم بدا بۆ تەواوکردنی بەرگی چوارەمیشی. سُبحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفونَ، و سلامٌ على المُرسلين، و الحمد للّه رب العالمين.**

## سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

١ـ تُحفةُالمُحتاج، في شرح المِنهاج، لابن حَجر الهَيْتمی؛

٢ـ فتح الوَهّاب، في شرح منهج الطّلاب، للقاضي زكريّا الانصاري؛

٣ـ حاشية الشّيخ سليمان الجمل على شرحِ المَنْهج؛

٤ـ إعانةُ الطّالبين، للشّيخ ابي‌بكر شَطا البكري؛

٥ـ بُغية الطّالبين، لمُفتي الدّيار الحَضْرميّة عبدالرّحمن بن محمّد المشهور باعلوی.

هەرکەس شوبهە لە بابەتێکی ئەم کتێبە ئەکا، با بگەڕێتەوە سەر ئەم کتێبانەی کە ناومان نووسیون وە ئەگەر هەڵەیەکی ئێمەی بۆ دەرکەوت، ئاگادارمان بکاو لێمان ببوورێ، چونکە کەس خاڵی نییە لە سەهوو، وە پێشەکی سوپاسی ئەکەین.

# شەریعەتی ئیسلام

به پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی

ـ خوای لێ رازی بێ ـ

دانراوی:

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

«بەرگی چوارەم»

بڵاوکردنەوەی کوردستان و پەرتەو بەیان

# ناواخن

## باسی زیانگەیاندن بەگیان یا بە ئەندام (جِراح)

زیانگەیاندن ـکە لە شەرعدا پێی ئەوترێ «جِنایت» ـ سێ جۆرە؛ «عَمْد»و «شِبه عَمد»و «خَطأ». زیانگەیاندنی عەمد، ئەوەیە زیاندەرەکە، نیازی زیانگەیاندنەکەیش‌و نیازی کەسەکەیشی کردبێ بەهۆی شتێکەوە کە زیاتر وابێ کوشندەبێ، وەکوو چەقۆو کێردو خەنجەرو شیرو دەمانچەو تفەنگ‌و بەردی گەورەو سووزن‌و دەرزییەك کە بیکا بە سکی کابرادا، یا بە چاویا، یا بە میزەڵدانیا یا بە هەر ئەندامێکی تریا کە ببێ بە هۆی مردنی، یا ئەندامەکەی لەوانە نەبێ کە دەرزی پیا کردنی کوشندە بێ، بەڵام ئێشی پێبگەیەنێ‌و بیئاوسێنێ تا کابرا بمرێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئێشی نەگەیاندو نەیئاوساند، وەکوو دەرزییەك کە بیکا بە پێستی پاژنەی کەسێکداو بە رێکەوت کابرا بمرێ، ئەوە هیچی تیا نییە، بەڵام ئەگەر بە بەردێك یا کوتەکێك ـکە زیاتر وابێ کوشندە نەبێ ـبدا لە کەسێکی لاواز یا لە پیرێك یا لە نەخۆشێك و کابرا بمرێ، ئەوەیش هەر بەر عەمد ئەکەوێ، چونکە لە راستیدا ئەم شتانەیش بۆ ئەو کەسانە بە کوشندە ئەناسرێن، هەرچەند بۆ خەڵکی تر کوشندە نەبن.

نیازی شەخس ئەوە ئەگرێتەوە کە نیازی کەسێکی تایبەتی بکا، وەك ئەوە کە دەمانچەیەك بنێ بە کەسێکەوەو بیکوژێ وە ئەوەش ئەگرێتەوە کە نیازی کەسێکی تایبەتی نەکا، وەکوو ئەوە کە دەمانچەیەك بنێ بە کۆمەڵە خەڵکێکەوە کە بە دوژمنیان بزانێ بۆ ئەوە کە یەکێکیان لێ بکوژێ، هەر کامیان بێ.

«شِبهَ عمد»یش بریتییە لەوە کە نیازی ئیشەکەو کەسەکەی هەبێ، بەڵام بە شتێك کە زیاتر وابێ کوشندە نەبێ وەکوو ئەوە بە توولێك یا بە عاسایەکی سووك، بدا لە کەسێکی بەهێزو شوێنەکەیش کە لێی ئەدا خەتەر نەبێ، کەچی وا رێکەوێ بیکوژێ.

«خَطَأ»یش، ئەوەیە نە نیازی ئیشەکەو نە نیازی کەسەکەی نەبێ، وەکوو لەکاتێکا کە بەرێگادا ئەروا پێی هەڵکەوێ لە منداڵێك‌و بیکوژێ، یا نیازی ئیشەکەی ببێ، بەڵام نیازی کەسەکەی نەبێ، وەکوو ئەوە کە لە شاییدا دەمانچەیەك بتەقێنێ‌و بیەوێ بە بەرزا بڕوا،

کەچی دەستی دانەویّو بدا لە کەسیّك و بیکوژیّ، یاخود دەمانچە بنیّ بە کەسیّکەوە، کەچی بدا لە کەسیّکی ترو بیکوژیّ، یا دەمانچە بنیّ بە نەچیریّکەوە کەچی بدا لە کەسیّك و بیکوژیّ.

بەلاّم ئەوە کە نیازی کەسی هەبیّو نیازی ئیشەکەی نەبیّ، ئەوە مەحالّەو میسالی نییە؛ لەناو ئەم چەند جۆرەدا، تەنها لە عەمددا، «قِصٰاص» هەیەو لە شیبهە عەمدو خەتادا، «دِیە»، واتە خویّن ئەستیّنریّ کە مالّیّکە ئەدریّ بە کەس و کاری کوژراوەکە، وەکوو لەمەولا باسی ئەکەین.

**بزانن!** ئەو کردەوانە کە ئەبن بەهۆی زیانگەیاندن، سیّ بەشن؛ «مُبٰاشَرَة» و «سَبَب» و «شَرط»؛ موباشەرە، بریتییە لە کردەوەیەك کە کار بکا لە کوشتنی کەسەکەداو «فِعلاً» بیکوژیّ، وەکوو ئەوە کە دەمانچەیەك بنیّ بە کەسیّکەوەو بیکوژیّ؛ سەبەبیش، ئەوەیە کار نەکا لە کوشتنا، بەلاّم شتیّکی لیّ پەیدا ببیّ کە ببیّ بەهۆی کوشتن، وەکوو ئەوە کە زۆر بکا لە کەسیّك بۆ ئەوە کە ئەوکەسە بکوژیّ؛ شەرتیش، ئەوەیە نەبیّ بەهۆی کوشتن، بەلاّم بە بیّ ئەو شتە کوشتنەکە نەبیّ، وەکوو هەلّکەندنی بیریّك لە سەرە ریّگایەکدا کە خەلّکی تیّبکەویّ.

سەبەب، سیّ جورە؛

یەکەم، سەبەبی شەرعی، وەکوو شایەتیدان بە درۆ لەسەر ئەوە کە فلاّنکەس فلاّنکەسی کوشتووە؛

دووهەم، «حِسّی»، وەکوو زۆر کردن لە کەسیّك بۆ کوشتنی کەسیّکی تر؛

سیّهەم، عورفی وەکوو ئەوە کە زەهر بکاتە خواردنیّکەوە بۆ ئەوە کەسیّك بیخواو بمریّ؛ جا لەم شویّنەدا، بە تەرتیب هەندیّك میسال ئەنووسین بۆ ئەوە کە ببن بەهۆی چاوکرانەوە بۆ میسالی ئەم بەشانە.

یەکەم، واتە سەبەبی شەرعی، وەکوو ئەوە دووکەس شەهادەت بدەن کە ئەحمەد، مەحموودی کوشت و دادگا، ئەحمەد لە تۆلّەدا بکوژیّتەوە، پاشان شاهیدەکان پەشیمان بنەوەو بلّیّن: بە درۆ شەهادەتمان دا لە ئەحمەد، ئەمە وەکوو کوشتنی عەمد وایەو ئەبیّ

بەهۆی کوشتنەوەی ئەم دوو شاهیدە، مەگەر میراتگرانی کوژراوە کە بڵێن: خـۆمـان ئەمانزانی کە شەهادەتەکەیان درۆیـە، ئـەمە لەم کـاتەدا ئـەوان ئـەکـوژرێنـەوە نـەك شاهیدەکان کە بە درۆ شەهادەتیان دابوو.

دووهەم، واتە سەبەبی حیسسی، وەکوو ئەوە کەسێك زۆر بکا لە کەسێکی باڵغی عاقڵ کەسێك بکوژێ‌و ئەویش کەسەکە بکوژێ؛ ئەمەیش، بەکوشتنی عەمد ئەناسرێت و زۆرکەرو زۆر لێ‌کراو هەردووکیان، ئەکوژرێنەوە وە ئەگەر زۆری لە منداڵێك یـا لە شێتێك کردبوو کابرا بکوژێ‌و ئەویش کوشتی، ئەوە هەر زۆرکەرە کە ئەکـوژرێتـەوە، چونکە منداڵ‌و شێت بە ئالەتی رووت دائەنرێن.

زۆر لێ‌کردنی شەرعی، بەوە دێتەجێ کە زۆردارەکە، بڵێ: ئەگەر ئەوکەسە نەکوژی، خۆت ئەکوژم، یا کوڕت ئەکوژم و بە هەمووجۆرە ترساندنێك نابێ؛ بـەڵێ، ئـەگـەر زۆردارەکە پیاوێکی‌وا بوو هەرکەس لە فەرمانی دەربچوایە ئەیکوشت، ئەوە پێویست نییە کابرای زۆر لێ‌کراو بە هەڕەشەی کوشتن بترسێنێ و هەر بە فـەرمانەکـەی، زۆر لێ‌کردنەکە دێتەجێ و لەپاش کوشتنی کابرا، ئەم دوو کەسە هەردووکیان ئەکوژرێنەوە. لە غەیری ئەم سوورەتانەدا، ئەگەر کابرا هەر بە فەرمانی زۆردارەکە ئەوکەسە بکوژی، ئەوە هەر پیاوەکە ئەکوژرێتەوە، ئیتر زۆردارەکە ناکوژرێ.

لە جۆری سەبەبی «حِسّـی»ی زۆرلێ‌کـردنە ئـەمە کـەسێك زۆر بکـا لە کـەسێك دەمانچەیەك بنێ بە نەچیرێکەوە و بیشزانێ کەنەچیر نییەو ئادەمیزادە و کـابرای زۆر لێ‌کراو بە نەچیری بـزانـێ‌و بـیکوژێ، ئـەوە لەم سـوورەتەدا هـەر فـەرماندەرە کـە ئەکوژرێتەوە وە ئەگەر ئەمیش بزانـێ ئـادەمیزادەو نـەچیر نـییە، ئـەوە هـەردووکیان ئەکوژرێنەوە وە لە سوورەتی زۆر لێ‌کردنا، ئەگەر خوێن (دِیَە) واجب بوو، یا لەبەر لێ‌خۆش بوون یا لەبەر هەڵە، ماڵەکەیش ئەکەوێتە سەر هەردووکیان.

وە لە هەموو سوورەتێکی زۆر لێ‌کردنا، زۆرکەرو زۆرلێ‌کراو بەو شەرتە ئەکوژرێنەوە ئەگەر لە سیفاتی قیساسدا رێك بن لەگەڵ کوژراوەکـەدا، ئـەگـینا ئـەگـەر کـوژراوو زۆرکەرەکە بەندە بوون و زۆر لێ‌کراوەکە ئازاد بوو، ئەوە هەر زۆرکەرەکە ئەکوژرێتەوە

وە ئەگەر زۆر لێ کراوەکەو کوژراوەکە بەندە بوون و زۆرکەرەکە ئازاد بوو، هەر زۆر لێ کراوەکە ئەکوژرێتەوە.

هەروەها، پێوستە زۆرکەرو زۆر لێ کراویش باڵغ و عاقڵ بن، ئەگینا ئەگەر منالێك زۆری کرد لە کەسێك کە فلانکەسێك بکوژێ، ئەویش کوشتی، ئەوە قیساس هەر لەسەر زۆر لێ کراوەکەیە؛ هەروەها، ئەگەر کەسێکی باڵغ زۆری کرد لە منالێك کە فلانکەسێك بکوژێ و ئەویش کوشتی، ئەوە هەر زۆرکەرەکە ئەکوژرێتەوەو منالەکە ناکوژرێتەوە. جا ئەگەر عەمدی ناباڵغ، بە عەمد بزانرێ، ئەوە نیوەی دیيەی عەمدی ئەکەوێتە سەر، وەکوو ئەوە کە منالەکە بێ تەمیز بێ، لەوێیشدا ئیشی ئەو بە هەڵە ئەزانرێ و نیوەی دیيەی هەڵەی ئەکەوێتە سەر.

ئەگەر کەسێك زۆری کرد لە کەسێك کە دەمانچەیەك بهاوێ بۆ نەچیرێك و ئەویش دەمانچەکەی پێوەناو دای لە ئادەمیزادێك و کوشتی، ئەوە قیساس لەسەر هیچیان نییە، چونکە نیازی کوشتنی ئەو کەسەیان نەبووە، بەڵکوو دیيەی هەڵەیان ئەکەوێتەسەر و پێوستە یەکی نیوەی بدەن.

ئەگەر کەسێك زۆری کرد لە کەسێکی تر کە ئەحمەد یا مەحموود بکوژێ، ئەویش یەکێکیانی کوشت، ئەمە بەر زۆر لێ کردن ناکەوێ و لەم سوورەتەدا، قیساس هەر لەسەر پیاوکوژەکەیەو خاوەن فەرمانەکە گوناهبار ئەبێ و بەس.

هەروەها، بەر زۆر لێ کردن ناکەوێ ئەمە کە کەسێك زۆر لە کەسێك بکا کە خۆی بکوژێ، چونکە مەرجی زۆرلێ کردن ئەوەیە کوشتنەکەو ئیشە لێ ترسراوەکە، جیا بن لە یەك و لەم حاڵەدا، هەردووکیان یەك شتن[١]. هەروەها، ئەگەر زۆری لێ بکا بڵێت: ئەبێ خۆم بکوژی، ئەمەیش نابێ بەهۆی قیساس لەسەر بکوژەکە، هەرچەند بەم کردەوەیە گوناهبار ئەبێ.

ئەکەر کەسێك کەسێکی دا بە دەمی مارەوە، یا نای بە کلکی دووپشکەوە و مارو دووپشکەکە دایان بەکابراوەو مرد، یا خود دڕندەیەکی پیاوخۆری خست بەسەر

١. لە «رَوْض» دا، جەزمی ناوە بەوەدا کە لەم سوورەتەدا، نیوە «دِیە» ئەکەوێتە سەر زۆرکەرەکە.

کەسێکداو ئەو کەسە ی خوارد، یا کەسێکی خست بە سەر دڕندەیەکی پیاوخۆردا لە تەنگەلانێکدا کە ئەو کەسە مەیدانی راکردنی نەبێ، یا خود دڕندەیەکی بەردایە کەسێك لە شوێنێکی وادا کە کابرا مەیدانی راکردنی نەبێ، یا خود مەیدانی ببێ، بەڵام دڕندە کە زۆر چالاك بوو و کابرای گرتو خواردی، ئەوە لە هەموو ئەم حاڵانەدا قیساس ئەکەوێتە سەر ئەو کابرایە.

بەڵام ئەگەر کەسێك سەگێکی لانگری بەستەوە لە داڵانداو کەسێکی بانگ کرد بۆ ماڵی خۆی و سەگەکە کابرای خوارد، ئەوە ئەو کابرایە بە بێ‌قیساس و بێ خوێن ئەڕوا، هەرچەند مەجالی ئەوە نەبێ کابرا لە بەردەمی سەگەکە دەربچێ، هەروەها ئەگەر ئەو سەگە لانگرە بەرەڵڵا بێ‌و پەلاماری کابرا بداو بیخوا، چونکە ئەو سەگە بە ئارەزووی خۆی و بە بێ هاندانی خاوەنەکەی کابرای خواردووەو کابرایش مەیدانی خۆ رزگاری کردنی بووە وە ئەگەر مەیدانیشی نەبووبێ، بە ئارەزووی خۆی چووە بۆ ئەو شوێنەو کەمتەرخەمیشی کردووە کە عاسایەك یاخەنجەرێکی هەڵنەگرتووە بۆ ئەوەی خۆی پێ‌بپارێزێ لەو جۆرە دڕندەیە.

ئەگەر کەسێك کەسێکی بەند کرد لە ژوورێکا یا لە چۆڵێکدا بەستیەوەو نانو ئاوی لێ مەنع کرد تا مرد، ئەوە قیساسی ئەکەوێتەسەر ئەگەر ئەوماوەیە لەوانە بێ زۆرتر ئینسان بە بێ نان یا بە بێ ئاو نەژی تیادا، هەرەها ئەگەر ماوەکە کەم بوو، بەڵام کابرای بە برسییەتی یا بە تینوویەتی بەند کردبوو؛ بەڵام ئەگەر ئینسانێکی تێرو تێراو لە ماوەیەکدا حەپس بکا کە ئینسان بتوانێ بە بێ نانو ئاو بژی، کەچی وا رێ کەوێ کابرا بمرێ، ئەوەیش هەر «شیبهە عەمد»ە.

ئەگەر کەسێك منالێك بخاتە ئاوێکی کەمەوەو منالەکە تیایدا بخنکێ، ئەمە بە عەمد ئەزانرێ‌و ئەبێ بە هۆی قیساس، هەروەها ئەگەر کابرایەکی مەلەنەزان بخاتە ناو ئاوێکی زۆرەوەو کابرا بخنکێ، یاخود کابرا مەلە بزانێ بەڵام دەستی ببەستێ بەجۆرێ کە مەلەی پێ نەکرێ، یاخود کابرا پێویستی بە کوولەکە بێ بۆ مەلەوانی‌و ئەو کوولەکەکەی لێ بسێنێ؛ بەڵام ئەگەر کابرای مەلەوان خەریکی مەلە بوو و کەلو پەلی مەلەی لەلادا بوو، بایەکی توند هات نەیهێشت مەلە بکات، ئەوە شیبهە عەمدە وە ئەگەر مەلەوانەکە بە

ئارەزووی خۆی مەلەی نەکرد تا خنکا، یاخود ئاوە کە کەم بوو، بەڵام ئەم خۆی تیا ڕاکێشا تا خنکا، ئەوە خۆی بە دەستی خۆی فەوتاندووەو نە قیساسی هەیەو نە خوێن (دییە).

کەسێك کەسێك بخاتە هۆدەیە کەوەو دەرگای لێ ببەستێو دووکەڵی بدا تا ئەخنکێو ئەمرێ، ئەمە عەمدە، هەروەها ئەگەر بیخاتە ناو ئاگرێکی وەهاوە کە نەتوانێ خۆی لێ ڕزگار بکا؛ بەڵام ئەگەر ئاگرە کە لەوانە بوو کە کابرای لێ دەربچێ و بە ئارەزوو دەرنەچوو تا مرد، ئەوە قیساسی نییە، بەڵام لە واجب بوونی خوێنەکەیدا، دوو فەرموودە هەیە.

کەسێك ژار بکاتە ناو چێشتەوە بۆ منداڵێك یا شێتێك ئەویش بیخواو بمرێ، ئەوە عەمەدەو باعیسی قیساسە وە ئەگەر میوانداریی پیاوێکی عاقڵ بکا بە چێشتێ کە ژاری تێ کردبێ، ئەویش بیخواو بمرێ، ئەوە لە فەرموودەیەکی ئیمامدا، بە عەمد ئەناسرێ و لە فەرموودەیەکدا، بە شیبهە عەمدو باعیسی دییەیە، چونکە خۆی کەمتەرخەمی کردووە، هەروەها ئەگەر بە دزییەوە ژار بکاتە ناو خواردەمەنییەکیواکە ئەغلەب کابرا لەو خواردەمەنییە بخواو خواردیو مرد، ئەمەیش هەر عەینی ئەو دوو فەرموودەیەی تیا هەیە؛ هەندێ لە زانایان ئەفەرموون لەم دوو سوورەتەدا، ئەگەر ئەو کەسە کە لەو خواردەمەنییە ئەخوا ـ لەو دوو سوورەتەدا ـ لەوانە بوو بەهۆی زانینی هونەری دوکتۆرییەوە یا بە بەراورد خواردەمەنی زەهراویی ئەناسی، ئەوە ئەم سوورەتە شیبهە عەمدە وە ئەگەر لەوانە نەبوو کە خواردنی زەهراوی بناسێ، ئەوە عەمدە، چونکە هەرچەند کابرای خاوەنژار زۆری لێ نەکردبێ، بەڵام خواردەمەنی عادەتی بۆ میوان، یاخود خواردنی خۆراکی ماڵی خۆی، وەکوو پێویست وایە و کابرایش نەیزانیوە بە ژارەکە و نیازی خراپەی خاوەن ژارەکەیش، وەکوو بەکار هێنانی ئالەتی کوشتنە، لەم سوورەتەدا، ئەبێ بەهۆی قیساس لە خاوەنژار.

ئەگەر کەسێك زۆری کرد لە کەسێك بۆ ئەوە کە بڕواتە خوارەوە بە بیرێکدا، یا سەرکەوێ بە دارێکدا، یا بە زەردوماهێکدا و کابرا کەوتە خوارو مرد، ئەگەر ئەو شوێنانە لەوانە بوون زۆرتر وابن بنیادەمیان لێ خوارەوەداکەوێتە زۆردارە کەش

مەبەستی فەوتاندنی کابرا زۆر لێ کراوەکە بێ، ئەوە بە عەمد دائەنرێ‌و باعیسی قیسـاسە وە ئەگەر نیازی خراپ نەبوو، ئەوە شیبهە عەمدەو باعیسی دییەیە لەسەر کەس‌و کاری کابرا، هەروەها ئەگەر لەوانەیش نەبن کە بنیادەمیان لێ داکەوێ بـە ئـەغڵەب، پشت پێ‌بەستراو، وەکوو "شیروانی"بەپێی فەرموودەی دا باسی کردووە. لە

ئەگەر کەسێك کەسێکی خستە ناو ئاوێکی زۆرەوەو گورج ماسییەك قووتی دا، ئەوە بە عەمد ئەناسرێ‌و ماسییەکە لەبەر بێ‌شوعووری بە ئالەت دائەنرێ وە ئەگەر کەسێك کەسێکی بریندار کردو کابرای برینداركراو دەرمانی برینەکەی نەکرد تا مرد، ئەوە هەر بە عەمد دائەنرێ.

ئەگەر کەسێك بیرێکی هەڵکەند لە ڕێگایەکداو کەسێکی نەفامی بانگ کرد کە زیاتر وابوو ڕێگای بەسەر بیرەکەدا ئەڕۆیی‌و کەوتە ناوی‌و مرد، ئەوە بە عەمد ئـەزانـرێ‌و باعیسی قیساسە وە ئەگەر پیاوێکی عاقڵی بانگ کردو کەوتە ناوی و مرد، ئەوە نابێ بە زامنی، مەگەر سەری بیرەکەی داپۆشیبێ یاخود ئەو پیاوەکە ئەکەوێتە ناوی، کوێر بێ، یاخود بیرەکە لە شوێنێکی تاریکدا بێ، ئەوە ئەم ڕووداوە بە شیبهە عەمد دائەنرێ؛ هەروەها، ئەگەر سەری بیرەکە داپۆشێ بۆ ئەوە کە هەرکەس بێ بەسەریا، بکـەوێتـە ناوی، ئەوەیش هەر بە شیبهە عەمد ·ائەنرێ، یا ئەگەر تەڵەیەك دابنێ لە ڕێگوزەرێکداو دایبپۆشی، ئەمەیش ئەگەر نەفامێك بانگ بکا بۆ سەری‌و بکەوێتە تەڵەکەوەو بـمرێ، قیساسی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر خاوەن تەمیزێکی پێوە بێ، شیبهە عەمدە؛ بـەڵێ، ئەگەر بەدزییەوە تەڵەیەکی لە پشتی دەرگای کەسێکەوە شاردەوە یا بۆمبایەکی دانا یا بیرێکی هەڵکەندو دایپۆشی بەنیازی ئەوە کابرای خاوەن دەرگای پێ‌بکوژێ و خاوەن دەرگاکە پێوەبوو، ئەمانەیش بە عەمد ئەناسرێن و ئەبن بە هۆی ئەوەکە قیساس لەسەر کابرا ئیسپات ببێ.

وە ئەگەر ئینسانێکی خستە خوارەوە بە بیرێکدا کە قووڵ‌و مرێنەر بێ و لە بیرەکەدا شمشێرێکی ڕووت داچەقێنرابوو، یا مارێکی پـیس هـەبوو و کـابرا کـەوت بـەسەر شمشێرەکەداو مرد، یاخود مارەکە پێیەوە داو کوشتی، ئەمەیش هەر بە عەمد دائەنرێ و شمشێرەکەو مارەکە بە ئالەت دائەنرێن.

ئەگەر ئەحمەد کەسێکی گرت و مەحموود کوشتی، یا ئەحمەد بیرێکی هەڵکەندو مەحموود کەسێکی تێفڕێ داو مرد، یا ئەحمەد کەسێکی لە بەرزییەکەوە خستە خوارەوەو مەحموود بە شمشێر کردی بە دوو کەرتەوە، ئەوە لەم سوورەتانەدا قیساس لەسەر مەحموودە؛ بەڵێ، ئەگەر مەحموود لەوانە نەبووکە بۆ زامن بوون بشێ و ئەحمەد لەوانە بوو، ئەوە لە سوورتی یەکەم و دووهەمەدا، قیساس لەسەر ئەحمەدە، بەو شەرتە لە سوورەتی یەکەمدا کابرا بەنیازی ئەوە بگرێ کە بکوژرێ، ئەگینا ئەگەر بۆ پاراستنی خۆی گرتی یا بۆ گاڵتەو یاری گرتی، ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر و لە سوورەتی دووهەمیشا، لە شوێنێکی بەرزی واوە بیخاتە خوارکە زۆرتر وابێ ئینسانی پێ بمرێ، ئەگینا هەر دییەی شیبهە عەمدی ئەکەوێتە سەر و لە مەسئەلەی بیرەکەدا، ئەحمەد هەر گوناهو سەرزەنشتی ئەکەوێتە سەر، ئەویش بەو شەرتە ئەو بیرە بە ناحەق هەڵبکەنێ.

بێداربن! لەم سوورەتانەوە کە بەیانمان کردن، دەرکەوت ئەگەر شەرت و خەریك بوون (مباشَرَة) کەوتنە یەك، ئەوە حوکم بۆ خەریك بوونە، وەکوو لە مەسئەلەی بیرەکەدا، ئێستە هەرچەند هەڵکەندنی بیرەکە شەرتە، بەڵام قیساس لەسەر ئەو کەسەیە کە خەریك بووەو کابرای خستووەتە خوارەوە.

وە ئەگەر سەبەب و خەریك بوون کەوتنە یەك، ئەوە هەندێجار، حوکم بۆ سەبەبەکەیە، وەکوو لە مەسئەلەی شەهادەتی درۆدا بەوە کە فلانکەس فلانکەسی کوشتووە و هەندێجار، حوکم بۆ خەریك بوونە، وەکوو ئەوە کەسێك یەکێك لە بەرزییەکەوە بخاتە خوارەوە و لەپێش ئەوەدا کە بکەوێتە زەوی، یەکێك بە شمشێر دوولەتی بکا و هەندێجار، حوکم بۆ هەردووکیانە، وەکوو لە مەسئەلەی زۆر لێ کردنا بۆ کوشتن بەیانمان کرد.

## باسی کوبوونەوەی دوو جینایەت بە خەریك بوون

ئەگەر دوو کەس جینایەتیان کرد لە کەسێك، ئەوە یا ئەم دوو جینایەتە لە یەك کاتدا ئەکرێن، یا بەرودوا ئەبن؛ جا ئەگەر لە یەك کاتدا بوون و هەردووکیان بە زوویی کابرایان ئەکوشت، وەکوو ئەوە دووکەس پێکەوە دەمانچە بنێن بە سەردڵی کەسێکەوە، یاخود بە

زوویی گیانیان دەرنەئەکرد، وەکوو ئەوەکە یەکێکیان دەستی راستیو یەکێکیان دەستی چەپی بڕیو پاش ماوەیەك کابرا مرد، یاخود یەکێکیان برینێکی لێ‌کردو ئەویان دە برینی لێ‌کردو کابرا مرد، ئەوە لەم سوورەتانەدا قیساس لەسەر هەردوو کەسەکە سابت ئەبێو هەردووکیان لە قیساسدا ئەکوژرێن.

وە ئەگەر برینی یەکێکیان بە گورجی گیانی دەرئەکردو هی ئەویتریان وا نەبوو، وەکوو ئەوە یەکێکیان ملی کابرای بڕیو ئەویان دەستی بڕی، ئەوە هەر خاوەنی برینە گیاندەرکەرەکە بە بکوژ ئەناسرێو قیساس لەسەر ئەوە، هەرچەند گومانیشمان ببێ لەوەدا کە برینی دووهەمیش گیاندەرکەرە، چونکە قیساس بە گومان ئیسپات نابێو شوبهە مانیعی قیساسە، بەڵام پێویستە بژاردنەوە یا قیساسی ئەو برینە بدا کە کردوویەتی؛ مەسەلا، کەسێك شمشێرێکی دا لە ملی کەسێك و ملی لە لاشەی جیا کردەوە و کەسێکی تریش دەستی بڕی، ئەوە سەربڕەکە ئەکوژرێتەوەو دەستی دەست بڕەکەیش ئەبڕرێ.

وە ئەگەر جینایەتەکان بەرودوابوون، ئەوە ئەگەر یەکەمیان کابرای گەیاندە «حەرەکەی مەزبووح»: یەعنی جمەوجووڵی حەیوانی سەربڕاو، بەم رەنگە کە قسەو روانینو جمجووڵی بە ئارەزووی خۆی پێ نەهێشت و لەپاش ئەو، یەکێکی تر برینداری کرد، ئەوە قیساس هەر لەسەر یەکەمە و شەخسی دووهەم تەعزیر ئەکرێ، چونکە ئەو بریندارە لە حوکمی مردوودایەو ئەم کەسەیش وەکوو ئەوە وایە حورمەتی مردووی شکاندبێ.

وە ئەگەر کابرای یەکەم نەیگەیاندە حاڵەتی جمەوجووڵی حەیوانی سەربڕاو و کابرای دووهەم برینیلێ‌کرد، لەم کاتەدا، ئەگەر برینی کابرای دووهەم گیاندەرکەری دەس بەجێ بوو؛ مەسەلا، یەکەم دەستی بڕیو دووهەم سەری بڕی، ئەوە قیساس لەسەر دووهەمە و بژاردن یا قیساسی ئەندامە بڕاوەکەیش لەسەر یەکەمە وە ئەگەر دووهەمەمیش نەیگەیاندە پلەی جمەوجووڵی حەیوانی سەربڕاو؛ مەسەلا، یەکەم دەستی راستیو دووەم دەستی چەپی بڕیو کابرا مرد، ئەوە قیساس لەسەر هەردووکیانە چونکە کابرا بە تەئسیری برینی هەردوو دەستی مردووە.

بزانن! حاڵەتی جمەوجووڵی حەیوانی سەربڕاو، بەوە دێتەجێ کە قوڕقوڕاچکەی ببڕێ، یا لوولەی سوورێچکەی ببڕێ، یاخود سکی بدڕێو هەندێ لە ریخۆڵەکانی بێنە دەرەوە، بەجۆرێ کە بە قەتعی بزانین ئەو کابرایە لەپاش ماوەی رۆژێك یا دوورۆژ ئەمرێ، لە وێنەی ئەم حاڵەتانەدا، ئەگەر بریندارەکە قسەی رێك و جوانی نەبوو، ئەوە دیارە وە ئەگەر قسەی رێکیشی هەبوو، هەر بە هیچ دانانرێ، چونکە پاش ئەوەکە سارد بووەوە، ئەو قسەیەشی نامێنێ و ئەم حاڵەتە بە حاڵەتی یەئس‌و نائومێدی دائەنرێ‌و کابرا حوکمی مردوو وەرئەگرێ، یەعنی دروستە میراتی بدرێ بە میراتبەر وە ئەگەر خزمێکی مرد، میراتی لێ وەرناگرێ وە ئەگەر ژنەکەی لەو کاتەدا دووگیان بوو و مناڵەکەی بوو، دروستە شوو بکا وە هەر قسەیەك بکا لەبارەی کڕین‌و فرۆشتن‌و مامەڵەوە، یا لەبارەی نیکاح‌و تەڵاق‌و وەسیەت‌و بەخشین‌و هەر خێرو خیراتێکی ترەوە، یا تۆبە بکا، یا موسوڵمان ببێ، ئەوە هەمووی بێ‌ئیعتیبارەو رەواجی نییە؛ نەخۆشیش ئەگەر بگاتە ئەم حاڵەتە، وەك مردوو وایەو قسەو تەسەڕوفاتی بێ‌ئیعتیبارە، تەنها ئەوە نەبێ کە ژنی ناتوانێ شوو بکاو میراتی دابەش ناکرێ وە ئەگەر خزمێکی مرد، میراتی لێ وەرئەگرێ.[1]

ئەگەر نەخۆشێك گەیشتبووە کاتی سەرەمەرگ و لەو کاتەدا، یەکێك کوشتی یا دارێکی لێداو گیانی دەرچوو، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەری، چونکە گەلێ‌جار وا رێکەوتووە نەخۆش گەیشتووەتە ئەم حاڵەتەو پاش ئەوە چاك بووەتەوە.

ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت کە بە کافری ئەهلی زیممەی ئەزانی، یا وایئەزانی باوکی کوشتووە، یا باوکی کوشتبوو و وایئەزانی میرات بەرەکان هەموویان رازین بە کوشتنەوەی، یاخود لە وڵاتی ئیسلامدا موسوڵمانێکی کوشت کە بە کافری جەنگکەر (حَربی)ی ئەزانی، کەچی کابرای کوژراو بە پێچەوانەی زانستی بکوژەکە دەرچوو، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، قیساس لەسەر کابرای بکوژ سابت ئەبێ و ئەو باوەڕەی کە بوویەتی، بە هیچ دەرئەچێ، چونکە کوشتن خەتەرەو بە خەیاڵی رووت،

---

١. سەیری بەرگی هەشتەمی «شیروانی» بکە لەسەر «تُحفە»، لە لاپەڕە ٣٩٤دا.

کوشتنی کەس دروست نییە؛ بەڵێ، ئەگەر لە وڵاتی کافرانا یا لە ریزی جەنگدا، دای لە موسوڵمانێك، بە گومانی ئەوە کە کافری جەنگکەرە، ئەوە قیساس ناکەوێتە سەری، هەروەها ئەوە دییەیشی ناکەوێتە سەر، لەبەرئەوە کە ئەم کابرایە بە مانەوەی لە وڵاتی جەنگ (دارُالحرب)دا، حورمەتی خۆی شکاندووە.

## باسی مەرجەکانی قیساس

بە شەرت گیراوە لە قیساسدا بێجگە لە دەسەنقەستێتی (تَعمُّد)، چەند مەرجێك؛

یەکەم، ئەوەیە خوێنی کوژراوەکە پارێزراو بێ، بە هۆی موسوڵمانەتییەوە یا بەهۆی جیزیەوە، یا بەهۆی «أَمان» دانەوە؛ ئەگەر وانەبوو، خوێنی بە فیڕۆ ئەڕوا، یا نیسبەت بە هەموو کەس، وەك کافری جەنگکەر کە هەرکەسێ بیکوژێ قیساسی نییە، یا بە نیسبەت هەندێ کەسەوە، وەکوو بکوژێ کە قیساسی لەسەر بێ، ئەوە ئەگەر میراتگری کوژراوە کە بیکوژێ، خوێنی هەدەرە، بەو شەرتە بکوژ یەك کەس بێ یا کۆمەڵێکی فامیدە بن‌و یەکێکیان بە ئیزنی ئەوانی تریان بیکوژێ؛ «مَعَ العِلم»، ئەم جۆرە کوشتنەش، بە بێ ڕێگادانی گەورەی موسوڵمانان گوناهە، چونکە لەوانەیە هەراو فیتنەی لێ پەیدا ببێ وە ئەگەر کەسێك لە غەیری میراتگرەکان لەخۆیەوە بیکوژێ، ئەوە قیساسی لێ ئەسێنرێ.

بەڵێ، ئەگەر موسوڵمانێك هەڵمەتی هێنا بۆ گیان یا نامووس یا ماڵی کەسێك، یا ڕێگەی گرت لە خەڵك و بە غەیری کوشتن چاری نەئەکرا، ئەوە کوشتنی دروستەو نە قیساسی هەیە و نە خوێن (دییە).

دووهەم: ئەوەیە بکوژە کە تەکلیفی لەسەر بێ، یەعنی باڵغ‌و عاقڵ بێ‌و کافری جەنگکەر نەبێ؛ کەواتە، قیساس نییە لەسەر کافری جەنگکەر، چونکە لەخۆیدا خوێنی هەدەرەو ئەکوژرێ‌و حوکمی ئێمەی وەرنەگرتووە؛ هەروەها، قیساس نییە لەسەر شێت‌و نابالغ و لەسەر ئینسانێکی نووستوو کە بتلێتەوە بەسەر کەسێکداو بیکوژێ؛ بەس لەسەر منال‌و شێت، خوێن (دییە) پێویستە کە لە ماڵی خۆیان بیدەن و لەسەر کابرای نووستوویش، لە ماڵی خزم‌و کەس‌و کاری ئەدرێ.

ئەگەر کەسێك هەندێ کات شێت بوو و هەندێ کات عاقڵ بوو، ئەوە لە هەرکاتێکا بە گوێرەی خۆی، موعامەلەی لەگەڵ ئەکرێ.

بەڵێ، قیساس واجبە لەسەر کەسێك کە بەهۆی خواردن یا خواردنەوەی شتێکی حەرامەوە سەرخۆش بووبێ بە سوورەتێکی ناشەرعیو کەسێکی کوشتبێ، ئەمەش بە نیازی ئەوە کە ئەم جۆرە کەسانە سڵ بکەنەوەو شتیوا نەکەن.

ئەگەر بکوژەکە ئیددیعای کرد کە لە کاتی کوشتنەکەدا منداڵ بووەو، قسەکەی ڕێی تێ ئەچوو و شاهید نەبوو لەسەر ئەوە کە لەوکاتەدا باڵغ بووە، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند و لە باتی کوشتنەوە، خوێنی لێ ئەسێنرێ؛ هەروەها، ئەگەر ئیددیعای کرد کەوا لەوکاتەدا شێت بووە و لەوەوپێش، جاروبار شێتی بەسەرا هاتبێ و شاهیدیش نەبێ لەسەر ئەوە کە لەوکاتەدا عاقڵ بووە؛ بەڵێ، ئەگەر بکوژەکە هاتو وتی ئێستا منداڵم و قسەکەشی ڕێی تێ ئەچوو، ئەوە سوێندی نادرێو قیساسی لێ ناسەنرێ، مادام شاهید نەبێ لەسەر ئەوە کە لەوکاتەدا باڵغ بووە.

**سێهەم:** ئەوەیە بکوژەکە زیادی نەبێ بەسەر کوژراوەکەدا، ئەگینا موسوڵمان ناکوژرێتەوە بەهۆی ئەوەوە کە «ذِمّی»یەك یاکافرێکی خاوەن عەهدو پەیمانی کوشتبێ؛ بەڵێ، زیممی ئەکوژرێتەوە لەبەرئەوەکە زیممی یا موسوڵمان یاکافری پەیمان لەگەڵ کراوی کوشتبێ، هەرچەند لەپاش ئەوە کە ئەو زیممییە زیممییەکەی بریندار کرد، ئەو بریندارە موسوڵمان ببێ جا بمرێ.

**چوارەم:** ئەوەیە بکوژەکە زیادی نەبێ بەسەرکوژراوەکەدا بە ئازادی؛ کەواتە، ئەگەر ئازادێك بەندەیەك بکوژێ، ناکوژرێتەوە، بەڵام بەندە ئەکوژرێتەوە لە قیساسی ئازادو بەندەدا.

**پێنجەم:** ئەوەیە بکوژەکە زیادی نەبێ بەسەر کوژراوەکەدا یا بەسەر میراتبەری کوژراوەکەدا بەوە کە پنچینەی ئەو بێ، واتە باوك یا دایك یا بەرەوژوورتری بێ؛ کەواتە، ئەمانە ناکوژرێن بەهۆی کوشتنی نەوەی خۆیانەوە، یا بەهۆی کوشتنی ژنی

کوڕیانەوە، یا بەهۆی کوشتنی میردی کچیانەوە[1]، بەڵام مناڵ ئەکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی دایكو باوكو باپیرەی خۆیەوە، هەروەها برا ئەکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی برایەوە.

ئەگەر دووکەس ئیددیعای ئەوەیان کرد کە فڵانکەس کوڕیانە و لە پاشاندا، یەکێکیان ئەو کەسەی کوشت، ئەوە ئەگەر قیافەت شناس کردی بە کوڕی بکوژەکە، قیساسی لێ وەرناگیرێ وە ئەگەر کردی بە کوڕی ئەویان، ئەتوانێ قیساسی لێبسێنێ وە ئەگەر نەیکرد بە کوڕی ئەویش، ناتوانێ قیساسی وەربگرێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێکی سێهەم کردی بە کوڕی خۆیو ئیسپاتی کرد، ئەتوانێ قیساسی وەربگرێ، ئەگینا ئەم قیساسە رائەگیرێ تا راستی روون ئەبێتەوە.

ئەگەر دوو برای دایکیو باوکی، یەکێکیان باوكو یەکێکیان دایکی کوشت لە یەك کاتدا، ئەوە ئەم برایە حەقی قیساسی باوکی هەیەو ئەو براکەیش حەقی قیساسی دایکی هەیە، جائەگەر یەك کەوتن لە پێشکەوتنی یەکێکیاندا لە قیساس وەرگرتندا، ئەوە باشە، ئەگینا ئەبێ قورعە بخەن، جا قورعە بۆ هەرکەس دەرچوو، لە پێشدا حەقی خۆی وەرئەگرێ، ئەنجا پاش ئەوە کە قیساسی وەرگرت، میراتبەری برا کوژراوەکەیش ئەتوانێ ئەم بکوژێتەوە لە قیساسی ئەو باوکە یا ئەو دایکەدا کە کوشتوویەتی، هەروەها ئەگەر ئەو دوو برایە، بەرودوا باوكو دایکی خۆیان بکوژن و لەوکاتەدا ژنو مێردی لەبەینی باوكو دایکەکەدا نەبێ وە ئەگەر ژنو مێردی لە بەینیانابوو، ئەوە قیساس لە بکوژی یەکەم ناسەنرێ، چونکە لە حەقی قیساسەکە هەندێکی ئەگا بە کوژراوی دووهەم و ئەو حەقە بە میرات دێتەوە بۆ ئەم، کە هەندێکیش لە حەقی قیساس فەوتا، ئەوی تریشی ئەفەوتێ؛ مەسەلا، یەکێکیان لەپێشا باوکی خۆی کوشت، هەشتیەکی ئەو قیساسە ئەڕوا بۆ دایکی، جا لەوکاتەدا براکەی تر دایکەکەی کوشت، میرات لە

١. لە سوورەتی یەکەمدا، هەندێ لە مافی قیساسی ژنەکە ئەگەڕێتەوە بۆ مێردەکەی کە کوڕی بکوژەکەیە و ئەم هەندە، ئەفەوتێو مافەکە ئەڕواتە سەر «دیە» و لە سوورەتی دووهەمدا، هەندێ لە مافی قیساسی کابرا دێتەوە بۆژنەکەی کە کچی بکوژەکەیە و ئەم هەندە ئەفەوتێو مافەکە ئەڕواتە سەر «دیە».

دایکی نابا و ئەو هەشت یەکە ئەڕواتەوە بۆ بکوژی باوکەکە؛ کەواتە، ئەبێ لە جیاتی قیساس، «دییە» بدا بە میراتگری بکوژی دایکەکە و «دییە» کەیش، بریتییە لە حەوت هەشت یەك، چونکە هەشت یەکی دایکەکە هاتووەتەوە بۆ خۆی.

ئەگەر کۆمەڵێك بە هەموویان کەسێکیان کوشت و شەرتەکانی قیساس هاتنەجێ، ئەوە هەموویان ئەکوژرێنەوە لە قیساسدا، خواه بە کوشندەیەکی دەس بەجێ بیکوژن، یا لەوانە نەبێ، بەڵام هەموو لەپێشا تەگبیریان کردبێ و بڕیاریان دابێ ئەو کەسە بکوژن؛ ئەگێڕنەوە کە "حەزرەتی عومەر"، پێنج کەسی کوشتووە لە قیساسی کەسێکدا و دیارە قیساس دامەزراوە بۆ پاراستنی خوێنی ئادەمیزاد؛ کەواتە، ئەگەر قیساس لە کۆمەڵ نەسەنرێ، خوێنی خەڵك ئەکەوێتە مەترسییەوەو ناپارێزرێ؛ بەڵێ، خاوەنی کوژراوەکە ئەتوانێ لە هەموویان خۆش بێ یا لە هەندێکیان خۆش بێ، بەخوڕایی یا لەسەر بەشە «دییە»ی خۆی بە ژمارەی گەلەکە و قیساس لە باقییەکانیان بسێنێ.

ئەگەر کەسێك بوو بە هاوبەشی باوك لە کوشتنی مناڵدا، ئەوە ئەکوژرێتەوە، چونکە قیساس هەر لەسەر باوکەکە لاچووە، هەروەها ئەگەر بەندەیەك ببێ بە هاوبەشی ئازادێك لە کوشتنی بەندەیەکدا، یا کافرێکی زیممی ببێ بە هاوبەشی موسوڵمانێك لە کوشتنی کافرێکی زیمیدا، یا موسوڵمانێك ببێ بە هاوبەشی کافرێکی جەنگکەر لە کوشتنی موسوڵمانێکا، یا ببێ بە هاوبەشی کەسێ کە قیساس ئەسێنێ لە بکوژی باوکی خۆی، یا ببێ بە هاوبەشی کەسێك کە خۆی ئەکوژێ، یا بە ناحەق ببێ بە هاوبەشی کەسێ کە لە مەیدانی دەفعی کەسێکی هەڵمەتهێنەردا ئەو هەڵمەتهێنەرە ئەکوژێ، لەبەرئەوە کە ئەم بە هاوبەشبوانە بەبێ حەقی شەرعی خۆیان ئەکەن بە هاوبەش لە کوشتنی کەسێکدا کە ئەمان پەیوەندی شەرعییان پێوەی نییە.

بەڵام قیساس ناکەوێتە سەر کەسێك خۆی بکا بە هاوبەشی بکوژ بە «شِبه عَمد» یا بە هەڵە، چونکە لەم سوورەتانەدا، کوشتنی کابرا بە دوو ئیش دێتەجێ کە یەکێکیان قیساس پێویست دەکاو یەکێکیان پێویستی ناکا، لەم کاتەدا حوکم بەو ئیشەیان ئەکرێ کە قیساس پێویست ناکا.

ئەگەر کەسێك دوو برینی کرد لە کەسێك، یەکێکیان بە عەمد و یەکێکیان بە هەڵەو ئیشە عەمدەکە لەوانە نەبوو کە گیان دەربکا بە پەلە، ئەوەیش قیساسی لە سەر نییە بە هەمان دەلیل.

هەروەها، قیساس نییە لە سەر کەسێك کافرێکی جەنگاوەر بریندار بکا، جا کافرەکە موسوڵمان بێ و کابرا لەپاش ئیسلام بوونەکەی برینێکی تری لێ بکا و ئەمجا بمرێ.

ئەگەر کەسێك بریندار کراو ئەم بریندارکراوە دەرمانی برینەکەی خۆی کرد بە دەرمانیکی ژاراویی واکە دەس بەجێ بیکوژێ، ئەوە نە قیساس و نە «دییە»، لەسەر ئەو کەسە نییە کە برینداری کردووە وە ئەگەر ژارێکیوا نەبوو کە دەس بەجێ ئینسان بکوژێ، بەڵام لەوانەبوو کە زۆرتر ئینسانی ئەکوشت و ئەمکابرایە بە حاڵی دەرمانەکەی نەئەزانی، یا هەر وا نەبوو کە زۆرتر ئینسان بکوژێ، کەچی کابرا مرد، ئەوە قیساس لە سەر کابرای پێشوو نییە، بەڵام نیوەی دییەی «شِبه عَمد»ی ئەکەوێتەسەر؛ بەڵێ، ئەگەر دەرمانەکە بە ئەغڵەب، ئینسانی ئەکوشت و ئەم بریندارەیش بە حاڵی دەرمانەکەی ئەزانی، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەر کابرا کە برینداری کردووە، چونکە ئەبێ بە شەریکی کەسێ کە خۆی بکوژێ بە دەسەنقەست و مردنەکەیش ئەدرێتە پاڵ هەردوو برینەکە.

وە ئەگەر کەسێك تیماری برینداریکی کرد بە دەرمانێ کە دەسبەجێ ئینسان بکوژێ و کابرای دوکتۆر ئەیزانی ئەم دەرمانە وەهایە، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەر ئەم دوکتۆرەو بە تەنها خۆی ئەکوژرێ، چونکە دەرمانەکەی دەرمانێکی گیان دەرکەری دەس بەجێ بووە وە ئەگەر دەرمانەکەی گیان دەرکەری دەسبەجێ نەبوو، بەڵام زۆرتر وابوو ئینسانی ئەکوشت و کابرایش بە حاڵی دەرمانەکەی ئەزانی، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەر هەردووکیان، یەعنی ئەو کابرایش کە ئەم کەسەی بریندار کردووەو ئەم خاوەن دەرمانەش، هەردووکیان ئەکوژرێن وە ئەگەر بە حاڵی دەرمانەکەی نەئەزانی، ئەوە قیساس لەسەر کەسیان نییە، بەڵام دییەی «شبه عمد» ئەکەوێتە سەریانو یەکی نیوەی ئەدەن.

بەڵێ ئەگەر دەرمانەکە بە قسەی دووکەسی باوەڕ پێکراو دەرمانێکی بەسوود بوو یا بێزیان بوو و کابرایش مرد، ئەوە نە قیساس و نە دییە لەسەر ئەم دوکتۆرە نییە، بەڵکوو کرێیشی ئەکەوێ، چونکە واجبی خۆی بەجێهێناوەو هیچ درێغی لەلایەنی ئەوەوە نەبووە، بەڵام ئەبێ بزانین بەیانی پێشوو بۆ شوێنێکە کابرای بریندار ئیزنی دوکتۆرەکەی نەدابێ بە دەرمانێکی تایبەتی دەرمانی برینەکەی بکا، ئەگینا هەر زیانێ لەو دەرمانەوە پەیدا ببێ، بە خۆڕایی ئەڕوا، چونکە لەسەر ئیزنی بریندارەکەیە؛ هەروەکوو یەکێ لوویەك بە لەشیەوە بێتو ئیزنی کەسێ بدا بیبڕێو ئەویش، بیبڕێو کابرا بمرێ، ئەوە خوێنی بە زایە ئەڕوا، چونکە ئەم کابرا لەسەر ئیزنی ئەو خۆی، لووەکەی بڕیوە.

ئەگەر کۆمەڵێك بە تووڵ دایان لە کەسێك تا مرد و لێدانی یەکەیەکەیشیان لەوانە نەبووکە بە تەنیا خۆی کابرا بکوژێ، ئەوە راستتر ئەوەیە قیساس ئەکەوێتە سەریان، بەو شەرتەکە لەبەینی خۆیانا بڕیاریان دابێ بدەن لەوکابرایە و لێدانی هەموو یەکێکیشیان دەخلی هەبێ لە مردنی کابرادا وە ئەگەر لێدانی یەکێکیان هیچ پەیوەندی نەبێ تیایدا، بەم جۆرە جیا بووبێ لەلێدانی ئەوان و نەبێ بەهۆی هیچ جۆرە ئازارێکیوا، ئەوە ئەم کەسە بەر ئەم قیساسە ناکەوێ، هەتاوەکوو لە دییەیشدا بەشدار نییە وە ئەگەر بڕیاری ئەو لێدانەیان نەدابێ، ئەوە دییەی «شبه عَمد» ئەکەوێتە سەر هەموویان.

ئەگەر تاقەکەسێك کۆمەڵێکی بە بەرودوا کوشت، ئەوە ئەکوژرێتەوە لە قیساسی یەکەمیاندا و دییەی عەمدی باقی کوژراوەکانیشی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر هەموویانی بە جارێ کوشت، ئەوە بۆ کوشتنەوەی لە قیساسی یەکێکیاندا قورعە ئەخرێ، جا قورعە بە ناوی کێوە دەرچوو، ئەکوژرێتەوە لە قیساسی ئەوەدا وە ئەگەر غەیری ئەو کەسەی کە حەقی قیساسەکەی هەیە پەلەی کردو کابرای کوشت، ئەوە لەگەڵ ئەوەداکە گوناهبار ئەبێ، بەر قیساس ئەکەوێ و دییە بۆکوژراوەکانی تر لە ماڵی ئەوکەسە ئەدرێ.

## باسی گۆڕانی حاڵی جینایەتلێ‌کراو یا جنیایەتکەرەکە

بەر لە بەیانی حوکم لەم شوێنەدا، چەند دەستورێك هەیە ئەکرێن بە بناغە بۆ وەرگرتنی حوکمی جینایەت لەو شوێنانەدا کە بەیان ئەکرێن.

یەکەم: هەر جینایەتێك کە لە سەرەتاوە نەبێ بەهۆی ئەوەکە جینایەتکەرەکە زامن بێ لە ئاخرەوە بە گۆڕانی حاڵی کابرای جینایەتلێ‌کراو، نابێ بەهۆی ئەوە کە ئەوە کەسە ببێ بە زامن؛

دووهەم: هەر جینایەتێك کە لە سەرەتاو دوایییەوە زەمانەتی نەکرابێ، ئیعتباری ئەندازەی «حقُّ الضِّمان» لە ئاخریەوە ئەکرێ؛

سێهەم: پێویستە هاوسانی (تَكافُؤ) هەبێ لەبەینی تاوانکەرو تاوان لێ‌کراودا لە یەکەم بەشی تاوانەکەوە؛ جا ئەگەر کەسێك کافرێکی جەنگکەری بریندار کردو لە پاشان کافرەکە موسوڵمان بوو و بەو برینەیش مرد، ئەوە کابرای جینایەتکەر زەمانەتی لەسەر نییە، لەبەرئەوە کە لەکاتی بریندار کردنی کابرادا خوێنی بێ‌قیمەت بووە وە لە فەرموودەیەکی ئیمامدا، لەم کاتەدا دیەیەکی سووکی واکە بۆ موسوڵمانێکی ئازاد دەست بدا، ئەکەوێتە سەر کەس و کاری جینایەتکەرەکە.

وە ئەگەر موسوڵمانێك تیرێکی هاویشت بۆ کافرێکی جەنگکەر و کافرەکە لەپێش ئەوەدا کە تیرەکەی پێ‌بگات موسوڵمان بوو، جا تیرەکەی پێ گەیشت و مرد، ئەوە قیساس ناکەوێتە سەر ئەو تیر هاوێژە، بەڵام لەسەر مەزهەبی ئیمام، دیەیەکی سووك ئەکەوێتە سەرکەس و کاری وە ئەگەر شەخسێکی موسوڵمانی بریندار کرد، جا موسوڵمانەکە پاشگەز (مُرتَدّ) بووەوەو بە تەئسیری تیرەکەیش مرد، ئەوە قیساسی نەفسەکەی ناکەوێتە سەر جینایەتکەرەکە، بەڵام قیساسی ئەسڵی برینەکەی ئەکەوێتە سەر، چونکە لەکاتی موسوڵمانەتی کابرای جینایەتلێ‌کراودا کردوویەتی و ئەم قیساسە ئەدرێ بەو کەسە کە لەسەر فەرزی موسوڵمانەتی جینایەتلێ‌کراوە کە میراتی لێ وەردەگرت وە ئەگەر برینەکە قیساسی نەبوو، بەڵکوو مایەی واجب بوونی ماڵ بوو،

وەکوو ئەوە کە پارچەیەك لە گۆشتی رانی ببڕێ، ئەوە لەم کاتەدا ئەگەر ئەو ماڵە کەمتر بوو لە دییەی کابرا، ئەوە ئەو ماڵە ئەدەین بە میراتگرەکەی وە ئەگەر دییەکەی کەمتر بوو لەو ماڵە، ئەوە دییەکەی ئەدەینێ.

ئەگەر موسوڵمانێك بریندار کرا، لەپاشا پاشگەز (مُـرتَد) بـووەوەو لە ئـەنجامدا موسوڵمان بووەوە و بەهۆی برینەکەوە مرد، ئەوە قیساسی نییەو دییەیەکـی گـرانـی دەس‌بەجێی ئەکەوێتە سەر نەفسی بریندارکەرەکە بیدا بە میراتبەری کوژراوەکە وە لە فەرموودەیەکی ئیمامدا هەیەکەوا ئەگەر ماوەی پاشگەز بوونەوەکە کەم بوو، پێویستە قیساس لە کابرا بستێنرێت.

ئەگەر موسوڵمانێك کەسێکی زیممیی بریندار کرد، ئەوجا زیممییەکە موسوڵمان بوو و مرد، ئەوە قیساسی واجب نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر میراتگری موسوڵمانی هـەبوو، واجبە دییەی ئەو کەسە بدرێ بە میراتگرەکەی.

## باسی شەرتی قیساسی ئەندامو برین کردن‌و لابردنی هێز

ئەگەر کۆمەڵێك بەجارێك هێزیان خستە سەر شمشیرێك‌و دەستی کەسێکیان پێ بری، ئەوە دەستی هەموویان ئەبڕڕێتەوە، هەروەکوو ئەگەر کۆمـەڵێك بـە هـەموویان کەسێ بکوژن، ئەکوژرێنەوە.

ئەو برینانەی کە وان‌لە سەرو روخساردا، دە جۆرن؛

یەکەم: پێست رووکێن (حٰارِصە)؛

دووهەم: خوێن‌هێنەر، بە شەرتی ئەوەکە خوێنی لێ نەڕوا (دامیە)؛

سێهەم: ئەوەیە لە گۆشتی سەریش ببڕێ (باضِعە)؛

چوارەم: ئەوەیە ئەو برینە بە گۆشتەکەدا بڕواتە خوارەوە (مُتلاٰحِمة)؛

پێنجەم: ئەوەیە برینەکە بگاتە ئەو پێستە ناسکە کە وا لەبەینی گۆشت‌و ئێسکـدا (سِمْحاق)؛

شەشەم: ئەوەیە ئێسکەکەیش دەربخا (مُوضِحة)؛

حەوتەم: ئەوەیە ئێسکەکە بشکێنێ (هاشِمە)؛

**هەشتەم:** ئەوەیە ئێسکەکە لەجێی خۆیەوە بجوولێنێ بۆ جێیەکی تر، ئەگەرچی نەیشی شکێنێ (مُنقِلە)؛

**نۆهەم:** ئەوەیە برینەکە بگا بەکیسەی دەماغی کابرا (مَأمُومة)؛

**دەهەم:** برینێکە بگا بەکیسەی دەماغی کابراو بیشیدڕێنێ (دامِغه)؛ لەناو ئەم دە جۆرە برینەدا، هەر بۆ «مُوضِحه» قیساس هەیە کە ئێسکەکەی پێ دەرکەوتووە، ئیتر لە برینەکانی تردا «اَرْش» هەیە، واتە: بژاردن.

وە ئەگەر برین لە غەیری سەردا بەجۆرێك بووکە ئێسکی دەرخست، وەکوو سینەو قۆڵو ران، یاخود هەندێك لە نەرمەی لووتی یا نەرمەی گوێی یا لێوی یا زمانی بڕی، بەڵام لە ئەسڵەکەی جیا نەکردەوە، ئەویش قیساسی تیادێتەجێ؛ هەروەها، قیساس واجبە لە بڕینی هەر ئەندامێکی جمگەدا، وەکوو قولاپەو ئەژنۆو مووچی دەستو ئەنیشك و وردەڵەی پەنجەی دەستو پێ، هەتاوەکوو لە جمگەی بێخی رانو قۆڵا، ئەگەر نەبێ بەهۆی ئەوەکە تەنشتی کونی تێ ببێو ناوسکی دەرکەوێ، ئەگینا قیساسیان تیا دروست نییە، چونکە لەم کاتەدا لائەدا لە ئەندازەی حەقی شەرعی؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای ران یا قۆڵ بڕاو مردبوو، ئەوە قیساسەکەی واجب ئەبێ، هەرچەند بە بڕینی ئەو جمگەیە ناوسکی کابرای جینایەتکەر دەربکەوێو بمرێ.

هەروەها قیساس واجبە لەکوێرکردنی چاودا و لە بڕینی گوێچکەو پێلووی چاو و زوبان و لووتو نەرمەی لووتو زەکەرو هێلکەگونو ولّمەی رانو ئەم بەرو ئەوبەری فەرجی ئافرەتدا، بەڵام قیساس نییە لە شکاندنی ئێسقاندا، چونکە ئەندازەکەی دەرناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر لەگەڵ شکاندنی ئێسقانەکەدا لای خوارەوویشی جیا بووبووەوە، ئەوە دروستە لە نزیکترین جمگەوە لەو شوێنە شکستەیە ببڕێو «حوکوومەتی» شکستەکەیش وەربگرێ؛ بەڵام ئەگەر هیچ جوزئێك لە خواری شکستەکەوە جیا نەبووبێتەوە، ئەوە رەوا نییە لە ئەندامی کابرای جینایەتکەر ببڕێ، بەڵکوو هەر «حوکوومەتی» شکستەکەی ئەکەوێ کە بریتییە لە ئەندازەیەك پارەکە حاکم بڕیاری ئەدا بەرابەر بەو شکستەیە.

ئەگەر کەسێك ئێسکی سەری کەسێکی دەرخستو ئێسکەکەیشی لە شوێنی خۆی جوولاند، ئەوە سەری جینایەتکەرەکە ئەشکێنرێ لە قیساسدا بەجۆرێك کە ئێسکەکەی دەربکەوێ و پێویستە کابرای جینایەتکەر دە وشتریش بدا بە کابرای بریندار لەجیاتی جوولاندنی ئێسکی سەری.

وە ئەگەر کەسێك دەسی کەسێکی بڕی لە مووچدا، ئەوە دروست نییە بۆ ئەم دەست براوە پەنجەی کابرای جینایەتکەر لە وردەڵەدا ببڕێ و تەنها حەقی ئەوەی هەیە ئەویش دەستی ئەم ببڕێ لە جمگەی مووچدا وە ئەگەر هاتو ئەم وردەڵانەی بڕی، سەرزەنشت ئەکرێ، بەڵام حەقی قیساسی خۆی نافەوتێ.

ئەگەر کەسێك قۆڵی کەسێکی شکاندو جیایشی کردەوە، کابرای بریندار بۆی هەیە دەستی ئەو جینایەتکەرە ببڕێ لە ئەنیشکاو حوکوومەتی شکستەکەیشی لێ وەربگرێ وە ئەگەر ویستی دەستی کابرای جینایەتکەر لە مووچدا ببڕێو حوکوومەتی ئەوی تری وەربگرێ، بۆی هەیەو ئەمەی بۆ دروستە.

ئەگەر سەری بریندار کردو گەیاندی بەوە کە ئێسکی سەری دەرکەوێو بەهۆی ئەمەوە کوێر بوو، کابرای بریندار ئەتوانێ ئێسکی سەری ئەو دەربخا، جا ئەگەر ئەمیش کوێر بوو، ئەوە باشە، ئەگینا ئەتوانێ بە شتێکی بێزیان کوێری بکا؛ مەسەلا، سوورزنێکی سوورەوەکراو نزیك بکاتەوە لە چاوی تا کوێر ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك شەقازلەیەکی دا لە کەسێك و ئەو کەسە کوێر بوو، ئەمیش ئەتوانێ شەقازلەیەك بدا لەو کەسە، جا ئەگەر ئەویش کوێر بوو، ئەوە حەقی خۆی وەرگرتووە وە ئەگەر کوێری نەکرد، بەشێوەی پێشوو کە باسمان کرد کوێری بکا. هەروەها ئەگەر کەسێك دای لە کەسێكو کەڕی کرد یا کوێری کرد یا لاڵی کرد یا هێزو هەڵمەتی ئەندامێکی فەوتاند، ئەوە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا قیساس واجب ئەبێ، چونکە لابردنی ئەم هێزانە ئاسانە.

ئەگەر کەسێك پەنجەی کەسێکی بڕیو بەهۆی بڕینی ئەو پەنجەوە پەنجەکانی تریشی داکەوتن، ئەوە هەر حەقی قیساسی لەو پەنجەیەدا هەیە کە بڕیویەتی، چونکە جینایەتی

عەمدی لەلایەن کابرای جینایەتکەرەوە هەر بۆ ئەو یەك پەنجەیە بووە، بەڵام «دِیە»ی ئەو چوار پەنجەکەی تریشی ئەکەوێتە سەر و پێویستە لە ماڵی خۆی دەس بەجێ بیدا بە کابرا، هەروەها پارەیەکیشی ئەکەوێتە سەر لە حەقی شوێنی سەوز بوونی بنی پەنجەکانیدا.

بەڵێ ئەگەر یەکێ کوتەکێکی‌دا لە دەستی کەسێك و دەستی ئاوساو داکەوت، ئەوە ئەبێ دییەی هەموو دەستەکەی پێبدا وە ئەگەر لەم سوورەتەدا کابرا مرد، قیساسی لێ ئەسەنرێ‌و کابرا ئەکوژرێ.

## باسی چۆنیەتی قیساس و قیساس‌وەرگر و یەك نەکەوتنی میراتگرەکان لە قیساس وەرگرتن‌و عەفوکردنا

شەرتە لە قیساسی ئێسکی دەرکەوتوودا بێجگە لە شەرتە پێشووەکان، ئەندازە گرتنی ئەو برینە؛ کەوابوو، ئەبێ بە دارێك یا بە خەیاتەیەك ئەندازەی برینەکەی سەر بگیرێ بە درێژی‌و بە پانی وە مانیعی قیساس نییە جیاوازی هەبێ لەبەینی سەری جینایەتکەرو جینایەت لێ‌کراودا لەبارەی ئەستووریی پێست‌و زۆریی گۆشتەوە و دروست نییە ئەندازەی شوێنی برینەکە بەنیسبەت بۆ هەموو سەری کابرای جینایەت لێ‌کراوەوە بگیرێ، چونکە زۆر جار ئەبێ بەهۆی دەس‌درێژی لە برینداره‌کە یا لەو کەسە برینەکەی کردووە؛ مەسەلا، ئەگەر برینی سەری کابرا چواریەکی سەری بێ‌و ئێمەیش ئێسکی چواریەکی سەری جینایەتکەرەکە دەربخەین، ئەگەر سەری بچووکتر بێ لە سەری کابرای بریندارکەر، ئەوە حەقەکەی بەتەواوی وەرنەگرتووە وە ئەگەر سەری گەورەتر بێ لە سەری ئەو، لەم کاتەدا غەدرمان لە جینایەتکەرەکە کردووە، بەڵام ئەکەر کەسێك هەموو ئێسکی سەری کەسێکی دەرخست، ئەوە ئێمەیش ئێسکی هەموو سەری جینایەتکەرەکە دەرئەخەین، هەرچەند سەری بریندارەکە زلتر بێ لە سەری جینایەتلێ‌کراوەکە، ئیتر ئەندازەی سەری بریندارەکە تەواو ناکەین لە روخسارو پشت‌ملی جینایەتکەرەکەدا؛ بەڵێ، بەشی ئەوەی کە ماوەتەوە لە ئەرشی

برینەکە، وەری‌ئەگرین لە کابرای جینایەتکەر لەسەر ئیعتیباری دابەش کردنی ئـەو ئەرشە بەسەر هەموو بەشەکانی سەریا؛ مەسەلا، ئەگەر ئەرشی برینە ئێسك دەرخەرەکە دە دینار بوو وە دەیەکێکی سەری کابرای بریندار زیاتر بوو لە سەری جینایەتکەرەکە، ئەوە ئێسکی سەری جینایەتکەرەکە دەرئەخەین‌و دیناڕێکیشی لێ وەرئەگـرین بـۆ برینداره‌کە لە ئەرشی ئەندازەی فەرق لە بەینی سەریانا.

وە ئەگەر سەری جینایەتکەرەکە زلتر بوو، ئەوە ئەو ئەندازەیە لە ئێسکی سەری دەردەخەین کە لە سەری جینایەتلێ کراوەکەدا دەرکەوتووە و لەم کاتەدا، فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئیختیار بە دەستی جینایەتکەرەکەیە بۆ دیاری کردنی شوێنـی بـرین کردن لە سەریا. ئەگەر کەسێك ئێسکی پێشی سەری کەسێکی دەرخست، ئەوە ئێسکی پێشی سەری دەرئەخرێ‌و لە سەریشیا ئەندازەی ناتەواوییەکەی تەواو ئەکرێ.

ئەگەر قیساس‌وەرگر لە ئەندازەی برینی بـرینداره‌کـە زیـاتری دەرخست، ئـەوە قیساسی ئەو زیادەیەی لێ‌وەردەگیرێ، بەو شەرتە بە عەمدی زیاد بڕوا وە ئەگەر بە هەڵە بوو، یاخود عەمد بوو و کابرا لەسەر ماڵ عەفو کرا لە قیساس، پێویستە کابرای زیادەڕەو ئەرشی برینێکی ئێسك دەرخەری تەواو بدا؛ بەڵێ، ئەگەر زیادەکەی بەهۆی قوسووری جینایەتکەرەکەوە بوو، بەم رەنگە کە لەکاتی بریندار کردنەکەیدا جم‌وجووڵی زۆر ئەکردو دەستی کابرای برینداركەریش ترازا، ئەوە بە بێ‌قیساس‌و بەخۆڕایی ئەڕوا.

ئەگـەر سـەری بـرینداركـراوەکـە لەبـەر دەردێك مـووی لێ نـەئەڕوا و سـەری برینداركەرەکە مووی هەبوو، ئەوە قیساسی بۆ وەرناگرین، بەڵکوو ئەگەر برینەکە دییەی هەبوو، دییەی بۆ دائەنێین، ئەگینا لەسەر بڕیاری حاکـم پـارەیەکـی لەجـیاتی‌دا بـۆ وەرئەگرین.

ئەگەر کۆمەڵێك ئێسکی سەری کەسێکیان دەرخست، ئەوە ئێسکی سەری هەموویان دەرئەخرێ بە ئەندازەی دەرخستنی ئێسکی سەری بریندار کراوەکە.

بەشەرت گیراوە لەگەڵ شەرتەکانی‌تری قیساس بۆ وەرگرتنی قیساسی ئەندامـی لەش، وەکوو دەست‌و پێ‌و گوێچکەو چاوو زوبان‌و لێوو وێنەی ئەمانە، یەکـێتـی لە

شوێندا؛ کەواتە، راست لەجیاتی چەپو چەپ لەجیاتی راست نابڕێ، یا لێوی سەروو لەجیاتی لێوی خواروو، یا بە پێچەوانەوە، یا پەنجەی دەست لەجیاتی پەنجەی پێ، یا پەنجەیەکی دەست یا پێ لەجیاتی پەنجەیەکی تری دەست یا پێ، نابڕێ گوێچکەی ساغیش نابڕێ لە لەجیاتی گوێچکەیەك کە هەندێکی نەمابێ؛ هەروەها، هەر ئەندامێك کە سوودەکەی لە خۆیدا بێ، وەکوو چاوو زوبان، خاوەن سوودیان لەجیاتی بێسوود وەرناگیرێ، هەرچەند خاوەنەکەیشی رێگا بدات؛ کەواتە، ئەگەر دەستێکی ساغیان بڕی لەجیاتی دەستێکی ئیفلیج بەبێ رێگادانی خاوەن دەستەکە، ئەوە نابێ بە قیساس و دییەی ئەو دەستەساغە بڕاوە ئەکەوێتە سەر کابرای دەستبڕ وە ئەگەر تەشەنەی کردو گیانی کابرای دەست بڕاوی پێ دەرچوو، قیساس لەو دەستبڕە ئەسەنرێ؛ کەواتە دروست نییە بڕینی دەستێکی ساغ لەجیاتی دەستێ کە ئیفلیجی تیابێ وە پێیەکی ساف لەجیاتی پێیەك کە وشك بووبێو هاتوچۆی پێنەکرێ، وە زمانێکی گۆیا لەجیاتی زمانێ کە لاڵ بێ؛ چاوی ساغیش کوێر ناکرێ لەجیاتی چاوێ کە کوێر بێ، بەڵام کوێر ئەکرێ لەجیاتی چاوی خێل یا شەوکوێر یا ئاوپیاهاتوو یا بچووك؛ هەروەها، زمانی گۆیا ئەبڕرێ لە قیساسی زمانی منداڵێکدا کە نیشانەی قسە کردنی تیادەرنەکەوتبێ و دەستی ساغ ئەبڕرێ بە قیساسی دەستێ کە هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە ئەنیشکی وشك بووبێو لە ئیشکردن نەکەوتبێ؛ هەروەها قاچی ساف ئەبڕرێ لە جیاتی قاچێك کە هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە ئیفلیج بووبێ؛ گوێچکەی بیسندەیش ئەبڕرێ لەجیاتی گوێچکەی کەڕو لوتی بۆنکەر ئەبڕرێ لەجیاتی لووتی بۆن نەکەر.

دیارە دروستیشە پێیەك کە ئیفلیج بێ ببڕرێ لەجیاتی پێیەکی ساغ، مەگەر شارەزایان بڵێن: ئەگەر ئەو دەستە یا وئەو قاچە ئیفلیجە ببڕرێتەوە خوێنی ناوەستێتەوەو کابرا ئەمرێ، ئەوە لەم حاڵەدا نابڕرێنەوە.

جائەگەر ئەندامێکی عەیبدار بڕرا لە قیساسدا، پێویستە خاوەن قیساسەکە قەناعەت بکاو نەڵێت: تۆڵەی ئەو ناتەواوییەم ئەوێتەوە، چونکە ئەندامەکەی من ساغ بووە،

لەبەرئەوە کە لە بنچینەدا کابرا خۆی ڕازی بووە بەو قیساسە، بێجگە لەوەیش، هەردوو دەستەکان لە دیمەنو شێوەدا وەك یەك وان.

زەکەریش وەکوو دەست وایە لە ساغیو شلەپەتکەیی‌دا؛ شلەپەتکەیی لە زەکەردا ئەوەیە کە وشكو لوول بێ بەجۆرێ کە نەکرێتەوە، یا خود وشكو ڕەق بێ بەجۆرێك کە نەنووشتێتەوە، ئیتر ئیعتیبار بە هەستانو هەڵنەستان نییە؛ کەواتە، زەکەرێ کە هەڵسێت، ئەبڕرێ لە قیساسی زەکەرێکدا کە هەڵنەسێت و زەکەری ئینسانی «کەڵ»، ئەبڕرێ لە قیساسی زەکەری کەسێکی خەسێنراودا، یا لە قیساسی زەکەری شلەپەتکەدا.

هەروەها، مانیع نییە لە قیساس وەرگرتن ئەمە کە ئەندامی کابرای بڕندە گەورەتر یا بچووکتر بێ لە ئەندامەبڕاوەکە؛ هەروەها، قەیدی نییە جیا بن لە یەك لە قەڵەویو کورتیو درێژیو ساغیو نەخۆشیو ناشیرینیو لە ڕەنگو لە پیشە زانین‌دا؛ کەواتە، دەستی درێژ ئەبڕرێ لەجیاتی کورتو گۆشتن ئەبڕرێ لەجیاتی لەڕو دەستی نووسەر ئەبڕرێ لەجیاتی دەستی نەخوێندەوار و دەستی گەورە لەجیاتی دەستی بچووك و دەستێ کە نینۆکی پەنجەکانی جوان بێ لە جیاتی دەستێ کە نینۆکی پەنجەکانی جوان نەبێ و دەستێ کە هێزی زۆر بێ لەجیاتی دەستێ کە هێزی کەم بێ، یا دەستێ کە ساغ بێ لەجیاتی دەستێ کە گەڕۆڵ بێ.

بەڵام دروست نییە بڕینی دەستێ کە هەموو پەنجەکانی هەبێ لەجیاتی دەستێ کە هەندێ لە پەنجەکانی نەبێ، یاخود هەندێ لە نینۆکەکانی هەڵوەریبێ.

ئەگەر ئینسانێکی دەستو پەنجە تەواو دەستێکی چوار پەنجەی بڕی، ئەوە ئەو دەستە تەواو لە قیساسدا وەرناگیرێ و کابرا ئەتوانێ دیەی چوار پەنجەکەی وەربگرێ؛ هەروەها، ئەیشتوانێ ئەو چوار پەنجەیە لە دەستی کابرای جینایەتکەردا ببڕێ و لەم سوورەتەدا، دیەی بێخی پەنجەکانیشی لێ‌ئەسێنێ و لە هەردوو سوورەتەکەدا، ئەم کابرا ئەتوانێ پارەیەك لەجینایەتکەرەکە بسێنێ لەجیاتی پێنج‌یەکی بەری دەستی و ئەو پێنج‌یەکە، بریتییە لە شوێنی سەوزبوونی پەنجە ناتەواوەکەی، چونکە لە بەرابەری ئەوەوە هیچی دەست نەکەوتووە.

ئەگەر کابرایەکی خاوەن دەست و پەنجە، دەستێکی بێ پەنجەی بری، ئەوە لەو شوێنەدا قیساس نییە، بەڵکوو هەرحەقی پارەیەکی هەیە بەرابەر بەری دەستی و پشتی دەستی کە بریتییە لە ئەندازەیەك کە حوکمڕانی ئەو شوێنە بەپێی بیری خۆی بڕیاری ئەدا.

ئەگەر کەسێ کە پەنجەی دەستی ناتەواو بێ دەستێکی تەواوی بڕی، ئەوە دەستی لە قیساسدا ئەبڕرێ و دییەی پەنجەکانیشی لێ وەرئەگیرێ بە ژمارەی ناتەواویـیەکـانی دەستی، هەروەها ئەگەر کابرای دەست‌بڕ پەنجەکانی شەل و بێ‌سوود بن؛ بەڵێ کابرای دەست بڕاو ئەتوانێ قەناعەت بکا بە بڕینی ئەو دەستە ناتەواوەو داوای ماڵ نەکا.

بێداری! دەرکەوت لە بەیانە پێشووەکەوە کەوا پەنجەیەك لە قیساسی پەنجەیەکی تردا و سەرە پەنجەیەك لە قیساسی سەرە پەنجەیەکی تردا نابڕرێت؛ هەروەها، پەنجەیەکی زیاد بە هۆی پەنجەیەکی ئەسڵییەوە یا بە هۆی پەنجەیەکی زیادەوە کە شوێنیان جیابێ و پەنجەیەکی ئەسڵی بەهۆی پەنجەیەکی زیادەوە نابڕرێ و قیساس هەیە لە هەڵکەندنی دانێکی واداکە سوودی مابێ بەتەواوی، سەروو بە سەروو وە خواروو بە خواروو لەگەڵ چاودێری کردنی یەکێتی شوێندا؛ کەوابێ دانێ کە ئەوەندە بچووك بێ بـۆ جـووینی خواردەمەنی نەشێ، یا دانێ کە زۆری لێ هەڵوەریبێ یا لەق و شل بووبێ، وەکوو دانی پیر، ئەوە قیساسی نییە، مەگەر دانی کابرای جینایەت‌کەریش هەر وابێ.

قیساس نییە لە شکاندنی دانا مەگەر بەهۆی ئالەتێکی واوە کە بە بێ کەم و زیاد دانی کابرای جینایەت‌کەر بشکێنێ وەکوو دانی کابرای جینایەت‌لێ‌کراو.

ئەگەر کەسێك دانی منداڵێکی وای هەڵکەند کە هێشتا دانی کاتی شـیر خـواردنـی نەکەوتبوو، ئەوە رائەوستین تا کاتی دەرهاتنی دانەکانی، جا ئـەگـەر لەو کـاتەدا کـە دانەکەوتووەکانی دەردێن، ئەو دانە شکاوەی دەرنەهاتەوەو شارەزایان وتیان: جێگای دەرهاتنەوەی دانەکەی فەوتاوە، ئەوکاتە قیساسی ئەو دانە لە جینایەت‌کەرەکە وەرئەگرین؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك دانێکی کەسێکی شکاند کە لەپاش کەوتنی دەرهاتبووەوە، کەچی وا رێکەوت ئەو دانە دووبارە دەرهاتەوە، ئەوە قیساس وەرئەگیرێت لە جنایەت‌کەرەکە، چونکە ئەم جۆرە دەرهاتنەوەیە نایابەو لە حوکمی ئەوەدایە کە دەرنەهاتبێتەوە.

**بزانن!** هەر ئەندامێك كە لەپاش جینایەت لە كابرای جینایەتكەر پەیدا ببێ، لە قیساسدا وەرناگیرێ؛ كەواتە، ئەگەر كەسێك كە دانی پێشووی نەبوو، دانی پێشووی كەسێكی شكاند، كەچی پاش ئەم جینایەتە دانی پێشووی دەرهات، ئەوە ئەو دانەدەرهاتووە لە قیساسدا هەڵناكێشرێ.

## باسی جیاوازیی قسەی كابرای جینایەتكەرو كابرای موستەحەقی خوێن

ئەگەر كەسێك كابرایەكی وای كرد بە دوو لەتەوە كە خۆی پێچابوو لە جلەوە و ئیددیعای ئەكرد كە ئەو كابرا مردوو بووەو لە كاتی مردوویەتیدا لێی داوە، خوێنڕەسەكەیشی ئیددیعای ئەكرد كە لەو كاتەدا زیندوو بووەو بە زیندوویی لێی داوەو كوشتوویەتی، ئەوە ئەو خوێنڕەسە سوێند ئەدرێ، لەبەر ئەوە كە ئەسڵ مانەوەی ژیانی ئەو كەسەیە، بەڵام كە سوێندی خوارد، هەر دییەی ئەكەوێ و كابرای جینایەتكەر ناكوژرێ، چونكە ئەم شوێنە شوێنی گومانو شوبهەیەو قیساسیش بە شوبهە ئیسپات نابێ.

بەڵێ، ئەگەر كابرای جینایەتلێكراو مەعلووم نەبوو زیندوو بووە یا مردوو بووە، وەكوو منداڵێكی لەبارچوو، ئەوە لەم كاتەدا كابرای جینایەتكەر باوەڕی پێ ئەكرێ بە سوێند مادام شاهید لەسەر ژیانی راست نەبێتەوە.

ئەگەر كەسێك دەستی كەسێكی بڕی و ئیددیعای وابوو كە ئەو دەستە ئیفلیج بووەو كابرای دەستبڕاویش ئیددیعای ئەكرد كە دەستەكەی ساغ بووە، ئەوە بەپێی "مەزهەبی ئیمام"، سوێندی جینایەتكەرەكە ئەدرێ، هەروەها لە وێنەی ئەم حاڵەتەیشدا، واتە لە شوێنێكا كە جینایەت لە ئەندامی بەدەرەوەبووی دیاری كرابێ، مادام كابرای جینایەتكەر ئینكاری ئەسڵی ساغی ئەو ئەندامە بكا، باوەڕ بە سوێندی ئەو ئەكرێ، چونكە ئەگەر ئەندامەكە ساغ بوایە، كابرای جینایەتلێكراو ئەیتوانی شاهید راست بكاتەوە لەسەر ساغی دەستەكەی، بەڵام لە ئەندامی پەنهانیدا، وەكوو «زەكەر» ـمەسەلا ـ ئەوە كابرای جینایەتلێكراو سوێند ئەدرێ لەسەر ساغی ئەو ئەندامە،

چونکە ڕاست کردنەوەی شاهید لەسەر ساغی ئەو جۆرە شوێنە شتێکی گرانە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەسڵ لە ئەندامی ئادەمیزادا سەلامەتییە.

وە ئەگەر هەردووکیان قسەیان یەك بوو لەسەرئەوە کە ئەو ئەندامە وەختی خۆی ساغ بووە، بەڵام جینایەتکەرەکە ئەیوت: لەپێش ئەوەدا کە من جینایەتەکەم بکەم عەیبێکی تیا پەیدا بووبوو و خاوەنەکەی ئینکاری ئەکرد، ئەوە لەم حاڵەتەدا باوەڕ بە سوێندی خاوەنی ئەندامەکە ئەکرێ، چونکە مادام دیارە لەپێشدا ئەو ئەندامە ساغ بووە، ئەسڵ ئەوەیە عەیبی تیا پەیدا نەبووبێ و لەم جۆرە شوێنەدا، قیساسی شوێنەکە واجب ئەبێ، لە سەر فەرموودەی «ابن حجر» وە دییەی عەمد واجب ئەبێ لای «رَمَلی».

ئەگەر کەسێك هەردوو دەستو پێی کەسێکی بڕیو ئەو کەسە مرد، جا کابرای جینایەتکەر ئەیوت بە سیرایەتی برینەکان مردووە، یاخود: لەپێش چاكبوونەوەی دەستو پێیدا خۆم کوشتم بۆ ئەوە تاقە دییەیەکی بکەوێتە سەر ـکە دییەی نەفسە ـ وە سوورەتی مەسئەلەکەیش وابێ دییە واجب بێو خاوەنخوێنەکەیش ئیددیعای ئەوەی ئەکرد کە لەپێش مردنیا برینی دەستوپێکەی خۆش بووەتەوەو ئەوسا مردووەو قسەکەیشی ڕێی تێئەچوو و ئیمکانی هەبوو، یاخود ئیددیعای سەبەبێکی تری دیاریی ئەکرد بۆ مردنی کابرا، بەڵام شاهیدی لەسەر نەبوو و خۆشبوونەوەی کابرایش لەوماوەیەدا ڕێی تێبچێ یا نە، ئەوە لەم سوورەتانەدا ڕاستتر ئەوەیە کە ئەو خوێنڕەسە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، لەبەرئەوە کە بەهۆی بڕینی دەستو پێکانی، دییەی هەردوو ئەندامەکە سابت بووەو ئەسڵیش نەبوونی مانیعە لەسەریان، بەڵام ئەگەر لەوماوەیەدا خۆشەوە بوونی کابرا ڕێی تێنەچێ لەبەر کەمی وەخت، ئەوە باوەڕ بە سوێندی جینایەتکەرەکە ئەکرێ، تەنها لە یەك شوێندا نەبێ کە بریتییە لەو شوێنە کە خوێنڕەس سەبەبی دیاری نەکردبێو خۆشەوە بوونی ئەندامەکانیش لەوماوەیەدا ڕێی تێنەچێو جینایەتکەرەکەیش بڵێ: خۆم کوشتوومە، ئەوە پێویستە جینایەتکەرەکە سوێند بخوات، چونکە ئەسڵ وایە کردەوەیەکی تری وەهای نەکردەبێ کە تەئسیری کردەوە پێشووەکانی ببڕێ.

ئەگەر کەسێك دەستی کەسێکی بڕی و کەسەکە مرد و جینایەتکەرەکە ئیددیعای ئەکرد کە بە سەبەبێکی تر مردووە غەیری سیرایەتی برینەکە، خواه سەبەبەکە دیاری بکا یا نە، بۆ ئەوە کە نیوە دییەکەی بکەوێتە سەرو نیوەکەی تری بکەوێتە سەر ئەو خاوەن سەبەبەکەی تر و وەلییەکەیش ئیددیعای سیرایەتی ئەکرد، بۆ ئەوە کە دییەی تەواوی بکەوێتە سەر، یا خود قیساسی بکەوێتە سەر، ئەوە ڕاستتر ئەوەیە کە باوەڕ بە سوێندی وەلییەکە ئەکرێ، مادام جینایەتکەرەکە بە شاهید ئیسپاتی ئیددیعاکەی خۆی نەکا وە قیساس، یاخود تەواوی دییەی لەسەر سابت ئەبێ.

ئەگەر کەسێك دوو برینی لە سەری کەسێکدا کرد کە ئێسقانی سەری دەرخست و لەپاشان ئێسقانی بەینی ئەو دوو برینەشی دەرخست، بەڵام ئەیگوت ئـەو نـاوبەینەم لەپێش خۆشەوە بوونی برینەکاندا لابردووە، بۆ ئەوە کە بژاردنـی یـەك جـار ئـێسك دەرخستنی بکەوێتە سەر و بریندارەکەیش ئیددیعای وابوو کە لەپاش خۆشەوەبوونی ئەوانە بووە، تا بژاردنی سێ ئێسقان دەرخستنی لێ بسێنێ، ئەوە سوێنی جینایەتکەرەکە ئەدرێ، مادام قسەکەی ڕێی تێبچێ و بەعادەت لەوانەبێ قسەکەی ڕاست بێ، ئەگینا کابرای بریندار سوێند ئەدرێ، بەڵام کە سوێندی خوارد، هەردوو بژاردنی ئەکەوێتەسەر جینایەتکەرەکە نەك سێ بژاردن، چونکە ئەم سوێندەی کە خواردوویەتی، بۆ مەنعی ئیددیعای جینایەتکەرەکە بووە تا بژاردنەکە نەبێ بە یەکێ، ئیتر وەکوو مەنعی قسەکەی ئەو ئەکا، بژاردنێکی سێهەمیشی پێ سابت نابێ.

## باسی موستەحەقی قیساس و قیساسوەرگرو هەندێ بابەتی تر

سوننەتە لە قیساسی غەیری گیاندا، خۆڕاگرتن لە وەرگرتنی قیساسدا تا برینەکە خۆش ئەبێتەوە و دروست نییە کابرا عەفو بکرێ لەسەر ماڵ، چونکە ڕێی تێئەچێ ئەو برینە تەشەنە بکا بۆگیانی کابراو بیکوژێ، چونکە لەمکاتەدا حەقی بریندارەکە ئەفەوتێ.

ڕاست وەهایە حەقی قیساس سابت ئەبێ بۆ هەموو میراتگرەکانی کـوژراوەکـە بەنیسبەتی میرات وە ئەگەر یەکێ لەم میراتبەرانە کابرای عەفو کرد بـەخۆڕایـی یـا

لەسەر ماڵ، ئیتر دروست نییە ئەو کابرا بکوژرێ، لە بەرئەوە کە قیساس پارچە پارچە نابێ، جا کە یەکێکیان بکوژەکەی عەفو کرد، ئەوە میراتگرەکانی تر یا بەشە دیـەی خۆیان وەرئەگرن یا ئەوانیش عەفوی ئەکەن.

وە ئەگەر لەناو میراتگرەکانا منداڵ یا شێت یا نادیار هەبوو، واجبە راوەستن تـا منداڵەکە باڵغ ئەبێ، یا شێتەکە چاك ئەبێتەوە، یا نادیارەکە ئەگەڕێتەوە؛ ئەگەر شارەزایان (ئەهلی خیبرە) وتیان: ئەو شێتە هەرگیز چاك نابێتەوە، ئەوە لەم حاڵەدا وەلی ئـەمری شێتەکە دائەنیشێ لەجێیداو قیساس ئەستێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو شێتە لاتو هەژار بوو و مەسرەفی نەبوو، واجبە لەسەر وەلی ئەمرەکەی کابرای بکوژ ببەخشێ بەرابەر بە پارە، بۆ ئەوەی بەو پارەیە شێتەکە بژیێنێ، بەڵام وەلی ئەمری منداڵی عـاقڵی نـاباڵغ حـەقی ئەمەی نییە کەوا بکوژەکە ببەخشێ بەرابەر بە پارە، چونکە باڵغبوونو پێ گـەیشتنی منداڵەکە شتێکی نزیك و عادەتییە.

بەڵێ، ئەگەر بکوژەکە رێگرو جەردە بێو خەڵك بکوژێ، واجبە لەسـەر حـاکـم شەرعی ئەو شوێنە پەلەپەل بکا بۆ کوشتنەوەی کابراو مەودای نەدا و پێویستە گوێ نەدا بەمیراتگری کابرای کوژراو، چونکە ئەم کوشتنەوەیە لە دەستی ئەودایە.

هەروەها واجبە لەسەر حاکم شەرعی موسوڵمانان، بکوژ بخاتە بەندیخانەوە تـا کاتی قیساس لێوەرگرتنەوەی دێت، ئیتر دروست نییە بە کەفیل بەرەڵڵای بکا، چونکە لەوانەیە هەڵبێو دەس نەکەوێتەوەو قیساسەکە بفەوتێ.

واجبە لەسەر میراتگرەکانی کابرای کوژراو رێك بکەون لەسـەر دیـاری کـردنی کەسێ کە قیساسەکەیان بۆ جێبەجێ بکا، ئیتر دروست نییە بە هەموویان کۆببنەوە کابرا بکوژن، چونکە بەهۆی کۆمەڵ کردنی ئەم تاقمەوە، پەرێشانیو ناڕەحەتی بۆ کابرای بکوژ زیاتر لەو ئەندازەیە پەیدا ئەبێ کـە مـوستەحەقیەتی، مـەگـەر لەحـاڵێکـدا کـە قیساسەکەی بەوجۆرە بێ کە بیخەنە ناو ئاوێکی زۆر یا لە زەردوماهێکەوە هەڵی دێرنە خوارەوە.

جا ئەگەر رێك نەکەوتن لەسەر کەسێك کـە بـیکوژێ، پـێویسـتە قـورعە بـخەن؛ نەخۆشو پیرو لاوازیش ئەخرێنە قورعەوە، بەڵام ئەگەر قورعە بەناوی یەکێ لەمانەوە

دەرچوو، ئەبێ وەکیل بگرێ بۆ قیساس سەندن؛ ئەگەر یەکێ لە میراتگرەکان لەخۆیەوە، لەپێش قورعەخستندا یا لەپاش قورعە، بەڵام بەپێچەوانەی ئوسوولی قورعەکە، کابرای کوشتەوە، ئەوە لەگەڵ ئەوەدا کە پێچەوانەی شەرع جووڵاوەتەوە، قیساسی ناکەوێتەسەر، چونکە شوبهەی حەقی هەیە و لەمکاتەدا میراتگرەکانی تر حەقی دییەیان هەیە لە ماڵی جینایەتکەرەکە، چونکە ئەم کابرا بە بێئیزنی ئەوان بکوژەکەی کوشتووە و لەوە ئەچێ کە کەسێکی بێگانە کوشتبێتی، بەڵام میراتگرانی کابرای جینایەتکەر، دییەی جینایەتکەرەکە لەم کەسە پەلە کردووە ئەستێنن، تەنها ئەو ئەندازەیەی نەبێ کە بەشی خۆیەتی لەو دییەیە کە لە میراتی جینایەتکەرەکە وەرگیراوە.

بزانن! ئەگەر حاکمی شەرع مەنعی ئەمکابرایەی کردبوو لەکوشتنی جینایەتکەرەکە، ئەویش گوێی‌نەدایەو کوشتی، ئەوە گومانی تیا نییە کە قیساسی لێ ئەسێنرێ وە ئەگەر ئیزنی‌دابوو بۆ کوشتنی، ئەوە گومانی‌تیا نییە کە قیساسی لێ‌ناستێنرێ؛ بەڵێ، ئەگەر یەکێك لە میراتگرەکان بکوژەکەی عەفو کرد لە قیساس، کەچی یەکێکی‌تریان هەر کوشتی، ئەوە قیساس لەو یەکە ئەستێنرێ، خواه ئاگای هەبێ لەو عەفو کردنە یا نە، چونکە کەمتەرخەمی کردووە بەهۆی ئەوەوە کە بە بێ لێکۆڵینەوەیەکی باش ئەو کابرایەی کوشتووە.

دروست نییە قیساس بستێنرێ بە بێ‌ئیزنی ئیمام یا جێگری ئیمام، لەبەرئەوە کە بەجێ‌هێنانی «حُدود» لە دەسەڵاتی ئیمامدایە، ئەوەندە هەیە ئیمام لە حەقی خوادا سەربەخۆ حەق ئەستێنێ و لە حوقووقی ئادەمیزاددا، پێویستە خاوەن‌حەق داوای حەقی خۆی بکا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەهل بێ بۆ وەرگرتنەوەی ئەو حەقە، ئەوسا بۆی دروستە حەقەکە بسێنێ، ئەگینا بە بێ‌داواکردنی حەق‌داری ئەهل، دروست نییە دەس بدا لە قیساسەوە وە سوننەتە قازی دووکەسی دادپەروەری لەگەڵدا بێ‌و ئاگایان لە داواکردنی میراتگرەکە بێ، بۆ ئەوە کە ببن بە شاهید لەسەر داواکردنی حەقەکە لەلایەنی ئەو میراتگرەوە، جا ئەگەر میراتگر پەلەی کردو بە بێ‌ئیزنی ئیمام قیساسی

سەند، ئەوە حەقەکە تەواو ئەبێ، بەڵام گوناهی ئەگاو تەعزیریش ئەکرێ بۆ ئەوە کەسی‌تر ئیشی‌وا نەکا.

واجبە لەسەر ئیمام ئیزنی خاوەن حەق بدا بۆ وەرگرتنی حەقی خۆی، بەو شەرتەکە کابرا لایق بێ بۆ قیساس‌وەرگرتن، یەعنی لە قیساس وەرگرتندا لە موسوڵمان، ئەو کەسە موسوڵمان بێ‌و باڵغ‌و عاقڵ بێ‌و دڵی ئەستوور بێ‌و ئوسووڵی قیساس وەرگرتن بزانێ؛ ئەم ئیزن دانە، تەنها لە قیساسی نەفسدا دروستە، ئەگینا لە قیساسی ئەندامدا وەکوو دەست‌و پێ‌و دەرخستنی ئێسکی سەر و لە قیساسی هێزدا، وەکوو کەڕکردن‌و کوێرکردن، دروست نییە ئیزنی خاوەن حەقەکە بدا، لەبەرئەوە کە زیاتر وایە میراتگر داخ لە دڵەو لەوانەیە لە ئەندازەی حەقی خۆی لابدا؛ لەم سوورەتانەدا، پێویستە کەسێکی تایبەتی دابنێن بۆ ئەوە کە حەقەکە وەربگرێ؛ هەروەها، دروست نییە ئیزن‌دانی خاوەن حەق بۆ وەرگرتنی حەددی بوختان کردن‌و تەعزیر، نەوەك لە ئەندازەی حەق لابدا. جا ئەگەر ئیزنی شەخسێکی لایقی دا کە بدا لە گەردنی، ئەویش دای لە شوێنێکی‌تری‌و وتی: بە عەمدی بووە، ئەوە تەعزیر ئەکرێ بەڵام عەزل ناکرێ وە ئەگەر وتی: بە هەڵە بووە، ئەوە تەعزیر ناکرێ، بەڵام ئەبێ عەزلی بکا.

**بزانن!** وەرگرتنی قیساس، حەقێکە واجبە دەس‌بەجێ جێ‌بەجێ بکرێ لە هەر شوێنێکا بێ، هەرچەند حەرەمی مەککە، یا ناوماڵی کەعبەبێ، وە لە هەرکاتێکا بێ، گەرم یا سارد، بەڵام دروست نییە لەناو مزگەوتەکەدا بکوژرێ، لە ترسی پیس‌کردنی؛ هەروەها، دروست نییە لە موڵکی کەسێکی تردا بکوژرێ بە بێ‌ئیزنی ئەو کەسە. ئەگەر قیساس کەوتە سەر ژنێکی دووگیان، بە حەڵاڵ یا بە حەرام، موسوڵمان یا کافر یا پاشگەز بووەوە وە قیساسەکە قیساسی نەفس بێ یا ئەندامی لەش، ئەوە دروست نییە قیساسی لێ وەربگیرێ تا سکەکەی لێ‌ئەبێتەوەو مناڵەکە گۆش ئەکاو کەسێك پەیدا ئەبێ کە شیری پێ بداو بە شیرەکەی قەناعەت بکا وە ئەگەر کەسێکی‌وا پەیدا نەبوو، پێویستە ئەو ژنە خۆی شیری پێ بدا تا لە شیر ئەبڕێتەوە؛ ئەگەر هات‌و خاوەن‌حەق بەپێچەوانەی ئەم دەستوورە جووڵایەوەو قیساسی وەرگرت لە ژنەکەو مناڵەکە لەبەر

بێشیری مرد، ئەوە قیساس لەو کەسە ئەسەنرێ، چونکە بە دەسەنقەست بووە بەهۆی فەوتانی ئەو مناڵە.

ئەگەر ئەو ژنە کە قیساسی لەسەرە ئیددیعای کرد کەوا دووگیانە، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند، هەرچەند نیشانەی دیاریشی نەبێ؛ کەوابوو، ژنێکی وەها ئەگەر مێردی هەبوو، واجبە مەنعی مێردەکەی بکرێ لەوە کە بچێتە لای، نەوەك ژنەکەی دوو گیان بێ‌و قیساسەکە دوابکەوێ.

بێدار بن! هەرکەسێ بە هەرجۆرێ کەسێکی کوشت، بەوجۆرە قیساسی لێ وەرئەگیرێ، مادام ئەوجۆرە ڕەوابێ لە شەرعدا؛ کەواتە، ئەگەر بە شیر یا بە تیر یا بە خەنجەر یا خنکاندن یا هەڵدێراندن یا بە سەر پانکردنەوە کوشتی، هەر بەوجۆرە ئەکوژرێتەوە لەگەڵ تەماشای چۆنیەتی‌و چەندییەتی‌دا وە ئەگەر بە مەنعی نان‌و ئاو لەیەکێ بوو لە ماوەی سێ ڕۆژدا ـ مەسەلا ـ ئەوە کابرای بکوژ مەنعی نان‌و ئاوی لێ ئەکرێ لەو چەند ڕۆژەدا، جا ئەگەر بەوماوەیە نەمرد، ئەبێ ماوەی مەنعەکەی زیاد بکرێ تا ئەمرێ وە ئەگەر کەسێك شەرابی کرد بە قوڕگی کەسێکا تا مرد، یا زینای لەگەڵ کردو بەو کردەوەیە کوشتی، ئەوە ئەم کەسە بە شمشێر ئەدرێ لە ملی.

ئەگەر کەسێك دەستی کەسێکی بڕی‌و برینەکە تەشەنەی کردو مراندی، ئەوە خاوەن‌حەق ئەتوانێ بە شیر بدا لە ملی‌و ئەیشتوانێ دەستی ببڕێ، جا ئەگەر برینەکەی ئەم تەشەنەی نەکردو نەمرد، بدا لە ملی بیکوژێ و ئەیشتوانێ دەستی ببڕێ‌و گورج بیکوژێ.

ئەگەر کەسێك قۆڵی شەخسێکی شکاند، یاخود سکی دڕی‌و کابرا بەوە مرد، ئەوە خاوەن حەق ئەتوانێ بە شمشێر بدا لە ملی ئەو کەسەو بیکوژێ، چونکە شکاندنی قۆڵ یا دڕینی سکی کابرامان بۆ زەبت ناکری وە ئەگەر دەست بڕاوێ قیساسی خۆی وەرگرت‌و لەپاشا مرد، ئەوە میراتگرەکەی ئەتوانێ کابرای جینایەتکەر بکوژێ وە ئەگەر لێی خۆش بوو، حەقی نییە ماڵی لێ وەربگرێ.

ئەگەر جینایەتکەر بەهۆی تەشەنەکردنی برینی قیساسەوە گیانی دەرچوو، ئەوە خوێنەکەی بە هەدەر ئەڕوا وە ئەگەر جینایەتکەرو جینایەت لێ‌کراویش بەهۆی

تەشەنەکردنی برینەکەیانەوە مردن، ئەوە ئەگەر بەیەکەوە گیانیان دەرچوو، یاخود جینایەتکەر لەپاشانا مرد، ئەوە باشە وە ئەگەر جینایەت لێ کراوەکە کەوتە دواوە، ئەوە میراتگرەکەی ئەتوانێ نیوەی دییە لە ماڵی جینایەتکەرەکە وەربگرێ.

ئەگەر کەسێك دەستی راستی کەسێکی بڕیبوو و لەکاتی قیساسدا دەستی چەپی دەرکردبۆ کابرای جینایەتلێ‌کراو تا لە تۆڵەدا بیبڕێتەوە، ئەویش بڕی، ئەمە ئەگەر جینایەتکەرەکە بە نیازی حەڵاڵ‌کردن دەستی چەپی بۆ دەرکرد، ئەوە بە هەدەر رۆیشتووە وە ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەکەوێتە بەر تۆڵەی دەستی راستیو خاوەن‌حەقیش باوەڕی بەوە نەبوو، یا ئەویش باوەڕی بەوە هەبوو، ئەوە راستتر ئەوەیە ئەو دەستی چەپی کابرایە قیساسی نییە، چونکە خاوەنەکەی بە بێ‌سوود فەوتاندوویەتی و قیساسی دەستە راستەکەشی لەسەر ئەمێنێ، هەروەها ئەگەر جینایەتکەرەکە وتی: سەرم لێ‌شێواو بە دەستی راستم زانی و کابرای خاوەن حەقیش وتی: منیش بە دەستی راستم زانیوەو بەو باوەڕە بڕیومە.

بەڵێ، ئەگەر کابرای خاوەن‌حەق ئەیزانی کە دەستی چەپە، بەڵام بۆیە بڕی وایئەزانی ئەکەوێتە برێتی دەستە راستەکە، یاخود ئەیزانی کە بە شەرع ناکەوێتە برێتی دەستە راستەکەو تەنها بە بیرو بڕیاری خۆی کردی بە قیساسی دەستە راستەکەی، ئەوە قیساسی دەستە راستەکەی نامێنێ، بەڵام دییەی دەستی راستی ئەکەوێو ئەتوانێ لەکابرای جینایەتکەری وەربگرێ و لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، تەنها سوورەتی یەکەم نەبێ، دییەی دەستە چەپەکەی ئەکەوێتە سەر ئەم کابراکە بڕیویەتی.

ئەگەر لەو سوورەتەداکە کابرای جینایەتکەر وتی: سەرم لێ‌شێوا، ئەم خاوەن‌حەقە وتی: بۆیە دەستەکەم بڕی وامئەزانی حەڵاڵی کردووە بۆم، ئەوە قیساسی ئەو دەستە چەپەی ئەکەوێتەسەر؛ هەروەها، ئەگەر وتی: ئەمزانی ناکەوێتە بەردەستی راستو هەر بە دەسەنقەست بڕیومە، یاخود بڵێت: سەرم لێ‌شێوا بۆیە بڕیم، هەر قیساسی ئەکەوێتە سەر بۆ ئەو دەستە چەپە.

## چی لە جینایەتی عەمدەوە پەیدا ئەبێ؟

ئەوەی کە لە جینایەتی عەمدەوە پەیدا ئەبێ، هەر قیساسە، بەو شەرتە پێویستی پەیدا ببێ و مانیعی نەبێ؛ جا ئەگەر قیساس کەوت، ئەوکاتە دییە جێگەی ئەگرێتەوە. ئەگەر خاوەن حەق جینایەتکەرەکەی عەفوکرد لە قیساس بەخۆڕایی، ئەوە بەخۆڕایی عەفو ئەبێ. وە ئەگەر لەسەر دییە عەفوی کرد، دییەکەی ئەکەوێتەسەر، هەروەها ئەگەر لەسەر زیاتر لە دییە عەفوی بکا بەو شەرتە ئەو ماڵە لە جینسی دییەکە بێ، وەکوو دووسەد حوشتر ـ لەسەر فەرموودەی بەهێز کە ئەوەتە: پاداشی کوشتنی عەمد قیساسە ـ ئەوە ئەو زیادەیشە واجب ئەبێ، بەو شەرتە کابرای جینایەتکەر قەبووڵی بکا وە ئەگەر لەسەر غەیری جینسی دییە عەفوی بکا، ئەوە پێویستە بە قەبووڵی جینایەتکەرەکە، خواهـ ئەو ماڵە کەمتر بێ لە ئەندازەی دییە یا ئەوەندەی ئەو بێ یا زیاتر بێ وە ئەگەر قەبووڵی نە کرد، ئەوە ماڵەکە ناکەوێتە سەری، بەڵام قیساسەکە لە شوێنی خۆیا ئەمێنێتەوە وە ئەگەر هەر لە سەرەتاوە جینایەتکەرەکەی عەفوکرد لە دییە ئەوە بەتاڵە، چونکە هێشتا دییە واجب نەبووە تا عەفوی بکا؛ بەڵی، ئەگەر لە پێشا عەفوی کرد لە قیساس بەرابەر دییە و لەپاشا، لە دییەکەیش عەفوی کرد، ئەوە دروستە وە ئەگەر هەردوولا سوڵحیان کرد لەجیاتی قیساس لەسەر ئەندازەیەك ماڵ و خاوەن حەق کابرای جینایەتکەریشی عەفوکرد لەو ماڵە، ئەمەیش هەر دروستە.

ئەگەر خاوەنحەق حیجری لەسەر بوو بە هۆی لاتکەوتنەوەو کابرای جینایەتکەری عەفوکرد لە قیساس و ناوی ماڵی نەبرد، ئەوە دروستەو هیچ ناکەوێتەسەر جینایەتکەرەکە، هەروەها ئەگەر عەفوی کرد لەسەر بڕیاری ئەوە کەماڵ نەکەوێتەسەری وە ئەگەر عەفوی کرد لە قیساس لەسەر ئیعتیباری دییە، ئەوە دییەکە واجب ئەبێ لەسەر جینایەتکەرەکە و لەم کاتەدا، ناتوانێ لەو دییەیە عەفوی بکا، لەبەر ئەوە کە حیجرلەسەرنراوی لات کەوتوو حەقی بەخشینی ماڵی نییە؛ هەروەها، لەسەر ئەو فەرموودەیە کە پاداشی عەمد یەکێکە لە قیساس و لە ماڵ، هەر حەقی نییە کابرا لە

دییەکە عەفو بکا؛ هەر خاوەن حەقێکیش حیجری لەسەر بێ بەهۆی ئیسراف‌و تەبزیرەوە، ئەویش حوکمی حیجرلەسەرنراوی لات کەوتووی هەیە لە حوکمی عەفوی جینایەتکەرەکەدا.

ئەگەر خاوەن روشدێك وتی بە یەکێ: دەستم ببڕە، ئەویش بڕی، ئەوە بەخۆڕایی لەکیسی چووەو حەقی هیچی نییە، هەرچەندیش برینەکەی تەشەنە بکاو بمرێ؛ بەڵێ، لەم سوورەتەدا، لە فەرموودەیەکدا دییە ئەکەوێتە سەر دەس‌بڕەکە، وەکوو ئەوەکە بڵێت: بمکوژەو ئەویش بیکوژێ، ئەوە لەم سوورەتەیشدا فەرموودەی هەڵاوێردراو، ئەوەیە دییەی ناکەوێ، بەڵام لە فەرموودەیەکدا دییە ئەکەوێتە سەر بکوژەکە.

ئەگەر کەسێك دەستێکی کەسێکی بڕی‌و بریندارەکە کابرای عەفو کرد لە قیساسی دەستەکەی‌و لە بژاردنەوەکەشی، یەعنی لە نیوە خوێنەکەی، خواهلێ‌خۆش بوونەکە بە لەفزی وەسیەت بێ یا بەگەردن ئازادکردن (إبْراء)بێ یا بە «إسْقاط» (خستنی)بێ یا بە هەر جۆرێکی تر، ئەوە لەم سوورەتانەدا ئەگەر ئەو برینە خۆش بووەوەو تەشەنەی نەکرد، ئەوە باشە وە ئەگەر تەشەنەی کرد بۆ گیانی کابراو کوشتی، یا بۆ ئەندامێکی تری، ئەوە کابرای جینایەتکەر عەفو ئەبێ لە قیساسی دەستەکەی‌و لە بژاردنەوەکەشی، بەڵام عەفو نابێ لە حەقی تەشەنەکردن بۆ گیانی کابرا، یا بۆ ئەندامێکی تری، هەرچەند لە لەفزی عەفوەکەدا پێی‌وتبێ: عەفوم کردی لە حەقی جینایەت لەم دەستەمدا و لە هەر شتێکیش لەمەوە پەیدا ببێ؛ کەواتە، ئەگەر برینەکە تەشەنەی کرد بۆ ئەندامێکی تری، دییەی ئەو ئەندامەی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر تەشەنەی کرد بۆ گیانی کابرا، ئەوە ئەندازەیەکی‌واکە دییەی نەفسی پێ تەواو ببێ لەگەڵ بژاردنی دەستەکەیدا، واجب ئەبێ لەسەر تاوانبارەکە، یەعنی ئەگەر جینایەتکەرەکە دەستێکی بڕیبێ‌و کابرا مردبێ، نیوە دییەی دەستەکەی لائەچێ‌و نیوەی دییەی گیانی لەسەر تاوانبارەکە ئەمێنێ ئەبێ بیداتێ؛ بەڵێ، ئەگەر وەختی خۆی کابرای جینایەتکەر هەردوو دەستی کابرای بڕیبێ‌و کابرایش لە قیساس‌و لە بژرادنی ئەو دوو دەستەی، عەفوی بکاو پاشان بە تەشەنەکردنی برینەکە بمرێ، ئەوە ئیتر هیچی ناکەوێتەسەر جینایەتکەرەکە، چونکە دییەی ئەو دوو دەستە، دییەی گیانەو کابرایش لەو ئەندازەیە عەفوی کردووە.

بەڵام ئەگەر عەفوکردنەکە بە لەفزی وەسیەت بێ، وەکوو ئەوەکە بڵێت: وەسیەت بێ بۆ ئەو کەسەی کە جینایەتی لێ کردووم بە پارەی بژاردنی جینایەتەکەی‌و بە هەرچی لەو جینایەتەوە پەیدا ببێ، ئەوە کابرای جینایەتکەر لە دییەی تەشەنەکردنی برین بۆ نەفس‌و لە دییەی ئەندامی تریش هەر ئازاد ئەبێ، بەو شەرتە کە لەسێیەکی ماڵی دەربچێ، یاخود میراتبەرەکانی ئیزنی زیاد لە سێیەکیش بدەن، ئەگینا هەر لە ئەندازەی سێیەکی ماڵی برینداره مردووەکەدا وەسیەتەکە جێبەجێ ئەکرێ.

**بزانن!** لەو سوورەتانەدا کە عەفوەکە بە لەفزی وەسیەت نەبێ، ئەوە کابرای جینایەتکەر لە هەرچی ئازادببێ پێویستە لە سێیەکی ماڵی زیاتر نەبێ، یا میراتبەرەکان رازی بن، وەکوو ئەوەکە عەفوەکەی بە لەفزی وەسیەت بێ.

ئەگەر کابرای دەستبڕاو وتی بە جینایەتکەرەکە: وا عەفوم کردی لەم جینایەتەو لەوە زیاتر درێژەی پێنەداو باسی هیچی نەکرد، ئەوە کابرای جینایەتکەر هەر لە قیساسی دەستەکەی رزگار ئەبێ نەك لە دییەکەیشی، چونکە ئەو لەفزە هەر بۆ قیساسی دەستەکە ئەڕواتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر زۆری پێنەچوو لە پاش ئەوە وتی: «وە لە بژاردنی دەستەکەیش»، ئەوە لە بژاردنی دەستەکەیش رزگاری ئەبێ.

ئەگەر کەسێك چەقۆیەکی کرد بە سکی کەسێکاو بریندارەکە کابرای جینایەتکەری عەفو کرد لە قیساس و لەپاشا مرد، ئەوە خاوەن حەق ئەتوانێ قیساسی ئەو کەسە لە جینایەتکەرەکە بسێنێ و عەفوی بریندارەکە بێسوودە، چونکە کابرای جینایەتکەری لە قیساسی برینی «جائِفە»کەی عەفو کردووەو برینی وا قیساسی نییە، چونکە زەبت ناکرێ وەکوو لەپێشەوە بەیانمان کرد[1].

ئەگەر کەسێك بەهۆی تەشەنەکردنی برینی لایەکەوە، حەقی قیساسی نەفسی دەسکەوت و ئەم کەسە کابرای جینایەتکەری عەفو کرد لە قیساسی نەفس، ئیتر حەقی قیساسی تەرەفەکەی نامێنێ، بەڵام ئەگەر لە حەقی قیساسی تەرەفەکە عەفوی کرد، ئەوە حەقی قیساسی نەفسی ئەمێنێ.

---

١. ئەم حوکمی عەفومانە لەبەر رووناکی عیبارەتی «تُحفە»و «شیروانی»و «شرح مَنْهج»و حاشیەی «جمل»دا نووسیوە؛ تکام وایە ئەو کەسانەی تەماشای ئەم شوێنە ئەکەن، بە وردی تەماشای ئەو کتێبانە بکەن.

ئەگەر کەسێك دەستی کەسێکی بڕی و کابرا بە تەشەنەکردنی برینەکەی مرد و خاوەن حەق دەستی کابرای بڕییەوەو لە قیساسی نەفس عەفوی کرد، ئەوە ئەگەر ئەم جینایەتکەرە نەمرد ئەوە عەفوەو رزگارە وە ئەگەر ئەمیش بە تەشەنەکردن مرد، ئەوە دەرئەکەوێ ئەو عەفوە بێسوود بووە، ئیتر ماڵی ناکەوێتە سەر ئەم کەسە کە عەفوی کردووە.

ئەگەر کەسێك کەسێکی کرد بە وەکیل لە وەرگرتنی قیساسدا و لەپاشانا وەکیلەکەی عەزل کرد و وەکیلەکەیش کابرای جینایەتکەری لە قیساسدا کوشت، ئەوە ئەگەر ئەیزانی بەوە کە عەزلکراوە، قیساسی کابرا ئەکەوێتە سەری وە ئەگەر نەیئەزانی بە عەزەلەکە، ئەوە قیساسی لەسەر نییە، بەڵام دییەی کابرای ئەکەوێتەسەر و پێویستە لە ماڵی خۆی ئەو دییەیە بدا و حەقی ئەوەیشی نییە بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو کەسە کە کردوویەتی بە وەکیل، مادام ئەو کەسە عوزری هەبێ لە تەفرەدانی خەبەر پێدانی وەکیلەکەی دا، بەڵام ئەگەر بە بێعوزر تەفرەی خەبەر پێدانی کابرای وەکیلی دا، ئەوە واجبە ئەو دییەیە کە وەکیلەکە ئەیدا بە میراتبەری کوژراوەکە، ئەمیش بیداتەوە بە وەکیلەکە.

ئەگەر کەسێك قیساسی کەوتە سەر ژنێك و ژنەکەی مارە کرد بۆ خۆی لە حەقی قیساسەکەدا، ئەوە باشەو قیساسەکە لەسەر ژنەکە نامێنێ؛ جا ئەگەر لەپاش چوونە لای ژنەکە لێی جیا بووەوە، ئەوە هیچ وە ئەگەر لەپێش چوونەلایدا لێی جیا بووەوە، نیوەی بژاردنی جینایەتەکە لە ژنەکە ئەسێنێتەوە و بە فەرموودەیەك، نیوەی «مَـهْرُ المـثل»ی لێوەرئەگرێت.

## باسی «دِیە»

«دِیە» لە شەرعدا، بریتییە لە ماڵێ کە واجب ئەبێ لەسەر ئینسانێکی تەکلیف لێکراو بەهۆی جینایەتەوە لەسەر نەفسی کەسێك، یا لەسەر ئەندامێکی لەشی.

دییە، قورس ئەبێ بەهۆی چەند شتەوە؛ وەکوو ئەوە جینایەتەکە عەمدی و بە دەسەنقەست بێ؛ یاخود «شِبە عَمد»بێ؛ یا خود بە هەڵە بێ، بەڵام لە "حەرەمی شاری

مەککەدا" رووبدا؛ یا خود لە یەکێك لە "چوار مانگە حەرامەکە"دا بکرێ ـکە بریتین لە «ذِي القَعده»و «ذِي الحجّة»و «محرّم»و «رَجب» ـ، یاخود لەسەر خزمێکی‌وا بێ کـە مەحرەم بێ، وەکوو ئەوە کابرا برای خۆی یا خوشکی یا پووری بکوژێ.

سووکیش ئەبێ بەهۆی چەند شتەوە؛ وەکوو ئەوە کوژراوەکە مێیینە بێ؛ یا بەچکە بێ لە سکی دایکیا، یا کافر بێ.

دییەی موسوڵمانی ئازادی نێرینە، غەیری منالێ کە لەسکی دایکیا بێ، سەد وشترە، بەڵام ئەم وشترانە لە جینایەتی «عَمد»و «شِبه عَمد»دا ئەکەین بە سـێ بـەشەوە، بـەم جۆرە: سی وشتری مێچکەی سێ ساڵانە، سی وشتری مێچکەی چوار ساڵانە، چل وشتری ئاوس، هەرچەند لە تەمەنی پێنج ساڵان کەمتردا ئاوس بووبن. وە لە جینایەتی بە هەڵەدا، ئەکرێن بە پێنج بەشەوە: بیست وشتری مێچکەی یەك ساڵانە، بیست وشتری مێچکەی دوو ساڵانە، بیست وشتری نێری دوو ساڵانە، بیست وشتری مێچکەی سێ ساڵانە، بیست وشتری مێچکەی چوار ساڵانە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم جینایەتی بەهەڵەیـە لەسەر خزمێکی مەحرەم بوو، یاخود لە حەرەمی شاری مەککەدا بوو، یا لە یەکێك لە چوار مانگە حەرامەکەدا بوو، ئەوە ئەو دییەیە ئەکری بەسێ بەشەوە، وەکوو لە دییەی کوشتنی «عەمد»و «شیبهە عەمد»دا.

دییەی جینایەتی عەمد، دەس‌بەجێ ئەدرێ لە ماڵی کابرای جینایەتکەر و دییەی شیبهە عەمد لە ماوەی سێ ساڵدا ئـەدرێ لە مـاڵی خـزم‌و خـوێش‌و کـەس‌و کـاری جینایەتکەرەکە و دییەی جینایەتی بەهەڵە، خواه پێنج بەش بێ یا سێ بـەش بـێ، ئەویش بە سێ ساڵ وە لە ماڵی خزم‌و خوێش‌و کەس‌و کاری جینایەتکەرەکە ئەدرێ. ئەم وشترانە، ئەبێ ساغ‌و بێ‌عەیب بن و وشتری نەخۆش‌و عـەیبدار دروست نـییە، مەگەر خاوەن‌حەقەکە رازی بێ؛ ئاوس بوونی وشتریش بە قسەی دووکەس ئیسپات ئەکرێ لەوانە کە ئاگادارن لە وەزعی وشتر.

هەرکەس دییەی لەسەر بێ، مادام خۆی وشتری هەبێ، لە ماڵی خۆی دییەکە ئەدا، ئەگینا لە زۆربەی وشتری ئەو شارە یا ئەو دەشتە کە ئەکەوێتە نزیکی ئەو شوێنەوە کە

تاوانەکەی تیاکراوە وە دروست نییە لابدرێ لەو جۆرە وشترەکە شەرع دیاریی کردووە بۆ جۆرێکی تر یا بۆ قیمەتەکەی، مەگەر بە رەزامەندیی خاوەن حەقەکەو رەزامەندیی جنایت کەرەکەیش.

ئەگەر حوشتر دەس نەکەوت لەو وڵاتەو لە نزیکی ئەو وڵاتەدا، یاخود بە قیمەتێکی زۆرتر لە قیمەتی عادەتی ئەیانفرۆشت، ئەوە لەو کاتەدا قیمەتی سەد وشترەکە ئەدرێ بە قیمەتی عادەتیو بە پارەی نەختی ئەو شوێنە کە واجبە وشترەکەی تیا بدرێت وە ئەگەر هەندێ وشتر هەبوو کە بەشی تەواوی دییەکەی نەئەکرد، ئەوە ئەو ئەندازەیە کە هەیە لەگەڵ قیمەتی باقییەکەیدا ئەدرێت.

دییەی ئافرەتو خونسا (نێرومێ)، نیوەی دییەی پیاوە لە نەفسو لە ئەندامدا و هەر کافرێ کە بانگی ئایینی ئیسلامی پێ گەیشتبێ، ئەگەر «کِتابی»بێ، یەعنی لە شوێن کەوتوانی «تَوراة» یا «انجیل»بێ، دییەی نەفسی یا ئەندامی، سێ یەکی دییەی موسوڵمانە، بەو شەرتە لەو تاقمە بێ کە دروست بێ موسوڵمان ژنیان لێ مارە بکا. وە دییەی ژنو خونسایان، نیوەی دییەی پیاوەکەیانە وە ئەگەر ئاگرپەرست (مَجُوسی) یا خود بتپەرست یا رۆژپەرست یا گاپەرست یا زەندیقو بێئایین بێ، ئەوە دییەکەی سێ یەکی پێنج یەکی دییەی موسوڵمانە؛ کەواتە، دییەی ئاگرپەرستو ئەوانەی لەگەڵیا باسکران، شەش وشترو دوو سێ یەکی وشترێکە و دییەی ژنو خونسایان، نیوەی دییەی پیاوە.

وە ئەوە «سامِری»یانەی کە جوولەکە بە کافریان نەزانن، یەعنی لە ئوسووڵی بناغەی ئاییندا لەوان جیا نەبن و ئەو «صُبّی»یانەی کە گاورەکان بە کافریان نەزانن، یەعنی لە ئوسووڵی بناغەی ئایینا لەوان جیا نەبن، ئەوانەیش لە دییەدا وەکوو «کِتابی»ی جوولەکەو گاور وان وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوان بن، ئەوە دییەیان وەکوو دییەی ئاگرپەرست وایە، هەروەها ئەو کافرانە کە بانگەوازی ئیسلامەتییان پێ گەیشتووەو موسوڵمان نەبوونو خۆیان بە شوێنکەوتووی ئایینی "حەزرەتی ئیبراهیم" ـ علیه السّلام ـ یا "حەزرەتی داوود" ـ علیه السّلام ـ ئەزانن وە هەرکەسێ بانگەوازی ئایینی

**ئیسلامی پێ نەگەیشتبێ، ئەوە ئەگەر شوێنی ئەو بەشەی ئایینەکەی خۆی کەوتبێ کە نەگۆڕراوە[١]، ئەوە حوکمی لە دییەدا وەکوو حوکمی ئەهلی ئەو ئایینەیە؛ کەواتە، ئەگەر لە جوولەکە بێ، وەکوو جوو وە ئەگەر لە گاور بێ، وەکوو گاور وە ئەگەر لە ئاگرپەرست بێ، دییەی ئاگر پەرستی هەیە.**

**وە ئەگەر وانەبوو، بەم جۆرە گومان هەبوو لەوەدا کە بانگەوازی ئیسلامی پێ گەیشتووە، یانە، یاخود کەوتبووە شوێنی ئەوەی کە گۆڕراوە لە ئایینەکەیدا، یاخود نەکەوتبووە شوێنی ئوسووڵی ئایینەکەی خۆی، یاخود وەختی خۆی ئایینێکی حەقی بووبوو، بەڵام ئێمە نەمانزانی چ ئایینێکە، بەوڕەنگە کە کابرای کوژراو ڕێی تێ ئەچوو لە جوولەکە یا گاور یا لە کۆمەڵی ئایینی "حەزرەتی ئیبراهیم"بێ وە بەڕاستی نەمانئەزانی لەکامیانە، یاخود ئەمانزانی ئایینەکەی چییە بەڵام نەمانئەزانی واجبی دییەی چەندێکە؛ مەسەلا، جوولەکەیەك کوژراو گورج لاشەکەی لە ناوبراو نەمانزانی پیاو بووە یا ژن، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، دییەی، ئەوەندەی دییەی پیاوی ئاگرپەرستە.**

**بزانن! لە بەیانی پێشووەوە دەرکەوت کە دییەی غەیری ئەو جوولەکەو گاورە کە لە نەتەوەی "حەزرەتی یەعقووب"بێ، وەکوو دییەی ئاگرپەرست وایە، چونکە بە شەرت گیراوە لە واجب بوونی سێ یەکی دییەی موسوڵماندا بۆ ئەوان، ئەوە کە دروست بێ ژنیان مارە بکرێ لە موسوڵمان وە ئەم شەرتەیش، لە غەیری ئەولادی حەزرەتی یەعقووبدا نادر و نایابە وە پارێزراوی بۆ کافری غەیری کیتابی لە وڵاتی ئێمەدا هەر بە ئەمانو سوڵحو ڕێکەوتنەو بە عەقدی جیزیە نابێ. بەڵام بۆ کافری کیتابی بە عەقدی جیزیەیش ئەبێ.**

## باسی «دییە»ی برین کردن لە روخسار

**دییەی برینێ کە ئێسك دەربخا لە روخساری ئینسانێکی موسوڵمانی ئازادی نێرینەدا، نیوەی دەیەکی دییەکەیەتی ـکە ئەکاتە پێنج وشترـ هەرچەند ئەو برینە**

---

١. ئەوەیش بزانین کە ئایینە پێشووەکان، هەموو دەستی گۆڕینیان تێ براوە.

ئێسقاندەرخەرە لەو ئێسقانەدا بێ کە لە پشتی گوێچکەوە بەرز بووەتەوە، یا لەژێر جەمسەری بەندی شەویلەدا بێ، یا لە پشتی سەرەوە بێ لەو شوێنەدا کە دائەپەڕێ بۆ مل.

جا ئەگەر برینەکە «عَمد» یا بە «شبه عَمد» بوو، ئەوە وشترەکان بە سێ بەش ئەدرێن؛ وشترو نیوێکی مێچکەی سێ ساڵەو وشترو نیوێکی مێچکەی چوار ساڵەو دوو وشتری ئاوس وە ئەگەر بە هەڵە کرابوو، بە پێنج بەش ئەدرێن؛ وشترێکی مێچکەی یەك ساڵەو مێچکەیەکی چوار ساڵە.

دیەی برینێ کە ئێسقانی روخساری ژنێکی موسوڵمانی ئازادی دەرخستبێ، چواریەکی دەیەکی دییەکەیەتی ـ کە بریتییە لە دوو وشترو نیو ـ و دییەی برینێ کە ئێسقانی روخساری ناموسوڵمانێکی دەرخستبێ، هەر بەم نیسبەتەیە، بەڵام لە دییەکەی خۆی؛ کەواتە، دییەی برینێ کە ئێسقانی روخساری نێرینەیەکی کیتابی دەرخستبێ، وشترێكو دووسێ یەکی وشترێکە وە دییەی برینێ کە ئێسقانی روخساری نێرینەیەکی ئاگرپەرست یا بتپەرستێکی دەرخستبێ، سێ یەکی وشترێکە وە دییەی برینێ کە ئێسقانی روخساری ژنێکی ئاگرپەرست یا بتپەرستی دەرخستبێ، شەش یەکی وشترێکە.

وە بۆ منداڵێ کە لە سکی دایکیا بێ، ئەگەر ئێسقانی روخساری دەرخراو پاشان بە مردوویی داکەوت بەڵام بە غەیری ئێسقانی روخسار دەرخستنەکەی مردبوو، ئەوە دییەکەی بریتییە لە بیست یەکی دییەی دایکی وە ئەگەر بە ئێسقان دەرخستنەکە مرد، ئەوە دییەکەی بریتییە لە دەیەکی دییەی دایکی و لەم کاتەدا، دییە بۆ برینە ئێسقاندەرخەرەکە دانانرێ، چونکە جینایەتەکە بووە بە جینایەت لەسەر نەفس.

دییەی برینێ کە ئێسك بشکێنێ بە تەنها، یا ئێسك بجووڵێنێ لە جێی خۆیەوە بۆ جێی تر ـ با نەیشی شکێنێ ـ نیوەی دەیەکی دییەی خاوەنەکەیەتی. دییەی برینێکیش کە ئێسك بشکێنێو بیگوێزێتەوە لەجێی خۆیەوە یا دەری بخا، یا خود پێویستی بکا کە ئێسکەکە دەربخرێ بۆ دەرهێنانی یا بۆ راستکردنەوەی، ئەوە دەیەکی دییەی خاوەنەکەیەتی، هەروەها حوکمی برینێ کە ئێسك لەجێی خۆی بگوێزێتەوە لەگەڵ

تێك شكاندنیا، یا لەگەڵ دەرخستنیا وە ئەگەر لەگەڵ هەردووكیانا بوو، ئەوە دییەكەی دەیەكو نیوەی دەیەكی دییەی خاوەنەكەیەتی.

دییەی برینێكیش كە بگا بە توورەكەی مێشكی كابرا یا توورەكەی مێشكی بدڕێ؛ ئەگەر كابرای بریندار ئازاد و نێرینە بوو، سێ یەكی دییەی كابرایە، هەروەها دییەی برینێ كە بگاتە ناوەوە، وەك سكو سینەو كەلەكەو ژێرگەردنو هەردوو تەنشتی ئادەمیزاد، یا برینێ كە لە وڵمەی رانی ئافرەتەوە بگاتە ناو عەورەتی یا لە وڵمەی رانی پیاوەوە بگاتە دوای، یا لە پشت ملیەوە بگاتە ناو قوڕقوڕاچكەی، یا لە پێستی پێشیەوە بگاتە میزەڵدانی؛ لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، سێ یەكی دییەی كابرا بریندارەكە واجب ئەبێ.

بەڵام لەم جۆرە دانانرێ ئەوە كە كەسێك روخساری كەسێك كون بكاتو كونەكە بگاتە ناودەمی، یا پێڵووی چاوی كون بكاتو بگاتە ناوچاوی، یا پێستی زەكەری كون بكاتو كونەكە بگاتە جێگای تێپەڕبوونی میزی، یا قوڵی كون بكاتو كونەكە بگاتە ناو مۆخی ئێسقانی، یا لووتی كون بكاو كونەكە بگاتە ناو لووتی.

ئەگەر كەسێ ئێسكی سەری كەسێكی دەرخستو كەسێكی تر شكاندیو كەسێكی تر جووڵاندی لە شوێنی خۆیو كەسێكی تر برینەكەی گەیاندە توورەكەی مێشكی كابرا، ئەوە هەركام لەمانە نیوەی دەیەكی دییەی كابرای ئەكەوێتە سەر، تەنها كابرای چوارەم نەبێ، ئەوە لەسەر حیسابی ئەو ماڵە كە پێشووەكان داویانە، پێویستە سێ یەكی دییەی كابرا تەواو بكا، یە عنی دەیەكو نیوەی دەیەكو سێ یەكی دەیەكی دییەی كابرا بدات.

**بزانن!** برینی ئێسقاندەرخەر، زۆر ئەبێ بە چەند شت؛ یەكەم: جیاوازی لە سوورەتدا، وەكوو ئەوە كە یەكێ لە دوو لاوە ئێسكی سەری یەكێ دەربخاو پێستو گۆشتی مابەینی ئەو دوو برینە بە حاڵی خۆی بمێنێتەوە؛ ئەگەر هیچیان نەمایەوە، یاخود هەر یەكێكیان مایەوە، ئەوە بە یەك برینی ئێسقاندەرخەر ئەناسرێ، هەروەها ئەگەر ناوبەینەكەیان بە تەشەنە كردنی ئەوان رزیو لەناوا نەما؛ بەڵێ، ئەگەر كەسێكی تر ناوبەینەكەیانی لابرد، ئەوە ئەو كەسە بژاردنی برینێكی ئێسقاندەرخەری ئەكەوێتە

سەر و بژاردنی دوو برینە ئێسقاندەرخەرە پێشووەکەیش لەسەر کابرای یەکەم ئەمێنێتەوە وە ئەگەر هەر کابرای یەکەم ئەو ناوبەینەی لابرد، ئەوە ئەو دوو برینە ئەبن بە یەك برین‌و کابرا بژاردنی یەك برینی ئێسقاندەرخەری ئەکەوێتە سەر، مادام پێش خۆش‌بوونەوەی دوو برینە ئێسقاندەرخەرەکان لەناوی بردبێ، بەڵام ئەگەر کابرای بریندار خۆی ناوبەینەکەیانی لابرد، ئەوە بژاردنی دوو برینە ئێسقاندەرخەرەکان لەسەر کابرای جینایەتکەر ئەمێنێتەوە.

دووەم: جیاوازیی شوێن؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك درێژەی دا بە دەرخستنی ئێسقانی سەری کەسێك تا گەیشت بە دەم‌و چاوی، ئەوە بە دوو برینی ئێسقاندەرخەر دائەنرێ، لەسەردا یەکێك‌و لە روخساردا یەکێك.

سێهەم: جیاوازیی جینایەتکەرەکە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك ئێسقانی سەری کەسێکی دەرخست‌و کەسێکی تر برینەکەی پان یا درێژ کرد، ئەوە ئەبێ بە دوو برینی ئێسقاندەرخەر، بۆ هەرکامیان، بژاردنێکی تایبەتی ئەکەوێتە سەر جینایەتکەرەکە؛ کەواتە، ئەگەر هەر کابرای یەکەم برینەکەی گەورە کرد، ئەوە هەر بە یەك برینی ئێسقاندەرخەر دائەنرێ، ئەگەر لەسەر دەرنەچێ بۆ روخسار، یا بە پێچەوانەوە.

چوارەم: جیاوازیی حوکمە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك برینێکی ئێسقاندەرخەری لەسەری کەسێکدا کرد، بەڵام نیوەی بە «عەمد»و نیوەی بە «شبه عمد» یا بە هەڵە بوو، ئەوەیش ئەبێ بە دوو برینی ئێسقاندەرخەر، بۆ هەرکام بژاردنێکی تایبەتی هەیە لەسەر ئیعتیباری «عەمد» یا «شیبهە عەمد» یا هەڵە؛ بەڵام ئەگەر یەکێ بە هەڵە ناوبەینی دوو برینی ئێسقاندەرخەری لابرد، ئەوە بە یەك برینی ئێسقاندەرخەر دائەنرێ، مادام برینە پێشووەکانیش بە دەستی ئەم کرابوون.

برینی گەیشتووە ناوەوەیش، زۆر ئەبێ بەو هۆیانەی کە برینی ئێسقاندەرخەریان پێ زۆر ئەبێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك رمێکی دوو شاخی کرد بە سکی کەسێکا، ئەوە دیەی دوو برینی بە ناوەوە گەیشتووی ئەکەوێتە سەر؛ هەروەها، ئەگەر تیرێکی کرد بە پشتیاو لە سکیەوە دەرچوو، یا گوللەیەکی دا لە سکی‌و لە پشتیەوە دەرچوو و کابرا نەمرد، ئەوە بژاردنی دوو برینی گەیشتووە ناوەوی ئەکەوێتەسەر.

هەرکام لەم برینانە کە بژاردنی دیاریان هەیە، بژاردنەکەیان نافەوتێ بە خۆش بوونەوەیان. فەرقی برینی گەورەو بچووك نییە لە بژاردندا، هەتاوەکوو ئەگەر کەسێك سووزنێك بکا بە سەری کەسێکداو بگا بە ئێسقانەکەی، ئەوە بژاردنی برینێکی ئێسقاندەرخەری ئەکەوێتە سەر.

ئەو برینانەی کە وان لەپێش برینی ئێسقاندەرخەرەوە، ئەگەر بەهۆی ئەندازەیەکەوە نیسبەتیان لە برینی ئێسقاندەرخەرەوە دەردەکەوت، ئەوە بەو نیسبەتە دەبژێررێن وە ئەگەر دەرنەدەکەوت، ئەوە ئەندازە ماڵێکی بۆ واجب ئەبێ کە حاکمی شەرع بە قەناعەتی خۆی لەسەر ڕێپیشاندانی شارەزایان بۆی دائەنێ.

## باسی ئەو ئەندامانە کە بژاردنی دیارییان هەیە

یەکەم لەو ئەندامانە: گوێیە، لە بڕینی گوێچکەیەکدا، نیوەی دییەی کابرا واجب ئەبێ و بە هەردووکیان، دییەی تەواو واجب ئەبێ وە ئەگەر هەندێکیان لێ بڕا، ئەوە لەسەر نیسبەتیان بۆ تەواوی گوێچکەکان دییەی بۆ دائەنرێ؛ هەڵکێشانی گوێچکەیش وەکوو بڕینی وایە، هەروەها ئەگەر بەهۆی دەرمانێکەوە گوێچکە وشك بکاتەوە وە ئەگەر ئەو گوێچکەیە کە بڕا کابرا دەنگی پێ نەئەبیست، ئەوە وەکوو نیوە دییە لە گوێچکەکەدا هەیە، لە لابردنی هێزی بیستنی گوێچکەکەشدا نیوە دییە هەیە. هەروەهایە حوکمی ئەو ئەندامانەی کە هێزەکەیان لە خۆیاندا نییە، وەکوو لووت، ئەویش دییەی خۆیو دییەی لابردنی هێزەکەی لە یەك جیا ئەکرێنەوە ـ وەکوو لەمەولا دەرئەکەوی ـ چونکە ئەم ئەندامانە خۆیان مایەی جوانین بۆ لەشی کابرا، هەرچەند بێهێزیش بن، لەبەرئەوە، فەرق نییە لەبەینی بڕینی گوێچکەی کەڕو گوێچکەی بیسندەدا لە واجب بوونی دییەداو ئەگەر کەسێك گوێچکەیەکی وشك بووەوەی بڕی، ئەوە نیوە دییەی لەسەر نییە، چونکە ئەو گوێچکەیە هیچ جوانییەکی پێوە نەبووە، بەڵکوو حاکمی شەرع خۆی شتێکی بۆ دائەنێ وە ئەگەر لەگەڵ بڕینی گوێچکەدا، ئێسقانەکەی بنیشی دەرکەوت، ئەوە ئەبێ بژاردنی بڕینی ئێسقاندەرخەریشی بۆ بدا.

**دووهەم:** چاوە؛ ئەگەر یەکێ تاقە چاوێکی کەسێکی هەڵکۆڵی، نیوەی دییەی ئەو کەسەی ئەکەوێتە سەر؛ ئەگەر هەردوو چاوی هەڵبکەنێ، تەواوی دییەی ئەکەوێتە سەر. وە لە واجب بوونی دییەدا، فەرق نییە لە بەینی چاوی ساغو بەهێزو چاوی نەرمو بێهێزدا یا چاوێ کە تکەتك بکا یا شەوکوێر بێ یا بچکۆلە یا خێل بێ، یا تانەی بەسەرەوە بێ بەڵام هێزی بینینی کەمی نەکردبێ وە ئەگەر بەهۆی ئەو تانەیەوە هێزی کەمی کردبێ، ئەوە ئەگەر نیسبەتی لەگەڵ چاوی خاوەن هێزدا دیار بێ، بەو نیسبەتە بژاردنەکەی ئەدرێ، ئەگینا هەر ئەوەندەی تیایەکە حوکمڕانی شەرع شتێك بڕیار ئەدا کە بیدرێتێ لەجیاتیدا. وە ئەگەر کەسێك چاوێکی کوێری هەڵکۆڵی، ئەوە حوکمڕانی شەرع، ئەندازە پارەیەکی ئەخاتە سەر کە بیدا بەکابرای چاو هەڵکۆڵراو و لە سوورەتی کوێر کردنی چاوی ساغدا، هەر یەك بژاردن واجب ئەبێ، چونکە هێزی بینین وا لەو شوێنەداو بە وێنەی گوێچکە نییە کە دییەی جێگەکەو دییەی هێزەکە لە یەك جیا بن.

**سێهەم:** پێڵووی چاوەکانە؛ لە بڕین یا وشك کردنی هەر پێڵوویەکدا چواریەکی دییەیەك هەیە و لە هەر چواریانا، دییەی کەسەکە بەتەواوی واجب ئەبێ، خواه ئەو پێڵوانە برژانگێکیان ببێ یا نە و پێڵووی چاوی، بینابن یا کوێر، چونکە پێڵوو خۆی مایەی جوانی ئادەمیزادە.

**چوارەم:** نەرمە لووتەکە بریتییە لە سێ پەردە وە لەبڕینی هەر یەکێکیانا، سێ یەکی دییە واجب ئەبێ و لە بڕینی دوانیانا، دوو سێ‌یەك و لە بڕینی هەرسێکیانا، تەواوی دییەی کەسەکە واجب ئەبێ؛ ئەگەر لەگەڵ بڕینی ئەم سێ پەردەیەدا هێزی بۆن کردنیشی لابرد، ئەوە دوو دییە ئەکەوێتە سەری وە ئەگەر ئێسقانی لووتی دەرخست، ئەوە بژاردنی ئێسقان دەرخستنی ئەکەوێتە سەر.

**پێنجەم:** لێوە؛ لە بڕینی هەر لێوێکدا، نیوە دییەیەك هەیە و لە بڕینی هەردوو لێودا، دییەی تەواو هەیە.

**شەشەم:** زوبانە؛ لە بڕینی تەواوی زوباندا، دییە واجب ئەبێ، هەرچەند پسك بێ یا حەرفێك بگۆڕێت بە حەرفێکی تر، یا هەندە حەرفێکی بۆ نەوترێ یا بە گران قسەی بۆ

بکرێ وە ئەگەر بەهۆی بڕینی زوبانەوە هێزی چەشتنی نەما، ئەوە دوو دییە ئەکەوێتە سەر زوبانبڕەکە وە ئەگەر کەسێك هەندێکی لە زوبانی کەسێك بڕی، بەشە دییەی ئەو ئەندازە بڕاوەی ئەکەوێتە سەر بە ئەندازەگرتنو نیسبەتدانی لە هەموو زوبانەکە وە ئەگەر ئەو زوبانە لاڵ بوو و هیچ قسەی پێ نەئەکرا، ئەوە لە بڕینیا هەر ئەو ئەندازە پارەیە هەیە کە حوکمڕانی شەرع دایئەنێ و لە زوبانی منداڵدا ئەگەر نەگەیشتبێ بە وادەی دەرکەوتنی قسە، یا گەیشتبێو «بابا» و «ماما» بڵێت، یا نیشانەی قسەکردنی لێدەرکەوێ بەهۆی گریانو مەمك مژینەوە، ئەوە بڕینی ئەو زوبانە ئەبێ بەهۆی واجببوونی دییە وە ئەگەر مناڵەکە گەورە بووبوو و نیشانەی قسەکردنی لێ پەیدا نەبووبوو، ئەوە بە لاڵ دائەنرێو تەنیا ئەندازە پارەیەکی تیا واجب ئەبێ کە حوکمڕانی شەرع دای بنێ.

**حەوتەم:** دانە؛ لە شکاندنی هەر دانێکی کەسێکی نێرینەی ئازادی موسوڵماندا، چ تەنیا ئەوەی وا بەدەرەوە بیشکێنێ، یاخود بە بێخەکەیەوە هەڵیبکەنێ، پێنج وشتر دییە واجب ئەبێ بە چەند شەرت؛

(یەکەم)، ئەوەیە دانەکە ئەسڵی بێ؛ کەواتە، ئەگەر دانەکە دانی لاپاڵ بوو، ئەوە حوکمڕانی شەرع شتێکی بۆ دائەنێ؛

(دووەم)، ئەوەیە تەواو بێ؛ کەواتە، ئەگەر دانەکە شکاو بێ یاخود هەڵوەریو بێ یا هەندێ لەو ئەندازەیەی کەوا بەدەرەوە قرتابێ، ئەوە بەشی خۆی لە دییە پێ ئەدرێ؛

(سێهەم)، ئەوەیە دانێکی رەسای بە سوود بێ؛ کەواتە، ئەگەر ئەوەندە بچووك بێ کە بۆ جوینو بڕینی خواردەمەنی عادەتی بە کار نەیەت، ئەوە حوکمڕانی شەرع خۆی شتێکی تیا دادەنێ؛

(چوارەم)، ئەوەیە لەپاش کەوتنی کاتی مناڵی روابێتەوە، ئەگینا ئەگەر دانی زەمانی شیر خواردن بێو یەکێك هەڵیکەندبێو لە وادەی خۆیدا دەرهاتبێتەوە، ئەوە دییەی نییەو تەنها حوکمڕانی شەرع خۆی ئەندازە پارەیەکی لەسەر دادەنێ، هەروەها ئەگەر دەرنەیەتەوەو دوو کەسی شارەزا بڵێن: جێگای دەرهاتنەوەکەی خراپ نەبووە، بەڵام

ئەگەر هاوڕیزەکانی دەرهاتنەوەو ئەو دەرنەهاتەوەو دووکەسی شارەزا وتیان: شوێنی دەرهاتنەوەی خراپ بووە، ئەوە دییەی ئەکەوێ؛

(پێنجەم)، ئەوەیە ئەوەندە شل و لەق نەبووبێ کە بۆ بڕین و جاوینی شتی خواردەمەنی نەشێ، ئەگینا هەر حوکمڕانی شەرع خۆی شتێکی لەسەر دائەنێ.

جا لەگەڵ بەجێهاتنی ئەم مەرجانە، ئەگەر کەسێك دانێکی یا چەند دانێکی کەسێکی شکاند یا هەر لە بنا هەڵی کەند، ئەوە لە هەر دانێکا پێنج وشتر دییەی ئەکەوێتەسەر وە ئەگەر هەموو دانەکانی هەڵکەند، دییەی هەموویان واجب ئەبێ، هەرچەند لە ئەندازەی دییەی نەفسیش زیادبێ.

هەشتەم: شەویلەیە؛ لە فڕێدانی هەر شەویلەیەکدا، نیوە دییەیەك هەیە و لە فڕێدانی هەردووکیانا، تەواوی دییە واجب ئەبێ و هەرچەند ددانیشیان لەسەر بێ، دییەی ئەوانیش واجب ئەبێ و ناکەوێتە بەر دییەی شەویلەکان.

نۆهەم: دەستە؛ لە بڕینی هەر دەستێکا، نیوە دییەیەك و لە بڕینی هەردووکیانا، تەواوی دییە واجب ئەبێ؛ جا ئەگەر لە جمگەی مووچدا بڕان، ئەوە باشە وە ئەگەر لە ژوورترەوە بڕان، حوکمڕانی شەرع ئەندازەیەکیش پارە بۆ ئەندازەی سەرووی ئەو جمگەیە دادەنێ، چونکە ناوی دەست لە شەرعدا، لە مووچ بەرەوژوور ناگرێتەوە وە لە هەر پەنجەیەکدا، دە وشتر واجب ئەبێ و لە هەر وردەڵەیەکدا لە پەنجەکان، سێ وشتر و سێ یەکە وشترێك هەیە، تەنها لە وردەڵەی پەنجەگەورەدا نەبێ، ئەوە پێنج وشتری پێ واجب ئەبێ، لەبەرئەوە کە هەر دوو وردەڵەی هەیە.

دەهەم: پێیە؛ لە هەر پێیەکدا لە قولاپەدا ببڕێت، نیوەی دییەی ئەو کەسە و لە هەردوو پێیدا تەواوی دییەی هەیە وە ئەگەر پێی لە ژوور قولاپەوە بڕرابوو، ئەوە بۆ لای ژووروری قولاپەکە حوکمڕانی شەرع خۆی شتێك دائەنێ و لە هەموو پەنجەیەکی پێدا، دە وشتر و لە هەر وردەڵەیەکدا، سێ یەکی ئەوە هەیە، مەگەر پەنجەگەورەکە، ئەوە لە هەر وردەڵەیێکیدا، پینج وشتر هەیە و لە واجب بوونی دییەدا، فەرق نییە لە بەینی پێی ساغ و شەل و دەستی ساغ و شەلدا و هەمان دییە بۆ ئەوانیش واجب ئەبێ؛ بەڵێ ئەگەر وشك بووبوون، ئەوە حوکمڕانی شەرع خۆی شتێکیان تیا بڕیار ئەدا.

**یازدەهەم:** دوو گۆی مەمکی ژنە؛ لە بڕینی گۆیەکی مەمکدا، نیوە دییە و لە بڕینی هەردووکیاندا دییەی تەواو واجبە وە ئەگەر بڕینی گۆی مەمکەکە بوو بەهۆی کونبوونەسینە، ئەوە بژاردنی ئەو کونەشی ئەکەوێتەسەر، بەڵام لە بڕینی گۆی مەمکی پیاودا، ئەوە حوکمڕانی شەرع خۆی شتێك بڕیار ئەدا، هەروەها لە بڕینی وڵمەگۆشتی ژێر گۆی مەمکیا.

**دوازدەهەم:** زەکەرە؛ لە بڕینی زەکەردا تەواوی دییە پێویست ئەبێ، خواه خاوەن زەکەرەکە پیر بێ یا جوان بێ، گەورە بێ یا منداڵ بێ، خەسێنراوبێ یا ساغ بێ؛ هەروەها، لە بڕینی سەری زەکەردا دییەی تەواو واجب ئەبێ و لە بڕینی هەندێ لە سەری زەکەردا، بژاردنی واجب ئەبێ بەپێی نیسبەتی بڕاوەکە بۆ هەمووی وە ئەگەر کەسێ دارێکیدا بە زەکەری کەسێكداو شەلی کرد، بەجۆرێ کە هێزی تیا نەما، ئەوە تەواوی دییەی کەسەکە ئەکەوێتە سەری؛ هەروەها، ئەگەر بەدرێژیدا لەتی بکاو لە ئیش بکەوێ، ئەوە تەواوی دییە واجب ئەبێ، بەڵام بۆ بڕینی هەندێ لە گۆشتی زەکەر لەم‌لاو لەولایەوە، ئەوە حوکمڕانی شەرع خۆی شتێك بڕیار ئەدا.

**سیازدەهەم:** هێلکەگونە؛ لە بڕینی هێلکەیەکیاندا، نیوە دییە، وە لە بڕینی هەردووکیاندا، تەواوی دییە هەیە، هەرچەند هێلکەگونی منداڵ یا پیاوی پیر یا ئینسانی زەکەر بڕاو یا شلەپەتکە بێ؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە پێویستە هێلکەکە دابکەوێ، ئەگینا بڕینی پێستەکەی نابێ بەهۆی دییە.

**چواردەهەم:** دوو لێوەی فەرجی ئافرەتە؛ لە بڕینی یەکێکیانا، نیوە دییە وە لە بڕینی هەردووکیانا، تەواوی دییە هەیە، خواه ئەو ژنە پیر بێ یا جوان، بێوەژن بێ یا کچ، خەتەنەکراو بێ یا نە و فەرجی عادەتی بێ یاخود بە پارچەگۆشت یا بە پارچە ئێسقان گیرابێ وە ئەگەر لەگەڵ بڕینی ئەو دوو لێوارەی فەرجیدا لە گۆشتی بەریشی بڕی، یاخود کچێتی لابرد، ئەوە واجبە بەرابە بەوەیش ئەندازەیەك پارە بدا کە حوکمڕانی شەرع دیاریی ئەکا وە ئەگەر بە چوونەلا یا بە ئالەتێك یەکاڵای کردووە، ئەوە دییەی تەواوی ئەکەوێتەسەر.

**یازدەهەم:** وڵمە گۆشتی ئەمبەرو ئەوبەری رانە، ئەو شوێنەکە ئینسان لەسەری دائەنیشێ؛ ئەوە لە برِینی وڵمەیەکیاندا، نیوەی دییە، وە لە برِینی هەردووکیاندا، دییەی تەواو واجب ئەبێ.

**شازدەهەم:** پێستی لەشە؛ ئەگەر کەسێك پێستی لەشی کەسێکی گرتەوە و لەوکاتەدا کە هێشتا ژیانێکی دامەزراوی تیا مابوو، کەسێکیتر هات کوشتی، ئەوە دییەی تەواو ئەکەوێتە سەر ئەوکەسەکە پێستەکەی گرتووەتەوە، وەکوو چۆن قیساسی ئەکەوێتە سەر ئەوکابراکە کوشتوویەتی، بەڵام ئەگەر هەر ئەوکەسەکە پێستەکەی گرتووەتەوە کوشتی، ئەوە هەر قیساس یا دییە ئەکەوێتە سەر ئەم کابرایە کە ئەم دوو ئیشەی کردووە.

## باسی لابردنی هێز لەگیانی ئادەمیزاددا وە هەندێ شتیتر

ئەو هێزانەی کە بژاردنی تأیبەتی هەیە بەرابەر بە نەهێشتنیان، چواردەن؛

**یەکەم:** عەقڵە؛ ئەگەر کەسێك بە دەرمان یا بە لێدان یا بە ئازارداناو ترساندن ـ مەسەلا ـ عەقڵی کەسێکی نەهێشت، ئەوە ئەبێ تەواوی دییەی ئەوکەسە بدا وە ئەگەر بەهۆی بریندار کردنی شوێنێکیەوە بوو، ئەوە ئەبێ بێجگە لە بژاردنی عەقڵەکەی، برینەکەشی بۆ ببژێرێ یا ئەو ئەندازە پارەیە بداکە حوکمرانی شەرع دایئەنێ لە بەرابەریا؛ جا ئەگەر وەلیئەمری منداڵ ئیددیعای فەوتانی عەقڵی منداڵەکەی خۆیکرد، ئەوە ئەگەر قسەوکردەوەی منداڵەکە لەکاتی تەنهاییو سەربەخۆییدا تێکچووبوو، ئەوە باوەرِی پێئەکرێ بە بێسوێند وە ئەگەر قسەوکردەوەی بەجێبوون، ئەوە باوەرِی پێ ناکرێت.

**دووەم:** هێزی بیستنە؛ ئەگەر کەسێك هێزی بیستنی گوێیەکی کەسێکی نەهێشت، ئەوە نیوەی دییە وەئەگەر هێزی هەردوو گوێی نەهێشت ئەوەتەواوی دییەی ئەو کەسەی ئەکەوێتەسەر. وە ئەگەر لەگەڵ لابردنی هێزی بیستنیا گوێچکەشی برِی، یا هەڵیکەند لە بن، یا وشکیکردەوە، ئەوە ئەبێ دییەی گوێچکەکەیش بدا، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای لاچوونی هێزی بیستنی خۆی کرد بەهۆی جینایەتی کەسێکەوە، ئەوە واجبە لێی‌ورد بینەوە، ئەگەر لەکاتی بێ‌ئاگاییدا لە دەنگی خەڵك رائەچڵەکا، ئەوە باوەڕی پێ‌ناکرێ، ئەگینا سوێند ئەدرێ‌و دییەی هێزی گوێچکەکەی وەرئەگرێ. ئەگەر کەسێك دای لە هەردوو گوێچکەی کەسێك‌و هێزی بیستنیان کەم‌بوو، ئەوە ئەگەر نیسبەتی هێزی ئێستەیان لە هێزی لەوەوپێشیان دەرئەکەوت بۆمان، ئەوە بەونیسبەتە دییەی ئەو هێزە فەوتاوەی لێ ئەسێنرێ، ئەگینا حوکمڕانی شەرع شتێکی ئەخاتە سەر کە بیدا بە کابرا لێدراوەکە.

وە ئەگەر هەرهێزی تاقە گوێچکەیەکی کز کرد، ئەوە گوێچکە کزەکەی بە لۆکە ئەگیرێ‌و هێزی ساغەکەیان بەراورد ئەکرێ، بۆ ئەوەی بزانین لەکوێیەوە دەنگ ئەبیسێ، پاش ئەوە ئەم گوێچکە ساغەی بە لۆکە ئەگیرێ‌و ناساغەکەی بەر ئەدرێ‌و ماوەی بیستنی ئەمیش دیاری ئەکرێ، جا بەنیسبەتی فەرقی ئەم دوو شێوەیە دییە بۆ ئەو گوێچکە هێز کزکراوە دائەنرێ.

**سێهەم:** هێزی چاوە؛ لە لابردنی هێزی یەك‌چاودا، نیو دییە پێویستە و لە لابردنی هێزی هەردووکیانا، دییەیەکی تەواو واجبە وە ئەگەر ئەم هێزە بەتەنها خۆی لابرێ‌و چاوەکان خۆیان هیچیان لێ‌نەیەت، یا خود لەگەڵ هەڵکەندنی چاوەکانا بێ، دییەکە زیاد ناکات‌و وەکوو گوێچکە نییە، چونکە هێزی چاو وا لە عەینی جێگەدا.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای لاچوونی هێزی چاوی کرد بەهۆی جینایەتی کەسێکەوە، ئەوە بەراورد ئەکرێ بەوەکە شتێکی وەك دەرزی یا سووزن لە چاوی نزیك بکرێتەوە، ئەگەر کابرا دانەچڵەکاو خۆی لانەدا، ئەوە باوەڕی پێ‌ئەکرێ، هەروەها لاچوونی چاوەکە سابت ئەبێ بە قسەی دووکەسی دادپەروەر لە دوکتۆرانی چاو.

**چوارەم:** لابردنی هێزی بۆن کردنە؛ لە لابردنی هێزی بۆن کردندا بەتەواوی، دییە سابت ئەبێ و لە لاوازکردنیا، ئەگەر نیسبەت مەعلووم بوو، بەشی خۆی لە دییە بۆ دائەنرێ، ئەگینا حوکمڕانی شەرع شتێکی بۆ دائەنێ و ئەگەر لەگەڵ لابردنی هێزەکەدا، نەرمەلووتی کەسەکەیشی بڕی، ئەوە دییەی ئەوەیشی ئەخرێتەسەر.

**پێنجەم: هێزی قسەکردنە؛** لە لابردنی هەمووی هێزی قسەکردندا، دییەی کەسێك بە تەواوی واجب ئەبێ و لەلابردنی هێزی وتنی هەندێ حەرفدا، بەشە دییەی بۆ دائەنرێ لەسەر نیسبەتی بەتێکڕای ئەو حەرفانە کە لە زوبانی ئەو کەسەدا بە عادەت بەکار ئەهێنرێن.

ئەگەر کابرا وەختی خۆی نەیئەتوانی هەندێ حەرف بەکاربهێنێ، خواە هەروەها لە دایك بووبوو یا پاشان بەهۆی دەردێکەوە وای لێ‌هاتبوو و کابرای جینایەت‌کەریش توانای بەکارهێنانی حەرفەکانی‌تری پێ لابرد، ئەوە تەواوی دییەی ئەدرێتێ وە ئەگەر ئەو هەندە حەرفەی کە زوو فەوتاوە، بەهۆی جینایەتی کەسیکەوە بووبێ، ئەوە لەسەر ژمارەی حەرفەکان دییەی ئەم جینایەتە دواییە دائەنرێ.

ئەگەر کەسێك هەندێکی لە زمانی کەسێك بڕی‌و هەموو توانای قسەی ئەو کەسە فەوتا، ئەوە تەواوی دییەی واجب ئەبێ وە ئەگەر هەندێکی لە زمانی بڕی‌و هەندێ لە توانای قسەکردنی ئەو کەسە ڕۆیشت، ئەوە دییەکەی لەسەر حیسابی زۆرەکەیانە؛ مەسەلا، چواریەکی زمانی ببڕێ‌و نیوەی توانای قسەکردنی بڕوا، یا نیوەی زمانی ببڕێ‌و چواریەکی توانای قسەکردنی بڕوا، لە هەردوو حاڵەتەکەدا، نیوەی دییەی لەسەر واجب ئەبێ.

**شەشەم: هێزی دەنگە؛** لە لابردنی هێزی دەنگی کەسێکدا، تەواوی دییە لەسەر جینایەت‌کەرەکە واجب ئەبێ وە ئەگەر لەگەڵ لابردنی هێزی دەنگیدا زمانیشی لە هاتوچۆ کەوت، ئەوە دوو دییە ئەکەوێتە سەر جینایەت‌کەرەکە.

**حەوتەم: هێزی چەشتنە؛** لە لابردنی تەواوی هێزی چەشتنی کەسێکدا، تەواوی دییەکە لەسەر کابرا واجب ئەبێ و لە بەر ئەوەکە بە هێزی چەشتن شیرینی‌و ترشی‌و تاڵی‌و سوێری‌و زوڵاڵی وەرئەگیرێ، ئەگەر کابرا هێزی وەرگرتنی هەندێ لەم تامانەی نەما، ئەوە بەنیسبەتی هێزە فەوتاوەکەوە بۆ ئەم پێنجە، دییەی بۆ دائەنرێ وە ئەگەر هەموو تامەکانی وەرئەگرت بەڵام بە ناتەواوی، ئەوە حوکمڕانی شەرع شتێکی بۆ دائەنێ.

**هەشتەم:** هێزی جاوینی خواردەمەنییە؛ ئەگەر کەسێك دای لە دەم‌و دانی کەسێك بەجۆرێکی‌وا کە هێزی جاوینی خواردەمەنی نەمێنێ، ئەوە واجبە تەواوی دییەی ئەو کەسە بدا.

**نۆهەم:** هێزی هەڵمەتی دەستە؛ بە لابردنی هێزی هەڵمەتی یەك‌دەست، نیوە دییە و بە لابردنی هێزی هەڵمەتی هەردوو دەست، دییەی تەواو واجب ئەبێ.

**دەهەم:** هێزی هەڵمەتی پێیە؛ بە لابردنی هێزی هەڵمەتی یەك پێ، نیوە دییە و بە لابردنی هێزی هەڵمەتی هەردوو پێ، دییەی تەواو واجب ئەبێ.

**یازدەهەم:** هێزی دەرپەڕاندنی ئاوی ئارەزووی ئینسانە؛ ئەگەر کەسێك دای لە پشتی کەسێك، یاخود ئازارێکی‌تری پێ‌گەیاند، بەجۆرێك کە هێزی دەرکردنی ئاوی پێ نەهێشت، ئەوە واجبە دییەی تەواوی بداتێ.

**دوازدەهەم:** هێزی لەزەت‌و خۆشی وەرگرتنە لە چوونەلای ژن.

**سیازدەهەم:** هێزی ئاوس‌کردنی ژنە؛ ئەگەر کەسێك بە ئازاردانی کەسێك وای لێ‌کرد کە خۆشی چوونەلای ژنی نەما، یاخود وا دای لە هێلکەگونەکانی کە هێزی ئاوس‌کردنی ژنی پێ‌نەهێشت، ئەوە واجبە دییەی ئەو کەسە بدا.

**چواردەهەم:** هێزی ئاوس‌بوونی ژنە؛ ئەگەر کەسێك بە دەرمان یا بە لێدان‌و ئازار پێ‌گەیاندن، وای کرد لە ئافرەتێك کە منداڵدانی لە کەڵکی ئەوە کەوت منداڵ هەڵپێچێ‌و ئاوس ببێ، ئەوە واجبە دییەی ئەو ژنە بدا.

وە ئەگەر کەسێك پشتی کەسێکی‌شکاند، یاخود بە دار لێی‌داو ئازارێکی‌وای پێ‌گەیاند کە هێزی چوونەلای ژنی نەما، یا هێزی چوونەلای ژن‌و ئاودەرپەڕاندنی نەما، ئەوە واجبە لەسەری دوو دییە بەو کەسە بدات.

## باسی لابردنی کچێتی

ئەم کچێتییە، ئەگەر مێردەکەی لای‌ببا، ئەوە حەقی خۆیەتی، خواە بە زەکەر یا بە پەنجەی خۆی یا بە شتێکی‌تر؛ «مَع العلم»، ئەگەر بە غەیری زەکەر لای‌بباو ئازار بە

کچەکە بگەیەنێ، ئەوە کردەوەیەکی حەرامی کردووە [و] لەسەری گوناهبار ئەبێ، بەڵکوو ئەگەر بڵی بە ژنێك کە بە پەنجە کچێتی ئەو کچەی بۆ لابباو ئەویش لایبیا، ئەوە بژاردنی ئەو کچێتییە ئەکەوێتە سەر ئەو ژنەو ئیزنی کابرا بێسوود ئەبی؛ ئەرشەکەشی بەم جۆرە ئەبێ ئەو ژنە فەرز بکرێ بە جارییە و تەماشا بکرێ ئەگەر ئەو جارییەیە کچ بێ، قیمەتی چەندە وە ئەگەر بێوەژن بێ، قیمەتی چەندە، ئەوە فەرقو جیاوازیی بەینی ئەم دوو حاڵە ئەبێ بە بژاردنی کچێتی ئەو کچەو وەرئەگیرێ لەو ژنەو ئەدرێ بە کچەکە.

وە ئەگەر کچێکتییەکەی لەلایەنی غەیری مێردی خۆیەوە لابرا، لەم سوورەتەدا ئەگەر بە غەیری زەکەر لایبرد، ئەوە هەر بژاردنی کچێتییەکە ئەکەوێتە سەر ئەو کەسەکە لایبردووە ـ وەکوو ئێستە بەیانمان کرد ـ وە ئەگەر بە زەکەر لایبردو بە ئیزنی کچەکە خوی بوو، ئەوە هەردووکیان حوکمی کەسێکی زینا کردوویان هەیە کە سەد دارە بۆ کچەکەو بۆ پیاوەکەیش، یا سەد دارە یا سەنگەسار کردنە، ئیتر ماڵی دنیا ناکەوێتە سەر کابرا.

وە ئەگەر بە زۆر رۆیشتبووە لای کچەکە، یا بە شوبهە نیکاحی دانەمەزراو، یاخود بە شوبهەی ژنی خۆی، ئەوە ئەبێ کچێتییەکەی بۆ ببژێرێ لەگەڵ ئەندازەی «مَهر المثل»ی ئەو کچەدا، بەڵام لەگەڵ فەرزکردنیا بە بێوەژن، چونکە مادام کچێتییەکەی بۆ بژارد، ئیتر مارەیی بێوەژن دائەنرێ بوێ وە ئەگەر کچێ بە پەنجە کچێتی کچێکی تری لابرد، ئەوە قیساسی هەیە، یەعنی ئەویش ئەتوانێ کچێتی ئەم لاببا. وە ئەگەر کەسێك بە زۆر یا بە شوبهە رۆیشتە لای بێوەژنێك، ئەوە «مَهر المثل»ی ژنەکەی ئەکەوێتە سەر و ئە لە سوورەتی زۆردا، حوکمی زینایش لەسەر کابرا جێبەجێ ئەکرێت.

ئەگەر کەسێك چووە لای ژنێك و یەکالای کردەوە، یەعنی بەینی پێش و پاشی لابرد، ئەوە دییەی ئەو ژنەی ئەکەوێتە سەر، خواە ئەم کابرایە مێردی ژنەکە بێ یا نە و بە ئالەتی چوونەلا یەکالای کردبێتەوە یا بە ئالەتێکی تر وە ئەگەر قابیل نەبوو مێردەکەی بچێتە لای بە بێ یەکالاکردنەوەی، ئەوە حەرامە بڕواتە لای وە ئەگەر ژنەکە بە هۆی ئەوە چوونە لایەوە مرد، قیساسی ئەکەوێتە سەر مێردەکەی.

**بێداربن!** ئەگەر کەسێك چەند ئەندامێك و چەند هێزێکی کەسێکی لابرد کە ببێ بە هۆی واجب بوونی چەند دییە لەسەری و ئەو کەسە بە سوێی ئەم زامانەوە مرد، ئەوە ئەگەر عەفویان کرد لە قیساس، تاقە یەك دییە واجب ئەبێ لەسەری، هەروەها ئەگەر کابرای جینایەتکەر پاش ئەو جینایەتانە و بەرلەوە کابرا خۆش ببێتەوە، بیکوژێ؛ بەڵێ، ئەگەر زامەکانێ بەدەسەنقەستوکوشتنەکە بە هەڵە بوو، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە هەر برینێ دییەی تایبەتی خۆی ئەکەوێو دییەی کوشتنەکەیش زیاد ئەکرێ لەسەریان؛ هەروەها، ئەگەر کەسێکی تر غەیری ئەو کەسەی لەپێشەوە ئەو جینایەتانەی کردووە، بیکوژێ، لەم سوورەتەیشدا دییە زۆر ئەبێ.

## باسی ئەوەی کە حوکمڕانی شەرع بڕیاری ئەدا بەرابەر بە هەندێ برین

هەر برینێ کە بژاردنی بۆ دیاری نەکرابێ، حوکمڕانی شەرع ئەندازەیەك پارە بڕیار ئەدا لە بەرابەریا؛ نیسبەتی ئەم ئەندازە پارەیە بۆلای دییەی کابرای برینداركراو، وەکوو نیسبەتی ئەو ئەندازەیە کە کەمی کردووە لە قیمەتی کابرای برینداركراو بەهۆی برینەکەوە، بۆ لای قیمەتەکەی بە ساغی، بە فەرزی ئەوە کە ئەو کەسە بەندە یا کەنیزەك بێ؛ مەسەلا، ئەو پیاوە کە پارچەیەك گۆشت لە رانی بڕاوە، فەرزی ئەکەین بە بەندەو ئەڵێین: قیمەتی بە ساغی دە دینارەو بەهۆی ئەو گۆشت لێبڕینەوە، بووە بە نۆ دینار؛ کەواتە، ئەو ئەندازە پارەیەی کە بۆی دائەنرێ بەرابەر بە بڕینی پارچەگۆشتەکەی رانی، دەیەکی قیمەتی عەبدەکەیە، واتە لێرەدا دەیەکی دییەی ئەو کەسەیە.

جا ئەگەر ئەو بڕینە لە ئەندامێکا بێ کە دییەی هەبێ، وەکوو دەستو پێ، ئەوە پێویستە نەگا بە ئەندازەی دییەی ئەو ئەندامە؛کەواتە، ئەبێ ئەندازە پارەی دیاریکراو بەرابەر بە برینی وردەڵەی پەنجە، کەمتر بێ لە دییەی ئەو وردەڵەیە و ئەندازە پارەی دیاریکراو بەرابەر بە برینی پەنجە، کەمتر بێ لە دییەی پەنجەکە وە ئەگەر دەستێکی بێ پەنجە لە مووچدا بڕرا، یا بەری دەست یا پشتەکەی بریندار کرا، ئەبێ ئەو ئەندازە پارەیە کە دیاری ئەکرێ لە بەرابەریا، کەمتر بێ لە دییەی پێنج پەنجەکە و ئەندازە

پارەیەك کە دیاری ئەکرێ بەرابەر بە بریندار کردنی سك، کەمتر بێ لە بژاردنی کونکردنی سك و ئەندازە پارەیەك کە دیاری ئەکرێ بەرابەر بە بریندار کردنی سەر، کەمتر بێ لە بژاردنی زامێکی سەر کە ئێسکەکەی دەرخستبێ وە ئەگەر برینەکە لە شوێنێکدا بێ کە دییەی نەبێ، وەکوو رانو باسك و قۆڵو شانو پشت، پێویستە نەگا بە ئەندازەی دییەی کەسەکە وە ئەگەر وا هەڵکەوت لەسەر ئەساسی ئەم لێکدانەوەیەی کە وتمان، ئەندازەی پارە دیاریکراوەکە گەیشتە ئەندازەی دییەی ئەندامەکە، یا دییەی نەفس، ئەوە ئەبێ قازی بە ئیجتیهادی خۆی شتێکی لێ کەم بکاتەوە.

**بێدار بن!** قیمەت دائەنرێ بۆ بریندارە کە لەپاش خۆشەوە بوونی برینەکەی؛ جا ئەگەر لەو کاتەدا ناتەواویی هەبوو، ئەوە باشە وە ئەگەر ناتەواویی پێوە نەبوو، ئیعتیباری نزیکترین کاتی عەیبدار بوونی ئەو کەسە ئەکرێ، و بە ئیعتیباری ئەوکاتە قیمەتی بۆ دائەنرێ و هەر برینێ کە بژاردنی دیاریکراوی هەبێ، وەکوو ئەو برینەی کە ئێسقانی سەری دەرخستبێ، هەر عەیبێ لە وردە برینەوە بەدەوریا پەیدا ببێ، تابیعی ئەوە لە بژاردندا و ئیتر ئەندازە پارەیەکی بۆ دانانرێ و هەر برینێ بژاردنی دیاریکراوی نەبێ، وەکوو خوێنلێهێنانی لەشی کەسێك، ئەوە هەر برینێ بەدەوریا پەیدا ببێ ئەندازە پارەیەکی بۆ دائەنرێ وەکوو برینە ئەسڵییەکە کە ئەم وا لە دەوروبەریا.

## باسی هەندێ لەو شتانەکە ئەبن بە هۆی واجب بوونی «دییە»

ئەگەر کەسێك قیڕاندی بەسەر منداڵێکی نەفامدا، یا بەسەر نەخۆشێکدا، یا بەسەر نوستوویەکدا، یاخود بە خەنجەرەوە هەڵمەتی بۆ بردن، ئەوانیش لەسەر قەراغی بانێ یا بیرێ یا چەمێکدا بوونو بەهۆی ئەمەوە راپەڕینو کەوتنەخوارەوەو مردن، ئەوە لەم سوورەتانەدا دییەیەکی قورس ئەکەوێتە سەرکەسو کاری ئەو کەسە؛ هەروەها، ئەگەر شێت بوون، یا کەڕ بوون، یا کوێر بوون، دییەی ئەو شتانە لەسەر ئەو کەسە پێویست ئەبێ، چونکە ئەم کردەوانە بە جینایەتی «شِبە عمد» دائەنرێن و لە فەرموودەیەکی ئیمامدا، ئەبن بەهۆی قیساس وە ئەگەر کابرا عەفو کرا، دییەیەکی قورس لەسەر خۆی واجب ئەبێ.

وە ئەگەر هەرای لە نەچیرێك ئەکرد، یا بە خەنجەر درندەیەکی ئەفڕاند وە ئەو جۆرە کەسانەی کە باسمان کردن لەویادا بوون و ترسانو مردن، یا لە قەراغی بیرەکەوە، یا لە قەراغی بانەکەوە کەوتنە خوارەوەو مردن، یا شێت بوون، یا کەڕ بوون، ئەوە دییەیەکی سووك ئەکەوێتە سەر کەس‌و کاری ئەو کەسە وە ئەگەر ئەمانە لە شـوێنـێکـی پـانو بێ‌ئەندێشەدا بوون، یاخود کابرا هەرای لە ئینسانێکی باڵغی خاوەن هۆش‌و فام کرد، کەچی وا ڕێکەوت لە قەراغ بانێکدا وەستابوو و راچڵەکاو کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە نابێ بە هۆی واجب بوونی دییە.

ئەگەر پیاوێکی زۆرداری‌واکە خەڵك لێی بترسن، ژنێکی بانگ کردو ژنەکە لەترسا بەری خست، یا بەزۆر دای بەسەر خانوویەکداو ژنێکی ئاوس لەویادا بەری خست، ئەوە ئەو زۆردارە ئەبێ بە زامنی بەچکەی ئەو ژنە، بە ئەندازەی دەیەکی دییەی دایکی ـ وەکوو لەمەولا باسی ئەکەین ـ و ئەو ماڵە ئەکەوێتە سـەر کـەس‌وکاری ئـەو کـابرا؛ هەروەها، ئەگەر ژنەکەیش مرد، ئەوە دییەی ئەکەوێتە سەر کەس‌و کاری زۆردارەکە.

هەروەها، ئەگەر کەسێك خۆی بباتە شێوەی درندەیەکەوەو ژنێکی دووگیان لەترسا بەر بخا، یا مناڵێکی نەفام بترسێ‌و بمرێ، ئەوە ئەو کابرایە ئەبێ بە زامنی بـەچکەی ژنەکەو مناڵەکە.

ئەگەر کەسێك دەنگی ئەسپێ یا قاترێکی‌دا، یا دەستی لێ هەڵتەکاندو وڵاخـەکـە کەوتە ناو ئاوێکەوە یا کەوتە چاڵێك، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامنی قیمەتی ئەو وڵاخە وە ئەگەر کەسێك بەسەر وڵاخەکەوە بوو و بەهۆی راپەڕینی وڵاخەکەوە داکەوت‌و مرد، ئەوە دییەی شیبهە عەمد ئەکەوێتە سەر کابرا؛ هەروەها، ئەگەر نەقیزەی وڵاخەکە بداو ئەویش هەڵبخاتەوەو شتێك بفەوتێنێ و سروشتی وڵاخەکە وابێ لەوانە نەبێ ئەو شتە بفەوتێنێ، وەکوو وشتر یا قاتر یا ئەسپ یا گای بارەبەر، ئەو کابرا ئەبێ بە زامنی ئەو شتە.

ئەگەر کەسێك مناڵێکی نابالغی خستە کونی درندەیەکەوەو درندەکـەی تـیابوو، یاخود درندەیەکی فڕە دا بەسەریا، یاخود ئەو مناڵەی لەگـەڵ درنـدەیەکـدا خـستە

تەنگەبەرێکەوەو درندەکە منداڵەکە ی خوارد، یا برینداری کرد، ئەوەکابرا ئەبێ بە زامنی ئەو منداڵە؛ جا ئەگەر درندەکە خوێنخوار بوو، وەکوو شێرو پڵنگو ورچو بەراز، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەرکابرا وە ئەگەر لەوانە نەبوو، کەچی بە رێکەوت خواردی، وەکوو سەگ، ئەوە بە «شِبه عَمد» دائەنرێو دییە ئەکەوێتە سەر کەسوکاری کابرا.

ئەگەر کەسێك منداڵێکی لە کێوێ داناکە شوێنی درندە بوو وە لەوکاتەدا درندەکە لای منداڵەکەدا نەبوو، بەڵام لەپاشا رێی لێ کەوتو خواردی، ئەوە کابرا نابێ بە زامنی منداڵەکەو هاتنو خواردنی درندەکە بە هەڵکەوت ئەژمێررێ؛ هەندێ لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: ئەگەر منداڵەکە بێ تەمیز بوو و لەوانە نەبووکە را بکا لەو درندەیە، کابرا ئەبێ بە زامنی.

بەڵام ئەگەر باڵغێکی خاوەنهۆشی لەویادا دانا و لە ئەنجامدا درندە هاتو خواردی، ئەوە بە هیچ جۆرێ کابرا نابێ بە زامنی، مەگەر دەستو پێی ئەو پیاوەی بەستبێتەوەو لەو شوێنەدا وەکوو کۆتەرەدار فڕەی دابێ، ئەوە لەم کاتەدا ئەبێ بە زامنی.

ئەگەر کەسێك بە چەکەوە کەوتە دوای کەسێکی عاقڵی باڵغو ئەویش رای کردو خۆی هاویشتە ئاوێکەوە، یا ئاگرێکەوە، یا لە بەرزاییەکەوە خۆی فڕێ دایە خوارەوەو مرد، ئەوە کابرا نابێ بە زامنی، چونکە ئەو فەوتانە بە دەستی ئەو کەسە نەبووە، بەڵکوو کابرا بە ئارەزووی خۆی وای لە خۆی کردووە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا لەکاتی راکردنا بە خۆی نەزانی لە بانێکەوە یا لە بەرزاییەکەوە کەوتە خوارەوە، یاکەوتە ئاوێکەوەو مرد، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامنیو دییەی شیبهە عەمدی ئەکەوێتە سەر؛ هەروەها، ئەگەر وەختەکە تاریك بوو، یاخود کابرای راکردووکوێر بوو، یاخود لەکاتی راکردنا بانەکە لەژێریا رووخاو بوو بە ژێرەوە، ئەوە لەم سوورەتانەیشدا کابرای خاوەن چەك ئەبێ بە زامن.

وە ئەگەر کەسێك کەوتە دوای منداڵێك یا شێتێك یا پیاوێکی عەقڵسووكو ئەویش خۆی خستە خەتەرەوەو مرد، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامنو دییەی شیبهە عەمدی ئەکەوێتەسەر.

ئەگەر کەسێك منداڵێکی دایە دەستی مەلەوانێك بۆ ئەوە کە فێری مەلەی بکاو منداڵەکەی بەدەستەوە خنکا، ئەوە ئەبێ بە زامنی منداڵەکە بە دیەی شیبهە عەمد؛ هەروەها، ئەگەر مەلەوانەکە بە منداڵەکە بڵێت خۆی بڕواتە ناو ئاوەکەوەو ئەویش بڕوات‌و ئاو بیبا یا بخنکێ، ئەبێ بە زامنی، هەروەها ئەگەر لەو کاتەدا کە فێری مەلەی ئەکا بە عەمدی دەست لە ژێری منداڵەکە دەربێنێ‌و منداڵەکە بخنکێ لەم وەختەدا قیساسی ئەکەوێتە سەر، بەڵکوو لەم سوورەتەدا، ئەگەر ئەو کەسە کە ئەیەوێ فێری مەلە ببێ پیاویش بێ، مادام کابرا دەستی لە ژێرا دەرهێنا تا خنکا، هەر قیساسی ئەکەوێتە سەر مەلەوانەکە.

ئەگەر کەسێك بیرێکی هەڵکەندو بیرەکە بوو بەهۆی فەوتانی نەفسێ یا ماڵێ، ئەوە ئەگەر هەڵکەندنی ئەو بیرە بە سوورەتی زۆرو ناشەرعی بوو، بەو رەنگە کە ئەو بیرە لە موڵکی غەیردا هەڵبکەنێ بە بێ ئیزنی خاوەنەکەی، یا لە موڵکی تێکەڵاوی خۆی‌و کەسێکی تردا بە بێ ئیزنی هاوبەشەکەی، یاخود لە رێگەیەکی تەسکدا هەڵی‌بکەنێ ـ هەرچەند بە ئیزنی پێشەوای موسوڵمانان‌و بۆ سوودی گشتی بێ ـ یا لە رێگایەکی گوشادا بێ بە بێ رێگادانی پێشەوای موسوڵمانان، یاخود رێگای دابێ بەڵام بۆ مەسڵەحەتی خۆی هەڵی‌بکەنێ، ئەوە ئەو بیرهەڵکەنە ئەبێ بە زامن بۆ هەر زیانێك لەوبیرەوە پەیدا ببێ لە گیان‌و ئەندام‌و ماڵی خەڵکدا.

وە ئەگەر بیرەکەی لە شوێنێکدا هەڵکەندبێ کە خۆی موستەحەقی سوودی ئەو شوێنەبێ بە موڵك یا بە وەقف یا بە وەسیەت یا بە بەکرێ گرتن، یاخود لەشوێنێکی وێرانەدا هەڵی‌بکەنی، چ بۆ ئەوە کە بیکا بە موڵك و چ بۆ ئەوە تا لەوێ بێ ئاوی لێ هەڵبگۆزێ، یاخود لە رێگایەکی گوشادا هەڵی‌بکەنێ کە زیانی بۆکەس نەبێ بە عادەت‌و پێشەوای موسوڵمانانیش رێگەی دابێ، یاخود ئەو رێگای نەدابێ، بەڵام بیرەکەی بۆ سوودی گشتی بێ، ئەوە لەم سوورەتانەدا، هەرچی لێ پەیدا ببێ، کابرا نابێ بە زامنی.

هەروەها، ئەگەر لە موڵکی کەسێکی تردا هەڵی‌بکەنێ، بەڵام خاوەنەکەی رێگای دابێ، لەم سوورەتەیشدا ئەم بیر هەڵکەنە زامن نابێ، بەڵام ئەگەر لەپاش ئەوە کەسێکی

تێ کەوت، خاوەن موڵکەکە وتی: من ڕێگام داوە لەوەدا کە ئەو بیرە هەڵکەنێ، ئەوە لێی قەبووڵ ناکرێ، چونکە لەپاش ئەوەکە هۆی زامن بوون بە زاهیر هاتەجێ، بە قسەی ئەو کابرا لاناچێ.

وە ئەگەر کەسێك لە موڵکی خۆیدا بیری هەڵکەند، بەڵام بیرەکەی زیانی هەبوو بۆ خەڵکی تر، وەکوو ئەوە لەپاڵ دیواری ماڵە دراوسێدا بوو، ئەوە ئەبێ بە زامنی هەرچی کە بەو بیرە بفەوتێ، بەڵام لەو ئەندازەیەدا کە لە عادەت دەرچووەو بە ناحەق هەڵکەنراوە.

حوکمی مزگەوتو تەکیەو میوانخانەی خێراتیش، وەکوو ڕێگا وایە، یەعنی ئەگەر کەسێك بیرێکی هەڵکەند لە شوێنێکی تەنگەبەریدا بەجۆرێ کە خەڵکی ئەو شوێنەی لە هاتوچۆدا تێ بکەوێ، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامن، هەروەها ئەگەر لە شوێنێکی گوشادا هەڵیبکەنێ بێ ڕێگادانی پێشەوای موسوڵمانان، یاخود لەسەر ڕێگادانی ئەو بەڵام لەبەر مەسڵەحەتی کابرا خۆی بێ. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی گوشادا بە ئیزنی پێشەوای موسوڵمانان هەڵیبکەنێ، یاخود بە بێ ئیزنی ئەو هەڵیبکەنێو لەبەر سوودی گشتی بێ، ئەوە کابرا زامن نابێ.

وە ئەگەر کەسێك لە موڵکی خۆیدا ئیشێکی عادەتی کرد، کەچی بوو بە هۆی زیان پێ گەیشتنی کەسێك، وەکوو ئەوە گۆزەیەك ئاو لەسەر بان دابنێ کەچی با بیخاتە خوارەوە، یاخود لە ماڵی خۆیدا دار لەت بکاو تەڵەزمێکی لێ بپەڕێو بدا لە شتێ بیشکێنێ، یاخود لەکاتی ئارامی هەوادا ئاگر لە حەوشی خۆیدا بکاتەوەو پاشان بە هەڵکەوت پزیسکێکی لێ ببێتەوەو شتێك بسووتێنێ، ئەوە نابێ بەهۆی زامن بوونی بۆ ئەو کەسە کە زیانی پێ گەیشتووە.

وە ئەگەر ئەو کابرا ئیشەکەی بەپێچەوانەی عادەت بوو، وەکوو ئەوە کە لەکاتی هێرشی بادا ئاگر بکاتەوە لە موڵکی خۆیدا، بەڵام با ئاگرەکەی ببا بۆ شوێنێکی ترو ئەو شوێنەی پێ بسووتێنێ، یاخود لە غەیری وەختی بادا ئاگرێکی گەورەی کردەوەو لەپاشان با هەڵیکردو شوێنێکی سووتاند، یاخود لەکاتی وشك بوونی کشتو کاڵدا

ئاگری جگەرەی فڕێدا بۆ قەراغی ئەو کشتو کاڵە، ئەو لە هەموو ئەم سووورەتانەدا کابرا زامن ئەبێ.

ئەگەر کەسێك ئاوی باخ یا کشتو کاڵی خۆی داو ئاوەکە سەری کرد بۆ دەرەوەو کشتو کاڵی کەسێکی تری فەوتاند، یا خەرمانی کەسێکی برد، یاخود ئاوڕشێنی شوێنێکی کرد لەبەر مەسڵەحەتی خۆی یا لەبەر مەسڵەحەتی کەسێکی تر، بەلام ئەوەندە موبالەغەی تیاکرد شوێنەکەی کرد بە قوروکەسێك پێی هەڵخلیسکاو زیانێکی پێ گەیشت، ئەوە ئەو کەسە ئەبێ بە زامن، بەو شەرتە کە ئەو کەسەی بەویا رائەبووری، نەزانێ ئەو شوێنە بەوجۆرەیە، ئەگینا ئەگەر ئاگای لێ بێو هەر لەبەر کەللەڕەقی خۆی گوزەری پیا بکا، ئەوە کەس نابێ بە زامنی، چونکە تاوانی خۆیەتی.

هەروەها، ئەگەر کەسێك ئاوی هەڵکرد بۆ باخ یا بۆ زەراعەتی خۆیو جۆگەکە شکا بەسەر زەراعەتی کەسێکی تراو فەوتاندیو ئەیشیزانی بەوە کە جۆگەکە داشکاوەو هیچی نەکرد، ئەوەیش ئەبێ بە زامن.

ئەگەر کەسێك فەرمانی دابەکەسێك کە ئاوڕشێنی شوێنێك بکاو ئەویش موبالەغەی تێدا کردو بوو بەهۆی زیان پێ گەیشتنی کەسێك، ئەوە کابرای ئاوڕشێنکەر زامن ئەبێ، بەڵام ئەگەر بە فەرمانی خاوەن فەرمانەکە کابرا موبالەغەی کرد لەو ئاوڕشێنەدا، ئەوە ئەم ئەبێ بە زامن.

ئەگەر کوێرێك بە بێئەوەی کەسێ دەستی رابکێشێ بە رێیەکدا رۆیشتو زیانێکی گەیاند، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو زیانە؛ هەروەها، ئەگەر سواری ولاخێك بوو و ولاخەکەی زیانێکی گەیاند، ئەوە خۆی ئەبێ بە زامن، نەك ئەو کەسە کە لە ولاخەکە ئەخوڕێ.

ئەگەر کەسێك داوێك یا تەڵەیەك لە وێرانەیەکدا یا لە موڵکی کەسێکدا بنێتەوە، ئەوە هەر حەیوانێکی پێوەبێ، یا هەر ئینسانێکی بێتەمیزی تێبکەوێ، ئەم خاوەنتەڵەیە ئەبێ بە زامنی ئەو زیانە وە ئەگەر ئینسانێکی باڵغی عاقڵی تێ بکەوێو زیانی پێ بگا، ئەوە ئەم کابرایە نابێ بە زامنی، مەگەر سەری داوەکە یا تەڵەکەی داپۆشیبێ بەجۆرێ

کەس پێی نەزانێ، ئەوە لەم حاڵەدا هەر خاوەن تەڵەکە زامنە، هەروەها ئەگەر کابرای زیان پێ گەیشتوو کوێر بێ.

ئەگەر کەسێك کەسێکی گرت بە کرێ بۆ ئەوە بیرێکی بۆ هەڵبکەنێ و بیرەکە رووخا بەسەر کابرادا، ئەوە ئەو خاوەن ئیشە نابێ بە زامن، هەرچەند بیشزانێ کە ئەو شوێنە خەتەرە.

ئەگەر کەسێ دارێکی لە دیوارێکەوە دەرکردو زیانی لێ پەیدا بوو بۆ ئەو کەسانەکە لە رێگاوە بەلای ئەو دارەدا ئەڕۆن، ئەوە ئەو خاوەن دارە ئەبێ بە زامن؛ جا ئەگەر زیانەکە بەهۆی ئەو ئەندازەیەوە بوو کە وا بەدەرەوە، وەك ئەوەکە جلی کەسێك بدڕێ، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامنی هەمووی وە ئەگەر بەهۆی هەموو دارەکەوە بوو، چ ئەوەی وا لەناو دیوارەکەداو چ ئەوەی وا لە دەرەوە، بەم ڕەنگە کە گیرا لە بارێك و بەهێزی ئەو ئەندازەیەی کە لەناو دیوارەکەدایە زیانی بە بارەکە گەیاند، ئەوە زەمانەتەکە لەسەر نیوەیە، یەعنی کابرای خاوەن‌دار ئەبێ بە زامنی نیوەی ئەو شتەو بەس، لەبەرئەوەکە ئەو دارە نیوەی لەناو دیواری ماڵی کابرادا بووەو لەو ئەندازەیەدا کابرا ئیشێکی ناشەرعی نەکردووەو سەرەڕێگەی خەڵکی نەگرتووە.

حەڵاڵە ئینسان پلووسك لەسەر بانی خۆی دابمەرزێنێ، هەرچەند ئاوی لێوە بڕژێ بەسەر رێگای خەڵکداو پێشەوای موسوڵمانانیش رێگای نەدابێ، چونکە شتیوا ناچارییە، بەڵام هەر زیانێکی لێ پەیدا ببێ، خاوەن پلووسکەکە ئەبێ بە زامنی؛ جا ئەگەر زیانەکە بەهۆی پلووسکەکە خۆیەوە بوو، واتە پلووسکەکە درێژ بوو وە گیرا لە بەرگی کەسێك یا لە بارێك و دڕی، ئەوە لەم سوورەتەدا ئەگەر هەموو پلووسکەکە لەناو دیوارا قایم‌کرابوو، زەمانەتی لەسەر کابرا نییە وە ئەگەر هەمووی لە دەری دیوارەوە بوو وکابرا پلووسکەکەی بە بزمار قایم کردبوو بە دیوارەکەوە، ئەوە ئەبێ بە زامنی هەمووی وە ئەگەر هەندێکی لە دەرەوە بوو و هەندێکی لە سەربان یا لەناو دیوارا بوو ـ وەکوو عادەت وایە ـ ئەوە ئەبێ بە زامنی نیوەی وە ئەگەر زیانەکە بەهۆی ئاوی پلووسکەکەوە بوو، ئەوە ئەبێ بە زامنی هەمووی.

ئەگەر کەسێك دیوارێکی بە لاری دروست کردو لەپاشان کەوت، ئەوە هەر زیانێکی لێ پەیدا ببێ، کابرا ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر بە راستی دروستی کردو هەندێکی بەهۆی تەکانی شتێکی وەك بوومەلەرزەوە لار بووەوەو کەوت‌و زیانی گەیاند، ئەوە ئـەگـەر زیانەکە بەهۆی ئەندازە لارەکەیەوە بوو، ئەوە کابرا ئەبێ بە زامنی هەمووی وە ئەگەر بەهۆی راستەکەی‌و لارەکەیەوە بوو، ئەوە ئەبێ بە زامنی نیوەی وە ئەگەر دیوارەکەی راست دروست‌کردو لەپاشان بەهۆی کارەساتێکەوە کەوت‌و زیانی گەیاند، ئەوە نابێ بە زامن؛ بەڵێ، لەم کاتەدا ئەگەر بەهۆی ئەو کۆما گڵەوە کە کەوتووە زیانێك پەیدا بوو، کابرا ئەبێ بە زامنی، بەم شەرتە قوسووری کردبێ لە لانەبردنی گڵەکە.

ئەگەر کەسێك توێکڵی کاڵەك‌و شووتی‌و شتی‌وای فڕێدایە سەر رێگاو بوو بەهۆی هەڵخلیسکان‌و زیان پێ گەیشتنی خەڵك، ئەوە ئەبێ بە زامن وە ئەگەر لە شوێنـێکـی لارێدا فڕەی دا، یاخود بردی بۆ سەلوێنکی خەڵکی ئەو شوێنەو لەوێ فڕەی دا، ئەوە هەر زیانێکی لێوە پەیدا ببێ، نابێ بە زامنی؛ هەروەها، ئەگەر ئـەم کـابرا ئـەم جـۆرە شتانەی لە موڵکی خۆیدا فڕێ داو یەکێ بەسەریا هات‌و زیانی پێ گەیشت، ئەوە ئەو کابرایە نابێ بە زامن.

ئەگەر کەسێك لە حەمامدا سابوونێك یا شتێکی‌وای فڕێدایە سەر رێگای گوزەری خەڵك‌و بوو بەهۆی زیان پێ گەیشتنیان، ئەوە تا ئەو ماوەیە کە بەعادەت خاوەن حەمام حەمامەکەی ئەشۆرێ، کابرای فڕێدەر زامنە و لەپاش ئەو مـاوەیە، کـابرای خـاوەن حەمام ئەبێ بە زامن؛ بەڵێ، لە فەتاوای "ئیمامی غـەزالی‌دا" ئـەڵێ: ئـەگـەر خـاوەن حەمامەکە مەنعی کابرای کرد لە فڕێدانی شتی‌وا، یاخود مەنعی نەکرد، بەڵام کابرای خۆشۆر لە عادەت‌بەدەر ئەو شتانەی فڕێدا، ئەوە هەر ئەم کابرایە ئەبێ بە زامن؛ "ابن حجر" فەرموویەتی: ئەم فتوایە جوانە. لەڕاستیدا، ئەگەر کـابرا مـەنعی کـرا، حـەقی فڕەدانی ئەوانەی نییە وە ئەگەر مەنع نەکرا، حەقی بە ئەندازەی عادەتەو لەوە زیـاتر ستەمەو ئەبێ بەهۆی زامن بوونی.

بزانن! لە هەموو ئەم سوورەتانی زەمانەتەدا، ئەو کەسە کە زیانەکەی لێ کەوتووە،

ئەبێ خوێ بە ئارەزوو و لەگەڵ عەقڵ و زانستدا نەخستبێتە ئەو زیانەوە، ئەگینا هەر زیانێکی لێ بکەوێ، بێ قیمەتەو بە خۆڕایی ئەڕوا.

ئەگەر کەسێ کەسێکی بە کرێ گرت بۆ بڕینی میوەیەك، یابۆ هەڵکەندنی کارێزێك، یا بۆ دەرکردنی کانێك و کابرا لە دارەکە کەوتە خوارەوە، یاکارێزەکە یاکانەکەی بەسەردا رووخاو مرد، ئەوە خاوەن ئیشەکە زامن نابێ.

ئەگەر دوو هۆی زیان پێ گەیشتن کەوتنە یەك، ئەوە ئەو هۆیەیان کە نزیکترە بە زیانەکە ئەبێ بەهۆی زامن بوون؛ کەوابوو، ئەگەر کەسێك بە ناحەق بیرێکی هەڵکەندو کەسێکی تر بەردێکی بە ناحەق لە قەراغی بیرەکەدا داناو کەسێك پێی لەو بەردە هەڵکەوت و کەوتە بیرەکەوە، ئەوە کابرای بەرددانەر زامنە وە ئەگەر خاوەن بەردەکە ئەو بەردەی بە حەق دانا؛ مەسەلا، جێگەی بەردەکە موڵکی خۆی بوو و بۆیەی دانابوو کە سنووری موڵکەکەی دەربکەوێ و خەڵك داگیری نەکەن، ئەوە کابرای بیرهەڵکەن ئەبێ بە زامن.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك بیرێکی بە حەق هەڵکەند لە موڵکی خۆیدا و کەسێ چەقۆیەکی خستە ئەو بیرەوەو بەو چەقۆیە کەسێك تووشی زیان بوو، ئەوە زیانەکەی بەخۆڕایی ئەڕوا، چونکە بیرەکە کە هۆی پێشوو بووە، بە حەق هەڵکەنراوە.

ئەگەر کەسێك بەردێکی لەسەرە رێگادا داناو دووکەسی تریشی بەردێکی تریان داناو یەکێك بەهۆی ئەو دوو بەردەوە پێی هەڵکەوت، ئەوە هەر سێکیان وەکوو یەك ئەبن بە زامنی ئەو کەسە، بە سێ بەش، هەریەکی بەشێك.

ئەگەر کەسێك کێردێکی بەدەستەوە بوو و کەسێکی تر یەکێکی دا بەسەر ئەو کێردەدا، ئەوە زەمانەت لەسەر ئەم کەسەیە نەك لەسەر خاوەن کێردەکە. ئەگەر کەسێك پاڵی نا بە کەسێکەوە بۆ ئەوە بیخاتە ناو ئاو، یا بیخاتە خوارەوە لەسەربان، یا بیخاتە ئاگرەوەو ئەوی تریش ئەم کابرایەی لەگەڵ خۆیدا راکێشاو بەیەکەوە کەوتنەخوارەوە، یا سووتان، یا خنکان، ئەمە ئەگەر کابرای دووهەم بەهیوای خۆ رزگار کردن ئەوی یەکەمی راکێشابێ، ئەوە هەر یەکەم زامنە بۆ دووهەم و دووهەم نابێ بە زامنی یەکەم وە ئەگەر مەبەستی ئەوە بووبێ ئەمیش لەگەڵیا بێ، ئەوە هەردووکیان ئەبن بە زامنی یەکتر.

ئەگەر دووکەس بە خەنجەر دایان لە یەك، ئەوە هەردووکیان بە زامنی ئەویان دائەنرێن وگوێ لە ئیددیعای کەسیان ناگیرێ کە بڵێ: دیفاعی لە نەفسی خۆی کردووە؛ بەڵێ، ئەگەر بە شاهید ئیسپات بکرێ کە یەکێکیان لە پێشا دەستی وەشاندووەو ئەویان دیفاعی کردووە، ئەوە دیفاعکەرەکەیان نابێ بە زامن.

ئەگەر کەسێك بەردێکی لە ڕێگایەکدا داناو کەسێك پێی لێ هەڵکەوتو مردو بەردەکەشی تلکردەوەو شتێکی پێ شکاند، یا منداڵێکی پێ کوشت، ئەوە کابرای یەکەم زامنی دووهەم ئەبێو کابرای دووهەمیش ئەبێ بە زامنی زیانی کابرای دوایی.

ئەگەر کەسێك لەناو ڕێگایەکدا دانیشت یا نووست و یەکێ پێی لەو کەسە هەڵکەوتو مرد، ئەوە ئەگەر ڕێگەکە پان بێو مەیدانی هاتوچۆ ببێ بۆ خەڵك لە شوێنێکیترەوە، ئەوە کابرای مردوو خوێنی بە خۆڕایی ئەڕوا، چونکە خۆی بووە بەهۆی مردنی خۆی، بەڵام لەم سوورەتەدا ئەگەر نووستووەکە یا دانیشتووەکە مرد، کابرای ڕێبوار ئەبێ بە زامنیان.

وە ئەگەر ڕێگەکە تەسك بوو، ئەوە بەپێچەوانەوەیە؛ یەعنی ئەگەر دانیشتووەکە یا نووستووەکە مرد، ئەوە خوێنی بە هەدەر ئەڕوا وە ئەگەر ڕێبوارەکە مرد، ئەمان ئەبن بە زامنی وە لەسەر ئەم دەستوورانە حوکمی ئەوەیش دەرئەکەوێ کە ئەگەر ڕێبوارەکەیش بمرێو نووستووەکە یا دانیشتووەکەیش بمرێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك لە قەراغی ڕێگەکەدا دوور لە بەرپێی خەڵکەوە دانیشت، یا نووست وە یاخود ماندوو بوو لە ناچەقی ڕێگەدا ڕاوەستاو یەکێ بە هۆی ئەوەوە پێی هەڵکەوتو زیانێکی تووش بوو، ئەم کابرایە نابێ بە زامنی، چونکە قەراغی ڕێگە ناگیرێ لە کەس، هەروا ڕێگا لەکەس ناگیرێ لەکاتی ماندوویەتی‌دا، لە چەقی ڕێگەدا ڕاوەستێو وچانێك بدا، بەڵام ئەگەر کابرای دانیشتوو یا نووستووی قەراغی ڕێگا، یا کابرای وەستاوی چەقی ڕێگا، مردن، ئەوە کابرای ڕێبوار ئەبێ بە زامن.

هەروەها ئەگەرکەسێك لە مزگەوتا نوێژی ئەکرد، یاخود لای گرتبوو بۆ خواپەرستیو کەسێك بەسەریا هات، ئەوە ئەگەر ڕێبوارەکە تووشی زیان ببێ، بەخۆڕایی ئەڕوا وە

ئەگەر ئەم تووشی زیان ببێ، ئەوە ڕێبوارەکە زامنە؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك لە موڵکی خۆیا دابنیشێ و کەسێك بێ بەسەریا، ئەگەر ئەو ڕێبوارە تووشی زیان ببێ، ئەو بەخۆڕایی ئەڕواو ئەگەر خاوەن موڵکەکە تووشی زیان ببێ، ئەوە ڕێبوارەکە زامنە.

هەروەها، ئەگەر کەسێك لەسەر سەکۆی بەردەمی دووکانی خۆیا دابنیشێ و کەسێك بێ بەسەریا، ئەوە ئەگەر ڕێبوارەکە تووشی زیان ببێ، بەخۆڕایی ئەڕوا وە ئەگەر خاوەن دووکانەکە تووش ببێ، کابرای ڕێبوار زامنە؛ بەڵێ، ئەگەر دووکاندارەکە بە ناحەق ئەو شوێنەی گرتبوو، ئەوە کابرای ڕێبوار هەر زیانێکی پێ بگا، ئەمیش ئەبێ بە زامنی ئەو.

## باسی ئەوەکە دووکەس لە یەك بدەن وە هەندێ شتی تریش

ئەگەر دوو کەسی باڵغ و عاقڵ و ئازاد دایان لە یەك، پیادە بن یا سوار، یا یەکێکیان پیادە بێ و یەکێکیان سوار و هەردووکیان مردن، ئەمە ئەگەر بە بێ قەسد بووبێ، یەکی نیوەی «دِیە»ی سووکی هاوڕێکەی ئەکەوێتە سەر ئەو خزم و کەس و کارانەی کە لەپشتا ئەچنەوە سەر یەك و لە یەك ئەپیرەن، چونکە مردنی هەرکام لەمانە بەهۆی خۆیەوەو هاوڕێکەیەوە بووە؛ کەوابوو، هەریەکی نیوەی دیەی ئەفەوتێ و نیوەی ئەکەوێتە سەر هاوڕێکەی و لەبەرئەوەکە جینایەتەکەی بە خەتا بووە، دیەکە سووکەو پێویستە لەسەر کەس و کاری بۆی بدەن.

وە ئەگەر بە عەمدی و قەسد دایان لە یەك و مردن، یەکی نیوە دیەیەکی قورس ئەکەوێتە سەر کەس و کاریان.

فەرقی نییە لەم حوکمەدا کە وتمان ئەوەکە هەردوو کەسەکە لە هێزدا وەکوو یەك بن یا فەرقیان ببێ، وە ئەگەر سوار بوون وڵاخەکانیان لە یەك جۆر بێ یا جیاواز بێ. بەڵێ ئەگەر یەکێ لەم دووکەسەکە پیادەن ئەوەندە بێ هێز بوو جووڵانەکەی هیچ تەئسیرێکی نەبوو، ئەوە خوێنی کابرای خاوەن هێز بەخوڕایی ئەڕواو نیوەی دیەی بێ هێزەکەش ئەکەوێتە سەر کەس و کاری ئەو کابرا بەهێزە. هەروەها ئەگەر وڵاخی یەکێکیان هێزو تەکانی نەبوو، وە تەکان تەنها لە وڵاخی یەکێکیانەوە بوو، وە بوو بەهۆی ئەم کارەساتی مردنە.

وە ئەگەر یەکێکیان بەقەسدو ئەویان بێ‌قەسد بوو، ئەوە کەس‌و کاری خاوەن قەسدە کە نیوەی دییەی قورسی بێ‌قەسدەکەی ئەکەوێتە سەر و کەس‌و کاری بێ‌قەسدەکەیش، نیوەی دییەی سووکی خاوەن‌قەسدەکە ئەدا؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە یەکی دوو کەفارەتیش واجبە لەسەریان؛ کەفارەتێك بۆ ئەوەکە دەخڵیان لەکوشتنی خۆیاندا بووەو کەفارەتێك بۆ ئەوەکە دەخڵیان لەکوشتنی هاوڕێکەیاندا بووە، چونکە کەفارەت بەش ناکرێ‌و هەرکەس کەمترین پەیوەندێکی ببێ لەکوشتندا، کەفارەتی بەتەواوی ئەکەوێتە سەر وە ئەم کەفارەتە لە میراتەکەی دەرئەکرێ[1]؛ هەروەها، ئەگەر ولاخەکانیش مردن، هەریەکێ لەمانە نیوەی قیمەتی ولاخی هاوڕێکەی ئەکەوێتە سەرو لە میراتەکەی دەرئەکرێ.

ئەگەر دوو منال یا دوو شێت یا منالێك‌و شێتێك لە یەکیان داو مردن، عەینی حوکمی رابوردوویان تیا هەیە؛ بەڵێ، ئەگەر وەلییەکەیان ئەوانەی سوار کردبێ بە بێ‌مەسڵەحەتی خۆیان، ئەوە ئەو وەلییە ئەبێ بە زامن، یەعنی وەلی هەرکامیان نیوەی قیمەتی هەردوو ولاخەکە ئەدا وە لەسەر خزم‌و کەس‌و کاری واجبە نیوەی دییەی هەردوو منالەکە بدا؛ هەروەها، وەلییەکان یەکی دوو کەفارەت ئەکەوێتە سەریان وە ئەگەر بێگانە بە بێ ئیزنی وەلییەکەیان سواری کردن، ئەوە ئەبێ بە زامنی دییەی منالەکان‌و واجبە کەس‌و کاری ئەو بیدەن و ئەبێ بە زامنی ولاخەکانیش لەگەڵ دوو کەفارەتدا و لە ماڵی خۆی ئەدرێ.

ئەگەر دوو ژنی دووگیان دایان لە یەك‌و خۆیان مردن‌و منالەکەیشیان لەبارچوو، ئەوە هەردوو ئەبن بە زامن، یەعنی لەسەر کەس‌و کاری هەر یەکێکیان واجبە نیوەی دییەی ئەوی‌تریان بدات لەگەڵ بیست‌یەکی دییەی دایکی منالە لەبارچووەکە لەجیاتی منالە لەبارچووەکەی ئەویان و هەر یەکێ لەو دوو ژنە چوار کەفارەت لە میراتەکەی دەرئەکرێ، یەکێ بۆ خۆی‌و یەکێ بو منالەکەی‌و یەکێ بۆ ژنەکەی‌ترو یەکێ بۆ منالەکەی؛ ئەمە هەشت کەفارەت و تەماشای ئەوە ناکرێ فەوتاو چوارکەسەو کەفارەت

---

١. ئەم کەفارەتە بریتییە لە ئازادکردنی بە ندەیەك، یا دوو مانگ رۆژوو لەسەریەك؛ جا کرێ لە ماڵەکەیان دەرئەکرێ بۆ کەسێ کە دوو مانگ لەجیاتی ئەوان بەرۆژوو بێ.

زیاترە، چونكە مادام ئەم ژنانە دەخلْیان لە فەوتانی خۆیانو منالْەكانیانا هەیە، ئەبێ كەفارەتەكان بەتەواوی بدەن.

## له یەكدانی كەشتی

ئەگەر دوو پاپۆڕ دایان لە یەك، ئەوە حوكمی پاپۆڕەكان، وەكوو ولاْخە سوارییەكانەو حوكمی كەشتییەوانەكانیش، وەكوو سوارەكان وایە؛ یەعنی ئەگەر كەشتییەكان مالْی خۆیان بێ و كەل و پەلی خۆیانی تێدا بێ، ئەوە گشت یەكێ لەوان، ئەبێ بە زامنی قیمەتی نیوەكەشتی ئەوی تریان لەگەلْ قیمەتی نیوەی ئەو كەل و پەلەكە لە ناویا بووەو فەوتاوە و لەسەر كەس و كاری هەركامیان پێویستە نیوەی دییەی قورسی ئەویان بدا، ئەگەر بە دەسەنقەست دابوویان لە یەك و نیوە دییەی سووك، ئەگەر بە سەهو دابوویان لە یەك؛ هەروەها، واجبە هەریەكێ كە فارەتێك بۆ خۆی و كەفارەتێك بۆ هاوڕێكەی لە میراتەكەی دەربكرێ.

وە ئەگەر كەشتی و كەل و پەل هی یەكێكی تر بن، ئەوە لەسەر هەر یەكێكیان پێویستە نیوەی قیمەتی هەردوو كەشتییەكەو نیوەی قیمەتی ئەو كەل و پەلەی تیایاندا بووە بدا بە خاوەن مالْەكە و حوكمی دییەو كەفارەتی كوشتنەكان، وەكوو ئەوی پێشوو وایە.

ئەگەر پاپۆڕێك كەوتە مەترسی خنكان، دروستە ئەو كەل و پەلەی تیایەتی فڕێ بدرێتە ناو دەریا، بەلْكوو واجبە ئەگەر ئومێدی رزگاربوونی سوارەكانی تیا بێ؛ بەلاْم خاوەن مالْەكە ئەتوانێ لەسەر بڕیاری قیمەتی مالْەكەی و بژاردنی بە خەلْكەكە، مالْەكەی خۆی فڕێ بدا؛ كەواتە، ئەگەر كەسێك مالی كەسێكی بە بێ ئیزنی ئەو كەسە فڕێ دا ئەبێ بە زامنی و پێویستە لەسەری بیبژێرێ.

ئەگەر كەسێك بە كەسێكی وت: ئەو كەل و پەلەی وا لەو كەشتییەدا فڕەی بدە من ئەبم بە زامنی، ئەویش فڕەی دا، ئەوە كابرا ئەبی بە زامنی وە ئەگەر هەر وتی: فڕەی بدەو باسی زامنی خۆی نەكرد، ئەوە نابێ بە زامنی، بەلاْم ئەو كەسە كە فەرمان ئەدا بە كابرا مالْەكە فڕێ بدا لەسەر زەمانەت، بە دوو شەرت ئەبێ بە زامن؛ یەكەم، ئەوەیە ترسی

خنکانی کەشتییەکە هەبێ؛ ئەگەر لە ئاسایشا بڵێ بە یەکێ: ئەو ماڵە فڕەبدە من ئەبم بە زامنی، ئەوە نابێ بە زامنو لەوە ئەچێ یەکێ بڵێ بە کەسێ: خانووەکەی خۆت بسووتێنە من ئەیبژێرم، ئەویش بیسووتێنێ؛ جا ئەو کابرا ئەگەر خاوەنی ماڵەکە بێ، ئەوە خۆی ماڵەکەی خۆی فەوتاندووە وە ئەگەر خاوەنی ماڵەکە نەبێ، واجبە بیبژێرێ بۆ خاوەن ماڵەکە؛ شەرتی دووهەم، ئەوەیە قازانجی فڕێدانی ماڵەکە تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ کە فڕەی ئەدا، یەعنی قازانجەکەی تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ کە فەرمان ئەدا، بەڵکوو یا بۆ ئەوو بۆ خاوەن ماڵەکەیش بێ، یا بۆ خاوەن ماڵو بێگانەیەکیش بێ، یا هەر بۆ بێگانەیەك بێ، یا بۆ فەرماندەرەکەو خاوەن ماڵو بێگانەکە بێ، ئەگینا ئەگەر سوودی فڕێدانەکە هەر بۆ ئەو کەسە بێ کە فڕێی ئەدا، ئەوە هەر خۆی ئەبێ بە زامنو فەرماندەرەکە بەشدار نابێ لەو زامنییەدا.

ئەگەر بە چەند کەس بەردێکیان بە مەنجەنیقێك فڕێدا، یاخود بەردێکیان لە شوێنێکەوە جوولاندو بەردی مەنجەنیقەکە گەڕایەوە دای لە یەکێ لەم کۆمەڵەو کوشتی، یاخود پارچەیەك لەو بەردە کە جوولاندبوویان جیابووەوەو دای لە یەکێ لەمانەو کوشتی، یاخود چەند کەسێك دارێکیان هەڵگرتبوو و هەموو بەجارێ دەرچوون لەژێر دارەکەو لەوکاتەدا دارەکە دای لە یەکێکیانو کوشتی، ئەوە دییەی کابرای کوژراو بەش بەش ئەکرێ ئەوەندەی ژمارەی ئەو کۆمەڵەو بەشی کابرای کوژراو لائەچێ، چونکە مادام خۆی کوژراوە، وەکوو ئەوە وایە لە تاوانەکەدا بەشدار نەبووبێ وە بەشەکانی تر واجب ئەبن لەسەر کەسو کاری ئەوانەو ئەبێ بیدەن بە میراتگرانی کوژراوەکە.

وە ئەگەر لە یەکێك لەم سوورەتانەدا، کەسێکی تر لە غەیری ئەم کۆمەڵە کوژرا، ئەوە ئەگەر بە دەسەنقەست نەبوو دییەی سووکی ئەو کابرایە ئەکەوێتە سەر کەسو کاری ئەم کۆمەڵە وە ئەگەر بە دەسەنقەست بوو، دییە ی قورسی ئەکەوێتە سەریان؛ بەڵێ، ئەگەر لە یەکێ لەم سوورەتانەدا کە بەیان کران، ئەم جۆرە کردەوانە بەکار ئەهێنران[١] بۆ کوشتنی

١. مەسەلا، کۆمەڵێك بە پیلان، لۆسێ هەڵبگرن بۆ ئەوە لە رێدا لە ژێری دەرچنو یەکێکی لە خۆیان پێ بکوژن.

خەڵك و زۆرتر وابوو ئەو کەسە بکوژرێت، ئەوە «قِصاص»یان ئەکەوێتە سەر؛ جا ئەگەر لێیان خۆش بوون لە قیساس، ئەوە دیبەی قورس ئەکەوێتە سەر خۆیان‌و لە ماڵی خۆیان ئەدرێ.

## باسی چۆنیەتی کەوتنی «دیبە» لە ئەستۆی کەس‌وکار (عاقِلە)

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە دیبەی جنیایەتی «شبه عمد»و خەتا لەسەر کابرای جینایەت‌کەر واجب ئەبێ، بەڵام واجبە لەسەر کەس‌وکاری کە بۆی هەڵبگرن‌و بیدەن بە خاوەن حەقەکە. مەبەست لەم کەس‌وکارە ـ کە لە شەرعدا پێیان ئەوترێ «عاقلە» ـ ئەو نێرینە تەکلیف لەسەرانەن کە لە کاتی جینایەتەکەدا هەن‌و ئەگەر کابرای جینایەت‌کەر بمرێ، میراتی لێ ئەبەن، تەنها باوك‌و باپیرو دایك‌و نەنك‌و کوڕو کچ‌و کوڕەزاو کچەزای نەبێ. لەم کۆمەڵە نێرینە تەکلیف لەسەرانەدا، ئەوەیان پێشتر ئەخرێ کە نزیکتر بێ؛ بەڵێ، ئەگەر لە ئاخری ساڵدا نزیکەکان بەشی ئەو ساڵەیان پێ تەواو نەکرا، ئەوە واجبە لەسەر دوورەکان تەواوی بکەن بەپێی ریزی پایەی نزیکی لە خزمایەتی‌دا.

جا لەسەر دەستووری پێشوو، برا پێش‌ئەخرێ لە برازاو برازا لە برازازا و برازاکان ـ هەرچەند لە خوارەوە بن ـ پێش‌ئەخرێن لەسەر مام‌و مام لەسەر ئامۆزا و ئامۆزاکان ـ هەرچەند لەخوارەوە بن ـ پێش‌ئەخرێن لەسەر مامی باوکی جینایەت‌کەرەکە و هەروا بەم‌پێیە وە لەناو ئەم خزمانەدا، ئەوەی بەهۆی باوك‌و دایکەوە بگا بە جینایەت‌کەرەکە، پێش‌ئەخرێ لەسەر ئەوەی کە بەهۆی تەنیا باوکەوە پێی ئەگا.

ئەگەر ئەوەی واجبە لەسەر کەس‌وکاری کابرای جینایەت‌کەر بەشی نەکرد، یاخود کابرا کەس‌وکاری هەر نەبوو، یاخود بووی بەڵام بێ‌دەسەڵات بوون، ئەبێ لە خەزێنەی «بیت المال» ـ کە سندووقی دارایی موسوڵمانانە ـ دیبە بدرێ بە خاوەن حەق لەجیاتی ئەو جینایەت‌کەرە کە موسوڵمان بێ وە ئەگەر «بیت المال» خاڵی بوو، یاخود خاوەن حوکمی موسوڵمانان بەزۆر نەیهێشت ئەوە دیبەیە لەو «بیت المال»ە بدرێ، ئەگەڕێتەوە بۆسەر جینایەت‌کەرەکە خۆی و هەرکاتێ هەرکەس لە بێ‌دەسەڵاتەکانی کەس‌وکاری کابرای جینایەت‌کەر دەوڵەمەند بوو، ئەبێ بەشەکەی خوێ بدا، ئەگەر لە پێشا نەدرابوو.

دییەی نەفسی نێرینەی موسوڵمان، بە ماوەی سێ ساڵ ئەدرێ، هەر ساڵێ سێ یەکی و دییەی ژنی موسوڵمان، بە دوو ساڵ ئەدرێ، لە ساڵی یەکەمدا سێ یەکی ئەدرێ و لە ساڵی دووهەمدا ئەوەی ماوەتەوە ئەدرێت و دییەی کافری زیممی و ئاگرپەرست، چ پیاو بێ و چ ژن، بە یەك ساڵ ئەدرێت.

ئەگەر کەسێك دوو موسوڵمان یا زیاتر بکوژێ بە «شبه عمد» یا بە خەتا، واجبە لەسەر کەس و کاری ئەو کەسە لە ماوەی سێ ساڵا دییەی ئەو کوژراوانە بدەن.

دییەی ئەندامیش، وەکوو دەست و پێ و دییەی هێز، وەکوو بیستن و بینین، هەر ساڵێ بە ئەندازەی سێ یەکی دییەیەکی لێ ئەدرێ؛ مەسەلا، ئەگەر سێ چارەکە دییە بوو، ئەوە لە ساڵی یەکەمدا، سێ یەکە دییەیەك و لە ساڵی دووهەما، سێ یەکێکی تر و لە ساڵی سێهەما، نیوە شەش یەکێکی ئەدرێ وە ئەگەر وا رێکەوت ئەوەندەی دوو دییەی نەفس بوو، بەم رەنگە دییەی چەند ئەندامێکی لەسەر بوو، ئەوە لە شەش ساڵدا ئەدرێ.

ئەو ماوەیە کە بۆ دانی دییە دانراوە لە دییەی نەفسدا، لە گیان دەرچوونی کابراوە ئەژمێررێ و لە دییەی ئەندامدا و لە دییەی هێزدا، لە کاتی جینایەتەکەوە ئەژمێررێ وە بە شەرت گیراوە ئەو کەس وکارە کە ئەم دییەیە ئەدا، منداڵ و شێت و بێ دەسەڵات نەبێ و لەو ساڵەدا کە بەشەکەی ئەدا، تا ئاخری ساڵ لە ژیاندا بێ و لە ئاخری ساڵەکەدا دەوڵەمەند یا مامناوەندی بێ؛ جا ئەوەی دەوڵەمەندە، سەری نیو دیناری ئاڵتوون و ئەوی نیمچەدەوڵەمەندە، سەری چارەکە دینارێك ئەدا. ئەگەر جینایەتکەرەکە موسوڵمان بوو، شەرتە کەس وکارەکەیشی موسوڵمان بن و بەپێچەوانەیشەوە؛ کەواتە کافر بۆ موسوڵمان و موسوڵمان بۆ کافر دییە هەڵناگرێت؛ بەڵێ، جوولەکە لەجیاتی گاورو گاور لەجیاتی جوولەکە دییە ئەدەن، چ زیممی بن و چ پەیمانیان لەگەڵ کرابێ و چ ئەمانیان درابێتێ.

## باسی بژاردنی حەقی منداڵێك کە لە سکی دایکیدا بکوژرێ

ئەگەر کەسێك جینایەتی کرد لە ژنێکی دووگانی زیندوو، یاخود هەڕەشەی لێ کرد، یا دەرمانخواردی کرد، یا بە زۆر شتێکی قورسی پێ هەڵگرت، یاخود

خواردەمەنییەكی‌وای لادا خوارد كە حەزی لێ‌ئەكردو بەشی نەداو ئـەویش بـەهۆی ئەوەوە منداڵەكەی فڕێ دا، یا بەهۆی یەكێ لە هۆ رابوردووەكانەوە منداڵەكەی بە مردوویی لێ‌بوو، یا تەنیا سەری بە مردوویی هاتە خوارەوەو دایكەكەی مرد، یـاخود پـارچـە گۆشتێكی‌وای لێ‌داكەوت كە مامانەكان ئەیانوت سوورەتی ئادەمیزادی تیایە، ئەوە لە هـەموو ئـەم سـوورەتانەدا «غُـرّە»یـەك واجب ئـەبێ لەسـەر كـابرای جـینایەت‌كەر ـلەمەوپاش باسی «غُرّە»ئەكەین ـ وە پێویستە لەسەر كەس‌وكاری بیدەن بە میرات‌گری ئەو منداڵە لەبارچووە، كە دایكەكەشی ئەگەر مابێ، یەكێكە لە میرات‌گرەكان.

بەڵێ، ئەگەر ژنە دووگیانەكە خۆی دەرمانی خواردبوو بۆ ئەوەی سكەكەی فڕێ بداو فڕێی دا، یاخود رۆژووی گرت‌و بەهۆی رۆژووەكەوە منداڵەكـەی لەبـارچـوو، ئـەوە لەم‌كاتەدا دایكەكە لەو میراتە بەش نابا وە ئەگەر نەخۆشییەكی قورسی‌وای گرت كە ژیانی پێی‌كەوتە مەترسییەوەو دوكتۆر بڕیاریاندا: بە بێ‌دەرمان خواردن رزگار نابێ، ئەوە دروستە دەرمان بخوا وە ئەگەر بەهۆی دەرمانەكەوە منداڵەكەی لێ‌داكەوت، زامن نابێ.

وە ئەگەر منداڵەكە بە زیـندوویی داكـەوت‌و گـورج مـرد، ئـەوەیش هـەر بـەهۆی جینایەتەكەوە دائەنرێ‌و ئەبێ بەهۆی واجب بوونی «غرّە» لەسەر جینایەت‌كەرەكەو كەس‌وكارەكەی ئەیدەن بە خاوەن حەقەكان؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش جینایەتەكە منداڵەكە بە زیندوویی داكەوت‌و ماوەیەك بە بێ‌ئـازار مـایەوە ئـەوسا مـرد، ئـەوە بـەهۆی ئـەو جینایەتەوە دانانرێ‌و جینایەت‌كەرەكە نابێ بە زامن، چونكە وادیارە ئەم مـردنە لەو جینایەتەوە نەبووە، ئەگینا یا هەر لەسكی دایكەكەیدا ئەمرد، یاخود لەپاش داكەوتنی، ئازاری بەردەوام ئەبوو تا ئەمرد.

«غُرّە» لە عورفی شەرعدا، بریتییە لە بەندەیەك یا كەنیزەكێك كە عەیبێكی‌وای پێوە نەبێ لە فرۆشتنا زیانی پێ‌بگەیەنێ وە ئەگەر بەندە یا كەنیزەك نەبوو، واجبە پێنج وشتر بدرێ بە میرات‌گری منداڵەكە لەسەر ئیعتیباری ئەوەكە زیندوو بووەو مردووە وە ئەگەر وشتر نەبوو، پێویستە قیمەتی ئەو پێنج وشترە بدرێ بە ئیعتیباری قیمەتی ئەو وشترانە

لە نزیکترین وڵاتێکدا لەو شوێنەوە؛ بەکورتی؛ «غُرّە» دەیەکی دییەی دایکەکەیەتی وە بۆ منداڵی جوولەکەو گاور، «غُرّە»یەك پێویستەکە سێ یەکی «غرە»ی منداڵی موسوڵمان بی و لە منداڵی ئاگرپەرستو هاوچەشنی ئاگرپەرستدا، «غرە»یەك پێویستە کە بگا بە دوو سێ یەکی «غرّە»ی منداڵی موسوڵمان.

## باسی کەفارەتی کوشتن

هەرکەسێ کەسێك بکوژێ، کەفارەتێك واجبە لەسەری وەك کەفارەتی «ظِهار»، تەنها بەشی خواردنپێدانەکەی نەبێ، خواه بکوژەکە پیاو بێ یا ژن، منداڵ بێ یا گەورە، موسوڵمان بێ یا کافری زیممی، بە دەسەنقەست ئەوکەسە بکوژێ یا بە شیبهە عەمد یا بە خەتا وە خۆی بە دەستی خۆی کوشتبێتی یا بووبێ بەهۆی کوشتنەکە، وەکوو کەسێك کە زۆر بکا لە کەسێك بۆ کوشتنی کەسێکی تر، یا کەسێك کە فەرمان بدا بە ئینسانێکی بێ تەمیز، یا کەسێك بە درۆ شەهادەت بداکەوا کەسێك کەسێکی کوشتووە، یا بیرێك بە ناحەق هەڵبکەنێو کەسێکی تێبکەوێ وە خواه کوژراوەکە ژن بێ یا پیاو، منداڵ بێ لە سکی دایکیا یا منداڵی لەدایك بوو بێ یا گەورەبێ، موسوڵمان بێ یا کافری زیممی، هەتاوەکوو ئەگەرکەسێك بە دەستی خۆی خۆی کوشت، واجبە لە میراتەکەی کەفارەتی ئەو کوشتنە دەربکرێت وە ئەگەر کۆمەڵێك پێکەوە یەکێکیان کوشت، واجبە لەسەر هەریەکێکیان سەربەخۆ کەفارەتێکی تەواو بدا.

کەفارەتی کوشتن، بریتییە لە ئازادکردنی بەندەیەك کە پاك بێ لەو عەیبانەی لە شتی فرۆشتندا بە عەیب ئەژمێررێن؛ ئەگەر بەندە دەسنەکەوت، وەکوو لەم زەمانەدا، بەتایبەتی لە وڵاتی ئێمەدا، یاخود کابرا لات بوو، ئەوە واجبە دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بێ وە لەسەر فەرموودەی بەهێز، ناندان نابێ بە کەفارەت لە کوشتندا؛ بەڵام بۆ ئەم زەمانە کە بەندە دەس ناکەوێو رۆژوو بۆ هەمووکەس دەسنادا، ئیعتیبار کردنی بە نان پێدانی شەست هەژار، زۆر باشە.

## باسی ئیددیعای خوێنو سوێندی خاوەن حەق

بەشەرت گیراوە بۆ بیستنی دەعوا، چەند شەرت؛

[شەرتی] یەکەم، ئیددیعاکراوەکە زانراو بێ، بەم جۆرە ئیددیعاکەرەکە بەیانی ئەو شتانە بکاکە مەبەستی پێ ئەگۆڕێ؛ مەسەلا، لە ئیددیعای خوێندا بەیانی ئەوە بکا ئەو کوشتنە بە دەسەنقەست بووە یا بە شیبهە عەمد بووە یا بە خەتا وەکابرای بکوژ بە تەنها کوشتوویەتی یالەگەڵ هاورێدا وە ئەگەر شوێنەکە شوێنی واجب بوونی دییە بێ، بەیانی ژمارەی هاوبەشەکان بکا، هەرچەند بەم شێوەیە کە بڵێت: ئەزانم لە دە کەس زیاتر نەبوون، ئەوسا ئیددیعاکەی لێ ئەبیسرێ و ئەتوانێ داوای بەشە دییەی خۆی بکا لە «مُدّعی عَلیه»، یەعنی ئەگەر یەك کەس بێ، دەیەك وە ئەگەر دووکەس بن، پێنج یەك داوا بکا.

ئەگەر «مُدَّعِي» بەیانی «مدّعی بِە»یەکەی بە درێژی نەکرد، سوننەتە بۆ قازی داوای تەفسیلی لێ بکا بۆ ئەوەکە ئیددیعاکەی ببیسرێت وە هەندێك، وتوویانە: واجبە لەسەر قازی بێدەنگ بێو داوای تەفسیلی لێنەکا با نەبێ بە ئامۆژگاری بۆ «مدّعي»، بەڵام ئەم واتەیە رەدکراوەتەوە، چونکی ئامۆژگاری ئەوەیە قازی پێی بڵێت بڵێ بە دەسەنقەست کوشتوویەتی یا بە شیبهە عەمد کوشتوویەتی، نەك لێی بپرسێ بەیانی ئەوە بکا چۆنی کوشتووە؛ کەوابێ، سوننەتە قازی پرسیاری لێبکا بە عەمد کوشتوویەتی یا بە شیبهە عەمد؛ جا ئەگەر «مُدَّعِي» یەکێکیانی دەربڕی، داوای بەیانی سیفەتی ئەو یەکەیانی لێ بکا؛ مەسەلا، بپرسێ: عەمدەکە چۆن بوو؟ جا کاتێ کە بەیانی کرد، بپرسێ کەسی لەگەڵدا بوو یا نە؟ وە ئەگەر وتی کەسی لەگەڵا بوو، بپرسێ: چەندکەس بوون؟ بەکورتی، پرسیاری قازی لە بەیانی ئەو سیفەتە کە «مدّعي» بە موتڵەقی وتوویەتی، قەیدی نییە، بەڵام پرسیار لە شەرتێك کە «مدّعي» بەیانی نەکردبێ، دروست نییە.

جیاوازیی قسە هەیە لەوەدا کە ئاخۆ دروستە «مدّعي» لە پارچە کاغەزێکدا سوورەتی دەعواکەی خۆی بنووسێ، جا بڵێت: دەعواکەم ئەمەیە لەم کاغەزەدا

نووسیومە، یا نە؟ وادیارە قەناعەت ئەکرێ بەم نووسراوە، ئەگەر قازی خۆی بیخوێنێتەوە، یاخود یەکێکی تر بیخوێنێتەوە بە سەریا لە کاتێکدا کە «مدّعی علیە» حازربێ، هەروەها لە کاتی دیارنەبوونی «مُدّعیٰ علیە»دا، ئەگەر شوێنەکە لەوانە بێ کە ئیددیعا لەسەر ئینسانی نادیار دروست بێ.

بەڵێ، شەرتی مەعلووم کردنی «مدّعی بە»، ئەغڵەبییەو چەند ماددەیوا هەیە کە ئیددیعای نامەعلوومی تیائەبیسترێ، وەکوو ئەوە یەکێ ئیددیعا بکا لە میراتبەری کەسێك بڵێت: میراتدەر (مُورِّث)ەکەت وەسیەتی بۆکردووم بە بەشێك لە ماڵەکەی، یا ئیددیعا بکا لە یەکێ بڵێت: تۆ ئیقرارت کردووە بۆ من بە شتێ لە ماڵەکەت، هەروەها لە سوورەتێکدا ژن داوای «حەقی موتعە»، یا داوای نەفەقەی مێردەکەی بکات یاخود یەکێك داوای پارەی بژاردنی برینێك بکا کە بژاردنێکی دیاریکراوی نەبێ، یاخود سەربازێك داوای «رَضخ»[1] بکا لە ماڵی تاڵانیدا، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا ئەو داوایە ئەبیسرێ، هەرچەند ئەندازەی ماڵەکە مەعلووم نەکا.

شەرتی دووهەم، ئەوەیە ئیددیعاکەی «مُلزِم»بێ، یەعنی شتەکە واجبو سابت بکا لەسەر کابرای «مدّعیٰ علیە»؛ مەسەلا، ئەگەر ئیددیعای کرد لە یەکێك کە گوایە شتێکی پێبەخشیوە، پێویستە بڵێ: ئەو ماڵەیشی داوەتەدەستم، یا: من وەرمگرتووە، یا ئەگەر ئیددیعای ئەوەی کرد شتێکی پێ فرۆشتووە، ئەبێ بڵێ: واجبە لەسەری ماڵەکە تەسلیم بکا.

شەرتی سێهەم، ئەوەیە کابرای «مدّعی علیە» دیاری بکا؛ کەواتە، ئەگەر لە ئیددیعای کوشتندا لەگەڵ خەڵك، بڵێ: یەکێکیان کوشتوویەتی، یا بڵێت: یا ئەمیانە کوشتوویەتی، یا ئەویانە و داوا بکا لە قازی کە سوێندیان بدا، ئەوە دروست نییە بۆ قازی ئەم داوایە جێبەجێ بکا و دروست نییە سوێندیان بدا تا «مدّعي» کابرای بکوژ دیاری ئەکا، بەپێی فەرموودەی راستتر؛ ئەم یەکنەکەوتنی قسەی زانایانی شەرعە کە

---

[1] ١. رَضخ: بریتییە لە ماڵێك کە ئەوەندەی بەشی تەواو نەبێ، یەعنی کەمتر بێ لە بەشی سەربازێکی جەنگی.

لەم مەسەلەیەدا هەیە، لە ئیدديعای زەوتکردن‌و دزی‌و فەوتاندنی ماڵ‌و غەیری ئەمانەیشدا هەیە لەو شوێنانەداکە ڕێی تێبچێ «مُدّعی علیه» بە تەنها شتەکەی کردبێ یا لەگەڵ خەڵکدا؛ واتە: فەرموودەی ڕاستتر، ئەوەیە ئیدديعا لەسەر شەخسی نەناسراوو دیاری نەکراو نابیسرێ، بەڵام بەپێی فەرموودەکەی‌تر (بەرابەری فەرموودەی ڕاستتر)، ئیدديعاکە ئەبیسرێ، چونکە زەوتکەرو دزو کەسانی‌وا، لەکاتی خەریك بوونداب ئیشەکەی خۆیان، خۆیان پەنا ئەدەن‌و خۆئەشارنەوە؛ کەواتە، دەرخستنی «مدّعی علیه» شتێکی گرانە.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە «مدّعي» لەکاتی ئیدديعاکەیدا تەکلیفی لەسەر بێ‌و حوکمەکانی ئیسلامی لە گەردن گرتبێ؛

**شەرتی پێنجەمیش**، ئەوەیە «مدّعی علیه» لەکاتی ئیدديعاکەیدا تەکلیفی لەسەر بێ‌و حوکمەکانی ئێمەی لەئەستۆ گرتبێ؛ کەواتە، ئیدديعای مناڵ لە مناڵ یا لە گەورە و ئیدديعای گەورە لە مناڵ و ئیدديعای شێت‌و ئیدديعا لە شێت‌و ئیدديعا لە کافرێ کە لە «ذمّه»ی موسوڵماناندا نەبێ، یا کافرێ کە حەربی بێ و ئیدديعای کافری حەربی لە موسوڵمان، نابیسرێت.

وە ئەگەر مناڵ یا شێت حەقێکی لەسەر یەکێ هەبوو، پێویستە وەلی ئەمرەکەی داوای ئەو حەقە بکا، یاخود کەسێ حەقی ماڵێکی لەسەر شێتێ یا مناڵێك هەبوو، ئەبێ داوای ئەو حەقەی لە وەلییەکەی بکا؛ ئەگەر وەلی حازر نەبوو، ئەوە ئیدديعا لەسەر ئەوان وەکوو ئیدديعا لە ئینسانی نادیار وایەو ئەو ئیدديعایە نابیسرێ، مەگەر کابرای «مدّعي» شاهیدی هەبێ‌و خۆیشی سەرەڕای شاهیدەکان، سوێند بخوات لەسەر ئەوە کە موستەحەقی ئەو حەقەیە کە داوای ئەکا.

**شەرتی شەشەم**، ئەوەیە کە لەپێش ئەم ئیدديعایەدا ئیدديعایەکی وای نەکردبێ کە لەگەڵ ئەم ئیدديعایەیدا یەك نەکەوێ؛ کەواتە، ئەگەر ئیدديعای کرد لە "ئەحمەد" کە بەتەنها براکەی کوشتووە لەپاش ئەوە، ئیدديعای کرد لە "مەحموود" کە بە تەنها یا لەگەڵ کەسێکی‌تردا براکەی کوشتووە، ئەوە ئەم ئیدديعا دواییە نابیسرێت، چونکە

ئیددیعای یەکەم، ئەچێ بەگژی ئەم ئیددیعادواییەدا؛ جا ئەگەر ئەم ئیددیعا دووهەمە لەپێش حوکم کردن بە پێویستی ئیددیعای یەکەمدا بێ، ئەوە ماڵ وەرناگرێ، چونکە وەکوو دەعوای دووهەم نابیسرێ، دەعوای یەکەمیش بەتاڵ ئەبێتەوە، چونکە کابرای «مدّعي» خۆی پەشیمان بووەتەوە لەو ئیددیعایە وە ئەگەر لەپاش حوکم بەوەرگرتنی ماڵەکە بێ لە کابرای یەکەم، ئەوە مەیدانی ئەم «مدّعي»یە ئەدرێ بچێتەوە سەر کابرای یەکەم وە ئەگەر هەر وتی حەقم لەسەر کابرای یەکەم نییەو ئیددیعاکەم درۆ بووە، ئەوە هەرچی لێ وەرگرتووە، ئەبێ بیداتەوە.

**بێداربن!** ئەگەر «مدعی علیه»ی دووهەم پێی‌لێنا بەپێی ئەوەی کە لە ئیددیعاکەدا وتراوە، ئەوە دەعواکەی لەسەر ئەبیسرێ‌و حوکم ئەدرێ بەسەریا بەو پێیە لەسەر فەرموودەی راستتر کە لە ئەسڵی «رَوضه»دا وتراوە؛ ئیتر مەجالی «مدّعي» نادرێ پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە سەر کابرای یەکەم ـ وەکوو «علي الشّبراملسي» لە حاشیەی «نهایه»دا فەرموویەتی ـ وە ئەگەر کابرایەك ئیددیعای کوشتنی عەمدی کرد لە کەسێك‌و وەسفی کوشتنەکەی بە سیفەتی «شیبهە عەمد» یا «خَطَأ» کرد، ئەوە ئەسڵی ئیددیعاکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەپێی فەرموودەی ئاشکراتر.

## باسی «قَسامە»

قەسامە، بریتییە لە قەرینەیەکی‌واکە هێز بدا بە راستی «مدّعي» لە ئیددیعاکەیدا؛ ئەم قەسامەیە، تەنها لە مەیدانی «لَوْث»دا دێتەجێ کەواتە: گومان لەسەر بنچینەو ئەساس، یا گومانی بەهێز، بەڵام پێویستە ئەم قەرینەیە بێتەجێ بە شەهادەتی شاهید، یا بە پێ‌لێنانی «مدّعی علیه»، یا بە زانینی قازی بە شتەکە کە خۆی ئاگای لێ‌بووبێ.

قەرینەی «لوث»، وەکوو ئەوە کابرای کوژراو لە گەڕەکێکی بچووکا یا لە دێیەکی بچووکا بێ کە هی گەلێ بێ لە دوژمنانی کابرای کوژراوو کەسی‌تری غەیری ئەو دوژمنانەیان تێکەڵ نەبێ، یا وەکوو ئەوە کۆمەڵێك کۆببنەوە لەسەر کەسێك و پاش ئەوە کە بڵاوەیان کرد، کابرایەك بە کوژراوی لەویادا بەجێ بمێنێ.

وە ئەگەر دوو کۆمەڵ ریزیان بەست بۆ جەنگ کردن وە لەپاش بڵاوە کردنیان، کەسێك بەکوژراوی کەوتبوو، ئەوە ئەگەر ئەم دوو کۆمەڵە تێکەڵی یەکتر بووبوون، ئەوە ئەبێ بە «لَوث» بۆ دوژمنەکان.

هەروەها، ئەگەر شەڕەکەیان بە تفەنگ بێو گوللەی هەر تاقمێك بگات بە تاقمی دوژمن، ئەوە هەر بە «لَوث» ئەژمێررێ بۆ دوژمنەکان، چونکە زاهیر وایە ئەم ریزە لە کۆمەڵی خۆیان ناکوژن وە ئەگەر شەڕەکەیان بە چەکی سارد بوو و ئەو دوو تاقمە تێکەڵی یەکتر نەبوون، ئەوە ئەبێ بە «لوث» بۆ ریزەکەی خۆی.

هەروەها، بە «لوث» ئەژمێررێ مەشهوور بوونی ئەوە کە فلانکەس کابرای کوشتووە، بەڵام قسەی کابرای بریندار یا کابرای کوژراو لەپێش مردنیا کە بڵێ، فلانکەس برینداری کردم، یا: فلانکەس کوشتمی، نابێ بە «لوث»، چونکە ئەم کابرایە بە «مدّعي» موتتەهەمە؛ کەواتە، باوەڕ بە قسەی ناکرێت.

وە ئەبێ بە «لوث» قسەی کەسێك کە بڵێ: من سیحرم کرد لە فلانکەسو نەخۆشم خست، هەروەها دەرکەوتنی کەسێك بە چەکەوە لە نزیکی کابرای کوژراودا، بەو شەرتە لەویادا دڕندەیەك یا شتێکیوا نەبێ ئەم کوشتنەی بدرێتە پاڵ، هەروەها بە «لوث» دائەنرێ شەهادەتی تاقە کەسێکی بەداد لەسەر یەکێك کە بڵێ: ئەو کەسە فلانکەسی کوشتووە، هەروەها شەهادەتی کۆمەڵێ لە ژن یا مناڵ یا کافر کە بڵێن: فلانکەس فلانکەسی کوشت.

ئەگەر کەسێك کوژرا لە حاڵەتێکدا کە گومانێکی بەهێز هەبوو لەسەر کوشندەکە وە کوژراوەکە دوو کوڕی هەبوو یەکێکیان وتی: ئەحمەد کوشتی لەگەڵ کەسێکی نەناسراودا و ئەویان وتی: مەحموود کوشتی لەگەڵ کەسێکی نەناسراودا، ئەوە بەم یەكنەکەوتنی قسەی دوو کوڕە، گومانە بەهێزەکە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ کەواتە، هەرکام لەم دوو کوڕە ئەبێ پەنجا سوێند بخوا لەسەر ئەو کەسە کە دیاریی کردووەو بە کوشندەی داناوە؛ جا لەپاش سوێندەکان، هەرکام چواریەکی دییە ئەسێنن لەو کەسە کە دیارییان کردووە، چونکە لەسەر ئیددیعای هەرکامیان، ئەو کەسە کوشتوویەتی لەگەڵ کابرای

نادیاردا وە لەم سوورەتەدا، نیوە دییە ئەکەوێتە سەری‌و ئەم «مـدّعي»یـەیش نـیوەی ئەوەی ئەکەوێ کە ئەبێ بە چواریەك، چونکە برایەکی تری هەیە.

وە ئەگەر هەردووکیان پەشیمان بوونەوە لە کابرای نادیارو هەر کامیان وتی: بـۆم دەرکەوتووە ئەو کەسە نادیارە ئەو کەسەیە کە براکەم دیاریی کردووە، ئەوە ئـەتوانـن سوێند بخۆن لەسەر نادیارەکە، هـەرکەس لەسـەر نـادیاری خـۆی وە فـەرموودەی هەڵاوێردراوتر، ئەوەیە ئەگەر یەکێ بیست‌و پێنج سوێند بخۆن، بەسە.

ئەگەر یەکێك لە دوو کوڕەکە وتی: بکوژی باوکم، ئەحمەدو مەحموودەو ئەویان وتی تەنها ئەحمەدە، ئەوە هەردووکیان سوێند ئەخۆن لەسەر ئەحمەد، یەکی بیست و پێنج سوێندو نیوە دییەی لێ وەرئەگرن، ئیتر حەقی قەسامەیان لەسەر مەحموود نییە؛ بەڵێ، ئەو کەسەکە مەحموودی دیاری کردووە، ئەتوانێ سوێندی بداکە ئەوی تیا نییە، هەروەکوو دووهەم ئەتوانێ کە ئەحمەد سوێند بداکە مەحموودی لەگەڵا بووە، ئەگینا پێویستە دییەی تەواو بدا.

ئەگەر لە شوێنی «لوث»دا، دوو کوڕی کوژراوەکـە قسـەیان جـیا بـوو؛ مـەسەلا، یەکێکیان وتی: ئەحمەد باوکمی کوشتووەو ئەو یەکەکەیان وتـی نـەخەیر ئـەحمەد نەیکوشتووە، ئەوە ئەو «لوث»ە بەتاڵ ئەبێتەوە.

ئەگەر «مدّعي» ئینکاری «لوث»ی کرد لە حەقی خۆیدا و وتی: بە قەتعی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا نەبووم کە فڵانیان کوشتووە بە توهمەت، یا من لەو کۆمەڵەدا نەبووم کـە بـە دەوری کوژراوەکەدا بوون، یاخود: لەکاتی کوشتنی ئەو کەسەدا من لەم وڵاتەدا نەبووم، یا: ئەو کەسە کە بە شیری رووتەوە بینراوە من لەنزیکیا نەبووم، ئەوە مادام بە شاهید ئیسپاتی خیلافی ئەو قسەیە نەکرێت، سوێند ئەدرێ لەسەر قسەکەی خۆی‌و باوەڕی پێ ئەکرێت.

ئەگەر «لوث» بۆ ئەسڵی کوشتنەکە هەبوو وە بۆ سیفەتی «عَمد»و «خَطأ» نەبوو، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە قەسامەی تیا نایەتەجێ؛ هەروەها، قەسامە نییە لە بـڕیـنی ئەندامدا و لە فەوتاندنی ماڵدا.

قەسامە، زیاتر ئەوەیە کە «مدّعي» پەنجا سوێند بخوات لەسەر ئەوە کە کابرای «مدّعى عليه» ئەو کەسەی بە عەمد یا بە «شبه عَمد» کوشتووە، یا بە هەڵە کوشتوویەتی و لە هەموو سوێندێکا قسەکەی تەواو بکا؛ مەسەلا، بڵێت: «وەڵڵاهـ، فلانکەس ئەحمەدی برامی بە دەسەنقەست کوشتووە»، ئیتر شەرت نییە ئەم سوێندانە لە سەریەك بن؛ کەواتە، ئەگەر لەپاش دە سوێند نەخۆش کەوت یا لە هۆشی خۆی چوو، ئەوە لەپاش چاك بوونەوە ئەتوانێ چل سوێندی تر بخوات؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو قازییەکە سوێندە پێشووەکانی لا خواردووە عەزلکراو قازییەکی تری لە جێ دانرا، پێویستە لەسەرەوە پەنجا سوێندەکە بخوات؛ هەروەها، ئەگەر لە پاش دە سوێندەکە مرد، واجبە لەسەر میراتبەرەکەی لە سەرەوە پەنجا سوێندەکە بخوات وە ئەگەر میرات بەری کوژراوەکە زۆر بوون، ئەم پەنجا سوێندە بەش ئەکرێ لەنێوانیانا بەپێی نیسبەتی میراتەکەیان؛ کەواتە، لە سوورەتی دوو کوڕو کچێکدا، واجبە هەر کوڕێ بیست سوێندو کچەکە دە سوێند بخوات وە ئەگەر کەسر کەوتە ژمارەی سوێندەکان، ئەو کەسرە ئەکرێ بە فەردێکی ساغ؛ کەواتە، ئەگەر میراتبەر کوڕێك و دوو کچ بوو، کوڕەکە بیست و پێنج سوێندو کچەکان یەکی دوانزە سوێندو نیویان بۆ ئەمێنێ و ئەبێ یەکی سیازدە سوێن بخۆن؛ بەڵێ، ئەگەر میراتبەر ژنێك و «بیتُ المال» بوو، ئەوە لەم سوورەتانەدا سوێندەکان لەسەر نیسبەتی میرات نییە، بەڵکوو واجبە ژنەکە هەر پەنجا سوێندەکە بخوا و لە ئەنجامیشدا هەر چواریەکی دییەکەی ئەدرێتێ و ئەویتری ئەدرێ بە «بیتُ المال».

ئەگەر یەکێ لە دوو میراتبەر نکوولی کرد لە سوێندخواردن، واجبە ئەویانە کە نکوولی نەکردووە پەنجا سوێندەکە بخوا، ئەوسا بەشە دییەکەی خۆی وەرئەگرێ.

ئەگەر هەندێ لە میراتبەرەکان منداڵ بوون، یا دیار نەبوون، ئەوە ئەویانە کە باڵغە، یا حازرە، پێویستە خۆی رابگرێ تا منداڵەکە باڵغ ئەبێ، یا نادیارەکە دێتەوە، ئەوسا هەریەکێ بەشە سوێندی خۆی بخوات و دییەکە وەربگرێ، یاخود هەر لەپێش ئەوەدا کە منداڵەکە باڵغ ئەبێ، یا نادیارەکە دێتەوە، ئەم میراتبەر پەنجا سوێند بخواو بەشە دییەی خۆی وەربگرێ، ئەوسا کە منداڵەکە باڵغ بوو، یاخود نادیارەکە هاتەوە، بەشە

سوێندی خۆی ئەخوا لەسەر تەقدیری دابەش کردنو بەشە دیەکەی خۆی وەرئەگرێ و بەهۆی چاوەڕێ کردنی باڵغ بوونی مناڵەکە، یا هاتنەوەی نادیارەکەوە، ئەم میراتبەرە باڵغە حازرە ئەگەر سوێند نەخوات، حەقی ئەکەوێ، چونکی عوزری هەیە.

بزانن! ئەساسی زۆریی سوێند لە قەسامەدا، بەگران گرتنی مەسئەلەی قەتڵە و هۆی ئەوەکە ئەم سوێندە پەنجایە ئەوەیە ماڵ کەگەیشت بە بیست دینار، سوێندی تیا قورس ئەکرێت و ئەندازەی دیە ـکە هەزار دینارە ـ بەمپێیە پێویستی بە پەنجا سوێندە.

هەر لە سەر ئەم ئەساسەیە ئەگەر «مدّعي»ی کوشتنی بێ«لوث»، شاهیدی نەبوو، یا تاقە شاهیدێکی هەبوو، پێویستە «مدّعی علیه» پەنجا سوێند بخوات وە ئەگەر ئەمیش سوێندی رەد کردەوە بۆ سەر «مدّعي»، واجبە ئەو پەنجا سوێند بخوات هەروەها، ئەگەر لە مەیدانی «لوث»دا «مدّعي» سوێندی نەخواردو دای بەسەر «مدّعی علیه»دا، پێویستە «مدّعی علیه» پەنجا سوێند بخوات و لەپاش ئەوە کە «مدّعي» لە مەیدانی «لَوث»دا پەنجا سوێندی خوارد، ئەگەر کوشتنەکە شیبهە عەمد بوو، یا هەڵە بوو، دیە واجب ئەبێ لەسەر بکوژەکە و واجبە کەس و کارەکانی بیدەن وە ئەگەر «عەمد» بوو، واجبە لە سەر بکوژەکە خۆی بیدات؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم پەنجا سوێندە سوێندێ بوون کە «مدّعی علیه» لە کوشتنی دەسەنقەستی بێ«لوث»دا، رەدی کردبووەوە بۆسەر «مدّعي»، ئەوە ئەبێ بەهۆی واجب بوونی قیساس لەسەر بکوژەکە.

ئەگەر کەسێك لە مەقامی «لوث»دا ئیددیعای لە سێ کەس کرد و ئەم کەسانە یەکەیەکە بەرودوا حازربوون، ئەوە ئەم «مدّعي»یە واجبە پەنجا سوێند بخوات لەسەر یەکەم، ئەوجا سێ یەکە دیەکەی ئەکەوێتە سەر ئەو حازرە؛ جا ئەگەر لەم پەنجا سوێندەدا ناوی ئەو دوو کەسەی تریشی بردبوو، ئەوە بەو سوێندانە قەناعەت ئەکرێ و ئەبن بەهۆی واجب بوونی بەشە دیە لەسەر ئەوانیش وە ئەگەر ناوی نەبردن، ئەوە واجبە بۆ هەرکام لەوانیش پەنجا سوێند بخوات.

ئەگەر کەسێك باوکی کوژرا لە شوێنی «لوث»دا، جا خۆی لە ئایین هەڵگەڕایەوە ـ پەنا بەخوا! ـ ئەوە هەتا موسوڵمان نەبێتەوە سوێند نادرێ؛ بەڵێ، ئەگەر خۆی لەکاتی

هەڵگەڕانەوەکەیدا سوێندەکانی خوارد و لەپاشاندا موسوڵمان بووەوە، متمانە بەو سوێنانە ئەکرێ وە ئەگەر هەر لەسەر حاڵی کوفر مایەوە، قیمەت بۆ سوێندەکانی نامێنێ.

وە هەرکەسێ میراتبەری نەبێ، قەسامە لە کوشتنیا نییە؛ بەڵێ، پێشەوای موسوڵمانان ئەبێ «مدّعي»ی بۆ دابنێو کابرای «مُتَّهَم» بگرێو حەپسی بکا، تا پێ‌لێ ئەنێو حوکمی بەسەردا ئەدرێ، یا هەتا پەنجا سوێند ئەخواتو رزگار ئەکرێ.

## باسی ئەو جینایەتانە کە ئەبن بەهۆی «قِصاص» یا «دِیە»

هەر جینایەتێ کە ببێ بەهۆی «قصاص»، چ کوشتن، چ بڕینی ئەندام، چ لابردنی هێز، سابت ئەبێ بە چەند شت؛ یەکەم، ئیقرار کردنی جینایەتکەرەکە لەگەڵ بالغیو عاقڵیدا؛ دووهەم، شەهادەتی دوو پیاوی بەداد؛ سێهەم، زانینی قازی لەشوێنێکا کە دروست بێ حوکم بکا بە ئاگاداریو زانینی خۆی، بەم رەنگە کە «مُجتَهِد» بێ؛ چوارەم، سوێندی «مدّعي» لەکاتێکا کە «مدّعی علیە» نکوولی بکا لە سوێند خواردن.

هەر جینایەتێکیش کە ببێ بەهۆی دیە، سابت ئەبێ بەو چوار شتە کە باسمان کردن وە بە شەهادەتی پیاوێك و دوو ژنی بەدادیش وە بە شەهادەتی یەك پیاوی بەدادیش لەگەڵ سوێندی «مدّعي»یەکەدا.

ئەگەر کەسێك کەسێکی جینایەتکەری عەفوکرد لە «قصاص» بۆ ئەوە بە شەهادەتی پیاوێكو دوو ژن ماڵ لەسەری ئیسپات بکا، ئەوە قەبووڵ ناکرێ، لەبەرئەوە تا قیساسەکە سابت نەبێ، کابرا نابێ دەست بەردار ببێ لێی و لەم سوورەتەدا هێشتا قیساسەکە سابت نەبووە.

ئەگەر پیاوێكو دوو ژن شەهادەتیان دا بە «هاشِمە»یەکیوا کە لەپێشیەوە ئێسکی سەری دەرخستبێ، ئەوە بژاردنی ئەو «هاشمە»یە واجب نابێ، چونکە لەم سوورەتەدا «هاشمە»کەو ئێسك دەرخستنەکە بە یەك جینایەت هاتوونەتەجێ و ئێسك دەرخستن، قیساسی تیا نییە وە هەر جینایەتێك کە ببێ بەهۆی قیساس، شەهادەتی تەواوی ئەوێ کە شەهادەتی دوو پیاوە.

بزانن! لەکاتی شەهادەتدا واجبە شاهید بە ئاشکرا باسی ئەو شتە بکا کە کـابرای «مدّعي» ئیدديعای ئەکا، بەمڕەنگە نیسبەتی فەوتاندنەکە بدا بـۆلای ئـیشی کـابرای «متّهم»؛ کەواتە، ئەگەر بڵێت: شەهادەت ئەدەم فلانکەس بـە شـمشێر دای لە فـلانو بریندارىکرد و مرد، ئەوە مەبەستەکەی پێ سابت نابێ، بەڵکوو ئەبێ بڵێت: «بەو برینە مرد» یا: «کوشتی»، یا «لە شوێنی خۆیا مرد». هەروەها، کافییە بڵێت: شەهادەت ئەدەم فلان فلانی کوشت. ئەگەر وتی: شەهادەت ئەدەم دای لەسەریو خوێناویی کرد، یا: خوێنی لێهێنا، ئـەوە بـرینی «دامـیە»ی پـێ سـابت ئـەبێ وە لە شـەهادەت لەسـەر دەرخستنی ئێسکدا، بڵێت: لێیداو ئێسقانیسەری دەرخست. هەروەها واجبە بـەیان کردنی شوێنو ئەندازەی برینە ئێسك دەرخەرەکە بۆ ئەوە کە قابیل بێ قـیساسی لێ وەربگیرێ. لەم بەیاناتەوە دەرکەوت هەرشتێ هۆیەکەی نادیاری بێ، بە شاهید سابت نابێو پێویستە جینایەتکەرەکە خۆی پێی لێبنێ.

ئەگەر کەسێك شەهادەتی دا لەسەر برینداركردنی باوکی یا برای یاکەسێکیتری کە میراتی لێ وەربگرێ وە شەهادەتەکەی لەپێش خۆش بوونەوەی برینەکەیدا بوو، ئەوە قەبووڵ ناکرێت، چونکە ئەو شاهیدە توهمەتی قازانج دەسکەوتنی پـێ ئـەبری بـۆ خوێ، لە بەرئەوە کە لەوانەیە بریندارەکە بمرێ وە ئەگەر شەهادەتەکەی لەپاش خۆش بوونەوەی برینەکەی بوو، قەبووڵ ئەکرێ، وەکوو شەهادەت بە ماڵ بۆ ئەو خزمەی، لە نەخۆشی مردندا.

قەبووڵ ناکرێ شەهادەتی کەسوکار لەسەر فاسقی ئەو شـاهیدانـە کـە ئـیسپاتی کوشتنیان کردووە لەسەر خزمەکەیان، لەبەرئەوە کە ئەیانەوێ کوشتنەکە ئیسپات نەبێ بۆ ئەوەکە دییەکەی نەدەن، ئەمەیش ئەبێ بەهۆی ئەوەکە «مُتهم» بکرێن بەوەکە زیان لە خۆیان لائەدەن.

ئەگەر دووکەس شەهادەتیان دا لەسەر دووکەس بەوەکە فلانکەسیان کوشت و ئەم دوو کەسەیش شەهادەتیان دا لەسەر ئەو دوو کەسە کە ئەوان فلانکەسیان کـوشتووە، ئەوە تەماشا ئەکەین، ئەگەر خوێنگری کوژراوەکە باوەڕی بە دووکەسی پێشوو هەبوو،

ئەوە حوکم بە شەهادەتەکەی ئەوان ئەدرێ وە ئەگەر باوەڕی بە دوو کەسە دواییەکە هەبوو، یاخود باوەڕی بە هەموویان هەبوو، یاخود باوەڕی بە هیچیان نەبوو، ئەوە شەهادەتی هەردوولایان بەتاڵو بێسوودە وە ئەگەر هەندێ لە میراتگرەکان ئیقراریان کرد بەوەکە هەندێ لە میراتگرەکان کابرایان لە قیساس عەفو کردەوە، ئەوە قیساس نامێنێ وە ئەگەر دوو شاهید قسەیان جیاواز بوو لەبارەی کات، یا شوێن، یا ئالەت، یا شێوەی کوشتنی کابرای کوژراوەوە، ئەوە قیساس سابت نابێ، بەڵام بەهۆی ئەم شەهادەتەوە گومانێکی بەهێز پەیدا ئەبێ لەو کەسەکە موتتەهەمە بە کوشتنی ئەو کابرا.

## باسی هەڵمەت هێنانو بەرگری کردن

ئەگەر موسوڵمانێك یا کافرێکی زیممی یا منالێك یا شێتێك یا درندەیەك یا حەیوانێکی تر هەڵمەتی هێنا بۆ سەر شتێ کە پاراستنی پێویست بێ، وەکوو گیان یا ئەندامێکی لەش یا مەنفەعەتی یەکێکیان، یا ناموس یا ماڵ یا شتێ کە هی کەسێك بێ، وەك زبڵو سەگی پاس، ئەوە دروستە بۆ ئینسان بەرگری بکات لەو هەڵمەتهێنەرە، بەڵام تا ئەم بەرگرییە بە شێوەیەکی سووكو بێزیان قابیل بێ، دروست نییە بە شێوەیەکی گرانو زیانبەخش بێ؛ مەسەلا، ئەگەر بە پاڕانەوە یا هاوار بردن بۆ کەسێك یا بە راکردن یا بە هەڕەشە چاری بکا، دروست نییە لێی بدا. وە ئەگەر بە لێدان بە دەست چاری بکا، دروست نییە بە شووڵ لێیبدا وە ئەگەر بە شووڵ چاری بکا، دروست نییە بە کوتەك لێیبدا وە ئەگەر بە کوتەك چاری ئەکرد، نابێ تێغ بەکاربهێنێ وە ئەگەر بە بڕینی پارچەیەك لە لەشی، یا بە شکاندنی شوێنێکی چاری ئەکرد، دروست نییە بیکوژێ؛ بەڵێ، لەکاتێکا کە دوژمن لە هەردوولاوە تێك بڕژێن، تەماشا کردنی ئەم تەرتیبە پێویست نییەو بە هەموو جۆرێ بەربەرەکانێ دروستە. وە ئەگەر کابرای بەربەرەکانێ کەر پاش چاودێری کردنی تەرتیبەکە ناچار بوو هەڵمەتبەرەکە بکوژێو کوشتی، ئەوە زامن نابێ، نەبۆ قیساس و نە بۆ خوێن (دییە)و نە بۆ قیمەت.

وە ئەگەر دارێکی لێداو ئەویش رای کردو ئەمیش کەوتە شوێنیو کوتەکێکی تری لێداو مرد، ئەوە ئەم کابرایە ئەبێ نیوە دییەی کابرا بدا، چونکە مردنەکەی بە دووشت

بووه، یەکێکی زامنیکراو و یەکێکی زامنی نەکراو. ئەگەر کەسێ بە چەکەوە رووی لە کەسێك کردو ئەم کەسە باوەڕی وابوو بە نیازی کوشتن بۆی هاتووه، ئەوه بۆی دروسته بەرگریی لێ بکا بە هەرجۆرێ کە بۆی ڕێبکەوێ، هەرچەند ئەو کابرایشە دەستنەوەشێنێ لەم وه شەرت نییە ئەم باوەڕە بگا بە پایەی یەقین، بەڵکوو گومان (ظَن) کافییە؛ کەوابوو، ئەگەر دوو کەس هەڵمەتیان برد بۆ یەکترو هەر یەکێکیان گومانیان وابوو کە ئەویان بە نیازی خراپە هەڵمەتی هێناوه، ئەوه لەم حاڵەتەدا بۆ هەردووکیان دروسته بەرگری لە یەکتر بکەن، جا ئەگەر هەردووکیان فەوتان، یا هەر یەکێکیان فەوتا، ئەوه زەمانەتی ناکرێ، مەگەر ئەم یەکە لەپاش دەست بەردار بوونی ئەویان هەڵمەت بداو بیکوژێت، ئەوه لەم کاتەدا دییەی ئەکەوێتە سەر کەسوکاری بکوژەکە؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێ کەسێکی کوشتو لەدواییدا ئیددیعای ئەوەی کرد کە لە مەیدانی بەرگریدا کوشتوویەتی، ئەوه لێی قەبووڵ ناکرێ، مادام ئیسپاتی ئیددیعاکەی خۆی نەکا، وەکوو لە «انوار» و «تُحفه»دا بەیانکراوه.

ئەگەر هەڵمەتبەرەکە بە تووڵ یا بە دار چاری ئەکرا، بەڵام کابرای هەڵمەتبۆبراو لە شمشێرو خەنجەرو شتیوا بەولاوه هیچی لانەبوو، ئەوه بۆی دروستە بەمشتانە بەربەرەکانێ بکا لە خوێ، چونکە لەمانە بەملاوه هیچی لانییە وه ئەگەر یەکێك لەوانەبوو ئەیزانی بە شمشێر بەرگری بکا لە خۆیو کابرای هەڵمەتهێنەریش بریندار نەکا، کەچی برینداری کرد، ئەوه زامن ئەبێ وه ئەگەر نەیئەزانی بە بێ بریندار کردن بەرگری پێ بکا، ئەوه زامن نابێ.

ئەگەر کەسێك بە دارەوه چوو بۆ کەسێكو ئەویش بە شمشێر یا بە خەنجەرەوه بەریگرت، ئەوه زامن نابێ، بەو شەوتە مەیدانی راکردن یا پەنابردنی نەبێ، ئەگینا واجبە لەسەری رابکا یا پەنا بیا بۆ ئەو شوێنە بۆ ئەوە کە کابرا بریندار نەکا یا نەیکوژێ وه ئەگەر هەر بە ئارەزوو واز لەمانە بێنێو بە شیر بدا لە کابرا، ئەوه زامن ئەبێ؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای هەڵمەتهێنەر کافری جەنگکەر یاخود پاشگەز بووەوه بێ، ئەوه دروست نییە رابکاو واجبە لەسەری بەربەرەکانێ بکا، هەرچەند بیانکوژێ، چونکە ئەمانە خوێنیان هەدەرە.

وە ئەگەر حەیوانێك یا ئادەمیزادێك گازی گرت لە دەستی، ئەوە خۆی رزگار بکا بە شتێ کە سووك بێ، وەکوو بڵاوکردنەوەی شەویلەکانی یا مشتەکوڵ دان لە لا لەغاوەکانی؛ ئەگەر ئەمانەی بۆ نەکراو دەستی بە زۆر دەرکێشایەدەرەوەو بە هۆی ئەوەوە دانی گازگرەکە شکا، ئەوە ئەم کابرای گاز لێ گیراوە زامن نابێ وە ئەگەر گۆزەیەك لە بەرزەوە داکەوت بەسەر یەکێکداو چاری نەبوو مەگەر بە شکاندنی و شکاندی، ئەوە زامن ئەبێ، چونکە ئەو گۆزەیە خاوەنخواستو ئارەزوو نییە لە داکەوتنیا؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەنەکەی لە شوێنێکیوادا دایناوبوو کە دابکەوێ، ئەوە ئەم کابرایە زامن نابێ.

جا ئەگەر ئەو شتەکە دەفعی هەڵمەتهێنەری لێ ئەکا ماڵ بوو و ماڵەکەیش گیانلەبەر نەبوو، ئەوە ئەگەر ماڵی خۆی بوو واجب نییە بەرگری لێ بکاو ئەتوانێ وازی لێبێنێو گوێی نەداتێ، مەگەر حەقی کەسێکی تری پێوە بەسرابێ؛ مەسەلا، وەکوو ئەوە کە لە رەهندا بێ وە ئەگەر ماڵی کەسێکی تر بێ، واجبە بەرگریی لێ بکا بەئەندازەی توانای خۆی، بەتایبەتی ئەگەر لەلای خۆیدا بێ بە سوورەتی ئەمانەت، یا ویسایەت، یا چاودێری، وەکوو ماڵی هەتیوو ماڵی وەقف.

وە ئەگەر ماڵەکە گیانلەبەر بوو، ئەوە واجبە بەرگریی هەڵمەتهێنەرەکەی لێ بکا، چ ماڵی خۆی بێو چ ماڵی کەسێکی تر بێو خاوەنەکەی هەڵمەتی بۆ هێنابێ، وەکوو ئەوە کە یەکێك بیەوێ سەری گاجووتی خۆی بە بەرد بشکێنێ، هەتاوەکوو ئەگەر سەگێك پەلاماری برد بۆ سەگێك، واجبە دەفعی سەگە هەڵمەتهێنەرەکە بکرێ، بەڵام شەرتی بەرگری کردن لە ماڵ ئەوەیە کابرا ئەمین بێ لە گیانی خۆی، هەروەها ئەمین بێ لە مەینەتی لەش، وە لە فەوتانی ماڵ یا ئابڕووچوونو بێحورمەت بوون و لە بەرپا بوونی فیتنە و ئەمین بێ لە حوکمڕانی ستەمکار کە ئارەزووی لە فەوتاندنی ماڵێ خەڵك بێ.

وە ئەگەر شتەکە گیان بێ، واجبە بەرگری لێ بکا، بەو شەرتە ترسی ببێ لە گیانی خۆی یاخود لە بڕینی ئەندامیکی لەشی یا فەوتانی قازانجی ئەندامێکی گیانی، ئەگینا بەرگری لێ کردن واجب نییە؛ هەروەها، ئەگەر کابرای هەڵمەتبەر هەڵمەتی بۆ سەر گیانی خۆت هێنا، ئەوە بەرگری واجب نییە، بەڵکوو دروستە خۆت بدەیتە دستی قەزاو قەدەر، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە هیوای پایەی شەهیدبوونت هەبێ.

وە ئەگەر شتە هەڵمەت بۆ براوەکە نامووس بوو، خواه کابرا دەس بۆ نامووس بەرێ یاخود خەریکی سەرەتای دەس بۆ نامووس بردن بێ، وەکوو ئەوە کە باوەش بکا بە ژنێکدا، یا ماچی بکا، یاخود بیەوێ سواری وڵاخەکەی ببێ، ئەوە واجبە دەفعی هەڵمەتبەرەکەی لێ بکرێ، بەو شەرتە ئەوکەسە ئەمین بێ لە گیانو ئەندامو قازانجی ئەندامی خۆی و لە فەوتانی ماڵێك کە بەش بە حاڵی کابرا قیمەتێکی زۆری هەبێ بەڵێ، ئەگەرکەسێ دەسی برد بۆ ناموسی خۆی، ئەوە واجبە لەسەری تا پێی ئەکرێ بەرگریی لێ بکاو خۆی نەدا بەدەستەوە، هەرچەند ترسی فەوتانی گیانیشی هەبێ.

بزانن! واجبە لەسەر حوکمڕانو خاوەندەست، دەفعی هەڵمەتهێنەر بکەن لە گیانو ماڵو نامووسی ئەو کەسانە کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئەواندان، بەپێی تواناو دەسەڵات.

## باسی روانین بۆ خێزانی خەڵك

ئەگەرکەسێ لە ماڵێکیوادا بێ کە حەقی دانیشتنی تێدا هەبێ، خواه بە موڵکییەتی یا بە کرێ گرتن یا بە خواستنو شتیوا وە کەسێك لەسەر منارەوە یا لەسەر بانەوە یا لە پەنجەرەوە یا لە تاقێکی بچووکی عادەتییەوە تەماشای ژنو مناڵی ئەم کەسە بکا بە دەسەنقەست و هیچ شوبهەیەکی نەبێ لە حەڵاڵی ئەو تەماشاکردنەداو ئەم خاوەن خانووەش شتێکی سووکی بۆ فڕێ دا، یاخود شتێکی قورسی بۆ فڕێداو غەیری ئەو شتە قورسە لەویادا بەردەس نەکەوتو چاوی تەماشاکەرەکەی کوێر کرد، یاخود بریینداری کرد و بەهۆی برینەکەوە مرد، ئەوە ئەوکەسە خوێنی هەدەرەو نە «قصاص»و نە دییەی نییە، هەرچەند قابیل بێ بە قسە مەنعی بکا؛ بەڵێ،گوناهی ئەگاکوتوپڕ بەر لە ترساندنو هەڕەشە لێ کردن دەستی لێ بووەشێنێ.

وە ئەگەر ئەو کابرا شوبهەیەکی هەبوو لەو روانینەدا، وەکوو ئەوە کە کەلوپەلی لەویادا هەبێ، یاخود ژنی یاکەنیزەکی یا مەحرەمێکی لەوماڵەدا بێ، ئەوە دروست نییە خاوەن ماڵەکە بەردی بۆ بخاو دەستی لێ بووەشێنێ، ئەگینا زامن ئەبێ؛ هەروا، ئەگەر

خاوەن ماڵەکە خۆی دەرگاکەی کردبووەوە، یاخود تاقو دەلاقەکە زیاد لە عادەت گەورە بوون، یاخود تەماشاکردنی کابرا بە دەسەنقەست نەبوو، ئەوە لەمسوورەتانەدا لەپێش ترساندنا، دروست نییە بەردی بۆ بخا، ئەگینا زامن ئەبێ، هەروەها ئەگەر ئەو کەسە کە ئەڕوانێ، مەحرەم بێ بۆ ئەهلی خانووەکە، وەکوو مامیان یا براو برازایان.

**بزانن!** لەوسوورەتانەدا کە دروستە بەردی بۆ بخا، ئەبێ هەر بۆ چاوی بهاوێ؛ جا ئەگەر دای لە چاویو کوێری کرد، یا دای لە نزیکی چاویو بە سیرایەت مرد، ئەوە خوێنی هەدەرە وە ئەگەر بۆ شوێنێکیتری خست، ئەوە زامن ئەبێ.

## باسی ئەو شتانەکە لە تەمێ کردنەوە روو ئەدەن

ئەگەر وەلی ئەمری منداڵ یا مامۆستا، ئامۆژگاریو تەمێی مناڵێکی کرد، یا حوکمڕانی شەرع سەرزەنشتو تەمێی کەسێکی کرد، یا مێرد تەمێی ژنەکەی کرد و ئەو تەمێ کراوە لەوەوە تووشی زیانێك بوو لەگیانیا یا لە ئەندامیا یا لە قازانجێکیا، ئەوە ئەم کەسانەکە تەمێکەیان کردووە زامن ئەبن، چونکە ئەم جۆرە تەمێیە هەرچەند دروستە، بەڵام ئەبێ بەجۆرێ بێ کە ئەنجامی سەلامەت بێ وە ئەگەر زیانی گەیاند، ئەوە دیارە بە جۆرێك بووە لای داوە لە ئەندازەی شەرعی.

وە ئەگەر حوکمڕانی شەرع «حَدّ»ی دا لە کەسێك کە زینا، یا دزی کردبوو، یا بوختانی بە دەمی یەکێکەوە کردبوو، یا شەرابی خواردبووەوە و ئەو کەسە بەهۆی حەد لێدانەوە مرد، ئەوە حوکمڕانی شەرع زامن نابێ وە ئەگەر زیاتر لەو ژمارەیە کە شەرع دایناوە داری لێدا، ئەوە زامنی بەشی زیادەکەی دەبێ؛ کەواتە، ئەگەر بۆ شەراب خواردنەوە پەنجا داری لێدابوو زامنی پێنج یەکی دییەکەی ئەبێ وە لە فەرموودەیەکدا زامنی نیوەی دییەکەی ئەبێ، یەکێکی زەمانەتکراو و یەکێکی زەمانەت نەکراو؛ ئەم دوو فەرموودەیە، رەوان دەرحەق بە حوکمڕانێکیش کە هەشتاو یەك دار بدا لە کەسێ کە بوختانی بۆ یەکێك کردبێو ئەو کەسە بەو دارانە بمرێ.

## باسی هەندێ دەسکاری کردن لە منالْدا وە لە لەشی ئینسان خۆیدا

ڕەوایە بۆ ئینسانی بالْغی عاقلْی ئازاد «لوو»یەك كە لە لەشی خۆیدا بێ ببڕێ، مەگەر لە شوێنێکی مەترسیدارا بێ‌و مانەوەشی هیچ زیانی نەبێ، یاخود مەترسی لە بڕینەکەیدا زۆرتر بێ؛ هەروەها، دروستە بۆ باوكو باپیرە بڕینی لوو لە لەشی منداڵ و شێتدا، بەو شەرتە کە مانەوەی لووەکە مەترسی هەبێ و بڕینی زیانی نەبێ، یاخود مانەوەو بڕینی هەردووکیان خەتەریان هەبێ، بەلْام خەتەر لە هێشتنەوەیدا زۆرتر بێ؛ بەلْام غەیری باوكو باپیرە، وەکوو حوکمڕانی شەرعو وەسی منالْو کەسێك کە دادگا کردبێتی بە سەرپەرشتیکەری، ئەوە حەقی ئەم جۆرە کردەوانەیان نییە تەنها لەکاتێکدا نەبێ کە مانەوەی لووەکە مەترسی هەبێ بۆ منالْەکەو بڕینەکەی هیچ مەترسییەکی نەبێ، ئەوە لەوکاتەدا بۆیان دروستە.

دروستە بۆ وەلیئەمری منالْو شێت خوێن گرتنو کەلْەشاخ گرتن لێیان و دەرمان پێدانیان بەهۆی دوکتۆرەوە، بەو شەرتە دوکتۆرەکە ناسراوو دیاری بێ‌و زانا بێ؛ جا ئەگەر وا ڕێکەوت بەهۆی ئەم جۆرە کردەوەوە منالْەکە یا شێتەکە مردن، ئەوەکەس زامن نابێ.

هەروەها دروستە کونکردنی نەرمەی گوێچکەی کچ بو ئەوە کە گوارەی تێ‌بکرێ، بەلْام لە کون کردنی گوێچکەی کوڕدا قسەی زانایانی شەرع یەك نییە؛ فەرموودەی «رٰاجِح» لای زانایانی پەیرەوی شافیعی، ئەوەیە کە دروست نییە، بەلْام هەموو قسەیان یەکە لەوەدا کە کونکردنی لووت حەرامە، چ بۆ کوڕو چ بۆ کچ و گوێ بەوە نادرێ کە لووت سمین لەناو ژنانا بووە بە باو.

ئەگەر دەسەلْاتداری وڵات تەسەڕوفێکی نارەوای کرد لە منالْ یا لە شێتداو ئەو منالْو شێتە بەهۆی ئەوەوە مردن، ئەوە ئەبێ بە زامنو دییەیەکی قورسی ئەکەوێتە سەر لە مالْی خۆی وە هەر زیانێ کە پەیدا ببێ لە خەتاو هەلْەی ئیمام لە لێدانی «حدّ»دا و لە جێ‌بەجێ کردنی حوکمی شەرعدا، ئەوە ئەکەوێتە سەرکەس‌وکاری، لە فەرموودەیەکیشدا

ئەکەوێتە سەر «بیتُ المال» وە ئەگەر کەس‌وکار بژاردیان، بۆیان نییە بچنەوە سەر ئەو کەسانەکە بوون بەهۆی هەڵەکردنی ئیمام، وەکوو دوو شاهیدکە لەئەنجامدا دەربکەوێ فاسقن، چونکە ئیمام خۆی کەمتەرخەمی کردووە لەپێشا لە حاڵی ئەم شاهیدانە نەکۆڵیوەتەوە.

وە ئەگەر ئیمامی موسوڵمانان، لەگەڵ ئەوەشدا کە بزانێ بە فاسقی شاهیدەکان، بە دەسەنقەست، «حەد» بدا لە کەسێك و ئەو کەسە بمرێ، یا قیساسی سەند لە کەسێك کە تومەتی قەتڵی لەسەر بوو، ئەوە قیساسی ئەو کەسە لەسەر ئیمامەو لە قیساسدا ئەکوژرێتەوە؛ بەڵێ، لە سوورەتێکدا بە هەڵە باوەڕ بکا بەو شاهیدانەو خۆی بە عادڵیان بزانێ، ئەوە دییە ئەکەوێتە سەر کەس‌و کاری ئیمام و لە فەرموودەیەکدا ئەکەوێتە سەر «بیتُ المال»، وەکوو ئێستە لە ئوسووڵە پێشووەکەوە دەرکەوت.

ئەگەر سەربڕ بە فەرمانی پادشا دای لە یەکێ یا کوشتی، ئەوە ئەگەر ئەم سەربڕە پادشا بە عادڵ بزانێ‌و فاسقی‌و زوڵم‌و زۆری پادشا دیاری نەبێ، ئەوە لەم سوورەتەدا وەکوو ئەوە وایە کە پادشا خۆی کابرای کوشتبێ یا لێی‌دابێ‌و هیچ لەسەر سەربڕەکە نییە وە ئەگەر پادشاه بە زۆر ئەم ئیشەی پێ کردبێ، ئەوە هەردووکیان ئەکوژرێنەوە وە ئەگەر بە بێ زۆری پادشا، بەڵکوو هەر بە قسەی رووتی کابرا بکوژێ، ئەوە قیساس تەنها لەسەر سەربڕەکەیە.

## باسی زیانگەیاندنی حەیوان

ئەگەر کەسێك لەگەڵ حەیوانێك یا چەند حەیوانێکدا بێ، ئەوە ئەو کەسە ئەبێ بە زامنی هەر زیانێ لەو حەیوانانەوە پەیدا ببێ، چونکە هەر کردەوەیەك لەو حەیوانانە رووبدا، وەکوو کردەوەی ئەوکەسە خۆی تەماشا ئەکرێ، خواه ئەو حەیوانانە بەسرابن بە یەکەوە یا نە و زیانەکەیان لە گیاندا بێ یا لە ئەندامی لەشدا یا لە ماڵدا وە ئەو کەسە کە لەگەڵیانایە خاوەنیان بێ یا حەیوانەکانی بە کرێ گرتبێ، یا بە خواستن خواستبنی، یا بە زۆر داگیری کردبن، یاخود شوان یا گاوان یا پاسەوانیان بێ، یا لێخوڕیان بێ یا جڵەو

راکێشیان بێ یا سواریان بێ؛ بەڵێ، ئەگەر حەیوانەکە لە زۆری ئینسان دەرچـووبێ، وەکوو هەنگ، ئەوە هەر زیانێ بدا هەدەرە، هەروەها باڵدار، وەکوو بازو هەڵۆ، مەگەر فێر کرابێ و کابرای فێرکەر بەری دابێ بۆ سەر حەیوانــێ، ئـەوە لەم کـاتەدا زامـن ئـەبێ؛ هەروەها، ئەگەر شوانێك لەگەڵ راندا بوو، بەڵام بە بێ کەمتەرخەمی ئەو شوانە؛ مەسەلا، لەبەر هێرشی باو باران یا دز یا جەردە یا گەلەگورگ، ئەو حەیوانانە تار بوون و زیانیان گەیاند، ئەوە شوانەکە زامن نابێ، هەروەکوو ئەگەر لەمکاتەدا حەیوانێك فەوتاو بێ سەرو شوێن رۆیشت، کابرای شوان نابێ بە زامنی ئەو حەیوانە، چونکە پاراستنی لە توانای ئادەمیزاد بەدەرە.

وە ئەگەر دووکەس لەگەڵ ئەو حەیوانانەدا بوون کـە زیـانیان داوە لەشـتێ، ئـەوە هەردووکیان زامن ئەبن، خواه ئەو دوو کەسە پاسەوان بن یا لێخوڕ یا جڵەوکێش یـا سوار بن، بەو شەرتە هەردوو سوارەکە عەلاقەیان هەبێ بە لێخوڕین و رۆیشتنی ئـەو وڵاخەوە وە ئەگەر تەنها یەکێکیان عەلاقەدار بێ لەوەدا، وەکوو ئەو کە ئەوەی پاشەوە منداڵی بێ لە پاشکوێ سوارەکەدا، یاخود ئەوی پێشەوە منداڵ بێ یا نەخۆش بێ، ئەوە هەر ئەو یەکە زامنە.

ئەگەر تاقەکەسێك سواری وڵاخێك بوو وە وڵاخەکە زیانێکی دا، ئەوە سوارەکە زامنە، هەرچەند ژن بێ یاخود کوێر بێ و لەغاوی وڵاخەکەیش بەدەستیەوە نەبێ؛ بەڵێ، «علي الشّبراملسي» لە حاشیەی «نِهایە»دا پێچـەوانـەی ئـەم حـوکمە دەفـەرموێ لە مەسەلەی کوێردا و ئەڵێت: مادام لەغاوی وڵاخەکە بە دەست کوێرەکەوە نەبێ، ئەوە زامن نابێ، بەڵکوو لەغاودارەکە زامنە؛ وادیارە ئەگەر لە سوورەتێکیشا کە ژن سوار بێ، ئەگەر ژنەکە پەچەی دادابێ و لەغاوی وڵاخەکەی بەدەستی کەسێکەوە بێ، ئەو کەسە زامن ئەبێ نەك ژنەکە، چونکە ئەو پەیوەندی نییە لە رۆیشتنی وڵاخەکەدا.

وە ئەگەر ئەو وڵاخەکە کەسێك سواری بووە لەغاوی نەبوو و یەکێك لەپاشەوە لێی ئەخوڕی، ئەوە نەقیزەوەشینەکە زامن ئەبێ؛ هەروەها، ئەگـەر کـەسێك بـەرەوڕووی وڵاخەکە هات و دایە بەر بەردو وڵاخەکە گەڕایەدواوە و لەو گەڕانەوەیەیدا زیانێکـی

گەیاند، ئەوە ئەو کەسە ئەبێ بە زامن نەك سواری وڵاخەکە یا ئەو کەسە کەوا لەگەڵیا؛ هەروەها، ئەگەر کابرای سوار سوارێکی عادەتی بوو و لەغاوی وڵاخەکەیش قایم بوو، بەڵام ولاخەکە کەللەڕەق بوو وکابرای سوار دەرەقەتی نەئەهات وکەوتە غارو زیانێکی گەیاند، ئەوە کابرا نابێ بە زامن، مەگەر بزانێ کە وڵاخەکەی پێ راگیر نـاکـرێو بـە بێموبالاتی سواری بووبێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو کەسە کە سواربووە کەسێ بێ بە بێ ئیزنی خاوەن وڵاخەکە سوار بووبێو وڵاغەکە زاڵ بێ بەسەریاو غار بداو زیان بگەیەنێ، ئەو سوارە زامن ئەبێ، چونکە سواربوونەکەی بە ناحەقو خیلافی شەرعە.

وە ئەگەر کەسێ سواری ماینێ بووکە نۆمایەکی لەگەڵدا بێ، یا سواری کەرێ بووکە جاشێکی بەدواوە بوو، ئەوە ئەو کابرایە هەروەکوو زامنی زیانی وڵاخەکـانە، زامـنی زیانی بەچکەکانیشە.

هەر وڵاخێ کە سەرکێش بێو بە لەغاو راگیر نەکرێ، دروست نییە خاوەنەکەیشی لە بازاڕو شوێنی قەرەباڵغدا سواری ببێ، ئەگینا هەر زیانێ بدا، سوارەکەی زامن ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر وڵاخەکەی لەقەی ئەدا یا هەڵی ئەخستەوەو جووتەی ئەوەشاند یـا گازی ئەگرت، دروست نییە خاوەنەکەی سواری ببێو بەناو قەرەباڵغدا بـیگێڕێ وە ئەگەر سواریی پێ کرد، ئەبێ بە زامنی زیانی.

وە ئەگەر کەسێك غاری کرد بە وڵاخ لە شوێنێکا کە شوێنی غـار نـەبێ، یـاخود لەشوێنێکا کە قوڕو لیتەی تێدابێ، ئەوە لەم سوورەتەدا هەر زیانێك پەیدا ببێ، کابرای سوار زامنە؛ هەروەها، ئەگەر چەند حوشترێکی لێخوڕی لە بازاڕا یا لە مەیدانێکـی قەرەباڵغدا بە بێئەوە کە ریزیان بکاو بیانبەستێ بە یەکـەوە، ئـەوە لەو حـاڵەدا هـەر زیانێکیان دا، کابرای لێخوڕ زامنە.

ئەگەر حەیوان لەکاتی بەرەڵڵا بووندا زیانی گەیاند بەگیانێك یا بە ئەندامی کەسێك یا بەکشتو کاڵێك، ئەوە ئەگەر خاوەن حەیوانەکە کەمتەرخەمی کردبێ، زامن ئەبێ. جا لەم شوێنەدا روون کردنەوەیەك پێویستە بەتایبەتی بۆ مەسەلەی زیانگەیاندن بەکشتو کاڵ؛ مەسەلا، ئەگەر دەوروپشتی شوێنەکە کشتوکاڵی زۆری تیابوو و لەوەڕگاکە لەناو

کێڵگەکە یا لەنزیکیا بوو، ئەوە عادەتێك کە شەرع پێی رازی بێ ئەوەیە نە بە شەو و نە بە رۆژ ئەو حەیوانانە کە زیان ئەگەیەنن بەرەڵڵا نەکرێن وە ئەگەر بەرەڵڵاکرانو زیانیان گەیاند، ئەوە ئەگەر کەسیان لەگەڵدا بوو، ئەوکەسە زامنە وە ئەگەر کەسیان لەگەڵدا نەبوو، ئەوە خاوەن حەیوانەکان زامنن، مەگەر حەیوانەکە زۆر توند بەسرابێتەوەو هەر بە زۆر خۆی بەرەڵڵا کردبێ، ئەوە لەم سوورەتەدا خاوەنەکەی زامن نابێ؛ هەروەها، ئەگەر راکردنی وڵاخەکە بەکەمتەرخەمی خاوەنەکەی بوو وگەیشت بەکێڵگەکە، بەڵام خاوەن کێڵگەکە لای کێڵگەکەی بوو و وڵاخەکەی دەرنەکرد تا زیانی گەیاند، ئەوە خاوەن وڵاخ زامن نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەنکێڵگەکە دەرەقەتی وڵاخەکە نەهاتو چاری پێ نەکرا، ئەوە خاوەن وڵاخەکە زامن ئەبێ. ئەوەش بزانین کە هەر وڵاخێك وا بەهێزو بەدخوو بێ، واجبە لەسەر خاوەنەکەی کارێکیوا بکا ئەو وڵاخە دەرنەچێو بەر نەبێ، ئەگینا هەر زیانێ بدا، بە شەو یا بە رۆژ، ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر ئەو وڵاتە وابوو کە لەوەڕگەیان دوور بوو لەکشتوکاڵیانو بە رۆژدا حەیوانیان بەرەڵڵا ئەکرد بۆ ئەو لەوەڕگایەو بە شەو ئەیانبەستەوە یا ئەیانکردە ناو پەچە یا ناو خانوو، ئەوە هەر زیانێ بە رۆژا بیدەن، زەمانەتی نییە و هەر زیانێ بە شەو بیدەن، ئەبێ خاوەنحەیوانەکە زەمانەتی بکاو بیبژێرێ.

وە ئەگەر عادەتی وڵات بەپێچەوانەی ئەم سوورەتە بوو؛ مەسەلا، بە رۆژدا ئیشیان ئەکرد بە حەیوانەکانیانو بە شەو بەرەڵڵایان ئەکردن، ئەوە هەر زیانێ بە رۆژا بیدەن، زەمانەتی هەیە و هەر زیانێ بە شەو بیدەن، زەمانەتی ناکرێ.

وە ئەگەر بە رۆژو بە شەو حەیوانیان بەرەڵڵا بوو، چونکە کشتوکاڵو باخو بێستانیان دیواری بەدەوردا کرابوو و دەرگایان لێداخرابوو، ئەوە هەر زیانێ بدەن زەمانەتی نییە، چ بە شەوو چ بە رۆژ، چونکە ئەگەر دەرگا دابخرێت، حەیوان ناڕواتە ناوی وە ئەگەر دانەخرێت، بەکەمتەرخەمی خاوەن کێڵگەکە دائەنرێ، مەگەر وڵاخەکان دیواری کێڵگەکە بڕووخێنن یان بیشکێننو بڕۆنە ناو کێڵگەکەو زیان بگەیەنن بە کشتوکاڵەکە، ئەوە لەم کاتەدا زامن ئەبێ.

ئەگەر خاوەن کشتوکاڵ حەیوانەکەی لە کێڵگەکەی خۆی دەرکردو کردیە کێڵگەکەیەکی ترەوە، ئەوە ئەم کابرا ئەبێ بە زامنی ئەو زیانە کە ئەیگەیەنێ وە ئەگەر دەوری کێڵگەی کابرا هەموو کێڵگەی خەڵك بوو، ئەوە واجبە لەسەری خۆی رابگرێو مەیدانی ئەو حەیوانە بدا لە کێڵگەکەی خۆیدا بلەوەڕێو لەپاشا هەرچی زیانێکی پێ گەیشتووە، بیبژێرێ بە خاوەنی ئەو حەیوانە وە ئەگەر دەوری کێڵگەکەی چۆڵ بوو، ئەتوانێ دووری بخاتەوە، بەڵام ئەوەندە دووری نەخاتەوە کە گورگ بیخوات یا تووشی زیان ببێ، ئەگینا زامنی ئەبێ.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی تووشی بوو کە وێڵ ئەبوو بە شوێنی کێڵگەداو زیانی ئەگەیاند، واجبە لەسەری ئاگای لێبێو بیبەستێتەوە بۆ ئەوە کە زیان نەگەیەنێ بە خەڵك؛ جا ئەگەر نەیبەستەوەو وڵاخەکەی دەرچوو زیانی دا، یاخود بە رەشمەیەکی درێژی وا بەستیەوەو دەمی بگا بە کشتوکاڵی خەڵك، یاخود باش نیبەستەوەو ئەویش خۆی بەرەڵڵاکردو زیانی دا، ئەوە ئەوکەسە وڵاخەکەی لایە زامن ئەبێ؛ بەڵێ، ئەگەر بە رەشۆی ئەستوور بەستیەوە، کەچی دەرچوو زیانی گەیاند، ئەوە زامن نابێ. ئەگەر وڵاخەکەی جووتەی ئەوەشاند، یا گازی ئەگرت، یا لەقەی ئەدا، یا قۆچی ئەدا لە خەڵك، ئەوە واجبە لەسەر خاوەنەکەی یا ئەوکەسە کە حەیوانەکەی لەدەستایە ئاگاداریی بکاو لە جێگەیەکدا نەیبەستێتەوە کە زیان بگەیەنێ؛ جا ئەگەر لە چۆڵێکدا بەستیەوە یا لە موڵکی خۆیدا یا لە موڵکی خەڵکداو بە ئیزنی خاوەنەکەی بوو وە زیانیدا لە شتێك، ئەوە هەدەرەو نابێ بە زامن وە ئەگەر لە سەرەرێگایەکی تەنگدا بەستیەوە، یا لەسەر رێگایەکی گوشادا، بە بێ ئیزنی ئیمام یا جێگری ئیمام وە زیانیدا، ئەوە زامن ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر لە ماڵی خۆیدا بەستیەوەو یەکێکی بانگ کردبوو وە خەبەری نەدابوویە کە حەیوانێکی وای لەماڵدایە، ئەوە زامن ئەبێ.

ئەگەر کەسێك سەگێکی لاگیری بەدخووی راگرتبوو، یا پشیلەیەکی زیانەخۆری هەبوو کە مریشكو هێلکەی ئەخوارد یا زیانی ئەدا، یا سەگێکیوای هەبوو، واجبە لەسەری بە شەوو بە رۆژ بیانبەستێتەوە بۆ ئەوە کە زیان نەدەن، ئەگینا هەر زیانێ بە هەر شتێ بگەیەنن، خاوەنەکەیان زامن ئەبێ؛ بەڵێ، ئەگەر سەگەکەی لە لادەرگا یا لە دەشتا

بەستەوەو یەکێ بە ئارەزووی خۆی ڕۆیشت بۆلای و سەگەکە گازی لێ گرت، ئەوە کابرای خاوەن سەگ زامن نابێ؛ هەروەها، ئەگەر بە بێ بانگ کردنی خاوەن ماڵ بڕواتە ژوورەوەو سەگەکە لەوێ گازی لێ بگرێ، هەر زامن نابێ. هەر حەیوانێ کە حاڵی دیاری بێ و بزانرێ کە زیان ئەگەیەنێ، دروستە بکوژرێ، بەڵکوو ئەگەر زیانی زۆر بێ، کوشتنی واجبە بۆ ئەوە کە خەڵك لە زیانیان بپارێزرێن.

وە ئەگەر پشیلەیەك یا سەگێك لای کەسێك بوو وە زیانی مەعلووم نەبوو، کەچی بە ڕێکەوت زیانی گەیاند، ئەوە لە یەکەمجاردا خاوەنەکەی زامن نابێ. ئەگەر کەسێك بارێدار بنێ لە وڵاخێك و ئەو وڵاخە خۆی توندبکا لە دیوارێ یا لە شتێکی ترو زیانی پێ بگەیەنێ، ئەوە ئەو کەسە کە وڵاخەکەی بەلاوەیە زامن ئەبێ، هەروەها ئەگەر بەبارە دارەوە ڕۆیشت بە بازاڕدا یا بە ڕێگەیەکی قەرەباڵغدا وە ئەگەر ڕێگەکە یا بازارەکە قەرەباڵغ نەبوو، ئەوە زامنی زیان نابێ، مەگەر ئەو کەسە کە تووشی زیان ئەبێ منداڵێکی بێ تەمیز بێ یا کوێر بێ، هەروەها ئەگەر پشتی لە وڵاخەکە بێ و کابرای خاوەن وڵاخ خەبەرداری نەکا.

**بزانن!** شەرتی زەمانەت ئەوەیە کابرای خاوەن ماڵ کەمتەرخەمی نەبێ؛ ئەگەر کابرا ماڵەکەی خۆی لە سەرەڕێگەو بەرپێدا دانا، یاخود گوێی نەدایە، ئەوە خاوەن وڵاخەکە زامن نابێ وە بە دەستووری گشتی، لە هەر شوێنێکا زەمانەت هاتەجێ، ئەگەر زەمانەتی گیان بوو وە کابرای خاوەن حەیوان بە دەسەنقەست نەیکردبوو، وەکوو ئەوە کە درندەیەك بخا بەسەر کەسێکدا، ئەوە دییە لەسەر کەس و کاری واجب ئەبێ وە ئەگەر ماڵ واجب بوو، ئەوە لەسەر خۆیەتی.

## باسی پێشەوایەتی موسوڵمانان

فەرزی کیفایەیە لەسەر هەموو موسوڵمانان پێشەوایەك دابنێن بۆ خۆیان کە فەرمانڕەوای گشتی بێ بۆ ئەوە ئایینی ئیسلامیان بۆ ڕاگیر بکاو برەو بدا بە حوکمی قورئان و حەدیسی پیرۆزو فەرمانەکانی ئایینی ئیسلام بەسەر هەموو کەسدا جێ بەجێ بکا و هەرچی پێویست بێ بۆ مانەوەو بەرز بوونەوەی ئایینی ئیسلام بیکا، وەك

پاراستنی سنووری وڵاتی ئیسلام لە کافرانو خزمەت کردنی زانستو پیشەسازیو ئابووریو ئاوەدانیو ئاوەدانکردنەوەی هەر شوێنێ بە ئەندازەی پێویستو راگرتنی لەشکرو پاراستنی ئاسایشو هێمنیو دادگەریو نەهێشتنی ناکۆکیو ئاژاوە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵداو دانەوەی مافی هەرکەسێ بەدەستی خۆیو وەرگرتنەوەی مافی زۆرلێ کراوان لە زۆرداران و کردنی هەرچی باش بێ بۆ موسوڵمانان بەپێی رۆژ.

شەرتی پێشەوای موسوڵمانان، ئەوەیە موسوڵمانو تەکلیف لێ کراوو ئازاو نێرینەو قورەیشی نەسەبو «مُجتهِد» بێ لە دیندا و دادپەروەرو دڵقایمو بەغیرەتو هۆشیارو چالاك بێ لە بەڕێوەبردنی پێویستییەکانی گشتیدا و خاوەن زمانو چاوو گوێو لەش ساغ بێ.

جا ئەگەر گەورەیەکیوا کرا بە پێشەوای موسوڵمانان کە ئەم مەرجانەی تیابوو و پاش ماوەیەك فیسقی بەسەرا هات، بەو فاسق بوونە عەزل نابێت و ئەگەر باری دنیا وا گۆڕا کە کەسێکیوا دەس نەکەوت بێ بە پێشەوای موسوڵمانان، بەڵکوو هەندێ لەم مەرجانە فەوتا، ئەوە هەرکەس بەنیسبەتی وەخت باشتر بوو، ئەوە ئەبێ بە پێشەوای موسوڵمانان.

وە ئەگەر هاتو گیرۆدە بووین بە سەرۆکایەتی پێشەوایەکی فاسق، ئەوە فەرمانی جێبەجێ ئەکەین لە هەر شتێکا کە بەئاشکرا پێچەوانەی نەسسی ئایینی ئیسلام نەبێ و بەقەدەر توانا تێئەکۆشین بۆ ئەوەی کاروباری موسوڵمانان بە رێگەی راستدا بڕواو مەیدانی ئەوە نادەین هەراو ئاژاوە لەناو موسوڵماناندا پەیدا ببێ.

پێشەوایی بەهۆی چەند شتێکەوە پەیدا ئەبێ:

یەکەم: ئەوەیە کە کاربەدەستانی وڵاتی ئیسلام، دەس بخەنە دەسی یەکێ لەوانە کە ئەو مەرجانەیان تیا دێتەجێو بیکەن بە پێشەوای موسوڵمانان؛ مەبەست لە کاربەدەستانی وڵاتی ئیسلام، کەسانێکە کە موسوڵمان بنو تەکلیفیان لەسەر بێو ئازادو لەرێ لانەدەروو خاوەن پیاوەتی بن؛ جا ئەگەر کۆمەڵێکیوا یا دووکەس لە شوێنێکدا کە لەوەندە زیاتری تیا نەبێ، دەسیان خستە دەستی کەسێ کە مەرجەکانی تیا بێ، ئەوە ئەبێ بە پێشەوای موسوڵمانانو فەرمانداری کردنی واجب ئەبێ لەسەر هەموو موسوڵمانێ، خوا لەو

وڵاتەدا یا لە وڵاتانی تری ئیسلامدا؛ ئیتر ڕێکەوتنی هەموو کاربەدەستانی وڵاتانی ئیسلام پێویست نییە، چونکە ئەگەر مەرجیوا دابنێین، ئەوە دانانی پێشەوا بۆ موسوڵمانان وەکوو مەحاڵی لێ دێ.

ئەگەر لە یەك کاتدا لە یەك وڵاتدا یا لە دوو وڵاتدا دەس خرایە دەسی دوو کەس کە هەموو مەرجەکانیان تیابێ، ئەوە هیچیان نابن بە پێشەوای موسوڵمانانو پێویستە کاربەدەستانی موسوڵمانان یەکێکیان دیاری بکەن وە ئەگەر بەرودوا دەسیان خستە دەسیان، ئەوە دەس خستنە دەستی پێشووەکەیان دائەمەزرێو هی دواییەکەیان بەتاڵو بێ قیمەتە.

دووەم: ئەوەیە پێشەوایەك کە بە شەرعی پێشەوایەتییەکەی دامەزرابێ، هەر لە ژیانی خۆیدا یەکێك بکا بە پێشەوا، بەڵام ئیشکردنی ببەستێ بە پاش مردنی خۆیەوە، یاخود وەسیەت بکا بۆی کە لەپاش مردنی خۆی بیکەن بە پێشەواو کابرایش لەپاش مردنی پێشەوا قەبووڵی بکاو خەڵك دەسبخەنە ناو دەستیەوە وە ئەگەر پێشەوایەك حەقی پێشەوایەتی کرد بە راوێژو تەگبیر لەناو چەند کەسێکدا، ئەوەیش دروستە، بەڵام واجبە لەسەر ئەو کەسانە یەکێ لە خۆیان دیاری بکەن بۆ پێشەوایی.

سێهەم: ئەوەیە کەسێ کە هەموو مەرجەکانی تیابێ، لەپاش مردنی پێشەوای راستی، بەهێز پایەی پێشەوایی داگیر بکا؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك کە مەرجەکانی پێشەوایی تیا نەبوو، بەهێزی خۆیو دەستو پێوەندی پایەی پێشەوایی داگیر کرد، ئەوە ئەبێ بە پێشەواو پێویستە لەسەر خەڵك کە فەرمان بەرداریی بکەن بۆ ئەوەی ئیشو کاری موسوڵمانان جێبەجێ بکرێ.

## باسی ئەوانەی کە یاخی دەبن لە پێشەوای موسوڵمانان

مەبەس لە یاخیبوو، کۆمەڵە موسوڵمانێکە گەورەیەکی فەرمانڕەوایان هەبێ [و] بەهێزو توانای خۆیان لێی یاخی ببنو فەرمانی جێبەجێ نەکەنو بیانوویەك بدۆزنەوە بۆ ئەم دەرچوونەیان لە فەرمانی ئەو گەورەیە؛ ئەمانە، شایەتیو فەرمانی قازیو نووسراوی قازییان پەسەند ئەکرێ، بە شەرتێ کە خوێنی موسوڵمانان بە حەڵاڵ نەزانن.

ئەگەر ئەم کۆمەڵە «حدّ»یان دا لە کەسێك، یا زەکاتیان وەرگرت لە موسوڵمانان، یا سەرانەیان سەند لە کافری زیممی، یا خەراجیان وەرگرت لەوانەی کە زەوی‌وزاری «بیت المال»یان بەدەستەوەیە وە بەشی سەربازی نانخۆر (مُرْتِزقه)یان دابەش کرد بەسەر سەربازەکانی لەشکری خۆیاندا، ئەوە دروستە.

هەرشتێ کە یاخی‌بوو بیفەوتێنێ لە ماڵی کەسانی لە رێگا لانەداوو شوێن کەوتوانی پێشەوای موسوڵمانان، یا ئەمان بیفەوتێنن لە ماڵی ئەوان، ئەگەر لە کاتی جەنگ‌و هەرادا بێ، کەس نابێ بە زامنی، ئەگینا هەردوولا ئەبن بە زامنی ماڵی یەکتر؛ بەڵام هەر فەوتاندنێ کە لە غەیری ئەم یاخی‌بوانەوە بێ؛ مەسەلا، وەکوو کۆمەڵەیەك کە بە بێ مەعنا بۆدۆزینەوەو بیانوویەك لە فەرمانی پێشەوای ئیسلام دەرچووبن، ئەوە ئەو کەسانەی کە فەوتاندوویانە زامنی ئەبن، خواه لە سەردەمی جەنگدا بێ یا نە.

دروست نییە بۆ پێشەوای موسوڵمانان بچێ بەگژی یاخی‌بواندا تا کەسێکی ئەمین‌و هۆشیارو زیرەك ئەنێرێ بۆ لایان‌و لێیان ئەپرسێ کە لە چی عاجز بوون‌و بۆچی لە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان دەرچوون؛ جا ئەگەر ئیددیعای ئەوەیان کرد کە زۆریان لێ کراوە، یاخود شوبهەیەکیان هەبوو، بۆیان چار ئەکا. وە ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر بێ گوێیی، ئامۆژگارییان ئەکا بەڵکوو پەشیمان ببنەوە وە ئەگەر گوێیان نەدایە، ئاگاداریان بکا کەوا سوپا دێتە سەریان‌و لەگەڵیان ئەجەنگێ وە ئەگەر داوای مۆڵەتیان کرد، ئەتوانێ بەگوێرەی مەسڵەحەت رەفتاریان لەگەڵ بکا، واتە یا مۆڵەتیان بدا یا شەڕیان لەگەڵدا بکا وە کاتێ کەوتە شەڕەوە لەگەڵیانا، دروست نییە کوشتنی هەرکەسێ لەوان کە دیل بکرێ یا بریندارێکی پەك‌کەوتوو بێ یا پشتی هەڵکردبێ بۆ ئەوەی لە ریزی شەڕکەران دەرچێ، بەڵام دروستیش نییە دیلەکانیان بەرەڵڵا بکا ـ هەرچەند ژن یا مناڵ بن ـ تا شەڕەکە دوایی دێت، مەگەر ئەو دیلەی کە بەئارەزووی خۆی لە حاڵی خۆی پەشیمان ببێتەوەو فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان بگرێتە گەردن وە کاتێ کە شەڕ تەواو بوو و بڵاوەیان لێ کردو پێشەوا ئەمین بوو لە خەتەری شەڕکەرەکان، هەر چەك‌و کەل‌وپەل‌و وڵاخێکیان گیرابێ، پێویستە بیانداتەوە؛ دروستیش نییە چەکیان بەکار بێنێ لە شەڕدا، مەگەر لەبەر ناچاری.

دروست نییە لەکاتی شەڕدا بە ئاگرو تۆپو شتێ کە زیانی زۆر بێ شەڕیان لەگەڵ بکا، مەگەر ناچار بێ لەبەرئەوە کە ئەوانیش ئەو شتانە بەکاربێنن، یاخود زۆر بەهێزو بەسام بن، یا دەورەی سوپای پێشەوای موسوڵمانان بدەنو بیانگرنە ناوخۆیان.

دروست نییە بۆ پێشەوای موسوڵمانان کۆمەك وەربگرێ لەکافران بۆ سەریان وە لەو کەسانە کە لەوباوەڕەدان کوشتنی ئەم کۆمەڵە دروستە لەکاتی پشت هەڵکردنا. ئەگەر ئەوان یارمەتییان لە کافران وەرگرتو ئەمانیان پێ‌دان، ئەوە ئەو ئەمانپێدانـە بـەسەر ئەواندا دائەمەزرێو نیسبەت بە ئێمە قیمەتی نییە وە ئەگەر کافری زیمی یـارمەتی ئەوانی‌دا لەسەر ئێمە، ئەوە ئەو پەیمانەی کە هەیانە لەگەڵ ئێمە هەڵئەوەشێتەوە، مەگەر بە زۆر هێنرابن یاخود بڵێن: وامانزانیوە ئەم یارمەتییە دروستە، یاخود: بە باوەڕی ئێمە ئەم یاخییانە لەسەر حەقن؛ جا لەم سوورەتەدا وەکوو یاخی (بُغاة) شەڕیان لەگەڵدا ئەکرێ.

## باسی پاشگەز بوونەوە (رِدّة)

«رِدّة» یا پاشگەز بوونەوە، بریتییە لەوە کە موسوڵمانێك بەردەوامی موسوڵمانەتی خۆی ببڕێ یا بە نیاز یا بە گوفتار یا بەکردار، واتە یا بە دڵ نیازی کافربوونی خۆی بکا، یا بە زمان قسەیێکی کوفر بڵێت، یاخود بەکردەوە ئیشێکی‌وا بکاکە کوفر بێ، خواه ئەم قسەو کردەوەیە بە گاڵتە بێ، یاخود لەسەر کەللەڕەقیو رقەبەری بـێ لەگـەڵ ئـایینی ئیسلامدا، یا هەر لەبەرئەوە کە ئەو کەسە خۆی بیروباوەڕی وابێ، هەروەها نیازەکەی لەبەر کەللەڕەقی بێ، واتە بزانێ کە ئیسلامەتی حەقە، بەڵام لەبەر کەللەڕەقی دڵی خۆی لەو باوەڕە لابدا، یا هەر لەڕاستیدا باوەڕی وابێ.

کەوابوو، ئەگەر کەسێك بە دڵ یا بە زوبان وتی: کەسێك نییە کە ئەم دنیایەی دروست کردبێو بڕیاری‌داکە ئەم دنیایە لەخۆیەوە دروست بووە، یاخود ئینکاری پێغەمبەرایەتی کرد، واتە بە زوبان وتی: خوداکەسی نەکردووە بە پێغەمبەری خۆی بۆسەر ئادەمیزاد، یا بە دڵ باوەڕی وابوو، یاخود ئینکاری پێغەمبەرایەتی یەکێ لەو پێغەمبەرانەی کرد کە

پێغەمبەرایەتییان دیاری‌و ئاشکرایە، یاخود وتی: رۆژی قیامەت نییە یا ئادەمیزاد پاش مردن زیندوو نابێتەوە، یا وتی: بەهەشت‌و دۆزەخ نین، یا هەر شتێکی‌وا کە بە ئیجماعی زانایانی شەرع حەرام بێ ئەو بە حەڵاڵی زانی وەکوو کوشتن بە ناحەق‌و زینا، یا شتێکی‌وا کە بە ئیجماعی زانایانی شەرع حەڵاڵ بێ ئەو بە حەرامی زانی، وەکوو کڕین‌و فرۆشتن‌و ژنهێنان‌و تەڵاق‌دان، یاخود ئینکاری واجبی شتێکی‌وای کرد کە بە ئیجماعی زانایانی شەرع واجب بێ وەکوو یەکێك لە پێنج فەرزەی نوێژ، یاخود شتێ کە بە ئیجماعی زانایانی شەرع واجب نەبێ، وەکوو سوننەتی پێش‌نوێژی نیوەڕۆ بە واجبی بزانێ، بەو شەرتە کابرا لەوانە نەبێ کە ئەم جۆرەشتانە نەزانێ، یاخود نیازی ئەوە بکا کە سبەینێ کردەوەیەکی کوفر بکا، یا بکەوێتە دوودڵییەوە لەوەدا کە سبەینێ کوفر بکا یا نەیکا، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا ئەو کابرا کافر ئەبێ.

هەروەها ئەگەر کردەوەیەك بکا کە بەئاشکرا گاڵتە کردن بێ بە ئایینی ئیسلام، وەکوو ئەوە کە قورئانی پیرۆز بخاتە ناو زبڵەوە یاخود سوجدە ببا بۆ بت یا بۆ رۆژ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو سوجدەیە لەبەر بەگەورە گرتنی شتەکە نەبوو، ئەوە حوکم بەکافر بوونی ئەو کەسە ناکرێ لە بەینی خۆی‌و خوادا، بەڵام بە زاهیری شەرع حوکم بە کافربوونی ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر جلێك بکاتە بەر یاخود نیشانەیەك پیشان بدا کە هی میللەتێکی تایبەتی بێ لە کافران، وەکوو «زُنّار» یا «صَليب»، ئەمانەیش ئەبن بەهۆی حوکم کردن بە کافر بوونی ئەو کەسە.

**بزانن!** پێویستە بۆ کارکردنی پاشگەز بوونەوە ئەو کەسە باڵغ‌و عاقڵ‌و خاوەن ئیختیار بێ؛ کەوابێ، ئیعتیبار نییە بە پاشگەز بوونەوەی مناڵ‌و شێت‌و کەسێ کە بە زۆر قسەی کوفری پێ‌بکەن یا کردەوەیەکی‌وای پێ‌بکەن کە کوفر بێ، مادام لە دڵدا باوەڕی بە ئایینی ئیسلام دامەزراو بێ، بەڵێ، پاشگەز بوونەوەی ئینسانی سەرخۆش بە پاشگەز بوونەوە دائەنرێ، ئەگەر کابرا بە ناحەق خۆی سەرخۆش کردبێ.

مەعنای واجب‌و سوننەت‌و حەرام‌و حەڵاڵی ئیجماعی، ئەوەیە هەمووکەس بیزانێ، ئەگینا ئینکار کردنی حوکمێك کە تەنها زانایانی شەرع بیزانن بە کوفر دانانرێ،

وەکوو ئینکاری ئەوە کە کچی کوڕ شەش یەکی میرات ئەبا لەگەڵ تاقە کچێکی مردووەکەدا، یاخود وەك ئینکاری حەرامی مارەبڕینی ئافرەتێکی بەشوودراو کە لە «عدّە»ی کەسێکی تردا بێ؛ هەروەها، پێویستە ئەو قسەی کوفرە تەئویلێکی راستی وەهای نەبێ کە لە کوفر دەری بکا، ئەگینا حوکم بە کافر بوونی خاوەن قسەکە نادرێ، وەکوو لە «تُحفە»دا ئەفەرموێت.

هەروەها شێخی «ابنُ حَجَر» لە توحفەدا ئەفەرموێت: پێویستە موفتی تا لەتوانایدا بێ پارێز بکا لە بەکافردانانی ئەو کەسانەدا کە نیسبەتی گوفتارو کرداری پاشگەز بوونەوەیان لێ ئەدرێ، چونکە بە کافردانانی موسوڵمان زۆر خەتەری هەیەو پێشەوایانی شافیعی مەزهەب لە تازەو کۆنەیان، لەسەر ئەم باوەڕەن‌و لەم رووەوە پارێزیان کردووە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە ئاگاداریی ئەم فەرموودەیە بکرێ.

پاشگەز بوونەوەی کەسێك ئیسپات ئەبێ بە پێ‌لێنانی خۆی وە بە شەهادەتی دوو شاهیدی عادڵ وە شەهادەت وەرئەگیرێ لەسەر پاشگەز بوونەوە بە بێ‌لێکدانەوەو درێژە پێدان، بەڵام لە فەرموودەیەکدا پێویستە لەسەر شاهیدەکە بەدرێژی باسی بکا کە هۆی پاشگەز بوونەوەی کابرا چییەو چی وای وتووە یا چی وای کردووە کە پێی پاشگەز ببێتەوە؛ جا لەسەر فەرموودەی یەکەم، ئەگەر دوو شاهید شەهادەتیان‌دا بە پاشگەز بوونەوەی کەسێك و ئەو کەسە ئینکاری کرد، ئەوە حوکم بە شەهادەتەکەیان ئەکرێ وە ئەگەر کابرا ئینکاری نەکردو وتی: ئەو قسەیە یا ئەو کردەوەیەم کردووە، بەڵام بە زۆر پێیان کردووم، ئەوە ئەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر راستی کابرا، وەك ئەوە کە دیلی کافران بووبێ، ئەوە سوێند ئەدرێ لەسەر قسەکەی‌و باوەڕی پێ‌ئەکرێ وە ئەگەر بەڵگە نەبێت، باوەڕی پێ ناکرێ.

وە ئەگەر شاهیدەکان شەهادەتیان لەسەر ئەوە دا کە فڵانکەس لەفزی کوفری بە دەمدا هاتووەو کابرایش ئیددیعای زۆرلێ‌کرانی کرد لەسەر بەدەما هاتنی ئەو لەفزە، ئەوە سوێند ئەدرێ‌و ئیددیعاکەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، بەڵگەی هەبێ یا نە، چونکە شاهیدەکان شەهادەتیان نەداوە لەسەر ئەوە کە کابرا پاشگەز بووەتەوە، بەڵکوو وتوویانە لەفزی کوفری بەدەما هاتووەو ئەم دوو قسەیە جیان لەیەك.

لەپاش ئەوە کە پاشگەز بوونەوەی کەسێك ئیسپات بوو، واجبە لەسەر قازی دەس بەجێ داوای پەشیمانبوونەوەی لێ بکا؛ جا ئەگەر کابرا پەشیمان بووەوە، ئەوە خوێن و ماڵی ئەپارێزرێ و حوکم ئەدرێ بەو کە موسوڵمانە. پەشیمانبوونەوە لە پاشگەز بوونەوە بەم جۆرەیە کابرا بە دەم بڵێت: «أَشْهَدُ أَنْ لاَّ إِلَهَ إلاّ اللّهُ و أَشْهَدُ أنَّ محمّداً رَّسولُ اللّه»؛ جا ئەگەر پاشگەز بوونەوەکەی بەوە بووبوو کە ئایینێکی تری پەسەند کردبوو، ئەوە لەپاش وتنی کەلیمەی شەهادەت، ئەڵێ: بەریم لە هەر ئایینێ کە لەگەڵ ئایینی ئیسلام یەك نەکەوێ وە ئەگەر بەهۆی قسەیەك یا کردەوەیەکەوە بووبوو کە ئینسانی پێ کافر ئەبوو، ئەبێ بەیانی پاکی خۆی بکا لەو قسەیە یا لەو کردەوەیە.

وە ئەگەر پەشیمان نەبووەو لەسەر حاڵی پاشگەز بوونەوە مایەوە، ئەوە پێشەوای موسوڵمانان ئەیکوژێو هەرچی میراتێکی لێ بەجێ بمێنێ، وەك ماڵی «فَيْء» وایە کە بە بێ شەڕ لە کافرانەوە دەس کەوتبێو وەك ئەو ماڵە سەرف ئەکرێ و لە گۆڕستانی موسوڵمانانیشدا نانێژرێ.

ئەگەر کەسێکی ناسراو بە موسوڵمانەتی مردو دوو کوڕی موسوڵمانی هەبوو یەکێکیان وتی: باوکم بە پاشگەزبووەوەیی مردووەو ئەویان وتی بە موسوڵمانەتی مردووە، ئەوە بەشە میراتی کوڕی یەکەم، «فَيْء»ەو لە شوێنی «فيء»دا خەرج ئەکرێو بەشی کوڕی دووهەم ئەدرێ بە خۆی.

مناڵی کەسێك کە پاشگەز بووبێتەوە، ئەوانەیان لەپێش پاشگەز بوونەوەی باوکیانا پەیدا بووبن، واتە بەر لەوە لە سکی دایکیانا گیرسابن، بە موسوڵمان ئەناسرێن وە ئەوانەیان لە کاتی پاشگەز بوونەوەی باوکیاندا گیرسابن، یا پاش پاشگەز بوونەوەی باوکیان گیرسابن، ئەگەر یەکێك لە باوكو دایکیان موسوڵمان بوو یا یەکێ لە باوكو باپیری کۆنیان موسوڵمان بوو، حوکم بە موسوڵمانەتیان ئەدرێ، چونکە بە تابیعی ئەو ئەسڵە موسوڵمانە دائەنرێن وە ئەگەر کەس لە باوكو دایك و باپیرە کۆنەکانیان موسوڵمان نەبووبن، ئەوە حوکمی پاشگەز بووەوەیان هەیە، بەڵام مناڵیوا ناکوژرێ تا باڵغ ئەبێ، جا پاش باڵغ بوون، ئەگەر دانی بە ئایینی ئیسلامدا نا، ئەوە خوێنی

ئەپارێزرێ وە ئەگەر ئەمیش ئیددیعای پاشگەز بوونەوەی کرد، ئەوە لەپاش داوای پەشیمانبوونەوە لێ کردنیو پەشیمان نەبوونەوەی، ئەکوژرێ؛ ئەمەی کەوتمان بۆ حوکمی دنیایە، ئەگینا بۆ حوکمی دین، ئەو منالە تا بالغ ئەبێ، ئەگەر مرد، هەر بە موسولمان دائەنرێ، واتە باوەرمانوایە ئەچێتە بەهەشت.

فەرموودەی ئاشکراتر ئەوەیە مولکی کەسێ کە پاشگەز بوووبێتەوە رائەگیرێو تەسەروفی تیا ناکرێ، جا ئەگەر گەرایەوە بۆسەر ئیسلامەتی، ئەوە مولکی خۆیەتی، وە ئەگەر بە پاشگەز بووەوەیی مرد، دەرئەکەوێ کە لەکاتی پاشگەز بوونەوەکەوە لە مولکی ئەو درچووەو ئەو مولکەو هەرچی لەوەوە پەیدا بووبێ حوکمی «فَیْء»ی هەیە؛ هەروەها هەر تەسەروفێ لەو ماوەیەدا کردبێتی، وەك وەقفو وەسیەتو بەخشینو نەزر، ئەویش رائەگیرێ؛ جا ئەگەر موسولمان بووەوە، ئەوە بە دامەزراو دائەنرێ وە ئەگەر بە پاشگەز بووەوەیی مرد، ئەوە بە بەتاڵ دائەنرێ.

هەر قەرزێ کە ئینسانێکی پاشگەز بووەوە لەپێش پاشگەز بوونەوەکەیدا کردبێتی و هەرشتێ کە لەپێش ئەوەدا فەوتاندبێتی، یا لەکاتی پاشگەز بوونەوەکەیدا، ئەوە لە ماڵەکەی ئەدرێتەوە؛ هەروەها، مەسرەفی خۆیو منالو باوكو دایك و ئەو ژنانەی کە نیکاحیان راگیراوە، هەموو لەو ماڵە ئەدرێ وە هەر فرۆشتنو رەهنو موعامەلەیەکی تر کە بیکات. هەمووی بە بەتاڵ دائەنرێ و ئەموالی ئەدرێتە دەستی کەسێکی دادپەروەر و کەنیزەك (جارِیە)ی ئەدرێتە دەستی ژنێکی باوەرپێ کراو و ژنەکانی لێی جیا ئەکرێنەوە و هەرکامیان لە ماوەی «عدّە»دا مێردەکەی نەهاتەوە سەر موسولمانەتی، بە «بائِنە» دائەنرێ و موڵك و دووکانو خانووی ئەدرێن بە کرێ تا ئەنجامی حاڵی دیاری ئەدا، بزانین چی بەسەردێ.

## باسی «زِنا»

«زِنا» لە شەرعدا، بریتییە لەوە کە ئینسانێکی باڵغی عاقڵ بە ئارەزووی خۆی و بە بێ شوبهەی حەلاڵی، تەواوی زەکەری خۆی یا ئەوەندەی کە پێستەکەی لەسەر ئەبرِرێ

له خەتەنەدا، بیکا بە فەرجی ژنێکی زیندووی واداکە لە زاتی خۆیدا حەرام بێ لەسەر ئەو کەسە، یاخود ژنێك بە بێ شوبهەی حەڵاڵی قەبووڵی ئەوە بکاکە ئەندازەی ناوبراو بڕواتە فەرجیەوە؛ مەزهەب وایە کە پاشی ژن‌و نێرینەیش، وەکوو پێشی ژن وایە.

کەواتە، بە زینا دانانرێ هەرشتێ کە چوونی زەکەروسەری زەکەری تیا نەبێ، وەکوو خۆ لەیەك سوینی دوو پیاو یا دوو ژن یا ژن‌و پیاوێك؛ هەروەها، بە زینا ناژمێررێ ئەو تێچوونە کە لە لایەنی نابالغ‌و شێت‌و کەسێکی زۆرلێ‌کراوەوە بێ، یا لەگەڵ ژنێکی مردوو یا حەیوانێکی زیندوودا بێ، یا ئەوە کە ئینسان بچێتە لای ژنی خۆی لەکاتی حەیزدا یا لەکاتی ئیحرام بەستن‌دا بۆ حەج یا بۆ عەمرە.

هەروەها زینا نییە ئەمە کە کەسێك بە شوبهە بڕواتە لای ژنێك، خوای شوبهەی موڵك بێ، وەکوو چوونەلای کەنیزەکێکی کە مارە کرابێ لە یەکێك، یا لە «عـدّە»ی مێردێکدا بێ، یا کەنیزەکێکی کە مەحرەم بێ پێی، یاخود شوبهەی «فاعِل»بێ، وەکوو ئەوەکە کابرا بڕواتەلای ژنیکی بێگانە بە شوبهەی ئەوەکە بە ژنی خۆی بزانێ، یاخود بە شوبهەی «طَریق»بێ، وەکوو ئەوەکە بڕواتە لای ژنێ کە نیکاح کرابێ بۆی بە نیکاحێك کە لە مەزهەبی خۆیدا ئەو نیکاحە دروست نەبێ بەڵام لای هەندێ لە پێشەوایانی دین دروستبێ وەکوو نیکاحی ژن بە بێ وەلی کە لەسەر «مەزهەبی حەنەفی» دروستە، یا بە بێ شاهید کە بە مەزهەبی «ئیمامی مالیك» دروستە، یا بە بێ وەلی‌و شاهید کە بە مەزهەبی داودی «ظاهِری» دروستە، یا بە سوورەتی وەختی (مُوقَّت)، وەکوو ریوایەت کراوە لە «ابنُ عبّاس»ەوە، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا کابرا حەددی لێ نادرێ بەوە کە بچێتە لای ژنەکە.

جا لەم سوورەتانەی شوبهەی «طریق»دا، ئەگەر کابرا تەقلیدی ئەو ئیمامەی کردبێ‌و تەقلیدەکەی دروستبێ، ئەوە وەکوو حەددی لێ نادرێ، گوناهیشی ناگا وە ئەگەر تەقلیدی نەکردبوو، یا تەقلیدی کردبوو و تەقلیدەکە بەتاڵ بوو، وەکوو تەقلیدی «داودی زاهیری» لە نیکاحی بێ‌وەلی‌و بێ‌شاهیددا یا تەقلیدی «ابن‌عبّاس» لە نیکاحی وەختی‌دا، لەبەرئەوە کە ئێمە ئاگامان لێ نییە ئادابی ئەو نیکاحە چۆنە لە مەزهەبی ئەو ئیمامەدا، ئەوە هەرچەند حەددی لێ نادرێ، بەڵام گوناهی ئەگا.

بەڵێ: ئەگەر حاکم حوکمی کرد بە دانەمەزرانی ئەو نیکاحەو لەپاش ئەو حوکمە کابرا رۆیشتە لای ژنەکە، ئەوە حەددی لێ ئەدرێ وە ئەگەر حوکمی کرد بە دامەزرانی نیکاحەکەو حوکمەکە نەچوو بەگژ ئیجماعدا ـ وەکوو لە نیکاحی وەختیدا ـ ئەو نیکاحەکە بە راست دائەنرێ.

بەڵام حەد ئەدرێ لەکەسێك کە بڕواتە لای ژنێ کە خۆی دابێ بەکرێ بەکابرا، واتە خۆی حەڵاڵ کردبێ بۆ ئەو کابرایە یا بۆ هەرکەس، چونکە ئەم سوورەتانە «زینا»ی رووتن و جێگەی شوبهەی پێشەوایانی ئایین نین.

بزانن! زینا سابت ئەبێ بە دووشت؛

یەکەم، ئەوە ئەوکەسە کە زیناکەی کردووە، ئیقرار بکا لەسەر خۆی بە زیناکەی، بە شەرتێ کە ئەو ئیقرارە لەکاتی باڵغیو عەقڵو ئیختیاردا بێ و وەختو شوێنی زیناکە لێك بداتەوە؛ جا ئەگەر لەپاش ئیقرارەکە پەشیمان بووەوەو وتی: درۆم کردووە، یا: پەشیمانم لەو ئیقرارە، ئەوە حەددەکە لائەچێ، وە ئەگەر وتی: حەددم لێمەدەن، یاخود رایکرد، ئەوە حەددی لەسەر لاناچێ.

دووهەم، شەهادەتی چوار پیاوی عاقڵی دادپەروەرە کە بەدرێژی باسی ئەوە بکەن کە کابرا چۆن چووەتە لای ئافرەتەکەو شوێنی چوونەلاکەی کوێ بووەو ئەندازەی زەکەری کە بە سوورەتی زینا چووەتە ناو فەرجی ژنەکەوە، چەند بووە.

ئەگەر چوار کەس شەهادەتیان دا بەوە کە ئەو ئافرەتە کچە، ئەوە حەد نادرێ لەو ئافرەتە لەبەر شوبهەی مانەوەی کچێتییەکەی وە حەد نادرێ لەوکەسەیش کە ژنەکەی لەکەدارکردووە بە زیناکردن وە لەوکەسانەش کە شاهیدی زینای ژنەکە بوون، چونکە رێی تێئەچێ کچێتی ئافرەتەکە پەیدا بووبێتەوە، یاخود فەرجی قووڵ بووبێو کچێتییەکەی لانەچووبێ وە ئەگەر یەکێ لە شاهیدەکان وتی: زیناکە لە فڵان شوێندا بووەو یەکێکی تریان وتی: لە شوێنێکی تردا بووە، ئەوە حەد نادرێ لەو کەسانە کە شاهیدییان لەسەردراوە.

بزانن! ئینسانێ کە بە ناحەق سەرخۆش بووبێو لە سەرخۆشییەکەیدا زینای

کردبێ، حەددی لێ ئەدرێت. وە بەجێهێنانی حەد لەسەر ژنو پیاوی زینا کـردوو، حەقی پێشەوای موسوڵمانانو جێنشینەکانیەتی.

جا ئەگەر ئەو کەسە کە زینای کردووە، «مُحصِن»بێ، واتە پیاوێکی ئازادی وابێ کە لەپێش ئەو زینایەدا بە نیکاحی دروست چووبێتە لای ژنێ، یا ژنێکی ئازادی وابێ کە لەپێش زیناکەدا بە نیکاحێکی دروست کەسێك چووبێتە لای، ئـەوە حـەددەکـەیان «رَجم»ە، واتە سەنگەسار کردن، بەمڕەنگە بە گڵمتكو بەردی پـڕەمشتو بـچووکتر، ئەوەندەیان لێ بدرێ تا ئەمرن؛ بەڵام لە سەنگەسار کردنی ئافرەتدا سوننەتە چاڵێك هەڵبکەنرێ ژنەکەی تێبخرێ ئەوسا سەنگەسار بکرێ و چاڵ بۆ پیاو هەڵناکەنرێت وە بە هەرحاڵ، ڕەجم کردن دواناخرێت لەبەر گەرماو سەرمای لەعادەت بەدەر.

وە ئەگەر ژنو پیاوەکە «مُحصِن» نەبوون، حەددەکەیان بریتییە لەوە یەکی سەد داریان لێ بدرێتو بۆ ماوەی ساڵێك دوور بخرێنەوە لەو شوێنە کە زیناکەیان تیا کردووە تا مەسافەی دوو قۆناغ یا زیاتر، بەڵام ئەگەر غەریب بوون، نابرێنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان وە ئەگەر ئیمام شوێنێکی دیـاری کـرد بـۆیـان، ئـەوە حـەقی ئـەوەیان نـییە داوای شوێنێکی تر بکەن؛ بەڵێ، واجبە ژنەکە لەگەڵ مەحرەمێکی خۆیدا دوور بـخرێتـەوە وەکوو مێردەکەی یا کەسێکی تر، هەرچەند بە کرێ لەگەڵیدا بڕوا؛ ئەگەر کەس نەبوو لەگەڵیدا بێ هەتاوەکوو بە کرێش، ئەوە دوورخستنەوەکەی دوائەخرێ تا ئەسبابی بۆ ڕێك ئەکەوێ وە هەرکاتێ یەکێك لەگەڵیدا ڕۆیشت، کرێی ئەوکەسە لەسەر ژنەکەیە وە ئەگەر خۆی هیچی نەبوو بیداتێ، کرێی لەسەر «بیتُ المال»ی موسوڵمانانە.

وە ئەگەر وەخت زۆر گەرم بوو یا زۆر سارد بوو، ئەو دار لێدانە دوائەخرێ، چونکە لەم سوورەتانەدا مەبەست کوشتنی ئەو کەسانە نییە؛ کەواتە، مەجال نییە بۆ ئەوە لەو کاتانەدا لێیان بدرێتو بمرێنرێن؛ بەڵێ، ئەگەر پـێشـەوای مـوسوڵمـانان لە یـەکـێ لەوکاتانەدا فەرمانیدا لێیان بدەنو بەو لێدانە مردن، ئەوە زامـن نـابێ، چـونکە ئـەو دواخستنە سوننەتەو واجب نییە؛ هەروەها، دار لێدانیان دوائەخرێ لەبەر نەخۆشییان؛ بەڵێ، ئەگەر نەخۆشییەکە لەوانە بوو کە ئومێدی شیفایان نەبوو، ئەوە داریان لێ ئەدرێ

بەڵام بە دارێ کە لقە وردەی زۆری پێوەبێ؛ جا ئەگەر سەد لقی هەبوو، یەکجار وە ئەگەر پەنجا لقی هەبوو، دووجار لێیان ئەدرێ، بە جۆرێ کە هەموو لقەکان بەر ئەو کەسە بکەون یا بنیشنە سەر یەکو ئازاری پێ بگەیەنن؛ جا ئەگەر لەپاش ئەم جۆرە لێدانە چاك بوونەوە، ئەوە بەسەو جارێکی تر لێیان نادرێتەوە.

## باسی حەددی بوختان بەدەمەوە کردن (قَذْف)

«قَذْف» لە شەرعدا، بریتییە لەوە کەسێ نیسبەتی زینا بدا لە کەسێکی تر بەجۆرێکی وا کە تووشی شەرمەزاریی بکات.

شەرتی واجب بوونی حەددی «قەزف»، چەند شتە:

یەکەم، ئەوەیە قەزفکەرەکە تەکلیفی لەسەر بێ؛ کەواتە، حەد نییە لەسەر منداڵو شێتو سەرخۆش کە بە ئارەزووی خۆی خۆی سەرخۆش نەکردبێ؛ بەڵێ، منداڵی بەتەمیز تەعزیر ئەکرێ ئەگەر قەزفی کەسێکی کرد، بۆ ئەوەی فێری بێئەدەبی نەبێ؛

دووهەم، ئەوەیە ئەحکامی ئیسلامی لە ئەستۆ گرتبێ؛ کەواتە، حەد نادرێ لە کافری جەنگکەر؛

سێهەم، ئەوەیە بە ئارەزووی خۆی قەزفەکە بکات وە ئەگەر یەکێ بەزۆر قەزفی کەسێکیان پێ کرد، حەددی لێ نادرێ؛

چوارەم، ئەوەیە کابرای قەزفکراوە ئیزنی نەدابێ؛

پێنجەم، ئەوەیە قەزفکراوەکە لە نەوەی قەزفکەرەکە نەبێ؛ هەروەها، یەکێ نەبێ کە تەنها نەوەکەی میراتی لێ وەربگرن، وەکوو ژنی کوڕەکەی یا مێردی کچەکەی کە میراتگری تریان نەبێ بێجگە لە منداڵی ئەم نەوانە؛

شەشەم، ئەوەیە قەزفکراوەکە «مُحصِن»بێ، یەعنی باڵغو عاقڵو موسوڵمانو پاك بێ لە چوونەلایەك کە بیێ بە هۆی حەد؛ کەواتە، حەد نادرێ لە کەسێ کە قەزفی منداڵ یا شێت یا ئینسانی ناپاك بکا، بەڵام ئەم قەزفکەرە تەعزیر ئەکرێ لەسەر قەزفەکە بۆ ئەوە کە قسەی خراپ بڵاو نەبێتەوە.

حەددی قەزفـکەری ئازاد، هەشتا دارە بە تووڵی نەرمی مام ناوەندی بەجۆرێ کە یەکەیەکەی تووڵەکان ئێش‌بگەیەنن بەو کەسە و ئەم تووڵانە حەقی پێشەوای موسوڵمانانە بیان‌وەشێنێ بەدەستی خۆی یا یەکێك بکا بە وەکیل، وەکوو قازی شەرع لە شارەکاندا، یا غەیری قازی لەو کەسانە کە دیاری کراون بۆ بەجێ‌هێنانی حەد؛ کەواتە، ئەگەر ئەو قەزفـکراوە خۆی ئەم دارانەی دا لە قەزفـکەرەکە بە بێ‌ڕێگادانی پێشەوای موسوڵمانان، ئەوە نابێ بە حەددی شەرعی و حەقی لەم کابرایە ئەستێنرێتەوە وە ئەگەر قەزفـکەرەکە بەو دارانە مرد، ئەوە قیساس ئەستێنرێ لەم قەزفـکراوە، مادام بە بێ‌ئیزنی پێشەوای موسوڵمانان دارەکانی وەشاندووە.

ئەگەر دووکەس قەزفی یەکتریان کرد، ئەوە نابێ بە حەق سەندن، بەڵکوو هەردووکیان حەدی شەرعییان بەسەردا جاری ئەکرێ وە ئەگەر کەمتر لە چوارکەس شەهادەتیان دا لەسەر زینا کردنی کەسێك، ئەوە حەددیان لێ ئەدرێ؛ هەروەها، ئەگەر چوار ژن یاخود چوار کافری زیممی بێن شەهادەت بدەن، حەددی قەزفیان لێ ئەدرێ؛ بەڵێ، ئەگەر یەکێ شەهادەتی دا لەسەر ئیقراری ئەوکەسە بە زینای خۆی، ئەوە حەددی لێ نادرێ، چونکە ئەم شەهادەتە لەسەر زینا نییە، بەڵکوو لەسەر قسەی خۆیەتی؛ هەروەها، ئەگەر لەبەر فاسقی ڕەددی شەهادەتەکەیان کرایەوە، حەددیان لێ‌نادرێ.

**خەبەرداربن!** ئەگەر کەسێك دارێ بدا لە شوێنێکی کەسێك، دروستە ئەمیش دار بداتەوە لە عەینی جێگا لە لەشی ئەوکەسەدا. ئەگەر کەسێك داری دا لە منداڵی یەکێك یا لە حەیوانی یەکێك، ئەوە بە یاسای دەفعی هەڵمەت‌هێنەر ئەتوانێ مەنعی ئەوکەسە بکا هەرجۆرێ بووە بە تەرتیبی پێشوو وە ئەگەر کەسێك قەزفی کەسێك بکا، دروست نییە ئەم‌کەسە قەزفی ئەو بکاتەوە وە ئەگەر جنێوی تری پێ‌دا، دروستە ئەویش جنێو بداتەوە بەوکەسە خۆی نەك بە باوكو دایكو نەوەوکەس‌وکاری وە واجبە جنێوێکی پێ‌بدا کە ڕاست بێ، وەکوو «بێ‌عەقڵ»و ژمارەیشی لە ژمارەی ئەو زیاد نەبێ.

وە ئەگەر کابرای قەزفـکراو مرد، میرات بەرەکانی ئەتوانن داوای ئەوە بکەن کە قازی حەددی قەزف بدا لە قەزفـکەرەکە. حەددی قەزف لاناچێ بەوە کە قەزفـکراوەکە یا میرات‌بەرەکانی یا هەندێکیان کابرا عەفو بکەن.

## باسی حەددی دزی

حەددی دزی، دەس بڕینە؛ شەرتی دەس‌بڕینی دزیش، چەند شتە؛

[شەرتی] یەکەم: ماڵە دزراوەکە چارەکە دینارێکی ئاڵتوونی ساغی سکە لێدراو یا شتێکی‌تر بێ بە قیمەتی چارەکە دینارێك: کەواتە، ئەگەر کەسێك چارەکە مسقاڵێك ئاڵتوونی سکە لێ نەدراوی دزی کە قیمەتی کەمتر بێ لە سکە لێدراو، ئـەوە دەسـتی نابڕرێ؛ بەڵێ، ئەگەر چەند دینارێکی دزی بەگومانی ئەوەکە دیناری زێڕ نییەو فلسەو قیمەتی لە چارەکە دینارێکی زێڕ کەمترە، ئەوە دەسـتی ئـەبڕرێ، هـەروەها ئـەگـەر پۆشاکێکی کۆنی دزی کە ئەوەندەی پارە تیا قایم کرابوو لەگەڵ جلەکەدا چـارەکـە دینارێکیان ئەهێنا.

ئەگەر کەسێك بە دووجار چارەکە دینارێکی لە جێگـایەکـی پـارێزراو (حِـرز) دەرهێنا، ئەوە ئەگەر لەپاش جاری یەکەم خاوەن ماڵەکە پێی زانی‌و ئەمیش ماڵەکەی لە شوێنی خۆیدا دانایەوە، ئەوە دزییەکەی بـە دوو دزی دائـەنرێ‌و دەسـتی لەسـەری نابڕرێ، چونکە هەردوو چارەکە ماڵە دزراوەکە لە رادەی دیاری‌کراو کەمتر بووە کـە چارەکە دینارێکە وە ئەگەر پێی نەزانی تا نیوەکەی‌تریشی دەرهێنـا، ئـەوە هـەردوو چارەکە بە یەك دزی دائەنرێ‌و دەستی لەسەری ئەبڕرێ.

ئەگەرکەسێك فەردەیەك گەنمی دڕی و بە ماوەیەك بایی چارەکە دینارێك گەنمی لێ ڕژاو فەوتا، ئەوە دەستی ئەو کەسە ئەبڕرێ؛ بەڵێ، ئەگەر خـاوەنەکـەی گـەنمەکـەی کۆکردەوە بەرلەوەی بڕوا قازی ئاگادار بکاو ئیددیعای لێ‌بکا، ئەوە دەستی نابڕرێ، وەکوو چۆن ئەگەر کابرای دز ئەو ماڵەی کە دزیویەتی بیکڕێ لە خاوەنەکەی یاخود لە رێگایەکی‌ترەوە ببێ بە خاوەنی بەرلەوەی خاوەنی پێشووی بڕواتە لای قازی‌و ئیددیعا بکا، ئەویش دەستی نابڕرێ.

ئەگەر دووکەس پێکەوە شتێکیان دزی، ئەوە ئەگەر ئەندازەی دوو «نِصاب» بوو، هەردووکیان دەستیان ئەبڕرێ وە ئەگەر لە دوو نیساب کەمتر بوو، دەسـتی کـەسیان

نابڕریٚ وە ئەگەر کەسێك شتێکی دزی کە عەینەکەی پیس‌بوو، وەکوو سەگو بەرازو تەپاڵەو پێستی مردارەوە بوو بەر لە دەباخی کردنی، ئەوە دەستی نابڕرێ، هەروەها ئەگەر کووپەیەك شەرابی دزی، بەو شەرتەکە کووپەکە قیمەتی چارەکە دینارێك نەبێ، یا ئەگەر زوڕناو تەموورەو ئەسبابی‌تری رابواردنی دزی، بەو شەرتە ئەگەر بشکێن، وردە پارچەکانیان بایی چارەکە دینارێك نەبێ.

**شەرتی دووهەم**، ئەوەیە ئەو ماڵە موڵکی کەسێکی‌تر بێ؛ کەواتە، ئەگەر کابرا بەهۆی میراتەوە بوو بە خاوەنی ئەو ماڵە بەرلەوەی لە شوێنەکەی خۆیدا هەڵگیرێ، دەستی نابڕرێ، هەروەها ئەگەر بەر لە دەرکردنی لەو شوێنە ئەوەندەی لێ فەوتاند پاشماوەکەی لە نیساب کەمتر بوو، یا ئەگەر کابرا ئیددیعای ئەوە بکاکە ئەو ماڵە هی باوکیەتی یا هی منالیەتی یا هی «بیتُ المال»ەو حەقیشی هەبێ لە «بیتُ المال»دا، هەرچەند لەپێش دزینەکەدا بە شاهید ئیسپات بووبێ ئەو ماڵە هی خاوەن ماڵەکەیە، چونکە رێی تێ‌ئەچێ لەوە پاش لە موڵکی ئەو دەرچووبێ، هەروەها ئەگەر ماڵ لێ‌دزراوەکە پێی لێ بنێ کەوائەو ماڵە لەکاتی دزینەکەدا ماڵیٚ کابرای دز بووە. ئەگەر دووکەس دوو نیسابیان دزی و یەکێکیان ئیددیعای کردکە وا ئەو ماڵە ماڵی خۆیەتی یا هی هەردووکیانەو شەریکەکەی باوەڕی پێ‌نەکرد، ئەوە دەستی موددەعییەکە نابڕرێت، بەڵام دەستی ئەویان ئەبڕرێت. ئەگەر کەسێك ماڵێکی تێکەڵی خۆیو کەسێکی‌تری دزی کە لە شوێنی پاراستنیا دانرابێ، ئەوە دەستی نابڕرێ، هەرچەند بەشێکی زۆر کەمیشی لەوماڵەدا هەبێ.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە کابرای دز شوبهەی موڵکی نەبێ لەو شتەدا کە دزیویەتی؛ کەواتە، دەستی نابڕرێ بەهۆی دزییەوە لە ماڵی باوکی یا دایکی یا نەتەوەی خۆی؛ بەڵام فەرموودەی دیارتر ئەوەیە کە دەستی پیاو ئەبڕرێ بە دزی لە ماڵی ژنەکەی و دەستی ژن ئەبڕرێ بە دزی لە ماڵی مێردەکەی، مەگەر حەقی نەفەقەی لەسەری هەبێ‌و بەونیازە شتێ لە ماڵەکەی بدزێ، وەکوو خاوەن قەرزێك کە بە نیازی قەرزەکەی لە ماڵی قەرزارەکەی شتێ بدزێ، هەرچەند ئەو شتە کە ئەیدزێ لە ئەندازەی قەرزەکەی زیاتر بێ، ئەگەر بەجارێ هەمووی لە «حِرزُ المثل» بکاتە دەرەوە.

ئەگەر کەسێك شتێکی لە «بیتُ المال» دزی، ئەوە ئەگەر حەقی هەبێ لەومـاڵەدا، دەستی نابڕرێ، هەروەها ئەگەر ئەندازەیەك لە «بیتُ المال» جیاکرابێتەوە بۆ کۆمەڵێك و ئەمیش لەو کۆمەڵەیە بێ، یا لەوان نەبێ، بەڵام نەزانێ بەوە کە ئەو ماڵە بۆ ئەو کۆمـەڵە جیاکراوەتەوە.

ئەگەر کەسێك بە ئیزنی خاوەن ماڵ رۆیشتە ماڵێکەوە یـا رۆیشـتە دووکـانێ بـۆ شتکڕین و شتێکی لەو ماڵە یا لەو دووکانەدا دزی، ئەوە دەستی نابڕرێ، چونکە مادام بەئیزن رۆیشتووەتە ئەو شوێنانە، ئەو کـەل وپەلەی لەومـاڵە یـا لەو دووکـانەدا هـەیە بەنیسبەت ئەمەوە لە «حِرز»دا نین؛ هەروەها، دەستی نابڕرێ بە دزینی خواردەمەنی لەساڵەگرانیداو لە ساڵی قاتی و نەهاتیدا، بەو شەرتە کە دەسـتی نـەڕواو پـارەی نـەبێ خواردەمەنی پێ بکڕێت و بە قەرزیش پێی نەدەن.

هەروەها دەستی نابڕرێ بەهۆی دزیی حەسیرو فەرشی مزگەوت و چرای مزگەوتەوە، هەرچەند کە دزینی ئەم شتانە گوناهی گەورەیەو ماڵە دزراوەکەی پێ ئەبژێررێ و لەسەر دزییەکەی تەمێ ئەکرێ، چونکە ئەم جۆرە کەل و پەلەی مزگەوت حوکمی «بیتُ المال»ی هەیەو بۆ هەموو موسوڵمانێك دروستە کەڵکی لێ وەربگرێ، بەڵام دەستی ئەبڕرێ بە دزینی دەرگای مزگەوت و پەنجەرەی و کۆڵەکەی و دار رایەڵی و ئەو چرایانەی کە بـۆ جوانی تیا هەڵواسراون؛ بەڵێ، ئەگەر دزەکە کافری زیممی بـوو، بـە دزیـنی هـەموو شتێکی مزگەوت دەستی ئەبڕرێ.

هەروەها دەستی دز ئەبڕرێت بە دزینی ماڵی وەقفکراو کە خۆی یـەکـێك نـەبێ لەوانەی ئەو ماڵەیان لەسەر وەقفکراوە، بەڵام ئەگەر خۆی یەکێك بوو لەوانـە ئـەوە دەستی نابڕرێت.

شەرتی چوارەم، ئەوەیە ئەو ماڵە پارێزراو بێ بەهۆی چاودێری کردنیەوە لەلایەن کەسێکی بەهێزو هۆشیارەوە بەجۆرێ کە توانای بێ بە هێزی خۆی یا بە هاوار کردن لە کەسێکی تر ئەو ماڵە بپارێزێ، یاخود ئەو ماڵە لە شوێنێکی مەحکەم و بەسراودا بێ. ئەم شەرتە، ئەگۆڕێ بە گوێرەی گۆڕانی ماڵەکەو باری زەمانەو شوێن؛ مەسەلا، ئەگەر ئەو ماڵە لەدەشتا بوو، یا لە مزگەوتا، یا لە کۆڵانێکدا، پێویستە هەمیشە چـاودێری کـەری

لەسەر بێ، مەگەر لە فەترەیەکی کەمی عادەتیدا، وەکوو کاتی نوێژکردن و نان خواردن؛ ئەگەر لەم ماوەیەدا کابرای پاسەوان ئاگای لێنەما و کەسێك ماڵەکەی دزی، ئەوە دەستی ئەو دزە ئەبڕڕێ وە ئەگەر ماڵەکە لە قەلایەك یا ماڵێکی مەحکەمدا بوو، بەسە ئەوەندە کە خاوەنەکەی یا چاودێریکەرەکەی جارجار سەیرێکی بکا، ئیتر پێویست نییە هەمیشە لایدا بێ.

تەوێڵەیش بۆ پاراستنی وڵاخ، بە جێگای پاراستن (حِـرز) دائەنری، هەرچەند وڵاخەکان وڵاخی نایابو بەقیمەت بن، مادام تەوێڵەکە لە ئاوەدانیدا بێو دەرگای داخرابێ، ئەگینا پێویستە پاسەوانیشی هەبێ؛ ئیتر تەوێڵە نابێ بە جێگای پاراستنی قاپو قاپچاخی ماڵ، هەرچەند بێقابیلەتیش بێ، مەگەر ئەوجۆرە قاپو قاپچاخانەی کە پێویستن بۆ خزمەتچی وڵاخەکان، بەلام بە جێگای پاراستن دائەنرێ بۆ زینو بەرگو ئاوزەنگیو دان لەغاوو هەرکەلو پەلێکی تر کەوا پێویست بێ بۆ خزمەتی وڵاخەکان.

حەوشی ماڵو خانو هەیوانو سەکۆی ناوحەوش، ئەبن بە جێگای پاراستن بۆ قاپو قاپچاخو کەلوپەلی عادەتی ناوماڵ، بەلام نابن بە جێگای پاراستن بۆ شتی گرانبەهاو جلوبەرگی نایابو پارەی نەختو خشڵی ژنانە، چونکە پێویستە ئەم جۆرە شتانە لە سندووقو شوێنی تایبەتیدا دانرێن.

ئەگەر کەسێك لە دەشتێکدا یا لە مزگەوتێکدا یا لە خانێکدا یا لەسەر فەرشێك نووست، یاخود بوخچەیەکی کەلوپەلی خستە ژێر سەری خۆیو نووست، ئەوە شتەکانی لە جێگای پارێزراودا داناوە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك فەرشەکەی لە ژێری دەرکرد یا کەلوپەلەکەی لە ژێرسەری دەرهێناو بردی، ئەوە دەستی ئەبڕڕێ، بەلام ئەگەر لەم جۆرە شوێنانەدا شتەکەی لە دووری خۆیەوە دانابوو، ئەوە پێویستە چاودێرییان بکا، ئەگینا وا دانانرێ کە لە شوێنی پارێزراندا داینـاون و هەرکەس بیاندزێ، دەستی نابڕڕێ.

هەر خانوویەك کە جیا بێ لە ئاوەدانی، ئەگەر پاسەوانێکی توانای هۆشیاری تێدابوو، ئەوە ئەو خانووە ئەبێ بە جێگای پاراستن بۆ ئەو شتانەی کە تیایەتی، خواه دەرگای داخرابێ یا نە، ئەگینا بە جێگای پاراستن دانانرێ وە ئەگەر یەکێ ئەو

کەل‌وپەلانەی دزی کە لەو خانووەدان، دەستی نابڕڕێ، بەلام خانوویەك کە لە ئاوەدانیدا بێ، پێویستە پاسەوانی ببێ‌و دەرگاکەی دابخرێ، ئەگینا بە جێگای پاستن دانانرێ بۆ ئەو کەل‌وپەلەی کە تیایەتی وە ئەگەر دەرگای ماڵەکە کرایەوەو کابرای پاسەوانیش نووست، ئەوە ئەو خانووە بە جێگای پاراستن دانانرێ بۆ ئەو کەل‌وپەلەی کە تیایەتی، نە بە شەوو نە بە ڕۆژ، هەروەها ئەگەر کەسێکی بە ئاگای‌وای تیادا بێ کە دز بتوانێ هەڵی بخلەتێنێ‌و شتی لێ بدزێ وە ئەگەر کەسی تێدا نەبوو، ئەوە ئەبێ بە جێگای پاراستن بۆ کەل‌وپەلی ناوماڵ بە ڕۆژدا نەك بە شەودا، بەو شەرتە کە شوێنەکە هێمن‌و بێ‌ئاژاوە بێ‌و دەرگای ماڵەکەیش داخرابێ وە بە شەواو بە ڕۆژیشا ئەگەر شوێنەکە هێمن‌و بێ‌ئاژاوە نەبێ یا دەرگای ماڵەکە دانەخرابێ، نابێ بە جێگای پاراستن بۆ کەل‌وپەلی ناوماڵیش.

دەوارو خێوەتێ کە لە دەشتا هەڵبدرێ، ئەگەر شریتی دەوروبەرەکەی قایم نەکرابێ‌و داوێنەکانی دانەدرابێتەوە، ئەوە ئەو خێوەت‌و دەوارەو هەرچی لەناویا بێ، وەکوو کەل‌وپەلێك وایە لە چۆڵییەکدا دانرابێ‌و وا دانانرێ کە لە شوینێ پاراستنیدا دانراوە وە ئەگەر بە شریت قایم کرابێ‌و داوێنەکەی دادرابێتەوە، ئەبێ بە جێگای پاراستن بۆ هەرچی کە لەناویا بێ‌و خۆیشی وادائەنرێ کە لەجێگای پاراستندا دانراوە، بەو شەرتە پاسەوانێك هەبێ بە پێی عادەت ئاگای لێ بێ.

ئاژەڵی وەکوو مەڕو بزنیش، ئەگەر لە خانوویەکدا بن کە لەناو ئاوەدانیدا بێ، ئەوە وادائەنرێن کە لە جێگای پاراستندا دانراون، ئەگەر دەرگای خانووەکە داخرابێ، هەرچەند پاسەوانیان نەبێ، بەلام حەیواناتی دەشت یا ناوخانووی دوور لە ئاوەدانی، پێویستە پاسەوانیان لەلادا بێ‌و قەیدی نییە ئەو پاسەوانەیش بەپێی عادەت بنوێت.

دەشتیش بە شوێنی پاراستن دائەنرێ بۆ حوشتر، ئەگەر چاودێریکەرێکی بەهێزو توانای هەبێ؛ کۆمەڵەحوشترێکیش کە بە یەکەوە بەسترابن، وادائەنرێ کە لەشوێنی پاراستندان ئەگەر جڵەوبەدەستەکەیان چاوی‌لێیانەوە بێ‌و هەر قەتارێکیان لە نۆ حوشتر زیاتر نەبێ.

کفنی مردوویش لە شوێنی پاراستندا ئەبێ ئەگەر ئەو قەبرەی کە مردووەکەی تێ ئەخرێ لە خانوویەکی پارێزراودا بێ یا لە قەبرستانێکی نزیکی ئاوەدانیدابێ، ئەگینا وادانانرێ کە لە شوێنی پاراستندایە.

## باسی هەندێ شت کە بەسراون بە دزییەوە

ئەگەر کەسێکی خاوەن شوێن یا موستەحەقی قازانجی شوێن، شوێنەکەی بە کرێ یا بە خواستن دا بە کەسێك و ئەندازەی نیسابی لە موڵکی ئەوکەسە دزی، دەستی ئەبڕرێ وە ئەگەر کەسێك شوێنێکی داگیر کرد لە کەسێك، جا خاوەنشوێنەکە یا کەسێکی بێگانە ئەندازەی نیسابی لە ماڵی زەوتکەرەکە لەو شوێنە دەرکرد، ئەوە دەستی نابڕرێ؛ هەروەها، ئەگەر کەسێ بە بێ زانستو ڕێگادانی خاوەن شوێن شتێکی دانا لەو شوێنەدا و یەکێ ئەو شتەی دزی، ئەوە دەستی نابڕرێ.

وە ئەگەر کەسێ شتێکی زەوت کرد لە کەسێك و لە خانووی خۆیدا داینا، جا خاوەنشتەکە یا بێگانەیەك شتە زەوتکراوەکەی دزی، ئەوە دەستی نابڕرێ، چونکە خاوەنێتی شەرعی لەم مەسئەلەیەدا نییە.

ئەگەر کەسێك شتێکی نیسابی ڕفاند، یاخود ماڵێکی تاڵان کرد، یاخود نیسابێك بە ئەمانەت لای دانرابوو ئەمیش ئینکاری کردو نەیدایەوە، ئەوە دەستی بەمانە نابڕرێ وە ئەگەر دزێك شەوێك دیواری ماڵێکی کونکردو لە شەوی دووهەمدا نیسابێکی لەوکونەوە دەرکرد، ئەوە ئەگەر لە سبەینێی شەوی یەکەمدا کابرای خاوەنماڵ بە کونەکەی نەزانیو خەڵك لێی خەبەردار نەبوون، ئەوە دەستی ماڵ کونکەرەکە ئەبڕرێ، ئەگینا نابڕرێ.

ئەگەر کەسێك کونی کردە دیواری خانوویەكو کەسێکی تر شتێکی لەو کونەوە دەرهێناو دزی، ئەوە دەستی دزەکە نابڕرێ، چونکە بەهۆی کونەکەوە خانووەکە لە پارێزران دەرچووە وە ئەگەر دوو کەس بەیەکەوە خانوویەکیان بڕیو یەکێکیان نیسابێکی دەرهێنا، یاخود یەکێکیان بەتایبەتی دیوارەکەی کونکردو شتەکەیشی هێنایە

نزیکی کونەکەوە، جا ئەوی تریان دەری هێنا، ئەوە ئەم شەخسی دووهەمە دەستی ئەبڕرێ، لەبەرئەوە کە ئەوی یەکەم نیسابەکەی لە شوێنی پاراستنی دەرنەکردووە و ئەگەر یەکەم لە ناوەڕاستی کونەکەدا دایناوە و دووهەم لەوێ هەڵیگرت و هێنایە دەرەوە وە شتەکە ئەوەندەی دوو نیساب، یا زیاتر لە دوو نیساب بوو، ئەوە کەسیان دەستی نابڕرێ، لەبەرئەوە کە یەکەم ماڵەکەی دەرنەکردووەو دووهەمیش کە دەریکردووە لە تەواوی شوێنی پاراستنی دەرینەکردووە.

ئەگەر کەسێك نیسابێکی فڕێدا بۆ دەرەوەی شوێنی پاراستنی، یا خستیە ناو ئاوێکی ڕەوانەوە کە بۆ لای شوێنی پاراستنی ئەڕۆیشت و کابرای دز شتەکەی لە ئاوەکە دەرهێنا، یا ئەو کەسە شتەکەی خستە ناو ئاوێکی مەنگەوە کە ڕاوەستابێ، یا خستیە ناو ئاوێکەوە کە ئەڕوێشت بۆ غەیری ئەو شوێنە کە شتەکەی تیادا دەپارێزرێ وە لە هەردوو ئەم حاڵەتەدا کابرا ئاوەکەی بە دەست جووڵاند تا شتەکەی لێ دەرهێناو بردی، ئەوە دەستی ئەبڕرێ، بەڵام ئەگەر کابرا وازی لە ئاوەکە هێنا تا شتەکەی لەو دەورە دەرکرد، یاخود وازی لە ئاوە ڕاوەستاوەکە هێنا، کەچی بەهۆی لافاوێکی تازەوە شتەکە چوو بۆ دەرەوەی شوێنی پاراستنی، ئەوسا دەری هێنا، ئەوە دەستی نابڕرێ.

ئەگەر کەسێك نیسابێکی خستە سەر پشتی وڵاخێك کە لە ڕۆیشتندا بوو، یا لەبەر بایەکی بەهێزدا دایناو بایەکە لەو شوێنەی دەرکرد، ئەوە دەستی کابرای ماڵدەرکەر ئەبڕرێ، چونکە لەم سوورەتانەدا دەرکردنی شتەکە ئەدرێتە پاڵ ئەو کابرا نەك وڵاخەکە یا بایەکە وە ئەگەر نیسابێکی نایە سەر پشتی وڵاخێکی ڕاوەستاو و بەهۆی دانانی شتەکەوە ئەو وڵاخەکەوتە ڕۆیشتن و پاشان کەسێك ئەو شتەی برد، ئەوە هەر ئەو کەسە دەستی ئەبڕرێ کە ناویەتە سەر پشتی وڵاخەکە.

ئەگەر کەسێك شتێکی لە هۆدەیەکی داخراوەوە گواستەوە بۆ حەوشی خانووەکەو دەرگای حەوشەکە کرابووەوە، ئەوە دەستی ئەبڕرێ وە ئەگەر دەرگای حەوشەکە داخرابوو، دەستی نابڕرێ، هەروەها ئەگەر هەردوو دەرگاکە کرابونەوەو پاسەوانیشیان بەلاوە نەبوو، یاخود دەرگای حەوشەکە داخرابوو و دەرگای هۆدەکە کرابووەوە،

چونکە لە سوورەتی یەکەمداماڵەکەی لە شوێنی پاراستنی تەواوی دەرنەکردووەو لە سوورەتی دووهەمدا هەر لە شوێنی پاراستنیدا نییە.

ئەگەر میوان لە ماڵی خانەخوێ، یا دراوسێ لە دووکانی دراوسێکەی، یاخۆشۆر لە حەمام، یا ماڵکرێ لە دووکانی کراوەی سەر ڕێگوزەر شتێکیان دزی کە لە سندووق‌و دۆڵابی داخراودا نەبوو، ئەوە دەستیان نابڕێ، چونکە ئەو شتە دزراوە لە شوێنی پاراستنیدا نەبووەو بەراستی نەپارێزراوە.

**بزانن!** ئادەمیزادی ئازاد مەزموون نابێ بە داگیر کردن‌و دەست‌بەسەرا گرتنی؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك منداڵێکی ئازادی دزی کە گەردن‌بەندێکی نیسابی لە ملدا بوو، ئەوە دەستی نابڕێ، چونکە ئەو گەردن‌بەندە تابیعی شتێکە بە ماڵ ناژمێررێ؛ بەڵێ منداڵەکەی لە دەست وەردەگیرێتەوە لەگەڵ گەردن‌بەندەکەدا ئەگەر مابێ، ئەگینا پێی ئەبژێررێ‌و تەمبیەکی باشیش ئەکرێ.

ئەگەر کەسێکی ئازاد بەسەر وڵاخێکەوە نووستبوو کە لەناو کارواندا بوو و کەسێك لەغاوی وڵاخەکەی گرت‌و لە کاروانەکەی دەرکرد، ئەوە دەستی نابڕێ، چونکە مادام کابراکە بەسەریەوە نووستووە، وڵاخەکە لە ئیدارەی ئەودایە و ئەو کابرا خۆیشی مەزموونی نییە.

**بزانن!** لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە دەستی دزیان تیا نابڕێ، دزەکە تەعزیر دەکرێ.

## باسی شەرتی دز بۆ دەس‌برینی

شەرتی دز، ئەوەیە تەکلیفی لەسەر بێ‌و بە ئارەزووی خۆی دزییەکە بکاو ئەحکامی شەرعی لە ئەستۆدابێ؛ کەواتە دەستی دزێ نابڕێ کە منداڵ یا شێت یا زۆرلێکراو یا کافری حەربی بێ، بەڵام دەستی کافری زیممی ئەبڕێ بەهۆی دزینی ماڵی زیممی یا موسوڵمانەوە، هەروەکوو دەستی موسوڵمان ئەبڕی بەهۆی دزینی ماڵی موسوڵمان یا کافری زیممییەوە.

## دزی بەچی ئیسپات ئەکرێ؟

دزی سابت ئەبێ بە چەند شت؛

یەکەم، پێلێنانی دزەکە خۆی لەپاش ئیددیعای خاوەن ماڵەکە، بەو شەرتەکە تەکلیفی لەسەر بێ و بەئارەزووی خۆی ماڵەکەی دزیبێ و لە پێلێنانەکەیشیدا بە درێژی باسی دزییەکەی خۆی بکاو روونی بکاتەوە کەی دزیویە. مەزهەبی ئیمامی شافیعی وایە ئەگەر دزەکە پەشیمان بووەوە لە پێلێنانەکەی، لێی قەبووڵ ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك پێلێبنێ بە حەقێك لە حەقەکانی خوادا، وەکوو زیناو دزیو خواردنەوەی شەراب، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ پەشیمان ببێتەوە، هەرچەند پێلێنانەکەشی لەپاش ئەوە بێ کە مەحکەمەی شەرع ئیددیعای لێ بکا؛ سوننەتیشە بۆ قازی تا سێ جار بەمەعنا پێیان پیشان بداکە پەشیمانبینەوە، وەکوو ئەوەکە بڵێت: لەوانەیە ئەو ماڵەکە تۆ دزیوتە، لە شوێنی پاراستنی خۆیدا نەبووبێ، یا: ئەو ئافرەتەکە چوویتە لای، بە خێزانی خۆتت زانیبێ، یا: ئەو شەرابەی خواردووتەتەوە، واتزانیبێ ئاوە، بەڵام دروست نییە بەئاشکرا پێیان بڵێ پەشیمان ببنەوە لە پێلێنانەکەیان.

وە ئەگەر دزەکە لەپێش ئیددیعای خاوەن ماڵدا، یاخود لەپاش ئیددیعای وەکیلی خاوەن ماڵ کە خۆی دیار نەبێ، پێینا لە دزییەکە، ئەوە دەستی نابڕرێ تا خاوەن ماڵەکە حازر ئەبێ، چونکە لەوانەیە کاتێ کە کابرای خاوەنماڵ دێتەوە، پێلێبنێ بەوە کە ئەو ماڵەی زوو حەڵاڵ کردووە بۆ ئەو دزە؛ هەروەها، ئەگەر ماڵی منالێ یا شێتێکی دزی و پێیلێنا، دەستی نابڕرێ و چاوەڕوانی ئەوە منالە باڵغ ببێ، یا ئەو شێتە خۆش ببێتەوە، بەڵکوو پاش ئەوە ئەو خاوەن ماڵانە پێ لێبێن بەوەکە ئەو دزە بەشێکی لەوماڵەدا هەیە کە دزیویەتی، یاخود لەپێش ئەوەدا کە ئەڕۆن بۆ لای قازی بۆ ئیددیعا کردن، ئەو ماڵە دزراوە ببەخشن بە دزەکە، بەڵام لەپاش ئیددیعا کردنی خاوەنماڵ یا وەکیلی خاوەن ماڵی حازر، مەیدانی چاوەڕوانی کردن نییە، چونکە ئەگەر خاوەن ماڵ لەسەر دەستنەبڕینی دزەکە بوایە، ئیددیعای نەدەکرد، یاخود وەکیلی نەدەگرت بۆ ئیددیعا کردن لەو دزە.

دووهەمی ئەو شتانە کە دزییان پێ سابت ئەبێ، ئەوەیە کە کابرای ئیددیعاکەر سوێند بخوا لەسەر دزەکە پاش ئەوەکە دزەکە سوێندەکە بگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوو خۆی سوێند نەخوا.

سێهەم، ئەوەتە دوو کەسی شەهادەتڕەوا شەهادەت بدەن؛ شەرتە ئەم شاهیدانە هەرچی پێویستی بەجێ‌هاتنی دزییە لەشەرعدا، بەیانی بکەن؛ مەسەلا، بڵێن: فڵانکەس ئەوەندە ماڵی فڵانکەسی لە شوێنێکی وادا دەرکردووە کە جێگای پاراستنە بۆ ئەو جۆرەماڵە؛ جا ئەگەر دزەکە خۆی لەویادا بوو، ئیشارەت بکەن بۆ خۆی وە ئەگەر لەویادا نەبوو، ناوو بن‌و بنەچەی بەجۆرێکی‌وا باس بکەن کە هیچ شوبهەی تیا نەمێنێ. ئەگەر شاهیدەکان قسەیان بەتەواوی یەك نەئەکەوت، وەکوو ئەوەکە یەکێکیان بڵێ: پێش بەرەبەیان ماڵەکەی دزیوەو ئەویان، بڵێ: پاش هەتاوکەوتن بوو، ئەوە شەهادەتەکەیان بەتاڵە.

ئەگەر پیاوێك‌و دوو ژن شەهادەتیان دا لەسەر دزییەکە، ئەوە ماڵەکە سابت ئەبێ لەسەر دزەکە، بەڵام دەستی نابڕێ وکاتێ کە مالەکە سابت بوو، واجبە عەینی ماڵەکە بداتە دواوە، ئەگەر مابێ، ئەگینا بیبژێرێ.

لەپاش سابت‌بوونی دزی، دەستی راستی دزەکە ئەبڕێ لەیەکەم جمگەدا، جا ئەگەر پاش ئەوە جارێکی‌تر دزیی کردەوە، پێی چەپی ئەبڕێ لە قولاپەداو ئەگەر پاش ئەوەش دزیی کردەوە، دەستی چەپی‌و بۆ جاری چوارەمی دزی، پێی راستی ئەبڕێ. ئەگەر لەپاش ئەمانەش کابرا دەس بەردار نەبوو لە دزی، تەعزیرو تەمێ ئەکرێ بەجۆرێ کە پێشەوای موسوڵمانان بە قازانجی ئەزانێ وە لەپاش بڕینی ئەم ئەندامانەی، پێویستە شوێنەبڕاوەکەی بکرێ بە رۆنی هەڵقرچاودا بۆ ئەوەی لێی پیس نەکا و فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەمە لەسەر کابرای دزە خۆیەتی‌و ئەبێ خوێ مەسرەفی بدا.

ئەگەر کەسێك چەند جارێك دزیی کرد لە ماڵی کەسێك و پاش ئەوە ئیددیعای لێ‌کراو دزییەکەی لەسەر سابت بوو، ئەوە بەرابەر بەو چەند جارە دزییە هەر دەستی راستی ئەبڕێ، هەرچەند پەنجەکانیشی نەمابن وە ئەگەر دزیی کردو دەستی راستی بە

نەخۆشی داکەوت، ئەوە دەستی چەپی نابڕێ وە ئەگەر دەستی چەپی داکەوت، نابێ بە مانیعی بڕینی دەستی راستی، چونکە واجبی خۆیەتی وە هەر دەستێ کە بڕینی واجب بێ، ئەگەر پەنجەی زیادەی هەبێ، نابێ بە مانیعی بڕینی ئەو دەستە.

## باسی رێگرو جەردە (قُطّاع الطُّرق)

رێگر یا جەردە لە شەرعدا، بریتییە لە ئینسانێکی موسوڵمانی تەکلیف لەسەری وەها کە دەس درێژ بکا بۆ گیان یا ماڵ یا ناموسی کۆمەڵێك بە ئاشکرا، بەو شەرتە کە ئەم رێگرە هێزو تواناو دەسەڵاتی هەبێ و ئەو کۆمەڵەیش کە ئەم دەسیان درێژ ئەکاتە سەر، کەس نەبێ بێ بەهاواریانەوە لەبەرئەوە کە شوێنەکەیان دوور بێ لە ئاوەدانی، یا لەبەر بێهێزیی پادشای موسوڵمانان، یا بێهێزیی خەڵکی ئەو شوێنە، یا لەبەر هەر هۆیەکی تر، وەکوو ئەوە کە کۆمەڵێك بدەن بەسەر ماڵێکداو چەکیان لێ بسێنن و ماوەیان نەدەن هاوار ببەن بۆ کەس، خواه رێگر یەك کەس بێ یا کۆمەڵێك وە پیاو بێ یا ژنێکی ئازاو زۆردار کە دەرەقەتی کۆمەڵێك بێت یاوەکوو ئەوان بێت.

کەواتە، بە رێگر ناناسرێ کافری جەنگاوەرو کافری زیممی و پەیمان لەگەل کراو و منداڵ و شێت و کۆمەڵێکی وا کە هێزو تواناو دەسەڵاتیان نەبێ، بەڵام دەستدرێژ بکەنە سەرکاروان و رێبوارو پەلاماریان بدەن و پشتیان بەوە قایم بێ کەوا هەڵدێن و دوور ئەکەونەوە.

هەرکەسێ یا هەر کۆمەڵە کەسێك کە زاڵ ببن بەسەر کەسێك یا چەندکەسێکدا، ئەوە بە رێگر ئەناسرێن بە نیسبەت ئەو کەسە یا ئەو چەند کەسەوە کە بەسەریاندا زاڵ بوون، هەرچەند بەنیسبەت کۆمەڵێکی تری زۆرەوە بە بێهێز دابنرێن و دەسەڵاتیان بەسەریاندا نەبێ وە لە هەر حاڵەتێکدا کە کۆمەك بۆ کۆمەڵە پەلاماردراوەکە پەیدا ببێ کە رزگاریان بکا لە دەستی رێگرەکان، ئەوە ئەم کۆمەڵە پەلاماردەرە ئیتر بە رێگر ناناسرێن.

هەروەها، کۆمەڵێ کە رێبوار بترسێنن بەڵام رووتیان نەکەنەوەو کەس نەکوژن، ئەمانەیش بە رێگر ناناسرێن، بەڵام واجبە لەسەر حوکمڕانی موسوڵمانان تەمێیان بکاو نەهێڵێ وابکەن و ناچاریان بکا دەس بەرداری خەڵك ببن.

جا ئەگەر ڕێگرەکان نیسابی حەددی دزییان سەند لە خەڵك، یەکەیەکە دەستی ڕاست و پێی چەپیان ئەبڕرێ وە ئەگەر جاری دووهەم ڕێیان لە خەڵك گرتەوە، دەستی چەپو پێی ڕاستیان ئەبڕرێ وە ئەگەر پیاویان کوشت، ئەکوژرێنەوە وە ئەگەر پیاویشیان کوشتو ماڵیشیان لە خەڵك سەند، ئەوە ئەکوژرێنو ئەشۆرریٚنو نوێژی مردوویان لەسەر ئەکرێ، جا پاش ئەوە تا سێ ڕۆژ بە دارێکی پاندا هەڵدەواسرێن، ئەوسا ئەهێنرێنە خوارەوەو ئەشاررێنەوە.

وە هەرکەس بە ئارەزووی خۆی کۆمەکی کرد بەم ڕێگرانە؛ مەسەلا، شەو جێگەی کردنەوە یا نانی پێدان، ئەوە واجبە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان تەعزیرو تەمێیان بکا بە گرتن یا بە دوورخستنەوە بە هەرجۆرێ کە خۆی بە سوودی موسوڵمانانی بزانێ، لەگەڵ چاودێریی ئینسافو قیمەتی یارمەتییەکەیاندا.

**بزانن!** کوشتنی ڕێگر زیاتر وایە لەشێوەی قیساسدا ئەبێت؛ کەواتە، ڕێگر ناکوژرێتەوە لەجیاتی کوشتنی منداڵی یا وەچەی خۆی، یا لەجیاتی کافری زیممی وە ئەگەر نەکوژرا تا خۆی مرد، یا بەهۆیەکیترەوە کوژرا، دییە لە ماڵەکەی وەرئەگیرێ بۆ ئەو کوژراوانە کە قیساسیان وەرنەگیراوە وە ئەگەر کۆمەڵێکی کوشتبوو، ئەوە لە قیساسی یەکێکیاندا ئەکوژرێو دییە لە میراتەکەی ئەدرێ بۆ ئەوانیتر وە ئەگەر وەلیئەمری کوژراوەکە عەفوی کرد بەرابەر بە پارەیەك، ئەوە ئەو پارەیە واجب ئەبێو قیساس نامێنێ، بەڵام لەم کاتەدا هەر بە جیهەتی حەددی ڕێگر ئەکوژرێتەوە وە ئەگەر خەڵکی کوشتبوو بە شتێکی قورس یا بە بڕینی ئەندامی لەش، ئەوە هەر بەوجۆرە ڕەفتاری لەگەڵدا ئەکرێتەوە وە ئەگەر کەسێکی بریندار کردو ئەو کەسە لە پاشاندا خۆش بووەوە، ئەوە فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە کە قیساس واجب نییە لەم حاڵەدا.

**بزانن!** هەر سزایەك بکەوێتە سەر ڕێگر بەهۆی ڕێگرییەوە، ئەوە ئەگەر لەپێش ئەوەدا کە پادشای موسوڵمانان دەسی بەسەردا بگرێ، تەوبەی کرد، ئەو سزایەی لەسەر لائەچێ، بەڵام ئەگەر لەوەپاش تەوبەی کرد، هیچ کەڵکی نییە؛ بەڵێ، هەر سزایەك پەیوەندی بە سیفەتی ڕێگرییەوە نەبێ، وەکوو ئەوە کە کەسێکی کوشتبێ یاخود دەستی

کەسێکی بڕیبێ، ئەوە بە تەوبە لاناچێ خواه لەپێش تەوبەدا یا لەپاش تەوبە بگیرێت؛ بەڵێ، حەددی زیناو دزیو خواردنەوەی شەراب لەپاش سابت بوونی، هەرگیز لاناچێ، خواهکابرا تەوبە بکا یا نەیکا، بەڵام هەندێ لە زانایانی شەرع لەسەر پێچەوانەی ئەم فەرموودەیەنو بەڵگەیان هێناوەتەوە بەو ئایەتو حەدیسانە کە وائەگەریەنن تەوبە گوناه لائەبا، بەڵام نوێژنەکەر لەسەر هەردوو فەرموودەکە بەهۆی تەوبەوە حەددی لەسەر لائەچێ. هەموو ئەم فەرموودانە، بەنیسبەت زاهیری شەرعەوەن، ئەگینا لەبەینی ئینسان خۆیو خوادا هەرکاتێ تەوبەی راستەقینەی کرد، هەموو حەددێکی لەسەر لائەچێ، وەکوو لە «تُحفە»دا ئەفەرموێت.

## باسی کەوتنەیەکی چەند حەددێك

ئەگەر کەسێك قیساس و حەددی دزیو حەددی بوختانی زینای کەوتەسەرو ئیددیعای لێکرا، ئەوە لەپێشانا جەلدەی لێئەدرێ، ئەوجا دەستی ئەبڕێ، ئەوجا قیساسی لێئەستێنرێ و لەپاش دەسبڕینەکە دەسبەجێ دەست ئەکرێ بە کوشتنی، بەڵام لەپاش جەلدە لێدانەکە پێویست نییە دەسبەجێ دەستی ببڕرێ ئەگەر موستەحەقی کوشتنەکەی حازر نەبێ، هەروەها ئەگەر حازر بێو نەڵێ: زوو بە پەلە دەستی ببڕن تا منیش قیساسی خۆمی لێبستێنم.

ئەگەر موستەحەقی کوشتنەوەکە حەقەکەی خۆی دواخست، ئەوە جەلدەکەی لێ ئەدرێ؛ جاکە ئێشی ئەو جەلدە لێدانە دامردەوە، ئەمجار دەستی ئەبڕرێ؛ بەڵێ، ئەگەر موستەحەقی دەستبڕین حەقی خۆی دواخست، ئەوە هەر جەلدەکەی لێ ئەدرێ. واجبە لەسەر موستەحەقی نەفس خۆی رابگرێ تا دەستی کابرا ئەبڕن وە ئەگەر پەلەی کردو کوشتی، ئەوە ئەبێ دییەی دەستەکە بدا بەوکەسەکە موستەحەقی دەس بڕینەکەیە وە ئەگەر موستەحەقی جەلدە حەقی خۆی دواخست، ئەوە قیاس وایەکە موستەحەقی نەفسو ئەندام سەبر بکەن.

ئەگەر چەند حەددێك لە حەددەکانی خوا کۆبوونەوە، وەکوو ئەوە کە ئینسانێکی عازەب زینا بکاو شەرابخواتەوەو پاشگەزیش ببێتەوە لە ئایینی ئیسلام، ئەوە

هەرکام لەو حەددانە سووکتر بێ ئەویانە پێش‌ئەخرێ لەوەیان کە قورسەو هەروەها بە ریز وە ئەگەر چەند حەقێکی خواو ئادەمیزاد کۆبوونەوە، ئەوە حەددی بوختانی زینا پێش‌ئەخرێ لە حەددی زینا و حەددی زینا پێش‌ئەخرێ لە حەددی شەراب خواردنەوە و قیساسی گیان یا ئەندام پێش‌ئەخرێ لە حەددی زینا.

## باسی خوردنەوەو حەددی خواردنەوە

هەر خواردنەوەیەك کە زۆری ئینسان سەرخۆش بکا، کەمیشی وەکوو زۆری حەرامەو هەرکەسێ بیخواتەوە، کەمی یا زۆری، حەددی لێ ئەدرێ. شەرتی جێ‌بەجێ کردنی حەد چەند شتە:

یەکەم، ئەوەیە ئەو کەسەی ئەیخواتەوە موسوڵمان بێ.

دووهەم، ئەوەیە تەکلیفی لەسەر بێ.

سێهەم، ئەوەیە بە ئارەزووی خۆی بیخواتەوە؛

چوارەمیش، ئەوەیە ئەو کەسە کە ئەیخواتەوە بزانێ ئەوەی کە ئەیخواتەوە شەرابە؛ کەواتە، حەد نادرێ لە منداڵو شێت‌و کافری جەنگاوەرو زیممی و کەسێك کە بە زۆر شەرابی پێ بخورێتەوە یا بکرێ بە قورگیا، هەروەها کەسێ کە نەزانێ ئەوەی ئەیخواتەوە شەرابە.

ئەگەر نەوموسوڵمانێك شەرابی خواردەوەو ئیددیعای کرد کە نەیزانیوە شەراب حەرامە، حەددی لێ نادرێ وە ئەگەر بڵێت: ئەمزانی حەرامە، بەڵام نەمئەزانی حەددی لەسەرە، ئەوە حەددی لێ‌ئەدرێ؛ هەروەها، حەددی لێ‌ئەدرێ بە خواردنەوەی خڵتەی شەراب‌و شەرابێ کە وشك بووبێتەوە، بەڵام حەددی لێ‌نادرێ بە خواردنی نانێ کە هەویرەکەی بە شەراب شێلرابێ، یا بە خواردنی هەوێرێ کە شەرابی تێ‌کرابێ وە بە هۆی بەکارهێنانی شافێ کە بە شەراب دروست کرابێ، هەروەها ئەگەر وەکوو بڕنووتێ بیکا بە لووتیا.

ئەگەر کەسێك پاروویەك گیرایە قوڕگی‌و لە شەراب بەولاوە شتێك نەبوو خۆی پێ رزگار بکا، ئەوە دروستە بۆی ئەوەندە بخواتەوە کە پاروەکە بەرێتە خوارەوەو رزگاری

بکا. فەرموودەی راستتر ئەوەیە حەرامە شەراب بخورێتەوە بۆ تەداوی یاخود بۆ نەهێشتنی تینوویەتی، بەڵام کابرا حەد لێدانی واجب نابێ، بەڵام ئەگەر دەرمانەکە تێکەڵ بوو لە شەراب‌و شتی تر بەجۆرێ کە شەرابەکە کارێکی زۆر نەکاو دوکتۆرێکی لە خواترس وتی: قازانجی هەیە، ئەوە دروستە تیماری پێ‌بکا؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك لەبرسانا یا لەبەر تینوویەتی ترسی مردنی هەبێ، دروستە بیخواتەوە.

حەددی شەراب خۆری ئازاد، چل جەلدەیە بە تووڵ‌و بەدەست‌و بە کەوش‌و بە چمکێ چڵ وە ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان وای بە باش زانی هەشتا داری لێ بدا، ئەوەش دروستە و هەرچەندی لە چل دارەکە زیاتر لێ بدا، بە تەعزیر دائەنرێ.

حەد ئەدرێ لە ئینسان بەوە کە خۆی پێی لێ‌بنێ کەوا شەرابی خواردووەتەوە، یا دوو پیاو شەهادەت بدەن کە خواردوویەتیەوە، نەك بە بۆنی دەم یا بە رشانەوە. بەسە ئەوەندە کە لە پێ‌لێنانەکەیدا بڵێ: شەرابم خواردووەتەوە، یا شاهیدەکە لە شەهادەکەیدا بڵێ: شەرابی خواردووەتەوە وە لە فەرموودەیەکدا، پێویستە شاهیدەکە ئەوەش بڵێ کە: زانیویە شەرابەو حەرامەو بە ئارەزووی خۆی خواردوویەتیەوە.

بزانن! داری حەد لە حەددی زیناو بوختان‌و شەراب خواردنەوەدا، لە بەینی تووڵی نەرم‌و رەق‌و وشك‌و تەڕدایە بەجۆرێ کە ئازاریان هەبێ‌و لەوانەش نەبن بە عادەت ئادەمیزاد بکوژن. ئەم جەلدانە، دابەش ئەکرێن بەسەر ئەندامی لەشدا، بەڵام نادرێن لە روخسارو جێگەی کوشندەی وەك کەلەکەو میزەڵدان وە دروست نییە دەستی کابرا ببەسترێ یا رووت بکرێتەوە لە جل‌و بەرگ؛ بەڵێ، ئەو پۆشاکەی کە زۆر قایم بێ‌و رێگا لە ئێشی دارەکان بگرێ، دادئەکەنرێ بۆ ئەوەکە لووت شکاندنی کابرا بێتەدی. هەروەها سەرخۆش لەکاتی سەرخۆشیدا جەلدەی لێ نادرێ.

## باسی تەعزیر

هەر گوناهێ کە حەددو کەفارەتی تێدا نەبێ، تەعزیری تێدا هەیە و پێشەوای موسوڵمانان تەعزیرو تەمێ بەجێ‌دێنێ بە حەپس کردن، یا لێدان بە شەقازلە، یا بە

لۆمەو سەرزەنشت وە حەقی ئیجتیهادی هەیە لە دیاریکردنی جۆر یا ئەندازەی ئەم تەعزیرەدا؛ جا ئەگەر داری لێدا، پێویستە لە چل دار کەمتر بێ، چونکە دروست نییە تەعزیر بگاتە پلەی حەد. هەموو گوناهێکیش وەك یەك وان لەوەدا کە پێویستە تەعزیریان لە ئەندازەی حەد کەمتر بێ. ئەگەر موستەحەقی حەد کابرای عەفو کرد لە شوێنێکا کە عەفو تەئسیری تیا هەبێ، ئەوە پێشەوای موسوڵمانان حەقی تەعزیری نییە وە ئەگەر موستەحەقی تەعزیر کابرای عەفو کرد، حەقی تەعزیر هەر ئەمێنێتەوە بۆ پێشەوای موسوڵمانان.

## باسی غەزا (کتابُ السِّیَرِ) و ئەو شتانەی کە بەسراون بە غەزاوە [و فەرزی کیفایە]

غەزا لەپێش کۆچ کردنی پێغەمبەرداﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە، حەرام بووە؛ وە لەو زەمانەدا حەزرەت تەنها فەرمانی ئەوەی پێدرابوو کە ئایین بە دەم رابگەیەنێ بە خەڵکداو ئایەتیان بۆ بخوێنێتەوەو موژدە بدا بەوانەی کە فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەن کەوا دەچنە بەهەشت و ئەوانە بترسێنێ کە مل پێچی لێدەکەن کەوا لە دۆزەخدا سزا ئەدرێن وە پاش ئەوە کە کۆچی فەرموو بۆ مەدینەی مونەووەرە، فەرمانی پێدرا کە غەزا بکا. غەزا لە زەمانی پێغەمبەرﷺ خۆیدا، فەرزی کیفایە بووە، بەڵام لەپاش وەفاتی ئەو، دوو حاڵەت هەیە؛ یەکەم، ئەوەیە کە کافران لە وڵاتی خۆیاندا بن؛ لەم حاڵەدا ساڵی یەك جار غەزا فەرزی کیفایەیە وە ئەم غەزایە بەوە ئەبێ کە لەشکری ئیسلام سنووری وڵاتی خۆی دابگرێو هەر شوێنێکی شوێنی ترس بێ کە کافران لەشکری تێبێنن، ئەمان لەشکری تیا دانێن وە بەوەیش ئەبێ کە لەشکری ئیسلام بچێتە خاکی وڵاتی کافران، ئەگەر عەهدو پەیمانمان لەگەڵیاندا نەبێ.

ئەم جورە غەزایە واجب نییە لەسەر منداڵ و شێتو ژنو نەخۆشو شەلو کوێر و لەسەر کەسێ کە مەسرەفو ئەسبابی شەڕکردنی نەبێ، و هەر عوزرێ کە رێگا بگرێ لە واجب بوونی حەج، رێگاش ئەگرێ لە واجب بوونی غەزا تەنها ترسی رێگا نەبێ لە

کافران و لە دزو جەردەی موسوڵمان؛ ئەمانە نابن بە بیانوو وە هەر قەرزێ کە وەعدەی هاتبێ، مەنعی سەفەرکردن بۆ غەزا ئەکا، مەگەر بە ئیزنی خاوەن قەرزەکە.

لەم حاڵەدا، حەرامە لەسەر مناڵ بەبێ ڕێگادانی باوکیو دایکی بچێ بۆ غەزا، ئەگەر باوك و دایکی موسوڵمان بن، بەڵام سەفەری خوێندن و فێر بوون و هەر شتێ کە فەرزی عەین بێ یا فەرزی کیفایە بێ، ئەوە پێویستی بە ئیزنی دانی باوكو دایك نییە. ئەگەر باوكو دایك ئیزنی مناڵیان دا بچێ بۆ غەزا، یا خاوەنقەرز ڕێگای قەرزارەکەی دا وە لەپاشا پەشیمان بوونەوە، ئەوە ئەگەر نەگەیشتبوونە ریزی شەڕ، واجبە زوو بگەڕێنەوە، ئەگینا حەرامە بگەڕێنەوە.

حاڵەتی دووهەم، ئەوەیە کە کافرەکان بێنە وڵاتی موسوڵمانانەوە؛ لەم حاڵەتەدا، غەزا واجب ئەبێ لەسەر هەرکەسێ کە توانای هەبێ لە ئەهلی ئەو شوێنەو ئەوکەسانەی کە لە مەسافەی دروست بوونی نوێژ کورتکردنەوە نزیکترن لەو شوێنەوە وە ئەگەر کافرەکان بەبێ جەنگ نەئەچوونە دەرەوە، ئەوە واجبە لەسەر دەوڵەمەندو فەقیر، بەڵکوو لەسەر قەرزار بەبێ ڕێگادانی خاوەن قەرزەکە و لەسەر منداڵ بە بێ ڕێگادانی باوكو دایکی، بڕۆن بۆ غەزا لەگەڵیانا؛ جا ئەگەر کافرەکان بەمانە دەرنەکران، فەرزە لەسەر موسوڵمانانیتر کە لە مەسافەی دروست بوونی نوێژ کورت کردنەوەدان یا دوورترن لەو مەسافەیە، بڕۆن بۆ یارمەتیدانی خەڵکی ئەو شوێنانە کە کافر داگیریان کردوونو دەریانبکەن.

هەر پیاوێكو هەر ژنێکی موسوڵمان کە کافر بە نیازی جەنگ روویان تێبکا، واجبە لەسەریان بە هەرجۆرێ کە ئەتوانن بەربەرەکانێ بکەنو خۆیان نەدەن بە دەستەوە وە ئەگەر لەو باوەڕەدا بوون کە کافرەکان دیل ناکوژنو ناموسیان نابەن، دروستە لەکاتی ناچاریدا خۆیان بدەن بەدەستەوە.

فەرزی کیفایە، تەنها غەزا نییە، بەڵکوو هەرچی بەسوود بێو پێویست بێ بۆ مانەوەی ئایینو هێزی موسوڵمانان، واجبە جێبەجێ بکرێت؛ مەسەلا، لە فەرزی کیفایەیە ڕاگرتنی باوەڕی ئیسلامەتی بەهۆی ئەو زانایانەوە کە ئەتوانن بە بەڵگەو دەلیل

ئیسپاتی راستیەتی ئایینی ئیسلام بکەنو دەفعی شوبهەو گومان بکەن لە بیروباوەڕی موسوڵمانان؛ هەروەها، فەرزی کیفایەیە راگرتنی عولوومی دینی، وەك تەفسیرو حەدیس و ئوسووڵی حەدیسو ناوی ئەو کەسانە کە بەڕیز حەدیسیان دەم بەدەم گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ زانینی هۆیەکانی «جَرْح»و «تَعدیل»و ئاگاداری لە حەدیس بە هەموو جۆرەکانیەوە.

هەروەها فەرزی کیفایەیە زانینی عیلمی «ئوسوولی فیقه» بە تەفسیلو زانینی لقەکانی «فیقه»و ئەو مەسئەلانە کە جێگەی یەکێتی قسەی زانایانی شەرعن وە یا جێگەی جیایی قسەی زانایانی شەرعن، بەجۆرێ کە هەمیشە کۆمەڵە زانایەکیوا پەیدا ببن رەوا بن بۆ پایەی قازییەتیو فتوادان لە حوکمەکانی ئیسلامەتیدا.

هەروەها فەرزی کیفایەیە لە هەموو دوو مەنزڵێکدا «موفتی»یەك وە لە هەر مەسافەیەکی نیوڕۆژەڕێگەدا قازییەك هەبێ بۆ ئەوە کە ئیشوکاری موسوڵمانان پەکی نەکەوێ وە فەرزی کیفایەیە زانینی هەر عیلمێك کە پێویست بێ بۆ زانینی قورئانی پیرۆزو حەدیسی پێغەمبەرﷺ و ئەحکامی دین، وەك سەرفو نەحوو زمانی عەرەبیو مێژوو و بەلاغەو ئینشاو عەرووزو ئادابی مونازەرەو مەنتیقو غەیری ئەمانە لەو عیلمانە کە پێویستن بۆ ئایین، وەك عیلمی نووسینی خەت.

وە فەرزی کیفایەیە زانینی عیلمی هەندەسەو حیساب بۆ دابەش کردنی میراتو ماڵی تێکەڵو وەسیەتجێبەجێ کردنو بەڕێوەبردنی مامەڵەی خەڵك. هەروەها فەرزی کیفایەیە هەمیشە کۆمەڵێك هەبێ قورئانی پیرۆزیان لەبەربێ بۆ پاراستنی قورئان لە فەوتان وە هەموو ساڵێ لە وەختی حەجدا کۆمەڵێك لە موسوڵمانان زیارەتی کەعبە بکەن بۆ ئەوەی هیچ ساڵێ چۆڵ نەبێ، خواه لەنزیکەوە بڕۆن یا لە دوورەوە، بەجۆرێ کە نیشانەی حەج جێبەجێ بکرێت.

هەروەها فەرزی کیفایەیە لە هەموو قەرەباڵغێکی موسوڵمانانا نوێژەکان بە جەماعەت بکرێن تا نیشانەی ئیسلامەتی دیار بێ وە فەرزی کیفایەیە هەمیشە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان عیلمی «طِب» بزانن بۆ تیمار کردنی نەخۆشو برینداری ناو کۆمەڵ.

هەروەها کۆمەڵێکیش هەبن هەموو جۆرە پیشەسازییەکی پێویست بزانن بەنیازی پاراستنی وڵات لە دوژمن و جێبەجێ کردنی پێویستی یەکانی کۆمەڵ و بەرزکردنەوەی پلەی ئاوەدانی، بە پێی توانا وە فەرزی کیفایەیە راکرتنی بازرگانی و کشتوکاڵ و باخ و بێستان و بەخێو کردنی حەیوانات و خەریك بوون بە هەر وردە پیشەیەکەوە کە پێویست بێ بۆ ئادەمیزاد بۆ خۆشی ژیان و بەرزبوونەوەی پلەی گوزەران و سەربەخۆیی موسوڵمانان لەناو گەلانی تردا.

فەرزی کیفایەیە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بە چەند شەرت؛

[شەرتی] یەکەم: ئەو چاکەو خراپەیە بەپێی مەزهەبی ئەو کەسە بێ کە ئەمرو نەهیەکەی لە گەڵدا ئەکرێت؛ بەڵێ، مێردی ژن ئەتوانێ مەنعی ژنەکەی بکا لە شتێ کە لای ژنەکەی دروست بێ و بە عەقیدەی ئەم خۆی حەرام بێ، وەکوو ئەوەکە پیاوێکی شافیعی مەزهەب مەنعی ژنی حەنەفی مەزهەبی خۆی بکا لە خواردنەوەی «نَبيذ»وە قازی ئەتوانێ مەنعی کەسێ بکا لە شتێ کە لە مەزهەبی ئەو کەسەدا دروست بێ بەڵام لە مەزهەبی قازی خۆیدا دروست نەبێ، وەکوو مەنعی قازی شافیعی مەزهەب بۆ پیاوێ کە ژنێکی لەسەر مەزهەبی حەنەفی بە بێوەلی مارە کردبێ، بەو شەرتە کە ئەو مەسئەلەیە بە سوورەتی دەعوا ببرێ بۆلای قازی و لەپێش ئەوەدا قازییەکی حەنەفی مەزهەب حوکمی نەکردبێ بە دامەزرانی ئەو مەسئەلەیە.

شەرتی دووهەم: ئەوەیە کابرا ئەمین بی لە گیان و ناموس و ئەندام و ماڵی خۆی یا کەسێکی تر، ئەگینا واجب نییە ئەمر بە چاکەکەو نەهی لە خراپەکە بکا؛ جا ئەگەر ترسەکەی لە خۆی بوو، ئەوە هەر دروستە بیکاو خۆی لەبەر ئازارو مەینەتدا رابگرێ وە ئەگەر ترسی لە کەسێکی تر بوو، حەرامە ئەو کەسە تووشی ئەو دەردو مەینەتە بکاو دروست نییە ئەو ئەمرو نەهیە بکا.

شەرتی سێهەم: ئەوەیە باوەڕی وانەبێ ئەو کەسە کە ئەمرەکەی پێ ئەکا یا نەهیەکەی لێ ئەکا مل پێچییەکی زۆر ئەکا، یاخود کردەوەیەکی خراپی لێ ئەوەشێتەوە، ئەگینا واجب نییە.

**چوارەمیش: ئەوەیە ئەو ئەمرو نەهیە هەرای لێ پەیدا نەبێ، ئەگینا حەرامە توخنی بکەوێ.**

فەرزی کیفایەیە موسوڵمان ببێ بە شاهید لە هەر ئیشێکی حەڵاڵداو لەکاتی پێویستیشدا شەهادەتەکە بدا، بەو شەرتە لە دانی ئەو شەهادەتەوە هەرایەك بەرپا نەبێ‌و کابرا ئەمین بێ لە گیان‌و ماڵ‌و ئەندام‌و ناموسی خۆی‌و هەرکەسێکی تر. هەروەها فەرزی کیفایەیە دەفعی زیان لە موسوڵمان، وەکوو پۆشتەکردنەوەی رووت‌و تێرکردنی برسی لەکاتێکا کە لە رێگای «بیتُ المال» یا زەکاتی دوڵەمەندانەوە ئەم جۆرە شتانە جێبەجێ نەکرێن. هەروەها واجب‌و فەرزی کیفایەیە کفن‌و دفن‌کردنی مردوو ئەگەر خۆی هیچی لێ بەجێ‌نەمابێ و لەو شوێنەدا «بیت المال» ئەوەندە رێك‌وپێك نەبێ کە ئەم ئەرکانە بەجێ‌بێنێ. هەروەها فەرزی کیفایەیە لەسەر کۆمەڵ کە هیچ‌نەبێ یەکێکیان جوابی سەلام بداتەوە وە سوننەتی کیفایەشە یەکێك لەناو کۆمەڵێکدا سەلام بکا لە خەڵکی‌تر.

غەیری ئەم شتانەی باسمان کردن، فەرزی کیفایەی‌تر زۆرە ـ وەکوو لە کتێبە گەورەکانا نووسراون ـ و مەسرەفی ئەم فەرزانە لەسەر «بیتُ المال»ە، ئەگەر رێك‌وپێك بێ، ئەگینا لەسەر هەموو ئەو کەسانەیە کە خاوەن‌ماڵ‌و خاوەن‌هێزو توانان لەناو موسوڵمانانا.

جا وەکوو لەپێشەوە وتمان، غەزا یا فەرزی کیفیایەیە یا فەرزی عەینە. هەرچۆن بێ، غەزا بە بێ رێگادانی پێشەوای موسوڵمانان یا جێ‌نشینی ئەو، کەراهەتی هەیە، چونکە ئیشێکی مەترسی‌دارەو پێویستی بە شت‌ومەکی جەنگییەو نان‌و خۆراکی دەوێ‌و تەماشاکردنی باری جیهانی دەوێ‌و ئەم جۆرە ئیشەیش بە غەیری پێشەوای موسوڵمانان ناکرێ.

سوننەتە هەرکاتێ پێشەوای موسوڵمانان لەشکری نارد بۆ غەزا، یەکێکی وا کە باوەڕی پێی ببێ‌و متمانەی لە عەقڵ‌و لێهاتوویی‌و تێ‌گەیشتنی هەبێ، بیکا بە گەورەی موسوڵمانان‌و فەرمانی بداتێ کە بە دادپەروەری لەگەڵ لەشکرەکەیدا بجووڵێتەوە؛

هەروەها، گفتو پەیمانیش لە ئەندامانی لەشکرەکە وەربگریّ کـە لە فـەرمانی خـوا دەرنەچنو بەگوێی سەرلەشکرەکەیان بکەنو لەکاتی شەڕا خۆیان ڕاگرنو هەڵنەیەن.

دروستە لەکاتی پێویستیدا پێشەوای موسوڵمانان یارمەتی وەربگریّ لەکافران، بەو شەرتەکە دڵنیا بێ لەوەکە خەیانەت ناکەن لێیو ئەوەندەیش بن کە ئەگەر فەرز بکەین لەگەڵ کافرە دوژمنەکاندا ببن بە یەك، لە دوو قـاتی ئـێمـە زیـاتر نـەبن. دروسـتیشە ئینسانێکی نابالّغیوا کە نزیك بێ بالّغ ببێ بچێتە ناو سوپاوە، بەو شەرتە ئازاو بەهێز بێ.

پێشەوای موسوڵمانان ئەتوانێ چەکی سوپا لە ماڵی خۆی بدا، وەکوو ئەتوانێ لە ماڵی «بیتُ المال» بیدا وە دروست نییە موسوڵمان بەکریّ بگریّ بۆ غەزا، چونکە کریّ بەرابەر بە فەرز نادریّ، ئەوماڵەش کـە سـوپای مـووچەخۆر وەریئـەگـرن لە مـاڵی دەسکەوتووی غەزای کافران، یاخود ئەو زەکاتەی کە سەربازی داوتەڵەب (مُتَطوِّع) وەریئەگرن، بە کۆمەكو یارمەتی دائەنریّ نەك بە کریّ.

جا کاتێ کەوتینە جەنگەوە لەگەڵ کافران، دروست نییە منداڵو شێتو ژنو خونسا بکوژین، مەگەر کەوتبنە جەنگەوە لەگەڵمان وەکەراهەتی هەیە غەزاکەر خزمی خۆی بکوژێ، بەتایبەتی ئەگەر مەحرەم بێ پێی، وەکوو باوكو باپیرەو کوڕو کوڕەزاو براو برازاو مام، مەگەر ئەمانە بە ئاشکرا جنێو بدەن بە خوداو بە پێغەمبەر. هەروەها دروست نییە ئەوکەسەی کە کافران بۆ ئیشێك بینێرن بۆ لامان بیکوژین، چونکە فروستادە هیچی لەسەر نییە.

لەبارەی ڕەبەن (ڕاهِب)و کرێکارو پیرو کوێری کافرانەوە، ئـیمامی شـافیعی دوو فەرموودەی هەیە؛ یەکەم ـکە فەرموودەیەکی بـەهێزە ـ ئـەوەیە دروسـتە بکـوژرێنو دروستیشە بهێڵرێنەوە؛ فەرموودەی دووهـەمیشی ئـەوەیە دروست نـییە بکـوژرێنو پێویستە بهێڵرێنەوە؛ ئەم حوکمە، ئەمڕۆ بەپێی مەسڵەحەتی موسوڵمانانەو پێشـەوای موسوڵمانان چی بە باش بزانێ ئەوە ئەکرێ وە ئەتوانێ بە پێی بیرو ڕای خۆیو ڕاوێژو تەدبیری موسوڵمانان ڕەفتار بکا وە هەر کافرێکی ئازادی بە دیل گرت، ئەتوانـێ یـا

بیکوژێ یا بیکا بە بەندە یا منەت بنێتە سەر کافرەکان‌و بەرەڵڵای بکا بە خۆڕایی یا بەرابەر بە ئەندازەیەك پارە ئازادی بکا.

دروستە بۆ پێشەوای موسوڵمانان دەوری کافرەکان بگرێ لە شار یا لە قەڵاداو ئاویان بەسەرا بشکێنێتەوە بۆ ئەوە کە شوێنەکەیان بخنکێ وە ئەتوانێ خانوویان برووخێنێ‌و باخیان ببڕێ‌و دەغڵ‌ودانیان بسووتێنێ، ئەگەر ئەم کردەوانە ببن بەهۆی داگیرکردنی شوێنی کافرەکان‌و زاڵبوون بەسەریاندا، بەڵام حەرامە فەوتاندنی حەیوانات‌و مەڕو ماڵاتیان تەنها ئەو وڵاخی سوارییانە نەبێ کە سواریان دەبن‌و شەڕیان پێوە ئەکەن. هەروەها دروستە لەکاتی بێ ئاگایی‌دا بدا بەسەریانا، هەرچەند موسوڵمانیشیان لەناودا بێ، خواه ئەو موسوڵمانانە دیل بن لا یان یاخود بۆ کاسبی‌و بازرگانی چووبنە ناویان.

وە ئەگەر شەڕ گەرم بوو و کافرەکان دەوری خۆیانیان گرت بە ژن‌و منداڵی خۆیان، ئەوە هەر دروستە شەڕیان لەگەڵدا بکرێت، ئەگینا ئەمە ئەکەن بەهۆی ئەوە هەرکاتێ کەوتنە تەنگییەوە بەم‌جۆرە خۆیان رزگار بکەن، بەڵام ئەگەر ناچار نەبین بۆ ئەم شەڕە، واتە ئەگەر بە بێ شەڕ زاڵ ببین بەسەریاندا، ئەوە لەم کاتەدا شەڕیان لەگەڵدا ناکەین بۆ ئەوە کە ئەو منداڵانەو ئەو ژنانە نەکوژرێن وە ئەگەر دەوری خۆیانیان گرت بە ژن‌و منداڵ‌و پیاوی موسوڵمانان، ئەوە تا ناچار نەبین شەڕیان لەگەڵ ناکەین بۆ پاراستنی موسوڵمانەکان؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم فێڵەیان بۆ ئەوە کرد کە بیکەن بەهۆی زاڵ بوون بەسەر ئێمەدا، ئەوە ناچارین شەڕیان لەگەڵ ئەکەین.

حەرامە لەسەر ئەو موسوڵمانەی لە ریزی جەنگدایە لە ریز دەرچێ‌و پشت‌هەڵکا، ئەگەر کافرەکان لە دوو قاتی ئێمە زیاتر نەبن، مەگەر بۆ فێڵی شەڕ، واتە بە فێڵ خۆی بشکێنێ بۆ ئەوە کە لەپاشا زاڵ ببێ بەسەریانا، یا بۆ ئەوە کە بڕوا بۆ سەنگەرێکی مەحکەم یا لە هەتاو دەرچێ بۆ سێبەر یاخود بڕوا بۆ ناو کۆمەڵێکی تر لە موسوڵمانان کە لەگەڵ ئەواندا باشتر شەڕی پێ بکرێ.

جا ئەگەر ئەم کۆمەڵە نزیك بوون لە کۆمەڵەکەی خۆیەوە، ئەوە هەروەکوو ئەوە وایە کە لەناو ئەواندا بێ وە ئەگەر بە عورف دوور بن لە کۆمەڵەکەی خۆیەوە، ئەوە ئیتر بە جیا

دائەنرێ لەو کۆمەڵی پێشووە وە ئەگەر ئەمان تاڵانێکیان گرت، ئەو لەگەڵیاندا بەشدار نابێ.

وە ئەگەر کافرەکان لە دوو قاتی ئێمە زیاتر بن، دروستە هەڵبێین لەبەریاندا، هەروەها ئەگەر ئێمە ئەسبابی جەنگمان بەدەستەوە نەماو ئەوان خاوەن چەك بوون، چونکە خۆگرتن لەم حاڵەدا ئەبێ بەهۆی فەوتانی سوپای ئیسلام بە بێ‌سوودو قازانج؛ بەڵێ، ئەگەر زیادەکەیان ژمارەیەکی کەم بوو و ئیسلامەکانیش خاوەن هێزو خاوەن‌چەك بوون، ئەوە دروست نییە لەبەریان هەڵبین.

ئەگەر کافرێك داوای شەڕەمەیدان (مُبارَزَە)ی لە موسوڵمانان کرد، دروستە یەکێ لە ئێمە بڕواتە مەیدانەوە لەگەڵی، بەشەرتێ کە پێشەوای موسوڵمانان ڕێگای بداو کابرایش خاوەن هێز بێ‌و خۆی تاقی کردبێتەوە.

## باسی پیاوو ژن‌و منداڵ‌و ماڵی کافران کە بکەونە دەستی موسوڵمانان

ژن‌و منداڵی کافران کە لە جەنگدا گیران، ئەکرێن بە بەندەو پێشەوای موسوڵمانان ئارەزووی خۆیەتی چی‌ئەکا لە پیاوە بەدیل گیراوەکانیان، ئەتوانێ هەرکام لەو سێ کردارەیان لەگەڵ بکاکە پێشان باسمان کردن. ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان زوو نەیزانی چییان پێ‌بکا باشترە ڕاگیریان بکا تا بەرچاوی ڕۆشن ئەبێتەوە. ئەگەر ئەو کافرەی کە کەوتووەتە دەستی موسوڵمانان موسوڵمان بوو، ئەوە کوشتنی دروست نییە، بەڵام ئەتوانێ یا بیکا بە بەندە یا بەخۆڕایی بەرەڵڵای بکا وە ئەگەر کافرێك بەر لەوە کە بکەوێتە دەستی موسوڵمانان موسوڵمان ببێ، ئەوە خۆی‌و منداڵی نابالغی ئەپارێزرێن لەو سێ کردارە کە لەپێشا باسمان کردن؛ هەروەها، ماڵیشی تاڵان ناکرێ‌و دانانرێ بە دەسکەوتی جەنگ، بەڵام بۆ ژنەکەی، دوو فەرموودەی ئیمامی شافیعی هەیە؛ یەکەم، ئەوەیە کە ناپارێزرێ‌و ئەکرێ بە کەنیزەك، چونکی ئەو کەسێکی سەربەخۆیە؛ فەرموودەی دووهەمیشی ئەوەیە کە چاوەڕێ ئەکەین تا «عِدَّە»ی تەواو ئەبێ؛ جا ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان ئازادی کرد، ئەدرێتەوە بە مێردەکەی و ئەگەر ئازادی نەکرد،

ئەوە ئەکرێ بە کەنیزەك و ئەخرێتە ریزی دەسکەوتی جەنگەوە. ژنی زیممی و ئازادکراویشی، ئەگەر شەڕکەر بن، ئەکرێن بە کۆیلە (رَقیق)، بەڵام ئازادکراوی ئینسانی موسوڵمان و ژنیشی، ئەگەر لە جەنگدا بگیرێن، ناکرێن بە کۆیلە.

ئەگەر ژن و مێردێك بەیەکەوە گیران، یا یەکێکیان بەتەنها گیرا، ئەوە نیکاحی بەینیان هەڵئەوەشێتەوە، خواه وەختی خۆی ئازاد بووبن یا کۆیلە بووبن. هەروەختێ کافری شەڕکەر گیرا و کرا بە کۆیلە، ئەو هەر قەرزێ کە بەسەریەوە بێ لەسەری لاناچێ، خواه قەرزی موسوڵمان بێ یا هی کافری زیممی بێ یا هی کافری پەیمانلەگەڵکراو یا متمانە پێدراو و ئەو قەرزەی لە ماڵی خۆی ئەدرێتەوە ئەگەر لەپاش ئەوە کە کرا بە کۆیلە ماڵەکەی بکەوێتە دەستمان.

ئەگەر کافرێکی شەڕکەر قەرزی کردبوو لە کافرێکی شەڕکەر و لەپاشاندا هەردووکیان موسوڵمان بوون، یا قەبووڵی جیزیەیان کرد، ئەوە ئەو قەرزەی لەسەر ئەمێنێتەوە، هەروەها ئەگەر شتێکی بە قەرز لێ کڕیبێ؛ بەڵێ، ئەگەر ماڵێکی فەوتاندبوو و لەپاشاندا هەردوولا موسوڵمان بوون، ئەوە ئەو ماڵە نابژێررێ.

هەر ماڵێ بە زۆر لە کافری شەڕکەر وەربگیرێ، خواه ئەو ماڵە لەوانە بێ بگوێزرێتەوە یا نەگوێزرێتەوە، ئەوە بە دەسکەوتی جەنگ دائەنرێ. هەروەها ئەو ماڵە کە یەکێ یا دووکەس یا زیاتر بە دزی بیدزن لە ماڵی کافری شەڕکەر، یا وەکوو «لُقطە» (دۆزراوە) وەری بگرن و لە ماڵی موسوڵمان نەچێ، ئەگینا پێویستە تەعریف بکرێت بەڵکوو خاوەنەکەی بدۆزرێتەوە.

وە دروستە بۆ ئەم کۆمەڵەی سوپایە کە دەسکەوتی جەنگ وەرئەگرن، بە ئارەزووی خۆیان لەو ماڵی دەسکەوتە بخۆن، چ خواردەمەنی قووت و چ میوە و چ لەو شتانە بێ کە بۆ لەزەت ئەخورێن و ئەتوانن لە حەیواناتیان سەربڕن بۆ خواردنی خۆیان؛ هەروەها، ئەتوانن ئالف و ئالیکی وڵاخی سواریی خۆیانی لێ بدەن وە قیمەتی ئەمانەیش ناکەوێتە سەریان، چ فەقیر بن و چ دەوڵەمەند بن، بەڵام ئەم جۆرە تەسەڕوفانە دروست نین بۆ ئەو کەسانە کە لەپاش جەنگ و وەرگرتنی ماڵەکە هاتوون.

هەر سەربازێك گەڕایەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانانو لەم ماڵی دەسکەوتی جەنگە شتێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، پێویستە بیخاتەوە سەر ئەو ماڵە تا دابەش ئەکرێ لەنێوانی موستەحەقەکانیا.

هەر کەس لەم غەزاکەرانە کە خاوەن روشد بێ، ئەتوانێ بەر لە دابەش کردن دەسبەرداری حەقی خۆی ببێو هیچ لە دەسکەوتی غەزاکە وەرنەگرێ، هەرچەند لەپاش جیاکردنەوەی پێنج یەکەکەیش بێ؛ هەروەها، هەموو غەزاکەرەکان ئەتوانن دەسبەرداری حەقی خۆیان ببن بۆ «بیتُ المال»، بەڵام خزمانی پێغەمبەرﷺ، لە "بَنی هاشِم"و "بَنی مطَّلِب"، دروست نییە دەسبەردار ببن لە بەشی خۆیان، چونکی بەشی ئەوان بەزۆرەو جگە لەو پێنج یەکە هیچ بەرهەمو دەسکەوتێکی تریان نییە.

هەروەها ئەگەر موسوڵمانێك کافرێکی کوشت، دروست نییە دەستبەردار ببێ لە کەلوپەلی ئەو کافرە کوژراوە کەوا پێوەیەتی و هەمووی بە ناچاری ئەبێ بە موڵکی ئەو کەسە بکوژە. هەرکەس دەست بەردار بوو لە حەقی خۆی لە دەسکەوتی جەنگ، وەکوو کەسێك وایە کە لەو جەنگەدا نەبووبێ کە ئەو شتانەی تیا بە تاڵانگیراوە وە هەرکەسێ لە خاوەن حەقەکان بمرێ، بەشەکەی بە میرات ئەمێنێتەوە بۆ میراتگرەکانی و بە ئوسووڵی میراتدابەش کردن دابەشی ئەکەن. تاڵانی جەنگ نابێ بە موڵکی جەنگکەرەکان تا دابەش نەکرێ لە نێوانیانا. ئەرزو ئاوی کافرە شەڕکەرەکانیش ئەبێ بە موڵکی ئەو شەڕکەرانە کە بە شەڕ ئەو ئەرزو ئاوەیان داگیر کردووە.

وە ئەگەر لەناو دەسکەوتی شەڕدا شتی «اختِصاصی» هەبوو، وەکوو تاپاڵەو سەگی راو وە هەندێ لە شەڕکەرەکان داوایان ئەکرد بۆ خۆیان، ئەوە ئەگەر ئەوانی تریان چاویان لێ پۆشی بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ، ئەوە باشە، ئەگینا ئەگەر بۆ ئەوە ئەشیا کە دابەش بکرێ، ئەوە بەشی ئەکەن وە ئەگەر بۆ بەش کردن نەئەشیا، دەوی لێ ئەکرێو ئەدرێ بەو کەسە کە بەناویەوە دەرئەچێ.

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان یا جێنشینی ئەو لەگەڵ کافرێك رێك کەوتن کە رێگایان پیشان بدا بۆ ناو قەڵایەك، بەو شەرتە کە قەڵاکە گیرا، کەنیزەکێکی بدرێتێ لە

دانیشتوانی ئه‌و قه‌ڵایه‌، ئه‌وه دروسته‌؛ جا ئه‌گه‌ر به هۆی ڕێپیشاندانی ئه‌و که‌سه‌وه قه‌ڵاکه گیرا، که‌نیزه‌که‌که‌ی ئه‌درێتێ وه ئه‌گه‌ر نه‌گیرا، یاخود گیرا به‌ڵام به‌هۆی ڕێپیشاندانی ئه‌مه‌وه نه‌بوو، ئه‌وه نایدرێتێ وه ئه‌گه‌ر قه‌ڵاکه به‌هۆی ڕێپیشاندانی ئه‌وه‌وه گیرا به‌ڵام که‌نیزه‌کی تیا نه‌بوو، یاخود له‌پێش ئه‌و ڕێك‌که‌وتنه‌دا که‌نیزه‌که‌که مردبوو، ئه‌وه هیچی ناکه‌وێ، یا له‌پاش گرتنی قه‌ڵاکه‌و پێش‌ئه‌وه‌ی بدرێ به‌و که‌سه مرد، ئه‌وه له‌جیاتی که‌نیزه‌که‌که بایی قیمه‌ته‌که‌یی ئه‌درێتێ وه ئه‌گه‌ر له‌پێش گرتنی قه‌ڵاکه‌دا مردبوو، ئه‌وه فه‌رمووده‌ی دیاریتر ئه‌وه‌یه هیچی ناکه‌وێ وه ئه‌گه‌رکه‌نیزه‌که‌که موسوڵمان بوو، واجبه له‌جیاتی‌دا شتێکی بدرێتێ که بریتی بێ له کرێی ئیشێکی وه‌ك ئه‌و ئیشه که ئه‌و کردوویه‌تی.

***

هه‌ر وڵاتێ که به ڕێك که‌وتن (صُلْح) بگیرێ، ئه‌وه به‌وجۆره له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی ئه‌و وڵاته‌دا موعامه‌له ئه‌کرێ که له ڕێك‌که‌وتن‌نامه‌ی شه‌ڕ وه‌ستاندنه‌که‌دا نووسراوه‌؛ ئه‌گه‌ر باسی وه‌زعی ئه‌رزو ئاوو خانوو و که‌ل‌وپه‌لی‌تریان نه‌کردبوو، ئه‌وه هه‌مووی له‌سه‌ر حاڵی پێشووی خۆی ئه‌مێنێته‌وه‌و هی خاوه‌نی خۆیه‌تی. فه‌رمووده‌ی ڕاستیش ئه‌وه‌یه شاری مه‌ککه به سوڵح گیراوه‌و ئه‌ررو خانووه‌کانی هه‌مووی هی خاوه‌نه‌کانیه‌تی.

هه‌ر شوێنێکیش که به جه‌نگ‌و به زۆر گیرا، وڵاته‌که ئه‌بێ به هی ئه‌و سه‌ربازانه که گرتوویانه‌و دابه‌ش ئه‌کرێ له‌به‌ینیانا، ته‌نها پێنج یه‌کێکی نه‌بێ که دابه‌ش ئه‌کرێ به‌سه‌ر پێنج تاقمدا، وه‌کوو له‌مه‌وپێش باسمانکرد.

فه‌رمووده‌ی ڕاست ئه‌وه‌یه که "سَوادُ العِراق" له زه‌مانی "حه‌زره‌تی عومه‌ردا" ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ به چه‌ند جارێ به‌زۆر داگیر کراوه‌؛ "سَوادُ العِراق" بریتییه له‌و ناوچانه‌ی عێراق که به‌هۆی زۆریی ئاوو باراناوه‌وه داری لێ‌ڕواوه‌و گیای زۆری تیا سه‌وز ئه‌بێ‌و کشت‌وکاڵی تیا ئه‌کرێ.

ئه‌م وڵاته‌، پاش داگیر کردنی، دابه‌ش کرا له‌به‌ینی غه‌زاکه‌ره‌کان‌و خاوه‌ن حه‌قه‌کانی‌ترا؛ حه‌زره‌تی عومه‌ریش دڵی‌خۆش کردن و هه‌ندێکیان به پاره‌و هه‌ندێکیان

بە خۆڕایی دایان بە حەزرەتی عومەر، جا ئەویش هەمووی بە سوورەتی «وەقفی عام» وەقف کرد لە تێکڕای موسوڵمانان و بە بەکرێدانی هەمیشەیی دایەوە بەکرێ بەو کەسانە کە لەو زەوی‌وزارەدا بوون و بە گوێرەی جۆری کشت‌وکاڵ کرێی لەسەر دانان و ئەو کرێیە کرا بە خەراجی ساڵانە بەسەریانەوە کە ساڵ بە ساڵ بیدەن بە خەزێنەی «بیت المال»ی موسوڵمانان. ئەم بەکرێدانە، هەرچەند لەسەر ئوسووڵی بەکرێدانی تر نییە، بەڵام لەبەر خاتری قازانجی تێکڕای موسوڵمانان، حەزرەتی عومەر بڕیاری دا و ئەسحابە ئینکاریان نەکرد و بوو بە «ئیجماعی سکووتی»و پێشەوا موجتەهیدەکانی شەرع، وەك "مالیك"و "شافیعی"و "ئەحمەدی کوڕی حەنبەل"، مەزهەبیان بەم جۆرەیە کە باسمان کرد، کتێبە باوەڕ پێکراوەکانی وەك «مینهاجی نەوەوی»و «وەجیزی ئیمامی غەززالی»یش لەسەر ئەمەن؛ بەڵێ، لای «ئیمامی ئەبوو حەنیفە» ئەم وەقفە سابت نەبووە.

خەراجی خاکی «سوادُ العراق»، وەهایە هەر «جەریب»ێك زەوی کە بکرێ بە جۆ، دوو درەم و بکرێ بە گەنم، چوار درەم و بکرێ بە زەیتوون، دوانزە درهەم و بکرێ بە درەخت‌و باخ‌و قامیشی شەکر، شەش درەم و بکرێ بە دارخورما، هەشت درەم خەراجی لەسەر بێ؛ ئەم خەراجە، جگە لە زەکاتی شەرعییە کە بریتییە لە دەیەك یا بیست یەك لە زەراعەتی قووتدا، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

«جەریب»، بریتییە لە زەوییەکی چوار خشتەکی کە هەر پاڵوویەکی دە قامیش و هەر قامیشی شەش گەزە بە "گەزی هاشمی" و هەر گەزێکی شەش پڕە مشت (قَبْضە)یەو هەر پڕە شتێکی چوار پەنجەیە، کە بەم حیسابە هەر پاڵوویەکی ئەکاتە شەست گەزو بە لێکدانی شەست لە شەست، ئەکاتە سێ‌هزارو شەشسەد گەز، وەکوو دونمی ئەمڕۆ کە بریتییە لە دوو هەزارو پێنج‌سەد مەتری چوارگۆشە، چونکە مەتر لەم گەزە درێژترە.

وەکوو وتمان، خەراجی ئەم زەوییە لە جێگای بەدەڵی بەکرێ دانەکەیدایە وە هەر زەوییەك کە لە دەستی کەسێکدا بێ، کەس ناتوانێ لە دەستی بسێنێ، چونکە یا لە نەوەی ئەوەکەسانەیە کە بە سوورەتی بەکرێ‌وەرگرتن لە حەزرەتی عومەریان وەرگرتووە، یا

له‌وانه‌یه به سووره‌تێکی شه‌رعی، وه‌کوو به‌کرێ‌وه‌رگرتن له‌وخاوه‌ن ده‌ستانه‌یان وه‌رگرتبێ؛ به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی زانرا که‌سێك به ناحه‌ق ده‌ستی کێشاوه به‌سه‌ر ئه‌و زه‌وییه‌دا، ئه‌وه له ده‌ستی ئه‌سه‌نرێ‌و ئه‌درێته‌وه به خاوه‌ن ده‌ستی پێشوو، ئه‌گه‌ر بزانرێ کێیه، یا ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ «بیت المال»و به‌ڕێوه‌به‌ری «بیت المال» ئه‌توانێ به‌شێوه‌یه‌کی دادپه‌روه‌رانه ته‌سه‌ڕوفی تیا بکا وه‌کوو موڵکه‌کانی تری «بیتُ المال».

خاوه‌ن‌ده‌سته شه‌رعییه‌کان ناتوانن له‌م زه‌وییانه بفرۆشن، به‌ڵام ئه‌توانن به‌کرێی بده‌ن به که‌سێکی تر، به‌و شه‌رته که حه‌قی خه‌راجی «بیتُ المال» بپارێزرێ وه ئه‌توانن هه‌ر خانوو و به‌ره‌یه‌کی تیادا دروست کرابێ بیفرۆشن؛ له «تُحفه»دا ئه‌فه‌رموێت: هه‌ر خانوویه‌ك که به به‌ردو خاکی سه‌واد بکرێته‌وه له شوێنێکدا که شوێنی کشت‌وکاڵ بێ، ئه‌ویش نابێ به موڵکی شه‌رعی که بفرۆشرێت، چونکه که‌ره‌سته‌که‌ی له خاکی وه‌قف ده‌رهێنراوه وه هه‌ر کڕین‌و فرۆشتن‌و موعامه‌له‌یه‌ك که ئه‌مڕۆ ئه‌کرێ، له‌سه‌ر ئه‌ساسی به موڵك کردنی عه‌ینی ماڵه‌که نییه، به‌ڵکوو عیباره‌ته له ده‌ست هه‌ڵگرتن له‌و شوێنه که ئه‌و خاوه‌ن خانووه دروستی کردووه بۆ که‌سێکی تر به‌رابه‌ر به ئه‌ندازه‌یه‌ك ماڵ که وه‌ری‌ئه‌گرن له کڕیار.

به‌ڵێ، هه‌ر شوێنێ که وێرانه (مَوات) بووبێ‌و کشت‌وکاڵی تێدا نه‌کرابێ، هه‌رکه‌سێ به سووره‌تی شه‌رعی ئاوه‌دانی بکاته‌وه، ئه‌بێ به موڵکی، یا ئه‌گه‌ر بیکاته‌وه بۆ مزگه‌وت یا ته‌کیه، ئه‌وه به عیباده‌تخانه‌ی شه‌رعی ئه‌ناسرێ له هه‌موو حوکمێکدا؛ «مَع العِلم»، دروسته ئه‌وه‌نده‌ی پێویست له ده‌شت‌و ده‌ریشا بکرێ به مزگه‌وت، چونکه مزگه‌وتێ که پێویست بێ، حوکمی جیاکراوه‌ی هه‌یه وه ئه‌و مزگه‌وتانه که ئه‌سحابه‌کان له سه‌رده‌می داگیرکردنی ئه‌م وڵاتی کورده‌وارییه‌دا کردوویانه‌ته‌وه، وه‌کوو مزگه‌وتی "خورماڵ‌و بیاره‌و پاوه"که وا مه‌شهووره ئه‌وان کردوونیانه‌ته‌وه، ئه‌وه بێ‌گومان هه‌موو حوکمێکی مزگه‌وتیان تیا دێته‌جێ.

پێوانه‌ی «سواد العراق» ـ وه‌ك له «تحفه»و کتێبه باوه‌ڕ پێ‌کراوه‌کانی ترا نووسراوه ـ به‌درێژی، له شاری «عه‌بادان»ه‌وه‌یه که سی فه‌رسه‌خ له خواری به سره‌وه‌یه تا «حدیثة

الموصل»، واتە "مووسڵی تازە"کە لەملای "نەینەواوە" دروستکراوە وە بە پانی، لە «قادِسیە»وەیە کە دوو مەنزڵ لە "کووفەوە" دوورە تا "حەلوان"کە شارێکی قەدیمی جاهیلیو ئیسلامی بووە لە ژووری "قەسری شیرین"ەوە و ئەمڕۆ مەشهوورە بە «زەهاو» وە لەسەر لێکدانەوەی خوالێخۆش بوو "مەلا ئەبووبەکری موسەنیف" لە کتێبی «وُضوح»ی شەرحی «مُحرَّر»دا کە لە ساڵی ١٠١٤ی هیجریدا تەواوی کردووە، "هەولێرو کەرکووکو ئالانو سیوەیلو شارباژێڕو شارەزوورو سازان" ـکە دێیەکە لە "قەزای هەڵەبجە" لە ڕۆژاوای "چەمی سیروانەوە" لە عێراقی ئەمڕۆداو "قەڵای دەڕنە" لە ژوور "دەشتی وڕەوە" لە ناوچەی باوەجانیدا وە "قەسەبەی پاوە"و دێی دەودان لە خۆرهەڵاتی چەمی سیروانەوە ـ کە ئەمڕۆ لە "کوردستانی ئێران"دان هەموو بەر وڵاتی «سواد العراق» ئەکەون.

"ئیمامی نووی" ئەفەرموێ: "شاری بەسرە" بەر حوکمی «سواد العراق» ناکەوێ، چونکە لەوکاتەدا بێشەڵان بووەو کێڵگە نەبووە، تەنها دوو شوێنی لای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژاواوەی نەبێ.

## باسی «دارُ الاسلام»و «دارُ الکُفر»و کۆچ کردن لە «دارُ الکفر»ەوەو ڕاکردنی دیل

«دارُ الاسلام»، شوێنێکە بە وڵاتی موسوڵمانان بزانرێ. ئەو شوێنانەی بە وڵاتی موسوڵمانان ئەزانرێن، سێ بەشن؛

یەکەم: وڵاتێکە موسوڵمانی تیا بێو حوکمو دەسەڵاتی کافری بەسەرەوە نەبێ؛

دووەم: وڵاتێکە موسوڵمانان داگیریان کردبێ لە کافرانو بەهۆی «جِزیە»وە کافرەکانیان لە وڵاتەکەدا هێشتبێتەوە؛

سێهەم: وڵاتێکە وەختی خۆی شوێنی موسوڵمانان بووبێو پاشان کافر داگیریان کردبێ، بەو شەرتە کە موسوڵمانەکان دەرنەچووبنو لە وڵاتی خۆیانا مابنەوە، وەکوو هەندێ لە زانایانی ئەم چەرخانەی دوایی فەرموویانە.

هەر وڵاتێ غەیری ئەم سێ جۆرە بێ، وڵاتی کافرانەو بـە «دارُ الکـفر» دائـەنرێ، وەکوو ئەو وڵاتانەی کە کافریان تیایەو موسوڵمانان دەستیان ناڕوا بەسەریانا.

هەر موسوڵمانێ لە «دارُ الکفر»دا بێ، ئەگەر بتوانێ ئوسووڵی دین‌و ئایینی خۆی بەئازادی جێ‌بەجێ بکا، چ لەبەر شەرەفی خۆی‌و چ لەبەر شەرەفی کۆمـەڵی خـزم‌و کەس‌وکارو دەس‌و پێوەندی وە ئەمینیش بێ لەوە کە تـووشی فـیتنەی دیـن نـەبێ‌و ئومێدیشی وانەبێ کە بە مانەوەی ئەو لەو شوێنەدا ئیسلام بەرز ئەبێتەوە، ئەوە سوننەتە کۆچ بکا لەو وڵاتە؛ ئەگەر وانەبوو، واجبە لەو وڵاتە دەربچێ‌و کۆچ بکا، بەو شەرتە کە دانەمێنێ بۆ مەسرەفی خۆی و هەرکەس کە مەسرەفی لەسەری بێ‌و ڕێگاش ئەمین بێ‌و مەجالی ببێ بە بێ زیان‌پێ‌گەشیتن دەربچێ و ئەو شوێنەش کە بۆی ئەڕوا، خاڵی بێ لەو خراپەیە کە لەم وڵاتەدا هەیە.

ئەگەر موسوڵمانێك دیل بوو لای کافران‌و ئـەیتوانـی لە دەسـتیان رابکـا، واجـبە لەسەری رابکا وە ئەگەرکافرەکان بە بێ قەیدو شەرت بەرەڵڵایان کرد، واجبە ئەو وڵاتە بەجێ‌بێڵێ، بەڵام لەم سوورەتەدا ئەتوانێ بە هەرجۆرێ زیان بگەیەنێ بەو کـافرانـەو لێیان بکوژێ وە ئەگەر بەو شەرتە بەرەڵڵایان کرد کە ئەوکافرانە لە ئەمانی ئەودا بن، ئەوە بە قەتعی دروست نییە زیان بە کەسیان بگەیەنێ؛ هەروەها، ئەگەر باوەڕی وابوو ئەگەر ئەم لەو کافرانە بکوژێ یا زیانیان پێ بگەیەنێ، ئەوانیش لە دیلە موسوڵمـانەکـانی‌تر ئەکوژن یا زیانیان پێ ئەگەیەنن، ئەوە لەم سوورەتەیشدا دروست نییە دەستیان بۆ ببا.

وە ئەگەر پاش ڕاکردن، کافرێك یا چەند کەسێکیان کەوتنە شوێنی، ئەوە دروستە دەفعیان بکا، هەرچەند بە کوشتنیشیان بێ وە ئەگەر بەو شەرتە بەرەڵڵایان کرد کە لە وڵاتی کافرەکان دەرنەچێ، ئەوە دروست نییە بۆی ئەم شەرتە جێ‌بەجێ بکا.

## باسی ئەمان‌دان بەکافران

دروستە هەر موسوڵمانێکی تەکلیف لەسەر، پیاو بێ یا ژن، جوان بێ یا پـیر، بـە ئارەزووی خۆی ئەمان بدا بە کافری شەڕکەر، پیاو بێ یا ژن، یەکێ بێ یا کۆمەڵێك، بەو

شەرتە کۆمەڵێکی وا بن ژمارەیان بکرێ‌و ژمارەیان دیاربێ؛ بەڵێ، ئەگەر موسوڵمانێك دیل بێ لەناو کافراندا، ئەوە دروست نییە ئەم دیلە ئەمان بدا بەو کافرانە کەوا لەگەڵیاندا یا بە غەیری ئەوان، چونکە مادام ئەم خۆی وا لەژێر زۆرو چاودێریی ئەواندا، سووەتی وەکوو زۆرلێ‌کراو وایە و خۆی ئەمین نییە لە فرِوفێڵی ئەوان، چ‌جای ئەوە ئەم ئەوان تەئمین بکا.

ئەمان‌دان بە کۆمەڵی ژمارە نادیاریش، وەکوو خەڵکی شارێکی گەورە، بە غەیری پێشەوای موسوڵمانان ناکرێ، چونکە ئەمە وەکوو سوڵح (هدنة) وایەو لە دەسەڵاتی پێشەوای موسوڵماناندایە.

جا هەرکاتێ موسوڵمانێك ئەمانی دا بە کەسێك یا بە چەند کەسێك کە ژمارەیان دیار نەبوو، ئەوە ئەم ئەمان‌دانە دائەمەزرێ‌و دروست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك زیانیان پێ‌بگەیەنێ، چونکە لە حەدیسی پیرۆزدا، پێغەمبەرﷺ لەعنەتی کردووە لەو کەسە کە ئەمانی موسوڵمانان ئەشکێنێ.

عەقدی ئەمان دائەمەزرێ بە لەفزێ کە مەعنای تەئمین کردن بگەیەنێ، وەکوو ئەوە کە پێی بڵێ: «وا تۆم تەئمین کرد» یا: «ئەمانم پێ‌دای»، وە بە نووسین لەگەڵ نیازدا، وەکوو ئەوە کە جوملەی تەئمین کردنەکە بنووسێ‌و لەگەڵ ئەوەیشدا نییەتی تەئمین کردنی بهێنێ؛ هەروا بەوەیش دێتەجێ کە یەکێ راسپێرێ بۆلای کافرەکە کە لە وەکالەتی ئەمەوە ئەمانی بداتێ.

بە شەرت گیراوە ئەو کافرە کە ئەمانی ئەدرێتێ بەو تەئمین کردنە بزانێ‌و قەبووڵیشی بکا بە لەفز یاخود بە ئیشارەتێکی وا کە ئینسان تێی بگا؛ ئەگەر هات‌و کابرا قەبووڵی نەکرد، واتە بێ‌دەنگ بوو لە قەبووڵ کردن، یاهەر جوابی ئەمان دانەکەی دایەوە بە نەویستن، ئەوە بەتاڵە؛ هەروەها، بە شەرت گیراوە کە ماوەی تەئمین کردنەکە لە چوار مانگ زیاتر نەبێ وە لە فەرموودەیەکدا دروستە مادام ماوەکەی نەگات بە ساڵێك، بەڵام ئەم ماوە دانانە بۆ کاتێکە کە ئێمە لاواز نەبین، ئەگینا دیاری کردنی ماوەیەك کە لە چوار مانگ زیاتر بێ، ئەبەسرێ بە بیرو راوێژی پێشەوای موسوڵمانانەوە، ئەگەر ئەو

زیادەکەی ڕەوا بینی، ئەوە دروستە هەرچەند بێ، ئەگینا هەر چوار مانگەکە دروستەو زیادەکەی بەتاڵە.

دروست نییە بۆ موسوڵمان ئەمانی کافرێکیوا بداکە زیانی هەبێ بۆ موسوڵمانان، وەکوو پیاوی جاسووس‌و پیاو، خراپ‌و ئاژاوەگێڕو کافرێ کە چەکی بەدەستەوە بێ. هەر ئەمانێ کە دابمەزرێ، دروست نییە بۆ پێشەوای موسوڵمانان هەڵیوەشێنێتەوە مادام ترسی لە خەیانەتی ئەو کافرە نەبێ وە ئەگەر ترسی هەبوو، ئەتوانێ بەتاڵی بکاتەوە. لە ئەمان دانی کافردا، ماڵ‌و سامانی بەرناکەوێ، هەروەها ئەو خێزان‌و منداڵەی کە وان لە وڵاتی کافراندا، مەگەر ئەماندانی ئەمانەیش بە شەرت گیرابێ، ئەوکاتە هەموویان ئەمین ئەبن.

## باسی «جِزیە»

سوورەتی عەقدی جیزیە بۆ زیممی ئەوەیە کە پێشەوای موسوڵمانان یا جێنشینی ئەو، بڵێ: ئەتانهێڵمەوە لە «دارُ الاسلام»دا یا: وا ڕێگام دان بمێننەوە لە وڵاتی موسوڵماناندا بەو شەرتە کە هەموو ساڵێ جیزیە بدەن‌و فەرمانی ئێمە جێبەجێ بکەن. فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە واجبە ئەندازەی جیزیەکە دیاری بکرێ، ئیتر پێویست نییە باسی ئەوە بکرێ کە زمانی خۆیان بگرن لە بێئەدەبی کردن دەرحەق بەو شتانەی لە ئایینی ئیسلامدا پیرۆزن، چونکە ئەم زمان گرتنە بەشێکە لە فەرمان بەرداریی ئیسلام.

عەقدی جیزیە، نابێ «مُعلَّق» یا «موقَّت»بێ وە بە شەرت گیراوە قەبووڵی جیزیەدان بە لەفز لەلایەنی زیممییەکانەوە بە شەرتێ کە باڵغ‌و عاقڵ بن؛ هەروەها، ئەم قەبووڵ کردنە دروستە لەلایەن وەکیلیشیانەوە.

ئەگەر کافرەکان داوای عەقدی جیزیەیان کرد لە پێشەوای موسوڵمانان، واجبە لەسەری بەگوێیان بکا، مەگەر بۆ کەسێ کە ترسی لێی هەبێ، وەکوو جاسووس‌و پیاوخراپ‌و ئاژاوەگێڕو کەسانی لەم چەشنە.

عەقدی جیزیە ئەکرێ بۆ "جوولەکەوگاورو سابیئی‌و ئاگرپەرست‌و سامیری" وە بۆ منداڵانی ئەوانە کە بوون بە جوولەکە یا بە گاور بەر لە هەڵوەشاندنەوەی ئایینەکەیان،

هەروەها ئەگەر گومانمان هەبوو لە کاتی وەرگرتنیانا بۆ ئەو ئایینە. وە بۆ کافرێکیش کە یەکێ لە باوكو دایکی «کیتابی»بێو ئەویان «بتپەرست»بێ وە بۆ ئەو کافرانەیش کە ئیددیعای ئەوە ئەکەن کە لەسەر "شەریعەتی حەزرەتی ئیبراهیم" یا لەسەر "زەبووری حەزرەتی داوود" ئەڕۆن بەرێوە.

جیزیە نییە لەسەر ژنو منداڵو شێتو خونسا؛ بەڵێ، ئەگەر شێتەکە شێتییەکەی بەیناوبەین بێ، ئەوە عەقدی جیزیەی بۆ ئەبەسترێ، بەو شەرتە کە ماوەی شێتییەکەی زۆر کەم بێ. وە ئەگەر ماوەی شێتییەکەی زۆر بوو؛ مەسەلا، رۆژێ شێتو رۆژێك ژیر بوو، ئەوە ماوەی ساغییەکەی کۆئەکرێتەوە، جاکە گەیشت بە ساڵێ، جیزیەی ساڵێکی لەسەر واجب ئەبێ.

وە ئەگەر منداڵی زیممی باڵغ بوو وە قەبووڵی عەقدی جیزیەی نەکرد، ئەوە واجبە رەوانە بکرێتەوە بۆ شوێنی خۆی کە تیایدا ئەمین بێ وە ئەگەر داوای عەقدی جیزیەی کرد، عەقدی بۆ ئەکرێ.

جیزیە واجبە لەسەر ئینسانێ کە توانای کاسبی کردنی نەبێ وە لەسەر رەبەن (راهِب)وکرێکارو پیروکوێر، چونکە ئەم ماڵی جیزیەیە وەکووکرێ‌خانوو وایە، بەڵام ئەگەر ساڵ بەسەرچوو و ئەم کەسانە هیچیان نەبوو جیزیەی لێ بدەن، ئەکرێ بە قەرز بەسەریانەوە تا هەرکاتێ کە دەسیان بڕوا.

بزانن! مەنعی هەموو جۆرە کافرێ ئەکرێ لەوەکە "خاکی حیجاز"بکا بە نیشتمانی خۆی؛ حیجازیش بریتییە لە "مەککەو مەدینەو یەمامە"و ئاوەدانیو دێهاتی دەوروبەری ئەمانە وە ئەگەر کافر رۆیشتە خاکی حیجازەوە بە بێ‌ڕێگادانی پێشەوای موسوڵمانان، واجبە لەسەر ئەو دەری بکاو تەعزیریشی بکا ئەگەر زانیبێتی دروست نییە وە ئەگەر کافرێك داوای رێگادانی کرد لە پێشەوای موسوڵمانان بۆ هاتن بۆ وڵاتی حیجاز، ئەوە ئەتوانێ رێگای بدا، مادام بزانێ هاتنەکەی سوودی موسوڵمانانی تیایە، وەك ئەوە کە کافرەکە نامەی حوکوومەتێکی پێ بێ یا شتێکی وای پێ‌بێ کە قازانجی موسوڵمانانی تیابێ وە ئەگەر هاتنەکەی بۆ بازرگانی بوو و بازرگانییەکەی

سوودێکی‌وای بۆ ئێمە تیا نەبوو، دروست نییە پێشەوای موسوڵمانان بە خۆڕایی ڕێگای بداو نابێ بێڵێ لە سێ ڕۆژ زیاتر دانیشێ، بێجگە لە ڕۆژی هاتن‌و دەرچوونی و کە گەیشتە هەر شوێنێکی تازە، بەم جۆرە سێ ڕۆژی بۆ ئەژمێرێ تا دەرئەچێ وە ئەگەر ئاڵوویڵێکی هەمیشەیی هەبوو لە وڵاتی حیجازدا، ئەوە ئەبێ موسوڵمانێك بکا بە وەکیلی خۆی.

واجبە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان مەنعی کافر بکا لە چوونە حەرەمی مەککە وە ئەگەر نامەی هێنابوو، پێویستە پێشەوای موسوڵمانان یا جێ‌نشینی، بڕوا بۆلای چاوی پێی بکەوێ‌و نامەکەی لێ وەربگرێ وە ئەگەر کافرێك لە حەرەمی مەککەدا نەخۆش کەوت، ئەگوێزرێتەوە بۆ دەرەوەی حەرەم، هەرچەند ترسی مردنیشیمان بێ وە ئەگەر مرد، لە حەرەمدا دفن ناکرێ وە ئەگەر دفن‌کرا، دەرئەهێنرێتەدەر لە قەبرەکەی و ئەبرێتە دەرەوەی حەرەم دفن ئەکرێ وە ئەگەر لە غەیری حەرەمی مەککە لە شوێنێکی‌تری حیجازا نەخۆش‌کەوت‌و زەحمەت بوو بگوێزرێتەوە، وازی لێ ئەهێنین وە ئەگەر مرد، هەر لەو شوێنەدا دفنی ئەکەین.

## باسی ئەندازەی جیزیە

لای کەمی جیزیە، دینارێکە کە بریتییە لە مسقاڵێك ئاڵتوون. سوننەتە حوکمڕانی موسوڵمانان خۆی بگرێ تا لە پیاوی میانە دوو دینارو لە دەوڵەمەند چوار دینار وەربگرێ وە ئەگەر عەقدی بۆ کردن بە زیاتر لە دینارێك و لەپاشا زانییان کە بە دینارێکیش دروستە، واجبە لەسەریان ئەو ئەندازەیە کە عەقدیان لەسەر کردووە بیدەن وە ئەگەر عەقدەکەیان جێ‌بەجێ نەکرد، هەڵئەوەشێتەوە.

ئەگەر زیممییەك پاش ماوەیەك موسوڵمان بوو، یاخود چەند ساڵێك جیزیەی نەداو مرد، ئەوە جیزیەی ئەو ماوەیە لەسەری دامەزراوەو لە میراتەکەی دەرئەکرێ، وەك ئەوە کە قەرزی خەڵکی بەسەرەوە بێ وە ئەخرێتە پێش جێ‌بەجێ کردنی وەسیەتەوە وە ئەگەر لە ساڵەکەدا مرد، بەشی ئەو ماوەیە لە میراتەکەی جیا ئەکرێتەوە.

هەر کاتێ پێشەوای موسوڵمانان سوڵحی کرد لەگەڵ زیممییەکانداو لە وڵاتی خۆیاندا هێشتنیەوە، ئەبێ شەرتی ئەوەیان لەگەڵدا بکا کە میوندارییی ڕێبوارانی موسوڵمان بکەن و ئەمە، بە زیاد دائەنرێ لە سەر لای کەمی جیزیە -کە دینارێکە- و تەنها لەسەر دەوڵەمەند و میانە دائەنرێ؛ لەم کاتەدا، پێویستە ژمارەی میوانەکان، لە پیادە و لە سوار و جۆری خواردنیان و پێخۆریان و ئەندازەی خواردن بۆ هەر یەکێکیان و ئالفی وڵاخیان و ئەندازەکەی و هۆدەی میوانەکان، ئاخۆ لە کەنیسە دائەبەزن، یا لە هۆدەی زیادەی ناو ماڵی زیممییەکان خۆیاندا، هەمووی دیاری بکرێ بۆ ئەوە کە لە پاشا مەیدانی دەس‌درێژی کردن نەبێ؛ ئەم ماوەی میواندارییەش نابێ لە سێ ڕۆژ زیاتر بێ.

ئەگەر کۆمەڵێك زیممی وتیان: ئێمە جیزیە ئەدەین بەڵام بە ناوی زەکاتەوە، ئەوە دروستە بۆ پێشەوای موسوڵمانان ئەگەر بە مەسڵەحەتی زانی، قەبووڵی بکا، لەم حاڵەدا ئەم ماڵە کە بە ناوی زەکاتەوە وەرئەگیرێ، جیزیەیەو وەرناگیرێ لەوانە کە جیزیەیان لەسەر نییە، وەك فەقیرو منداڵو شێت.

## باسی ئەو واجباتە کە لەپاش عەقەی جیزیە پەیدا ئەبن

پاش عەقدی جیزیە واجبە لەسەر موسوڵمانان بە هیچ جۆرێ دەس درێژی نەکەن بۆ گیانو ناموس‌و ماڵی زیممییەکان وە هەر شتێکیان بفەوتێنین لە گیانو ماڵو ناموس‌و «اختِصاصات»، ئەبێ حەقی شەرعییان بدەینێ وە دەفعی دوژمن‌و شەرکەریان لێ بکەین.

هەر شارێ کە ئێمە خۆمان دروستمان کردبێ، وەکوو «بَصره»و «قاهِره»، یاخود ئەوان خۆیان دروستیان کردبێ بەڵام بە بێ جەنگو سوڵح کردن موسوڵمان بووبن لەسەری، وەکوو شارەکانی "یەمەن"، ئەوە ڕێگا نادەین «کَنیسة»و «بیعَة»و «صومعَة»ی تازەی تیا دروست بکەن، هەروەها ئەگەر شاری خۆیان بووبێ‌و ئێمە بە زۆر داگیرمان کردبێ، لەم سوورەتەدا هەر عیبادەتگایەکی کۆنیشی تێدابێ، تێکی ئەدەین‌و ناهێڵین بەکاریان بێنن.

وە ئەگەر شارەکە شاری ئەوان بووبێو بە سولح گرتبێتمان، بەڵام باسی عیبادەتگامان نەکردبێ، یاخود ئەوەمان بە شەرت گرتبێ کە مەنعیان بکەین لە کردنەوەی عیبادەتگا، ئەوە ناهێڵین عیبادەتگای تازە بکەنەوە وە ئەگەر بە سولح گرتبێتمان بە شەرتی ئەوە زەوییەکەی بۆ خۆیان بێ، ئەوە عیبادەتگا کۆنەکانیان بۆئەمێنیتەوەو دروستە هی تازەش بکەنەوە؛ هەروەها ئەگەر بە شەرتی ئەوە بێ زەوییەکەی بۆ ئێمە بێو بڕیاری ئەوە بدەین ئەوان لەو وڵاتەدا بمێننەوە عیبادەتگاکانیان بمێننەوە، ئەوە ئەتوانن سواغیان بدەنو جوانیان بکەنەوەو تازەیان بکەنەوە، بەڵام ناتوانن گەورەیان بکەن یا عیبادەتگای تر لە شوێنی تردا بکەنەوە.

ئەگەر زیممییەکان خانوویان لەناو خانووی ئێمەدا بێ، نابێ لە خانووی ئێمە بەرزتر بێ، یا ئەوەندەی خانووی ئێمە بەرز بێ، بەڵام ئەگەر گەڕەکیان جیا بوو لە شوێنی ئێمە، ئەتوانن هەموو جۆرە خانوویەك بکەنەوە وە مەنع ئەکرێن لە سوار بوونی ئەسپ، بەڵام مەنع ناکرێن لە سواربوونی کەر و هێستر، هەرچەند نایابو بەقیمەتیش بێ؛ بەڵێ، ئەبێ جلو هەوساری لێ بکەن نەك زێنو ئاوزەنگیو لەغاوی ئاسن وە دروست نییە تەعزیم بکرێنو لەلای ژوورووی مەجلیسەوە دابنرێن، هەروەها نابێ ئیشێکیوایان پێ بسپێررێ کە موسوڵمانان لەبەردەستیانا زەلیلو داماو بن.

وە ئەگەر ئەو زیممییانە لەناو ئێمەدا بن، ئەمریان پێ ئەکرێ بە «غِیار»، واتە گۆڕینی جلو بەرگیان لە حاڵی تەبیعی خۆی بەهۆی ئەوەوە کە پارچەیەك بۆ نیشانە بدووررێت بە سەرشانیانا ـ مەسەلا ـ کە ڕەنگی جیا بێ لە ڕەنگی جلەکانیان؛ هەروەها، ئەمر ئەکرێ بە پیاویان کە «زُنّار» بەسەر جلەوە ببەستنە پشتیانو ژنەکانیان لەژێر جلەوە بیبەستن وە ئەگەر چوونە حەمامێك کە موسوڵمانی تیابێ، پێویستە خۆیان دیاری بکەن بەهۆی حەڵقەیەکی ئاسن یا زەردەوە کە بیکەنە دەستیان وە ڕێگایان نادرێ کە لەفزی کوفریان بەدەمدا بێت، وەکوو ئەوەکە بڵێن: «عُزَیْر» یا «مَسیح» کوڕی خوان، پەنا بەخوا!

هەروەها، مەنع ئەکرێن لەوەکە بە ئاشکرا ئارەقو شەراب بخۆنەوە، یاخود گۆشتی بەراز بخۆن، یا «ناقووس» لێبدەن، یا ئوسووڵی جەژنی خۆیان لەناو ئێمەدا دەربخەن

وە ئەگەر موخالەفەیان کرد لەو شتانەدا کە بڕیار دراوە لەسەریان، عەهدەکەیان تێك ناچێ، بەڵام ئەگەر شەڕیان لەگەڵ کردین، یاخود جیزیەیان نەدا، یا ڕێگایان نەدا کە ئەحکامی ئایینی ئیسلامیان بەسەردا بڕوا، ئەوە عەقدەکەیان تێك ئەچێ.

ئەگەر زیممییەك زینای کرد لەگەڵ ژنێکی موسوڵماندا، یاخود دوژمنی حەربی ئێمەی ئاگادار کرد لە ناتەواوییەکی ئێمە، یا موسوڵمانێکی لە ئایین هەڵگێڕایەوە، یا تانەی دا لە قورئانی پیرۆز، یاخود ناوی پێغەمبەری بە خراپە برد، ئەوە فەرموودەی ڕاست ئەوەیە ئەگەر وەختی خۆی شەرتی ئەوەمان کردبێ لەگەڵیانا کە بەمجۆرەکردەوانە عەهدەکەیان تێك بچێ، ئەوە عەهدەکەیان تێك ئەچێ، ئەگینا عەهدەکەیان ئەمێنێتەوە، بەڵام تەمێ ئەکرێن و حەقی شەرعییان لێ وەرئەگیرێ بۆ ئەوەی جارێکی تر نەتوانن ئەم جۆرە ئیشانە بکەن.

هەر کافرێکی زیممی بە شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵمانان عەهدی تێك بچێ، واجبە بکوژرێ وە ئەگەر بە غەیری شەڕ کردن عەهدی تێکچوو، ئەوە کوشتنی واجب نییە، بەڵام پێشەوای موسوڵمانان بە دەستی خۆیەتی هەرکام لەو سێ خەسڵەتەیان لەگەڵدا جێبەجێ بکا کە لەمەوپێش بەیانمان کردن؛ جا ئەگەر لەپێش ئەوەدا کە پێشەوای موسوڵمانان یەکێ لەو سێ خەسڵەتە هەڵبژێرێ، زیممییەك موسوڵمان بوو، ئەوە دروست نییە بکرێ بە بەندە وە ئەمانی ژن و منداڵ تێك ناچێ بەهۆی تێکچوونی ئەمانی خاوەن ژن و منداڵەکەوە و هەرکاتێك زیممییەك ویستی ئەمانەکەی تێك‌بدەن و ڕەوانەی بکەنەوە بۆ «دارُ الحَرب»، پێویستە ڕەوانە بکرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئەمین ئەبێ تیایدا.

## باسی سوڵح لەگەڵ کافراندا (هُدْنة)

سوڵح، ئەگەر لەگەڵ کافری ئیقلیمێکدا بێ، ئەوە هەر لە دەسەڵاتی پێشەوای موسوڵماناندایە وە ئەگەر لەگەڵ کافری تاقە شارێکدا بێ، ئەوە هەروەکوو بۆ پێشەوای موسوڵمانان دروستە، بۆ فەرمانداری ئەو شارەیش دروستە. ئەم سوڵحە، لە کاتێکدا

ئەکرێ کە مەسڵەحەتی ئیسلامی تیا بێ، وەکوو حاڵی بێهێزیی ئیسلام لەبەر کەمی ژمارەی شەڕکەر یا نەبوونی کەلوپەلی جەنگ یا ئومێدی موسوڵمان بوونیان یـا بـۆ تەسلیم کردنی جیزیە؛ جا ئەگەر بێهێز نەبووبن، ئەوە ئەو سوڵحە هەر بۆ چوار مانگ ئەکرێ وە ئەگەر بێهێز بووبن، ئەوە دروستە زیاتر بێ لەوماوەیە تا بۆ ماوەی دەساڵ و لە دە ساڵ زیاتر نابێ وە ئەگەر بۆ دە ساڵ زیاتر کرا، ئەوە لە فەرموودەیەکدا هەمووی بەتاڵە و لە فەرموودەیەکدا تا دە ساڵەکەی دروستەو زیادەکەی بە بەتاڵ دائەنرێ.

هەر عەقدی سوڵحێك کە ناوی ماوەی سوڵحەکەی تیا نەبرابێ، بەتاڵە، هـەروەها ئەگەر ناوی ماوەی شەرعی تیا برابێ بەڵام شەرتێکی نادروستی تیابێ وەکوو شەرتی بەرەڵلا نەکردنی دیلی موسوڵمانان لەلای کافران یا شەرتی بڕیاردانی ماڵی ئێمە بـۆ ئەوان یا شەرتی ئەوە کە جیزیە لە دینارێك کەمتر بێ. دروستە عەقدی سوڵح لەسەر بڕیاری ئەوە کە هەرکاتێ پێشەوای موسوڵمانان ئارەزووی کرد بـەتاڵی بکـاتەوە وە هەرکاتێ عەقدی سوڵح کرا، واجبە لەسەرمان تا ئەو ماوەیە تەواو ئەبێ دەسدرێژی نەکەین بۆ سەر کافرەکان، مەگەر لەحاڵێکا کە ئەوان عەقدەکە تێك بدەن بـە لەفـزی سەریح، یا بەهۆی ئەوەوە کە شەڕمان لەگەڵدا بکەن، یاخود شتێکـیوا بـنووسن بـۆ دوژمنمان کە زیانی ئێمەی تیا بێ یا موسوڵمانێ بکوژن.

جا هەرکاتێ عەقدی هودنە تێكچوو، دروستە شەڕیان لەگەڵ بکەینو شەو، بدەین بەسەریانا وە ئەگەر هەندێکیان عەقدی هودنەکە تێك بدەنو ئەوانیتریان ئینکاریان نەکرد، بە قسە یا بە کردەوە، ئەوە عەقدەکەی ئەوانیش بـەتاڵ ئـەبێتـەوە وە ئـەگـەر ئینکاریان کرد، بەم جۆرە خۆیان لەو هەندە دوورخستەوە، یا خەبەریان دا بە پێشەوای موسوڵمانان کە ئەوان لەسەر عەهدو پەیمانەکەیان ماونەتەوە، ئەوە عەهدی ئەمانە تێك ناچێ وە ئەگەر لە ماوەی سوڵحەکەدا پێشەوای موسوڵمانان ترسا لەوەکە زیممییەکان خەیانەت بکەن، ئەوە ئەتوانێ عەهدو پەیمانەکە هەڵوەشـێنـێتـەوە، بـەڵام پـێویسـتە بیانگەیەنێ بە شوێنی ئەمینییان، ئەوەندە هەیە نابێ ئەم ترسە هەر لە خەیاڵەوە بـێو پێویستە نیشانەیەکی ئەو نیازی خەیانەت کردنە دەرکەوتبێ.

دروست نییە لە عەقدی هودنەدا بە شەرت گرتنی ئەوە کە ئەگەر ژنێکی کافر رای کرد بۆ ناو موسوڵمانان، رەوانەی بکەنەوە بۆ ناو کافرەکان وە ئەگەر شەرتێکی وا کرا، ئەوە وەکوو شەرتەکە خۆی بەتاڵە، عەقدەکەیش بەتاڵ ئەکاتەوە وە ئەگەر شەرتی ئەوە کرا کە هەرکەس بێ بۆ ناومان بنێررێتەوە، یاخود باسی ئەوە نەکراو لەپاشا ژنێ لەناو کافرکانەوە هات بۆ ناومان، واجب نییە مارەییەکەی بدرێ بە مێردەکەی وە ئەگەر منداڵو شێت هاتن بۆلای ئێمە، ئەوە نایان گێڕینەوە، هەروەها بەندەو ئازادێکی وایش کە عەشرەتی نەبێ یاخود عەشرەتی ببێ بەڵام عەشرەتەکەی نەیپارێزن وە هەرکەسێ هاتە ناو ئێمەو خزمو عەشرەتی داوایان لێ کردین بیدەینەوە، ئەوە ئەیدەینەوە بە عەشرەتەکەیو نایدەین بە کەسێ کە بیبا بۆ شوێنێکی تر، مەگەر ئەم کەسە بتوانێ زاڵ ببێ بەسەر ئەو کەسەدا کە لەگەڵیا ئەڕواتەوەو لە دەستی دەرچێو رابکا.

مەعنای گێڕانەوە، ئەوەیە مەجالی رێگەنەدان نادەین لەبەینی کابرای کافرو ئەو کەسەدا کە هاتووە بەدوایا، نەك ئەوە کە کابرا بە زۆر بنێرینەوە وە ئەگەر کەسێ داواکراو لەگەڵ ئەو کەسەدا رۆیشتەوە کە هاتووە بەدوایا وە بۆی هەڵکەوت ئەتوانێ لە رێگەدا ئەو کەسە بکوژێ کە هاتووە بەدوایا، دروستە بۆ ئێمەیش بە مەعنا ئەمەی تێبگەیەنین، بەڵام بە ئاشکرا دروست نییە وە ئەگەر شەرتی ئەوە کرا کە هەر پاشگەز بووەوەیەك لەناو ئێمە رای کرد بۆلای ئەوان، رەوانەی بکەنەوە، واجبە لەسەریان ئەو شەرتە جێبەجێ بکەن، ئەگینا عەهدەکە تێك ئەچێ؛ فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە دروستە لە بابەتی وادا باسی نەناردنەوەیش بکەین.

## باسی پێش‌بڕکێ (مُسابَقَة)و تیرئەندازی (مُناضَلَة)

پێش‌بڕکێ، بریتییە لەوە کە دووکەس یا زیاتر وڵاخ غار بدەن لە مەسافەیەکی دیاریدا بۆ ئەوەی دەربکەوێ کامیان زووتر ئەگاتە ئەوپەڕی ئەو مەسافەیە. تیر ئەندازیش، ئەوەیە دووکەس یا زیاتر تیر یا تفەنگ بتەقێنن تا دەربکەوێ کامیان نیشانەکە ئەپێکێ؛ ئەم پێش‌بڕکێ و تیرئەندازییە سوونەتنو حەڵاڵە بریتی (عِوض)یان لەسەر وەربگیرێ بەو شێوە کە باس ئەکرێت.

تیرئەندازی، دروستە لەسەر تیری عەرەبی کە پێی‌ئەڵێن: «نَبْل» یا تیری عەجەمی کە پێی‌ئەڵێن: «نشاب»؛ هەروەها دروستە لەسەر رمی کورت‌و رمی عادەتی‌و فڕەدانی بەرد بە بەردەقانی یا بە مەنجەنیق وە لەسەر هەر شتێکی‌واکە سوودی هەبێ بۆ جەنگ لەگەڵ دوژمندا، وەکوو نیشانەنانەوە بۆ تفەنگ‌و دەمانچەو شمشێربازی، نەك لەسەر گۆبازی بە گۆچان‌و مەلەوانی‌و شەترەنج‌و گۆرەوێ‌بازی‌و فنجانێن‌و راوەستان لەسەر یەك پێ‌و کاکڵەمستێ؛ هەروەها، پێش‌بڕکێ دروستە لەسەر ئەسپ‌و وشترو فیل‌و ئێستر و کەر، نەك لەسەر پەلەوەر، وەکوو کۆتربازی‌و لەسەر غەیری ئەمانە، وەکوو زۆران‌گرتن.

فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە عەقدی پێش‌بڕکێ‌و تیرئەندازی جێگرتوو دەبن‌و لەپاش دامەزرانیان تێك ناچن بە پەشیمان‌بوونەوە؛ هەروەها، دروست نییە دەست هەڵگرتن لە ئیشەکە لەپێش یا لەپاش دەست پێ کردنی وەکەم و زیاد کردنی ئیشەکە یا ئەو پارەیە کە بڕیار دراوە، دروست نییە.

شەرتی پێش‌بڕکێ ئەوەیە شوێنی راوەستان لەم‌پەڕی مەیدانەوە دیاری بکرێت‌و نوختەی ئەوپەڕی مەسافەکەیش دیاری بێ و مەسافەی مەیدانی غاری هەردوو سوارەکە وەکوو یەك وابن‌و ئەسپی هەردوولایان دیاری بکرێ و هەرکام لەو ئەسپانە لەوانە بێ پێش‌بکەوێ لەوی‌تریان وە ئەندازەی پارە دیاری‌کراوەکەیش دیاری بێ.

پێش‌بڕکێ دروستە بە دوو جۆر؛

یەکەم، ئەوەیە ئەوکەسەکە ماڵەکە بڕیار ئەدا بۆ پێش‌کەوتوو، غەیری ئەو دووکەسە بێ کە پێش‌بڕکێ کە ئەکەن؛ مەسەلا، پێشەوای موسوڵمانان یا یەکێ لە رەعیەتەکانی بڵێ بەو دووکەسە: هەرکامتان پێش‌بکەوێ، ئەوەندە پارەی پێ ئەدەم لە «بیتُ المال»، یا: لە پارەی خۆم؛

جۆری دووهەم، ئەوەیە کە یەکێ لەم دووکەسە بە هاوڕێکەی بڵێ: ئەگەر تۆ پێش کەوتی، من ئەوەندە ماڵت ئەدەمێ وە ئەگەر من پێش کەوتم، هیچم ناوێ.

وە ئەگەر شەرتی ئەوە کرا هەرکامیان پێش کەوت ئەوەندە ماڵی لەسەر هاوڕێکەی بێ، ئەوە دروست نییە، مەگەر بە هۆی کەسێکی سێهەمەوە کە ببێ بە «مُحلِّل»، یەعنی

دروستکەرو حەلاڵ کەری ئەم پێشبڕکێیە، بەم تەرتیبە ئەڵێت: ئەگەر ئێوە پێشکەوتن لە من، ئەوە هیچتان نادەمێ وە ئەگەر من پێش کەوتم لە ئێوە، ماڵی هەردووکتان وەرئەگرم؛ جا ئەگەر ئەو دووکەسە پێشکەوتن لە کابرا، ئەوە هیچ وە ئەگەر ئەم پێشکەوت لەوان، ئەوە ماڵی هەردووکیان وەرئەگرێ وە ئەگەر لە یەکێکیان پێشکەوت، ئەوە ماڵی کابرای پاشکەوتوو ئەدرێ بە حەلاڵ کەرەکەو بەو یەکەکە لەگەڵیا ڕۆیشتووە، بە چونیەکی وە ماڵی کابرا کە لەگەڵ حەلاڵ کەرەکەدا ڕۆیشتووە، هەر بۆ خۆیەتی وە ئەگەر یەکێ لەو دووکەسە گەیشت بە ئاخری مەیدانەکە، ئەمجار حەلاڵ کەرەکە، ئەمجار کەسی سێهەم، ئەوە ماڵی ئەم سێهەمە بۆ کابرای یەکەمە وە شەرتە کە ئەسپی کابرای حەلاڵ کەر ئەوەندەی ئەسپی یەکەیەکەی ئەو دوو کەسە بەهێزو توانا بێ.

ئەگەر سێ کەس یا زیاتر لە سێ کەس کەوتنە پێشبڕکێوە و ئەوەندەی بەشی کابرای یەکەم بەش دانرا بۆ کابرای دووهەم، ئەوە بەتاڵە وە ئەگەر لە بەشی ئەوکەمتری بۆ دانرا، ئەوە دروستە.

**بزانن!** پێشکەوتنی وشتر، بە شانەو پێشکەوتنی ئەسپ، بە گەردنە.

بۆ دامەزرانی تیرئەندازیش، بە شەرت گیراوە کە سەرکەوتن بە دەس پێشخەری «مُبادَرَة»بێ، یەعنی ئەو کەسە کە زووتر ژمارەی پێکانەکان تەواو بکا، یاخود بە لە عاستییەکدا دانان (مُحاطَّة)بێ، واتە ژمارەی پێکانی هەردوولایان موقابەلەیان پێ بکرێ و ئەوەی تێکەڵ بوولە لەبەینی هەردوولایاندا فڕە بدرێ، ئەمجار هەرکامیان ئەوەندە ژمارە زیادەی هەبوو، ئەوە سەرکەوتووە؛ هەروەها، بەشەرتگیراوە کە بەیانی ژمارەی تیرهاویشتن و پێکانەکەیش بکەن و بەیانی ئەندازەی مەسافەکە بکەن و بەیانی ئەوەیش بکەن کە ئەندازەی نیشانەکە بە درێژیو بە پانی چەندە؛ بەڵام ئەمە بۆ شوێنێکە کە نیشانەیەکی تایبەتی تیا دانەنرابێ، ئەگینا نیشانەی دیارینەکراو ئەبڕێ بەسەر ئەو نیشانەدا کە لەو شوێنەدا هەیە.

سوننەتە بەیانی سیفەتی تیرئەندازییەکە بکەن ئاخۆ بە شێوەی لێدانی نیشانەکە ئەبێ بە بێ ئەوە کە بریندار بکاو کونی بکا کە پێی ئەڵێن: «قَرع»، یاخود بە کونکردنی

نیشانەکە ئەبێ کە تیا رانەوەستێ کە پێی دەڵێن: «خَرق»، یاخود بە کونکردنی نیشانەکەو تیامانەوەی دەبێ کە پێی دەڵێن: «فسق»، یا بە کونکردنی نیشانەکەو دەرچوونی تیرەکە دەبێ کە پێی دەڵێن: «مرق» وە ئەگەر لەم سیفەتانە هیچ کامیان باس نەکرا، ئەوە ئەبڕێ بەسەر لێدانی رووتدا.

حوکمی بریتی (عِوض) لە تیرئەندازیدا، وەکوو لە پێش‌بڕکێدا وایە بە هەموو تەفسیلاتێکیەوە. لە تیرئەندازیدا شەرت نییە دیاری کردنی تیروکەوان وە ئەگەر دیاری کران، ئەو دیاری کردنە بەتاڵەو دروستە کابرا بیانگۆڕێ بە تیروکەوانێکی‌تر وە ئەگەر دیاری‌کرانو بەشەرت گیرا کە نابێ بگۆڕرێن، ئەوە ئەو عەقدە بەتاڵە، بەڵام فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە کە شەرتە باسی ئەوە بکرێت کامیان لەپێشا دەس بکا بە تیر هاویشتن.

**بزانن!** ئەم سیفەتی تیرئەندازییە کە باسمان کرد، بۆ تیرئەندازییە بە تیروکەوان کە ئێستا نەماوە؛ ئەوەی ئەمڕۆ پێویست بێ بۆ بەکارهێنانی تفەنگو دەمانچە لە مەیدانی پێش‌بڕکێ کردندا، هەر تەنها پێکانی نیشانەو شوێنی پێکانەکەیە.

ئەگەر کۆمەڵێك ئامادە بوون بۆ تیرئەندازیو دووکەس ئامادە بوون بۆ ئەوە کە هاوڕێی خۆیان هەڵبژێرنو بیانکەن بە دوو دەستە، ئەوە دروستە؛ لەم کاتەدا، نابێ ئەو دووکەسە دەستەی خۆیان بە قورعە هەڵبژێرن، چونکە رێ ئەکەوێ لە قورعەدا هەموو زیرەكو دەست راستەکان بکەونە لایەکەوە وە ئەگەر شەرتی قورعە کرا، ئەوە بەتاڵەو عەقدەکەیش بەتاڵ دەکاتەوە.

جا ئەگەر یەکێ لەسەرۆکەکانی دوو دەستەکە بێگانەیەکی هەڵبژاردو وای‌تێ گەیشت دەستی راستە، کەچی وانەبوو، ئەو عەقدەکە هەر لەو کەسەدا بەتاڵە و پێویستە لە دەستەی دووهەمیش یەکێك لابرێ وە لە بەتاڵ‌بوونەوەی عەقدەکەدا بۆ ئەوانی‌تریش، دوو فەرمودەی «تَفریق صفقة» هەیە؛ جا ئەگەر بڵێین: عەقدەکە دامەزراوەو عەقدکەرەکان حەقی پەشیمان‌بوونەوەیان هەیە، لەم سوورەتەدا هەموو حەقی پەشیمان‌بوونەوەیان هەیە وە ئەگەر رێگای عەقدەکەیان دا بەڵام هەرایان بوو لەوەدا کە کێ بەرابەر بەکەسە بێگانەکە لائەبرێ، ئەوە عەقدەکە بەتاڵ ئەکرێتەوە.

ئەو دەستەیەش کە ئەیباتەوەو ماڵەکەی دەس ئەکەوێ، دابەشی ئەکەن لە بەینی خۆیاندا بەپێی نیسبەتی ژمارەی پێکانی نیشانەکە وە لە فەرموودەیەکیشدا هەیەکە وەك یەك دابەشی ئەکەن. پێکانیش ئەوەیە کە بە نووکی تیر بێنەك بە تەنشتی.

ئەگەر کەسێك بە بێئەوەی خۆی قوسوورێکی هەبێ، کەوانەکەی یا ژێکەی فەوتا، یاخود شتێك هاتە رێگای تیرەکەی و لەگەڵ ئەوەیشدا هەر تیرەکەی دای لە نیشانەکە، ئەوە ئەم پێکانەی بۆ ئەژمێررێ وە ئەگەر نەیپێکا، ئەو جارەی بۆ ناژمێررێو لە کیسی ناچێ وە ئەگەر وەزعەکە قوسووری خۆی تیابوو، ئەوە ئەگەر پێکای بۆی ئەژمێررێ وە ئەگەر نەیپێکا، لەسەری حیساب ئەکرێ بەجارێك.

وە ئەگەر بەهۆی شتێکەوە، وەك بایەکی توند، نیشانەکە لە شوێنی خۆیدا نەماو تیرەکە دای لە شوێنی نیشانەکە، ئەوە بۆی ئەژمێررێ وە ئەگەر نەیدا لە شوێنەکەی، هیچی بۆ ناژمێررێ.

وە ئەگەر بە شەرت گیرابوو کە تیرەکە لە نیشانەکەدا بمێنێتەوە، کەچی کونی کردو کەمێك لە نیشانەکەدا مایەوە ئەوجار داکەوت، یا دای لە شتێکی رەقو داکەوت، ئەوە بۆی ئەژمێررێت، چونکە کابرای تیرهاوێژ عوزری هەیە لە داکەوتنی تیرەکەیدا.

## باسی سوێند خواردن (أَیْمان)

سوێند، دانامەزرێ تەنها بە زاتی خودا یا سیفەتێك لە سیفەتەکانی نەبێ. سوێند خواردن بە زاتی خودا، وەکوو ئەوەکە بڵێت: قەسەم بە خودا، یا قەسەم بەوکەسەکە ئەم جیهانەی دروست کردووە، یا: قەسەم بەو زیندووەکە هەرگیز نامرێت، یا: قەسەم بەو کەسەکە گیانی من لە دەستیایە؛ هەروەها، هەر ناوێ کە تایبەتی بێ بە زاتی خـواوە، وەکوو «اللّٰە»، یا دروستکەری جیهان، ئەوە سوێندی پێدەخورێ وە ئەگەر کابرا بڵێ: مەبەستم ناوی خودا نەبووە، لێی وەرناگیرێ وە هەر ناوێ کە بە بێ قەید بۆ زاتی خودا بەکار بهێنرێ، وەکوو «رَحیم»و «رزّاق»و «رَبّ»، ئەوە سوێندی پێ دائەمەزرێ، مەگەر کابرا مەبەستی غەیری خودا بێ وە هەر ناوێ کە بۆ خوداو غەیری خودا بەکاربهێنرێ

وەكوو یەك، وەك «مەوجوود، عالم، زیندوو»، ئەوە نابێ بە سوێنـد، مـەگـەر نـیازی سوێندی پێ هەبێ.

نموونەی سوێند خواردنیش بە سیفەتی خوا، وەكوو ئـەوە كـە بـڵێ: قـەسەم بـە گەورەیی خودا، بەكەلامی خودا، بە قودرەتی خودا، بە عیلمی خودا، بە ئیرادەی خودا؛ جا ئەگەر مەبەستی لە عیلم، مەعلوومات بێ‌و مەبەستی لە قودرەت، مەقدوورات بێ‌و مەبەستی لە ئیرادە، موراد بێ‌و هەر بەم‌جۆرە، ئەوە نابێ بە سوێند، مەگەر خۆی نیازی سوێندی پێ هەبێ وە ئەگەر بڵێ: بە حەقی خودا، ئەوە سوێندە، چونكە زیاتر وایـە مەبەستی لە حەقی خودا، زاتی خودایە؛ بەڵێ، ئەگەر مەبەستی ئەو عیبادەتانە بێ كـە حەقی خودان بەسەر ئادەمیزادەوە، وەكوو نوێژو رۆژوو، ئەوە نابێ بە سوێند.

حەرفی سوێندخواردن لە زمانی عەرەبیدا، «واو»و «بێ»و «تێ»یە، وەكوو «وَاللّٰه»و «بِاللّٰه»و «تَاللّٰه» وە لە زمانی كوردیدا، دوو لەفز بەكار دەهێنرێن بۆ قەسەم؛ یەكەم «بە»، وەكوو دەڵێن: «بەكەلامی خودا»؛ دووهەم، «وە»، وەكوو «وەكەلامی خودا»؛ جا ئەگەر كابرای سوێندخۆر گوتی: قەسەم بە خودا، یا: بە خودا ئەو شتە ئەكەم، ئەوە بێ‌گومان سوێندە وە ئەگەر وتی: قەسەمم خواردووە بە خودا، یا: قەسەم ئەخۆم بە خودا، ئەوە ئەگەر نیازی سوێندی هەبێ، یا بە بێ‌نیاز بە دەمیا بێت، ئەوە وادیارە ئەبێ بە سوێند وە ئەگەر مەبەستی خەبەردان بێ لە رابوردوو یـا لە پـاشەڕۆژ، یـەعنی بـڵێ لەوەپـێش سوێندی خواردووە یا لەمەوپاش سوێند ئەخوا و ئیددیعای ئـەم نـیازە بكـا، ئـەوە باوەڕی پێ دەكرێ.

وە ئەگەر وتی بە كەسێك: سوێندت ئەدەم بە خودا ئەو ئیشە ئەكەی و مـەبەستی سوێندی خۆی بێ، ئەوە ئەبێ بە سوێند وە ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبێ، ئەوە نابێ بە هیچ.

ئەگەر وتی: ئەگەر ئەو شتەم كرد بە جوولەكە بم، یا: لە ئایینی ئیسلام بێ‌بەری بم، ئەوە نابێ بە سوێند، چونكە ناوی زات‌و سیفەتی خوای تێدا نییە، بەڵام بەكارهێنانی ئەم عیبارەتە حەرامە، جا ئەگەر مەبەستی زیادەڕەوی بێ لە دووركەوتنەوەیدا لەو شتە،

یا نیازی هیچ نەبێ، ئەوە کافر نابێ وە ئەگەر نیازی تەعلیق کردنی کافربوونی خۆی بێ بەوەوە کە ئەو شتە بکات، ئەوە هەر لە ئێستاوە کافر دەبێ؛ جا لەبەر ئەم ئیحتیماله، سوننەتە بۆ هەرکەس کە ئەم لەفزەی بە دەمدا بێ، زووبەزوو داوای لێخۆش بوون بکا لە خوداو لەفزی شەهادەتەین بڵێت.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد لەسەر شتێك‌و کەسێکی تریش وتی: منیش سوێندم لەگەڵ سوێندی تۆدا بێ، ئەوە ئەم لەفزە بۆ ئەمەی دواییيان نابێ بە سوێند وە ئەگەر کەسێك لەفزی سوێندی بە دەمدا هات بە بێ‌نیازی سوێند، ئەوە سوێندەکەی دانامەزرێ، هەرچەند بە زاهیری شەرع بە سوێند دەناسرێت.

بزانن! سوێند خواردن، هەندێ‌جار واجبە، وەکوو سوێندێ کە بێ بەهۆی پاراستنی گیان یا ناموس یا ماڵێکی بێ‌گوناه وە هەندێ جار حەرامە، وەکوو سوێندی درۆ یا سوێند لەسەر تەرکی واجب یا کردنی حەرام وە هەندێ جار سوننەتە، وەکوو سوێندی «مدّعي» لەلای حاکمی شەرعدا لەکاتێکا کە «مدّعى عليه» سوێند نەخواو سوێندەکە بگێڕێتەوە بۆ سەر «مدّعي» وە هەندێ‌جار کەراهەتی هەیە، وەکوو سوێند لەسەر شتی مەباح وە هەندێ‌جار مەباحە، وەکوو سوێند لەسەر کردنی واجب‌و سوننەت‌و نەکردنی حەرام‌و مەکرووه

جا ئەگەر کەسێ سوێندی خوارد لەسەر نەکردنی واجب، یا کردنی حەرام، ئەوە گوناهبار ئەبێ‌و واجبە سوێندەکە بشکێنێ‌و کەفارەتی‌بدا وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەرکردنی واجب، یا نەکردنی حەرام، ئەوە سوێندەکە مەباحەو واجبە سوێندەکەی بیاتەسەرو حەرامە بیشکێنێ‌و کەفارەتی بدا؛ هەروەها، ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر کردنی سوننەت‌و نەکردنی مەکرووه، ئەوە سوێندەکەی مەباحەو سوننەتە سوێندەکەی بیاتەسەرو کەراهەتی هەیە بیشکێنێ‌و کەفارەتی بدا وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر نەکردنی مەباح، یا کردنی مەباح، ئەوە سوێندەکەی کەراهەتی هەیەو باشتر ئەوەیە سوێندەکەی نەخا، لەبەر پاراستنی حورمەتی ئەو ناوە پیرۆزە، یا ئەو سیفەتە کە سوێندەکەی پێ خواردووە.

## باسی کەفارەتی سوێند

ئینسانێ کە سوێندی کەوت، ئارەزووی خۆیەتی هەرکام لەم سێ شتە بکا؛ یەکەم، ئازادکردنی بەندەیەك، وەکوو ئەوە کە لە باسی کەفارەتی «ظِهار»دا رابورد؛ دووهەم، خۆراكدانی دە کەسی هەژار هەریەکی «مُدّ»ێك لە دانەی شتێ کە لە زیاتری قـووتی شوێنی کابرا بێ، سێهەم پۆشاك پێدانیان بە بەرگێکی وەکوو کراس و مێزەرەو دەرپێ، نەك «خُفّ»و دەسکێش و پشتێن؛ شەرت نییە ئەو بەرگە بە کاری ئەو کەسە بـێت کـە پێی ئەدرێ؛ کەوابێ دروستە دەرپێی بچووك بۆ پیاوی گەورەو پۆشاکێ کە لە لۆکـەو هەورێشم و کەتان دروست کرابن بۆ ژن و پیاو، هەروەها بەرگێ کە کۆن بووبێ بـەڵام هێزی تێدا مابێ؛ جا ئەگەر کابرا توانای نەبوو لەسەر ئەم سێ شتە، پێویستە سێ رۆژ بە رۆژوو بێ و شەرت نییە ئەو رۆژانەیش لەسەر یەك بگرێت وە ئەگەر ماڵەکەی لەویادا نەبوو، چاوەڕوانی هاتنەوەی دەکات و بەرۆژوو نابێ.

ئەم کەفارەتانە، لەپاش سوێند کەوتن واجب ئەبن؛ ئەیشتوانـێ کـەفارەت بـدا لە پێش کەوتنی سوێندەکەیدا، خواه ئەو سوێند خستنە دروست بێ، یا حەرام بێ، وەکوو چۆن دروستە کەفارەتی زیهار بخرێتە پێش گەڕانەوەی کابرای زیهارکەر و کەفارەتی کوشتن بخرێتە پێش مردنی کوژراوەکەوە، یا نەزری ماڵێك بخرێتە پێش بەجێهاتنی «معلَّق علیە»ی نەزرەکەوە، بەڵام دروست نییە پـێش خسـتنی کـەفارەتی جـیماع لە رەمەزاندا لەسەر جیماعەکە؛ هەروەها، دروست نییە پێش خستنی کەفارەتی حـەج و عەمرە لەسەر حەج و عەمرەکە، یا پێش خستنی «فِدیة»ی سەرتاشین و بەرگ لەبەرکردن لە حەجدا لە سەر سەرتاشین و بەرگ لەبەرکردنەکە، مـەگـەر کـابرا عـوزری هـەبێ لەم شتانەدا؛ مەسەلا، نەخۆش بکەوێ و ناچار ببێ جل لەبەر بکا، ئەوە ئەتوانێ لەپێشانا کەفارەتەکە بدا.

## باسی سوێند لەسەر دانیشتن و لەگەڵدانیشتن و هەندێ شتی تر

ئوسووڵ لەم باسەدا، ئەوەیە ئەو لەفزانە کە لە سوێنددا بەکار ئەهێنرێن، ئەبڕێن بەسەر مەعنای راستەقینەیاندا، مەگەر کاتێ کە مەعنا مەجازییەکەیان مەشهوورتر بێ، یا سوێندخۆر نیازی داخڵبوونی مەعنامەجازییەکەیش بکا، لەوکاتەدا ئەویش بەرئەکەوێ؛ کەوابوو، ئەگەر پادشایەك سوێندی خوارد کە خانوو ناکاتەوە، ئەوە سوێندی ناکەوێ، مەگەر بەوەکە خۆی بە دەستی خۆی ئیش بکاو خانووەکە بکاتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر مەبەستی خانوونەکردنەوەی خۆی و غەیری خۆیشی بوو، ئەوە بە خانوو کردنەوەی عەمەلەیش سوێندی ئەکەوێ، لەبەرئەوە کە بەهۆی ئەو نیازەوە لەفزەکەی بەکارهێناوە لە حەقیقەت و مەجازدا بەیەکەوە؛ بینا لەسەر ئەوە، دروستە بە جارێ ئەم دوو مەعنایە لە یەك لەفز وەربگیرێن، یاخود بە ئوسووڵی عومومیەتی مەجاز، یەعنی لەو لەفزە مەعنایەکی مەجازیی وا ئیعتیبار بکرێ کە مەعنا راستییەکەشی بگرێتەوە؛ ئەم ئوسووڵەی لای خاوەنی نیهایە جێگەی باوەڕە.

لە فەرموودەیەکی تردا، پادشاهەکە لە مەسئەلەی پێشوودا سوێندی ئەکەوێ بەوەکە کرێکار خانووەکە بکەنەوە لەبەر هێزی عورف؛ ئیمامی رافیعی ئەم فەرموودەیەی بە ساغ داناوە، ئیمامی ئەسنوی یش ئیعتیمادی داوەتە سەری. لەسەر ئەم ئەساسەیە ئەوەی کە لە ئەسڵی «رَوضە»دا لەم شوێنەدا ئەفەرموێت: لە لەفزەکانی سوێنددا شوێنی ئەو مەعنایە دەکەوین کە لە لەفزەکەوە پێویست دەبێ؛ هەندێ جاریش تەقیید رووئەکاتە لەفزی موتڵەق و تەخسیس رووئەکاتە لەفزی عام بەهۆی نیازی کابرای سوێندخۆرەوە یا لەبەر هێزی عورفی خاس یا لەبەر قەرینەیەك لەسەر ئەو مەعنایە.

ئەم قسەیە، زوو ئەچێ بە دڵدا؛ مەسەلا، کابرا سوێندی خوارد وتی: سەر ناتاشم، مەعنای عورفی ئەوەیە کە: بە سەرتاش سەرناتاشم، یا ئەگەر بە کەسێ بڵێن: فەرموو! بێرەماڵەوە، ئەویش بڵێت: وەڵڵا نایەمە ماڵەوە، مەعنای ئەوەیە نایەمە ئەم ماڵەوە نەك نارۆمە هیچ ماڵێکەوە، یاخود بە کەسێ بڵێن: فەرموو! قاوەڵتی بکەین، ئەویش بڵێ:

وەڵڵا قاوەڵتی ناکەم، ئەوە مەعنای وایە لەگەڵ ئەو کەسانەدا قاوەڵتی ناکا لەوکاتەدا نەك لەکاتی‌تردا، یا لەگەڵ کەسدا قاوەڵتی ناکا، یا هەر خۆی قاوەڵتی ناکا.

جا کە وابوو هەرکەسێ سوێندێکی خواردو پرسیاری کرد لە مەلایەك بۆ حوکمی سوێندەکەی، ئەبێ ئەو مەلایە لێی بپرسێ: نیازی چی بووە؟ ئەگەر نیازی خۆی باس کرد، ئەوە لەسەر نیازەکەی وە رامی بداتەوەو ئەگەر نیازی نەبوو، ئەمجارە ئەگەر عورفێکی بڵاو هەبوو، لەسەر ئەو عورفە بڵاوە بڕوا وە ئەگەر عورف نەبوو، بەڵام قەرینەیەکی بەهێز هەبوو، تەماشای قەرینەکە بکا، ئەگینا بڕواتە سەر مەعنای راستەقینەی لەفزەکە، وەکوو لە ئەسڵی «رَوضە»وە دەرئەکەوێ؛ بەڵێ، مەلا ئەگەر لەوانە نەبێ تەرجیحی قسەی یەکێ لە ئیمامەکان بکا بەسەر قسەی ئەوانی‌تریاندا، ئەتوانێ بەپێی فەرموودەی هەرکامیان بجووڵێتەوە.

ئەگەر کەسێ سوێندی خوارد: لەوماڵەدا دانانیشێ، یاخود لەو ماڵەدا نامێنێتەوەو کابرا لەکاتی سوێندەکەیدا لەو ماڵەدا بوو، پێویستە دەس‌بەجێ لەو ماڵە دەرچێ وە ئەگەر بە بێ عوزر لەو شوێنەدا مایەوە، سوێندی دەکەوێ وە ئەگەر عوزری هەبوو؛ مەسەلا، دەرگایان لێ داخست، یاخود نەخۆشییەکی کوت‌وپڕی بەسەرا هات، یا هەر لەکاتی سوێندەکەدا نەخۆش بوو بە نەخۆشییەکی‌وا کە دروست بێ لەبەر ئەو نەخۆشییە بە دانیشتنەوە نوێژ بکا، یاخود ئەگەر لەوکاتەدا دەربچوایە ترسی گیان یا ناموس یا ماڵی هەبوو، یا ترسی ئەوەی هەبوو نوێژی بفەوتێ، یا شەوێکی تاریك بوو و ترسی ئەوەی هەبوو بکەوێتە چاڵێکەوە یا تووشی دڕندەیەك ببێ، یا ترسی کاربەدەستێکی ستەمکاری هەبوو، یاخود کابرا خەریك بوو بە ئەسبابی دەرچوونیەوە، وەکوو کۆکردنەوەی قاپ‌وقاچاخی ناوماڵ یا لەبەر کردنی بەرگێ کە پێویست بێ بۆ دەرەوە، ئەو لەم سوورەتانەدا سوێندی ناکەوێ، هەرچەند زۆریش بمێنێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا لەکاتی سوێندەکەدا لەدەرەوە بوو و لە پاشا رۆیشتەوە ماڵەوە، سوێندی ئەکەوێ؛ بەڵێ، لە «مُغنی»دا ئەفەرموێت: ئەگەر بۆ کۆکردنەوەی شت‌ومەك رۆیشتەوە ماڵەوە، هەر سوێندی ناکەوێ، چونکە عوزری هەیە.

ئەگەر سوێندی خوارد هاوڕێیەتی فڵانکەس ناکەم لەوماڵەدا، یا لەگەڵیا دانانیشم لەوماڵەدا و گورج لەپاش سوێندەکە یەکێکیان لەو شوێنە چوونە دەرەوە، ئەوە سوێندی ناکەوێ، هەروا ئەگەر سوێندی خوارد کە فڵانکەس لەگەڵما دانانیشێ لەم ماڵەدا؛ بەڵێ، لەم سوورەتەیشدا ئەگەر خەریك بوو بە کۆکردنەوەی کەل‌وپەل‌و قاپ‌و قاچاخەوە، هەر سوێندی ناکەوێ وەکوو سوورەتی پێشوو، هەروا ئەگەر دەس‌بەجێ دیوارێك دروست بکا لە بەینی خۆی‌و کابرادا، بەو شەرتە هەرلایەك دەرگایەکی تایبەتی هەبێ.

وە ئەگەر لەم سوورەتەداو لە سوورەتی پێشوودا ئیددیعای ئەوەی کرد کە نیازی لە ماڵەکە ئەو هۆدەیە بووە، ئەوە ئەگەر قەرینەیەك ببێ لەسەر راستی کابرا، وەکوو ئەوە کە ئەو هۆدەیە جێگەی کابرا بێ بەتایبەتی‌و ئەمیش عاجز بێ لەو کەسە، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ، ئەگینا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام کابرا حەواڵەی ئایینی خۆی ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد لەگەڵ فڵانکەسدا بەیەکەوە دانانیشن‌و زیاتری نەوت‌و شوێنەکەیان لە یەك خانوودا بوو، بەڵام ئەوەندە دوور بوون لە عورفدا بە هاوڕێی یەکتر نەئەناسران، ئەوە سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر سوێندی خوارد لە فڵان شاردا لەگەڵیا دانانیشم، ئەوە ئەگەر هەریەکی لەناو خانوویەکدا بن، سوێندی ناکەوێ، هەرچەند دراوسێی یەکیش بن وە ئەگەر لە یەك خانوودا دابنیشن، سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ناڕۆمە ماڵی فڵانکەسەوە و لەو کاتەدا لەناو ماڵەکەدا بوو، یاخود وتی: لەو ماڵە ناڕۆمە دەرەوەو لەوکاتەدا لە دەرەوە بوو، ئەوە ئێستە سوێندی ناکەوێ، جا ئەگەر هاتە دەرەوە ئەوسا ڕۆیشتەوە ناو ماڵەکە، یاخود ڕۆیشتە ماڵەکەو ئەوسا هاتە دەرەوە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: دەستنوێژ ناگرم‌و لەو کاتەدا دەستنوێژی هەبوو، یا وتی: جل‌ناکەمەبەر و لەوکاتەدا جلی لەبەردا بوو، یا وتی: سوار نابم و لەوکاتەدا سوار بوو، یا وتی: ڕاناوەستم و لەوکاتەدا ڕاوەستابوو، یا وتی: دانانیشم و لەوکاتەدا دانیشتبوو، یا وتی: شەریکی فڵانکەس ناکەم و لەوکاتەدا شەریکی بوو، یا وتی: ڕووناکەمە فڵان شوێن و لەوکاتەدا ڕووی لەو شوێنە بوو وە درێژەی دا بەم

وەزعانە کە سوێندی لەسەر خواردوون، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر وتی: نیازم ئەوە بووە پاش ئەم وەزعە کە وام لەسەری تازەی ناکەمەوە، ئەوە لەسەر ئەو نیازەی رەفتاری لەگەڵدا دەکرێ.

ئەگەر یەکێ لە دوو برا سوێندی خوارد وتی: لەگەڵ ئەم برایەمدا هاوبەشی ناکەم و لەپاشا باوکیان مرد، ئەوە بەوە کە ماڵەکەی باوکیان ئەبێ بە ماڵی ئەوان سوێندی ناکەوێ، بەڵام واجبە پاش مردنی باوکیان یەکێکیان لە شەراکەتی ئەو ماڵە دەربچێ، خوای بە فرۆشتنی بێ یا بە بەخشینی بە یەك ـ مەسەلا ـ وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: لە فلان شوێندا سێ رۆژ نامێنمەوە و بە جیاجیا سێ رۆژ لەو شوێنەدا دانیشت، سوێندی ئەکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر خۆی وتی: نیازم لە مانەوە، مانەوەی سێ رۆژ بووە لەسەر یەك، ئەوە سوێندی بەو سوورەتە ناکەوێ.

بەڵام ئەگەر سوێندی خوارد لە ژنەکەی سێ رۆژ لە فلان شوێندا میوان نابێ و ژنەکەی دوو رۆژ لەو شوێنەدا دانیشت جا دەرچوو و لەپاش ئەوە رۆژێکی تر لەوێ دانیشت، ئەوە سوێندی ناکەوێ؛ هەروا، ئەگەر سوێندی خوارد وتی: سی رۆژ قسە لەگەڵ فلانکەس ناکەم و بیست و نۆ رۆژ قسەی لەگەڵ نەکرد و پاش ئەوە رۆژێکی تر قسەی لەگەڵدا نەکرد، ئەوە سوێندی ناکەوێ، لەبەرئەوە کە مەبەست لە قسە نەکردن ئازاردانە وە ئەگەر هەموو کاتەکە ئەو دیاریی کردووە تەرکی قسە نەکا، سوێندەکەی ناکەوێ.

وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: ژن ناهێنم و لەوکاتا ژنی هەبوو، یا وتی: خۆم بۆنخۆش ناکەم و لەوکاتەدا بۆنی خۆش بوو، ئەوە سوێندی ناکەوێ؛ هەروەها، بە درێژەدان بە زەوتکردنی ماڵ و بە نوێژ و رۆژوو و بە چوونە لای ژنەکەی، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە ئەم جۆرە ئیشانە تەقدیر ناکرێن بە زەمان و هەرچی کە ماوەکەی تەقدیر نەکرێ، دەوام لەسەر کردنی وەکوو دەست پێ کردنی نییە، بەڵام ئەو شتانە کە زەمانیان تەقدیر دەکرێ، یەعنی تەقدیر دەکرێن بە زەمانێکی تایبەتی، وەکوو سوورەتی سوێند خورادن لەسەر راوەستان و دانیشتن، ئەوە دەوام لەسەر کردنیان وەکوو دەس پێ کردنیان وایە، وەکوو لەسەرەوە باسمان کرد.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: ماڵی کەس زەوت ناکەم و لەوکاتەدا ماڵێکی داگیرکراوی لابوو و لەپاش سوێندەکەی نەیدایەوە بە خاوەنەکەی، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، چونکە درێژەدان بە زەوتکردنی ماڵی خەڵك هەر بە ماڵ زەوتکردن ئەناسرێ؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: مەبەستم ماڵ زەوتکردنی تازە بووە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك ماوەی ساڵێکی دانا بۆ کردەوەیەك، ئەوە ئەو ساڵە ئەبڕرێ بەسەر ساڵی قەمەریدا کە لە ئەوەڵی مانگی موحەڕڕەمەوە دەست پێدەکا وە ئەگەر عورف لەسەر ئەوە بوو کە ساڵی شەمسی بژمێررێ، یا کابرا خۆی مەبەستی ساڵی شەمسی بوو، ئەوە ئەبڕرێ بەسەر ساڵی شەمسیدا؛ جا ئەگەر لە سەری ساڵەکەوە سوێندی خوارد، پێویستە ئەو ساڵە تەواو ببێ وە ئەگەر لە ناو ماوەی ساڵەکەدا سوێندی خوارد پێویستە ئەو ساڵە تەواو ببێو لە ساڵی دواییش ئەوەندە بڕوا کە بگاتەوادەی سوێندی کابرا.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: ئەمساڵ یا مانگی رەمەزان، لەم شوێنەدا نابم، ئەوە ئەگەر دانیشێ تا چەند سەعاتێك پێش تەواو بوونی ئەو ساڵە یا ئەو مانگە، ئەوجا لەوێ دەربچێ، سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: لەم زستانەدا، یا لەم بەهارەدا ـ مەسەلا ـ یا ئەمساڵ یا ئەم مانگە لەم شوێنەدا نابم، ئەوە ئەگەر بە بێعوزری شەرعی سەعاتێك لەو شوێنەدا بمێنێ، سوێندی ئەکەوێ، چونکە مەعنای سوێندی پێشوو ئەوەیە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لەو شوێنەدا نابێ و مەعنای ئەم سوێندە ئەمەیە لە هیچکاتێ لەکاتەکانی ئەم ساڵە یا ئەم فەسڵە یا ئەم مانگە لەو شوێنەدا نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر مانیعێکی شەرعی هەبێ، وەکوو ئەوە قەرزارێك دەرکەوێتو مەنعی بکا لە رۆیشتن، یاخود فەرمانڕەوایەك بە زۆر رێی لێ بگرێ، سوێندی ناکەوێ.

**بزانن!** هەر کردەوەیەك کابرا سوێندی لێبخوا، کە کردی، بەو شەرتە سوێندی ئەکەوێ کە ئیشەکە ئیشی خۆی بێو لەگەڵ زانستو نیازو ئارەزووی خۆیدا بیکا؛ کەواتە، ئەگەر سوێندی خوارد ناڕواتە لای فلانکەس و لەپاشا ئەوکەسە هاتەلای ئەم، یاخود چوو بۆ لای کەسێكو نەیزانی ئەمە ئەو کەسەیە کە سوێندی خواردووە

نەڕواتەلای، یاخود زانی ئەوە بەڵام سوێندەکەی پێشووی لەبیرچووبووەوە، یاخود لە بیری بوو بەڵام کەسێك بە زۆر بردی بۆلای، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر سوێندی خوارد کە هاوڕێیەتی فلانکەس ناکات لە ڕێگاداو کەچی ئیشێکی حوکوومەت یەکی خستن لە سەفەرێکدا، یا ئەم کابرا چوو بۆ شوێنێك بە ئیشێك و ئەویش هات بۆ هەمان شوێن و بە ناچاری، تا ئیشەکەی هەردووکیان تەواو بوو لەو شوێنەدا مانەوەو مەجالی ئەوە نەبوو بۆ کابرای سوێندخۆر بچێتە شوێنێکی تر، ئەوە لەم سوورەتانەدا سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: ناڕۆمە ئەو ئوتێلە، یا ئەو خانووە، یا ئەو قوتابخانەیە، یا ئەو مزگەوتە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بەوە کە بڕواتە داڵانی ئەو شوێنانەوە ئەگەر داڵانەکە لەم دیوی ئەو شوێنانەوە بێ بە ڕووی حەوشەدا، هەرچەند لەولای داڵانەکەشەوە دەرگایەکی تر بێ بۆ سەر حەوشی ئەو ئوتێلە، یا ئەو خانووە، یا ئەو مزگەوتە، بەڵام سوێندی ناکەوێ بەوە کە بڕواتە سەر خواجەنشینی بەردەرگاکە، یاخود بڕواتە تاقێکەوە لە دیوارەکەدا بە ڕووی دەرەوە، یاخود لە ڕێگەیەکی دەری ئەو خانووەوە بڕواتە سەر بانی خانووەکە، خواە ئەو سەربانە دەوری گیرابێ یا نە.

هەروەها سوێندی ئینسان ناکەوێ بەوە کە دەستی یا سەری بخاتە ئەودیوی دەرگاکەوە یاخود هەردوو پێی یا تاقە پێیەکی بخاتە ئەودیویەوە بە بێ ئەوە کە هێزی بخاتەسەر هەردووکیان یا سەر ئەویانە کە وا لەودیوی دەرگاکەوە؛ عەینی ئەم حوکمانە تێپەڕ دەبێ لە سوورەتێکدا کە کابرا بڵێت: ناڕۆمە ئوتێل، یا خانوو، یا قوتابخانە، یا مزگەوت، بە بێ دیاری کردنی و نیشانە بۆ دانانی، وەکوو لە «رَوض»و «مُغنی»و «نهایە»دا جەزمی پێدا نراوە.

ئەگەر ئەو شوێنانە رووخانو بوون بە دەشتو تەختانو بەرزیی بناغەیان بەدەرەوە نەما، یاخود بوون بە شەقامی هاتوچۆ، هەرچەند هەندێ دیواریشیان لەلاوە مابێ، ئەوە ئەگەر کابرا بڕواتە ناویانەوە سوێندی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر نەبووبوون بە ڕێگەو هەندێ دیواریان بەسەر زەوییەوە مابێ، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

وە ئەگەر لەکاتی سوێندەکەیداگوتی: نارۆمە ئەو شوێنەو ناوی نەبردکە ئەو شوێنە کوێیەو چییە، ئەوە بە هەرجۆرێ بڕواتە ئەو شوێنەوە، سوێندی ئەکەوێ، هەرچەند بووبێ بە دەشتو نیشانەی کۆنی پێوە نەمابێ؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد وتی: نارۆمە ئەو خانووەوو لەپاشاندا خانووەکە کرا بە مزگەوت یا بە قوتابخانە یا بە هەرچی، ئەوجا چووە ناویەوە، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە ئەمانە لە عورفدا پێیان ناوترێ ماڵ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: نارۆمە ماڵی فلانکەس، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بەوەی بڕواتە ماڵێکەوە کە ئەو کەسەی تیا دانیشتبێو موڵکی خۆی بێ نەك بە کرێی گرتبێ یا خواستبێتی یا داگیری کردبێ وە ئەگەر مەبەستی لە ماڵی فلانکەس ئەو شوێنە بێ کە تێیدا دانیشتووە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، ئیتر ئەو کەسە بە هەرجۆرێ لەوماڵەدا دانیشتبێ.

بەڵام لە سوێند بە تەڵاقدا، نیازی خاوەن خانوو قەبووڵ ناکرێ ـ وەکوو رَمَلی دەفەرموێو پشت بەم فەرموودەیە دەبەستێ ـ بەڵام «ابنُ حجر» فەرموویەتی: لە تەڵاقیشدا قەبووڵ ئەکرێ لەو شوێنانەدا کە حوکمەکە قورس بێ لەسەر کابرا نەك لە شوێنی حوکمی سووکدا.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: نارۆمە ماڵی فلانکەس، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بەوە کە بڕواتە خانوویەکەوە کە موڵکی ئەو بێ، هەرچەند خۆیشی تێیدا دانەنیشتبێ؛ مەسەلا، دابێتی بە کرێ وە ئەگەر خانووەکە بەوناوەوە مەشهوور بوو و ئێستا موڵکی ئەو کەسە نەبوو، ئەوە بە هەرجۆرێ بڕواتە ئەو شوێنەوەو موڵکی هەرکەس بێ، سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: لەم دەرگایەوە نایەمە ژوورەوەو دەرگاکە لەو شوێنەدا هەڵکەنراو لە شوێنێکی تردا دامەزرێنرایەوەو کابرا پیادا رۆیشتە ژوورەوەو، سوێندی ناکەوێ، چونکە مەبەست لە دەرگا کەلێنەکەیە نەك دەروازەکە کە دارە، مەسەلا.

وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: نارۆمە ماڵەوە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بەوە کە بڕواتە هەر ماڵێکەوە لە هەرچی دروست کرابێ و هی هەرکەس بێ، بەڵام سوێندی ناکەوێ بەوە کە بڕواتە مزگەوت یا حەمام یا کەنشتە یا ئەشکەوت یا ئاش یا هەر شوێنێکی‌تری گشتی، چونکە ئەم جۆرە شوێنانە پێیان ناوترێ ماڵ؛ بەڵێ، ئەگەر رۆیشتە هۆدەیەکی تایبەتی چلەکێشانەوە لە مزگەوتدا ـ مەسەلا ـ ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر وتی: کۆنابمەوە لەگەڵ فڵانکەس، ئەوە سوێندی دەکەرێ بەوە کە بڕواتە شوێنێکەوە ئەو کەسەی تێدابێ و تێیدا بمێنێتەوە، هەرچەند خەڵکی‌تریشی لەگەڵدا بێ وەئەگەر وتی: نارۆم بۆ لای فڵانکەس، ئەوە سوێندی ناکەوێ بەوە کە بڕواتە لای کەسێکی‌تر کە کەسە کە سوێند لەسەرخوراوەکەی لادا بێ؛ هەروەها، ئەگەر وتی: نارۆمە لای ئەحمەد لە ماڵی مەحموددا، ئەوە سوێندی ناکەوێ بەوە کە بڕواتە لای لە ماڵی کەسێکی‌تردا، هەرچەند هەردووکیشیان لە یەك ماڵدا بن.

ئەگەر کەسێك وتی: نارۆمە لای فڵانکەس و لەپاشا رۆیشتە مزگەوتێك یا حەمامێك یا ئاهەنگێکی‌وا کە ئەو کەسەی تیابێ، ئەوە سوێندی ناکەوێ ئەگەر نیازی ئەوەی نەکردبێ کە بە تایبەتی بۆلای ئەو کەسە بڕوا؛ هەروەها، ئەگەر رۆیشتە ماڵێکەوەو لەپاشا ئەو کەسە کە ئەم سوێندی خواردووە نەڕواتە لای هاتە ئەو ماڵەو لای ئەمدا دانیشت، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە ئەم نەڕۆیشتووەتە لای ئەو، بەڵکوو ئەو هاتووەتە لای ئەم.

ئەگەر کەسێك وتی: نارۆمە ماڵی فڵانکەس، یا: قسە لەگەڵ نۆکەرەکەیدا ناکەم و لەپاشا کابرا خانووەکەی فرۆشت و نۆکەرەکەی دەرکرد، ئەمیش ئەوجار رۆیشتە ماڵەکە، یاخود قسەی لەگەڵ نۆکەرەکەیدا کرد، سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر سوێندی خوارد کە قسە لەگەڵ ژنی فڵانکەسدا ناکاوپاشان ئەو کەسە ژنەکەی تەڵاقداو ئەمیش قسەی لەگەڵدا کرد، ئەوە سوێندی ناکەوێ ئەگەر تەڵاقەکە «بائِن» بووبێ؛ بەڵێ، ئەگەر کابرا لە سوێندەکەیدا وتبێتی: ناچمە ئەم ماڵەی فڵانکەس، یا قسە ناکەم لەگەڵ ئەم

نۆکەرەی فڵانکەس، یا ئەم ژنەی فڵانکەس، ئەوە هەرکاتێك بڕواتە ئەو ماڵە یا قسە لەگەڵ ئەو نۆکەرە یا ئەو ژنە بکا، تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە وەك ئەوە وایە سوێندی لە ماڵەکە خۆی یا لە نۆکەرەکە یا لە ژنەکە خواردبێ.

## سوێند لەسەر قسەکردن

ئەگەر کەسێك سوێندی خواردو وتی: سەلام لە فڵانکەس ناکەم، سوێندی ئەکەوێ بەوەکە سەلام بکا لەو کەسە بەتەنها یا سەلام بکا لە کۆمەڵێ کە ئەویشیان تێدابێ بە جۆرێ کە ئەو کەسە سەلامەکە ببیسێ بە عادەت، هەرچەند لەوکاتەیشدا نەیبیسێ، خواه لەو سەلامەدا نیازی سەلامی لەو کەسە ببێ یا سەلام کردنەکەی بەرەڵلا بێو رووی نەکردبێتە کەسێکی تایبەتی؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو کەسەی جیا کردەوە لە سەلامەکەیدا بە زوبان یا بە دڵ، ئەوە سوێندی ناکەوێ.

وە ئەگەر وتی: قسە لەگەڵ فڵانکەسدا ناکەمو پاشان سەلامی لێ کرد، یا سەلامی کرد لە کۆمەڵێك کە ئەویشیان لەگەڵدا بوو و ئەوی جیا نەکردەوە، ئەوە سوێندی دەکەوێ، هەروەها ئەگەر قسەی لەگەڵدا کرد بەجۆرێ کە لەوانە بێ ببیسێ، هەرچەند بەهۆی مانیعێکیشەوە نەیبیسێ؛ بەڵام ئەگەر لە دەرەوە قسەی لەگەڵدا کرد بەجۆرێ کە بەعادەت نەیبیسێ، هەرچەند وا هەڵکەوێ لەوکاتەدا ببیسێ یا لەکاتی بێهۆشی یا نووستندا بوو وە ئەو کەسە تێنەگەیشت، یاخود قسەی کرد لەگەڵ یەکێكو ئەویش تێ گەیشت، یاخود کاغەزی بۆ نووسی یا کەسێکی راسپارد ئەو قسەی لەگەڵدا کرد، یاخود ئیشارەتی بۆ کردو ئەویش حاڵی بوو، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا سوێندی ناکەوێ.

وە ئەگەر ئایەتێکی خوێندەوە بەنیازی قورئانو بەس یا لەگەڵ نیازی حاڵی کردنی ئەوکەسەشدا وە ئەگەر نیازی هەر حاڵی کردنی ئەوکەسە بوو یا نیازی هیچ نەبوو و ئەو تێ گەیشت، ئەوە سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر قسەی کرد لەگەڵ دیوارێکدا یا هەر لەخۆیەوە بە بێقسە لەگەڵ کەسداو ئەویش تێیگەیشت، ئەوە ئەگەر نیازی قسەکردن بوو لەگەڵ ئەو کەسەدا، سوێندی ئەکەوێ، ئەگینا سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد قسە ناکا، لەپاشا قورئانی خوێند یا ناوی خوای برد، یا «سُبحان اللّه» و «لا إلهَ إلا اللّه»ی کرد، ئەوە سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر شتێکی وای خوێندەوە کە نوێژ بەتاڵ بکاتەوە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

## باسی سوێند لەسەر خواردن‌و خواردنەوە

ئەگەر کەسێك سوێندی خوراد «سەر» ناخوا، یا سەری برژاو ناخوا، ئەوە سوێندی ئەکەوێ ئەو سەرانەو پارچەی ئەو سەرانە بخوا کە عادەت وایە بە تەنها ئەفرۆشرێن، خواه عادەتی جێگەی سوێند خواردووەکەش وابێ یا نە، وەکوو سەری مەڕو بزن‌و گاو وشترو بەچکەیان وە سوێندی ناکەوێ بە خواردنی سەری مریشك‌و کەڵەشێرو پەلەوەری ئەهلی یا کێوی وە بە خواردنی سەری ماسی‌و ئاسك‌و وێنەی ئەمانە، مەگەر سوێندخۆر خەڵکی وڵاتێك بێ کە لەو وڵاتەدا سەری ئەمانە بەتەنها بفرۆشن، ئەوە لەم‌کاتەدا بە خواردنی ئەمانە سوێندی دەکەوێ، هەرچەند کابرای سوێندخۆر لەو وڵاتەیشدا نەبێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد گۆشتی فلانە حەیوان ناخوا، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی گۆشتی بەچکەیەك کە لە سکی ئەو حەیوانەدا بێ. وە ئەگەر سوێندی خوارد هێلکە ناخوا ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی هەر هێلکەیەك لە حاڵی زیندوویيدا لە هێلکەکەرەکە جیا ببێتەوە، وەکوو هێلکەی مریشك‌و سۆنەو کەوو پەلەوەرەکانی ترو غەیری پەلەوەریش، هەرچەند هێلکەکەرەکەیش گوشتی نەخورێ، وەکوو لەقلەق‌و قشقەڕە وە سوێندی ناکەوێ بە خواردنی هێلکەی ماسی‌و کوللە.

ئەگەر سوێندی خوارد گۆشت نەخوا، سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی گۆشتی حەیوانێکی‌وا کە گۆشتی حەڵاڵ بێ‌و سەری بڕرابێ لە بزن‌و مەڕو وشترو گاو ئەسپ‌و ماین‌و حەیوانی وەحشی‌و پەلەوەری حەڵاڵ وە لەو گۆشتەیە گوێچکەو زمان‌و گۆشتی سەرو بەزی گۆشتی پشت‌و تەنشت؛ ئیتر سوێندی ناکەوێ بە خواردنی گۆشتی ماسی‌و بە خواردنی دووگ‌و بەزی سك‌و چاو و بە ورگ‌و سپڵ‌و سی‌و جگەرو دڵ‌و

گورچیلەو ریخۆڵەو گوانو گونی حەیوانو جیقەتۆرەی مریشكو مۆخی حەیوانو بە خواردنی پێستی پەلەوەر كە زۆر ناسك بێ.

وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر دووگی مەڕ، ئەوە سوێندی ناكەوێ بە دووگی وشتر وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر بەز، سوێندی ناكەوێ بە چارەبەزی سكی حەیوانو بە پێچەوانەیشەوە، بەڵام ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر چەوری، ئەوە سوێندی ئەكەوێ بە خواردنی هەموو چەورییەك لە بەزی گۆشتو چارەبەزی سكی حەیوانو دووگی مەڕو دووگی وشتر، هەتا بە گۆشتێكیش كە چەوریی تیا مابێ وە بە رۆنو كەرە و بە خواردنی شۆربایەك كە چەوریی تیابێ، هەروەها بە شیرو ماستو پەنیر، بەڵام سوێندەكەی ناكەوێ بە خواردنی رۆنی گوێزو قەزوانو بادەمو زەیتوونو كونجیو غەیری ئەمانە، لەبەر مولاحەزەكردنی عورف، بەپێچەوانەی قسەی هەندێ لە زانایانی شەرع كە لایان وایە بەمانەیش سوێندی ئەكەوێ، چونكە هەموو هەر چەورین.

ئەگەر وتی: گۆشتی گا ناخۆم، ئەوە مەعنای وایە نابێ گۆشتی هیچ جۆرە گایەك بخوا كە گامێشو گاكێویش ئەگرێتەوە وە ئەگەر وتی گۆشتی بزن ناخۆم، ئەوە ئەبڕێ بەسەر هەموو جۆرە بزنێكدا، هەتاوەكوو بزنەكێویش وە ئەگەر وتی: گۆشتی مەڕ ناخۆم، ئەوەیش ئەبڕێ بەسەر هەموو جۆرە مەڕێكدا، چماڵیو چ كێوی وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: گۆشتی ئەم كارژەلەیە، یا ئەم بەرخە، یا ئەم گوێرەكەیە، یا ئەم جووجەڵەیە ناخۆم، ئەوە سوێندی ناكەوێ بە خواردنی گۆشتی ئەمانە پاش گەورەبوونیانو بوونی كارژەلەكە بە بزنو بەرخەكە بە مەڕو گوێرەكەكە بە گا یا بە مانگاو جووجەڵەكە بە مریشك یا بە كەڵەشێر، مەگەر وەختی خۆی مەبەستی ئەوە بووبێ لە هیچ حاڵەتێكدا گۆشتیان ناخوات.

ئەگەر كەسێك سوێندی خوارد گوتی: گۆشتی مردارەوە بوو ناخۆم، ئەوە سوێندی ناكەوێ بە خواردنی گۆشتی ماسیو كوللە وە ئەگەر وتی: خوێن ناخۆم، سوێندی ناكەوێ بە خواردنی سیو جگەر.

وە ئەگەر ئیشارەتی كرد بۆلای گەنمێكو سوێندی خوارد كە نایخوات، ئەوە سوێندی ئەكەوێ بە خواردنی بە گەنمیو برێشكەییو بە قاوتیو بە ئاردیو بە نانی وە

ئەگەر وتی ئەوگەنمە ناخۆم، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی بە کاڵیو بە برژاویو بەکوڵاوی و لە حاڵەتەکانی تردا سوێندی ناکەوێ.

وە ئەگەر سوێندی خوارد نان ناخوا، سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی هەموو جۆرە نانێك، چ کولێرەو چ سەموونو چ نانی پان، لە ساجیو تەنووری هی گەنم یا غەیری گەنم وە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر جۆرێك لەمانە، ئەوە سوێندی ناکەوێ بە خواردنی جۆرێکی تر وە ئەگەر وتی: نان ناخۆمو نانێکی کرد بە تریتو خواردی، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: قاوت ناخۆم، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بەوە کە بە کەفلەمە یا بە سەرپەنجە بیخوات، بەڵام سوێندی ناکەوێ بەوە کە بیکاتە ئاوو بیخواتەوە وە ئەگەر وتی: نایخۆمەوە، ئەوە حوکمەکەی بەپێچەوانەوەیە وە ئەگەر وتی: شیر ناخۆم، یا دۆشاو ناخۆم، سوێندی ئەکەوێ ئەگەر بیانخواتەوە وە ئەگەر وتی: نایانخۆمەوە، ئەوە بە خواردنەوەیان سوێندی ئەکەوێ، بەڵام بە خواردنیان سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر وتی: رۆن ناخۆم، ئەوە سوێندی دەکەوێ بەوە کە بە رووتی بیخوا یا بە نانەوە، بە وشکی یا بە تەڕی وە ئەگەر تواندیەوەو خواردیەوە، سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر کرابووە چێشتێك یا شتێکی ترو بەوەوە خواردی، ئەوە سوێندی ناکەوێ، مەگەر لەکاتێکدا کە عەینەکەی دیار بێ.

ئەگەر کەسێك وتی: میوە ناخۆم، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی سێوو هەڵووژەو قەیسیو توو و قۆخو هەرمێوترێو هەنجیرو هەنارو نارنجو پرتەقاڵو لیمۆو گۆیژو خورمای تەڕو کاڵەكو شووتیو ناوکی بادامو پستە، بە وشکیو تەڕی و سوێندی ناکەوێ بە خواردنی ترۆزیو خەیارو تەماتەو بایجانو پەتاتەو گێزەرو توورو چەوەنەرو گوێزی وشكو خورماو مێوژ.

وە ئەگەر وتی: خواردەمەنی ناخۆم، ئەوە هەمووجۆرە قووتو میوەو پێخۆرو حەڵواو خواردەمەنییەکی تر ئەگرێتەوە وە ئەگەر وتی: لەو درەختە ناخۆم، ئەوە

سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی بەرەکەی نەك بە خواردنی توێکڵەکەی یا گەڵاکەی یا وردە لقەکانی.

## باسی هەندێ سوورەتی جیاجیای سوێند

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ئەو خورمایە ناخوا و ئەو خورمایە تێکەڵی خورمایەکی زۆر بووبوو، ئەوە سوێندی ناکەوێ تا هەمووی نەخوا وە ئەگەر سوێندی خوارد ئەو هەنارە ئەخوا، ئەوە رزگاری نابێ تا هەموو دەنکەکانی هەنارەکە دەخوا.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: ئەو جلە ناکەمەبەر، ئەوە ئەگەر تاڵێکی لە قوماشی جلەکە دەرکێشا ئەوجا لەبەریکرد، سوێندی ناکەوێ؛ فەرقی ئەم سوورەتە لەگەڵ سوورەتی خانووەکەدا ئەوەیە مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەو جلە بکاتە بەرو جلەکە بەتەواوی نەماوەتەوە، مەبەست لەویش ئەوەیە دابنیشێ لە بەشێك لە بەشەکانی ئەو خانووەدا و مادام دانیشت لە خانووەکەدا، مەبەستەکەی هاتووەتەجێ؛ بۆیە ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر ئەو حەسیرە، یا لەسەر ئەو فەرشە دانانیشێو لەپاشا پارچەیەکی لەو حەسیرە یا لەو فەرشە بڕیو بەسەریانەوە دانیشت، ئەوە سوێندەکەی ئەکەوێ، چونکە لێرەدا مەبەست دانیشتنە لەسەریانو ئەو مەبەستە هاتووەتەجێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ئەو دوو جلە ناکاتەبەر، ئەوە سوێندی ناکەوێ تا هەردووکیان نەکاتەبەر؛ بەڵێ، ئەگەر نیازی ئەوەبوو هیچیان نەکاتەبەر، ئەوە بە کردنەبەری یەکێکیشیان سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: نە ئەمە و نە ئەوە ناکەمەبەر، ئەوە هەرکامیان بکاتە بەر سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر هەر دوانیانی کردەبەر، پێویستە دوو کەفارەت بدا.

وە ئەگەر سوێندی خوارد هیچ لەبەرناکەم، سوێندی ئەکەوێ بەوەکە کراسی زرێ لەبەر بکا، یا «خُفّ» یا کەوش یا نەعل لە پێ بکا، یا ئەنگوستیلە بکاتە پەنجەی، یا کڵاو بکاتە سەری وە ئەگەر وتی: جل ناکەمەبەر، ئەوە بە پۆشینی ئەمانە سوێندی ناکەوێ، بەڵام بە لەبەر کردنی کراسو دەرپێو جبەو لەسەر نانی مێزەر و لەبەرکردنی هەر پۆشاکێکی تر، سوێندی ئەکەوێ.

وە ئەگەر سوێندی خوارد ئەو خواردەمەنییە ئەخوات، یا قەرزی فڵانکەس ئەداتەوە، یا ئەڕوا بۆ سەفەر و لەپێش سبەینێدا مرد، ئەوە هیچی لەسەر نییە؛ بەڵێ، ئەگەر لە سبەینێدا مەیدانی کردنی ئەو ئیشانەی هەبوو کە سوێندی لەسەر خواردوون‌و نەیکردو مرد، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، چونکە بە ئارەزووی خۆی ئەوە شتەی فەوتاندووە کە هۆی رزگار بوونیەتی لە سوێن‌کەوتن؛ کەواتە، ئەگەر هەر لە ئیمڕۆدا خۆی خواردەمەنییەکە بڕێژێ، یاخود پشیلە بیخوات‌و ئەمیش ئاگای لێ بێ‌و دەری‌نەکا، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

وە ئەگەر کەسێك تەڵاقی خوارد کە لەم مانگەدا دەچێ بۆ فڵان شوێن و پاش ئەوە کە مەجالی هەبوو بڕوا بۆ ئەو سەفەرە، نەڕۆیشت‌و خولعی ژنەکەی کرد بۆ ئەوە کە تەڵاقی نەکەوێ، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێ، چونکە لەپێش خولعەکەدا خۆی «بڕ»ەکەی فەوتاندووە؛ بەڵێ، ئەگەر لەپێش ئەوەدا کە مەجالی سەفەر کردنی ببێ خولعی کرد لەگەڵ ژنەکەی، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ؛ بەڵام ئەگەر لە سبەینێدا مەجالی ئیشەکەی نەبوو لەبەر ئەوە کە خەریکی نوێژی سبەینێ بوو و لەکاتی نوێژەکەدا فەوتا، یاخود دوکتۆرێکی بەداد وتی: ئەو چێشتە ژاری تێدا هەیەو خواردنی زەرەرەو ئەمیش نەیخوارد، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکی لە سوورەتی یەکەمدا، ناچاریی «حِسّی»و لە دوو سوورەتی دووەما، ناچاریی شەرعی هەیە؛ هەروا، ئەگەرخواردەمەنییەکە خۆی رژا، یاخود کەسێکی بێگانە فەوتاندی لەپێش مەجالی خواردنیاو ئەم کەسە مەیدانی ئەوەی نەبوو نەهێڵێ، ئەوە سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: هەر کە ماڵەکەم فرۆشت قەرزی فڵانکەس ئەدەمەوە و ماڵەکەی فرۆشت لەکاتی دیار نەبوونی کابرای خاوەن قەرزدا، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، چونکە کابرا بە ئارەزووی خۆی هۆی رزگاربوونی فەوتاندووە.

وە ئەگەر سوێندی خوارد کە: لە سەری مانگدا حەقەکەت ئەدەمەوە، ئەوە واجبە لەکاتی رۆژاوا بوونی دوارۆژی ئەو مانگەدا بیداتەوە وە ئەگەر بە ئارەزوو لەپێش رۆژاوا بووندا دایەوە، یاخود لەپاش رۆژاوا بوون‌و مەجال بوونی دانەوەی قەرزەکەدا نەیدایەوە،

سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر ئەیزانی مادام ڕۆژێ لەپێش ئەو ڕۆژەدا نەڕوا بۆلای کابرا لە وەختی دیاریکراوا ناتوانێ ئەو حەقە بداتەوە، ئەوە واجبە زوو بڕوا بۆ ئەو شوێنە وە ئەگەر بە بێعوزر نەڕۆیشت ئەوە سوێندی ئەکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر دەستی کرد بە تەسلیمی حەقەکە لەکاتی ڕۆژاوابووونداو تەواو بوونی دانەوەکە کەوتە عیشا، یا پاش عیشا ئەوە سوێندی ناکەوێ، مادام لە ماوەی دانەوەکەیدا بە عادەت کەمتەرخەمی نەکا.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد لە کەسێك وتی: لێت جیا نابمەوە تا حەقەکەت لێ ئەسێنمەوە، کەچی کابرا کە حەقەکەی لایە رای کردو ئەمیش نەیتوانی بکەوێتە شوێنی، ئەوە سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر لێی جیا بووەوە، یا ڕاوەستا تا کابرا ڕۆیشت، یا قەبووڵی حەواڵەی کرد بۆسەر کەسێکی ترو جیابووەوە لەو کابرایە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر کابرا لات کەوتو ئەمیش جیا بووەوە لەو کەسە؛ دەلیلی ئەم سوورەتە دواییە ئەوەیە کابرا خۆی بە ئارەزووی خۆی جیا بووەتەوە، هەرچەند جیا بوونەوەکەشی واجب بێ؛ کەواتە، ئەگەر قەرزارەکە موراجەعەی حوکمڕانی شەرعی کردو ئەویش زۆری لێ کرد جیا بێتەوە لێی، سوێندی ناکەوێ.

وە ئەگەر حەقەکەی لێ وەرگرتو جیا بووەوە، کەچی کە لەپاشا ژماردی کەم دەرچوو، ئەوە ئەگەر ئەو ماڵەی وەریگرتووە لە جینسی حەقەکەی خۆی بوو، بەڵام ناتەواوییەکەی بەهۆی ئەوەوە بووکە پارەکە مەغشووش بوو، ئەوە سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر لە جینسی حەقەکەی خۆی نەبوو؛ مەسەلا، حەقەکەی گەنم بوو و ئەو پارەی وەرگرتو لە قیمەتەکەی کەمتر بوو، ئەوە مادام لە کاتی وەرگرتندا نەیزانیبوو کە ناتەواوە، دوو فەرموودەکەی نەزانی تیا دێتەجێ وە فەرموودەی ئاشکراتر ئەوەیە سوێندی ناکەوێ.

بێداری! توانینی کردنی شتی سوێند لەسەر خوراو ئەوەیە لە عورفی شەرعدا بە توانین بزانرێت و ئەم توانینە بەگوێرەی ئیشەکەو سەردەمی دەگۆڕێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد کەوا ماڵی نییە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە هەموو جۆرە ماڵێك، زۆر یا کەم، بەقیمەت یا بێ قیمەت، هەتاوەکوو بە جلی بەریشیو بە ماڵێ

کە لە قەرزدا بێ، وادەی هاتبێ یا نە وە ئەگەر سوێندی خواردکەوا ماڵی بە دەستەوە نییە یا ماڵی لا نییە، ئەوە سوێندی ناکەوێ بە ماڵێ کە لە دوورەوە هەیبێ، یا قەرز بێ بەسەر خەڵکەوە.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ئەدا لە فڵانکەس، ئەوە لە سوێندەکەی رزگار ئەبێ بەوە کە بە هەر جۆرەلێدانێك لێی بدا کە پێی بڵێن لێدان، ئیتر ئازار پێ گەیاندنی شەرت نییە وە ئەگەر بڵێت: بەجۆرێك لێی ئەدەم کە ئازاری پێ بگەیەنێ، ئەوە لەم کاتەدا ئازار گەیاندن پێویستەو لەقە لێدانو مشتەکۆڵەو شەقازلەو بەرد پیادا ماڵین، بە شەرتێ لێی بکەوێ، بە لێدان ئەناسرێن، بەڵام دانانی تووڵێك یا دارێك لەسەر لەشی کابرا یا خنکاندنی یا رووتاندنەوەی مووی یا نقورچك لێ گرتنی، بە لێدان ناناسرێن.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد سەد تووڵ ئەدا لە کەسێكو سەد تووڵی بەست بە یەکەوە بە یەك جار لێی دا، یا لقەداریکی وای هێنا کە سەد تووڵی باریکی پێوەبوو و دای لە کابرا بەجۆرێك هەموو لقە وردەکانی لێ کەوت، یاخود دارەکە قورس نیشتە سەریو ئازاری پێ گەیاند، ئەوە کابرای سوێندخۆر بەوە رزگاری ئەبێ لە سوێندەکەی؛ هەروەها، ئەگەر لەم کاتەدا شکی هەبوو لەوەدا ئاخۆ هەموو لقە وردەکانی لێ کەوتووە یا نە، هەر سوێندەکەی ناکەوێ وە ئەگەر سوێندی خوارد کە بە سەدجار لێی ئەدا ئەوە پێویستە یەکە یەکە سەد جار لێی بدا، ئەگینا سوێندەکەی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: هەر خیلافی شەرعێکم چاو پێ کەوت خەبەر ئەدەم بە قازی شارو لەپاشا خیلافی شەرعی بینیو خەبەری پێ نەدا، نە بە دەمو نە بە راسپێریو نە بە نووسین هەتا مرد، ئەوە سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر وتی: خەبەر ئەدەم بە قازی، ئەوە بە قازی ئەو شارە مەعنای لێ ئەدرێتەوە کە خیلافشەرعەکەی تێدا ئەکری، چونکە مەبەست لە خەبەردان لابردنی خراپەکەیەو ئەمەش بە قازی ئەو شارە ئەکرێ؛ ئەگەر ئەو قازییە کە لەکاتی سوێندەکەدا بوو عەزلکرا، پێویستە خەبەر بدا بەو قازییە لەپاش ئەو دێت وە ئەگەر وتی: خەبەر ئەدەم بە قازییەك، ئەوە رزگار ئەبێ لە سوێندەکەی بە خەبەردان بە هەر قازییەك هەر شارێکدا بێ؛ ئەگەر وتی: خەبەر ئەدەم بە

قازی فڵانو خیلاف شەرعەکەی دیو خەبەری نەدایە تا عەزل کرا، ئەوە ئەگەر نیازی وابوو کە لە ماوەی قازییەتی ئەودا خەبەری پێبدا، ئەوە لەم حاڵەدا سوێندی ئەکەوێ بەو شەرتە بتوانێ خەبەری پێبدا بەڵام نەیدا وە ئەگەر نەیتوانیبێ خەبەری پێ بدا، ئەوە وەکوو زۆر لێ کراوی لێ دێو سوێندی ناکەوێ وە ئەگەر مەبەستی هەر ئەوە بوو خەبەر بە کەسەکە بدا، ئەوە ئەگەر لەپاش عەزلکردنیش خەبەری پێبدا، سوێنـدی ناکەوێ.

## باسی سوێند لەسەر موعامەلەو عەقد

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد نافرۆشی یا ناکڕێو لەپاشاندا شتێکی فرۆشت یا شتێکی کڕی بە موعامەلەیەکی راستو دامەزراو بۆ خۆی یا بە وەکالەتی کەسێك، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر وەکیلی گرت بۆ کڕینو فرۆشتنو وەکیلەکە موعامەلەکەی کرد، ئەوە سوێندی ناکەوێ، مەگەر مەبەستی وابێ کە نە بە خۆیو نە بە وەکیل ئەو موعامەلەیە ناکات.

ئەگەر سوێندی خوارد کچەکەی مارە نابڕێ بۆ کەس، یا ژنەکەی تەڵاق نەداو لەپاشا وەکیلی گرت کچەکەی مارەکرد، یا ژنەکەی تەڵاقدا، ئەوە سوێندی ناکەوێ، هەرچەند خۆیشی لەلای وەکیلەکەدا حازر بێ، مەگەر نیازی وابووبێ کە نە خۆیو نە وەکیل ئەو عەقدە ناکەنو ئەو ژنە تەڵاق نادەن؛ هەروەها، ئەگەر وتی: لە فڵانکەس نادەمو لەپاشا فەرمانیدا بە یەکێك لێیبدا، ئەوە سوێندی ناکەوێ، مەگەر نیازی ئەوە بووبێ نە بە خۆیو نە بە هۆی کەسەوە لێی‌نادا.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ژن نادەم بە فڵانکەس و لەپاشا کابرایەك خوازبینی لێکرد و ئەمیش وتی: پیرۆزە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، چونکە لە عورفدا بەم جۆرە کەسە ئەڵێن: ژنی داوە بە شوو؛ بەڵام ئەگەر کابرا وتی: نیازم ئەوە بوو ژنەکەی بۆ مارە نەکەم، ئەوە تا ژنەکەی بۆ مارەنەکرێ، سوێندی ناکەوێ.

وە ئەگەر سوێندی خوارد ژن مارە نەبڕێ بۆ خۆیو لەپاشا ژنی هێنا، ئەوە سوێندی ئەکەوێ، خواە خۆی بە دەمی خۆی قەبووڵی نیکاحەکە بکا یا وەکیل بنێرێ بـۆی

قەبووڵ بکا، چونکە وەکیل لە قەبووڵی نیکاحدا بە فروستادە دەنـاسرێو تـەماشای کابرای ئەسڵی ئەکرێ، وە ئەگەر قەبووڵی نیکاح بۆ کەسێکی‌تر بکا بە وەکالەت، ئەوە سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ژنەکەم تەڵاق نادەمو لەپاشا تەڵاقەکەی دایە دەستی ژنەکەیو ژنەکەی خۆی تەڵاق دا، ئەوە سوێندی ناکەوێ، هەروەها ئەگـەر وەکـیل بگرێو وەکیلەکە تەڵاقی بدا، لەبەر ئەوە سوێندی لەسەر ئیشی خۆی خواردووە.

ئەگەر وتی: خوشکەکەم مارە ناکەم بۆ فڵانو لەپاشا بـاوکی مـارەی کـرد بـۆی، سوێندی ناکەوێ. ئەگەر وتی: ژن نادەم بە فڵان، یا: نایەڵم باوکم ژنی پێ‌بدا، ئەوە ئەگەر باوکی بە بێ ئاگاداریی ئەو ژنەکە مارە بکا بۆ کابرا، یا ئیزن‌بدا بیگوێزنەوە، ئەوە ئەم کەسە سوێندی ناکەوێ؛ بەڵێ، پێویستە لە سوورەتی دووەمدا ئەگەر کوڕەکە پێی‌زانی، بەپێی توانا مەنعی باوکی بکا لەو ئیشە وە لەم سوورەتەدا چار ئەوەیە کە ئەو کەسەی دەسەڵاتی هەیە لەو شوێنەدا، هەڕەشە بکا لەو کوڕە کە ئەگەر مەنعی باوکی بکا ئازاری بدا، یاخود حاکمی شەرع هەڕەشەی لێ بکا، ئیتر کوڕەکە ئەگـەر مـەنعیش نـەکـا، سوێندی ناکەوێ، چونکە مەجالی مەنع کردنی نامێنێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد ماڵی فڵانکەس نافرۆشم، ئەوە ئەگەر مـاڵی ئـەو کەسەی بە وەکالەتی ئەو کەسە خۆی فرۆشت، سوێندی ئـەکـەوێ، بـەڵام ئـەگـەر لەخۆیەوە بیفرۆشێ، سوێندی ناکەوێ، چونکە ئەوە پـێی‌دەڵێن: بـەیعی «فُـضولی»و فرۆشتنی وایش لای ئێمە بەتاڵە وە ئەگەر سوێندی خوارد وتی: ئەو ماڵە نابەخشم بە فڵانکەسو لەپاشاندا پێی‌وت: وا ئەو ماڵەم پێ بەخشیت، بەڵام کابرا قەبووڵی نەکرد، سوێندی ناکەوێ، چونکە بەخشین لەشەرعدا بریتییە لە ئیجابو قەبووڵ، مەگەر کابرا بڵێ: نیازم هەر ئیجابەکە بووە، ئەوە بە ئیجابە رووتەکە سوێندی ئەکەوێ.

هەروەها، لەکاتی سوێندا لەسەر بەخشین، سوێندی ئەکەوێ بە بەخشین بە درێژایی عومرو بە درێژایی مانەوەی گەردنی کابرای پێ‌بەخشراو، مادام کابرای پێ‌بـەخشراو قەبووڵی بکا، چونکە ئەم دوانەیش بە بەخشین دەناسرێنو وەخت بـۆدانـانەکـەیان

بەتاڵە، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد، هەروەها ئەگەر شتەکەی بە سوورەتی خێرو سەدەقەدا بەو کەسە، چونکە سەدەقەیش هەر بە بەخشین دەناسرێت، بەڵام سوێندی ناکەوێ ئەگەر بە ئەمانەت یا بە وەقف یا بە سوورەتی وەسیەت پێیبداو وەسیەت بکا ئەو ماڵە بۆ ئەو کەسە بێ وە ئەگەر سوێندی خوارد ئەو شتە بە سەدەقە نادەم بە فڵانکەسو لەپاشاندا بە ئیجابو قەبووڵ پێیبەخشی، ئەوە سوێندی ناکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد نانی فڵانکەس ناخۆمو لەپاشاندا بوو بە میوانیو چێشتو نانی ئەوی خوارد، ئەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە میوان بەرلەوە کە خواردەمەنییەکە بخوا، ئەبێ بە خاوەنی ئەو ئەندازەخواردەمەنییەکە قووتی ئەدا و لەم کاتەدا بەپێی شەرع نانی ئەوی نەخواردووە نانی خۆی خواردووە، مەگەر کابرا نیازی ئەوەی بووبێ کە لە ماڵی ئەو کەسەدا خواردەمەنییەك ناخوا کە بڵێن: هی ئەو کەسەیە، ئەوە سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: خواردەمەنییەك ناخۆم کە فڵانکەس کڕیبێتی، ئەوە سوێندی ئەکەوێ بە خواردنی ئەوەی کە ئەو کەسە بە کڕینێکی دامەزراو کڕیبێتی نەك بەخواردنی شتێ کە بە کڕینێکی دانەمەزراو کڕیبێتی، یا بە کڕینێکی دامەزراو لەگەڵ کەسێکی تر کڕیبێتیان وە ئەگەر ئەو خۆراکە کە ئەو کەسە سوێند لەسەر خوراوە کڕیبووی، تێکەڵی خۆراکی کەسێکی تر بوو ئەمیش لەو تێکەڵەی خوارد، ئەوە ئەگەر خواردەمەنییەکە ئاوەکی بوو، سوێندی ئەکەوێ وە ئەگەر وشك بوو، ئەبێ بزانێ کە لەو خۆراکەی خواردووە کە ئەو کەسە سوێند لەسەر خوراوە کڕیویەتی، ئەوسا سوێندی ئەکەوێ.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد وتی: ناڕۆمە خانوویەکەوە فڵانکەس کڕیبێتی، ئەوە سوێندی ناکەوێ بەوە کە بڕواتە خانوویەکەوە ئەو کەسە بە شوفعە وەری گرتبێ.

بزانن! لەم سوورەتانەوە کە باسمان کردن، دەرئەکەوێ هەر لەفزێ کە لە عورفی شەرعدا مەعنایەکی هەبێو یەکێك سوێندیان لەسەر بخوات، وەکوو فرۆشتنو ئیجارو وەقفو نەزرو بەخشینو ئەمانەتو نیکاح، ئەبڕێ بەسەر ئەو مەعنایەدا کە لە شەرعدا

بۆی دانراوە، مەگەر کابرا نیازی مەعنا گشتییەکەی هەبێ کە لە ناو خەڵکی ئەو شوێنەدا بۆی بەکار دەهێنرێ.

## باسی داوەری (القَضاء)

داوەری لە شەرعدا، بریتییە لە نەهێشتنی کێشەو هەرا لە بەینی دوولادا بە رابووراندنی حوکمی خودا لە بەینیاندا، بەڵام فتوادان (إفتاء)، بریتییە لە روون کردنەوەی حوکمەکە بە بێ رابووراندنو جێبەجێ کردنی.

دانانی قازی فەرزی عەینە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان لە هەموو ناوچەیەکدا وە لەسەر قازی ئەو ناوچانەش ـ ئەگەر دەسەڵاتیان پێ درابێ ـ لە هەموو مەسافەیەکی نیورۆژە رێگەدا وە ئەگەر دەسەڵاتیان نەدرابوویە، ئەووەختە ئەمیش هەر لەسەر پێشەوای موسوڵمانان فەرزی عەینەو قەبووڵەکەیشی فەرزی عەینە لەسەر هەر موسوڵمانێ کەبۆ قازییەتی دەس‌بدات؛ جا ئەگەر لەو کەسە بەو لاوە کەسی‌تر نەبوو ببێ بە قازی، ئەوە ئەبێ بە فەرزی عەین لەسەر ئەو کەسەو فەرزیشە لەسەری داوا بکا لە پێشەوای موسوڵمانان بیکا بە قازی ئەگەر ئومێدی هەبێ کە بیکا وە ئەگەر کەسی‌تر هەبوو کە ببێ بە قازی، ئەوە ئەگەر ئەو کەسە باشتر بوو، ئەمیش دروستە ببێ بە قازی بەڵام کەراهەتی هەیە وە ئەگەر ئەویش وەکوو ئەم وابوو، ئەوە بۆ ئەم دروستە وەری‌بگرێو دروستیشە داوای بکاو کەراهەتی نییە، بەڵکوو ئەگەر بێ‌ناو بوو و ویستی ناو دەرکا بۆ ئەوە کە خزمەتی ئایینی ئیسلام بکا، ئەوە سوننەتە داوای بکا، یاخود ئەگەر پێویستی بەوە بوو کە بەهۆی ئیشێکەوە بژی، یاخود رۆژەکە لەوانە بوو کە بە بێ بوونی قازییەکی باش حوقووقی موسوڵمانان ئەفەوتا، ئەگینا کەراهەتی هەیە داوای بکا. بوونو نەبوونی کەسێك کە بۆ قازییەتی بەکار بێ، بەگوێرەی ناوچەکەیە کە کابرای خاوەن عیلم تیایا دانیشتووە.

ئەگەر لە وڵاتێکدا حوکمی پێشەوای موسوڵمانان نەبوو، یا پێشەوای موسوڵمانان هەبوو بەڵام گوێی نەدەدا بە جێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئایین، ئەوە پێویستە لەسەر

ئەهلی حەلو عەقدی ئەو شوێنە قازی بۆ خۆیان دانێن، هەرچەند ئەهلی حەلو عەقد لەو شوێنەدا تەنها یەك كەس بێ، وەكوو ئەو بەدەسەڵاتانەی دەستیان ئەڕوا بەسەر دەوروبەری خۆیاندا.

شەرتی قازی، ئەوەیە نێرینەو ئازادو باڵغو عاقڵو بیسندەو قسەكەرو لێهاتوو بێ؛ هەروەها، ئەبێ «مُجتَهِد»بێ؛ موجتەهید، كەسێكە ئاگای لەو ئایەتو حەدیسانە هەبێ كە پەیوەندییان بە ئەحكامی ئیسلامەوە هەیەو «عامّ»و «خاصّ»و «مجمَل»و «ناسِخ»و «مَنسوُخ» بزانێو فەرق بخا لە بەینی حەدیسی «مُتَواتِر»و «آحاد»و «مُتَّصِل»و «مُرسَل»دا و ئاگای لە حاڵی ئەوانە بێ كە حەدیسەكانیان گێڕاوەتەوە، ئاخۆ بەهێزن یا بێهێزن، وە زمانی عەرەب بزانێ لەبارەی «لُغة»و «نَحو»و «صَرف» «بَلاغە»وە و ئاگای لەو حوكمانەی هەبێ كە ئیجماعی زانایانی شەرعیان لەسەر هەیەو جیایان بكاتەوە لەو حوكمانەی كە جێگای خیلافن و جۆرەكانی «قِیاس» بزانێ، وەك «جَلی»و «مُساوی»و «اَدْوَن» وە لە هەموو ئەمانەدا پلەی ناوەندی بەسە.

ئەگەر كەسێكی وەها دەست نەكەوتو ئیمام یا دەسەڵاتداری شوێنەكە كەسێكی تری كرد بە قازی كە ئەم مەرجانەی تێدا نەبوو، وەكوو فاسق یا «مقلِّد»، ئەوە قەزاوەتی رەوایە لەبەر ناچاری و ئەم جۆرە قازییانە، پێیان ئەڵێن: قازی ناچاری.

سوننەتە بۆ پێشەوای موسوڵمانان هەر قازییەكی دانا رێگای بدا ئەویش جێنشین بۆ خۆی دابنێ؛ جا ئەگەر پێشەوا رێگای دا كە جێنشین بگرێ، ئەوە باشە وە ئەگەر رێگای نەدا، دروست نییە جێنشین بگرێ وە ئەگەر نە رێگای داو نە رێگای لێ گرت، ئەتوانێ جێنشین بگرێ لەو ئیشانەدا كە خۆی دەرەقەتیان نایەت نەك لە شتێكا كە بەعادەت بۆ خۆی ئاسان بێ؛ شەرتی ئەم جێنشینە ئەوەیە ئەو شەرتانەی تیا هاتبێتەدی كە لە قازی خۆیدا پێویستن، مەگەر تەنها بۆ ئیشێكی تایبەتی كردبێتی بە جێنشینی خۆی، وەكوو بیستنی شەهادەتی شاهیدێك، یا سوێندانی یەكێك، ئەوە بەسە ئەوەندە كە بزانێ لەو ئیشە تایبەتییەدا چی پێویستە.

بزانن! قازی ئەگەر موجتەهیدبێ، ئەبێ حوكم بە مەزهەبی خۆی بكا وە ئەگەر «مقلّد» بێ، حوكم بە مەزهەبی ئیمامە تەقلیدكراوەكەی ئەكا، هەروەها جێنشینی قازیش.

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان بە شەرتی گرت لەسەر قازی مجتهد کە بە غەیری مەزهەبی خۆی حوکم بدا وە یا شەرتی کرد لەسەری کە بە غەیری مەزهەبی ئیمامە تەقلیدکراوەکەی حوکم بدا، ئەوە ئەو تەولیەی قەزاوەتە بەتاڵە.

وە ئەگەر شەرتی کرد کە بە مەزهەبی ئیمامەکەی خۆی حوکم بکا یا باسی مەزهەبی نەکرد، ئەوە واجبە بە راجیحی مەزهەبی ئیمامی خۆی حوکم بکا و دروست نییە بە مەرجووحی مەزهەبی ئەو ئیمامە حوکم بکا؛ بەڵێ، لە «بغیَه»دا لە «کتابُ القَضاء»دا دەفەرموێت: دروستە بۆ قازی حوکم بکا بە مەرجووحی مەزهەبی ئیمامەکەی لەو مەسئەلانەدا کە زانایانی «مُتأَخِّرین» تەرجیحیان داوە لەبەر مەسڵەحەتی تێکڕای موسوڵمانان، وەکوو ویلایەتی فاسق وە وتنی ئەوە کە روشد هەر سەلاحی دنیایەو شەهادەتی «الامثل فالأمثل» قەبووڵ ئەکری لە زەمانێکدا کە فاسقی بڵاو بوو بێتەوە وە ئەگەر قازی حوکمی کرد بەمانە، ئەوە حوکمەکەی هەڵناوەشێنرێتەوە، وەکوو «اَشخَر»و «اَبو مخرَمە»و کەسانی تر وتوویانە.

هەروەها، دروست نییە بۆ قازی حوکم بە غەیری مەزهەبی ئیمامەکەی خۆی بکا؛ بەڵێ، لە «تُحفە»دا لە «کتابُ القَضاء»دا دەفەرموێت: ئیمامی «ماوَردی»وکەسانی تریش، فەرموویانە: دروستە قازی «مقلّد» حوکم بە غەیری مەزهەبی ئیمامەکەی خۆی بکا وە لە «الفَتاوَی الکُبریٰ»دا ئەگێڕێتەوە لە ئیمامی غەزالی یەوە کە فەرموویەتی: دروستە بۆ حاکمی «مقلّد» حوکم بە غەیری مەزهەبی ئیمامە تەقلیدکراوەکەی خۆی بکا بینا لەسەرئەوە کە «عامی» مەزهەبی نییەو دروستە تەقلیدی هەموو موجتەهیدێك بکا هەرچۆن خۆی ئارەزووی هەبێ مادام نەیەت لە هەر لایەك حوکمێکی ئاسان هەبێ ئەوە هەڵبژێرێ بۆخۆی.

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان دوو قازی دانا لە شارێکداو هەریەکێ لەوانی کرد بە قازی بۆ ماوەیەك یا بۆ گەڕەکێك، ئەوە دروستە، هەروەها ئەگەر بە هەرکامێکیان هەندە حوکمێك بسپێرێ، بەڵام ئەگەر شەرتی ئەوەی کرد کە هەردووکیان رێك بکەون لەسەر حوکمێك، ئەوە بەتاڵە ئەگەر «مجتهِد» بن یا «مقلّد»ی دوو «مجتهد» بن وە ئەگەر

«مقلد»ی یەك ئیمام بن، یا «مقلد»ی دوو ئیمام بن‌و شەرتکرابێ لە ئەحکامی رێك‌کەوتنەکەدا یەك بکەون، ئەوە باشە.

## باسی حەکەم دانان (تَحکیم)

دروستە بۆ دووکەسی ناکۆك یا دووکەس کە ناکۆکییان لە بەینا نەبێ کەسێك بکەن بە حەکەم بۆ خۆیان لە غەیری حوکمێکدا کە «حقُّ الله»بێ، وەکوو حەددی شەرعی. جا ئەگەر ئەو حەکەمە، «مجتهد» بوو، ئەوە دروستە بکرێ بە حەکەم، خواه لە وڵاتەکەدا قازی هەبێ یا نەبێ وە ئەگەر قازی هەبوو، «مجتهد» بوو یا «مقلّد» وە ئەگەر حەکەمەکە، «مقلّد» بوو، ئەوە بە شەرتی عەداڵەت دروستە، بەو شەرتە قازی لە وڵاتەکەدا نەبێ یا نەخوێندەوار یا فاسق بێ، یا عادڵ بێ بەڵام لەوجۆرە ئیشەدا حوکم نەکا کە کراوە بە حەکەم تیایدا، یا حوکم بکاو ئەندازەیەکی‌وا پارە وەربگرێ کە بەش‌بەحاڵی ئەوکەسانە کە کردوویانە بە حەکەم خاوەن ئەهمیەت بێ.

کەوابێ، لەم سوورەتانەدا ئەگەر لەبەینی دووکەسدا هەرا هەبوو لە موعامەلەیەکدا، دەتوانن عالمێکی عادڵ بکەن بە حەکەم‌و ئەم هەرایەی پێ ببڕنەوە، یاخود هەرا نەبێ لە بەینیانا، وەکوو ئەوە کەسێك سوێندی خواردبێ قسە لەگەڵ باوکیا نەکا، ئەمجار باوکی‌و خۆی کەسێك بکەن بە حەکەم ئەویش حوکم بکا لە کوڕەکە کە ئەبێ قسە لەگەڵ باوکیا بکا لەسەر قەراری ئەوە کە لە باسی زۆر کردن (إکراه)دا قسەمان لێ کرد.

لای بُلقینی و هەندێ لە زانایانی دواکەوتوو (مُتَأَخِّر)، تەحکیمی فاسقیش دروستە، بەڵام ئەمەیش بەو شەرتە کە قازی نەبێ، یاخود قازییەکی فاسق هەبێ‌و لە حەکەمەکە فاسقتر بێ، یاخود عادڵ بێ بەڵام رێی نەدرابێ ئەو جۆرە حوکمانە بدا، یا پارەیەکی ئەوەندە زۆر وەربگرێ کە ئەم کەسانە پێیان نەدرێت.

بەڵام واجبە بزانین کە ئەم جۆرە تەحکیمەی ئەمڕۆ هەندێ مەلا دەیکەن لەسەر فەرموودەی «بلقینی» بۆ مارەبڕینی تازە لەپاش کەوتنی سێ تەڵاقە، ئەوە بەتاڵە، چونکە «بلقینی» کە رازییە بە تەحکیمی فاسق، رازییە بە مارە بڕینە پێشووەکە کە بە وەلی‌و

شاهیدی فاسق کراوە؛ کەواتە، پاش کەوتنی سێ تـەڵاقـە، لە مـارەبەجاش (تَـحليل) بەولاوە چارێکی تر نییە.

## باسی هەندێ ئەحواڵی قازی

ئەگەر قازی شێت بوو، یا بێهۆش کەوت، یا کوێر بوو، یا کەڕ بوو، یا لاڵ بوو، یا لیاقەتی ئیجتیهادی نەما، یاخود زەبت و شوعووری تێك‌چوو، ئەوە لە خۆیەوە عەزل دەبێ‌و لە تەئریخی ئەو بەسەرهاتەوە حوکمی ڕەوا نابێ، هەروەها ئەگەر قازی عادڵ فاسقی بەسەردا هات وە ئەگەر ئەم مانیعانەی لەسەر لاچوو، ئەوە حوکمی قەزاوەتی بۆ نایەتەوە تا سەرلەنوێ نەکرێتەوە بە قازی.

دروستە بۆ پێشەوای موسوڵمانان قازییەکی‌وا عەزل بکاکە عەیبێکی‌وای بەسەردا هاتبێ کە ببێ بە مایەی عەزل‌بوونی، وەکوو ئەوە کە زۆر شکاتی لێ بکرێ، یـاخود عەیبی نەبێ، بەڵام لەو وڵاتەداکەسێکی‌وا ببێ فەزڵی لەم‌کابرا زۆرتر بێ، یاخود وەکوو ئەم قازییە بێ، بەڵام بە عەزل کردنی ئەم قازییە فیتنە بنیشێتەوە، ئەگینا عـەزلەکـەی دروست نییە، بەڵام ئەگەر عەزلی کرد، ئەوە عەزلەکەی کار دەکات.

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان نووسی بۆ قازی: کاتێ کە ئەم کاغەزەت خوێندەوە، ئەوکاتە تۆ عەزل‌کراوی، ئەویش خوێندیەوە، یا بۆیان خوێندەوە، ئەوە عەزل دەبێ؛ هەرکاتێ قازی عەزل بوو، ئەوە هەرکەسی بۆ ئیشێکی تایبەتی ناردبێ، وەکوو فرۆشتنی ماڵی مردوو، یا بیستنی شەهادەت‌و ئەم جۆرە شتانە، ئەوە ئەویش عەزل ئەبێ.

هەروەها، هەر کەسێکی لەجێی خۆی دانابێ، ئەوە ئەگەر بە بێ ڕێگادانی پێشەوای موسوڵمانان لەجێی خۆیی دانابێ، یا ڕێگا درابێ کە جێ‌نشین بگرێ بۆ خۆی، یا پێی وترابێ جێ‌نشین بگرێ، ئەوە جێ‌نشینەکەشی عەزل دەبێ وە ئەگەر ڕێگای درابـێ جێ‌نشین بۆ پێشەوای موسوڵمانان بگرێ، ئەوە لەم‌کاتەدا ئەو جێ‌نشینە عەزل نابێ؛ بەڵام قازی عەزل نابێ بە مردنی پێشەوای موسوڵمانان، هەروەها سەرپەرشتی‌کەری ماڵی وەقف‌و ماڵی هەتیو، ئەوانیش بە مردنی قازی عەزل نابن.

ئەگەر قازی لەپاش عەزلبوونی لە قازییەتی وتی: لە وەختی قازییەتیما حوکمم لە فلان مەسەلەدا بەوجۆرە کردووە، ئەوە لێی قەبووڵ ناکرێ، بەڵکوو ئەگەر لەگەڵ شاهیدیشدا شەهادەت بدا بەو حوکمە، هەر لێی قەبووڵ ناکرێت؛ بەڵێ، ئەگەر شەهادەت بدا بە حوکمی حاکمێکی حوکمڕەوا، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێت؛ هەروەها، ئەگەر لەپێش عەزلکردندا بڵێت: حوکمم کردووە بەو مەسەلەیە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێت، بەڵام ئەگەر لە غەیری شوێنی قەزاوەتەکەیدا ئەوە بڵێ، ئەوە وەکوو عەزلکراو وایەو قسەکەی بێسوودەو لێی قەبووڵناکریت.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای کرد لە قازییەکی عەزلکراو کە ماڵی لێ وەرگرتووە بە بەرتیل یا بە شەهادەتی دووبەندە حوکمی داوە، ئەوە واجبە قازییەکە حازر بکرێتو هەراکەیان چار بکرێت؛ هەروەها، دروستە قازییە عەزلکراوەکە خۆی حازر نەبێتو وەکیلێ بگرێ بۆ ئەوەی لەجیاتی خۆی بچێتە بەردەمی قازی وە ئەگەر کەسێك ئیددیعای کرد کە قازییە عەزل کراوەکە بە شەهادەتی دوو فاسق حوکمی کردووەو ئیتر ناوی ماڵی نەبرد، ئەوە قازییەکە حازر ئەکرێ، جا ئەگەر ئینکاری کرد، ئەوە بە سوێند باوەڕی پێئەکرێ وە ئەگەر کابرا ئیددیعای ئەوەی کرد کە قازییە عەزلکراوەکە لە حوکمدا نارەوا رۆیشتووەو ستەمی لێ کردووە، ئەوە دەعواکەی نابیسرێت مادام بە شاهید ئیسپاتی نەکات وە ئەگەر دەعوایەکیوا لە قازی کرا کە پەیوەندی نەبوو بەو حوکمانەوە کە داویەتی، وەکوو قەرزو موعامەلەی بەینی خۆیان، ئەوە پێویستە جێنشینی ئەو قازییە خۆی یا قازییەکیتر تەماشای مەسەلەکە بکاو حوکمی تێدا بدا.

## باسی ئادابی قەزاوەت

سوننەتە پێشەوای موسوڵمانان نامە بنووسێ بۆ ئەو کەسەی کە دایئەنێ بە قازیو لە نامەکەدا باسی ئەوە بکا کەوا کردویە بە قازیو بۆی روون بکاتەوە کە دەسەڵاتی چی داوەتێو نامەکەی بە قەدرو حورمەتەوە بۆ بنووسێتو ئامۆژگاریی بکا کە زۆر لە خوا بترسێو بە فەرمانی خوا بجووڵێتەوەو پرسبکا بە زانایانی ئەو ناوچەیە کە تیا

دامەزراوەو شاهیدیش بگرێ لەسەر ئەوەی لە کاغەزەکەیدا نووسیوەیەو لەگەڵ کاغەزەکەیدا بیانێرێ بۆ ئەو شارەی قازییەکەی تیایە بۆ ئەوە خەبەری بدەنێ کەوا پێشەوای موسوڵمانان کردوویە بە قازی لەم شارەدا وە ئەگەر ئەم شاهیدانەی نەنارد، بەڵام دانانی قازییەکە مەشهوور بوو، ئەوە بەسە، بەڵام بەگوێرەی مەزهەبی ئیمامی شافیعی خۆی، بەس نییە.

سوننەتە بۆ قازی رۆژی دووشەمە بچێتە ئەو شارەوەکە بۆی دانراوە و لە ناوەراستی شارەکەدا دابەزێ وە سوننەت وایە کاتێ کە دامەزرا، مەجلیسەکەی گوشادو بەدەرەوە بێ‌و دوور بێ لە هەرچی خەڵك ئەزیەتی پێ‌بخۆن‌و دوور بێ لەگەرماو سەرماو بۆ ئەو رۆژو سەعاتە دەست‌بدا. کەراهەتی هەیە قازی لە مزگەوتدا قەزاوەت بکاو زیاتر کەراهەتی هەیە حەددی شەرعی لە مزگەوتدا جێ‌بەجێ بکرێ؛ هەروەها، کەراهەتی هەیە قەزاوەت بکا لەکاتی رق‌هەستان‌و برسییەتی‌و تینوویەتی‌و حاڵەتی‌تردا کە ئادەمیزاد لە وەزعی عادەتی بکاتە دەرەوە.

کاتێ کە قازی دامەزرا، سوننەتە ئەحواڵی مەلایانی شارەکە بپرسێ‌و بزانێ پیاوی عادڵ لەو شارەدا کێیە؛ سوننەتە بەر لە هەرچی تەماشای حاڵی ئەوکەسانە بکاکە وان لە بەندیخانەداو پرسیاریان لێ بکاو بزانێ کامیان ئەڵێ بە حەق حەپس کراوم بیهێڵێتەوەو کامیان ئەڵێ بە ناحەق حەپس کراوم داوای بەڵگەی لێ‌بکاو بزانێ لەسەر شکاتی کێ گیراوە بنێرێ بەدوای ئەوکەسەداو ئەگەر لەوناوەدا نەبوو، بیدۆزێتەوەو مەسەلەکەیان ببڕێتەوە؛ ئەنجا تەماشای ئەو کەسانە بکا کە کراون بە «وَصی»و تەسەروف لە ماڵی غەیردا دەکەن، وەکوو وەکیل و هەرکەس وتی من وەسیم، ئەحواڵی بپرسێ لە خەڵك، جا ئەگەر باش بوو، بیهێڵێتەوەو ئەگەر خراپ بوو یا فاسق بوو، ماڵەکەی لێ‌وەربگرێتەوەو بیداتە دەستی کەسێکی تر وە ئەگەر بێ کارە بوو، کەسێك دابنێ بۆ ئەوە یارمەتی بدا، جا تەماشای ئەوقافی عموومی بکا.

سوننەتە «مُزکّی»یەك رابگرێ بۆ تێ‌گەیشتنی ئەحواڵی خەڵك‌و کاتب رابگرێ بۆ نووسینی مەحزەرو لیستەراگرتن‌و سوننەتە ئەم کاتبە ئاگای لە ئەحکامی شەرع هەبێ‌و

خەتی خۆش بێو سوننەتە تەرجومانیش رابگرێ بۆ ئەوە کـە حـاڵی بکـا لە قسـەی هەرکەس کە زمانی نەزانێ؛ شەرتی ئەم تەرجومانەیش ئەوەیە عادڵو ئـازاد بـێو لە دووکەس کەمتر نەبن، بەڵام ئەگەر کوێر بێ، قەیدی نییە. سوننەتە لە هەر حوکمێکی بە ئەهمیەتیشدا راوێژ بکا بە زانایانی ئەو شوێنە.

سوننەتە بۆ قازی قەمچییەکی قایشی هەبێ بۆ تەمێ کردنی تاوانبارو بەندیخانەشی هەبێ بۆ ئەوانە کە حەپس ئەکرێن. سوننەتە قازی بە نەفسی خۆی مامەڵە نەکاو وەکیلی تایبەتیشی نەبێ وە ئەگەر دیاریی بۆ هات لای کەسێکەوەکە ناکۆکییەکی لەگەڵ یەکێکدا هەبێ، یاخود وا تێبگاکە ئیشی هەیە، یاخود لەم جۆرە نەبێ بەڵام لەوەپێش دیاریی بۆ نەناردبێ، حەرامە وەریبگرێ، ئەگینا دروستە وەریبگرێ ئەوەندەی کە عادەتی بێ، بەڵام سوننەتە ئەوەندەی دیارییەکەی جەزای بداتەوە.

حوکمی قازی رەوا نابێ بۆ خۆیو بۆ هاوبەشی لە مـاڵی تـێکـەڵدا وە بـۆ کـوڕو کوڕەزایو باوكو باپیریو بەرەو خوارو بەرەوژووری، چونکە لەوانەیە لەم حوکمانەدا لایەنگر بێ وە پێویستە لەم جۆرە حوکمانەدا، یا پێشەوای موسوڵمانان یا قازییەکی تر حوکم بدا، هەرچەند جێنشینی خۆیشی بێ.

## باسی هەندێ لە ئادابی قازی

واجبە لەسەر قازی جیاوازی نەخات لەنێوان ئەو کەسانەدا کە هەرایـان لەبـەیندا هەیەو دێنەلای، نە لە رێگادانیاندا بۆ چوونە لایو نە لە هـەستاندا لەبـەریانو نـە لە رووخۆشیو قسە لەگەڵ کردنیانداو نە لە جوابدانەوەی سەلامو جێگادانی دانیشتنو لە هەرچییەکی ترداکە وا بگەیەنێ ئەو دوو کەسە یەکێکیان لە یەکێکیان گەورەترە، بەڵام فەرموودەی راستتر ئەوەیە کە واجبە شوێنی موسوڵمان لە شوێنـی کـافری زیـممی لەپێشتر بێو هەندێ کەس ئەڵێن: ئەمە سوننەتە. کاتێ کە دوو کەسە ناکۆکەکە دانیشتن، دروستە بۆ قازی قسە نەکا تا ئەوان قسەیان تەواو ئەکەنو بۆیشی دروستە بڵێت: کێ «مدّعي»یە با قسە بکا؛ جا کاتێ کە «مدّعي» قسەی خۆی تـەواو کـرد، قـازی داوای

جواب لە «مدّعى عليه» بكا، جا ئەگەر پێی‌لێنا، ئەوە باشە وە ئەگەر ئینكاری كرد، بۆی هەیە بێ‌دەنگ بێ‌و بۆی هەیە بڵێت بە «مدّعي»: شاهیدت هەیە؟ ئەگەر وتی: شاهیدم هەیەو ئەمەوێ سوێندی «مدّعى عليه» بدەم، بۆی هەیە وە ئەگەر وتی: شاهیدم نییەو كەچی لەپاشاندا شاهیدی هێنا، لێی قەبووڵ ئەكرێ، چونكە لەوانەیە لەوكاتەدا لەبیری چووبێ كە شاهیدی هەیە، یاخود پێی نەزانیبێ.

ئەگەر چەند كەسێك هاتبوون بۆ موحاكەمە، ئەوە هەر كامیان زووتر هاتووە، ئەوەیان پێش‌ئەخرێ، ئەگەر نەزانرا كێ لەپێشا هاتووە، یاخود هەموو بەیەكەوە هاتبوون، ئەوە «قُرعه» ئەخرێ لەناویاناو هەركەسێ قورعەی بۆدەرچوو، لە یەك موحاكەمەدا پێش ئەكەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر كۆمەڵێ لەمانە خۆیان ئامادەكردبوو بۆ سەفەر و ئەوانی‌تریان نیشتەجێ بوون، ئەوە ئەوانەیان پێش‌ئەخرێن كە رەوتەنین؛ هەروەها، ئەگەر چەند ژنێك هاتبوون، ئەوە ئەو ژنانە پێش‌ئەخرێن لە پیاو وە هەركەسێ نەخۆش یا پیر یا بێ‌هێز بێ، پێش‌ئەخرێ، مەگەر ئەمانە ئەوەندە زۆر بن كە ببن بەهۆی ماتڵ بوونی ئیشی خەڵك.

هەركاتێ «مدّعى عليه» پێی‌لێنا، یاخود نكوولی كرد لە سوێند خواردن‌و «مدّعي» سوێندی خوارد وە لەم كاتەدا «مدّعي» داوای كرد لە «قاضى» كە شاهید بگرێ لەسەر پێ‌لێنانی «مدّعى عليه»، یا لەسەر سوێندەكەی خۆی، یاخود داوای لێ‌كرد كە حوكم بدا بەپێی ئەوەی ئیسپات بووە لای‌و شاهیدیش بگرێ لەسەر حوكمەكەی خۆی ئەوە واجبە قازی بەگوێی بكا.

هەروەها ئەگەر «مدّعى عليه» سوێندی خواردو داوای كرد لە قازی كە شاهید بگرێ لەسەر سوێندخواردنەكەی بۆ ئەوە كە لە دەستی «مدّعي» رزگاری ببێ، ئەوە واجبە لەسەر قازی كە بەگوێی بكا. هەروەها ئەگەر «مدّعي» داوای كرد لە قازی فەرمان بدا مەحزەرێ بنووسن بۆ سوورەتی مورافەعەكە، یاخود حوكمەكەی قازی لە مەسەلەكەدا لە دەفتەرێكدا بنووسنەوە، واجبە لەسەر قازی كە بەگوێی بكا، چونكە ئەم مەحزەرو نووسینەوە بۆ پاشەڕۆژ زۆر بەسوودن‌و شت‌دەخەنەوە بیر. ئەوەی كە دەنووسرێ،

سوننەتە دوو نوسخەی لێ بنووسرێتەوە یەکێکیان لە دیوانی دادگادا بمێنێتەوەو یەکێکیان بدرێ بەوەی داوای ئەکا.

حەرامە لەسەر قازی چەند شاهیدێکی تایبەتی دیاری بکاو غەیری ئەوانە وەرنەگرێ، چونکە ئەمانە ئاگایان لە هەموو شتێك نییەو زیاد لەوە ئەبێ بەهۆی نارەحەت بوونی خەڵك‌و زۆر نزیکە ئەم چەند کەسە کەڵك لەو وەزعە وەربگرن بۆ زیانگەیاندن بە خەڵك.

ئەگەر شاهید شەهادەتی دا لە مەسەلەیەکداو قازی ئەیزانی کە عادڵە، ئەوە باشە وە ئەگەر حاڵی نەدەزانی، واجبە لەسەری «استِزکاء» بکات، واتە نیشان‌و ناوی شاهیدەکان‌و شەهادەت بۆ دراوو شەهادەت لەسەردراو بنووسێ‌و ئەندازەی حەقە کەیش بنووسێ و بە دوو کەسی عادڵدا رەوانەی بکا بۆ پرسیار کردن‌و لێکۆڵینەوەی حاڵی شاهیدەکان کە ئاخۆ عادڵن یا نە و دوژمنی کابرای شەهادەت‌لەسەردراون یا نە، یاخود لەو شەهادەتەیاندا لەسەر ئەو حەقە قازانجێکی تایبەتییان هەیە یانە؛ جا پاش ئەوە کە لە حەقیقەتی حاڵیان حاڵی‌بوون، بێنەوە بۆلای قازی باسی بکەن وە ئەگەر عەداڵەتی شاهیدەکان‌و بێ‌عەیبییان دەرکەوت، ئەوە باشە، ئەگینا بە شەهادەتی ئەوانە حوکم نەدا.

شەرتی ئەم دووکەسە «مُزکِّی»یەو ئەو کەسانەش کە پرسیاریان لێ‌دەکەن، وەکوو شەرتی شاهید وایە؛ زیاد لەمەیش پێویستە ئاگایان بێ لە ئەسبابی «جَرح»و «تَعدیل» بۆ ئەوە کە بە ناحەق عادڵ نەکەن بە فاسق‌و فاسق بە عادڵ دانەنێن؛ هەروەها، پێویستە ئاگایان لە حاڵی نهێنی شاهیدەکان بێ‌و پێویستە بە لەفزی شەهادەت بەیانی عەداڵەتی شاهیدەکان بکەن وە لەکاتی «جَرح»دا ئەسبابی جەرحەکە باس بکەن‌و پشت بە چاو پێ‌کەوتنی خۆیان ببەستن ئەگەر شتەکە لەوانەبێ ببینرێ، یا پشت بە بیستن ببەستن ئەگەر شتەکە لەوانەبێ ببیسرێ، وەکوو «قَذف»و «رِدّة». وە گوێ نادرێ بە چاوپێ‌کەوتن‌و بیستنی خەڵك، مەگەر ئەوەندە مەشهوور بێ کە باوەڕی تەواویان بۆ پەیدا ببێ پێی، بەوجۆرە کە ئەو کەسانە کە خەبەریان ئەدەنێ ئەوەندە زۆر بن ژمارەیان بگاتە رادەی پەیدا بوونی عیلمی قەتعی.

ئەگەر لە شاهیدێکدا «جَرح»و «تَعدیل» گردبووەوە، «جَرح» پێش «تَعدیل» ئەخرێ، بەڵام ئەگەر «مُعدِّل» وتی: ئاگام لە ئەسبابی «جَرح»ەکەی هەیە بەڵام پاشان تەوبەی کردووەو ماوەی پاك بوونەوە (إستِبْراءَ) کە ساڵێکە بەسەریا رابوردووەو ئێستە عادڵە، ئەوە «تَعدیل» پێش ئەخرێ.

بەس نییە بۆ «تعدیل» ئەمە کە کابرای «مدّعی علیه» بڵێ: من ئەزانم ئەو شاهیدە عادڵە بەڵام لەم شەهادەتەدا کە لەسەرم داویەتی بە سەهودا رۆیشتووە، چونکە تەزکیەی شاهید حەقی خوایەو پێویستی بە سابتبوونی شەرعییە.

ئەگەر قازی لەسەر بناغەی ئیجتیهادی خۆی حوکمی کردو لەپاشا دەرکەوت ئەو حوکمە خیلافی نەسسی کیتاب یا سوننەتە یا خیلافی ئیجماعە یا خیلافی قیاسی جەلییە، ئەوە واجبە لەسەر خۆیو لەسەر غەیری خۆی ئەوە بڵاو بکاتەوە کە ئەو حوکمە بەتاڵە.

حوکمی حاکم لە شوێنێکا باتینی ئەمر پێچەوانەی زاهیری بێ، هەر بە زاهیر کار دەکات و لە باتیندا بێدەسەڵاتە وە ئەگەر باتینو زاهیری مەسەلەکە وەکوو یەك بوون، ئەوە حوکمەکە رەوایەو کار ئەکا.

زانایانی شەرع هاودەنگن لەسەر ئەوە کە دروست نییە قازی بەپێچەوانەی مەعلووماتی خۆی بڕیار بدا؛ فەرموودەی دیاری ئەوەیە ئەتوانێ حوکم بدا بە پێی ئەوەی خۆی دەیزانێ یا گومانی دەباو گومانەکەی «مُؤکَّد»بێ، مەگەر لە مەسەلەی حەددا، وەکوو حەددی زیناو دزیو رێگری. ئەگەر قازی کاغەزێکی دی کە حوکمی وەختی قازییەتی خۆی تیا بوو یا شەهادەتی خۆی تیا بوو، یاخود دوو شاهید شاهیدییان دا کەوا تۆ لە فلانوەختدا لە فلان مەسەلەدا حوکمت بەو جۆرە بووە، یا شەهادەتت لەسەرداوە، ئەوە لەم سوورەتانەدا دروست نییە پشت بەمانە ببەستێ، مەگەر خۆی ئەو حوکمو شەهادەتەی بە رۆشنی بکەوێتەوە بیر؛ بەڵێ، قسەیەك هەیە بۆ ئەوە کە دروستە قازی حوکم لەسەر بناغەی کاغەزێك بدا کە وەختی خۆی خۆی نووسیبێتیو هەڵی گرتبێ، هەروەها بۆ دروست بوونی شەهادەتدان لەسەر مەزموونی نووسراوی ناو کاغەزێك کە لای خۆی هەڵیگرتبێ.

دروستە ئینسان سوێند بخوات کە فڵانەشت حەقی خۆیەتی، یا فڵانە قەرزی داوەتەوە و لەم سوێندخواردنەیدا پشت بە خەتی خۆی یا خەتی باوکی یا وەکیلی یا هاوبەشی ببەستێ ئەگەر لەوباوەڕەدا بێ کە ئەو خەتە خەتی خۆی یا باوکی یا وەکیلی یا هاوبەشەکەیەتی؛ هەروەها، دروستە سوێندخواردن بە پشتبەستن بە خەبەردانی کەسێکی عادڵ وە دروستە گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بە خەتی خۆی یا خەتی کەسێکی باوەڕ پێکراو، بەو شەرتە نووسراوەکە لای خۆی هەڵگیرابێ.

## باسی قەزاوەت لەسەر کەسێ کە خۆی حازر نەبێ

دروستە بۆ قازی حوکمبدا بەسەر کەسێکدا کە خۆی دیار نەبێ، بەو شەرتە کە بەڵگەی لەسەر هەبێو کابرای «مدّعي» بڵێت بە قازی کە: «مدّعى عليه»یەکە پێ لێنانێو پێویستە ئێستاماڵی ئیددیعاکراو تەسلیم بکا، یاخود «مدّعى عليه» باسی ئینکارو پێ لێنان نەکا وە ئەگەر وتی: کابرای «مدّعى عليه» پێ ئەنی لە ماڵە ئیددیعاکراوەکە، بەڵام من بۆیە بەڵگە پیشان ئەدەم بۆ پشتقایمی نەوەك لە ڕۆژێکدا نکوولی بکا، یا بۆ ئەوەکە ئەم قازییە بنووسێ بۆ قازی وڵاتی «مدّعى عليه»، ئەوە لەمسوورەتانەدا دروست نییە قازی دەعواو بەڵگەکەی لێبیسێ، چونکە بەڵگە لەسەر کەسێکە کە ئینکار بکاو «مدّعى عليه» لێرەدا ئینکار ناکات.

ئەوە بەڵگەیە کە دروستە بۆ قازی وەری بگرێ، وەکوو شەهادەتی دوو شاهید یا شاهیدێكو سوێندێك لەلایەنی «مدّعي»یەوە. وەك دەعوا لەسەر کەسێکی نادیار وایە دەعوا لەسەر منداڵو شێتو مردوو؛ لەم سوورەتانەدا واجب نییە لەسەر قازی کەسێ لەجیاتی ئەمانە دابنێ دیفاعیان لێبکاو ئینکاری حەقەکە بکا، بەڵام واجبە لەسەر لەپاش بیستنی بەڵگەی کابرای «مدّعي»، سوێندی بدا لەسەر ئەوە کە ئەو حەقەی لەئەستۆی «مدّعى عليه»دا هەیە وە ئەگەر منداڵو شێتەکە «وَلى أمر»یان هەبوو وە مردووەکە میراتگری تایبەتی هەبوو، ئەوە سوێنددانی ئەم «مدّعي»یە بەسراوە بە داواکردنی ئەوانەوە، ئەگەر ئەوان داوایان نەکرد، لە سوورەتی دەعوا لەسەر منداڵو

شێتدا قازی سوێندی کابرای «مدّعي» ئەدا، نەك لە سوورەتی بوونی میراتگری تایبەتی مردووەکەدا، لێرەدا مادام میراتگرەکە داوا نەکا، قازی حەقی سوێند دانی ئەو «مدّعي»یەی نییە.

لەپاش ئەوە کە قازی حوکم ئەدا، حەقی «مدّعي» لە ماڵی «مدّعی علیه» جێبەجێ ئەکرێ وە هەرکاتێ «مدّعی علیه»یە مناڵەکە باڵغ بوو، یا شێتەکە چاك بووەوە، مەیدانی ئەدرێ بەڵگەی کابرای «مدّعي» بەتاڵ بکاتەوە بەوە کە ئیسپاتی بکا شاهیدەکان عادڵ نەبوون؛ جا ئەگەر «مدّعي» نەیتوانی دیفاع بکا، واجبە ئەو ماڵەی بردوویەتی بیگێڕێتەوە دواوە بۆیان.

ئەگەر کابرای «مدّعی علیه»ی نادیار خۆی شاردبووەوە، یاخود خۆی بە گەورە ئەزانیو نەئەهات بۆ لای قازی، ئەوە تەنها ئەوەندە بەسە کە «مدّعي» بەڵگەی خۆی بهێنێو سوێندی نادرێ.

ئەگەر لە سوورەتی دەعوا لەسەر کەسێکی نادیاردا «مدّعي» وەکیلی گرتو ئەم وەکیلە دەعوای گرت لەسەر کابرای نادیار، ئەوە لەپاش شەهادەت دانی شاهید، قازی بۆی نییە سوێندی وەکیلەکە بدا وە ئەگەر «مدّعی علیه» بە وەکیلەکەی وت: «مُوکِّل»ەکەت ئازادی کردووم، ئەوە ئێستە ناچار دەکرێ کە حەقەکە تەسلیمی وەکیلەکە بکا، جا ئەگەر پاشان ئیسپاتی ئازاد کردنەکەی کرد، حەقەکەی خۆی وەرئەگرێتەوە؛ بەڵێ، لەم سوورەتەدا ئەتوانێ سوێندی وەکیلەکە بدا لەسەر ئەوە کە ئاگای لەوە نییە «مُوکِّل»ەکە ئەم کەسەی ئازاد کردووە، چونکە ئەگەر ئەم وەکیلە پێ‌لێ‌بنێ بە ئازاد کردنەکە، ئیتر حەقی دەعوای نامێنێو وەکالەتەکەیشی قیمەتی نابێ.

بێداربن! لە سوورەتی دەعوای وەکیلدا، بەسە بۆ دامەزرانی دەعواکە ئەمە کە «مدّعی علیه» باوەڕ بکا بەوەکە ئەم وەکیلە بەڕاستی وەکیلە، بەڵام بۆ تەسلیمی حەقەکە، پێویستە ئەم وەکیلە بە شاهید ئیسپاتی وەکالەتی خۆی بکا.

ئەگەر کابرای «مدّعی علیه» ماڵی لەو وڵاتەدا نەبوو کە «مدّعي» دەعواکەی تێدا کردووە، بەڵکوو لە وڵاتێکی تردا بوو وە «مدّعي» داوای کرد لە قازی کە بەڵگەکەی لێ

وەربگرێو قازی وڵاتی «مدّعی علیه»یەکە ئاگادار بکا، یا هەر لێرە حوکمەکە بداو قازی ئەو وڵاتە ئاگادار بکا، ئەوە واجبە لەسەری بەگوێی بکا، واتە سوورەتی بیستنی بەڵگەکە بنووسێ بۆ قازی ئەو وڵاتە تا ئەو لەوێ حوکم بدا بە دامەزرانی حەقەکە، ئەگەر خۆی حوکمەکەی نەدابوو، یا بنووسێ بۆی کە ئەو حوکمەکە ئەم لێرە داویەتی ئەو لەوێ جێبەجێی بکا، ئەگەر ئەم لێرە حوکمەکەی دابوو، وە ئەو لەوێ حەقەکە لە ماڵی «مدّعی علیه» وەربگرێ یاخود هەر خۆی لە ماڵی «مدّعی علیه» جێبەجێی بکا؛ واجبە لەگەڵ ئەو نامەیەدا کە دەینووسێ دوو شاهیدیش رەوانە بکا بۆ لای قازی ئەو شوێنە بو ئەوەی لەوێ شەهادەت بدەن لەسەر ئەوەی کە رووی‌داوە؛ سوننەتە قازی لەگەڵ ئەم دوو شاهیدەدا نامەیەك بنووسێ لەو نامەیەدا ناوونیشانی کابرای حوکم بۆدراوو کابرای حوکم لەسەردراوو شاهیدی ئیسپاتی حەقەکە بەتەواوی بنووسێو نامەکە مۆر بکا.

جا ئەگەر «مدَّعی علیه» لای قازی حازر بوو و وتی: من ئەو کەسە نیم کە دەعوای لەسەر کراوە، باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێند و پێویست ئەبێ لەسەر «مدّعي»یەکە ئیسپاتی ئەوە بکاکە ئەم‌کەسە «مدّعی علیه»یەکەیە؛ جا ئەگەر شاهیدی بۆ ئەمە هەبوو و لەگەڵ ئەوەشداکابرا هەر ئەیوت: من ئەوکەسە نیم، ئەوە واجبە لەسەر قازی حوکم بدا بەسەریا مادام لەو شوێنەدا هاوناوو نەسەبی نەبێ، ئەگینا پێویستە هاوناو و نەسەبەکەی حازر بکا؛ جا ئەگەر ئەم پێی‌لێنا کە «مدّعی علیه»یە، داوای حەقەکەی لێ بکاو ئەوی پێشوو بەرەڵڵا بکا وە ئەگەر ئەمیش وتی: من نیم، پێویستە لەسەر قازی ئەم شوێنە بنووسێتەوە بۆ قازی وڵاتی «مدّعي» تا نیشانەی زیاتری «مدّعی علیه» بنووسێ لەو نیشانەیەی جارێ پێشوو ناردوویە تا راستی بەتەواوی دەرکەوێ.

ئەگەر قازی شاری «مدّعی علیه» هاتە لای قازی شاری «مدّعي»و بە زوبانی خۆی بەیانی شەهادەتو حوکمەکەی بۆ کرد، ئەوە دروستە بۆی کە رۆیشتەوە بۆ شوێنی خۆی حوکمەکە جێبەجێ بکا لەسەر بناغەی ئەوە کە لە قازی شاری «مدّعي»ی بیستووە، بەپێی ئەو فەرموودەیە کە دەڵێ: دروستە قازی لەسەر مەعلووماتی خۆی حوکم‌بدا، هەروەها ئەگەر هەردووکیان هاتنە سەر سنووری وڵاتی خۆیانو بەیەکەوە قسەیان کردو قازی شاری «مدّعي» قازی شاری «مدّعی علیه»ی تێ گەیاند.

بێداری! ئەگەر ئەو نامەیەی کە قازی شاری «مدّعي» نووسیویە، لەسەر حوکم‌دان بوو، ئەوە قازی شاری «مدّعی علیە» لە هەموو حاڵێکا ئەتوانێ ئەو حوکمە جێ‌بەجێ بکا وە ئەگەر لەسەر بیستنی بەڵگە بوو بە بێ حوکم، ئەوە وەختێ ئەم قازییە ئەتوانێ بە پێی ئەو کاغەزە ئیش بکاو شەهادەتی ئەو شاهیدانەی بەگوێدا بچێ کە لەگەڵ کاغەزەکەدا هاتوون، مەسافەی بەینی هەردوو قازییەکە ئەوەندە زۆربێ کە شەهادەت لەسەر شەهادەتی تێدا دروست بێ، بەم‌ڕەنگە لە مەسافەی نیو ڕۆژەرێ زیاتر بێ.

ئەگەر قەرزارێکی «مدّعی علیە» لای قازی‌دا حازر بوو وە وتی: ماڵی خۆم نافرۆشم بۆ قەرزی «مدّعي»، ئەوە قازی ئەتوانێ ماڵی ئەو قەرزارە بفرۆشێ بۆ قەرزەکە، مادام وەعدەی دانەوەی هاتبێ‌و کابرای «مدّعي» داوای حەقی خۆی بکا؛ هەروەها، ئەگەر کابرای قەرزار حازر بوو وە ماڵەکە لەو شوێنەدا نەبوو، قازی ئەتوانێ پیاو بنێرێ بۆ شوێنی ئەو ماڵە بیفرۆشێ، بەڵام ئەگەر قەرزارەکە لە شوێنێکدا نەبوو کە لە قەڵەمڕەوی قازییەکە بێ‌و ماڵی لەو شوێنەدا هەبوو، ئەوە بەبێ‌حوزووری خۆی یا وەکیلی، ماڵی نافرۆشرێ وە لەم حاڵەدا قازی ئەو شوێنە هەر ئەوەندەی بۆ ئەکرێ بنووسێ بۆ قازی ئەو وڵاتە کە کابرای تیایە تا قازی ئەو شوێنە حەقەکە لە کابرای قەرزار وەربگرێ.

## باسی حازری‌و ناحازری ئەو ماڵەی کە ئیددیعای ئەکرێ

ئەگەر کەسێك ئیددیعای عەینێکی کرد لە یەکێك، ئەوە ئەگەر ئەو عەینە حازر بوو لە مەجلیسی حوکمدا، ئەوە باشە وە ئەگەر لەو مەجلیسەدا نەبوو، بەڵام لەو ناوچەیەدا بوو کە قازییەکە دەستی بەسەردا ئەڕوا، ئەوە ئەگەر توانا هەبوو حازر بکرێ، ئەبێ فەرمان بدا تا حازری بکەن بۆ ئەوە شاهید شەهادەت لەسەر عەینەکەی بدا وە ئەگەر لەتوانادا نەبوو حازر بکرێ، یاخود زەحمەت بوو، ئەوە ئەگەر قازی خۆی عەینەکەی ئەناسی، یا عەینەکە مەشهوور بوو، یاخود وەسف‌و تەحدید ئەکرا بە جۆرێ کە دەرکەوێ، ئەوە دەعوای لەسەر ئەبیسترێ‌و شەهادەتی شاهیدیشی لەسەر وەسف‌و بەیان وەرئەگیرێ، ئەگینا واجبە یا قازی خۆی بڕوا عەینەکە ببینێ یا وەکیل بنێرێ ببینێ هەتا دەعوا لەسەر ئەو عەینە بکرێ‌و شەهادەتی لەسەر وەربگیرێ.

وە ئەگەر عەینەکە وەکوو لە مەجلیسی قازیدا نییە لەو ولآتەیشدا نەبوو کە قازی تیایە، ئەوە لەم سوورەتەدا ئەگەر ئەمین بووین لە لێ گۆڕانی ئەو عەینە، وەکوو باخو خانوو و ئەسپی مەشهوور، ئەوە قازی ئەتوانێ دەعواکە ببیسێو شەهادەتی شاهیدەکانیش وەربگرێو بنووسێ بۆ لای قازی ئەو ولآتەی کە عەینەکەی تیایە تەسلیمی «مدّعي»یەکەی بکا وە بۆ ناسینی وێنەی باخ، ئەگەر بە ناوبانگ قەناعەت ئەکرا، ئەوە باشە وە ئەگەر بە ناوبانگ قەناعەت نەئەکرا، ئەبێ باسی هەر چوار سنوورەکەی بکرێو ئەوەندە روون بکرێتەوە کە بە تەواوی دەرکەوێ، ئیتر باسی قیمەت پێویست نییە وە ئەگەر ئەمین نەبووین لە گۆڕان، ئەوە دەعوا ئەبیسترێ لەسەر وەسفکردنی عەینەکە.

بەڵام ئەگەر ئەو عەینە لەوانە بوو کە هاوچەشنی هەبوو، ئەوە موبالەغە کردن لە وەسفیدا واجبەو بەیانی قیمەتی سوننەتە وە ئەگەر لەوانە بوو قیمەتی بۆ دابنرێ، بەیانی قیمەتی واجبەو موبالەغە لە وەسف کردنیدا سوننەتە وە ئەبێ قازی لەپاش ئەمانە بنووسێ بۆ قازی ئەو شارەی کە عەینەکەی تێدایە بۆ ئەوەکە ئەم عەینە بنێرێ بۆ ئەم تا شاهیدەکان شەهادەتی لەسەر بدەن، بەڵام ئەبێ بە بێ کەفیل نەیدا بە «مدّعي»یەکە؛ جا ئەگەر شاهیدەکان شاهیدییان لەسەردا، عەینەکە تەسلیمی «مدّعي» بکاو بنووسێ بۆ قازی ولآتی عەینەکە تا کەفیلەکە بەرەڵلا بکا وە ئەگەر شەهادەتیان لەسەر نەدا، بینێرێتەوە بۆ شوێنی خۆیو مەسرەفی عەینەکەو مەسرەفی ناردنەوەی لەسەر «مدّعي»یەکەیە.

وە ئەگەر ئەو عەینە قابیلی ئەوە نەبوو کە ئامادە بکرێ، ئەوە پێویستە یا لەلای خۆی شەهادەتی ئەو شاهیدانە وەربگرێو حوکم بداو ئەم شەهادەتەو حوکمەکەی خۆی بنووسێ بۆ قازی ئەو ولآتەی کە عەینەکەی تیایە، یاخود «مدّعي»و «مدّعی علیه»و شاهیدەکان بنێرێ بۆلای تا ئەو لەوێ مورافەعەیان بکا، وەکوو شێخی رَمَلی فەرموویەتی.

بزانن! هەرکاتێ واجب بوو عەینی ماڵە ئیددیعاکراوەکە حازر بکرێ کابرای «مدّعی علیه» وتی: عەینێکیوام لابوو و ئێستە نەماوە، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند وە لەم وەختەدا «مدّعي» بۆی هەیە ئیددیعای قیمەتەکەی بکا وە ئەگەر «مدّعی علیه» سوێندی نەخوارد لەسەر ئەوەکە عەینەکە ئێستە دیار نییەو «مدّعي» سوێندی

خوارد لەسەرئەوە کە ئێستە حازرە لای و بە درۆ ئەڵێت حازر نییە، یاخود شاهیدی هێنا کە ئێستا عەینەکەی لایەو بە درۆ ئەڵێ لام نییە، یاخود شاهیدی نییەکە عەینەکەی لایەو شاردوویەتیەوە، داوای لێ ئەکرێ حازری بکاو حەبس ئەکرێ تا حازری ئەکا یا ئیددیعای فەوتانی ئەکاو سوێندی لەسەر ئەخوا.

ئەگەر «مدّعي» گومانی هەبوو لەوەدا عەینی ماڵە ئیددیعاکراوەکە ماوە تا داوای بکا یا نەماوە تا داوای قیمەتەکەی بکا، ئەوە ئەبێ دەعواکەی وابێ بڵێ: فلانکەس عەینێکی وای لێ داگیر کردووم، ئەگەر ماوە، با پێم بداتەوە وە ئەگەر نەماوە، قیمەتەکەم پێ‌بداو ئەم دەعوایە بەم‌جۆرە ئەبیسرێ وە لە واتەیەکدا، پێویستە کابرا تەنیا دەعوای عەینەکە بکاو ئیسپاتی زەوت‌کردنەکە بکا، جا ئەگەر «مدّعی علیه» دەعوای فەوتانی کردو سوێندی لەسەری خوارد، ئەوسا «مدّعي» داوای قیمەتەکەی لێ بکا.

ئەم دوو فەرموودەیە جاری دەبن لە کەسێکیشدا جلێکی دابێ بە دەلالێك بیفرۆشێ‌و لەپاشا دەلالەکە ئینکاری ئەو جلە بکاو خاوەنەکەشی نەزانێ بەڕاستی ئەو جلەی لاماوە یا فەوتاوە.

بزانن! لە هەر شوێنێکدا حازر کردنی عەین واجب بێ‌و عەینەکە سابت بێ بۆ «مدّعي»یەکە، ئەوە هەر مەسرەفێ لەو عەینەدا بکرێ، لەسەر «مدّعی علیه» دائەنرێ، ئەگینا لەسەر «مدّعي» ئەبێ.

## باسی مەسافەی حازر نەبوونی «مُدَّعیٰ عَلیه»

ئەو کەسە نادیارەی کە دەعوای لەسەر ئەبیسرێ‌و شاهیدی لەسەر تێ‌دەپەڕێ‌و حوکمی بەسەردا ئەدرێ، کەسێکە لە مەسافەی نیوەڕۆژێکدا یا زیاتر لەو مەسافەیە بێ؛ مەبەست لە مەسافەی نیوەڕۆژەڕێگەیەك ئەوەیە ئەگەر کابرا بەیانی لە شوێنی خۆیەوە بڕوا بۆ ئەوێ، نەتوانێ بە عادەت بۆ ئێوارە بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی؛ هەندێ لە زانایانی شەرعیش دەڵێن: مەسافەی بیستنی دەعوا لەسەر «مدّعی علیه»ی نادیار، ئەو مەسافەیەیە کە دروستە نوێژی تیادا کورت بکرێتەوەو ئەگەر کەسێك لە مەسافەیەکی

لەوەندە نزیکتردا بوو، ئەوە بە بێ حـازربوونی خـۆی، دەعـوای لەسـەر نـابیسرێ‌و حوکمی بەسەردا نادرێ، مەگەر خۆی شاردبێتەوە، یاخود فیز بکاو نەیەتە دادگاوە.

فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە دروستە حوکمدان بەسەر کەسێکی نادیاردا لە قیساس و لە حەددی قەزف‌و هەرچی حەقێکدا کە حەقی بێ‌گەردی بەنی‌ئادەم بێ وە دروست نییە لە حەقی بێ‌گەردی خوادا، وەکوو حەددی شەراب خواردنەوەو پاشگەز بوونەوە لە ئایینی ئیسلام؛ بەڵام ئەو شتانە کە هەردوو حەقەکەیان تیایە، دروستە حوکمیان تێدا بدرێ بۆ ماڵەکە نەك بۆ دەست بڕینەکەی.

ئەگەر قازی شەهادەتی لەسەر کەسێکی نادیار وەرگرت‌و لەپاشا نادیارەکە حازر بوو، ئەوە نابێ دووبارە ئەو شەهادەتە وەربگیرێتەوە، ئەوەندە هەیە ئـەبێ مـەیدانـی «مدّعی علیه» بدا بۆ ئەوە کە «جَرح»ی ئەو شاهیدانە بکا؛ بەڵێ، ئـەگـەر شـەهادەتی بیست‌و لەپێش حوکمدانا عەزلکراو دووبارە کرایـەوە بـە قـازی، ئـەوە واجـبە ئـەو شەهادەتە دووبارە وەربگرێتەوە.

ئەگەر کەسێك لای قازی شکاتی کرد لە کەسێ کە لە وڵاتەکەیدا حازر بوو، واجبە لەسەری حازری بکا بە کاغەزێك یا بە مۆرێك یا بە کاربەدەستێك کە دانراوە بۆ ئەو جۆرە کارانە؛ جا ئەگەر کابرا نەهات، بە زۆری حوکوومەت رایکێشێ‌و تەمێیشی بکا لەسەر ئەو نەهاتنەی وە ئەگەر کابرا لە شوێنی ویلایەتی قازییەکەدا نەبوو، واجب نییە لەسەر قازی حازری بکا، بەڵکوو دەعواکـەو شـەهادەتی شـاهیدەکـان وەربگـرێ‌و بنووسێ بۆ قازی وڵاتی کابرا بۆ وەرگرتنی حەقەکە، هەروەها ئەگەر کابرا لە شوێنی ویلایەتی قازییەکەدا بوو، بەڵام جێ‌نشینێکی لەو شـوێنـەدا هـەبوو، بـەڵام ئـەگـەر جێ‌نشینی لەو شوێنەدا نەبوو، واجبە حازری بکا بۆ لای خۆی. فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە کە ئینسانی نەخۆش‌و پیری بێ‌تـاقەت‌و ژنـێ کـە خـاوێن‌و داپـۆشـراو بـێ، بانگ‌ناکرێن، بەڵکوو پێویستە قازی خۆی یا جێ‌نشینی بچن بۆلایان، یا فەرمان بدا کە ئەوان وەکیل بگرن‌و وەکیلەکە بێتەلای قازی تا مەسەلەکەیان ببڕێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر مەسەلەکە موناسبی قورس کردنی سوێند بوو، ئەوە پێویستە ـ تا بکرێ ـ حازر بکرێن بۆ بەجێ‌هێنانی سوێندەکە.

## باسی دابەش کردنی ماڵێ کە تێکەڵ بێ

ماڵێ کە تێکەڵ بێ لە بەینی چەند کەسێکدا، یا هاوبەشەکان خۆیان دابەشی ئەکەن یاخود پێشەوای موسوڵمانان یا کەسێ کە ئەو دایناب‌ێ دابەشی ئەکا وە لە سووورەتی پێشوودا ئەگەر هەموو هاوبەشەکان پێ گەیشتوو بوون، ئەوە باشە وە ئەگەر منداڵیان لەناوا بوو، ئەوە لەم‌حاڵەدا ئەگەر بەش کردنی ئەو ماڵە قازانج بوو بۆی، ئەوە واجبە لەسەر وەلییەکەی دابەشی بکا وە ئەگەر قازانجی تێدا نەبوو، دروست نییە ئەم وەلییە داوای دابەش کردنی بکا، بەڵام ئەگەر هاوبەشەکان داوای دابەش کردنیان کرد، پێویستە ئەمیش بە گوێیان بکا وە ئەگەر منداڵەکە وەلی‌ئەمری نەبوو، واجبە قازی کەسێکی بۆ دابنێ؛ ئەگەر قازی لە وڵاتدا نەبوو یا گوێی بەمە نەدا، واجبە لەسەر ئەهلی حەل‌وعەقدی ئەو شوێنە ئینسانێکی عادڵ دابنێن بۆ ئەوە لەگەڵ هاوبەشەکاندا ماڵەکە دابەش بکاو بەشی منداڵەکە وەربگرێ.

شەرتی ئەو کەسەی کە پێشەوای موسوڵمانان یا هاوبەشەکان ئەیکەن بە حەکەمی خۆیان بۆ دابەش کردنی ماڵەکە، ئەوەیە ئازادو باڵغو عاقڵو عادڵ بێ وە ئەگەر بەش کردنەکە پێویستی بە پێوانەو ژمارە هەبوو، ئەبێ ئەوکەسە کە ئەکرێ بە حەکەم، پێوانەو ژمارە بزانێ وە ئەگەر دابەش کردنەکە پێویستی بە قیمەت دانان بوو بۆ هەندێ لە ماڵە دابەش‌کراوەکە، ئەبێ دوو کەس دابنێن بۆ قسمەت دانان، بەڵام بۆ وەکیلی هاوبەشەکان هەر ئەوەندە پێویستە باڵغو عاقڵ بێ، ئیتر قەیدی نییە ژن بێ، یاخود غەیرە عادڵ بێ؛ بەڵێ مادام هاوبەشەکان منداڵیان تیابێ، ئەبێ ئەو کەسەی کە لەلایەن قازییەوە دائەنرێ عادڵ بێ.

پێشەوای موسوڵمانان ئەتوانێ ئەو کەسەی کە ئەیکا بە حەکەم بیشیکا بە حاکم بۆ دانانی قیمەتی ماڵەکە وە لەم کاتەدا، واجبە ئەو کەسە لە قیمەت دانانەکەدا پشت بە دووکەسی دادپەروەر ببەستێ.

بزانن! کرێی ئەو کەسەی پێشەوای موسوڵمانان ئەیکا بە حەکەم، لە بەیتولماڵی موسوڵمانانە لە بەشی مەسالیح؛ جا ئەگەر بەیتولماڵ ماڵی تیا نەبوو، یا ئەوەی کە

بەیتولماڵی بەدەستە نەیدا، کرێکەی ئەکەوێتە سەر هاوبەشەکان وە لەم کاتەدا، ئەگەر هاوبەشەکان لەگەڵ کابرادا ڕێکەوتن لەسەر ئەندازەی کرێ، ئەوە باشە وە ئەگەر کرێکەیان دیاری نەکرد، ئەوە لەسەر نیسبەتی بەشەکان ئەبێ کرێی هاوچەشنی ئەو ئیشە بۆ کابرای حەکەم تەواو بکرێت، بەڵام لە ڕێك کردنی زەویدا کرێ لەسەر کەم‌و زۆریی زەوییەکەیە، چونکە تا زەوییەکە زۆرتر بێ ئازاری کابرا زۆرتر ئەبێ.

جا هەر ماڵێ کە بە هۆی دابەش کردنەوە زیانی زۆری پێ بگات، ئەوە ئەگەر سوودە مەبەستەکەی بە تەواوی بەتاڵ بووەوە، وەکوو گەوهەرێ یا جلێکی خاوەن قیمەت، یا جووتێ خوف، یا ئاش‌و حەمامێکی بچووك کە بۆ ئەوە نەشێن بکرێن بە دووئاشی بچووك یا دووحەمامی بچووك ئەوە هەرکاتێ هاوبەشەکان داوای دابەش کردنیان کرد، واجبە لەسەر قازی مەنعیان بکا وە ئەگەر سوودەمەبەستەکەی نەدەفەوتا بەڵام زیانێکی زۆری لێ ئەکەوت، ئەوە قازی بەگوێیان ناکا بۆ دابەش کردنی، بەڵام ناتوانێ ڕێیشیان لێ بگرێ لە دابەش کردنیا، مەگەر منداڵیان تیادا بێ، ئەوە لەو حاڵەدا قازی لەبەر پارێزگاری حەقی مناڵەکە ئەتوانێ مەنعیان بکا لە دابەش کردنی ماڵەکە، نموونەی ئەوە وەك شمشێرێکی گەورە کە لەوانەبێ بشکێنرێ‌و چەند کێردێکی لێ دروست بکرێ، یا ئاشێك یا حەمامێك کە لەوانەبێ بکرێن بە دوو ئاش یا دوو حەمامی بچووك.

ئەگەر یەکێ لە هاوبەشەکان دەیەکێکی هەبوو و ئەوی‌تری هی هاوبەشەکەی بوو، ئەوە ئەگەر خاوەنی نۆ بەشەکە داوای دابەش کردنی کرد، خاوەنی دەیەکەکە ناچار ئەکرێ بۆ دابەش کردنی وە ئەگەر خاوەنی دەیەکەکە داوای کرد، ئەوی‌تریان ناچار ناکرێ.

**بزانن! دابەش کردن سێ جۆرە:**

**یەکەم،** «تَقسیمُ الأَجزاء»، واتە بەش‌بەش کردنی بەشەکانی شتە بەش‌کراوەکەیەکە بە عەرەبی پێیشی دەڵێن: «تَقسیمُ المُتَشابِهات» واتە دابەش کردنی موڵکی هاورەنگ، وەکوو دابەش کردنی تۆپێك بلووری یا هۆقەیەك ئاڵتوون یا زیو یا خانوویەك کە هۆدەکانی وەکوو یەك وابن یا زەوییەك کە پارچەکانی لە ڕەقی‌و نەرمی‌و چاکی‌و

خراپی دا وەك یەك وابن؛ ئەم جۆرە موڵکە، مادام هەندێ لە هاوبەشەکان داوای دابەش کردنی بکەن، هاوبەشەکانی تر ناچار ئەکرێن کە ئامادە بن بۆ دابەش کردنی وە بۆ بەش کردن پێویستە بەشەکان هەموو جیا بکرێنەوە بە گەز یا پێوانە یا کێشانە ئەوەندەی سەری خاوەن بەشەکان، ئەگەر وەکوو یەك بەش ببەن؛ ئەمجار ئەوەندەی بەشەکان پارچەکاغەز ئەبڕرێو لە هەر پارچەکاغەزێك ناوی پارچەیەك لەو زەوییە ئەنووسرێ، هەروەها ئەوەندەی خاوەن بەشەکانیش کاغەز ئەبڕرێو لە هەریەکێکیان ناوی خاوەن بەشێك ئەنووسرێ، جا پارچە کاغەزی بەشەکان بە جیا یەکە یەکە لوولە ئەکرێنو ئەدرێن بە دەستی کەسێکەوە کە پێشان حازر نەبووبێ لەویادا، تا هەر لوولەیەك بخاتە سەر ناوی یەکێك لە هاوبەشەکان، یاخود ناوی کەسەکان لوولەئەکرێو ئەو پارچە کاغەزانەی کە ناوی بەشەکانیان تیایە دائەنرێن تا کەسی ناوبراو هەرلوولەیەك بخاتە سەر پارچە کاغەزێ لەوانە کە ناوی بەشەکانیان تیایە.

وە ئەگەر بەشەکان جیاییان هەبوو، وەکوو نیوەو سێ یەكو شەش یەك، ئەوە ماڵەکە بەش بەش ئەکرێ لەسەر کەمترین بەش؛ مەسەلا، لەم سوورەتەدا ئەکرێ بەشەش بەشەوە؛ بەڵام لێرەدا چاكوایە هەر ناوی شەریکەکان بنووسرێتو بدرێتە دەستی کابرای ناوبراو تا دایانبنێ لەسەر ناوی بەشەکان، جاکاتێ ناوی کەسێکی لەسەر ناوی بەشێك دانا، ئەگەر ناوی خاوەن شەش یەکەکە بوو، ئەوە ئەو بەشە ئەبا وە ئەگەر ناوی خاوەن سێ یەکەکە بوو ئەوە ئەو بەشە ئەبا لەگەڵ بەشێکی تر لەپاڵیا وە ئەگەر ناوی خاوەن نیوەکە بوو، ئەو بەشەو دووبەشی تر لەپاڵیا ئەبا بۆ ئەوەکە بەشەکان تێکەڵ نەبن.

وە ئەگەر ناوی بەشەکان لوولەکران، پێویستە لەپێشا ناوی نیوە بدا بەدەستی کابراوە هەتا خاوەن نیوە تەواو بەشەکەی خۆی لەپاڵ یەکا وەربگرێ، ئەمجار ناوی سێ یەکەکە، ئەمجار ناوی شەش یەکەکە؛ بەم تەرتیبە بەشەکان تێکەڵ نابن.

وە ئەگەر قیمەتی دوو خانوو یا دوو دووکان وەکوو یەك بوو وە یەکێ لە هاوبەشەکان داوای ئەوەی کرد هەر خانوویەك بدرێ بە یەکێکیان، یا هەر دووکانێ بۆ یەکێك بێ، ئەوە زۆر ناکرێ لە هاوڕێکەی بۆ قەبووڵ کردنی ئەم وەزعە، چونکە مەبەست لە

شوێن‌و وەزعی ئەماندا ئەگۆڕێت، بەڵکوو ئەو هاوبەشە بیەوێ نیوەی ئەم خـانووەو نیوەی ئەو خانووە، یا نیوەی ئەم دووکانەو نیوەی ئەو دووکانە وەربگرێ؛ بەڵێ، ئەگەر لەناو خۆیاندا وایان بڕیاردا، ئەوە باشە؛ بەڵام ئەگەر دوو تۆپ بلووری لە جۆردا وەکوو یەك وابن‌و یەکێ لە هاوڕێکان داوای کرد یەکی تۆپێ ببەن، ئەوە ئەو هاوبەشە ناچار ئەکرێ، چونکە لە بەش کردنی یەکەیەکەی تۆپەکان هیچ مەبەستێك نییە وە ئـەگـەر جۆرەکەیان جیاجیا بوون، ئەوە زۆر لێ کردنی تێدا نییە.

**جۆری دووهەم**، «تَقسیمُ التَّعدیل»ە کە بریتییە لە دابەش کردنی شتێ کە نـرخـی بەشەکانی جیاجیابێ، وەکوو زەوییەك کە هەندێکی نەرمەزەوی‌و هەندێکی شۆرەکات بێ، یاخود هەندێکی نزیکە ئاوو هەندێکی دوورەئاو بێ؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە لەم جۆرە دابەش کردنەشدا، ئەگەر هەندێك لە هاوبەشەکان داوای دابەش‌کردنیان کرد، ئەوانی تریان ناچار ئەکرێن.

**جۆری سێهەم** «قِسمَةَ الرَّد»ە کە بریتییە لە دابەش کردنی زەوییەك هەندێکی کانی ئاوی تێدا بێ یا کانێکی تێدا بێ و ئەو هەندەی کەکانییەکە یان کانەکەی تیایە، بۆ دابەش کردن نەشێ‌و ئەوی تری بێ کانی یا بێ کان بێ؛ ئەوە لەم سوورەتەدا ئەو هاوبەشەیان کە ئەو پارچەیە هەڵئەگرێ کە کانەکە یا کانی‌ئاوەکەی تیایە، بەپێی نرخی پارچەکان پارە ئەگێڕێتەوە بۆ هاوبەشەکەی‌تر؛ کەواتە، ئەگەر قیمەتی هەرکام لە دوو پارچە زەوییەکە هەزار دینار بوو وە قیمەتی کانییەکەیش یا کانەکەیش بە تەنها خۆی هەزار دینار بوو، پێویستە ئەو کەسەیان کە ئەو پارچەیەیان هەڵئەگرێ کە کانییەکە یان کانەکەی تیایە، پێنج‌سەد دینار بدا بەوی‌تریان. ئەم دابەش کردنە ناچار کردنی تێدا نییە و لە مەعنادا فرۆشتنە لەبەرئەوە لە سوورەتی پێشوودا ئەو دوو هاوبەشە زەوییەکەیان وەکوو یەك دابەش کردووەو ئەوەیان کە کانی یا کانەکەی وەرگرتووە، بەشی هاوبەشەکـەی‌تری کڕیوە بە پێنج‌سەد دینار.

«قسمةُ التّعدیل»یش، هەر لە مەعنادا فرۆشتنە، هەرچەند زۆر لێ‌کردن لەو دابەش کردنەدا ناچارییە، بەڵام «تقسیمُ الأجزاء»، هەر جیا کردنەوەی حەقی شەرعییە.

بەشەرت گیراوە لە «قِسمَةُ الرّد»دا رازی بوونی هاوبەشەکان بە بەشەکەی خۆیـان لەپاش دەرچوونی قورعەکە، هەروەها لە «قسمةُ التّعدیل»دا و لە هەر دابەشکردنێکدا کە زۆرلێ کردنی تێدا نەبێ؛ مەسەلا، پێویستە بڵێن: رازین بەم دابەش کردنە، یا: رازین بەوە کە قورعەکە دەریخستووە.

ئەگەر لەپاش دابەش کردنەکە بە پێ‌لێنانی هاوبەش یا بە شەهادەتی شاهید، هەڵەیەك یا ناحەقییەك لە تەقسیمی زۆرلێ کەری‌دا سابت بوو، ئەوە ئەوە دابەش کردنە بـەتاڵ ئەکرێتەوەوەئەگەر یەکێ لە هاوبەشەکان ئیددیعای ستەم‌وناحەقی کردلە تەقسیمەکەدا، ئەوە بۆی هەیە سوێندی هاوبەشەکەی بدا؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد کە: ئاگـام لە ستەم‌و ناحەقی نییە، ئەوە دابەش کردنەکە بە حاڵی خۆی ئەمێنێتەوە.

ئەگر یەکێ لە هاوبەشەکان ئیددیعای کرد کە لە دابەش کردندا هەڵەکراوە یا ناحەقی لێ‌کراوەو دابەشکردنەکە بە رەزامەندیی هەموویان کرابوو وە ماڵە دابەشکراوەکەش لەوانە نەبووکە «رِبا»ی تێدابێ، وەکوو زەوی‌و پۆشاك‌و بیشڵێین: ئەم‌جۆرە دابەشکردنە فرۆشتنە بەوجۆرە کە دابەشکردنەکە، «قسمةُالتّـعدیل» یـا «قســمة الرّد» بـوو، ئـەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەو ئیددیعایەکار ناکاو بێ‌سوودە، بەڵام ئەگەر ماڵەکە لەوانە بوو کە ریبای تێدا بێ، وەکوو پارەو خواردەمەنی، ئەوە مادام ناحەقی لێ‌کرانی تێدا دەربکەوێ، دابەش کردنەکە بەتاڵ ئـەبێتـەوە، واتـە دەرئـەکـەوێ کـە بـەتاڵ بـووەو دانەمەزراوە وە ئەگەر بڵێین: ئەم دابەش کردنە جیا کردنەوەیە (افراز) بـەوجۆرە کـە «قسمةُ الأجزاء»بێ، ئەوە ئەگەر هەڵەکە سابت بوو، دابەش کردنەکە بەتاڵ ئەبێتـەوە، چونکە ئەبێ بە جیاکردنەوە لەگەڵ جیاوازی لە بەشەکانداو ئەمەش بەتاڵە وە ئەگەر هەڵەکە سابت نەبوو، ئەوە هەر حەقی ئەوەی هەیە هاوبەشەکەی سوێند بداکە ئاگای لە هەڵە نییە لەو دابەش کردنەدا کە کردوویانە.

ئەگەر لەپاش دابەش کردن هەندێ لەو ماڵە کە دابەشکراوە بە ماڵی کـەسێکـی‌تر دەرچوو، ئەوە ئەگەر ئەو هەندە بڵاو بوو، وەکوو چواریەك؛ مەسەلا، چواریەکی ماڵەکە بە ماڵی یەکێکی‌تر دەرچێ، ئەوە دابەش کردنەکە لەو ئەندازەیەدا بەتاڵ ئەبێتەوەو لە

دابەش کردنی ئەوی تریدا ئەو جیاوازیی قسەیە هەیە کە لە «تفريقُ الصَّفقة»دا هەیە؛ واتە هەندێ لە زانایانی شەرع لایانوایە دابەش کردنەکە دروستە، بەڵام هاوبەشەکان حەقی پەشیمانبوونەوەیان هەیە لەو دابەش کردنەدا کە کراوە وە لەلای هەندێکی تر، دابەش کردنەکە لە هەموویدا بەتاڵە؛ لەم دوو فەرموودەیەدا، فەرموودەی یەکەم جێگەی باوەڕە.

وە ئەگەر لە هەر بەشێکدا ئەندازەیەکی دیاری بە ماڵی خەڵك دەرچوو، ئەوە ئەگەر ئەوەندەی یەك بوون، دابەش کردنەکە لەوی تریدا دروستە وە ئەگەر ئەو ماڵەکە بە ماڵی کەسێکی تر دەرچووە هەر لە بەشی یەکێکدا بوو تەنها، یا لە بەشی هەموو خاوەنبەشەکاندا هەبوو بەڵام کەم و زۆر بوون، ئەوە دابەش کردنەکە لە هەموو ماڵەکەدا بەتاڵە.

ئەگەر لەپاش دابەش کردنەکەو پاش ئەوەکە زەوییە دابەشکراوەکە کێڵرا یا خانووی تێدا کرایەوە یا درەختی تێدا نێژرا، هەندێکی بە ماڵی کەسێکی تر دەرچوو، ئەوە ئەو حوکمانەی کە لەپاش دەرکەوتنی دانەمەزرانی فرۆشتن جاری ئەبن، لێرەیشدا جاری ئەبن؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە لەم شوێنەدا کاتێ کابرای هاوبەش خانووەکەی رووخاند یا درەختەکەی هەڵکەند یا کشت و کاڵەکەی لابرد، بژاردنی ناتەواویی زەوییەکەی ناکەوێتەسەر ئەوەندەی بەشەکەی خۆی نەبێ.

بزانن! لە هەر شوێنێکدا قورعە بکرێ، لەبەرئەوە ناکرێ کە قورعە واجبە، چونکە ئەگەر هاوبەشەکان لەناو خۆیاندا رازی بوون بە دابەش کردنی ماڵە تێکەڵەکە بە بێ قورعە، ئەوە دروستە، هەتاوەکوو ئەگەر هەندێ لە هاوبەشەکان ماڵەکەیان دابەش کرد لەکاتێکا کە هەندێ لە هاوبەشەکان دیار نەبوون و ئەمان بەشی خۆیانیان وەرگرت و کاتێ کە هاوبەشە نادیارەکان هاتنەوەو پێیانزانی، رازی بوون بەو دابەش کردنە، ئەوە ئەو دابەشکردنە دائەمەزرێ لەوکاتەوە کە رەزامەندییان لێ پیشان داوە.

ئەگەر هەموو هاوبەشەکان یا هەندێکیان داوایان کرد لە قازی ماڵێکی تێکەڵیان لەنێواندا دابەش بکا، دروست نییە بەگوێیان بکا تا ئیسپاتی خاوەن موڵکێتی خۆیان نەکەن بۆ ئەو ماڵە، هەرچەند کەسێکیش نەبێ کە لەگەڵیاندا لەهەرادا بێ، چونکە تەسەڕوفی قازی لە مەسەلەیەکدا کە داوا کرابێ لێی جیای بکاتەوە، بە حوکم دائەنرێ و

حوکم کردنیش بە تەنها قسەی خاوەنحەق دروست نییە وە ئەو شاهیدانـەی لێرەدا ئەبێ ببن، پێویستە یا دوو پیاو یا پیاوێك‌و دوو ژن بن، ئیتر بە شاهیدێك‌و سوێندێك مەسەلەکە سابت نابێ؛ بیستنی شاهید لەم سوورەتانەدا بێ پێش‌کەوتنی دەعوا لەبەر ناچاری دروستە، چونکە مەبەست ئەوەیە مـەنعی هـاوبەشەکـان بکـرێ لەوەکـە لە پاشەڕۆژدا تەسەڕوفی قازی بکەن بە بەڵگە لەسەر خاوەن موڵکێتی خۆیان.

لە هەر دابەش کردنێکدا کە بە فرۆشتن دابنرێ، هەرکام لە هاوبەشەکان ئاگادار بوو بەسەر عەیبێکدا لە بەشەکەی خۆیدا، ئەتوانێ دابەش کردنەکە هەڵوەشێنێتەوە، وەکوو لە فرۆشتندا دروستە.

بزانن! دابەش کردن دروست نییە لە قەرزێکـدا کـە تـێکـەڵ بـێ لەنـێوان چـەند کەسێکدا، وەکوو ئەوە کەسێك سەد دینار بە قەرز بدا بە کەسێکی‌ترو لەپاشانا بمرێ‌و ئەو قەرزە ببێ بە ماڵی مناڵەکانی، چـونکە ئـەمە یـا فـرۆشـتنی قـەرزە بـە قـەرز یـا جیاکردنەوەی ماڵێکە کە لە ئەستۆدا بێ‌و ئەمانەیش دروست نین؛ دەلیلی دانەمەزرانی جیاکردنەوەی ماڵێکیش کە لە ئەستۆدا بێ، ئەوەیە هێشتا وەرنەگیراوە.

## باسی شەهادەتدان

شەهادەتدان لە شەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك خەبەر بـدا لە حـەقێ کـە بـەسەر کەسێکەوە بێ بە لەفزێکی تایبەتی. شەرتی شاهید، ئەوەیە باڵغ‌و عاقڵ‌و ئازادو خاوەن پیاوەتی‌و فامیدەی کاروباری دنیاو دینی خۆی بێ وە لە هەر شتێکـدا کـە بـبیسرێ پێویستە گوێی ببێ‌و لە شەهادەتەکەیشیدا «مُتَّهَم» نەبێ.

گەلێ لە زانایانی شەرع، وەکوو «اذْرَعی»و «غَزّی»و کەسانی‌تریش، فـەرموودەی هەندێ لە زانایانی مەزهەبی ئیمام مالیکیان هەڵبژاردووە کە فەرموویانە لەکاتێکا کـە فاسقی بڵاوبوویێتەوە لە وڵاتدا، حوکمڕانی شەرع ئەتوانێ حوکم بدا لەسەر شەهادەتی شاهیدی فاسق، بەڵام پێویستە تەماشای ئەوە بکرێ شاهیدێ کە فاسقییەکەی کەمتر بێ، شەهادەتی پێش بخرێ لە شاهیدێ کە فاسقییەکەی زۆرتر بێ.

شەرتی عەداڵەت، ئەوەیە ئەو کەسە خۆی بپارێزێ لە هەموو گوناهێکی گەورەو لە هەر گوناهێ کە وا بگەیەنێ ئەو کەسە کەم موبالاتە بە ئایین وە خۆی بپارێزێ لە بەردەوام بوون لەسەر گوناهی بچووك لە یەك جۆر یا لە چەند جۆرێك؛ کەواتە، ئەگەر یەك گوناهی گەورەی کرد، عەداڵەتی نامێنێ، هەروەها ئەگەر شتێکی وای کرد کە بێ موبالاتی بگەیەنێ بە ئایین، یا ئەگەر بەردەوام بوو لەسەر گوناهی بچووك، بەو شەرتە خواپەرستنی زۆرتر نەبێ لە گوناهکردنی وە ئەگەر خواپەرستنی لە گوناهکردنی زۆرتر بوو لە گوناهی بچووکدا بە جۆرێ کە ژمارەی خواپەرستنی زۆرتر بوو لە ژمارەی گوناهە بچووکەکانی، ئەوە عەداڵەتی نافەوتێ.

**بزانن!** گوناهی گەورە زۆرن، بەڵام ئەتوانرێ لە چەند شتێکدا کۆبکرێنەوە:

**یەکەم**، ئەوانەی هەڕەشەی بەهێزیان لەسەر بێ لە قورئانو حەدیسدا، وەکوو کوفر کردنو هاوبەش دانان بۆ خوداو کوشتنی نەفسی بێ گوناه و فیتنەیی کردن لەناو خەڵکدوا هەوڵدان لای پیاوی دەسەڵاتدار بۆ زیانگەیاندن بە گیان، یا ناموس، یا ماڵی خەڵك. بەتایبەتی ماڵی هەتیوو ماڵی وەقفو غەشکردن لە موعامەلەداو خەیانەت کردن لە ئەمانەتداو فرۆفێڵ کردن لە خەڵك بە سیحرو چاوبڕاوو دەستبڕین بە هەر جۆرێ بێ.

**دووهەم**، هەر گوناهێ کە حەددی لەسەر بێ، وەکوو زیناو بوختان کردن بۆ کەسێکی پاکی بەحەیاو شەرمو جەردەییو دزیو خواردنەوەی ئارەقو شەرابو هەرچی ئینسان سەرخۆش بکا.

**سێهەم**، تەرکی ئەو واجبانەی کە لە ئایینی ئیسلامدا هەن، وەکوو نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو خۆگرتن لە جەنگی کافرانداو ئەو شتانەیتر کە فەرزی عەینن، وەکوو وازلێهێنانی فێر بوونو خوێندنی ئەو شتانە کە فەرزن لەسەر موسوڵمان.

لەو بەشە گوناهەیە کە خوا لە قورئانا هەڕەشەی لێ کردووە، قومار. وە وەکوو قومار وایە دامەو شەترەنجو ریزێنو پشکیلانو فنجانێن، ئەگەر لەسەر ماڵ بکرێن، بەڵام ئەگەر لەسەر ماڵ نەکران، ئەوە حەرام نین، بەو شەرتە نەبن بەهۆی فەوتاندنی پێویستی

ئایین، ئەگینا حەرام ئەبن وە لەم بەشەیە بەکارهێنانی ئەو ئالەتانەی کە بەپێی عادەت فاسق‌و شەرابخۆر بەکاریان دەهێنن، وەکوو زورناو تەموورەو کەمانچەو جووزەلەو سونج‌و دمڵەك‌و بلوێر (شمشاڵ) کە زیاتر لە قامیش دروست دەکریٚ‌و شوان زیاتر لێی دەدەن ـ بە فەرموودەی راستتر ـ بەڵام بەرابەر بەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکـی تریش هەیە کە شمشاڵ حەڵاڵە‌و "ئیمامی غـەزالی" لەسـەر ئـەم فـەرموودەیەیەو "ئـیمامی رافیعی"یش هەر لەسەر ئەمە رۆیشتووەو "بُلقینی"یش ئارەزووی لەم فەرموودەیەیە، چونکە دەلیلێکی جێگرتوو نییە بۆ حەرامی شـمشاڵ‌و دروسـتە ئـینسان بـۆ خـۆی تەقلیدی فەرموودەکەی ئیمامی غەزالی بکات.

دەفـلێدان‌و گویٚ لیٚ‌گرتنی حەڵاڵە، خوای حەڵقەی پێوە بیٚ یا نە و بەتەنها بیٚ یا لەگەڵ شمشاڵدا بیٚ وە بە تایبەتی لە خەتەنە سوورانی منال‌و شایی ژن هێنان‌و لەکاتی خۆشیدا، وەکوو ئـەو کـاتەی کـە حـاجی لە حـەج دێتـەوە؛ بـەڵام "ابـنُ الصَّـلاح" فەرمووویەتی: ئەگەر شمشاڵ‌و دەف کەوتنە یەك، ئەوە حەرامن بە ئیتتیفاقی قسەی ئەو زانایانەی کە قسەیان جێگەی باوەڕە، "تـاجُ‌الدّیـنی سُـبْکی"و غـەیری ئـەویش ئـەم قسەیەی ئیبنوسەلاحیان پەسەند نەکردووەو فەرموویانە: دەف خۆی حەڵاڵە‌و شمشاڵ لەسەر فەرموودەیەك هەر حەڵاڵە‌و لە کۆکردنەوەی دوو شتی حەڵاڵدا حەرامیٚ پەیدا نابیٚ، هەروەها ئەو تەپڵە کە مەشهوورە بە «تـەپڵی بـاز»و ئـەدرێتـە پـاڵ "حـەزرەتی غەوس"و ئەوانەی کە سەر بەون‌و لە کاتی حەڵقە بەستنی زیکری خـوادا لێی‌ئـەدەن، ئەوەیش حەڵاڵە.

مۆسیقای لەشکری ئیسلام حەڵاڵە‌و هەڵپەرکێیش حەڵاڵە، مەگەر خۆ شکاندنەوەی تێدا بیٚ لەسەر ئوسوولی ئەوانەی کە ژنانە هەڵئەپەڕن وە حەڵاڵە شیعر خوێنـدنەوەو شیعردانان، مەگەر زەمی موسوڵمانێکی تێدا بیٚ یا درۆی تێدا بیٚ یا ناوهێنانی ژنێکی دیاریی تێدا بیٚ کە هەر بە ئاشکرا ناوی بهێنریٚ یا ناوونیشانی هەڵبدریٚ، هـەروەها ئەگەر ناوهێنانی یا ناوونیشان هەڵدانی کوڕێکی موولێنەهاتووی تێدا بیٚ.

بەڵام پێویستە بزانین هەرکام لەم‌شتانە کە بە حەڵاڵ دانراون، وەکوو دەف لێدان یا شیعرخوێندنەوە یا هەڵپەڕین یا تەپڵ لێدان، هەرکاتیٚ بوون بە هۆی شتێکی حـەرام،

وەکوو تێکەڵ بوونی ژنو پیاو یا بوون بەهۆی کردەوەی حەرام یا قسەی غەیبەتو بوختانو وێنەی ئەمانە، ئەوە ئەو حەلاڵانە هەموو حەرام ئەبنو پێویستە ئینسان ئاگاداری ئایینی خۆی بێ.

پیاوەتی (مُروَّت)، بریتییە لەوە ئینسان لە هەر چینو تاقمێك بێو لە هەر جێگەیدا بێ، لەو زەمانو شوێنەدا لەبارەی جلو بەرگو خواردنو خواردنەوەو هەڵسانو دانیشتنەوە بە جۆرێ بێ کە ئوسووڵی ئەو چینو تاقمو جێگەیە بەکار بهێنێ وە هەرچی پێچەوانەی ئەوە بێ کە باسمان کرد، پێچەوانەی پیاوەتییەو مەنعی قەبووڵی شەهادەت دانی ئەو کەسە ئەکا، وەکوو ئەوە کە ژنی خۆی لە بەرچاوی خەڵکدا ماچ بکاو زیاد لە عادەت قسەی وا بکا کە ببێ بەهۆی پێکەنین، هەروەها ئەگەر جلو بەرگی کۆمەڵێك لەبەربکا کە لە چینو تاقمەکەی خۆیەوە بگۆڕێ بۆ چینو تاقمێکی ترو خەڵکیش بیناسنەوە، یاخود زیاد لە عادەت گۆرانی بڵێ یا گوێی لێ بگرێ یا هەڵپەڕێ.

پیاوەتی، لەکەدار دەبێ بە هەر کاسبییەك کە پەستی تێدا بێ لەلایەنی کەسێکەوە کە شایانی ئەو کاسبییە نەبێو بە ناچاریش مەجبووری کردنی نەبووبێ؛ بەڵێ، ئەگەر کاسبییە پەستەکە لایق بوو پێی، خوای پیشەی باوکی بێ یا نە، یاخود لایقی نەبێ بەڵام لەبەر ناچاری بیکا یاخود لە ماڵی خۆیدا بۆ شکاندنی نەفسی خۆی هەندێ ئیشیوا بکا کە لایق نەبێ پێی ئەوە پیاوەتی لەکەدار ناکات.

«توهمەت»، بریتییە لەوە شاهیدەکە بەهۆی شەهادەتەکەیەوە سوودێك رابکێشێ بۆ خۆی یاخود زیانێك لە خۆی دوور بخاتەوە، خواه بۆ عەینی ئەوکاتە یا بۆ پاشەڕۆژ؛ کەواتە، شەهادەتی کەس وەرناگیرێت بۆ باوكو بەرەوژوور و کوڕ و بەرەوخواری خۆی، هەروەها شەهادەت بۆ برایەکی کە مردبێ بەم شەرتە میراتگری وایnەبێ هەموو ماڵەکە ببا؛ هەروەها، شەهادەت بە ماڵی وەقف لە کەسێك وەرناگیرێ کە خۆی لەو وەقفەدا بەشدار بێ یا ئیشێکی تێیدا هەبێ. شەهادەتی یەکێك لە چەند هاوبەش وەرناگیرێ لە سنووری بەشی شەریکەکانی تردا لەکاتێکا کە هەرایان لەبەیندا هەبێ، چونکە ئەمە ئەبێ بەهۆی هەڵنەوەشاندنەوەی ئەو دابەش کردنە؛ هەروەها،

شەهادەت بە ماڵ وەرناگیرێ بۆ قەرزارێ کە مردبێ یا قەرزارێ لەبەر لاتکەوتن حیجری لەسەر دانرابێ.

شەهادەت وەرناگیرێ بە شیرخواردنی کچی کابرای شەهادەتدەر کەوا شیری دایکی کوڕێکی خواردووە کە داوای ئەم کچەی کردووە، مادام ئەو کوڕە هاوکووفی کچەکە بێو ئەم کابرا مەنعی کچەکەی کردبێ لەوە کە شوو بکا بەوکوڕە؛ هەروەها، شەهادەت وەرناگیرێ لە کەسێکەوە لە ئیشێکدا کە خۆی وەکیل یا «وَصِی» یا «قَیِّم»بێ لەو ئیشەدا وە شەهادەتیش وەرناگیرێ بە ئازادبوونی قەرزارێك کە ئەم شاهیدە زامنی بێ وە شەهادەت وەرناگیرێ بە بریندارکردنی کەسێك کە ئەگەر ئەو بریندارە بمرێ میراتەکەی بێتەوە بۆ ئەم شاهیدە وە شەهادەتی کەس‌وکاری پیاوکوژ وەرناگیرێ [کە شەهادەت بدەن] بە فاسقی ئەوانەی شاهیدی پیاوکوشتنەکەن. [هەروەها] شەهادەتی ئەو کەسانەش وەرناگیرێ کە قەرزیان لەسەر کەسێکی لاتکەوتوو هەیە کەوا [بڵێن:] شاهیدی قەرزێکی تازە، فاسقە[1]. بەڵام ئەم شەهادەتە قەبووڵ ئەکرێ ئەگەر دووکەس شەهادەتیان دا بۆ دوو کەس بە وەسیەتێك لە ماڵی کەسێکدا وە ئەو دووکەسەیش شەهادەتیان دا بۆ ئەو دوو شاهیدە بە وەسیەتێك لە عەینی میراتدا.

شەهادەتی کوڕ دروستە لەسەر باوكو دایکی، هەروەها شەهادەتی باوكو دایك لەسەر کوڕیان وە شەهادەتی کوڕ لەسەر باوکی بە تەڵاقدانی هەوێی دایکی وە شەهادەت بۆ براو برازاو دۆستان و شەهادەتی ژنو مێرد لەسەریەك و بۆ یەك و شەهادەتی ئینسان بۆ دوژمنی وە شەهادەتی بۆ کەسێ کە دوژمنایەتی لەگەڵ هەبێ لەبارەی دینەوە، وەکوو کافرو ئەهلی بیدعەت، هەروەها شەهادەت لەسەردانیشی دروستە، شەهادەتی ئەهلی بیدعەتیش دروستە بەو شەرتە شاهیدەکە بەهۆی بیدعەتەکەیەوە کافر نەبێ.

قەبووڵ ناکرێ شەهادەتی کەسێ کە ئەوەندە بێئاگاو بێهۆش بێ رووداو بە

---

[١. مەسەلەن، «زەید» و «عەمر» قەرزیان بە سەر «بەکر»ی لاتکەوتووەوە هەیە، وە کەسێکی تریش شاهید راست ئەکاتەوە کەوا ئەویش قەرزی هەیە بەسەر بەکرەوە، جا شەهادەتی زەید و عەمر کە بڵێن شاهیدی ئەم قەرزارە تازەیە فاسقە، وەرناگیرێ، ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان].

پوختەیی وەرنەگرێ، هەروەها شەهادەتی کەسێ کە بە بێ ئەوەی داوای شـەهادەتی لێبکرێ شەهادەت بداو شەهادەتەکەیشی بە خۆڕایی نەبێ.

**بزانن!** مەبەست لە دوژمن، کەسێکە رقی لە ئینسان بێ بەجۆرێ کە بە شادیی ئەم خەفەتبارو بە خەفەتباریی ئەم شاد ببێ.

## باسی شەهادەتی خۆڕایی (حِسْبی)

شەهادەتی خۆڕایی، ئەوەیە کەسێك تەنها لەبەر رەزامەندیی خودا بڕوا بۆلای قازی شەهادەت بدا؛ ئەم شەهادەتە قەبووڵ ئەکرێ لە حەقی خوادا، وەکوو نوێژو رۆژوو و زەکاتو کەفارەتو حەج لەجیاتی کەسێك کە مردبێ وە لە ماڵی مزگەوتدا وە لە شتێکدا کە حەقی خوداو حەقی ئادەمیزادی تێدا بێ، بەڵام حەقی خودا بەهێزتر بێ، وەکـوو تەڵاقی «رِجعی» یا «بائِن»، هەرچەند بە شێوەی خولع بێ، بەڵام بە نیسبەتی نـەفسی تەڵاقەکەوە، نەك بۆ ماڵەکە وە لە عەفو لە قیساس و لەو حەددانەدا کە حەقی خودان، وەکوو حەددی «زینا»و حەددی رێگرو دزیو «إحصان»و ئیسپاتی سـەفاهەت وە لە نەسەبو لە باڵغ بوونو لە ئیسلامو کوفردا وە لە وەسیەتدا بۆ جیهەتی عاممە.

سوورەتی شەهادەتی حیسبی ئەوەیە شاهیدەکان بێن بۆ لای قازی بـڵێن: ئـێمـە شەهادەت ئەدەین بەوە کە فڵانکەس نوێژ ناکا، یا رۆژوو ناگرێ، یـا زەکـاتی مـاڵی لەسەرە، یا فڵان مزگەوت ئەوەندە حەقی هەیە لە ماڵی فڵانکەسدا، یا فـڵان، کـوڕی فڵانە.

ئەگەر دوو شاهید شەهادەتیان دا و قازی لەسەر ئەو شەهادەتە حوکمیدا، لەپاشا شاهیدەکان بە کافر یا بە فاسق دەرچوون، ئەوە واجبە لەسەر قازی ئیعلانی بەتاڵیـی حوکمەکەی بکا؛ هەروەها، لەسەر قازیتریش پێویستە بەیانی بەتاڵیی ئەو حوکمە بکا.

ئەگەر کەسێ لەکاتی کافریی خۆیدا، یا لەکاتی منداڵیدا شەهادەتێکی هەڵگـرت و لەپاش موسوڵمان بوون یا باڵغ بوون شەهادەتەکەی دا، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر کەسێك لە حاڵی فاسقیدا شەهادەتی دا بە شتێ و لەپاش تۆبە کردنو تێپـەڕ بـوونی

ماوەی پاكبوونەوە لەگوناھ (إستبْراء) ـکە ساڵێکە ـشەهادەتەکەی زووی دایەوە، ئەوە ئێستەیش هەر ئـەدرێتـە دواوە؛ بـەڵێ، ئـەگـەر زوو شـەهادەتی نـەدابـوو و لەپـاش سابتبوونی عەداڵەت شەهادەتی دایەوە، یا هەڵگرتنی ئەو شەهادەتەو بەجێ گەیاندنی لەپاش گەڕانەوەی عەداڵەتی بوو، ئەوە شەهادەتەکەی لێ قەبووڵ ئەکرێ.

ماوەی پاكبوونەوەی فاسق لەگوناھ لەپاش تۆبەکردن، ساڵێکەو پێویستە لەوساڵەدا موعامەلەی وا بێ کە ئەوکەسانەی ئاگایان لە ئەحواڵیەتی باوەڕیان وابێ کەوا ئەوکەسە لەو تۆبەکردنەیدا راست دەکا.

بزانن! بۆ تۆبە کردن لە هەر گوناهێ کە بە کردار بێ یا بە گوفتار، پێویستە دەست بەردار ببێ لەو گوناهەو پەشیمان ببێتەوە لەوەی کردوویەتی یا وتوویەتی و نیازیشی وابێ تا ماوە نەیکاتەوە وە ئەگەر گوناهەکەی بە قسە بوو، ئەبێ بە قسە ـمەسەلا ـبڵێت: ئەو «قَذف»ەی کردوومە بەتاڵو درۆ بوو وە بە دڵ لێی پەشیمانمو ناگەڕێمەوە سەری، وەکوو ئەوەکە لە تەوبە لە پاشگەز بوونەوەدا، پێویستە بە زمان بڵێ: «أشهدُ أن لاَّ إلهَ إلاَّ اللّه وأشهدُ أنَّ محمَّداً رَّسولُ اللّه» و من بەریم لە هەر ئایینێ کە پێچەوانەی ئایینی ئیسلام بێ، ئەمە بۆ گوناهێ کە بە گوفتار بووبێ.

وە ئەگەر گوناهەکەی بەکردار بوو، ئەوە وتن پێویست نییە، بەڵکوو ئەوەندە بەسە کە دەسبەردار ببێ لەو گوناهەو پەشیمان ببێتەوەو نیازی نەکردنی ئـەو گـوناهە بکـا لە پاشەڕۆژدا، هەر لەبەرئەوە کە گوناهە نەك لەبەرئەوە کە زیانی هەیە بۆ گیانی یا بۆ ماڵی؛ بەڵێ، ئەگەر لەبەرئەوە کە گوناهەو زیانیشی هەیە بۆ لەشی پـەشیمان بـبێتـەوە، هـەر دروستە.

وە ئەگەر کابرا حەقێکی ئادەمیزادی لەسەر بوو، ئەبێ لەو حەقە خۆی رزگار بکا، خواهبەوەکە حەقەکە بداتەوە بە خاوەنحەق، یاخود خاوەنحەقەکە گەردنی ئازاد بکا. ئەگەر کابرا داوای حەقەکەی ئەکردو ئەم شەخسە ماڵی نەبوو، واجبە کاسبی بکا تا ئەو حەقە ئەداتەوە وە ئەگەر خاوەن حەقەکە مردبوو، بیداتەوە بە میراتگرەکانی بەگوێرەی میراتبردنیان وە ئەگەر میراتگری نەبوو، یا دیار نەبوون، حـەقەکـە بـدا بـە قـازی

هەڵی‌بگریّ تا خاوەن حەق پەیدا ئەبیّ؛ ئەگەر قازی نەبوو، یاخود وەری‌نەگرت، یاخود ستەمی تیّدا ئەکرد، ئەوە ئەم کەسە خۆی ئەتوانیّ سەرفی بکا لە مەسڵەحەتی موسوڵمانانا بەنیازی ئەوە ئەگەر خاوەن حەقەکەیش پەیدا بووەوە، بۆی ببژیّریّتەوە وە ئەگەر کابرای بیّ‌ماڵ هیّزی کاسبی نەبوو، یا ئەوەندەی دەست ئەکەوت لە مەسرەفی رۆژانەدا سەرفی بکا، ئەوە واجبە نیازی وابیّ هەرکاتیّ دەستی رۆیشت، ئەو حەقە بداتەوە؛ جا ئەگەر لەپیّش دانەوەی حەقەکەدا مرد، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا ئازادە، بەو شەرتە کە وەختی خۆی ئەو حەقەی زەوت نەکردبیّ یا بۆ کردەوەی حەرام قەرزی نەکردبیّ، ئەگینا ئەکەویّتە مەیدانی رەحمەتی خواوەو مەیدانی رەحمەتی خوایش گوشادە.

ئەگەر گوناهی کابرای تۆبەکار ئەوەبوو کە غەیبەتی کەسیّکی کردبوو وە غەیبەتەکەیش گەیشتبووەوە بەکابرا، پیّویستە داوای گەردن ئازادیی لیّ‌بکا، ئیتر واجب نییە بەیانی جۆری غەیبەتەکە بکا وە ئەگەر کابرا مردبوو، یا نەیتوانی پیّی بڵیّ غەیبەتی کردووە، ئەوە پیّویستە داوای لیّ‌خۆش بوون (إستِغْفار) بکا بۆ ئەو کەسەو لە خوا بپاریّتەوە کە خوا لە گوناهی خۆش بیّ وە ریوایەتیّك هەیە لەسەرئەوە کە: هەر کەسیّ هەموو رۆژیّ بیست‌و پیّنج جار بڵیّ: «اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي وِلِـوٰالِـديَّ و لِلمؤمنينَ و لِلْمُؤْمِنٰاتِ»، ئەوە ئەبیّ بە کەفارەتی ئەو غەیبەتانەی کە کردوویەتی وە ئەگەر غەیبەتەکە نەگەیشتبووەوە بەکابرا، ئەوە ئەوەندە بەسەکە داوای لیّ‌خۆش بوونی بۆ بکا لە خوا؛ هەروەها، «أَسْتَغْفِرُ اللّٰه» کردن بەسە بەرابەر بەو حەسوودییەی کە بە خەڵکی بردووە.

هەرکەسیش زینای کردبیّ، یا گوناهیّك کە حەقی خودا بیّ، وەکوو ئارەق خواردنەوە، سونەتە بیشاریّتەوەو لای خەڵك باسی نەکاو هەر ئەوەندە پیّویستە کە تۆبەی لیّ بکا ـ وەکوو بەیانمان کرد ـ وە ئەگەر پیّشی لیّنابوو، سونەتە لیّی پەشیمان ببیّتەوە، بەڵام ئەگەر گوناهەکە «قَذف» کردنی موسوڵمانیّکی پاك بوو، یا کوشتنی کەسیّك، یا برینی ئەندامیّکی بوو، واجبە پیّی لیّ‌بنیّ بۆ ئەوە کە ئەو حەقەی لیّ

وەربگیرێو تۆبەیش واجبە ـوەکوو باسمان کرد ـ وە لە هەموو تۆبـەیەکـدا شـەرتە کابرای تۆبەکەر نەگەیشتبێ بەحاڵی «غَرْغَرْه» (سەرەمەرگ)، ئەگینا تۆبەکەی قەبووڵ نابێ.

## باسی ژمارەی شاهید لە شەهادەت‌دانا

حوکم ناکرێ بە شەهادەتی یەك پیاو، تەنها لە شەهادەتدا نەبێ لەسەر چاوپێ کەوتنی مانگی نوێی رەمەزان و لە شتێکدا کە تابیعی ئەمە بـێ، وەکـوو پـەلەکـردن لە دانـی سەرفیترەدا لە یەکەم رۆژی رەمەزانداو هاتنی مانگی «شوّال»و کردنی نوێژی «تەراويح».

بە شەرت گیراوە بۆ ئیسپاتی زیناو «لِواط»و چوونە لای حەیوان، چوار پیاو کە بە جارێ هەموو چاویان کەوتبێ بە زەکەری کابرا لە فەرجی ئافرەتەکەدا ـمەسەلا ـ وە پێویستە ئەو شاهیدانە ئەو کردەوەیە رۆشن بکەنەوە؛ مەسەلا، بڵێن: چاومان لێیەوە بوو لە حاڵی تەکلیفو ئیختیاردا هینی خۆی کرد بە هینی ئافرەتەکەدا بە حەرامی، بەڵام پێویست نییە باسی کاتو شوێنی ئەوکردەوەیە، مەگەر یەکێ لە شاهیدەکان لە خۆیەوە باسی کردبێ، ئەوە لەوکاتەدا پێویستە لەسەر قازی پرسیاری کـاتو جـێگـا بکـا لە شاهیدەکانی‌تر بۆ ئەوە بەڵکوو خیلاف بکەوێتە بەینی قسەی شاهیدەکانو ببێ بەهۆی شوبهە بۆ دەفعی حەددی زینا لە کابراو دانەدواوەی شەهادەتەکان.

شەهادەتی ئەم چوار پیاوە بۆ مەسەلەی زینا پێویستە؛ بەڵام بۆ کەوتنی «حَصانَت» (پارێزراوی)ی کابرا یا نەمانی عەداڵەتی یا کەوتنی تەڵاقێ کە بەسرابێ بە زیناوە، دوو پیاو کافییە شەهادەت بدەن وە لەم‌کاتەدا بۆ ئەوە کە حەددی «قَذف» نـەدرێ لەم دوو شاهیدە، پێویستە لەپێش شەهادەتەکەدا بڵێن: ئێمە شەهادەت ئەدەین لەسەر زینای ئەو کابرا بۆ ئەوە حەسانەتی یا عەداڵەتی نەمێنێ یا ژنەکەی تەڵاقی بکەوێ، نەك بۆ ئەوە کە حەددی زینای بکەوێتە سەر، ئەوجا شەهادەتەکەیان بدەن.

شەرتە بۆ ئیسپات کردنی سەرەتای زینا، وەکوو باوەش پیاکردنو ماچ کردن وە بۆ ئیسپاتکردنی چوونەلای بە شوبهە کە مەبەست ئیسپاتکردنی نەسەبی مناڵەکـە بـێ، شەهادەتی دوو پیاو؛ بەڵێ، لە ئیسپاتی چوونەلای بەشوبهەدا بۆ مـەبەستی ئـیسپات

کردنی «مَهرُ المثل»ی ژنەکە، بە شەهادەتی پیاوێك‌و دوو ژن قەناعەت ئەکریٚ، هەروەها بە شەهادەتی پیاوێك لەگەڵ سوێندی «مدّعي»دا قەناعەت ئەکریٚ وە لە شەهادەت بە وەتئی شوبهەدا پێویست نییە بڵێن: چاومان کەوت بە سەری زەکەری کابراکە کردی بە فەرجی ژنەکەدا. شەرتە بۆ شەهادەت لەسەر ئیقرار بە زینا، دوو پیاو شەهادەت بدەن. شەرتە بۆ ئیسپاتی ماڵ، عەین بیٚ یا قەرز وە بۆ ئیسپاتی هەرشتیٚ کە مەبەست لەودا ماڵ بیٚ لە فرۆشتن‌و حەواڵەو زەمانەت‌و سولْح‌و رەهن‌و شوفعەو موسابەقەو عیوەزی خولع، ئەگەر مێردەکە یا میراتگری ئەو داوای بکەن وە بۆ ئیسپاتی حەقی ماڵی وەکوو «خِیار» لە موعامەلاتدا و لە وەعدەی دانەوەی حەقدا، شەهادەتی دوو پیاو، یا پیاوێك‌و دوو ژن؛ بەڵیٚ، بۆ ئیسپاتی عەقدی شەراکەت‌و «قِراض» (قازانج بە شەراکەت)و کەفالەتی شەخس، پێویستە بە شەهادەتی دوو پیاو؛ هەروەها، بۆ ئیسپاتی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح، دوو پیاو پێویستە.

بۆ غەیری ئەمانە، لەو شتانە کە ماڵ نەبن‌و مەبەستیش ئیسپات کردنی ماڵ نەبیٚ، وەکوو سزایەك کە حەقی خودا بیٚ، وەکوو حەدی عەرەق خواردنەوەو دزی‌و جەردەیی‌و سزای ئادەمی، وەکوو قیساس و حەدی «قَذف»و مەنعی میرات وەرگرتن؛ مەسەلا، میراتگرەکان ئیددیعای ئەوە بکەن کە برامردووەکەیان لە ژیانی خۆیا ژنەکەی بە تەڵاقی «بائِن» تەڵاق داوە بۆ ئەوە کە میرات وەرنەگریٚ وە لە هەر شتێکی ترا کە زیاتر هەر پیاو ئاگای لیٚ بیٚ، وەکوو نیکاح‌و تەڵاقی «مُعلَّق» یا «مُنجَّز»و گێڕانەوە (رِجعە)ی ژن‌و موسوڵمان بوون‌و پاشگەز بوونەوەو «جَرح»و «تَعدیل»ی شاهیدو مردنی کەسێك‌و ئیسپاتی لاتی‌و «وەدیعە»و «وِصایە»و شەهادەت لەسەر شەهادەت وە بۆ ئیسپاتی تەڵاق، هەرچەند بە عیوەزیش بیٚ، ئەگەر ژنەکە ئیددیعای بکا بۆ ئەوە مەجالی ئەوەی ببیٚ کە شوو بکا، بۆ ئەمانەو وێنەی ئەمانە، پێویستە دوو پیاو شەهادەت بدەن، ئیتر بە یەك پیاوو دوو ژن سابت نابن، «مَعَ العِلم»، پێویستە بۆ شەهادەت لەسەر ئیسپاتی نیکاح، ئەو شاهیدانە بەیانی تەئریخی رێك‌وپێکی ئەو نیکاحە بکەن ؛ مەسەلا، بڵێن: سەعاتیٚ لە پێش‌نوێژی جومعەی رۆژی یەکەمی فلان مانگدا عەقدەکە

کرا، یا پێش عەسر یا پاش مەغریب، ئیتر بەس نییە هەر بڵێن: لە رۆژی جومعەدا عەقدەکە کرا بە بێ‌ئەوە زەبتی وەختی عەقدەکە بکەن، لەبەرئەوە بۆ ئیسپات کردنی راستی نەسەبی مناڵ لەو نیکاحەدا، لەحزە ئەژمێررێ.

هەر شتێ کە بە تەنها لە ژنەوە ئەزانرێ، یا زیاتر وایە ئەوان ئەیزانن‌و پیاو نایزانێ، وەکوو کچێتی‌و بیوەژنی‌و پارچە گۆشت‌و پارچە ئێسقانی ناو فەرجی ژن‌و حەیز پیاداهاتن‌و منال بوون‌و شیر پێدان‌و عەیبی ژێر جل‌و بەرگ، وەکوو بەڵەکی‌و گەڕی، ئەمانە هەموو ئیسپات ئەبن بە چوار ژن‌و بە دوو پیاو وە بە پیاوێك‌و دوو ژن، ئیتر بە پیاوێك‌و سوێندێك ئیسپات نابن.

تێکڕا هەرچی بە پیاوێك‌و دوو ژن ئیسپات نەبێ، بە شاهیدێك‌و سوێندێك ئیسپات نابێ وە هەرچی بە پیاوێك‌و دوو ژن ئیسپات ببێ، بە شەهادەتی پیاوێك‌و سوێندێکیش ئیسپات ئەبێ تەنها عەیبی ژنانە نەبێ، ئەوە بە پیاوێك‌و سوێندێك ئیسپات نابێ‌و پێویستە بە دوو پیاو، یا چوار ژن، یا پیاوێك‌و دوو ژن وە هیچ شتێ بە شەهادەتی دوو ژن‌و سوێندێك ئیسپات نابێ وە هەر شتێ کە بە شاهیدێك‌و سوێندێك ئیسپات ببێ، پێویستە لەپێشا شاهیدەکە شەهادەت بداو «تَعدیل»ی بکرێ، ئەمجار کابرای «مدّعي» سوێند بخواو لە سوێندەکەیدا، وەکوو بەیانی ئیستیحقاقی خۆی ئەکا، بەیانی راستی شاهیدەکەیشی بکا.

وە ئەگەر لەپاش شەهادەتی شاهیدەکە کابرا سوێندی نەخواردو داوای لە «مدّعی علیه» کرد کە سوێند بخوات، ئەوە حەقی هەیە؛ جا ئەگەر «مدّعی علیه» سوێندی خوارد، ئەوە حەقی «مدّعي» ئەکەوێ وە ئەگەر ئەو سوێندی نەخواردو گەڕاندیەوە بۆ سەر «مدّعي»، ئەوە حەقی هەیە؛ جا لەم‌کاتەدا ئەگەر «مدّعي» هەر سوێندی نەخوارد، ئەوە حەقەکەی ئەکەوێ.

وە ئەگەر چەند میرات‌گرێك لەپاش ئیسپاتی مردنی باوکیان ـ مەسەلا ـ و پاش ئیسپاتی وەراسەتیان‌و حەسرکردنی میرات‌گر لە خۆیانا ئیددیعای ماڵێکیان کرد بۆ باوکیان‌و شاهیدێکیان رابووراندو یەکێکیان، لەگەڵ شاهیدەکەدا سوێندی خوارد کە

باوکی موستەحەقی هەموو ئەو ماڵە بووە، ئەوە هەر بەشی خۆی بۆ سابت ئەبێ، چونکە «حُجَّت» هەر بۆ خۆی تەواو بووە وە لە و بەشەداکە ئەو دەیبا میراتگرەکانی تر نابن بە هاوبەشی، بەڵکوو هەرکەسێ ئەتوانێ سوێندی خۆی بخواو بەشی خۆی وەربگرێ وە هەریەکێکیان نکوول بکا لە سوێند خواردن لەپاش حازربوون، ئەوە حەقی ئەکەوێ.

وە ئەگەر میراتگرەکە منداڵ بوو، یاخود شێت بوو، یا دیار نەبوو، ئەوە بەشەکەی وەرناگیرێت، بەڵکوو چاوەڕوانی ئەکرێت؛ جا ئەگەر لەپاش باڵغبوونی منداڵەکە، یا چاکبوونەوەی شێتەکە، یا دەرکەوتنی نادیارەکە، سوێندی خوارد، ئەوە حەقی خۆی ئەبا وە لەم کاتەدا پێویست نییە بەوەکە شەهادەتی شاهیدەکە دووبارە بکرێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو شاهیدە حاڵی گۆڕا؛ مەسەلا، لەپاش عەداڵەت فیسقی بەسەردا هات، ئەوە باقیماوەی ئەو میراتگرانە کە زوو سوێندیان نەخواردووە، حەقیان نامێنێو حەقیان ئەکەوێ، ئەگەر شاهیدی تر پەیدا نەکا، چونکە حوکم بە ماڵەکە نەبەسراوە بە شەهادەتی کابراوە و پێویست بووە بە سوێند وە مادام کە پێش سوێندی کابرا حاڵی شاهیدەکە گۆڕاوە، ئەوە وای لێ دێ کە شاهیدی نەبووبێ.

جا ئەگەر شەهادەت لەسەر کردەوە بێ وەکوو زەوتکردنو شیر پێدانو فەوتاندنو جینایەت لەسەر نەفسو ماڵ بوون، ئەوە پێویستە لە شەهادەتەکەیدا وەختی خۆی چاوی لەو شتەوە بووبێو ئێستەیش بەیانی چاوپێکەوتنی بکا و ئەم جۆرە شەهادەتە لە ئینسانی کەڕ وەرئەگیرێ وە هەرچی بە وتن بێ، وەکوو عەقدو هەڵوەشاندنەوەو پێ‌لێنان، پێویستە ئەو شاهیدە وەختی خۆی ئەو قسەیەی گوێ لێ بووبێو کابرای خاوەنقسەی بەچاو بینیبێو ئێستەیش بەیانی بیستنی خۆی بکا، ئەم جۆرە شەهادەتە پێویستی بەوەیە کابرا چاوی بێ؛

ئەم شەهادەتە لە کوێر نابیسرێ، هەروەها لە کەسێك کە کابرای دیبێ، بەڵام باش جیای نەکردبێتەوە، مەگەر شەهادەتەکەی لەسەر بنچینەی ناوبانگو بڵاوی بێ، یاخود خاوەن قسەکە ئەو قسەیە بخوێنێ بەگوێیداو ئەم شاهیدەیش کابرا بگرێ تا ئەیباتە لای قازیو شەهادەتی لەسەر ئەدا.

وە ئەگەر کەسێ بە چاوساغی شەهادەتێکی هەڵگرتو لەپاشان کوێر بوو، ئەوە ئەتوانێ بە کوێری شەهادەتەکە بدا، بەو شەرتە کابرای شەهادەت لەسەر دراوو شەهادەت بۆ دراو ناو نەسەبیان مەشهوور بێ.

هەر کەس قسەیەکی بیستبێ، یا کردەوەیەکی دیبێ، ئەگەر هەمان کابراو ناوو نەسەبی زانی، ئەوە لە حوزووریا ئەتوانێ شەهادەت بدا بە ئیشارە بۆ هەمان کابرا وە لەکاتی دیارنەبوونیا، یا لەپاش مردنو شاردنەوەی، بە ناوو نەسەب شەهادەتی لەسەربدا؛ بەڵێ، لەپێش شاردنەوەیدا ئەتوانێ شەهادەت لەسەر عەینەکەی بدا وە لە سوورەتی شەهادەت بە ناوو نەسەبدا، پێویستە ئەو ناوو نەسەبە بە شاهید سابت ببن و بە ئیقراری کابرای شەهادەت لەسەردراو سابت نابێ، چونکە شەهادەت حەقی خوای تیایەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەیە.

دروست نییە شەهادەت لەسەر ژنێ کە چارشێوو پەچەی دادابێتەوە بە پشت بەستن بە دەنگی، چونکە دەنگ لە دەنگ ئەچێو مەیدانی لێ گۆڕانە؛ بەڵێ، ئەگەر بە عەین ئەو ژنە بناسێ یا بە ناوو نەسەبی بیناسێ، ئەوە باشە وە لەکاتی شەهادەتدا هەرچی ئەزانێ لەناوو نەسەبی بەیانی بکات، ئەگینا ئیشارە بکا بۆ عەینەکەی وە ئەگەر ناوو نەسەبی نەزانی، رووی ژنەکە هەڵماڵێو نیشانەکانی وەربگرێو بەیانی بکا.

دروست نییە هەڵگرتنی شەهادەت لەسەر ئافرەتێك کە چارشێوو پەچەی دادابێتەوە بە ناساندنی پیاوێك یا دوو پیاوی عادڵ، چونکە شەهادەت بە یەك لە یەك بیستن، پێویستی بەوەیە بە قسەی کۆمەڵێکیوا بێ کە ئەمین بن لەوە رێ کەون لەسەر درۆ، بەڵام ئەمرۆ بەپێچەوانەی ئەمە ئیش ئەکرێ کە بریتییە لە ئیکتیفاکردن بە ناساندنی پیاوێك یا دوو پیاوی عادڵ.

ئەگەر شەهادەت درا لەسەر عەینی کەسێك بۆ حەقێكو «مدّعي» داوای کرد لە قازی کە نیشانەکانی کابرای شەهادەت لەسەر دراو بنووسێتەوە نەك ناوی خۆیو باوكو باپیری، ئەوە ئەبێ قازی بە گوێی بکا، مەگەر کابرا لەوانە بێ کە ناوو نەسەبی بە سوورەتی شەرعی سابت بووبێ.

## باسی شەهادەت لەسەر بیستن

دروستە بۆ ئینسان شەهادەت بدا لەسەر ئەساسی بیستن (تَسَامُع) بە نەسەبی یەکێ لە باوکی یا لە دایکی یا لە هۆزی یا لە شاری؛ مەسەلا، شەهادەت بدا بەوە کەوا: فڵانکەس کوڕی فڵان پیاو، یا فڵانە ژنە و لە فڵان هۆزەو خەڵکی فڵان شارە؛ مەسەلا، بۆ کاتێ کە خەڵکی ئەو شارە یا ئەفرادی ئەو هۆزە شتێکیان لەسەر وەقف کرابێ و بمانەوێ ئەو کابرایە بخرێتە ناو ئەهلی ئەو شارە یا ناو ئەو هۆزەوە. هەروەها دروستە شەهادەت بە بیستن لەسەر ئەسڵی وەقفێکی دامەزراو، وەکوو ئەوەکە بڵێت: فڵان موڵك وەقفە، بەڵام شەهادەت بە شەرتەکانو تەفسیلاتی وەقفەکە، ئەوە بە لەخەڵك بیستن سابت نابێ، ئەوەندە هەیە لە «تُحفە»دا ئەفەرموێت: ئەمە وەختێ وایە کە شەهادەت بەشەرتەکان سەربەخۆ بێ، بەڵام ئەگەر بە دوابەدوای شەهادەت بە ئەسڵی وەقفەکەوە بێ، ئەوە دروستە، وەکوو ئەوە کابرا شەهادەت بدا بەوە کە فڵان موڵك وەقفە لەسەر فەقێی شافیعی مەزهەب بەو شەرتە فڵانکەس سەرپەرشتیکەری ئەو وەقفە بێ تا ماوەو فەقێکانیش هەموو رۆژێکی خوێندنی دەرس، کتێبی «شَرحْ مَنْهَج» بخوێنن، مەسەلا.

هەروەها شەهادەت بە مارەبڕین بە بیستن دروستە؛ مەسەلا، بڵێن: فڵان پیاو فڵان ژنی مارەکردو فڵان، مێردی فڵانەو فڵانە ژن، ژنی فڵان پیاوە وە دروستە شەهادەت بە بیستن لەسەر موڵکایەتی؛ مەسەلا، بڵێن: فڵان خانوو، یا فڵان پارچە زەوی، موڵکی فڵانکەسە، بە بێ‌ئەوە کە ئیزافەی ئەو موڵکە بکرێ بۆ سەبەبی موڵکییەت، وەکوو ئەوە کە:کڕیویەتی لە فڵان، یا: فڵان پێی‌بەخشیوە، چونکە سەبەبی موڵیکەت بە بیستن سابت نابێ تەنها میرات نەبێ.

هەروەها دروستە بەهۆی بیستنەوە شەهادەت بدا بە ویلایەتی قازیو موستەحەقێتی زەکاتو شیرخواردنو «جَرحو تَعدیل»ی شاهیدو لاتیو روشدو سەفیهیو میرات بردنو زەوتکردن.

شەرتی بیستن، ئەوەیە ئەو شتە کەوا شەهادەتی پێ‌ئەدا، بیستبێتی لە کۆمەڵێکیواوە کە ئەمین بێ لەوە کە ئیتیفاقیان کردبێ لەسەر درۆ، ئیتر پێویست نییە ئەفرادی ئەم

کۆمەڵە نێرینەو عادڵ بن، بەڵام شەرتی دروستبوونی شەهادەت بە بیستن، ئەوەیە شتێکی بەهێزتر لەو بیستنە نەچێ بەگژی بیستنەکەدا، وەکوو ئەوە کە ئەو کەسە کە شەهادەت ئەدرێ بە نەسەبی لە شەخسێ، خۆی ئینکاری ئەو نەسەبە بکا یاخود هەندێ کەس تەعن بدەن لە نەسەبی ئەو کەسە، هەرچەند خاوەن فیسق بن.

"ابنُ اَبی‌الدم" بەشەرتی گرتووە کابرای شاهید بە ئاشکرا نەڵێ بەڵگەی شەهادەتەکەی بیستنە، هەروەها لە شەهادەت بە «استصحاب»دا، وەکوو ئەوە کە شەهادەت بدا بە فەقیریی کەسێك لەسەر ئەساسی ئەوە کە لەمەوپێش فەقیر بووە وە لەپاشاندا ئەوەی هەڵبژاردووە: ئەگەر کابرای شاهید بەیانی «استِفاضە»و «استِصحاب»ەکە وەها بکا کە هێز بدا بە زانینەکەی؛ مەسەلا، لەپێشا شەهادەتەکەی بە جەزم بدا و لەپاشانیش بڵێت: سەنەدم ئەوەیە کە بیستوومە لە کۆمەڵێکی زۆر لە ئادەمیزاد، یا: سەنەدم «استِصحاب»ە، ئەوە ئەو شەهادەتە قەبووڵ ئەکرێ، بەڵام ئەگەر هەر بە دوودڵیو شکەوە ئەدای شەهادەتەکەی کرد، وەکوو ئەوە کە شاهیدەکە بڵێت: من خۆم ئاگادار نیم، بەڵام مادام خەڵك ئەڵێن، شەهادەت ئەدەم کە فڵان کوڕی فڵانە، یا بڵێت: مادام فڵانکەس دوێنێ لات بوو، شەهادەت ئەدەم کە ئیمڕۆیش لاتە، ئەوە ئەو شەهادەتە قەبووڵ ناکرێ.

وە ئەگەر شاهیدەکە شەهادەتەکەی ئەداکرد بێ قەیدو تەفسیلو دەرکەوت بۆ قازی کە سەنەدی کابرا بیستنە، ئەوە حەقی نییە مەجبووری بکا بە بەیانی سەنەدەکەی، مەگەر کابرا نەخوێندەوار بێ، ئەوە ئەوکاتە دروستە داوای سەنەدی لێ بکا، چونکە وائەبێ غەیری بیستنی شەرعی بە بیستن ئەزانێ.

سوورەتی شەهادەت بە بیستن، ئەمەیە کابرا بڵێت: شەهادەت ئەدەم ئەم شەخسە کوڕی فڵانە، یا: ئەم موڵکە وەقفی فڵان مزگەوتە، یا: ئەم ژنە ژنی فڵانکەسە وە نابێ لەفزەکەی وا بڵێ: ئەم منداڵە لە ژنی فڵانکەس لەدایك بووە، یا فڵانکەس ئەو ماڵەی وەقف کردووە، یا ئەو ژنەی مارەکرد، چونکە ئەم لەفزانە ئەوە ئەگەیەنن کە ئەم شاهیدە بە چاوی خۆی دیتراوەکەی دیوە یا بە گوێچکەی خۆی لەفزی کابرای بیستووەو لە واقیعیشدا وا نییە.

**بزانن!** دروست نییە شەهادەت لەسەر موڵکی ئەرزو ئاویێ یا دووکان یا خانوو یا شتێکی گوێزراوە (مەنقوول) نەقد بێ یا جینس، بە تەنها لەژێردەستا بوون (مَـحض اليَد)، چونکە دەستی رووت نـابێ بـە هـۆی مـالیکییەت؛ هـەروەها، دروست نـییە شەهادەت بە موڵك بەهۆی دەستو تەسەڕوفەوە لە ماوەیەکی کەمدا، چونکە قابیلە ئەم خاوەن دەستو تەسەڕوفە وەکیلی خاوەن موڵکەکە بووبێ؛ بەڵێ، دروستە لە سوورەتی یەکەمدا شەهادەت بەوەکە ئەو ماڵە لە دەستی ئەم پیاوەدا بووە وە لە سوورەتی دووهەما بەوەکە لە دەستو تەسەڕوفیا بووە.

بەڵام دروستە شەهادەت بە موڵك بەهۆی دەستو تەسەڕوفەوە لە زەمانێکی درێژدا بە عورف بە بێ هەراو نیزاع، بەو شەرتە تەسەڕوفەکە بە ئاشکرا سوودی بۆ موڵکەکە بێ، وەکوو دەست دان لە خانوو و رووخاندنی هەندێ سووچیو کردنەوەو لێ زیاد کردنو گۆڕینی دارو کۆڵەکەیو هەڵگێڕانەوەی بانەکەیو بەکـرێدانـیو دانـانی لە رەهندا؛ کە ئەم جۆرە تەسەڕوفانەی چاو پێ کەوت لە زەمانێکا کە بە عورف درێژ بێ، ئەتوانێ شەهادەت بدا کە ئەو خانووە موڵکی فلانکەسە.

وە دروستە شەهادەت بە حەق، وەکوو حەقی ئاوداپەڕاندن بۆ سەربانی کەسێكو رابوردن بە دالانی ماڵی کەسێکا بۆ سەربانو بۆ دەرگای خانووی لەسەرەوەو حەقی ئاو راکێشان لە خاکی یەکێکەوە بۆ باخی خۆیو حەقی هاتوچۆ بەناو باخی کەسێکا هەتا ئەگاتە باخەکەی خۆیو حەقی ئاودانی باخی خۆی لە ئاوێ کـە لە بـاخو مـوڵکـی یەکێکی ترا دەرچێ، وەکوو ئەو کانیاوانە کە لەناو هەندە باخێکا هەنو ئاوەکەیان بـە جۆگە ئەبرێ بۆ چەند باخێکی غەیری باخی خاوەن ئـاوەکـە؛ بـەهۆی ئـەوەوە کـە زەمانێکی بە عورفو عادەت زۆر، کابرا چاوی پێکەوتبێ ئەم کەسە ئەو حـەقانەی وەرگرتووە، چونکە ئەسڵ لە تەسەڕوفی موسوڵماندا ئەوەیە بە حـەق بـێ و کـابرای خاوەن بان یا خاوەن باخوکانی، ناتوانێ مەنعی ئەم شەخسە بکا لەو حەقە؛ بەڵێ، ئەگەر ئیدیعای ئەوەیکرد کە ئەم کابرایە بە زۆر ئەم حەقەی داگیر کردووەو ئیسپاتی کرد، ئەتوانێ مەنعی بکا.

بێدار بن! لە مەسئەلەی کانیی ناوباخەکەدا، بەپێی شەرع، ئەوکانییە لە بنچینەدا بە موڵکی خاوەنزەوییەکە دائەنرێ کە کانییەکەی تیایەو ئێمە قسەمان لەوە نییە ئەو کانییە موڵکی کابرا نییە، بەڵکوو قسەمان لەوەیە مادام کەسێك چەند ساڵێك لەو کانییەوە ئاوی راکێشابێ بۆ خۆی، ئێمە بەهۆی ئەو تەسەڕوفە درێژەوە ئەڵێین: ئەم کەسە حەقی ئاو راکێشانی هەیە، چونکە لەوانەیە وەختی خۆی ئەو حەقی ئیجرایەی پێ بە خشرابێ یا بە کڕین کڕیبێتی وە یا بە رێگەیەکیتری شەرعی دامەزرابێ وە ئەم کابرایە هەر ئەوەندە بڵێت: من ئەوەندە ئەزانم چەند ساڵە ئەم ئاوە لەو باخەوە ئەهێنین بۆ باخی خۆمان بێ هەرا، ئەوە ئیتر لێی مەنع ناکرێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئیددیعای سەندن یا بەخشینی کردو بۆی سابت نەبوو، ئەوە کابرای خاوەن کانی ئەتوانێ سوێند لەسەر خیلافی دەعوای کابرا بخواو مەنعی بکا.

شەهادەت بە لاتیی کەسێك دروستە بە گوێرەی ئەو بەڵگانەی کە هۆی فەقیرین، وەکوو رووتیو بێگوزەرانی خێزانو داوا کردنی قەرز لەلایان خاوەن قەرزەوە بەجۆرێ کە ئینسان باوەڕی بێتە سەر ئەوە کە ئەو کەسە هەژارو لاتە، هەروەها بە «استِصحاب»، واتە بەهۆی ئەوەوە کە بزانێ دوێنێ لاتو هەژار بووە.

## باسی هەڵگرتنی شەهادەت

هەڵگرتنی شەهادەت، فەرزی کیفایەیە لە نیکاحو پێلێنانو تەسەڕوفاتی ماڵیو غەیرە ماڵیدا، وەکوو فرۆشتنو رەهنو بەکرێدانو مارەبڕینو تەڵاقدانو گێڕانەوەو لە غەیری ئەمانەیشدا؛ بەڵێ، هەڵگرتنی شەهادەت لەو شتانەدا کە ئەبن بە هۆی «حەد»، وەکوو زیناو قەزفو دزیو جەردەیی، فەرز نییە، بەڵکوو دروستەو سوننەتە ئەگەر ببێ بەهۆی مەنع کردنی موسوڵمانان لە زیان لێکەوتنیانو ببێ بە هۆی ئەوە کە خەڵك تووشی ئەم گوناهانە نەبن.

هەروەها، نووسینی سەنەد فەرزی کیفایەیە لە شوێنێکدا پێویست بێ بەتایبەتی لە ماڵی هەتیوو ماڵی مەوقووفەداو لە سەفەرو شوێنی غەریبیدا و لە کاتی نەخۆشی خاوەن موعامەلەکاندا.

جا ئەگەر لە مەسەلەیەکدا دووکەس شاهید بوون، ئەوە فەرزی عەینە لەسەریان ئەدای شەهادەت بکەن وە ئەگەر یەکێکیان شەهادەتی داو ئەوی تریان شەهادەتی نەداو وتی بە «مدّعي»یەکە: بڕۆ سوێند بخۆ لەگەڵ ئەو شاهیدەدا، ئەوە گوناهبار ئەبێ وە ئەگەر شاهید زۆر بوون، ئەوە ئەدای شەهادەت لەسەر دوانیان فەرزی کیفایەیە وەکوو هەڵگرتنەکەی؛ کەواتە، ئەگەر داوا کرا لە دووکەسیان بێن ئەدای شەهادەت بکەن، ئەوە واجبە لەسەریان ئەدای بکەن ـ لەسەر فەرموودەی راستتر ـ وە ئەگەر هەر تاقە شاهیدێك هەبوو و داوای شەهادەتی لێ کرا، ئەوە واجبە لەسەری شەهادەت بدا، بەو شەرتە مەسەلەکە لەوانە بێ بە شاهیدێك و سوێندێك ئیسپات ببێ، ئەگینا واجب نییە.

ئەدای شەهادەت، چەند شەرتی هەیە؛ یەکەم، ئەمەیە کابرای شاهید بانگ بکرێ بۆ ئەدای شەهادەت لە مەسافەیەکەوە کە لە مەسافەی نیوەڕۆژەڕێ (عَدوی) زیاتر نەبێ؛ ئەگەر لە مەسافەیەکەوە بانگ کرا کە لە مەسافەی نیوڕۆژەڕێ زیاتر بوو، واجب نییە لەسەری بڕوا لەبەرئەوەکە ڕۆیشتنەکەی زەحمەتەو قابیلیشە شاهید لەسەر شەهادەتەکەی رابووڕێنێ و ئەم شاهیدە فەرعە بڕوا شەهادەت بدا.

دووەهەم، ئەوەیە کابرا لەوانە بێ کە شەهادەتی قەبووڵ بێ، ئەگینا ئەگەر فاسق بوو، یا مانیعێکی تێدا بوو، واجب نییە بڕوا، مەگەر قازی لەوانەبێ کە شەهادەتی فاسق وەربگرێ.

سێهەم، ئەوەیە شەهادەتەکەی لەسەر شتێ بێ کە قازی متمانەی پێ هەبێ هەرچەند ئەم شاهیدە خۆی باوەڕی پێ نەبێ، وەکوو ئەوە کە کەسێکی شافیعی مەزهەب بڕوا شەهادەت بدا لای قازییەکی حەنەفیمەزهەب لەسەر شوفعەی دراوسێیەتی (شُفعةُ الجِوار).

چوارەم، ئەمەیە مەعزوور نەبێ بە شتێ کە ببێ بە بیانووی واز لێهێنانی نوێژی جومعە، ئەگینا واجبە یا شاهید لەسەر شەهادەتەکەی بگرێت وە یا قازی یەکێ بنێرێ کە شەهادەتەکەی لێ ببیسێ.

## باسی شەهادەت لەسەر شەهادەت

شەهادەت لەسەر شەهادەت قەبووڵ ئەکرێ لە غەیری سزایەکداکە حەقی خودا بێ، وەکوو حەدی زیناو شەراب خواردنەوەو ژنداری (إحصان)ی ئەوکەسەی کە زیناکردنی

سابت بووە وە هەر شتێ کە پاراستن (احصان)ی لەسەر راوەستابێ، خواه ئەو شتە سزای ئادەمی بێ، وەکوو قیساسی نەفس‌و ئەندامانی لەش‌و هێزو حەدی قەزف، یا غەیری سزا بێ، وەکوو حوقووقی ئادەمیزاد لە چەشنی پێ‌لێنان‌و عەقدو هەڵوەشاندنەوەو شیرپێدان‌و منداڵ بوون‌و عەیبی ژنانە، یا حوقووقی خودا، وەکوو زەکات‌و وەقفی مزگەوت‌و جیهەتی گشتی‌و مانگی یەك‌شەوەی رەمەزان بۆ رۆژوو و مانگی یەك شەوەی قوربان بۆ حەج کردن‌و غەیری ئەمانە.

هەڵگرتنی شەهادەت لەسەر شەهادەت، بە سێ جۆر ئەبێ؛

یەکەم، «اِستِرعاء»، یەعنی شاهیدە ئەسڵییەکە داوا بکا لە کەسێك کە چاودێریی شەهادەتەکەی بکاو رای بگرێ تا لە وەختی خۆیدا ئەدای ئەکا؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم شەخسە ئاگای لێ‌بوو کە ئەسڵەکە ئیستیرعای کەسێکی کرد، ئەوە دروستە بۆ ئەم‌کەسە ئەو شەهادەتە هەڵ‌بگرێ؛ سیغەی ئیستیرعا، وەکوو ئەوە ئەسڵەکە بڵێت: من شاهیدم لەسەر فڵان رووداوو تۆ ئەکەم بە شاهید لەسەری لەجیاتی خۆم، یا بڵێت: شەهادەت بدە لەسەر شەهادەتی من، یا بڵێت: هەرکاتێ داوای شەهادەتیان لێ‌کردی، ئیزنت بێ شەهادەت بدە لەسەر شەهادەتی من.

دووەم، ئەوەیە ئەم فەرعەگوێی لێ بێ کە ئەسڵەکە شەهادەت ئەدا لای قازی یا لای «مُحکّم» یا لای وەزیرێ یا لای میرێ، چونکە ئەوکابرا شەهادەت نادا لەو شوێنانەدا مەگەر لەکاتێکا جەزمی بە شەهادەتەکەی هەبێ؛ کەوابێ، دروستە ئەو شەهادەتە هەڵبگرێ.

سێهەم، ئەوەیە ئەم فەرعە گوێی لێ بێ ئەسڵەکە شەهادەت ئەدا لەسەر شتێ‌و سەبەبەکەیشی بەیان ئەکا؛ مەسەلا، ئەڵێت: شەهادەت ئەدەم فڵان‌کەس هەزار درەمی لەسەر فڵان هەیە لە قیمەتی ئەو دووکانەداکە پێی‌فرۆشتووە؛ لەم سوورەتەدا دروستە بۆ ئەوکەسەی ئاگای لەو شەهادەتە هەیە ئەدای شەهادەتەکە بکا، چونکە ئیسنادی ئەو شەهادەتە بۆ لای سەبەبەکەی، مانیعە لە ئیحتیمالی تەساهولی کابرای شاهید وە لەم قیسمی دواییەدا، وەجهێك هەیە ئەڵێ: پێویستە شاهیدە ئەسڵەکە ئیزنی فەرعەکە بدا ئەدای شەهادەت بکا لە جیاتی ئەو.

کافی نییە بۆ شەهادەتی فەرعەکە ئەمە کە گوێی لە یەکێ بێ بڵێت: فڵان، ئەوەندە حەقی لەسەر فڵانکەس هەیە، یا بە شێوەی خەبەردان بڵێت: شەهادەت ئەدەم فڵان دە درەمی لەسەر فڵان هەیە، یا بڵێ: شەهادەتێکی وەهام لەلایە.

پێویستە لەوکاتەدا کە فەرعەکە شەهادەت ئەدا، جیهەتی هەڵگرتنی ئەو شەهادەتە بەیان بکا لە هەرکام لە سێبەشە پێشووەکە بێ؛ مەسەلا، بڵێت فڵانکەس ئیستیرعای کردووم بۆ ئەم شەهادەتە، یاخود بڵێ: گوێم لێبوو کە لای قازی شەهادەتەکەی ئەدا، یا: فڵانە شەهادەتی ئەداو سەبەبی شەهادەتەکەیشی بەیان کرد، بۆ ئەوەی قازی لە جیهەتی شەهادەتی ئەم فەرعە حاڵی ببێ وە ئەگەر جیهەتی هەڵگرتنی شەهادەتەکەی بەیان نەکرد بەڵام قازی باوەڕی هەبوو بە زانینی ئەم فەرعە، ئەوە بەسە.

**بزانن!** دروست نییە هەڵگرتنی شەهادەت لەسەر شەهادەتێ کە بدرێتە دواوە، وەکوو شەهادەتی فاسق وە دروست نییە بۆ ژن شەهادەتی غەیر هەڵبگرێ، چ پیاو بێو چ ژن بێ، چونکە ئەم شەهادەت لەسەر شەهادەتە لەوانەیە کە پیاو زیاتر ئاگای لێ بێ؛ کەواتە، پێویستە هەر پیاو ئەم شەهادەتە هەڵبگرێ وە ئەگەر فەرعەکە ئەدای شەهادەتی کرد لەکاتێکا کە ئەسڵەکە مردبوو یا نەخۆش بوو یا دیار نەبوو یا شێت بووبوو یا کوێر بووبوو یا لاڵ بووبوو، ئەوە دروستە و ئەم حاڵانە نابن بە مانیعی شەهادەتی فەرعەکە؛ بەڵێ، ئەگەر پاشگەزبوونەوە لە ئیسلامی بەسەردا هاتبوو یا فاسق بووبوو یا بووبوو بە دوژمنی کابرای شەهادەت لەسەردراو، ئەوە دروست نییە فەرعەکە ئەدای شەهادەت بکا، چونکە شەهادەتی ئەم فەرعە تابیعی دامەزرانی شەهادەتی ئەسڵەکەیەو ئەسڵەکەیش لەو سوورەتانەدا مانیعی لێ پەیدابووە.

وە ئەگەر کەسێك لەکاتی منداڵیدا یا لەکاتی فاسقیدا شەهادەتی لە ئەسڵەکە وەرگرتو لە کاتی باڵغبوونو عەداڵەتدا ئەدای کرد، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ.

ئەگەر دووکەس شەهادەت لە دووکەسەوە وەربگرنو ئەدای بکەن، ئەوە دروستە بەو شەرتە کە هەریەکێ لەم دووکەسە شەهادەتی هەردوو ئەسڵەکەی وەرگرتبێ و لە فەرموودەیەکدا، پێویستە بۆ هەڵگرتنی شەهادەتی هەر پیاوێك یا هەر ژنێك، دوو پیاو؛ کەواتە، هەڵگرتنی شەهادەتی دووکەس، پێویستی بە چوار کەسە.

بزانن! شەرتی قەبوولّی شەهادەتی فەرعەکان، ئەوەیەکە شەهادەتدانی ئەسڵەکان لەتوانادا نەبێ بەمڕەنگەکابرای ئەسڵ مردبێ یاخود شەهادەتدانی زەحمەت بێ، وەك ئەوەکە زیاتر لە مەسافەی نیورۆژ ڕێگە دوور بێ یاخود پیر بێ یا نەخۆش بێ یا عوزرێکیوای ببێ کە تەرکی جومعەی بۆ بکرێ.

پێویستە فەرعەکە لەکاتی شەهادەت دانا ناوی ئەسڵەکە ببا بۆ ئەوەکە قازی بیانناسێو شەخسی شەهادەت لەسەردراویش مەیدانی ئەوەی ببێ کە ڕەخنە لە شاهیدەکان بگرێ، ئیتر پێویست نییە ئەم فەرعانە تەزکیەی ئەسڵەکەیان بکەنو بڵێن: عادڵ بووە، ئەگەر تەزکیەشی بکەن قەیدی نییە.

وە ئەگەر شەهادەتیان داو ناوی ئەسڵەکەیان نەبرد، ئەوە بەتاڵە، چونکە ئەم وەزعە ئەبێ بەهۆی گرتنی دەرگای «جَرح»ی شاهیدو ئەمەیش دروست نییە.

ئەگەر فەرعەکان هاتن بۆ شەهادەتدانو لەپێش شەهادەتدانەکەدا ئەسڵەکە حازر بوو، ئەوە شەهادەتی فەرعەکە وەرناگیرێ، بەڵام ئەگەر شەهادەتیان داو لەپاش ئەوە ئەسڵەکە حازر بوو، ئەوە نابێ بە مانیعی شەهادەتی فەرعەکە.

## باسی پەشیمانبوونەوە لە شەهادەت

ئەگەر هەندێ لە شاهیدەکان یا هەموویان لەپێش ئەوەداکە قازی حوکمی خۆی بدا پەشیمان بوونەوە لە شەهادەتەکەیان، ئەوە ئیتر قابیل نییە قازی لەو مەسەلەیەدا حوکم بدا، هەروەها ئەگەر یەکێ لەو شتانەیان بەسەردا هات کە مانیعی شەهادەتدانە، وەکوو پاشگەز بوونەوە لە ئیسلامەتیو فاسقیو دوژمنایەتیو بوختانکردن.

وە ئەگەر لەپاش حوکمی قازی پەشیمان بوونەوەو لەپێش وەرگرتنی حوکمی ماڵیدا، ئەوە ئەو حەقە وەرئەگیرێ، بەڵام واجبە لەسەر ئەو شاهیدانە ئەو ماڵە بیژێرن بۆ کابرای شەهادەت لەسەردراو، هەروەها ئەگەر حوکمپێدراوەکە عەقد بێ یا حەل، وەکوو تەڵاق یا هەڵوەشاندنەوەی نیکاح وە ئەگەر لەپێش وەرگرتنی سزادا بوو، وەکوو قیساس و حەدی قەزفو ziناو خواردنەوە، ئەوە ئەو حەقانە وەرناگیرێن، چونکە پەشیمانبوونەوەی شاهیدەکان ئەبێ بەهۆی شوبهەو شوبهەیش مانیعی حەدە.

وە ئەگەر لەپاش وەرگرتنی عوقووبەت بوو، ئەوە حوکمەکە تێكناچێ، هەتا بۆ حاکمیش دروست نییە لەپاش دانی حوکمەکەی پەشیمان ببێتەوە، چونکە ئەگەر حوکمەکەی بە زاهیرو باتین جێبەجێ ئەبوو، ئەوە لەبەرئەوە کە بە زاهیر دروستە، تێکدانی دروست نییە. جا ئەگەر ئەوەی بەهۆی حوکمی قازییەوە وەرگیراوە قیساس بوو یا کوشتن بوو بەهۆی پاشگەز بوونەوەو یاخود رەجم بوو بەهۆی زیناوە یا جەلدەی زینا بوو و شاهیدەکانیش لەدوای پەشیمانی وتیان: وەختی خۆی بە عەمدی ئەم شەهادەتەمان داوە، ئەوە قیساسی ئینسانەمردووەکە ئەکەوێتە سەریان وە ئەگەر لە قیساسەکە عەفو کران، دییەیەکی قورس ئەکەوێتەسەریان.

وە ئەگەر قازی لە حوکمەکەی پەشیمان بووەوە لەپاش جێبەجێ کردنی حوکمەکەی‌و ئیقراری کرد بەوە کە بە عەمدی حوکمی داوە، ئەوە قیساسی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر لەگەڵ شاهیدەکاندا پەشیمان بووەوەو شاهیدەکانیش وتیان شەهادەتەکەی ئێمەیش عەمدی بووە، ئەوە قیساس ئەکەوێتە سەر هەموویان.

وە ئەگەر هەموویان وتیان: بە هەڵەدا چووین، ئەوە نیوە دییەیەکی سووك لەسەر قازییەو نیوە دییەیەك لەسەر شاهیدەکان وە ئەگەرکابرای تەزکیەکەر لەپاش جێبەجێ کردنی حوکمەکە پەشیمان بووەوەو وتی: تەزکیەناحەقەکەم عەمدی بووە، ئەوە قیساسی لەسەرە وە ئەگەر وتی: خەتا بووە، دییەی ئەکەوێتەسەر؛ هەروەها، ئەگەر وەلی بە تەنها پەشیمان بووەوە، ئەوە لە سوورەتی عەمددا قیساسی لەسەرەو لە سوورەتی خەتادا دییەی لەسەرە وە ئەگەر لەگەڵ شاهیدەکاندا پەشیمان بووەوە، ئەوە قیساس یا دییە هەر لەسەر وەلییەکەیە، چونکە ئەو خەریکی جێبەجێ کردنی حوکمی قازی بووە بە خۆی یا بەهۆی جێ نشینیەوە.

ئەگەر دوو شاهید شەهادەتیان دا بە شیرخواردن لەبەینی ژن‌و مێردێکا، یا بە تەڵاقی بائین‌و قازی ژن‌و پیاوەکەی لەیەك جیاکردەوە، ئەمجار شاهیدەکان لە شەهادەتەکەیان پەشیمان بوونەوە، ئەوە ئەو جیا بوونەوەیە لەبەینی ژن‌و مێردەکەدا هەر دەوام ئەکاو ئەندازەی «مَهر المثل»ی ژنەکە ئەکەوێتە سەر ئەو شاهیدانە بۆ مێردی ژنەکە ـ مُطْلَقاً ـ

وە لە فەرموودەیەکدا ئەگەر جیابوونەوەکە لەپێش چوونەلادا بوو، نیوەی «مَهر المثل» ئەکەوێتە سەر شاهیدەکان.

وە ئەگەر دووکەس شەهادەتیان دا بە تەڵاقی بائین لەبەینی ژنو مێردێکا و لەپاشاندا پەشیمان بوونەوە، ئەمجار شاهید راست بووەوە لەسەر ئەوە کە ئەو ژنو مێردە شیرخواردنیان لەبەیندا بووە، ئەوە لەمکاتەدا «مَهرُالمثل» ناکەوێتەسەر شاهیدەکان، چونکە بەهۆی شاهیدی شیرەکەوە دەرکەوتووە کە ئەو نیکاحەی لەبەینیانا تێپەڕیوە، دانەمەزراوە.

وە ئەگەر شاهیدی ماڵ لەپاش حوکمدانو وەرگرتنی ماڵەکە پەشیمان بوونەوە، ئەوە پێویستە ئەو ماڵە هەموو ببژێرن بۆ ئەو کەسە کە ماڵەکەی لێ وەرگیراوە؛ جا ئەگەر شاهیدەکان هەموو پەشیمان بوونەوە، ئەوە ماڵەکە ئەبژێرن لەسەر حیسابی سەریان وە ئەگەر هەندێکیان پەشیمان بوونەوەو نیسابی شەهادەت مابووەوە، ئەوە بژاردنی ماڵیان لەسەر نییە و ئەگەر نیسابی شەهادەت کەم بووەوەو ژمارەی شاهیدەکان لە وەختی خۆیدا لەنیساب زیاتر نەبوو، ئەوە ئەمشاهیدە کە پەشیمان بووەتەوە قیستی خۆی ئەبژێرێ وە ئەگەر ژمارە لە نیساب زیاتر بوو، وەکوو دووکەس لە سێ شاهید، ئەوە لە فەرموودەیەکدا قیستی نیسابی پێ ئەدەن کە نیوەیە وە لە فەرموودەیەکدا قیستی ژمارەی کە دوو سێ یەکە.

وە ئەگەر پیاوێكو دوو ژن لەپاش شەهادەتدان پەشیمان بوونەوە، ئەوە پیاوەکە نیوەو دوو ژنەکەش نیوەیان لەسەرە. ئەگەر پیاوێكو چوار ژن لەپاش شەهادەت بە شیر پەشیمان بوونەوە، ئەوە پیاوەکە سێ یەکێکی «مَهر المثل»و ژنەکان دوو سێ یەکی «مَهر المثل» ئەبژێرن؛ ئەگەر هەر تاقە پیاوەکە یا تەنها دوو ژن لە ژنەکان پەشیمان بوونەوە، ئەوە هیچیان ناکەوێتەسەر، چونکە نیساب ماوەتەوە. ئەگەر پیاوێكو چوار ژن شەهادەتیان دا بە ماڵێك و لەپاش حوکمدان پەشیمان بوونەوە، ئەوە پیاوەکە نیوەی ماڵەکەیو ژنەکانیش ئەو نیوەکەی ئەبژێرن، خواه لەگەڵ ئەودا پەشیمان بووبنەوە یا بە جیا وە ئەگەر دوو ژن لەم چوار ژنە پەشیمان بوونەوە، ئەوە هیچیان لەسەر نییە، چونکە نیسابی شەهادەت ماوە.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەگەر شاهیدی پارێزراوی (إحصان) لەپاش سابتبوونی زیناو جێبەجێ کردنی حەد بەسەر کابرای زیناکەردا پەشیمان بوونەوە، یاخود ئەگەر شاهیدی بەجێهاتنی سیفەت لە تەعلیقی تەڵاق پەشیمان بوونەوەو حوکم بە کەوتنی تەڵاقەکە کرابوو، ئەوە ئەو شاهیدانە هیچ نابژێرن، چونکە شاهیدی پارێزراوی شەهادەتیان نەداوە بە زینا کە سەبەبی حوکمە وە شاهیدەکانی سیفەت لە تەعلیقدا شەهادەتیان نەداوە بە تەڵاق کە سەبەبی حوکم بە جیابوونەوەیە، ئاشکرایشە کە حوکم ئیزافە بۆ لای سەبەب ئەکرێ نەك بۆ لای شەرت.

## باسی ئیددیعاو شاهید

ئیددیعا لە شەرعدا، بریتییە لەوەکەسێك لای قازی ئیددیعای حەقێکی شەرعی خۆی بکا لەسەر کەسێك بۆ ئەوەکە قازی ئەوکەسە ناچار بکات بە دانەوەی ئەو حەقە؛ شاهیدیش بریتییە لەو کەسەی کە حەقەکەی پێ سابت ئەبێ.

دەلیل لەمباسەدا، ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی ﴿وَ إذا دُعُوا إِلَى اللّٰهِ وَ رَسُولِه لِيَحكُمَ بَيْنَهُمْ﴾، واتە: «ئەگەر بانگ بکرێن بۆلای خوداو پێغەمبەر تا حوکمیان لەنێواندا بدا» وە حەزرەتﷺ فەرموویەتی: «لَو يُعطَى النّاسُ بِدَعواهم لَادَّعى أُناسٌ دِماءَ رجالٍ وَ أموالَهم، ولٰكِنَّ البَيِّنَةُ على المُدَّعِي واليَمينُ عَلى مَن أَنْكَر»، یەعنی: «ئەگەر ئادەمیزاد بە داواکردن مەبەستی خۆیان بدرایەتێ، هەندێ کەس بە ناحەق داوای خوێن و ماڵی هەندێ کەسیتریان ئەکرد، بەڵام شاهید لەسەر ئەو کەسەیە کە ئیددیعا ئەکاو سوێند لەسەر ئەوکەسەیە کە ئینکاری ئەکا»، یەعنی لەبەرئەوەکە قسەی «مدّعي» لاوازەو خیلافی زاهیرە، پێویستی هەیە بە دەلیلێکی خاوەنهێز کە بریتییە لە شەهادەتی شاهید وە لەبەرئەوە کە قسەی «مدّعی علیه» خاوەن هێزەو لەسەر ئەسڵ ئەڕوا کە پاکی ئەستۆیەتی لە حەقی خەڵك، بە سوێندی رووت قەناعەتی پێئەکرێ.

دەعوا چەند شەرتی هەیە وەکوو لە باسی «قەسامە»دا روونمان کردەوە؛ لەو شەرتانەیە ئەمە کە دەعوا لای قازی یا لای کەسێ بێ کە کرابێ بە حەکەم.

جا ئەو شتە کە داوا ئەکرێ، ئەگەر سزایەك بوو کە حەقی خودایە، وەکوو حەدی دزیو جەردەییو شەرابخواردنەوە، ئەوە دەعوای تیادا نابیسرێ؛ بەڵێ، شەهادەتی خۆڕایی تیا قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر سزایەك بوو کە حەقی ئادەمیزادە، وەکوو قیساس و حەدی قەزف، ئەوە پێویستە ئەو دەعوایە لای قازی بکرێتو لەپاش سابتبوونی، قازی حەقەکە بسێنێ.

مادام قازی لە وڵاتا بێو موبالات بکا بە وەرگرتنی حەقی ئادەمیزاد، دروست نییە کابرای «مدّعي» سەربەخۆ حەقەکەی بسێنێ، لە بەرئەوەکە ئەبێ بەهۆی فیتنەو شۆڕش لە وڵاتدا. هەروەها دەعوا ئەبیسرێ لای قازی ئەگەر دەعوای غەیری سزا بێ بەڵام لەو حەقانە بێ کە شەهادەتی خۆڕاییان تێدا وەرناگیرێ لە عەقدو هەڵوەشاندنەوە، وەك فرۆشتنو بەکرێدانو مارەبڕینو تەڵاقدانو پاشگەزبوونەوەو غەیری ئەمانە وە ئەگەر لەو حەقانە نەبێ کە شەهادەتی خۆڕاییان تێدا وەرئەگیرێ، ئەوە دەعوا پێویست نییەو بە شەهادەتی خۆڕایی قەناعەت ئەکرێ، بەڵام ئەگەر دەعواکرا، ئەو دەعوایە ئەبیسرێ.

وە ئەگەر مەبەست لە دەعوا ماڵ بوو و ماڵەکە عەینێك بوو لای کەسێك خواه داواکەی بەهۆی موڵکەوە بێ یا بە کرێدان یا وەقف یا وەسیەت بە قازانج یا بەهۆی ویلایەتەوە بێ، وەکوو ئەوە یەکێ ماڵی منداڵێکی زەوتکردبێو کابرا نەتوانێ بە بێهەرا ئەو عەینە وەربگرێتەوە، ئەوە لەگەڵ ئەوەدا کە دروستە دەعوای بکا لای قازی، دەعواکردن واجب نییەو کابرا ئەتوانێ سەربەخۆ بڕوات ئەو عەینە بهێنێتەوە وە ئەگەر ترسی هەراو ئاژاوەی هەبوو، واجبە لای قازی دەعوای بکاو بە زۆری ئەو وەری بگرێتەوە.

وە ئەگەر ماڵەکەی قەرزێك بوو لە ئەستۆی کەسێکدا کە ئینکاری نەئەکرد، ئەوە دەعوا لای قازی دروست نییە بەڵکوو ئەبێ بڕوا داوای بکا لەوەی کەوا لەسەریەتیو وەریبگرێتەوە و دروست نییە لە ماڵی ئەو کەسە شتێ وەربگرێ وە ئەگەر قەرزەکەی لەسەر کەسێك بوو کە ئینکاری ئەکردو ئەم «مدّعي»یە شاهیدی نەبوو، یا شاهیدی هەبوو بەڵام شەهادەتیان بۆ نەئەدا یا داوای ماڵیان لێ ئەکرد یا قازی بەرتیلی وەرئەگرت،

ئەوە «مدّعي» ئەتوانێ لە جینسی حەقەکەی خۆی ئەوەندەی ئەو حەقە بە دزیو بەهەر شێوەیەك ڕێی تێ کەوێ لە ماڵی کابرا وەربگرێ وە ئەگەر لە جینسی حەقەکەی خۆی نەبوو، ئەتوانێ لە غەیری جینسی ئەو حەقە وەربگرێ بەپێی مەزهەبی ئیمامی شافیعی خۆی.

وە ئەگەر قەرزەکەی لەسەر کەسێك بوو کە پێی لێ‌ئەنا بەڵام نەیئەدایەوە، یاخود لەسەر کەسێ بوو کە ئینکاری ئەکردو ئەم «مدّعي»یەش شاهیدی هەبوو، ئەوە وەکوو ئەتوانێ لای قازی داوای بکا، ئەیشتوانێ سەربەخۆ حەقەکەی وەربگرێ، چونکە داوای لای قازیو ڕابووراندنی شاهید زەحمەتە، بەڵام هەندێك ئەڵێن: لەم کاتەدا واجبە هەر لای قازی داوای بکا، چونکە شاهیدی هەیەو بە قازی بە ئاسانی وەری‌ئەگرێ.

هەروەختێ کابرا بتوانێ عەینی حەقەکەی لە جینسی ئەو حەقە یا لە غەیری جینسی لە ماڵی ئەو کەسە وەربگرێو ئەمەی بۆ ڕێ‌نەدەکەوت مەگەر بەهۆی شکاندنی دەرگاوە یا بەهۆی ڕووخاندنی پەرژین یا کون‌کردنی دیوارەوە، ئەوە دروستە بۆ نەفسی خۆی ئەمانە بکا و دروست نییە وەکیل بنێرێ ئەم ئیشانە بکا، بەڵام ئەگەر خۆی بەتەنها بۆی نەدەکرا، ئەتوانێ یەکێ لەگەڵ خۆیا ببا بۆ ئەوە یارمەتی بدا لەو ئیشانەدا؛ بەڵێ، لەم سوورەتا گەلێ لە زانایانی شەرع فەرموویانە: ئەگەر بەهۆی قازییەوە حەقەکەی بۆ وەرئەگیرا، دروست نییە ئەم ئیشانە بکا، چونکە ئەبن بەهۆی فیتنەو هەرا لەناو خەڵکدا.

جا ئەگەر خۆی سەربەخۆ ڕۆیشت لە ماڵی کابرا ماڵێکی دەرهێناو ئەو ماڵە لە جینسی حەقەکەی خۆی بوو، ئەوە ئەتوانێ لەجیاتی ماڵەکەی خۆی تەسەڕووفی تێدا بکا، بەڵام بەبێ‌نیازی کردن بە موڵك، نابێ بە موڵك بۆی وە هەندێ لە زانایانی شەرع فەرموویانە: ئەو ماڵە هەر بە وەرگرتن ئەبێ بە موڵکی.

وە ئەگەر لە غەیری جینسی حەقەکەی بوو، ئەتوانێ بە نەفسی خۆی یا بەهۆی وەکیلەوە بیفرۆشێو حەقەکەی خۆی لێ وەربگرێ وە ئەگەر شتێکی لێ‌مایەوە، هەڵی‌بگرێ تا بە هەرجۆرێ بووە ئەیداتەوە بە خاوەنەکەی؛ هەندێکیش ئەڵێن: واجبە

لەسەری ئەو ماڵە بدا بە قازی بیفرۆشێ لەبەرئەوەکە قازی بە ئەمینی گشتی ئەناسرێو تەسەڕوفی ئەویش ئەبێ بەهۆی دوورکەوتنەوەی ئەم کەسە لە توهمەتی خەیانەت.

ئەو ماڵەکە ئەم کەسە وەری‌ئەگرێ لە ماڵی کابرا، خواه لە جینسی حەقەکەی بێ یا نە، ئەکەوێتە زەمانەتی ئەم کەسەوە وە ئەگەر فەوتا، ئەندازەی حەقەکەی دائەشکێو واجبە لەسەری ئەوی‌تری بێژێرێ بۆ خاوەنەکەی.

**بزانن!** دروست نییە بۆ خاوەن‌حەق کە زیاد لە حەقەکەی خۆی وەربگرێ، مەگەر بۆی رێنەکەوێ کە شتێکی‌وا وەربگرێ، ئەوە لەم‌کاتەدا دروستە شتە زیادەکە وەربگرێ لەبەر ناچاری وە هەروەکوو دروستە لەماڵی قەرزارەکەی وەربگرێ، دروستە لە ماڵی قەرزاری قەرزارەکەیشی وەربگرێ، بەم شەرتە دەستی نەگا بە ماڵی‌قەرزارەکەی، بەڵام واجبە لەسەری هەردوولا حاڵی بکا لەم واقیعە بۆ ئەوەکە جارێکی‌تر کابرای قەرزاری ئەم خاوەن حەقە ئەو قەرزەی لەو قەرزاری دووهەمە وەرنەگرێ.

فەرموودەی ئاشکراتر ئەوەیە کە «مدّعي» کەسێکە قسەی خیلافی زاهیر بێ کە بەرائەتی زیممەی کابرای «مدّعی علیه»یەو «مدّعی علیه»، کەسێکە قسەی موافیقی زاهیر بێ کە بەرائەتی زیممەیەتی؛ دەی ئەگەر ژن‌و مێردێکی کافر لەپێش چوونەلای یەك، ئیسلام بوون‌و کابرا وتی: بەیەکەوە موسوڵمان بووین؛ کەواتە، نیکاح لە بەینماندا ماوەتەوە و ژنەکە وتی: نەخەیر بەرودوا موسوڵمان بووین‌و نیکاح لە بەینماندا نەماوەتەوە، ئەوە کابرا بە «مدّعي» ئەزانرێ لەبەرئەوە کە ئیسلام بوونیان بەیەکەوە خیلافی زاهیرە و ژنەکە بە «مدّعی علیها» ئەزانرێ؛ کەوابێ، ئەگەر کابرا شاهیدی هەبوو لەسەرئەوە کە بەیەکەوە ئیسلام بوون، ئەوە باشە، ئەگەرنا، ژنەکە سوێند ئەدرێ.

ئەگەر یەکێ ئیددیعای نەقدێکی پاك یا خڵتە یا قەرزێکی وێنەدار (مِثل)ی یا قیمەت بۆ دانراو (مُتَقَوِّم)ی کرد، ئەوە شەرتە بۆ دامەزرانی ئیددیعاکەی بەیانی جینس‌و جۆرو ئەندازەو ساغی‌و شکاویی نەقدەکە بکا، هەروەها سیفەتێکی‌تر کە نیازی پێ‌بگۆڕێ، چونکە شەرتی دەعوا ئەوەیە کە دیاری کراو و «مُلزِم»بێ.

وە ئەگەر کەسێ ئیددیعای عەینێکی کرد کە حازر بوو لە وڵاتەکەداو مومکین بوو بەعادەت حازر بکرێو زەبتی سیفەتەکانی بکرێ، وەکوو حەیوان‌و دەغڵ‌و دان، ئەوە

واجبە کابرای «مدّعي» وەسفی بکا بە سیفاتی سەلەم، چونکە بەتەواوی جیا ناکرێتەوە لە غەیری خۆی هەتا بەیانی سیفەتی نەکا وە ئەگەر قابیل نەبوو زەبتبکرێ بە بەیانی سیفەت، وەکوو گەوهەرێ یا یاقووتێك یا ئەڵماسێك، ئەوە واجبە کابرای «مدّعي» بەیانی قیمەتەکەی بکات، هەروەها بەیانی جینسو نەوعو رەنگیشیان بکا ئەگەر بەهۆی ئەمانەوە قیمەتیان بگۆڕێ وە ئەگەر ئەو عەینەکە داوای ئەکا لای «مدّعي» فەوتابوو، ئەوە لەمکاتەدا ئەگەر «مِثل»ی بوو، واجبە باسی سیفاتی بکا بۆ ئەوە لەپاش ئیسپات کابرای «مدّعی علیه» ناچار بکرێ لەسەر ئەوە کە وێنەی ئەو عەینە تەسلیم بکا وە ئەگەر «متقوّم» بوو، واتە شتێك بوو کە قیمەتی بۆ دائەنرا، واجبە بەیانی قیمەتەکەی بکا لەبەرئەوە کە پێویستە «مدّعی بە» دیاری بێ.

بەڵێ، لە چەند شوێنێکدا ئیددیعای شتی نامەعلووم دروستە، وەکوو ئیددیعای وەسیەتو ئیقرارو رێگوزەر و شوێنی هاتنی ئاو بۆ موڵکی خۆی لەناو موڵکی کەسێکی ترەوە؛ مەسەلا، کابرا ئیددیعا بکا لە هەندێ لە میراتبەرەکان کە باوکیان وەسیەتی کردووە بە شتێ لە ماڵی خۆی بۆ ئەو، یا بڵێ بە کەسێك کە تۆ ئیقرارت کردووە بە شتێ لە ماڵی خۆت بۆ من، یا بڵێ: حەقی هاتوچۆم لە موڵکی تۆدا هەیە، یا: حەقی ئەوەم هەیە کە لە موڵکی تۆوە ئاو بێنم بۆ موڵکی خۆم.

وە ئەگەر کەسێك ئیددیعای نیکاحی کرد لە ژنێك، پێویستە تەفسیلی بدا بەو رەنگە کە بڵێ: ئەو ژنەم مارەبڕیوە بە مارەبڕینێکی دروست بە ویلایەتی وەلییەکی عادڵو شەهادەتی دوو شاهیدی عادڵو بە رەزامەندیی ژنەکە، بەڵام ئەم قەیدە دوایییە بۆ کاتێکە رەزامەندیی ژنەکە پێویست بێ، ئەگینا هەر بەیانی رەزامەندیی وەلییەکە بکاکە باوك یا باپیرە بووە.

وە ئەگەر ئیددیعای عەقدێکی ماڵی کرد، وەکوو فرۆشتنو سەلەمو بەخشین، ئەوە لەمانەدا دەعوای موتڵەق کیفایەت ئەکاو پێویست بە درێژە پێدان نییە، چونکە موعامەلاتی ماڵی وەکوو نیکاح نییە لە ئیحتیات کردنو ئەهمیەت پێدانا، بەڵام پێویستە باسی دامەزرانی بکا؛ مەسەلا، بڵێت: فڵانکەس بە فرۆشتنێکی دروست ئەو خانووەی پێ فرۆشتووم.

وە ئەگەر دەعوا لەسەر مردوویەك بوو کە میراتگرێکی تایبەتی نەبوو، یا لەسەر کەسێکی نادیار بوو کە وەکیلی نەبوو، یا لەسەر حیجر لەسەر دانراوێك بوو کە لە چاودێریی قازیدا بوو، یا لەسەر «بيتُ المال» بوو، ئەوە لەم سوورەتانەدا واجبە لەسەر قازی یەکێ دابنێ بیکا بە «مدّعى عليه» لەجیاتی ئەمانە بۆ ئەوە دەعواکەی لێبکرێ وە ئەگەر دەعواکە بۆ ئەمانە بوو، واجبە لەسەر قازی لەجیاتی ئەمانە «مدّعي» دابنێ بۆ ئەوە کە دەعوایان بۆ بکا.

**بزانن!** پاش ئەوە کە «مدّعي» دەعواکەی کردو شاهیدی رابوورواند، «مدّعى عليه» حەقی ئەوەی نییە سوێندی «مدّعي»یەکە بدا لەسەرئەوە کە موستەحەقی ئەو حەقەیە، چونکە ئەمە ئەبێ بە داواکردنی «حُجَّة» لەپاش «حُجّة»و ئەبێ بە تانەیەکی ناحەق لە شاهیدەکان؛ بەڵێ، دروستە بۆ خاوەن قەرز پاش ئەوە کە قەرزارەکەی شاهیدی رابوورواند لەسەر لاتی خۆی، سوێندی بدا کە ماڵی نییە؛ هەروەها، ئەگەر یەکێ شاهیدی رابوورواند لەسەرئەوە کە مالیکی عەینێکەو شاهیدەکان وتیان: ئاگامان نییە لەوە کە ئەم ماڵەی فرۆشتبێ یا بەخشیبێتی، ئەوە بۆ خەسمەکەی دروستە سوێندی بدا لەسەر ئەوە کە بە هیچ جۆرێ ئەو عەینە لە موڵکی خۆی دەرنەچووە.

ئەگەر لەپاش دەعوا کابرای «مدّعى عليه» وتی: ئەو ماڵی تۆیە کە لەسەرم بووە داومەتەوە، یاخود: ئازادت کردووم لێی، یا: بە پارە کڕیم لێت یا: بەخشیت پێم و داتە دەستم، ئەوە ئەگەر بۆ ئیسپاتی ئەمانە شاهیدی رابوورواند، باشە، ئەگینا قسەکەی بێسوودەو بەس ئەوەی بۆ هەیە کابرای «مدّعي» سوێند بدا لەسەر ئینکاری ئەم شتانە کە ئەم ئیدیعای کردوون. شەرتی بیستنی ئەو جۆرە دعوایە، ئەوەیە کە لەپێش رابوورواندنی شاهیدی «مدّعي»دا بێ، یا لەپاش رابوورواندنی شاهیدو لەپێش حوکمی قازیدا بێ و ماوەیەکی وایش رابووردبێ کە ئەو گوێزانەوانەی تیادا مومکین بێ، ئیتر لەپاش حوکمی قازی ئەو دەعوایە نابیسرێ؛ بەڵێ، "اذرَعی"و "زَرکَشی"و "بلقینی"، فەرموویانە: لەپاش حوکمی قازیش هەر دەبیسرێن مادام کابرای «مدّعى عليه» داوای کەوتنی ئەوانە بکا لەپێش حوکمی قازیدا، یەعنی بڵێت: هێشتا قازی حوکمی

نەکردبوو ئەو گەردن ئازادییە، یا ئەو فرۆشتنە، یا ئەو بەخشین و وەرگرتنە جێبەجێ بوون، چونکە ئەگەر کابرای «مدّعي» ئیقرار بکا بەمانە، ئەوە قازانجی هەیە بۆ «مدّعی علیە» و هەرچی قازانجی هەبێ بۆ هەرکەس لە مورافەعاتدا، ئەتوانێ و دروستە دەعوای بکات.

دروستە بۆ «مدّعی علیە» دەعوا بکا لە «مدّعي»یەکەی کە ئەزانێ بە فاسقی شاهیدەکانی یا بە درۆکردنیان وە لەم کاتەدا ئەبێ «مدّعي» سوێند بخوا لەسەرئەوەکە بەوانە نازانێ وە ئەگەر ئەم سوێندەی نەخوارد، ئەوە «مدّعی علیە» ئەتوانێ سوێند بخوا کە «مدّعي» بە فاسقی یا بە درۆی شاهیدەکان ئەزانێ و لەمکاتەدا شەهادەتەکەیان بەتاڵ ئەبێتەوە.

وە ئەگەر کەسێك ئیقراری کرد بە شتێك بۆ کەسێك و لەپاشاندا ئیددیعای کرد کە ئەو ئیقرارەی لەڕووی زانستی خۆیەوە نەبووە بەڵکوو لەسەر تەماشا کردنی قەباڵە بووە، ئەوە ئەتوانێ کابرای ئیقرار بۆکراو سوێند بدا لەسەر ئەوە کە ئیقرارەکەی لەسەر بنچینەی زانینی خۆی بووە.

**بزانن!** دروست نییە بۆ «مدّعی علیە» ئیددیعای ئەوە بکا کە شاهیدەکان درۆ ئەکەن و سوێندیان بدا لەسەر ئەوەکە لەو شەهادەتەیاندا راستیان وتووە؛ هەروەها بۆی دروست نییە دەعوای ئەوە بکا لە قازی کە زانیویەتی ئەو شاهیدانە درۆ ئەکەن و بە ناحەق حوکمیداوە، چونکە شاهید سوێند نادرێ و پایەی قازیش بەرزترە لەوەکە ئەم جۆرە توهمەتەی لەسەر بژمێررێ. هەروەها ئەگەر یەکێ دەعوای کرد لە «مدّعي»و وتی: تۆ وەختی خۆی منت ئازاد کردووە لە دەعوا کردن، ئەوە ئەم قسەیە بێسوودە، چونکە لە فەرزێکدا ئازادیشی کردبێ لە دەعوا لێ کردن، ئازاد کردن لە دەعوا بەتاڵە.

ئەگەر یەکێ ماڵێکی فرۆشت و پاشان دەعوای ئەوەی کرد کە ئەوە ماڵەی لەپێش فرۆشتنندا وەقف یا نەزرکردووە لە کەسێك، ئەوە ئەگەر لەکاتی فرۆشتنەکەدا بەیانی ئەوەی نەکردبوو کە ئەو ماڵە ماڵی خۆیەتی، ئەم دەعوایەی لێ ئەبیسرێ و ئەتوانێ شاهیدی لەسەر راست کاتەوە وە ئەگەر لە وەختی فرۆشتنەکەدا بەیانی خاوەن موڵکێتی

خۆی کردبوو، ئەم دەعوایەی لێ نابیسرێو شاهیدی لێ وەرناگیرێ؛ بەڵێ، ئەتوانێ کڕیارەکە سوێند بداکەوا ئاگای لەو وەقفو نەزرە نییەو ماڵەکە لە وەختی فرۆشتنەکەدا موڵکی فرۆشیار بووە.

ئەگەر «مدّعی علیه» لەپاش دەعوای «مدّعي»و رابووراندنی شاهید داوای مۆڵەتی کرد لە قازی بۆ ئەوەی رەدی ئەم شەهادەتانە بکاتەوە، واجبە لەسەر قازی مۆڵەتی بدا، بەڵام واجبە کەفیلی لێ وەربگرێ یاخود پاسەوانێکی لەسەر دابنێ نەوەك رابکا وە نابێ ماوەی ئەو مۆڵەتە لە سێ رۆژ زیاتر بێ وە ئەگەر لەپاش سێ رۆژەکە شاهیدی «جَرح»ی هێناو داوای مۆڵەتێکی تری کرد بۆ ئەوەی «تَعدیل»ی شاهیدەکانی خۆی بکا، یاخود تاقە شاهیدێکی هێنابوو و داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی شاهیدێکی تریش بێنێ، ئەوە قازی سێ رۆژی تریش مۆڵەتی ئەدا.

وە ئەگەر ئەم «مدّعی علیه»یە ناحیەی فاسقی دیاری کردبوو بۆ بەرپەرچ دانەوەی شاهیدەکانی «مدّعي»و شاهیدی دەست نەکەوت بۆ ئیسپاتکردنی فاسقییان، ئەمجار ناحیەیەکی تری دیاری کرد، وەکوو دوژمنایەتی شاهیدەکان لەگەڵیدا، ئەوە ئەم گۆڕینەی لێ قەبووڵ ناکرێ ئەگەر لە ماوەی مۆڵەتەکەدا بێ وە ئەگەر لەپاش تەواوبوونی ماوەی مۆڵەتەکە بوو، قەبووڵ ئەکرێ.

وە ئەگەر تا ماوەی مۆڵەتەکە تەواو بوو بەرپەرچی شاهیدەکانی بۆ نەدرایەوە بەڵام گەڕایەوە سەر قازی کە «مدّعي»یەکەی بۆ سوێند بدا لەسەر ئەوە کە «مدّعی علیه»ی ئازاد نەکردووە، واجبە لەسەر قازی بەگوێی بکاو سوێندی «مدّعي»یەکەی بۆ بدا.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای قەرزێکی خاوەن وەعدەی ئەکردو هێشتا وەعدەکە نەهاتبوو، ئەوە ئەم دەعوایە نابیسترێ؛ بەڵێ، ئەگەر هەندێ لە قەرزەکە وەعدی هاتبوو وە دەعوای گشتی کرد بۆ ئەوە ئەو هەندەی کە وەعدەی هاتووە وەریبگرێ، ئەوە دەعواکەی ئەبیسرێ.

بزانن! وەکوو لە «قەسامە»دا بەیانمان کرد، شەرتی دەعوا ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەو دەعوایە لەپێشەوە رانەبوردبێ وە لەمجۆرەیە ئەمە کە فەرع ئەسڵی خۆی بەدرۆدا

نەخاتەوە؛ کەواتە، ئەگەر پیاوێك ئیقراری بەوە کرد کە لە نەتەوەی حەزرەتی "عەباس"ەو پاشان کوڕەکەی ئیددیعای کرد کە لە نەتەوەی حەزرەتی "عەلی"یە، ئەوە ئەم دەعوایە نابیسرێ.

لە هەموو دەعوایەکدا زانینی ئیددیعاکراوەکەو واجب‌بوونی لەسەر ئیددیعا لەسەر کراوەکەو عەدەمە «مُناقَضَە» پێویستە، تەنها لەو چەند ماددەیەدا نەبێ کە بەیان کران بۆ دامەزرانی ئیددیعای شتی نەزانراو.

لە دەعوا لەسەر نادیارو مردوو و منداڵو شێت‌دا، پێویستە کابرای «مدّعي» بڵێت بە قازی: شاهیدم هەیەو ئەمەوێ بیهێنم شەهادەتم بۆ بدا؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك ژنەکەی تەڵاق داو ژنەکەی شووی کرد بە یەکێك‌و مێردەکۆنەکەی لای قازی ئیددیعای کرد کە ئەو ژنە لەپێش تەواو بوونی «عدّە»یدا شووی کردووە، پێویستە کابرای «مدّعي» بڵێت: من، لە فلان رۆژدا تەڵاقم داوە شاهیدم لەسەر ئەمە هەیە؛ کەواتە، بەوحیسابە، لەو رۆژەدا شووی‌کردووە «عدّە»ی تەواو نەبووەو نیکاحەکەی بەتاڵە.

پێویستە بۆ ئیددیعای فرۆشتن یا بەخشین لە کەسێك کە عەینەکە بە دەستیەوەیە بڵێت: ئەو عەینەم کڕی لە فلانکەس یا بە بەخشین لێم وەرگرت‌و لەوکاتەیشدا موڵکی خۆی بوو وە لەکاتی دەعوا لەسەر مردوودا، ئەگەر دەعوا لە میراتگرێکی تایبەتی بوو، پێویستە بڵێ: ئەم میراتگرەیش ئەزانێ بەو قەرزی منە ـ مەسەلا ـ وە شاهیدیشم هەیە لەسەری.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای هەزار درەمی کرد لە کەسێك‌و ئەویش وتی: ئەو هەزار درەمە لە حەقی فلانە شتدا لێم وەرگرت، پێویستە «مدّعی علیه» دەس‌بەجێ ئەو هەزار درەمەی بداتە دەست، چونکە هەردوولا رێك‌کەوتون لەسەر ئەوە کە هەزار درەمەکە هەیەو جیاوازی لە هۆی بوونی هەزار درەمەکەدا زیانی نییە؛ جا ئەگەر کابرا لەپاشاندا ئیسپاتی ئەو شتەی‌کرد کە بایی هەزار درەم بووەو پێی فرۆشتووە، ئەتوانێ حەقەکەی لێ وەربگرێت.

دەعوای عەقدی دانەمەزراو ئەبیسترێ بۆ ئەوە کە پارەکەی بۆ بدرێتە دواوە وە دەعوای عەقدی خیلافی ئەبیسرێ بۆ ئەوە کە قازی حوکمی پێ بکا لەسەر مەزهەبی

خۆی، ئه‌گه‌ر «مجتَهِد»بێ، یا له‌سه‌ر مه‌زهه‌بی ئیمامه‌ته‌قلید کراوه‌که‌ی، وه‌کوو ده‌عوای شافیعی مه‌زهه‌ب بۆ «شُفعه‌ی جِوار» لای قازی حه‌نه‌فی مه‌زهه‌ب.

## باسی جواب‌دانه‌وه‌ی ده‌عوا

ئه‌گه‌ر «مدّعی علیه» جوابی «مدّعي»ی نه‌دایه‌وه‌و به‌رده‌وام بوو له‌سه‌ر بێ‌ده‌نگی، ئه‌وه‌ دائه‌نرێ به‌ ئینکارکه‌رێك که‌ نکوولی بکا له‌ سوێند خواردن و له‌م کاته‌دا قـازی حوکم ئه‌کا به‌ نکوولی کردنی یا ئه‌ڵێ به‌ «مدّعي»: سوێند بخۆ، ئه‌ویش سوێند ئه‌خواو قازی حوکمی بۆ ئه‌دا، ئیتر پاش ئه‌مه‌ مه‌یدان نادرێ به‌ «مدّعی علیه» سوێنـد بـخوا له‌سه‌ر نه‌بوونی حه‌قی «مدّعي»، به‌ڵام شه‌رتی ئه‌مه‌ ئه‌وه‌یه‌ کابرای «مدّعی علیه» بزانێ ئه‌نجامی بێ‌ده‌نگ بوونی‌وا خراپه‌، یا نه‌زانێ‌و قازی حاڵیی بکاکه‌ ئه‌گه‌ر بێ‌ده‌نگ بێ، به‌ نکوول کردوو دائه‌نرێ.

ئه‌گه‌ر «مدّعي» داوای ده‌ دره‌می کرد له‌ یه‌کێك‌و کابرا وتی: ده‌ دره‌مم له‌سه‌ر نییه‌، ئه‌وه‌ کافی نییه‌ له‌ جوابدا هه‌تا نه‌ڵێ: که‌متر له‌ ده‌ دره‌میشم له‌سه‌ر نییه‌و سوێند بخوات له‌سه‌ر ئه‌مه‌؛ ئه‌گه‌ر هه‌ر سوێندی له‌سه‌ر نه‌بوونی ده‌ دره‌م ئه‌خوارد، ئه‌وه‌ نیسبه‌ت به‌ که‌متر له‌ ده‌ دره‌م به‌ نکوول کردوو ته‌ناسرێ و له‌م‌کاته‌دا «مدّعي» ئه‌توانێ سوێند بخوا له‌سه‌ر ئیستیحقاقی که‌متر له‌ ده‌ دره‌م‌و وه‌ری ئه‌گرێ؛ به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر قازی هه‌ر له‌سه‌ر نه‌بوونی ده‌ دره‌م سوێندی پێ نیشاندا ئه‌ویش وه‌ها سوێندی خوارد، ئه‌وه‌ «مدّعي» به‌ بێ ده‌عوایه‌کی تازه‌ ناتوانێ له‌سه‌ر ئیستیحقاقی که‌متر له‌ ده‌م دره‌م سوێند بخوات.

ئه‌گه‌ر «مدّعي» ئیستیحقاقه‌که‌ی خۆی دایه‌ پاڵ عه‌قدێك؛ مه‌سه‌لا، ژنێك ده‌عوای کرد له‌ مێرده‌که‌ی که‌ له‌سه‌ر په‌نجا دینار ماره‌ی کردووه‌و داوای ئه‌و ماڵه‌ی کرد، ئه‌وه‌ به‌سه‌ که‌ کابرا له‌ جوابیدا بڵێت: به‌ په‌نجا دینار ماره‌م‌نه‌کردووه‌و سوێندی له‌سه‌ر بخوا وه‌ ئه‌گه‌ر کابرا نکوولی کرد له‌ سوێند، ئه‌وه‌ ئه‌و ژنه‌ ناتوانێ ئیددیعا بکاکه‌ له‌سه‌ر چل‌و نۆ دینار ماره‌ی کردووه‌و وره‌ی‌بگرێ، چـونکه‌ ئـه‌م دعـوایـه‌ پـێچـه‌وانـه‌ی ده‌عـوا پێشووه‌که‌یه‌؛ که‌وابێ، له‌پاش سوێندی کابرا ئه‌م ژنه‌ «مَهر المثل»ی ئه‌که‌وێته‌ سه‌ری.

ئەگەر یەکێ ئیددیعای ماڵێکی کرد لە کەسێك‌و شاهیدی نەبوو وە وتی بە «مدّعی علیە»: سوێند بخۆ، ئەویش وتی: سوێند ناخۆم‌و ئەوە ماڵەکەیە وەری بگرە، واجب نییە لەسەر «مدّعي» وەری‌بگرێ بە بێ‌ئەوە کە «مدّعی علیە» ئیقرار بکا بەو ماڵە و بۆی هەیە سوێندی بدا لەبەرئەوە کە ئەمین نییە لەوە کە لە پاشەڕۆژدا داوای ئەو ماڵە بکاتەوە لە «مدّعي»و لێی بسێنێتەوە. هەروەها ئەگەر «مدّعی علیە» نکوولی کرد لە سوێندو «مدّعي» ویستی سوێند بخواو «مدّعی علیە» وتی: سوێند مەخۆ و ماڵەکەت وەربگرە، ئەتوانێ «مدّعي» وەری‌نەگرێ تا سوێندەکە ئەخوا یاخود «مدّعی علیە» ئیقرار ئەکا بە سابت بوونی ئەو ماڵە لەسەری.

ئەگەر کابرا دەعوای ماڵێکی کرد کە بەسرابوو بە هۆیەکەوە؛ مەسەلا، وتی: دە دینارم بە قەرز پێ‌داوی پێم‌بدەرەوە، کافییە کابرای «مدّعی علیە» بڵێت: هیچت لەسەرم نییەو ئیتر باسی قەرز نەکا. یاخود دەعوای کرد کە: حەقی شوفعەم لەسەرتە، کافییە بڵێت: هیچ حەقت لەسەرم نییە یاخود: موستەحەقی ئەوە نیت ئەو بەشەماڵەت بدەمێ، ئیتر پێویست نییە بەئاشکرا بڵێ: حەقی شوفعەت نییە، چونکە ڕێك ئەکەوێ لە ئەسڵدا حەقی شوفعەی لەسەر بووبێ بەڵام بەهۆی شتێکەوە ئەو حەقە نەمابێ وە ئەگەر ئێستە ناوی کەوتنی ئەو حەقە ببا بەهۆی مانیعێکەوە، ئیسپاتی ئەو مانیعەی بۆ ناکرێ؛ کەواتە، لەبەر ناچاری لێی قەبووڵ ئەکرێ بە موتڵەقی بڵێت: هیچ حەقت لەسەرم نییە.

وە ئەگەر یەکێك دەعوای «وەدیعە»ی کرد، کافییە «مدّعی علیە» بڵێت: هیچت بە «وەدیعە» لام دانەناوە، یا بڵێت: موستەحەقی هیچ نیت لەسەرم، یا: ماڵەکەت فەوتاوە لام، یا: داومەتەوە پێت، ئیتر بەس نییە بڵێت: واجب نییە لەسەرم بتدەمەوە، چونکە ئەگەر «وەدیعە»کەیشی لابێ، واجب نییە لەسەری کە ئەم تەسلیمی بکاتەوە، بەڵکوو هەر ئەوەندە پێویستە مانیع نەهێڵێ لەبەینی خاوەن وەدیعەو ماڵەکەیدا.

ئەگەر ژنێك داوای هەزار درەم مارەیی کرد، ئەوە ئەگەر کابرا ئینکاری ژن‌و مێردیی ئەکرد لەبەینیاندا، ئەوە بەسە بڵێت: پێویست نییە لەسەرم هیچت بدەمێ وە ئەگەر ئیقراری ئەکرد بە ژن‌و مێردی، ئەوە ئەم جوابە کافی نییە، بەڵکوو پێویستە قازی لێی

بپرسێ؛ جا ئه‌گه‌ر کابرا ناوی ئه‌ندازه‌یه‌کی تری برد، ئه‌وه له‌م سووره‌ته‌دا ئه‌گه‌ر هه‌ردوولا سوێندیان خوارد هه‌ریه‌کی له‌سه‌ر ئه‌ندازه‌یه‌ك، یاخود هه‌ردوولا نکوولیان کرد، ئه‌وه «مَهر المثل» واجب ئه‌بێ له‌سه‌ری وه ئه‌گه‌ر هه‌ریه‌کێکیان سوێندی خوارد، حوکم بۆ ئه‌ویانه ئه‌درێ به‌و ئه‌ندازه که سوێندی له‌سه‌ر ئه‌خوا.

وه ئه‌گه‌ر ژنه‌که ده‌عوای ته‌ڵاقی کرد، کافییه کابرا بڵێ: تۆ ژنی منی وه ئه‌گه‌ر ده‌عوای نیکاحی کرد، کابرا بڵێ: تۆ ژنی من نیت‌و ئه‌م له‌فزه نابێ به ته‌ڵاق؛ جا ئه‌گه‌ر کابرا سوێندی خوارد له‌سه‌ر ئه‌وه‌که ئه‌و ژنه ژنی نییه، حه‌ڵاڵه بۆ کابرا خوشکی ئه‌و ژنه ماره بکا، یا ئه‌گه‌ر سێ ژنی تری بوو، ئه‌توانێ ژنێکی چواره‌م ماره بکا، به‌ڵام مادام ژنه‌که ئیددیعای ئه‌وه ئه‌کا که ژنی ئه‌و کابرایه‌یه، ناتوانێ شوو بکا هه‌تا کابرا به سه‌راحه‌ت ته‌ڵاقی ئه‌دا و ماوه‌ی «عدّه» ته‌واو ئه‌بێ وه له‌م کاته‌دا چاك‌وایه قازی به قسه‌ی خۆش به کابرا بڵێت: که به‌و ژنه بڵێ: «ئه‌گه‌ر ژنی منی، وا ته‌ڵاقم دای».

**بزانن!** «مدّعی علیه» هه‌رچۆن وه‌رامی «مدّعي» بداته‌وه، به‌گوێره‌ی ئه‌و وه‌رامه سوێند ئه‌خوا تا سوێنده‌که‌ی موافیقی جوابه‌که‌ی بێ؛ مه‌سه‌لا، ئه‌گه‌ر وه‌رامی وا دایه‌وه وتی: «قه‌رزت پێ نه‌داوم»، ئه‌بێ وه‌ها سوێند بخوا وه ئه‌گه‌ر وه‌رامه‌که‌ی موتڵه‌ق بوو، یه‌عنی وتی: هیچت له‌سه‌رم نییه، ئه‌بێ هه‌روه‌ها سوێند بخوا وه له‌م کاته‌دا داوا له «مدّعی علیه» ناکرێ که «تَعرّض» بکا بۆ نه‌فی کردنی سه‌به‌به‌که‌ی وه ئه‌گه‌ر خۆی ته‌عه‌رڕوزی بۆ کرد، قه‌ید ناکا، به‌ڵام ئه‌گه‌ر «مدّعي» شاهیدی هێنا له‌سه‌ر ئه‌و سه‌به‌به‌و له‌پاشان «مدّعی علیه» شاهیدی هێنا له‌سه‌ر ئه‌وه‌که ئه‌و حه‌قه‌ی داوه‌ته‌وه، یاخود «مدّعي» ئازادی کردووه، ئه‌وه نابیسرێ، چونکه ئه‌م «مدّعي»یه زوو ئه‌م شاهیده‌ی به‌درۆدا خستووه‌ته‌وه به‌هۆی نه‌فی کردنی سه‌به‌به‌که‌یه‌وه.

وه ئه‌گه‌ر یه‌کێ ئیددیعای قه‌رزێکی کرد له‌که‌سێك و ئه‌و قه‌رزه وه‌عده‌ی هه‌بوو وه کابرا ناوی وه‌عده‌که‌ی نه‌برد، ئه‌وه ئه‌وه‌نده کافییه که «مدّعی علیه» وه‌رام بداته‌وه به‌وه که ئێستە لازم نییه له‌سه‌ری ته‌سلیمی بکاو سوێنده‌که‌ی له‌سه‌ر بخوا.

ئه‌گه‌ر «مدّعی علیه» سوێندی خوارد له‌سه‌رئه‌وه‌که: واجب نییه له‌سه‌رم هیچت بده‌مێ، جا «مدّعي» هات ئیددیعای کرد وتی: ئه‌و سوێنده‌ت له‌به‌رئه‌وه راست بوو که

لەوکاتەدا موفلیس بووی‌و ئێستا دەستت ئەڕوا، ئەوە ئەم دەعوایە لێ قەبووڵ ئەکرێ‌و «مدّعی علیه» بەوە رزگار ئەبێ کە سوێندی بۆ بخوات کە لە واقیعیدا هیچ حەقی لەسەری نییە.

بێداری! ئەوەی کە وتمان کافییە «مدّعی علیه» لە جوابدا بڵێ بە «مدّعي»: موستەحەقی هیچ نیت لەسەرم، لە چەند سوورەتێکدا نابێ؛ یەکێ لەوانە، ئەوەیە ئەگەر یەکێ ئیقراری کرد بەوە کە هەرچیوا لەماڵەکەیدا موڵکی ژنەکەیەتی‌و لەپاشاندا مردو ژنەکەی شاهیدی هێنا لەسەر ئەم ئیقرار کردنەو میراتگرەکان وتیان: ئەم شتانە کە ئێستا لەم ماڵەدان لەکاتی ئیقرار کردنەکەدا نەبوون، ئەوە نابێ سوێند بخۆن بۆ ژنەکە بڵێن: تۆ موستەحەقی هیچ نیت لەسەرمان، بەڵکوو ئەبێ بڵێن: ئاگامان لەوە نییە کە ئەم شتانە هەموویان یا هەندێکیان لەم ماڵەدا بوون.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی رەهن‌کراو یا ماڵێکی بەکرێ لەلا بوو و خاوەنەکەی داوای کردەوە، کافییە کابرا بڵێت: لازم نییە لەسەرم تەسلیمی بکەم وە ئەگەر ئیقراری کرد بۆ کابرا بە موڵك‌و ئیددیعای رەهن یا بەکرێ‌گرتنی کرد، واجبە لەسەری بە شاهید ئیسپاتی ئەو رەهن‌و بەکرێ‌گرتنە بکا؛ کەواتە، چارەی ئەمەیە بەو «مدّعي»یە بڵێت: ئەگەر ئیددیعای موڵکی موتڵەق ئەکەیت، واجب نییە لەسەرم تەسلیمت بکەم وە ئەگەر ئیددیعای ماڵی رەهن‌کراو یا ماڵی بەکرێ‌دراو ئەکەیت کە لام بێ، بەیانی بکە تا جوابت بدەمەوە.

ئەگەر کەسێك دەعوای عەینێکی کرد لە کەسێك‌و ئەویش وتی: ئەو عەینە هی من نییە، یاخود وتی: هی پیاوێکە نایناسم، یاخود: ماڵی کوڕە منداڵەکەمە، یا: وەقفە لەسەر فڵان مزگەوت‌و من نازرم لەسەری، ئەوە فەرموودەی راستتر وایە ئەم جۆرە جوابە ئەو دەعوایە لانادا لەوکەسە، بەڵام عەینەکەش لە دەستی وەرناگیرێ، چونکە فەرموودەی ئاشکراتر ئەوەیە ئەو عەینە کەوا لە دەستیا، یا موڵکی خۆی بێ یاخود کابرا موستەحەقی ئەوەبێ کە لەلای بێ، بەڵکوو ئەگەر «مدّعي» شاهیدی هەبوو، ئەوە باشە، ئەگینا قازی حەقی ئەوەی هەیە سوێندی بداکە واجب نییە لەسەری ئەو عەینە تەسلیم

بکا بۆ ئەوە بەڵکوو ئیقرار بکا یاخود نکوول بکا لە سوێندو «مدّعي» سوێند بـخواو عەینەکەی لێ وەربگرێ.

وە ئەگەر کابرای «مدّعی علیه» ئیقراری کرد کە ئەو عەینە ماڵی کەسێکە لەو شوێنەدا حازرە یا زیاتر لە مەسافەی «عَدوی» (نیو رۆژە رێگە) دوور نییەو ئەوکەسەیش قابیلی ئەوەبوو مورافەعەی لەگەڵدا بکرێ، ئەوە ئەبێ قازی پرسیاری لێ بکا، جـا ئـەگـەر باوەڕی بەمکەسە کرد، ئەوە ئەو مورافەعەیە لە کابرای «مدّعی علیه» لائەدا بۆلای ئەم کەسە وە ئەگەر باوەڕی پێ‌نەکرد، ئەوە عەینەکە لەدەستیا ئەهێڵرێتەوەو مورافـەعەی لەگەڵدا ئەکرێ، جا ئەگەر «مدّعي» شاهیدی راست‌کردەوە، ئەوە باشە، ئەگینا پێویستە کابرا ئیقرار بکا یا سوێند بخوا یا سوێندەکە بداتە دواوە بۆسەر «مدّعي».

ئەگەر کابرای «مدّعی علیه» ئیقراری کرد بەوەکە ئەو عەینە ماڵی کەسێکە لەو شوێنە نییەو لەمەسافەی نیوەڕۆژە رێیەك دوورترە، ئەوە فەرموودەی راستتر ئـەوەیە کـێشـە لەمکەسە لائەدرێ‌و چاوەڕوانی ئەوە ئەکرێ ئەوکەسە نادیارە حازر ببێت‌و مورافەعەی لەگەڵدا بکرێ، جا ئەگەر «مدّعي»یەکە شاهیدی هەبوو لەسەرئەوەکە ئەو عەینە ماڵی ئەوەو شەرتی «قەزاء لەسەر غائیب» هاتەجێ، ئەوە ئەبێ قـازی حـوکم بـدا بـەسەر نادیارەکەداو عەینەکە بداتە دەستی کابرای «مدّعي» وە مـادام مـەسئەلەکـە بـوو بـە مەسئەلەی «قەزاء لەسەر غائیب» پێویستە لەسەر «مدّعي»یەکەیش سوێند بخواکە ماڵی خۆیەتی.

**بزانن!** چاوەڕوانی لەم مەسئەلەیەدا هەر بۆ ئەوەیە کە عەینەکە نـەدرێتـە دەسـتی «مدّعي»، بەڵام بۆ سوێنددانی کابرا مەجالی هەیە؛ جا ئەگەر کابرا سوێندی خوارد کە ئەم عەینە ماڵی غائیبەکەیە، ئەوە باشە، ئەگینا پێویستە بەدەلی عەینەکە بـبژێرێ بـۆ «مدّعي» تا کابرای نادیار حازر ئەبێ‌و مورافەعەی لەگەڵدا ئەکرێ.

ئەگەر «مدّعي» شاهیدی هێنا لەسەر ئەوە کە ئەو عەینە موڵکی خۆیەتی‌و کابرای «مدّعی علیه» هەم شاهیدی هێنا کە موڵکی کابرای نادیارە، ئەوە بە شـەهادەتی ئـەم کەسە ئیش ئەکرێ، بەو شـەرتە کـە سـابت بـێ وەکـیلی کـابرای نـادیارە، ئـەگـینا

شەهادەتەکەی لیّ وەرناگیریّ بەنیسبەت سابت بوونی موڵکەکەوە بۆ نادیارەکە.
خولاسە، ئەگەر ئیددیعای ئەوەی کرد کە وەکیلی کابرای نادیارە، پێویستە بۆ سابت بوونی موڵکەکە بو نادیارەکە، ئیسپاتی وکالەتی خۆیو ئیسپاتی مالیکییەتی نادیارەکەیش بکا وە ئەگەر هەر شاهیدی لەسەر مالیکییەتی نادیارەکە هێنا، ئەوە لێی نابیسریّ تەنها بۆ دەفعی توهمەتی درۆ لەخۆی نەبیّ بۆ ئەوە کە سوێند نەدریّ، هەروەها ئەگەر ئیددیعای حەقێکی خۆی لەو عەینەدا بکا؛ مەسەلا، بڵێت: بە رەهن بەلامەوەیە، یا: بەکریّ وەرم گرتووە وە لەم سوورەتەدا شاهیدی لیّ وەرئەگیرێت لەسەر ئەوەکە ئەم عەینە موڵکی ئەوکەسە نادیارەیەو ئێستا لە رەهنی ئەمکەسەدایە، یا بەکرێی گرتووە.

**بزانن!** ئەگەر «مدّعی علیه» وتی: ئەو عەینە ماڵی خۆمەو وا لە دەستی خۆمداو «مدّعي» شاهیدی هێنا کە ماڵی ئەوخۆیەتیو حوکمی حاکم بەمە دەرچوو وە لەپاشان، دەرکەوت کە عەینەکە لە دەستی «مدّعی علیه»دا نەبووە، ئەوە ئەگەر خاوەن دەست حازر بیّ، ئەم حوکمەی قازی جیّبەجیّ ناکریّ وە ئەگەر دیار نەبیّو شەرتی «قەزاء لەسەر غائیب» بێتەجیّ، ئەوە حوکمی قازی جیّبەجیّ ئەکریّ.

هەرکەسیّ ئیددیعای حەقێك بکا بۆ غەیری خۆیو نە وەکیل بیّو نە وەلی ئەمر بیّ بۆ ئەوکەسە، ئەوە ئەم دەعوایە لیّ نابیسریّ بەم شەرتە ئیددیعای گواستنەوەی حەقەکە نەکا بۆلای خۆی یاخود ئەو عەینە ماڵی کەسیّ بیّ کە قەرزاری ئەم کەسە بیّو ئەم کابرایە عەلاقەیەکی هەبیّ بەو عەینەوە؛ نموونەی میسالی لقی یەکەم، ئەو کەسەی قەرزی هەیە لەسەر مێردی ژنێکی مردوو بڵێت: ئەو ژنە مارەیی هەیە لەسەر مێردەکەی، یاخود ژنێك ئیددیعای ئەوە بکا کە مێردەکەی قەرزی لەسەر فڵانکەس هەیە، ئەوە ئەم دەعوایە نابیسریّ نموونەی لقی دووهەمیش، ئەوەیە یەکێك بەشێکی جیانەکراوەی لەموڵکێك کریو لەکاتی دیار نەبوونی فرۆشیارەکەدا ئیسپاتی کرد کە ئەو بەشەی ئەو کڕیویەتی لەو موڵکە ئەو بەشەیە کە بە میرات پێی گەیشتووە لە میراتی باوکی، جا برای فرۆشیارەکە ئیددیعای ئەوەی کرد کە باوکیان وەختی خۆی هەموو ئەو موڵکەی

بەخشیوە بەو وە شاهیدیشی لەسەر راست کردەوە، ئەمجار کڕیارەکەیش شاهیدێکی راست کردەوە لەسەر ئەوە کە باوکی لەو بەخشینە پەشیمان بووەتەوە، ئەوە ئەم ئیددیعایەو راست کردنەوەی ئەو یەك شاهیدەی لێ قەبووڵ ئەکرێ. ئەمجار ئەم کڕیارە سوێند ئەخوا لەگەڵ شاهیدەکەیدا، چونکە ئیددیعای موڵکی کەسێکی تر ئەکا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو موڵکەیش گوێزراوەتەوە بۆ لای خۆی.

نمونەیەکی تری ئەم لقە، وەکوو ئەوە کە «خالید» ئیددیعای خانوویەك بکا کە بە دەستی «ئەحمەد»ەوە بێ‌و بڵێ: من ئەو خانووەم کڕیوە لە «مەحموود»و ئەویش کڕیویەتی لە «موحەممەد»و ئەویش کڕیویەتی لە «ئەحمەد»و «ئەحمەد» ئینکاری ئەوە بکا، ئەوە ئەو شاهیدە کە «خالید» راستی ئەکاتەوە، لێی قەبووڵ ئەکرێ.

## باسی چۆنیەتی سوێندو دەستووری سوێند

سوننەتە بۆ قازی کە سوێندی «مدّعي» قورس بکا، یەعنی ئەو سوێندەی کە «مدّعی علیە» ئەیداتەوە بەسەریاو ئەو سوێندەی کە لەگەڵ شاهیدێکدا ئەیخوا؛ هەروەها، سوننەتە سوێندی «مدّعی علیە» قورس بکا، هەرچەند خەسمەکەیشیان داوای قورس کردنی سوێندەکە نەکا؛ ئەم قورس کردنی سوێندە، بۆ شتێکە نە ماڵ بێ‌و نە مەبەست لێی ماڵ بێ، وەکوو نیکاح‌و تەلاق‌و ریجعەو وەکالەت‌و وێنەی ئەمانە لەو شتانە کە بە پیاوێك‌و دوو ژن سابت نابن، هەروەها لە ماڵێکیشدا کە بگا بە حەدی زەکات ـ کە دووسەد درەمە لە زیو یا بیست مسقاڵە لە ئاڵتوون ـ وەکوو لە باسی قورس کردنی سوێندی «لِعان»دا رابورد؛ بەڵێ، لەم بابەدا قورس کردنی سوێند بەوە نابێ کە لەلای کۆمەڵدا بێ یا بە دووبارە کردنەوەی کەلیمەکان بێ.

جا ئەو شتەی کە کەسێك سوێندی لەسەر ئەخوا، ئەگەر کرداری خۆی نەبێ‌و کرداری غەیرێکی عاقڵیش نەبێ، بەمڕەنگە هەر کردار نەبێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەو پەلەوەرە کەو نییە، یاخود کرداری غەیرە عاقڵ بێ، وەکوو دەرچوونی رۆژ، یاخود کرداری خۆی بێ چ لە ئیسبات و چ لە نەفیدا، وەکوو قسەکردن‌و قسە نەکردن لەگەڵ

کەسێك، ئەوە لەم سوورەتانەدا واجبە سوێندەکەی جەزمی بێ لەسەر ئەساسی ئەوەی رووی‌داوە؛ مەسەلا، بڵێت: وەڵڵاهـ ئەو پەلەوەرە کەو نییە، وەڵڵاهـ رۆژ هەڵهاتووە، وەڵڵاهـ قسەم لەگەڵ فڵاناکرد، یا نەکرد. هەروەها ئەگەر کرداری کەسێکی تر بێ لەوانەکە عاقڵن بەڵام کردارەکە «مثبت»بێ، وەکوو وەڵڵاهـ فڵانکەس ئەو قسەیەکرد، یا ئەو شتەی نووسی، یا خود «نفی مَحصور»بێ، یەعنی نەفییێکی تایبەتی دیاری بێ، وەکوو بڵێت: فڵانکەس لە فڵان مەجلیسدا ئەو قسەیە نەکرد، ئەوە پێویستە ئەو سوێندە بە شێوەی جەزم و لەسەر بنچینەی رووداو بێ.

وە ئەگەر کردارەکە کرداری کەسێکی تر بێ لە مەجالی نەفی کردناو نەفیەکەش حەسر نەبێ، ئەوە سوێندەکە لەسەر نەزانین ئەخورێ، وەکوو ئەوە کە بڵێت: وەڵڵاهـ ئاگام لەوە نییە کە باوکت ئەو قەرزەی دابێتەوە پێمان وە داوای جەزمو نەفیی روودانی لێ ناکرێ، هەرچەند ئەگەر سوێند لەسەر جەزمیش بخوا، باشتر لێی قەبووڵ ئەکرێ.

بەڵێ، ئەگەر غەیرەکە لە حوکمی نەفسی خۆیدا بوو وەکوو حەیواناتێکیوا کە لە ئیدارەیدا بێ وە یەکێك ئیددیعای ئەوەی لێ بکاکە ئەو حەیواناتە زیانیان بە زەراعەتی ئەم گەیاندووە، ئەوە واجبە لەسەری سوێند بخوا لەسەر جەزمو رووداو؛ مەسەلا، بڵێت: وەڵڵاهـ ماینەکەم زەراعەتی تۆی نەخواردووە، چونکە مادام ئەم حەیوانە وا لە ژێردەستی کابرادا، ئیشی ئەو وەکوو ئیشی کابرا وایە؛ بۆیە ئەگەر حەیوانەکە لای کەسێك بێ کە زامنی کردەوەی بێ، وەکوو کرێچیو ماڵخوازو ماڵداگیرکەرو شوان، ئەوە ئیددیعای زیانگەیاندنی ئەو حەیوانانە لەسەر ئەو کەسەیەو پێویستە هەر ئەویش سوێندی لەسەر بخوا، ئیتر ئیددیعای زیانگەیاندنو سوێند خواردن لەسەر خاوەن ماڵ نییە.

جا ئەگەر کورێك داوای قەرزی باوکی کرد لە کەسێكو ئەویش وتی: داومەتەوەو شاهیدی نەبوو، ئەوەکورەکە سوێند ئەخوا ئەڵێ: وەڵڵاهـ ئاگام لەوە نییە کە ئەو قەرزەت دابێتەوە.

بزانن! لە هەر شوێنێکدا سوێند خواردن لەسەر نەزانین مەبەست بێ، پێویستە «مدّعي» لە دەعواکەیدا باسی ئەوە بکاکە «مدّعی علیه» ئاگای لەو شتە هەیە.

بێدار کردنەوە! دروستە ئینسان سوێندی جەزمی بخوا بە هەموو بیرو باوەڕێکەوە؛ مەسەلا، یەکێك ئەتوانێ بە پاڵدان لەسەر نووسراوی خۆی یا باوکی یا کەسێکی باوەڕ پێ کراو، سوێند بخوا لەسەر ئەوە کە ئەو قەرزە دراوەتەوە یا نەدراوەتەوە یا ئەوەندەی ماوە یا قیمەتەکەی ئەوەندەیە؛ هەروەها، ئەتوانێ لەسەر نووسراوێکی باوەڕ پێ کراو سوێند بخوا کە ئەوەندە قەرزی باوکی لەسەر فـلانکەس هـەیە؛ هـەروەها، نکـوولی خەسمەکەی لە سوێند خواردن ئەبێ بەهۆی هێزی باوەڕ لەسەر ئەوە کە ئەو خەسمە حەقەکەی لەسەرەو سوێندی لەسەر بخوا، بەو شەرتە خەسمەکە لەوانە نەبێ کـە بـە هەموو جۆرێ خۆی بپارێزێ لە سوێند خواردن.

پێویستە بۆ ئەوەی کە سوێند قیمەتی ببێ و کار بکا، خەسم داوا بکا لە قازی و قازی داوا بکا لە کابرا سوێند بخواو کەلیمەکانی سوێندەکە بە پێی عورف یەك لەدوای یەك بن. لە سوێند خواردندا، تەماشای نییەتی قازی یا نییەتی حەکەم یا نییەتی ئەو کەسە ئەکرێ کە دیاریکراوە بۆ وەرگرتنەوەی حەق لە خەڵکی؛ هەروەها، تەماشای عەقیدەی قازی ئەکرێ، ئەگەر «مجتهِد»بێ یا تەماشای عەقیدەی ئیمامەکەی ئەکرێ، ئەگـەر «مقلِّد»بێ؛ کەوابێ ئەگەر کابرای سوێندخۆر لەفزێکی وت و مەعنایەکی تری مەبەست بوو، یا خیلافی ئەو سوێندەی لا حەق بوو، وەکوو کەسێکی شـافیعی مـەزهەب کـە خانوویەکی بە شوفعەی دراوسێیەتی وەرگرتبێ و لای قازی حەنەفی سوێند بخوا کە فلانکەس حەقی شوفعەی لەسەرم نییە (واتە بە مـەزهەبی شـافیعی)، یـاخود لەژێر لێوەوە بڵێ: «إن شاء الله» بە جۆرێ کە قازی نەیبیسێ، ئەوە ئەم حاڵەتانە دەفعی گوناهی سوێندی درۆ ناکەن، بەڵام ئەگەر هەر خاوەن حەق سوێندی کابرای دا یا خـۆی لە سەرەتاوە سوێندی خوارد، ئەوە ئیعتیبار بە نیازی خۆیـەتی و لەسـەر حـیسابی دڵی خۆی سوێندی ناکەوێ، بەڵام گوناهبار ئەبێ بەهۆی ئەوەوە کە حەقی خەڵکی پێ بەتاڵ ئەکاتەوە؛ بەڵێ، وتنی لەفزێك و مەبەست بوونی مەعنایەکی نهێنـی جگـە لە مـەعنا دیارییەکەی لەفزەکە کە ـ پێی دەڵێن: «تَورِيَة» ـ سوودی هەیە بـۆ نـەکـەوتنی تـەڵاق، هەرچەند لای قازیش سوێند بخوا، ئەگەر ئەو قازییە مەزهەبی لەسەر ئەوە نەبێ کـە تەڵاق دانی خەسم دروستە، وەکوو قازی شافیعی مەزهەب.

**بزانن!** دەستووری ئەو کەسەی کە سوێندی لەسەرە ئەوەیە هەرکەسێ لەپاش دەعوای «مدّعي» ئەگەر ئیقراربکا ناچار بکرێ بە جێبەجێ کردنی پێویستی ئیقرارەکەی، ئەوە ئەگەر ئینکاری کرد، سوێندی لەسەرە؛ بەڵێ، ئەم دەستوورە بە ئەغلەب وایەو چەند مادەیەك هەیە کە بەر ئەم دەستوورە ئەکەون، کەچی کابرا سوێند نادرێ؛ یەکەم، ئەگەر دەعوای ستەم بکرێ لە قازی، سوێندی نادرێ؛ دووەم، ئەگەر ئیددیعای ئەوە بکرێ کە شاهید درۆی کردووە، ئەوە سوێندی نادرێ لەسەر ئەوە کە درۆی نەکردووە؛ سێهەم، ئەگەر «مدّعی علیه» بڵێ: من منالم‌و هەڵبگرێ قسەکەی راست بێ، سوێندی نادرێ لەسەرئەوە کە درۆی نەکردووە، بەڵکوو ئەو مەسئەلەیە رائەگیرێ تا باڵغ ئەبێ؛ چوارەم، لە عوقووبەتی خودادا، وەکوو حەدی زیناو عەرەق خواردنەوە، ئەگەر کابرا ئینکاری کرد، سوێندی نادرێ؛ پێنجەم، ئەگەر «مدّعی علیه» بڵێت بە «مدّعي» کە: ئازادت کردووم لەم دەعوایە، سوێندی نادرێ، چونکە ئازاد کردن لە دەعوا مەعنای نییەو شتێکی بەتاڵە.

ئەگەر کەسێك تەعلیقی تەڵاقی ژنەکەی کرد بە کرداری ژنەکە خۆیەوەو لەپاشان ژنەکە ئیددیعای ئەوەی کرد لە کابرا کەوا ئەو کارەی کردووەو تەڵاقی کەوتووەو کابرا ئینکاری کرد، ئەوە کابرا سوێند نادرێ لەسەر نەزانین بەو کردارە، بەڵکوو ئەگەر ژنەکە ئیددیعای جیابوونەوەی کرد، کابرا سوێند ئەدرێ لەسەرئەوە کە تەڵاقی نەکەوتووەو جیا بوونەوەی لە مێردەکەی نەهاتووەتەجێ.

ئەگەر کەسێك ئیددیعای شوفعەی کرد لە کەسێك‌و ئەویش وتی ئەو بەشەم بۆ کوڕەکەم کڕیوە، ئەوە کابرا سوێند نادرێ وە ئەگەر کوڕێك ئیددیعای کرد لە باوکی کەوا بە روشدەوە باڵغ بووەو باوکیشی پێی ئەزانی‌و پێویستە هەر ماڵێکی لایەتی بیداتەوەو باوکی ئینکاری کرد، ئەوە سوێند نادرێ وە ئەگەر ئیددیعای کرد لە قازی کە ژنێکی شێتی لێ مارە بڕیوەو قازی ئینکاری کرد، سوێندی نادرێ، هەرچەند ئەگەر ئیقرار بکا، ئەو نیکاحە بەتاڵ ئەبێتەوە. ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان ئیددیعای کرد لەو کاربەدەستەی کە زەکاتی موسوڵمانان کۆئەکاتەوە کەوا زەکاتی فلانکەسی وەرگرتووەو

ئەویش ئینکاری کرد، ئەوە سوێند نادرێ. ئەگەر «ئەحمەد» قەرزی لەسەر «مەحموود» هەبوو و ئیددیعای کرد لە «حامید» کەوا ئەو ماڵەی وا بەدەستیەوە ماڵی «مەحموود»ەو پێویستە ئەو قەرزەی ئەوی لێبداتەوە، ئەویش ئینکاری کرد، ئەوە سوێند نادرێ.

ئەگەر کەسێك قەرزی لەسەر مردوویەك هەبوو و ئیسپاتی کردو حوکمی بۆ درا، ئەمجار مەحزەرێکی هێنا سەبتی موڵکی کابرا مردووەکەی تێدا بوو بۆ ئەوە ئەو موڵکە بفرۆشرێو حەقەکەی ئەوی لێ بدرێتەوە، ئەوە دروستە، هەرچەند میراتگرەکان نەیان کردبێ بە وەکیل بۆ ئەم ئیسپات کردنە.

**بزانن!** سوێند ئەوەندە هێزی هەیە کە لەئێستەدا هەراو ناکۆکییەکە ئەبڕێتەوە، ئیتر نابێ بەهۆی ئەوە کابرا لە حەقیقەتدا ئەستۆی پاك ببێتەوە لە حەقی خاوەنحەق؛ کەواتە، ئەگەر لەپاش سوێندی «مدّعی علیه»، کابرای «مدّعي» شاهیدی راست کردەوە لەسەر حەقەکەی، هەرچەند یەك شاهیدیش بێ کە خۆی سوێندی لەگەڵدا بخوا، ئەوە حوکم ئەکرێ بەم شەهادەتە یا بەم شەهادەتو سوێندەو حەقەکەی لێ ئەسەنرێتەوە. هەروەها ئەگەر «مدّعی علیه» سوێندەکەی گێڕایەوە بۆ سەر «مدّعي»و ئەمیش ئێستە نکوولی کرد لە سوێند و لەپاشان شاهیدی راست کردەوە لەسەر حەقەکەی، ئەوە ئەو حەقەی بۆ سابت ئەبێ، چونکە قابیلە ئەو نکوول لە سوێندەی لەبەر کەرامەتی نەفسو لەبەر پارێز بووبێ.

**بزانن!** ئەگەر یەك دەعوای تەنیا، دەعوای گەلێ حەقی تێدابوو، ئەوە «مدّعي» ئەتوانێ کە «مدّعی علیه» سوێند بدا لەسەر هەموویان بە جارێ یا سوێندی بدا لەسەر هەندێکیانو بەسو ئەیشتوانێ کە یەکەیەکە لەسەر هەموو حەقێکیان سوێندێکی تایبەتی بدا، بەڵام ئەگەر دەعواکان یەکەیەکە لە یەك جیا کرابوونەوە، ئەوە قابیل نییە بە یەك سوێند کابرا رزگار ببێ، هەرچەند «مدّعي»یەکەیش قەناعەت بکا، چونکە ئەم دەعوایانە بەشی خوایان تێدایە کە تەماشاکردنیانە بە جیاجیا بەگوێرەی جیاکردنەوەی «مدّعي»یەکە.

وە ئەگەر کۆمەڵێك حەقێکیان لەسەر کەسێك هەبوو، ئەوە پێویستە ئەو کابرا بۆ هەریەکێکیان سوێندێکی تایبەتی بخواتو بە تاقە سوێندێك قەناعت ناکرێ،

هەرچەند رازی بن بە سوێندێ. ئەگەر «مدّعي» شاهیدی هێنا لەسەر حەقەکەی‌و لەپاشان وتی: ئەم شاهیدانە شەهادەتەکەیان بە درۆ بوو، ئەوە حەقی ئەو کابرایە بەتاڵ ئەبێتەوە.

ئەگەر «مدّعی علیە» وتی: سوێند ناخۆم، پێویستە «مدّعي» سوێند بخواو بەتەنیا سوێند نەخواردنی «مدّعی علیە» حوکم نادرێ بۆ «مدّعي». سوێند نەخواردن، ئەوەیە کابرا بڵێ: ئامادە نیم سوێند بخۆم، یاخود قازی پێی‌بڵێ: سوێند بخۆ، ئەویش بڵێ: سوێند ناخۆم وە یا ئەگەر بێ‌دەنگ بوو، قازی حوکم بکا بە سوێندنەخواردنی وە ئەگەر قازی بڵێ بە «مدّعي»: سوێند بخۆ، ئەو حوکمە بە نکوولی «مدّعی علیە»، ئیتر ئەم ناتوانێ پاش ئەوە سوێند بخوات، مەگەر بە رەزامەندیی «مدّعي»، جا لەم‌کاتەدا دروستە سوێند بخوات وە ئەگەر سوێندی نەخوارد، «مدّعي» حەقی سوێند خواردنی نامێنێ، چونکە خۆی بە ئارەزووی خۆی حەقی سوێندەکەی خۆی فەوتاندووە وە لەم‌کاتەدا غەیری راست کردنەوەی دوو شاهید یا شاهیدێك‌و سوێندێکی خۆی، حەقی هیچی نامێنێ.

ئەگەر «مدّعی علیە» نکوولی کرد لە سوێند خواردن‌و لە مەجلیسی حوکمەکە دەرچوو و هێشتا قازی سوێندی نەدابوو بە «مدّعي»، ئەوە قازی ناتوانێ پاش ئەوە سوێند بدا بە «مدّعي».

دروستە بۆ «مدّعي» لەپاش ئەوەکە شاهیدێکی راست کردەوە خۆی سوێند نەخواو سوێند بدا بە «مدّعی علیە»؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە حەقی «مدّعي» ئەکەوێ وە ئەگەر سوێندی نەخوارد، «مدّعي» لەپاش ئەمە ناتوانێ سوێند بخوا، بەڵکوو هەر ئەوەی بۆ ئەمێنێتەوە کە دوو شاهید راست کاتەوە و ناتوانێ شاهیدێك راست کاتەوەو سوێندی لەگەڵدا بخوا، چونکە خۆی سوێندەکەی خۆی فەوتاندووە.

بزانن! ئەو سوێندەی کە لەلایەنی قازییەوە یا لەلایەنی «مدّعی علیە»یەوە ئەدرێتە دواوە بۆسەر «مدّعي»، مادام «مدّعي» خواردی، لە فەرموودەیەکدا وەکوو دوو شاهید یا شاهیدێك‌و سوێندێك وەهایە؛ فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە ئەو سوێندە وەکوو

پێ‌لێنانی «مدّعی علیە» وایە وە بینا لەسەر ئەم فەرموودە دیاریترە، هەر لەپاش ئەوەکە «مدّعي» سوێندەکەی خوارد، بە بێ موحتاج بوون بە حوکمی قازی، حەقەکە واجب ئەبێ بۆ «مدّعي» وە ئەگەر «مدّعی علیە» لەپاش ئەم سوێندی «مدّعي»یـە شـاهیدی راست کردەوە لەسەرئەوە کە وەختی خۆی ئەوە حەقەی داوەتەوە بە «مدّعي» یاخود «مدّعي» ئازادی کردووە، یا لەسەر شتێکی تر کە حەقەکەی بفەوتێنێ، ئەوە ئەو شاهیدە نابیسترێ، چونکە ئەو پێ‌لێنانە تەقدیرییە کە لە سوێندی «مدّعي»یەوە پەیدا ئەبێ، ئەم بەڵگەیەی خۆی بەدرۆدا خستووەتەوە؛ بەڵام "دَمیری" لە زانایانی زەمـانی خـۆیـی گێڕاوەتەوە کەوا ئەگەر «مدّعی بِە» عەین بێ، ئەو شاهیدانە کە «مدّعی علیە» راستیان دەکاتەوە لەپاش سوێندی «مدّعي» سوودیان هەیە؛ شێخی «ابنُ حجر» لە «تُحفە»دا ئەم قسەیەی بە باش زانیوەو لەسەر ئەم ئەساسەیە کە "ابن الصلاح" فـتوای داوە ئـەگـەر کەسێك ئیددیعای بەشێك بکا لە موڵکێك کەوا بەدەست براکەیەوە بەهۆی میراتەوە و براکەی ئینکاری کرد بەڵام سوێندی نەخواردو سـوێنـدەکـەی گـێڕایـەوە بـۆ سـەر «مدّعي»و ئەویش سوێندی خواردو قازی حوکمی بۆ دا، جا پاش ئەمە ئەو برا «مدّعی علیە»یە شاهیدی راست کردەوە کە باوکی لە ژیانی خۆیدا ئیقراری کردووە بەوە کە ئەو عەینە وا لە دەستی ئەم کوڕەدا،ماڵی خۆیەتی، ئەوە واجبە لەسەر قازی حوکمی پێ بکا ئەو عەینە لە «مدّعي»یەکە بسێنێتەوە بۆ ئەم برا «مدّعی علیە»یە.

ئەگەر لەپاش ئەوە کە قازی یا «مدّعی علیە» سوێندیان گێڕایـەوە بـۆ «مـدّعي»و ئەمیش سوێندی نەخواردو عوزری بە هیچ نەهێنایەوەو داوای مۆڵەتی نەکرد، یاخود وتی: من نکوولم هەیە، یا هەر بێ‌دەنگ بوو وە قازی حوکمی کرد بە نکوولی، ئەوە ئیتر «مدّعي» حەقی سوێندی نامێنێ‌و حەقی داواکردنی لە خەسمەکەیش نییە، مەگەر سا شاهید راست بکاتەوە لەسەر «مدّعی علیە».

وە ئەگەر بیانووی بەوە هێنایەوە کە لەوەلا شاهید دێنێ یا داوای مۆڵەتی کـرد تـا تەماشای حیسابی خۆی بکا، ئەوە تا سێ رۆژ مۆڵەتی ئەدرێ و ئەگەر لەپاش سـێ رۆژەکە حازر نەبوو بۆ سوێند خواردن بە بێ عوزری شەرعی، ئەوە ئیتر حەقی سوێند

خواردنی نامێنێ، بەڵام ئەگەر «مدّعی علیه» لەوکاتەداکە داوای سوێندی لێ کرا داوای مۆڵەتی کرد، بە بێ ڕەزای «مدّعي» دروست نییە مۆڵەتی بدرێ، چونکە بەپێی شەرع ناچارە لەسەر ئیقرار بە حەقی «مدّعي» یا بە سوێند لەسەر نەفیی حەقەکەی، بەڵام «مدّعي» بە ئارەزووی خۆیەتی، ئاخۆ داوای حەقەکەی ئەکا یا داوای ناکاو تەفرەی ئەدا.

بەڵێ، ئەگەر «مدّعی علیه» لە سەرەتای مەجلیسەکەوە داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوە پرسیار لە ئەهلی شەرع بکا یا تەماشای دەفتەری حیساباتی خۆی بکا، ئەوە تا ماوەی ئاخری ئەو مەجلیسە مۆڵەت ئەدرێ، ئەگەر قازی بە مەسلەحەتی بزانێ.

**بزانن!** ئەگەر «مدّعي» لەپاش دەعوا سوێندی «مدّعی علیه»ی نەداو داوای کەفیلی کرد لە «مدّعی علیه» تا شاهیدەکانی دەهێنێ، واجب نییە لەسەر «مدّعی علیه» قەبووڵی بکاو کەفیل بێنێ، بەڵام ئەگەر لەپاش ڕاستکردنەوەی شاهید داوای کەفیلی کرد لە «مدّعی علیه» تا تەعدیلی شاهیدەکانی ئەکرێ، ئەوە ئەو «مدّعی علیه»یە ناچار ئەکرێ بە حازرکردنی کەفیل وە ئەگەر نەیهێنا، حەپس ئەکرێ تا ماوەی تەعدیلی شاهیدەکان تەواو ئەبێ.

ئەگەر داوای زەکات کرا لە کەسێك و ئەویش وتی: داومە بە زەکاتکۆکەرەوەیەکی تر، یا وتی: تەخمینکەرەکە غەڵەتی کردووە، ئەوە سونەتە سوێند بدرێ وە ئەگەر سوێندی نەخوارد، داوای هیچی لێ ناکرێ وە ئەگەر بڵێین: واجبە سوێند بخواو سوێندەکەی نەخواردو قابیلیش نەبوو سوێندەکە ڕەدبکرێتەوە بۆسەر «مدّعي»، لەبەرئەوە کە موستەحەق حەسر نەبێ لە چەند کەسێکدا، ئەوە فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە زەکاتەکەی لێ وەرئەگیرێ نەك لەبەر نکوول، بەڵکوو لەبەرئەوە کە ئەوەندەی هەیە بگاتە حەدی زەکات و ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە.

ئەگەر کەسێك داوای ماڵی مردووی بێمیراتبەری لێ کرا، یا داوای وەقفی عامی لێ کرا، یا داوای وەقفی مزگەوتی لێ کراو شاهید نەبوو ئیسپاتی بکا، ئەوە حەپس ئەکرێ تا یا ئیقرار ئەکا یا سوێند ئەخوا کە لەسەری نییە.

وە ئەگەر وەسی مردوو ئیددیعای کرد لە میراتبەرەکان کە فڵانکەس وەسیەتی کردووە بە سێ‌یەکی ماڵەکەی بۆ فەقیرو هەژارو ئەوانیش ئینکاریان کردو سوێندیان نەخوارد، ئەوە حەپس ئەکرێن تا ئیقرار ئەکەن یا سوێند ئەخۆن.

ئەگەر وەلی ئەمری منداڵ یا شێت ئیددیعای قەرزی ئەمانەی کرد لە یەکێك‌و ئەویش ئینکاری کردو نکوولیشی کرد لە سوێند خواردن، ئەوە ئەو وەلیە ئەگەر ئیددیعای موباشەرەی سەبەبی قەرزەکەی کردبێ، خۆی ئەتوانێ سوێند بخوا، ئەگەر نا، دروست نییە سوێند بخواو مەسەلەکە ماتڵ ئەکرێ تا منداڵەکە باڵغ ئەبێ، یا شێتەکە خۆش ئەبێتەوە، جا خۆیان سوێند ئەخۆن.

وە ئەگەر ئیددیعای قەرزی مناڵی خۆی کرد لە یەکێك‌و ئیسپاتی کرد، جا «مدّعى عليه» ئیددیعای ئەوەی کرد کە زوو ئەو قەرزەی داوەتەوە، بەڵام شاهیدی نەبوو، ئەوە واجبە ئێستە قەرزەکەی لێ وەربگیرێ، جاکاتێ کە مناڵەکە باڵغ بوو، ئەبێ سوێند بخوا لەسەر ئەوەکە ئاگای لەوە نییە کە ئەوکابرایە زووتر ئەو قەرزەی دابێتەوە.

وەسی منداڵ‌و «قیّم»ی مزگەوت‌و نازری وەقف، وەکوو منداڵ وەهان لە وێنەی ئەم دوو مەسئەلەیەدا کە بەیانمان کردن.

## باسی ئەوەکە شاهید لە دوو لاوە بەرانبەریی یەك بکەن

ئەگەر دووکەس دەعوای عەینێکیان کرد، ئەوە ئەو عەینە، یا وا لە دەستی کەسێکی غەیری خۆیاندا، یا وا لە دەستی هەردووکیانا، یا وا لە دەستی یەکێکیانا، یا لە دەستی هیچیاندا نییە؛ جا ئەگەر عەینەکە لە دەستی کەسێکی غەیری ئەماندا بوو وە هەرکام لەم دووکەسە شاهیدیان راست کردەوە، ئەوە هەردوو شەهادەتەکە پەکیان ئەکەوێ، چونکە بە گژی یەکدا چوون‌و شتێکیش نییە لایەکیان بەهێز بکات؛ کەواتە، وەکوو ئەوە وایە هیچیان شاهیدیان نەبێ، خوای هەردوو شاهیدەکان رێك بن لە تەئریخدا، یاخود یەکێکیان تەئریخی ببێ‌و ئەویان نەیبێ، یاخود هیچیان تەئریخیان نەبێ و لەم سوورەتەدا پێویستە لەسەر کابرای خاوەن دەست بۆ هەریەکێ لەو کەسانە سوێندێك بخواکە ماڵی تۆ نییە، ئەمجار عەینەکە بۆ خۆی ئەمێنێتەوە.

وە ئەگەر کابرای خاوەن دەست ئیقراری کرد بۆ یەکێکیان، خوای لەپێش هێنانی شاهیدەکاندا بێ یا لەپاش ئەوە، ئەوە هێز ئەدا بەو یەکیانە وە ئەگەر تەنها یەکێ لەو دووکەسە «مدّعي»یە شاهیدی هەبوو، ئەوە حوکم بۆ ئەو ئەدرێ.

وە ئەگەر ماڵەکە لە دەستی هەردووکیانا بوو، وەکوو ئەوە یەکێك بمرێو دووکوڕی لەپاش بەجێبمێنێو خانوویەکی بیێو کوڕەکان لە خانووەکەدا بن، بەڵام هەموو یەکێ لەوانە ئیددیعای ئەوە بکا کە باوکی پێش مردنی خانووەکەی داوە بەو وە هەرکامیشیان شاهید لەسەر دەعواکەی ڕاست کاتەوە، ئەوە ئەو عەینە هەروەکوو لەوەپێش لە دەستیاندا ئەهێڵرێتەوە.

وە ئەگەر عەینەکە بە دەستی کەسەوە نەبوو وە هەر دوو «مدّعي»یەکەیش شاهیدیان ڕاست کردەوە، هەرکام لەسەر مالیکییەتی خۆی، ئەوە ئەبێ بە چونیەك لە بەینی هەردووکیاندا دابەش بکرێ وە ئەگەر لە دەستی یەکێکیاندا بێو «مدّعي»یەکان هەردووکیان شاهید ڕاستکەنەوە، ئەدرێ بەویانە کە عەینەکەی لایە لەبەر هێزی دەستەکەی.

بزانن! ناکۆکی لە بەینی ئەم شەهادەتانەدا لە وەختێکدایە کە لە هیچ لایەکەوە شتێکیوا نەبێ تەرجیحی بدا بەسەر ئەویتریاندا، ئەگینا ئەو لایە پێش ئەخرێ کە تەرجیحدەری هەیە.

ئەسبابی تەرجیحدان زۆرە؛

یەکەم، وەکوو ئەوە یەکێ لە شەهادەتەکان بەیانی نەقڵی مولّك بکا؛ مەسەلا، شاهیدی یەکێکیان شەهادەت بدا بەوە کە ئەو عەینە موڵکی «مەحموود»ەو شاهیدی ئەولایان شەهادەت بد ا بەوە کە ئەو عەینە موڵکی «ئەحمەد»ەو لە «حامید»ی کڕیوە.

دووهەم، وەکوو ئەوە کە ئەو ماڵە لە دەستی یەکێکیاندا بێ یا لە دەستی یەکێکدا بێ کە ئیقراری کردبێ بۆ یەکێکیان، خوای شاهیدی هەردوولا سەبەبی موڵك بەیان بکا یا نە وە ئەگەر بەیانی سەبەبیان کرد، ئەو سەبەبانە یەك بن یا جیا بن؛ هەروەها، ئەگەر موڵکەکەیان دایە پاڵ ئەسڵ، فەرق نییە لەوەدا کە هەردوولایان بیدەنە پاڵ یەك کەس یا هەر لایەك بیداتە پاڵ یەکێك؛ مەسەلا، شاهیدی یەکێکیان بڵێت: لە «ئەحمەد»ی کڕیوەو

شاهیدی ئەویان بڵێت: لە «مەحموود»ی کڕیوە، ئەوە هەر شاهیدی کابرای خاوەندەست پێش ئەخرێتو خاوەن دەست، پێی ئەڵێن: «داخِل»و خەسمەکەی، پێی ئەڵێن: «خارِج» وە لەکاتی مورافەعەدا شاهیدی کابرای «داخِل» نابیسرێ تا شاهیدی کابرای «خارج» شەهادەت ئەدا؛ بەڵێ، هەندێ کەس وتوویانە: شەهادەتی «داخل»یش لەپێشدا ئەبیسرێ لەبەر نووسینی شەهادەتەکەی، بەڵام پێویستە لەپاش شەهادەتی «خارج» دووبارە بکرێتەوە.

دەلیلی پێشکەوتنی شەهادەتی داخیل، دوو شتە؛ یەکەم، حوکمی حەزرەتﷺ بە پێش خستنی شەهادەتی داخیل؛ دووەم، هێزی دەستو تەسەڕوفە، هەرچەند شاهیدی خاریج دوو پیاو وە شاهیدی داخیل پیاوێكو سوێندێك بێ؛ جا مادام هۆی پێشکەوتنی شاهیدی داخیل دەستە، ئەگەر شاهیدی خاریج وتی: ئەم خاریجە ئەو عەینەی کڕیوە لە خاوەن دەستەکە یا لەو کەسەکە ئەو فرۆشتوویە بەو، یا وتی: ئەو کەسەی کە بەوی فرۆشتووە زەوتکەر بووە، یا ئەم خاوەن دەستە زەوتی کردووە، ئەوە لەم سوورەتانەدا شاهیدی کابرای خاریج پێش شاهیدی داخیل ئەخرێ وە ئەگەر شاهیدی خاریج وتی: کابرای داخیل ئەو عەینەی زەوتکردووە و شاهیدی داخیلەکە وتی: لە فڵانکەسی کڕیوە، ئەوە هەر شاهیدی داخیل پیش ئەخرێ، چونکە نەقڵی راستی گێڕاوەتەوە.

ئەگەر دووکەس هەرایان بوو لەسەر حەیوانێكو یەکێکیان کەلوپەلی بە کۆڵی حەیوانەکەوە بوو، یا هەرایان بوو لەسەر زەوییەكو زەوییەکە زەراعەتی یەکێکیانی تێدا بوو، یاخود هەرایان بوو لەسەر خانوویەك کە کەلوپەلی یەکێکیانی تێدابوو، وە هەردووکیان شاهیدیان لەسەر موڵکی موتڵەق راست کردەوە، ئەوە شاهیدی ئەوەیان پێش دەخرێ کە کەلوپەلی بە کۆڵی وڵاخەکەوەیە، یا لە ماڵەکەدایە یا تۆوی لە زەوییەکەدا چاندووە؛ خاوەند شت بۆیە پێشئەخرێ چونکە ئەم بەکارهێنانە وەکوو دەستو تەسەڕوف وایە.

سێهەم، وەکوو پێشکەوتنی تەئریخی موڵکی یەکێکیان؛ مەسەلا، شاهیدی لایەکیان بڵێت: دوو ساڵە ئەم عەینە موڵکی «زەید»ەو شاهیدی ئەولاکەیان بڵێت: سێ ساڵە

موڵکی «عەمر»ە، یا وەکوو ئەوەکە شاهیدی لایەکیان بڵێت: ئەم بزنە موڵکی «زەید»ە و شاهیدی ئەولا بڵێت ئەم بزنە لە حەیوانی «خالید» لە دایك‌بـووە، یـاخود شـاهیدی لایەکیان بڵێت: ئەو خانووە موڵکی «زَید»ەو شاهیدی ئەولا بڵێت: ئەو خانووە بە میرات لە باوکی «عەمر»ەوە هاتووەتەوە بۆ «عەمر».

**چوارەم**، وەکوو ئەوە شەهادەتێکیان، «ناقِلة»بێ و ئەویان، «مُستَصحبە»بێ، وەکوو کوشتنی کەسێ کە میراتگری ئیددیعای بکاتو شاهید لەسەر کوشتنەکـەی راست بکاتەوەو شاهیدی ئەولا بڵێت: لە ماڵی خۆیدا مردووە؛ یەکەم، ناقیلە لە ئەسڵەوە کە مردنیەتی لە جێگەی خۆیا بۆ حاڵەتی کوشتن، دووەمیش ئیستیسحابی ئـەو ئـەسڵە ئەکاو ناقیلەکە پێش‌ئەخرێ.

جا ئەگەر عەینێ بە دەستی یەکێکەوە بوو وە کەسێکی خاریج وتی: ئـەو عـەینە موڵکی منەو کڕیومە لە تۆو داخیل وتی: نەخەیر، هەر موڵکی خـۆمـە وە هـەردوولا شاهیدیان راست کردەوە، ئەوە شاهیدی خاریجەکە پێش‌ئەخرێ، لەبەرئەوەکە زیادە زانستی هەیە بەهۆی ئەوەوە کە ئاگای لە گواستنەوەی ئەو عـەینەیە لە داخـیلەوە بـۆ خاریج؛ هەروەها، ئەگەر شاهیدی خاریج بڵێ: ئەو عەینە موڵکی خاریجەو بە ئەمانەت لای داخیل دایناوە، یاخود کابرای داخیل زەوتی کردووە لەم خاریجە، یا ئەوکەسەی فرۆشتوویەتی بە داخیل زەوتی کردووە لەم خاریجە، ئەوە هەر شاهیدی خاریجەکە پێش‌ئەخرێ.

بەڵێ، ئەگەر شاهیدی خاریج شەهادەتەکـەی مـوتڵەق بـوو و شـاهیدی داخـیل شەهادەتەکەی ناقیلە بوو؛ مەسەلا، شاهیدی داخیل بڵێت: ئەو عەینە موڵکی «زەید»ەو لە «عەمر»ی کڕیوەو شاهیدی خاریج هەر بڵێت: موڵکی خاریجەکەیە، ئەوە شاهیدی کابرای داخیل پێش‌ئەخرێ؛ هەروها، ئەگەر خاریج بڵێ موڵکی منە و لە باوکمەوە بە میرات وەرم گرتووە، وە داخیل بڵێ: موڵکی خۆمەو لە باوکی تۆم کڕیوەو شاهید لەسەر ئەمانە راست‌کەنەوە، هەر شەهادەتی شـاهیدی داخـیل پـێش ئـەکـەوێ وە ئـەگـەر هەردوولایان ناقیلە بوونو عەینەکەیش لە دەستی یەکێکیانا بێ، ئەوە لەم سوورەتەدا

شاهیدی خاوەن دەست پێش ئەکەوێ؛ مەسەلا، شاهیدی خاریج ئەیوت: مولْکی خاریجەو لە داخیلی کڕیوەو شاهیدی داخیل وتی: مولْکی داخیلەو لە خاریجی کڕیوە، ئەوە شەهادەتی داخیل پێش ئەکەوێ.

**پێنجەم**، بەهۆی ئەوەوە کە شاهیدەکە بەیانی مالیکییەتی ئێستاکەش بکات؛ مەسەلا، شاهیدی لایەکیان بلْێ: ئەم عەینە مولْکی «زَید»ەو بەس و شاهیدی ئەم لا بلْێ: مولْکی «عَمرو» بووەو ئێستەش هەر مولْکی «عَمرو»ە.

شەشەم، وەکوو ئەوە حوججەتی یەکێکیان دوو شاهید بێ‌و حوججەتی ئەولا شاهیدێك‌و سوێندێك بێ، ئەوە دوو پیاوەکە پێش ئەکەون.

وە لەو سوورەتانەیەکە داخیل پێش ئەکەوێ ئەمە ئەگەر یەکێ فەرشێکی لە ماڵێکدا دەرهێناو وتی: فەرشی خۆمەو لە ماڵی تۆدا بووە، خاوەن ماڵیش وتی: ماڵی خۆمەو شاهیدیان نەبوو، ئەوە ئەمر ئەکرێ بە خاریج کە فەرشەکە بداتەوە بە داخیل وە ئەگەر هەردوولا شاهیدیان هەبوو، ئەوە شاهیدی خاوەن‌ماڵ لەپێشە وە ئەگەریەکێ وتی: هەزار دینارم لە فلان وەرگرت چونکە ماڵی خۆم بوو لەسەری، کابرایش وتی: ئەو پارەیە ماڵی خۆمەو شاهیدیان نەبوو، ئەوە ئەمر ئەکرێ بە کابرای خاریج پارەکەی پێ بداتەوە وە ئەگەر هەردوولا شاهیدیان بە موتلەقی هەبوو، ئەوە شاهیدی داخیل پێش‌ئەخرێ وە ئەگەرهەر یەکێکیان شاهیدی هەبوو، ئەوە حوکمی دیارە.

وە ئەگەر خاوەن ماڵ‌و کرێچی هەرایان بوو لە شتێکدا کە لکابوو بە خانووەکەوە، وەکوو رەفەو پەیژەی قایمکراو، ئەوە باوەڕ بە خاوەن ماڵ ئەکرێ وە ئەگەر هەرایان هەبوو لە شتێکداکە نەلکابوو بە خانووەکەوە، وەکوو سەماوەرو تەشتی بەردەست، ئەوە باوەڕ بە کرێچی ئەکرێ وە هەر شتێ لەوانە بێ کە قابیلی ئەوە بێ بلکێ بە خانووەوەو جیایش بکرێتەوە، وەکوو مێخی جل هەڵواسین، ئەوە هەرکام لەوان سوێندی خوارد، حەقی ئەو کەسەیە وە ئەگەر هەردوولایان سوێندیان خوارد، ئەوە دابەش ئەکرێ لە بەینیاندا.

«ابنُ الصّلاح»یش فتوای داوە لەبارەی درەختێکەوە کە لەناو حەوشی خانوودا بێ کەوا خاوەن‌دەست ئەو کەسەیەکە تەسەڕوف ئەکا لەو درەختەداو میوەکەی ئەچنێ؛ جا

لەسەر ئەم ئەساسە، ئەگەر بەرگدروو و خاوەن ماڵ هەرایان بوو لەسەر مەقەستو دەرزیو مەکینەی بەرگدروون، ئەوە باوەڕ بە بەرگدرووەکە ئەکرێ بە سوێند.

وە ئەگەر ژنو مێرد هەرایان کەوتە بەینەوە لەکەلوپەلی ناوماڵداو شاهیدیش نەبوو، ئەوە ئەگەر ئیختیساسی بە یەکێکیانەوە بوو بەهۆی تەسەڕوف لەو شتەدا، وەکوو خشڵ بۆ ژنو خەنجەر بە ناوقەدی خۆیەوە، ئەوە خاوەنئیختیساس سوێند ئەدرێ وە ئەگەر ئیختیساسی کەسیان نەبوو بەو شتەوە، ئەوە دروستە بۆ هەرکام لەوان ئەوی‌تریان سوێند بدا؛ جا ئەگەر هەریەکێ لەوان سوێندی خوارد، ئەوە هەر ماڵی ئەو یەکەیە با ئەو شتەیش بۆ ئەو نەشێ، وەکوو خشڵ بۆ پیاو وە ئەگەر هەردوانیان سوێندیان خوارد، ئەوە بەش ئەکرێ لە بەینیاندا، هەرچەند هەر بۆ یەکێکیان بشێ.

ئەگەر بەهۆی شاهیدەوە عەینەکە لە کابرای داخیل وەرگیراو لەپاشان ئەم داخیلە شاهیدی راست کردەوە لەسەر مالیکییەتی خۆی لەپێش لابردنی دەستیدا لەسەر عەینەکەو عوزری هێنایەوە بەوەکە شاهیدەکانی دیارنەبوون، ئەوە ئەم شاهیدانەی لێ وەرئەگیرێو عەینەکەی پێ ئەدرێتەوە، چونکە سابت بووەکە خاوەن دەستی شەرعی ئەم کەسە داخیلەیە.

ئەگەر کەسێ ئیقراری کرد بە عەینێك بۆ کەسێكو لەپاشا داوای کرد بۆخۆی، ئەوە ئەم دەعوایە نابیسرێ، مەگەر لەم دەعوایەدا بەیانی نەقڵی عەینەکە بکا بۆلای خۆی بە وەزعێکی شەرعی؛ بەڵام ئەگەر کەسێك عەینێکی بەهۆی شاهیدەوە لێوەرگیراو لەپاشان ئیددیعای موڵکییەتی کرد بۆ خۆی، ئەوە شەرت نییە باسی گواستەوەی بکا بۆ لای خۆی، بەپێی فەرموودەی راستتر.

مەزهەبی ئیمامی شافیعی لەسەر ئەوەیە کە زۆریی ژمارەی شاهیدەکان لەلایەکەوە، نابێ بەهۆی هێزی ئەولایە، مەگەر ئەوەندە زۆر بن بگەن بە ئەندازەی «تَواتُر»، وە لەم کاتەدا پێش‌ئەخرێ، چونکە ئەبێ بەهۆی عیلمی قەتعی؛ هەروەها، شەهادەتی دوو پیاو پێش ناخرێ لەسەر شەهادەتی پیاوێكو دوو ژن وە شەهادەتێ کە بەیانی تەئریخ نەکا، پێش ناخرێ لەسەر شەهادەتێ کە بەیانی تەئریخ بکا؛ بەڵێ، شەهادەتی دوو پیاو یا

شەهادەتی پیاوێك‌و دوو ژن پێش‌ئەخرێ لەسەر شاهیدێك‌و سوێندی «مدّعي»، وەکوو لەمەوبەر بەیانمان کرد.

ئەگەر شاهیدی لایەك شەهادەتی دا بە موڵکییەت لە ساڵێکەوەو شـاهیدی ئـەولا شەهادەتی دا بە موڵکییەت لە شەش مانگەوە، ئەوە یەکەمیان پێش‌ئەخرێ، بەو شەرتە موڵکەکە بە دەستی هیچیانەوە نەبێ یا بە دەستی هەردووکیانەوە بێ، بەڵام ئەگەر بـە دەستی ئەویانەوە بێ کە شاهیدەکانی ماوەکەمەکەیان بەیان کردووە، ئەوە هەر شاهیدی ئەم خاوەن دەستە پێش‌ئەخرێ؛ هەروا، ئەگەر بە دەستی ئەولاوە بێ کە شاهیدەکەی ماوەی زۆری بەیان کردووە، ئەوە بێ‌گومان پێش‌ئەخرێ‌و کە حوکم بۆ هەرکەس درا، هەر قازانجێ کە لە وەختی شوموولی شەهادەتەکەوە پەیدا بووە، ئەدرێ بەم‌کەسە کە موڵکەکەی بۆ سابت بووە، ئەگەر بە دەستی خۆیەوە نەبووبێ.

**بزانن!** شەرتی قەبووڵی شاهیدی موڵك، ئەوەیە یا بڵێ: ئێستە مالیکی ئەو ماڵەیە، یا ئەگەر بەیانی مالیکییەتی لەمەوپێشی کرد، بڵێ: ئێستەیش هەر موڵکی ئـەم کـەسەیە، یاخود بڵێ: وە ئاگام نییە لەوە کە ئەو عەینە لە موڵکی ئەم کەسە دەرچـووبێ لەو وەختەوە تا ئێستە، ئەگینا شەهادەتەکەی قەبووڵ ناکرێ.

**بزانن!** دروستە ئینسان شەهادەت بدا بە مالیکییەتی شەخس بە ئیعتیماد لەسـەر ئەوە کە لەمەوپێش مالیك بووە؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە ئەگەر شەهادەت بە مالیکییەت بە ئیعتیماد لەسەر میراتگرتن بوو لە کەسێکەوە، یا کڕین لە کەسێکەوە، پێویستە بزانێ ئەو کەسە کە موڵکەکە لەوەوە هاتووە بۆ ئەم مالیکی شەرعی بووە.

وە ئەگەر شاهید شەهادەتی دا لەسەر ئەوە کە ئەو «مدّعی علیه»یە دوێنێ ئیقراری کردووە بەوە کە ئەو عەینە موڵکی «مدّعي»یەکەیە، ئەوە حوکمی ئەو ئیقرارە دەوامی پێ‌ئەدرێ، هەرچەند شاهیدەکان باسی مالیکییەتی ئەمڕۆیشی نەکەن، چونکە ئیقراری «مدّعی علیه» حوججەتی قەتعییە.

ئەگەر یەکێ شاهیدی ڕاست کردەوە لەسەر ئەوە کە خاوەنی حەیوانێك یا باخێك یا درەختێکەو باسی مالیکییەتی زوویان نەکرد، ئەوە هەر سەمەرێك ئێستا بۆ دارو باخەکە

بێ، یا هەر بەچکەیەك جیا بووبێتەوە لە حەیوانەکە، نابێ بە موڵکی ئەم کابرایە؛ بەڵێ، ئەگەر بەچکەیەك لە سکیا بێ، ئەوە ئەبێ بەماڵی، هەروەها هەر بەرێ کە لەمەولا ئەو دارو باخە بیگرن، بۆ ئەم کابرایە[یە].

ئەگەر کەسێك شتێکی کڕیو بە حوججەتێکی موتڵەقە لێی وەرگیرا، ئەگەڕێتەوە بۆسەر فرۆشیارەکە بەو قیمەتەکە پێیداوە. ئەگەر یەکێ دەعوای موڵکی موتڵەقی کردو شاهیدەکان شەهادەتیان دا بە مالیکییەتیو بەیانی سەبەبی موڵکەکەشیان کرد، ئەوە زیانی نییە، بەڵام ئەگەر «مدّعي» بەیانی سەبەبێکی کرد، وەکوو کڕینو ئەو شاهیدانە بەیانی سەبەبێکی تریان کرد، وەکوو میرات ـ مەسەلا ـ ئەوە زیانی هەیە بۆی، چونکە زیددی دەعواکەی ئەمە بۆ موڵکییەت بەو سەبەبە تایبەتییە.

## باسی یەكنەكەوتنی قسەی «مدّعي»و «مدّعی علیه» لەبارەی عەقدەوە

«زَید»، وتی بە «عَمرو»: تەواوی خانووەکەت پێداوم بەکرێ بۆ ساڵێ بە ١٠ دنیار وە «عَمرو» وتی: تەنیا هۆدەیەکم لەو خانووە پێداوی بەوپارەیە و هەردووکیان شاهیدیان هێنا، خواە هەردوو شەهادەتەکە موتڵەق بن، یاخود یەکێکیان موتڵەقو ئەویان «مقیّد»بێ بە تەئریخەوە، یاخود هەردووکیان «مقیّد» بوون بە تەئریخەوەو تەئریخەکەیان یەکێك بوو یاخود جیاواز بوو بەڵام «متّفِق» بوون لەسەر ئەوەکە هەر یەك عەقدی بەکرێدان تێپەڕیوە، ئەوە لە هەموو ئەم سورەتانەدا ئەو دوو شەهادەتە لەگەڵ یەك «مُتَعارِض»نو هیچیان قیمەتی نییە، جا لەمکاتەدا پێویستە هەردوولا لەسەر مەبەستی خۆیانو پێچەوانەی ئەویان سوێند بخوا، جا ئەو عەقدە هەڵدەوەشێتەوە.

بەڵام ئەگەر تەئریخیان جیاواز بوو و ئیتیفاقیشیان لەسەر یەك عەقد نەبوو؛ مەسەلا، شاهیدی لایەکیان وتی: ئەو هۆدەیە داوە بە کرێ بۆ ساڵێك لە مانگی رەمەزانەوە و ئەوی تریان وتی: خانووەکەی پێداوە بە کرێ بۆ ساڵێك لە مانگی شەوالەوە، ئەوە ئەو شەهادەتەیان ئیعتیباری هەیە کە تەئریخەکەی لە پێشترە؛ جا ئەگەر شەهادەتی پێشوو لەسەر بەکرێدانی خانووەکە بوو، ئەوە شەهادەتی دوایی بەتاڵ ئەبێتەوە وە ئەگەر پێشوو

لەسەر بەکرێدانی هۆدەیەك بوو، ئەوە شەهادەتی دوایی ئەبێ بە دەلیلی بەکرێدانی هۆدەکانی تریش وە لەم سوورەتەدا، مەعنای رەفتار بە شەهادەتی پێشوو ئەمەیە کە ناکۆکی لە بەینی شەهادەتەکاندا نامێنێ، خواه ئەوی دوایی بەتاڵ بکرێتەوە ـ وەکوو سوورەتی یەکەمی ـ یاخود رەفتار بە هەردووکیان بکرێ، وەکوو سوورەتی دووهەم.

ئەگەر دووکەس دەعوای عەینێکیان کرد کە لە دەستی کەسێکی سێهەمدا بوو و هەردوولا شاهیدیان هەبوو، ئەوە ئەگەر ئەو کەسە سێهەمە ئیقراری کرد بۆ یەکێك لەو دوو «مدّعي»یە، ماڵەکە تەسلیمی ئەو ئەکرێ‌و ئەوی تریشیان ئەتوانێ سوێندی بدات بۆ ئەوە بەڵکوو ئیقرار بکات بۆ ئەمیش‌و بەدەڵی عەینەکەی بۆ ببژێرێ وە ئەگەر ئینکاری «مُدَّعا»کەی هەردووکیانی کردو ئەوانیش شاهیدیان نەبوو، ئەوە بۆ هەریەکێ لەوانە سوێندێ ئەخواو عەینەکە هەر لە دەستی ئەمدا ئەمێنێتەوە وە ئەگەر هەردوولا شاهیدیان راست کردەوە بەڵام شاهیدی لایەك وتی: ئەم کەسە سێهەمە ئەم عەینەی زەوت کردووە لە «مدّعي»و شاهیدی ئەولا وتی: ئەم سێهەمە ئیقراری کردووە بەوەکە زەوتی کردووە لە «مدّعي»یەکە، ئەوە شاهیدی پێشوو پێش ئەکەوێ چونکە شاهیدی عەیانە.

وە ئەگەر شاهیدی هەردوولایان شەهادەتی دا بەوەکە «مدّعي»یەکەی ئەو عەینەی کڕیوە لەو کەسە سێهەمەو عەینەکەی وەرگرت‌و کڕیار قیمەتەکەی تەسلیم کرد، ئەمە ئەگەر مێژوویان جیاواز بوو، حوکم ئەکرێ بەو شەهادەتە کە مێژووەکەی پێشترە، چونکە مەعلووماتی زیادەی لایەو ئەوی دوایی ئەگەر لە واقیعدا عەینەکەی کڕیبێ، ئەوە لەوکاتەدا کڕیویە کە عەینەکە لە موڵکی کابرا دەرچووەو فرۆشتنەکەی بەتاڵ بووە؛ بەڵام ئیمامی "بلقینی" ئەوەی جیا کردووەتەوە کە ئەگەر «مدّعي» ئیددیعای فرۆشتنی دوایی بکا لە ماوەی خیاری فرۆشتنەپێشووەکەداو شاهید شەهادەتی لەسەر بدا، ئەوە ئەم شاهیدی فرۆشتنی دواییە پێش‌ئەخرێ‌و کڕیاری یەکەم پارەکەی پێ ئەدرێتەوە؛ هەروەها، ئەگەر شاهیدی دوایی تەعەرڕوزی کرد بۆ ئەوەکە لەکاتی فرۆشتنەکەدا موڵکی فرۆشیار بووە، ئەوە هەر شەهادەتە دواییەکە پێش‌ئەخرێ.

خولاسە، هەرکام لەو دوولایە شەهادەتی دا بە مالیکییەتی فرۆشیار بۆ ئەو عەینە لەکاتی فرۆشتنەکەدا، یاخود شەهادەتی دا بۆکڕیارەکەکە ئێستە مالیکی ئەوعەینەیە، یا شەهادەتی دا بە تەسلیم کردنی پارە بە فرۆشیارەکەو شاهیدی ئەولا ئەمەی بەیان نەکرد، ئەوە پێش‌ئەخرێ، چونکە مەعلووماتی زیادەی لایە و «تَعرُّض» بۆ تەسلیمی قیمەت، باعیسی تەسلیمی عەینەکەیەو شەهادەتەکەی‌تر باعیسی تەسلیم نییە، لەبەرئەوە کە لەپێش وەرگرتنی قیمەتدا لە کڕیار فرۆشیار حەقی حەپس کردن‌و ڕاگرتنی عەینەکەی هەیە.

وە ئەگەر تەئریخیان جیاواز نەبوو بەم جۆرە هەردوو شەهادەتەکە موتڵەق بوون، یاخود یەکێکیان موتڵەق بوو و ئەویان تەئریخی دیاری کرابوو، یاخود هەردووکیان تەئریخیان دیاری کرابوو بە یەك تەئریخ، ئەوە «تَعارُض» ئەکەن‌و هەردووکیان ئەکەون؛ جا ئەگەر کابرای سێهەم ئیقراری کرد بۆ یەکێکیان، ئەوە ئەو عەینە ئەدرێ بەو کەسە وە ئەگەر ئیقراری کرد بۆ هەردووکیان، بەش ئەکرێ لەبەینیانا، ئەگینا ئەو کەسە بۆ هەریەکێ لەو دوو «مدَّعي»یە سوێند ئەخواو عەینەکە لەدەستی خۆیا ئەمێنێتەوەو هەر پارەیەکیان داوە بەو سێهەمە لەسەر شەهادەتی شاهیدەکان، وەری‌ئەگرنەوە لێی چونکە بە شاهید سابت بووە کە وەری‌گرتووە وە تەعاروزی شاهیدەکان هەر بە نیسبەت عەقدەکەوەیە، بەڵام ئەمە وەختێ وەهایەکە تەعەروز نەکەن بۆ وەرگرتنی فرۆشراوەکە، ئەگینا هەرکەسێ کە شاهیدەکان وتیان فرۆشراوەکەی وەرگرتووەو بە خاوەن دەست ناسرا، ئەوە شاهیدەکانی پێش‌ئەخرێن‌و کەسیشیان حەقی نییە داوای پارەکە لەکابرای سێهەم بکات، چونکە ئەو پارەیە دامەزراوە بۆی بەهۆی وەرگرتنی فرۆشراوەکەوە.

ئەگەر عەینێك لە دەستی یەکێکدا بوو وە دوو کەس دەعوایان کردو هەرکامیان وتی ئەو عەینە ماڵی خۆی بووەو فرۆشتوویە بەو کەسە بە دە دینار ـ مەسەلا ـ و داوای پارەکەی لێ‌کردو شاهیدی لەسەر ڕاست کردەوە، ئەوە ئەگەر تەئریخی هەردووکیان یەکێ بوو، «تعارُض» ئەکەن‌و هەردوو ئەکەون وە ئەگەر تەئریخەکەیان جیاواز بوو، کابرای عەین بەدەست هەردوو قیمەتەکەی ئەکەوێتە سەر، چونکە هەردو دەعواکە

ئیحتیمالی ئەوەیان هەیە واقیعی بن؛ کەوابێ، پێویستە ماوەکە قابیل بێ بۆ عەقدی یەکەم وگواستنەوە بۆ فرۆشیاری دووەم و عەقدی دووەم، ئەگینا سوێند ئەخوا بۆ هەردوولایانو پارەی ناکەوێتەسەر، هەروەها ئەگەر هەردوو شاهیدەکان موتڵەق بن، یاخود یەکێکیان بە موتڵەقی ناوی هێناو ئەویان بەیانی تەئریخی کرد وە لەم کاتەیشدا پارەی هەردوولای ئەکەوێتە سەر، چونکە مادام جیاوازیی زەمانی موعامەلەکانو راستی هەردوو شاهیدەکە قابیلە ناکەون، ئەم مەسئەلەیە جیا ئەبێتەوە لە مەسئەلەی پێشوو بەوە کە قابیل نییە عەینەکە لە یەك کاتدا ببێ بە حەقی دووکەس؛ کەوابێ، شاهیدەکان «تعارُض» ئەکەن وە لێرەدا مەبەست دوو قیمەتەکەیە و «ذِمّە»ی شەخس قابیلی هەڵگرتنی هەردووکیانە؛ کەواتە، واجب ئەبن و شەهادەتی هەردوولا لەسەر ئیقراری کابرا، وەکوو شەهادەتە لەسەر فرۆشتنەکان؛ کەواتە، هەردوو قیمەتەکە واجب ئەبێ لەسەری، مەگەر تەئریخی هەردوو شەهادەتەکە یەکێ بێ، یا زەمان ماوەیەکی وای نەبێ کە قابیلی گواستنەوەکان بێ، ئەوە ئەو دوو قیمەتەی ناکەوێتە سەرو بە دو سوێند رزگار ئەبێ.

## باسی قیافەت

هەرچی بۆ شاهید شەرت بێ، بۆ قیافەتشناسیش شەرتە؛ هەروەها، ئەوەش شەرتە کە بەراوردکرابێ؛ مەسەلا، کەسێك جارێك منداڵێکی نیشان بدرێ لەناو چەند ژنێکا غەیری دایکی منداڵەکە وە جاری دووهەم لەناو چەند ژنێکا کە دایکی منداڵەکەیان لەناودا بێ؛ جا ئەگەر لە هەردوو سوورەتەکەدا زانی بەوەکە ئەو منداڵە لەو ژنەیە، ئەوە بە قیافەتشناسی تەجرەبەکراو دائەنرێ.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە شەرت نییە قیافەتشناس زۆر بێ، هەروەها شەرت نییە لە هۆزی «بَنی مدلج»بێ؛ جا ئەگەر دوو کەس ئیددیعای نەسەبی منداڵێکی «مجهولُ النَّسَب»یان کرد، ئەوە منداڵەکە پیشانی قیافەتشناس ئەدرێ. هەروەها ئەگەر دوو کەس شەریك بن لەوەدا کە هەردوو بە شوبهە چووبنە لای ژنێكو ژنەکە منداڵێکی لێ

بووبوو، جا ئەو دوو پیاوە بوو بە هەرایان لەسەر منداڵەکەو هەرکامیان بە منداڵی خۆیی ئەزانی، ئەوە ئەو منداڵە لەگەڵ هەردوو پیاوەکەدا پیشانی قیافەتشناس ئەدرێ‌و قیافەتشناس بە منداڵی هەرکامیانی دانا، حوکمی بۆ ئەدرێ؛ بەڵێ، ئەگەر حەیز کەوتە بەینی چوونی ئەو دوو پیاوەوە بۆ لای ژنەکە، ئەوە ئەو منداڵە ئەدرێ بە کابرای دووهەم، مەگەر پیاوی یەکەم مێردی ژنەکە بێ‌و لە نیکاحی دامەزراودا چووبێتەلای، ئەوە منداڵەکە لەم حاڵەدا بۆ کابرای یەکەمە؛ لەم سوورەتانەدا فەرق نییە لە بەینی ئەوەدا کە «مدّعي»یەکان جیا بن لە موسوڵمانەتی‌و ئازادیدا، یا وەك یەك بن.

ئەگەر دووکەسی قیافەتشناس حازر بوون‌و یەکێکیان ئەو منداڵەی دا بە یەکێ لە «مدّعي»یەکان بەهۆی ئیعتیباری شێوەیەکی زاهیر و ئاشکراوەو ئەویان دای بە «مدّعي»ی دووهەم بەهۆی ئیعتیباری شێوەیەکی پەنامەکی واوەکە هەر قیافەت شناسی زۆرزان ئەیزانی، ئەوە منداڵەکە ئەدرێ بە «مدّعي»ی دووهەم، چونکە دەرئەکەوێ کە ئەو قیافەت شناسە زۆر زیرەکە لە قیافەت شناسیدا.

**بزانن!** هەر مەسرەفێ کە بکرێ بۆ ژنی دووگیان بەهۆی سکەکەیەوە، یا لەسەر منداڵێ کە کابرای مەسرەفکەر بە منداڵی خۆیی بزانێ وە لە ئەنجاما، ئەو سکە یا ئەو منداڵە بدرێ بە کەسێکی تری جگە لەوە کە مەسرەفەکەی بۆ کردووە، ئەوە ئەم کەسە پێویستە ئەو مەسرەفە بداتەوە بەو کەسەی کە کردوویەتی، چونکە کابرای مەسرەفکەر بە هیوای دەسکەوتنی ئەو منداڵە ئەو مەسرەفەی کردووە.

***

ئومێدەوارم بە میهرەبانی خودای میهرەبان ئەم کارەمان لە نامەی کاردا بە کردارێکی پاکو بێ گەرد بۆ بنووسێو بە لوتفی خۆی جەزای خێرمان بداتەوە.

سُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمّا يَـصِفونَ، وَ سَـلامٌ عَـلَى المُـرسَلينَ، وَالحَمدُ للّٰهِ رَبِّ الْعالَمينَ.

لە سایەی خواوە لێ بووەمەوە لە نووسینی بەرگی چـوارەمـی کـتێبـی «شەریعەتی ئیسلام» لە چێشتەنگای رۆژی یەکشەممە، یازدەی مانگی شەعبانی ١٣٨٠ی هیجری، رێکەوتی بیستو نۆی کانوونی دووهەمی ١٩٦١ی میلادی، لە حوجرەی "مەدرەسەی مزگەوتی حەزرەتی شـێخ عەبدولقادری گەیلانی" ـ رەحمەتی خوای لێبێ ـ لە شاری "بەغدا".

***

هەرکەس شوبهە لە بابەتێکی ئەم کتێبە بکا، با بگەڕێتەوە سەر شاکتێبـەکـانی فـیقهی شافیعی؛ جا ئەگەر بۆی دەرکەوت ئێمە بەهەڵەدا چووین، با هەڵەکە لای خۆی راست کاتەوەو ئێمەش ئاگادار بکا، چونکە کەس نییە هەڵە نەکا. وە پێشەکیش، سـوپاسی زۆری ئەکەین.

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- ناوی «عبدالكريم»ە و کوڕی «محمّد»ە و نازناوی «نامی» یە و ناسراوە بە «مدرّس»
- مانگی «ربيع‌الاول»ی ساڵی ۱۳۲۳ی کۆچی و بەهاری ۱۲۸۴ی هەتاوی و ۱۹۰۵ی زایینی لە دێی «تەکیە»ی خورماڵ (یان «گوێزە کوێرە»ی مەریوان) هاتۆتە دنیاوە.
- لە ۱۳۳۱ی کۆچیدا دەستی کردووە بە خوێندن لە حوجرەکانی ناوچەکانی کوردستاندا و لە ۱۳۴۳ی کۆچی ئیجازەی عیلمی (مەلایەتی) وەرگرتووە لە خزمەتی مامۆستای ناوداری کورد مەلا (عمرابن القرەداغی) دا لە سلێمانی
- لە پاش ئیجازە تا نزیکەی فەوتی، لە (بیارە) (۲۴ ساڵ) و لە «کەرکووک» و «سلێمانی» و «بەغدا» دەرسی وتوەتەوە.
- نزیکەی ۶۰ کەسی ئیجازەی عیلمی (مەلایەتی) پیداوە لە ماموستایانی ناوچەکانی کوردستان و عێراق و ئێران.
- زیاتر لە ۸۰ کتێبی داناوە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی لە بابەتە جۆر بە جۆرکانی ئایین و ئەدەب دا.
- ۸ ی خەرمانانی ۱۳۸۴ ی هەتاوی لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە و لە پاڵی مەرقەدی «عبدالقادری گەیلانی» دا نێژراوە.

شابک دوره
9 789649 926100
جلد دوم
9 789649 926131

انتشارات پرتو بیان

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج - پاساژ عزتی - تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲